# فەرهەنگی رامان

(ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردی)

بەرگی 1

**Raman Dictionary of kurdish etymology**

ئەمەگ رامان (د. عەبدوڵڵا ئیبراهیم زادە)

**Emeg Raman (Dr. A. Ibrahimsade)**

**پێشکێشە بە یادی نەمر مامۆستا حەسەن قزڵجی و بە زانا و تێکۆشەری دۆستی کورد**
**د. ئیسماعیل بێشکچی**

**دیباچە**

لە دەمێکەوە وەک بابەتێکی سەرنجراکێش دەمڕوانییە لێکچوونی وشەکانی زمانە جۆربەجۆرەکان و بەتایبەتی هی زمانی کوردی دەگەڵ ئەوانی دیکە. ساڵی 1997 بڕیارم دا وتارێک بنووسم و تێیدا ئاماژە بە کۆمەڵێک وشەی زمانی کوردی بکەم کە تا ئەو کاتە کۆم کردبوونەوە. لەسۆنگەی ئامادە کردنی ئەم وتارەدا چووم بۆ کتێبخانەی شار (لە
Münster ی ئەڵمان). لەوێ بۆ یەکەم جار چاوم بە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی کەوت. چەندین کتێبی قەبارەزل و ئەستوور لەبەر چاوم قوت ببوونەوە. کتێبی ئەوهای لێ بوو کە لە چەندین بەرگ و هەر بەرگەش لە سەدان لاپەڕە پێک هاتبوو. کاتێک کتێبێکم هەڵگرت و هەر لەوێ تاوێک چاوم پێداخشاند، بە سەرسوورمانەوە بۆم دەرکەوت کە لە هەر دوو سێ لاپەڕەدا لانی کەم وشەیەک بەدی دەکرێ کە دەتوانێ خزمایەتی دەگەڵ وشەیەکی کوردی هەبێ. هەر ئەو کاتە بە تەواوی دڵنیا بووم کە خزمایەتی زمانی کوردی دەگەڵ ئەڵمانی زۆر لەوە نیزیکترە کە پێشتر بیرم لێ کردبۆوە. ئیتر گومانم نەما کە ئەو وشانەی تا ئەو رۆژە کۆم کردبوونەوە، تەنیا مشتێک بوو لە خەروار.
لە لایەکی دیکەوە بە دیتنی ئەو کتێبە زەبەلاح و ئەو هەموو زانیارییە ورد و بەکەڵکە کە لەسەر وشەکانی زمانی ئەڵمانی کۆ کرابوونەوە، بەزەییم بە خۆماندا هاتەوە. لە خۆم دەپرسی بۆچی زمانی کوردی بە چل میلیۆن ئاخێوەر دەبێ لە فەرهەنگێکی ئەوتۆ بێ بەری بی؟
هەر ئەو کاتە بەدەم چاوپێداخشاندنی کتێبەکانەوە بیرێک بە میشکمدا تێپەڕی، تۆ بڵێیی من نەتوانم ئەو کارە دەست پێ بکەم، کار لەپێناو دانانی فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژیکی زمانی کوردیدا؟ ئیتر نووسینی وتارم لەبیر چۆوە و بیرۆکەی نووسینی فەرهەنگ وەک کێچ کەوتە کەوڵمەوە. ماوەیەک کەوتمە ململانێیەکی هزری توند دەگەڵ خۆم. لەلایەکەوە دەمزانی کات و هەلومەرجی ژیانم بە هیچ جۆرێک دەگەڵ قورسایی کارێکی ئەوتۆ ناگونجێ. بیرم لەوە دەکردەوە کە بۆ منی ئەوکات خوێندکاری پزیشکی ددان خۆ هەڵقوتاندن لە کارێکی سەختی زمانەوانی رەنگە هەر باش نەبێ و لەوانەیە هەم خوێندنەکەم تووشی کێشە بکا و هەم لەو لاشەوە سەرکەوتن بەدەست نەهێنم. بەڵام لە لایەکی دیکەوە دڵخۆشیی خۆم دەداوە کە من ئاشنایەتیم بە چەند زمانێک هەیە، دەمێکە هۆگری زمانەوانیی کوردیم، چەند ئەزموونێکم لە نووسین و لێکۆڵینەوە ناوەتە پشت سەر و لە هەمووش گرینگتر حەز و خولیایەکی لەرادەبەدەر بەرەو ئەم کارە رامدەکێشێ. زۆری نەخایاند ئەو ململانێیە هزرییە گەیشتە سەرەنجام و بەوە کۆتایی هات کە ئەوین بەسەر مەنتیق، خەون و خەیاڵیش بەسەرمندا زاڵ بوو. لەوە دەچوو کورەهەژارێک دڵی بە کیژی پادشا دابێ و بەهیچ جۆرێک نەتوانێ دەست لەو ئەڤینە پڕ لە تینە بەر بدا. ئیتر دەستم پێکرد و هەرگیز نەمدەزانی کە هەویری ئەو کارە ئەوەندە زۆر ئاو دەبا و ئەوەندە ساڵ لە رۆژان و شەوانی تەمەنم بە خۆیەوە خەریک دەکا. هەرگیز نەمدەزانی تا دەگەمە کیژی پادشا، ئیتر تەمەنم لە پەنجا تێ دەپەڕێ و تووکی سەرم نیوەی دەوەرێ!
بەشێکی بەرچاو لە لێکۆڵینەوە و هەڵگرتنی یادداشتەکان لە سێ ساڵی یەکەمدا ئەنجام درا، ئەوەش بە کەڵک وەرگرتن لە رۆژانی پشوودانی زانینگە و بەتایبەتی پشووەکانی زستان و هاوینان و زۆرتر بەدەم

کاری تاکسییەوە. فەرمانی تاکسی ببووە میزی نووسین و زۆر جار ئەوەندەم هەزارە دەکرد و وەها نوقمی وشەکان دەبووم کە ئاگام لە بێتەلی تاکسی و کابرای بێتەلوان دەبڕا و پاش ئەو هەموو چاوەڕوانییە بۆ گەشتێک، نۆرەکەم لەکیس دەچوو. ئەو کاتانەش لە ماڵ بووایەم، ئەوەندەی بکرایە، کاتم لە ماڵ و منداڵ گل دەدایەوە و بە زیقەی کوڕە شیرەخۆرەکەم نەبێ - کە ئێستا بووەتە لاوێکی جوانچاک و بیرپاک- لە دونیای خەون و خەیالاوی وشەکانم دانەدەپچڕام.

لە ساڵی 2000 ەوە دەستم کرد بە تایپ کردن و لە هەمان کاتدا درێژەدان بە لێکۆڵینەوەکان. ئەو کۆمپیوتێرە کۆن و شەق و شڕە کە بۆ یەکەم جار دەستم کەوت و چەند ساڵی بەرایی بە پرۆگرامێکی کوردی پڕ لە گرێ و گۆڵ کارم پێ دەکرت، وەک ئێسترەشێت وا بوو، زۆر جار مانی لێم دەگرت و رۆژ نەبوو چەند جار جووتە نەهاوێژێ. بەڵام دواکەوتن و درێژەکێشانی کارەکە تەنیا تاوانی ئێسترەشێتی هەژار نەبوو، رێگەی پڕ کەند و لەندی ئەم کارە وەها بوو کە بە ئەسپی حدوودیش هاسان نەبوو، پێیدا دەرباز بم. لێرەدا حەز دەکەم ئەوە روون بکەمەوە کە بۆچی تەواو کردنی ئەم کارە ئەوەندە ساڵەی خایاند.

ئەوەی راستی بێ، من چەند شووتیم بە دەستێک هەڵگرتبوو. لە لایەکەوە خودی ئەم کارە، بە لێکۆڵینەوە، تایپ کردن بەتایبەتی و هەروەها پێداهاتنەوەی دووبارە و چەندبارە، کارێکی ئاسایی نەبوو، کارێک بوو یەکجار وەختگیر، پڕ لق و پۆ، پڕ لە نەهێنی و رەمز و راز و وردەکاری و هەتا بڵێی هەڵگری لێکۆڵینەوەی قووڵتر و دوور و درێژتر. زۆرجار ئەم کارەم وەک دەریایەکی بێسنوور دەهاتە بەرچاو کە دەکرێ بە دەیان ساڵ مەلەی تێدا بکەی. لە لایەکی دیکەوە هەلومەرجی ژیانی من، بەتایبەتی لە باری کاتەوە بە هیچ شێوەیەک دەگەڵ پێویستییەکانی ئەم کارە جۆر نەدەهاتەوە، دیاردەیەک کە بە داخەوە تا رۆژی ئەمڕۆش هەر بەردەوامە! من چەندین ساڵ دەرگیری خوێندنێکی سەخت و وەختگیر بووم، بە جۆرێک کە لە بەیانی زوو تا درەنگی ئێواران دەبایە لە کلینیکی زانینگە بە خوێندن و ئیش و کاری پراکتیکییەوە خەریک بووبام. رۆژانی ڤاڵایی و پشووەکان و تەنانەت ماوەیەک یەکڕاست لە زانینگەڕا دەچوومە سەر کاری تاکسی، بۆ ئەوەی بژیوی ژیان پەیدا بکەم. دوای تەواو کردنی خوێندن بۆ ماوەیەک لە پاڵ ئیشی رۆژانەدا خەریکی تێزی دوکتۆراکەم بووم. ئەوجار دانانی مەتەب و کاری رۆژانەی ئەوێ کات و هێزێکی زۆریان لێ ئەستاندم و بڕستیان پێ نەهێشتم. لەپاڵ هەموو ئەوانەشدا بە درێژایی گشت ئەو ساڵانە زۆر جار کە شەوانە ماندوو و شەکەت دەگەیشتمەوە ماڵ، تا دەهاتم پشوویەک بدەم و تاوێک بچمە سەر کاری فەرهەنگەکە، ئەوا رووداوە هورووژێنەر و مخابن زۆرجار دڵتەزینەکانی کوردستان هورووژمیان دەهێنا و وەها مێشکی ماندوومیان داگیر دەکرد، کە ئیتر چ کات و هێز بۆ ئەو فەرهەنگە بەستەزمانە نەدەماوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا سەرەنجام کوڕە هەژاری ئەڤیندار و کیژە گەردن بەرزەکەی پادشای وشە، هەرچەند بە قەیرەییش بێ، پێک گەیشتن و داستانی پڕ لە چەرمەسەریان بە شادی کۆتایی پێ هات. بۆ جارێکیش بێ، قسەکەی باوکم وە راست نەگەڕا کە هەمیشە پێی دەگوتین "هەر کەس لەسەر سەبرانە، لەسەر قەبرانە"! ئێستا پاش دەرباز بوونی پازدەساڵی ئازگار، پازدە ساڵی پڕ لە رۆژانی خەوناوی و شەوانی بێداری، سەرەنجام بەرهەمی ئەم ئەڤینە لەم فەرهەنگەدا خۆی دەبینێتەوە.

ئاشکرایە کە سەبارەت بەو هەلومەرجانەی لەسەرەوە باس کران، سەرەرای هەموو هەوڵ و تەقەلایەک، ئەم فەرهەنگە ناتوانێ لە هەڵە، کەم و کورتی و ناتەواوی بەدەر بێ و بگرە لە گەلێک رووەوە نەگەیشتووەتە ئەو ئاستە بەرزە کە خۆم حەزم لێی بوو. بێگومان ئەگەر لە خاک و وڵاتی ئازادی خۆم، وەک مرۆڤێکی ئاسایی و لە هەلومەرجی ژیاتیکی لەباردا کارم لەسەر ئەم بەرهەمە کردبایە، دەسکەوتێکی گەلێک سەنگین و رەنگینترم پێشکێش دەکرد کە زۆر لەوە پێشتر و ئەوپەڕەکەی تا ساڵی 2005 بە ئەنجام دەگەیشت. بەڵام مەخابن کە چەرخی چەپگەردی رۆژگار ئێمەی کورد هەروا بێبەزە

لەناو بەرداشی خۆیدا دەهاڕێ و ئەو شتانەی کە بۆ خەڵکانی دیکە ڕەوا و ئاساییە، لە ئێمەی دەکاتە خەون و خەیاڵێکی دوورەدەست.

لێرەدا ڕەنگە ئەم پرسیارە بێتە پێش کە ئایا ساخ کردنەوەی فلانە و فیسارە وشەی زمانی کوردی نرخی ئەوەی هەیە کەوا مرۆڤ ئەوەندە ساڵە وەك عەوداڵێك بە دوایدا بگەڕێ و خۆی ئەوەندە بۆ ماندوو بکا. یان بە وتەی چەند دۆست و ناسیاوێك ئایا ئەگەر فلانە وشەم لە گۆڕ دەر هێنا، زیندووم کردەوە و بە خزم و کەسوکاری خۆیم شاد کردەوە، ئەم کارە بۆ ئێمەمانان چی لێ هەڵدەوەرێ و ئایا بۆ ئێمە دەبێتە نان و ئاو؟ هێندێك جار خۆشم ئەم پرسیارەم ئاراستەی خۆم کردووە و تەنانەت بیرم لەوە کردۆتەوە کە ئەگەر چەرخی ڕۆژگار پازدە ساڵ بەرەو دواوە بگەڕێتەوە، ئایا ئامادەم دیسان ئەو ڕێگا پڕ کەند و لەندە بگرمەوە بەر. بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەرێ. لە ڕاستیدا من ئەم کارەم تەنیا بە مەبەستی وەڵامدانەوەی نیازێکی دەروونی و شەخسی خۆم نەکردووە. ئەگەر ئەم کارەم تەنیا بەو مەبەستە بکردایە، لەوانەیە ئێستا پەشیمان بووبام بۆ لە دەست دانی ئەو کاتە زۆر و زەوەندە، کە دەکرا بۆ زۆر شتی "بەسوود"تر کەڵکی لێوەربگرم. بەڵام لەم کارەدا پێش هەر شتێك بەرژەوەندی زمانی کوردیم لەبەر چاو بووە و هەر ئەوەش هێزبەخش و هاندەرەم بوو تاکوو بتوانم ئەو ماوە درێژە لەسەر کارەکە بەردەوام بم.

وەك لەسەرەوە ئاماژەم بۆ کرد، زمانی ئەڵمانی و بێگومان زۆر لە زمانانی دیکەش فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی خۆیان هەیە و ئەم بەشە وەك بەشێك لە زانستی زمانەوانی بە دەیان ساڵ و تەنانەت ڕەنگە چەند سەدەیەك کاری لەسەر کراوە. بۆیە زمانی کوردیش وەك یەکێك لە زمانە زیندووەکانی ئەم جیهانە پێویستی بە فەرهەنگێکی لەم چەشنە هەیە و ئێمەی کورد پێویستە بایەخ بە هەموو بەشەکانی زانست و لەوانە زانستی ئێتیمۆلۆژی بدەین. تەنانەت بایەخ دان و کارکردن لەسەر ئێتیمۆلۆژی بۆ زمانی کوردی گەلێك گرینگترە تاکوو بۆ زۆرێك لە زمانانی دیکە. ئەو زمانانەی دیکە زمانی جێکەوتوو و پێگەیشتوون، زمانی یەکگرتوو و ستانداردن، کێشە سەرەکییەکانی ڕێزمان و ڕێنووسی خۆیان یەکلا کردۆتەوە. ئێتیمۆلۆژی بۆ ئەم زمانانە تەنیا لەباری زانستییەوە گرینگە و شتێکە وەك مێژوو و دێرین ناسی. زمانی کوردی بەڵام زمانێکە لە دۆخی پەرەگرتن و پێگەیشتندا و هێشتا بە تەواوی نەبووەتە زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی. لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژیك بۆ ئەم زمانە پێویستییەکی هەنووکەییە و نەك هەر لەباری زانستیی رووتەوە، بەڵکوو لەباری کردارییەوە بۆ یەکلا کردنەوەی گەلێك لە کێشە و پرسیارەکانی ڕەوتی پێگەیشتنی زمانی یەکگرتوو گرینگ و کاریگەرە.

کاتێك منی کورد چاو لە فەرهەنگێکی زمانی ئەڵمانی دەکەم، کەم وشە هەیە کە نەیناسم و پێشتر لە نووسراوەکاندا نەمدیبێ یان گوێم لێ نەبووبێ. بەلام کە لاپەڕەکانی فەرهەنگێکی کوردی هەڵدەدەمەوە، تووشی سەدان وشە دەبم کە سەرەڕای سی ساڵ خوێندەواریی کوردی لە هیچ کۆی نەمدیون یان نەمبیستوون. پرسیار لێرەدایە کە بۆ ئەو وشانە نەهاتوونە ناو زمانی ئەدەبی و تاکوو ئێستاش وەك گولی دوورئاوا لە کەلێن و قوژبنی فەرهەنگەکاندا شاراوە و دوورەپەرێز ماونەوە و تۆزی فەرامۆشی لەسەریان نیشتووە. بێگومان هۆی سەرەکی ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە نووسەرانی کورد نازانن ئەم وشانە چین و لە کوێوە هاتوون و هەر بۆیە لە نووسیندا بەکاریان ناهێنن. زۆرکەس لەوانەیە ئەم وشانەیان سەیر و سەمەرە و نامۆ بێتە بەرچاو، لەوانەیە سەبارەت بە مانای وشەکان دوودڵ بن، لەوانەیە ئەم وشانە بە وشەی بیانی تێ بگەن و خۆی لێ لا بدەن، لەوانەیە نەزانن کام یەك لە شێوەکانی فلّانە وشە دروستە، لەوانەیە پێیان وابێ ئەم وشانە ئیتر دەوریان بەسەر چووە و بۆ بەکارهێنان ناشێن، یان وایان دانابێ کە وشەکان ڕەمەکین، نەك ئەدەبی و خوێندەوارانە! لەوانەیە وا بیر کرابێتە کە هێندێك لە وشەکان مانایەکی جوان نابەخشن و هتد. یەکێك لەو دیاردانەی کە بەداخەوە زۆر لەناو

نووسەرانماندا باوە، ئەوەیە کە هێندێک وشە لەبەر ئەوەی سەرچاوەیان نەناسراوتەوە یان چونکوو روخساریان لە وەشەی عەرەبی یان تورکی دەچێ، ئیتر وەک بیژوو چاو لێکراون و شاربەدەر کراون و نەک هەر لە ریزی وشەی کوردی خراونەتە دەرەوە، بەڵکوو بە دەستی خۆشمان کردوومانن بەماڵی بێگانە. لەلایەکی دیکەوە ژمارەیەکی زۆر وشەمان هەیە کە زمانانی هاوسێ بە هی خۆیانی دەزانن و ئێمەش بێئاگا لەوەی کە ئەو وشانە دە ئەسڵدا وشەی ئێمەن، نەک هەر ئەو وشانە ئیتر بە هی خۆمان نازانین و لێیان نەبانین، بەڵکوو پێداگریش دەکەین کە ئەو وشانە هی زمانانی هاوسێکانن! تەنانەت جاری وایە کار دەگاتە جێگایەک کە نەک هەر هێندێک لە وشەکان دەست و دڵبازانە بە کیسەی خەڵیفە دەبخشرێن، بەڵکوو تێکڕای زمانی کوردی یان "کوردی کۆن" بە شێوەیەک لە زمانی عەرەبی - زاراوەیەک لە زمانی عەرەبی؟- یان هەرنەبێ بە دەستەخوشکی زمانی عەرەبی لە قەڵەم دەدرێ!
شۆڤینیستەکانی نەتەوە سەردەستەکان لەمێژە هەوڵ دەدەن لە رێگەی شاخ و باڵ لێنان لە زمانی خۆیان و نزم و بێ بایەخ کردن و دواکەوتوو نیشان دانی زمانی کوردی هەستی خۆبەکەمزانی لەناو ئێمەدا پەروەردە بکەن و لەم رێگەوە هێز و ورەی ئازادیخوازی وەچە یەک لەدوای یەکەکانی کورد لاواز بکەن. تەوژمی گران و بەردەوامی ئەم لاف و گەزافە شۆڤینیستییە بەداخەوە کاری کردووەتە سەر هەست و بیری ژمارەیەکی زۆر لە کوردانیش. کەم نین ئەو کوردانەی کە زمانی دایک ئەوەندەی زمانە رەسمییە داسەپاوەکان بە لایانەوە گرنگ نییە، یان ئەو خۆشی وچێژەیان پێ نابەخشێ کە زمانە داسەپاوەکە دەیبەخشێ!
ئەم فەرهەنگە بۆ جارێکی دیکە دەیسەلمێنێ کە زمانی کوردی یەکێک لە رەسەنترین و دەوڵەمەندترین زمانەکانی جیهانە و نەک هیچی لە زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی کەمتر نییە، بەڵکوو بە بەردەوامی وەک خەزێنەیەک بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو زمانانە بەکار هێنراوە.
دۆزینەوەی گەلێک وشەی رەسەنی کوردی لە ناو زمانانی دەر و دراوسێدا دەلاقەیەکی نوێمان لەبەردەم دەکاتەوە بۆ تەماشا کردنی زمانەکەمان و تێگەیشتن لەم راستییە کە ئێمەی کورد خاوەنی زمانێکی بەهێز و دەوڵەمەندین، زمانێک کە بە تەواوی شیاوی ئەوەیە لە ناخەوە خۆشمان بوێ، شانازی پێوە بکەین و وەک بیبیلەی چاو بیپارێزن. ئەم فەرهەنگە نەک هەر بە دەیان و دەیان وشەی رەسەنی کوردی نیشان دەدا کە دە زمانانی نەتەوە سەردەستەکاندا بەکار دەهێنرێن، بەڵکوو بە ئاوەڵە کردنەوەی دەرگایەکی شیکاری و لێکۆڵینەوە و خستنەرووی چەندین یاسا و رێسا، بە دڵنیاییەوە ئەو بوارە دەرەخسێنێ کە لە داهاتوودا بە سەدان وشەی کوردی دیکە لەناو ئەم زمانانەدا بدۆزرێنەوە. دوای زێدەتر لە پازەساڵ کاری توێژینەوە لەسەر وشەی کوردی و بە دوور لە هەرچەشنە دەمارگیرییەک بە تەواوی لەو باوەڕە دام کە زمانی کوردی دەوڵەمەندترین زمانی روژهەڵاتی ناوینە و ئەگەر دەرەتانی گەشە کردنی بۆ برەخسێ و دەسەڵاتیکی دڵسۆز لە پشتەوەی بوەستێ، ئەوا لە ماوەی بیست تا سی ساڵدا دەتوانێ خۆ لە قەرەی زمانانی ئینگلیزی، ئەڵمانی و فەرانسەیی بدا.
ئەم فەرهەنگە هەروەها وڵامێکی دابڕ و یەکلاکەرەوە بۆ ئەو لێکۆڵەرە فارسانەیە کە لە روانگەیەکی شوڤینیستییەوە دان بە بوونی زمانی کوردیدا ناتێن و وەک زاراوەیەک لە زمانی فارسی دەیناسێنن یان ئەگەر زۆریش بەزەییان هەبێ و مایەمان بۆ دابتێن، ئەوا زمانی کوردی وەک زمانێکی "ناوچەیی" (محلی)، واتا زمانێکی پلەدووەم پێناسە دەکەن. ئەگەرچی ئەوە تەنیا خودی ئێمەین کە لەسەر پێناسەکردنی خۆمان و زمانەکەمان بڕیار دەدەین و هیچ کەسێک بۆی نییە لە دەرەوەڕا پێناسەیەکی جیا لەوەی خۆمان، بۆ ئێمە دیاری بکا و بڕیارمان بۆ بدا و ئەگەرچی زمانی کوردی لەمێژە لە لایەن بەناوبانگترین زمانەوانانی جیهان وەک زمانێکی سەربەخۆ دیاری کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا جێی هەیە لێرەدا هەڵوەستەیەکی کورت لە سەر بۆچوونی شوڤینیستی هێندێک لە لێکۆڵەرە فارسەکان بکەین.

ئەو تاقمە شۆڤێنیستە بەناو توێژەرە بە لەرچاوگرتنی ئەوە کە بەشی زۆری وشەکانی زمانی کوردی و فارسی لە یەکتری نیزیکن و بە لە بەرچاو گرتنی ئەوە کە بەشێك لە وشە کوردییەکان بە درێژایی سەدان ساڵ و هەروەها لەبەر ئەدەبی نەبوونی زمانەکە (بەهۆی داگیرکارییەوە) تووشی هێندێك ئاڵوگۆڕ و سوانەوە بوون، وای لە قەڵەم دەدەن کە کوردی نەك زمان، بەڵکوو زاراوەیەك لە زمانی فارسییە، یان هەر نەبێ زمانێکی پلەنزمترە لە فارسی.

ئەگەر ئێمە سەیری وشەکانی زمانە ژێرمەنییەکان بکەین، کە بەسەدان نموونەی لەم فەرهەنگەدا هاتووە، دەبینین کە لەم زمانانەشدا نیزیکی و هاوشێوەیی وشەکان یەکجار زۆرە و تەنانەت زۆر جار وشەکانی ئەم یان ئەو زمان جیاوازییان دەگەڵ یەکتر هەر نییە. لە لایەکی دیکەوە لەناو هەر دەستەزمانێکدا، وەك دەستەزمانی ژێرمەنی، لاتینی، سلاڤی، سامی و هیتر، وشەکانی ئەم یان ئەو زمان، جا بە هەر هۆیەك بێ، زۆرتر ئاڵوگۆڕی بەسەرداهاتووە. بۆ وێنە لەناو دەستەزمانی ژێرمەنیدا وشەکانی زمانی ئینگلیزی لەچاو زمانی ئەڵمانی گەلێك بەرچاوتر تووشی ئاڵوگۆڕ و سوانەوە بوون. بەڵام ئایا کەس لەم جیهانەدا هەیە نکۆڵی لە زمانی ئینگلیزی بکا؟ ئایا تا ئێستا تەنانەت فاشیستەکانیش بە مێشکیاندا هاتووە کە زمانی ئینگلیزی بکەنە زاراوەیەك لە زمانی ئەڵمانی یان بێژن زمانی ئینگلیزی نزمترە لە زمانی ئەڵمانی؟

ئاشکرایە لەناو ئەو دەستەزمانەش کە بە دەستەزمانی "ئێرانی" دەناسرێ ("زمانە ئێرانییەکان")، زۆرینەی وشەکان هاوشێوەن و لەم یان ئەو زمانیشدا وشەکان بە بەراورد دەگەڵ زمانی فارسی هێندێك زۆرتر ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە. هۆی ئەمەش پێش هەرشتێك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زمانی فارسی لە کۆنەوە زمانێکی ئەدەبی بووە و لەبەر ئەمە شێوەی کۆنتری وشەکان لە توێی پەرتووك و نووسراوەکاندا پارێزراون. تەنانەت لە زمانی فارسیشدا گۆڕان و سوانەوە وشەکان بە بەراورد دەگەڵ پارسی کۆن گەلێك زۆرە و هەروەها ئەگەر چاو لە زمانی ئاخافتنی فارسی بکەین، دەبینین سەرەرای زمانی ئەدەبیی سەدان ساڵە زۆر لە وشەکان لە زمانی ئاخافتندا تووشی ئاڵوگۆڕ و سوانەوەیەکی زێدەتریش بوون. کەوابوو نە وێکچوون و هاوشێوەیی وشەکان و نە ئاڵوگۆڕ و سوانەوەی وشەکانی هیچ زمانێك، ئەو زمانە ناکاتە زاراوەی زمانێکی دیکە یان پلە و پایەی ئەم زمانە لەچاو زمانەکانی دیکە دانابەزێنێ. ئەگەر بەم لۆژیکە سەیری زمانەکان بکرێ، ئەوسا ئیتر چەمکی "دەستەزمان" مانای خۆی لە دەست دەدا، ئەوسا بۆ وێنە هەموو زمانە ژێرمەنییەکانی وەك ئینگلیزی، هولەندی، دانمارکی، نوروێژی، سوێدی، ئیسلەندی و هیتر دەبێ بە زاراوەکانی زمانی ئەڵمانی دابنێین، یان هەموو زمانە جیاوازە سلاڤییەکان، لاتینییەکان، سامییەکان بکەینە زاراوەکانی یەك زمان لە هەرکام لەم دەستەزمانانەدا!

ئەگەر ئەم لۆژیکە شوڤینیستییەی هێندێك لە لێکۆڵەرە فارسەکان راست بێ، ئەوسا دەبێ چەمکی "زمانەئێرانییەکان" لە زانستی زمانەوانیدا بسردرێتەوە و تەنیا دان بە بوونی یەك زمان دابنرێ، کە ئەویش زمانی فارسییە و هەموو زمانە هاوشێوەکان بکرێن بە زاراوەکانی زمانی فارسی. یان دەنا دەبێ لەناو هەر دەستەزمانێك و لەوانە دەستەزمانی "ئێرانی"دا یەك لە زمانەکان وەك "گل سر سبد"، وەك سەرتۆپی زمانەکانی دیکە سەیر بکرێ و ئەوانی دیکە بە پلەنزم و کەمبایەخ دابنرێن. ئاشکرایە بۆچوونێکی لەم چەشنە نەك هەر لە ناخەوە دژی زانستی و شوڤینیستییە، بەڵکوو زۆریش سەیر و سەمەرە و پێکەنینییە.

خاڵێکی دیکە کە لێرەدا دەبێ بەگوێی ئەو شۆڤینیستانەی هەڵبێنین، ئەوەیە کە ئەگەر ئێمە باس لە رەسەنایەتی وشەکانی زمان دەکەین، ئەو باسە تەنیا بە فۆنۆلۆژیی زمانەکە، واتا ئاڵوگۆڕی دەنگەکان کۆتایی نایە. راستە گەلێك لە وشەکانی زمانی کوردی لە باری فۆنۆلۆژییەوە ئاڵوگۆڕیان بەسەرداهاتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا زمانی کوردی توانیویەتی بەپێچەوانەی زمانی فارسی بە سەدان وشەی رەسەن بپارێزێ و هەروەها لە هێندێك دۆخدا فۆنیمە کوردییەکان لەچاو زمانی فارسی

ڕەسەنتر ماونەتەوە. ئێمە بێ ئەوەی تووشی ڕقەبەرایەتی بین و بێ ئەوەی بمانەوێ زمانی فارسی خەوشدار بکەین، ئەوە وە بیر دێنینەوە کە زمانی کوردی کانگایەکی زێرین و گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی وشەی ڕەسەنە و هەروەها کارتێکەری وشەی بێگانەی زۆر کەمتر بە سەرەوە دیارە.
ئەم دەوڵەمەندییەی زمانی کوردی هەر لە کۆنەوە نابێ بۆ زۆرێک لە شۆڤێنیستەکان شتێکی شاراوە بووبێ. لە وتووێژێکی تەلەویزیۆنی دەگەڵ بەرپرسێکی بەرێیی وێستگەی ڕادیۆی کوردی کرماشاندا، ئەو بەڕێزە گێڕایەوە، کە ئەوان جار بەجار لە ناوەندەوە نامەیان بۆ دەهات کە تێیدا داوایان لێ دەکرا، وشەی کوردییان بۆ بدۆزنەوە، تاکوو زمانی فارسی وەک ئالترناتیو لە جیاتی وشەی عەرەبی بەکاریان بێنێ. گومان لەوەدا نییە کە لەم ڕێگەیە و لە زۆر ڕێگەی دیکەوە بە دەیان وشەی کوردی خراونەتە ناو فەرهەنگی زمانی فارسییەوە. دیارە دان و ستانی وشە لەنێوان زمانەکاندا شتێکی ئاسایی و تەنانەت پێویستە و هیچ گرفتێک دروست ناکا، گرفتەکە تەنیا لێرەدایە کە لە فەرهەنگەکانی زمانە سەردەستەکاندا ئاماژە بە سەرچاوەی وشەی عەرەبی، تورکی، فارسی، چینی، مەغولی، هیندی، ئەورووپی و هیتر دەکرێ، بەڵام ئەو وشە کوردییانەی کە بە ئاشکرا و بە بەرنامە وەرگیراون، بە بێدەنگی بەسەریاندا تێپەڕ دەبن. لە فەرهەنگەکانی زمانە سەردەستەکاندا بەدەگمەن ئاماژە بە کوردی بوونی وشە خوازراوەکان دەکرێ، ئەمە لە کاتێکدایە کە بە دەیان و سەدان وشەی زەق و زیندووی کوردی لەناو ئەم زمانانەدا بەکار دەهێنرێن. ئەم هەڵسوکەوتە ناحەز و نارەوایە نەک هەر هەڵسوکەوتێکی ناشارستانییە، بەڵکوو جۆرێک و بەشێک لە تاڵانی سامانی فەرهەنگییە کە بەدرێژایی دەیان و سەدان ساڵ هاوکات دەگەڵ تاڵانی ماددی و مرۆیی لە لایەن دەسەڵاتدارە عەرەب و پارس و تورکەکانەوە بەرانبەر بە گەلی کورد بەڕێوەچووە. ئەم هەڵسوکەوتە نەک هەر نیشاندەری زۆرداری و ستەمکاری ئاشکرایە، بەڵکوو جۆرێک لە بێشەرمی و بێویژدانی نیشان دەدا. تراژێدیای زمانی کوردی تەنیا خۆی لەوەدا نابینێتەوە کە لە لایەن شۆڤێنیستە زۆردارەکانەوە نکۆڵی لێ دەکرێ، بەڵکوو لەمە ناخۆشتر، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە دەیدزن، تاڵانی دەکەن و بەوپەڕی بێشەرمییەوە دان بە بوونیشیدا ناهێنن.
شۆڤێنیستە پارسەکان، بەشێک لە رووی بێئاگایی و بەشێکیش فێڵبازانە زمان لە "وشەکان"دا بەرتەسک دەکەنەوە. ڕاستە زمان لە وشە پێکهاتووە، بەڵام زمان تەنیا وشە نییە. زمان پێکهاتەیەکی هەمەلایەنتر و بەربڵاوترە لە وشەکان. وشەکان دەکرێ وەک ئەو خشتانە چاو لێ بکەین کە خانووی زمان پێک دەهێنن، بەڵام "خانوو" خۆی شتێکی جیاوازە لە چەمکی "خشت". ئەگەر ئێمە بە لۆژیکی ئەو شۆڤێنیستیانە باس لە جێگە و پێگەی زمان بکەین، ئەوا نەک زمانی کوردی دەبێتە زاراوەی زمانی فارسی، بەڵکوو بە پێچەوانەوە زمانی پارسی دەبێتە زاراوەیەک لە زمانی کوردی، چونکوو زمانی کوردی، بەتایبەتی لە شێوەزاری باکووری خۆیدا گەلێک لە زمانی پارسی کۆنتر و ڕەسەنترە. زمانی کوردی لەم شێوەزارەدا لە ڕووی ڕێزمانییەوە زۆر نیزیکترە بە زمانە ژێرمەنییەکان و ئەوەش دێرینایەتی و ڕەسەنایەتی زۆرتری ئەم زمانە لەچاو زمانی فارسی بە تەواوی دەسەلمێنێ.
لە لایەکی دیکەوە بەڵگە مێژووییەکان ئەم درۆ زلەی شۆڤێنیستە پارسەکان بە تەواوی پووچەڵ دەکەنەوە کە زمانی کوردی زاراوەیەک لە زمانی پارسی بێ. وەک بۆ هەموو لایەک ئاشکرایە مادەکان لانی کەم دوو سەد ساڵ بەر لە پارسەکان لەم ناوچانە دەسەڵاتدار بوون و ناوچە پارس نشینەکانیش بەشێک بوون لە پانتایی دەسەڵاتداری ئەوان. بێگومان مادەکان سەدان ساڵیش بەر لەوەی ببنە دەسەڵاتداری ناوچەکە، لە وڵاتەکەی خۆیاندا ژیاون و ڕەنگە پێشتریش باو و باپیرانی ئەوان بە ناوێک یان چەند ناوی دیکەوە لە ناوچەکەدا ژیابن. ئەوان خاوەن زمان و فەرهەنگێکی بەهێز و گەشاوە بوون و بە زمانێکیش ئاخەڤیون کە زۆر لە زمانی پارس کۆنتر بووە.

پاش بە دەسەڵات گەیشتنی فارسەکان لە ناوچەکەدا کە لە ڕێگای کۆمپلۆ و کودیتایەکی بنەماڵەیی وەدی هات، مادە بەهێزەکان [کوردمادەکان] و زمانی مادی درێژەیان بە ژیان دا و بە درێژایی مێژوو ئەو شتەیان لێ بەرهەم هات کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ کورد و زمانی کوردی. ئەمە تاکە لێکدانەوەی ڕاستبینانەیە لە مێژووی مادەکان و نەوەکانی ئەوان کە پێیان دەگوترێ کورد. وشەی "کرمانج" دە زمانی کوردیدا هاومانا دەگەڵ "کورد" بەکار دێ. وشەی "کرمانج" دە ئەسڵدا "کوردماد" بووە، واتا مادی بەهێز (بڕوانە شیرۆڤەی وشەی "کرمانج" لەم فەرهەنگەدا). وەک دەبینرێ، وشەی "کورد" سەرەتا سفەتێک بووە بۆ هێز و ئازایەتی مادەکان. ڕەنگە ئەم وەسفە لە لایەن هاوسێکانەوە بە مادەکان درابێ، بەرانبەر بە ئازایەتی ئەوان لە شەڕەکاندا و بێگومان پارسەکانیش دواتر بۆ داگیر کردنی وڵاتانی دیکە کەڵکیان لەو ئازایەتییەی مادە کوردەکان [کوردمادەکان] وەرگرتووە. جێی بیر هێنانەوەیە کە لە سەردەمی شای پێشووی ئێرانیشدا کوردەکان وەک "مرزداران غیور" (سنوورپارێزانی بوێر) بەناو دەکران و لەوە دەچێ ئەم قسەیە کولتوورێکی کۆن و دوور و درێژی لەپشتەوە بێ.
هەر شیرۆڤەیەکی جیا لەمەی سەرەوە مانای ئەوە دەبێ کە مادەکان و زمانی مادی ئاسەواریان بە تەواوی لەسەر ڕووی هەرد سرابێتەوە و لە هەمان کاتیشدا گەلێکی دیکە لە غەیبەوە هاتبێ و لە سەر خاکی ئەوان قووت بووبێتەوە و ناوی خۆی نابێ "کورد". دیارە تێزێکی ئەوتۆ تەنیا بۆ پێکەنین دەبێ و بەس.
بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە ئێستا جێی خۆیەتی ئەم پرسیارە ئاراستەی شۆڤینستە پارسەکان بکەین کە چۆن زمانی مادی [دواتر: کوردمادی، کوردی] کە لانی کەم دوو سەد ساڵ بەر لە زمانی پارسی، زمانی بارەگا و دیوان و دەسەڵات بووە، دەبێتە زاراوەی زمانی پارسی کە دوو سەد ساڵ دواتر بە دەسەڵات گەیشتووە؟ هەر بۆیە ئەگەر قەرار بێ، زمانێک وەک زاراوەی زمانێکی دیکە چاو لێ بکرێ، ئەوە بە دڵنیاییەوە بەپێی بەڵگە مێژوویی و زمانناسییەکان دەبێ زمانی پارسی کۆن وەک زاراوەی زمانی مادی چاو لێ بکرێ.
جگە لەمە نوێترین لێکۆڵینەوەکان ئەمە دەسەلمێنن کە "زمانی دایک"، واتا ڕیشەی زمانانی هیندوئەورووپی لە شوێنێک سەری هەڵداوە کە ئەمڕۆ دەکەوێتە باکووری کوردستان. ئا لەم شوێنەوە زمانی دایک بەرەو شوێنەکانی دیکە (بەرەوە هیند و بەرەو ئەورووپا) پەلی هاویشتووە و بڵاو بۆتەوە. کەوابوو لەم گۆشەنیگایەشەوە، ئەگەر زمانێک لە زمانێکی دیکەوە پەرەی سەندبێ، ئەوە زمانی پارسی بووە کە وەک لقێک لە زمانی مادی جیا بووەتەوە. زمانی پارسی دەبێ سەرەتا زاراوەیەک لە زمانی مادی بووبێ و دواتر وەک زمانێکی سەربەخۆی لێ هاتبێ. دیارە ئێمەی کورد سەرەڕای ئەو ڕاستییانە، هەرگیز لۆژیکی شۆڤینیستەکان بەکار ناهێنین و ڕەسەنایەتی زمانی کوردی ناکەینە گۆپاڵ بە سەر سەری زمانی پارسییەوە، ئەوەش نەک لە ڕووی بێدەسەڵاتی، بەڵکوو لەڕووی پابەند بوون بە ئەخلاق و ویژدان و ڕاستگۆیی زانستییەوە.
ئەم بەرهەمە هەروەها وەڵام و پەیامێکی دابڕیشە بۆ ئەو شوڤێنیستە تورکانەی کە سەرەڕای کوشتو بڕ و کاولکاری لەرادەبەدر لە باکووری کوردستان، لەماوەی دەیان ساڵدا نکۆڵیان لە زمانی کوردی دەکرد و وەهایان لە قەڵەم دەدا کە زمانی ئەو گەلە شێوەیەکی "دواکەوتوو"ی زمانی تورکییە کە خەڵکێکی کێوی ودوور لەشارستانی، بەڵام بە ڕەگەز تورک، قسەی پێ دەکەن. مخابن ئەو ڕوانگە شۆڤینیستییە پڕ لە نەنگ و شوورەییە، پڕ لە درۆ و تاوان، پڕ لە نەزانی و بێویژدانی و پڕ لە زۆرداری و ستەمکارییە هەنووکەش بە شێوەیەکی دیکە لە ئارادایە. هەر ساڵی پار بوو کە ڕایەدارێکی باڵای دەوڵەتی تورکیا لووت بەرزانە ڕایگەیاند کە زمانی کوردی زمانی سەردەمی شارستانەتی نییە و بۆیە خوێندن بەم زمانە ڕێی پێ نادرێ. ئەگەر ئێمە دیسان بە لۆژیکی شۆڤینیستی ئەم پیاوە باسی شارستانی بوون و ناشارستانی بوونی زمان بکەین، ئەوا ناچار دەبین ئەم پرسیارە ئاراستەی ئەو کابرایە بکەین کە

ئەگەر زمانی دێرین و دەوڵەمەندی کوردی زمانی سەردەمی شارستانەتی نەبێ، ئەی زمانی تورکی دەبێتە زمانی چ سەردەمێک، لە کاتێکدا لانی کەم نیوەی وشەکانی ئەم زمانە وشەی خوازراون لە زمانەکانی کوردی، فارسی، عەرەبی و ئەورووپی؟
بەڵام لێرەدا ئێمە جەخت دەکەینەوە کە ئەو جۆرە بۆچوونانە جگە لە قسەی پڕ و پووچ و جگە لە تەقەلایەکی بێئاکام بۆ هەڵاتن لە راستییەکان چیتر نییە. ئێمە بەتەواوی لەو باوەڕە داین، هەروەک چۆن هەموو مرۆڤەکانی ئەم سەرزەمینە رێز و مافی یەکسانیان هەیە، هەر بەم شێوەیەش هەموو نەتەوە و هەموو زمانەکان، هەر لە زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرانسەییەوە بگرە تا دەگاتە زمانانی بچووکترین گەل و هۆزەکانی دوور لە "شارستانی"، بە یەکسان خاوەنی رێز و مافی خۆیانن. هیچ نەتەوە و زمانێک بەوە باڵا ناکا کە بە چاوی نزمەوە بڕوانێتە نەتەوە و زمانانی دیکە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەو نزم بینینە دەبێتە پەڵەیەکی نەنگ بە ناوچاوانی ئەم نەتەوەیە و بێگومان دەبێتە جێی ئازار و شەرمەزاری فراوان بۆ نەوەکانی داهاتووی وەها گەلێک. هێزە زۆردەست و داگیرکەرەکان دەبێ دڵنیا بن کە نووسینەوەی مێژوو هێشتا کۆتایی پێ نەهاتووە، مێژوو جارێکی دیکەش سەر لەبەری دەنووسرێتەوە و ئیتر لەم مێژوویەدا درۆ و دەلەسە، فڕ وفێڵ و چەواشەکاری جێی نابێتەوە. مێژووی نەوەکانی داهاتوو نەک هەر بە شان و باڵی ئێمپراتۆران، پادشایان، رێبەران و سەردارانی بێئاوەز، هێرشکار، خوێنرێژ و داگیرکەر هەڵنالێ و هیچ رەوایەتییەک بۆ ئەو هەموو جەنگ و کوشتار و کومەڵکوژییانەی ئەوان دانانێ، بەڵکوو بە چاوێکی هەتا بڵێی سووک و نزم و پڕ لە نفرەت و بێزاری لێیان دەڕوانێ. لەم مێژوویەدا ئەو کەسانە خاوەنی هیچ لاپەڕەیەکی شکۆدار نین و بگرە ناو و ناوبانگیان وەک قێزەونترین و تاوانکارترین کەسەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، وەک کەسانی هەرە دزێو و بەدکار بۆ هەتاهەتایە تۆمار دەکرێ.
با دیسان بگەڕێینەوە سەر باسی کاریگەریی لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژیک لەسەر زمانی کوردی. دەور و کاریگەریی ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردی هەر لەوەدا خۆی نابینێتەوە کە ئێمە وشە رەسەنەکانی زمانی خۆمان باشتر بناسین و بناسینەوە و بەشێوەیەکی بەربڵاوتر و چالاکانە دە زمانی ئەدەبیدا بەکاریان بێنین، بەڵکوو لەوەشدا خۆی دەبینێتەوە کە ئێمە زانیاری وردتر سەبارەت بە چۆنیتی دروست بوون و پەرەگرتنی شێوە و مانای وشەکان پەیدا دەکەین. زمانی کوردی وەک زمانێکی گەشەئەستێن پێویستی بە سەدان وشەی نوێ هەیە تاکوو لە بەشە جۆربەجۆرەکانی زانست و تێکنیکدا بەکاریان بهێنێ. لەماوەی دەیان ساڵی رابردوودا لەباری وشەسازییەوە گەلێک کار کراوە، گەلێک وشەی جوان و رێک و پێک خراوەنەتەوە سەر خەرمانی وشە کوردی، بەڵام هاوکات گەلێک وشەی ناجۆر و ناقۆڵاش بوونەتە بار بەسەر زمانەکەوە. فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی دەتوانێ لە پێوەندی دەگەڵ وشەسازیی کوردیدا لە دوو لاوە هاریکار بێ. لایەنی یەکەم ئەوەیە کە نیازی زمانی کوردی بە وشەداتاشین کەمتر دەبێتەوە، چونکوو ئێمە دەتوانین زۆر وشەی کۆن و لەباوکەوتوو، بەڵام جوان و پڕمانا، بۆ چەمکی تازە بەکار بێنین و ئەم وشانە ببووژێنینەوە. لایەنی دووەمیش ئەوەیە کە بە وردبوونەوە و سوود وەرگرتن لە چۆنیتی دروست بوون و پەرەگرتنی وشە رەسەنەکان و ماناکانیان، دەتوانین رێبازێکی راست و دروست لە بواری وشەسازیدا پێرەو بکەین و چیتر نەهێڵین وشەی هەڵە، لاسەنگ و نالەبار جوانی و رەوانیی زمانەکەمان بشێوێنن.
ئەوەی تا ئێرە باسمان کرد، تا رادەیەکی زۆر پێوەندی بە نووسەران و ئەو کەسانەوە هەیە کە بەشێوەیەکی چالاک لە کار و ژیانی رۆژانەدا زمانی ئەدەبی بەکار دەهێنن و بە تایبەتی ئەوانە کە لەسەر زمانی کوردی کار دەکەن. بەڵام ئێتیمۆلۆژی بۆ خوێنەر و خوێندەواری ئاساییش سەرنجراکێش، بەکەڵک و چێژبەخشە. کاتێک مرۆڤ ئاگاداری لەسەر ریشەی وشەکان و پێوەندی وشە جۆربە جۆرەکان دەگەڵ یەکدی نەبێ، وەک ئەوە وایە لە شارێکی نامۆ و نەناسدا بژی، ئاشنایەتی دەگەڵ سەدان

شەقام و کۆچە و کۆڵانی ئەو شارە نەبێ، نەزانێ کە شەقام و کۆڵانەکان لە کوێوە بۆ کوێ دەچن، چۆناوچۆن دەگەنەوە یەکتر و باشترین و نیزیکترین ڕێگا و بانەکان بە کوێدا تێدەپەڕن. مرۆڤێکی ئەوتۆ بەبێ کەڵک وەرگرتن لە نەخشە، یان GPS یان پرسینی بەردەوام لەم و لەو ناتوانێ بە هاسانی ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە. بە پێچەوانەوە مرۆڤی شارەزا بەردەوام وێنەی شارەکەی لە مێشکدایە و لە هەر شوێنێکی شار بێ، پێوەندی خۆی بە دەور و بەرە نیزیک و دوورەکانەوە بە خێرایی دەبینێتەوە. هەر بەم جۆرە تێگەیشتن لە ریشە و پێوەندی وشەکان دەتوانێ زانیاری ئەوتۆ بداتە خوێندەواران کە ئەوان بە هاسانی و بە چێژێکی زۆرترەوە لە ناو شاری وشەکاندا گەشت و گوزار بکەن. بێگومان خوێنەری کورد بە لایەوە گەلێک خۆش وسەرنجڕاکێش دەبێ، ئەگەر بۆی دەربکەوێ کە بۆ وێنە وشەی "ئەستێرە" خزمە دەگەڵ "ئەسترین" (سڕینەوە)، یان "بسک" خزمە دەگەڵ "ڕێوی"، یان "مردن" خزمە دەگەڵ "پێمەڕە"! و هەروەها ئەگەر بزانێ کە چۆناوچۆن ئەو خزمایەتییە دروست بووە.

پاش ڕوونکردنەوەی گرینگی و کاریگەریی ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردی، حەز دەکەم سەبارەت بە شێوەی ئامادە کردن و ڕێکخستنی ئەم فەرهەنگە ئاماژە بە چەند خاڵێک بکەم.

من بە پێی کات، هەلومەرج و ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستم دابوون، بەگشتی لە ڕێگای هەڵسەنگاندنی وشەکانی زمانی کوردی دەگەڵ زمانی ئەڵمانی و زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا هەوڵی ساخ کردنەوەی ریشەی وشەکانم داوە، واتا لە ڕێگای زمانی ئەڵمانییەوە ریشەی وشەکانی زمانی کوردیم دۆزیوەتەوە. هەوڵم داوە خزمایەتی وشەکانی زمانی کوردی و ئەڵمانی بدۆزمەوە و ئەوجار پشتم بەو زانیارییانە بەستووە کە لە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا باس کراون و لەم ڕێگایەوە گەیشتوومەتە ریشەی هاوبەشی وشەکان. ئەو سەرچاوەانەی کەڵکم لێوەرگرتوون (بڕوانە سەرچاوەکان)، هەرچەند پڕئەژمار نین، بەڵام سەرچاوەی قەبە و گرینگ و پڕ لە زانیارین. بەگشتی زانیارییە ئێتیمۆلوژییەکانم لەسەر وشەکانی زمانی ئەڵمانی لە سێ فەرهەنگی ئەڵمانی هەڵێنجاوە و هەروەها کەڵکیشم لە فەرهەنگێکی ئێتیمۆلۆژی ئینگلیزی وەرگرتووە.

ئەوەندەی پێوەندی بە سەرچاوەی کوردییەوە هەبێ، بەداخەوەوە لەبەر نەبوونی کات و دەرەتان نەمتوانیوە ژمارەیەکی زۆر لەم سەرچاوانە پەیدا بکەم و کەڵکیان لێوەربگرم. بێگومان بەرلەوەی من دەست بە نووسینی ئەم فەرهەنگە بکەم و دوای ئەوەش کەساتێکی بەڕێز و شارەزا لەم بارەوە وتار و زانیاری بەنرخیان بڵاو کردۆتەوە. هەر لە کۆنەوە هێندێک جار لە توێی وتار و تێبینییە زمانەوانییەکانی کەساتێکی وەک مامۆستایان پرۆفیسۆر جەماڵ نەبەز، مامۆستا مەسعوود مەحەممەد، مامۆستا زەبیحی، هەژاری موکریانی، حەسەن قزڵجی و چەندین بەڕێزی دیکە ئاگام لە هێندێک لە بۆچوونەکانی ئەوان لەسەر وشەگەلێکی کوردی هەبووە. دواتر کەساتێکی دیکەش وەک کاک عەلی نانەوازادە و مامۆستا ناسر ڕەزازی ئەسپی خۆیان لەم مەیدانەدا تاوداوە و چەندین تێبینی و شیکاری بەنرخیان پێشکێش کردووە. ئەوەندەی من بزانم ئەو زانیارییانە تا ئێستا زۆرتر بەشێوەی پەرژ و بڵاو و وەک وتار لێرە و لەوێ بڵاو کراونەتەوە. بەداخەوە من لەبەر ئاوارەیی و نەبوونی هەلومەرجی گونجاو بۆم نەلواوە هەموو یان کۆمەڵێکی زۆر لەم وتارانە پەیدا بکەم، تەنیا جار وبار شتێکم لێرە و لەوێ بەرچاو کەوتووە، سەردەمێکیش بە تاسەوە گوێم دەدایە بەشی زمانەوانی رادیۆ دەنگی ئەمریکا کە تێیدا مامۆستایان هۆمەر دزەیی و د. مایکڵ شایەت لەسەر ریشەی وشەکانی کوردی دەئاخەفین و منیش زۆر جار خۆشحاڵ دەبووم کە دەمدی بۆچوونەکانی ئەو بەڕێزانە زۆر نیزیکە لەو شتانەی من پێی گەیشتووم و هەر ئەوەش وای لێ دەکردم لەم بارەوە زۆرتر بە خۆ ڕابپەڕمووم. تا ئێستا ئاگام لەوە نییە کە فەرهەنگێکی تێر و تەسەلی تایبەت بە ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردی بڵاو بووبێتەوە، هەرچەند دووراودوور ئاگادارم کە چەند بەڕێزێک لەم بارەوە خەریکی کار و لێکۆڵینەوەن.

دوای بڵاوبوونەوەی وتارێکم لەسەر ریشەی وشەکانی "ماد، کرمانج، کورد" لە کۆتایی ساڵی 2012 دا کە تێیدا ئاماژەم بە نووسین و ئامادە کردنی ئەم پەرتووکە بۆ چاپ کردبوو، بەڕێزێک ئاگاداری کردم کە مامۆستا جەماڵ نەبەز پێشتر فەرهەنگێکی ئێتیمۆلۆژی لەسەر وشەکانی زمانی کوردی بڵاو کردۆتەوە و زۆر بە دڵئاوایی کتێبەکەی بە پی. دی. اف بۆ ناردم. منیش ئەم بەرهەمەی مامۆستام وەک چەندین بەرهەمی پێشتری زۆر بە چێژ و تاسەوە خوێندەوە. فەرهەنگەکەی مامۆستا ئەگەر بە هەڵە نەچووبم، دەکرێ بە یەکەم فەرهەنگ لەباری ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردییەوە دابندرێ، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە وشەکان ناگرێتە خۆی و زۆرتر کاری لەسەر "وشەی هەڵبژاردە" کردووە. ئەوەی راستی بێ، سەبارەت بە ژمارەیەک وشە زانیاری نوێ، سەرنجراکێش و بەکەڵکم لە فەرهەنگەکەی مامۆستادا بەدی کرد و هەوڵمدا لە دوایین پێداهاتنەوەی بەپەلەی کارەکەمدا ئاماژە بەو بۆچوون و زانیارییانەی بەڕێزیان بکەم، بەڵام بەداخەوە لەبەر نەبوونی کات پێرانەگەیشتم. لەسەر ژمارەیەکی دیکە لە وشەکانی ناو فەرهەنگەکەی مامۆستادا بیروڕای ئێمە جیاوازە و ئەمەش لە قادی لێکۆڵینەوەی زانستیدا شتێکی ئاساییە. بێگومان لە چاپی داهاتووی ئەم پەرتووکەدا کەڵک لە سەرنج و زانیارییەکانی مامۆستا و هی هەموو ئەو بەڕێزانە وەردەگرم کە چ پێش و چ دوای کارەکەی من لەسەر ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردی کاریان کردبێ و بیر و بۆچوونی خۆیان لەم بارەوە بڵاو کردبێتەوە.

سەبارەت بە سەرچاوە بە زمانی فارسی پێویستە ئاماژە بە پەرتووکی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (بەرگی یەکەم، پیتەکانی ا - ت) بکەم، کە چەندین ساڵ دوای ئەوەی من دەستم بە کارەکەم کردبوو، بڵاوکراوە. ئەم پەرتووکە بریتییە لە کۆکردنەوەی بیر و بۆچوونی زمانناسان، بەتایبەتی زمانناسە ئەورووپییەکان لەسەر وشەکانی زمانی فارسی. بەگوێرەی زانیاری من بەرگەکانی دیکەی ئەم بەرهەمە هێشتا بڵاو نەکراونەوە. جگە لەم سەرچاوەیە، چ سەرچاوەیەکی دیکەی فارسیم لەبەر دەست نەبووە. ئەم سەرچاوەیەش لەبەر نەبوونی کات ، بە تێر و تەسەلی لێی ورد نەبوومەوە و زۆرتر لە کاتی تەنگانەدا پەنام بۆ بردووە!

سەرچاوەی وشە کوردییەکانی ناو ئەم فەرهەنگە، فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"ی مامۆستا هەژارە، واتا بە گشتی وشە کوردییەکان و ماناکانم لەم فەرهەنگە هەڵێنجاوە و ئۆباڵی هەر کەم و کووڕییەک لەم بارەوە، ئەگەر هەبێ، دەکەوێتە ئەستۆی مامۆستا. دیارە هێندێک جار کە هەستم بە کەموکووڕییەکی زەق سەبارەت بە شێوە یان مانای وشەیەک کردبێ، تێبینی خۆم دەربڕیوە. فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە ئەگەرچی لەباری شێوازی فەرهەنگنوسییەوە کەم و کورتی تێدایە، بەڵام وەک سەرچاوەیەک بۆ وشەی کوردی زۆر بەنرخ و هەروەها جێی پشت پێ بەستنە. سەرەڕای هەموو ئەو وشانەی کە لەو فەرهەنگەدا هاتوون، لەو باوەڕەدام کە گەلێک وشەی رەسەنی دیکە لە زاراوە جۆربەجۆرکان و تەنانەت لە زاراوەی موکریانی- زاراوەی خودی مامۆستا هەژار- دا هەن کە لەم فەرهەنگەدا نەهاتوون و پێویستە لە داهاتوودا بخرێنە ناو فەرهەنگ و هەروەها لەباری ئێتیمۆلۆژیکەوە لێیان بکۆڵدرێتەوە.

لێرەدا دەخوازم پەنجە بۆ خاڵێکی گرینگ رابکێشم. من کارەکەی خۆم بەشێوەیەکی تەواو سەربەخۆ کردووە و لە لێکۆلینەوەکانیشدا شێوازێکم بەکارهێناوە کە تەنیا شێوازی خۆمە و بەس. هەر کەس بێلایەنانە سەیری ناوەرۆکی ئەم فەرهەنگە بکا، ئەو راستییەی بە تەواوی بۆ روون دەبێتەوە. ئەگەر سەبارەت بە هێندێک وشە نیزیکی یان هاوشێوەیی لە شیکردنەوەدا هەبێ، دەگەڵ کەساتێک کە پێشتر لەم بارەوە ئاخەفیون، ئەوا بۆچوونەکانی من کۆپی بۆچوونەکانی ئەوان نییە، بەڵکوو زادەی بیر و رامانی خۆمە. لە هەر جێگەیەک کە خۆم بیرم نەیبڕیبێ و بۆچوونی کەسانی دیکەم هێنابێتەوە، ئاماژەم بە سەرچاوەکە کردووە. ئەگەر کەساتێک بۆچووتێکی هاوشێوە یان تەنانەت جیا لە بۆچوونی منیان پێشتر بڵاو کردبێتەوە، برایانە داوایان لێ دەکەم، ئاگادارم بکەنەوە تا لە چاپەکانی داهاتووی ئەم فەرهەنگەدا ئاماژە بە ناو و بۆچوونەکانیان بکەم.

وەك لەسەرەوە ئاماژە کرا، مخابن کە نەمتوانی بە گوێرەی پێویست لە کارەکەمدا کەڵك لە سەرچاوەی هەمەرەنگ بەتایبەتی سەرچاوە کوردییەکان وەربگرم. دان بەوەدا دەنێم کە ئەوە یەکێك لە کەم و کورتییە سەرەکییەکانی ئەم فەرهەنگەیە. یەکێکی دیکە لە کەم و کورتییەکان لەوەدا دەبینم کە نەمتوانیوە جگە لە زمانی پارسی و پەهلەوی چاو بە "زمانە ئێرانییە" کۆن و نوێیەکانی دیکەدا بخشێنم و لەناو ئەو زمانانەشدا بە شوێن وشە خزمەکاندا بگەڕێم. جگە لەمانە نەتوانراوە هەموو وشەکانی زمانەکە ساخ بکرێنەوە. کەم نین ئەو وشانەی یان هەر ساخ نەکراونەوە یان ساخ کردنەوەکەیان لە رادەی شیمانە و گریمانەدا ماوەتەوە. دیارە لە فەرهەنگە ئێتیمۆلۆژییەکانی زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیشدا نەتوانراوە هەموو وشەکان ساخ بکرێنەوە، گەلێك شت وەك شیمانە باس کراون و هێندێك جاریش بیر و بۆچوونی جیاواز لەسەر وشەکان خراونەتەروو.
هەر چۆنێك بێ، هیوادارم لە سالانی دواتر و لە چاپەکانی دیکەی ئەم پەرتووکەدا هەموو کەسانی پێوەندیدار و هۆگری ئێتیمۆلۆژی کوردی هاریکار بن بو ئەوەی پێکەوە چ لەم بارەوە و چ لە هەر بارێکی دیکەوە بێ، کەم و کورتییەکان لا ببەین. فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی زمانانی ژێرمەنی زادەی هزر و بیری دەیان و رەنگە سەدان کەسە و کارێکی دەیان ساڵە و بگرە دوور و درێژتری لە پشتە. بێگومان زمانی کوردیش کاتێك لەم بارەوە دەبێتە خاوەنی فەرهەنگێکی تێر و تەسەل و پر بە پێستی خۆی کە ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی شارەزا ماوەیەکی دوور و درێژ کاری لەسەر بکەن. ئەو بەرهەمەی من پێشکێشم کردووە تەنیا سەرەتایەکە و رەنگە بتوانرێ وەك بەردێکی بناخەی ئەو کارە کەڵکی لێ وەربگیرێ. لەم بارەوە بەتایبەتی ئەو خاوەنڕایانەی ئاشنایەتی باشیان لەگەڵ زمانانی دیکەی ژێرمەنی، یان ئاشنایەتیان لەگەڵ زمانانی سلاڤی و لاتینی هەیە، دەتوانن سەبارەت بە ساخکردنەوەی وشەگەلێکی زۆرتر یان خستنەرووی زانیاری زۆرتر لەسەر وشە شیکراوەکان هاریکار بن. دوور نییە گەلێك وشەی کۆن و رەسەن هەبن کە دە زمانی ئەڵمانی ئەمرۆدا نەماون و لەوانەیە دە زمانانی ژێرمەنی دیکەدا، یان دە زمانانی سلاڤیدا مابن و پێوەندیان بە وشەی کوردییەوە هەبێ. نموونەیەك لەم وشانە وشەی هولەندی mier ە کە دەگەڵ "مێروو"ی خومان خزمە. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەیەکی دیکە بۆ مێروو بەکاردێ. ئەگەر من ئەم وشەیەم لە زمان ئاشنایەکی هولەندی نەبیستبا، هەرگیز نەمدەزانی کە دە زمانی کوردی و هولەندیدا وشەیەکی هاوچەشن و هاوڕیشە بۆ مێروو هەیە.
لێرەدا دوو داوای برایانە ئاراستەی خوێنەران و بەتایبەتی شارەزایانی بواری ئێتیمۆلۆژی دەکەم. داوای یەکەمم ئەوەیە کە هەر کەس دەتوانێ بەشداری لەم پرۆژە مەزنە دا بکا، بە جۆرێك کە لە لایەکەوە پەنجە بخەنە سەر هەڵە و کەم و کورتییەکانی ئەم فەرهەنگە و لە لایەکی دیکەشەوە هاوکار بن بۆ پەرەپێدان و بەرەوپێش بردنی. سینگم بۆ هەموو رەخنە و رێنوێنییەکی سازێنەر ئاوەڵایە و لە ناخەوە سپاسگوزار دەبم ئەگەر کەساتێك لە هەڵە و کەم و کورتییەکان ئاگادارم بکەنەوە، ناو ونیشانی سەرچاوەی پێوەندیدارم بۆ دیاری بکەن، بیر و بۆچوونی جیاوازی خۆیان لەسەر وشەکان دەرببڕن، یان زانیاری خۆیان لەسەر وشە ساخ نەکراوەکان بهێننە ئاراوە. بە دڵنیاییەوە گشت رەخنە و رێنوێنی و تێبینییەکان لەبەر چاو دەگرم و بیروڕا جیاواز و ناکۆکەکان لە چاپەکانی دواتردا بە ناوی خاوەنەکانیانەوە چاپ دەکرێن.
داوای دووەمم ئاراستەی نووسەرانی بەرێز دەکەم. تکام وایە هەرکەس ئەم فەرهەنگە دەخوێنێتەوە، لەناو ئەو وشانەدا کە پێشتر نەیناسیون و ئێستا لە رێگای شیکردنەوەی ئێتیمۆلۆژییەوە رەسەنایەتی و پەتی بوونی ئەم وشانەی بۆ دەرکەوتووە، *دە دانە* وشە هەڵبژێرێ و لە نووسینەکانی داهاتووی خۆیدا بە بەردەوامی بەکاریان بهێنێ. دیارە هەر کەس دەتوانێ لە بەشی پێوەندیداری خۆیدا ئەم وشانە هەڵبژێرێ و بە کاریان بێنێ، وەك بەشە جۆربەجۆرەکانی زانست، تێکنیك، ئەدەب، هونەر، سپۆرت و

هتد. ئا لەم ڕێگایەوە ئێمە دەتوانین لە ماوەیەکی کورتدا بە سەدان وشەی پەتی بخەینە ناو زمانی ئەدەبییەوە و هەنگاوێکی مەزن بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانی ئەدەبی بەرەو پێش باوێژین.
وەك باسکرا، لە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئەڵمانی و ئینگلیزیشدا زۆر وشە هەن کە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە ساخ نەکراونەوە، بەڵکوو بەشێوەی شیمانە باس لە ریشە یان وشە خزمەکانیان کراوە. لەم فەرهەنگەشدا هەموو بۆچوونەکان لەباری قورس و قایم بوونەوە هاوسەنگ نین. لەوباوەڕەدام کە توانیبێتم بەشی زورتری وشەکان بەشێوەیەکی یەکلا کەرەوە ساخ بکەمەوە. بەشێکی دیکە کە بە تەواوی لێی دڵنیا نەبووم لەرادەی "دەبێ" و "دەشێ" دا شی کراوەتەوە. سەبارەت بە بەشی سێهەمی وشەکانیش کە شی کردنەوەیان تارادەیەکی کەم و زۆر تەمی گومان و گریمانەی بەسەرەوەیە، لە هێندێك وشە و ئاماژە کەڵك وەرگیراوە، وەك "وێ دەچێ"، "لەوانەیە"، "جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ" و هتد. بێگومان دەکرێ زۆرێك لەم بۆچوونانە لە ساڵانی داهاتوودا و بە هاتنەئارای بۆچوونی نوێتر و بەربڵاوتر، باشتر بسەلمێنرێن و تەمی گومان و گریمانەیان لەسەر بڕەوێ، یان بە پێچەوانەوە وەلا بنرێن و بۆچوونی گونجاوتر جێگەیان بگرنەوە. هەر چۆتیك بێ، زانیارییەکانی ناو ئەم فەرهەنگە، چ لە پێوەندی دەگەڵ ئەو وشانەی بە دروستی ساخ کراونەوە، و چ ئەوانەش کە رەنگە بە دروستی یان بە تەواوی ساخ نەکرابنەوە، بۆ کاری داهاتوو لەسەر ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردی بەسوود و جێی لێ ورد بوونەوەیە. زانیاری و وشەگەلێکی فراوان کە لەناو فەرهەنگەدا هێنراونەوە، دەتوانرێ بۆ دۆزینەوەی بنەچەکی گەلێك وشەی باس نەکراوی دیکەی زمانی کوردی و هەروەها بۆ راست کردنەوەی هێندێك لە بۆچوونەکانی ناو خودی ئەم فەرهەنگە کەڵکیان لێ وەربگیرێ.
سەبارەت بە چەشنی نووسین و داڕشتنی شیکردنەوەکان هەوڵ دراوە بە مەبەستی هاسانکاری بۆ خوێنەران، لە هێندێك رێو شوێنی ناو فەرهەنگە ئەڵمانی و ئینگلیزییەکان کەڵك وەربگیرێ. لەپاڵ ئەمەشدا هەوڵ دراوە شێوەیەکی تایبەتی بەکار بهێنرێ، تاکوو هەموو کوردێك، واتا ئەوانەی شارەزای پیتی عەرەبیش نین و هەروەها کەسانی بیانی نائاشنا بەم پیتە، بتوانن لە رێگای هەڵسەنگاندنی وشەکانەوە تا رادیەك لە کاکڵی مەبەستەکە تێ بگەن.
زانیارییەکانی ناو ئەم فەرهەنگە تەنیا بۆ زمانی کوردی و خوێنەری کورد زمان بەسوود نییە. ئەم فەرهەنگە دەتوانێ هاوکات بۆ زمانی پارسی و هەموو "زمانە ئێرانییەکان" بەسوود بێ، چونکوو نەك هەر شیکردنەوەی سەدان وشەی هاوبەشی ئەو زمانانەی لە خۆ گرتووە، بەڵکوو هەروەها بە روونکردنەوەی هێندێك یاسا و رێسا رێگایەك نیشان دەدا کە ئەو زمانانە بتوانن کەڵکی لێ وەربگرن و وشە تایبەتییەکانی خۆیان شی بکەنەوە. جگەلەمە شیکردنەوەکانی ناو ئەم فەرهەنگە دەتوانێ بۆ ئێتمۆلۆگە ئەورووپی و لەوانە ئەڵمانییەکان جێی سەرنج و کەڵك لێ وەرگرتن بێ. لە توێی چەند هەزار لاپەرەی فەرهەنگە ئێتیمۆلوژییەکانی ئەڵمانیدا من تەنیا دوو تا سێ وشەی کوردیم بینیوە کە بۆ هەڵسەنگاندن دەگەڵ وشەی ئەڵمانی وەك نموونە هێنراونەوە، کە یەکیان وشەی "لەیزین" (لیزین)ە، یەکی دیکە وشەیەکە لەژێر "بەراز" لەم فەرهەنگەدا باس کراوە و لام وایە وشەیەکی دیکەشم چاو پێکەوتووە کە لە یادم نەماوە. ئەمە نیشان دەدا کە زانا ئەورووپییەکان بەداخەوە ئاگادارییەکی تێر و تەسەلیان لەسەر زمانی کوردی نییە یان نەیانویستووە هەیانبێ! ئاگاداری ئەم زانایانە لەسەر زمانانی مردووی وەك ئاڤێستا و پەهلەوی گەلێك زێدەترە تا لەسەر زماتیکی زیندوو کە چل میلیۆن کەس قسەی پێدەکا! لە لایەکی دیکەوە ئێتمۆلۆگە ئەڵمانییەکان لە پێوەندی دەگەڵ گەلێك وشەی ئەڵمانیدا دەبێژن کە وشەیەکی خزم لەناو زمانانی ناژێرمەنیدا بەدی ناکرێ، کەچی دەستەخوشك و دەستەبرای ئەم وشانە لەناو زمانی کوردیدا بە زەق و زیندوویی لەبەرچاون! تەنانەت وشەی ئەڵمانی ئەوتۆ هەیە کە ئەوان بۆیان ساخ نەکراوەتەوە و ئەگەر ئاوڕێکی وردبینانەیان لە وشەی کوردی داباوە، نەك هەر

خزمایەتی وشەکانیان بۆ ئاشکرا دەبوو، بەڵکوو ئەو وشە ساخنەکراوانەی زمانی ئەڵمانیشیان ساخ دەکردەوە. (بۆ وێنە بڕوانە وشەی "تەتك" یان "قەتان" لەم فەرهەنگەدا).
ئەم فەرهەنگە خۆی لەم وشانە نەداوە کە بەئاشکرا وشەی بیانین. دەکرێ وشە بیانییەکانی ناو زمانی کوردی بکەینە دوو بەش. بەشێك ئەو وشانەن کە لە کۆنەوە هاتوونە ناو زمانی کوردی و بە جۆرێك کوردێنراون کە ئیتر وەك وشەی بیانی ناچن. لەم فەرهەنگەدا هەوڵدراوە تا ئەو جێیەی بکرێ سەرچاوەی ئەم وشانە ساخ بکرێتەوە. دەستەی دووەمی وشە وەرگیراوەکان ئەو وشانەن کە لە دەیەکانی رابردوو و بەتایبەتی لەپێوەندی دەگەڵ بابەتە زانستی و تێکنیکییەکاندا هاتوونە ناو زمانی کوردی. ئەم وشانە ژمارەیان زۆرە و هەروەها بیانی بوونیشان بۆ زۆرینەی خوێنەران ئاشکرایە، لەبەر ئەوە بە پێویست نەزانرا بخرێنە چوارچێوەی ئەم فەرهەنگەوە. دە زمانی ئەڵمانی و رەنگە زمانانی ئەورووپی دیکەشدا فەرهەنگێك هەیە بە ناوی "فەرهەنگی وشەی بیانی"، کە تێیدا وشە بیانییەکان و سەرچاوەیان بەوردی روون کراونەوە. پێویستە زمانی کوردیش لە داهاتوودا بە هەوڵ و تێکۆشانی شارەزایانی ئەم بوارە ببێتە خاوەنی فەرهەنگێکی تێر و تەسەلی "وشەی خوازراو" یان "وشەی بیانی".
لەم فەرهەنگەدا حەول دراوە تا ئەو جێیەی بکرێ، وشەکان لە فۆرمی سادەی خۆیاندا شیرۆڤە بکرێن و هەموو وشە دارێژراو و لێکدراوەکان کە لە وشە سادەکان پێکهاتوون، باس نەکراون. هەر بۆیە ئەگەر خۆێنەری بەرێز بە شوێن شیرۆڤەی وشەیەکی لێکدراوی بۆ وێنە وەك "پێخوست"دا گەڕا و نەیدۆزییەوە، پێویستە لە وشەی "خوست" بگەڕێ و لەوێدا بیدۆزێتەوە. هەروەها وشە سادەکانیش لە زاراوە جۆربەجۆرەکانی زمانی کوردیدا گەلێك جار دوو یان چەند شێوەیان هەیە و ئەگەر خوێنەر یەکێك لەم وشانەی بۆ نەدۆزراوە، پێویستە بە دوای شێوەیەکی دیکەی وشەکەدا بگەڕێ، بۆ وێنە ئەگەر "تاو"ی پەیدا نەکرد، دەبێ لە "داو" بگەڕێ، ئەگەر "حاستەم" یان "عاستەم"ی نەدۆزییەوە، پێویستە لە "ئاستم" بگڕێ.
هەروەها لەم فەرهەنگدا لە وشەی "کوردمادی" [زمانی کوردمادی لە جیاتی زمانی کوردی] بە فراوانی کەڵکم وەرگرتووە، کە لەراستیدا وشەیەکی نوێ و داتاشراوی من نییە، بەڵکوو وشەیەکی زۆر کۆنە و شێوەی ئەسڵی وشەی "کورمانج، کرمانج"ە [لەم بارەوە بڕوانە شیرۆڤەی وشەی "کرمانج" لەم فەرهەنگەدا]. راست کردنەوەی وشەی کرمانج بەم شێوەیە لە زمانی ئەدەبیدا پێویستی و گرینگییەکی زۆری هەیە، چونکوو پێوەندی مێژوویی و هەروەها ئێتیمۆلۆژیکی چەمك و وشەکانی "ماد، کرمانج، کورد" بە ڕوونی نیشان دەدا و روونی دەکاتەوە کە ئێمەی کورد لە راستیدا هەر خودی مادین و تەنیا ناوەکەمان کەمێك گۆڕانی بەسەردا هاتووە و زمانەکەشمان زمانی مادییە. جگە لەمە حەزم دەکرد کە زاراوەی "زمانە ئێرانییەکان" لەم فەرهەنگەدا بەکار نەهێنم و لە هێندێك شوێندا لەجیاتی ئەو، "زمانانی کاپێ K.P."م بەکار هێناوە کە داتاشراوی خۆمە و ئەگەر کەسێك پێشنیارێکی باشتری هەبێ، دەتوانین بیگۆڕین. زمانانی کاپێ بریتیین لەو زمانە هیندووئەورووپییانەی کە لەباری ئەردنیگارییەوە دەکەونە نێوان زمانی کوردی و زمانی پەشتوو، واتا ئەم چەمکە زمانی پارسی و بەلووچ و زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەی ناوچەکەش لەخۆ دەگرێ. هۆی ئەوە کە لە داهاتوودا زاراوەی "زمانە ئێرانییەکان" بەکار ناهێنم، بۆ کەڵك وەرگرتنی شۆڤینیستیانەی وشەی "ئێران" لە لایەن شۆڤینیستە پارسەکانەوە دەگەڕێتەوە کە دەخوازن بە پشت بەستن بە وشەی "ئێران" کە وشەیەکی تەم و مژاوی و ئەفسانەئامێزی مێژوویییە، نکۆڵی لە بوونی نەتەوە جیاوازەکان و مافی ئازادی و سەربەخۆیی ئەوان بکەن. نووسەری ئەم فەرهەنگە وشەکانی "ئێران" و "ئێرانی"، بەو جۆرە کە لە لایەن شۆڤینیستە پارسەکانەوە بە مانای یەك وڵات و یەك نەتەوە بەکار دەهێندرێ، بە پشت بەستن بە گەلێك بەڵگەی مێژووی و زماننناسانە بە تەواوی بەرپەرچ دەداتەوە.

جگە لەم چەند خاڵە کە لەم پێشەکییەدا ئاماژەیان پێکرا، بە پێویستی دەزانم هێندێک تێبینی و زانیاری دیکە لە پێوەندی دەگەڵ چەند لایەنێکی دیکەی ئەم فەرهەنگەدا بخەمەڕوو. ئەم بابەتانە بەجیا و تا رادەیەک بە دوور و درێژی لە کۆتایی فەرهەنگەکە لە توێی چەند "پاشکۆ"دا خراونە ڕوو. ئەم بابەتانە بریتین لە ئێتیمۆلۆژی زمانی کوردی، گۆڕانکاری فۆنۆلۆژیک، کێشەکانی ئەلفوبێ، بزرۆکە و رێنووس بەتایبەتی لەپێوەندی دەگەڵ پیتی عەرەبیدا، پێڕستی ریشەکانی زمانانی هیندوئەورووپی و هەروەها سەرچاوەکان. خۆ ئەگەر خۆێنەری بەرێز کاتی هەبێ و چاوێک بەم پاشکۆیانەدا بخشێنێ، ئەوە هێندێک زانیاری بەکەڵک بۆ ئاشنا بوونی زۆرتر دەگەڵ ناوەرۆکی فەرهەنگەکە پەیدا دەکا و زۆرتر چێژ لە بابەتەکە وەردەگرێ.

ئەم بەرهەمە بە شانازییەوە پێشکێش کراوە بە یادی نەمر مامۆستا حەسەن قزڵجی کە ساڵی 2013 سی ساڵ بەسەر گیان بەخت کردنیدا تێدەپەڕێ. مامۆستا قزڵجی یەکێک بوو لەو کەسایەتییە پرشنگدار و دەگمەنانەی گەلەکەمان لە سەدەی بیستمدا و زیاتر لە نیو سەدە لە ژیانی خۆی لەپێناو کوردایەتی و مرۆڤایەتیدا بەخت کرد. ئەو لە گەلێک بوار دا تێکۆشا و خزمەتی بەرز و بەنرخی پێشکێش کرد، نەک هەر تێکۆشەرێکی سیاسی بوێر و کۆڵنەدر بوو، بەڵکوو لە هەمانکاتدا وەک رووناکبیر، نووسەر، داستاننووس، زمانەوان، رۆژنامەوان و بێژەری رادیۆ دەوری کاریگەر و لە هێندێک بارەوە دەوری پێشەنگانەی لە خەبات و تێکۆشاندا بینی. نامیلکەی "جێگۆڕکێ و سوانەوەی پیتەکان لە زمانی کوردیدا" کە کاتی خۆی لە لایەن کۆڕی زانیاری کورد و دواتر لە رۆژهەڵاتی کوردستان بڵاو کرایەوە، یەکێک لەو بەرهەمە دەگمەنە زمانەوانییانەی هەفتاکانە و نیشان دەدا کە مامۆستا چ بیرێکی ورد و چەندە توانا و دەسەڵاتی بە سەر زمانی کوردیدا هەبوو. ئێستاش لە بیرمە کە ئەوسا بە چ چێژ و خۆشییەکەوە ئەو بەرهەمەی مامۆستام خوێندەوە و ئەمە لەراستیدا سەرەتای ئاشنایەتی و ئەم ئەڤینە بوو کە دەگەڵ زمانەوانیی کوردی پەیدام کرد. مامۆستا قزڵجی لەگەڵ ئەمەدا کە کەسایەتییەکی فرەزان و بەناوبانگی سەردەمی خۆی بوو، مرۆڤێکی خاکی و خۆمانە بوو، هەڵسوکەوتی سادە و بێگەرد و مرۆڤێکی سەرورووو خۆش و قسەخۆش بوو کە زۆر زوو سۆز و خۆشەویستی کەسانی دەوروبەری بۆ لای خۆی رادەکێشا. مامۆستا لەسۆنگەی ئەم خەباتە هەمەلایەنە و کۆڵنەدەرانەدا سالاتێکی دوور و درێژ تووشی چەرمەسەری و ئاوارەیی بوو و سەرەنجام لە ساڵی 1983 لە تەمەنی پیریدا و سەرەرای نەخۆشی، پاش خۆڕاگرییەکی قارەمانانە لە سیاچاڵەکانی کۆماری ئیسلامیدا، بە دەستی ئاخوندە پەست و خوێنخۆرەکان شەهید کرا. یادی ئەم مرۆڤە سەربەرز و تێکۆشەرە هەمیشە بەرێز و هەزاران چەپکەگوڵی وەفاداری پێشکێش بە گڵکۆکەی بێ.

ئەم بەرهەمە هەروەها بەوپەڕی رێزەوە پێشکێش کراوە بە زانا و تێکۆشەری بەناوبانگی تورک د. ئیسماعیل بێشکچی. ئەم تێکۆشەرە ئازا و مروڤدۆستە سەبارەت بە دۆزی کورد و داکۆکی کردن لە مافی ئازادی و یەکسانی ئەم گەلە تێکرا هەفدە ساڵ لە ژیانی خۆی لەناو زیندانە سەختەکانی رەژیمی تورکیادا بەسەر بردووە و بەرەورووی گەلێک بوختان و گوشار و ئازار بۆتەوە. ئەم مرۆڤە بەرێزە ئەگەر ویستبای، دەیتوانی رێگەی "رووناکبیر"ەکانی سەر بە دەسەڵات و تێکنۆکراتە ملکەچەکان بگرێتە بەر، پلەوپایەی بەرز بەدەست بخا و ژیاتێکی پڕاوپڕ لە دەسکەوتی ماددی بۆ خوی بە دی بێنێ. بەڵام ئەو ویژدانی خۆی نەفرۆشت، چاوی خۆی بەسەر راستیدا نەبەست، گوێی خۆی لە دەرد و هاواری گەلێکی کوێلەکراو کپ نەکرد کە لەلایەن نەتەوەکەی خۆیەوە دیل کراوە و هەوڵی توانەوە و قڕ کردنی دەدرێ. ئەو خۆی کردە هاوبەشی رەنج و ئازاری ئەم گەلە و سەرەڕای لافاوی بەهێز و هەمەگری فاشیزم و شۆڤێنیزم لە تورکیا رێگای داکۆکی لە گەلی کورد و مافی رزگاری نەتەوەیی ئەم گەلەی گرتەبەر. بەرێز د. بێشکچی نەک هەر سەبارەت بە داکۆکی کردن لە مافی نەتەوەی کورد، لەناو رووناکبیرانی نەتەوە سەردەستەکاندا کەسایەتییەکی بێهاوتایە، بەڵکوو لەباری تێگەیشتنی دۆزی کورد و چارەسەری ئەم

کێشەیە تەنانەت لە گەلێک ڕووناکبیر و بگرە سیاسەتمەداری کورد لەپێشترە. کەسایەتی و ڕێبازی بێشکچی، ئەگەرچی تا ئەمڕۆ مخابن لەناو ڕووناکبیرانی تورک و پارس و عەرەبدا ڕەنگدانەوەی زۆر نییە، بەڵام بێگومان بۆ ئێمەی کورد لەرادەبەدر بەنرخ و جێی پێزانینە. لەراستیدا زێڕ بۆیە ئەوها بەنرخە، چونکوو لەسەر گۆی زەوی زۆر نایاب و دەگمەنە. وەک تاکێکی کورد لە ڕێگای پێشکێش کردنی ئەم بەرهەمەوە ئەوپەڕی سپاس و پێزانینی خۆم سەبارەت بە ڕەنج و خەباتی لەمێژساڵەی ئەو بەرێزە دەردەبڕم و پڕ بەدڵ ئارەزووی تەندروستی، تەمەندرێژی و کامەرانی بۆ دەکەم. ئاواتەخوازم نموونەی کەسایەتی وەها ئازا و بوێر، ڕاستگۆ، دادپەروەر و تێکۆشەر لەناو ڕووناکبیرانی نەتەوە سەردەستەکاندا ڕوو لە زیاد بوون بکا. تێکۆشانی بوێرانەی ئەو کەسانە دەتوانێ نەخشێکی ئەرێنی مەزن لە چارەسەریی کێشەی پڕ لە خوێن و ئازاری کورددا ببینێ، کە لە ڕاستیدا مەرجی سەرەکی بۆ گەشە کردن و سەرکەوتنی خودی نەتەوە سەردەستەکانیشە. ئاشکرایە بەردەوام کردنی سیاسەتی داگیرکاری، خوێنرێژی و کاولکاری لە کوردستان تەنیا بە لەناوچوونی هێز و وزە، سامان و سەرمایە، مرۆڤ و سروشتی کوردستان کۆتایی پێ نایە و ئەگەر مرۆڤە بیرمەند و هوشیارەکانی نەتەوە سەردەستەکان لەدژی نەوەستن و بەری پێ نەگرن، ئەوا بە دڵنیاییەوە و زۆریش بەداخەوە دەبێتە ئاگرێکی بەربڵاو کە هیچ لایەک لێی دەرباز نابێ. لە لایەکی دیکەوە با نەتەوە سەردەستەکان و دەسەڵاتدارە داگیرکەرەکان دڵنیا بن کە نە داگیرکاری تاهەتایە دەوام دەکا و نە دەسکەوتەکانی ئەم داگیرکارییەش بۆ هەمیشە نەتەوەیەک خۆشبەخت و دەوڵەمەند دەکا. ئەمڕۆکە چەندین وڵاتی وەک پرتەقاڵ، سپانیا، ئینگلیز و هولەند کە لە سەردەمێکی نەک هێندە دووردا بە دەیان گەل و نەتەوەیان کۆیلە کردبووە، بار و دۆخیان نەک باشتر لە نەتەوە ئەورووپییەکانی دیکە نییە، بەڵکوو لە زۆر بارەوە کێشەیان لەوان زۆرترە.

سەبارەت بە چاپ و بڵاو کردنەوەی ئەم پەرتووکە حەز دەکەم چەند وشەیەک باس بکەم. تا ئێستا سێ جار بە بەرهەمەکەدا هاتوومەوە، هەرجارە گەلێک شتم لەباری ناوەرۆک، شێوازی دارشتن و تارادەیەکی کەمیش لەباری ڕێنووس و ڕێزمانەوە دەسکاری و ڕاست و ڕێس کردووە و هەر جارەش بە دەیان وشە و زانیاریم لێ زیاد کردووە کە بەدەم پێداهاتنەوە بۆم دەرکەوتوون. سەرەڕای ئەمە حەزم دەکرد بمتوانیبایە چەند جاری دیکەش پێیدا بێمەوە تاکوو کەموکوورییەکانم گەیاندبایە ئاستێکی هەرە نزم. کێشەکە بەڵام لەوەدایە کە بە لەبەرچاوگرتنی کات و دەرەتانی من، هەرجار پێداهاتنەوە چەندین مانگێ دەخایەنێ. بۆیە من دوو ڕێگام لەبەر بوو، یان ئەوەتا بڵاو کردنەوەی پەرتووکەکە جارێکی دیکەش بۆ ماوەیەکی نادیار دوابخەم و یان وەک ئەوجۆرەی دواجار بەڵێنم بە خۆم و خوێنەران دابوو تا کۆتایی ساڵی 2013 بڵاوی بکەمەوە. پاش هەڵسەنگاندنی لایەنی باش و خراپی هەر دوو ڕێگاکە بڕیارم دا بەرهەمەکە سەرەتا بە شێوەی پەرتووکێکی ئەلێکترۆنیکی لە دوو بەرگدا بڵاو بکەمەوە. بەم جۆرە هەم خۆم و خوێنەران لە چاوەڕوانییەکی دوور و درێژ ڕزگارمان دەبێ و هەمیش پاش پشوودان و هێز هاتنەوەبەر، دەتوانم بۆ پێداهاتنەوەی زێدەتر لە داهاتوودا کاتێکی زۆرتر تەرخان بکەم، و هەروەها بیر و بۆچوونی خاوەنڕایان و خوێنەرانی بەڕێزیش بخەمە بەرچاو و لە چاپەکانی دواتردا کەڵکیان لێ وەربگرم. هەر بۆیە لێرەدا داوای لێبووردن دەکەم سەبارەت بەوەی کە نەتوانرا لە چاپی یەکەمی بەرهەمەکەدا، چ لەباری ناوەرۆک و دارشتنەوە و چ لەباری ئەلفبێ و ڕێنووس و ڕێزمانەوە بەسەر هێندێک لە کێشە و کۆسپەکاندا زاڵ بین.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم سوپاسی خۆم بۆ هاوسەر و کیژ و کوڕەکەم دەرببڕم. لەسەرخۆیی و تێگەیشتنی ئەوان لە ئاست مندا کە بە ساڵان نەمتوانی بەگوێرەی پێویست کات و ساتیان لەگەڵ بەش بکەم، هەروەها دڵسۆزی و پشتگیری بەردەوامی ئەوان بۆمن گەلێک جێگەی ڕێز و پێزانینە. سوپاسی خۆم ئاراستەی کەسوکار و ئەو دۆستانەم دەکەم کە بە بەردەوامی خۆشحاڵی خۆیان سەبارەت بە

کارەکەی من نیشان دا و لە هاندان و لە  هەستی پڕسۆزی خۆیان بێبەشیان نەکردم. هەروەها پڕ بە دڵ داوای لێبووورین دەکەم لە هەموو خزم و دۆست و ناسیاوانم کە بەدرێژایی ئەو ساڵانە و بە هۆی سەرقاڵ بوونی زۆر بەم کارەوە نەمتوانی بەرادەی پێویست پێوەندییان پێوە بکەم و وڵامی سۆز و خۆشەویستیان بدەمەوە. هیوادارم بە گەورەیی خۆیان لێم ببوورن. تەمەندرێژی و بەختەوەری بۆ هەموویان بە ئاوات دەخوازم و هەروەها بۆ هەموو ئێوەش.

Verl (ئاڵمان)، سەرماوەزی 2013

د. عەبدوڵڵا ئیبراهیم زادە (ئەمەگ رامان)

# ئا (A)

**ئا¹ a** [ ā ] - "ئەرێ، بەڵێ": ئێ e، هێ he و هەیا heya ش دەگوترێ [پێشگری هە he + یا ya]. خزمە دەگەڵ ja (G.) [پیتی j لە زمانی ئەڵمانیدا دەنگی y ی کوردمادی دەدا]، ja (Gt.)، yea (E.)
[yes (E.) وشەیەکی لێکدراوە بە مانای "ئا ئاوا"]، ja (Sw.)، گشتیان بەمانای "ئا". وشەکانی ئەرێ ere و ئادی adî دە زمانی کوردمادیدا دەشێ وشەی لێکدراو بن. هەردووکیان هەڵگری کەرتی ئە e/ ئا a ن.

**ئا-² a-** [ ā ] - "پێشگر": دە گەلێک وشەی کوردمادی و فارسیدا کە بە فۆتیمی a دەست پێ دەکەن، ئەم فۆتیمە دەوری پێشگر دەبینێ و دە بنەڕەتدا جیایە لە ریشەی وشەکە، بۆ وێنە دە کوردمادیدا ئەم پێشگرە دە وشەکانی خوارەوەدا دەبیندرێ: ئابلۆقە abloqe، ئابوور abur، ئاپۆڕە apore، ئاتەگ ateg، ئاخافتن axaftın، ئاراستە araste، ئاشنا aşına، ئاکار akar و هتد. دە ژمارەیەکی دیکەدا فۆتیمەکە بە وێنەی ئە e دەردەکەوێ، وەک ئەدەب edeb، ئەسپایی espayî، ئەستەنگ esteng، ئەسپەرە espere و هتد. هەروەها هێندێک جار شێوەی پێشگرەکە دەبێتە-ha یان -he، وەک لەم وشانەدا: هاوردن hawırdın، هەرمین hermîn، هەرشتە herışte و هتد. دە هێندێک وشەی دیکەدا فۆتیمی n وەک ناوگر دەکەوێتە نێوان ئەم پێشگرە و ئەسڵی وشەکە، وەک ئەنجنین encınîn (هەنجنین hencınîn)، ئەنگاوتن engawtın[هەنگاوتن hengawtın]، هەنگاو hengaw، ئانگژ angıj، ئەنجومەن encumen و هتد. وەک دەبینین ناوگری n دەکەوێتە نێوان ئەسڵی پێشگرەکە لە لایەک و فۆتیمی ج c یان گ g لە لایەکی دیکەوە. بەکورتی ئەم پێشگرە دە زمانی کوردمادیدا بەو شێوانەی خوارەوە دەردەکەوێ: ئا -a، ئە -e، ها -ha، هە -he، ئان -an، ئەن -en، هەن -hen. ئەم پێشگرە ئەرکی هاسانبێژی، جوانکاری یان وشەسازی دەگێڕێ و لە زۆر وشەگەلی سەردەمە کۆنەکانیشدا دەبیندرێ.

**ئابلۆقە abloqe** [ ābloqa ] - "دەوور گرتن، گەمارۆ دان": پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] + بلۆقە b(ı)loqe + a، خزمە لەگەڵ Blokade (G.) و blokieren (G.)"دەوور گرتن، گەمارۆ دان". ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر blok (MNl.) "کۆلکەدار، تەختەدار". مانای "دەوور گرتن و گەمارۆ دان" لێرەوە پەیدا بووە کە لە سەردەمە کۆنەکاندا بە دار و تەختە دەووری شت گیراوە. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *bhlugno-*** "تەختەدار، کۆلکەدار".

**ئابوور abur** [ ābūr ] - "ساز دانی کار، پێکهێنانی کار": دەچێتەوە سەر ↑بووردن [بواردن burdın "دەرباز بوون، تێپەڕ بوون" و لێرەدا بەمانای "دەرباز کردن و راپەڕاندنی ئیش و کار"ە. لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێک دێ لە ئا [پێشگر] + بوور bur + a. وشەی ئابوور(ی) abur(î) بەمانای "ئیقتیساد" لەم وشەوە هاتووە.

[تێبینی: لەباری ماناوە ئەم وشەیە هەڵ سەنگینە دەگەڵ Wirtschaftی ئەڵمانی بە مانای "ئابوور(ی)" کە دە ئەسڵدا بە مانای "میوانداری کردن، راپەڕاندنی کاروباری میوان" بووە].

**ئاپ ap** [ āp ] - "مام": هەر وەک باب bab [↑بابە babe] و ↑مام mam و گەلێک وشەی دیکەی لەم چەشنە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگێ [گڕ وگاڵ]ی زارۆک. هەڵی سەنگینە دەگەڵ Opa (G.) "باپیر" [بە زمانی زارۆک] و ابو abū (Arb.) "باوک". ab (Aram.) "باب" چووەتە ناو زمانی یۆنانی و بووەتە abbas (Gr.) "باوک" و لەوێشەوە چووەتە ناو زمانی لاتینی و بووەتە abbatem (L.) "باوکی رووحانی".

**ئاپۆڕە apore** [ āpora ] - "حەشیمەت، کۆمەڵ": ئا [پێشگر] + پۆڕە pore + a. کەرتی "پۆڕە" خزمە دەگەڵ↑ پۆل pol و↑ پڕ *pır* سەر بە ریشەیەک بە مانای "زۆر، پڕ".

**ئاتەگ ateg** ⌊ *ātag* ⌋- "1- داوێنی کەوا 2- داوێنی چیا"؛ پێک هاتووە لە ئا [پێشگر]+ تەگ a + teg و خزمە دەگەڵ تە tah (P.) "خوارەوە، بنەوە"، تەشک teşk [تەشک و داوێن] و ↑تەشق teşq [تەشقی ئاسمان واتا قووڵترین شوێنی کەوانەی ئاسمان]. هەروەها ↑ئەتک etık یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و ئەتک کردن دە بنەڕەتدا بە مانای "نزماندن (ی رێز و روومەت)" بووە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینەدەگەڵ دوو وشە ئەڵمانی niedrig "نزم، نەوی" و Erniedrigung "ئەتک، سووکایەتی"].

**ئاجگی acgî** ⌊ *ājgī* ⌋ - "دەست رژد، دەست قووچاو": خزمە دەگەڵ ↑حەز ħez و از āz (P.) "تەماح".

**ئاجووج acuc** ⌊ *ācūc* ⌋ - دەگەڵ "ماجووج" دێ [ئاجووج و ماجووج]. خزمە دەگەڵ ↑حووج ħûc "زۆر درێژ". کەرتی "ئا" پێشگرە. "ماجووج"یش خزمە لەگەڵ "مەزن". بەم شێوەیە مانای وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێتە "درێژ و مەزن". لەوانەیە وشەکان عەرەبێنراین و بەم شێوەیە هاتبنەوە ناو زمانی کوردمادی.

**ئاچخ açıx** ⌊ *āçıx* ⌋ - "رەنگی روون و کراوە": < *(T.) āçıġ* "کراوە".

**ئاخ[1] ax** ⌊ *āx* ⌋ - "خاک، زەوی": خزمە دەگەڵ اهک āhak (P.) " قسڵ" و خاک xāk (P.) "خاک، زەوی". دە زمانی کوردمادیدا خاک xak یش دەگوترێ. وشەی ئاخلێڤە axleve یان خاکەلێوە xakelewe بە مانای "سەرەتای بەهار، یەکەم مانگی بەهار" پێوەستە بەم وشەیە و پێک هاتووە لە دوو وشەی ئاخ ax/ خاک xak+ لێو lew. بە پێی بۆچوونێک مەبەست ئەوەیە کە هەرد لێو دەکاتەوە، واتا شینایی سەر وەدەر دەنێ. لە روانگەیەکی دیکەوە مەبەست ئەوەیە کە لێوی ئاژەڵ خۆڵی پێوە دەنووسێ، چونکە لەو کاتەدا گژ و گیا جارێ بەرز نەبۆتەوە ولچ و لێوی ئاژەڵ لە کاتی لەوەڕدا خۆڵاوی دەبێ. ئاخ و خاک هەردووکیان لە یەک وشەوە هاتوون کە بریتیینە لە -*āhaka* *(OI.)* "ئاخ، خاک". لەوانەیە وشەکە دە بنەڕەتدا پێک هاتبێ لە پێشگری ئا + هاکا -a + hāka ؟ [بڕوانە ↑خاک xak]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Hacke (G.) "ئامرازێکی کشتوکاڵە بۆ خۆش کردنی زەوی و نەرم و ورد کردنی هەردی رەق"، هەروەها کرداری hacken (G.)، hack (E.)، haccon (OG.) "ورد کردن، لەت وکوت کردن، قیمەکردن". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە بەتەواوی ساخ نەکراونەوە. بە لە بەرچاو گرتنی ئەوەی کە دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی "ورد" و "ئارد" و "هاڕین" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، لەوانەیە وشەی خاک xak یش دە بنەڕەتدا هەروەک وشەی ئارد بە مانای "وردکراو، نەرمکراو، بەخۆڵکراو" بووبێ و لەو مانایەوە دواتر مانای "زەوی" پەیدا بووبێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی خاکە xake بۆ وردکراوی هێندێک شتی وەک قەند و خەڵووز و هیتر بەکاردێ و هەر ئەمەش لەوانەیە مانا کۆنەکەی وشەکە بووبێ. دەشێ وشەی ↑خاش xaş [ورد و خاش] پێوەندی بە "خاک"ەوە هەبێ.

[تێبینی: شتێک کە ئەم بۆچوونە دەستەک دەکا، وشەی Grund (G.) و ground (E.) "زەوی، زەمینە"یە کە دە ئەسڵدا بە مانای "وردکراو، هاڕدراو"ە و خزمە دەگەڵ "هاڕین"ی کوردمادی].

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئاقار aqar.

**ئاخ[2] ax** ⌊ *āx* ⌋ - "(دەنگی) ئێش و ئازار": ah (P.)، ach (G.) ah (OG.)، ak (Lit)، och / ach (OIr.) "ئاخ، ئێش"، ache (E.) "ئێش، ئێشان". خزمە دەگەڵ ↑ئاە ah و ↑ئێش êş. ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە باس نەکراوە.

**ئاخافتن axaftın** ⌊ *āxāftın* ⌋ - "گوتن، قسەکردن": ئا [پێشگر] + خافتن a + xaftın. "خافتن" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گوتن gutın یان گۆتن gotın [هەڵی سەنگینە دەگەڵ گفتن goftan (P.)].

**ئاخلە axle** ⌊ *āxla* ⌋ - "1- خەرمانەی مانگ 2- پاپۆکەی مار": ئا [پێشگر] + خلە a + xıle. خزمە دەگەڵ ↑خەڵەک xelek و ↑هاڵقە halqe. هەڵی سەنگینە دەگەڵ هالە hāle (P.) "خەرمانەی مانگ".

**ئاخنین axnîn** ⌊ *āxnīn* ⌋ - "پڕ کردن بە پاڵەپەستۆ، پەستاوتن": اکندن ākandan (P.) "ئاخنین" و اکندە ākande (P.) "پڕ، ئاخنراو". ئا [پێشگر] + خنین a + xınîn. کەرتی خنین xınîn خزمە دەگەڵ ganz (G.)،

gana "یەکپارچە، سفت، توند"، (OIn.) ghana "تەواو، گشت، ساغ، یەکپارچە"، (Sw.) ganska ،(Nl.) gans (Lit.) "بەس، کافی". وشەی غنی ġanī (Arb.) پێوەندی بەو وشانەوە هەیە. [تێبینی: دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 44) ئەم وشەیە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە بەراورد کراوە، وەک ghana- (OIn.) "قەڵەو، پەیت، چڕ و پڕ"، gončti (Sl.) "بەس بوون"، agənyā- (Av.) "مانگای شیردەر". هەروەها وشەکە بردراوەتەوە سەر یەکێک لە ریشەکانی **< *gan- (IE.)** "چڕ و پڕ بوون، زۆر بوون" یان **< *gan- (IE.)** "با کردن، هەڵمسان"]. وێ دەچێ ئەم دوو ریشەیە دە بنەڕەتدا هەر یەک بن و دواتر دوو مانای جیاواز سەری هەڵدابێ. مانای بنەڕەتی دەبێ "با کران، هەڵمسان" بووبێ. کاتێک شتێک با دەکا و دەماسێ، دە هەمان کاتدا گەورە دەبێتەوە و قەوارەکەی زۆرتر دەبێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گەنین genīn [دە بنەڕەتدا "هەڵمسان"] بەهۆی ئەو گازانەی باکترییەکان دە رەوتی رزینی ماددەی ئۆرگانیکدا دروستی دەکەن.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "هەڵمسان" و "زۆر بوون" هەروەها لە دوو وشەی *بۆق* "قرواق" و *بۆش* "زۆر"دا دەبینین. ئەم دوو وشەیەش لە ریشەیەکی هاوبەشەوە سەریان هەڵداوە].

**ئاخوڕ axur** [ *āxur* ] - "شوێنی هەڵبەستراو بۆ لەوەڕی ئاژەڵ": اخور āxor (P.)، ā-hvarna- (OI.) سەر بە ریشەی *hvar-* "خواردن". [بڕوانە"فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.9]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑خواردن xuwardın

**ئاخۆڕان axoran** [ *āxorān* ] - لەگەڵ "باخۆڕان" دێ [ئاخۆڕان و باخۆڕان axoran u baxoran واتا بشێوی و ئاژاوە]. پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] + خۆڕان xoran + a، کەرتی "خۆڕان" جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ:

1- ↑خولان(ەوە) xulan(ewe) "سووڕان، لێکدران"،

2- ↑گۆڕین gorîn.

**ئاخین axîn** [ *āxīn* ] - "ئاخ هەڵکێشان": ↑ئاخ ax "دەنگی ئازار". دە زمانی ئەڵمانیدا ächzen (G.) "ناڵین".

**ئاخیە axîye** [ *āxīya* ] - "گوڵمیخ": خزمە لەگەڵ ↑ئاژنین ajnîn "کون کردن".

**ئاخێز axez** [ *āxez* ] - "نیوە هەستان": ئا [پێشگر] + خێز xez + a. هەروەها ↑خێزیان xezyan هەیە بە مانای "هەستان، راستەوە بوون". خزمە دەگەڵ ↑هەستان hestan، خیز xīz (P.) و خاستن xāstan (P.) "هەستان". "خیز برداشتن" دە زمانی فارسیدا مانای "هەستاتیکی بە تەوژم" (بەرەو کەسێک یان شتێک) دەبەخشێ. دە زمانی کوردمادیدا دەشێ ↑غیژ ĝîj "لوور بوونەوە" [هەڵۆ غیژی جووجکان بوو]، ↑گوژین gujîn "لوور بوونەوە، بەتەوژم هاتنەخوار" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 10) "اخیز، خاستن" بردراوەتەوە سەر ریشەی *haiz-* "تەکان خواردن، جووڵانەوە، هەستان"، بەڵام بەداخەوە باس لە ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە نەکراوە. ریشەیەکی هیندوئەورووپی لەم چەشنە کە لە وشەنامە ئێتیمۆلۆژییەکاندا دەبینرێ، بریتییە لە ریشەی **< *aig- (IE.)** "جووڵانەوە و بزوانی توند". ācol (OE.) "داچڵەکین"، eikinn (OIs.) "توند، خێرا، هار و هاج"، igrat (Rus.) "لەیزین، کایە کردن"، Eichhorn (G.) "سمۆرە" لەم ریشەوە هاتوون. لەوانەیە دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑هاج hac [هار و هاج]، ↑*هەژان hejan* "راتڵەکان، شەکانەوە"، ↑هەزاز hezaz "دارمانی کێو" هەزینگ hezîng "راپەڕ، شنگڵ" پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

**ئاد ad** [ *ād* ]- "دوڕگە، وشکانی ناو ئاو": خزمە لەگەڵ ↑قاد qad "هەرد، زەوی، خاک".

**ئادا ada** [ *ādā* ] - "خوشکی گەورە لە زمان منداڵەوە": هەروەک بابە babe، دایە daye و کاکە kake و گەلێک وشەی لەم چەشنە دە بنەڕەتدا لە زمانی زارۆک وەرگیراوە لە کاتی گاڵ و گغ دا.

**ئادان¹ adan** [ *ādān* ] - "زەوی بە پیت": ↑ئاد ad "خاک، زەوی".

**ئادان² adan** [ *ādān* ] - "بەرهەمەکانی شیر، شیرەمەنی": خزمە دەگەڵ ↑ئاز az "چێشت".

ئادەر **ader** [ *ādar* ] - "ڕەسەن، ئەسپی ڕەسەن": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ↑ ئەسڵ esıl.

ئادەمیزاد **ademîzad** [ *ādamīzad* ] - "مرۆڤ، منداڵانی ئادەم": ادمیزاد ādamīzad (P.) .ئادەم + ی + زاد < *(Heb.) adam* "مرۆڤ".

ئار **ar** [ *ār* ] - "ئاگر":

1- لە لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئاری[3] arî "خۆڵەمێش"، ↑*ئارا ara* "دەشت" و ↑ئاران aran "گەرمەسێر"، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "سووتان، هایسان، هیشک بوون". دە زمانی لاتینیدا ara (L.) "ئاورگەی قوربانگا" و area (L.) "دەشت، زەوی بەرئاوەڵا" پێوەندییان بە وشە کوردییەکەوە هەیە.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ -alāta (OIn.) "خەڵووز"، altāre (L.) "مزگەوت، ئاورگە"، ala (Sw.) "هایسان، بڵێسەدان"، سەر بە ڕیشەی < ***al-* *(IE.)*** "سووتان".

ئارا1 **ara 1** [ *ārā* ] - "1- ڕووبەر، دەشتایی، گۆڕ 2- وجوود 3- نێوان [ئارام دەگەڵ ئەو شتە نییە واتا نێوانم دەگەڵی نییە]": خزمە دەگەڵ area (L.) "ڕووبەری زەوی، پانتایی زەوەی"، سەر بە ڕیشەی < ***as-*** ***(IE.)*** "سووتان، هیشک بوون". هەروەها خزمە لەگەڵ ↑ئاری arî "خۆڵەمێش" و Asche (G.) "خۆڵەمێش" و لەوانەشە لەگەڵ ↑ئار ar "ئاگر" [بڕوانە↑هیشک hîşık یان ئیشک şıîk]. بەم پێیە دە بنەڕەتدا مەبەست لە "ئارا" شوێنیکی لەبەر تاو سووتاو، هیشک و ڕووتەن بووە. ماناکانی دووەم و سێیەمی وشەکە لە زمانی کوردمادیدا لە مانای یەکەمەوە پەرەیان گرتووە. لە بنەڕەتدا کاتێک باسی لە ئارا بوون [لە گۆڕێ بوونی] شتێک کراوە، مەبەست ئاماژە کردن بە بوون و وجوودی ئەو شتە لە سەر زەوی، لەسەر ڕووبەری بەرچاوی مرۆڤ بووە، هەروەک لە دەستەواژەی "لە گۆڕێ بوون"یشدا دەردەکەوێ [ گۆڕ: دەشت، پانتایی، زەوی بەرئاوەڵە]. جگە لەمە وشەی ئارا مانای "نێو" و "نێوان"یشی وەرگرتووە و ئەمەش بەهۆی بوونی پێوەندییەکی کۆنە دە نێوان ئەو دوو چەمکە دا. دە فارسیدا "درمیان بودن" مانای "لەئارا بوون" دەگەیەنێ ["میان" دە فارسیدا واتا نێوان]. هەروەها مەبەست لە "از میان بردن" دە فارسیدا و "لە نێو بردن" دە کوردمادیدا سەرەتا "لە گۆڕێ لابردن" یان "لە ئارا نەهێشتن" بووە. ئەم مانایە ئەمڕۆش دە زمانی کوردمادیدا ماوەتەوە بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "ئەو شتە لەو نێوە لا ببە" واتا ئەو شتە لە گۆڕێ لا ببە.

[تێبینی: دیسان هەر لەسەر ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین ئاماژە بە وشەی place (E.) بکەین کە بە مانای "جێ، مەیدان، ئارا"یە و کاتێکیش دەبێتە to take place، مانای "ڕوودان ، بەوجوود هاتن، هاتنە ئارا" دەبەخشێ. مانا بنەڕەتییەکەی وشەی ئارا دە وشەی ↑ئاران aran [ئارا + ان] "گەرمەسێر"دا بە ڕوونی دەردەکەوێ.

ئارا2 **ara 2** [ *ārā* ] - "ئۆقرە، ئارامی": دەگەڵ "قارا" دێ [ئارا و قارا ara u qara ی نەما].

1- یان کورتکراوی ئارام aram ە،

2- یان شێوەیەکی دیکە لە خودی ↑قارا qara یە.

ئاراستە **araste** [ *ārāsta* ] - "ڕووی شتێک بەرەو کەسێک گرتن": ئا a [پێشگر] + ڕاستە raste . پێوەندی نێوان وشەکانی ڕاستە، ئاراستە و ڕازاندنەوە [ئاراستن ārāstan (P.)] دە زمانی ئاڵمانیشدا هەر بەم شێوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا هەیە و هەموو وشە ئاڵمانییەکانی خوارەوە دەگەڵ وشە کوردمادییەکان بە خزم دەردەچن. ڕاستە [ئاراستە] یان "جیهەت" دەبێتە Richtung (G.)، ئاراستە کردن دەبێتە richten (G.) و هەروەها einrichten (G.) دەبێتە "ڕێک و پێک کردن" [ڕاستە و پاستە کردن] کە ئەم کردارەی دوایی زۆرتر بۆ شتی ناوماڵ بە کار دەهێندرێ . وشەی "ڕازاندنەوە" دە کوردمادیدا دەێ پێشتر مانای einrichten ی ئاڵمانی هەبووبێ و پاشان ماناکەی زۆرتر پەرەی گرتووە [دە بنەڕەتدا: ڕاست و ڕێس کردن]. وشە ئاڵمانییەکان دەچنەوە سەر وشەی recht (G.) "ڕاست" و وشە کوردمادییەکانیش

دەچنەوە سەر وشەی ↑راست rast و ئەم دوو وشەش خۆیان هاوریشەن. دە زمانی لاتینیشدا ئەو پێوەندییانەی سەرەوە هەر بەم چەشنە بەرچاو دەکەون.

**ئارام aram** *[ ārām ]* - "ئەهوەن، هێدی، هێور": ارام ārām (.P). ئا a [پێشگر] + رام ram. airime (.Av) "ئارام"، rámatē (.OIn) "ئارام دەگرێ"، rimis (.Gt) "ئارامی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Rahmen (.G) "قەتعە، چوارچێوە"، rama (.OG) "پایە، کۆڵەکە"، raam (.Nl) "قەتعە، چوارچێوە، پەنجەرە"، rambá-h (.OIn) و ramtis (.Lit) "کۆڵەکە، چێو"، سەر بە ریشەی < ***rem-** (.IE)* "شت دانە بەر، پشت گرتن، پاڵ دانەوە، ئارام گرتن". هەروەها رام rām (.P) "کەوی،ماڵی، دەستەمۆ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە واتا لەبنەڕەتدا مەبەست ئاژەڵی ئارام بووە بە پێچەوانەی ئاژەڵی وەحشی.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "ئارام گرتن، قەرار گرتن" [ئارام و قەرار] لەگەڵ "قەتعە و چوارچێوە" لە وشەی "گرێژنە"ی کوردمادیشدا دەردەکەوێ].

**ئاران aran** *[ ārān ]* - "گەرمەسێر": ئارا + ئان [پاشگری کۆ، یان پاشگری ناوچە وەک گەرمیان] -ara (a)n). دەچێتەوە سەر ↑ئارا ara بەمانای "رووبەری زەوی، دەشت، پانتایی زەوی". مانای "گەرمەسێر" لێرەوە پەیدا دەبێ کە دەشتاییەکان یاخود ناوچە دەشتەکییەکان شوێنی گەرمن، بە پێچەوانەی شاخ و بەرزاییەکان کە ساردن و زۆزان پێک دەهێنن. وشەی ↑ئالان alan کە ناوی ناوچەیەکی کوردستانە، شێوەیەکی دیکەیە لە ئاران.

[تێبیی: کاک عەلی نانەوازادە ئاماژە دەکا بە پێوەندی وشەکانی ئارا و ئاران و ئالان و دەیانباتەوە سەر وشەی aryan "ئاریایی" (فەرهەنگی هەرمان، ل. 53) و دواتر لە شوێنێکی دیکەدا (ل. 64) لە لێکدانەوەی وشەی "ئاریا، ئاری"دا دەبێژێ مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە "دۆست و هاواڵ" بووە. من لەگەڵ ئەو بەشەی بۆچوونەکەی کاک عەلی دام کە وشەکانی ئارا و ئاران و ئالان بە خزم دادەنێ، بەڵام لەوباوەڕەدام کە نەک ئەو وشانە بچنەوە سەر وشەی aryan "ئاریایی"، بەڵکوو بە پێچەوانەوە وشەی "ئاریا، ئاری" بچێتەوە سەر وشەکانی سەرتر. لەم تێڕوانینەوە هۆزە ئاری یان ئارییاییەکان، دەبێ ئەو هۆزانە بووبن کە لە پێدەشتەکان (ئاران)دا ژیاون، واتا دەشتەکی و نیشتەجێ بوون و بە کاری کشتوکاڵەوە خەریک بوون، بەپێچەوانەی ئەو هۆزانەی کە بە شێوەی کۆچەری و ناجێگیر ژیانیان بەسەر بردووە. وشەی ↑ئاری arî هەر ئێستا دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "نیشتەجێ، ناکۆچەر" بەکار دێ و ئەمە دەتوانێ زانیارییەکی گرنگ لەمەڕ وشەکە ئاشکرا بکا].

**ئاراو araw** *[ ārāw ]* - "کەفاوی جارێک دەکارکراو بۆ جل شوشتن کە هێشتا بەکەلک ماوە": ئاراڤ arav یش دەگوترێ. لەوانەیە وشەکە لە بنەڕەتدا بەمانای "ئاوی گەرم" بووبێ کە هێشتا کەڵکی جل شووشتنی پێوە ماوە.

1- لە "فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 54 ) ئەم وشەیە وەسا لێک دراوەتەوە کە لە دوو کەرتی ↑ئار ar واتا ئاگر و ↑ئاو aw پێک هاتووە و لە پێشدا "ئاروئاو" بووە و دواتر بووەتە "ئاراو" و ماناکەشی هێندێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەم بۆچوونە کە وشەکە پێوەندی بە "ئار"ەوە هەبێ، زۆر رێیی تێ دەچێ.

2- لەوانەشە وشەکە پێک هاتبێ لە ئا [پێشگر] + راو a + raw. کەرتی راو raw جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Lauge (.G)، lye (.E) "تراوی ئالکالی وەک کەفاوی سابوون". ئەم وشە ژێرمەنییە دەبنەڕەتدا بە مانای "ئاوی خۆشووشتن و جل شووشتن" بووە و خزمیشە دەگەڵ lavere (.L) "شووشتن"، سەر بە ریشەی < ***lou-** (.IE)* "شووشتن".

**ئارختک arxıtk** *[ ārxıtk ]* - "مۆتەکە، شەوە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئاڵ al [ئاڵ وشەوە].

**ئارد ard** *[ ārd ]* - "هاڕاو(ی گەنم)": ارد ārd (.P). خزمە دەگەڵ کرداری ↑*هارین harîn* "وردکردن" و گەلێک وشەی دیکەی وەک ↑گەرد gerd و ↑هورد hurd و ↑هەریس herîs و هتد.

[تێبینی: ئەم وشەیە لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 14) بردراوەتەوە سەر ریشەی ئێرانی کۆنی *ar- و لەوێشەوە بۆ ریشەی هیندوئەورووپی < *al- (IE.) "کوتان، هاڕین". من لەو باوەڕەدام ریشە ئێرانییەکە پێوەندی بە ریشەی < *ghreu- (IE.) "هورد کردن، هاڕین"ەوە هەبێ].

**ئارزینگ arzîng** [*ārzīng*] - "چەنەگە": لەوانەیە ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "شەویلکە" بووبێ. لەم تێڕوانینەوە بنجی وشەکە، واتا arz- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "هاڕین، ورد کردن" دەکەن، وەک هەرژین *herjîn* و هاڕین harîn.

[تێبینی: لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ *لاچلاچ(ک)* "1- شەویلکە 2- کاکیلە" کە پێوەندی بە "لەت" کردنەوە هەیە].

**ئارسم arsım** [*ārsım*] - "پەسیو، هەڵامەت": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاسرم asrım.

**ئارسی arsî** [*ārsī*] - "بەرداش": خزمە لەگەڵ ↑*هاڕین harîn* "ورد کردن" و ↑هەرژین herjîn و ↑هەردین herdîn "لەبەر یەک بڵاو بوون، هەلا هەلا بوون".

**ئارنگ arıng** [*ārıng*] - "نەخۆشییەکی ئاژەڵ": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ئاڵوو alu "خربوون (ی گەروو)".

**ئاروان arwan** [*ārwān*] - "ئازووخەی ئارد": خزمە دەگەڵ ↑ئارد ard.

**ئاروو aru** [*ārū*] - "ئاڵوو": ↑ئاڵوو alu.

**ئاروونگ arung** [*ārūng*] - "قەیسی": زردالوو zardālū (P.) [zard + ālu]. خزمە لەگەڵ ↑هەڵووچە heluçe.

**ئارۆ aro** [*āro*] - "پووک": ارواره ārvāre (P.) "شەویلکە". [بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 17) لە کۆندا adarvārak بووە کە لە دوو کەرت پێک هاتووە و کەرتی دووەمەکەی دەچێتەوە سەر ریشەی -*xvar* "خواردن"].

**ئارۆزیان arozyan** [*ārozyān*] - "هورووژان": شێوەیەکی دیکە لە ↑هوڕووژان hurujan.

**ئارۆشک aroşk** [*ārošk*] - "پشمین": خزمە دە گەڵ اروغ ārūġ (P.) "قرپ هێنانەوە".

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 18) وشەی "اروغ" بردراوەتەوە سەر a-rauga- *raug- (OI) "خستنەدەر، دەرپەڕاندن"، سەر بە ریشەی < *reug- (IE.) "بە زۆر کرانەوە، تەقینەوە"]. هەروەها لەوانەیە پێوەندییەک لەنێوان ئەم وشانەوە و ↑رشانەوە rışan(ewe) دا هەبێ.

**ئارەبە arebe** [*āraba*] - "چەرخ، ئاڵقە": عارەبە εarebe ش دەگوترێ. ارابه arrābe (P.). ئا [پێشگر] + رەبە rebe + a. "رەبە" خزمە دەگەڵ Reifen (G.) "تایر، تەگەر"، Reif (G.) "ئاڵقە"، reif (MG.) "بەند، کەمەربەند، ئاڵقە، نەوار"، (skauda)raip (Gt.) "تەسمەی چەرمین"، rep (Sw.)، rope (E.)، reep (Nl.) "پەت، بەند"، سەر بە ریشەی < *rei- (IE.) "بڕین، پچڕین، کڕاندن".

**ئارەزوو arezu** [*ārazū*] - "حەز، تاسە": ارزو ārezū (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ eros (Gr.) "خۆش ویستن، تاسە و ئەوینداری کردن". وشەی erotic دە زمانە ئەورووپییەکاندا بۆ erōtikós (Gr.) دەگەڕێتەوە کە لە وشەکەی سەرەوە وەرگیراوە.

[تێبینی: بەگوێرەی"فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 15) دە فارسی ناویندا āwarzōg (MP.) "ئارەزوو، تاسە" هەبووە کە بە بۆچوونی خاوەنڕایان پێک هاتووە لە پێشگری ā و ریشەیەک، کە لەوانەیە ریشەی -*barg* "پێهەڵگوتن" بووبێ یان ریشەی -*varz* "خۆش ویستن". تێبینی 2: وشەی eros دە زمانی عەڕەبیدا بووەتە عروس εarūs (Arb.) "بووک". لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "حەز" هەڵی سەنگێنین کە هەم مانای "خۆش ویستن" دەدا و هەمیش مانای "دڵدار"].

**ئاریان aryan** [*āryān*] - "زیبکە و کوان لە لەش دەرهاتن": دەچێتەوە سەر ئاروو aru [↑ئاڵوو alu].

**ئاری[1] arî** [ *ārī* ] - "کۆمەک، خەم لە کەسێک خواردن": خزمە دەگەڵ (gi)ruohhen (OG.) "دە فکردا بوون، خەم لێ خواردن"، ra can (E.) "خەم لێ خواردن، ئاگاداری کردن"، ra kja (OIs.) "هۆش پێوە بوون، خەم لێ خواردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە لای خۆیانەوە دەبنە خزم دەگەڵ arēgein (Gr.) "یاری دان، پشتیوانی کردن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *reg- <*** "راست کردنەوە". "ئاری" دە زمانی کوردمادیدا بە چەند شێوە دەردەکەوێ وەک ئاری arî، یاری yarî، ئاڵی alî[ئاڵیکاری alîkarî، هاریکاری harîkarî]. وەک دەبینین شێوەی "ئاری" و "ئاریکاری" لە شێوەکانی دیکەی ئەم وشەیە دروستترن.

**ئاری[2] arî** [ *ārī* ] - "نیشتەجێ، بەرانبەری کۆچەر": خزمە دەگەڵ↑ ئارا ara "پانتایی زەوی، دەشت، گەرمەسێر" و ↑*ئاران aran*. دەبنەڕەتدا مەبەست "دەشتەکی" بووە، واتا ئەو کەسانەی لە پێدەشتەکاندا ماونەتەوە و بە کاری زەوی و زارەوە خەریک بوون.

**ئاری[3] arî** [ *ārī* ] - "خۆڵەمێش": خزمە دەگەڵ ↑ئارا "دەشت، پانتایی زەوی". ئەم وشانە هەردووکیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هیشک بوون، سووتان". دە زمانی ئاڵمانیشدا وشەی Asche (G.) "خۆڵەمێش" لەم ریشەوە هاتووە.

**ئاریلە arîle** [*ārīla*] - "پیاوی ژنانیلە": ئاڵی alî ش دەگوترێ. دەبێ پێوەندی هەبێ بە ↑ئەری ere بە مانای "بەڵێ" و مەبەست دە بنەڕەتدا بەڵێ گوتنی زۆر بووە، واتا کەسێک کە هێزی "نا گوتن" و بەرپەرچ دانەوەی کەم بووە.

[تێبینی: منیش وێڕای فێمینیستەکان لەگەڵ بەکار هێنانی ئەم وشەیە بەم مانای "پیاوی ژنانیلە" نیم. بەڵام دەکرێ وشەکە بە مانا راستەکەی هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ژن بەکار ببردرێ].

**ئارینج arenc** [ *ārenj* ] - "کوانی بن هەنگڵ": خزمە دەگەڵ ↑ئاروو aru [↑ئاڵوو alu].

**ئاز1 az** [ *āz* ] - "چێشت، خۆراک": اش aş (P.) "ناوی جۆرە خۆراکێکە وەک دۆکڵیو". وشەی ئاش aş دە هێندێک شێوەزاری کوردمادیشدا هەربەو مانایە بەکاردێ. بەڵام وشەی ئاش یان ئاز دەبێ پێشتر بە مانای گشتی "چێشت، خۆراک" بەکارهاتبێ، هەربۆیە دە فارسیدا بە چێشتکەر دەگوترێ "اشپەز" و دە کوردمادی سەرووشدا دەگوترێ ئازپێژ. هەروەها دە کوردمادی و فارسیدا وشەی ↑ئازووقە azuqe هەیە بە مانای "خواردەمەنی پاشەکەوتکراو". ئەم وشەیە دەشێ خزمە دەگەڵ essen (G.)، eat (E.)، itan (Gt.)، äta (Sw.)، edere (L.)، ésti (Lit.) éss (OIr.)، گشتیان بەمانای "خواردن"، átti (OIn.) "دەخوا"، édō (Gr.) "دەخۆم"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *ed- <*** "خواردن". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە کە گشتیان پێوەندییان بە چەمکی خواردنەوە هەیە، وەک ↑ئادان adan "شیرەمەنی"، ↑دان dan "ددان"، ↑ئاشک aşık "ورگ" و هتد.

[تێبینی: کاک عەلی نانەوازادە دە "فەرهەنگی هەرمان"دا ئاماژەی بە پێوەندی وشەکانی ئاز، ئاش، ئادان و هەروەها خزمایەتی ئەوان دەگەڵ āča "خواردن" لە سانسکریتدا کردووە. دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 29) بە گوێرەی بۆچوونی یەکێک لە خاوەنڕایان اش āş (P.) بردراوەتەوە سەر ریشەی *yah-* "کوڵاندن" و دەگەڵ yeast (E.) "هەوێن، هەویرترش" بە خزم داندراوە.

**ئاز2 az** [ *āz* ] - "چەتوون":

1- لەوانەیە کورتکراوی ↑ئازگار azgar "سەخت" بێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئاسێ ase "سەخت، دژوار".

**ئازا aza** [ *āzā* ] - "بەجەرگ، نەترس، چالاک": هەرەروەها ↑ئازاد azad هەیە بە مانای "رەها، نەبەستراوە، بەند نەکراو". دە زمانی فارسیدا ازاد āzād (P.) بەم دوو مانایە بەکار دێ: "رەها، نەبەستراوە" و هەروەها "نەجیب، رەسەن". جگە لەمە دە فارسیدا ازناور aznāwar بە مانای "بوێر، پاڵەوان" بەکار هاتووە کە ماناکەی هاوشێوەی "ئازا"ی کوردییە و دەچێتەوە سەرāznāwar (MP.) "نەجیب" و ئەمەش گرێ دراوەتەوە بە -āsna (Av.). دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 19)

ئەم وشانە دە بردرێتەوە سەر ریشەی -zan "زان" (-*znta- > * zāta*). لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی بە وشەی ↑زان zan پەیدا دەکا.
[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی ئەم مانایانە بە چەمکی "زان"ەوە دەکرێ دەگەڵ وشەکانی "جسن" و "رەسەن" دە زمانی کوردمادیدا بەرهەڤی بکەین. "جسن" بە مانای "رەسەن" بەکار دێ و شێوەی گۆڕدراوی "جنس"ە و خزمە دەگەڵ "زان" [ genus (.L) "جینس، رەگەز، تۆرەمە"، generatio (.L) "رسکاندن، زان، بەدی هێنان"، g)natus) (.L) "لە دایکبوو"، génesis (.Gr) "بە دنیا هاتن، بنەچەک"].
هەروەها وشەی "رەسەن" پێوەندی بە چەمکی "رەگەز، تۆرەمە، رەگ و ریشە و بنەچەک" پەیدا دەکا. دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا هەروەها دەگوترێ "بە ئەسڵ و نەسەب"، واتا ئەو کەسانەی سەر بە تۆرەمەیەکی ناسراو و باشن. ئەم پێوەندییانە دەری دەخەن کە لە کۆندا لەوانەیە وشەی "ئازاد" نازناوێک بۆ کەسانی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار بووبێ کە خاوەنی "ئەسڵ و نەسەب"ی دیار و بەرچاو بوون و دیارە خۆیان پێ بوێر و نەترس بووە و ئاپۆڕەی گەلیش کە ژێردەستە و بەستراوەی ئەوان بوون، وەک مرۆڤی "نائازاد" ئەژمارده کراون. وشەی ↑ئەگیت egît [ئەگید egîd] "ئازا، قارەمان" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.
**ئازاد azad** [ *āzād* ] - "رەها، نەبەستراوە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ئازا aza.
**ئازار azar** [ *āzār* ] - "ئێش": هەروەها ئازراندن azrandın هەیە بە مانای "ئێشاندن". ازار āzār (.P) و ازردن āzordan / āzārdan (.P). بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 20 ) پێک هاتووە لە پێشگری ā و ریشەی -*zar* "هاروژاندن، تووڕە کردن". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ -zar (.Av) "تووڕە کردن" و hrnīté (.OIn) "تووڕە بوون". روون نەکراوەتەوە کە ئەو ریشەیە پێوەندی بە چ ریشەیەکی هیندوئەورووپییەوە هەیە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئاژر ajır [a-jır] "تووڕە، رق هەستاو" و دەگەڵ ↑غەزرین ġezrîn "تووڕەبوون".
**ئازاڵە azale** [ *āzāla* ] - "ئاوردوو": ئاز + ئاڵە az + ale .خزمە دەگەڵ ↑ئێزینگ ezîng "داری سووتەمەنی". کەرتی ئاڵە ale- پاشگرە.
**ئازگار azgar** [ *āzgār* ] - "سەخت، ناخۆش": [دە ساڵی ئازگار چاوڕوانی بوو]. ئەم وشەیە باری نێگاتیڤی هەیە و بۆ نیشان دانی ماوەیەکی زەمەنی ناخۆش بەکار دێ، پێک هاتووە لە پێشگری ئا + زگار z(ı)gar + a. کەرتەوشەی "زگار" خزمە دەگەڵ ↑سەخت *sext* و هێندێک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "سەخت بوون" دەکەن، وەک ↑زیک zîk، ↑سەقەم seqem، ↑شەختە şexta کە لە بنەرەتدا ئاماژە بە سەرمای سەخت دەکەن. کۆمەڵێک لە وشەکانی سەر بەم خێزانە لەژێر وشەی ↑سەق *seq* دا ریز کراون.
**ئازنگ azıng** [ *āzıng* ] - "خانووی بەسەر تەختەبەردی پانەوە دروست کراو": لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑ئازوو azu "خلێنە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەرد". هەڵیسەنگینە دەگەڵ اشیانە āšyān(e) (.P) "لانە، سەرپەنای ئاژەڵ". لەوانەیە مەبەستی وشە فارسییەکە دەبنەڕەتدا کون و کەلێنی ناو بەرد بووبێ کە ئاژەڵ خۆی تێدا حەشار داوە.
**ئازوباز azubaz** [ *āzubāz* ] - "وەباڵ، تاوان": ئاز az هەڵسەنگینە لەگەڵ از āz (.P) "تەماح، چاوچنۆکی" [خزمە دەگەڵ ↑حەز *ħez* "مەیل"]. باز baz خزمە دەگەڵ بزە bazeh (.P) "گوناح، تاوان" و ↑ بەد *bed*.
**ئازوو azu** [ *āzū* ] - "خلێنە، کاکیلە": بەم ددانە دە فارسیدا دەگوترێ ددانی اسیاب āsyāb (.P) واتا ددانێک کە دەهاڕێ. دەبێتە خزم دەگەڵ وشە فارسییەکە و گەلێک وشەی کوردمادی وەک ↑ئاش *aş* "بەردی (هاڕین)"، ↑هەسان hesan "بەردی تیژ کردن" و هەروەها↑ *ئاسمان asman* [دەبنەڕەتدا بە مانای "تاقی بەردینی سەر زەوی"]. ریشەی وشەکە بە مانای "بەرد"ە.
[تێبینی 1: ئەم ددانە لە زانستی پزیشکی ددانیدا وشەیەکی لاتینی بۆ بەکار دەهێنرێ کە بریتییە لە molar، دەچێتەوە سەر molare (.L) "هاڕین" و خزمە بۆ وێنە لەگەڵ mahlen (.G) "هاڕین" و Mühle (.G) و

"ئاش". لە زمانی کوردمادیشدا دەبێتە خزم لەگەڵ ماڵین malîn. مانای بنەڕەتی ریشەکە myle (Gr.) "ڕێخشاندن"ە کە لەوێوە ماناکانی دیکە وەک "هاڕین" پەیدا بوون، چونکوو دەنک و دان لەرێگەی ڕێخشاندنەوە (لەناو دەستاڕ یان بەرداش) هاڕدراوە. تێبینی 2: وشەی فارسی اسیاب āsyāb (P.) (لە بنەڕەتدا: ئاس ās + اب āb) و بە مانای "ئاشی ئاو" بووە و دواتر ماناکە بەگشتی بووەتە "ئاش"].

**ئازووقە azuqe** [ *āzūqe* ] - "بژێو و خۆراکی پاشەکەوتکراو": ازوقە azuqe (P.). بنەوشەی ئاز -az یەک دەگریتەوە دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی و فارسی کە پێوەندییان بە چەمکی "خواردن"ەوە هەیە، وەک↑ ئاز az "چێشت".

**ئازەب azeb** [ *āzab* ] - "لاوی تازە پێگەیشتوو، تازەلاو": عازەب εazeb یش دەگوترێ. هەروەها ئازەبە azebe [عازەبە εazebe] هەیە بە مانای "زیبکەی دەم و چاوی لاوی تازەپێگەیشتوو". وشەکە پێک هاتووە لە پێشگری ئا + زەب a + zeb. کەرتەوشەی "زەب" پێوەندی بە ↑زیپکە zîpke [زیبکەzîbke]ەوە هەیە کە لە کاتی گەورە بوون [باڵغ بوون]دا پەیدا دەبێ. وشەکە هەروەها هەڵ سەنگێنە دەگەڵ ↑زفتک zıftık "زیپکەی ئازەبی" و ↑زەوە zewe "زیپکە". بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەکە، وشەیەکی رەسەنی کوردمادییە و چ پێوەندی بە زمانی عەرەبییەوە نەداوە. فۆتیمی سەرەتا دە وشەکانی "عەزەب" و "عازەبە"دا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووەتە ع. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی ئاستەم و عاستەم.

**ئازەنتی azentî** [ *āzantī* ] - "ڕاڤە، لێکدانەوە": ئا [پێشگر] + زەنتی a + zentî. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک بە مانای "لێدان، لێکدان"، وەک ↑ژەنین jenîn، ↑ژەندن jendın. وشەکانی زەند zend و پادزەند padzend ی پێوەست بە ئەوێستا هەر ئەو مانایە دەبەخشن و پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. مەبەست لەم وشانە "لێکدانەوە"یە، واتا شەرح و تەفسیر کردن.

**ئاژ1 aj** [ *žā* ] - "زبر، گرنی گرنی": خزمە لەگەڵ ↑ئاژنین ajnîn "کون کردن" و لەوانەشە دەگەڵ ↑ئاژێنە ajene "چەکوچێکی سەر گرنی گرنی بۆ زوور کردنەوەی بەرداش".

**ئاژ2 aj** [ *žā* ] - "شووڵ، لقی تازەرووا": خزمە لەگەڵ ↑هاچە haçe "لکەدار، فاقە" و هەروەها ↑هەژال hejal "لکەداری سەوز و گەڵادار".

**ئاژاشکە ajaşke** [ *āžāška* ] - "مچورک": دەشێ بنەوشەی ئاژ پێوەندی بە ↑هەژان hejan ەوە هەبێ و کەرتی دووەمیش پاشگری گچکاندنە. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "هەژانی گچکە".

**ئاژاڵ ajal** [ *āžāl* ] - "چیلکە و چاڵ": شێوەیەکی دیکە لە↑ ئازاڵە azale "ئاوردوو".

**ئاژاوە ajawe** [ *āžāwa* ] - "بشێوی، نائارامی": اشوب āšūb (P.). ئا + ژاوە a + jawe. بڕوانە ↑شێوان şêwan.

**ئاژر ajır** [ *āžır* ] - "توورە، رق هەستاو": خزمە دەگەڵ ↑غەزرین ġezrîn [ġezır + în] "توورە بوون، رق هەستان". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑ئازار azar دا باس کراون. "ئازار" بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 20 ) پێک هاتووە لە پێشگری ā و ریشەی *zar-* "هارووژاندن، توورە کردن". کەوابوو ئاژر ajır پێک هاتووە لە پێشگری ئا + ژر a + jır. کەرتی ئەسڵی وشەکە دەگەڵ شێوە و مانای ریشەکە یەک دەگرێتەوە.

**ئاژنی ajnî** [ *žānī* ] - "مەلە": ئا [پێشگر] + ژنی a + jınî کەرتی "ژنی" دە فارسیدا دەبێتە شنا šena (P.) "مەلە"، خزمە لەگەڵ snāyate (OIn.) و snayeitē (Av.) "دەشوا، مەلە دەکا". ریشە؟

**ئاژنین ajnîn** [ *žānīn* ] - "کون کردن بە شتی تیژ، هەڵکۆڵین": اختن (P.) "بڕین و هەڵکۆڵین"، سەر بە ریشەی *(IE.) *ak- , *ok- >* "تیژ، نووک تیژ". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا گەلێک وشە دەچنەوە سەر ئەو ریشەیەی سەرەوە، وەک Ecke (G.)، edge (E.) "گۆشە، قەراخ" [شوێنی تیژ و دەرپەڕیو]، acus (L.)"دەرزی"، acuere (L.) "تیژ کردن"، akis (Gr.) "چقڵ" و oxys (Gr.) "تیژ، توند" [oxygen، ئۆکسیژێن

واتا ماکەی تیژ]، اختە axte (P.) "تیژ" و هتد. هەروەها دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئاخیە axîye "گوڵمیخ" و ↑ئاسک āsk و چەند وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا.

**ئاژۆتن ajotın** [ *žāotın* ] - "دانە پێش، لێخوڕین": خزمە دەگەڵ (Gr.) agein "ئاژۆتن"، (L.) agere "ئاژۆتن، بەرەو پێش بردن، راپەڕاندن"، سەر بە ریشەی ***ag-** > (IE.) "ئاژۆتن".

[دە "فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی"دا (ل. 3) ئەم وشەیە لە پێوەندی دەگەڵ وشەی فارسی ئاشفتن āšoftan (P.) (↑شێوان şêwan، شێواندن)دا لێکدراوەتەوە].

**ئاژەڵ ajel** [ *āžal* ] - "گیانلەبەر، حەیوان": ئا + ژە + (ە)ڵ a + je + (e)l. کەرتی یەکەم پێشگر و کەرتی دوایی پاشگرە. کەرتی ژە je دەچێتەوە سەر کرداری ↑ژین jîn. دە زمانی عەرەبیشدا وشەی "حەیوان" لە "حیات" بە مانای ژین وەرگیراوە.

**ئاسا asa-** [ *āsā* ] - پاشگرێکە دە زمانی کوردمادیدا و فارسیدا دەگەڵ هێندێک وشە دێ وەک گورگ ئاسا، شێرئاسا. پێک هاتووە لە پێشگری ئا + سا a + sa. کەرتی "سا" دەچێتەوە سەر ↑زانzan . جێی ئاماژەیە کە وشەی ↑گۆن gom "چەشن، نەوع" و هەروەها "ژێن، gen" دە زمانە ئەورووپییەکاندا پێوەندی بە "زان"ەوە هەیە. بەم جۆرە شێرئاسا واتا لە چەشنی شێر، لە رەگەزی شێر.

**ئاسان asan** [ *āsān* ] - "راحەت، نەگران": هاسان hasan یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە ↑حەسانەوە ħesan(ewe) [اسودن āsūdan (P.)] "وچان دان، ئارام گرتن، راحەت بوون".لەم تێڕوانینە مانای ئاسان دەبێتە "راحەت".

**ئاسایی asayî** [ *āsāyī* ] - "عادی":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی ***es-** > (IE.) "بوون، وجوود، *هەستی*". لەم تێڕوانینەوە "ئاسایی" دە بنەڕەتدا مانای "تەبیعی، سروشتی" دەگەیەنێ واتا ئەو شتەی کە لەگەڵ یاسا و رێساکانی تەبیعەت گونجاوە و ئاوارتە و شاز نییە. لەم مانایەوە ئەمجار مانای "عادی" سەری هەڵداوە.

[تێبینی: دەتوانین لەباری ماناوە دەگەڵ physikós (Gr.) "فیزیک، بەگوێرەی سروشت، سروشتی" هەڵی سەنگێنین کە دەچێتەوە سەر phyein (Gr.) "رسکان، بوون، دروست بوون" و خزمە دەگەڵ bauen (G.) "دروست کردن، رسکاندن" و بوون bun دە زمانی کوردمادیدا].

2- لەوانەشە پێوەندی بە یاسا yasa "قانوون"ەوە هەبێ و سەرەتا بە مانای "یاسایی"، واتا قانوونی و گونجاو لەگەڵ داب و دەستوور بەکار هاتبێ.

**ئاست ast** [ *āst* ] - "1- جێگە، شوێن 2- بەرانبەر، رووبەروو 3 - سەتح، رووبەر": پێشگری ئا + ست sıt، سەر بە ریشەی ***st(h)ā-** > (IE.) "وەستان، راوەستان، جێگیر بوون". خزمە لەگەڵ↑ وەستان westan [ایستادن īstadan (P.)]. دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێنی وەستان" بووە و دواتر مانای "رووبەر"ی وەرگرتووە و دیسان ماناکەی پەرەی گرتووە و مانای "پلە و پایە"شی پەیدا کردووە. ["لە ئاستی ئەودا نییە" واتا شوێنی وەستانی نزمترە، بە وتەیەکی دیکە واتا پلە و پایەی نەویترە]. وشەی Stand (G.) هەروەک "ئاست" لە کوردمادیدا -خزمیشن پێکەوە- لە بنەڕەتدا بە مانای "وەستان" بووە و دواتر مانای بووەتە "شوێن" و لەوێشەوە بووەتە "ئاست و پلە و پایە". ئەمیش دەچێتەوە سەر کرداری stehen (G.) "وەستان ".

**ئاستن astın** [ *āstın* ] - "هێشتن": شێوەیەکی دیکەیە لە↑ هێشتن hêştın.

**ئاستەم astem** [ *āstam* ] - "1- دژوار، ئاسێ، سەخت، زەحمەت 2- هێواش": ئەستەم estem و عاستەم ɛastem یش دەگوترێن. ئا [پێشگر] + ستەم sıtem + a. کەرتی دووەم هەمان↑ستەم sıtem ە بە مانای "زوڵم و زۆر" کە لە بنەڕەتدا مانای "سەختی و رەقی" دەدا. هەر بەم جۆرەش ستەم کردن لە بنەڕەتدا بە مانای سەختی و توندی نواندن واتا دڵڕەقی بووە. ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ Stein (G.)، ston (E.)، sten (Sw.)، stains (Gt.) "بەرد"، sten (Rus.) "دیوار"، stear (Gr.) "رۆنی مەییو" [رۆنی رەق]، stia (Gr.)

"بەردۆکە، خیز" [هەڵی سەنگینە لەگەڵ وشەی ↑چیا çîya]، styayate (OIn.) "رەق بوون، سفت بوون، مەیین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *staī- >** "رەق بوون، سفت بوون، توند بوون". کەواتە مانای بنەڕەتی وشەی "ئاستەم" بریتییە لە "سەخت". ئەم مانایە بە تەواوی دەردەکەوێ، کاتێک بۆ وێنە دەگوترێ "شاخێکی ئاستەمە، کارێکی ئاستەمە، بە ئاستم دەستی گەیشتێ". لە هەمان کاتدا مانای "هێواش، کەم"یش سەری هەڵ داوە، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "بە ئاستەم دەستم لێدا" یان "دەستم بە ئاستەم داroوشاوە". مانای دووەم لێرەوە پەیدا بووە، کاتێک کارێک بە سەختی دەچێتە پێش یان شتێک بە سەختی پێک دێ، ئەوا لێرەدا کارەکە بە هێواشی و کەم کەمە دەکرێ، بۆ وێنە کاتێک کەسێک وە سەر شاخێکی ئاستەم دەکەوێ، سەرکەوتنەکەی بە هێواشی و کەم کەمە ئەنجام دەدرێ، بە پێچەوانەی کاری هاسان کە بە لەز و خێرا جێ بە جێ دەبێ. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم بن دەگەڵ ↑هەستی hestî [↑ئێسک esık، هەستک hestık] و هەروەها بەمانای "دەنکی رەقی میوە، ناوکەمیوە".

**ئاستەنگ asteng** [ *āstang* ] - "تەگەرە، سەختی، دژواری": ↑خزمە لەگەڵ ئاستەم asrem "سەخت".

**ئاسرم asrım** [ *āsrım* ] - "هەڵامەت، پەسیو": ↑ئارسم arsım شێوەیەکی کۆنترە لە "ئاسرم". پێوەندی هەیە بە ↑ئەسرین asrîn "فرمێسک"ەوە. فرمێسک لە چاو هاتن یەکێک لە گرینگترین دیاردەکانی ئەم نەخۆشینەیە.

**ئاسرمە asırme** [ *āsırma* ] - "کوتە چەرمی سەر کەفەڵی بارگین": ئاشرمە aşırme، هاشرمە haşırme ش دەگوترێ. ئا + سرمە a + sırme. کەرتی سرمە [شرمە] شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چەرم çerım. هەروها دەبێتە خزم لەگەڵ ↑سیرمە sîrme.

**ئاسک ask** [ *āsk* ] - "خەزاڵ": اهو ahu (P.) [گۆڕانی فۆتیمی h و s لە هێندێک وشەی دیکەی کوردمادی و فارسیدا دەبیندرێ وەک ماسی و ماهی، ئاسن و اهن]. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *ak- >** "نووک ، تیژایی". خزمە دەگەڵ↑ ئاژنین ajnîn.

[تێبینی: لە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ناوی هێندێک لە ئاژەڵە شاخدارەکان دەچێتەوە سەر ریشەی *ker-* "قۆچ، شاخ"، وەک Hirsh (G.) "ئاسک"و کەڵ kel ی کوردمادی. بەم پێیە "ئاسک"ی کوردمادیش لە ریشەی *ak-* "نووک ، تیژایی"ەوە هاتووە و مەبەست ئاماژە بە شاخەکانی ئەم ئاژەڵە بووە].

**ئاسمان asman** [ *āsmān* ] - "ڤالایی سەر زەوی": اسمان asman (P.)، áśman (OIn.)، ákmōn (Gr.) "ئاسمان". وشەکانی زمانی هیندی و یۆنانی کۆن جگە لە مانای ئاسمان، بە مانای "بەرد"یش بوون و مانای بنەڕەتییان ئەمەی دوایی بووە. بە گوێرەی بۆچوونێک مرۆڤی کەونارا ئاسمانیان وەک تاقێکی بەردین لەبەرچاو گرتووە کە هەردی داپۆشیوە [لەوانەیە ئەم تێڕوانینە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە لە کاتی کەوتنە خوارەوەی بەردی ئاسمانیدا وایان زانیبێ ئەم بەردانە لە میچەکەوە لێ دەبنەوە و دەکەونە خوارەوە]! وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ↑ کەڤر *kevır* "بەرد"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(a)kamen- >** "بەرد". وشەی سماء samā (Arb.) دەبێ پێوەندی بە وشە هیندوئەورووپییەکانەوە هەبێ. بە گوێرەی بۆچوونێک ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی دوورتری **(IE.) *ak- >** "تیژ". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم لەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ئاش aş [لە بنەڕەتدا: بەرد(ی هاڕین)] و ↑هەسان hesan "بەردی تیژ کردن"، ↑ئازنگ azıng "خانووی بەسەر تەختەبەردی پانەوە دروست کراو" و چەندین وشەی دیکە کە لەژێر ↑حەمرین *ħemrîn* دا باس کراون.

[تێبینی: هەر لە پێوەندی دەگەڵ ئەم ریشانەی سەرەوەدا ریشەیەکی دیکەش دروست بووە کە بریتییە لە ریشەی *(IE.) *kem-* "داپۆشین، لێهاڵاندن". گەلێک وشەی کوردمادی کە ئەم چەمکە لە خۆ دەگرن، لەم ریشەوە هاتوون، وەک ↑جامە *came* "جلوبەرگ"، ↑خام xam "پەڕۆ بۆ تێوەپێچان"، ↑شەمڕاندن şemrandın "شاردنەوە" و هتد].

ئاسن **asın** [ āsın ] - "کانزایەکی ڕەق": اهن āhan (P.). خزمە لەگەڵ ayanh- (Av.)، áyas (OIn.) "ئاسن". وشەکانی ئەڤێستایی و هیندی کۆن بە خزم دادەنرێن لەگەڵ ehren (G.)، æren (OE.)، ērīn (OG.) "برۆنزی، لە برۆنز دروستکراو"، ēr (OG.)، aiz (Gt.)، eir (OIs.)، ore (OE.) "بەردی مەعدەن"، a(h)enus (L.) "برۆنزی"، سەر بە ریشەی **< *aios- (IE.)** "مس، برۆنز".

[تێبینی 1: فۆتیمی s دە وشە کوردمادییەکەدا بە تەواوی دەگەڵ ریشەکە دەگونجێ. تێبینی 2: هەر لەم پێوەندییەدا چەند وشەیەکی ژێرمەنی دیکەش سەرنج رادەکێشن کە بریتیین لە Eisen (G.)، isan (OG.)، aisarn (Gt.)، iron (E.)، järn (Sw.) "ئاسن". ریشەی ئەم وشە ژێرمانییانە ساخ نەکراوەتەوە و ئاماژە بە چ پێوەندییەک لە نێوان ئەم وشانە و وشەکانی سەرتردا نەکراوە. بەڵام دوور نییە پێوەندییەک لە ئارادا بێ. دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 64) سەبارەت بە ریشەی وشەی "اهن" واتا "ئاسن" ئاماژە بە چەند بۆچوونێکی دیکە کراوە کە لەوە ناچێ گونجاو بن].

ئاسوودە **asude** [ āsūda ] - "ڕاحەت، حەساوە": ↑حەسانەوە ħesan(ewe) [اسودن āsūdan (P.)] "وچان دان، ئارام گرتن، راحەت بوون".

ئاسۆ **aso** [ āso ] - "ئەو شوێنە دوورەی ئاسمان و هەرد دەگەنە یەکتری": پێشگری ئا + سۆ a + so. کەرتی ↑سۆ so خۆی بە تەنیاش بەکاردێ و هەم مانای "ئاسۆ" دەدا و هەم مانای "سۆزی، سبەی" و هەمیش مانای "سۆما". چەمکی هاوبەش لە هەموو ماناکاندا بریتییە لە "رووناکی". وێ دەچێ لە بنەڕەتدا بە مانای "رووناکی" بووبێ و ئاماژە بەو شوێنە دوورە کرابێ کە یەکەمین یان دوایین رووناکایی خۆر لەوێ بەدیار دەکەوێ ودواتر ماناکە بە گشتی بووبێتە ئەو شوێنە رووناکەی کە لە دوور دوورەوە دەبیندرێ، بە وتەیەکی دیکە دوورترین شوێنی رووناک. لەم تێڕوانینەوە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑سبەی sıbey، ↑سۆزی sozi، ↑سپی *sıpi* و ↑سووتان sutan و هیتر، سەر بە ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە، رووناک بوون".

ئاسۆس **asos** [ āsos ] - "ناوی چیایەک لە کوردستان": پێک هاتووە لە پێشگری ئا + سۆس a + sos. کەرتی سۆس sos- خزمە دەگەڵ ↑ساسۆن sason و ↑سەکران sekran کە ناوی دوو چیان لە کوردستان. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑سەق *seq* [دە بنەڕەتدا: بە مانای "سەخت"].

ئاسەوار **asewar** [ āsawar ] - "شوێنەوار": پێک هاتووە لە دوو وشەی ئاس + (ە)وار as + (e)war. ئاس as پێوەندی هەیە بە کرداری ↑هەیە heye [هەس hes دە زاراوەی سنەییدا] و هست hast یان است ast (P.)، سەر بە ریشەی **< *es- (IE.)** "بوون". سەبارەت بە کەرتی دووەمی وشەکە دەتوانین ئاماژە بکەین بە بۆچوونی کاک عەلی نانەوازادە دە "فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 82) کە کەرتی "وار"ی بردۆتەوە سەر ↑وار war ی کوردمادی بە مانای "ماڵ" و بەگشتی بە مانای "شوێن و جێگە". لەم تێڕوانینەوە ئاسەوار دەتوانێ بە مانای "شوێنی بوون" بێ. سەبارەت بە کەرتی ئاس as کاک عەلی وشەکانی asah (Av.) "جێگا و شوێن" و هەروەها as- (OIn.) "دانیشتن"ی خستووەتە بەر هەڵسەنگاندن.

ئاسێ **ase** [ āse ] - "سەخت": ئەم وشەیە بۆ دوو مەبەست لە زمانی کوردمادیدا بەکار دێ، یەکەمیان بۆ کێوی ئاستەم [کێوێکی ئاسێیە]، دووەم بۆ مەبەستی "گیرکردن" [دەستم لەو شتەدا ئاسێ بووە، لە ژوورەکەدا ئاسێ بووین]. وشەکە دەشێ وشەیەکی وەرگیراو بێ و بچێتەوە سەر ***عاصي*** *εāsī (Arb.)* "سەرکەش، نافەرمان". رەنگە مانای دووەمی وشەکە دە زمانی کوردمادیدا دە بنەڕەتدا ئاماژە بێ بە "سەرکەش" بوونی ئەو شتە کە گیری کردووە و خۆی رەها ناکا، واتا خۆی بە دەستەوە نادا.

ئاش **aş** [ āš ] - "شوێنی هاڕینی گەنم": خزمە لەگەڵ ↑*ئاسمان asman* و ↑هەسان hesan "بەردی تیژ کردن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەرد" و دە بنەڕەتدا مەبەست "بەری هاڕین" بووە، واتا بەرد بۆ هاڕینی دەخڵ و دان. دواتر ماناکە گۆڕاوە بۆ ئەو شوێنە [ئەو ماڵەی] بەردەکەی لێ بووە.

[تێبینی: دە "فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 84) ئەم وشەیە بەراورد کراوە دەگەڵ "ئەشە"ی ئەوێستایی بەمانای ئارد و "ئەسەن"ی فارسی کۆن بە مانای بەرد. هەروەها دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل.23) وشەی اس (اسیاب) (.P) ās بردراوەتەوە سەر ریشەی -ās ‎*ar-‎ "ورد کردن، هاڕین". بە پێی بۆچووتیکی دیکە بە دروستی بردراوەتەوە سەر ریشەی ‎< *ak- (.IE)‎ "تیژ، بەرد" و لەم ڕێیەوە بە خزم داندراوە لەگەڵ "ئاسمان"].

**ئاشاخە aşaxe** [ *āšāxa* ] - "ئاشغاڵ، بێکەڵک": ئاشاغە aşaġe ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑ئاشغاڵ aşġal.

**ئاشتی aştî** [ *šātī* ] - "تیوان خۆشی، بەرانبەری شەڕ": اشتی (.P) aştî. وشەکە لە ئاشت aş(ı)t وەرگیراوە، هاست hast یش دەگوترێ، واتا "تیوانخۆش، تەبا و رەبا". دەشێ پێوەندی بە ↑وەستان westanەوە هەبێ و سەرەتا مەبەست "راوەستاوی، ئارامی، جێگیر بوون" بووبێ. دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا هەر لە ریشەی وەستان و وەستاندنەوە وشە پێک هاتووە بە مانای ئارامی، بێدەنگی [بێ هەرا و کێشە]، بۆ وێنە still (.G) و (.E) "ئارام، بێدەنگ"، هەروەها لەم تیرِوانینەوە دەبێتە خزمیش لەگەڵ ↑ئاست ast.

[تێبینی: لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 30) ئاماژە کراوە بە پێوەندی ئەم وشەیە دەگەڵ ‎āxšti-‎ (.Av) "ئارامی، ئاشتی" و بردراوەتەوە سەر ریشەی ‎< *ok- (.IE)‎ "روانین، دیتن". لەوباوەڕە دام کە دە ژمارەیەکی زۆر لە وشە کۆنەکاندا، وەک ئەوەی ئەڤێستایی فۆتیمی x فۆتیمێکی زێدەیە. ئەم فۆتیمە لەوانەیە بووبێتە h کە دە ژمارەیەک وشەی کوردمادی و فارسیدا خۆی دەبینێتەوە، وەک پاڵەوان، پەهلەوان (فارسی: پهلوان)، پاڵ، (فارسی: پهلو) و هتد].

**ئاشغاڵ aşġal** [ *šāġāl* ] - "زبڵ و زاڵ": اشغال āġšāl (.P). هەروەها ↑ئاشاخە aşaxe یان ئاشاغە aşaġe هەیە بە مانای "بێکەڵک، زبڵ و زاڵ". هەڵی سەنگینە لەگەڵ خاشاک xāšāk (.P) "خاک و خۆڵ، زبڵ و زاڵ". دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑خاش xaş "ورد و خاش" و ↑خاک xak [لە بنەڕەتدا: ‎*āhaka- (.OI)‎ "ئاخ، خاک"]. بەم پێیە مەبەست لە ئاشغاڵ لە بنەڕەتدا خاک و خۆڵێک بووە کە لەکاتی خاوێن کردنەوە [گەسک لێدان، دابێژتن]دا بەجێ ماوە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "زبڵ، ئاشغاڵ" و "ورد و خاش" دەتوانین لەگەڵ وشەی ئەڵمانی Müll (.G) "زبڵ، ئاشغاڵ" هەڵی سەنگێنین کە خزمە لەگەڵ mahlen (.G) "هاڕین، ورد و خاش کردن" و myll (.OE) "تۆز و خۆڵ"].

**ئاشک aşk** [ *āšk* ] - "ورگ": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑سک sık یان زگ zıg. اشکنبە eşkenbe (.P) "ئاشک، ورگ " و شکم şêkem (.P) "سک". وشەکە دەبێ سەرەتا بەمانای "ورگ، گەدە" بووبێ و پاشان بە گشتی مانای "سک"ی لێ کەوتبێتەوە. لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ئەو وشانەی چەمکی "خواردن" دەرەبڕن، بۆ وێنە ↑ئاز az "چێشت".

**ئاشکرا aşkıra** [ *āškıra* ] - "دیار، بەرچاو": اشکار aşkar (.P). لەوانەیە پێک هاتبێ لە ئا [پێشگر] و شکرا şıkra -a. کەرتی شکرا -şıkra جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ schier (.G)، scir (.OE)، skire (.OF)، sheer (.E)، skir (.Sw) "روون، پاک"، skeirs (.Gt) "روون ، ئاشکرا". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ‎< *skei-na- (.IE)‎ "درەوشانەوە". پێوەندی دوو چەمکی "رووناکی" و "ئاشکرایی" لە وشەکەدا بە باشی دەردەکەوێ، چونکوو ئەم وشەیە لە زمانی کوردمادیدا زۆرجار لەگەڵ "روون" بەکار دێ [روون و ئاشکرا].

[تێبینی: بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 32) وشەکە دەچێتەوە سەر ‎*āviškāra‎ ‎(.OI)‎ و ئەمەش پێک هاتووە لە دوو کەرت کە یەکەمیان سەر بە ریشەی ‎< *au- (.IE)‎ "تێگەیشتن" و دووەمیشیان پەیوەستە بە کرداری "کردن"].

**ئاشنا aşna** [ *āšnā* ] - "ناسیاو": ئا [پێشگر] + شنا şına + a. کەرتی "شنا" دەچێتەوە سەر کرداری شناسین şınasîn [↑ناسین nasîn].

**ئاشووتە aşûte** [ *āšūta* ] - "ڕنوو، شاپە". ئاشیت aşît ش دەگوترێ. دەکرێ بە دوو باردا لێکی بدەینەوە:

1- لەوانەیە پێک هاتبێ لە پێشگری ئا + شووتە a + şûte. ئەوسا کەرتی شووتە şûte دەبێتە خزم دەگەڵ سودن sudan (P.) و سابیدن sābidan (P.) و دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ ↑سوون sun(ewe) و سووانەوە، سەر بە ریشەی **(IE.) *ske-bh-, *ska-bh- >**. ئەم لێکدانەوە زۆرتر ڕێی تێ دەچێ، چونکوو وشەی "ڕنوو"ش لە "ڕنین"ەوە هاتووە و لە باری ماناوە پێوەندی بە چەمکی "سوون، سووانەوە" هەیە.

2- لەوانەشە خزم بێ لەگەڵ ↑ئاژۆتن ajotın "بردنە پیش، دانە پێش خۆ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ag- >** "ئاژۆتن، دانەپێش، ڕەپاڵ دان".

**ئاشێف aşêf** [ *āšef* ] - "بنکۆڵ کردنی تەڕە و سەوزی بۆ بەهێزکردنی": ئا + شێف a + şêf [پێشگر]. کەرتی شێف şêf خزمە دەگەڵ ↑شێ şê، ↑شۆم şom و ↑شاش şaş.

**ئاشێو aşêw** [ *āšew* ] - "ئاژاوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاژاوە ajawe.

**ئاغا aġa** [ *āġā* ] - "ئەرباب": وشەیەکی سەر بە زمانی مەغول (Mang.) ییە، بە مانای "کاك، براگەورە"، لە فارسیدا بووەتە اقا āqā (P.). [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.42]

**ئاغەڵ aġel** [ *ġāal* ] - "هۆڵەمەڕ": ئا [پێشگر] + غەڵ a + ġel. کەرتی "غەڵ" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هۆڵ hol.

**ئافتاوە aftawe** [ *āftāwa* ] - "مەسینە": افتابە aftabe (P.). ئاف + تاوە af + tawe. کەرتی یەکەم دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑ئاو aw و کەرتی دووەمیش دەشێ هەمان↑ تاوە tawe "دەفر" بێ لە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە تێکڕا دەبێتە "دەفری ئاو".

**ئافراندن afrandın** [ *āfrāndın* ] - "دروست کردن، بەدی هێنان": افریدن āfarīdan (P.) "ئافراندن" و āfrīt (MP.) "بوونەوەر، ئافرێنراو". پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] و فراندن a-frandın. لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا ( ل.41) لەم بارەوە دوو لێکدانەوە باس کراوە، یەکەمیان خزم بوونی وشەکە لەگەڵ ↑ئافەرین aferîn و دووەمیان پەیدا بوونی وشەکە لە ریشەی -brī "بڕین" [ **a-brī* ]. بە گوێرەی تێڕوانینی دووەم کە زۆرتر ڕێی تێ دەچێ ئافراندن دە بنەڕەتدا مانای بڕین و داتاشینی شتێکی گەیاندووە بۆ فۆرم بەخشین بەو شتە.

[تێبینی1: لە باری پێوەندی دوو چەمکی بڕین یاخود تاشین دەگەڵ ئافراندن دەکرێ -taš "تاشین" و -tašan ی ئەوێستایی "ئافرێنەر" بە نموونە بێنینەوە و یان ئاماژە بکەین بە دوو وشەی ژێرمەنی schaben (G.) "سوونەوە، ك<ڕاندن، تاشین" و Schöpfer (G.) "ئافرێنەر" کە دە ریشەدا دەگەنەوە یەکتر. تێبینی 2: وشەی عفريتة εafrīta (Arb.) "دێوەزمە" لە āfrīt "بوونەوەر، ئافرێنراو" وەرگیراوە کە دە فارسی ناویندا بەکار هاتووە و دە فارسی ئەمڕۆدا دەبێتە "افریدە"].

**ئافرەت afret** [ *āfrat* ] - "ژن، مێینەی مرۆڤ": وشەکە پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] و فرەت a- fret.

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئافەرین aferîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "خۆش ویستن".

2 - هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Frau (G.) "ژن، خاتوون"، frouwa (OG.) "خانم، خاتوون"، **fraw-jon (Gm.)* "ئاغا"، سەر بە ریشەی **(IE.) *per- >** "بەر، پێشەوە". وەک دەبینین وشەکە لە زمانی ئەڵمانی کۆندا بە گشتی بە مانای "ژن" نەبووە، بەڵکوو لەقەبێکی ڕێز لێنان بە مانای "ئاغاژن" بووە، وەک "مەلاژن"ی خۆمان. دواتر ئەم وشە بەرێزە گشتێنراوە و مانای "ژن"ی وەرگرتووە.

[تێبینی1: بە گوێرەی بۆچوونیکیش ئافرەت لە عفريتة εafrīta (Arb.) وەرگیراوە. ئەم وشە عەرەبییەخۆی دەچێتەوە سەر āfrīt (MP.) "بوونەوەر، ئافرێنراو" و پێوەستە بە کرداری ↑ئافراندن afrandın. ئەم بۆچوونە ڕێی تێ ناچێ. وشەی پیرەک pîrek "ژن" لای کوردانی ئێزیدی باسەکە روونتر دەکاتەوە. ئافرەت a-fret یان پیرەک pîrek لە بنەڕەتدا بە مانای "ژن" نەبووە، بەڵکوو وشەیەک بووە بۆ *بانگ کردنی* ژن و بە مانای "خۆشەویست(ەکەم)، عەزیز(ەکەم)". لە زمانی ئەڵمانیدا ژن و پیاو

یەکتر بە Liebling بانگ دەکەن، واتا خۆشەویستە بچکۆڵانەکەم، "ئەڤینۆل، ئەڤینۆچک". شتیکی دیکەش کە ئەم بۆچوونە پشت راست دەکا، ئەمەیە کە پیاو تەنیا ژنەکەی خۆی وەک "ئافرەت" بانگ دەکا و ناکرێ ژن و کەسی بێگانە بەم ناوە بانگ بکا. هیوادارم ئەم روون کردنەوەیە شەڕەوشەی "ژن" و "ئافرەت" لە راگەیاندنەکاندا چارەسەر بکا. تێبینی 2: لە یەکێک لە بەشەکانی زنجیرەوتاری "رەچەڵەکی وشە"دا کە دە پازدە ساڵ لەمەوبەر خوێندمەوە و بە داخەوە ناوی نووسەری بەڕێزیم لە بیر نەماوە، ئاماژە بە پێوەندی "ئافرەت" و Frau ی ئەڵمانی کرابوو].

**ئافەت afet** *[ āfat ]* - "نەخۆشی (دەغڵ ودان یان هی مەڕ ومالات)": ئا [پێشگر] و فەت a + fet. کەرتی fet شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پەتا peta "نەخۆشی". وشەی "ئافەت" لە زمانی عەرەبی وەرنەگیراوە، بە پێچەوانەوە زمانی عەرەبی لە کوردمادی وەرگرتووە، چونکوو پێشگری ئا a- یەکێک لە پێشگرە چالاکەکانی زمانی کوردمادی و فارسی لە وشەسازیدایە و دە گەلێک وشەدا بەکار هاتووە.

**ئافەرین aferîn** *[ āfarīn ]* - "وشەی پەسەند کردن و هان دان": ئا [پێشگر] + فەرین a + ferîn. کەرتی دووەم خزمە لەگەڵ (.G) Freund و (.E) feiend "دۆست، هاوال"، frijōn (.Gt) "خۆش ویستن"، Friede(.G) "ئاشتی" [لە بنەڕەتدا: دۆستایەتی، تێوانخۆشی]، priyá-h (.OIn) "خۆشەویست، دلدار، خێزان [ئافرەت]"، prītí-h (.OIn) "شادی، خۆش بوون"، prijati (.Rus) "لەبار بوون"، سەر بە ریشەی **< *prāi-** **(.IE)** "خۆش ویستن، پەسند کردن، پێ خۆش بوون". لە زمانی کوردمادیدا ↑پیرە pîre ش بە مانای "ئافەرین" بە کار دێ [پیرە! کارێکی باشت کرد]. ئەم وشەیە شێوەیەکی کۆنترە لە"ئافەرین". ↑ئافرەت afret و هەروەها ↑پەری perî "بوونەوەری ئەفسانەیی جوان و هاریکار" پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە.
[تێبینی: دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا ( ل.42) "افرین" لەپێوەندی دەگەڵ ریشەی ناوبراودا لێکدراوەتەوە].

**ئاڤزیم avzem** *[ āvzem ]* - "کویرەکانییەک کە بەهاران دەزێتەوە": ئاڤ [ئاو] + زیم av + zem. کەرتی av شێوەیەکی پێشووتری aw ە لە زمانی کوردمادیدا. کەرتی زێم zem دەچێتەوە سەر یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑تزان tızan "دەرکەوتن یان کۆ بوونەوەی تەڕایی لە شوێنێکدا". ئەگەر پێوەندی بەم وشەوە بێ، ئەوا فۆنێمی t سواوەتەوە. وێ دەچێ ئەم کردارە بە سوانەوەی فۆنێمی t شێوەی ↑زانەوە zan(ewe) وەرگرتبێ کە ئەمە جیایە لە "زان" بە مانای "بە دونیا هێنان". کاتێک بۆ وێنە دەگوترێ "تەندوورەکەمان زاوەتەوە"، ئەمە چ پێوەندییەکی بە "زان، بە دنیا هێنان"ەوە نییە، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە ئاوی تێ *تزاوە*. کرداری "تزان" مانای "کێشان، راکێشان" دەبەخشێ و لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئاو و تەڕایی دەوروبەری راکێشاوە و تێیدا خڕ بۆتەوە.

2- ↑زان zan "بە دنیا هێنانی زارۆک".

**ئاقار aqar** *[ āġār ]* - "1- شوێن و جێگە 2- دەوروبەر 3- مەڵبەند و ناوچە": Acker (.G)، acre (.E)، aker (.Sw) "زەوی کشت و کاڵ، مەزرا"، agros (.Gr) "زەوی، مەزرا"، ajra-h (.OIn) "مەزرا، رووبەری هەرد"، ager (.L) "مەزرا"، سەر بە ریشەی **< *ag-** **(.IE)** "ئاژۆتن". مەزرا یان لەوەڕگە ئەو شوێنە بووە کە ئاژەڵیان بەرەو ئەوێ ئاژۆتووە و بەم هۆیەوە ناودێر کراوە.

[تێبینی: پێوەندی نێوان چەمکەکانی "زەوی و هەرد" لەگەڵ "شوێن و جێگە" لە هێندێک وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ، بۆ وێنە پاشگری "-ڵان" لە بنەڕەتدا مانای "زەوی" دەدا و کاتێک دەبێتە "بەرەڵان، نەوتەڵان، خێزەڵێن..."، ئاماژە بە شوێن و جێگەیەک دەکا کە ئەو شتانەی لێ دەست دەکەوێ].

**ئاقت aqıt** *[ āqıt ]* - "دۆشاوی خەستی ترێ": ئاقید aqîd یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر < عقد *εaqada* *(.Arb)* "خەست کردن، دۆشاو گرتن". [بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 8].

**ئاکار akar** [ ākār ] - "ڕەوشت": ئا [پێشگر] + ↑کار a + kar. مەبەست لە ئاکار سەرجەمی "کار و کردەوە"ی مرۆڤ بووە.

[تێبینی: لێرەدا نموونەیەك لە دەوری پێشگری "-ئا" دەبینین. یەکێك لە نەخشەکانی ئەم پێشگرە لە بواری وشەسازیدایە، واتا بۆ ساز کردنی وشەیەکی نوێ. وشەی "کار" کاتێك پێشگرەکە وەردەگرێ، وشەیەکی نوێی لێ بەرهەم دێ و مانایەکی جیاواز دەبەخشێ کە پێوەندی بە مانا کۆنەکەشەوە هەر دەمێنێ. "ئاکار" ئاماژە بە "سەرجەمی کار و کردەوەکان" یان "شێوەی ڕەفتار و هەڵسوکەوت" دەکا].

**ئاکام akam** [ ākām ] - "ئەنجام": دەشێ پێك هاتبێ لە ئا [پێشگر] + کام a + kam. جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑کاو² kaw "مەیل، حەز، ئارەزوو" [بە کاوەخۆ].

**ئاکنجی akıncî** [ ākınjī ] - "بنەجێ، نیشتەجێ": بەگوێرەی سەرچاوەیەك دەچێتەوە سەر < akıncı (Tur.) "هێرشبەر، تاڵانکەر" [بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 3]. ڕوون نەکراوەتەوە کە ئەم مانایە چۆن گۆڕاوە بە "بنەجێ".

**ئاکرێ akre** [ ākre ] - "ناوی شارێکی کوردستان": پێشگری ئا + کرێ a + kırê، خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کورد kurd دا باس کراون، کە ئاماژە بە پتەو و بەهێز بوون دەکەن، وەك ↑خار xar.

**ئاگا aga** [ āgā ] - "هۆش، زەین": هاگی hagî و های hay یش دەگوترێ [هایدار]. اگاه āgāh (P.)، دەشێ خزم بێ لەگەڵ acht (G.) "ئاگا" و achten (G.) "ئاگا لێبوون"، ahta (OG.)، eaht (OE.)، aha (Gt.) "ئاگا". لەوانەیە بچێتەوە سەر ڕیشەی < *ok- (IE.) "بیرلێکردنەوە، تێڕوانین".

[تێبینی: بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل.43): *ā-kāθa- (OI.)، *kāθa- "ئاگا، سەرنج"، سەر بە ڕیشەی < *kek- (IE.) "دیارکەوتن، نیشان دان"].

**ئاگر agır** [ āgır ] - "ئاور": āzar (P.)، ādur (MP.)، *atr- (OI.) سەر بە ڕیشەی < *ātr-, *āter- (IE.) "ئاگر" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" ل. 12]. دە "فرهنگ ریشەشناختی"دا وشەی سەر بەم ڕیشەیە دە زمانەکانی دیکەدا بە میناك نەهێنراوەتەوە. لەوانەیە ئەم ڕیشەیە خزم بێ یان شێوەیەکی دیکە بێ لە ڕیشەی *ēt-r- (IE.) "گەرمی، تین". ↑هەترەش hetreş "هێزی دڵ و دەروون" لەم ڕیشەوە هاتووە.

**ئاڵ1 al** [ āl ] - "لا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ halb (G.)، half (E.) "نیوە". ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "لا، ئاڵ"یشی هەبووە. ئەم مانایە دەبێ لێرەوە هاتبێ کە نیوەی شتێك بە لایەکی ئەو شتە داندراوە.

[بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی (ل. 4) دەچێتەوە سەر ڕیشەی ئێرانی کۆنی *arda- (OI.) "ئاڵ، نیوە" و خزمە لەگەڵ ardhá (OIn.) "نیوە" و árdha (OIn.) "ئاڵ"].

**ئاڵ2 al** [ āl ] - "جندۆکەی زەیستان کوژ": خزمە لەگەڵ Elf (G.)، aelf (OE.) "جندۆکەی بن هەرد". لەبەر چاوی هۆزە ژێرمەنییە کۆنەکان ئەم "گیانلەبەرانە" لە چیا و جەنگەلەکان دەژیان. وشەی alp / alb (OG.) "مۆتەکە" [جندۆکەی شەو؟] هەر لەو پێوەندییە دایە. لە زمانی کوردیدا هەر ئەم وشەیە بە شێوەیەکی دیکە، واتا بە شێوەی ↑هەل hel، مانای "فریشتەی ئاگاداری لە جەنگەڵ" دەدا.

**ئاڵ3 al** [ āl ] - "سووری کاڵ":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ڕیشەی < *ol-, *el- (IE.) "درەوشاوە، ڕووناك". دە زمانە ئەورووپییەکاندا ناوی هێندێك لە دارەکان دەچنەوە سەر ئەم ڕیشەیە، وەك Eller (G.)، Ulme (G.) و alnus (L.). ئەم ڕیشە هیندوئەوروپییە زۆرتر بۆ ڕەنگەکانی سوور و شین بەکار هێندراوە.

2- لە لایەکی دیکەوە لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 45) ئەم وشەیە لەگەڵ harda- (OI.) "سوور" بەراورد کراوە، سەر بە ڕیشەی < *sor-, *ser- (IE.) "سوور".

3-هەر لەم سەرچاوەیەدا دیسان ئەم وشەیە هەڵسەنگێنراوە لەگەڵ alāta- (OIn.) "خەڵوون"، altāre (L.) "مزگەوت، ئاورگە"، ala (Sw.) "هایسان، بڵێسەدان"، سەر بە ریشەی *(IE.) *al- >* "سووتان". ئەم ریشەیەی دوایی دەبێ دەگەڵ ریشەکانی لەسەرەوە باسکراوی *ol-, *el-* دە بنەڕەتدا هەر یەک بن. وشەی ↑ئار ar "ئاگر" لەوانەیە سەر بەم ریشەیە بێ.

**ئاڵ[4] al** *[ āl ]* - "قامکی هەرە درێژ": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑هەرە here، ↑هەرەت heret "بەرزی، ئەوج" و هەروەها alt (G.) و old (E.) "پیر" [تەمەن هەڵکشاو]، سەر بە ریشەی *(IE.) *al- >* "هەڵدان، گەورە بوون، بەرز بوون". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کاڵ kal [پیر و کاڵ]، ↑ئاڵا ala "پەرچەم، بەیداخ " [بەرز راگیراو]، ↑هەلاندن helandın "بڵیند کردن"، ↑حەلحەلە ħelħele "تەشقی ئاسمان"، ↑هەلهلین helhılîn "1- زۆر گەیشتن و بڵ بوونی میوە 2- زۆر پیر و کەنەفت بوون" و ↑حەلکی ħelkî "هێژا، بەنرخ" [عالی، بەرز]. وشەی عالي ɛalī (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**ئاڵ[5] al** *[ āl ]* - "کول بوونی ددان بە ترشی": هەر دوو وشەی "ئاڵ" و ↑کول[4] kul دەشێ دوو شێوە لە یەک وشە بن و خزم بن دەگەڵ ↑کاڵ kal "کەمرەنگ، رووناک" و hell (G.). وشە ئەڵمانییەکە مانای "رووناک، کاڵ" دەدا و هەروەها "زیرەک، بەهۆش، بە ئاگا". مانای ئاڵ بوون(ەوە) یان کول بوونی ددان بریتییە لە "بەئاگا هاتن"ی ددان. دە دۆخی ئاساییدا مرۆڤ هەست بە ددانەکانی ناکا [ددانەکان بێدەنگ و بێ هەست و خوستن]، بەڵام بە خواردنی شتی زۆر ترش ددانەکان هەست پێ دەکرێن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *kel-, *kle- >* "بانگ کردن، هەرا کردن، قیژاندن". دە زمانی ئەڵمانی ناویندا hel (MG.) بە مانای "دەنگ بڵیند" و hellen (MG.) بە مانای "دەنگ دانەوە، زرینگانەوە" بەکار هاتوون. مەبەست لە رەنگی کاڵ، رووناک و بریقەدار دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە ئەم رەنگە هاوار دەکا، واتا رەنگیکی قیژەکەرە. دە زمانی کوردمادیدا چەمکی هاوار کردن لە پێوەندی دەگەڵ هێندێک جۆری ژان و ئێش بەکار دەهێندرێ و بۆ وێنە دەبێژن "ددانم دەزیرێنێ". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑ئاڵە2 ale "پەڵەی دەم وچاوی ژنی زگپڕ" و ↑خاڵ xal پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن.

**ئاڵا ala** *[ ālā ]* - "پەرچەم، بەیداخ": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑ئاڵ al "قامکی هەرە درێژ" و چەندین وشەی دیکە بە مانای "بەرز، بڵیند". ئاڵا شتێکە هەڵدەکرێ و بەرز رادەگیرێ.

**ئالاستن alastın** *[ ālāstın ]* - "لێستنەوە": ئالستن alıstın یش دەگوترێ: ئا [پێشگر] و لاستن a-lastın. بڕوانە ↑لێستنەوە lestın(ewe).

**ئالاڤ[1] alav** *[ ālāv ]* - "گڕ، بڵێسە": جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ ↑ئاڵ3 al "درەوشاوە".

**ئالاڤ[2] alav** *[ ālāv ]* - "ئامێر، دەزگا": وێ دەچێ خزم بێ لەگەڵ ↑ئامێر amer [کۆنتر arme] و ↑هەرمە herme "شان و پیل".

**ئالان alan** *[ ālān ]* - "ناوی مەڵبەندیکی کوردستان": ↑ئاران aran "ناوچەی دەشتەکی، گەرمەسێر، گەرمێن".

**ئاڵتوون altun** *[ āltūn ]* - "زێر": ئەم وشەیە وەک وشەیەکی تورکی ناوزەد کراوە. بەڵام وشەکە خزمە دەگەڵ یان وەرگیراوە لە golden (G.)، guldīn (OG.)، gylden (OE.) "زێڕین". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑زێڕ zer و دواجار دەگەڵ ↑زەرد *zerd*. وشەکانی yellow (E.)، *hári-h* (OIn.)، helvus (L.) "زەرد" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**ئاڵشک alışk** *[ ālıšk ]* - "زوقم، خووسار": لەوانەیە پێک هاتبێ لە ئاڵ al(ı) + پاشگری گچکاندنی شک şık. "ئاڵ" جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گلێرە gıl(l)ere "تەزرە، گلەسەهۆڵ"، سەر بە ریشەی *(IE.) *gel- >* "سارد بوون(ەوە)، بەستن لە سەرمان، پێکەوەنووسان، تۆپەڵە بوون".

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی g لەم وشەیەدا هەڵی سەنگینە لەگەڵ "ئاڵتوون"].

ئالف **alıf** [ *ālıf* ] - "گیای لەوەڕ": پێشگری ئا + لف lıf + a. کەرتی سەرەک وشەکە، واتا لف lıf خزمە لەگەڵ ↑لەوەڕ lewer و Laub (G.)، leaf (E.) "گەڵای داران"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "داڕنین، پچڕین" و دە بنەڕەتدا مەبەست داڕنینی گەڵا بۆ لەوەڕ و دەرخوارد دانی ئاژەڵ بووە. ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە علف ɛalaf (Arb.).

ئاڵفتە **alıfte** [ *ālıfta* ] - "هۆگر، ئاڵوودە": ئالفتن āloftan (P.) "ئاشق، پەریشان، شێواو". وشەکە وەک کردار لە زمانی کوردمادیدا نەماوە و لە زمانی فارسیشدا تەنیا لە فەرهەنگەکاندا بەدی دەکرێ و لە زمانی رۆژانەدا بەکار نایە. ئەم وشەیە وشەیەکی رەسەنی کوردمادی و فارسییە بە مانای "خۆش ویستن، پێ خۆش بوون". پاشان لەم مانایەوە لە زمانی کوردمادیدا مانای "هۆگر و ئاڵوودە بوون" بە کارێک یان شتێک پەیدا بووە کە لە مانای ئەسلی خۆش ویستن زۆر نیزیکە. دە زمانی فارسیدا مانای پەریشان و شێواو بوون پەیدا بووە کە ئەمەش لە خۆش ویستن وئاشق بوونەوە هاتووە. وشەکە پێک هاتووە لە پێشگری ئا + لۆفتە lıfte + a. بنەوشەی لف -lıf [یان دە فارسیدا -lof] خزمە دەگەڵ lieb (G.)، liob (OG.)، liufs (Gt.)، lief (E.)، ljuv (Sw.) "لەبەردڵان، خۆش ویستراو"، lieben (G.)، love (E.)، ljubit (Rus.) "خۆش ویستن"، libere (L.) "حەز کردن، تاسەکردن"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *leubh-*** "خۆش ویستن، حەز کردن، دڵ بۆچوون". [دە "فەرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 46) وشە فارسییەکە هەر لەم چوارچێوەیەدا شی کراوەتەوە]. لە زمانی کوردمادیدا وشەی "ئاڵوودە بوون" بە مانای هۆگر بوون و خوو گرتن بە شتێک بە کار دێ، وەک ئاڵوودە بوون بە قومار، مەی، جگەرە و هتد. ئەم وشەیە هەمان ئاڵفتە alıfte یە کە گۆڕاوە و بووەتە ↑ئاڵوودە aldue و پێوەندی بە وشەی فارسی ālūde (P.) "پیس بوون"ەوە نییە.

ئاڵقە **alqe** [ *ālqa* ] - "خەلەک، بازن": هاڵقە halqe ش دەگوترێ. حلقە halqe (P.). بە ڕواڵەت وێ دەچێ وشەکە لە زمانی عەرەبی وەرگیرابێ، بەڵام دە راستیدا وشەکە لە زمانی کوردمادی یان فارسییەوە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و پاشان شێوە عەرەبیندراوەکەی [عەرەبی کراوەکەی] هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و فارسی. دوو شێوەی دیکە هەر لەم وشەیە لە زمانی کوردمادیدا بریتین لە ↑خەلەک [خەل + ەک (پاشگر)] xelek [xel + ek]، هەروەها هەلەک helek کە دەبێ شێوەی کۆنتر و رەسەنتری وشەکە لە زمانی کوردمادیدا بن و لەوانەشە پێشتر خەلەکە xeleke یان "هەڵەکە heleke" بووبێ. ئەم وشەیە دە زمانی عەرەبیدا کراوەتە حلقة ħalaqa (Arb.) و پاشان وەک هاڵقە halqe هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی. وەک دەزانین پاشگری -ek یان -eke پاشگرێکی چالاکی زمانی کوردمادییە و دە گەلێک وشەدا دەردەکەوێ. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑هاڵان halan [لەدەور هاڵان] و هالە hāle (P.) "خەرمانەی مانگ، تیشکی دەوری مانگ".

ئاڵقەزوونە **alqezune** [ *ālqazūna* ] - "ئاڵقە و زوونە": ئاڵقە + زوونە alqe + zune. کەرتی زوونە دەشێ هەمان↑ زمان zıman (زوان zuwan) بێ و مەبەست ئەو ئەو ئاسنە درێژووکەی ناو ئاڵقەکەیە کە وەک زمانەیەک دەچێ.

[ئەم وشەیە دە "فەرهەنگی هەرمان"یشدا (ل.117) بەم جۆرە لێک دراوەتەوە].

ئاڵگ **alıg** [ *ālıg* ] - "1- لوو 2- شوێنی برین": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئاڵوو alu "گرێ و خڕایی سەر یان ناو لەش". مانای دووەمی وشەکە لێرەوە پەیدا بووە کە شوێنی برین، ئەگەر برینەکە تا ڕادەیەک قووڵ بێ، لەسەر لەش خڕاییەکی وەک لوو دروست دەکا.

ئالنگ **alnıg** [ *ālıng* ] - "خڕ بوونی بن هەنگڵ": بڕوانە ↑ئاڵگ alıg "لوو" و هەروەها ↑ئارێنج arenc "خڕ بوونی بن هەنگڵ"، ↑ئاریان aryan "زیبکە و کوان لە لەش هاتن".

ئاڵوو **alu** [ *ālū* ] - "بادامەی گەروو، لەوزە": ئاروو arû ش دەگوترێ. جگە لەم وشەیە چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەن کە مانای "کوان، زیبکە و دومەڵ" دەبەخشن، وەک ↑ئالنگ alnıg یان

↑ئارێنج arenc "خڕ بوونی بن هەنگڵ"، ↑ئاریان aryan "زیبکە و کوان لە لەش هاتن"، ئەم وشانەی سەرەوە تێکڕا مانای "خڕ بوون" دەگەیەنن و دەشێ بچنەوە سەر ریشەی < *el- (IE.) "چەمان". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑هەڵووچە heluçe [عەلووکە، گچکە ئاڵوو].

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ئەو وشانەی مانای "خڕ بوون" دەگەیەنن، دەچنەوە سەر چەند ریشەک و یەک لەوان ئەم ریشەی سەرەوەیە. دەستەیەکی دیکە لەو وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *geu- (IE.) "چەمانەوە"، وەک گۆ، گوێز، گوێزینگ، گۆیژە، گۆج، گۆد، گود "خڕ، گرۆڤەر"، گۆک یان گەوک "خونچەی دار"، کۆک و هتد].

**ئاڵووباڵوو alubalu** [ *ālūbālū* ] - "بەڵاڵووک": البالو albalu (P.). ئال (وو) + باڵوو al (u) + balu. کەرتە وشەی "باڵوو" دە وشەی "ئاڵووباڵوو"دا خزمە دەگەڵ ↑بۆل bol "دەنکەترێ" و ↑باڵۆکە baloke و هتد. هەردووک وشەکە ئاماژە بە خڕایی و گرمۆڵەیی دەکەن. کەرتی یەکەم، واتا ئاڵوو alu پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑ئاڵ al "سوور". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "سوورەبالوو"، "بۆلی ئاڵ"، "تۆپەڵەی سوور".

2- ↑هەڵووچە heluçe، زەردالو zerdalu (P.) "قەیسی" [دەبنەڕەتدا: ئاڵووی زەرد]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ وشەی ↑ئاڵوو alu "بادامەی گەروو" و ئاماژە بە شتی "خڕ" دەکەن. ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، ئەوا هەردووک کەرتی وشەکە یەک مانا دەبەخشن، وەک لە وشەی "بانگاواز"دا [بانگ و ئاواز] و چەندین وشەی لەم شێوەیە.

**ئاڵوودار aludar** [ *ālūdār* ] - "داری دارەڕا": دە بنەڕەتدا مەبەست "خڕەدار" واتا داری ئوستوانەیی [ئەستوونی] یە، بەپێچەوانەی داری داتاشراوی تەختکراو]. ئەم وشەیە لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی < *el (ei-) (IE.) "چەمان" و ببێتە خزم دەگەڵ ↑ئاڵوو alu "بادامەی گەروو ، لەوزە". لە لایەکی دیکەوە ریشەی < *uel- (IE.) "سووڕان"یش لەم پێوەندییەدا جێی هەڵسەنگاندنە. لەم بارەوە بڕوانە ↑ورەس wıres "ئاڵوودار".

**ئاڵوودە alude** [ *ālūda* ] - "خووگرتوو، تێکەڵاو": ئەم وشەیە پێوەندی نییە بە الودە ālūde (P.) "پیس، شتی پیس وێکەوتوو" و الودن ālūdan (P.) "پیس بوون، تیهەڵسووران"، بەڵکوو شێوەی گۆڕدراوی ↑ئاڵفتە alıfte یە بە مانای "هۆگر، خوو گرتوو".

[لەباری ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکانی f و u هەڵی سەنگینە دەگەڵ گفتن goftan (P.) و گوتن gutın ی کوردمادی یان جفت ğoft (P.) و جووت cut یان "شفتی" و "شووتی"].

**ئالوولە alule** [ *ālūla* ] - "کۆڵانی تەنگ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ allée "شەقامی نێو داران". ئەم وشە فەرانسییە دە بنەڕەتدا بە مانای "رەوت، پیاسە"یە و دەچێتەوە سەر aller (F.) "رۆیشتن" و ئەمەش ریشەی لاتینی هەیە. وشەکوردمادییەکە لەوە دەچێ وەرگیراو بێ.

**ئاڵووێر aluwer** [ *ālūwer* ] - " مامەڵە": ئاڵ + وێر al + wer . هەردووک وشەکە لە زمانی تورکی وەرگیراون، "ئال" لە *(Tur.) almaġ* "ستاندن" و "وێر" لە *(Tur.) wermaġ* "دان".

**ئاڵۆ alo** [ *ālo* ] - "خاڵۆ": شێوەیەکی دیکە لە خاڵۆ xalo [بڕوانە ↑خاڵ xal]. لەوانەیە شێوەی کۆنتری وشەکە بێ.

**ئاڵۆز aloz** [ *āloz* ] - "تێکەڵ پێکەڵ، لێکهاڵاو": هاڵۆز haloz یش دەگوترێ. ئاڵ + ئۆز al + oz. بنەوشەی ئاڵ al / هاڵ hal دەچێتەوە سەر کرداری ↑هاڵان halan [لێکهاڵان]، کەرتی ↑ئۆز oz پاشگرە.

**ئاڵۆزان alozan** [ *ālozān* ] - "لێکهاڵان، تێکەڵ پێکەڵ بوون": ئاڵۆزکان alozkan یش دەگوترێ کە تێیدا ناوگری ک k بەدیار دەکەوێ. ئەم ناوگرە وەک ئامرازی جەخت کردن دێتە ئاراوە. [وەک بزرکان، پەشۆکان، خلیسکان، دامرکان و هتد]. هەروەها ئاڵزین alzîn یش دەگوترێ. کردارەکە لە وشەی ↑ئاڵۆز

aloz وەرگیراوە و ئەمیش خۆی پێک هاتووە لە بنەوشەی ئاڵ -al سەر بە کرداری ↑*هاڵان halan* [ئاڵان، لێک ئاڵان] و پاشگری ↑ئۆز oz.

[دە "فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی"دا (ل. 5) وشەی "ئاڵۆز" برداوەتەوە سەر ریشەی سریانی -l-s-' (Syr.) "گوشین، پاڵ پێوەنان، تەنگاو کردن". وێ ناچێ ئەم وشەیە وشەیەکی وەرگیراو بێ، پێوەندی وشەکە بە کرداری ئاڵان alan (هاڵان، لێکهاڵان) زۆر ئاشکرایە].

**ئاڵۆش aloş** [ *ālош* ] - "خورووی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئاڵە[1] ale.

**ئالها alha** [ *ālhā* ] - "ئارەزوو، تاسە":لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑خولیا xulya.

**ئاڵە 1ale** [ *āla* ] - "نەخۆشییەکی پێستە کە لە ناوگەڵ پەیدا دەبێ":

1- لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ: ↑ئاڵگ alıg "1- لوو 2- شوێنی برین" و ↑ئاڵوو alu "گرێ و خرایی ناو لەش" و ↑ئاریان aryan "زیبکە و کوان دەردان".

2- دە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا Galle (G.) و gall (E.) بە جۆرێک زیپکە و برین دەگوترێ و دەچنەوە سەر galla (L.) "مازوو". لەوانەشە وشە کوردمادییەکە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**ئاڵە 2ale** [*āla*] - "پەڵەی دەم وچاوی ژنی زگپڕ": شێوەیەکی دیکە لە ↑خاڵ xal.

**ئاڵەک alek** [ *ālak* ] - "گوپ، ڕوومەت، گونا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ↑ئاڵوو alu سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمان، خوار بوون". شیاوی باسە وشەی "گونا"ش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە کە ئەویش هەمان مانا دەبەخشێ.

**ئاڵەکۆک alekok** [ *ālakok* ] - "ئەسپینگی بنکدار": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ↑ئاڵوو alu. ↑کۆک[2] kok مانای "ریشە" دەدا و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "بنخڕ، ریشەی خڕ".

**ئاڵەکە** [ *ālaka* ] - "نەخۆشییەکی چاو":

**ئالیک alîk** [ *ālīk* ] - "لەوەڕ، تفاق": دە زمانی فارسیدا علیق εalīq (P.) ئەم مانایانەی بۆ کراوە: خۆراک، لەوەڕ، جۆ، دانەوێڵە". پێ دەچێ ئەم وشەیە بە ئەسڵ کوردمادی بێ و خزم بێ دەگەڵ ↑گاڵ gal "هەرزنەتاڵە". لەوانەیە وشەی "ئالیک" دە زمانی عەرەبیدا گۆڕدرابێ بۆ علیق εalīq (Arb.).

**ئام am** [ *ām* ] - "مام" [ئامۆژن]. خزمە دەگەڵ یان وەرگیراوە لە عم εam (Arb.) "مام". ام umm (Arb.) "دایک" و Oma (G.) "نەنک" [بە زمانی زارۆک] پێوەندیان بەم وشەوە هەیە.

[تێبینی: ئەو وشانە کە بۆ ناوی کەسوکار بەکار دێن، هێندێک جار ماناکانیان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە دەگۆڕدرێ. بۆ وێنە "دایک، دایە" دە فارسیدا بووەتە *دایی* "برای دایک". دە زمانی فارسیدا بە دایک دەگوترێ "مام" (یان ماما، مامان) و دەکوردمادیدا "مام" دەبێتە"برای باوک". دە ئینگلیزیدا dad (یان daddy) ناوە بۆ باوک، دە کوردمادیدا "دادە" ناوی خوشکی گەورەیە. دە عەرەبیدا "اب" (ابو) ناوی باوکە، دە کوردمادیدا "ئاپ" (ئاپۆ) ناوێکی دیکە بۆ "مام" ە. دە کوردمادیدا "کوڕ" ناوی زارۆی تێرینەیە، دە ئینگلیزیدا girl زارۆی مێیینەیە. دە کوردمادیدا "نەوە" زارۆی فرزەند"ە، دە ئەڵمانیدا Neffe دەبێتە "کوڕی خوشک، کوڕی برا"].

**ئامادە amade** [ *āmāda* ] - "ساز، تەیار": امادە āmāde (P.)، ā-māta- (OI.) سەر بە ریشەی > **mā(y)-* "ئەندازە گرتن، پێوان، هەڵسەنگاندن" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" ل. 50]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑پێوان pewan، ↑مەزەندە mezende، ↑مات mat [هەڵماتین] و ↑*مێزاندن mêzandın* "تەماشا کردن" و هتد. ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتری > ****mē-* (IE.)** "گەڕان، ڕێ پێوان، ڕێگە بڕین". وشەی ↑مانگ mang لەم ریشە کۆنەوە هاتووە.

**ئاماژە amaje** [ *āmāža* ] - "ئیشارە": پێک هاتووە لە پێشگری ئا + ماژە maje + a. خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مێزاندن mêzandın "تەماشا کردن"دا باس کراون.

**ئامال amal** [ *āmāl* ] - "نیزیک، ویچوو": دەگەڵ ناوی رەنگەکان دێ، وەک ئامالّ سپی، ئامالّ سوور. خزمە دەگەڵ ↑ئاوالّ awal "دۆست، یار" یان باشتر بڵێین شێوەی کۆنتری ئەمەیە. رەنگی ئامالّ سپی دەبنەڕەتدا واتا رەنگێک کە ئاواڵی رەنگی سپییە و لەو دەچێ.

[تێبینی: کاک عەلی نانەوازادەش ئەم وشەیەی ئاوا لێک داوەتەوە (فەرهەنگی هەرمان، ل. 124)].

**ئامان1 aman 1** [ *āmān* ] - "قاب و قاچاخ": خزمە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑حەمرین ħemrîn دا باس کراون، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەرد". جێی ئاماژەیە کە وشەکانی ↑جام *cam*، ↑هەوەڕ hewer [هەوڕ hewır] "ئێربار، دەفری لە سواڵەت": یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست قوڕی رەقکراو و بەردکراوە.

**ئامان2 aman 2** [ *āmān* ] - "پارێزگاری، پارێزراوی" [دە ئامانی خودای دابی واتا خودا بتپارێزێ]. ئەمان eman یش دەگوترێ. [ ئەمان لە دەست تۆ واتا لە دەست تۆ پاراستنم دەوێ]. وشەکە لەوانەیە لە عەرەبییەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردمادی، بەڵام ریشەکەی بۆ زمانی لاتینی دەگەڕێتەوە و لە immunis (.L) وەرگیراوە بە مانای "ئازاد لە ئەرک، لە باج و خەراج پارێزراو". وشەکە دواتر دە زمانە ئەورووپییەکانیشدا مانای گشتی "پاراستن، پارێزگاری، پارێزراوی" وەرگرتووە. وشەکانی وەک immun و Immunität دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر ئەو وشە لاتینییە.

**ئامانج amanc** [ *āmānj* ] - "هەدەف، نیشانە، مەبەست": ئارمانج armanc یش دەگوترێ. اماج āmāj (.P). پێک هاتووە لە پێشگری ئا + ماج a + maj. فۆنێمەکانی r و n لە هەر دوو شێوەی وشە کوردمادیەکەدا زێدەن و خزاونە ناو وشەکەوە. کەرتی "ماج" خزمە لەگەڵ ↑مت mıt، ↑هەڵماتین (hel)maten "مێشێن" [کایەی نیشانە گرتن، هەدەف گرتن]. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑مێزاندن mêzandın "تەماشا کردن".

[تێبینی1: سەبارەت بە زێدەبونی فۆتیمی n دە وشە کوردمادییەکەدا هەڵی سەنگینە لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر "مەنگوڕ"دا باس کراون. تێبینی 2: زۆر وێ دەچێ کە هەردوو وشەی ارم arm (.P) "نیشانە" و ارمان arman (.P) "هەدەف" لە زمانی فارسیدا وشەی تازە بن کە لە دەیەکانی رابردوودا لە وشەی کوردمادی ئارمانج armanc وەرگیراون].

**ئامایی amayî** [ *āmāyī* ] - "کوێری": دەشێ خزم بێ دەگەڵ hamo (.OG) "تێپێچ، بەرکَ، پۆشش" و Himmel (.G) "ئاسمان" [دەبنەڕەتدا: سەرپۆشی هەرد، تاقی زەوی] سەر بە ریشەی *(IE.) *kem- >* "داپۆشین، لێهاڵاندن". ئەم وشانەخزمن دەگەڵ↑*جامە came* و دە پلەیەکی دوورتریشدا خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لە ژێر ↑ئاسمان asman دا باس کراون. لەم تێڕوانینەوە "ئامایی" واتا داپۆشران یان داپۆشراوی (چاو).

[تێبینی 1: لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "کوێر" [کۆر]. تێبینی 2: وەک لەژێر وشەی "ئاسمان" و وشەکانی هاوپێوەندیدا باس کراوە، ئەو وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەرد" و ریشەیەکی دوورتریش بە مانای "تیژ". ئەم وشانە بە گوێرەی فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی DUDEN ی ئەڵمانی خزمایەتی پەیدا دەکەن دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە و ریشەکەیان بە مانای "داپۆشین". ئەم پێوەندییە دەشێ وەسا شیرۆڤە بکەین کە مرۆڤەکانی کەونارا سەرەتا ئاسمانیان وەک تاقێک یاخود میچێکی بەردین لەبەرچاو گرتبێ کە هەردی داپۆشێوە (وەک تاقی ناو ئەشکەفتێک]. ئا لەم مانایەوە دەشێ پاشان مانای "داپۆشین" سەری هەڵدابێ].

**ئامباز ambaz** [ *āmbāz* ] - ئامبازی یەکتر بوون واتا بەرەویەک چوونی دوو کەس بە مەبەستی یەکتر دە باوەش گرتن. هەروەها "دە ئامێز گرتن" [*ئامێز *ambez*، *ئامباز *ambaz*] هەیە بە مانای "دە باوەش گرتن". ئام + باز am + baz. ئام am شێوەیەکی دیکەیە لە هام / ↑هاو ham / haw بەمانای "یەکتر". باز baz یش دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑باسک basık "قۆڵ" [بازوو (.P)]. ئامباز بوون یان دە ئامێز گرتن دە بنەڕەتدا بە مانای لێهاڵاندنی باسکەکان لە دەوری کەسێک بووە.

[لە باری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ umarmen (G.) "دە ئامێز گرتن" کە لە وشەی Arm (G.) "باسک" وەرگیراوە].

**ئامراز amraz** [ *āmrāz* ] - "ئامێر، دەزگا":

1- لەوانەیە گۆڕدراوی وشەی پارسی ابزار abzār (P.) بێ، دەکوردیدا دەبێتە ↑هەوجار hewcar.

2- یان لەوانەیە پێک هاتبێ لە دوو بەشی ئامر + ئاز amır + az. کەرتی یەکەم دەشێ شێویەکی دیکە بێ لە ↑ئامێر amer یان ئاموور amur. کەرتی یەکەم، واتا ئاز az-، لەوانەیە ئەک ek- بووبێ کە هەم پاشگری گچکاندنە و هەم پاشگری دروست کردنی ناوی شتومەک وەک خەڕەک، دەستەک، دۆشەک [دۆشەگ] وهتد.

**ئامک amık** [ *āmık* ] - "پوور": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئامە ame "دایک".

**ئاموور amur** [ *āmūr* ] - "هەوجار، ئامێری کێڵان": خزمە دەگەڵ↑ئامێر amer. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑هەرمە herme "شان و پیل" [جێگۆڕکێی فۆتیمی r].

**ئامووشو amûşo** [ *āmūšo* ] - "هاتوچۆ": ↑هامووشۆ hamûşo ش دەگوترێ. ئام + u + am + شۆ şo. شێوەیەکی کۆنترە لە هاتوچۆ hatuço، [بڕوانە ↑هاتن hatın و ↑چوون çun].

**ئامۆژگاری amojgarî** [ *āmožgarī* ] - "ڕێنوێنی، فێرکاری": اموزگار āmūzgār (P.) "مامۆستا، فێرکار"، سەر بە کرداری اموختن āmūxtan (P.) "فێر بوون، فێر کردن" [بنەوشەکە دە فارسیدا اموز- āmūz ە]. دە زمانی کوردمادیدا کرداری سەر بەم بنەوشەیە بە چەند شێوەی ↑هەڤۆتن hevotın، ↑هەوسین hewsîn، ↑هۆژان hojan دەبیندرێ. وشەکە دەبێ دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا ئامۆژین *amojîn** بووبێ و پاشان ئەو شێوانەی دیکەی لێ پەیدا بووبێ. بنجی "ئامۆژ" خۆی پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] + مۆژ moj + a. کەرتی مۆژ moj لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ music "مۆسیقا" دە زمانە ئەورووپییەکاندا. وشەی music ریشەی یونانی هەیە و دە بنەڕەتدا دەچێتەوە سەر moūsa (Gr.) "هونەر، زانیاری، پەروەردەکاری ورد و ناسک". ئەم وشە یۆنانییە دەبنەڕەتدا ناوی خواژنێکی پارێزەری هونەر یاخود زانستە جوانەکان بووە. وشەی ↑مۆزە moze [مۆزەخانە] ش کە لە زمانە ئەورووپییەکانەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردمادی، هەر سەر بەو ریشە یۆنانییە.

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 54) وشەکە بردراوەتەوە سەر یەکێک لە دوو ریشەی *mauk-* "شل کردن، بەردان" یان *auk-* "ئاخافتن، قسە کردن"].

**ئامە ame** [ *āma* ] - "دایک": خزمە دەگەڵ Oma (G.) "داپیرە، نەنک" [بە زمانی زارۆک] و هەروەها ام umm (Arb.) "دایک" وعم ɛamm (Arb.) "مام". دە زمانی کوردمادیدا ئامۆ amo بە مانای "مامۆ" و ↑ئامک amık بەمانای "پوور" یش هەن. لەوانەیە ئەم دوو وشەیە لە عم-ی عەرەبی وەرگیرابن و لەوانەشە پێوەندییان بە ئامە "دایک"ەوە هەبێ کە وێ دەچێ وشەیەکی سەربەخۆ ی کوردمادی بێ.

[تێبینی: ناوی کەسوکار (کەسانی سەر بە بنەماڵە) زۆرجار لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە یان هەر لەناو خودی زمانێکدا گۆڕانیان بەسەردادێ، بۆ وێنە دە کوردمادیدا "دایە" هەیە و هەر ئەم وشەیە دە فارسیدا دەبێتە "دایی" بەمانای خاڵ. وشەی "خاڵ" واتا برای دایک، دە فارسیدا دەبێتە "خالە" بە مانای خوشکی دایک. "مام" دە زۆربەی زمانە هیندوئەورووپییەکاندا مانای "دایک" دەدا، کەچی دە کوردمادیدا بۆ برای باوک بە کاردێ. "دادە" دە کوریدا دەبێتە خوشکە گەورە، کەچی dad دە ئینگلیزیدا بۆ "باوک" بەکاردەهێنرێ].

**ئامەد amed** [ *āmad* ] - "شاری هەرە مەزن لە باکووری کوردستان": ئامێد amed یش دەگوترێ. ناوێکی کۆنە، دە ویکیپێدیا بە زمانی ئەڵمانیدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەم ناوە لە سەرچاوە و زمانە کۆنەکاندا بەکار هاتووە. هەروەها ئاماژە بەوە کراوە کە ئەگەرچی کوردکان خۆیان ئەم ناوە بە ناوی "ماد"ەوە گرێ دەدنەوە، بەڵام پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک لەتیوان ئەم دوو وشەیەدا لە ئارادا نییە. وەک لە چەند

جێگای دیکە لەم فەرهەنگەدا و لە پێوەندی دەگەڵ چەندین وشەی دیکەشدا باس کراوە، بە داخەوە زۆرێک لە لێکۆڵەرە ئەورووپییەکان، کاتێک باس دێتە سەر کورد، ئیتر ئەخلاق و زانست لەبیر دەبەنەوە و دەبنە کاسەی داغتر لە ئاش بۆ داگیرکەرانی کوردستان. ئەوان لەپێناو بەرژەوەندییە ئابوورییە قرێژەکان و لەژێر کارتێکەری شۆڤینیزمی داگیرکەرانی کوردستاندا زۆرێک لە باس و خواسەکانی پێوەندیدار بە کورد و کوردستان وەها چەواشە دەکەن کە کورد دەستی لە هەنبانە دەر بچێ و چی بەر نەکەوێ. نووسەرانی ئەم بۆچوونەی سەرەوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بە هیچ بەڵگە، شیمانە یان گریمانەیەکی دیکە لەسەر وشەی "ئامەد" بکەن، پێوەندی ئەم وشەیە بە "ماد" رەت دەکەنەوە! ئێمە لەو لێکۆڵەرە ویژدان مردووانە دەپرسین، ئەگەر ناوی "ئامەد" لە "ماد"ەوە نەهاتووە، ئەی لە کۆێرِا هاتووە؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێ بۆچووتێک رەت بکاتەوە، بێ ئەوەی بە بەڵگەوە یان لانی کەم بە شیمانە و گریمانەیەکی بەهێز بۆچووتێکی دیکە بخاتە روو؟ بە پێچەوانەی بۆچوونی دژەکوردی ئەو لێکۆڵەرانە، وشەی ئامەد [ئامێد] وشەیەکی سەر بە زمانی مادە و ئەم وشەیە لە شوێنانی دیکەش لە کوردستان بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە شاری ئامێدی amedî لە باشووری کوردستان و گوندی ئامێد amed لە تێوان مەهاباد - سەردەشت. هەروەها بەشیمانەیەکی بەهێز ناوی شارەکانی ئامووده amude لە رۆژئاوای کوردستان و هەمەدان hemedan "پێتەختی ماد" پێوەندییان بە "ماد"ەوە هەیە. وشەی ئامەد amed [ئامێد amed] لە دوو کەرت پێک هاتووە: پێشگری ئا + مەد/ مێد a + med/ med. پێشگری ↑ئا[2] -a یەکێک لە پێشگرە کۆنەکانی زمانی کوردمادییە کە لە دەیان وشەی کوردمادی و فارسیدا بەرچاو دەکەوێ، وەک ئاشنا aşına (ئا- شنا، سەر بە کرداری ناسین، شناسین)، ئاژەڵ ajel (ئا- ژەڵ، سەر بە کرداری ژین)، ئاخورِ axur (ئا- خورِ، سەر بە کرداری خواردن)، ئالاستن alastın(ئا- لاستن، شێوەیەکی دیکە لە لێستنەوە)، ئاواڵە awale (ئا- واڵە، شێوەیەکی دیکە لە والا، ڤالا)، ئاواز awaz (ئا- واز، خزمە دەگەڵ وشە، وێژە، بێژتن) و هەروەها گەلێک وشەی دیکە کە لە ژێر پیتی a لەم فەرهەنگەدا هاتوون. ئەم شێوە دارِشتنە لە ناوی شار و ناوچەکانی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە ئاکرێ akre [ئا- کرێ a- kre]. بنجی ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑خار xar "سەخت، پتەو" و هەروەها ↑کورد kurd. وشەی "ئاکرێ" خۆی خزمە دەگەڵ هەکاری hekarî و لەوانەیە پێشتر یەک وشە بووبن [هە- کاری he- karî]. گومان لەوەدا نییە، بێتوو چاوێک بە ناوی شار و گوند و ناوچەکانی کوردستان و هەروەها "ئێران"ی ئەمرِودا بخشێنین، دەتوانین چەندین ناوی دیکەش لە چەشنی ئەو ناوانەی سەرەوە بدۆزینەوە.

**ئامێر amer** *[ āmer ]* - "ئامراز": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئامورِ amur "ئامرازی کێڵان" و خزمە لەگەڵ ↑هەرمە *herme* "شان و پیل".

[تێبینی: دە زمانی فارسیشدا وشەی ابزار ebzar (.P) "ئامراز، ئامێر" خزمە دەگەڵ هەوجارِ hewcar ی کوردمادی کە ئەویش مانای ئامورر دەدا].

**ئامێز amez** *[ āmez ]* - "باوەش": خزمە دەگەڵ ↑ئامباز ambaz.

**ئامێژە ameje** *[ āmeža ]* - "هەوێن، ئامیان": شێوەیەکی دیکە لە↑ ئامیان amyan. خزمە دەگەڵ ↑*ئامێتە* *.amete*

**ئان an** *[ ān ]* - "دەم، وەخت": حان ĥan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هەنووکە henuke.

**ئانادۆڵ anadol** *[ ānādol ]* - وشەیەکی یۆنانییە: < *(Gr.) anatole* "خۆرهەڵات".

**ئانقەست anqest** *[ ānqast ]* - بە ئانقەست واتا بە مەبەست، لە زمانی عەرەبی وەرگیراوە: < *عن قصد* *.(Arb.) εan qasd*

**ئانگژ angıj** *[ āngıž ]* - "گژ": ئانگژا بوون واتا بەگژدا چوون. ئا [پێشگر] + ن [ناوگر] + گژ gıj + n + a. وەک دەبینین وشەکە هەر↑ گژ gıj ە کە پێشگری ئا a ی وەرگرتووە و دەنگی n یشی وەک ناوگر تێ

کەوتووە. فۆتیمی n زۆرجار دەکەوێتە ناو وشەکان، لەنێوان بزوێنی ئا a و ئە e و هێندێک فۆنێمی وەک گ g، ج c دا، بۆ وێنە تاج / تانج، گاو/ هەنگاو، جنین/ ئەنجنین و هتد.

**ئانی anî** *[ ānī ]* - "هەنێ، نێوچاوان":↑هەنێ henê.

**ئانیسک anîsk** *[ ānīsk ]* - ↑هەنیسک henîsk.

**ئانیشک anîşk** *[ ānīšk ]* - "شوێنی چەمانەوەی باسک": ارنج āranj (P.). دە زمانی کوردمادیدا پێشتر ئارنیشک arnîşk بووە، بەڵام دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا r سواوەتەوە .خزمە دەگەڵ Elle (G.)، elina (OG.)، eleina (Gt.)، ell (E.)، eln (Sw.)، گشتیان بەمانای " لای خوارەوەی قۆڵ، لە ئانیشک بە خوارەوە". دە هێندێک لە زمانەکاندا هەر بە مانای "ئانیشک" دێ، وەک ulna (L.)، ōlena (Gr.)، aratni-h (OIn.). دە زمانی ئیرلەندی کۆندا uile (OIr.) بە مانای "گۆشە" هاتووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *el (ei)- >** "چەمانەوە".

**ئانین anîn** *[ ānīn ]* - "هێنان": هانین hanîn و ↑هێنان henan یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ -nay (OP.) و (Av.) "بەرێوە بردن، ئاژۆتن"، nīdan (MP.) و ānīdan (MP.) "ئانین، هێنان". [بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی - ئینگلیزی، ل. 6]. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە کرداری ↑شاندن şandın "هەناردن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "رۆیشتن، گەڕان، ئاژوان". کرداری ↑هەناردن henardın یش لەوانەیە هەر لەم ریشەوە هاتبێ.

**ئاو1 aw** *[ āw ]* - "تراوی ژیانبەخش": اب āb (P.)، āp (OP.)، āp (Av.)، āp (OIn.) "ئاو"، ape (OPr.) "چەم، رووبار"، apus (OPr.) "کانیاو"، upe (Let.) "ئاو"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *ap-** "ئاو" [بڕوانە فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 1].

**ئاو2 aw** *[ āw ]* - "پێشگری هاوبەشی": ↑هاو haw.

**ئاوا1 awa** *[ āwā ]* - "بەم جۆرە، وەسا": ئا [پێشگر] + وا a + wa. وشەکە بە بێ پێشگریش مانای خۆی دەبەخشێ [بڕوانە ↑وا wa].

**ئاوا2 awa** *[ āwā ]* - "ون، دوور": [ئاوا بوون واتا دوور بوونەوە، لەبەر چاو ون بوون]. دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑حەپوو ħepû [وشەیەکە بە مانای "نەما، تەواو بوو" دە زمانی زارۆکدا]، ↑ئەوداڵ ewdal، ↑ئاواق awaq "1- خانووی چۆلکراو و بێ ئاوەدانی 2- چۆلگە، بیابان"، ئاوزینگ awzîng "ئاویلکە، دەمی مەرگ، دەمی ئاوا بوونی ژیان"،↑ئاویلکە awîlke و↑ئاودیو awdîw "لەبەر چاو ون، بزر"، ↑ئاوەکی aweki "ئاژەڵێک کە لە مێگەلەکەی تەرە بووبێ و چووبێتە ناو مێگەلێکی دیکەوە". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- پرێپۆزیسیۆن و ئاوەڵکرداری ab (G.)، aba (OG.)، af (Gt.)، off و of (E.)، av (Sw.)، apo (Gt.)، ab (L.)، apa (OIn.) و هتد. [ئاوا بوونی خۆر هەڵ سەنگینە دەگەڵ off ی ئینگلیزی بە مانای "کووژانەوە"]. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە "دوور بوونەوە، ون بوون" دەکەن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> (IE.) *apo-** "لە، دوور، ئاوا".

2- ریشەی **> (IE.) *au-, *aue-** "دووربوونەوە لە، بەرەو پێش".

**ئاوا3 awa** *[ āwā ]* - "ئاوەدان، شوێنێکی پڕ لە مروڤ": ئەم وشەیە دە کوردمادی و فارسیدا وەک پاشگر دەگەڵ ناوی گەلێک لە گوندەکاندا دێ وەک قازی ئاوا، سەیداوا، شیلاناوێ [ئاوا ← ئاوێ]. اباد ābād (P.).

1- بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 1) دەچێتەوە سەر ریشەی *(OI.) *ā- pāta-* "ئاگا لێ بوو، پارێزراو"، سەر بە ریشەی **> pā(y)-** "ئاگا لێبوون، چاوەدێری کردن". سەبارەت بەم ریشەیە بڕوانە پاشگری ↑وان -wan [ڤان -van].

2- له لایه‌كی دیكه‌وه ده‌كرێ ده‌گه‌ڵ habito (.L) "ئاوا كردن، ئاوه‌دان كردنه‌وه" هه‌ڵیسه‌نگێنین.

ئاوات **awat** [ *āwāt* ] - "ئومێد ، ئاره‌زوو": شێوه‌یه‌كی دیكه له ↑ئومێد umed و ↑*هیوا* *hîwa* [هیڤی hevî].

ئه‌م سێ وشانه ده‌بنچینه‌دا هه‌ر یه‌ك وشه بوون.

ئاوارتن **awartın** [ *āwārtın* ] - "هه‌ڵاواردن، جیا كردنه‌وه": [هه‌ڵ] ئاواردن awardın [hel] یش ده‌گوترێ.

ئا [پێشگر] + وارتن wartın + a. بنه‌وشه‌ی وار -war خزمه ده‌گه‌ڵ wählen (.G)، wellan (.OG)، waljan (.Gt)، välja (.Sw) "هه‌ڵبژاردن"، سه‌ر به ریشه‌ی < *(IE.) *uel- , *wel-* "ویستن، هه‌ڵبژاردن". ئاشكرایه چه‌مكه‌كانی هه‌ڵاواردن و هه‌ڵبژاردن له‌رووی ناوه‌رۆكه‌وه هه‌ر یه‌ك مانایان هه‌یه كه بریتییه له "جیا كردنه‌وه".

ئاواره **aware** [ *āwāra* ] - "وێڵ، هه‌ڵوه‌دا، سه‌رگه‌ردان": اواره āvāre (.P). به دوو جۆر ده‌كرێ لێكی بده‌ینه‌وه:

1-ده‌توانێ خزم بێ ده‌گه‌ڵ↑ ئاوا[2] awa "دوور، ون".

2- له‌وانه‌شه پێك هاتبێ له ئا [پێشگر] + واره ware + a. ئه‌گه‌ر ئه‌مه راست بێ، كه‌رتی واره ware پێوه‌ندی په‌یدا ده‌كا به گه‌لێك وشه‌ی وه‌ك ↑ور wır، ↑وێر wer، ↑فر fır، ↑فرفره fırfire و↑ *وه‌رانین* *weranîn*. ئه‌م وشانه گشتیان چه‌مكی "سووڕان، خولانه‌وه" ده‌رده‌بڕن. له‌م تێڕوانینه‌وه "ئاواره" واتا مرۆڤێك كه به‌م لا و ئه‌و لادا ده‌سووڕێته‌وه [سه‌رگردان، بێ ماڵ و حاڵ، وێڵ. وشه‌ی "وێڵ"یش ده‌چێته‌وه سه‌ر ریشه‌یه‌ك به مانای "سووڕان(ه‌وه)"].

ئاواز **awaz** [ *āwāz* ] - "گۆرانی، ئاهه‌نگ": اواز āvāz (.P). ئا [پێشگر] + واز waz + a. كه‌رتی واز waz خزمه ده‌گه‌ڵ هێندێك وشه‌ی وه‌ك ↑وشه wışe، ↑وێژه weje و ↑بێژتن bejtın "قسه‌كردن". ئه‌م وشانه له ریشه‌یه‌كه‌وه هاتوون به مانای "ده‌نگ، هه‌را، قسه كردن" كه بریتییه له ریشه‌ی < *(IE.) *uek-* "قسه‌كردن".

ئاواق **awaq** [ *āwāq* ] - "1- خانووی چۆلكراو و بێ ئاوه‌دانی 2- چۆلگه، بیابان": پێك هاتووه له ئاوا + (ه) ك [پاشگر] (e) k + awa. پاشگره‌كه دواتر گۆڕاوه به ق q. كه‌رتی ئاوا awa ده‌چێته‌وه سه‌ر↑ ئاو2 بوون awa به مانای "دوور بوونه‌وه، بزر بوون". له‌م تێڕوانینه‌وه ئاواق ده‌بێته ئه‌و خانوویه كه مرۆڤ به‌جێی هێشتووه و ئاوه‌دانی تێدا به‌دی ناكرێ یاخود شوێنی دووره‌ده‌ست و جیا له ئاوه‌دانی، واتا چۆلگه و بیابان.

ئاواڵ **awal** [ *āwāl* ] - "دۆست، هاورێ": هاواڵ hawal و هه‌ڤاڵ heval یش ده گوترێن. ئاو/ هاو + ئاڵ al + aw / haw. كه‌رتی ئاڵ al به گوێره‌ی "فه‌رهه‌نگا كورمانجی- ئینگلیزی" (ل. 244) خزمه ده‌گه‌ڵ arθa (.Av) "مه‌به‌ست، ئامانج" و تێكرای وشه‌كه مانای "هاوئامانج" ده‌دا. ئه‌م كه‌رته‌وشه‌یه هه‌روه‌ها جێی هه‌ڵسه‌نگاندنه ده‌گه‌ڵ ↑ئاڵ al "لا، جیهه‌ت" [ < *(OI.) * arda-* "ئاڵ". به پێی "فه‌رهه‌نگی هه‌رمان" (ل. 148) شێوه‌یه‌كی دیكه‌یه له یار yar "دۆست" و تێكڕای وشه‌كه ده‌بێته "یاری یه‌كتر".

ئاوانته **awante** [ *āwānta* ] - "1- مفته 2- فێڵ و گزی": هاوانته hawante ش ده‌گوترێ. وشه‌یه‌كی ئه‌ورووپییه كه ده‌چێته‌وه سه‌ر avantage (.OF) "به‌رژه‌وه‌ندی، قان، ئیمتیاز". وه‌ك ده‌بینرێ له زمانی كوردمادیدا چه‌مكی "ئیمتیاز" به دروستی پێوه‌ندی به چه‌مكی فێڵ و مفته‌خۆری و گه‌نده‌ڵییه‌وه په‌یدا كردووه.

ئاودیو **awdîw** [ *āwdīw* ] - ئاودیو بوون واتا له‌به‌رچاو ون بوون. ئاو + دیو dîw + aw. كه‌رتی ئاوaw شێوه‌یه‌كی دیكه‌یه له↑ ئاوا[2] awa [ئاوا بوون واتا ون بوون، دوور بوونه‌وه]، كه‌رتی دیو dîw ده‌چێته‌وه سه‌ر كرداری ↑دیتن dîtın، تێكڕای وشه‌كه ده‌بێته "له‌به‌رچاو نه‌ماو، له‌به‌ر دید ون". ئه‌م وشه‌یه چ پێوه‌ندییه‌كی به وشه‌ی "دیو" به مانای "هۆده، وه‌تاخ"ه‌وه نییه و جیاوازه له وشه‌ی "ئه‌ودیو".

ئاور **awır** [ *āwır* ] - "ئاگر": وشەکە پێوەندی بە "ئاگر" [کۆنتر: ئاتر]ەوە نییە. دە زمانی پەهلەویدا خڤەر xvar (Pl.) هەبووە بە مانای "ئاگر". ئەم وشە پەهلەوییە خزمە دەگەڵ "ئاور" و پێوەندییان هەیە بە ↑هووری hurî [خووری xurî] "ناوی گەلێکی دێرین لەسەر خاکی کوردستانی ئەمڕۆ"، ↑ئەهوورا ehura [e-hura]و هەروەها ↑خۆر xor "هەتاو".

ئاوڕ **awır** [ *āwır* ] - ئاوڕ دانەوە واتا "بۆ پاشەوە ڕوانین". ئا [پێشگر] + وڕ wır + a. وڕ wır خزمە دەگەڵ ↑وڕwır "گێژ"، ↑فڕ fır "مووی هەڵگەڕاوە"، ↑فرفرە fırfire "لەیستۆکی بسووڕ" و ↑وەڕانین weranîn"لێهاڵاندن". ئەم وشانە هەموو ئاماژە بە "سووڕان(ەوە)" دەکەن. بەم جۆرە ئاوڕ دانەوە دەبێتە سووڕاندنەوە و گەڕاندنەوە (ی نیگا).

ئاورا **awra** [ *āwrā* ] - "برسی": وێ دەچێ پێک هاتبێ لە ئا [پێشگر] + ورا wıra + a. کەرتی ورا wıra دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑برسی bırsî [ awra ←wıra ← wırsî]

ئاوریشم **awrîşım** [ *āwrīšim* ] - ابریشم abrīšam (P.) > **upa- raiš(a)ma-* (OI.) > **raiš-/ rais-* (OI.) سەر بە ڕیشەی *(IE.) *reik- >* "ڕستن، هۆنینەوە" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.71]. لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ڕستن rıstın، ↑ڕەشمە reşme، ↑ڕەشکە reşke "تۆری کا کێشان" و هتد.

ئاوزان **awzan** [ *āwzān* ] - "تێگەیشتن، فام کردن": ئاوزین awzîn و ئاوەزین awezîn یش دەگوترێ. ↑ئاوەز awez "ئەقڵ، ژیری".

ئاوزەنگی **awzengî** [ *āwzangī* ] - "زەنگۆ، ڕکێف": ئاو aw + زەنگی zengî. پێشگری ئاو aw پێشگرێکی وشەسازییە کە پێشتر بە فراوانی لە زمانی کوردمادی و فارسیدا بەکار هاتووە و ئێستاش لە ژمارەیەک وشەدا بەدی دەکرێ. لە زمانی کوردمادیدا شێوەکەی زۆرتر بۆ هەو -hew گۆڕاوە، وەک لەم وشانەدا: هەوجاڕ، هەوراز، هەوسار، هەوشار. لە زمانی فارسیدا وەک -af ماوەتە: افسار، افزار [بووەتە ابزار و خزمە لەگەڵ هەوجاڕ]، افروختن، فراز [پێشتر: افراز و خزمە لەگەڵ هەوراز]، افشار و هتد. کەرتی زەنگی zengî شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زەنگۆ zengo یان زەنگوو zengu. خزمە دەگەڵ ↑زەنگی zengî یان ↑زەنگە zenge بەمانای "گوێزینگ، نێوان زرانی و پا" و هەروەها ↑زەنگاڵ zengal "بەلەک پێچ". ڕکێف یان زەنگوو ئەو شتەیە کە لەو شوێنەی لاق جێ دەگرێ. لەباری وشەسازییەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ افسر (P.) "تاج" [لە بنەڕەتدا: ئەو شتەی دە سەر دەکرێ]. لەم وشانەشدا هەمان پێشگر دەور دەبینێ.

[تێبینی: بە گوێرەی "فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی" (ل. 688) وشەکە دە تورکیدا üzengi (Tur.) یە و ڕیشەی مەغوولی هەیە. ئەم بۆچوونە جێگەی گومانە، چونکوو پێوەندی زەنگوو (زەنگۆ، ئاوزەنگی) بەم وشانەی سەرەوە و چەندین وشەی دیکەی زمانی کوردی ڕوون و ئاشکرایە].

ئاوزینگ **awzîng** [ *āwzīng* ] - "ئاویلکە، دەمی مەرگ": ئاوەزینگ awezîng یش دەگوترێ. ئاو(ە) + زینگ zîng + aw(e). کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑ئاو2 awa "دوور، ون، بزر". کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر کرداری ↑ژین jîn. تێکڕا مانای وشەکە دەبێتە ئەو دەمە کە ژیان ئاوا دەبێ واتا زیندەگی دوایی دێ. کەرتی ئاوا awa دە وشەی ↑ئاویلکە awîlke شدا دەردەکەوێ و لەوێشدا هەر ئەم مانایە دەگەیەنێ.

ئاوس **awıs** [ *āwıs* ] - "زگپڕ": ابستن ābestan (P.). بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل.4) دەچێتەوە سەر > **ā- puça- tanū-* (OI.) "هەڵگری لەشی کوڕ، بێچوو لە سکدا هەڵگر". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ -a-puθra (Av.) "ئاوس، دوو گیان" و -puça (Av.) "کوڕ، پس". ئەم تێڕوانینە، واتا بردنەوەی وشەکە بۆ سەر وشەی "پس" و گرێ دانی بە بێچوو ڕێی تێ دەچێ، بەڵام دانانی وشەی tanū"تەن، لەش" دە ڕیشە کۆنەکەدا لە جێی خۆی نییە. هەر وەک لە فەرهەنگی ناوبراو دەردەکەوێ، وشەکە دە چەندین زماندا بە فۆنێمی s کۆتایی دێ و کەرتی -ten دە وشەی فارسی ابستن abesten (P.)دا

دەبێ پاشگری بە چاوگ کردن بووبێ و چ پێوەندییەکی بە -tanū "تەن"ەوە نییە. بە وتەیەکی دیکە وشەی فارسی ابستن abesten (P.) دەبێ دە ئەسڵدا چاوگ بووبێ بە مانای "ئاوس بوون" و دواتر ماناکەی گۆڕابێ بۆ ئاوەڵناو. وشەی ābusīdan (MP.) "ئاوس بوون" ئەو بۆچوونە پشتراست دەکا.

[تێبینی: وشەی "ابستن" دەبێ دە بنەڕەتدا چاوگێک بووبێ، وەک گرفتن، شناختن، تاختن، باختن، خفتن دە زمانی فارسیدا و گەستن، مشتن، خەوتن، دیتن و هیتر دە زمانی کوردمادیدا. دە هەموو ئەم وشانەدا فۆتیمی t وەک نیشانە یان ئامرازی چاوگ بەکار هاتووە. ئەم فۆتیمە دە هەر دوو زمانی کوردمادی و فارسیدا دواتر دە ژمارەیەک لە چاوگەکاندا بووەتە d، وەک دیدن، گزیدن، مکیدن، خوابیدن (فارسی) یان هەڵاواردن، بژاردن، وەشاردن (کوردمادی). لە هێندێک لە چاوگەکاندا هەر دوو شێوە بەکار دەهێنرێن، وەک "تافتن، تابیدن"، "خفتن، خوابیدن"، "شنفتن، شنیدن"، "رفتن، روبیدن" و هتد].

**ئاوسان awsan** *[ awsān ]* - "هەڵمسان، ئەستووربوون": پێشگری ئا a + وسان wısan. ↑ماسینmasîn و هەڵمسان helmısan یش دەگوترێ. اماسیدن āmāsden (P.).

**ئاوقا awqa** *[ āwġā ]* - ئاوقە awqe ش دەگوترێ. ئاوقا بوون واتا "تێکەوە گلان، تێکبەزین، دەست بە یەخەبوون". هەروەها عەوق ɛewq [ئەوق ewq] هەیە بە مانای "قەتیس، دە گیر کەوتوو". مامۆستا زەبیحی "ئاوقا"ی بردۆتەوە سەر "قەد" (قامووسی زەبیحی، بەرگی1، ل. 89). کاک عەلی نانەوازادە بردوویەتییەوە سەر یەقە (ئەخە) و وای داناوە کە دە ئەسڵدا "ئاوئەقە" بووە (فەرهەنگی هەرمان، ل. 162). ئەگەرچی بۆچوونەکەی کاک عەلی سەبارەت بە پێوەندی وشەکە بە "یەخە" لە جێی خۆیدایە، بەڵام وێ ناچێ وشەکە دە ئەسڵدا "ئاوئەقە" یان "هاوئەخە"بووبێ، چونکوو "هاویەخە" بوون مانای "دەست بە یەخە بوون" نادا. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ↑یەخە yexe وە و دەچێتەوە سەرریشەی ***iugo-** (IE.) < "لێکبەستن، تێکخستن". لەم مانایەوە بە هاسانی دەتواندرێ مانای "تێکبەزین، یەکترگرتن [بۆشەڕ]" پەیدا ببێ. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئەوک ewık "بەرۆک، یەخە" و چەند وشەیەکی دیکە.

**ئاوڵ awıl** *[ āwıl ]* - "دۆڵی چکۆڵە": ئا [پێشگر] + وڵ a + wıl.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ hohl (G.) "قووپاو، ناوبۆش، هەڵۆڵ"، hole (E.) "کون و کەلێن"، Höhle (G.) "ئەشکەفت"، سەر بە ریشەی ***kel-** (IE.) < "داپۆشان، لێهاڵان". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ↑ هەڵۆڵ helol،↑کلۆرkılor، ↑قالۆر qalor، ↑هۆڵ hol و چەندین وشەی دیکە.

2- لە لایەکی دیکەوە کەرتی wıl هەڵسەنگینە دەگەڵ vallis (L.) "دۆڵ".

**ئاوڵە awle** *[ āwla ]* - "خوروێکە": ابلە āble (P.). ئا [پێشگر] + وڵە a + wıle. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑بڵق bılq، ↑بلۆق bıloq، ↑بالۆکە baloke، ↑باوڵ bawıl. [↑بۆل *bol* "دەنکە ترێ"]. ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بەمانای "هەڵمسان، دەر پۆقین".

[تێبینی: بە پێی بۆچووتێک لەوانەیە ئەم وشەیە لە ریشەی *brad-* "درەوشانەوە" هاتبێ. (بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 6). ئەم بۆچوونە زۆر رێی تێ ناچێ].

**ئاونگ1 awıng** *[ āwıng ]* - "دەفری شت تێداکوتانەوە": ↑هاونگ hawıng.

**ئاونگ2 awıng** *[ āwıng]* - "1- شەونم 2- مێلاق": اونگ aweng (P.) "پەتی شت بەسەردا هەڵاوەسین". لە هەردوو مانا دا چەمکی "هەلاوەسران" بەدی دەکرێ، شەونم، نمێکی هەڵاوەسراوە بەسەر پەلکی گیا و گوڵ دا و مێلاقیش تریی هەڵاوەسراوی هیشک کراوە.

لەبەر ئەوە بۆچوونی کاک عەلی نانەوازادە بەجێیە کە وشەکەی گرێ داوەتەوە بە کرداری "هەڵاوەسین" (فەرهەنگی هەرمان، ل. 165). بنەوشەی ئەم کردارە ئاوەس awes ە و "ئاونگ " دە ریشەدا دەبێ ئاوەگ *aweg** بووبێ و پاشان فۆتیمی n ی تێ کەوتبێ [↑ ئاوەسین awesîn].

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 60) وشەکە هەر لەم چوارچێوەیەدا شی کراوەتەوە].

ئاوەدان **awedan** [ *āwadān* ] - "شوێنی پڕ لە مرۆڤ و ژیانی مرۆڤی": ابادان abadan (P.). ئاوەد + ان an + awed. کەرتی ئاوەد [ئاواد] شێوەیەکی کۆنترە لە ↑ئاو3 awa. کەرتی ئان an نیشانەی بە کۆ کردنە.

ئاوەز **awez** [ *āwaz* ] - "فام، ئەقڵ، تێگەیشتن": ئا [پێشگر] + وەز wez + a. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها کرداری ئاوزین / ئاوزان awzan / awzîn هەیە بەمانای "تێگەیشتن، فام کردن". بنجی وەز -wez خزمە دەگەڵ wissen (G.)، wizzan (OG.)، witan (Gt.) "زانین"، هەروەها Weise (G.)، wise (E.) "زانا". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی وەک ↑وێژدان wîjdan، ↑وەزیر wezîr، ↑وەیس weys [ناوێکی پیاوانە]، ↑پیتۆڵ pîtol "زۆرزان" دەچنەوە سەر ریشەی هاوبەشی ***weid-* (IE.)** "دیتن، (پێ) زانین، دۆزینەوە، دیتنەوە".

ئاوەژوو **aweju** [ *āwažū* ] - "بەرەواژی، سەرنخوون": ئاوەژی awejî یش دەگوترێ. واژگون (P.) vāžgūn [واژ + گون]. پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] + وەژی [واژی، وەژوو] weju + a. بنەوشەی وەژ- wejخزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە مانای "خوار بوونەوە، با دران" دەدەن، وەک ↑وێژ wej [گێژ و وێژ]، ↑ویش wêş "خوار و خێچ"، ↑وێژینگ wejîng "خەونوچکە" [خوار بوونەوەی سەر بەدەم خەوەوە] و هتد. ئەم وشانە خزمن لەگەڵ ↑وێزنین weznîn [وەزنین، هەڵوەزنین، هەڵوێزنین].

ئاوەسین **awesîn** [ *āwasīn* ] - دەگەڵ پێشگری هەڵ hel بەکاردەهێندرێ [هەڵاوەسین helawesîn واتا "بە پەتێک لە حەوادا راگرتن"]. هلاڤیشتن hılawîştın یش دەگوترێ. اویختن avīxtan (P.) یان اویزان کردن āvīzān kardan (P.). پێک هاتووە لە ئا [پێشگر] + وەس wes + a.

1- بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە شتی هەڵواسراو دە حەوادا رادەژێ و بەم لا و ئەو لادا خول دەخوا، دەتوانین وای بۆ بچین کە ئەم بنەوشەیە خزم بێ دەگەڵ↑ وەشاندن2 weşandın "راوەشاندن، تەکان دان" و دەگەڵ ↑بزاوتن bızawtın و گەلێک وشەی دیکەی سەر بە ریشەی **> *uegh- (IE.)** "بزوان، جووڵانەوە، رۆیشتن، ئاژوان". ئەم وشانەی خوارەوەش لەم ریشەوە هاتوون: bewegen (G.)، wegan (OG.)، (ga)wigan (Gt.) "راوەشان، بزوان، تەکان خواردن"، vega (OIs.) "بزوان، راژان، هەڵێنان، هەڵکێشان"، váhati (OIn.) "داژۆێ, دەڕوا "، vahitra-m (OIn.) "ئامرازی هاتوچوو، کەشتی"، vehere (L.) "ئاژۆتن".

2- دە"فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 60 ) وشەکە بردراوەتەوە سەر ریشەی *vaik-* "بزوان، جوولان، راژان"، بەڵام ریشە هیندوئەورووپییەکە باس نەکراوە. روون نییە کە ئایا ئەم ریشەیە پێوەندی بە ریشەی **uegh- (IE.)* "بزوان، جووڵانەوە، رۆیشتن، ئاژوان"ەوە هەیە یان نا. لەلایەکی دیکەوە هەر لەم سەرچاوەیەدا اویختن[2] avīxtan (P.) بە مانای "بە شەڕ هاتن" هاتووە و وەک وشەیەکی جیا لەمەی پێشوو شی کراوەتەوە. ئەم وشەیە برداوەتەوە سەر ریشەی *vaig-* "خێرا بزوان، راژان" و ئەمەش برداوەتەوە سەر ریشەی هیندوئەورووپی **ueig- (IE.)* "چەماندن، جووڵاندن، هەڵسووراندن". دە پێوەندی لەگەڵ ئەم ریشەیەدا چەندین وشە باس کراون، وەک vijáte (OIn.) "خێرا بزوان، تەکان خواردن"، -vaēg (Av.) "هەڵسووڕاندن"، -vaēya (Av.) "پێکان، وێکەوتن"، wīxtan (MP.) "هەڵسووڕاندن، هاویشتن". وەک دەبینرێ ↑هاویشتن hawîştın ی کوردمادیش دەبێ پێوەندی بەم وشانەی دواییەوە هەبێ [هاویشتن hawîştın (ha-wîştın) یان ئاویشتن awîştın (a-wîştın)]. وشەی vijáte (OIn.) کە سەرتر ئاماژەی پێکرا، لە وشەنامەی ئێتیمۆلۆژیی ئەڵمانیدا لەپێوەندی لەگەڵ چەندین وشەی دیکەدا و هەروەها بە مانای "هەڵاتن، دەرچوون" باس کراوە. پێ دەچێ ئەم وشەیە لەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی خزم بێ وەک ↑فیزماڵک fîzmalk، ↑ویسک wîsk، ↑بی bî [دارەبی] و هیتر کە دواجار دەچنەوە سەر ریشەی **> *uei- (IE.)** "چەمان، سووڕان، با دران". ئێستا پرسیار ئەوەیە کە وشەی "هەڵواسین" [هەڵ- ئا- وەسین] پێوەندی بە کام یەک لەم ریشانەوە هەیە؟ ئایا دە بنەڕەتدا مەبەست "راژان و راوەشان" یان "سووڕان و با دران" لە هەوا دایە؟

ئاوەشی **aweşî** [ *āwasī* ] - "نەخۆشی گوانی مەڕ کە ڕەق دەبێ و نادۆشرێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ↑ ئاوسان awsan "ئەستوور بوون، هەلمسان".

ئاوەکی **aweki** [ *āwakī* ] - "ئاژەڵێك لە مێگەلەکەی تەرە بووبێ و چووبێتە ناو مێگەلێکی دیکەوە": ئاوا + [ە] کی ki [e] + awa. کەرتی دووەم پاشگری ئاوەڵناوە. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر↑ ئاو2 awa "دوور، ڕۆیشتوو، ون بوو". ئەم ناوە لەوەڕا هاتووە کە ئاژەڵەکە لە مێگەڵ هەڵدەبڕێ، دوور دەبێتەوە و ون دەبێ.

ئاوەڵە **awele** [ *āwala* ] - "کراوە": هەروەها ئاوەڵا awela و ئاواڵە awale ش دەگوترێن.

ئا [پێشگر] + وەڵە a + wele. وەڵە wele- دەبێتە خزم دەگەڵ↑ فۆڵ fol [فش و فۆڵ] و ↑فل fıl [شل و فل]، ↑ڤالا vala "کراوە، بۆش، بەتاڵ"، ↑بڵاو bılaw [ولو welou (P.)]، ↑پەل pel "پان و بەرین". ئەم وشانە مانای "کرانەوە و لەبەر یەك کشانەوە" دەبەخشن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *< *ple-/*pla-* ***(IE.)*** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەك کشانەوە". دە زمانی کوردمادیدا ڤاڵایی valayî بە مانای" فەزا"ش بەکار دێ.

[تێبینی: ئەم پێوەندییەی سەرەوە دەتیوان چەمکەکانی "بۆش، ڤالا" و " فەزا"دا لە وشەکانی space (E.) "فەزا" و spatium (L.) "لەبەر یەك کشانەوەی کات و شوێن"دا دەردەکەوێ. ئەم وشانەش دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "لەبەر یەك کشانەوە" و خزمن دەگەڵ وشەی کوردمادی "زاف"].

ئاوەنیا **awenya** [ *āwanyā* ] - "رەپستە": پێك هاتووە لە دوو وشەی ئاو + نیا aw (e)+ nîya. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑ئاو aw، کەرتی دووەم دەچێتەوە سە کرداری نیان nîyan "نانەوە"، تیکرا واتا ئەو زەوییە کە ئاوی لێ دەنێن. [بڕوانە "فەرهەنگی هەرمان"، ل. 172].

-ئاوی **-awî** [ *āwī* ] - پاشگریکە مانای "تێکەڵ بوون و تێهەڵسووران" دەگەیەنێ، وەك قوڕاوی، تۆزاوی، خوێناوی و هتد. امیز āmīz (P.). دەچێتەوە سەر ↑ئاوێتە awete.

ئاویلکە **awîlke** [ āwīlka ] - "ئاوزینگ، دواهەناسەی ژیان": خزمە دەگەڵ ↑ئاوزینگ awzîng.

ئاوێتە **awete** [ *āweta* ] - "تێکەڵ": ئامێتە amete ش دەگوترێ. امیختن amîxten (P.) "تێکەڵ کردن، ئامێتە کردن". ئا [پێشگر] + وێتە/ مێتە a + wete / mete.

1- کەرتی دووەمی وشەکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ mischen (G.)، mix (E.)، miscere (L.) "تێکەڵکردن، ئامێتن". وشە ژێرمەنییەکان دەبردرێنەوە سەر وشە لاتینییەکە و ریشەی لاتینییەکەش باس نەکراوە. [مامۆستا هەژار دە فەرهەنگی "هەنبانە بۆرینە"دا ئامێتن ametın ی وەك چاوگ هێناوەتەوە، بەڵام شێوەی گەردان کردنی روون نەکردۆتەوە].

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین وشەکە بەراورد بکەین دەگەڵ ↑مشت mışt [مشت و ماڵ] و ↑ماشتن maştın "گەسك دان"، سەر بە ریشەی *< *mag-* ***(IE.)*** "هەڵشێلان"].

3- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" دا (ل. 54) دا وشەکە بەراورد کراوە دەگەڵ mya-s (Av.) و miśrá (OIn.) "تیکەڵ کردن، ئاوێتن" و بردراوەتەوە سەر ریشەی *< *mei-k-* ***(IE.)*** "تێکەڵ کردن".

ئاوێنە **awene** [ *āwena* ] - "قودیك، نەینك": اینە āyīne (P.)، ādēnk (Bal.)، ā-daynaka- *(OI.)، āwēnag (MP.) < **abi-dayanaka-* < *day-* *(OI.)* "دیتن" و خرم دەگەڵ dāy- (Av.) "دیتن" و هەروەها خزم دەگەڵ ↑ئایین ayîn و ↑دین dîn "رێباز" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.68]. وشەی کوردمادی ↑قودیك qudîk یش لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و ڕەنگە دە بنەڕەتدا *خو(د) دیك* **xu(d)dîk* بووبێ، واتا ئەو شتەی خۆتی تێدا دەبینی یان *ئادیك* **adîk* بووبێ و گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

ئاویە **awîye** [ *āwīya* ] - "1- سواخ، قوڕ تێهەڵسوون 2- جۆشدانی کانزا": پێوەندی هەیە بە ↑ئیپە îpe و ↑کیپ kîp سەر بە ریشەیەك بە مانای "بەستن، لێك قایم کردن، پێوەنووساندن".

ئاە **ah** [ *āh* ] - "دەنگی ئێش و ئازار": ↑ئاخ ax.

ئاهۆ **aho** *[ āho ]* - "نەخوشی [گیرۆ]": لە ↑ئاه ah وەرگیراوە، خزمیشە دەگەڵ ↑ ئێش êş و ↑ئاخ ax و هتد.

ئاهەک **ahek** *[ āhak ]* - "کلس، قسڵ": ↑ئەهاک ehak.

ئاهەنگ **aheng** *[ āhang ]* - "[هەوای] گۆرانی": اهنگ āhang (P.). دە کوردمادیدا هەنگ heng یش دەگوترێ. ئا [پێشگر] + هەنگ heng + a. خزمە دەگەڵ ↑هان han [هان دان واتا دەنگ دان] و دەگەڵ ↑خوێندن xuwendın [خێندن xendın]، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەرا، دەنگ، گۆرانی". دە زمانی کوردمادیدا وشەکە مانای "مەراسیم"یشی وەرگرتووە و دەگوترێ "ئاهەنگ گێران". ئەم مانایە لەوەرا هاتووە کە دە جێژن و مەراسیمەکاندا گۆرانی گوتن و دەنگ هەڵبرین دەوری باڵای گێراوە.

ئاهین **ahîn** *[ āhīn ]* - "ناڵین": لە↑ ئاه ah "دەنگی ئێش و ئازار" وەرگیراوە. دە زمانی ئەڵمانیشدا ächzen (G.) "ناڵین" لە ach "ئاه، ئاخ " وەرگیراوە.

ئای **ay** *[ āy ]* - "دەنگی هاوار و بانگ کردن": ای ey (P.). ↑ئەی ey.

ئایسان **ayîsan** *[ āyīsan ]* - "هەڵبوون، داغ بوون، سوور بوونەوە": هایسان hayısan یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- heiss (G.)، heet (NL.)، hot (E.)، het (Sw.) "داغ"، Hitze (G.)، heat (E.)، hitte (NL.)، heta (Sw.) "داغی، تین"، kaitrus (Lit.) "داغ"، hei (OG.) "هیشک هەڵاتوو، رووتەن"، و gihei (OG.) "گەرما، هیشکەساڵی، سەر بە ریشەی ***(IE.) *kei-, *ki- >*** "گەرما، تین". هەروەها ↑هیت hît "تین، گەرما" هەیە کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

2 - aither (Gr.) "ئایسەر، بڵێسەدەر، ئاگرین"، aestus (L.) "کلپە، گەرمی" و aestas (L.) "وەرزی گرما"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *aidh- >*** "سووتان، داغ بوون، هایسان". ↑ئەتر etır [عەتر] لەم ریشەوە هاتووە.

ئایش **ayş** *[ āyš ]* - "ئاخ، ئۆف": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئاخ ax، خزمە دەگەڵ↑ ئێش êş.

-ئایەتی **-ayetî** *[ -āyatī ]* - پاشگرێکە ناوی مانا دروست دەکا، وەک کوردایەتی، برایەتی، خزمایەتی و هتد. ئەم پاشگرە بە چەند شێوەیەک خۆ نیشان دەدەا، وەک ئاتی -atî [براتی]، ێتی -etî [چۆتیتی]، یەتی yetî [چۆنیەتی]. خزمە دەگەڵ پاشگری -heit (G.) و -keit (G.) کە دە زمانی ئەڵمانیدا وەک پاشگرە کوردمادییەکە دەور دەگێرن. لەم بارەوە بڕوانە ↑هەیتاڵ heytal "کۆتەل".

[تێبینی: دە زمان ئینگلیزیدا پاشگرێک هەیە کە ئەم دەورە دەگێرێ و لە فەرانسەیی کۆن وەرگیراوە و ریشەکەی بۆ زمانی لاتینی دەگەڕێتەوە، بۆ وێنە quality (E.) > qualite (OF.) > qualitas (L.). هەروەها دە زمانی عەرەبیدا پاشگرێکی لەم چەشنە لە دروست کردنی ناوی مانا دەور دەبینێ، وەک یەت -yat، كيفية kayfīyat (Arb.)، نوعية newɛîyat (Arb.). پاشگرەکەی زمانی کوردمادی لەباری ئێتیمۆلۆژییەوە چ پێوەندییەکی بەم دۆخانەی سەرەوە نییە، بەڵکوو دەگەڵ پاشگرەکەی زمانی ئەڵمانی خزمە].

ئاییا **ayya** *[ āyyā ]* - "1- پوور 2- دایک": شێوەیەکی دیکە لە ↑یایە yaye "دایک ، پوور".

ئایین **ayîn** *[ āyīn ]* - "رێباز، دین": ایین āyīn (P.) < *(OI.) *a-dayana-* < *(OI.) * day-* "دیتن" سەر بە ریشەی ***(IE.) *dhei(ə)- >*** "دیتن، تیرین". وەک دەبینین دوو وشەی ↑دین dîn و ↑ئایین ayîn دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون بە مانای "دید، روانگە". وشەی عەرەبی دین dīn (Arb.) لە زمانە ئێرانییەکان وەرگیراوە [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 68].

## ئو ( U )

**ئوتوو utu** - ↑وتوو wıtū ش دەگوترێ.

**ئۆتوز utuz** - "بانگردێن": هاتۆر hator یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هاتن hatın "گەیشتنە بەرەوە"، itti (Rus.) "رۆیشتن"، oītos (Gr.) "چارەنووس" [دە بنەڕەتدا: ڕەوت]، سەر بە ریشەی *(IE.) *ei- >* "رۆیشتن". چەمك و مانای رۆیشتن دە وشەی "باگردان، بانگردێن"یشدا بەرچاوە. کەرتەوشەی "گردان" خزمە دەگەڵ "گەڕان" و مانای رۆیشتن لە خۆ دەگرێ [سەرکەوت هاتەوە ماڵ، یان گەڕاوە ماڵ].

[تێبینی: سەبارەت بە وشە یۆنانییەکەی سەرەوە بە مانای "چارەنووس" دەتوانین دەگەڵ وشەیەکی ئەڵمانی هەڵی سەنگێنین کە ئەویش مانای "چارەنووس" دەدا، واتا Schicksal (G.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ schicken (G.) "ناردن، رەوانە کردن" و خزمیشە دەگەڵ "چوون"ی کوردمادی و لێرەشدا ئاماژە بە "رەوت، رۆیشتن" کراوە].

**ئوخت uxt** - "جووت، هاواڵ": شێوەی کۆنتری ↑جووت[1] cut. هەروەها بڕوانە ↑جق cıq.

**ئورزان urzan** *[ urzān ]* - "هەڵپەرین، هەڵبەزین": خزمە دەگەڵ ↑هرزا hırza "جۆرێك هەڵپەڕکێ" [هۆرز horz یش دەگوترێ] و دەگەڵ ↑*هۆریزان horîzan* "هەستان".

**ئوسترە ustre** *[ ustra ]* - "گوێزان، تیخی ردێن تاشین": خزمە دەگەڵ ↑سرین [سترین، ئەسترین]. وەك لەژێر ئەو وشەیەدا شی کراوەتەوە، مانای سەرەکی وشەی ئەسترین "رێخشاندن"ە. دیارە تیخی ردێن تاشین بە "رێخشاندن" موویەکان لا دەبا. دە زمانی ئینگلیزیدا razor (E.) "تیخی ردێن تاشین" دەچێتەوە سەر radere (L.) "کڕاندن، رێخشاندن"، هەروەها electric shaver (E.) "دەزگای ردێن تاشین" دەچێتەوە سەر shave (E.) و دەگەڵ "سوون، ساوین"ی کوردمادی هاوریشەیە.

**ئوڤە uve** *[ uva ]* - "وشەی ئاگادارکردنەوەی زارۆك لە مەترسی، بڤە": هەروەها دوو وشەی کوردمادی دیکە لەم پێوەندییەدا سەرنج رادەکێشن و پێکەوە خزمن، یەکەمیان وشەی ↑ئۆووەی owey "وشەی دەربڕینی شەرم، وشەی دەربڕینی خەم" و دوومیان ↑ئۆڤ of [ئاخ و ئۆف]. دەشێ ئەم وشانە لە دوو کەرتی ئۆ o [وشەی بانگ کردن] و ڤەی vey یان وەی way پێکهاتبن، کە ئەمانە دە ریشەدا مانای "ئێش و ئازار" دەبەخشن و وەك وشەی سەربەخۆش بەکار دێن [وەی لەو زستانە ساردە، وەیش چەند ساردە...]. لەم تێڕوانینەوە وشەکانی "ئوڤە"، "ئۆووەی" و"ئۆف" شێوەیەکی دیکەن لە "ئەی وەی" [ئەی وەی بارانە...]. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ ای وایey wāy (P.). بۆ شرۆڤەی وشەکە بڕوانە ↑وەی wey.

دە زمانی ئەڵمانیدا وەك یان o و e ی کوردمادی مانا دەدا، بۆ وێنە دەگوترێ o mein Gott "ئەی خودای من"، o Tannenbaum "هۆ(ی) دارەکاج" [گۆرانی بەناوبانگی کریسمەس لە ئەڵمان].

**ئومێد umed** *[ umed ]* - "هێوا، هێڤی": هومێد humed یش دەگوترێ. امید omīd (P.). شێوەیەکی دیکەیە لە هێڤی hevî یان ↑هیوا hîwa [گۆڕانی m بۆ w/v].

# ئۆ ( O )

**ئۆباڵ obal** *[ obāl ]* - "گوناه، تاوان، خراپە": وەباڵ webal یش دەگوترێ [وەباڵ بە (ئە)ستۆم] یان دەڵێن "ئۆباڵت وە ئەستۆی من". مەبەست لەم وتەیە وەئەستۆ گرتنی تاوان و گوناهی کەسێکە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ü bel (G.)، ubil (OG.)، ubils (Gt.)، euvel (Nl.)، evil (E.) "خراپ، بەد". ریشە وشە ژێرمەنییەکان بە تەواوی ساخ نەکراوەتە. گومان دەکرێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ هێندێک وشەی ئەو زمانانە کە ئاماژە بە لای سەرەوە دەکەن وەک über (G.)، obere (G.)، over (E.). لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا "لە ئەندازە تێپەڕاندن"، "گەیاندنە ئەوپەری خۆی" [پێ لە بەڕەی خۆ درێژتر کردن] بووە. دە زمانی ئەڵمانی کۆندا وشەی uppi (OG.) هەبووە بە مانای "بەدفەر، بەدفەرانە". بەم شێوەیە وشەی ئۆباڵ دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە وەک ↑ئەوپەڕ ewper، ↑هەڵ hel[هەڵگرتن] و ↑هەورەبان hewreban و هتد.

**ئۆخژن oxıjın** *[ oxıžın ]* - "شادی، ئارامی": بڕوانە ↑ئۆخەیش oxeyş.

**ئۆخەیش oxeyş** *[ oxayš ]* - "وشەی دەربڕینی شادی": هەروەها دەگوترێ ↑ئۆخەی oxey کە شێوەی کورتکراوەی ئەوەی دیکەیە. دە زمانی کوردمادیدا ↑ئۆخژن oxıjın یش بەکار دێ بە مانای "شادی، ئارامی". پێک هاتووە لە دوو کەرتی ئۆ o [زێدە یان پێشگر] و xeyş. ئەم کەرتە کە ئەسڵی وشەکەیە، دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑خەی xey.

**ئۆرت ort[1]** - "تیوان، ناوەڕاست": ↑وەرتە werte ش دەگوترێ کە شێوەیەکی گۆڕدراوە. هەروەها ↑ئۆرتە orte یان وەرتە werte بەمانای "فەرشێک کە لە ناوەڕاستی ژوورێک رادەخرێ" بەکار دێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ Ort (G.) "جێگا، شوێن، نوقتە، مەحەل"، ort (OG.) "جەمسەر، گۆشە، قەراخ، شوێن، جێگا، مەیدان"، oord (Nl.) "ناوچە، جێگا، شوێن"، ord (OE.) جەمسەر، نووک، تیژە"، uud (Sw.) "چقڵ، نووک". ئەم وشە ژێرمەنییانە لە ریشەی ژێرمەنی -uzđa (Gm.) "نووک" سەرچاوەیان گرتووە. لە زمانی کوردمادیدا ↑وەرت wert بە مانای "بریکار" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لە زمانی ئەڵمانیدا erörtern (G.) "باس کردن، شی کردنەوە" وörtern (MG.) "بە وردی لێکۆڵینەوە" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. هەر لەم پێوەندییەدا وشەی↑ئۆلکە olke "مەڵبەند" جێی ئاماژە پێکردنە کە رەنگە خزمایەتی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەبێ. لەوانەیە ئەم وشەی دوایی پێشتر "ئۆرتکە ortke" بووبێ و گۆڕابێ بە سەردا هاتبێ.

[تێبینی1: سەبارەت بەوە کە چۆن دە زمانی ئەڵمانیدا مانای "شی کردنەوە" لە مانای یەکەمەوە پەیدا بووە، جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ دوو وشەی هاوپێوەند دە زمانی لاتینیدا، واتا terminus "قەراخ، سنوور، جەمسەر، چمک" و determinare "دیاری کردن، موحەددەت کردن". وشەی عەرەبی "موحەددەت" یش خۆی پێوەندی بە "حەدد" و "حدوود"ەوە هەیە. وشەی terminus دە زمانە ئەورووپییەکاندا بە مانای "چەمک، مەفهوومی زانستی" بەکار دەهێنرێ (سەرنجی پێوەندی دوو وشەی کوردمادی "چمک" و "چەمک" بدە). کەوابوو ماناکانی "باس کردن، شی کردنەوە، لێکۆڵینەوە، دیاری کردن" دە بنەڕەتدا لە مانای "دانان یان دیاری کردنی حەد و مەرز" بۆ بابەتێک، بە مەبەستی جیا کردنەوەی لەوانی دیکە، سەری هەڵداوە. تێبینی 2: لەباری ئەوە کە چۆن وشەکە دە زمانی کوردمادیدا مانای "تیوان، ناوەڕاست"ی پەیدا کردووە، دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ دوو وشەی هاوریشەی چقڵ çıqıl "دڕک" و چەق çeq

"مەرکەز" (لەسەر چەقی ڕێگا). بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە وشەی چەقا çeq "ناوەند، تیوەڕاست، مەرکەز"].

ئۆرت **ort2** - "ڕێز، ئیعتیبار": شێوەیەکی دیکە لە ↑وەرج werc "نرخ، بایەخ" و لەباری شێوەوە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Wert (G.) "نرخ، بەها" بە تەواوی نیزیکە.

ئۆرتە **orte** [ *orta* ] - " مافوورەیەکە لە ناوەڕاستی ژوور رادەخرێ": دەچێتەوە سەر ↑ئۆرت ort¹ "تیوان، ناوەڕاست".

ئۆردوو **ordu** [ *ordū* ] - "سپا، حەشیمەتێکی ڕێکخراو": اردو ordū (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Herde (G.)، herta (OG.)، hairda (Gt.)، herd (E.)، hjord (Sw.) "ڕەوە، گەلە، دەستە"، هەروەها Hirt (G.)، hirti (OG.)، (shep) herd (E.)، herde (SW.) "شوان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ śárdha-h (OIn.) "گەلە، ڕەوە" و čereda (Rus.) "ڕیز، ڕیزبەندی"، سەر بە ڕیشەی < *(IE.)* kerdho-* "گەلە" یان "ڕیزی ئاژەڵ". لەوانەیە وشەی ↑شەڵغە şelġe [یان شەڵخە şelxe] "پوورە" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

ئۆرین **orîn** [ *orīn* ] - "قۆڕە قۆڕی گا": شێوەیەکی دیکە لە هۆڕین horîn [↑هۆڕاندن horandın].

-ئۆز **-oz** "پاشگری جەخت کردن": ئەم پاشگرە بە چەندین شێوە خۆی نیشان دەدا، ئاوەڵناو دروست دەکا و دە هەمان کاتیشدا ئاماژە بە دۆخی جەخت کردن دەکا. هێندێک لەم وشانە بریتین لە: ↑قۆپز qopız، ↑قۆقز qoqız، ↑قەڵووز qeluz، ↑کلۆز kıloz یان کەلۆس kelos، ↑کنۆس kınos، ↑چکۆس çıkos، ↑گرۆز gıroz، ↑گەرووز geruz، ↑مارز marız، ↑لاواز lawaz، ↑نەگریس negrîs، قەفتیس qeftîs، ↑وتۆز wıtoz، ↑مڵاز mılaz یان مڵاس mılas، ↑چلێس çıles و هتد. وەک دەبینین بزوێنی پاشگرەکە چەندین شێوەی هەیە و فۆنێمی کۆتاییش زۆرتر بە شێوەی z یان s خۆی نیشان دەدا، بەڵام جاروبار شێوەی تریش پەیدا دەکا وەک [↑قلووج qılûc "کووڕ"]. هێندێک جار بزوێنی e بە کۆتایی پاشگرەکەوە دەلکی، وەک ↑گەڤۆزە gevoze "مووی ماش و برینجی". لەوانەیە پاشگری ئۆز oz- پێوەندی یان خزمایەتی لەگەڵ نیشانەی us- دە زمانی لاتینی یان os- دە زمانی یۆنانیدا هەبێ. ڕەنگە ئەم پاشگر یان نیشانەیە دە زمانی کۆنی کوردمادی و فارسیشدا بووبێ و پاشگری os- لەمەوە جێ مابێ].

ئۆغر **oġır** - "خێردیتن لە سەفەر": لەکاتی ماڵاوایی کردندا بەو کەسەی دەڕوا، دەگوترێ "ئۆغر بێ". ئەم وشەیە دەبێ پێک هاتبێ لە کەرتی ئۆ o [پێشگر یان زێدە] و کەرتی غر ġır کە ئەسڵی وشەکەیە. ئەم وشەیە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑خێرxer، واتا وشەکە دەبێ دەبنەڕەتدا "ئۆخێر" بووبێ و سووکتر کرابێ و بووبێتە ئۆغر. لە مەڵبەندی موکریان لەجیاتی "ئوغر بێ"، دەگوترێ "بەخێر چی". دیارە لە هەردوو دۆخدا مەبەست ئارەزوو کردنی ئەوەیە کە سەفەرەکە بەخێر و خۆشی تەواو بێ. دە زمانی فارسیدا کاتی سەفر کردن بە لایەنی سەفرکەر دەگوترێ "سفر بخیر"، واتا سەفەرت خێر بێ. دە زمانی ئەڵمانیدا دەگوترێ gute Reise (G.) "سەفەر باش".

ئۆغەن **oġen** [ *oġan* ] - "دوامین حەوتەی چلەی بچووک": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئاخنین axnîn [ئا+ خنین] "پڕ کردن بە پاڵەپەستۆ، پەستاوتن"، ganz (G.)، gans (Nl.)، ganska (Sw.) "تەواو، گشت، ساغ، یەکپارچە".دە زمانی ئەڵمانیدا ergänzen (G.) دەبێتە "تەکمیل کردن". لەوانەیە مەبەست ئەوە بێ کە چلە وەک دەفرێکی زەمانی پڕ دەبێ واتا تەواو دەبێ.

ئۆف **of** - "وشەی دەربڕینی خەم و ئازار" [ ئاخ و ئۆف ]، بڕوانە↑ ئۆڤە ove.

ئۆقرە **oqre** [ *oqra* ] - "ئارامی": پێک هاتووە لە ئۆ + قرە qıre + o. کەرتی یەکەم هەر ئەو پێشگر یاخود ئەو زێدەیە کە بە شێوەی ئا a و ئە e لە زۆر وشەدا خۆ نیشان دەدا، وەک (ئا)ڕام، (ئا)ستەم یان (ئە)ستەم، (ئە)شکەفت، (ئا)خافتن و هتد. کەرتی دووەم کە ئەسڵی وشەکەیە، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کڕ kır [کڕ و کپ]، ↑قڕ qır [قڕ و ڤپ] و هتد. پێشگری o- هەروەها هەڵ سەنگێنە دەگەڵ ↑ئۆغر oġır.

ئۆلک **ol(ı)k** - "مێخی زنجیر، مێخی تەویلە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئۆیە oye.

**ئۆلکە olke** [ *olka* ] - "مەڵبەند": هەڵیسەنگینە دەگەڵ↑ ئۆرت ort[1] "تیوان، ناوەڕاست، مەرکەز".

**ئۆوەی owey** [ *oway* ] - "وشەی دەربڕینی شەرم، وشەی دەربڕینی خەم": بڕوانە↑ ئۆڤە ove.

**ئۆیە oye** [ *oya* ] - "نەواری پووڵەکەدار، پووڵەکەی لێکبەستراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جۆخین coxîn و چەندین وشە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێکبەستن، بەند کردن". وشەی ↑هوویە ĥûye "نیر" [یوغ yūġ (P.)] پێوەندی بەم خێزانەوە هەیە.

## ئە ( E )

**ئەبتەر ebter** [ *abtar* ] - "شێتۆکە": خزمە دەگەڵ ↑ئەبداڵ ebdal و هەروەها دەگەڵ ↑*ئاوا awa*. ریشەی ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "دوور بوونەوە، ون بوون" دەکا. لە وشەی "ئەبتەر"دا دەشێ مەبەست دوور بوونەوەی مرۆڤ لە خۆی یاخود مەبەست ون بوون و بزر بوونی ئەقڵ و ئاوەز بێ.

**ئەبداڵ ebdal** [ *abdāl* ] - "دەروێشی گەڕیدە": خزمە دەگەڵ ↑ئەبتەر ebter. دەروێشی گەڕیدە دیارە ئەو کەسەیە لە شوێن و زێدی خۆی دوور دەکەوێتەوە و بە وتەیەکی دیکە ون و "ئاوا" دەبێ. وێ دەچێ هەردوو وشەی "ئەبتەر" و "ئەبداڵ" دە بنەڕەتدا یەک وشە بووبن و دواتر دوو وشە بە دوو مانای هێندێک جیاواز سەری هەڵدابێ. کەرتی یەکەمی ئەم وشانە ئاماژە بە "دوور بوونەوە، ون بوون و بزر بوون" دەکا. هەرچێ کەرتی دووەمە، لەوانەیە "دڵ" بێ یان شێوەی کۆنتری ئەم وشەیە بێ کە خاوەنی فۆتیمی r ە لەجیاتی l [ بڕوانە وشەی "دڵ" ]. ئەگەر ئەم شیمانەیە راست بێ، ئەبتەر یان ئەبداڵ ئەوکەسەیە کە دڵی لە دەست داوە یاخود ئەو شتانەی مرۆڤ لە ژیاندا دڵی پێ دەبەستێ، لەناو دڵی ئەودا ون و بزر بوون.

**ئەبلە eble** [ *abla* ] - "نەفام، گێلۆکە": ↑خەپلە2 xeple ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەبلە eble [گۆڕانی e /he بە xe]..

ئەم وشەیە دەشێ وشەیەکی کوردمادی بێ و کەرتی یەکەمەکەی، واتا ئە e، هەر ئەو پێشگرەیە کە دەگەڵ هێندێک وشە دێ، وەک "ئەتۆ"، "ئەتک"، "ئەدەب"، "ئەژنۆ" و هتد. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بلِح bılĥ.

**ئەبڵەق ebleq** [ *ablaq* ] - "رەش و شپی": پێشگری ئە a + بلەق bıleq، بۆ کەرتی دووەم بڕوانە ↑بەڵەک belek. وێ دەچێ وشەکە دە زمانی عەرەبیدا کرابێ بە "ابلق".

**ئەتر etır** [ *atır* ] - "جۆرێک گوڵاوی بەهێز بۆ بۆنخۆش کردن": هەروەها عەتر εetr. وشەکە لە زمانی عەرەبییەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردمادی [عطر εatr (Arb.)]، بەڵام ئەسڵی وشەکە دەچێتەوە سەر وشەیەکی یۆنانی. دە زمانی ئەڵمانیدا بووەتە Äther (G.) [هەروەها Ether وەک وشەیەکی زانستی]. ئەم وشەیە بە چەندین مانای جیاواز بەکار دێ و یەک لەوانە بە مانای "دەرمانی بێهۆش کردن". دە زمانی ئەڵمانیدا ätherisch (G.) بە مانای "شتێک کە زوو دەهەڵمێ، رووحانی، ئاسمانی، وەک هەڵم و شنەبا نەرم و ناسک" بەکار دێ. هەروەها ätherische Öle وەک چەمکێکی کیمیایی بەکار دێ کە ماناکەی دەبێتە "رۆن یاخود تراوی پڕ بۆن و بەرامە کە لە گوڵ و گیا دەگیرێ و بەردەوام دەهەڵمێ و بۆن و بەرامە بڵاو دەکاتەوە". ریشەی وشەکە دەچێتەوە سەر aither (Gr.) "ئایسەر، بڵێسەدەر، ئاگرین". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ aestus (L.) "کڵپە، گەرمی" و aestas (L.) "وەرزی گەرما"، سەر بە ریشەی < ***aidh-** (IE.)* "سووتان، داغ بوون، هایسان". لەوانەیە ↑ئایسان ayîsan [هایسان hayîsan]ی کوردمادی و هەروەها ↑ئەستێ este [بەردئەستێ] لەم ریشەوە هاتبن.

[تێبینی: بەلای یۆنانییە کۆنەکانەوە هەوای سەر زەوی لە دوو چین پێک هاتووە، چینێکی خوارەوە و چینێکی سەرەوە کە زۆر لە بان و هەروەها زۆر زەلال و ناسک بووە و خوداکان لەوێ نیشتەجێ بوون. ئەوان بۆ ئەم چینەهەوایە ناوی aither (Gr.) یان بەکار هێناوە کە دە بنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە "ئایسەر، بڵێسەدەر، ئاگرین"].

**ئەترەش (etre(ş** [ *atraš* ] - "هێزی دڵ و دەروون": هەترە(ش) hetre(ş) یش دەگوترێ. دەبێ خزم بێ دەگەڵ Ader (.G)، ader (.Sw) و (.OE) "رەگ، دەمار"، ādra (.OG) "دەمار، رەگ، ماسوولکە، ریخۆڵە"، ētor (.Gr) "دڵ"، ētron (.Gr) "بەرسک". دە زمانە کۆنە ژێرمانییەکاندا وشەکە بە مانای "گورچیلە" و "ناوسک، هەناو" یش بەکار هاتووە. بە گشتی وشەکە دە سەردەمە کۆنەکاندا بە مانای "دەروون، هەناو" بەکار هاتووە. لەوانەیە دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا هەر بەو مانای "دڵ، دەروون" بەکار هاتبێ و دواتر ماناکەی گۆڕابێ بۆ "هێزی دڵ و دەروون". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > ***ēt-r** (.IE)* "گەرمی، تین" و لەوانەیە پێوەندی پەیدا بکا بە atar (.Av) "ئاگر".

[تێبینی: مانای کۆن و تازەی وشەکەی سەرەوە هەڵ سەنگێنە دەگەڵ وشەی "جەرگ" کە ناوی ئەندامێکە و هەروەها "بەجەرگ" وەک نیشانەی ئازایەتی و هێزی دەروون بەکار دێ].

**ئەتفک etıfk** [ *atıfk* ] - "زەنگەتە، تلسک": هەروەها عەتفک εetıfk. دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری ئە + تفک e + tıfk. لەم تێروانینەوە کەرتەوشەی تفک -tıfk دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەڤ tev "پێکەوە، بە هەڤڕا". "ئەتفک" ئەو دەنکانەن کە پێکەوە نووساون و یەکیان گرتووە.

**ئەتک etık** [ *atık* ] - "سووکایەتی پێکردن": هەتک hetık یش دەگوترێ.هتک hetk (.P). پێک هاتووە لە پێشگری ئە + تک e + tık. خزمە دەگەڵ ↑ئاتەگ ateg "1- داوێنی کەوا 2- داوێنی چیا" و دەگەڵ تە teh (.P) "خوارەوە، بنەوە"،↑تەشک teşk [تەشک و داوێن] و ↑تەشق teşq [تەشقی ئاسمان واتا قووڵترین شوێنی کەوانەی ئاسمان]. ئەتک کردن دە بنەڕەتدا بە مانای "نزماندن(ی رێز و روومەت)"ە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشە ئەڵمانی niedrig "نزم، نەوی" و erniedrigung "ئەتک، سووکایەتی" ].

**ئەتوار etwar** [ *atwār* ] - دەگەڵ "ئەدا" دێ [ئەدا و ئەتوار]. atvār (.P). پێک هاتووە لە ئە [پێشگر] + توار(t(ı)war + e. "توار" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تەور2 tewır "جۆر، شێوە". مانای ئەتوار دە بنەڕەتدا "شەقڵ و شێوە دەرهێنان" بووە. لە زمانی فارسیدا دەگوترێ četor (.P) "چۆن، بە چ شێوەیەک".

**ئەتوان etwan** [ *atwān* ] - "مەڵهەم، دەرمان بۆ تیهەڵسوون": ↑هەتوان hetwan یش دەگوترێ.

**ئەتۆ eto** [ *ato* ] - "جێناوی کەسی دووەمی تاک": ↑تۆ to.

**ئەتەک etek** [ *atak* ] - "داوێن، شاقەل": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاتەگ ateg.

**ئەجزا ecza** [ *ajzā* ] - "شتی پلاستیک": لەوانەیە پێک هاتبێ لە پێشگری ئە + جزا e + c(ı)za و کەرتی "جزا" پێوەندی بە چزان çızan ەوە هەبێ و مەبەست لە وشەکە گەیاندنی تایبەتمەندی سووتان و قاڵ بوونی ئەو شتانە بێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی جززە cızze "دەنگ دان و ئاگادار کردنەوەی زارۆک لە شتی داغ". [بڕوانە ↑چزاندن çızandın].

**ئەجندە ecınde** [ *ajnıda* ] - "جندۆکە": پێشگری ئە + جندە e + cıınde. کەرتی سەرەکی وشەکە لە وشەی ↑جندۆکە cındoke دا دەبینین.

**ئەخت ext** [ *axt* ] - دەگەڵ چار çar دێ و دەگوترێ ئەختوچار extuçar کردن، واتا هەوڵدان و زەحمەتیکی زۆر و بێ ئاکام. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑کەد[1] ked "کار، زەحمەت، رەنج" [پێشگری ئە + کەد a+ ked ؟]، سەر بە ریشەی > ***kad-** (.IE)* "غەم، دەرد، ناخۆشی". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، کەرتی دووەم، واتا چار çar دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئازار azar [a-zar]. بەم جۆرە مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "رەنج و ئازار کێشان".

**ئەختە exte** [ *axta* ] - "1- یەختە 2- داری شینی هەڵپەرتراو": اختە axte (.P). شێوەیەکی دیکە لە یەختە yexte . دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "بڕاو، تیغ لێدراو" بووبێ و سەر بە ریشەیەکە بە مانای "تیژ". خزمە دەگەڵ ↑ئاژنین ajnîn.

**ئەختەر exter** [ *axtar* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەستێرە estere.

**ئەدەب edeb** *[ adab ]* - "1- ناسکی لە هەڵسووکەوتدا 2- وێژە، چاند": ادب adab (.P). ئەم وشەیە بە دڵنیاییەوە وشەیەکی کوردمادی و فارسییە و لەو زمانانەوە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە. پێک هاتووە لە پێشگری ئە + دەب e + deb. کەرتی سەرەکی وشەکە، واتا "دەب" لە هێندێک وشەی دیکەدا بەرچاو دەکەوێ وەک ↑تیپ tîp "حەرف"، ↑تاپۆ tapo "سەنەد، قەباڵە"، ↑دەبستان debıstan "خوێندنگە" [دە ئەسڵدا "نڤیسگە"]، ↑دیباچە dîbaçe "پێشەکی کتێب، پێشوتار"، ↑دەفتەر defter [بە هەردوو ماناکەیەوە واتا شوێنی تێدا نووسین]، ↑دەبیر debîr و هەروەها dīp (.Pl) "نووسراوە" و dapīr (.Pl) "دەبیر، نووسەر". وەک لە هەموو ئەو وشانەدا دەبیندرێ، کەرتی سەرەکی وشەکە مانای "نووسین، نووسراو" دەبەخشێ. ئەم وشەیە پاشان ماناکەی لە "نووسین"ەوە پەرەی گرتووە بۆ "وێژە" واتا "ئەدەبیات". دیارە پێوەندی ئەو دوو چەمکانە بەیەکەوە ئاشکرایە و ئەدەبیات بەو نووسراوانە گوتراوە کە لەبەر دەستدا بوون. ئەم وشانەی سەرەوە خزمن دەگەڵ typós (.Gr) "شەقڵ، نیشانە، وێنە، نموونە"، سەر بە کرداری typtein (.Gr) "لێدان، کوتان". دیارە دە کۆندا شەقڵ و وێنە و نیشانە و هەروەها حەرفەکان کە خۆیان جۆرێک وێنە و نیشانە بوون، بە لێدان و کوتان واتا بە هەڵکەندن و داتاشین لەسەر دار و بەرد دروست دەکران. ئەم مانا بنەرەتییە، واتا "لێدان"، دە چەندین وشەی زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا پارێزراوە، وەک ↑*تەپاندن tepandın* "لێدان". هەروەها مانای "شەقڵ و نیشانە" دە وشەی ↑تەپڵ tepıl "شوێن پەنجە، جێ قامک" بەدی دەکرێ. دە زمانە ئەورووپییەکانیشدا وشەی تیپ/ تایپ type بە مانای "شەقڵ، نیشانە، مۆر، حەرف" بەکاردێ و دەچێتەوە سەر وشە یۆنانییەکە. سەرجەم ئەو وشانە دە پلەیەکی دیکەدا دەگەڵ ↑دەپ dep "تەختە" پێوەندی پەیدا دەکەن، چونکوو تەختە و تەخت کردنی دار و بەرد شتێکە کە لەرێگای تاشین و لێدان و کوتانەوە ئەنجام دەدرێ.

[تێبینی1: لە باری پێوەندی نێوان دوو چەمکی "حەرف، تیپ" و "ئەدەبیات" هەڵی سەنگینە دەگەڵ letter (.E) "تیپ، حەرف" و literature (.E) "ئەدەبیات". ئەم دوو وشە ئینگلیزییە ریشەی لاتینیان هەیە و پێکەوە خزمن. تێبینی 2: ئەو پێوەندییانەی سەرەوە هەروەها نیشان دەدا کە بەکار هێنانی وشەی "وێژە" بە مانای "ئەدەبیاب" هەڵەیە، چونکوو "وێژە" باس لە "دەنگ" دەکا، نەک لە "حەرف و نووسین". هەر بۆیە بە باوەڕی من باشترە کە وشەی رەسەنی کوردمادی "ئەدەب" وەک خۆی بەکار بهێنرێ (زمان و ئەدەب، ئەدەبی کوردی، ئەدەبی کلاسیک....). ئەم وشەیە بە هیچ شێوەیەک وشەیەکی عەرەبی نییە، بەڵکوو چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بەشێوەی "ادبیات" و "اداب" گۆڕانی بەسەردا هاتووە. تێبینی 3: وشەی ئەدەب ماناکەی پلەیەکی دیکەش پەرەی گرتووە و مانای "ناسکی" لە ئاخاوتندا پەیدا کردووە، چونکوو مرۆڤی خوێندەوار و بەهرەمەند لە ئەدەبیات بە شێوەیەکی ناسکتر ئاخاوتن و هەروەها هەڵسوکەوتی کردووە. بەم شێوەیە بە مرۆڤی "وێژەناسک" و "رەفتارناسک" گوتراوە "بەئەدەب". تێبینی 4: زۆر سەرنجراکێشە کە لە ریشەیەکەوە بە مانای "لێدان و کوتان" وشە و مانایەک دروست بێ کە باس لە "نەزاکەت" (ناسکی) بکا. گۆڕان و پەرە گرتنی ماناکان بە چەشتێکی ئەوتۆ لە چەندین وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ و نیشان دەدا کە مانای وشەیەک مەرج نییە راستەخۆ پێوەندی بە مانای ریشەکەوە هەبێ، بەڵکوو دەتوانێ لەرێگای چەندین گۆڕانەوەی پێوەندی بە مانای ریشەکەوە پەیدا بکا].

**ئەر er** *[ ar ]* - "دەنگی کەر، زەر": هەروەها عەر ɛer [عەرعەر ɛerɛer]. خزمە دەگەڵ:

1- یان ↑هەرا hera [دەنگ و هەرا].

2 - یان شێوەیەکی دیکەیە لە زەڕ zer [↑زەڕ(ڕ)اندن zer(r)andın]

**ئەرئەر erer** *[ arar ]* - "ناوی دارێک": هەروەها عەرعەر ɛerɛer. عرعر ɛarɛar (.P). بنەوشەی er دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑*هەر her* [ هەر کەس] و ↑هەرە here [هەرە جوان].

ئەرا **era** [ *arā* ] - "لەبەر، ژ بەر": ئەرای تۆ واتا لەبەر تۆ. برای beraye (P.)، کۆنتر: ازبرای ez beraye (P.) "ژ بەر". دە شێوەزاری خواروودا کۆنتر وشەیەکی هاوچەشنی وشە فارسییەکە لەئارادا بووە و پاشان سواوەتەوە، واتا "ازبرای" بووەتە "ئەرای".

ئەرخەوان **erxewan** [ *arxawān* ] - "دارێکە گوڵێکی سووری ئاماڵ بنەوش دەکا": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە < *argón* (Gr.) "گازی ئارگون". ئەمە وشەیەکی یۆنانییە و دەچێتەوە سەر aergós (Gr.) واتا "ناکاریگەر"، خزمە دەگەڵ ↑ئەرک erk "کار". لەوانەیە جۆرێک پێوەندی [رەنگە؟] لە نێوان ئەم دوو چەمکەدا بەدی کرابێ.

ئەرخەیان **erxeyan** [ *arxayān* ] - "خاترجەم، دڵنیا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ urge (E.) "پێداگرتن" < *urgēre* (L.) "پاڵ نان".

ئەرد **erd** [ *ard* ] - "زەوی": هەرد herd و↑عەرز erz یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ Erde (G.)، erda (OG.)، earth (E.)، jord (Sw.)، erā (Gr.) "ئەرد"، < ***er(t)-** (IE.) "ئەرد".

ئەردەڵان **erdelan** [ *ardalān* ] - "ناوچەیەک لە کوردستان": پێک هاتووە لە دوو کەرتی ئەرد erd + ڵان lan. کەرتی یەکەم بە مانای "سەخت"ە و بە چەند شێوە دە زمانی کوردمادیدا دەبینرێ، وەک ↑هەرد2 herd "شاخی سەخت و پڕبەرد"، ↑زەرد zerd [ماه و زەرد]، ↑خرتە2 xırte "زەوی رەقەن و نەکێڵ"، ↑سرت sırt "رەق، سەخت" و دواتر خزمە دەگەڵ ↑خار xar، ↑خورت xurt "بەهێز" و ↑کورد *kurd* و هتد. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ hart (G.) و hard (E.) "سەخت". کەرتی دووەمی وشەکە بە مانای "هەرد، زەوی"یە و خزمە دەگەڵ پاشگری ↑ڵان -lan [بەردەڵان، خیزەڵان، بێشەڵان...] و land "زەوی" دە زمانە ژێرمەنییەکاندا. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "هەردی سەخت، شوێن و ناوچەی ئاستەم". سەبارەت بە شێوازی ناو لێنانی ناوچە و هۆزەکانی کوردستان بڕوانە شی کردنەوەی "سۆران".

ئەرزان **erzan** [ *arzān* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑هەرزان herzan.

ئەرزن **erzın** [ *arzān* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑هەرزن herzın.

ئەرزەن **erzen** [ *arzen* ] - "چەنە": ↑ئەرزینگ erzîng یش دەگوترێ.

ئەرک **erk** - "زەحمەت، کار": < *ergon* (Gr.) "کار، ئەرک" < *eirgein* (Gr.) "پەرژین کردن، بەربەست کردن" [بڕوانە ↑وەرزێڕ werzer "جووتیار"].

ئەز **ez** [ *az* ] - "من": ich (G.)، ih (OG.)، ik (Gt.)، ic (OE.)، I (E.)، jag (Sw.)، egón (Gr.)، ego (L.)، ahám (OIn.)، azm (Av.)، (j)azu (OIs.) "ئەز"، سەر بە ریشەی < ***eĝ(ō), *eĝom-** (IE.) "ئەز".

ئەزماندن **ezmandın** [ *azmāndın* ] - "بانگ هێشتن، میوانی دان": هەروەها عەزماندن ɛezmandn. دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری ئا + زماندن zımandın + a. کەرتی ئەسڵی وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑جڤین *cıvîn* "کۆم بوون"، هەروەها ↑زەماوەند zemawend "داوەت".

ئەزموون **ezmun** [ *azmūn* ] - "تەجرەبە کردن، تاقی کردنەوە": ئەزمین ezmîn و ئەزماندن ezmandın یش دەگوترێن [ئەو کارەی دەئەزمووم یان دەیئەزمێنم]. ازمودن āzemūdan (P.).

1- بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 22 ) وشەکە دەچێتەوە سەر وشەی ئێرانی کۆنی ***zu-māya-** (OIran.) سەر بە ریشەی *mā(y)-* "ئەندازە گرتن، هەڵسەنگاندن".

2- لە لایەکی دیکەوە دەکرێ ئەم وشەیە دەگەڵ exsamen (L.) "تاقیکاری" هەڵسەنگێنین. لەوانەیە وشەکە لەم وشە لاتینییە وەرگیرابێ. ئەم وشە لاتینییە دەچێتەوە سەر ***eksag-s-men** (L.) سەر بە ریشەی < ***ag-** (IE.) "ئاژۆتن، بەرەوپێش بردن". لەم مانایەوە مانای "بزوان" (ی تەرازوو) و دواتر "هەڵسەنگاندن" و سەرەنجام "تاقی کردنەوە" پەیدا بوون.

ئەژدیها **ejdîha** [ *aždīhā* ] - "ماری مەزن": ↑ حەزیا ħezya ش دەگوترێ. اژدها ajdehā (P.). دەبێ سەر بە ریشەی < *(IE.) *eĝhi-* "مار، کرم" بێ و لەم تیروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ژیشك jîşık "ئاژەڵێکی درکاوی" [دە بنەرەتدا: مارخۆر، کرم خۆر].

ئەژنۆ **ejno** [ *ežno* ] - "چۆك": زانو zānū (P.). پێشگری ئە + ژنۆ j(ı)no + e. خزمە دەگەڵ Knie (G.)، kneo (OG.)، kniu (Gt.)، knee (E.)، knā (Sw.)، góny (Gr.)، genu (L.)، jānu (OIn.) "ئەژنۆ"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *genu-* "ئەژنۆ".

ئەسپاردن **espardın** [ *aspārdın* ] - "ئەرکدار کردن بۆ پارستن": سپردن sepordan (P.). پێك هاتووە لە پێشگری ئە + سپاردن spardın + e. خزمە دەگەڵ ↑سپر *sıper* و ↑ئەسپەرە espere کە ئەوانیش جۆرێك لە پاراستن دەستەبەر دەکەن.

ئەسپۆل **espol** [ *aspol* ] - ↑سپڵ sıpıl.

ئەسپۆن **espon** [ *aspon* ] - "سابوون": ئە + سپۆن spon + e. کەرتی "سپۆن" شێوەی کۆنتری وشەکەیە، چووەتە ناو زمانی عەرەبی، بووەتە صابون sābūn (Arb.) و پاشان بەشێوەی "سابوون" گەراوەتە ناو زمانی کوردمادی و فارسی. خزمە دەگەڵ Seife (G.)، seipfa (OG.)، zeep (Nl.)، soap (E.) "سابوون، ئەسپۆن"، sebum (L.) "پیو". ئەسپۆن یان سابوون لە سەردەمی کۆندا لە پیو و خۆڵەمێش و شیرەی دار دروست کراوە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑سەپی sepî "پاڵاوتە"، ↑سافان safan "دڵۆپە، چکە"، ↑سافۆ safo "پاڵوێنە، راوەك"، ↑زیپك zîpık "دڵۆپە" و هەروەها ↑کەو kew [کەو و بێژینگ]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "چۆڕاندنەوە، دڵۆپاندن".

ئەسپەرە **espere** [ *aspara* ] - "1- دارۆکەیەکە دەخرێتە دەسکی پێمەرە بۆ پێ لەسەر داگرتن 2- دارۆکەیەکە دەخرێتە تیوان میچ و کۆڵەڵە": وشەکە پێك هاتووە لە پێشگری ئە + سپەرە spere + e. کەرتی "سپەرە" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سپەرsper "ئامرازی پاراستن". وەك ئاشکرایە ئەسپەرە بە هەردوو ماناکەیەوە ئەرکی پاراستن جێ بەجێ دەکا. "ئەسپەرە" دە پێمەرە دا ئەو بەشەیە کە بەری پێی پێمەرەدار دەپارێزی و پێشی ئەوە دەگری لێواری ئاسنەکە لە کاتی پێ داگرتندا گوشاری راستەوخۆ بخاتە بنی پێ. لە مانای دووەمیشدا ئەسپەرە پێشی ئەوە دەگرێ کە کۆڵەکە لە بن گوشارێکی راستەوخۆدا دەرپەرێ واتا دەبێتە پارێزەری کۆڵەکە بۆ وستان لە شوێنی خۆیدا.

ئەسپەك **espek** [ *aspak* ] - "ناوی نەخۆشییەك": وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە حصبة ħasba (Arb.). زمانی فارسی وشە عەرەبییەکە بەکار دەهێنێ. وشەکە دەچێتەوە سەر ↑ئەسپێ espe "زیندەوەری بچووك". ئەو باکتیریەی نەخۆشی گیرۆی "ئەسپەك" دروست دەکا، لە رێگای "ئەسپێ"وە دەگوازرێتەوە و هەر بۆیە نەخۆشینەکە بە ناوی "ئەسپێ"وە کراوە.

ئەسپەناخ **espenax** [ *aspanāx* ] - "گیایەکی خواردنی": پێشتر دە زمانی فارسیدا ispanāġ (P.) گوتراوە. ئێستا شێوەی عەرەبێندراوی وشەکە واتا اسفناج esfanāj (P.) دە زمانی فارسیدا بەکار دێ. بە گوێرەی بۆچووتێك ئەم وشەیە دەبێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ spina (L.) "درك". ئەم وشەیە لە رێگەی زمانی عەرەبی و دواتر سپانی هاتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیشەوە، بۆ وێنە Spinat (G.). دوور نییە و پێوەندی بە ↑ئەسپینگ *espîng* ەوە هەبێ.

ئەسپین **espîn** [ *aspīn* ] - "هۆرە، پواز": دەشێ پێك هاتبێ لە ئە [پێشگر] + سپین sıpîn + e. کەرتی "سپین" دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سەپاندن sepandın [چپاندن čapāndan (P.) واتا بە زۆر تیرا کردن].

ئەسپینگ **espîng** [ *aspīng* ] - "گیایەکی خواردن کە بەهاران دەروێ، شنگ": شنگ šang (P.). شێوەی "ئەسپینگ" کۆنترە لە شێوەی "شنگ"، پێك هاتووە لە پێشگری ئە + سپینگ spnîg + e. "سپینگ" دە بنەرەتدا بە مانای "زراڤ، شلومل، لارا" بووە و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑جینگل cîngıl دا باس

کراون. لەوانەیە↑ئەسپەناخ espenax یش پێوەندی بە "ئەسپینگ"ەوە هەبێ واتا وشەکە بە گۆرانکارییەکەوە بۆ ئەم گیایەش بەکار هاتبێ.

**ئەسپێ espe** *[ aspe ]* - "زیندەوەرێکی بچووک": شپش šepeš (P.). ناوی زانستی ئەم زیندەوەرە pediculus (L.)ە و بنجی وشەکە مانای "پێ" دەدا و ئاماژە بە لاقەکانی ئەم زیندەوەرە دەکا. دە وشە کوردییەکەشدا کەرتەوشەی ↑پێ pe دەردەکەوێ. کەرتی سەرەتای وشەکە، واتا ئەس es- یان [ئە- س] دەبێ ئاماژە بە ژمارەی پێ یەکان بکا و خزم بێ دەگەڵ ↑هەشت heşt یان شەش şeş بێ. دیارە ئەسپێ شەش پێی هەیە، بەڵام دوو ئانتین لە پێشەوە بەدی دەکرێن و لەوانەیە ئەوانیش بە لاق ژمێردرابن و تێکڕا وەک زیندەوەرێکی هشت لاق سەیر کرابێ.

**ئەستاندن estandın** *[ astāndın ]* -"وەرگرتن": هەستاندن hestandın یش دەگوترێ.پێک هاتووە لە پێشگری ئە یان هە + ستاندن standın + (h)e. ستاندن setāndan (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ get (E.)، geta (ON.)، gietan (OE.)"وەرگرتن، بەدەست هێنان". وشە ئینگلیزییەکە خزمە دەگەڵ prehendere (L.)، khandánein (Gr.) "گرتن". دە وشە لاتینی و یۆنانییەکەدا فۆتیمێکی n هەیە کە زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکانەوە و هەروەها دە وشە لاتینییەکەدا پێشگری pre هاتووەتە سەر ئەسڵی وشەکەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *ghed- (IE.)** "گرتن".

**ئەستران estran** *[ astran ]* - "گۆرانی". پێشگری ئە + ستران sıtran + e. بڕوانە ↑ستران sıtran. **ئەستری estırî** *[ astırī ]* - "دڕک، چقڵ": خزمە دەگەڵ ↑ئەستنگ estıng "زەردەواڵە".

**ئەستریلک estırīlk** *[ astırīlk ]* - "چرێش": خزمە دەگەڵ ↑ئەسترین estırîn [سترین، سڕین] سەر بە ریشەیەک بە مانای "پێداخشاندن، رێخشاندن، پێداهێنان".

**ئەسترین estırîn** *[ astırīn ]* - "خاوێن کردنەوە، رێخشاندن": ئەسترین جۆرێک لە خاوێن کردنەوەیە بەهۆی رێخشاندن یاخود پێداخشاندنەوە. ستردن sotordan (P.). پێک هاتووە لە پێشگری ئە + سترین sıtrîn+ e. خزمە دەگەڵ streichen (G.)، strhhan (OG.)، strijken (Nl.)، strike (E.)، stringere (L.) "رێخشاندن، پێداخشاندن"، strigillis (L.) "رنەک"، steicheln (G.) "دەست پێداخشاندن بە مەبەستی ناز کردن"، Streichholz (G.) "دەنکەشەمچە، واتا ئەو ئەوچێوکەی بە رێخشاندن گڕ دەگری". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *ster(ə)- (IE.)** "رێخشاندن، پێداخشاندن".

**ئەستنگ estıng** *[ astıng ]* - "زەردەواڵە": خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە دە زمانی کوردمادی و فارسی و دە زمانە ئەورووپییەکاندا. ئەم وشانە ماناکانی تیژ بوون، تیراچوون، تیهەڵچەقین دەخۆ دەگرن، بۆ وێنە ↑ئەستری estırî "دڕک، چقڵ"، ↑سینگ sîng "دارۆکەی تیژ"، ↑تیخ tîx، ↑چقڵ çıqıl، ↑چەقین *çeqîn*، ستیغ setīġ (P.)"دوندی کێو، تیژایی بان کێو" و هتد.

**ئەستوور estur** *[ astur ]* - "قەوی، قەڵەو": پێک هاتووە لە پێشگری ئە + ستوور stur + e. دەشێ خزم بێ لەگەڵ stark (G.)، stark (E.)، sterk (Nl.)، stark (Sw.) "سەخت، بەهێز". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)ter- (IE.)** "سەخت، توند، رەق".

**ئەستۆ esto** *[ asto ]* - "مل، ئەستوونی سەر": ستۆ sıto ش دەگوترێ. پێک هاتووە لە پێشگری ئە + ستۆ sıto + e. خزمە دەگەڵ ↑ستوون sıtûn یاخود ئەستوون estun.

**ئەستەم estem** *[ astam ]* - ↑ئاستەم astem یش دەگوترێ.

**ئەستیلان estîlan** *[ astīlān ]* - "کایەی کەڵەمستین": دەچێتەوە سەر کرداری ↑ئەستاندن estandın.

**ئەستیو estîw** *[ astīw ]* - "خاکەندازی سۆپە": خزمە دەگەڵ ↑ ئەستیولک estêwılık.

**ئەستێ este** [ *aste* ] - "ئاستێکە لە بەردەستێ دەدرێ و پریشکی ئاگری لێ هەڵدەستێ"؛ ستە sıte و ستێ sıtêش دەگوترێ.

1- یان خزمەدەگەڵ استە aste (P.) [هستە haste (P.)] "بەرد، هەستی، ئێسک، ناوکی میوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ئێسک êsık [کۆنتر: ئێستک êstık].

2- یان لەوانەیە وشەکە پێوەندی بە چەمکی "ئاگر هەڵکردنەوە" هەبێ. ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ aestus (L.) "کڵپە، گەرمی" و aestas (L.) "وەرزی گەرما"، سەر بە ریشەی < *aidh- (IE.)* "سووتان، داغ بوون، هایسان". هەروەها لەوانەیە ↑ئایسان ayîsan [هایسان hayîsan]ی کوردمادی لەم ریشەوە هاتبێ.

**ئەستێرک¹ esterk** [ *asterk* ] - "گۆلاو، ئاوی راوەستاو"؛ ئەستێل estel یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە پێشگری ئە + ستێرک e. + sterk. استخر estaxr (P.)، سەر بە ریشەی < *stel- (IE.)* "وەستاندن، وەستاو، راوەستاو، بێ جووڵە". ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی < *st(h)a- (IE.)* "وەستان، وەستاندن" وخزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەو وشانە کە ئاماژە بە چەمکی "وەستان" دەکەن، وەک ↑ستار sıtar "ئارام"، ↑*ستان sıtan*، ↑ئێست îst، ↑ئەستۆ esto، ↑ستوون sıtûn و هتد.

**ئەستێرک² esterk** [ *asterk* ] - "هەرزاڵ، سەکۆ بۆ کولوپەل لەسەر دانان"؛ پێک هاتووە لە پێشگری ئە + ستێرک e. + sterk. هەروەک وشەکەی سەرتر دەچێتەوە سەر ریشەی < *st(h)ā- (IE.)* "وەستان، راوەستان". دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ Ständer (G.)، stanter (OG.) "جێگەی شت لەسەر دانان". ئەم وشە ئەڵمانییەش دەچێتەوە سەر هەمان ریشە.

**ئەستێرە estere** [ *astera* ] - "قەوارەی ئاسمانی". ستێر ster یش دەگوترێ. ستارە setāre (P.). خزمە دەگەڵ Stern (G.)، starinō (Gt.)، stjärna (Sw.)، star (E.)، ster (Nl.)، aster (Gr.)، stella (L.) [کۆنتر: ster-la]. وشەکە بەشێوەی ↑ئەختەر exter یش دەبینرێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *stĕr- (IE.)* "ئەستێرە". "ئەستێرە" خزمایەتی هەیە دەگەڵ ↑ترێفە tırîfe و ↑ئەسترین estırîn (سرینەوە، سترینەوە). پێوەندیّ "ئەستێرە" و "ئەسترین" لە چی دایە؟ وەک لە ژێر وشەی "ئەسترین"دا باس کرا، ریشەی ئەم وشەیە مانای "لێکخشان، رێکخشان" دەگەیەنێ. کاتێک رووبەرێک بە دەسرە یان بە دەست خاوێن دەکرێتەوە، دە راستیدا لێکخشانی دەست یان دەسرە دەگەڵ رووبەرەکە دێتە ئاراوە. جا لەبەرئەوەی ئەستێرەکان لەسەر "رووبەری" ئاسمان دەخوشن (را دەخوشن)، ناوی ئەستێرە گرێ دراوە بە چەمکی رێخشان یان راخوشین. ئەو ریشەیەی سەرەوە بە مانای "ئەستێرە" خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر کە بریتییە لە ریشەی < *ster(ə)- (IE.)* "رێخشاندن، پێداخشاندن". دە زمانی هیندی کۆندا ئەستێرە tarah (OIn.) بووە. طالع taliɛ (Arb.) "بەخت" لە زمانی عەرەبیدا دەشێ پێوەندی بەم وشەی هیندی کۆنەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "ئەستێرەی بەخت" بووبێ. دە سەردەمانی کۆن و نەزانیدا بەختی مرۆڤەکان [تاکەکان] بە ئەستێرەکانەوە گرێ دەدران و وەک باس دەکرێ لەم دواییانەشدا ئەم دیاردەیە برەوێکی یەکجار بەرچاوی پێ دراوەتەوە.

**ئەستیور estêwır** [ *astewır* ] - "نازا، بێبەر": ئە [پێشگر] + ستیور stêwır + e. بڕوانە ↑ستیور stêwır.

**ئەستیوڵک estêwılık** [ *astewılık* ] - "1- ئاستیک بەسەر تەنووردا رای دەنگێون 2- ئاسنی تێکوەردانی ئاگر": وشەکە لە سێ بەش پێک هاتووە: پێشگری ئە + ستیو+ ڵک stew +(ı)lk + e. کەرتی کۆتایی پاشگری گچکاندنە. وەک لە ماناکە دەردەکەوێ مەبەست میلەیەکی ئاسنە. هەستیف hestîf و هەستیڤ hestîv یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ Stab ‏(G.)، staff ‏(E.)، stav ‏(Sw.) "داردەست، میلە"، stabas ‏(Lit.) "میلە، دیرەکێ"، Steven ‏(G.) "میلەیەک لە دەکەلی کەشتیدا"، سەر بە ریشەی ***-stēb(h)**** ***(IE.)*** "وەستاندن، وەبەر دان، راگیر کردن".

**ئەسرۆ esro** [ *asro* ] - "قۆچ (ی ئاژەڵ): لەوانەشە دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری ئە + سرو sıro + e. کەرتی "سرۆ" پێوەندی بە ↑سەر ser ەوە پەیدا دەکا و دەچێتەوە سەر ریشەی ***< -ker**** ***(IE.)*** "سەر، دوند، قۆچ، بەرزترین شوێن". وشەی Horn ‏(G.)، horn ‏(E)، horn ‏(Sw.)، cornu ‏(L.) "شاخ" لەم ریشەوە هاتوون.

**ئەسر(ین) esr(în)** [ *asr(īn)* ] - "فرمێسک، رۆندک": چەندین وشە دە زمانی کوردیدا بە مانای "ئەسر" بەکار دێن و شێوەی وشەکانیش لە یەک دەچن، وەک ئەسر(ین) esr(în)، هەرس hers، هەرش herş [جێگۆڕکێی فۆنێمەکان]، اشک eşk ‏(P.) [سوانەوەی r] و فرمێسک fırmêsk [دە بنەڕەتدا: فرم fırm + ئێسک esk] و هتد. خزمە دەگەڵ -asrū ‏(Av.)، -áśru ‏(OIn.)، ašara ‏(Lit.) "ئەسرین"، aśrāyate ‏(OIn.)، ašaroju ‏(Lit.) "ئەسرین دەرێژێ"، سەر بە ریشەی هیندوئەورووپی ***< -akru**** ***(IE.)*** "ئەسر، رۆندک". لەوانەیە وشەی "ئەسرین" دە بنەڕەتدا وەک چاوکێ بە کار هاتبێ و دواتر چاوگەکە نەمابێ و وشەکە وەک ناو کەڵکی لێ وەرگیرابێ. جێگۆڕکێی فۆتیمەکان دە وشەکانی هەرس hers و هەرش herş دا دە زمانی فارسیشدا دەبینرێ. دە فارسیشدا لەپاڵ وشەی اشک ašk ‏(P.)، پێشتر ارس ars ‏(P.) بەکار هاتووە کە شێوەیەکی گۆڕاوی وشەکە نیشان دەدا.

**ئەسک esk** [ *ask* ] - "وێنە، عەکس": ئە [پێشگر] + سک sık + e. بنجی "سک" خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑سەکوت sekut "تەرح و دیدار" [سەر و سەکوت]، ↑شەقڵ şeqıl "وێنە، مۆر"، ↑سککە sık(k)e و هتد. ئەم وشانە هەموو بە مانای "شەقڵ، شێوە، وێنە" دێن و دەچنەوە سەر ریشەی ***< -sek**** ***(IE.)*** "بڕین". بەم پێیە مەبەست لە "ئەسک" دە بنەڕەتدا بڕدراوی یاخود هەڵکەنراوی لەسەر دار و بەرد و کانزا بووە کە وەک نیشانە، وێنە و مۆر کەڵکیان لێ وەرگرتووە. ئەم وشەیە فۆتیمەکانی پاش و پێش بوون و بووەتە ئەکس eks یان عەکس ɛeks.

**ئەسکڵ eskıl** [ *askıl* ] - "پۆلوو، پشکۆ": خزمە دەگەڵ ↑هیشک hîşık، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووتان".

**ئەسکۆ esko** [ *asko* ] - "کەوچکی گەورە": ئەسکوی eskö یش دەگوترێ. هەروەها ↑ئەشکەو eşkew هەیە بە مانای "دەفری سواڵەت" [پێشگری ئە + شکەو şkew + e یان ئە + سکو sko + e]. کەرتی "سکو" یان "شکەو" خزمە دەگەڵ ↑سواڵەت suwalet و ↑ساوین sawîn و دەچنەوە سەر ریشەی ***< -(s)kā-bh**** ***(IE.)*** "بە ئامرازی تیژ کار کردن، تاشین، کڕاندن، ساوین".

[تێبینی: ئەم وشانەی سەرەوە هەروەها خزمن دەگەڵ Schif ‏(G.)، scif ‏(OG.)، ship ‏(E)، skepp ‏(Sw.) "کەشتی". مەبەست لەم وشە ژێرمەنییە دە بنەڕەتدا "دەفر، جام، قاپ" بووە و دواتر کەشتی بە "دەفری ناو ئاو" شوبهێنراوە و مانای "کەشتی" لەمەوە پەیدا بووە. دە زمانی کوردمادیشدا هەر ئەم پێوەندییە دەتیوان دوو وشەی "جام" و "گەمێ"دا لەئارا دایە. سەرنجراکێش ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی دیکەش بە مانای "ئەسکۆ" بەکار دێن، کە بریتین لە "چەمچە" [دواتر کەمچە، کەمچک، کەوچک] و "کەشتیلە". چەمچە پێوەندی بە وشەکانی "جام" و "گەمێ"وە هەیە و کەشتیلەش دەگەڵ "کەشتی" خزمە.

ئەم پێوەندییانە ئەوە دەخەنە ڕوو کە چەمکەکانی "دەفر"، "کەوچک" و "کەشتی" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و وشەکانی دەربڕی ئەم چەمکانەش لە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک دەگەڵ یەکتر دان].

**ئەسکەملە eskemle** [ *askamle* ] - "گەمەیەکە بە قەرەپووڵ دەیکەن": ئەسکە + ملە eske + mıle. کەرتی ئەسکە [ئە + سکە e + ske] هەرئەو کەرتەیە کە دە وشەکانی ↑سکە sıke و ↑ئەسکەناس eskenas یشدا دەبینرێ. ئەسکە یان سکە خزمە دەگەڵ ↑شەقڵ şeqıl بەمانای "نیشانە، وێنە، شکڵ". لێرەدا مەبەست ئەو نیشانە یان وێنەیە کە لەسەر قەرەپووڵەکە هەڵکەندراوە. کەرتی دووەمی وشەکە، واتا ملە mıle دەشێ وشەیەکی دیکە بێ و دەبنەڕەتدا مانای "نەخش و نیگار، خەت و خاڵ"ی هەبووبێ. بەراوردی ئەم وشەیە بکە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی malen (G.) "نیگار کێشان، نەخشاندن". ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ ↑ماڵە male "پەڵە یان خاڵی سەر دەموچاوی ژنی دووگیان". مەبەست لە "ئەسکەمەلە" دەبێ دە بنەڕەتدا ئەوە بووبێ کە قەرەپووڵەکان بە رووی ئەسک [وێنەکە] یان "ملە" [خەتەکە، نووسراوەکە]دا دەکەوێ.

**ئەسکەناس eskenas** [ *askanās* ] - "پارەی کاغەز": خزمە لەگەڵ ↑ئەسکەملە eskemle و ↑ئەسک esk "وێنە، عەکس". مەبەست ئەو ئەسکەیە لەسەر قاقەزەکە کێشراوەتەوە.

**ئەسکەنە eskene** [ *askana* ] - "ئامرازی دارکۆڵین": پێشگری ئە + سکەنە e + skene. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ئەشکەفت ekeft، ↑شکاف şıkaf، ↑چەقۆ çeqo، ↑شەقە şeqe (مشار)، ↑چاک çak "قەڵش، کەلێن"، ↑شەقار şeqar و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)kei-* >** "بڕین، قەڵشین، جودا کردن".

**ئەسکنجە eskınce** [ *askınja* ] - "جوجکەسمت": ئە + سکنجە e + skınce. ↑ئەشکنج eşkınc یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schenkel (G.)، scencel (OE.)، shank (E.) و (Sw.) "ران". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑زەنگاڵ zengal. ئەم وشەیە دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑(ئە)شکەنجە (e)şkence "عەزاب، ئازار".

**ئەسڵ esıl** [ *asıl* ] - "بنەچەک، ئۆریگینال": لەم بارەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دوو وشەی هاوپێوەند سەرنج رادەکێشن کە بریتین لە edel (E.)، æđle (OE.) "ئەسڵ، رەسەن" و هەروەها Adel (G.)، adel (MNl.)، æđel (OE.)، ađal (OIs.) "رەسەن، نەجیب زادە، بە ئەسڵ و نەسەب". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. بەڵام دەشێ ئەم وشانە دەگەڵ وشەیٚ "ئەسڵ" لە یەک ریشەوە هاتبن. لەوانەیە وشەکە لە رێگای زمانی کوردمادی یان پارسی کۆن رێی کەوتبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە و بووبێتە اصل asl (Arb.).

**ئەشخەڵ eşxel** [ *ašxal* ] - "دەوەن": وشەکە دەبێ دەبنەڕەتدا بە مانای پنچکەدار و دەوەنی ئیشک بووبێ کە بۆ سووتاندن بەکار هاتووە. ئەم وشەیە بەدوو شێوەی دیکەش دەردەکەوێ، واتا ئیشکەڵ îşkel و ↑هەژگەڵ hejgel و خزمە دەگەڵ ↑ئیشک îşık یان هیشک hîşık.

**ئەشقەمە eşqeme** [ *ešqeme* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑سک sık.

**ئەشکەفت eşkeft** [ *aškaft* ] - "غار، کەلێنی مەزن لە شاخدا": پێشگری ئە + شکەفت e + ışkeft. ئەشکەوت eşkewt یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شکاف şıkaf "دۆڵاب" و شکاف şêkaf (P.) "درز، قەڵش" و شکافتن şêkaften (P.) "قەڵشاندن" و گەلێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا کە هەموویان ئاماژە بە چەمکی "بڕین، قەڵشین، جودا کردن" دەکەن، بۆ وێنە ↑چەقۆ çeqo، ↑شەقە şeqe (مشار)، ↑چاک çak "قەڵش، کەلێن"، ↑شەقار şeqar و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)kei-* >** "بڕین، قەڵشین، جودا کردن".

**ئەشکەڵە eşkele** [ *aškala* ] - "مەنگەنەی دارتاش": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی ***(IE.) *(s)ker-* >** "سووڕان، خوار بوون، با دران" [ئە + شکەڵە e + şıkele]. وشەی schräg (G.) "خوار" لەم ریشەوە هاتووە.

ئەشکەنجە **eşkence** *[ aškenja ]* - "ئازاردان، عەزاب": ↑ئەشکنجە eşkınce.

ئەشکنج **eşkınc** *[ aškınj ]* - "بەندی تیوان ران و پشت، جومگەی سمت":↑ ئەسکنجە eskınce ش دەگوترێ.

ئەشکنجە **eşkınce** *[ aškınja ]* - "1- جەڕ و مەنگەنە 2- شکەنجە": ↑ئەشکەنجە eşkence و ↑شکەنجە şıkence ش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا شکنجە êşkence (P.) بەمانای "ئازار دان" دێ و هەروەها شکنج êşkenc (P.) بەمانای "خوار و خێچی، چرچ و لۆچی، چین و چرووك، با دران" دێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ئەشکنج eşkınc یان ↑ئەسکنجە eskınce بە مانای "بەندی تیوان ران و پشت، جومگەی سمت". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی< *(s)keng-* (IE.) "خوار، بادراو". چەمکی "با دان" لە مانای یەکەمی ئەم وشەیە، واتا لە "جەر و مەنگەنە"دا خۆی دەردەخا. هەرچی مانای "ئەشکەنجە و ئازار دان"یشە، دەبێ بە جۆرێك پێوەندی بە چەمکی "بادان و خوار بوون"ەوە هەبێ. لەوانەیە ئەشکەنجەدان لە بنەڕەتدا با دانی دەست و لاق بووبێ، یان مەبەستەکە خوار بوونەوە و قەد بوونی لەشی مروڤ لەکاتی لێدان و کوتاندا بووبێ.

[تیبینی: لە زمانی ئینگلیزیدا torture (E.) بە مانای "ئەشکەنجە" بەکار دێ. ئەم وشەیە ریشەی لاتینی هەیە و دەچێتەوە سەر tortūra (L.) "با دان"].

ئەشکەو **eşkew** *[ aškaw ]* - "دەفری سواڵەت": ئە[پێشگر] + شکەو şkew + e. کەرتی "شکەو" خزمە دەگەڵ ↑سواڵەت suwalet و فۆتیمەکانی شێوەیەکی کۆنتر نیشان دەدەن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ئەسکوی eskö [↑ئەسکۆ esko] "کەوچکی گەورە" و ↑ساوین sawîn و دەچنەوە سەر ریشەی < *(s)kā-* *bh-* (IE.) "بە ئامرازی تیژ کار کردن، تاشین، کڕاندن، ساوین".

ئەغیار1 **eġyar 1** *[ aġyār ]* - "بەئاگا": خزمە لەگەڵ ↑ئاگا aga.

ئەغیار2 **eġyar 2** *[ aġyār ]* - "بێگانە": دەچێتەوە سەر < غیر *ġayr* (Arb.).

ئەفرە **efre** *[ afra ]* - "زۆرانی، زۆرەوانی": هەروەها عەفرە εefre. لەوانەیە پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑زۆر[2] zor "هێز، زەخت". ئەم وشەیە لە کۆندا زاڤەر/ زەڤەر بووە.

2- ↑کەڤر kevır "بەرد" [جێی ئاماژەیە کە وشەی "بەرد" دەگەڵ وشەی "پاڵەوان" خزمە].

3- *capere* (L.) "گرتن" [یەکتر گرتن]. ↑کیپ kîp کردن دەگەڵ ئەم وشە لاتینییە خزمە.

ئەفسانە **efsane** *[ afsāne ]* - "چیرۆکی کەونارا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ épos (Gr.) "قسە، گێرانەوە، چیرۆکی قارەمانان". ئەم وشە یۆنانییە دەبێتە خزم دەگەڵ vox (L.) "دەنگ" و vocare (L.) "بانگ کردن" و erwähnen (G.) "باس کردن"، سەر بە ریشەی < **uek-* (IE.) "قسەکردن، بێژتن". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون وەك ↑بێژتن *bêjtın*، ↑وشە wşe، ↑ئاواز awaz و هتد.

ئەڤین **evîn** *[ avīn ]* - "خۆش ویستن، حەزی بەتین": پێشگری ئە + ڤین vîn + e. کەرتی سەرەکی وشەکە خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشە دە زمانە ئەورووپییەکاندا وەك una (OIs.) "قایل بوون، راحەت بوون"، unwunands (Gt.) "خەمگین، نارەحەت"، gewöhnen (G.) "خوو پێگرتن" و Wonne (G.) "خۆشی، لەززەت"، -vanas (OIn.) "حەز، لەززەت"، vánati (OIn.) "حەز دەکا، ئارەزوو دەکا"، venus (L.) "خواژنی دلداری"، Wunsch (G.) "حەز، ئارەزوو"، wini (G.) و wine (OE.) "یار، دۆست"، Wahn (G.) "خولیای شێتانە، جنوون" [دە بنەڕەتدا: ئاوات و ئارەزوو]، winnan (Gt.) "ئازار کێشان"، gewinnen (G.)، win (E.) و vinna (Sw.) "بەدەست هێنان، بردنەوە" و هتد. ئەم وشانە دە کوردمادیدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑ڤیان vîyan "خۆشەویستی، دلداری" و ↑نەباندن nebandın "وە خۆ نەگرتن، خوو پێ نەگرتن،

خۆش نەویستن" و هەروەها ↑ویستن wîstın. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *uen(ə)- >* "بە دوای شتێک کەوتن، چاو لە دووی شتێک بوون، هەڵوەدای شتێک بوون".

**ئەگریجە egrîce** [ *agrīja* ] - "بسک، مووی بەسەر لاجانگدا کەوتوو": پێشگری ئە + گریجە e + g(ı)rîce. کەرتی سەرەکی وشەکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑خوری xurî یان هری hırî "پەشم، مووی ئاژەڵ"، هەروەها دەگەڵ ↑کورک kurk، کرک kork (P.) "کورک، کوڵکە"، Haar (G.)، hair (E.)، har (Sw.)، haar (Nl.) "موو"، سەر بە ریشەی *(IE.) *ker(s)- >* "زوور، سیخ بوون".

[تێبینی: هەر ئەم پێوەندییەی سەرەوە لەنێوان دوو وشەی "بسک" و "پەشم"یشدا بەدی دەکرێ].

**ئەگیت egît** [ *agīt* ] - "ئازا": ئەگید egîd یش دەگوترێ. دە زمانی عەرەبیدا بووەتە عقيد εaqīd (Arb.) و بەمانای "کولۆنێل" بەکار دێ.

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئازا aza "بوێر".

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑زات zat "بوێری" [پێشگری ئە e + زات zat ← ئەزات ← ئەگیت].

**-ئەڵە -ele** [ *-ala* ] - پاشگری گچکاندن: بڕوانە ↑-لە2 -le "پاشگری گچکاندن".

**ئەم em** [ *am* ] - "جێناوی ئاماژە بە نیزیک": [ئەمرۆ، ئەمساڵ، ئەم کابرایە]. این în (P.). خزمە دەگەڵ himma (Gt.) "ئەو، ئەم" [himma daga واتا ئەمرۆ]، him (E.)، ihm (G.)، imu, imo (OG.). خزمە دەگەڵ ↑ئەو ew.

**ئەمان eman** [ *amān* ] - "پارێزراوی": ئەمان لە دەست تۆ، واتا لە دەست تۆ پارێزراو بم. ↑ئامان2 aman یش دەگوترێ.

**ئەمەک emek** [ *amak* ] - "وەفا": ئەمەگ emeg، هەمەک hemek و هەمەگ hemeg یش دەگوترێ. دە زمانی کوردمادیدا جگە لەم وشەیە "سفەت"یش هەیە [بەسفەت، بێسفەت] کە ئەویش مانای "وەفاداری" دەگەیەنێ. وەک لەژێر وشەی "سفەت"دا شی کراوەتەوە، ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا "مانای *سفت*، سەخت" دەگەیەنێ و دە بنەڕەتدا مەبەست سفت و سەخت بوون لە پێوەندی دایە، بە وتەیەکی دیکە پێوەندییەکی سفت و سەخت و بە هێز کە لە کەمی نادا و لاواز نابێتەوە. وشەی "ئەمەک" یان "ئەمەگ"یش هەر بە هەمان شێوە دروست کراوە. ئەم وشەیە پێک هاتووە لە پێشگری ئە + مەک e + mek [یان e + meg]. کەرتی مەک mek- یان meg- خزمە دەگەڵ چەندین وشەی زمانی کوردمادی کە ئاماژە بە "هێز و توانایی" دەکەن، وەک ↑مێش3 mêş "هێز(ی کار و چالاکی)"، ↑میچ mîç "پێداگرتن"، ↑میجک mîcık "گورجوگۆڵ"، ↑مزوور mızūr "بەهێز"، ↑موکوڕ *mukur* [مکوڕ mıkur] "پێداگر، سەرسەخت"، [ناوی ناوچەی موکریان لەم پێوەندییەدایە] و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Macht (G.)، mahts (Gt.)، meaht (OE.)، mecht (OF.) "هێز، دەسەڵات"، mögen (G.)، may (E.) "شیان"، mogu (Rus.) "دەتوانم"، megt (Let.) "توانایی، دەستەڵات"، māchaná (Gr.) "ئامراز، ئامێر"، سەر بە ریشەی *(IE.) *magh- >* "توان، هێز". کەوابوو مانای بنەڕەتی "ئەمەگ" هەمان "هێز و توان"ە و مەبەست ئاماژە کردن بە پێوەندییەکی بەهێز و پتەوە.

[تێبینی1: شیاوی باسە کە دە زمانی ئاڵمانیدا وشەی Treu هەیە بە مانای "وەفا، ئەمەگ". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دار dar، داربەڕوو" و لەمیشدا مەبەست دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بە سەخت و پتەو و بە هێز بوونە. تێبینی 2: ئاشنایەکی باکووریم دەیگوت "ئەمەک" لای ئەوان مانایەکی وەک "ئەرک و زەحمەت" دەگەیەنێ. ئەو لای وابوو وشەکە تورکییە، چونکوو دەگوترێ emeklî "پڕزەحمەت". دیارە پێوەلکانی پاشگرێکی زمانی تورکی، مەرج نییە وشەکە بکا بە تورکی! ئەم وشە چووەتە ناو زمانی تورکی و ئەوانیش بەپێی رێزمانی خۆیان پاشگریان پێوەلکاندووە و بەکاریان هێناوە. نموونەی لەم بابەتە لە هەموو زمانەکاندا گەلێک زۆرە. لەوانەیە زشەکە دە زمانی کوردمادیدا هەر لە کۆنەوە دوو مانای هەبووبێ. سەبارەت بە مانای "ئەرک، زەحمەت" دەتوانین دەگەڵ وشەی

"ئاستەم، ئاستەنگی" یان دەگەڵ وشەی "سەختی" بەرهەفی بکەین. ئەم وشانەش دە ریشەدا مانا "سەخت و پتەو بوون، بەهێز بوون" دەبەخشن].

**ئەنتیکە** **entîke** *[ antīka ]* - "کۆنەی بەنرخ": دەچێتەوە سەر antique ‏(.Fr). ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر antiquus ‏(.Lat) "پێشان، کۆن" و لەوێشەوە بۆ anticus ‏(.Lat) "ئەوەی پێشەوە" و دواجار بو ante ‏(.Lat) "پێش". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەنێ hene دە زمانی کوردمادیدا بەمانای "تیوچاوان" کە دە فارسیدا پێی دەگوترێ "پیشانی".

**ئەنتین** **entîn** *[ antīn ]* - "دژایەتی کردن، خۆش نەویستن": هەروەها عەنتین εentîn. پێوەندی هەیە بە antí ‏(.Gr) "بەرەوروو، لەپێش، لەدژ". ئەم وشە یۆنانییە خزمە لەگەڵ ↑حاند ħand "رووبەڕوو" و ↑هەنێ hene "تیوچاوان".

**ئەنجام** **encam** *[ anjām ]* - "دوایی، ئاکام": وێ دەچێ وشەکە لە فارسی وەرگیرابێ و پێوەندی هەبێ بە هنجیدن hanjīdan ‏(.P) "دەرکێشان(ەوە)، هەڵکێشان، دەرهێنان".لەوانەیە "ئەنجام" وشەیەکی کۆن نەبێ و زمانناسە فارسەکان ئەم وشەیان لەم کردارەی سەرەوە داتاشیبێ و مەبەستیان لە وشەکە "نەتیجە، دەرهاوردە" بووبێ ودواتر لەمەوە مانای "کۆتایی" پەیدا بووبێ، چونکوو نەتیجەی کار پێوەندی بە کۆتایی کارەکەوە هەیە. ئەم کردارە فارسییە خزمە لەگەڵ ↑هێنجان hencan [هەڵهێنجان helhencan "ئاو لە چاڵاو دەرهێنان بە سەتڵ"].

**ئەنجنین** **encınîn** *[ anjınīn ]* - "لەت لەت کردن": پێشگری ئە + ناوگری ن + جنین cınîn + n + e. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑جنین cınîn.

**ئەنجومەن** **encumen** *[ anjuman ]* - "یەکێتی، کۆما، جڤات": انجمن ancoman ‏(.P). پێشگری ئە + ناوگری ن + جومەن cumen + n + e. کەرتی جومەن cumen شێوەیەکی کۆنترە لە جڤین cıvîn "کۆ بوونەوە، کۆم بوون". وەك لە زۆر وشەی دیکەشدا، فۆتیمی m گۆراوە بە v. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑جڤین cıvîn. خزمە دەگەڵ ↑جڤات cıvat.

**ئەنجەت** **encet** *[ anjat ]* - "بیانوو، دەلیل": < **حجة** *ħujja(t)* ‏(*.Arb*).

**ئەنجینە** **encîne** *[ anjīna ]* - "ئێزینگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئێزینگ ezîng "داری سووتاندن". **ئەندازە** **endaze** *[ andāza ]* - "قاس، بڕ، چەندایەتی": اندازە endaze ‏(.P). دەچێتەوە سەر ↑هەند hend یان ↑هێند(ێک) hend(ek). دە زمانی عەرەبیدا بووەتە هندسة handasa ‏(.Arb) "ئەندازەناسی".

**ئەندام** **endam** *[ andam ]* - "لەش، بەشێک لە لەش": اندام andām ‏(.P). لەوانەیە بەم شێوەیە پێک هاتبێ: پێشگری ئەن en + دام dam. لە زمانی ئەوێستادا han-dāman ‏(.Av). "ئەندام". لە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 131) کەرتی ئەسڵی وشەکە بردراوەتە سەر ریشەی *da-* "دانان، رۆنان".

**ئەندێشە** **endêşe** *[ andeša ]* - "1- هزر و بیر 2- نیگەرانی": اندیشە andīše ‏(.P). دەشێ بەم شێوەیە پێک هاتبێ: پێشگری ئەن en + دێشە dêşe.

1- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 136) بە خزم داندراوە دەگەڵ -daēs ‏(.Av) "نیشان دان" و sam-deśa ‏(.OIn) "ئەمر، فەرمان، راسپاردە"، سەر بە ریشەی < *deik-** ‏(*.IE*) "نیشان دان، بەدیارخستن". بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دژ2 dıj "شەقڵی خەرمان".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تاسە tase "حەز، ئارەزووی بەتین و ژان".

**ئەنقەست** **enqest** *[ anqast ]* - بە ئەنقەست واتا لەرووی زانین. دە ئەسڵدا وشەیەکی عەرەبییە، < *عن قصد εan qasd* ‏(.Arb).

ئەنگاوتن **engawtın** [ *angāwtın* ] - "پێکان، لێدانی نیشانە": پێشگری ئەن + گاوتن en + gawtın . کەرتی "گاوتن" خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کەوتن kewtın [کەفتن]. مەبەست لە "ئەنگاوتن" دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە بەردێک یان پللارێک وە نیشانەیەک کە*وتووە*.

ئەنگران **engıran** [ *angırān* ] - " زۆر دەوڵەمەند بوون": ↑هەنگران hengıran یش دەگوترێ.

ئەنگرین **engırîn** [ *angırīn* ] - "تووڕە بوون": عەنرین ɛenrîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هەنجەت[1] hencet "رەق، تووڕەیی" [لە هەنجەتان واتا لە رقان، لە داخان]. دە زمانە ئەورووپییەکاندا خزمە دەگەڵ anger (E.)، angra (ON.) "نارەحەتی، توورەیی".

ئەنگوتک **engutık** [ *angutık* ] - "گونتک، تۆپەڵەهەویر": پێک هاتووە لە ئەن + گوت [کەرتی ئەسڵی] + ک [پاشگری گچکاندن] en + gut + ık. بنجەوشەی "گوت" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گود gud "خڕ، گرۆڤەر".

ئەنگوست **engust** [ *angust* ] - "قامک": انگشت angošt (P.). بە پێی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 140) خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک angulus (L.) "گۆشە" و Angel (G.) "قوڵاپ" سەر بە ریشەی < *(IE.) *ank-, *ang-* "خوار بوون، چەمانەوە". دیارە وشەی ئەنگوستیلە engustîle ش پێوەستە بەم وشەیە.

ئەنگووچک **enguçık** [ *anguçık* ] - "لەوەندی، بەندی قۆڵی کراس": گوچک guçık، قۆچک qoçık و هەنگوچک henguçık یش دەگوترێن. پێشگری ئەن + گوچک en + guçık. "گوچک" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گۆشە *goşe*. ئەو بەندە شێوەیەکی گۆشەیی هەیە واتا لەلای سەرەوە پانە و لەخوارەوە باریک دەبێتەوە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑کۆشکە koşke "قەڵاخ"، ↑قووچ quç "بڵیندی مەخرووتی"، ↑قووچەکە quçeke و ↑کۆچکە koçke و هتد.

ئەنگووتن **engûtın** [ *angūtın* ] - "*دەرکەوتنی ئەستێرە*": پێشگری ئەن + گووتن en + gûtın. کەرتی "گووتن" شێوەیەکی دیکەیە کە ↑کەوتن kewtın یان کەفتن keftın. مانای بنەڕەتی وشەکە "کەوتن"ە، بۆ وێنە کاتێک دەڵێن هەتاو ئەنگووت، مەبەست کەوتنی هەتاوە بەسەر وڵاتدا. خزمە دەگەڵ ↑هەڵەنگوتن helengutın و ↑ئەنگاوتن engawtın.

ئەنگۆ **engo** [ *ango* ] - "ئێوە، جێناوی کەسی دووەمی کۆ": ↑هون hun یش دەگوترێ کە شێوەیەکی دیکە لە وشەی "ئەنگۆ" نیشان دەا. خزمە دەگەڵ uns (G.)، uns (Gt.)، us (E.)، oss (Sw.)، nos (L.)، nas (OIn.) سەر بە ریشەی < *(IE.) *ns-* "جێناوی بەرکاری کەسی یەکەمی کۆ". فۆتیمی s لە وشە هیندوئەورووپییەکاندا بووەتە g لە وشە کوردمادییەکەدا.

ئەنگۆر **engor** [ *angor* ] - "ترێ": انگور engur. خزمە دەگەڵ ↑هەنگوین hengwîn.

ئەنگۆرە **engore** [ *angore* ] - "دەمی ئێوارە": دە بنەڕەتدا لە دوو کەرتی هەنگی ئێوارە hangî eware پێک هاتووە، بە مانای دەمی ئێوارە. بڕوانە ↑هەنگ heng و ↑ئێوارە êware.

-ئەنگێز **-engz** [ *angez* ] - ئەم وشەیە دە زمای کوردمادی و فارسیدا وەک پاشگر بەکار دێ. دە کوردمادیدا بۆ وێنە دەگوترێ "شەرەنگێز" یان "شەرەنگێزانە". دە زمانی فارسیدا زۆرتر باوە [شورانگیز، هیجان انگیز، غم انگیز]. وشەکە دەچێتەوە سەر کرداری انگیختن angīxtan (P.) "هەژاندن، هاروو‌ژاندن". دە فارسی ئەمڕۆییدا پێشگری بر bar دەلکێنرێ بە چاوگەکەوە و دەبێتە برانگیختن ber angīxtan (P.). رەگی کردارەکە لەکاتی ئێستادا دەبێتە گیز -gīz [می انگیزد mī angīzad (P.) واتا "دەهەژێنێ، دەهاروو‌ژێنێ"]. هەروەها وشەی انگیزە angīze (P.) دە زمانی فارسیدا بە مانای "پاڵنەر، مۆتیڤ" بەکار دەهێنرێ. چاوگە فارسییەکە لە چەند کەرت پێک هاتووە: پێشگری ان an + بنجی گیز gīz [گیخ gīx] + نیشانەی بە چاوگ کردن یان بە کردار کردن. بەوتەیەکی دیکە ئەسڵی چاوگەکە دەبێ گیزتن *gīztan** یان گیختن *gīxtan** بووبێ و بەشەکانی دیکەی پێوە لکابێ. لەم بارەوە دە زمانی کوردمادیشدا چەندین نموونە هەیە، وەک "ئەنگاوتن، ئەنگووتن، ئەنگران" کە لەوانیشدا ئەسڵی چاوگەکان کەرتی ئەن

en پێوه لکێنراوه. سەبارەت بە بنجی گیز -gīz کە چاوگەکەی لەسەر دارێژراوە، دەتوانین بیبەستینەوە بە یەکێك لەم دەستەوشانەی خوارەوە:

1- ↑ئاخێز a-xez، ↑هەژان *hejan*، ↑غیژ ğîj "لوور بوونەوە"، ↑هاج hac [هارو هاج] و هتد. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە "بزوان" و بەتایبەتی بزواتیکی توند و خێرا دەکەن.

2- ↑گژیان gıjyan "شێوان و لێکدرانی موو"، ↑گیزان gîzan "لێکدرانی تراو، ژان"، ↑گژەبا gıjeba، ↑گیژ gej، ↑گاشە gaşe، ↑کاس kas، ↑گەشکە geşke، ↑گیچەڵ geçel. ئەم وشانە جۆرێك لە هەژان یان بزواتیکی تێکەڵ پێکەڵ نیشان دەدەن.

**ئەو ew** *[ aw ]* - "جێناوی ئاماژە بە دوور": خزمە دەگەڵ he (E.)، he (OS.)، hinn (ON.) [هەڵی سەنگینە دەگەڵ این în (P.) و هین hîn ی کوردمادی]. دە زمانی ئەڵمانی کۆندا hiutu (OG.) [کۆنتر: hiu tagu] هەبووە بەمانای "ئەمرۆ" کە دە زمانی ئێستادا بووەتە heute (G.) "ئەمرۆ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *(IE. ) *k(e)i-,*ke -* "ئەو، ئەم".

**ئەورا ewra** *[ awrā ]* - "برسی": پێشگری ئە + ورا e + w(ı)ra. کەرتی "ورا" دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ ↑برسی bırsî.

**ئەوق ewıq** *[ awıq ]* - "قەتیس، گیرخواردوو": هەروەها ئەوقە ewqe هەیە بە مانای "گیرۆدە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ئەوك ewık و دەگەڵ یوغ yūġ (P.) "نیر" و ↑یەخە *yexe* و ژمارەیەك وشەی دیکە کە ئاماژە بە "لێکبەستن، گرێ دان، پێوەست بوون" دەکەن.

**ئەوك ewık** *[ awık ]* - "بەرمل": ئەوك دەبنەڕەتدا بەمانای "یەخە" بووە و خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑یەخە *yexe* و خزمە دەگەڵ دەگەڵ یوغ yūġ (P.) "نیر" و ژمارەیەك وشەی دیکە دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکاندا.

**ئەوەتا eweta** *[ awatā ]* - "جێناوی ئاماژە بە شوێن": ئەوە ewe + تا ta. بۆ کەرتی یەکەم بڕوانە ↑ئەو ew. کەرتی دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ the (E.)، that (E.) و da (G.) "ئەو، ئەوە، ئەوێ" و ↑تا ta سەر بە ریشە (ڕەگەجێناو)ی < *(IE. ) *to-, *tod-*.

**ئەوەندە ewende** *[ awanda ]* - "ئەو ئەندازە، ئەوقاس": ئەو + هەندە ew + hende. بڕوانە ↑هەند hend و ↑هێندێك hendek.

**ئەها eha** *[ ahā ]* - "وشەی ئاگادار کردنەوە و وریایی دان": ئەم وشەیە بە چەند مەبەستێك بەکار دێ و بۆ وێنە دەگوترێ "ئەها نەیکەی، ئەها مەهێڵە، ئەها لا چۆ" و هتد. یان کاتێك کەسێك جۆرێك لە زانیاری دەداتە لایەنی بەرانبەر، ئەو لایەنە دەڵێ "ئەها"، واتا ئێستا دەزانم چ باسە [لەم دۆخەدا وشەکە درێژ دەکرێتەوە ehaaaa]. کاتێك شتێك دەقەومێ، بۆ وێنە کیفی پارە لە بیر دەچێ، دەگوترێ "ئەها کیفەکەم لەبیر چوو". هەر ئەم وشەیە جاران بەشێوەیەکی خۆشتر لە ئاودەستخانەی مزگەوتەکان ڕەد و بەدەڵ دەکرا، لەتیوان ئەو کەسەی دەیهەویست خۆی بە ژوورێکی ئاودەستخانەکەدا بکا و ئەو کەسەش کە لە ژوورەکە دانیشتبوو و خەریکی ئیشەکەی بوو! لەم دوخەدا وشەکە بە ناچاری و لەبەر پەلەپەلان کورت دەکراوە و سەر و گوێی دەپەڕا [ıhı]؛ زۆرجاریش وشەکە، "ح"یەکی خەستیان تێ دەخست و بە شێوازێکی عەڕەبی دەگوترا ıḣḣı. لە هێندێك دۆخدا وشەکە بە شێوەیەی ↑ها ha یان ↑هانێ hane بەکار دێ [ها ئەو توورەکەم لێوەربگرە، ها ئەو کراسە لەبەر بکە] یان [هانێ ئەو کراسە لەبەر بکە]. دە زمانی فارسیشدا دەگوترێ ها hā (P.) و هان hān (P.) ["هان ای پسر عزیز دلبند"]. ئەم وشانە وێ دەچێ خزم بن دەگەڵ ↑ئاگا aga. ئەم وشانە جۆرێك لە بە ئاگا کردن و ئاگاداری دەربڕین نیشان دەدەن. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑های hay "ئاگا" و هایدار haydar "ئاگادار" بەکار دێن.

**ئەهاك ehak** *[ ehāk ]* - "کلس، قسڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاهەك ahek. اهك āhak (P.). خزمە دەگەڵ ↑ئاخ ax و ↑خاك xak. دە بنەڕەتدا هەرسێ وشەی "ئاخ"، "خاك" و "ئەهاك" یەك وشە بوون و دواتر سێ

شێوەیان پەیدا کردووە. هەر لەم وشەیەوە چەند وشەی دیکەش پەیدا بوون وەک ↑ئەیاغ eyaġ "فازلاب، بەرماو، بنژیل"، ئاشاغە aşaġe یان ↑ئاشاخە aşaxe "ئاشغاڵ، بێکەڵک" و ↑ئاشغاڵ aşġal. هەموو ئەو وشانە دەبنەڕەتدا بەمانای ئەو "خاک" و خڵتە و خۆڵە بوون کە وەک بەرماوی دوای پاک کردن و خاوێن کردنەوە بەجێ ماوە و فڕێ دراوە.

**ئەهوورا ehura** *[ ahūrā ]* - ئاهوورا ahura ش دەگوترێ. ئەهوورامەزدا ehurāramezda ناوی ناوی خودا لە ئایینی زەردەشتی دایە. وشەکە دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری ئە e [ئا a] + هوورا hura. هوورا شێوەیەکی کۆنە لە وشەی ↑خۆر xor "هەتاو". مەزدا mezda بە مانای ↑مەزن mezın ە و خزمە دەگەڵ ئەم وشەیە. بەم جۆرە ئەهوورامەزدا مانای "خۆری مەزن" دەبەخشێ. هەروەها دەشێ ناوی گەلی کۆنی خووری xurî [هووری hurî] پێوەندی بە وشەی "خۆر" [هۆر، هوور]ەوە هەبێ.

[تێبینی: ماوەیەک لەمەوبەر هەواڵێک لەسەر ئینتێرنێت بڵاو کراوە کە تێیدا باس لەوە کرابوو، کۆمپانی ماشێن سازی "مەزدا"ی ژاپۆنی ئاشکرای کردووە کە ناوی "مەزدا"یان لە وشەی ئەهوورامەزدا وەرگرتووە].

**ئەی ey** *[ ay ]* - "دەنگی هاوار و بانگ کردن": ↑هەی hey ، ئۆی oy و هۆی hoy یش دەگوترێ. ای ey (P.). دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە دەگوترێ o mein Gott "ئەی خودای من"، o Tannenbaum "هۆ(ی) دارەکاجەکە" [گۆرانی بەناوبانگی کریسمەس لە ئەڵمان].

**ئەیاغ eyaġ** *[ ayāġ ]* - "فازلاب، بەرماو، بنژیل": خزمە دەگەڵ ↑ئەهاک ehak "خاک". مەبەست لە "ئەیاغ" دە بنەڕەتدا ئەو "خاک و خۆڵ" بووە کە نیشتووە و ماوەتەوە.

# ئـی (î)

**ئیپه îpe** ‏[ *īpa* ] - "بەندێکی قایشە نیری پێ لە ئاموور دەبەستن": خزمە دەگەڵ Haft (G.) "دەست بەسەرکراوی، بەستراوەیی"، hafta (OG.)، ha ft (OE.)، haptr (OIs.) "دەست بەسەرکراو، دەست بەسەرداگیراو، بەندکراو، بەستراوە"، haften (G.) "بەستراوە بوون، پێوەنووسان، قایم بوون"، heften (G.)، ha ftan (OE.)، häfta (Sw.) "بەستن، قایم کردن، پێوەنووساندن" و هەروەها Heft (G.) کە هەم مانای "دەسک، دەستک، دەسگیرە" دەدا و هەمیش مانای"دەفتەر" [پەڕەکاغەزی لێکبەستراو]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *kap- >** "گرتن". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە وەک ↑قاپ qap و ↑کیپ kîp "قایمکراو، پێکەوە نووساو"، ↑هەبن hebın "بەندی سینگی رەشماڵ"، ↑ئۆیە oye "نەواری پووڵەکەدار" [پووڵەکەی لێکبەستراو]، ↑پەراو peraw "دەفتەر" [پەڕ- ئاو] پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. "قاپ" ئەو فەزا بەستەیە کە شتی تێدا رادەگیرێ، وەک ئەوەی شتەکە لەوێدا بەند و راگیر کرابێ. "کیپ کردن"یش بەو مانایە دێ کە دەرگا و پەنجەرە بە تەواوی ببەسترێ، بۆ ئەوەی دەنگ یان هەوا پێیدا تێ نەپەڕێ.

**ئیتر îtır** ‏[ *ītır* ] - "ئیدی": ↑*هیتر hîtır* یش دەگوترێ. هەروەها ↑تر$^2$ tır هەیە وەک "رۆژێکی تر، کەسێکی تر"، کە ئەمەش پێوەندی بەم وشەوە هەیە.

**ئیخ îx** ‏[ *īx* ] - ئیخ دانی وشتر واتا دانیشاندن و چۆک دادان بە وشتر. ↑ییخ yîx ش دەگوترێ. هەروەها دەگوترێ وشترەکە ئیخی خوارد واتا چۆکی دادا. خزمە دەگەڵ hocken (G.) "هەڵتڕووشکان"، hūchen (MG.)، hūka (OIs.) "خۆ مات کردن، خۆ خەفتاندن" [دە بنەڕەتدا: خۆ داهێنانەوە، خۆ نووشتاندنەوە]، سەر بە ریشەی **(IE.) *keu- >** و دوورتر ریشەی **(IE.) *kug- , *koug- >** "چەماندن، نووشتاندن، خوار کردنەوە".

**ئیدی îdî** ‏[ *īdī* ] - "ئیتر": دە شێوەزاری سەرووودا ئێدی edî دەگوترێ. دە زمانی کودمادیدا چەندین وشە لەم پێوەندییەدا بەرچاو دەکەون، کە پێوەندییان بەیەکەوە روون و ئاشکرایە. بەڵام ئەوە کە پێوەندی ئەم وشانە دەگەڵ یەکتر بە وردی چۆناوچۆنە، جێی هەڵوەستە و لێکۆڵینەوەیە. ئەم وشانە بریتین لە ↑تر tır [رۆژێکی تر، کەسێکی تر]، ↑هیتر hîtır [یان ئیتر îtır]، ↑دی dî [رۆژێکی دی]، دیکە dîke. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ دیگر dīgar (P.). من پاش هەڵسەنگاندنی ئەم وشانە دەگەڵ یەکتر بەم ئەنجامەی خوارەوە گەیشتووم: دەشێ وشە لە کۆندا *دیتەر dîter** بووبێ. ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا بووەتە دیگر dīgar (P.)، واتا فۆتیمی t گۆڕاوە بۆ g. [گۆڕانی لەم چەشنە دە وشەی دیشدا بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە "ئاتر" بووەتە "ئاگر"، یان بڕوانە دوو وشەی *ترانِدن* "چاوەنۆڕی کردن" دە زمانی کوردمادیدا و "نگریستن" دە فارسیدا]. دە زمانی کوردمادیدا وشەکە بووەتە ↑دیکە dîke و دواتر دیسان سواوەتەوە و بووەتە ↑دی dî [رۆژێکی دیکە، رۆژێکی دی]. دە زمانی فارسیدا وشەی "دیگر" هەم وەک ئاوەڵناو بەکار دێ [رۆز دیگر] و هەم دەوری ئاوەڵکردار دەبینێ [دیگر نمی روم، او دیگر انجا نبود]. بۆ ئەم دۆخەی دوایی دە زمانی کوردمادیدا وشەی دی نیشانە یان ئامرازێکی خراوەتە سەر، واتا ئی î یان ئێ e [ئیدی نارۆم، ئەو ئێدی لەوێ نەبوو]. ئەم نیشانەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئامرازی خستنەپاڵی ↑هی$^2$ hî/ ئی î [هی می، ئی من]. لەوە دەچێ کە هەر ئەم ئامرازە لە وشەی ↑هیتر hîtır / ئیتر îtır یشدا رۆڵ بلەیزێ. ئێستا بگەڕێینەوە سەر وشەی دیتر dîtır کە شێوەی کۆنتری وشەکە بووە. ئەم وشەیە پێک هاتووە لە دوو کەرتی دی dî + تر tır. کەرتی دووەم دە زمانە خزمەکانیشدا دەبینرێ، وەک لەم وشانەی

خوارەوەدا: (G.) ander، (E.) other، (OIs.) annar، (OIn.) ántara-h، (Lit.) antras "دی، دیکە، ئیدی، ئەوی دی"، سەر بە ریشەی *-onotero (IE.) < "تر، هیتر، ئەویتر". ئەم ریشەیە خۆی لە دوو کەرت پێک هاتووە، واتا کەرتی -ono* ,-eno* (IE.) "ئەو، ئەوێ" و -tero (IE.). ئەم وشەی دوایی خزمە دەگەڵ نیشانە یان ئامرازی ↑تر tır کە دە زمانی کوردمادیدا بۆ ئاوەڵناوی "باڵاتر" بەکار دەهێنرێ، وەک باشتر، جوانتر، سەرتر و هتد. بەم جۆرە مانای وشە ئەورووپییەکان دە بنەڕەتدا دەبێتە "ئەوتر"، هەر وەک "باشتر، جوانتر". تا ئێرە کەرتی "تر" دە وشەی "دیتر"دا ساخ کراوە، دەمێنێتەوە کەرتی "دی". وەک لە وشە ئەورووپییەکاندا دەبینرێ، کەرتی یەکەم دە بنەڕەتدا جێناوێکە بە مانای "ئەو". هەر بەم پێیە دە وشەی "دیتر"یشدا کەرتی یەکەم دەبێ ئەو مانایەی هەبێ. ئەگەر لەم تێروانینەوە بە دوای ریشەی ئەم وشەیەدا بگەڕێین، تووشی چەند وشەیەک دەبین کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ئەم مانایە دەبەخشن، واتا (G.) die، (OG.) diu، (Nl.) de، (E.) the، (Gr.) tó "ئەو"، سەر بە ریشەی *-to (IE.) < "ئەو". لەوانەیە هەر ئەم وشەیە بێ کە لە وشەکانی دوێ dö، دوێکە döke، ↑دوێنێ döne [دیروز dīrūz (P.) و دیشب dīšab (P.)]دا بەرچاو دەکەوێ.

[تێبینی: پاش نووسینی ئەم دێڕانەی سەرەوە، ویستم بزانم ئایا وشەی "دیتر" دە زمانی کوردمادی ئەمرۆدا بەکار دێ. ئەم وشەیە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا نەهاتووە، بەڵام بە خۆشییەوە دە "فرهنگ فارسی- کوردی دانشگاه کردستان"دا دۆزیمەوە (بڕوانە ماناکانی وشەی فارسی"دیگر" لەم پەرتووکەدا). بوونی ئەم وشەیە بۆچوونەکەی سەرەوە پشتراست دەکا].

**ئیربار** îrbar [*īrbār*] - "قاپ و قاچاخ": هیربار hîrbar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شەربە şerbe.

**ئیزۆک** **îzok** [*īzok*] - "زیپکەی دەموچاوی زارۆکی شیرەخۆرە": خزمە لەگەڵ ↑ئازەب azeb.

**ئیژگڵ** **îjgıl** [*īžgıl*] - "پۆڵوو، پەنگر": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەسکڵ eskıl و خزمە دەگەڵ ↑ئێزینگ êzîng "داری سووتەمەنی".

**ئیست** **îst** [*īst*] - "1- پشوو 2- ماوەیەک لە کات": دە شێوەزاری موکریانیدا بۆ وێنە دەگوترێ ئیستێکی پێ چوو، ئیستێکی دی دەگاتێ، ئیستێکی دی دەڕۆین و هتد. ئەو ئەندازە لە کات کە وشەکە لەو زاراوەیەدا ئاماژەی پێدەکا، ئەندازەیەکە وەک "تاوێک" [تاوێکی دیکە، بە مەزەندەی من هێندەی سەعاتێک]. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑وەستان westan [دە فارسیدا ایستادن īstādan (P.)] و دە بنەڕەتدا بە مانای راوەستانێک واتا پشوودانێک بووە. پاشان وشەکە مانای ماوەیەک لە کاتی وەرگرتووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ (G.) Stunde و(Nl.) Stonde "سەعات" [بە مانای ماوەیەک لە کات] و ئەم وشە ئەڵمانییەش خۆی لە (G.) stehen "وەستان"ەوە هاتووە و خزمیشە دەگەڵ "وەستان". هەروەک لە زمانی کوردمادیدا، دە زمانی ئەڵمانیشدا سەرەتا مەبەست راوەستانێک و پشوودانێک بووە و پاشان مەبەستەکە گۆڕدراوە بە ماوەیەک لە زەمان و سەرەنجام لە سەدەی پازدەوە مانای "سەعات"ی وەرگرتووە.

[تێبینی: وشەی ایست īst (P.) دە زمانی فارسیدا مانایەکی دیکە دەبەخشێ و بە مانای فەرمان دان بە وەستانە، واتا "بوەستە"].

**ئیسک** **îsk** [*īsk*] - "نزگەرە": ئیسکە îske دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑هەسکیان heskîyan "هەنیسک دان، نزگەرەی پاش گریان".

**ئیسیوەت** **îsîwet** [*īsīwat*] - "هیشککراو و وردکراوی بیباری رەش": دەکرێ ئاماژە بە دوو شیمانە بکەین:

1- لەوانەیە وشەکە دە بنەڕەتدا لە دوو کەرت پێک هاتبێ و کەرتی یەکەم هەر ئەو کەرتە بێ کە دە وشەی ↑هەزوێڵە hezwele دا هەیە بە مانای "ئەدویە، بوهارات". بنجی ئەم وشەی دوایی بریتییە لە هەز -hez کە خزمە دەگەڵ ↑هیشک hîşk. کەرتی دووەم، واتا "وێڵە" دە هێندێک وشەی دیکەشدا دەبینرێ،

وەك دانەوێڵە، وردەواڵە، ئاسنەواڵە و هتد. ئەم وشەیە وەك پاشگرێك بەكار دەهێنرێ و ئاماژە بە دەستەیەك یان چەندین جۆر لەناو دەستەیەك دەكا. دە زمانی كوردمادی بۆ ئەم مانایە پاشگری "جات" و "ئات، وات"یش بەكار دەهێنرێن، وەك سەوزیجات، بوهارات، ئەدەوات، پۆخڵەوات و هتد. لەم تێروانینەوە وشەكە دەتوانێ دەبنەڕەتدا "هەزەوات، هیسەوات" بووبێ، واتا هەمان "هەزوێڵە"كەی خۆمان، بە پاشگرێكی جیاوازەوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Droge (G.) "داو و دەرمان" دەچێتەوە سەر وشەیەكی كۆنتری ئەڵمانی و هولەندی، واتا droge "هیشك(كراو)". مەبەست لە وشە ئەڵمانییەكە بریتی بووە لە گژ و گیای هیشككراو كە وەك داو و دەرمان (دەوا و دەرمان) بەكار هێنراوە. جێی ئاماژەیە كە وشەی "ئەدویە، ئەدویەجات"یش خزمە دەگەڵ *دەوا* "دەرمان" و *دەواخانە* "دەرمانخانە"].

2- یان لەوانەیە وشەی "ئیسیوەت" پێوەندی هەبێ بە وشەی عەرەبی *اسود* *aswad* *(Arb.)* "رەشتر".

**ئیشار îşar** *[ īšār ]* - "جۆرێك سەرپۆشی ژنانە": دەشێ پێوەند ی هەبێ بە ↑*شاردنەوە şardınewe* و ↑حەشاردان ḧeşar.

**ئیشك îşık** *[ īşık ]* - شێوەی پێشتری ↑هیشك hîşık.

**ئیشكارۆ īşkaro** *[ īškāro ]* - "بیابان": ئیشك + ئارو îş(ı)k + aro. كەرتی دووەمی وشەكە شێوەیەكی دیكەیە لە ↑ئارا ara واتا "دەشت، پانتایی زەوی" و مانای تێكڕای وشەكە دەبێتە "پانتاییەكی ئیشك".

**ئیشكاوز îşkaw(ı)z** *[ īškāw(ı)z ]* - "تۆو بەسەر هەردی هیشكەوە چاندن": ئیشكاوس îşkaw(ı)s یش دەگوترێ. ئیشك + ئاوز îşk + aw(ı)z. كەرتی دوومی وشەكە پێوەندی بە ↑هاویشتن hawîştın [هاوێژ]ەوە هەیە و مەبەست "تۆو هاویشتن"ە.

**ئیقلیم îqlîm** *[ īqlīm ]* - "ناوچە، قەڵەمڕەو": اقلیم eqlīm (P.). لەوانەیە ئەم وشەیە لە رێگای زمانی عەرەبییەوە هاتبێتە ناو زمانی كوردمادی و فارسی. وشەكە خۆی ریشەی یۆنانی هەیە: *klíma > (Gr.)* "كلایی، نشێو، شوێن و هەڵكەوتی جوگرافی". دە زمانە ژێرمەنییەكاندا بۆوێنە Klima (G.)، climate (E.) "كەش و هەوا، شوێنێكی تایبەتی لەرووی كەش و هەواوە" لەم وشە یۆنانییە وەرگیراون. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑كل kıl بوون بە مانای "خوار بوون، داهاتنەوە".

**ئیكلام îklam** *[ īklām ]* - "كرنۆش، سەر چەماندن بۆ رێز گرتن": خزمە دەگەڵ ↑ئیقلیم îqlîm "قەڵەمڕەو". ئەم وشەیە خۆی ریشەیە یۆنانی هەیە و دەچێتەوە سەر klíma (Gr.) "لێژایی، نشێو، داوێن، شوێنی جوگرافی"، خزمە دەگەڵ ↑كل kıl دە زمانی كوردمادیدا بە مانای "خوار".

**-ئیلان -îlan** *[ -īlān ]* - "1- پاشگری گچكەیی 2- پاشگری خۆشەویستی": بڕوانە ↑لە2 le.

**ئینكەبەری înkeberî** *[ īnkabarī ]* - "لاساری، عیناد": پێك هاتووە لە ئینكە + بەری înke + berî. كەرتی یەكەم شێوەیەكی دیكەیە لە ↑هەنێ hene یان ئەنێ ene واتا "تیوچاوان" و كەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ↑بەر ber بە مانای "پێش". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەكە دە بنەڕەتدا دەبێتە بە رووی كەسێكدا وەستان، روو بەروو بوونەوە، جیبهەگیری.

# ئێ ( E )

**ئێ1 e** [e] - کورتکراوەی ↑یەک yek یان یێک yek: دارێ dare [دارێک darek]، ڕۆژێ roje [ڕۆژێک rojek] و هتد.

**ئێ2 e** [e] - دەگەڵ ناوی ژن دێ لە دۆخی بانگ کردندا: شەمێ şeme، نازێ naze، کاڵێ kale، گوڵێ gule و هتد. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ پاشگر یاخود نیشانەیەکی زمانی ئەڵمانی کە دەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاو لەو ناوانە دێ کە وەک ناوی ژن بەکار دێن، وەک Renate، Beate، ، Nicole، Simone، Susane، Anette و هتد.

**ئێ3 e** [ e ] - "1- وشەی بەردەوامی و پشتراست کردن 2- وشەی سەرسوڕمان": کاتێک کەسێک قسەیەک دەگێڕێتەوە، لایەنی بەرانبەر بۆ ئەوەی قسەرکەر لەسەر گێڕانەوەکەی بەردەوام بێ و لە پشتگیری قسەکاندا ناوەناوە ئەو وشەیە بەکار دێنێ. لە زاراوەی موکریانیدا وشەی "دەی" بۆ ئەم دۆخە بەکاردێ [دەی، دەتفەرموو]. هەروەها ئەگەر گێڕانەوەکە جێی سەرسووڕمان بێ، لایەنی بەرانبەر دەبێژێ "ئێ؟"، کە ئەم جارەیان دەربڕینی وشەکە شێوەیەکی پرسیارکردن و سەرسوڕماوی دەگەیەنێ. بۆ هەردووک ئەم دۆخانە دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی ja (G.) "ئا، بەڵێ" بەکاردەهێنرێ کە دیارە ئاهەنگی گوتنەکەی دوو شێوەی جیاوازی هەیە. وشە کوردمادی و وشە ئەڵمانییەکە خزمن و هەردووک دە بنەڕەتدا بە مانای "بەڵێ" ن. لە دۆخی یەکەمدا بەڵێ گوتنەکە مانای پەژراندن و پەسەند کردنی قسە و باسێک دەگەیەنێ و حەزی بیسەر بۆ بەردەوامی قسەکان نیشان دەدا. لە دۆخێ دووەمیندا بەڵێ گوتنەکە پرسیار و سەرسوڕمانی تێدایە و هێشتا نەبووەتە پەژراندنی تەواو و حەزی بیسەر بۆ دڵنیا بوون لە قسەکە نیشان دەدا. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑ئا a "بەڵێ".

**-ئێتی -êtî** [etī] - شێوەیەکی دیکە لە پاشگری ↑ئایەتی ayetî-.

**ئێجگار ecgar** [ ejgar ] - شێوەی گۆڕدراوی ↑یەکجار yekcar یان ئێکجار êkcar.

**ئێختە êxte** [ exta ]- شێوەی پێشتری ↑یەختە yexte "خەسێنراو". دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئاژنین ajnîn "کون کردن بە شتی تیژ، هەڵکۆڵین"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *ak-, *ok- >*** "تیژ ، نووک تیژ". لەم تێڕوانینەوە یەختە دەبێ دە بنەڕەتدا ئاماژە بەو کارە نەشتەرگەرییە بێ کە لەسەر ئاژەڵ کراوە.

**ئێختەرمە êxterme** [ extarma ] - "ئەسپی یەدەک": ڕەنگە پێوەندی بە ↑ئێختە êxte وە هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "ئەسپی ئێختەکراو" بێ.

**ئێراق êraq** [ erāq ] - "بەربەڕۆچکە": خزمە دەگەڵ ↑ئارا "دەشت"، سەر بە ریشەی ***(IE.)* ās- >*** "سووتان، هایسان". ڕەنگە ناوی وڵاتی ئێراقیش پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هێرک1 herık "دەشتایی بچووکی ناو چیا". بەم شێوەیە وێ دەچێ عێراق [دە ئەسڵدا: ئێراق] وشەیەکی کوردمادی بێ.

**ئێرە ēre** [ era ] - ئاماژە بە شوێنی نیزیک [ئێرە و ئەوێ]. خزمە دەگەڵ hier (G.)، hiar (OG.)، hār (Sw.)، hēr (Gt.)، here (E.)"ئێرە" و هەروەها her (G.)، ئەم ئاوەڵکردارەی دوایی دە زمانی ئەڵمانیدا ئاماژە دەکا بە ئاراستەیەک بەرەو شوێنی ئاخێور، بەپێچەوانەی ئاوەڵناوی hin کە دووربوونەوە لە شوێنی ئاخێوەر نیشان دەدا. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ke-, * k(e)i- >*** "ئەمە". وشەکە دە شێوەزاری سەروودا بووەتە ڤر vır [سوانەوەی h لە شێوەزاری ناوەڕاستدا و گۆڕانی بۆ v لە شێوەزاری سەروودا].

**ئێرەق ereq** [ *eraq* ] - ئێرەق بوون واتا هەستان و ڕەپ بوونی ئەندامی جینسی نێر. < *erectio* (*Lat.*) "قیت کردن و دەرپەڕاندن". دەشێ وشە لاتینییەکە خزم بێ دەگەڵ وشەی کوردمادی ↑ڕاست rast و دەبنەڕەتدا مەبەست "ڕاست کردنەوە" بووبێ.

**ئێرەیی ereyî** [ *erayī* ] - "حەسوودی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Ehre (G.)، ēra (OG.)، eer (OE.)، ār (Nl.)، eir (OIs.) "ڕێز و ڕوومەت، وەرج، ئیحتیرام، ئیعتیبار"، سەر بە ریشەی < *ais-* (*IE.*) "بەڕوومەت بوون، بە ئەدەب بوون، ڕێز دانان". aistan (Gt.) "ترسان"، aídesthai (Gr.) "ترسان، زات نەکردن، ڕێز دانان" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. وێ دەچێ دە زمانی کوردمادیشدا مانای وشەکە پێشتر لەو مانایانەی سەرەوە نیزیک بووبێ و پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

**ئێزی ezî** [ *ezī* ] - "جۆلانە لە گوریس": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑هەژان hejan و ئەو وشانەی لەوێ باس کراون.

**ئێزیدی ezîdî** [ *ezīdī* ] - "ئاییتێکی کۆنی کوردمادی": یەزیدی yezîdî یش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑یەزدان yezdan و ↑جێژن *cêjın*.

**ئێزینگ êzîng** [ *ezīng* ] - "داری سووتەمەنی": خزمە دەگەڵ ↑ئازاڵە azale "ئاوردوو" و دواجار دەگەڵ ↑هیشک hîşk یان ئیشک îşk، سەر بە ریشەی < ** ās-* (*IE.*) "سووتان، هایسان". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ هیزم hīzom (P.) "داری سووتەمەنی".

**ئێستا êsta** [ *estā* ] - "هەنووکە، نها، ئەم کاتە": وشەی "ئێستا" لە ڕستەی ئەرێنیدا بەکاردێ [ئێستا دەچێ] و "هێشتا" لە ڕستەی نەرێنیدا بەکار دەبردرێ [هێشتا نەڕۆیوە]. ئەم وشەیە لەوە ناچێ پێوەندی بە وشەی "هێشتا"وە هەبێ، بەڵکوو دەبێ لە ریشەیەکی دیکەوە هاتبێ و لەژێر کاریگەری وشەی "هێشتا"دا شێوەکەی گۆڕاتیکی بەسەردا هاتبێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە :

1- ↑سات sat "کات". وەک لەژێر "سات"دا شی کراوەتەوە، هاواڵەکانی ئەم وشەیە لە زمانە کۆنە ئەورووپییەکاندا بە مانای "دێرتر، دواتر" بەکار هاتووە. لەوانەیە "ئێستا" دە زمانی کوردمادی بەرێدا بە مانای "کەمێک دواتر، تاوێکی دیکە" بەکار هاتبێ.

2- ↑ئیست îst "دەم" [ئیستێکی دی واتا تاوێکی دیکە].

**ئێسقان esqan** [ *esqān* ] - "ئێسک": بڕوانە ↑ئێسک êsık.

**ئێسک êsık** [ *esık* ] - "ئەو بەشە سەختەی لەش کە کۆڵەکەیە بۆ بەشە نەرمەکان": ئێسقان êsqan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ استخوان ostoxan (P.)، os (L.)، ast- (Av.)، ásthi- (OIn.) "ئێسک". ریشەی ئەم وشانە دەبردرێتەوە سەر **ost(h)-* (*IE.*) "ئێسک". [بڕوانە فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 95]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑هەستی hestî و هەستک hestık وەک شێوەیەکی دیکە لە وشەی ئێسک بەکار دێ. "هەستی" هەروەها بە مانای "ناوکی میوە" [بە مانایەکی دیکە "ئێسکی میوە"] ش بەکار دێ و بەم مانایە دە زمانی فارسیشدا هسته haste (P.) دەگوترێ. شێوەی ئێستک êstık شێوەی کۆنتری وشەکەیە و ئێستاش لە هێندێک شێوەزاری کوردمادیدا بەکار دێ. شێوەکانی ئێسک و ئێسقان بۆ ئەم شێوە کۆنترە دەگەڕێنەوە و هەرکامیان هێندێک گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. ریشەی باسکراو لە سەرەوە دەبێ دە بنەرەتدا پێوەندی بە ژمارەیەک وشەی دیکەوە هەبێ کە ئاماژە بە چەمکی "سەختی" دەکەن، وەک ↑ئاستەم *astem*، ↑ئاستەنگ asteng، ↑ستەم stem و هتد. ئەم وشانەی دەچنەوە سەر ریشەی < **staī-* (*IE.*) "ڕەق بوون، سفت بوون، توند بون".

[تێبینی: پێوەندی نێوان دوو چەمکی "ئێسک" و "بەرد" دە زمانی ئەڵمانیشدا بەدی دەکرێ. لەم زمانەدا دەستەواژەی Stein und Bein هەیە بەمانای "بەرد و ئێسک". شیاوی باسە کە وشەی Stein "بەرد" لەگەڵ وشە کوردییەکانی سەرەوە خزمە].

ئێش **êş** [ *eš* ] - "ئازار هەبوون": خزمە دەگەڵ ache (E.) ، eche (ME.) "ئێش". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ئاخax2 "دەنگی ئێش و ئازار".

ئێشک **êşık** [ *ešık* ] - "پاسەوانی، نەخەوتن و ئاگا لێ بوون": دەشێ پێوەندی بە ↑هۆش hoş ەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست هۆشیار مانەوە بووبێ.

ئێع **eɛ** [ *eɛ* ] - وشەیەکە بۆ دەربڕینی بێزکردن [ئێع، بێزم هەستا].

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Ekel (G.) "بێز" و ekelhaft (G.) "بێزهەستێن". ریشەی وشە ئەڵمانییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑ئێق eq ەوە.

ئێڤار **êvar** [ *evar* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ئێوارە eware.

ئێق **eq** [ *eq* ] - "هێڵنج، رشانەوە": ↑حۆق ħoq یش دەگوترێ.

ئێک **ek** [ *ek* ] - شێوەیەکی دیکە لە یێک yek یان ↑یەک yek.

ئێڵ **el** [ *el* ] - "خێڵ": عێل ɛel یش دەگوترێ. بە فارس دەگوترێ ایل īl (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑خێڵ xel.

2- *ال al* (Arb.) "بنەماڵە".

ئێمە **ême** [ *ema* ] - "جێناوی کەسی یەکەمی کۆ": ئەمە ama ش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ me (E.) "جێناوی بەرکاری بۆکەسی یەکەمی تاک" mī/me (OS.)، me (L.)، me/emé (Gr.)، mā (OIn.)، سەر بە ریشەی **< *mege- (IE.)**.

ئێوارە **eware** [ *ewāra* ] - "کاتی بەر لە تاریک بوون": ئێڤار êvar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Abend (G.)، evening (E.)، afton (Sw.) "ئێوارە". بە گوێرەی سەرچاوەکان ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *epi- (IE.)** "دوایی، پاش، پشتی" و مەبەست دوایین بەش یان بەشی پاشینی رۆژ بووە. شیاوی باسە وشەی after (E.) یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: لە لایەکی دیکەوە ریشەیەکی دیکەی هیندوئەورووپی جێی ئاماژە کردنە، واتا **apo- (IE.)*، کە ئاماژە بە دوور کەوتنەوە دەکا. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑ئاوا awa [ئاوا بوون بە مانای دوور بوونەوە و ون بوون] لەو ریشەیەوە دێ. دوور نییە دوو وشەی "ئاوا" و "ئێوارە" پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و مەبەست لە ئێوارە کاتی ئاوا بوونی خۆر بووبێ. لەوانەشە ئەو دوو ریشە هیندوئەورووپییە پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و لە بنەڕەتدا سەرچاوەیەکی هاوبەشیان هەبێ، چونکوو لە نێوان دوو چەمکی "دووری" و "دوایی"دا پێوەندی توند و تۆڵ هەیە. بۆوێنە کاتێک دەگوترێ "برۆ دواوە" وەک ئەوە وایە کە بڵێی "دوور بەوە"].

ئێوە **êwe** [ *ewa* ] - "جێناوی کەسی دووەمی کۆ": هەوە hewe، هوون hun، هنگ hıng، ئەنگۆ engo ش دەگوترێ. دەشێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ you (E.)، īow (OE.)، iu /eu (OG.)، euch (G.)، jūs (Lit.)، سەر بە ریشەی **< *e (IE.)**.

## ب (B)

**ba 1** [ *bā* ] - "جولانەوەی هەوا": bād (P.)، vati- (OI)، خزمە دەگەڵ Wind (E.) و (G.)، winds (Gt.)، vind (Sw.)، ventus (L.)، vati- (OI)، "با"، waian (Gt.)، vayati- (OIn.)، vejati (OSl.)، wehen (G.)، wawan (OE.) "باهاتن، شنینەوە"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *hwe- >*** "با هاتن، شنینەوە، لەرینەوە بەدەم باوە". وشەی کوردمادی ↑هەوا hewa خزمە دەگەڵ با ba و لە ریشە هیندوئەورووپییەکە نیزیکترە.

[تیبینی: ئەو دەنگە w یە کە دە ریشەی هیندووئەورووپی وشەکاندا هەیە، دە زۆر وشەی کوردمادی و فارسی، بە تایبەتی دە سەرەتای وشەکاندا، گۆڕاوە و بووەتە b].

**ba 2ب** [ *bā* ] - "لێگەڕێ، بهێڵە": کورتکراوەی ↑بلا bıla یە. "بلا" دە کوردمادی سەروودا هەر بە مانا ی "با" ی شێوەزاری ناوەڕاستە.

**ba 3ب** [ *bā* ] - "سوڕ، پێچ، خول" [با دان واتا سووڕاندن، پێچانەوە]. هەروەها ↑باد bad هەیە بە مانای "پێچ، لۆ" کە ئەمەیان شێوەی کۆنتری وشەکەیە. "بادان" دە بنەڕەتدا "باد دان" بووە و سواوەتەوە. خزمە دەگەڵ winden (G.)، windan (OG.)، (OE.)، (Gt.)، wind (E.)، vinda (Sw.) "هۆنین، پێچان، بادان". Winde "چەرخی چاڵاو"، Windel (G.) "قۆنداغە، ئەو پەڕۆیەی زارۆکی تیوە دەپێچن یان دە زارۆکی وەدەپێچن"، Wand (G.) "دیوار" [دە بنەڕەتدا: چەپەر، پەرژین، دارو درەختی بادراو و تێکچندراو] و گەلێک وشەی دیکە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *wend- >*** "با دان، هۆنین [هۆندن، وەندن] سوڕاندن". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ↑ هۆنین honîn (هۆنینەوە، وندنەوە).

[تیبینی: شێوەی ↑هۆندن hondın دە کوردمادیدا لە هۆنین honîn کۆنترە، چونکوو فۆتیمی d ی ریشە هیندوئەورووپییەکە تێیدا ماوەتەوە].

**ba 4با** [ *bā* ] - "حەز و ئارەزووی جینسی ئاژەڵ": [دێڵە بەبا]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا کە ئاماژە دەکەن بە "حەز و ئارەزوو". بۆ زانیاری لەسەر ئەم وشانە بروانە ↑نەباندن nebandın. بە وتەی مامۆستا هەژار "با" چووەتە ناو زمانی عەرەبی و کراوە بە باه bah (Arb.).

باب **bab** [ *bāb* ] - "پیاوی منداڵدار": بابا bābā (P.)، دە زمانی لاتین و هێندێک لە زمانە ئەورووپییەکاندا papa"باب، وشەی بانگ کردنی باب".

[تیبینی: دە زمانە هیندوئەرووپییەکاندا هێندێک وشە هەن کە بۆ ناو لێنان و لەهەمان کاتیشدا بانگ کردنی کەسانی سەر بە خێزان واتا خزمەکان بە کاردەهێندرێن، وەک بابە babe، مامە mame، کاکە kake، دایە daye، دادە dade، یایە yaye، نەنە nene وهتد. زۆربەی ئەو وشانە دووپات کردنەوەی دەنگێکن و دە بنەڕەتدا لە زمانی زارۆک وەرگیراون، واتا لاسا کردنەوەی دەنگی زارۆکن لە کاتی گڕ و گاڵ کردندا].

بابڕ **babır** [ *bābır* ] - دەگەڵ "بابڕ" دێ [سمێڵ بابڕ]. ئەم وشەیە دە ئەسڵدا بە مانای "بادراو، پێچراو"ە و مەبەست لە سمێڵ بابڕیش سمێڵێکی ئەستوورە کە جەمسەرەکانی با دراون. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*بابۆڵە babole* و ↑فافۆن fafon [بافۆن bafon].

بابلەکانێ **bablekanê** [ *bāblakāne* ] - "جۆرێک هەڵپەڕکێ": خزمە دەگەک↑ بابۆڵە babole سەر بە ریشەی ***(IE.) *uei- >*** " سووڕان، با دران، چەمان، جووڵان بەم لا و ئەو لادا".

بابلیسک **babılîsk** *[ bābılīsk ]* - "باهۆز، باهوڕ": دەشێ پێک هاتبێ لە با + بلیسک ba + bılîsk، کەرتی دووەم دەشێ پێوندی هەبێ بە کرداری ↑ولین vılîn و گەلێک وشەی دیکەی سەر بە ریشەی < ***wel-** *(IE.)* "سوڕان".

بابۆڵە **babole** *[ bābola ]* - "(نانی) پێچراو": پاشگری bab + ole. بنەوشەی باب -bab خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانە هیندو ئەروپییەکاندا کە ئاماژە بە چەمکی "سووران، با دران، خوار بوون، لێهاڵان" دەکەن، وەک vit (Rus.) "پێچان، چنین"، Weide (G.) "دارەبی" [دارێکە هەم توانای چەمان و خوار بوونەوەی هەیە و هەمیش بۆ چنینی قەرتاڵە کەڵکی لێ وەرگیراوە]، viere (L.) "چنین، بەستن"، vifa (OIs.) "لێهاڵان"، weibon (OG.) "خوار بوونەوە، ناپایەدار"، viebt (Lett.) "سووڕان" و هتد. دە زمانی فارسیدا بافتن bāftan (P.) بە مانای "چنین" دێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***uei-b-** *(IE.)*, ***uei-p-** "چەمان، سووڕان، بەم لاو ئەولادا جوولان". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑بابلەکانێ bablekanê "جۆرێک هەڵپەرکێ"، ↑بابیتانێ babîtane "جۆلانە، دیلەکانێ"، ↑باو baw[1] "سووڕ، خول، تەکان"، ↑باویلکە bawîlke "پشیلە پاییزە"، ↑باپووک bapuk "کرێوە" و↑ فافۆن fafon و هتد.

بابەت **babet** *[ bābat ]* - " مژار، مەوزووع": "بەش، شت، بارە" [بە فارسی "در باب" واتا لەبارەی، لە بابەت] < بابة *bāba(t)* *(Arb.)*.

بابیتانێ **babîtane** *[ bābītāne ]* - "جۆلانە، دیلەکانێ": خزمە دەگەڵ ↑ بابۆڵە babole.

[تێبینی: هەم بابیتانێ و هەم دیلەکانێ سەر بە دوو ریشەی جیاوازن بە مانای "سووڕان، با دران، بەم لا و ئەو لادا جووڵان". هەروەها شیاوی سەرنجە کە بابلەکانێ bablekanê "جۆرێک هەڵپەرکێ" خزمە دەگەڵ "بابیتانێ" و دیلان dîlan یش خزمە دەگەڵ "دیلەکانێ"].

باپشکێو **bapışkêw** *[ bāpıškew ]* - "بووک، بێتک، چینچکە سڵاو": باپشکێو زیپکە یان هەڵمساوییەکە کە لەسەر مژۆڵ دروست دەبێ. وێ دەچێ ئەم وشەیە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ و دە ئەسڵدا "باپچکە bapıçke" بووبێ، پێک هاتوو لە دوو کەرتی ↑با ba بە مانای "هەوا، هەڵمساوی، باکراوی" و کەرتی "پچکە pıçke" بە مانای "بچووک" [پچووک]. لەم تێڕوانینەوە باپشکێو واتا "پچکەبا" یاخود پچێک با کردن و ماسین.

باپووک **bapuk** *[ bāpūk ]* - "کرێوە": باپووسکە bapuske ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑بابۆڵە babole. مەبەست لە بابۆڵە نانی بادراو و پێچراوەیە ومەبەست لە "باپووک" یش با و بەفری "بادراو"ە.

باپەڕ **baper** *[ bāpar ]* - "نەخۆش کەوتن بەهۆی لێدانی با و رق بوونی ماسوولکەکان": با + پەڕ per + ba. مەبەست ↑تێپەڕین teperîn ی بایە بەسەر لەشدا.

باپیڤ **bapîv** *[ bāpīv ]* - "قسەزل، خۆهەڵکێش": دەشێ پێک هاتبێ لە با + پیڤ ba + pîv. کەرتی پیڤ لەوانەیە هەر ↑پەیڤ peyıv "قسە" بێ و تێکڕا مەبەست ئەو کەسەیە کە قسەی "بادیهەوا" دەکا یان قسەکانی وەک بایە!

بات **bat** *[ bāt ]* - ئەم بنجەوشەیە بە تەنیا بەکار نایە و بەشێکە لە وشەی ↑لەباتی lebatî [لە+ بات + ی].

باتلاق **batlaq** *[ bātlāq ]* - "زەلکاو، زۆنکێ": باتلاق bātlāq (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ bathys (Gr.) "قووڵ".

[تێبینی: کاک عەلی نانەوازادە وشەکەی بردۆتەوە سەر batak (Tur.). بڕوانە "فەرهەنگی هەرمان" (ل. 192). وێ دەچێ ئەم وشەیە، بە رەسەن تورکی نەبێ و لە وشە یۆنانییەکە وەرگیرابێ.]

باتوو **batu** *[ bātū ]* - "گون": پێوەندی بەو وشانەوە هەیە کە لە ژێر↑ بەس bes شی کراونەوە و دەچنەوە سەر ریشەک بەمانای "ماسین، با کران". وشەی "بەد"یش سەر بەم خێزانەوشەیە.

باتووم **batum** *[ bātūm ]* - "گۆپاڵی پۆلیس":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پسان pısan "لەت بوون، قرتان"دا باس کراون.
2- یان لەوانەیە پێوەندی هەیە بە batare (L.) "لێدان".

**باج bac** [ bāj ] - "پیتاک": باج bāj (P.). کاک عەلی نانەوازادە ئەم وشەیەی بەدروستی لێک داوەتەوە و دەڵێ باج لە چاوگی baj ی ئەوێستایی بە مانای بەش کردن و دابەش کردن کەوتۆتەوە و لە کوردیدا بەش، پاژ و باقە و گەلێک وشەی دیکە هەر لەم چاوگەن. (فەرهەنگی هەرمان، ل. 194).
[تێبنی: وشەی ↑باقە لەوە ناچێ پێوەندی بە وشەکانی دیکەوە هەبێ].

**باجە bace** [ bāje ] - "خوشکی گەورە": خزمە دەگەڵ base (G.) و wase (Nl.) "ئامۆزا، خاڵۆزا". مانای پێشووی وشەکە لەو زمانانەدا "پوور، خوشکی باوک" بووە. دە بنەڕەتدا وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگی زارۆکە.

**باچاندن baçandın** [ bāčāndın ] - "لە پەنایەکەوە بۆی دەرچوون، کووزوو بوون": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ویسک wîsk "لەر و لاواز"، ↑فاق faq [فاق دان هەم بەمانای چەمانەوە و هەم بە مانای لاواز بوون]، ↑فێق feq "لاواز، ژار" هەروەها ↑فیسماڵک fîsmlalk [فیزماڵک] "کشانەوە و بۆی دەرچون" و ↑فەکەهان fekehan "لەجێ چوونی ئێسک". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *wig- > (IE.) "کشانەوە بۆ دوا لە ژێر گوشارێک، بەرگە نەگرتن، جێ خاڵی دان" و دوورتریش بۆ سەر ریشەی > *wei-, *uei- (IE.) "با دان، چەمانەوە".

**باخلە baxle** [ bāxla ] - "توربێنی تۆو چاندنی وەرزێڕ کە بە باخەڵییەوە هەڵواسراوە": خزمە دەگەڵ ↑باخەڵ baxel.
[تێبینی: دە "فەرهەنکی هەرمان"یشدا هەروا لێک دراوەتەوە، ل. 195].

**باد bad** [ bād ] - "پێچ، لۆ": ↑با3 ba "سووڕ، خول".

**بادام badam** [ bādām ] - "ناوی دارێک و بەری ئەو دارە": باهیڤ bahîv و باڤی bavî یش دەگوترێن. ئەو دوو وشەی دوایی دوو شێوەی دیکەن لە وشەی "بادام". خزمە دەگەڵ -bādāma و -vātāma (OIn.) و wādām (MP.) "بادام". ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑ڤامێر vamer بەکار دێ بەمانای "داربادام". ئەم وشەیە لە دوو کەرت پێکهاتووە. کەرتی ڤام vam گۆڕدراوی wādām ە و کەرتی دووەم دێر der بووە ، واتا ↑دار dar.

**بادە bade** [ bāda ] - "1- مەی، شەراب 2- پیاڵەی شەراب": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:
1- ↑بادی(یە) badî ( ye).
2- -bātu-gara (OP.) "پیاڵەی شەراب". ریشەی ئەم وشەیە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە، لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی هیندوئەورووپی > -*pō(i) (IE.) "خواردنەوە". [بڕوانە "فرهنگ ریشە شناختی زبان فارسی"، ل. 160].

**بادەوە badewe** [ bādawa ] - "1- لەیستۆکێک دە هەوا دەکرێ و بەدەم باوە دەجووڵێتەوە 2- بادەوانی کەشتی": دە زمانی فارسیدا بۆ چەمکی یەکەم بادبادک bādbādak (P.) و بۆ چەمکی دووهەم بادبان bādbān (P.) بەکار دەهێنرێ. وشەی "بادەوە" دەشێ پێشتر "بادەوان" بووبێ و سوابێتەوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑ودودە wıdwıde ش هەیە کە شێوەیەکی کۆنترە لە "بادبادک"ی فارسی.

**بادی(یە) badî(ye)** [ bādīya ] - "دەفر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:
1- Faß (G.)، vaz (OG.)، fat (OE.)، fet (OF.)، vat (E.) و (Nl.) و fat (Sw.)، گشتیان بەمانای "دەفر"، سەر بە ریشەی > -*ped (IE.) "دەفر". لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑بادە bade "جامی مەی". وشەی باطية bātīya (Arb.) وەک دەردەکەوێ ریشەی هیندوئەورووپی هەیە و بەمەش دەشێ لە زمانی عەرەبیدا وشەیەکی وەرگیراو بێ.

2- Pott (G.)، pot (Nl.)، pot (Fr.) "مەنجەل". ئەم وشە ئەورووپییانە دەبردرێنەوە سەر potus (L.) "خواردنەوە". دە "فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی" (ل. 160)، لە ژێر وشەی "بادە"دا ئاماژە بە ریشەی هیندوئەورووپی <- ***pō(i)-** (IE.) "خواردنەوە". لەوانەیە وشە لاتینییەکە پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.
3- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ bytina (Gr.) "دەفری شەراب" و butina (ML.) "دەفر، بوتڵ". وشەی ↑بۆتە bote "دەفری کانزا تێدا تاواندنەوە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. وشەی bottel (E.) "دەفری شووشەیی" لە bouteille (Fr.) وەرگیراوە و دە زمانی کوردمادیدا بووەتە بوتڵ butıl [دە بنەڕەتدا بە مانای "دەفرۆکە، دەفریلە"].

**بار1 bar** [ *bār* ] - "ئەوشتەی هەڵدەگیرێ و دەبردرێ": بار bār (P.). دەچێتەوە سەر کرداری ↑بردن bırdın.

[تێبینی: دە زمانی یۆنانیدا báros (Gr.) هەیە بە مانای "قورسایی، بار" کە دوورە خزمە دەگەڵ وشەی "گران"ی کوردمادی. بەڵام وێ ناچی "بار"ی کوردمادی پێوەندی بەم وشە یۆنانییەوە هەبێ].

**بار² bar** [ *bār* ] - "بار" دە زمانی کوردمادیدا بە هێندێک مانای جۆراوجۆر بەکار دێ: 1- دەگەڵ "دۆخ" دێ [بار و دۆخ bar u dox]، 2- بابایەکی بار کەوتووم، بۆم نایە [واتا بەخت و هات لەگەڵم نییە، وەزعم تەواو نییە]، 3- دە(ر) بارەی باسەکە [لە بارەی باسەکە] وتووێژ کرا، یان لەم بارەوە [لەم بارەدا] وتووێژ کرا، 4 - دە زمانی فارسیدا باری bārī (P.) هەیە واتا بە هەرحاڵ [بە هەر بارێکدا، هەر چۆتێک بێ]، 5- حاڵ و باڵت چۆنە؟ لێرەدا وشەکە بە شێوەی ↑باڵ bal خۆی دەر دەخا.

ئەگەر بمانەوێ چەمکی هاوبەشی ئەو مانایانە وەربگرین، دەگەینە ئەو ئەنجامە کە وشەکە بە گشتی دەبێ بە مانای "حاڵ، دۆخ" بێ. بەرانبەری ئەو مانا گشتیە وشەی casus (L.) هەیە کە دە ئینگلیزیدا دەبێتە case (E.) و دەچێتەوە سە وشەی cadare (L.) "کەوتن". دە زمانی ئەڵمانیدا بە هەمان پێودان وشەی Fall (G.) هەیە بە مانای "مەورید، حاڵ، رووداو، بار و دۆخ" کە دەچێتەوە سەر کرداری fallen "کەوتن". دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە دەگوترێ in diesem Fall " لەم بارەدا، لەسەر ئەم مەوریدە"، falls (G.) "لە حاڵێکدا کە، ئەگەر هاتوو [رێ کەوت]"،auf jedem Fall "بە هەرحاڵ، هەر چۆتێک [رێ بکەوێ]". وشەی بار bar ی کوردمادی و فارسی [یان بە شێوە کۆنترەکەی باڵ bal ؟] وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکە بە مانای "کەوتن". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی دیکەش هەن کە مانای "کەوتن" دەگرنە خۆ، وەک ↑بەر ber [بەر بوونەوە واتا کەوتن]، ↑وەرین werîn [دە بنەڕەتدا: کەوتنە خوار]، ↑فاڵ fal "بەخت خوێندنەوە" [دە بنەڕەتدا واتا ئەو شتەی روو دەدا، رێک *دەکەوێ*- سەرنجی "کەوتن" بدە لە "رێککەوتن"دا]، ↑فەلشین felşîn "رووخان" [دەبنەڕەتدا: هاتنەخوار، بەر بوونەوە]، ↑بوورانەوە buranewe "کەوتن بەهۆی حاڵ تێکچوون". بەم پێیە "بار" دەبێ بە مانای "دۆخ ، رووداو، وەزع و حاڵ" بێ و دە بنەڕەتدا مەبەست رێکەوت و هەڵکەوتەکان بووبێ.

[تێبینی: لە باری دروست بوونی ماناکەیەوە دەکرێ دیسان بەراوردی بکەین دەگەڵ واقعة wāqīεe (Arb.) "رووداو" کە دەچێتەوە سەر کرداری وقع waqaεa (Arb.) "کەوت"].

**بار3 bar** [ *bār* ] - باراوردن bār āvordan (P.) "پەروەردە کردن". بارهێنان دە بنەڕەتدا مەبەست هێنانەبەرهەم [وە بەر هێنان بووە] و شێوەیەکی دیکەیە لە↑بەر ber "میوە، بەرهەم، منداڵ".

**-بار⁴ -bar** [ *bār* ] - پاشگرێکە لە ناو ئاوەڵناو دروست دەکا و مانای "هەڵگر" دەداتە ئاوەڵناوەکە، وەک تاوانبار واتا هەڵگری تاوان، تۆمەتبار، خەتابار، تاسەبار و هتد. خزمە دەگەڵ ↑بار3 bar و ↑*بردن bırdın* "هەڵگرتن، حەمل کردن". دە زمانی ئەڵمانیشدا پاشگری -bar (G.) هەر ئەو ئەرکەی هەیە و مانای "هەڵگر، قابیل" دەبەخشێ و ئەویش دەچێتەوە سەر beran (OG.) "بردن". دە ئەڵمانیدا بۆ وێنە دەگوترێ fruchtbar (G.) "پڕبەرهەم" [هەڵگری بەرهەم] یان hörbar (G.) "شیاوی بیستن". پاشگرە

کوردمادییەکە بە چەند شێوە خۆی نیشان دەدا، وەک ↑بەرber [رەنجبەر واتا هەڵگری رەنج]، ↑وەرwer [بەختەوەر: هەڵگری بەخت] و↑ وار war [خوێندەوار: هەڵگری خوێندن و زانست].

**بار[5] bar** *[ bār ]* - "جار، کەڕەت": دەگەڵ جار دێ [جاروبار carubar] و هەروەها لە وشەی "دووبارە"دا دەبیندرێ. بارbar (P.)، بە پێی "فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی" (ل. 161) خزمە دەگەڵ -vāra (OIn.) "بار، جار"، سەر بە ریشەی ئێرانی کۆنی -var (OI.) " گەڕان، وەرگەڕان، سووڕان" و لەوێشەوە بۆ ریشەی **(IE.) *uel- >** "سووڕان، گەڕان". هەر بە پێی ئەو سەرچاوەیە لەباری ماناوە دەکرێ ئەو وشانە هەڵسەنگێندرێن دەگەڵ وشەی ئینگلیزی turn کە خۆی بە مانای "گەڕان و سووڕان" ە و مانای " گەڕ، نۆرە"ش دەدا.

**بار[6] bar** *[ bār ]* - *پاشگری* شوێن بە مانای قەراخ وەک لە "زرێبار"دا. بار bar (P.)، خزمە دەگەڵ -pāra (Av.) "مەرز، قەراخ (ئاو)، رۆخ"، pārá (OIn.) "سنوور، قەراخ ئاو"، ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ئێرانی کۆنی -par (OI.) "پەڕینەوە، تێپەڕین، لە لایەکەوە بەرەو لایەکی دیکە چوون" [بڕوانە "فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی"، ل. 161]. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەڕینەوە perînewe و↑ تێپەڕین teperîn. هەروەها ↑بەر[6] ber بە مانای "لا، قەراخ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە، کاتێک دەگوترێ "ئەم بەر و ئەو بەر" یان "بەری باڵەکایەتی، بەری سوێسنایەتی".

**بار[7] bar** *[ bār ]* - "قەراخ، ئاڵ": [میناک: بەردەکە (لە) باری خۆی نییە، بەو بارەدا دایبنێ یان لەسەر باری خۆی دانرابوو، کەچی ئەو لە باری برد]. شێوەیەکی دیکە لە↑ بەر[6] ber [ئەم بەر و ئەو بەر]. هەروەها پێوەندی هەیە بە ↑بار[6] bar "قەراخ، سنوور". دە فارسیدا var (P.) دەگوترێ [این ور īn var "ئەم بەر"، ان ورān var "ئەو بەر"]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *per- >** "تێپەڕین (بە شوێنێکدا)". وشەی pará (Gr.) لەم ریشەوە هاتووە و ماناکەی نیزیکە لە "بەر" یان "بار"ی کوردمادی. مانای وشە یۆنانییەکە دەبێتە "بە قەراخ ... دا، بە سەر ... دا". وشەی ↑لەبار lebar یش بە مانای "گونجاو" لەم پێوەندییەدا جێ دەگرێ. "لەبار بوون" دە بنەڕەتدا بەو مانایە هاتووە کە شتێک لەسەر باری خۆیەتی، بە بارێکی دروستدا دانراوە یان بە لایەکی باشدا جێی خۆی گرتووە.

**بار[8] bar** *[ bār ]* - "وێنە": لە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا "وێنە" وەک یەکێک لە ماناکانی ئەم وشەیە باس کراوە. مخابن روون نەکراوەتەوە کە ئەم وشەیە چۆن و لە کوێ بە کار دێ. لەم بارەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Bild (G.)، bilidi (OG.)، beeld (Nl.) "وێنە، ئەسک، شەقڵ، شێوە". دیسان بڕوانە ↑بەلاش belaş.

**باڕ bar** *[ bār ]* - "بێچووە مەلی بەهارە": دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑بەرخ berıx [برە barre (P.)] "بەچکەی مەڕ" و هەروەها دەگەڵ poule (Gr.) "ئاژەڵی جەوان، جوانوو" و pullus (L.) "ئاژەلی جەوان، مەلی جەوان"، Fohlen (G.)، folo (OG.)، foal (E.)، fale (Sw.) "جوانوو"، هەروەها puer (L.) "زارۆک" و پوور pūr (P.) "کوڕ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *pau- >** "بچووک، وردیلە، کەم".

**باران baran** *[ bārān ]* - "ئاو و تەڕایی کە لە هەورانەوە دەرژێتە خوارەوە": هەروەها بارین barîn وەک کردار بەکار دێ. باران bārān و باریدن bārīdan (P.)، خزمە دەگەڵ -vār (Av.) "باران"، -vār (In.) "ئاو، باران"، -vari (Av.) "دەریاچە"، vrëndë (Alb.) "نم نمی باران"، wārān (MP.) "باران"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uer- >** "ئاو، باران، چەم". [بڕوانە "فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی"، ل. 163].

[تێبینی: دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی زمانی ئەڵمانیدا، وشەی Wasser (G.) "ئاو" بردراوەتەوە سەر ریشەی *(IE.) *(a)ued- >* "ئاو، تەڕایی" و باس لەوە کراوە کە لەپاڵ ئەم ریشەیەدا ریشەیەکی هیندوئەورووپی دیکەش، واتا *(IE.) *(a)uer-* هەیە کە وشەکانی vár (OIn.) "ئاو" و urina (L.) "میز" لەوەوە سەرچاوە دەگرن. وێ دەچێ ئەم دوو ریشەیە خۆیان خزم بن و دە پلەیەکی دوورتر دا لە یەک ریشە پەیدا بووبن].

بارتەقا **barteqa** [ *bārtaqā* ] - "(وەزنی) بەرانبەر، هەمبەر": بار + تەقا bar + teqa. کەرتی تەقا دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑تا ta [تا بار] و ↑تاق taq "بەرانبەری جووت". مەبەست لە بارتەقا هاو وەزن بوونی تایەک بار دەگەڵ تایەکەی بەرانبەریەتی. هەرکام لەو دوو تایە کە بارێکی هاووەزنی دەگەڵ ئەوی دیکە تێدایە، دەبێتە بارتەقای ئەوی دیکە.

بارست **barıst** [ *bārıst* ] - "ئەندازە، قەوارە": خزمە دەگەڵ ballast (Nl.)، (E.) و (Sw.). شێوەی کۆنتری وشەکە دە زمانی دانیمارکیدا وەک barlast (Dan.) ماوەتەوە کە ئەمەیان لە کوردمادییەکە نیزیکترە. وشە ژرمانییەکە بە پێی بۆچوونێک دە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە دوو کەرتی bar "ڕووت، ڕەبەق، پەتی" + last "وەزن، بار"، تیکرا واتا "وەزنی خالیس". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرەتا بەو وەزنە گوتراوە کە لە شێوەی تەلیسەخیز لە بەشی خوارەوەی کەشتییەکاندا داندراوە بۆ ڕاگرتنی تەوازون و لەنگر لە سەر ئاو.

بارگین **bargîn** [ *bārgīn* ] - "ئەسپی بارەبەر": بارە bāra و بارگی bāragī (P.). پەیوەستە بە وشەکانی↑ بار bar و↑ بردن brdn.

بارمتە **barımte** [ *bārımta* ] - "دە گرێو نراو": خزمە دەگەڵ ↑متە mıte "بەدەڵ، زڕ، نەڕاست".

بارووت **barut** [ *bārūt* ] - "گەردێکی ڕەشە دەناو گوللە دەکرێ و ئاگر دەدرێ": *barut (Tur.)* برد *bard (Arb.)* "سارد بوون" ؟ (هەڵی سەنگینە دەگەڵ bārād (Heb.) "دانە، تەزرە"، bārad (Heb.) "پرژاندن، ڕەشاندن، تەزرە بارین"، برد barad (Arb.) "تەزرە"). بە گوێرەی بۆچوونێکی دیکە وشەکە دەچێتەوە سەر poudre (F.) "گەرد" [بڕوانە "فرهنگ ریشە شناختی زبان فارسی"، ل. 161].

باری **barî** [ *bārī* ] - "مەڵغە، نوێل، دەلەم": دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- barre (OF.) و (F.) "دار، میلە".

2- ↑باریسە barîse.

باریسە **barîse** [ *bārīsa* ] - "داری نیوان کۆڵەکە و کارتیە": خزمە دەگەڵ Brücke (G.)، brucca (OG.)، brug (Nl.)، bridge (E.)، brygga (Sw.) "پرد" و Prügel (G.) "چۆماخ، گۆپاڵ"، سەر بە ریشەی > ***bhrēu-, *bhrū- (IE.)*** "دار(ی بڕداوە)، دیرەک". مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە دە بنەڕەتدا ئەو دار یان دارانە بووە کە وەک پرد بەسەر چۆم و ئاواندا ڕاهێشتراوە.

باریک **barîk** [ *bārīk* ] - "1- زراف 2- کزولاواز": باریک bārīk (P.). پێوەندی هەیە بە↑ باڕ bar "بێچوو"، سەر بەڕیشەیەک بەمانای "کەم، گچکە".

[تێبینی: ئەم پێوەندییەی نێوان دوو چەمکی "باریک" و "گچکە" لە وشەی ژێرمەنی schmal (G.) یشدا دەردەکەوێ کە سەرەتا بە مانای "بێچوو، باڕ" بووە و ئێستا دە زمانی ئەڵمانیدا مانای "باریک" دەگەیەنێ].

[دە "فرهنگ ریشە شناختی زبان فارسی"دا (ل. 163) سەبارەت بەم وشەیە دوو بۆچوون پێشنیار کراوە: 1 پێوەندی دەگەڵ وشەی ئەوێستایی -bāra (Av.) "لێوارە، تیژایی"، سەر بە ریشەی -bar "برین"، 2- پێوەندی دەگەڵ -bālá (OIn.) "زارۆک"].

باز1 **baz 1** [ *bāz* ] - "ڕێگا": ئەم وشەیە دەزمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا بەم مانایە شوێنەواری کز بۆتەوە، بەلام لە چەند وشەیەکدا بەدی دەکرێ وەک بازی بێریان ، پردەباز. وشەکە خزمە دەگەڵ Weg (G.)، way (E.)، wec (OG.)، wigs (Gt.)، vag (Sw.) و گشتیان بە مانای "ڕێگا"، سەر بە ریشەی > ****wegh- , *uegh- (IE.)*** "بزووتن، جووڵان، ڕۆیشتن"، خزمە دەگەڵ↑ بزووتن (بزوان) bızutın و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا.

- باز2 **-baz 2** [ *bāz* ] - پاشگری ئاوەڵناوی کارا": خزمە دەگەڵ وشەی↑ بازی bāzī (P.) "کایە". [ئەم پاشگرە دە زمانی کوردمادیدا زۆرتر باری نەرێنی هەیەوەک قومارباز، جادووباز، مێباز و هتد]. وشەی

بازی bazî وەك وشەیەكی سەربەخۆ دە زمانی ئەمرۆی كوردمادیدا كەمتر بەكار دێ. دەبنەڕەتدا دەبێ خزم بێ دەگەڵ "هەڵبەز دابەز" سەربەكرداری↑ بزووتن bızutın.

[تیبینی: دە زمانی ئینگلیزیدا play بە مانای "كایە كردن" دێ و ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بزووتن"، وشەكە دە ئینگلیزی كۆندا plega بووە بە مانای "پەڕین، جمو جۆڵی توند و خێرا" و ئەم وشەیە دەبێ خزمی "پەڕین و هەڵپەڕ داپەڕ"ی كوردمادی بێ].

**باز3 baz** *[ bāz ]* - "باشوو، مەلی راوكەر": وشەكە بە شێوەی باشووbaşû، باشە başe، واشە waşe ش خۆ نیشان دەدا [سەرنجی فۆتیمی w بدە كە كۆنترە لە b و لە هێندێك لە وشەكانی سەرتر و خوارتری ئەم بەشەی وشەنامەكەدا گۆراوە بە b]. باز bāz (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ↑ بزووتن bızutın و دەبنەڕەتدا ئاماژە بە بزاڤ [فڕین] ی خێرای ئەم مەلە كرابێ.

[دە "فرهنگ ریشە شناختی زبان فارسی"دا (ل. 164) دوو بۆچوون سەبارەت بەم وشەیە ئاماژە پێكراوە: 1- پێوەندی بە ریشەی باز -baz "ئاوەڵا كردنەوە"ی (باڵەكان) 2- پێوەندی بە -vājín (OIn.) "توند، چابوك"].

**باز$^4$ baz** *[ bāz ]* - دەگەڵ "ئاز" دێ [ئاز و باز az u baz ت لە ئەستۆی من واتا ئۆباڵت بە ئەستۆی من]. خزمە دەگەڵ بزە baze (P.) "گوناح، خەتا، تاوان". خزمە دەگەڵ ↑بەد bed.

[تیبینی1: "بەد" لە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە böse (G.) و خزمە لەگەڵ وشە كوردمادییەكە و شێوەشی لە "باز" نیزیكە. هەروەها ئەم وشە ئەڵمانییە هاومانایە لەگەڵ وشەیەكی دیكەی ئەڵمانی، واتا übel (G.) "بەد". ئەمەش خۆی خزمی وشەی كوردمادی "ئۆباڵ، وەباڵ"ە كە لەسەرەوە وەك مانای "باز" هاتووە. تیبینی 2: وشە فارسی "بزە" بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 199) خزمە دەگەڵ -bazda (Av.) "نەخۆش، ناساخ" و banja (Gt.) "زەبر، گوشار"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *bhen- >*** "زەبر لێدان، زیان لێدان"].

**بازار bazar** *[ bāzār ]* - "شوێنی كڕین و فرۆش": بازار bāzār (P.)، wāzār (MP.). بە بۆچوونی Justi Ferdinand وشەی بازاڕ [واجار vacar (Pl.)] دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێنی هاتوچۆی زۆر" بووە. شێوەی وشەكە دە زمانی پەهلەویدا و هەروەها ئەسڵی ماناكەی گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە كە وشەكە خزمە دەگەڵ ↑بزاوتن bızawtın و مەبەست لە بازار "شوێنی جموجۆڵی زۆر" یان بە وتەی Justi "شوێنی هاتوچۆی زۆر" بووە. بنەوشەی بز bız [vac (Pl.)، vaz (Av.)] نەك هەر بە گشتی مانای "بزووتن وجووڵان" دەگەیەنێ، بەڵكوو هەروەها مانای "رێگا و هاتوچۆ"ش دەردەبڕێ و ئەم مانایە لە وشەی ↑*باز baz* ی كوردمادی بەمانای "رێگا" دا پارێزراوە [پردەباز، بازی بێریان].

[دە "فرهنگ ریشە شناختی زبان فارسی"دا (ل. 164) وشەكە بردراوەتەوە سەر -*vahā* و -**čarna* (OI.) پێك هاتوو لە دوو ریشەی -vah "دان و ستاندن" و-kar "جووڵان، بەم لا و ئەو لادا رۆیشتن"].

**بازد bazd** *[ bāzd ]* - "خۆ هەڵاویشتن" سەر بە كرداری ↑بەزین bezîn [هەڵبەزین] و خزمە دەگەڵ ↑بزووتن bızutın.

**بازرگان bazırgan** *[ bāzırgān ]* - "سەوداكەر": بازرگان bāzargān (P.). لە وشەی ↑بازار bazar وەرگیراوە.

[تیبینی: دە زمانی فەرانسی كۆندا دا وشەی بورژوازی bourgeois (OF.) "چینی سەرمایەدار، بازرگان" دەگەڕێتەوە بۆ burgeis "قەڵا" و مەبەست لە "قەڵا" شار و بازارەكان بوون كە لە سەردەمە كۆنەكاندا بە قەڵا دەوریان گیرابوو. پێوەندییەكی ئاوهایی لە زمانی كوردمادی و فارسیشدا هاتووەتە ئاراوە، كاتێك بە هەڵسووڕێنەرانی بازاڕەكان [باژێڕەكان] گوتراوە بازرگان].

**بازرە bazre** *[ bāzra ]* - "كەوانە كردن و گەڕانەوە": خزمە دەگەڵ ↑بازن bazın.

**بازرەقە bazreqe** [ *bāzraqa* ] - "فیچقە کردنی ئاو": خزمە دەگەڵ ↑بەزین bezîn [هەڵبەزین] و دەگەڵ ↑بزووتن bızutın.

**بازن(ە) bazın(e)** [ *bazın(a)* ] - "1- ئاڵقەی دەست، خرخاڵ 2- جەغز": خزمە دەگەڵ Bogen (G.)، bow (E.)، boog (Nl.)، bage (Sw.)، گشتیان بەمانای "کەوان، کەوانە". هەروەک چۆن وشەی کەوان دەگەڵ وشەی "چەمان"ەوە خزمە، هەربەم جۆرەش بازنە خزمە دەگەڵ ↑*فیزان* *fîzan* [*فیزانەوە*].

[ تێبینی: یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردمادی ئەوەیە کە دە زۆر وشەدا بەرانبەری فۆتیمی g ی زمانە ژێرمەنییەکان فۆتیمی z یان s دەردەکەوێ. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە بۆ وێنە دەگەڵ *باز* "رێگا" و *باسک* "قۆڵ" و هتد ].

**بازە baze** [ *bāza* ] - "جۆرە کووتاڵێکی ئەستوور": هەروەها ↑بزگوڕ bızgur هەیە بە مانای "کوتەپەڕۆ". دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑پەس پەسکەرە pespeskere [پسپسەکۆڵە pıspısekole] "جاڵجاڵووکە"، سەر بە ریشەی **< *pak-, *pag- (IE.)** "بەستن، تێکخستن، چنین، تەنین" و دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑فاق2 faq "1- جورێک *داو* بۆ گرتنی پەلەوەر 2- جۆرێک پارچەی رەش بۆ چارشێوی ژنان".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "داو" و "پارچە" بڕوانەی وشەی "داو" کە خزمە دەگەڵ "جاو" و "تەون"].

**بازەڵە1 bazele** [ *bāzala* ] - "بەڵەکی کەم" بازە baze و پیسە pîse ش دەگوترێ. ↑بازگ bazg "سپی، بەڵەک".

**بازەڵە2 bazele** [ *bāzala*] - "خڕەکە و هەراش بووکێ": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بزر bızır "دووربۆوە، ون" و ↑بازرە bazre "دەرپەڕین و دوور بوونەوە" و گشتیان پێوەستن بە کرداری ↑بزووتن bızutın. ئەم دەربڕینە بۆ هەراش بوونی منداڵ، دەبێ یان لێرەوە هاتبێ کە منداڵی هەراش بوو ئیتر زۆر بە دایکییەوە نانووسێ و وردەوردە لێی جیا دەبێتەوە [دوور دەبێتەوە] و خەریکی کایە و گەمەی خۆی دەبێ، یان منداڵەکە خڕەکە دەبێ، ئیتر زۆر بە سەر دەست و لەسەر کۆڵی ئەم وئەو نابێ و خۆی دەکەوێتە جم و جۆڵ و *بزوان* بەملا ولادا. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑باشیل başîl "ئاوارە و دەربەدەر".

**بازەڵێن bazelen** [ *bāzalen* ] - "کایەی قەمچان": خزمە دەگەڵ ↑باز2 و بازی bazî "کایە".

**بازی bazî** [ *bāzī* ] - "گەمە، کایە، لەیزین": بازی bāzī (P.). خزمە دەگەڵ ↑بەزین bezîn [هەڵبەز دابەزین] و دەگەڵ ↑بزووتن bızutın.

[تێبینی: وشەی "لەیزین"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خۆ هەڵاویشتن". هەروەها وشەی ئینگلیزی play "کایە، بازی" دەچێتەوە سەر pleien ی ئینگلیزی کۆن بە مانای "سەما، هەڵپەڕین، خۆ هەڵاویشتن لە خۆشیان].

**باژۆ bajo** [ *bāžo* ] - "گەمێی بادەوانی": خزمە دەگەڵ ↑ئاژۆتن ajotın "لێخوڕین".

[تێبینی: لە باری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ fahren (G.) "ئاژۆتن" و Fähre (G.) "کەشتی بۆ پەڕینەوە"].

**باژەڵە bajele** [ *bāžala*] - "نەخۆشی پێستی منداڵان": باژ + ەڵە baj + ele. باژێلە bajele ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە ماسین، خڕ بوون، هەڵتۆقین و ئەستوور بوون دەکەن وەک ↑پزە pıze "نەخۆشییەکی مەڕ"، ↑فزدووک fızdûk "زیپکەی بالغ بوون"، ↑پیزۆکە pîzoke "ورکەزیپکە"، ↑بووک2 buk "باپشکێو"، ↑بۆغمە boġme "ملەخڕە"، ↑بۆز boz "نەخۆشی ماسینی چۆکی ئاژەڵ"، ↑*بۆقژە* *boqje* "زیپکەی ناو دەمی زارۆک" و هتد. ئەم وشانە هەموو دەچنەوە سەر ریشەی **< *bhu- (IE.)** "ماسین، با کردن".

باژێر **bajer** [ *bāžer* ] - "شار" [دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا]: شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بازاڕbazar.
[تێبینی: لەبەر ئەوەی هەر لە کۆنەوە دوو چەمکی "شار" و "بازاڕ" بە تەواوی لێکبەستراو بوون، واتا یان بازاڕەکان بوونە هۆی سەرهەڵدانی شارەکان ویان شارەکان بوونە مەکۆ و مەڵبەند بۆ بازاڕەکان، ئیتر دە زمانی کوردمادیدا وشەی باژێریش بە مانای "شار" بەکار هێندراوە].

باستیک **bastîk** [ *bāstîk* ] - "شیرینییەکە لە نیشاستە و شەکر دروست دەکرێ": باسوخ basux و باسوق basuqیش دەگوترێن. وەرگیراوە لە pastee (OF.) "هەویر، پەڵوو". وشە فەرانسییەکە هاتووەتە ناو زمانی ئەڵمانیش و بووەتە Paste (G.) "هەویر".

باسقەننە **basqenne** [ *bāsqanna* ] - "دەسکی سەبیلە": باس [↑باسک bask] + ↑قەننە bas + qenne.

باسک **bask** [ *bāsk* ] - "باهۆ، لای سەرەوەی دەست": بازو bāzū (P.). خزمە دەگەڵ Bug (G.)، buog (OG.)، bog (OE.) و (Sw.). گشتیان بەمانای "شان، باسک"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *bheug- >*** "چەمانەوە، فیزانەوە". bahu- (OIn.) "باسک" [بەراوردی بکە دەگەڵ باهۆ baho ی کوردمادی]، pechys (Gr.) "قۆڵ، ئانیشک"، کەرتی دووەم دە وشەی Ellenbogen (G.) "ئانیشک" دا دەچنەوە سەر هەمان ریشە. دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ وشەکانی ↑بازنە bazne، ↑بستوو bıstu وهتد.

باسکێش **baskêş** [ *bāskeš* ] - "باسکەوجاڕ، ئێرەقە": لە ↑باسک bask وەرگیراوە و دەبێ کەرتی دووەمەکەش پێوەندی بە خیش xīš (P.) "هەوجار"ەوە هەبێ. [هەڵ سەنگینە دەگەڵ باسکەوجاڕ].
[تێبینی: وشەی ئێرەقە ereqe یان هێرەقە hereqe ش لەوانەیە دە ریشەدا بە مانای باسک بێ و خزم بێ دەگەڵ ↑هەرمە herme "شان و پیل"].

باسمە **basme** [ *bāsma* ] - "شەقڵی خەرمان": دەشێ پێک هاتبێ لە باس + پاشگری مە bas + me. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بێز3 bez "رەنگ، وێنە".

باش **baş** [ *bāš* ] - "چاک، دژی خراب": باشە bāše (P.) "باشە"، خزمە دەگەڵ besser (G.) "باشتر" و best (G.) و (E.) "باشترین، هەرەباش". ئەم وشە ژێرمەنییانە دۆخی باڵاتر و باڵاترین لە ئاوەڵناوی bass ن، کە لەو زمانانەدا ئیتر بەکار ناهێنرێ و دە کۆندا دەقاودەق بە مانای "باش"ی کوردمادی بەکار هێنراوە. ئەو وشانەی دوایی دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *(Gm.) * batiz-*. ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە دیاری نەکراوە.

باشوور **başûr** [ *bāšūr* ] - "جنووب": دەگەڵ وشەی ↑باکوورbakur دەبێ دە بنەڕەتدا یەک وشە بووبن، واتا دوو شێوەی جیاواز بووبن لە یەک وشە و دواتر دوو مانای جیاوازیان وەرگرتووە. ئەسڵی وشەکە دە کۆندا بە مانای "شیمال" بەکار هاتووە، دواتر دە زمانەکانی دیکەشدا مانای جیاوازی وەرگرتووە و دە فارسیدا مانای "رۆژاوا" و "رۆژهەڵات"ی وەرگرتووە و چووەتە ناو زبانی عەرەبیش و بووەتە افاهتر afāhtar (Arb.) بە مانای "باشوور، جنووب". دە زمانی ئەمرۆی فارسیدا باختر baxtar (P.) بە مانای "رۆژئاوا" بەکاردێ.

باشەل **başel** [ *bāšal* ] - "کۆلوانە، چارۆکە": باشێل başêl یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پاش paş و مەبەست ئەو پارچەیە بێ کە پاشەوە [پشتەوە] ی پێ داپۆشراوە.

باشیل **başîl** [ *bāīšl* ] - "ئاوارە و دەربەدەر": خزمە دەگەڵ ↑بازەڵە2 bazele "خڕەکە و هەراش بووکێ".

باغ **baġ** [ *bāġ* ] - "شوێنی پڕ لەدار و گوڵ": باغ bāġ (P.). بە لەبەرچاو گرتنی هەم مانا وهەم فۆتیمەکانی ئەم وشەیە، لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑بێشە bêşe "دارستانی چڕ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای" هەڵمسان، گەورە بوون، چڕ و پڕ بوون".
[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 167) وشەکە بردراوەتەوە سەر ریشەی ئێرانی کۆنی bāga- (OI.) "بەش، بەشەزەوی" و لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بەش beş].

باغر **bağır** [ *bāğır* ] - "بەفیز و هەوا": وێ دەچێ پێک هاتبێ لە بنەوشەی باغ- bağ کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بەمانای "هەڵمسان" [بڕوانە ↑بەس bes].

باغە **bağe** [ *bāġa* ] - "چێکراو لە نەوت، پەلاستیک": دەبێ خزم بێ دەگەڵ کرداری ↑بەهتین behtîn "توانەوە، حەلین". تایبەتمەندی "باغە" ئەوەیە کە بە تینی ئاگر زوو قاڵ دەبێ و دەتوێتەوە.

باغەڵ **bağel** [ *bāġal* ] - "ئامێز، باوەش، بەرۆک": باخەل baxel یش دەگوترێ. بغل bağal (P.). باغ + ەڵ [یان باغە + ڵ] bġa + el، کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑باقە baqe "گیا و گوڵی بەستەکراو" [دەبنەڕەتدا شتی پێچراوە و کۆ کراوە]. لەم تێروانینەوە باغەڵ ئەوشوێنەیە کەوا شتی تێدا بەستە کراوە [باقەکراوە] و بۆیەش بەم جۆرە ناو نراوە.

بافت **baft** [ *bāft* ] - "هۆنە، کر، هۆندراو": بافت baft (P.). خزمە دەگەڵ بنە وشەی باب -bab دە وشەی ↑بابۆلە babole دا، ئەم وشەیە وەک کردار دە زمانی فارسیدا هەیە و دەبێتە بافتن bāftan (P.) "چنین، هۆنین".

بافل **bafıl** [ *bāfil* ] - "ئاوهەڵدێر، تاڤگە": پێک هاتووە لە دوو کەرتی باف + پاشگری ل baf + ıl. بنجی "باف" خزمە دەگەڵ ↑باو1 baw "تەکان، بزاڤ، پاڵ".

باقاندن **baqandın** [ *bāqāndın* ] - "هاواری ئاژەڵی وەک ڕێوی": شێوەیەکی دیکە لە ↑واقاندن waqandın و خزمە دەگەڵ واق wāq (P.) [واق واق] "وەڕەوەڕ" و دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑وشە wışe، ↑وزە wıze و ↑فزە fıze دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەنگ و هەرا کردن".

باقر **baqır** [ *bāqır* ] - "قاب و قاچاخی مس": لە *(Tr.) bakır* "مس "وەرگیراوە [بڕوانە "فەرهەنگی هەرمان"، ل. 229].

باقلاوە **baqlawe** [ *bāqlāwa* ] - "جۆرێک شیرنی": پاقلاوە paqlawe ش دەگوترێ. کەرتی یەکەمی وشەکە، باق -baq، دەبێ باک -bak بووبێ و ئەمەش دەگەڵ backen (G.) و bake (E.) و ↑پێژان pejan ی کوردمادی یەک دەگرێتەوە. ئەم وشە ژێرمەنییانەش بۆ دروست کردنی نان و باقلاوە و شتی لەم جۆرە کەڵکیان لێ وەردەگیرێ.

باقلە **baqle** [ *bāqla* ] - "دانەوێڵەیەکە": باقلی bāqlī (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑بۆق1 boq دا شی کراونەوە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "ماسین، با کردن". لەم تێروانینەوە "باقلە" واتا "ماسیوی بچووک".

باقۆ **baqo** [ *bāqo* ] - "جۆرێک ماسی زل، نقە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ pike (E.) "ماسییەکی زلی زۆرخۆر کە لە ئاوی شیرندا دەژی". وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بەمانای "تیژ، دەرپەڕیو". ماسی pike لەبەر دەرپەڕین و تیژ بوونی دەم و لووتی بەم جۆرە ناودێر کراوە.

باقە **baqe** [ *bāqa* ] - "گیاو گوڵی لێکبەستراو، بەستەی گژ و گیا": خزمە دەگەڵ pack (Nl.)، baggi (ONr.) "بەستە، باقە"، bagge (Me.) و bag (E.) "ساک، توورەکە"، baggage (E.) "بارگە وبنەی تیکەوە پێچراو" pack (E.) "بەستە، دەستە، باقە"، packen (G.) "بەستە کردن، تیکەوەپێچان". وشەی "پاکەت"یش دە کوردمادیدا لە packet (E.) وەرگیراوە و سەر بەم خێزانە وشەیە. ریشەی ئەم وشانە بە تەواوی ساغ نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑بوخچە buxçe و ↑باغەڵ bağel دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە خزمن. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑فاق2 faq "جورێک داو بۆ گرتنی پەلەوەر"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *pag-, *pak-*** "قایم کردن، بەستن، تیکخستن، چنین". ئەگەر ئەم پێوەندییە ڕاست بێ، "باقە" دەبێتە خزم دەگەڵ ↑باقیە baqîye "تەقەڵ".

[تێبینی: ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەتیوان سێ وشەی ئەڵمانیشدا کە پێکەوە خزمن، لە ئارا دایە، واتا binden (G.) "بەستن، گرێ دان"، Bündel (G.) "باقە، بەستە" و Band (G.) "بەن، بەند"].

**باقەبێن baqeben** [ *bāqaben* ] - "گیای باقە پێ بەستن": ↑باقە + ↑بێن baqe + ben. "بێن" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بەن ben [بەند bend].

**باقیە baqîye** [ *bāqīya* ] - "تەقەڵ": بخیە baxīye ‹P.›. خزمە دەگەڵ pangere ‹L.› "قایم کردن" و pagus ‹L.› "لێکبەستن، تێکخستن"، سەر بە ریشەی ***pag-*** **‹IE.›** "قایم کردن".

**باک bak** [ *bāk* ] - "ترس": بێباک واتا "نەترس". باک bāk ‹P.›. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Fehde ‹G.›، fa hđ ‹OE.› "شەڕ و دوژمنایەتی"، fāh ‹OE.› "دوژمنکار، بێزراو"، foe ‹E.› "دوژمن"، Feige ‹G.›، veeg ‹Nl.›، fa ge ‹OE.›، feigr ‹OIs.› "نگریس، بێزاو، بە لەعنەت کراو". وشەی Feige دە زمانی ئەڵمانی ناویندا ماناکەی بووەتە "لە مردن، لە مەترسی سڵەمینەوە" و دە زمانی ئەمڕۆییدا بووەتە "ترسەنۆک". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***peik-* , *poik-*** **‹IE.›** "دوژمنکار".

**باکوور bakur** [ *bākūr* ] - "شیمال": خزمە دەگەڵ باختر bāxtar ‹P.›، abāxtar ‹MP.› "باکوور، شیمال"، *apāxtara-* ‹Av.› "پشتەوەتر، ئەولاتر"، *apānk-* ‹Av.› "بەرەودوا، بۆ لای پشتەوە". مانای وشەکە دە زمانی فارسی نوێدا گۆڕاوە و بووەتە "رۆژاوا" [بڕوانە "فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی"، ل. 157].

**باڵ bal 1** [ *bāl* ] - "ئەندامی فڕینی پەلەوەر": بال bāl ‹P.›.

1- wallen ‹G.› "گشت و گوزار کردن" [دە بنەڕەتدا: لە جم و جۆڵدا بوون]، Wedel ‹G.› "باوەشێن، تۆزتەکێن"، vēli ‹OIs.› "کلکی پەلەوەر". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(a)ue-, *hwe-*** **‹IE.›** "با هاتن، شنینەوە، لەرینەوە بەدەم باوە" و دەبنە خزم دەگەڵ ↑هەوا hewa و Wind ‹G.› "*با*" و Wetter ‹G.› "هەوا".

2- لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ↑پەل² pel "دەست".

3- valva ‹L.› "لابالی دەرگا" هەیە کە ئەویش دەچێتەوە سەر volare "فڕین".

4- دە"فرهنگ ریشه شناختی زبان فارسی"دا (ل. 168) سەبارەت بەم وشەیە چەند شیمانە باس کراوە، وەک پێوەندی وشەکە بە -varha ‹OIn.› "پەڕی تاوس".

**باڵ bal 2** [ *bāl* ] - "لەکن، ل جەم": شێوەیەیەکی دیکە لە ↑پاڵ pal "کن، نک". دەشێ مانای بنەڕەتی وشەکە "پاڵ، کن، جەم" بێ و ئەم مانایە دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا پارێزراوە [تشتێ من ل بال تەنە]. دە شێوەزاری موکریانیدا "دە باڵ یەکدا بوون و دە باڵ یەک کردن" مانای "دە ناو یەکدا بوون" و "خستنە ناو یەکدی، تێکەڵ کردن" دەگەیەنێ. مەبەست لەم دەربڕینانە سەرەتا دەبێ هەر "دەپاڵ یەکدا بوون، خستنە پاڵ یەک" بووبێ و دواتر هێندێک گۆڕانی مانایی بەسەردا هاتبێ. ئەم وشانە دواتر خزمن لەگەڵ ↑بار[7] bar "قەراخ، تەنیشت، ئاڵ"، هەروەها شێوەیەکی دیکە لە ↑بەر[6] ber [ئەم بەر و ئەو بەر، بەری باڵەکایەتی]. دە فارسیدا var ‹P.› دەگوترێ [این ور īn var "ئەم بەر"، ان ورān var "ئەو بەر"]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***per-*** **‹IE.›** "تێپەڕین (بە شوێنێکدا)".

[تێبینی1: گۆرانییەکی فارسی هەیە کە لەوێدا گۆرانیبێژ بە خواژنی نازەکەی دەبێژی "بیا بە بر من". "بر" لێرەدا هەر ئەم مانایانەی سەرەوە دەبەخشێ و مەبەستی گۆرانیبێژ ئەوەیە کە یارەکەی بچێتە پاڵی (باڵی، تەنیشتی). تێبینی 2: دە "فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 238) وشەی "باڵ" بردراوەتەوە سەر وشەی "باغەڵ" و ئاماژە بەوە کراوە کە وشەی "بەغەل" دە زمانی پەشتوودا مانای "پەنا، تەنیشت"یش دەدا].

**باڵ bal 3** [ *bāl* ] - دەگەڵ حاڵ دێ [حاڵ و باڵ]. شێوەیەکی دیکە و دەشێ کۆنتر بێ لە ↑بار² bar "بار و دۆخ".

**باڵا bala** [ *bālā* ] - "بلیندی، بەرزی": بالا bālā ‹P.›، خزمە دەگەڵ bor ‹OG.› "باڵا، بڵیندی"، empor ‹G.› "بەرەو سەرەوە"، سەر بە ریشەی ***bher-*** **‹IE.›** "هەڵهێنان، بردن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بەل2 bel "دەرپەریو، بڵیندتر لە دەوروبەر" و ↑بەلۆکە beloke "قیتکە".

[تێبینی 1: ده "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی"دا (ل. 169) وشه‌که هه‌ڵسه‌نگێنراوه ده‌گه‌ڵ barəz (Av.) "هه‌ڵدان، گه‌وره بوون" وfortis (L.) "به‌هێز" و بردراوه‌ته‌وه سه‌ر ریشه‌ی **(IE.) *bher(e)gh- >** "به‌رز، بڵیند". تێبینی 2: وه‌ك له ژێر وشه‌ی ↑به‌رز berız دا شی كراوه‌ته‌وه، ئه‌م ریشه‌یه خۆی شێوه‌یه‌كی په‌ره‌گرتووه له ریشه‌كه‌ی سه‌ره‌وه‌تر و به‌م جۆره‌ش تێكڕای وشه‌كانی سه‌ره‌وه پێوه‌ندی به یه‌كتره‌وه په‌یدا ده‌كه‌ن].

**باڵاته balate** [ *bālāta* ] - "سه‌ره‌تای گه‌یشتنی میوه": هه‌ڵی سه‌نگێنه ده‌گه‌ڵ ↑باڵا bala.

**بالار balar** [ *bālār* ] - "كاریته": ئه‌م وشه‌یه و چه‌ند وشه‌یه‌كی دیكه وه‌ك ↑باڵاشمه balaşme "داری سه‌تاقه"، ↑باڵشمه balışme "چوارچێوه‌ی ده‌رگا" ده‌شێ خزم بن ده‌گه‌ڵ balken (G.)، balk (Nl.)، (E.) و (OG.)، bjälka (Sw.) "داری داره‌ڕا، كاریته". phalagx (Gr.) "دار، ته‌نه‌دار" خزمه ده‌گه‌ڵ وشه ژێرمانییه‌كان. ئه‌م وشانه ده‌چنه‌وه سه‌ر ریشه‌ی **(IE.) *bhel- >** "هه‌ڵمسان".

**بالاندن balandın** [ *bālāndın* ] - "هه‌رای مه‌ڕ و بزن": باراندن barandın یش ده‌گوترێ. هه‌روه‌ها ↑بۆڕاندن borandın به مانای "ده‌نگ و هه‌رای گا و گۆل" به‌كار دێ. بڕوانه ↑باله‌بال balebal.

**باڵتاو baltaw** [ *bāltāw* ] - "باڵاپۆشی ئه‌ستوور": باڵتۆ balto و باڵته balte ش ده‌گوترێن. ئه‌سله‌كه‌ی paleto (Sp.) یه و له وانه‌یه له ڕێگای فه‌رانسییه‌وه هاتبێته ناو زمانه ڕۆژهه‌ڵاتییه‌كان.

**باڵته balte** [ *bālta* ] - "بیور، ته‌ور": خزمه‌ده‌گه‌ڵ Beil (G.)، bhila (OG.)، biail (OIr.) "بیور"، سه‌ر به ریشه‌ی **(IE.) *bhei- >** "لێدان، له‌ت و كوت كردن".

**بالاشمه balaşme** [ *bālāšma* ] - "داری سه‌رتاقه": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑بالار balar "كاریته".

**باڵشمه balışme** [ *bālıšma* ] - "چوارچێوه‌ی ده‌رك و په‌نجره": خزمه‌ده‌گه‌ڵ ↑بالار balar "كاریته".

**بالنج balınc** [ *bālınj* ] - "بالیف": به‌هلنگی behlıngî یش ده‌گوترێ. بالش bāleš (P.)، خزمه ده‌گه‌ڵ polster (G.)، bolster (E.)، bolstar (OG.)، barezis (Av.) "بالنج"، سه‌ر به ریشه‌ی **(IE.) *bhel- >** "ماسین، باكردن، هه‌ڵمسان".

[تێبینی: فۆتیمی n هه‌روه‌ك چۆن ده زمانی كوردمادیدا، ده هێندێك زمانی دیكه‌شدا كه‌وتووه‌ته ناو وشه‌كه‌وه، بۆ وێنه ده balzina (Serb-Kr.)دا].

**باڵوێز balwez** [ *bālwez* ] - "نوێنه‌ری ده‌وڵه‌ت له وڵاتێكی دیكه": به پێی "فه‌رهه‌نگی هه‌رمان" (ل.244) له *(Tur.) balyoz* وه‌رگیراوه و ئه‌میش له‌وانه‌یه له ئیتالیایی وه‌رگیرابێ.

**بالۆره balore** [ *bālora* ] - "جۆره گۆرانییه‌ك": هه‌ڵیسه‌نگێنه ده‌گه‌ڵ ballare (It.) "سه‌ما كردن". وشه‌ی ballade (F.) "جۆرێك گۆرانی ڕۆژاوایی" ده‌چێته‌وه سه‌ر وشه ئیتالییه‌كه. له لایه‌كی دیكه‌وه جێی هه‌ڵسه‌نگاندنه ده‌گه‌ڵ ↑باله‌بال balebal "ده‌نگ و هه‌رای مه‌ر و بزن".

**بالۆكه baloke** [ *bāloka* ] - "هه‌ڵتۆقاویی سه‌ر پێست": خزمه ده‌گه‌ڵ Beule (G.)، boil (E.)، bul (OG.)، byl (OE.) "هه‌ڵتۆقاویی، هه‌ڵمساویی". بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانه ↑بۆڵ bol "ده‌نكه ترێ".

**باله bale** [ *bāla* ] - "خرۆكه، ئاوڵه": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑بالۆكه baloke.

**باله‌بال balebal** [ *bālabāl* ] - "ده‌نگ و هه‌رای مه‌ر و بزن": جگه له‌م وشه‌یه، ده زمانی كوردمادیدا بۆڕاندن borandın "ده‌نگ و هه‌رای گاو گۆل" و باراندن barandın یان بالاندن balandın "هه‌رای مه‌ڕو بزن" هه‌ن كه بۆ ده‌ربڕینی مانای "ده‌نگ و هه‌را" به‌كار ده‌هێندرێن. هه‌روه‌ها بولبول bulbul "مه‌لی ئاوازه‌خوان" [ده‌بنه‌ڕه‌تدا: مه‌لی به‌ده‌نگ وهه‌را]. ئه‌م وشانه ده‌شێ له ریشه‌یه‌كی هاوبه‌شه‌وه هاتبن به مانای "ده‌نگ و هه‌را". ده‌شێ خزم بن ده‌گه‌ڵ bell (E.)، bellan (OE.) "وه‌ڕین، هه‌راهه‌را كردن"، bellow (E.)، belwen (ME.) "بۆڕاندن". ریشه وشه ئینگلیزییه‌كه ساخ نه‌كراوه‌ته‌وه. له‌وانه‌یه بێلیته/ بێریته berîte / belîte "به‌زم و گۆرانی" پێوه‌ندی به‌م وشانه‌وه هه‌بێ. ئه‌م وشانه هه‌روه‌ها جێی هه‌ڵسه‌نگاندنن

دەگەڵ bell ‎(E.)‎، belle ‎(OE.)‎، belle ‎(MG.)‎ "زەنگ، زەنگوڵە" کە گریمانە دەکرێ پێوەندی بە وشەی ئینگلیزییەکەی سەرەوە هەبێ.

**باڵەبان baleban** *[ bālabān ]* - "1- دەهۆڵ 2- جۆرێک نایە": بە پێی "فەرهەنگی هەرمان" (ل. 242) لە *baraban (Rus.)* وەرگیراوە.

**باڵەکە baleke** *[ bālaka ]* - "دەفەی شان": لەوانەیە باڵە bale شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑بێل bel. لەم تێڕوانینەوە مەبەست وێچواندنی شانە بە بێلە، کە شتێکی پان و تەختە.

[تێبینی: لەم بارەوە بەراوردی بکە دەگەڵ sternon ‎(Gr.)‎ "تەختی سینگ" کە دەشێ خزم بێ دەگەڵ "سێل"].

**بالیف balîf** *[ bālīf ]* - "باڵنج": خزمە لەگەڵ pulvinus ‎(L.)‎ "باڵنج". Pfühl ‎(G.)‎، pfuluvi ‎(OG.)‎، pillow ‎(E.)‎ "باڵنج" لەو وشە لاتینیە وەرگیراون و ئەویش خۆی دەبردرێتەوە سەر pulvis "تۆز، گەرد" [وەک گەرد نەرم؟].

**باڵینە balîne** *[ bālīna ]* - "رفێدە": خزمە دەگەڵ ↑باڵنج balinc [رفێدە وەک باڵنجێکی چکۆڵە وایە].

**باڵێن balen** *[ bālen ]* - "داری پشتیوانەی دەرگای داخراو": خزمە دەگەڵ ↑باڵار balar "کاریتە".

**بان[1] ban** *[ bān ]* - "1- سەرەوی شتێک 2- سەرەوەی خانوو": بام bām ‎(P.)‎. خزمە دەگەڵ oben ‎(G.)‎، oban ‎(OG.)‎ "سەرەوە". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **uban- (Gm.)*، خزمە دەگەڵ upara ‎(Av.)‎ "سەرەوە" و upama- ‎(Av.)‎ "سەرترین، باڵاترین".

[تێبینی 1: دە"فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 172) سێ بۆچوون خراوەتە روو: 1- پێوەندی بە ریشەی *pā-* "پاراستن، ئاگا لێبوون"، 2- پێوەندی بە بانو bānū "کابان"، 3- پێوەندی بە ریشەی vah- "مانەوە، جێ گرتن، نیشتەجێ بوون". تێبینی 2: "بان" دە زمانی کوردمادیدا نەک هەر بەمانای "بانی خانوو، سەربان" بەکار دێ، بەڵکوو بەگشتی بە مانای "سەر(ەوە)، لەسەر" بەکار دێ و ئەمەش دەبێ مانای بنەڕەتی وشەکە بێ (نموونە: بان چاو، بان سەر، لە بانەوە دانیشتن واتا لەلای سەرەوە دانیشتن). دە زمانی فارسیدا "بام" تەنیا بە مانای "بانی خانوو، سەربان" بەکار دێ و هەر بۆیەش دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا هەوڵ دراوە ریشەی وشەکە تەنیا لەم پێوەندییەدا بدۆزرێتەوە. بەڵام دە زمانی فارسیدا وشەیەکی دیکە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ کە ئەویش وشەی بم bam ‎(P.)‎ە. دەنگی "بم" واتا دەنگێک کە لە بانەوەیە. "بم"ی فارسی دیارە شێوەیەکی دیکەیە لە "بام" و نیشان دەدا کە وشەکە دە زمانی فارسیشدا پێشتر بە مانای گشتی "سەرەوە، لەسەر" بەکار هاتووە و ناتوانێ پێوەندی بەو ریشانەوە هەبێ کە لە فەرهەنگی ناوبراودا هاتوون. نموونەی ئەم وشەیە بە روونی نیشان دەدا کە وشەکانی زمانی فارسی ناتوانرێ بە باشی ساخ بکرێنەوە، ئەگەر وشە خزمەکانی زمانی کوردمادی نەناسرێن و نەخرێنە بەرچاو. ئەم دۆخە لە پێوەندی دەگەڵ وشە کوردمادییەکانیش هەر وایە و لێرەشدا بەبێ ئاگاداری باش لە وشە فارسییەکان، ساخ کردنەوەی وشەی کوردمادی هاسان نییە].

**بان[2] ban** *[ bān ]* - دەگەڵ چەند وشەیەک دێ وەک رێگا و بان، دەرک و بان [رووبەڕی ساف و تەختکراوی پێش دەرگا]، هەروەها کەرتێکە لە وشەی خیابان xīyābān ‎(P.)‎ "شەقام". [ئەم وشەیە کوردمادیش بەکاری دەهێنێ]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- bahn ‎(G.)‎ "رێگا" [وەک لە وشەکانی Eisenbahn ‎(G.)‎ "ریگای ئاسن" و Autobahn ‎(G.)‎ "ئوتووبان، رێگای ماشێن"دا] و baan ‎(NL.)‎. ئەم وشە ژێرمەنییە دەبردرێتەوە سەر ریشەی ژێرمەنی **bano-* "رووبەر" و ئەویش دەبردرێتەوە سەر ریشەی ***gono- (IE.) <** "لێدان". لەم تێڕوانینەوە "بان" دەتوانێ دەبنەڕەتدا بەواتای "هەردی لێدراو، کوتراو، تەختکراو" بووبێ. ئەگەر ئەم لێکدانەوە راست بێ، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ژەندن jendın "لێدان" دە کوردمادیدا.

2- baínein (Gr.) "ڕۆیشتن، بەسەردا ڕۆیستن، پێ لێنان". دیارە پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان دوو چەمکی "ڕۆیشتن" و "ڕێگا"دا. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی ڕێ [ڕێگا] و باز [واتا ڕێگا] بکەین کە هەردووکیان بۆ ئەو ریشانە دەگەڕێنەوە کە مانای "ڕۆیشتن، ڕەت بوون، بزووتن" دەبەخشن.

**بان³ ban** [ *bān* ] - دەگەڵ "تاو" دێ [تاو بان]، خزمە دەگەڵ ↑باو3 baw سەر بە ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە".

**بان⁴ ban** [ *bān* ] - دەگەڵ وشەکانی "جێگا" و "نوێن" دێ [جێگا و بان، نوێن وبان]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بناوان bınawan "کابان".

**باناندن banandın** [ *bānāndın* ] - "بێچووی بێ دایک خستنە بەر دایکێکی دیکە". ↑*بانین banîn* یش دەگوترێ. هەروەها↑نەباندن nebandın هەیە بە مانای "وەخۆ نەگرتن".

**بانبانک banbank** [ *bānbānk* ] - "جانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرە لە ڕەوەزە بەرداندا دەژی": بە گوێرەی مانای وشەکە ئەم جانەوەرە لە شوێنی بەرز و بڵیند دەژی و دەشێ لەبەر ئەوە ناوەکەی پێوەندی بە ↑بان1 ban "سەر، لای سەرەوە" هەبێ.

**باندۆر bandor** [ *bāndor* ] - "گوشار، کارتێکەری": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە بەندۆڵ bendol "زەنبەلەک".

**بانگ bang** [ *bāng* ] - "دەنگ، هەرا کردن، ڕاگەیاندن": با ba ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ phone "دەنگ"، phanai (Gr.) "قسەکردن، ئاخافتن"، bhánati (OIn.) "قسە دەکا" و fama (L.) "قسە، باس، دەنگ، بانگ"، Bann (G.) "دەستوور، فەرمان، حوکم، جادوو". ئەم وشە ئەڵمانییە کە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەشدا هەیە دەچێتەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی واتا bannan "حوکم دان بە پێی یاسای سزا دان"، سەر بە ریشەی < *bha- (IE.)* "قسەکردن، بانگ کردن". دە زمانی کوردمادیدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پەیڤین payvîn "قسەکردن" و↑باوbaw [بەیت و باو].

[تێبینی: بەپێی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 173) لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی vank- وەک شێوەیەکی گۆڕدراو لە ریشەی *vak-* "قسەکردن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وشە wışe].

**بانگەشە bangeşe** [ *bāngaša* ] - "تەبلیغات، پڕۆپاگاندە": بانگاشە bangaşe ش دەگوترێ. پێک هاتووە لە دوو وشەی بانگ + گاشە bang + gaşe. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قیژەqîje و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑گاز gaz [گاز کردن]، ↑*قسە qıse*، ↑کازین kazîn "دەنگ و هەرا" و ↑کاستین kastîn "لووراندن" و هتد. چەمکی هاوبەشی هەموو ئەم وشانە "دەنگ (بەرز) کردن، دەنگ هەڵبڕین"ە.

[تێبینی 1: لێرەدا ڕەنگە ئەو پرسە بێتە پێش کە چۆنە هەم "بانگ" و هەمیش "گاشە" کە دە بنەڕەتدا یەک مانایان هەیە، کەتوونە پاڵ یەکدی و یەک وشەی لێکدراویان پێک هێناوە. لە بەرسڤدا دەبێ بڵێین کە لە وشەسازی زمانی کوردمادیدا، بۆ دەربڕینی دۆخی جەخت کردن، چەند ڕێگە یاخود چەند شێوە بەکار دێ. یەکێک لەم شێوانە دووبارە کردنەوەی وشەکەیە وەک قیژەقیژ، لەرزەلەرز، دەنگەدەنگ و هتد. شێوەیەکی دیکە هێنانەوەی دوو وشەی هاومانایە وەک بانگاشە، بانگەواز [بانگ + ئاواز]، بایەقووش، جەمبازە، پاکتاو، ڕەشتاڵە، تەپلۆس، خڕخاڵ، سامۆتک، تارمایی، گۆنگەشە (گەنگەشە)، قرتماغە و هتد.

**بانوو1 banu 1** [ *bānū* ] - "دەشتی بەرز": خزمەدەگەڵ ↑بان ban "بەرز، لای سەرەوە".

**بانین banîn** [ *bānīn* ] - "کاری بانۆک، وەبەر خستنی بێچوو بەر دایکی نەبان": دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑نەباندن nebandın هەیە بە مانای "وەخۆ نەگرتن، خۆ دوور ڕاگرتن" ne + bandın. وشە سەرەکییەکە واتا باندن bandın شێوەیەکی دیکەیە لە بانین banîn و ئەمەش دەبێ پێشتر وەک کردارێکی سەربەخۆ بەکار هاتبێ و ماناکەی پێچەوانەی "نەباندن" بووبێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ

wohnen (G.) "له ماڵێك ژیان بردنه سەر". ده بنەڕەتدا مەبەست ئەوە بووە: بە پێخۆش بوونەوە نیشتەجێ بوون، خۆ بە شوێنێك بەستنەوە، عادەت بە شوێنێك گرتن". ریشەی وشەکە دە بنچینەدا مانای "خۆش لێ هاتن" دەگەیەنێ. دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا گەلێك وشە پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە، وەك una (OIs.) "قایل بوون، راحەت بوون"، unwunands (Gt.) "خەمگین، نارەحەت"، gewohnen (G.) "خوو پێگرتن" و Wonne (G.) "خۆشی، لەززەت"، -vanas (OIn.) "حەز، لەززەت"، venus (L.) "خواژنی دڵداری" و هتد. ئەم وشانە دە کوردمادیدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑ئەڤین evîn و ↑ڤیان vîyan "خۆشەویستی، دڵداری". بەم جۆرە دەردەکەوێ کە کرداری باندن bandın یان بانین banîn پێشتر دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "خۆش لێهاتن، حەز لێکردن، وەخۆ گرتن، خوو پێگرتن" بووە و "نەباندن"یش پێچەوانەی ئەم مانایانە بووە. دیارە مەبەست لە مەڕ و بزنی "نەبان" ئەوەیە کە دایکەکە بێچووەکەی خۆی خۆش ناوێ، خووی پێ ناگرێ یان وەخۆی ناگرێ.

**باو baw 1** [ *bāw* ] - "تەکان، بزاڤ، پاڵ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

-1 wave (E.) "1- شەپۆل 2- تەکان دان، شەکاندنەوە، بزاوتن بەم لا و لادا". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساغ نەکراوەتەوە.

-2 beben (G.)، bibēn (OG.)، bifian (OE.)، bīfa (OIs.) "لەرزین، تەکان خواردن"، سەر بە ریشەی < *bh(o)ī- (IE.)* "لەرزین، داچڵەکین".

**باو baw 2** [ *bāw* ] - "خول، سووڕ": هەروەها باوەخولێ bawexule هەیە بە مانای "سوڕ خواردن بە دەوری خۆدا". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑بابۆڵە babole.

**باو baw 3** [ *bāw* ] - "1- قسە وباس [بەیت وباو] 2- رەسم، مۆد، برەو": پێوەندی هەیە بە fama (L.) "قسە، بانگ، دەنگۆ، ناوبانگ". مانای دووەمی وشەکە دەزمانی کوردمادیدا لەوەڕا هاتووە کە هەرشتێك *قسە وباسی* لێ کرابێ، واتا وەك شتێکی رۆژ چاو لێ کرابێ، گوتراوە باوی هەیە و ئەگەریش شتەکە کۆن بووبێ و ئیتر لە بیر چووبێتەوە و *قسەو باسی* لێ نەکرابێ، گوتراوە باوی نەماوە یان لەباو کەوتووە. هەڵیسەنگینە دەگەڵ ↑بانگ bang.

**باو baw** [4] [ *bāw* ] - بام bam یش دەگوترێ. دە کوردمادیدا دەگەڵ رەنگەکانی رەش و سوور دێ و دەگوترێ "رەشباو" یان "سوورباو". دە فارسیدا وشەکە دەبێتە فام fam (P.) [سرخفام، نقرەفام]. دە فەرهەنگە فارسییەکاندا وشەی فام بە "رەنگ" مانا لێ دراوەتەوە کە ئاشکرایە پڕ بەپێستی خۆی نییە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بان ban [تاو و بان] و ↑بەیان beyan "سۆزی، سپیدە" کە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "درەوشانەوە". لەم تێروانینەوە سوورباو واتا وەك سوور دەدرەوشێتەوە [سووردەچێتەوە]. ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ bohnen (G.)، bōnen (MNl.)، boenen (Nl.) "ساف و لووس کردن، بریقە لێ هەستاندن"، bháti (OIn.) "دەدرەوشێتەوە"، phōs (Gr.) "تیشك، رووناکی"، سەر بە ریشەی < *bhā- (IE.)* "درەوشانەوە، بریقانەوە".

**باو baw** [4] [ *bāw* ] - دەگەڵ "خۆشتر" دێ ["باوخۆشتر" یان "باخۆشتر" بە مانای "گەورەتر، بە هەیکەلتر]. خزمە دەگەڵ Bau (G.)، bū (OE.)، bouw (Nl.)، bo (Sw.) "بینا، پێکهاتە"، سەر بە کردارێك بە مانای "دروست کردن، پێکهێنان، بینا کردن"، سەر بە ریشەی < *bheu- (IE.)* "رسکان، هەڵدان، گەشەکردن، دروست بوون، بوون". خزمە دەگەڵ کرداری ↑بوون bun. لەم گۆشە نیگایەوە مانای "با خۆشتر یان باوخۆشتر" دەبێتە وجوود یان پێکهاتەیەکی خۆشتر.

**باوك bawk** [ *bāwk* ] - "مرۆی خاوەن منداڵ": ↑باب bab.

**باول bawıl** [ *bāwıl* ] - "جانتا، چەمەدان [لەچەرم]": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Balg (G.)، bielg (E.)، balgs (Gt.) "ساکی لە چەرم"، سەر بە ریشەی < *bhel- (IE.)* "هەڵمسان". خزمە دەگەڵ ↑باڵنج balınc، ↑بۆل *bol*، ↑بلق bılq و هتد.

**باوەڕ bawer** [ bāwar ] - "ئیمان، دڵنیایی": باور bāvar ‎(P.)، wābar ‎(MP.)‎. بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 174) دە ئێرانی کۆندا ‎*vāvara-‎ ‎(OI.)‎ یان ‎*upa-ā-var-‎ ‎(OI.)‎ بووە، دەچێتەوە سەر ریشەی ‎*var-*‎ "هەڵبژاردن" و خزمە دەگەڵ ‎var-‎ ‎(Av.)‎ "هەڵبژاردن"، ‎varana-‎ ‎(Av.)‎ "باوەر"، ‎(varah)‎ "سوێند" و ‎vára-‎ ‎(OIn.)‎ "هەڵبژاردە، تایبەتی، ئاوارتە". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئاوارتە awarte و ئاوارتن awartın [هەڵاوارتن، هەڵاواردن].

**باوەش baweş** [ *bāwaš* ] - "ئامێز، باغەڵ": اغوش āġūš ‎(P.)‎. دە زمانی کوردمادیدا پرێپۆزیسێنی بە be بە وشەکەوە لکاوە و بووەتە بەشێک لە وشەکە [بە + ئاوەش ← باوەش]. "ئاوەش" [اغوش بە فارسی ā-ġūš] خۆی پێک هاتووە لە ئا + وەش a + weş بووە. بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 39) بنجی وشەکە خزمە دەگەڵ gaoz ‎(Av.)‎ "داپۆشین"، ‎gūzra-‎ ‎(Av.)‎ "شاراوە"، ‎(gūhati) guh-‎ ‎(OIn.)‎ "شاردنەوە، داپۆشین"، سەر بە ریشەی ‎gauz-‎ < ***(IE.)* *gheuĝh-*** "شاردنەوە". هەروەها gūžti ‎(Lit.)‎ "گرتنە خۆ، ئاگا لێ بوون" لەم ریشەوە هاتووە.

**باوەفس bawefıs** [ *bāwafıs* ] - "چڵەنۆک، کوتوڵە": ↑باوەقۆت baweqot یش دەگوترێ. پێکهاتووە لە باو + ە + فس baw + e + fis. کەرتی باو baw دە وشەی باوخۆشتر bawxoûtır دا دەبینین. ئەم کەرتە بە مانای "پێکهاتە، هەیکەل، سازی، بینا"یە [بڕوانە باو⁴ baw]. کەرتی فس-fıs یش خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "کەمی و گچکەیی" دەکەن، وەک ↑پز *pız*، ↑پیزە pîze، ↑پچ pıç، ↑بچووک bıçûk [پچووک pıçûk] و هتد.

**باوەڵی bawelî** [ *bāwalī* ] - "نەخۆشی ماسینی ئەژنۆی بەرخ و کاریلە": خزمە دەگەڵ Beule ‎(G.)‎ "بڵوق، هەڵتۆقاوی" [بڕوانە ↑بڵوق bıloq]، سەر بە ریشەی < ***(IE.)* *bhel-*** "ماسین، با کران، هەڵپزان".

**باویلکە bawîlke** [ *bāwīlka* ] - "پشیلەپاییزە، پەپوولەپاییزە": باوێلی bawelî و بایلە bayle ش دەگوترێن. پێک هاتووە لە بنەوشەی ↑باو² baw و پاشگرێک، خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑پاپلەکانێ paplekane "جۆلانە"،↑*بابۆلە* babole "نانی پێچراوە و لوولدراو"، ↑باو² baw "خول، سووڕ" [باوەخولێ bawexule] و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***(IE.)* *uei-b*** "چەمان، سووڕان، بەم لاو ئەولادا جوولان". باویلکە [کۆنتر: *بابیلکە* **babîlke* یان *باپیلکە* **bapîlke*] لەبەر ئەوە بەم جۆرە بەناو کراوە، چونکوو دە هەوادا بەم لا و ئەو لادا دەسووڕێتەوە [دە جووڵێتەوە]. بۆ ئەم شتە دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی دیکەش بەکار دەهێنرێن کە بریتین لە پەپوولەپاییزە pepulepayze و پشیلەپاییزە pışîlepayîze. ئەگەر لە وشەی یەکەم ورد بینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە کەرتی "پەپوولە" لەم وشەیەدا لەراستیدا پێوەندی بە "پەپوولە" [ی زیندەوەر] ەوە نییە. وێکچوونی ئەم دوو وشەیە تەنیا رواڵەتییە. کەرتەوشەی "پەپوولە" دە وشەی "پەپوولەپاییزە"دا شێوەیەکی کۆنترە لە "باویلکە" یاخود "باویلە" [کۆنتر: *پاپیلە* **papîle*].

[تێبینی: پشیلە pışîle دە وشەی پشیلەپاییزە pışîlepayîze دا لەوە دەچێ پێوەندی بە "پشیلە"ی جانەوەرەوە هەبێ. دە زمانی ئەڵمانیدا چەند ناوێک بۆ ئەم گیایە هەیە، وەک Löwenzahn "ددانی شێر"، Hundslattich "سەگەگیا". وێ دەچێ دە زمانی کوردمادیشدا لەبەر "تووکن" بوونی ئەم گوڵە ناوی "پشیلەپاییزە"ی بۆ دانرابێ].

**باهوڕ bahur** [ *bāhur* ] - "وڕەبا"ش دەگوترێ [با ba + هوڕ hur]. وەک دەبینین کەرتی "هوڕ" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑وڕ wır و دە بنەڕەتدا مانای "سووڕان، خولانەوە" دەبەخشێ. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ملهوڕ mılhur "لاسار".

**باهوو bahu** [ *bāhū* ] - "1- وارش یان خەندەکی *دەوری* باخچە 2- ئاسۆک، کەناری ئاسمان": بە هەر دوو ماناوە خزمە دەگەڵ ↑باهۆ baho "باسک، بازوو"، سەر بە ریشەی < ***(IE.)* *bheug-***"چەمانەوە،

خوار بوون(ەوە)". باهوو بە مانای وارشی دەوری باخچە ئەو شتەیە کە بە دەوری باخچەدا چەماوەتەوە. هەروەها ئاسۆگەش لە دوورەوە وەك هێلێکی چەماو خۆ دەنوێنێ.

**باهۆ baho** [ *bāho* ] - "باسك": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑باسك basık.

**باهێر baher** [ *bāher* ] - "زەمینی نەکێلدراو": ↑بەیار beyar و ↑بوور *bur* یش دەگوترێن.

**بایەخ bayex** [ *bāyax* ] - "نرخ، وەرج": ↑بایی bayî.

**بایەقووش bayeqûş** [ *bāyaqūš* ] - "کوندەبوو، کوندە بەبوو": پێك هاتووە لە با (یە) + قووشqûş + ba(ye). کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە بوو bu [دە ئەسڵدا: بووبوو bubu]. "بووبوو" ئەو دەنگ و هاوارەیە کە پەڵەوەرەکە لە خۆی دەردێنێ، واتا ناوی پەڵەوەرەکە لە رووی لاسا کردنەوەی دەنگ و هاواری ئەو دروست کراوە. بووبوو bubu پاشان گۆڕاوە و بووەتە ↑بەبوو bebu یان کورت کراوەتەوە و بووەتە بوو bu. کەرتی قووش qûş شێوەیەکی دیکەیە لە قیژە qîje و مەبەست "بەبووی قیژەکەر"ە.

**بایی bayî** [ *bāyī* ] - "نرخ، قیمەت": بها bahā (P.)، wahāg (MP.).

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Gewicht (G.) و (Nl.)، wicht (MG.)، weight (E.)، vaett (OIs.) بەمانای "وەزن، قورسایی"، سەر بە کردارێك کە لەو زمانانەدا مانای "وەزن کردن" دەبەخشێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Waage (G.) " تەرازوو" و هەروەها دەبنە خزمیش دەگەڵ ↑بێشکە bêşke "لانکە"، سەر بە ریشەی < ***uegh-*** **(IE.)** "(را) وەشان، لەرینەوە، جووڵان". لەم تێڕوانینەوە سەرەتا مەبەست لە پرسیاری "بایی چەندە؟" دەبێ پرسین سەبارەت بە وەزنی شتەکە بووبێ و دواتر ماناکە گۆڕدراوە بۆ گرینگی ونرخ. [وشەی "گرینگ"یش خۆی پێوەندی بە قورساییەوە هەیە و خزمە دەگەڵ "گران"].

2- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 221) پاش هەڵسەنگاندنی وشەکە دەگەڵ چەندین وشە و لەوانە -vasná (OIn.) "بەها، نرخ"، وشەکە بردراوەتەوە سەر ریشەی -vah و ئەمەش دەچێتەوە سەر ریشەی < ***ues-*** **(IE.)** " کڕین".

**ببرای bıbray** [ *bıbrāy* ] - ببڕای ببڕای واتا "هەرگیز". وشەکە دووبارە دەبێتەوە و دۆخی جەخت کردن دروست دەکا، وەك قەت قەت، هەرگیزاوهەرگیز. دە بنچینەدا بێ بڕا(نەوە) bê bıra(newe) بووە و سواوەتەوە، واتا بێ کۆتایی، تا هەتایە. بەم جۆرە دەچێتەوە سەر کرداری ↑بڕین bırîn.

**بچووك bıçûk** [ *bıčūk* ] - "وردیلە، گچکە، چکۆڵە": بچ + ئووك bıç + uk، پچووك pıčūk یش دەگوترێ [pıç + uk]. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑بێچوو beçu و ↑پز pız "مندالی ناوزك"، سەر بە ریشەی < ***pau-*** **(IE.)** "کەم، بچووك، وردیلە". وشەی few (E.) "کەم" و paucus (L.) "کەم ، بچووك" و paupos (Gr.) "بچووك" سەر بەو ریشەیەن.

[تێبینی: دوو چەمکی "بچووك" و "کەم" پێوەندی نیزیکیان بەیەکەوە هەیە، بۆ وێنە وشەی little دە .E دا بۆ هەر دوو مانا بەکار دەهێندرێ و دە وشە لاتینییەکەی سەرەوەشدا هەردوو مانا دەبیندرێ].

**بخوور bıxûr** [ *bıxūr* ] - "سووتەمەنی بۆنخۆش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بووغ buġ "هەڵم".

**بخووز bıxûz** [ *bıxūz* ] - "گای خەڤۆك، گایەك کە لە کاتی جووت کردندا دەخەڤێ": ئەسڵی وشەکە "بخفز bıxefız" بووە، پێك هاتووە لە پێشگری ب + خەف [خەو] + پاشگری بە ئاوڵناو کردنی ز ız + xef + bı. بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم پاشگرە بڕوانە ↑-ئۆز -oz.

[تێبینی: ئاڵوگۆری فۆنۆلۆژیکی لەم جۆرە لە زۆر وشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، وەك "خافتن" [ئاخافتن] کە بەشێوەیەکی دیکە بووەتە گوتن، "شفتی" [شەفتی] و شووتی، "زافەر" و زۆر، "گابار" و کوور [قووڵ]، "زافار" و زار و هتد].

**بدوو bıdu** [ *bıdū* ] - "قسەزان، دەم پاراو": ب + دوو bı + du.

1- کەرتی du یان شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑دەم dem، واتا دە بنەڕەتدا وشەکە دەتوانێ "بەدەم" بووبێ، وەک چۆن ئێستا دەڵێن فلانی "بەسەر و زمانە" یان "بەدەم و پەلە" [پەل لێرەدا خزمە دەگەڵ "فلّچ"، دەم و فلّچ]

2- یان کەرتی du پێوەندی هەیە بە کرداری ↑دوان duwan [دواندن duwandn] "قسە کردن".

بر **bır** [ *bır* ] - "لەبری" [لە بری le bırî] واتا "لە جێگەی، لەباتی". وشەکە خۆی سێ کەرتە، کەرتی "لە"، کەرتی ئەسڵی "بر" و نیشانەی "ی". چەنکوو ئەسڵی وشەکە هەمیشە لەم پێکهاتەیەدا بەکار دێ، لە ژێر ↑لەبری lebırî دا شی کراوەتەوە.

بڕ **bır** [ *bır* ] - "تەڕ و بڕ": پێوەندی هەیە بە وشەی ↑بڵ bıl.

برا **bıra** [ *bırā* ] - " کوڕ لە دایک و باوکی هاوبەشەوە": بڕوانە ↑برادەر brader.

برادەر **bırader** [ *bırādar* ] - "هاوڕێ": ئەسڵی وشەکە بە مانای "برا"یە. برادر barādar ‹P.›، Bruder ‹G.›، brother ‹E.›، bro(de)r ‹Sw.›، frater ‹L.›، phrētēr ‹Gr.›، brat ‹Rus.› "برا"، سەر بە ریشەی < ***bhrator-*** ‹***IE.***› "برا". بە پێی بۆچوونێک ئەم ریشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی < ***bher-*** ‹***IE.***› "بردن، هەڵگرتن، راگرتن" و مەبەست لە "برادەر" دە بنەڕەتدا راگر و پشتیوانی خوشکەکان بووە لە دوای مردنی باوک.

برازە **bıraze** [ *bırāza* ] - "باری، مەلغە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑باری barî.

2- ↑بیرازتن bîraztın.

برانە **bırane** [ *bırāna* ] - "مووچەی دیاریکراو، باج وپیتاک": ↑بڕین bırîn، واتا ئەو پووڵ یان شتەکە بۆ یەکێک براوەتەوە [دیاری کراوە] بیدا، یان پێی بدرێ.

برد **bırd** [ *bırd* ] - دەگەڵ "دەست" دێ [دەست و برد destûbırd واتا چالاکی و زرینگی]. وشەکە دەبێ پێوەندی هەبێ بە fortis ‹L.› "بەهێز، زرینگ" [لاتینی کۆن: forctis ‹OL.›]. ئەم وشە لاتینییە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەرز، بڵێند" و خزمە دەگەڵ ↑بەرز berız و دواتر ↑بەرد berd ی کوردمادی.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ "بەدەستوبرد"، واتا پێشگری be خراوەتە سەر دەست dest. دە زمانی ئەڵمانیشدا behände ‹G.› "زرینگ، بەدەستوبرد" پێک هاتووە لە پێشگری bei - bi ‹OG.› - و Hand "دەست"].

بردن **bırdın** [ *bırdın* ] - "هەڵگرتن، راگواستن": بردن bordan ‹P.›، ferre ‹L.›، pherein ‹Gr.›، beran ‹OG.› "بردن"، bear ‹E.›"هەڵگرتن، بردن، بەرگە گرتن"، bharati ‹OIn.› "هەڵ دەگرێ، دەبا"، سەر بە ریشەی < ***ber-*** ‹***IE.***› "بردن، هەڵگرتن". bringen ‹G.› و bring ‹E.› "هێنان"، byrđen ‹OE.› "بار کردن، هەڵگرتن"، burden ‹E.›، Bürde ‹G.› "بار"، دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. وشەکانی ↑بەر ber، ↑بەرە bere "زارۆک، وەچە"، ↑بەرگە berge "خۆ ڕاگرتن، تەحەممول" [bear ‹E.›]، ↑هاوردن hawırdn لە "بردن"ەوە هاتوون.

بڕەک **bırrek** [ *bırrak* ] - "بەرازی تیر": ئەم وشەیە پێوەندی بە کرداری "بڕین"ەوە نییە و شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بەراز beraz.

برژان **bırjan** [ *bıržān* ] - "برشتە بوون، بریان بوون": برشتن beraštan ‹P.›، خزمە دەگەڵ phrgein ‹Gr.›، bhrjati ‹OIn.›، frigere ‹L.›، گشتیان بەمانای "برژاندن". fry ‹E.› "سوور کردنەوە" لە وشە لاتینییەکە وەرگیراوە. ئەم وشانەی خوارەوەش پێوەندییان بەم خێزانەوە هەیە: braten ‹G.›، braden ‹Nl.›، bra dan ‹OE.› "سوور کردنەوە"، brühen ‹G.›، broeien ‹Nl.› "گەرم کردن"، brennen ‹G.›، burn ‹E.› "سووتان". ↑بیر2 bîr "چاڵاو" لە پلەیەکی دوورتردا خزمە لەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە. بیر واتا شوێنێک کە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ [دەکوڵێ].

برژانگ **bırjang** [ *bıržāng* ] - "مژۆڵ": ↑برژۆل bırjol.

برژۆل **bırjol** [ *bıržol* ] - "1- برژانگ 2- پرزە و ریشاڵی کووتاڵ 3- پرزەی گوڵەگەنم": خزمە دەگەڵ Borst (G.)، burst (OG.)، byrst (OE.)، borst (Sw.) "مووی زوور" [دە بنەڕەتدا: (مووی) سیخەوە بوو]. Bürste (G.)، brush (E.) "برۆس، فلچە" لەم وشانەی سەرەوە وەرگیراون. هەروەها Bart (G.) "ردێن" و barsch (G.) "زبر، زوور" و دە زمانی کوردمادیشدا ↑پۆر por "مووی سەر" خزمن دەگەڵ ئەو وشانەی سەوەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *bhar- <** "چقڵ، درک، (مووی) زبر، سیخەوە بوو". لەوانەیە ↑پرز(ە) pırz(e) "ریشاڵی بچووک" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

برست **bırıst** [ *bırıst* ] - "هێز، تابشت": هەروەها ↑پرزە pırze هەیە بە مانای "هێز، توان" [برستم نەماوە، پرزەم لێ براوە]. وشەکە بە شێوەی ↑برشت brışt یش دەگوترێ [زەوییەکی بە برشت، واتا بە پیت. جێی ئاماژەیە کە "پیت"یش مانای "هێز" دەبەخشێ. وشەکە پێوەندی هەیە بە ریشەی **> *bhreus-** **(IE.)** "ماسین، هەڵمسان". دە زمانی ئەڵمانیدا ئەم وشانە لەم ریشەوە هاتوون: Brust (G.) "سینگ"، Brausche (G.) "هەڵتۆقاوی، بلۆق"، Bries(el) (G.) "لوو، غوددە". وەک لە سەرەوە باس کرا، وشەکە دە زمانی کوردیدا بە دوو شێوەی "برست" و "برشت" دەر دەکەوێ، واتا گۆڕانی فۆتیمی s بۆ ş دەبینرێ. دە زمانی ئەڵمانیشدا وشەی Brausche (G.) هەڵگری فۆتیمی ş یە. ئەم فۆتیمە دە زمانی ئەڵمانیدا بە سێ پیتی sch دێتە نیشان دان.

[تیبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "ماسین، ئەستوور بوون" و "بەهێز بوون" پێویستە دەگەڵ وشەی "توانین" بەرهەڤی بکەین. وشەکانی توانین tuwanîn، تاو tav [هێز و گوڕ]، تابشت tabışt و چەند وشەی دیکە کە چەمکی "هێز و گوڕ" لەخۆ دەگرن، دەچنەوە سەر ریشەی *-tu /-*teu* (IE.) "ماسین، ئەستوور بوون". ئەم ریشەیە هەر لە کۆنەوە هاوکات مانای "بەهێز بوون"یشی وەرگرتووە. ژمارەیەک وشە وەک تبل tıbıl "قامک"، توو tu [تڤی tıvî]، تفقی tıvqî "قەڵەو، پڕگۆشت"، دومەڵ dumel، tumor (L.) "دومەڵ، کوان"، túmara-h (OIn.) "قەڵەو، بە هێز" و هیتر پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. وەک دەردەکەوێ لەم خێزانەوشەیەشدا وشەکان لەپاڵ مانای "ماسین، ئەستوور بوون" هەروەها مانای "بەهێز بوون" لە خۆ دەگرن].

برسی **bırsî** [ *bırsī* ] - "برچی، تێز": برچی bırçî یش دەگوترێ. گرسنە goresne (P.)، verse (OP.) [دەنگی v ی کۆن دە فارسیدا بووەتە g و لەم بارەوە نموونە زۆرە]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ brauchen (G.)، bruhhan (OG.)، bruken (MNl.)، brucan (OE.)، brukjan (Gt.) "پێداویستی هەبوون، نیاز هەبوون". دە بنەڕەتدا مانای وشە ژێرمانییەکان "نۆش کردن، سوود وەرگرتن، چێژ وەرگرتن" بووە و خزمن دەگەڵ fructus (L.) "بەروبۆ، سوود وەرگرتن، چێژ وەرگرتن". لەم تێڕوانینەوە برسی بوون دە بنەڕەتدا بەمانای "حەز و مەیل بۆ چێژ وەرگرتن یان سوود وەرگرتن" لە شتێک بووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> *bhrug- (IE.)** .

برش **bırş** [ *bırš* ] - "کەڕوو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بڵ bıl و ↑برڕ bır [تەڕ و بڕ]. پێوەندی برش هەڵێنان و تەڕ بوون بەیەکەوە ئاشکرایە.

برشت **bırışt** [ *bırišt* ] - ↑برست bırıst.

برغوو **bırġû** [ *bırġū* ] - "پێچ، مێخی پێچدار":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑بیرازتن bîraztın "ئاژن ئاژن کردن".

2: بەگوێرەی "فەرهەنگی هەرمان" (ل. 268) ئەم وشەیە لە burgu (Tur.) وەرگیراوە.

برک **bırk 1** [ *bırk* ] - "حەوز، ئەستیڵ": بەهرک behrık یش دەگوترێ. برکە berke (P.) "ئەستیڵ، گۆلاو"، خزمە دەگەڵ ↑بیر bîr "چاڵاو".

برکـ bırk 2 [ bırk ] - "هاویشتن": [برکی ده، واتا فرێی ده]، دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑فرێ fırê [فرێ دان].

2- ↑بەر 4 ber دانەوە.

برکـ bırk 3 [ bırk ] - "دەرد و ژانی کەلەکە، چکی": دە زمانی ئالمانیدا Seitenstich بە مانای "برک، چکی" بەکاردێ کە لە دوو کەرتی Seite (G.) "تەنیشت، کەلەکە" و Stich (G.) "تیراچوون" پێک هاتووە. ئەم ئیشە وەک تیراچوونی شتێکی تیژ یان وەک برانی کەلەکە بە شتێکی تیژ وایە و هەربۆیەش دە زمانی کوردمادیدا "برک" یان "چکی" ناوە نراوە ["چکی" خۆی خزمە دەگەڵ Stich ی ئەڵمانی بە مانای تیراچوون]. "برک"یش پێوەندی هەیە بە یەک لەم دوو وشانەی خوارەوە:

1- ↑بیرازتن bîraztın "تیژ کردنەوە و گرنی گرنی کردنەوەی بەرداش".

2- ↑برین bırîn.

برمە برم bırmebırm [ bırmabırm ] - "1- قسەکردنێکی وا کەس تێی نەگا 2- ناڵە و نووزەی تادار": بڵمەبڵم bılmebılm یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ brumen (G.)، breman (OG.) "وزەوز کردن، بۆڵاندن، قەڵس و ناروون و بە کزی قسە کردن". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی < *bhrem- (Gem.). ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە.

برناخ bırnax [ bırnāx ] - "کونەکەپو": دەشێ پێشتر پرناک *pırnak یان پرنەک *pırnek بووبێ و پێک هاتبێ لە پاشگرێک و بنەوشەی پرن *pırn. ئەم بنەوشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑پرمە pırme و ↑پرخە pırxe و ↑فرمە fırme کە ئاماژە دەکەن بە دەنگی دەرچوونی هەوا لە دەم و لووت.

بروسکـ bırusk 1 [ bırūsk ] - "کەموسکە، تۆزکاڵ": بر + ئوسک bır + usk ، هەر وەک وشەی برێک bırek "کەمێک" لە بنەوشەی بر bır پێک هاتووە و دەچێتەوە سەر کرداری ↑برین bırîn. کەرتی دووەمی وشەکە پاشگری گچکاندنە.

بروسکـ bırusk 2 [ bırūsk ] - "بەرقی ئاسمان": شێوەیەکی دیکە لە ↑بریسک bırîsk.

برۆ bıro - "مووی بان چاو": ابرو abru (P.)، Braue (G.)، brow (E.) "برو"، bra (OG.) "برۆ، مژۆڵ"، bra (OIs.) "مژۆڵ"، سەر بە ریشەی < *bherek- (IE.) "درەوشانەوە، *بریقانەوە*".

برۆ bıro - دەگەڵ "تاڵان" دێ [تاڵان و برۆ talan û bıro]. هەروەها پوێر puwer یان ↑پۆڕ 3 por هەیە بە مانای "تاڵان". خزمە دەگەڵ fāra (OG.) "کەمین، بۆسە"، fārēn (OG.) "دوژمنانە شتێک خستنە بەرچاو و تێکۆشان بۆی"، fear (E.) "ترس". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ pirata (L.)، peirátēs (Gr.) "چەتەی دەریا"، سەر بە ریشەی < *per- (IE.) "حەول دان، زات کردن، تاقی کردنەوە". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وێران weran، ↑پەروا perwa و ↑پەرموون permun.

برۆش bıroş [ bıroš ] - "دانەوێڵەیەکی ئاماڵ سوورە لە برنیج دەچێ": بروێش bırwêş و ↑پەرش perş یش دەگوترێ. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑برینج bırînc.

برەو bırew [ bıraw ] - "رمێن، رەواج": لە کرداری ↑رویشتن royştın وەرگیراوە. مەبەست دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە شتێک یان قسەیەک [چاک] دەڕوا. [دوور نییە وشەی رواج rawāj (Arb.) سەر بە کرداری "رۆیشتن" بێ و زمانی عەرەبی وەری گرتبێ].

بریا bırya [ bıryā ] - "خۆزگە": خزمە دەگەڵ ↑بەڵێ bele و ↑ئاوارتن awartın "هەڵاواردن" [هەڵ+ ئا + وارتن]، گشتیان سەر بەریشەی < *wel- (IE.) "خواستن، هەڵبژاردن". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑باوەڕ bawer.

بریان bıryanî [ bıryānī ] - "گۆشتی لە تەنووردا پیشێنراو": بریان beryān (P.) "گۆشتی برژاو"، خزمە دەگەڵ ↑برژان bırjan.

**بریسک1 bırîsk** [ *bırīsk* ] - "بریقه، ئاورینگ":

1- له لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Blitz "بریسک" و blitzen (G.) "بریسکانەوە"، blaze (E.)، fulgur (L.) "بریسک"، سەر بە ریشەی **(IE.) *bhel- >** "درەوشانەوە، بریسکانەوە". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑بەڵەک belek، ↑بڵێسە bılese.

2- له لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بریقە bırîqe، سەر بە ریشەی **(IE.) *bherek- >** "درەوشانەوە، بریقانەوە".

**بریسک2 bırîsk** [ *bırīsk* ] - "تەزووی بە ژان": ئەم وشەیە جیایە لە "بریسک"ی سەرەوە بە مانای "بریقە و ئاورینگ". دە زمانی فارسیدا بۆ ئەم دۆخە دەگوترێ "تیر کشیدن" واتا ئێشەکە بە "تیر" دەچوێندرێ، وەک ئەوە وایە تیرێک بە لەشدا تێپەر بێ. دە زمانی ئەڵمانیدا دەگوترێ stechender Schmerz واتا "ئێشی تیژ، ئێشێک کە تیرا دەچێ". [Stich و stechen (G.) "تیراچوون، تیراکردن" خزمە دەگەڵ وشەکانی "تیر" و "تیژ"]. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە وشەی *بریسک* "تەزووی بەژان" دەبێ پێوەندی هەبێ بە کرداری ↑برین bırîn. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑برک bırık [ژان و برک].

**بریقە bırîqe** [ *bırīqa* ] - "بریسکە، درەوشانەوە": لەوە ناچێ ئەم وشەیە لە برق barq (Arb.) وەرگیرابێ، چونکوو ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەکی هیندوئەورووپی و گەلێک لک و پۆی لەو زمانانەدا لێ دەبێتەوە، وەک brehen (MG.)، braga (OIs.) "درەوشان، بریسکان"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *bherek-** "درەوشانەوە، بریقانەوە". وێ دەچێ وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ یان لەوانەیە هەردووک وشە لە ریشەیەکی هاوبەشی پێش هیندوئەورووپییەوە پەیدا بووبن. دیارە فۆتیمی ق q پێشتر دە زمانی کوردیدا نەبووە و فۆتیمە کۆنەکە گۆڕاوە بۆ q.

**برین[1] bırîn** [ *bırīn* ] - "لەت کردن، لێک جودا کردنەوە بە شتی تیژ": بریدن borīdan (P.). خزمە دەگەڵ bohren (G.)، boren (Nl.)، bore (E.)، borra (Sw.) "کون کردن"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *bher-** "بەشتی تیژ کار کردن". priein (Gr.) "برین" و pharoein (Gr.) "کێڵان"، breja (OIs.) "لێدان، کوتان"، friare (L.) "کوتان، ورد کرن" دەچنەوە سەر هەمان ریشە.

**برین[2] bırîn** [ *bırīn* ] - دەگەڵ "رێگە" دێ [رێگە برین واتا تێپەربوون بە رێگەدا]. ئەم وشەیە چ پێوەندی بە برین bırîn[1] "لەت کردن"ەوە نییە و شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑بووڕین

burîn "تێپەڕ بوون". کەوابوو رێگا برین تێپەڕ کردنی رێگایە نەک "برین" و لەت کردنی رێگا!

**برین[3] bırîn** [ *bırīn* ] - لەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ: ↑هەڵبرین helbırîn "بەرز کردنەوە، بلیند کردن".

**برین bırîn** [ *bırīn* ] - "زام، ناسۆر": خزمە دەگەڵ↑ برین[1] bırîn، دە بنەڕەتدا واتا "شوێنی بڕدراوی لەش".

**برینج bırînc** [ *bırīnj* ] - "دانەوێڵەیەکی سپییە": برنج berenj (P.)، شێوەی کۆنتری وشەکە wîrînc بووە، virih (OIn.)، vriže (Afg.)، oriza (L.)، Reis (G.)، rice (E.) گشتیان "برینج". گومان دەکرێ وشەکە لە زمانێکی ئاسیای باشوورییەوە و لە رێگای زمانی یۆنانییەوە کەوتبێتە ناو زمانە ئەورووپییەکانەوە.

[تێبینی: شێوەی هیندی کۆن و ئەفغانی وشەکە ئەم بیرە دەخاتە مێشکەوە کە وشەی بڕوش bıroş (بڕوێش) دەکوردمادیدا دە ئەسڵدا *وریش vırîş** بووبێ و شێوەیەکی کۆنتری وشەی برینج بێ].

**برینگ1 bırîng** [ *bırīng* ] - "مقەست": خزمە دەگەڵ↑ برین[1] bırîn.

**برینگ2 bırîng** [ *bırīng* ] - دەگەڵ "هیشک" دێ [هیشک و برینگ hîşk û bırîng یان وشک و برینگ]. وەک لەژێر وشەی "هیشک"دا شی کراوەتەوە، ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووتان". بەم پێیە دەشێ وشەی "برینگ"یش پێوەندی بە چەمکی سووتانەوە هەبێ و بچێتەوە سەر ریشەی **> (IE.) *bhrē-** "سووتان، هایسان"، یان ریشەی **> (IE.) *bher-** "سووتان، کوڵین". وشەکانی ↑برژان bırjan

و ↑بیر 2 bîr "چاڵاو" پێوەندییان بە ڕیشەی دووەمەوە هەیە. لەوانەیە ئەم دوو ڕیشەی سەرەوە دواجار لە یەک بنەڕەتەوە پەیدا بووبن.

بڕێشکە **bırêşke** [ *bıreška* ] - "دەغڵ و دانی برژاو": خزمە دەگەڵ ↑برژان bırjan.

بز **bız 1** [ *bız* ] - "جەغز، دایرە": خزمە دەگەڵ ↑بازنە bazne.

بز **bız 2** [ *bız* ] - "منداڵدان": شێوەیەکی دیکە لە ↑پز pız.

بز **bız 3** [ *bız* ] - "کراوە، ئاوەڵا": [چاوبز دان، چاو بز کردنەوە]: خزمە دەگەڵ ↑باز bāz (P.) "کراوە، ئاوەڵە". هەروەها ↑بزە bıze "زەردەخەنە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست "کرانەوە"ی دەموچاوە. دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا بە جێگەی "باز" هەروەها واز waz (P.) دەگوترێ.

بزداندن **bızdandın** [ *bızdāndın* ] - "ترساندن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بزووتن bızutın

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک جار ئەو وشانەی مانای "ترساندن" دەبەخشن، دە بنەڕەتدا بە مانای "بزووتن، جم وجۆڵ" بوون، بۆ وێنە وشەی erschrecken (G.) "ترساندن" دەگەڵ "داچڵەکین"ی کوردمادی لە یەک ڕیشەوە هاتوون و ڕیشەکەش بە مانای "بزووتن، تەکان خواردن، هەڵبەزینەوە" بووە. مەبەست لەم وشانە سەرەتا هەڵبەزینەوە لە ترسان بووە و دواتر ماناکە گۆڕدراوە بۆ "ترسان"]. دە زمانی فارسیدا بزدل bozdel (P.) "ترسەنۆک" هەیە کە وێ دەچێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

بزر **bızır** [ *bızır* ] - "ون": خزمە دەگەڵ ↑باز baz "ڕێگا"، دە زمانی ئەڵمانیدا weg (G.) هەم بە مانای "ڕێگا، باز" بەکار دەهێندرێ و هەم بەمانای "دوور، بزر، ون"، دە ئینگلیزییشدا way (E.) هەر بەم جۆرە مانای "ڕێگا" دەبەخشێ و away دەبێتە "دوور، بزر". ئەم پێوەندییە لە تیوان دووچەمکی ڕێگا و بزردا لێرەوە پەیدا بووە کە دوور بوونەوە و بزر بوون دەبێتە ئەنجامی بەرێ کەوتن [ڕۆیشتن بە ڕێگادا]. وشەیەکی زۆر نیزیک بە "بزر" دە زمانی کوردمادیدا ↑بازرە bazre یە، بە مانای "دەرپەڕین و دوور بوونەوە"ی ئاژەڵ.

بزرکان **bızırkan** [ bızırkān ] - "1- ڕەنگ پەڕین 2- هەڵگەڕانی شیر": دەچێتەوە سەر ↑بزر bızır "ون" [دەبنەڕەتدا دەرپەڕیو، ڕۆیشتوو].

بزگوڕ **bızgur** - "کوتەپەڕۆ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بازە baze "جۆرە کووتاڵێکی ئەستوور".

بزمک **bızmık** - "دەمبێن، پۆزەبەند": بز- bız- دەچێتەوە سەر ↑پۆز poz [قەمپۆز، لمبۆز] و مک -mık [دەبنەڕەتدا: amek] خزمە دەگەڵ ↑جامە came، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "داپۆشین". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑دەمامک demamk و ↑بڵامک bılamık.

بزە **bıze** [ *bıza* ] - "زەردەخەنە": خزمە دەگەڵ ↑بز 3 bız "کراوە، ئاوەڵا".

بزەڵە **bızele** [ *bızala* ] - "بەچکەبەراز": بز+ ە + لە bız + e + le. بز bız خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە مانای "کەمی و گچکەیی" دەدەن، وەک ↑پچ pıç، ↑بچووک bıçûk [پچووک pıçûk]، ↑بەچکە beçke، ↑بێچووbeçu، ↑پز pız، ↑پس pıs، فس fis [باوەفس واتا کوتوڵە، بستەباڵا] و هتد.

[تێبینی: ناوی زۆرێک لە بێچووی ئاژەڵەکان دە زمانی کوردمادیدا بۆ ئەو ڕیشانە دەگەڕێنەوە کە پێوەندییان بە چەمکی "گچکەیی، منداڵی"ییەوە هەیە، وەک کوودەڵە، تووتک، جوانوو و هتد].

بزن **bızın** [ *bızın* ] - "ئاژەڵێکی ماڵی": بز boz (P.)، Bock (G.)، buck (E.)، bucca (OE.)، buza (Av.)، سەر بە ڕیشەی < ***bhugno-** (**IE.**) "بزن". فۆنێمی n کە دە ڕیشە هیندوئەورووپییەکەدا دەبیندرێ، دە "بزن"ی کوردمادیشدا ماوەتەوە.

بزووت **bızût** [ *bızūt* ] - "داری سووتەمەنی": دە ئەسڵدا بسووت bısût [↑سووتان sutan].

بزووتن **bızûtın** [ *bızūtın* ] - "جووڵان": بزوان bızwan یش دەگوترێ. bewegen (G.)، wegan (OG.)، wigan (Gt.)، wegan (OE.)، vega (OIs.)، گشتیان بە مانای "بزووتن"، سەر بە ڕیشەی < ***wegh-**,

بازره↑ *uegh- (IE.) "بزووتن". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ گەلێک وشەی وەک ↑باز baz "رێگا"، ↑بازرە bazre، ↑بزرbızır، ↑بازار bazar، بازی bazî "کایە"، ↑بەزین bezîn، ↑بازد bazd ، ↑بێشکە bêşke و هتد. تەواوی ئەم وشانە پێوەندییان بە چەمکی "جم و جۆڵ"وە هەیە. شیاوی باسە فۆتیمی w کە دە ریشە هیندوئەورووپییەکەدا بەدی دەکرێ، دە زمانی کوردمادیدا بووەتە b. گۆڕاتیکی لەم جۆرە دە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینین. دە هێندێک وشەدا فۆتیمە ئەسڵەکە وەک خۆی ماوەتەوە، بۆ وێنە ↑راوەشاندن raweşandın [ra-weşandın] "جووڵاندن، تەکان دان".

بزە **bıze** [ *bıza* ] - "زردەخەنە": دەشێ پێوەندی هەبێ دەگەڵ ↑بز bız [باز baz] بەواتای "کراوە، ئاوەڵا". لەم تێڕوانینەو "بزە" دە بێتە کرانەوەی لێو یان بەگشتی دەموچاو کرانەوە، بە پێچەوانەی تیکەوەچوون و توند بوونی کە مۆنی دروست دەکا.

بزیسک **bızîsk** [ *bızîsk* ] - "پریشکی ئاگر، ئاورینگ": بژنگ bıjıng یش دەگوترێ. پشنگ pašang (P.). خزمە دەگەڵ ↑پژان pıjan. بزیسک ئەو تیکە وردیلانەیە کە لە ئەنجامی "پژان"دا دروست دەبێ، هەروەک چۆن "پریشک"یش دەگەڕێتەوە سەر کرداری "پرژان".

بزین **bızên** [ *bızen* ] - "گەمەی جەغزێن": ↑بز[1] biz "جەغز".

بژ **bıj** [ *bıž* ] - دەگەڵ "یاڵ" دێ [یاڵ و بژ yal û bıj]: بش boš (P.)، buš (MP.). خزمە دەگەڵ puccha (OIn.) "کلک"، fox (OE.)، Fuchs (G.) "رێوی" [دەبنەڕەتدا بەمانای "ئاژەڵی کلکدار، تووکدار- سەبارەت بە تووکن بوونی کلکی ئاژەڵەکە]. هەروەها خزمە دەگەڵ puchu (ORus.) و paustis (L.) "تووکی ئاژەڵ". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑بسک bısık، ↑بووزوو buzu و ↑پەشم peşım. مانای بنەڕەتی وشەکە "تووک" بووە.

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 203) دوو ریشە بۆ ئەم وشەیە پێشنیار کراوە: 1- پێوەندی بە ریشەی *bhrso- (IE.) و چەند وشەیەکی وەک barr (OIr.) "نووک، دوند، لک و پۆپی هیشک" و barəša- (Av.) "مل، پشت (ی ئەسپ) 2- پێوەندی بە ریشەی *bhelg- , barg- و چەند وشەیەیەکی وەک wraž (Pash.) "یاڵ و بژ"].

بژاردن **bıjardın** [ *bıžārdın* ] - "1- پاک کردنی دانەوێڵە، چاک لە خراب جیا کردنەوە 2- ژماردن": گزیدن gozīdan (P.) "هەڵبژاردن"، voz- (Pl.) [دواتر دەنگی v دە فارسیدا بووەتە g و نموونەی لەم چەشنەش زۆرە]. هەروەها وجین vejīn (P.) "بژار کردن" و ویژە vīže (P.) "تایبەتی" [دەبنەڕەتدا جیاکراوە، هەڵبژاردە] هەیە کە تێیاندا فۆتیمی v پارێزراوە. دە زمانی کوردمادیشدا ئەم فۆتیمە لە وشەی ↑وەژارتن vejartın [هەڵوەژارتن] دا ماوەتەوە، کە ئەمیش "جیا کردنەوە و پاک کردنەوە" مانا دەدا. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها چەند وشەیەکی دیکە هەن کە سەر بەو خێزانەن، وەک ↑بێژان bejan [دابێژتن، جۆرێک لە جیا کردنەوە]، ↑بژار bıjar "هەڵکەندنی هەرزەگیا"، ↑بژ bıj "جگە، جیا لە"، ↑بیژوو bîju "زۆل" [دە بنەڕەتدا واتا زارۆکی جیا لەوانی دیکە، ئاوارتە، نائاسایی]، ↑بیژۆک bîjok "دەغڵ و دانی نەکوڵ" [بە وتەیەکی دیکە بەرهەمی نائاسایی] وهتد. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش کە دەبێ مانایەکی وەک "جیا کردنەوە"ی گەیاندبێ. لە ناو وشە ژێرمەنییەکاندا رەنگە بتوانین دەگەڵ وشەی Besen (G.) "گەسک" هەڵی سەنگێنین. ئەم وشە ژێرمەنییە بە گوێرەی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی > *bhes- (IE.) "خاوێن کردنەوە". بە گوێرەی بۆچوونێکی تر دەچێتەوە سەر ریشەی > bheidh- (IE.) "بەستن، هۆندنەوە". وشەی ↑بژوون bıjûn "خاوێن" دە کوردیدا دەشێ دەگەڵ ئەو وشە ژێرمەنییە خزم بێ. لە لایەکی دیکەوە وشەکانی سەرەوە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑واز[5] waz [جیاکراوە، تاق و واز].

[تێبینی: "بژاردن" دە زمانی کوردمادیدا هاومانای "ژماردن"یش بە کاردێ، بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونێک، ئەمە بەو مانایە نییە کە "بژاردن" لە "ژماردن"ەوە هاتبێ، واتا وشەی ژماردن گۆڕدرابێ و

بوو‌بێته بژاردن. ئه‌گه‌ر ئه‌سڵی وشه‌كه ژماردن به مانای "حیساب كردن" بووبێ، چۆن ده‌كرێ له‌مه‌وه ماناكانی "بژار و بیژوو و وه‌ژارتن و دابێژتن" سه‌ریان هه‌ڵدابێ؟ كه‌واته بژاردن و ژماردن دوو وشه‌ی جیاوازن و هه‌ركامیان ریشه‌ی خۆی هه‌یه. ده هێندێك شێوه‌زاری كوردمادیدا ئه‌م دوو كرداره، ره‌نگه به هۆی لێكچوونیان تێكه‌ڵ بوون و له‌ئه‌نجامدا كرداری ژماردن له‌م شێوه‌زارانه‌دا تێداچووه و كرداری بژاردن مانای ئه‌ویشی وه‌رگرتووه. به‌ڵام له هێندێكی دیكه‌ی شێوه‌زاره‌كاندا هه‌ر دوو وشه و هه‌ر یه‌كه‌ش له جێی خۆی به‌كار دێ].

**بژاڵ1 bıjal** [ *bıžāl* ] - "بڵاوی و په‌رێشانی": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑بژكین bıjkîn "پرژان، بڵاو بوون".

**بژاڵ2 bıjal** [ *bıžāl* ] - "هه‌ڵاش، چرپی": له‌م باره‌وه چه‌ند وشه‌ی دیكه‌ش سه‌رنج راده‌كێشن كه بریتین له ↑پیزاڵ pîzal "گیایه‌كه بۆ قاقه‌ز ده‌بێ و ده‌شیچنن"، پیزه‌ڵ pîzel "جۆرێك باقه‌بێن"، پیزۆك pîzok "گیایه‌كه له قۆپی و زه‌لكاو دا ده‌ڕوێ". له‌وانه‌یه ئه‌م وشانه پێوه‌ندییان هه‌بێ به ↑بژوێن bıjwên "سه‌وزه‌ڵان".

**بژكین bıjkîn** [ *bıžkīn* ] - "بڵاو بوون، پرژان": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑وه‌شان weşan "بلاو بوون" [داوه‌شان واتا له‌به‌ر یه‌ك بلاو بوونه‌وه]. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانه ↑وه‌شاندن1 weşandın "بڵاو كردنه‌وه".

**بژ(ل) bıj(ıl)** [ *bıž(ıl)* ] - "جگه، غه‌یر، جودا له": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑بژاردن bıjardın، وه‌ك ده‌رده‌كه‌وێ "بژاردن" ده‌ئه‌سڵدا به مانای "لێك جودا كردنه‌وه"یه. هه‌روه‌ك چۆن وشه‌ی "جگه" ده‌چێته‌وه سه‌ر وشه‌ی "جیا"، هه‌ربه‌م جۆره‌ش له وشه‌ی "بژاردن"ه‌وه، وشه‌ی "بژل" به‌مانای جگه دروست بووه.

**بژنك bıjıng** [ *bıžıng* ] - "پرِیشك": ده‌شێ سه‌ر به كرداری ↑بژكین bıjkîn بێ.

**بژوێن bıjwên** [ *bıžwen* ] - "سه‌وزه‌ڵان": بژوون bıjûn یش ده‌گوترێ. جێی هه‌ڵسه‌نگاندنه ده‌گه‌ڵ Wiese (G.) "چه‌مه‌ن، سه‌وزه‌ڵان". ریشه‌ی ئه‌م وشه ئه‌ڵمانییه به‌ته‌واوی ساغ نه‌كراوه‌ته‌وه. به‌پێی بۆچوونێك پێوه‌ندی هه‌یه به wise (OE.) "لاسك، چه‌كه‌ره" و visir (OIs.) "چه‌كه‌ره، چرۆ"، سه‌ر به ریشه‌ی > *weis- (IE.) "چه‌كه‌ره كردن ، هه‌ڵدان". له‌لایه‌كی دیكه‌وه ئه‌م وشه ژێرمانییانه به‌راورد ده‌كرێن ده‌گه‌ڵ vastra (Av.) "گیا و گژ، له‌وه‌ڕ".

**بژوون bıjun** [ *bıžūn* ] - "پاك، خاوێن":

1- له لایه‌كه‌وه له‌وانه‌یه پێوه‌ندی هه‌بێ به Besen (G.) "گه‌سك"، سه‌ر به ریشه‌ی > *bhes- (IE) "خاوێن كردنه‌وه".

2- له لایه‌كی دیكه‌وه جێی هه‌ڵسه‌نگاندنه ده‌گه‌ڵ ↑بازكَ bazıg "به‌ڵه‌ك"، ↑بووز buz "مه‌یله‌و سپی" و هتد. ئه‌م وشانه ده‌گه‌ڕێنه‌وه سه‌ر ریشه‌یه‌ك به مانای "سپی".

**بژۆك bijok** [ *bıžok* ] - "ئیشتیا، ئاره‌زوو": شێوه‌یه‌كی دیكه له ↑بێز[وو] bez[u].

**بژێو bıjêw** [ *bıžew* ] - "ئازووقه، پێداویستی ژیان": سه‌ر به كرداری ↑ژین jîn.

**بست bıst** [ *bıst* ] - "ئه‌ندازه‌ی له‌پی ده‌ست به كراوه‌یی": بۆست bost و بوهست buhıst یش ده‌گوترێن. bedast (P.)، widast (MP.)، vītasti- (Av.) "بست"، پێك هاتوو له tasti- + vi (پێشگر) [tn-s-ti- < *tan- (IE.) "ته‌نین، بڵاو بوونه‌وه"، بڕوانه "فرهنگَ ریشه‌شناختی زبان فارسی"، ل. 181]. له‌م تێڕوانینه‌وه وشه‌كه ده‌بێته خزم ده‌گه‌ڵ ↑ته‌نین tenîn. هه‌روه‌ها كه‌رتی یه‌كه‌می وشه‌كه، vi- جێی هه‌ڵسه‌نگاندنه ده‌گه‌ڵ weit (G.)، wide (E.)، vid (Sw.)، wijd (Nl.) "دوور، كراوه، به‌رین" و vi- (OIn.) "له یه‌كتر جیابۆوه، له‌یه‌كتر دوور بۆوه"، سه‌ر به ریشه‌ی > *ui- (IE.) "له یه‌كتر جیا بوونه‌وه، له یه‌كتر دوور بوونه‌وه".

[تێبینی: له‌وانه‌شه كه‌رتی دووه‌می وشه‌كه پێوه‌ندی به وشه‌ی ده‌ست dest ه‌وه هه‌بێ و مه‌به‌ست "ده‌ستی كراوه" بێ].

بستوو **bıstû** *[ bıstū ]* - "ملەی کێو، باسکی کێو": خزمە دەگەڵ Bucht (G.)، bocht (Nl.)، bight (E.)، bot (OIs.) "کەنداوی بچووک" [دەبنەڕەتدا واتا چەماوەیی هەردی قەراغ دەریا]. دە زمانە ژێرمانییەکاندا وشەکە لە پێوەندی دەگەڵ دەریادا کەڵکی لێ وەرگیراوە و دە زمانی کوردمادیدا لە پێوەندی دەگەڵ کێودا. دەزمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بازن bazın، ↑باسک basık، ↑بز bız "جەغز"، سەر بە ریشەی **< *bheug- (IE.)** "چەمانەوە".

بستە **bıste** *[ bısta ]* - "1- ئاسنی تیوان گەرووی دوو بەرداش 2- ئاسنی سەر تەنوور و ئاورگ": بست bıstو بستوو bıstû و بستک bıstık یش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەستن bestın. بستە ئەو ئاسنەیە کە دوو شت یان دوو لا بەیەکەوە دەبەستیتەوە.

بستیک **bıstîk** *[ bıstīk ]* - "زەنگەتە ترێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەستن bestın. بستیک ئەو دەنکە ترێیانەن کە بەیەکەوە بەستراونەتەوە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "زەنگەتە" کە ئەویش مانای "پێکەوەنووساو" دەبەخشێ.

بسک **bısık** *[ bısık ]* - "مووی سەر لاجانک": خزمە دەگەڵ ↑بژ bıj [یاڵ و بژ].

بشافتن **bışafıtn** *[ bıšāftın ]* - شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ پشاوتن pışawtın.

بشکافتن **bışkaftın** *[ bıškaftın ]* - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑پشکووتن pışkûtın.

بشکاندن **bışkandın** *[ bıškāndın ]* - "بە نووزە گریان": خزمە دەگەڵ ↑پیش pış [پیش خواردنەوە] و ↑پشوو pışû و هتد بە مانای "هەناسە". [هەر وەک وشەی هەنیسک لە هەناسەوە هاتووە، "بشکاندن"یش دەبێ لە "پیش" بە مانای هەناسە وەرگیرابێ].

بشکووژ **bışkûj** *[ bıškūž ]* - "خونچە": خزمە دەگەڵ کرداری ↑پشکووتن pışkûtın.

بشێوی **bışêwî** *[ bıšewī ]* - "ئاژاوە":

1- لە لایەکەوە وێ دەچێ پێک هاتبێ لە ب + شێو + ی bı +şêw +î. ئەگەر ئەمە راست بێ، ئەوسا بنەوشەی شێو şêw دەچێتەوە سەر کرداری ↑شێوان şêwan و خزمیشە دەگەڵ ئاژاوە ajawe.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە "پەرت و بڵاوی" دەکەن، بۆ وێنە ↑بژاڵ bıjal "بڵاوی و پەرێشانی". لەم تیروانینەوە وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە دۆخی لەبەریەک ترازان و لەبەر یەک هەڵوەشان کردووە.

بغوور **biġur** *[ bıġūr ]* - "غللوور، قەڵەو": ↑بۆق boq "زەق، هەڵمساو".

بڤکێ **bıvkê** *[ bıvke ]* - "ژنی خۆفرۆش": لەباری ریشەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بووک buk.

بڤە **bıve** *[ bıva ]* - "وشەی ترساندنی زاڕۆک لە شتی مەترسیدار": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ بیم bīm (P.) "ترس"، -bay (Av.) "ترساندن"، -bhīmā (OIn.) "ترسناک" و bháyate (OIn.) "دەترسێ"، سەر بە ریشەی **< -*bhī-,*bhōi-, *bhəi (IE.)** "ترسان".

بگار **bıııgar** *[ bıgār ]* - "بوار": هەروەها بگردن bıgırdın هەیە بە مانای "بووردن". شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بوار buwar [فۆتیمی w گۆڕاوە بە g].

بڵ **bıl** *[ bıl ]* - "نەرمی بەرەو رزین": [بۆ میوە بەکار دەهێندرێ]. خزمە دەگەڵ faul (G.)، ful (OG.)، fuls (Gt.)، foul (E.)، ful (Sw.)، گشتیان بەمانای "بڵ، رزیو، گەنیو"، سەر بە ریشەی **< -*pu (IE.)** "رزین، بۆگەن بوون".

بڵا **bıla** *[ bılā ]* - "با، بهێڵە": [بڵا بچین واتا بهێڵە بچین]، دەشێ کورتکراوەی بهێڵە bıhêle بێ و لە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا بووبێتە ↑با ba [بهێڵە ←بێلە← بڵا ← با]، [بڕوانە ↑هێڵان].

بڵامک **bılamık** *[ bılāmık ]* - "بزمک، دەمبێن، پۆزە بەند". کەرتی بڵ -bıl دچێتەوە سەر ↑پل pıl [دەم و پل، دەم و پەل، دەم و فلچ] و کەرتی ئامک -amık [دەبنەڕەتدا: amek] خزمە دەگەڵ ↑جامە came، سەر

به ریشەیەک بە مانای "داپۆشین". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑دەمامک demamk [دەم + ئامک] و بزمک bızmık [بز + مک].

**بڵاو bılaw** [ *bılāw* ] - "پان و بەرین، فش و فۆڵ": وڵاو wılaw یش دەگوترێ. ولو welou (P.). خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ڤالا vala، ↑ئاوەڵە awele، ↑فۆڵ fol [فش و فۆڵ]، ↑پەل pel و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەی **(IE.) *ple-, *pla- >** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە".

**بڵاوە bılawe** [ *bılāwe* ] - "ئاڵقەی ژێردانە لەغاو": وێ دەچێ لە ↑لێو lewەوەهاتبێ.

**بلچ bılç** [ *bılč* ] - "گوێژ، گێوژ": بلەت bılet یش دەگوترێ. دەشێ پێک هاتبێ لە بل + چ [پاشگری گچکاندن] ç(ı) + bıl. خزمە دەگەڵ ↑بول bol "دەنکی ترێ".

**بلح bılıħ** - "1- هەرزە 2- هیچ نەزان": ابله ablah (P.) [a-blah] "گەمژە". خزمە دەگەڵ ↑فەڵیت(ە) felît(e) "بلح".

**بلخ bılıx** [ *bılıx* ] - "1- باری سەرزمان ولێو 2- تلفی ئاوی کوڵاو کە بەنێو کتری و سەماوەرەوە دەنووسێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەڵەک belek، سەر بە ریشەی **(IE.) *bhel- >** "درەوشانەوە، سپی چوونەوە". بلخ شتێکی سپی یان ئامال سپییە و دەبێ بەم هۆیەوە ناودێر کراوبێ.

**بلغەم bılġem** [ *bılġam* ] - "تفی خەست": دەشی وەرگیرابێ لە phlegma (L.) "بلغەم" *phlegma* (Gr.) "سووتانەوە، کزانەوە، چڵک کردنی برین"، سەر بە کرداری phlegein (Gr.) "سووتان، برژانەوە". ئەم کردارەی زمانی یۆنانییە دەگەڵ ↑برژان bırjan ی کوردمادی خزمە.

**بلق bılıq** [ *bılıq* ] - "پۆرگی هەوا": خزمە دەگەڵ ↑بلۆق bıloq "پۆرگی سەر پێست".

**بللوور bıllûr** [ bıllūr ] - "کریستاڵ، شووشە": بلور bolūr (P.)، beryllos (Gr.)، berillus (L.) بە جۆرە شووشەیەکی ئامال شین گوتراوە کە ناوەکەی لە ناوی شارێکی هیندی، belur، وەرگیراوە، ئەو شوێنەی شووشەکەی لێ دروست کراوە. دە سەدەی چواردەیەمدا ، ئەم شووشەیە لە ئەورووپا بۆ دروست کردنی چاویلکە کەڵکی لێ وەرگیراوە و هەر لەبەر ئەوەش دە ئەڵمانیدا بە چاویلکە دەگوترێ Brille (G.). هەروەها وشەی brillant (F.) لەو ریشەوە هاتووە.

**بلمەبلم bılmebılm** [ *bılmabılm* ] - "قسەکردنێکی وا کەس تێی نەکا": ↑برمەبرم bırmebırm.

**بلوێر1 bılwer** [ *bılwer* ] - "شمشاڵ": خزمە دەگەڵ flare (L.)، blow (E.)، blasen (G.)، گشتیان بەمانای " تێکردن، با تێکردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *bhel- >** "ماسین، با کردن، فوو کردن". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ گەلێک وشە [بڕوانە ↑بۆڵ bol].

**بلوێر2 blwer** [ *bılwer* ] - "لوولک، جێ میزی منداڵ دە لانکە دا": ئەم لوولکە چونکوو وەک بلوێر1 blwer "نای، شمشاڵ" دەچێ، هەر بەم ناوە کراوە.

**بلۆچە bıloçe** [ *bıloča* ] - "قاپی چکۆڵەی دارین": هەروەها دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بلووت bılût بەکار دی بە مانای "دەوری گەورە". دە زمانی ئینگلیزیدا plate (E.) بەمانای "دەوری" بەکاردێ کە لە زمانی فەرانسەیی وەرگیراوە و دواجار دەچێتەوە سەر plattus (L.) "پەل". ئەم وشانە گشتیان خزمن دەگەڵ ↑پەل pel و چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا کە هێندێکیان لەژێر وشەی ↑وڵات wılatدا باس کراون.

**بلۆق bıloq** [ *bıloq* ] - "پۆرگی سەر پێست": بەرانبەری هەر دوو وشەی "بلق" و "بلۆق"ی کوردمادی دە زمانی ئەڵمانیدا Blase (G.) بەکا ردێ [وەک Wasserblase "بلقی ئاو"، Seifenblase "بلقی کەفی سابوون"، Luftblase "بلقی هەوا"] سەربە کرداری blasen (G.) "با کردن، فوو کردن". ئەو شەیە خزمە دەگەڵ وشە کوردمادییەکە و دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *bhel- >** "ماسین، با کران، فوو کردن". گەلێک وشەی کوردمادی دیکە لەم ریشەوە دێن، وەک ↑بالۆکە baloke، ↑بۆڵ bol "دەنکی ترێ" و هتد.

بڵۆز **bıloz** ⌊ *bıloz* ⌋ - "دەگەڵ ئاڵۆز دێ [ئاڵۆز و بڵۆز aloz û bıloz]: ↑پلۆز pıloz یش دەگوترێ: ئاڵۆز و پلۆز.

بلەماج **bılemac** ⌊ *bılamāj* ⌋ - "پەلوولەی شل، پرپۆلە": بل+ ە + ماج bıl + e + mac. کەرتی بل -bıl دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پەلوو pelu. کەرتی ماج mac دە بنەڕەتدا بەمانای "هەویر"ە و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵشێلان، مشتومالْ دان" و خزمە دەگەڵ ↑ماشتن *maştın*، ↑ماجووم macum، مزدان mızdan "رێک گوشین"، ↑مچاندن mıçandın "رێکگوشین، گلۆفین، پێکەوەنووساندن" و هتد.

بلیند **bılînd** ⌊ *bılīnd* ⌋ - "بەرز": خزمە دەگەڵ وشەی ↑بەرز berız.

بلیمەت **bılîmet** ⌊ *bılīmat* ⌋ - "هەڵکەوتوو، کەم وێنە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑بەل bel "دەرپەڕیو، زەق".

بڵێسە **bılêse** ⌊ *bılesa* ⌋ - "گڕ، کڵپە": بلێزە bılêze ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Blitz (G.) "بریسک" و blitzen (G.) "بریسکانەوە"، blaze (E.)، fulgur (L.) "بریسک"، سەر بە ریشەی < *bhel-* (IE.) "درەوشانەوە، بریسکانەوە". لەوانەیە خزمیش بێ دەگەڵ ↑بریسک bırîsk.

بن **bın** ⌊ *bın* ⌋ - "ژێر، لای خوارەوە": بن bon (P.)، Boden (G.)، bottom (E.)، bonn (MIr.)، pythmen (Gr.)، fundus (L.)، budhna (OI.) "بن، بناخە"، سەر بە ریشەی < *bhudh-men-* (IE.) "بن".

بناخە **bınaxe** ⌊ *bınāxa* ⌋ - "ئەو بەشەی خانوو کە لەژێر خاکدایە و دیوارەکانی لە سەر هەڵدەچنرێ": ↑بن bın + ئاخە axe [↑ئاخ ax "خاک"].

بناوان **bınawan** ⌊ *bınāwān* ⌋ - "خانەدار، کابان": بن (١) + وان bın(a) + wan. کەرتی وان پاشگری "ئاگاداری کردن"ە و دە گەلێک وشەدا دەبینرێ وەک باخەوان، پاسەوان، گەمێوان و هتد. کەواتە "بناوان" ئاگاداری لە شتێک دەکا یاخود بە کارێکەوە خەریکە کە لە کەرتی یەکەمی وشەکەدا بەدیار دەکەوێ. کەرتی "بن" خزمە دەگەڵ بنە bıne [بارگە و بنە]، بنە bone (P.) "ماڵ، شتومەکی ناوماڵ"، bunag (MP.) "ماڵ"، bunag (bal.) "شتومەک و کەرەسە، شتومەکی سەفەر"، هەروەها خزمە دەگەڵ ↑بان ban [نوێن و بان، جێگا و بان]. بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 213) ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *budna-* "بن، بناخە".

لە لایەکی دیکەوە دەتوانین وشەکە بەراورد بکەین دەگەڵ bauen (G.) "بینا کردن" و ↑بوون bun کە سەر بەریشەیەکی هاوبەشن و لەم ریشەیەوە چەندین وشە سەریان هەڵداوە بە مانای "ماڵ، خانوو، شوێنی حاوانەوە"، وەک ↑بۆتکە botke، ↑بەرە bere [خانووبەرە]، ↑بێرکم berkım . هەروەها وشەی بنا binā (Arb.) کە دە زمانی عەرەبیدا بەکار دێ، دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

بنج **bınc** ⌊ *bınj* ⌋ - "رەگ و ریشە": دەگەڵ "بناوان" دێ [بنج و بناوان bınc û bınawan]. لە↑بن bın وەرگیراوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بنەچەک(ە) bıneçek(e).

بنچاخ **bınçax** ⌊ *bınčax* ⌋ "قەباڵەی خاوەنداریەتی": بن + چاخ bın + çax. کەرتی ↑بن bın ئاماژە بە لەمێژینە بوون و گەڕانەوە بۆ دەسپێک دەکا. کەرتی چاخ çax خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑شەقل şeqıl، ↑ئەسک esık [ e-sık] "عەکس"، ↑سەکوت sekut [سەر و سەکوت]، ↑سکوم sekum "سەر و سیما" و ↑سکە sıke "پارەی ئاسن" [دە بنەڕەتدا: شەقڵ یان سیمای سەر پارەکە] و هتد. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە شەقڵ و وێنە دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، بڕ لێدان". مەبەست دە بنەڕەتدا هەڵکەندنی شەقڵ و شێوە و مۆر لە سەر دار و بەرد و ئاسن و شتی دیکە بووە. لەباری ماناوە دەتوانین هەڵی سەنگێنین دەگەڵ "تاپۆ" بە مانای قەباڵە کە ئەویش خزمە بۆ وێنە دەگەڵ تیپ "حەرف" و *دیباچە* "پێشەکی نووسراو" و دەبنەڕەتدا دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان". دیارە حەرف و تیپ و نووسراوەکان دە بنەڕەتدا بە لێدان و هەڵکەندن دروست کراون. هەروەها ئەگەر وشەی "خەت" یش لەبەر چاو بگرین، ئەم وشەیەش پێوەندی هەیە بە "کەت" و "کوت"ی زمانی کوردمادی و دە

بنەڕەتدا بەمانای "بڕین، بڕ لێدان" بووە. دیسان دەتوانین دەگەڵ Stempel ی زمانی ئەڵمانی بەراوردی بکەین کە مانای "شەقڵ، مۆر" دەدا و دەچێتەوە سەر وشەیەکی کۆن بە مانی "لێدان، کوتان".

[تێبینی: کەرتی بن bın لەم وشەیەدا بەرانبەری وشەی ur (.G) زمانی ئەڵمانی دەوەستێ کە ئاماژە دەکا بە دۆخێکی دوور و سەرەتای شتێک وەک Ursache "هۆکار"، Ursprung "سەرچاوە"، Urmensch "پێشمرۆڤ، بنەچەکەی مرۆڤ"، Urgroßvater "باوکی باپیر" و هتد]. کەوابوو "بنچاخ" بریتییە لە "شەقڵ، مۆر یان نقیسی سەرەتا و هەرە پێشین".

**بنژیل bınjîl** [ *bıžīl* ] - "خشت و خاڵی دەغڵ": بنجل bonjol (.P). بن + ژیل bın + jîl. کەرتی ژیل jîl دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑زاڵ zal [زبل و زاڵ].

**بندۆک bındok** [ *bındok* ] - "دۆک، ئەو سپیاتیەی کە لە کەرەی تواوەدا سەر دەکەوێ": بن + دۆک [بڕوانە ↑دۆ do].

**بنەچەک(ە) bıneçek(e)** [ *bınačak(a)* ] - "ئەسڵ، رەچەڵەک":

[تێبینی: ئەم وشەیە وەک وشەی ئەڵمانی Ursprung (.G) "ئەسڵ، دەسپێک، سەرچاوە" دروست کراوە کە پێک هاتووە لە دوو کەرتی -Ur و Sprung سەر بە کرداری springen (.G) "پەڕین، دەرپەڕین، بازد دان". پێشگری -ur هەر وەک بن bın دە زمانی کوردمادیدا ئاماژە دەکا بە قۆناخی دەسپێک و سەرەتای شتێک. کرداری springen دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە دەرپەڕین و فیچقە کردنی ئاو کردووە. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ spring (.E) "1- پەڕین 2- کانی، سەرچاوەی ئاو". پاشان ئەم "دەرپەڕین"ە مانای گشتی "بەدی هاتن، لێ پەیدا بوون"ی وەرگرتووە. بەم جۆرە بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانی کۆندا irspringan (.OG) هەبووە بە مانای "سەرچاوەگرتن، بەدی هاتن، (لێ) پەیدا بوون، رسکان". دە زمانی ئەمرۆی ئەڵمانیدا لەجیاتی ئەم کردارەی سەرەوە entspingen (.G) دەگوترێ بە هەمان مانا. ئەم مانایە لێرەوە دروست بووە کە کاتێک شتێک پەیدا دەبی، سەرهەڵدەدا، بەدی دێ، وەک ئەوە وایە لە شتێکی بەر لەخۆی سەری هەڵدابێ یان بە وتەی دیکە "لێی دەرپەڕیبێ"، هەروەک چۆن چرۆ لە لکی دار سەروەدەردەنێ (دەردەپەڕێ) و دواتر خۆی دەبێتە لکیکی تازە. یان دە کوردمادیدا دەڵێن "ئەو منداڵە چییە لێت دەرپەڕیوە؟". هەر بۆیە دە زمانی ئەڵمانیدا Spross (.G) "چرۆ، چەکەرە" و entsprießen (.G) "چەکەرە کردن، پەیدا بوون، رسکان" بە وشەکانی سەرەوە پێوەندی پەیدا دەکەن و دەگەڕێنەوە سەر مانای بنەڕەتی "پەڕین، دەرپەڕین"].

ئێستا بگەڕێینەوە سەر وشەی بنەچەک(ە) bıneçek(e). ئەم وشەیە پێک هاتووە لە دوو بەشی ↑بن bın [ئاماژە بە دەسپێک] و چەک(ە) çek(e). کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑چەکەرە çekere، ↑زەق zeq، ↑سەکۆ seko و هتد. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەرپەڕین". لەوانەیە وشەکانی ↑پنچک pınçık "بنەگیا، دەوەن" [کۆنتر: بنچک bınçık] و ↑بنج bınc "ریشە"ش پێوەندیان بەم وشانەوە هەبێ.

**بنەڕەت bıneret** [ *bınarat* ] - "بناخە": بن(ە) + رەت bın(e) + ret. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑ریز rîz و لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "ریزی بنەوە".

2- ↑رەتەوە retewe "1-نەژاد، تۆرەمە 2- تۆرەمەنامە".

**بنەما bınema** [ *bınamā* ] - "بنچینە، ئەسڵ": پێک هاتووە لە دوو وشەی ↑بن bın(e) + ما ma. "بن" ئاماژە بە لای هەرە خوارەوە واتا سەرەتای شتێک دەکا، "ما" خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑ماکە make، ↑مەک mek [شتومەک şıtûmek]،↑مێ me، ↑مادده madde "بنەشت، شتومەک، کەرەسە" و هەروەها مادەر mādar (.P) "دایک". مانای وشەکە دەبێتە "بنەشت، بنەکەرەستە" واتا ئەو شت یان کەرەستەیەی لە پیش پێشدا هەبووە و ئەوانی دیکەی لێ بەرهەم هاتووە.

بنیاد **bınyad** [ *bınyād* ] - "بناخه": بنیات bınyat یش دەگوترێ. بنیاد bonyād (P.) "1- بناخه 2- دامەزراو، دامودەزگا": دەچێتەوە سەر ↑بن bın. لەوانەیە وشەی بنا bina (Arb.) "دروست کردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین هەڵی سەنگینین دەگەڵ gründen (G.) "بناخە دانان، رۆنان، دامەزراندن" و Gründer (G.) "بنیادنەر، دامەزرێنەر" کە دەچنەوە سەر Grund (G.) "بن، بناخە"].

بنیس **bınîs** [ *bınīs* ] - دەگەڵ "باریك" دێ [باریك و بنیس barîk û bınîs].

1- یان خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لەژێر ↑فنك fınık "جاش ئێستر"دا شی کراونەوە.

2- یان پێوەندی هەیە بە penis (L.) "کلك، ئەندامی تێرینە". ئەم وشانەی خوارەوە بۆ ئەم وشە لاتینییە دەگەڕێنەوە: peniculus (L.) "کلکۆڵە، فڵچە(ی رەنگ کردن)"، pencil (E.) "قەڵەم"، Penis (G.) "ئەندامی تێرینە". سەرنج بدە وشەی "کلك" دە زمانی فارسیدا بە مانای "قەڵەم" بەکار دێ. هەروەها دە کوردمادیدا "قەڵەمی" بە مانای باریك و بنیس بەکار دێ.

بنێشت **bınêşt** [ *bınešt* ] - "شیلەی دارەبەن":

1- لەوانەیە لە ناوی ئەو دارەوە هاتبێ کە بنێشتی لێ دەگرن، واتا داری ↑بەن² ben.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بەن¹ ben "دەزوو"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "بەستن، گرێ دان، تێکخستن". بنێشت، تا ئەو جێگەی لە بیرم مابێ، وەك چەسپ بۆ بەستن یان پێکەوە لکاندنی هێندێك شت کەڵکی لێوەردەگیرا.

بوار **bıwar** [ *bıwār* ] - "شوێنی پەڕینەوە لە چۆم و ئاوان": poro (Gr.)، peretu- (Av.)، Furt (G.)، ford (E.)، fjord (Sw.) و هتد. دە ناوی ژمارەیەکی زۆر لە شار و گوندەکانی ئەورووپادا وشە ژێرمەنییەکان دەبیندرێن وەك Frankfurt، Oxford، Herford، Steinfurt و هتد. ناوی چۆمی فورات furat [فرات fırat] لەو ریشەیە وەرگیراوە و بەومانایە بووە کە چۆمەکە بواری داوە [پەڕینەوەی لێ خۆش بووە]، بەپێچەوانەی چۆمی دیجلە dicle کە چۆمێکی توند وتیژە و ناوەکەی خزمە دەگەڵ وشەکانی "تیژ" و "تیر" و هتد. وەك دەبیندرێ ناوی ئەو دوو چۆمە گەورەی کوردستان ریشەی هیندو ئەورووپییان هەیە و ناولێنەرانیشان باوباپیرانی کورد بوون کە هەر لە کۆنەوە لەو ناوچانە ژیاون. وشەکە دەزمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑بووڕین burîn (بواردن)، ↑پەڕینەوە perînewe و ↑تێپەڕین teperîn و هتد.

بوان **buwan** [ *buwān* ] - "ئەستۆندەکی چادر": خزمە دەگەڵ ↑بۆتکە botke "دیولکەی لە دار و تەختە".

بوت **but** [ *but* ] - "خودای لە دار و بەرد": بت (P.) "بوت"، (MP.) "بوودا، بوت"، *buddhá-* *(OIn.)* "ژیر، زانا، ئاگادار"، سەر بە ریشەی **budh-* "زانین، ئاگادار بوون، بەئاگا هاتن". خزمە دەگەڵ ↑بۆن bon کردن [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 219]. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەبێتە خزم دەگەڵ Bote (G.)، boto (OG.)، bode (Nl.)، boda (OE.)، bo?i (OIs.) "راگەیەنەر، پەیك، پیامدەر [ئەو کەسەی پیامێك دەگەیەنێ، شتێك دەداتە زانین]، bieten (G.)، bēodan (OE.)، bjuda (Sw.) "پێشنیار کردن، نیشان دان، داوا کردن، راگەیاندن"، سەر بە ریشەی ****bheudh-*** ***(IE.)*** **<** "بێدار بوون، هەست کردن، هۆش پێدان، ئاگادار بوون". pynthánesthai (Gr.) "تێگەیشتن" و budinti (Lit.) "بێدار کردن" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا لەوانەیە ↑بیستن bîstın یش خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانە. دیارە بیستن [بهیستن] خۆی جۆرێکە لە هەست پێ کردن و ئاگادار بوون.

[تێبینی: وەك دەردەکەوێ، "بۆت" سەرەتا بە مانای "زانا، راگەیێنەر، پەیامدەر" بووە، پاشان دەبێ بە پەیکەر و وێنەی داتاشراوی پەیامدەرەکە گوترابێ و دواتریش پێرەوانی پەیامدەرێکی دیکە لە رقی پەیامدەرە کۆنەکە ئەو وشەیان وەك نیشانەی کفر و بێخودایی لە قەڵەم داوە].

بوتڵ **butıl** [ *butıl* ] - "شووشەی تراو تێکردن": botrī (P.)، botele (OF.)، buttis (L.)، pūtinē (Gr.) "جۆرە دەفرێکی شەراب". خزمە دەگەڵ ↑پووت put "وەزنێکە بەرانبەر بە شازدە کیلۆ". مەبەست لە

پووت دە بنەڕەتدا تەنەکەیەکە واتا چەلەنگیکی تەنەکەیە کە 16 کیلۆ شت دەبا. دە زمانی فارسیدا بە چەلەنگی تەنەکە دەگوترێ پیت pît (P.). دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑پیتکە pîtke هەیە کە بە مانای "دیزەی شورباو" بەکار دێ. هەروەها ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑بادی badî و ↑بادە bade "جامی شەراب".

بوخچە **buxçe** [ bučxa ] - "جل و بەرگی پێچراو لە پەرۆدا": بقچە boqçe (P.). بوخ + چە (پاشگری گچکاندن) bux + çe. وشەی بوخ bux دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑باقە baqe ی کوردمادی وbag (E.) "ساکی دەستی".

بورج **burc** [ burj ] - "دیواری بلیندی قەڵا، منارە": برج borc (P.)، pyrgos (Gr.) "برج"، burgus (L.)، Burg (G.)، borough (E.) "قەڵا". دە ئەڵمانی کۆندا وشەکە مانای "شار"یشی گەیاندووە، چونکوو ئەو کاتە شارەکان بە قەڵا دەور دەدران. وشەی burg دەگەڵ ناوی زۆر شاری ئەورووپی دێ وەک Petersburg، Hamburg، Strasburg، Marburg. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە کە بە دوو جۆر لێک دەدرێتەوە:

1- یان دەچێتەوە سەرریشەی **< *bhergho (IE.)** "بەرز" [بەم جۆرە دەبێتە خزم دەگەڵ وشەی ↑بەرز berız].

2- یانیش **< * bherg- (IE.)** "پاراستن" وە هاتووە [لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بەرگ berg (جل و بەرگ)].

بولبول **bulbul** [ bulbul ] - "مەلی ئاوازەخوان": بلبل bılbıl یش دەگوترێ. bolbol (P.). وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑بالەبال balebal "دەنگ و هەرای بزن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەنگ و هەرا کردن".

[بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 208) وشەکە لە بلبل bulbul (Arb.) وەرگیراوە، سەر بە ریشەی سامی -bl "قوڵتەقولت کردن، دەنگ لێ هەستان"].

بوە **buh** - بوەکوێرە buhkuwere "جۆرێک کوند"ە. هەروەها بوەتەقلە buhteqıle هەیە بە مانای "جۆرێک کوندی مەزن" [کوندی وەک قەل مەزن؟]. بوە buh، بوو bu [کوندەبوو] یان بوەتە buht دەچنەوە سەر وشەی ↑بەبوو bebu کە ناوی ئەسڵی باڵدارەکەیە. [بڕوانە ↑کوندەبەبوو].

بوهرین **buhrîn** [ buhrīn ] - "1- پیر بوون، بۆربوون 2- بزرکانی شیر": ↑بۆر bor "گەورە، پیر". مانای دووەمی وشەکە لەوانەیە دە بنەڕەتدا "هەڵچوون" بووبێ و ئەمەش نیزیکە لە هەڵدان، بەرز بوونەوە و گەورە بوون.

بوهوژین **buhujîn** [ buhūžīn ] - "تاوانەوە": [ڤەبوهوژین]. خزمە دەگەڵ ↑پێژان *pejan* و ↑پیشان pîşan. دە زمانی ئەڵمانیدا backen (G.) "پێژان"، bähen (G.) "پیشاندن" و baden (G.) "گەرماو کردن، حەمام کردن" پێوەندییان بە وشە کوردییەکانەوەو هەیە و تێکڕا دەچنەوە سەر ریشەی **< *bhē-, *bhō- (IE.)** "گەرم کردن، پیشاندن".

بوودر **bûdır** [ būdır ] - "رەهۆڵ، کەنداڵ": بوو+ در bu + dır. کەرتی بوو bu کورتکراوی↑ بووم bum "زەوەی"یە. تێکڕا واتا "زەوی هەڵدڕاو یان هەڵدڕاویی لە زەویدا".

بوودەڵە **budele** [ būdala ] - "1- بێنموود، 2- تەمبەل و بێکارە": بوود + ەڵە bud + ele.

1- لە لایەکەوە دەکرێ پێوەندی هەبێ بە ↑پووت[2] put.

2- لە لایەکی دیکەوە دەشێ کەرتی بوود bud بچێتەوە سەر کرداری ↑بوون bun. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە و تێکڕا وشەکە دەبێتە "وجوودێکی کەم و بێنرخ".

بوور **bur** [ būr ] - "زەمینی نەکێڵدراو": ↑بەیار beyar و بایر bayır و باهیر bahîr یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ bar (G.)، ba(a)r (Nl.)، bare (E.)، bar (Sw.) "دانەپۆشراو، رووت، بەدیارەوە، ئازاد لە". ئەم

وشانە دە بنەڕەتدا مانای "رووت" دەبەخشن و دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *bohos- >* "رووت". زەوی بوور یان بەیار ئاماژە بە رووت بوون و دانەپۆشرانی زەوییەکە بە گژ و گیایە.

**بوورانەوە buranewe** [*būrānawa*] - "بێهۆش بوون، لە خۆ چوون": بنەوشەی بوور -bur خزمە دەگەڵ ↑بەر ber [بەر بوونەوە].

**بووردن burdın** [*būrdın*] - شێوەیەکی دیکە لە ↑بوورین burîn.

**بوورین burîn** [*būrīn*] - "1- تێپەڕبوون، رەت بوون 2- بەخشین": ئەم وشەیە و هێندێك وشەی دیکە وەك ↑بوارbıwar، ↑پرد pırd، هەروەها بنە وشەی پەڕ-per دە وشەکانی ↑پەڕینەوە perînewe و↑تێپەڕین teperîn دا دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *per- >* "تێپەڕ بوون، پێداچوون". گەلێك وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر ئەم ڕیشەیە، وەك (Gr.) perān "پێداچوون، تێوەچوون"، (Gr.) poro "بوار، شوێنی پێدا تێپەڕبوون"، (L.) porta "دەروازە"، (G.) Furt "بوار"، (G.) Fahrt "سەفەر، گوزەر" و (G.) fahren "لێخوڕین" و (G.) Fähre "کەشتی" [بۆ پە*ڕینەوە* لە چۆم ودەریا]، گشتیان دەچنەوە سەر هەمان ڕیشە. بوورین هەروەها مانای "بەخشین، چاوپۆشین"یش دەدا و ئەمەش دە بنەڕەتدا گەیاندنی ئەو مەبەستە بووە، کە مرۆڤ بەسەر هەڵە و سووچی کەسێکی دیکە دا "تێپەڕ" دەبێ و هەڵوەستەی لەسەر ناکا.

[تێبینی: دە زمانی فارسیشدا gozašt بە هەر دوو مانای "بوورین" و "لێبووردن" بەکار دێ].

**بووز1 buz** [*būz*] - "دارێکی بێ بەرە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Buche، (Rus.) boz "ناوی دارێکە".

**بووز2 buz** [*būz*] - بووز خواردن واتا "مومکین بوون، مەقدوور بوون": خزمە دەگەڵ ↑بووژانەوە bujanewe. بنەوشەی بووژ- buj مانای "هێز، وزە، گوڕ" دەدا.

[تێبینی: هەر وەك چۆن دە عەرەبیدا وشەی "مقدور" لە وشەی *قدرە* "هێز و توانایی" وەرگیراوە، دەبێ دە زمانی کوردمادیشدا بووز (خواردن) بچێتەوە سەر بنەوشەی "بووژ" بە مانای "هێز و توانایی". دە زمانی ئەلمانیشدا وشەی möglich "مومکین، مەقدوور" دەگەڵ Macht "توانایی، هێز و دەسەڵات" دەچنەوە سەر یەك ڕیشە].

**بووز3 buz** [*būz*] - "ئاماڵ سپی": خزمە دەگەڵ ↑بەش3 beş "ئاژەڵی تیوچاوان سپی".

**بووزوو buzu** [*būzū*] - "تەنراوی لە خوری و مەرەز": پێوەندی هەیە بە وشەکانی ↑بژ bıj "یاڵ و بژ" [دەبنەڕەتدا "موو"] و↑بسك bısık "مووی سەر لاجانگ".

[دە "فەرهەنگی هەرمان"دا بە لەبەرچاو گرتنی ئەوە کە بوزوو لە مووی بزن دروست دەکرێ، ئەم وشەیە بردراوەتەوە سە وشەی بزن bızın. بڕوانە "فەرهەنگی هەرمان"، ل. 34].

**بووژانەوە bujanewe** [*būžānawa*] - "گەش بوونەوە، هێز و گوڕ هاتنەوە بەر": بنە وشەی بووژ- buj خزمە دەگەڵ (L.) vigilare "بەئاگا هاتن، بێدار بوون" و (L.) vegere "بووژاندنەوە، ژیاندنەوە"، wachen (G.) و (E.) wake "لە خەو هەستان"، (OIn.) vaja-h "هێز، گوڕ، چالاکی"، (Nl.) wakker "بەئاگا، هوشیار، چالاك، بەگوڕ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *ueg-, * weg- >* " تەڕ و تازە بوون، هێز و گوڕ تێدابوون". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑بووز2 buz [بووزخواردن واتا مومکین بوون، مەقدوور بوون]، ↑وزە wıze "هێز"، ↑هێز hez، ↑هۆش hoş. وەك دەردەکەوێ دە زمانی کوردمادیشدا وەك زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکە لەو ڕیشەی سەرەوە هەم وشە بە مانای "هێز و گوڕ و چالاکی" پەیدا بووە و هەم بە مانای "هۆش و ئاگا".

[تێبیی: پێوەندی ئەم دوو چەمکە لێرەدایە کە هۆش و ئاگا لە لایەك و هێز و گوڕ هاتنە ناو لەش لە لایەکی دیکەوە بە یەکەوە بەستراونەوە، واتا کاتێك مرۆڤ خەوتووە یان بێهۆشە، هێز و جم و جۆڵ و

چالاکی بە خۆیەوە نابینێ، بەڵام کاتێک لە خەو هەڵدەستێ (هۆشی دێتەوە بەر)، ئەوجار هێز و گوڕ پەیدا دەکا].

**بووغ buġ** [ *būġ* ] - "هەڵم": بخار boxar (.P) "هەڵم". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ fog (.E) "مژ". ڕیشەی وشە ئینگلیزییەکە ساغ نەکراوەتەوە. [تێبینی: لە بەرئەوەی پاشگری ئار ar - یەکێک لە پاشگرە گرینکەکانی زمانە ئێرانییەکانە، لەوانەیە وشەی بخار buxar (.Arb) بە ئەسل وشەیەکی عەرەبی نەبێ].

**بووغە buġe** [ *būġa* ] - "مانگای زۆر قەڵەو": خزمە دەگەڵ ↑بۆق boq سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "هەڵمسان".

**بووک buk 1** [ *būk* ] - "خۆشەویستی زاوا، وەوی": وەوی wewî و ڤەیڤە veyve شێوەکانی کۆنتری ئەم وشەیەن کە دە شێوەزارەکانی سەروو و خوارووودا ماونەوە. دە فارسی ناویندا wayog (.MP) و دە فارسی دەری دا بووەتە بیوک bîyog و دە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا بووەتە بووک buk. خزمە دەگەڵ Weib (.G)، wib (.OG)، weif (.E)، viv (.Sw)، wijf (.Nl) "ژن". بە پێی بۆچوونێک وشەکە دەچێتەوە سەر ڕیشەی > *(IE.) *ueib-, *ueip-* "سووڕاندن، لێهاڵاندن". لەم تێڕوانینەوە بووک ژنی داپۆشراو [تارا بەسەر دادراو؟] بووە و بۆیە ئەوها ناو نراوە. ئەم ڕیشە هیندو ئەورووپییە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ڕیشەی > *(IE.) *uei-* "سووڕاندن، با دان" کە هێندێک وشەی وەک ↑بابۆڵە babole ی کوردمادی دەچنەوە سەر. ئەگەر ئەم بۆچوونەی سەرەوە ڕاست بێ، واتا وشەکە پێوەندی بە داپۆشین، پەڕۆ لێهالاندن و تارا بەسەردا دانەوە هەبێ، ئەوسا دەبێ بڵێین کە دە زمانی کوردمادیدا مانای ڕەسەنی وشەکە پارێزراوە. دە زمانە ئەورووپییەکاندا ماناکەی گشتێندراوە و بووەتە "ژن، ژنی شوودار".

**بووک buk 2** [ *būk* ] - "تەتە، بووکەڵە، لەیستۆک بە وێنەی مرۆڤێکی بچووک": ڕاستە لە زمانی فارسیدا بەم شتە دەگوترێ "عروسک" و ئەمەش دەچێتەوە سەر وشەی "عروس" بە مانای "بووک، هەڤاڵی زاوا"، بەڵام زۆر وێ دەچێ وشە "بووک"ی لەیستۆک دە بنەڕەتدا پێوەندی بە "بووک"ی زاواوە نەبێ. وشەی "عروس" خۆی لە عەرەبی وەرگیراوە و بێگومان لە زمانی فارسیشدا سەردەمێک هەم بۆ وشەی "عروس" و هەمیش بۆ ئەم لەیستۆکە وشەی لەچەشنی وشە کوردمادییەکان لە ئارادا بووبن. شتێک کە ئەم بۆچوونەی سەرەوە پشتراست دەکا، وشەی Puppe (.G) دە زمانی ئەڵمانیدایە کە بە مانای "بووک"ی لەیستۆک بەکار دێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر pupa (.L) "بووکەڵە، کیژی بچکۆڵە" [دە بنەڕەتدا: کیژی بچکۆڵە]. هەروەها وشەی pupilla (.L) "بیبیلە(ی چاو)" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. مرۆڤ دە بیبیلەی چاوی لایەنی بەرانبەریدا وێنەی بچووک کراوی خۆی وەک "بووکەڵە"یەک دەبینێ و لەبەر ئەمە بەم شوێنە گوتراوە "بیبیلە". لە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی وەک ↑بەبە bebe، ↑بیبل bîbıl [تیتل و بیبل]، بیبی bîbî و ↑بیبیلە bîbîle پێوەندییان پێکەوە هەیە. بیبی bîbî هەنووکە دە زمانی کوردمادیدا بە هەر دوو مانای "بووکەڵە" و "ڕەشکێنەی چاو" بەکار دێ و ئەمەش پێوەندی ئەم وشانەی سەرەوە پشتراست دەکا. کەوابوو دە زمانی کوردمادی بەرێدا دوو وشە لە ئارادا بوون و هێشتاش لە هێندێک لە شێوەزارەکاندا بەکار دێن، وشەی یەکەم وەوی wewî یان بیبی bîbî، کە دواتر پاش کەمێک گۆڕان بووەتە ↑بووک[1] buk "هەڤاڵی زاوا" [وەوی wewî ← ویوی wîwî ← بیبی bîbî ← بیوەک bîwek ←(ئەک ek پاشگری خۆش ویستن و ڤیاندن) ← بووک buk]. سەبارەت بەم پاشگرە هەڵیسەنگینە لەگەڵ وشەی کوردمادی پیرەک "خانم"]. وشەی دووەمیش شێوەکەی بیبی bîbî بووە و ئەویش هەر بەو شێوەیە گۆڕاوە و بووەتە بووک[2] buk و بووکەڵە bukele [بیبی bîbî ← بیوەک bîwek (ئەک ek پاشگری گچکاندن) ← بووک buk]. ئەم دوو وشەیە نە لە ڕیشەدا و نە لە ماناداا پێوەندییەکیان پێکەوە نییە. وشەی یەکەم دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "لێهاڵاندن" [داپۆشین بە تارا] و وشەی دووەم لاسا کردنەوەی دەنگی زارۆکە، واتا دەچێتەوە سەر وشەی "بەبە" کە تێیدا دەنگێک دووپات دەبێتەوە و

ئەمەش لە چەندین وشەی دیکەدا بەرچاو دەکەوێ، کە ریشەکەیان بۆ لاسا کردنەوەی گڕ و گاڵی زارۆك دەگەڕێتەوە، وەك مەمە، کاکە، دادە، بابە و هتد. ئێستا پرسیار لێرەدایە کە چۆن دە زمانی فارسیدا وشە کۆنەکە کراوە بە "عروسک". دیارە سەرەتا وشەی بووك ["بیوک" لە فارسی ناویندا] وەلا نراوە و وشەی "عروس"ی لە جێگە دانراوە. پاشان وا بیر کراوەتەوە کە وشەی بووکی لەیستۆکیش هەر پێوەندی بە بووکی زاواوە هەیە و ئەمە شتێکە کە ئێمەش ئەمڕۆ وای بۆ دەچین. لەسەر ئەم بۆچوونە ئەوجار وشەی "عروسک" داندراوە و جێگەی وشە کۆنەکەی گرتۆتەوە. تێکەڵ بوونی ئەم دوو وشەیە هەم بۆ وێکچوونی زۆری شێوەی وشەکان دەگەڕێتەوە و هەمیش لەباری مانابیەوە جۆرە پێوەندییەك لەتیوان ئەم دوو چەمکەدا دروست بووە، چونکوو بووك خانمێکی جوان و رازاوە و خۆشەویستە و بووکەڵەش لای زارۆك بە هەمان شێوە.

[تێبینی: لەباری تێکەڵ بوونی دوو وشەی هاوشێوە هەڵیسەنگینە بۆ وێنە دەگەڵ ↑تۆپاندن"1- مردارکردن 2- لێدانی زۆر"].

بووك3 **buk** *[ būk ]* - "باپشکیو، چنچکەسڵاو": خزمە دەگەڵ ↑بۆقژە boqje "زیبکە (ی ناو دەمی زارۆکان)".

بوولێل **bulel** *[ būlel ]* - ↑بوومەلێل bumelel.

بووم bum *[ būm ]* - "زەوی": بوم būm (P.)، būmī (OP.)، (Av.) و (OIn.) "زەوی، جیهان":

1- بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 218) وشەکە خزمە دەگەڵ ↑بوون bun و دە بنەڕەتدا مانای "شوێنی (لێ) بوون، شوێنی ژیان" دەدا.

2- لەلایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑بن bın "ژێر، لای خوارەوە"، بن bon (P.)، Boden (G.)، bottom (E.)، bonn (MIr.)، pythmen (Gr.)، fundus (L.)، budhna (OI.) "بن، بناخە".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "بن، بناخە" و "زەوی" دە وشەکانی Grund (G.) "بناخە، بنەما" و gründen (G.) "بناخە دانان، دامەرزاندن" و ground (E.) "خاك، زەوی، زەمینە"دا دەردەکەوێ].

بوومەلێل **bumelel** *[ būmalel ]* - "تاریك و روون": بووم + لێل bum + lel، بووم واتا "هەرد"، تێکڕای وشەکە دەبێتە "هەردی لێل". مەبەست ئەو کاتەیە کە زەوی هێشتا بەتەواوی رووناك یان بە تەواوی تاریك نەبووە.

بوون **bun** *[ būn ]* - "رسکان، وجوود": بودن būdan (P.)، phyein (Gr.)، be (E.) "بوون"، bin (G.) "هەم"، phyesthai (Gr.) "بوون" [لە شتێکەوە بوونە شتێکی دیکە]، physis (Gr.) "سرووشت" [بوونایەتی]، fuisse (L.) "بوون لە رابردوودا"، futurus (L.) "لە داهاتوودا"، bhávati (OIn.) "هەیە، دەبێ"، buti (Lit.) وbyt (Rus.) "بوون"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *bheu- >*** "بوون، پەیدا بوون، رسکان، هەڵدان، گەشە کردن".

بۆ1 **bo** *[ bo ]* - پرێپوزیسیۆن [بۆ ئامێد، بۆ تۆ]. خزمە لەگەڵ ↑بە be.

بۆ2 **bo** *[ bo ]* - "لەبەرچێ": دە ئەسڵدا بۆچی boçî بووە و کورت کراوەتەوە و بووەتە ↑بۆ1 bo.

بۆ3 **bo** *[ bo ]* - دە گەڵ "بەر" دێ [بەر و بۆ ber u bo]. بۆم bom یش دەگوترێ. بوم būm (P.)، پێوەندی هەیە بە poma (L.) "بەر و بۆم".

بۆت **bot** - "1- بانیژەی ئاش 2- ئاوبارە، قەمتەرە": خزمە دەگەڵ ↑بۆتکە botke.

بۆتکە **botke** *[ botka ]* - "دیوەلکە یان دووکانی گچکەی لە دار و تەنەکە دروستکراو": بۆت + کە (پاشگری گچکاندن) bot + ke. خزمە دەگەڵ Bude (G.) "دیوەلکە، دووکانی گچکەی لە دار و تەختە"، bode (MNl.) "دیوەلکە، بۆتکە، چادر، ئەنبار"، bod (Sw.) "دووکان، ئەنبار"، butas (Lit.) "خانوو". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە کرداری bauen (G.) "دروست کردن، خانوو چێ کردن" و دە زمانی کوردمادیشدا دەگەڵ ↑بوان buwan "ئەستوندەکی چادر"، ↑بۆت bot "بانیژەی ئاش، ↑بۆت bot یان بۆتك

botık"ئاوبارە، قەمتەرە"، ↑بەرە bere [خانووبەرە] و ↑بێرکم bêrkım "قەفەس، خانووچکە". دواجار خزمن دەگەڵ کرداری ↑بوون bun "بە وجوود هاتن، بە وجوود هێنان".

**بۆتە bote** [ *bota* ] - "دەفری کیمیاگەری": بوتە (P.) būte، (G.) Bütte، (OE.) byden، butina (ML.)، (Gr.) bytine /pytine "دەفر". وشەکە لە یۆنانییەوە و لە ڕێگای زمانی لاتینییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانی دیکەوە. وشەی پیت (P.) pît "چەلەنگی ئاو و نەفت" و ↑پیتکە ptîke ی کوردمادیش هەر لەم پێوەندییە دا دەتوانین لێک بدەینەوە.

**بۆج boc** [ *boj* ] - "فیز و دەعێ": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑فیز fîz.

**بۆچوون boçun** [ *bočūn* ] - "ڕوانگە، بیروڕا": بۆ + ↑چوون bo + çûn. مەبەست ئەوەیە چۆن کەسێک لە باری هزرییەوە بۆ کێشەیەک دەچێ.

**بۆدڕ bodır** [ *bodır* ] - "1- بۆنی تەگە 2- بۆنی توندی ئاڕەقە": دەشێ *بۆتەڕ boter* بووبێ [بۆ + تەڕ bo +ter] واتا بۆنی تەڕایی لەش. ↑دڕن dırın یش دەگوترێ [بۆدڕن].

**بۆدراو bodraw** [ *bodrāw* ] - "چێشتی قاوتی گەنمی برژاو": دە زمانی فارسیدا بو دادن (P.) dādan bū [بۆن دان، بۆن پێدان] بە مانای "برژاندنی دەغڵ و دان" بەکار دێ. لەوە دەچێ پێشتر دە زمانی کوردمادیشدا شتێکی لەم چەشنە بەکارهاتبێ و وشەی "بۆدراو"ی لێ کەوتبێتەوە، بە مانای "بۆن پێدراو".

**بۆر bor 1** [ *bor* ] - "1- سپی ئامال زەرد 2- ڕەنگی خۆڵەمێشی": بور (P.) būr "کاڵ، مەیلەو زەرد"، fahl (G.)، fallow (E.) "ڕەنگێ پەڕیو، زەردهەڵگەڕاو"، polios (Gr.) "بۆر، خۆلەمێشی"، pallidus (L.) "ڕەنگێ پەڕیو"، palvas (Lit.) "زەردهەڵگەڕاو"، سەر بە ریشەی **< *pel-* (IE.)** "بۆر، سپییەکی نەک زۆر ڕوون".
[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 215) لە پاڵ چەند بۆچوونێک هەروەها ریشەی **< *bhlēuo-* (IE.)** "شین، زەرد" پێشنیار کراوە، کە بەم پێیە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ blew (ME.) "ئابی" و blāvas (Lit.) "شینی کاڵ، زەرد"].

**بۆر bor 2** [ *bor* ] - "زەممە، نیشانەیەکە لە خەتتی عەرەبیدا": دە فارسیدا پیش (P.) pîşی پێ دەگوترێ کە هەر بە مانای "پێش"ە. دە کوردمادیشدا وشەکە سەرەتا ↑بەر ber بە مانای "پێش" بووە و گۆڕدراوە بۆ "بۆر". وێ دەچێ ئەم نیشانەیە بۆیە پێش یان بەر (بۆر) ی ناو لێ نرابێ، چونکوو بزاڤێک نیشان دەدا کە بە هۆیەوە لێو بۆ پێشەوە دەچێ.

**بۆڕ bor 1** - "تیشکاو لە کێبەرکێدا": [بۆڕ دان، بۆڕ خواردن]. خزمە دەگەڵ ↑بەر ber [4] [بەربوونەوە واتا کەوتن]. مەبەست لە بۆڕ دان دەبێ دە بنەڕەتدا خستنی لایەنی بەرانبەر لە گەمە و زۆرەوانیدا بووبێ.

**بۆڕ bor 2** - "گەورە، پێگەیشتوو، پیر": ↑بوهرین buhrîn "پیر بوونی گیا، بزرکانی شیر" هەر لەم ریشەیە وەرگیراوە.

1- لەوانەیە خزمە دەگەڵ ↑باڵا bala "بەرزی، بڵیندی" و ↑بڕین[3] bırîn [سەر هەڵبڕین، دەنگ هەڵبڕین]. لەوانەیە دە بنەڕەتدا مەبەست بەرز بوونەوە و هەڵدان بووبێ و دواتر مانای گەورە بوون و پیر بوونی لێ کەوتبێتەوە.

2- یان لەوانەیە دەگەڵ ↑پیر pîr خزم بێ.

[تێبینی: پێوەندی دووچەمکی بەرزی و پیری دە وشەی alt (G.) "پیر، بەتەمەن" دە زمانە ژێرمانییەکاندا و altus (L.) "بەرز، بڵێند"دا دەبینرێ کە هەردووکیان لە یەک ریشەوە کەوتوونەوە].

**بۆڕ bor 3** [ *bor* ] - "شەپۆلی ئاو": خزمە دەگەڵ ↑بۆران boran "کڕێوە"، سەر بە ریشەیەک بەمانای "سووڕان".

**بۆڕ bor [4]** - "قوڵکەی میوە تێدا ڕاگرتن": خزمە دەگەڵ būr (MG.) "قەفەس"، būr (OG.) "ماڵ، هۆدە، دیوەلکە"، bur (Sw.) " قەفەس، قوتوو، دیوەڵکە" و bower (E.) "کەپر، شوێنی تێدا پاراستن"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "شوێنی جێگیر بوون، شوێنی حاوانەوە". خزمە دەگەڵ ↑بەرەbere [خانووبەرە].

بۆراق **boraq** *[ borāq ]* - "چاوزەق": دەشێ پێوەندی بە ↑بۆڕ borەوە هەبێ، بە مانای" گەورە".

بۆران **boran** *[ borān ]* - "کرێوە": بوران būrān (.P)، سەر بە خیزانەوشەیەکی گەورەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ریشەی **(.IE) *uer-, *wer- >** "سووڕان، لێکهاڵان". بەراوردی بکە دەگەڵ ↑وەرانین weranîn و گەلێک وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا وەک wirbeln (.G)، whirl (.E) "سووڕان، لێکهالان"، whirlwind (.E) واتا تۆفان، بۆران"، Werra (.OG) "شەر، لێکدان"، سەر بە کرداری werran (.OG) "لێکدان، شێواندن" و verwirren (.G) "شێواندن، گێژ کردن، وڕ کردن".

بۆڕاندن **borandın** *[ borāndın ]* - "دەنگ و هەرا کردنی گاو گۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑ باڵەباڵ balebal "دەنگ و هەرای مەڕ و بزن".

بۆرانی **borani** *[ borānī ]* - "چێشتی کوولەکە و ماست": لەوانەیە لە وشەی↑ بۆر1 bor وەرگیرابێ و ئاماژە کرابێ بە رەنگی چێشتەکە.

[دە"فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 324) بە پێی سەرچاوە فارسییەکان ئەم وشەیە بردراوەتەوە سەر بۆران ناوێک کە ژنێک بووە بۆ یەکەم جار ئەم چێشتەی لێناوە].

بۆردوومان **borduman** *[ bordūmān ]* - "بومباران": bombardment (.E) < *bombard (.F)* "جۆرێک تۆپی سەرەتایی" < bombus (.L) و bombos (.Gr) "دەنگی تەقینەوە، تریشقە". وشەی ↑بۆمب bomb وشەیەکی وەرگیراوە و ریشەکەی دەچێتەوە سەر ئەم وشانەی سەرەوە.

بۆرژان **borjan** *[ boržān ]* - "بیرەخەو، سووکەخەو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑بوورانەوە buran(ewe) "لە خۆ چوون، بەلادا هاتن". شیاوی باسە وشەی ↑پوورسین pursîn یش هەیە بە مانای "بوورانەوە".

بۆرگە **borge** *[ borga ]* - "بانوو، پانتاییەکی بەرزی جوگرافی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بۆڕ bor "گەورە" [دە بنەڕەتدا: بەرز، بڵیند].

بۆری **borî** *[ borī ]* - "لوولە": بوریا > boryā (.Arb) < *boryā (.Aram)* و ئەمیش لەوانەیە لە 'ber "نەی، قامیش" وەرگیرابێ دە "زمانی حەبەشی"دا. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" ل. 216].

بۆز **boz** *[ boz ]* - "1- شینی ئاماڵ سپی 2- سپی و رەشی تێکەڵ": خزمە دەگەڵ↑ بازگ bazg "بەڵەک"، ↑بەش beş "ئاژەڵی تیوچاوان سپی" و هتد.

بۆژوو **boju** *[ božū ]* - "گیای بۆن گرتوو": بۆژە boje ش دەگوترێ. پێک هاتوو لە دوو کەرتی بۆ [↑بۆن bon] + ژە je + [n] bo ، کەرتی ژوو[ژە] [je ] ju دەچێتەوە سەرکرداری ↑ژەندن jendın یان "ژەنین" بەمانای "لێدان"، تێکڕای وشەکە واتا گیای "بۆن لێدراو". کەرتی "ژۆ" وەک پاشگر دەگەڵ وشەی دیکەش دێ، وەک گەرماژۆ germajo "گەرمالێدراو" [بە فارسی: گرمازدە].

بۆسە1 **bose 1** *[ bosa ]* - "سیپە، کەمین": خزمە دەگەڵ ↑پەسیو pesîw [پەنا و پەسیو].

بۆسە2 **bose 2** *[ bosa ]* - "قایشی جووت" (کە نیر و ئاموور لێک دەبەستێ): دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑بەستن bestın و ئاماژە بە لێکبەستنی دوو پارچەکە بکا.

بۆش1 **boş 1** *[ boš ]* - "زۆر" [لەشکرێکی بۆش]. بیش bîş (.P) و بسیار besyar (.P) "زۆر"، خزمە دەگەڵ ↑بەس bes "کافی، زۆر" و هەروەها ↑فش fış [فش و فۆڵ].

بۆش2 **boş 2** *[ boš ]* - "هەڵۆڵ": هەروها بۆشایی boşayî هەیە بە مانای "ڤالایی، فەزا". خزمە دەگەڵ بۆش1 boş "زۆر". دە تیوان دوو چەمکی "زۆری" و " هەراوی و بۆشایی"دا پێوەندی نیزیک هەیە و هەر بۆیەش وشەکە هەر دوو مانای وەرگرتووە.

[تێبینی: لە باری ماناوە واتا لەباری پێوەندی تیوان دوو چەمکی "زۆری، هەراوی" و "بۆشایی، فەزا" دەتوانین هەڵی سەنگێنین دەگەڵ دوو وشەی ڤالایی valayî بە مانای "فەزا، بۆشایی" و فۆڵ fol "هەراو"

[فش و فۆڵ] یان دوو وشەی دیکەی خزم وەک زۆر zor ی کوردمادی و space (E.) "فەزا" سەر بە [spatium (L.)].

**بۆشکە boşke** [ *boška* ] - "بەرمیل": بشکە boške (P.). دەچێتەوە سەر↑ بۆش boş "زۆر، هەراو، هەڵۆڵ".

**بۆشناغ boşnaġ** [ *bošnāġ* ] - "کۆک و پۆشتە": لەوانەیە دە ئەسڵدا "پۆشناک poşnak" بووبێ سەر بە کرداری ↑پۆشین poşîn .

**بۆغمە boġme** [ *boġma* ] - "نەخۆشی دووشاخە، ملەخڕە": بوغمە buġme و بەغمە beġme ش دەگوترێن. وشەکە ئاماژە بە ماسین و ئەستوور بوون و زل بوونەوە دەکا و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑بووک buk "باپشکێو"، ↑*بۆقژە boqje* "زیپکەی ناو دەمی زارۆک"، ↑بۆز boz"نەخۆشی ماسینی چۆکی ئاژەڵ، باژەڵە bajela یان باژیلە bajîle "نەخۆشی پێستی زارۆک" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بۆق3 boq، دەچنەوە سەر ریشەیەک بەمانای "هەڵمسان، ئەستوور بوون".

**بۆق1 boq** [ *boq* ] - "ئاژەڵێکە لەناو و لە دەرەوەی ئاو دەژی و دەقرێنێ": قورواق qurwaq یش دەگوترێ [قوڕ + واق، کەرتی واق waq شێوەیەکی دیکەیە لە بۆق boq]، قورباغە qūrbaġe (P.) [qūr-baġe]، pogg (G.) "بۆق"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *bhu- >*** "ماسین، با کردن". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە هێندێکیان لەژێر ↑بۆغمە boġme دا باس کراون. هێندێکی دیکەشیان لەژێر ↑بەس bes دا شی کراونەوە. [تێبینی: دەزمانی ئەلمانی ئەمڕۆدا وشەی frosch بە مانای بۆق بەکاردێ].

**بۆق2 boq** [ *boq* ] - "پشت (مل)": بۆقەتە boqete ش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ back (E.)، ba k (OE.)، bak (ON.) و (OS.) "پشتەوە".

**بۆق3 boq** [ *boq* ] - چاوبۆق واتا چاوزەق. لێرەشدا بۆق ئاماژە بە "زلی، زەقی، هەڵماسیوی" دەکا، خزمە دەگەڵ ↑بۆق1 boq و ↑بەس bes "زۆر" [دەبنەڕەتدا: ماسیو، زل].

**بۆق4 boq** [ *boq* ] - "تیرتکی چڵەپیواز و سیر": دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا هەروەها لە شیرۆڤەی وشەی "گیرهە"دا نووسراوە "بۆقی ئاوی رەقبووگ، تمتمان، بڵغ". لێرەدا مەبەست ئەو تۆێژە رەقەیە کە لە خڵتەی نیشتووی ئاو دروست دەبێ و بە بنی دەفرەوە دەنووسێ. دیارە ئەم "بۆق"ە جیاوازە لە "بۆق"ەکانی سەرەوە. ئەم دوو مانایە، واتا "خڵتەی ئاوی رەقبوو" و "تیرتک" دەشێ پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ، چونکوو هەردووکیان چەمکی "رەق، سفت" لە خۆ دەگرن. لەم تێڕوانینەوە ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑بۆق5 boq "پاڵ" [دەبنەڕەتدا: هێز، گوڕ، سەختی، پتەوی].
[تێبینی 1: لێرەدا دەکرێ بەراوردێک بکەین لەنێوان دوو وشەی "تیرتک" و "کرۆک"دا، یەکەمیان بە مانای "لاسکی رەقی ناوەڕاستی گیا" و دووەمیان بە مانای "ناوکی رەقی میوە". وشەی "کرۆک" لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای "رەق، سەخت". وەک دەبینرێ لە هەردوو وشەدا ئاماژە بە "چەمکی "رەقایی" دەکرێ. ئەم بەراوردە نیشان دەدا کە هەر دوو مانای وشەی "بۆق"، واتا "تیرتک" و "خڵتەی رەقبووگی ئاو" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. تێبینی 2: هەروەها پێوەندی دوو چەمکی "هێز" و "سەختی" بەیەکەوە ئاشکرایە. وشەی "گوڕ" کە هاومانا دەگەڵ هێز بەکار دەهێنرێ خزمە دەگەڵ *خار* "سەخت"، یان وشەی "پتەو" بە مانای سەخت خزمە دەگەڵ "پادشاە" واتا "شای بەهێز". سەبارەت بە پێوەندی ئەم چەمکانەی سەرەوە هەروەها بڕوانە وشەی "تیرتک"].

**بۆق5 boq** [ *boq* ] - "پاڵ" [بۆق پێوەنان: بۆقێکی پێوە بنێ]. خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک کە دە ریشەدا ئاماژە بە "هێز، گوڕ" دەکەن، وەک ↑پەک pek [پەک کەوتن واتا لە هێز کەوتن"، ↑پەژ pej، ↑*بووژانەوە bujanewe*[هێز هاتنەوە بەر]، ↑پێز pez [هێز و پێز]، ↑بووز buz [بووز خواردن]، ↑وزە wıze و هتد. وەک دەبینرێ چەمکی گشتی لەم وشانەدا "هێز و گوڕ"ە و ئەمەش دەگەڵ چەمکی "پاڵ، گوشار" یەک دەگرێتەوە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی ئەم چەمکانەی سەرەوە دەتوانین سەیری وشەی "زەخت" بکەین بە مانای "گوشار". ئەم وشەیە دەگەڵ "زۆر"یش بەکار دێ (زەخت و زۆر) و "زۆر" ئاماژە بە "هێز" دەکا (زۆردار، زۆرەوانی، زۆرانبازی). هەروەها "زەخت" خۆی خزمە دەگەڵ "سەخت" کە ئەویش دە بنەڕەتدا مانای "بەهێز بوون" (پتەو بوون) دەگەیەنێ].

**بۆقژە boqje** *[ boqža ]* - "وردە زیبکە": پۆقژە poqje ش دەگوترێ. بۆق + ژە boq + je / poq. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. بنەوشەی بۆق / پۆق خزمە دەگەڵ Pocke (.G)، pok (.Nl)، pock (.E) "زیبکە، بلۆق، ئاوڵە". هەروەها وشەی Pickel (.G) و pukkel (.Nl) بەمانای "زیبکە" دێ. [کەرتی el- دە وشە ژێرمانییەکانی سەرەوەدا هەر ئەو دەورە دەبینێ کە پاشگری "ژە" je دە وشە کوردمادییەکە دا هەیەتی]. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی دیکەش هەن کە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە وەک ↑باژەڵە bajele "نەخۆشی پێستی منداڵان"، ↑بووک2 buk "باپشکێو"، ↑بۆغمە boğme "ملەخڕە"، ↑بۆز boz "نەخۆشی ماسینی چۆکی ئاژەڵ" و هتد. ئەو وشانە ئاماژە بە چەمکی ماسین، خڕ بوون و ئەستوور بوون دەکەن و خزمن دەگەڵ گەلێک وشەی دیکە، بۆ وێنە ↑بۆق1 *boq*.

**بۆقل boqıl** *[ boqıl ]* - "گۆشتی بەلەک": هەم وشەی "بەلەک" و هەم وشەی "بۆقل" دەبنەڕەتدا مانای "هەڵمساوی"یان تێدایە. [لە دوو ریشەی جیاوازەوە]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بۆق3 boq.

**بۆقەتە boqete** [ boqata ] - ↑بۆق2 boq.

**بۆل1 bol** *[ bol ]* - "دەنکەترێ، گلوو": خزمە دەگەڵ ball "تۆپ" [بە گشتی هەرشتێکی خڕ] دە زمانەکانی .E، .G، .N، .F وهتد. [ڕێنووسی وشەکە لەو زمانانەدا جیاوازە]، سەر بە ریشەی **< *bhel-** *(IE.)* "ماسین، هەڵپزان، هەلپفان". دە شێوەزاری زازاییدا وشەی "بۆل" بە مانای "ران، مێگەل" هەیە، کە ئەویش خزمە دەگەڵ بۆل بە مانای "1- دەنگە ترێ 2- گلوو". ران و مێگەل دە راستیدا خڕ بوونەوە و لێکهالان و لە دەوری یەک کۆ بوونەوەی مەڕ و ماڵاتە و هەر بۆیە پێی گوتراوە بۆل. [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "گلوو" و "گەل، مێگەل"]. ئەو وشانە دواتر دا دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی وەک ↑بلۆق bıloq، ↑بلق bılıq، ↑بالۆکە baloke، ↑باڵوو balu [دە وشەی ئاڵوو باڵوودا]، ↑بەلەک belek "نەرمایی و زەقایی قاچ"، ↑پیلەک pîlek "دوگمە، قۆپچە"، ↑پێل pel "چاوزەق" و هتد.

**بۆل2 bol** *[ bol ]* - "دۆلی تەنگ": بوهل buhl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑بۆڕ bor "قوڵکەی میوە تێدا راگرتن".

**بۆل3 bol** *[ bol ]* - "ئاوتێزاو، گەیشتوو": خزمە دەگەڵ ↑بۆڕ bor [بۆر بوون واتا گەورە بوون، پیر بوون] و دەگەڵ ↑بوهرین buhrîn "پیربوونی گیا".

**بۆل⁴ bol** *[ bol ]* - "زەنگی ملی پێشەنگ": خزمە لەگەڵ bell (.E)، belle (.OE)، belle (.MG) "زەنگ، زەنگوڵە". وا گومان دەکرێ، ئەم وشە ژێرمەنییە پێوەندی بە bell (.E) ەوە هەبێ، بە مانای "وەڕین، هەراهەرا کردن". بەم شێوەیە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بالاندن balandn.

**بۆڵەبۆڵ bolebol** *[ bolabol ]* - "ورتاندن، قسەکردنێکی وا کەس تێی نەگا": بلمەبلم bılmebılm و برمەبرم bırmebırm یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ barbara-h (.OIn)، barbaros (.Gr) و barbarus (.L). بەم وشانە ئەو خەڵکە بیانییانە ناودێرکراون کە زمانیان بۆ خەڵکی خۆجێیی نامۆ بووە واتا خۆجێییەکان قسەکردنی ئەوانیان بەلاوە وەک بۆڵەبۆڵ [برمەبرم] بووە و لێی تێ نەگەیشتوون. دواتر مانای وشەکە گۆڕدراوە بۆ خەڵکی وەحشی ودڕەندە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***barbar-* <** ***(IE.)*** "برمەبرمە، بۆڵەبۆڵ". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگ بووە.

**بوڵەنمە bolenıme** *[ bolanıma ]* - "ئاوتێگەڕانی میوە": پێک هاتووە لە دوو وشەی ↑بوڵ +↑ نم nım + bol، وشەکەدەبنەڕەتدا واتا خڕەکە بوون و "هەڵمسان" دەگەڵ "تەڕ و بڕ" بوون.

بۆم **bom** [ *bom* ] - دەگەڵ "بەر" دێ [بەر و بۆم واتا بەرهەم]. < (Fr.) pomme < "سێو" (L.) *pōmum* "میوە، سێو".

بۆمب **bomb** [ *bomb* ] - "چەکێک کە دەتەقێتەوە و دەکوژێ": < (L.) *bombus* و (Gr.) *bombos* "دەنگی تەقینەوە، تریشقە".

بۆن **bon** [ *bon* ] - "هەستێک کە لە ڕێگەی لووتەوە پێک دێ": خزمە لەگەڵ ↑بوت but.

بۆنە **bone** [ *bona* ] - "موناسەبەت": خزمە دەگەڵ ↑بیانوو bıyanu.

بۆیاخ **boyax** [ *boyāx* ] - "مادەیەک بۆ ڕەنگ کردن": بۆیە boye ش دەگوترێ. بەپێی "فەرهەنگی هەرمان" (ل. 339) لە (Tur.) *boya* وەرگیراوە.

بە **be** [ *ba* ] - پرێپۆزیسیۆن [وەک "بە ئێمە"]. (P.) be. خزمە دەگەڵ (MP.) pad و (OP.) patiy "بە، بەرەو"، (Av.) paiti و (OIn.) práti "بە، بەرەو"، سەر بە ڕیشەی < *(IE.) *po-ti*. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 220].

بەبر **bebır** [ *babır* ] - "ئاژەڵێکی دڕندەی بەهێز": ببر babr (P.) و (MP.)، بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 175) دەچێتەوە سەر vagr (OI.) و لەوێشەوە بۆ -vyāghrā (OIn.) "بەبر، بەور" [دە بنەڕەتدا واتا "بۆن هەڵگر"] .

بەبلە **beble** [ *babla* ] - "توول، پیزە، بێچووی ناو زک": ↑بەبە bebe "زاروکی ساوا".

بەبوو **bebu** [ *babū* ] - دەگەڵ وشەی کوند دێ [کوندەبەبوو kundebebu] : "کوندە بوو"ش دەگوترێ. خزمە دەگەل بوف / بوم būf / būm (P.)، bubo (L.)، byas (Gr.)، گشتیان بە واتای "کوندە بەبوو". وشەکە دە بنەڕەتدا لاسا کردنەوەی دەنگی باڵدارەکەیە. دەنگ و هاواری باڵدارەکە بەم شێوەیە هاتووەتە بەر گوێی مرۆڤ: بووبوو bubu. ئەم وشەیە پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئەم وشانەی سەرەوەی لێ کەوتۆتەوە. وشەکە چ پێوەندی بە "بۆن"ەوە نییە. وشەی ↑کوند kund دواتر خراوەتە سەر ناوەکە و دە بنەڕەتدا بە مانای "خڕەکە، خڕتۆلە، کورتەبنە"یە و خزمە دەگەڵ گندە gonde (P.) "زلە، قەڵەوە". بەم جۆرە مانای "کوندەبەبوو" دەبێتە "بەبووی خڕتۆڵە".

بەبە **bebe** [ *bona* ] - "زارۆکی بەرمەمکان": خزمە دەگەڵ baby (E.)، baban (ME.) "بەبە"، Bube (G.) "هەتیو، مرۆڤی بەدکار"، babbe (Sw.-inf.) "کوریژگە"، Bub (Öst.) "کوریژگە"، pupa (L.) "کچۆڵە". ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر لاسا کردنەوەی زمانی زارۆک، هەر وەک چۆن دە وشەکانی ↑بابە babe و مامە mame و دادە dade و هیتردا ئەم دیاردەیە دەبینین.

بەتانی **betanî** [ *batānī* ] - "پەتوو، پێخەو": وشەکە لە بطانية batāniya (Arb.) وەرگیراوە و ئەمەش خۆی دەبێ لە ↑پەتوو petû وەرگیرابێ.

بەتەڵ **betel** [ *batal* ] - "پاڵەوان": وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشەی زمانی کوردمادی کە ئاماژە بە "هێز" دەکەن وەک ↑پتەوpıtew، ↑پیت pît [پیتاندن]، ↑فیتەر fiter "زل و بەهێز"، پاد pad [↑پادشا padşa واتا شای بەهێز]، ↑پەتڵین petlîn "خۆ گرتن، هێز پەیدا کردن" و هتد. دە زمانی عەرەبیدا بطل batal (Arb.) "قارەمان" هەیە کە لەوانەیە لە فیتەر fiter "زل و بەهێز" [کۆنتر: پیتەر pîter؟] وەرگیرابێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی < -*(IE.) *pad* "بەهێز بوون".

[تێبینی: وشەی "پاڵەوان"یش دە ڕیشەدا مانای "سەخت، بەهێز" دەبەخشێ]

بەتیە **betîye** [ *batīya* ] - "پارچەیەکی ناسکە بۆ عەبای هاوینان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پەتوو petû.

بەچک **beçk** [ *baçk* ] - "بیچم، تەرح، سەکوت":

1- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑بیچم bıçım.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑فەساڵ fesal ەوە هەبێ.

بەچکە **beçke** *[ bačka ]* - "منداڵ، بێچوو": بەچ + کە (پاشگری گچکاندن) beç + ke [↑بێچوو beçu].

بەخت **bext** *[ baxt ]* - "شانس": بخت baxt (P.). خزمە دەگەڵ ↑بەش beş. دە زمانی کوردمادیدا زۆرجار لە جیاتی بەخت وشەی عەرەبی "قسمەت و نەسیب"یش دەگوترێن و وەک ئاشکرایە قسمەت هەر مانای بەش دەدا. مەبەست لە بەخت دە بنەڕەتدا ئەو "بەش"یە کە مرۆڤ لەچارەنووس وە بەری کەوتووە .

[تێبینی: کاک عەلی نانەوازادەش ئاماژەی کردووە بە پێوەندی وشەکانی بەخت و بەخشین و بەش و باج و پاژ- "فەرهەنگی هەرمان"، ل. 357].

بەختە **bexte** *[ baxta ]* - "بەران، تێری": بختە baxte (P.) "مەڕی تێری سێ چوار سالان": بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 178) لەوانەیە بچێتەوە سەر **vaxtaka-* *(OI.)* سەر بە ریشەی ئێرانی *vac-* "چالاک بوون، چابوک بوون" و خزم بێ دەگەڵ vacyáte- (OIn.) "نائارام بوون، دە جم و جۆڵدا بوون، سووڕان"]. ئەم ریشە ئێرانییە دەشێ پێوەندی هەبێ بە یەکێک لەم دوو ریشەی هیندوئەورووپییەی خوارەوە:

1- ***< *uĝ- (IE.)*** "تەر و تازە، گەش، بە هێز و گوڕ". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑وزە wıze، ↑هێز hez، ↑هۆش hoş و ↑بووژانەوە bujanewe و هتد.

2- ***< *uegh- , *wegh- (IE.)*** "بزوان، جووڵانەوە، رۆیشتن، ئاژوان". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وەشاندن2 weşandın [راوەشاندن].

بەخشین[1] **bexşîn** *[ baxšīn ]* - "پێدان": بخشیدن baxšīdan (P.). خزمە دەگەڵ ↑بەشین beşîn [دابەشین]. دە زمانی فارسیدا بخش baxš (P.) مانای "بەش" دەدا. وشەکە دە بنەڕەتدا مانای "دابەشین، بەش دان"ی ئەمرۆی کوردمادی هەبووە و لەمەوە مانای "(پێ) دان" پەیدا بووە.

[تێبینی: دەتیوان دوو چەمکی "دان" و "بەش دان"دا پێوەندی نیزیک هەیە، بۆ وێنە Teil (G.)، deal (E.) "بەش، لەت" دەگەڵ dayati (OIn.) "بەش دەکا" و dayomai (Gr.) "بەش دەکەم، بڵاو دەکەمەوە" بە خزم دادەندرێن. ئەم وشانە دەگەڵ دان dan ی کوردمادی لەیەک ریشەوە هاتوون].

بەخشین2 **bexşîn** *[ baxšīn ]* - "لێبووردن": بخشیدن baxšīdan (P.) یان بخشودن baxšūdan. لە ↑بەخشین1 bexşîn بەمانای "بەش دان، دان" وەرگیراوە.

[تێبینی: دەزمانە ژێرمانییەکانیشدا vergeben (G.) و forgive (E.) "لێبووردن، چاوپۆشی کردن" دەگەڕێتەوە بۆ کرداری geben (G.) و give (E.) "دان"].

[بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 178) وشەکە بردراوەتەوە سەر apa + xšad *(OI.) و بۆ ریشەی xšad-. دیارە ئە بۆچوونە زۆر رێی تێ ناچێ].

بەد **bed** *[ bad ]* - "نەباش": بد bad (P.)، bad (E.)، böse (G.)، boos (Nl.). خزمە دەگەڵ ↑فیز fîz و ↑بەس bes و گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵمسان"

بەدەن **beden** *[ badan ]* - "لەش، بەژن": بدن (P.). خزمە دەگەڵ body (E.)، bodig (OE.)، botah (OG.) "بەدەن". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە ↑بەژن bejın ی کوردمادی شێوەیەکی دیکەی ئەم وشەیە بێ.

بەدەو **bedew** *[ badaw ]* - "1-جوان 2- ئەسپی خۆشبەز": دەشێ لە *بدوی badawī* (Arb.) "وەحشی، سەحرانشین" وەرگیرابێ. شیاوی باسە کە "وەحشی" هێندێک جار لەگەڵ وشەی "جوان" و بە مانای جوان بەکار دەهێنرێ.

بەر1 **ber** *[ bar ]* - "1- میوە، بەرهەم 2- منداڵی ناوسک [بەرهاویشتن]": [بڕوانە↑بەرە bere].

بەر2 **ber** *[ bar ]* - "پێش": vor (G.)، fora (OG.) befor (E.)، pro و prae (L.)، paros (Gr.)، pura (OIn.)"بەر، پێش"، سەر بە ریشەی ***< *per- (IE.)*** "بەر، پێش". خزمە دە کوردمادیدا دەگەڵ ↑پار par [سالی پار واتا ساڵی بەرێ]، ↑پێرارperar، ↑پێرێ pere.

بەر3 **ber 3** *[ bar ]* - "لەبەر، ژبەر": [دەکوردیدا بە تەنیا بە کار نایە]. (از) برای barāye [az] (.P) "لەبەر، بۆ"، خزمە دەگەڵ ↑بەر2 ber بە مانای "لەبەر". ئەم وشانە هەموو دەگەڵ for (.E)، für (.G)، faur (.Gt)"پێش" خزمن. دە شێوەزاری کوردمادی خوارووودا بووەتە ↑ئەرا(ی) (era(y [ئەرای چی واتا لەبەر چی].

بەر4 **ber 4** *[ bar ]* ـ بەر بوونەوە واتا "کەوتن": پێوەندی هەیە بە وشەی ↑وەرین werîn. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑بوورانەوە buranewe و چەند وشەیەکی دیکە.

بەر5 **ber 5** *[ bar ]* ـ لە بەر کردن واتا حیفز کردن، بە مێشك ئەسپاردن. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑بیر *bîr*"هزر، هۆش، حافیزە" و↑ فێر fer.

بەر6 **ber 6** *[ bar ]* - "قەراخ، لا، ئاڵ": بڕوانە ↑بار6 bar "قەراخ، ئاڵ".

بەر7 **ber 7** *[ bar ]* - "سینگ، باوەش" [سینگ و بەر]. هەروەها کاتێك دەگوترێ "لە بەر کردن"ی جلك یان "لە بەر داکەندن" یان کاتێك دەگوترێ "بەری دەست، بەری پێ". خزمە دەگەڵ بر bar (.P)، war (.MP)، varah- (.Av)، úras- (.OIn) "سینگ و بەر"، varu- (.Av) "پان، بەرین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uer-** > "پان، بەرین". [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 182]. وشەی ↑بەرین berîn "پان" لەم ریشەوە هاتووە.

-بەر8 **-ber 8** *[ bar ]* - پاشگرێکە لە ناو ئاوەڵناو دروست دەکا و مانای "هەڵگر" دەداتە ئاوەڵناوەکە، وەك ڕەنجبەر rencber، پیامبەر peyamber، دڵبەر dılber و هتد. شێوەیەکی دیکەیە لە پاشگری ↑-بار4 -bar بە هەمان مانا.

بەر9 **ber 9** *[ bar ]* - بەر دان واتا ڕەها کردن، ئازاد کردن. "بەر" لێرەدا مانای "ڕەهایی، ئازادی" دەگەیەنێ و بەر دان دەبنەڕەتدا واتا ئازادی یان ڕەهایی دان. خزمە دەگەڵ frei (.G)، frī (.OG)، free (.E)، fries(.Gt)، frjāls (.OIs) "ئازاد، ڕەها". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑پەری perî.

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا ول کردن vel kardan (.P) هەیە بە مانای "بەر دان". ئەم وشە فارسییە لەوە دەچێ خزم بێ دەگەڵ "فل" [شل و فل] و دە بنچینەدا مەبەست "شل کردن" بووبێ. هەر وەك ئاشکرایە ڕەهایی و ئازادی پێوەندی بە شل کردنەوە هەیە، بەپێچەوانەشەوە توند کردن و بەند کردن پێشی ئازادی و ڕەهایی دەگرێ. سەرنج بدە کە وشەی "بەر"ی کوردی دەگەڵ کرداری "دان" دێ، بەڵام "ول"ی فارسی دەگەڵ کرداری "کردن"].

بەرات **berat** *[ barāt ]* - "1- موچە، هەقدەست، داهاتی ڕۆژانە 2- ڕسق و ڕۆژی":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بەهرە behre و ↑بێر ber [خێر و بێر].

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ ↑بڕین bırîn. لەم ڕوانگەوە مانای "بەرات" دەبێتیە ↑بڕانە bırane واتا ئەو بەشەی یان ئەو ڕسقەی بۆ کەسێك بڕاوەتەوە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ کرداری ئەڵمانی bescheren (.G). ئەم کردارە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بەمانای "بڕین" و دە بنەڕەتدا مەبەست گەیاندنی ئەو بەشە بووە کە خودا بۆ مرۆڤی بڕیوەتەوە. ئەم وشەیە ژێرمەنییە دەگەڵ کێرد kerd خزمە].

بەراز **beraz** *[ barāz ]* - "خووك": fahrah (.OG)، farrow (.OE)، porcus (.L) "بەراز"، Ferkel (.G) "بەچکە بەراز"، سەر بە ریشەی **(IE.) *perk-** > "هەڵدڕین". وشەی ↑بڕڕەك bırrek "بەرازی نێر" دە کوردمادیدا هەر لەم ریشەیەوە هاتووە و شێوەیەکی کۆنترە لە وشەی بەراز.

[تێبینی: دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی DUDEN ی زمانی ئەڵمانیدا، تەنیا دوو تا سێ وشەی کوردی بۆ هەڵسەنگاندن بە نموونە هێنراوەتەوە، کە یەکێك لەوان لەژێر وشەی Ferkel "کوودەڵەبەراز"دایە. لەوێ ئاماژە بە وشەی کوردی purs کراوە کە دەبێ بە مانای "خووك، بەراز" بێ. ئەوەی ڕاستی بێ، من ئەم وشەیەم تا ئێستا نەبیستووە و دە وشەنامەی "هەنبانەبۆرینە"شدا بۆم پەیدا نەبوو. لەوانەیە وشەکە بەهەڵە نوسرابێ و مەبەست بەراز ەکەی خۆمان بێ].

بەراک **berak** [ *barāk* ] - "سەکۆ، هەیوان": خزمە دەگەڵ ↑پێرک perk "هەرزاڵ".

بەرام(ە) **beram(e)** [ *barām(a )* ] - " بۆنی خۆش":[بۆن و بەرام(ە)].

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ breath (E.) "دەم، هەناسە"، bra ? (OE.) "بۆن، بەرامە، هەڵم" سەر بە ریشەی *(IE.) *bhrē-* > "سووتان، هایسان".

2- لەوانەشە وەرگیرابێ لە árōma (L.) "بۆن و مەزەی خۆش" و پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتبێ [بە ئارۆمە ←بەرامە؟، گۆڕاتیکی ئەوتۆ لە وشەی "باوەش"یشدا دەبینرێ].

بەران **beran** [ *barān* ] - "قۆچ، تیرە مەڕ": خزمە دەگەڵ warān (MP.) و barán (Rus.) "بەران". دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 195) وشەی برە barre (P.) [↑بەرخ berx] بردراوەتەوە سەر ریشەی *(IE.) *uer-* > "خوری، ئاژەڵی پشمدار". -var (Av.) و -úra (OIn.) "قۆچ، مەڕ" دەبێ لەم ریشەوە هاتبن و هەروەها بەران beran دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

بەربەرە **berbere** [ *barbara* ] - ↑وەرووەرە.

بەربەرەکانی **berberekanî** [ *barbarakānī* ] -"بەرەنگاری، دە روودا وەستان": دەچێتەوە سەر ↑بەر[2] ber "پێش". مەبەست دە پێش کەسێکدا [بەرەورووی ئەو] راوەستان و دەست کردنەوەیە.

بەربینگ **berbîng** [ *barbīng* ] - "یێخە، پێسیر": ↑بەر[2] + بینگ ber + bîng، بەربینک berbînk یش دەگوترێ. ↑بین bîn بە مانای "هەناسە" یە و "بینگ" دەبێ شوێنی پێدا چوونە خوارەوەی هەوا، واتا " گەروو" بێ. بەربینگ گرتن واتا یێخە گرتن و رێگای هەناسە کیشان لێ بەستن.

بەرتل **bertıl** [ *bartıl* ] - "گوێچ، پارە یان متی کایە": بەر + تل ber + tıl، "تل" خزمە دەگەڵ ↑سیلە sîle "ئامانج، هەدەف" [تیلە tîle (P.) "مت، مەرمەڕ"]. لەم تێڕوانینەوە بەرتل واتا ئەو پارە یان شتەی دە کایەدا دەکەوێتە بەر ئامانج.

بەرتیل **bertîl** [ *bartīl* ] - "ریشوە": دەشێ لە دوو کەرت پێک هاتبێ: بەر + تیل ber + tîl. کەرتی "تیل" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Zoll (G.)، zol (OG.)، tol (Nl.)، toll (E.)، tull (Sw.) "خەرج، باج، پیتاک، گومرگ". ئەم وشانە لە رێگەی زمانی لاتینییەوە دەچنەوە سەر وشەی یۆنانی telōnion (Gr.) "گومرگ" و دواتریش télos (Gr.) "نیشانە، سیلە، سنوور".

[تێبینی: سەبارەت بە ریشەی وشە یۆنانییەکە شی کردنەوەیەک باس نەکراوە. لەوانەیە پێوەندی بە "سیلە"ی کوردییەوە هەبێ [بە فارسی "تیلە"] واتا "نیشانە". سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "نیشانە" و "سنوور" هەروەها بڕوانە وشەکانی مەرز و *مارکە* "نیشانە"].

2- ↑تۆڵە tole.

بەرج **berc** [ *barj* ] - دەگەڵ "خەرج" دێ [خەرج و بەرج xerc u berc]. برج barj (P.) "خەرجی لاوەکی". دەشێ خزم بێ دەگەڵ borgen (G.)، (Nl.)، borga (Sw.)، borrow (E.) "قەرز پێدان، قەرز وەرگرتن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بەرگ[1] berg، سەر بە ریشەی *(IE.) *bherg-* > "پاراستن، ئاگا لێبوون، هەڵگرتن لە شوێنێکی باش".

بەرجەوەند **bercewend** [ *barjawand* ] - "دیمەن": بەر + جەوەند ber + cewend، کەرتی جەوەند cewend دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زەوی zewî، تیکرای مانای وشەکە دەبێتە "زەوی بەر چاوان".

بەرچێڵ(ە) **berçel(e)** [ *barčela* ] - "ژێر چەنەگە": بەر + چێڵ ber + çel، ↑بەر ber ئاماژە بە لای پێشەوە یان خوارەوە دەکا. کەرتی چێڵ cel وەک وشەیەکی سەربەخو دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا نەماوە، بەڵام دەبێ سەردەمێک وشەیەکی سەربەخۆ بووبێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ gill (E.) "گوێ ماسی" و khelune (Gr.) "شەویلکە، لێو" و kheîlos (Gr.) "لێو".

**بەرخ berıx** [ *barıx* ] - "بێچووی مەڕ": بەررە berre (P.)، warrag (MP.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Fohlen (G.)، folo (OG.)، foal (E.)، fula (Gt.)، fale (Sw.) "جوانوو، بێچووی ئەسپ"، polos (Gr.) "جوانوو، بێچووی ئاژەڵ"، pullus (L.) "جەوان، بێچووی ئاژەڵ"، puer (L.) "زارۆک"، پور pur (P.) "کوڕ"، سەر بە ریشەی ***< *pou- (IE.)*** "گچکە، کەموسکە". دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا و لەوانەش زمانی کوردمادی چەندین وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک few (E.) "کەم"، putus (OG.) "کوڕیژگە"، pais (Gr.) "پس، منداڵ"، ↑پس pıs " کوڕ" [پسمام واتا کوڕی مام]، ↑پز pız "منداڵی ناو سک"، ↑باڕ bar "بێچووی پەلەوەر" و هتد.

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 195) وشەکە بردراوەتەوە سەر ریشەی ***< *uer- (IE.)*** "خوری، ئاژەڵی پشمدار". -vara (Av.) و-úra (OIn.) "قۆچ، مەڕ" دەبێ لەم ریشەوە هاتبن و هەروەها ↑بەران beran دەبێ پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ].

**بەرد berd** [ *bard* ] - "سەنگ": ward (MP.)، دە زمانی ئاوێستا دا -varəta (Av.) "بەرد" بە کار هاتووە. دە زمانی فارسیدا وشەی "لاجورد" هەیە [لاج + ورد] lāj(e)vard (P.) بە مانای "پیرۆزە، بەردێکی شینی بەنرخ". بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 186) وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی ***< *uel- (IE.)*** "سفت بوون، رەق بوون". دە زمانی کوردیدا جگە لە بەرد، وشەی ↑پەل pel یش بەم مانایە دێ و ئەمە شێوەی کۆنتری وشەکە نیشان دەدا.

[تێبینی: لەباری فۆنۆلۆژیکەوە پێوەندی "پەل" بە ریشەکەی سەرەوە هەڵسەنگێنە دەگەڵ وشەی *پێل* "شەپۆل" و ریشەی *-*uel (IE.)* "سووڕان، با دران"].

**بەردە berde** [ *barda* ] - "بەندە": بردە barde (P.)، wardag (MP.)، -varəta (Av.) "دیل، بەردە"، سەر بە ریشەی -var و دواتریش ریشەی هیندوئەورووپی ***< *uel- (IE.)*** "جیا کردنەوە، لێکردنەوە، دادڕین، رفاندن"، خزمە دەگەڵ uellō (L.) "دوورکردنەوە، بردن"، wilwan (Gt.) "تاڵان کردن" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 186]. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک↑ گورگ gurg، ↑وێرت wert و هتد.

**بەرز beriz** [ *barız* ] - "بڵیند": ئەم وشەیە دەگەڵ وشەی بڵیند bılnîd هاوریشە و دە بنەڕەتدا هەر یەک وشەن. بلند boland (P.)، brhant (OIn.) "بەرز، بلیند"، -barezah (Av.) "بەرزایی، کێو"، Berg (G.) "کێو"، bairgahei (Gt.) "بەندەن، ناوچەی شاخاوی"، berg (Sw.) "تەپۆڵکە"، barrow (E.) "گڵکۆ [تەپۆڵکی سەر گۆڕ]"، berj (Arm.) "بەرزی"، bereg (Rus.) "رۆخی دەریا"، beorg (ON.) "تاشەبەرد، رەوەز"، fortis (L.) "بەهێز" [دەبنەڕەتدا زەلام، بەرز]، سەر بە ریشەی ***< *bheregh (IE.)*** "بەرز، قیت". ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی ***< *bher- (IE.)*** "بردن، هەڵگرتن، بڵیند کردن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بردن bırdın.

**بەرزا berza** [ *barzā* ] - "یەکەم فرزەند، نۆبەرە": ↑بەر$^2$ + زا [↑زان zan] ber + za، واتا ئەوە لە پێشەوە هاتووەتە دونیا.

**بەرزاخ berzax** [ *barzāx* ] - "بەروار، بەرقەدی شاخ": ↑بەر$^2$ + زاخ ber + zax. زاخ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شاخ şax.

**بەرژەوەندی berjewendî** [ *baržawandī* ] - "قازانج": لەوانەیە پێوەندی بە ↑وەرج werc ەوە هەبێ بە مانای "نرخ، بایەخ" و پێک هاتبێ لە بەرج berc [وەرج werc] + وەند wend. "وەند" [کۆنتر: بەند] پاشگری وە پاڵ دان و بەستنەوەیە. لەم تێڕوانینەوە مانای "بەرجەوەند" دەبێتە "نرخدار" و "بەرجەوەندی"یش دەبێتە "نرخداری".

**بەرسڤ bersıv** [ *barsıv* ] - "وەڵام": ↑بەر$^2$ + سڤ ber + sıv. سڤ sıv خزمە دەگەڵ sprechen (G.)، sprehhan (OG.)، spreken (Nl.)، spraka (Sw.)، specan (OE.)، speak (E.) "ئاخافتن، قسەکردن".

کەرتی "بەر" دە وشە کوردمادییەکە دا مانای ئەوە دەدا کە قسەیەک بەرەورووی کەسێک یان قسەی کەسێک دەکرێتەوە، بە وتەیەکی دیکە بەرانبەر بە قسەی کەسێک شتێک دەگوترێ. ئەم وشەیە هەروەها خزمە دەگەڵ ↑دوان duwan "قسە کردن"،↑چپە çıpe و چپاندن çıpandın "بە دەنگی کز قسە کردن".

[تێبینی: وشەی Antwort (G.) "بەرسف، وەڵام" دە زمانی ئەڵمانیدا لە دوو کەرتی ant و Wortپێکهاتووە. کەرتی Wort مانای وشە (قسە) دەدا و دە ریشەدا خزمە دەگەڵ "ورتە"ی کوردمادی. کەرتی ant مانای رووبەروو (بەرانبەر) دەبەخشێ و خزمیشە دەگەڵ "هەنێ" دە زمانی کوردمادیدا. وشە ئەڵمانییەکە دە بنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە: قسەیەک کە دە بەرانبەر قسەیەکی دیکەدا دەگوترێ واتا هەمان "بەرسف"ی کوردمادی].

**بەرسیلە bersîle** *[ barsīla ]* - "قۆرە، ترێی کاڵ": شێوەکانی دیکەی ئەم وشەیە بریتین لە بێسیرە besîre، پەسیرە pesîre، بێشیرە bêşîre، لەناو ئەو چەند شێوەیەدا وشەی بێشیرە bêşîre زۆرتر سرنج رادەکێشێ و دەتوانێ ریشەی وشەکەمان بۆ ساغ بکاتەوە. بەپێی ئەم وشەیە بەرسیلە واتا ترێیەک کە هێشتا شیلە (شیرە) ی تێ نەگەڕاوە و شیرن نەبووە (ترێی بەرلە شیرە تێگەڕان). کەواتە دەبێ وشەکە سەرەتا "بەرشیلە" بووبێ و دواتر گۆڕدرابێ بۆ بەرسیلە [↑شیلە].

**بەرغەڵ berġel** *[ barġal ]* - "گەلەی بەرخ و کاریلە": بەرگەڵ bergel یش دەگوترێ. دە بنەڕەتدا دەبێ بەرخگەڵ *berıxgel** بوو بێ [ ↑بەرخ + ↑گەڵ berıx + gel] و کورت کراوەتەوە .

[دە "فەرهەنگی هەرمان"یشدا ئەم وشەیە بەم جۆرە لێک دراوەتەوە، بڕوانە ل. 384].

**بەرڤین bervîn** *[ barvīn ]* - "تۆپین، کەوتین، سەکەت بوون": ئەم وشەیە هەر وەک وشەکانی کەوتین و سەکەت بوون دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "کەوتن" بووبێ. لەم تێڕوانینەوە جێی بەراورد کردنە:

1- دەگەڵ werfen (G.)، werfan (OG.)، wairpan (Gt.)"خستن، فڕێ دان"، warp (E.)"با دران"، vrěšti (OSl.) "خستن، فڕێ دان"، سەر بە ریشەی **< -*wer (IE.)** "سووڕان، با دان".

2- لە لایەکی دیکەوە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ ↑بەر ber بوونەوە و ↑بوورانەوە buranewe.

**بەرک¹ berk** *[ bark ]* - "گوللە": لەوانەیە خزم بێ ↑دەگەڵ werfen (G.)، werfan (OG.)، wairpan (Gt.) "خستن، فڕێ دان"، warp (E.)"با دران"، vrěšti (OSl.) "خستن، فڕێ دان"، سەر بە ریشەی **< -*wer (IE.)** "سووڕان، با دان".

**بەرک2 berk** *[ bark ]* - "گیرفان": ↑بەریک berîk ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەرگ berg "1- جلک 2- کەرەسەی تێوەپێچان"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "پاراستن، ئاگاداری کردن".

**بەرکم berkım** *[ barkım ]* - "گۆلاو": ↑برک bırk "حەوز، ئەستێل".

**بەرگ1 berg** *[ barg ]* - "1- جلک 2- دە هێندیک شت دەگیرێ بۆ ئەوەی کۆن و خراب نەبێ وەک لێفە و دۆشەک و کتێب": خزمە دەگەڵ bergen (G.)، bergan (OG.)، bairgan (Gt.)، beorgan (OE.)، brga (Sw.)، گشتیان بە مانای "هێنانە ژێر پاراستن، لە مەترسی دەرباز کردن"، سەر بە ریشەی **< -*bherg (IE.)** "پاراستن، ئاگا لێبوون، هەڵگرتن لە شوێنێکی باش". دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە بەمانای "تێوەپێچان، حەشار دان" بە کار دێ. دە زمانی رووسیدا beregu (Rus.) دەبێتە "هۆدە، پەناو پەسێو". وەک دەبیندرێ لایەنی هاوبەش دە گشت زمانەکاندا مەسەلەی "پاراستن"ە. دیارە دە زمانی کوردمادیشدا بەرگ شتێکە بۆ پاراستن و باش راگرتنی لەش [جل و بەرگ] یان شتی دیکە وەک بەرگەدۆشەک، بەرگەلێفە و هتد.

[بەرگ بەم مانایەی سەرەوە نابێ دەگەڵ "برگ"ی فارسی بە مانای "گەڵا" تێکەڵ بکرێ. ئەمانە دوو وشەی جیاوازن و پێوەندی ئێتیمۆلۆژییان پێکەوە نییە. بەرگ بە مانا کوردمادییەکەی دەبێ سەردەمێک دە زمانی فارسیشدا لە ئارادا بووبێ، وەک لە جووتە وشەی ساز و برگ saz-o- berg (P.) دا دەبیندری، مەبەست لەم جووتە وشەیە دەبێ جلک و ئامێری شەڕ بووبێ، کەچی دە فەرهەنگەکانی زمانی فارسیدا

پەی بە مانای دروستی وشەی "برگ" نەبردراوە و ئەمیان وەک هاومانای وشەی "ساز" داناوە و بە "ئامێر، چەک، کەرەسەی شەر" لێکیان داوەتەوە].

**بەرگ²** **berg** [ *barg* ] - "یەکەی پەرتووک": دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ یەک یان چەند بەرگ کتێب، یان دەگوترێ فڵانە کتێب دو یان چەند بەرگە، بەرگی یەکەم یان دووەمی فڵانە کتێب. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە برگ berg I بە مانای "جلک" یان "جلد". ئەم چەمکە لێرەوە پەیدا بووە کە کتێب بەرگی تێ دەگیرێ و هەر بۆیەش دەگوترێ یەک یان چەند بەرگ.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ ئەم چەمکە وشەی Band بەکاردەهێندرێ کە دەچێتەوە سەر binden (G.) "بەستن" و دە بنەڕەتدا مەبەست لێکبەستنی پەڕە کاغەزەکانی کتێبەکەیە].

**بەرگن** **bergın** [ *bargın* ] - "لوا، کوڵکەی وشتر و برخ":

1- لەوانەیە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑برژۆڵ bırjol دا باس کراون.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑بەران brean ەوە هەبێ، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوری".

**بەرگە** **berge** [ *barga* ] - بەرگە گرتن واتا "پێوەستان، خۆ ڕاگرتن، دەوام هێنان": خزمە دەگەڵ ↑بردن bırdın [بەر + گە ber + ge].

[تێبینی: چەمکی بەرگە گرتن دە زمانی ئەلمانیدا لە کردارێک وەرگیراوە بە مانای "بردن، هەڵگرتن"، tragen (G.) واتا "بردن، هەڵگرتن"، ertragen (G.) واتا "بەرگە گرتن، تەحەممول کردن". دە زمانی عەرەبیشدا هەر وایە: حمل "بردن، هەڵگرتن" و تحمل "بەرگە کردن". دە زمانی ئینگلیزیدا وشەکە هاوشێوە و هاوریشەی وشە کوردمادییەکەیە: bear (E.)].

**بەرگەدە** **bergede** [ *bargada* ] - "لای خوارەوەی ورگ": بەر + ↑گەدە ber + gede، گەدە ئەسڵدا بە واتای "قەد، قەڵافەت، هەیکەل"ە. قەد یان گەد لێرەدا واتای "کەمەر، تیوقەد" دەگەیەنێ. بەرگەدە دەبێتە خوارەوەی قەد یان کەمەر، هەر وەک چۆن "بەرقەد"ی کێویش ئاماژە بە لای خوارەوەی کێو دەکا.

**بەرنامە** **bername** [ *barnāma* ] - "پرۆگرام". لە زمانی فارسی وەرگیراوە [ > *برنامه* *barnāme* (P.)].
وشە فارسییەکە بە پێودانی وشەی programm (Gr.) دروست کراوە

[pro واتا "بەر" و gramm یش لە graphein "نووسین"ەوە هاتووە، تیکڕای وشەکە "پێشنووس" مانا دەدا].

**بەروار** **berwar** [ *barwār* ] - "قەدی چیا": بەر + وار ber + war، مەبەست لای بەرەوەی کێوە، "بەر" دە زمانی کوردمادیدا جگە لە مانای "پێش"، مانای "ژێر، خوارەوە"ش دەدا. ["سەر لە بەر" واتا سەرتا پا، سەرتاخوار]. کەرتی وار war- لەوانەیە پێوەندی بە ↑بەرد berd ەوە هەبێ و مەبەست "چیا" بێ. ئەم وشەیە لە کۆندا ورد verd بووە. شیاوی باسە کە دوو چەمکی "بەرد" و "شاخ" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و هەر بۆیە وشەکانیان پێوەندی ئێتیمۆلوژیک بە یەکەوە پەیدا دەکەن، بۆ وێنە "چیا" خزمە دەگەڵ وشەیەکی ئەڵمانی بە مانای "بەرد".

[تێبینی: بەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ بەرزاخ berzax "بەروار، بەرقەدی *شاخ"*].

**بەروان(کە)** **berwan(ke)** [ *barwānka* ] - "پارچەی سەرسینگی زارۆکان لەکاتی خواردندا": بەر + وانک ber + wank. کەرتی یەکەم، بەر ber بە مانای "پێش" یان بە مانای "سینگ و بەر"ە، کەرتی دووەم پاشگری ↑وان wan- بۆ داپۆشین و پاراستنی ئەندامانی لەش بەکار دەهێنرێ، وەک دەستەوانە، پاوانە، ملوانکە، قامکەوانە و هتد.

**بەڕوو** **beru** [ *barū* ] - "بەری دارێکی جەنگەڵییە و ناوی دارەکەشە": balūt (P.)، خزمە دەگەڵ Föhre (G.)، foraha (OG.)، fuhr (OE.)، fir (E.)، fura (Sw.)، fyr (Den.) وهتد، گشتیان بە مانای "سەنەوبەر"، سەر بە ریشەی < *foruh* (Gm.) "بەڕوو"، سەر بە ریشەی < ***perku-s*** ***(IE.)*** "بەڕوو". وشە ژێرمەنییەکە سەرەتا بە مانای "بەڕوو" بووە و دواتر مانای "سەنەوبەر"ی وەرگرتووە.

بەرۆ(ک) **bero(k)** [ *barok* ] - "یەخە": دەچێتەوە سەر ↑بەر ber[7] "سینگ و بەر".

بەرە(ک) **bere(k)** [ *barak* ] - "سینەبەندی ئەسپ": ↑خزمە دەگەڵ ↑بەرۆک berok "سینگ و بەر".

بەرە**1** **bere 1** [ *bara* ] - "نەسل، وەچە": خزمە دەگەڵ ↑بەر1 ber "میوە، بەر و بۆم"، دەچێتەوە سەر کرداری ↑بردن bırdın، مەبەست بەرهەمی مرۆڤە [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی بەرهاویشتن، بەرەباب، پاشە بەرە]. کرداری "بردن" دە بنەڕەتدا مانای "هەڵ گرتن" دەدا و لەبەر ئەوەی دار و درەخت هەڵگر ی میوەن، یان مرۆڤ [ژن] منداڵ دە سکی خۆیدا هەڵدەگرێ، بۆیە بەو شتە هەڵگیراوە گوتراوە بەر یان بەرە. خزمە دەگەڵ وشەکانی gebären (G.)

[ge - bären] "زان"، gebärmutter (G.) "منداڵدان"، fertilitis (L.) "بەردار" و ferre (L.) "بردن، هەڵگرتن" و تیکرا دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *bher- >** "بردن، هەڵگرتن".

بەرە**2** **bere 2** [ *bara* ] - "وەستانی باران": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑برینگ bırīng [ئیشک و برینگ]. لەلایەکی دیکەوە دەشێ پێوەندی بە "بڕین"ەوە هەبێ و مەبەست ئەوە بێ باران "لێی بڕیوەتەوە".

بەرە**3** **bere 3** [ *bara* ] - "1- خەتتی پێشەوەی شەڕ 2- هەواڵبەندی هێزە سیاسییەکان": دە زمانی فەرەنسیدا front (F.) بۆ ئەم چەمکە بەکار هێنراوە کە دەچێتەوە سەر frons (frontis) (L.) "تیو چاوان (هەنێ)، لای پێشەوە". وشەی بەرە و هەروەها وشە لاتینییەکە دەگەڵ↑ بەر ber2 "پێش"ی کوردمادی خزمن. [دە زمانی عەرەبیدا وشەی "جبهە" بۆ ئەم مەبەستە بە کار دەهێندرێ و دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا "هەنێ" یان "ئەنیا" بە کار دەهێندرێ کە هەر وەک وشە لاتینییەکە مانای "تیوچاوان"یش دەدەن].

بەرە **bere** [ *bara* ] - "رایەخ":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑بەرین berîn و↑بەر ber[7] [سینگ و بەر]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *uer- >** "پان، بەرین". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وەرە were هەیە بە مانای "بەڕەی زین".

2- کاک عەلی نانەوازادە ئەم وشەیەی بردۆتەوە سەر varr (Pl.) "خوری، جلک".

بەرەبەرە **berebere** [ *barabara* ] -" کەم کەم": وشەکە دەبنەڕەتدا بەمانای "کەم کەم" نەبووە بەڵکوو بەمانای "دەستەدەستەی یەک لەدوای یەک" بووە و دەبێ لە پێوەندی دەگەڵ بەرهەمی باغ و بێستان بە کار هێندرابێ و بۆ وێنە گوترابێ "سێوەکان بەرەبەرە پێ دەگەن" واتا "بەر لەدوای بەر". ئەوجار چونکوو ئەم رەوتە، رەوتێکی کوتوپڕ نییە و کات دەخایەنی، لێرەوە مانای وشەکە گۆڕدراوە بۆ "کەم کەم، پلە بە پلە".

بەرەڤانی **berevanî** [ *baravānī* ] - "1- بەرگری، دیفاع 2- ناوبژی": بەریڤانی berîvanî یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە ↑بەر(ە) + ڤانی ber(e) + vanî. "بەر" بە مانای "پێش" و "ڤانی" یش دەرگەڕێتەوە بۆ پاشگری ڤان van/ ↑وان wan بەمانای "پاراستن".

بەرەلا **berela** [ *baralā* ] - "وێل، ئازاد، گەڕۆڵ": دە بنەڕەتدا دەچێتەوە سەر کرداری بەرهەڵدان berheldan، ئەسڵی وشەکە بەرهەڵدا berhelda بووە.

بەرەنگار **berengar** [ *barangār* ] - "دەرووودا وەستاو": هەر وەک ↑بەربەرەکانی berberekanî دەچێتەوە سەر ↑بەر[2] ber "پێش". لەم وشەیەدا هەروەها پاشگری گار gar- بەکار هێنراوە [رۆژگار، شەوگار] و فۆتیمی n وەک ناوگر خزاوەتە پێش فۆتیمی g. ئەم دیاردەیە دە زمانی کوردمادیدا چەندین نموونەی لێ دەبیندرێ وەک هەنگاو، ئەنگووتن، ئەنگران و هتد.

بەرەهووت **berehut** [ *barahūt* ] - "چۆل و هۆل": برهوت barahūt (P.). وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی بەر(ە) bere + هووت hut. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑بەیار beyar و ↑بوور *bur* بە مانای "رووت، رووتەن". کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ Öde (G.)، ōdi (OG.)، īeđe (OE.)، öde (Sw.) "چۆل و

هۆل، نائاوەدان، تەریک". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -aue* ,-au*** ***(IE.)*** "دووربوونەوە لە، بەرەو پێش" و دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑حۆت ħot "تووک وەریو، سەر رووتەن". وشەی west "خۆرئاوا" دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەم ریشەوە هاتووە.

**بەرهەڵبێنە berhelbene** *[ barhalbena ]* - "پێشبەندی ژنان لەکاتی ئیش و کاردا": ↑بەر[2] + هەڵبێنە ber + helbene پارچەیەکە بەپێی بار ودۆخی کار هەڵدەرێتەوە و بۆیە پێی گوتراوە بەرهەڵبێنە.

**بەرهەم berhem** *[ barham ]* - "بەر و بۆم": خزمە دەگەڵ ↑بەر[1] ber.

**بەرهەنگ berhang** *[ berhang ]* - "تەنگەنەفسی": مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "تەنگ بوونی سینگ" بووبێ. ↑بەر[7] ber لێرەدا مانای سینگ دەبەخشێ و هەنگ یش خزمە دەگەڵ eng (G.) "تەنگ". نەخۆشی Anginapectoris واتا توند بوونی سینگ بە هۆی گیرانی رەگەکانی دڵ خزمە دەگەڵ ئەو وشانە. وشەی "بەرهەنگ" دەتوانێ لە زمانی کوردمادیدا بۆ ئەم وشە لاتینییە بەرانبەرێکی باش بێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑خنکان xınkan و ↑هانکەهانک hankehank.

**بەرەو berew** *[ baraw ]* - "بۆلای": ↑بەر[6] ber "لا، ئاڵ" [بەربە← بەروە ← بەرەو].

**بەراوەژوو beraweju** *[ barawāžī ]* - "بەراوپشت": بەراوەژی berawejî بەرەوواژی berewajî و واژی wajî یش دەگوترێن. پێک هاتووە لە بەر + ↑واژی ber + wajî [وەژوو weju].

**بەریک berîk** *[ barīk ]* - "بەرک، گیرفان": ↑بەرک berk.

**بەرین berîn** *[ barīn ]* - "پان، بەربڵاو": خزمە دەگەڵ ↑بەر[7] ber [سینگ و بەر]، سەر بە ریشەی **< -uer*** ***(IE.)*** "پان، بەرین".

**بەز bez** *[ baz ]* - "رۆن، چەوری": خزمە دەگەڵ fett (G.)، fat (E.)، vet (Nl.)، fet (Sw.) "پڕچەوری"، veizen (OG.)، fa tan (OE.)، faita (OIs.) "قەڵەو کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -pē(i)*** ***(IE.)*** "بەز هەبوون، قەڵەو بوون، ماسین، هەڵکفان".

**بەزم bezım** *[ bazım ]* - "شادی، خوش رابواردنی بە کۆمەڵ": دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 198) لەم بارەوە دوو شیمانە سەرنج رادەکێشن: 1- پێوەندی بە -bhaj (OIn.) "شاد بوون، لەززەت وەرگرتن"، 2- پێوەندی بە ریشەی *-baz* "پان و بڵاو کردنەوە، راخستن"ی سفرە و خوان).

**بەزەیی bezeyî** *[ bazayī ]* - "روحم، دلۆڤانی": خزمە دەگەڵ ↑بەخشین[2] *beşîxn* "لێبوورین" و دواتر دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑باج bac، ↑بەش beş، ↑بەخت bext و هتد. دە بنەڕەتدا مەبەست لە مرۆڤی بێبەزەیی کەسێک بووە کە بەخشینی نییە، لە هەڵە و گوناهی کەسانی دیکە نابوورێ، بەپێچەوانەی مرۆڤێک کە بەزەیی هەیە، واتا بەخشەرە.

**بەزین1 bezîn 1** *[ bazīn ]* - "بازد هاویشتن، غار دان، پەڕین": خزمە دەگەڵ ↑بزووتن bızutın. کرداری بەزین هەروەها دەگەڵ پێشگری دا -da و هەڵ -hel دێ [دابەزین dabezîn "جووڵان و بزووتن بەرەو خوار، هەڵبەزین helbezîn "بزووتن بەرەو سەر"]، مانای "هاتنەخوار" [بەتایبەتی هاتنەخواری سوار، پیادە بوون]، دە بنەڕەتدا تەنیا ئاماژەیەک بووە بە "بزوان" بەرەوە خوارەوە.

**بەزین2 bezîn 2** *[ bazīn ]* - "دۆڕان": می بازم mī-bāzam (P.) "دەدۆڕیم، دەیدۆڕێنم". بڕوانە ↑فس2 fıs [فس خواردن].

**بەژ bej** *[ baž ]* - "وشکایی، وشکانی": جگە لەم وشەیە وشەی بەژی bej یان بەژک bejık یش هەیە بە مانای "دەغڵی دێمەکار". بە سەرنج دان لەو مانایانە دەتوانین وای بۆ بچین کە وشەکە دە بنەڕەتدا مانایەکی وەک "هیشک، بێ ئاو"ی گەیاندبێ. لەم تێڕوانینەوە لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی **< -bhoso*** ***(IE.)*** "رووت". وشەی ↑بۆر (بوورە) (bure) bor "زەوی نەکێڵدراو" دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیە.
هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بەیچەڵ beyçel "نەزۆک" [دە بنەڕەتدا: هیشک، شیرنەدەر"؟].
[تێبینی: جێی بیر هێنانەوەیە کە دوو وشەی "هیشک" و *ئارا* "دەشت، زەوی" یە یەکەوە خزمن].

بەژقین **bejqîn** [ *bažqīn* ] - "ورد بوون لە ژێر باری قورس": خزمە دەگەڵ ↑بژکین bıjkîn "پرژ و بڵاو بوون".

بەژن **bejın** [ *bažın* ] - "لەش، بەدەن، هەیکەل": بشن bašn (P.). دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 204) دوو ریشە بۆ ئەم وشەیە پێشنیار کراوە: 1- پێوەندی بە -barəšnu (Av.) سەر بە ریشەی -barz "بەرزی، بڵێندی"، 2- ریشەی vaxš "هەڵدان، گەشە کردن". ریشەی یەکەم زۆرتر ڕێی تێ دەچێ، چونکوو پێوەندی دوو چەمکی بەژن و بڵێندی دە وشەکانی "بەژن و باڵا" و "قەد و باڵا"دا بە ڕوونی دەردەکەوێ. لەباری ماناوە ئەم وشەیە هەڵ سەنگینە دەگەڵ "قەد"]. "بەژن" هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بەدەن beden.

بەس **bes** [ *bas* ] - "کافی، زۆر": بس bas (P.) "بەس"، هەروەها بسیار besyār (P.) "زۆر، گەلێک". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە کە بە گشتی ئەم مانایانە دەدەن: زۆر بوون، لە زۆری دان، گەورە بوونەوە، هەڵمسان". یەکێک لەم وشانە ↑بەش[1] beşە [بەشم دەکا واتا بەسە بۆم، زۆرە بۆم]. دە فارسیدا دا بیش bîş (P.) مانای "زۆر" دەدا. بنەوشەی بەس / بەش بە شێوەی جوربەجۆر و بە هێندێک گۆڕانەوە لەم وشانەی خوارەوە دا دەردەکەوێ: ↑بۆش boş "زۆر" [لەشکرێکی بۆش]، هەروەها بە مانای "کراوە، هەراو، هەڵۆڵ"، ↑فشین fışîn [لە خۆ فشین واتا خۆ زل کردنەوە، با دە خۆ کردن]، ↑فیز fîz "خۆ بەزل زانی، بادیهەوایی"، ↑پزان pızan [هەڵپزان]، ↑بێشە bêşe "جەنگەلی چڕ و پڕ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *bhu- (IE.)* "ماسین، با کردن". دە پلەیەکی دیکە دا ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بۆق boq [دەبنەڕەتدا واتا هەڵمساو]، ↑بۆقژە boqje، ↑بۆقل boqıl "گۆشتی بەلەک" و هتد.

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 200) وشەی "بس" بردراوەتەوە سەر ریشەی -vas "ئارەزوو، مەیل، ویست". ئەم بۆچوونە لەوە ناچێ راست بێ].

بەستن **bestın** [ *bastın* ] - "گرێ دان، داخستن": دە زمانی ئەڵمانیدا بە توێژی ناوەوەی توێکڵی گژ و گیا کە وەک بەن بۆ گرێ دان و بەستن کەڵکی لێوەرگیراوە، دەگوترێ Bast (G.)، بەم کرداری بەستنەش گوتراوە besten (G.). هەروەها دە زمانی ئەڵمانی ئەمڕۆ دا basteln (G.) هەیە بە مانای "تێکخستن و لێکبەستن"ی چەند شتێک وەک کارێکی دەستی و دروست کردنی شتێک. ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ وشەکانی سەرتر و ریشەی ئەم وشە ئەڵمانییانەش ساخ نەکراوەتەوە. وشە کوردمادییەکە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە زمانی فارسیدا بنەوشەی "بست" بۆ کرداری رابردوو بەکار دێ [بستم bastam (P.) "بەستم"] و بۆ کرداری ئێستا بنەوشەی "بند" بەکار دێ [می بندم mībandam (P.) "دەبەستم". شیاوی باسە ئەم دوو رەگی کردارە هەر یەکەی سەر بە ریشەیەکی جیاوازە].

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 201) ئەم وشەیە بردراوەتەوە سەر ریشەی < *bhe(n)dh- (IE.)* "بەستن، گرێ دان، قایم کردن". بەڵام ئەمە ریشەیەکە کە "بەن، بەند" لێیەوە هاتووە، نەک "بەستن"].

بەستە **beste** [ *basta* ] - "گۆرانی": دە زمانی کوردمادیدا زۆرجار لە جێاتی گۆرانی وشەی بەند bend یش دەگوترێ [دا توخودا بەندێکی تێ هەڵکە]. ئەمە لەوەڕا هاتووە کە گۆرانییەکان لە چەند بەندێک واتا چەند بەشێکی لێکبەستراو و گرێدراو پێک هاتوون. ئیتر لێرەوە "بەند" خۆی مانای گۆرانی وەرگرتووە. دە هێندێک شێوەزاردا وشەی "بەستە" لەجیاتی بەند جێی خۆی کردۆتەوە. [بڕوانە ↑بەستن]. وشەی ↑هەڵبەست helbest یش لەم پێوەندییەدا جێ دەگرێ.

[تێبینی: سەبارەت بە مانای "بەند، بەستە" وەک گۆرانی هەروەها دەتوانین دەگەڵ وشەکانی "قام" و "چامە"ش هەڵی سەنگینین. ئەم وشانەی دوایی خزمن دەگەڵ *سیم* "تاڵ" و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هۆندنەوە، گرێ دان، تێک خستنەوە، دروون"].

**بەستیر bestîr** [ bastīr ] - "جۆرێک مافوورە": خزمە دەگەڵ ↑بەستین besten.

**بەستین besten** [ basten ] - "هەردی بنەوەی چۆم و ئاوان": بستر bester ‏(P.) هەم بەمانای "بەستین" و هەم بە مانای "جێگەی خەو، شوێنی لەسەر راکشان"، wistar ‏(MP.). ئەم وشانە خزمن دەگەڵ upastərəna- ‏(Av.) و upastárana- ‏(OIn.) "فەرش، رایەخ، پۆشش"، سەر بە ریشەی *star-* "پان و بڵاو کردنەوە". دە زمانە ئێرانییەکاندا چەندین وشە هەن بە مانای "فەرش و رایەخ" یان "شوێنی لەسەر دانیشتن و نووستن" کە دەگەڵ ئەو وشانە خزمن. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 200].
کاک عەلی نانەوازادە وشەی بەست [بەستین]ی بردۆتەوە سەر vistarak ‏(Av.) و vistarg ‏(Pl.) بە مانای "نوێن، جێخەو، جل، رایەخ " [بڕوانە "فەرهەنگی هەرمان"، ل. 420]. ئەم وشانەی دوایی دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا بوونە ↑بەستیر bestîr "جۆرێک مافوورە". هەروها وشەی فارسی گستردن gostardan ‏(P.) "بڵاو کردنەوە، راخستن" دەبێ پێشتر *vistardan** بووبێ و پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

[تێبینی: یەکێک لە گۆرانکارییە فۆنۆلۆژییەکانی زمانی فارسی گۆرانی فۆتیمی v ی فارسی کۆن و ناوین بە g دە فارسی نوێدایە. دە زمانی کوردمادیدا فۆتیمە کۆنەکە زۆرتر پارێزراوە، وەک وەژاردن vejardın ‏(هەڵوەژاردن) و بژاردن bıjardın ‏(هەڵبژاردن) و گزیدن gozīdan ‏(برگزیدن) دە فارسیدا، ورسی vırsî [برسی bırsî] دە کوردمادیدا و گرسنە goresne دە فارسیدا یان "فش" دە کوردمادیدا و "گشاد" دە فارسیدا].

**بەسرپێرێ besırpere** [ basırpere ] - "رۆژێک بەر لە پێرێ، سێ رۆژ پێش ئێستا": بەسر + ↑پێرێ pere + besır. "بەسر" دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پاش paş [پس pas ‏(P.)] و دە بنەڕەتدا مەبەست "پاشتر" لە پێرێ بێ.

**بەش1 beş** [ baš ] - "بەس، تێر": [ئەوەندە بەشم ناکا]، ئەم وشەیە جیاوازە لە "بەش" بەمانای "پاژ، لەت"، وشەیەکی سەربەخۆیە و خزمە دەگەڵ ↑بەس bes. "ئەوەندە بەشم ناکا" واتا ئەوەندە بەس نییە بۆم.

**بەش2 beş** [ baš ] - "پاژ، لەت": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *bhag- (IE.)** "بەش کردن، بەش وەرگرتن". چەندین وشە دە زمانی کوردیدا دەگەڵ ئەم وشەیە خزمن، وەک ↑باج bac، ↑بەخت bext، ↑بەخشین bexşîn و هتد. هەروەها Backe ‏(G.) "گوپ، گونا"، phageīn ‏(Gr.) "خواردن" و فک fak ‏(P.) و ↑پووک puk"شەویلکە" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. مانای "خواردن" لە وشەکانی سەرەوەدا دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە "بەش وەرگرتن".

**بەش3 beş** [ baš ] - "ئاژەڵی تیوچاوان سپی": شێوەیەکی دیکە لە ↑ بازگ bazg و ↑ واش waş.

**بەشکوو beşku** [ baškū ] - "رەنگە، لەوانەیە": شێوە کۆنترەکە ↑بەشکم beşkım ە، کە لەپاڵ شێوە تازەکەدا بەکار دێ. پێک هاتووە لە بە + شک + م be + şık + ım، دەبنەڕەتدا واتا "بە شکی من، بە گومانی من". دەچێتە سەر وشەی **شك** *šakk (Arb.)* "گومان". وشە عەرەبییەکە وێ دەچێ وەرگیرابێ لە scire ‏(L.) "ناسین، زانین، تێگەیشتن" یان sképsis ‏(Gr.) "لێڕوانین، تێفکرین، گومان کردن".

**بەشین beşîn** [ bašīn ] - "(دا)بەش کردن": بڕوانە ↑بەش2 beş "پاژ، لەت".

**بەغمە beġme** [ baġma ] - "ملەخڕە، دووشاخە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بۆقژە boqje، سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەڵمسان".

**بەفر befr** [ bafr ] - "ئاوی بەستوو کە دەبارێتە سەر ئەرز": برف barf ‏(P.)، wafr ‏(MP.)، vafra- ‏(Av.) "بەفر"، سەر بە ریشەی vap- "پرژان، رژان"، سەر بە ریشەی **< *uep- (IE.)** "رژان، پرژان". [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 191].

**بەفش befş** [ bafş ] - "1- فلچەی مافوورە ماڵین 2- شەی جۆڵایی": بەوش bewş یش دەگوترێ. وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑بافت baft.

[تێبینی: دەزمانی عەرەبیدا "بقا "بەمانای "مانەوە" هەیە، بەڵام لەوە ناچێ وشە کوردمادییەکە لەمە وەرگیرابێ، چونکوو ئەم مانایە زۆرجیاوازە دەگەڵ ئەو مانایانەی کە وشە کوردمادییەکە هەیەتی].

**بەقتین beqtîn** [ *baqtīn* ] - "تەقین": شێوەیەکی دیکە لە ↑پۆقین poqîn.

**بەگ beg** [ *bag* ] - "خان، ئاغا": دە "فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 431) ئەم وشەیە بردراوەتەوە سەر *beg* (*Tur.*). لە لایەکی دیکەوە وشەی big (E.) "گەورە، بەهێز" لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ. ئەم وشە ئینگلیزییە بە پێی بۆچووتێك دەبردرێتەوە سەر زمانە سکاندیناوییەکان.

**بەل1 bel** [ *bal* ] - "بزنی گوێ لوول": خزمە دەگەڵ ↑وێل wel و ↑پێل pel و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *wel-* (*IE.*)** "سووڕان".

**بەل2 bel** [ *bal* ] - "1-دەرپەڕیو، بڵیندتر لە دەوروبەری 2- درێژ (مل بەل)": خزمە دەگەڵ ↑باڵا bala.

**بەل³ bel** [ *bal* ] - "هەڵواسراو، شۆڕ": خزمە دەگەڵ ↑فل fıl [شل و فل]، دە فارسیدا دەگوترێ "شل و ول" wel (P.). ئەم وشانە دە بنەڕەتدا خزمن دەگەڵ↑ بڵاو bılaw و سەر بە ریشەیەك بە مانای " لەبەر یەك کیشرانەوە". شیاوی بیر خستنەوەیە کە وشەی "شۆڕ"یش خزمە دەگەڵ "شل" و لێرەوە پێوەندی وشەکانی سەرەوە دەگەڵ یەکتر باشتر دەردەکەوێ.

**بەلا bela** [ *balā* ] - "رووداوی زۆر ناخۆش": خزمە دەگەڵ Plage (G.) "رەنج، ئازار، بەدبەختی"، plāga (OG.) "بەدبەختی، بەڵای ئاسمانی، سزای خودا، زجرو ئازار". زمانی ئەڵمانی ئەم وشەیەی لە plag (L.) "زەبر، لێدان، زەبری ئاسمان" وەرگرتووە و ئەویش دەچێتەوە سەر plāgā (Gr.) "لێدان، زەبر، برینداری". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑پلۆسین plosîn "لێدانی توند".

**بەلاش belas** [ *balāš* ] - "مفت، خۆڕایی": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ billig (G.) "هەرزان بایی"، billih (OG.) "لەبار، گونجاو". دیارە سەرەتا مەبەست لەبار بوونی نرخ و قیمەت بووە. مانای وشە ژێرمەنییەکە لە "لەبار"ەوە گۆڕدراوە بۆ "هەرزان" و دەچێتەوە سەر ریشەی **< *bil-* (*IE.*)** "وێنە، شێوە".

**بەلال belal** [ *balāl* ] - "سەرداری برژاو": بلال balāl (P.) < *palāl-* (*In.*) "کا" < *pálāla-* (OIn.) "لاسك، کاە" [بروانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 207]. وشە هیندییەکان هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑پاڵ³ pal [پەین و پاڵ].

**بەلالووك belaluk** [ *balālūk* ] - "ئالووباڵو": پێك هاتوو لە بەڵ + ئالوو + ك bel + alu + k، کەرتەکانی ئەم وشەیە لە وشەی ↑ئالووباڵو alubalu شدا هەن. لەوشەی "بەڵالووك"دا پاشگری گچکەندنی ıkهاتووەتە سەروشەکە و دووکەرتی ئاڵ alu و باڵ bal [یان بەل bel] پاش و پێش بوون.

**بەلان belan** [ *balān* ] - "تەژەی ناحەز": خزمە دەگەڵ ↑بڵیند bılînd و دە بنەڕەتدا مەبەست مرۆڤی زل و بڵیند بووە.

**بەلبەشۆ belbeşo** [ *balbašo* ] - "تێکەوڵێکە، کەسبەکەس، ئاڵۆز": بلبشو belbešū (P.). وێ دەچی خزم بێ دەگەڵ ↑پێل pel "مەوج، شەپۆل" و ئەو وشانەی دەچنەوە سەر ریشەی **< *uel-* ، *wel-* (*IE.*)** "سووڕان، خولان، با دران". لەم تێڕوانینەوە "بەلبەشۆ" دۆخێك دەگەیەنێ کە ئارامی و ئۆقرەیی نامێنێ و سووڕاتێکی تێکەڵ پێکەڵ دێتەئاراوە.

**بەلخ belıx** [ *balıx* ] - "1- کەڕوو 2- بلخ": وەك لە ژێر وشەی ↑بلخ bılx دا هاتووە، ئەم وشەیە دەشێ لە ریشەیەکەوە پەیدا بووبێ بە مانای "درەوشانەوە".

[تێبینی: شیاوی باسە کە دە زمانی ئەڵمانیشدا Schimmel (G.) "کەڕوو، برش" دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "درەوشانەوە". هەروەها هەلیسەنگینە دەگەڵ↑برش bırış "کەڕوو"].

**بەڵشین belşîn** [ *balšīn* ] - "تێکەوەگلان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑وڵین wılîn "گلۆفین، گوشین".

**بەلك belk** [ *balk* ] - "نەرمەی گوێ": خزمە دەگەڵ ↑بەل³ bel "هەڵواسراو، شۆڕ".

بەڵگە **belge** *[ balga ]* - "سەنەد، مەدرەک، دەلیل": برگە berge (.P) "سەنەد، کارت، کاغەزێک کە وەک بەڵگە و نیشانە وایە". دە فارسیدا خزمە دەگەڵ برگ berg (.P)، warg (.MP)، -varəka (.Av) "گەلا"، دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەلک pelık "گەڵا، هەرشتێکی وەک گەڵا پان و تەنک". مانای بنەڕەتی وشەکە "گەڵا" بووە و پاشان مانای "پەڕی کاغەز"ی لێ پەیدا بووە و دواجاریش مانای "سەنەد و مەدرەک"ی وەرگرتووە، لەبەر ئەوەی سەنەد و مەدرەک لەسەر کاغەزێک نووسراون و پارێزراون. وشە ئێرانییەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە ورقە waraqa (.Arb).

بەلۆ **belo** *[ balo ]* - "لەقەبی گورگ": ئەم وشەیە دەبێ شێوەیەکی کۆنتر بێ هەر لە وشەی ↑گورگ gurg.

بەلۆکە **beloke** *[ baloka ]* - "میتکە، قیتکە": ↑بەل² bel "قیت، دەرپەڕیو".

بەلەباریک **belebarîk** *[ balabārīk ]* - دە بنەڕەتدا دەبێ بالاباریک balabarîk بووبێ. [بڕوانە ↑باڵا bala و ↑باریک barîk].

بەڵەد **beled** *[ balad ]* - "شارەزا، بە ئەزموون": بلد balad (.P). خزمە دەگەڵ "وارتن" [↑ئاوارتن awartın [a-wartın، هەڵاوارتن یان هەڵاواردن] سەر بە ریشەی **< -uel-, *wel*** *(IE.)* "هەڵبژاردن". "بەڵەد" دە بنەڕەتدا کەسێکە کە بە پێی ئەزموون و شارەزایی دەتوانێ (ڕێگە) هەڵبژێرێ یان بەگشتی بڕیاردەر بێ.

[سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "شارەزا، بەڵەد" و "هەڵبژاردن" بڕوانە وشەی ↑گەزەک2 gezek "شارەزا، بەڵەد"].

بەلەفیرە **belefîre** *[ balafīra ]* - "سک چوونی پەیتاپەیتا": کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە↑ پەلە pele "لەز". بۆ کەرتی دووەمی وشەکە بڕوانە ↑فیڕاندن fîrandın.

بەلەک **belek** *[ balak ]* - "نەرمە گۆشتی خوارەوەی لاق": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی کە لە ژێر ↑بۆل bol "دەنکی ترێ" باس کراون و سەر بە ریشەیەکن بە مانای "هەڵمسان". ئەم بەشە گۆشتە لەبەر خڕ و پڕ بوون و هەڵمساو بوونی ئاوا ناو نراوە.

بەڵەک **belek** *[ balak ]* - "دوورەنگ، ڕەش و سپی یان سوور و سپی": خزمە دەگەڵ blass (.G) "سپی هەڵگەراو، ڕەنگ پەڕیو"، blas ros (.OG) "ئەسپی بەڵەک"، Blesse (.G) "پەڵەی سپی ئاژەڵی ماڵی"، blac (.ME) "سپی هەڵگەڕاو"، سەر بە ریشەی **< -bhel*** *(IE.)* "بریقانەوە، درەوشانەوە". وشەکە دەزمانی کوردمادیشدا دەبێ سەرەتا بە "ڕەنگی سپی، پەڵەی سپی" گوترابێ کە لەسەر پێستی ئاژەڵ وهێندێک جاریش مرۆڤ پەیدا دەبێ و وای لێ دەکا پێستەکە ببێتە دوورەنگ.

بەلەم **belem** *[ balam ]* - "گەمێ": بلم balam (.P). خڕمە دەگەڵ ↑پەل pel "ناقووڵ" [بەلەم جۆرە گەمێیەکی پەلە و ناوەکەشی لەوەڕا هاتووە].

بەلەنگاز **belengaz** *[ balangāz ]* - "هەژار، بێچارە": دەشێ وشەکە بەم شێوەیە پێک هاتبێ: بەل + ئەنگ + ئاز [پاشگری بە ئاوەڵناو کردن] bel + eng + az. کەرتی بەل -bel دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑پەل pel "دەست" یان شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑باڵ bal [دەست و باڵ]. کەرتی "ئەنگ "eng خزمە دەگەڵ eng (.G) "تەنگ" و ↑هانک hank و ↑خنکان *xınkan* سەر بە ریشەی **< -anĝh*** *(IE.)* " تەنگ، تەنگاندن، ڕێکگوشین". کەرتی سێهەم واتا "ئاز" پاشگری بە ئاوەڵناو کردنە. بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم پاشگرە بڕوانە ↑-ئۆز oz-. بەم پێیە مانای وشەی بەلەنگاز دەبێتە "دەست تەنگ".

بەلیاندن **belyandın** *[ balyāndın ]* - "ڕازی کردن، قانع کردن": دەچێتەوە سەر ↑بەڵێ bele "ئەرێ"، لەم تێڕوانینەوە مەبەستەکە دەبێتە ئەوە کە لایەنی بەرانبەر بهێندرێتە سەر بەڵێ گوتن واتا ڕازی بکرێ.

بەڵێ **bele** *[ bale ]* - "ئا، باشە": بلە bale (.P). خزمە دەگەڵ woll (.G)، wola (.OG)، wal (.OF)، wel (.OE)، well (.E)، wel (.Nl)، väl (.Sw) "باش، باشە". وشە ژێرمانییەکان خزمن دەگەڵ کردارێکی

ژێرمەنی بە مانای "ویستن، خواستن": wollen (G.)، will (E.) و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *wel- (IE.) "ویستن". بەم پێیە مانای وشەی بەڵێ دە بنەڕەتدا "بە پێی ویست و ئارەزوو" بووە و دواتر بووەتە "باش، باشە". سەرەتا کاتێک گوتراوە "بەڵێ باشە"، مەبەست ئەوە بووە کە "باشە، بە گوێرەی ویست (ی ئێوە)، هەر چۆنێک ئێوە بخوازن"، دە زمانی ئەلمانیشدا دەگوترێ ja woll (G.) "ئا بەڵێ، ئا باشە".

**بەڵێن belen** [ *balen* ] - "قەوڵ، وادە": لە وشەی ↑بەڵێ bele وەرگیراوە، دە بنەڕەتدا مەبەست بەڵێ گوتن بووە سەبارەت بە داوایەک.

**بەم bem** [ *bam* ] - "دەنگی بەرز" [زیل و بەم]. بم bem (P.). خزمە دەگەڵ بام bam (P.) "بان، سەربان". کەواتە دەنگی بەم دەنگیکە لە بانەوەیە، بەرزە. [بڕوانە ↑بان ban].

**بەن[1] ben** [ *ban* ] - "ریس، دەزوو": خزمە دەگەڵ بند band (P.) "بەن، بەند" و می بندم mībanam (P.) "دەبەستم"، binden (G.)، bind (E.)، bintan (OG.)، bindan (Gt.) "بەستن"، سەر بە ریشەی < *bhendh- (IE.) "بەستن". "بەن" بویە ئەو ناوەی لەسەر داندراوە، چونکوو شتی پێ بەستراوە. دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا وشەی band مانای "بەن، بەند" دەبەخشێ.

**بەن[2] ben** [ *ban* ] - "ناوی دارێکە": [دارە بەن]، جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ بن bon (P.) "پنچک"، wan (MP.) "دار، پنچک"، -van و-vanā (Av.) "دار"، ván (OIn.) "دار، جەنگەڵ، چێو" و هتد. سەبارەت بە پێوەندی وشە فارسییەکە دەگەڵ ئەو چەند وشەی سەرەوە بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 209.

**بەند bend** [ *band* ] - "1- بەن 2- زیندان 3- گیرو گرفت 4- بەرگیرەی ئاو 5- جومگەی قامک 6- پارچەیەک لە گۆرانی": بە هەموو ماناکانییەوە پێوەندی هەیە بە ↑بەن[1] ben بە مانای "پەت، دەزوو، ریس" و دە راستیدا شێوەیەکی کۆنترە لەم وشەیە. تەواوی ئەو مانا جۆربەجۆرانەی کە وشەی بەند هەیەتی، پێوەندییان بە چەمکی "بەستن و بەستنەوە" هەیە، بۆ وێنە جومگەی قامک بۆیە پێی گوتراوە بەند، چونکوو شوێنی لێکبەسترانی ئێسکەکانی قامکە. ئەوجار هەر وەک چۆن قامک لە چەند بەند پێک هاتووە، گۆرانییەکیش دابەش کراوە بەسەر چەند بەنددا، واتا چەند بەشی لێک گرێدراو.

**بەندۆڵ bendol** [ *bandol* ] - "زەنبەلەک": پاندۆڵ pandol یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر pendulus (L.) "هەڵواسراو" و لەوێشەوە بۆ pendere (L.) "هەڵواسراو بوون، لەرینەوە لە هەوادا". ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ pendere (L.) "هەڵواسین، وەزن کردن". وشەکە هاتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکانیشەوە، بۆ وێنە pendel (G.). دە شێوەزاری باکووردا وشەی ↑باندۆر bandor بە مانای "گوشار، کارتێکەری" بەکار دەهێنرێ، لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "قورسایی" بووبێ.

**بەندە bende** [ *banda* ] - "1- بەردە، کۆیلە 2- وشەی خۆ ناساندن دە بەرانبەر لایەنی مەزندا": بندە bende (P.). خزمە دەگەڵ↑ بەند bend. بەندە مرۆڤێکی ئازاد نەبووە، بە وتەیەکی دیکە مرۆڤێکی بەستراوە و ماڵی خاوەنەکەی بووە و بۆیە ئەوها ناودێر کراوە.

**بەندەر bender** [ *bandar* ] - "1- شاری قەراخ دەریا 2- شوێنی راگرتنی کەشتی": پێوەستە بە ریشەی -band [بڕوانە ↑بەند bend]. مەبەست شوێنێکە دەوری بە دەریا گیراوە، دوری بەستراوە.

**بەندەن benden** [ *bandan* ] - "شاخ و کێو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Tann (G.)، denn (E.) "جەنگەڵ"، dhenvan (OIn.) "بیابان" و dhanu (OIn.) "دوورگە". ئەم وشانە بەگشتی بۆشوێنی دوورەدەست و دەرەوەی ئاوایی بەکارهێندراون. لەوانەیە وشە کوردمادییەکە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لە دوو کەرتی بان + دەن *ban + den* پێک هاتبێ کە لەم حاڵەتەدا ماناکەی دەکاتە شتێکی وەک "سەرچیا".

**بەنگ beng** *[ bang ]* - "ماددەیەکی سڕکەر": بنگ bang (P.). خزمە دەگەڵ -bangha (Av.) "ناوی گیایەك بووە ماددەیەکی سڕکەریان لێ گرتووە". ریشەکەی ساخ نەکراوەتەوە. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" ل. 212].

**بەه beh** *[ bah ]* - "وشەی ئافەرین و پێهەڵگوتن": بەه bah (P.) "بەه" و بهتر behtar (P.) "باشتر". خزمە دەگەڵ -vouh (Av.)، -vásu (OIn.) "باش، چاك"، سەر بە ریشەی < **(IE.) *uesu-** "باش". دە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا بۆ ئەم دۆخە wow (G.) و (E.) دەگوترێ. ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە باس نەکراوە.

**بەها beha** *[ bahā ]* - "نرخ، وەرچ": وەها weha ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑بایی bayî.

**بەهار behar** *[ bahār ]* - "وەرزی سەرەتای ساڵ": بوهار buhar و وەسار wesar یش دەگوترێ. بهار bahār (P.)، wahār (MP.). خزمە دەگەڵ -vaŋhar (Av.)، vasantá (OIn.) "بەهار" و vasará (Lit.) "هاوین"، سەر بە ریشەی < **(IE.) *ues-r-** "بەهار" و دواتر سەر بە ریشەی < **(IE.) *aues-** "هایسان، درەوشانەوە". بەم پێیە بەهار واتا وەرزی هەتاو و گەرما. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 221].

**بەهتین behtîn** *[ bahtīn ]* - "توانەوە، حەلین": لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑پێژان pejan "کوڵاندن، لێنان". وشەکە بە تایبەتی هەڵ سەنگینە دەگەڵ bähen (G.) "پیشاندن" و baden (G.) "گرماو کردن". ئەم وشانەش خزمن دەگەڵ "پێژان" و "پیشان".

**بەهرە behre** *[ bahra ]* - "1- داهات، قازانج 2- نیعمەت": بهره bahre (P.) و bahrag (MP.) "بەش، قازانج". بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 222) دە ریشەدا خزمە دەگەڵ ↑بەش beş و↑ بەخت bext و -baxəδra (Av.) "بەش" و -bhadrá (OIn.) "خۆشبەخت، بەختەوەر".

**بەهلنگی behlıngî** *[ bahlıngī ]* - "باڵنج": شێوەیەکی دیکە لە ↑باڵنج balınc.

**بەهەشت beheşt** *[ bahašt ]* - "فیردەوس": بهشت bahešt (P.). خزمە دەگەڵ wahišt (MP.) "باشترین، بەهەشت"، -vahišta (Av.) "باشترین"، -vásistha (OIn.) "باشترین". بەم جۆرە مەبەست لە بەهەشت "باشترین ژیان" بووە. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 222 ]. بەم جۆرە دەبێتە خزم دەگەڵ↑ بەه beh "وشەی ئافەرین و پێهەڵگوتن".

**بەیات beyat** *[ bayāt ]* - "خۆراکێ شەو مابێتەوە، ناتیك کە ماوەتەوە و چیڕ بووە": پاتە pate ش دەگوترێ. بیات beyāt (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پەیت peyt "رەق". زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی لە زمانی کوردمادی وەرگرتووە.

**بەیار beyar** *[ bayār ]* - "زەمینی نەکێڵدراو": ↑بوور bur یش دەگوترێ.

**بەیان beyan** *[ bayān ]* - "سەرەتای رۆژ، سپێدە، سۆزی": خزمە دەگەڵ ↑بان ban [تاو وبان] لە ریشەیەکەوە دێ بەمانای "رووناکی".

**بەیت beyt** *[ bayt ]* - "چیرۆکی هۆنراوە کە بە گۆرانی دەیڵێن":

1- وەك دەزانین "پەخشان" بە جۆرێك لە نووسین یان وێژە دەگوترێ کە "پەخش و بڵاو"ە، واتا وەك هونراوە چڕ و پڕ و تیکچرژاو نییە. بە پێچەوانەوە، "هونراوە" نووسین یان وێژەیەکە کە خەست و پەیت کراوەتەوە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییە دەشێ "بەیت" دە بنەڕەتدا بە مانای "هۆنراوە" هاتبێ و دەگەڵ ↑پەیت peyt "توند، سفت، بەهێز" یەك ریشەی هەبێ. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ پیت *pît* "بەرهەم، رێژەو" [دەبنەڕەتدا: هێز و برشت] و ↑پتەو pıtew. [دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی dicht (G.) مانای "چڕ و پڕ" دەدا و Gedicht (G.) دەبێتە "هۆنراوە"].

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە (Gr.) poesis "هۆنراوە" سەر بە کرداری (Gr.) poein "کردن، داهێنان، بەدی هێنان". کاک عەلی نانەوازادە دەڵێ کە ئەم وشەیە لە -Av.) pad) "شێعر" کەوتۆتەوە و وشەی (Gr.) poetes " هۆنەر، داهێنەر" بە وشە ئەوێستاییەکەوە گرێ دەدا ("فەرهەنگی هەرمان"، ل. 454).

**بەیتاڵ** beytal [ *baytāl* ] - "پزیشکی ئاژەڵ": وەیتاڵ weytal یش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *(IE.) *ueid- , *weid-* "دیتن، زانین، تێگەیشتن، دوزینەوە". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، دەبێتە خزم لەگەڵ ↑ئاوەز awez [a-wez]. هەروەها هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑پیتۆڵ pîtol "زانا" و ↑ویتویتک wîtwîtık "پەڕتووکێکی پیرۆزی ئێزیدییەکان (ئەزادییەکان).

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی (L.) medicus "پزیشک" دە بنەڕەتدا مانای "هەڵ سەنگینەر، بە مشوور، ژیر" دەبەخشێ].

**بەیچەڵ** beyçel [ *bayčal* ] - "نەزۆک": دەشێ پێک هاتبێ لە بەیچ + ەل beyç + el . کەرتی بەیچ- دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە↑ بەژ baj "وشکانی" [دەبنەڕەتدا وشک]. مەبەست لە بەیچەڵ دەبێ هیشک بوون بە مانای "شیرلێ نەهاتن" بێ.

[تێبینی: پێوەندی "نەزۆکی" و "هیشکی" لە وشەی قسر qısır یشدا بەرچاو دەکەوێ کە ئەویش دە بنەڕەتدا مانای "هیشک" دەگەیەنێ.

**بی** bî [ *bī* ] - "ناوی دارێکە، دارەبی": بید (P.) bîd، (OG.) wīda، (G.) weide، (E.) withy، (Sw.) vide، (L.) vitis، (Rus.) vitvina سەر بە ریشەی < *(IE.) *uei-, *wei-* "با دان، چەمانەوە، هۆنین". لە بەر ئەوەی لک و پۆی ئەم دارە، شلک و ناسکە و بە هاسانی دەچەمێندرێتەوە و بۆ چنینی سەوەتە و قەرتاڵە و تەنینی پەرژین و هتد کەڵکی لێ وەرگیراوە، بەم جۆرە ناودێر کراوە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑با ba دان و ↑هۆنین honîn و چەندین وشەی دیکە.

**بیابان** bîyaban [ *bīyābān* ] - "سەحرا": بیابان (P.) bīyābān، (MP.) wiyābān. بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 224) وشەکە پێک هاتووە لە پێشگری -vi "وێران کردن، خراب کردن" و ریشەی < -*vap* [ < *(IE.) *uep-* "رشتن، رووخاندن، پرژاندن"] و بەراورد کراوە دەگەڵ -vī-vāpa (Av.) "وێرانی".

**بیانوو** bîyanu [ *bīyanū* ] - "عوزر": بهانه (P.) bahāne. بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل.222) دەچێتەوە سەر ریشەی -vah "داپۆشین، لێهاڵان" و خزمە دەگەڵ-vasana (OIn.) "جل و بەرگ". لەباری ماناوە وشەکە بەراورد کراوە دەگەڵ (G.) Gewand "جل و بەرگ" و (G.) Vorwand "بیانوو".

**بیانی** bîyanî [ *bīyānī* ] - "بێگانە": شێوەیەکی دیکە لە↑ بێگانە begane. [فۆنیمی g گۆڕدراوە بە y].

**بیبار** bîbar [ *bībār* ] - "فلفل": Pfeffer (G.)، piper (L.)، pepper (E.)، peperi (Gr.)، وشەکە ریشەی هیندی هەیە و بەو زمانە pippali (OIn.) بووە و دواتر لە ڕێگای یۆنانییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان. زمانی عەرەبیش وشەکەی وەرگرتووە و کردوویە بە "فلفل". دە زمانی فارسیدا شێوەی کۆنی وشەکە نەماوە و وشە عەرەبییەکە بەکار دەهێندرێ.

**بیبل** bîbıl [ *bībıl* ] - دەگەڵ تیتل دێ [تیتل و بیبل tîtıl û bîbıl ناوی دوو کاریلەن دە چیرۆکێکی کوردمادی زارۆکاندا کە بەناوبانگترین چیرۆکی زارۆکانە]. بیب + ل bîb + ıl. کەرتی "بیب" یان "بیبە" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بەبە bebe "زارۆکی چکۆڵە". مانای وشەکە دەبێتە "بەبەلە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بیبی bîbî "بووکەڵەی زارۆکان"

**بیبی** bîbî [ *bībī* ] - "بووکەڵەی منداڵ": بڕوانە↑ بیبیلە bîbîle.

**بیبیلە** bîbîle [ *bībīla* ] - "1- رەشێنەی چاو 2- منداڵی ساوا لە زمانی زاروکدا ": خزمە دەگەڵ pupilla (L.) "بیبیلەی چاو، کچۆلە". وشە لاتینییەکە بەمانای "بووکۆڵە" [لەیستۆکی زارۆکان] یش بەکارهاتووە. بۆیە بە رەشێنە چاو گوتراوە pupilla، چونکوو مرۆڤ دە رەشێنەی چاوی کەسێکی بەرانبەریدا، خۆی

وەك "بووكۆڵە" دەبینێ، واتا وێنەی چكۆڵە كراوی خۆی دەبینێ. لەوانەیە وشە كوردییەكە وشەیەكی وەرگیراو بێ و لەوانەشە بە شێوەیەكی سەربەخۆ لە وشەی بەبە bebe یان بیبی bîbî "زارۆكی چكۆڵە" وەرگیرابێ، واتا هەروەك زمانی لاتینی و یۆنانی، بردرابێتەوە سەر چەمكی زارۆك. شیاوی سەرنجە كە ↑بەبە bebe ی كوردمادی خزمە دەگەڵ pupa (.L) "كچۆڵە".

**بیچ bîç** [ *bčī* ] - "بیژوو": شێوەیەكی دیكە لە ↑بیژوو bîju.

**بیچم bîçım** [ *bīčım* ] - "ڕوو، چارە، قیافە": دە زمانی كوردمادیدا هەروەها ↑بەچك beçk بە مانای "بیچم" بەكار دێ و لەوانەیە شێوەیەكی دیكەی وشەكە بێ. بە بۆچوونی كاك عەلی نانەوازادە "بیچم" لە *biçim (.Tur)* وەرگیراوە. ["فەرهەنگی هەرمان"، ل. 460]. لە لایەكی دیكەوە وشەی بیچم نیزیكایەتییەك نیشان دەدا دەگەڵ vis (.L) "دەموچاو، ڕوو" و دەگەڵ ↑پێش pêş ی كوردمادی [پیش pîş و پیشانی pîşanîدە فارسیدا].

**بیر1 bîr 1** [ *bīr* ] - "هزر، فكر": دە زمانی كوردمادیدا شێوەكانی ویرwîr و هویر huwîr یش هەن. هەروەها هویل huwîl هەیە بەمانای "ئاگا" [ئاگادار بوون لە شتێك]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***wer-*** ***(IE.) *uer-,*** "دەورگرتن و پاراستنی شوێنێك بە دارو دیوار". وشەی ↑وار war "ماڵ، جێی ژیان" دە كوردمادیدا لەم ریشەیەوە هاتووە و مەبەست "شوێنی پارێزراو" یان "شوێنی پارێزەر" بووە. لەم ریشەیەوە كە دەبنەڕەتدا بە مانای "دەور گرتن، بەربەست كردن، دیوار كێشان" بووە، دواتر مانایەكی گشتی "پاراستن" پەیدا بووە. دە زمانە ژێرمەنییەكاندا هێندێك وشە ئەم مانایە دەردەبڕن، وەك wehren (.G) "پارێزگاری كردن، داكۆكی كردن"، Wehr (.G) "قایمكاری، خۆدابەستن، پارێزگاری"، Gewehr (.G) "چەك، تفەنگ" و هتد. هەر لە سەردەمە كۆنەكانەوە چەمكی "پاراستن" پێوەندی هەبووە بە چەمكی "ئاگا و ئاگاداری و وریایی"یەوە. ئەم پێوەندییە رەنگە لە هەموو زمانەكاندا بەدی بكرێ، بۆ وێنە دە كوردمادیدا دەگوترێ "ئاگات لێ بێ، چاكی بپارێزە"، دە ئەڵمانیدا warnen (.G) هەیە بەمانای "وریایی پێدان، ئاگادار كردنەوە"، aware (.E) "ئاگادار، وریا" [خزمە دەگەڵ ↑وریا wırya ی كوردمادی].

ئەگەر سەیری زمانی عەرەبی بكەین، دەبینین كە وشەی **حفظ** بە مانای "پاراستن " دێ و خزمیشە دەگەڵ **حافظة** "بیر، یاد" [شوێنی هەڵگرتن و پاراستن لە مێشكدا]. بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەردەكەوێ كە وشەی بیر bîr ی كوردمادی [دە بنەڕەتدا ویر wîr] بە مانای "ئاگا، هۆش، زەین، وریایی، حافزە" و بەگشتی "شوێنی پاراستن و ئاگاداری كردی لە مێشكدا" بووە.

چەند بەڵگەیەكی دیكە بۆ پشتراست كردنی ئەم بۆچوونە: یەكەم، پێوەندی ئاشكرای دوو وشە و دووچەمكی بیر [ویر] wîr و وریا wırya، دووەم، پێوەندی دوو چەمك و دوو وشەی بیر [ویر] و ↑فێر fer. وشەی فێر خزمە دەگەڵ بیر. فێر بوون جگە لە حیفز كردن و پاراستن لە ناو مێشكدا چیتر نییە. كاتێك دەگوترێ "فێر بوونی شتێك یان كارێك" مەبەست بە مێشك سپاردن و پاراستنی دە مێشكدایە. سێیەم، دە كوردمادیدا " لە بەر كردن" هەیە بۆ "حیفز كردن و بە مێشك سپاردن". وشەی ↑بەر[5] ber لێرەدا پێوەندی هەیە بە بیر bîr ەوە و مەبەست لە " لە بەر كردن" خستنە ناو بیرە و بە حافیزە ئەسپاردنە.

[پێوەندی ئێتیمۆلۆژی دوو وشەی "بەر" و "بیر" لە "فەرهەنگی هەرمان"دا (ل. 371) ئاماژەی پێ كراوە].

**بیر2 bîr 2** [ *bīr* ] - "چاڵاو": ئەم وشەیە زۆر جار بە وشەیەكی عەرەبی داندراوە [بئر bi´r (.Arb)]، بەڵام ئەمەراست نییە و وشەكە وشەیەكی رەسەنی كوردمادییە، خزمە دەگەڵ ↑برك bırık یان بێرك berık "گۆمیلكە" و بركە berke (.P) بە هەمان مانا. هەروەها دە زمانە ئەورووپییەكاندا دەبێتە خرم دەگەڵ Brunnen (.G)، brunno (.OG)، bourn (.E)، brunna (.Gt) "كانی، سەرچاوەی ئاو"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *bher-*** "سووتان، كوڵین، هەڵقوڵین".

**بیرازتن1** **bîraztın 1** [ *bīraztın* ] - "1- تیژکردنەوە و گرنی گرنی کردنەوەی بەرداش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ prick (E.)، prician (OE.) "کون کردن، ئاژن (ئاژن) کردن"، pri(c)ca (OE.)، pricke (MG.) "ئاژن کراو، کونکراو، تیژکراو"، prickle (E.)، pricel (OE.) "درِک، نەقیزە"، prik (Nl.) "چقڵ، نووک، برک"، prikken (Nl.) "تیرِاکردن، تیهەڵچەقاندن". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. ئەم وشانە لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑بیرازتن2 bîraztın 2 "ساف و لووس کردنی کێڵگە بۆ چاندن".

**بیرازتن2** **bîraztın 2** [ *bīraztın* ] - "ساف و لووس کردنی کێڵگە بۆ چاندن". خزمە لەگەڵ ↑پەرداخ perdax "ساف و لووس کراو" و دواتر ↑برین bırîn سەر بە ریشەی **< *bher-* (IE.)** "بەئامرازی تیژ کار کردن".

**بیرکم** **bîrkım** [ *bīrkım* ] - "گۆل، دەریاچە": خزمە دەگەڵ ↑بیر *bîr* "چاڵاو" و ↑بێرک berk "گۆمیلە لە چیا".

**بیرۆ** **bîro** [ *bīro* ] - "نەخۆشییەکی پێستە، پێست دەماسێ و بلۆقی ورد دەردەدا": وشەی ekzema (Gr.) کە بەرانبەری بیرۆی کوردمادییە دە بنەرِەتدا ماناکەی دەبێتە "زیبکە و بلۆق دەردان". کەواتە "بیرۆ"ش خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بلۆق bıloq و ↑بالۆکە baloke کە ئاماژە بە "هەڵمساوی و هەڵتۆقاوی" دەکەن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ Beule (G.) و boil (E.) "بلۆق، هەڵتۆقاوی".

**بیزا** **bîza** [ *bīzā* ] - "گیایەکی بۆنخۆشە تیکەڵی شیرێژی دەکەن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ bosem (Heb.) "بۆنخۆش". ئەم وشە عیبرییە دە زمانی یۆنانیدا بووەتە balsamon (Gr.) و لە رێگای زمانی لاتینییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان و بووەتە balsam "هەتوان".

**بیزە** **bîze** [ *bīza* ] - "توول، زارۆکی ناو سک": پیزە pîze و↑ پز pîz یش دەگوترێ.

**بیژوو** **bîju** [ *bīžū* ] - "زۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑بژاردن bıjardın "جیا کردنەوە، هەلاوارتن". مەبەست لە "بیژوو" دەبێ لە ئەسڵدا "ئاوارتە، جیاواز" بووبێ، چونکوو منداڵی بیژوو لە چاو منداڵانی دیکە بە شتیکی ئاوارتە و جیاواز داندراوە. ئەم مانایە دە وشەی ↑بیژۆک bîjok دا پارێزراوە کە بە مانای "دەنکی نەکوڵ" دێ دە ناو دەغڵ و دانی لێندراودا.

**بیژۆک** **bîjok** [ *bīžok* ] - خزمە دەگەڵ↑ بیژوو bîju.

**بیست** **bîst** [ *bīst* ] - "دوو جار دە": بیست bīst (P.)، wīst (MP.)، vīstaiti (Av.)، vimśati- (OIn.)، vīginti(L.)، سەر بە ریشەی **< *uī-kmt-ī-* (IE.)** "بیست، دوو دە". [-uī "دوو" و -dkmt "دە"].

**بیستن** **bîstın** [ *bīstın* ] - "ژنەوتن، گوێ لێبوون": دوو ریشە لەم بارەوە جێی ئاماژە کردنن: 1- **< *ueid- , *weid-* (IE.)** "دیتن، زانین، تیگەیشتن، دوزینەوە [دیتنەوە]". ↑ئاوەز [ئا +وەز] a + wez سەر بەم ریشەیە. لەوانەیە مەبەست لە "بیستن" دەبنەرِەتدا "پێ زانین و تێگەیشتن" بووبێ لەرێگای گوێ لێبوونەوە. 2- **< *bheudh-* (IE.)** "بێدار بوون، هەست کردن، هۆش پێدان، ئاگادار بوون". ↑بۆن bon کردن کە ئەویش جۆرێک هەست پێکردنە، بۆ ئەم ریشەیە دەگەرِێتەوە. لەوانەیە ئەم دوو ریشەی سەرەوە لە پلەیەکی دوورتردا خزم بن].

**بین(ە)** **bîn(e)** [ *bīn(a)* ] - "هەناسە": خزمە دەگەڵ بینی bīnī (P.) "لووت" [شوێنی هەناسە پێدا کێشان] و pnein (Gr.) "هەناسە کێشان". دواتر دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فوو fu.

**بینەقاقا** **bîneqaqa** [ *bīnaqāqā* ] - "بنی گەروو": بنەقاقا bıneqaqa ش دەگوترێ. لەوە دەچێ وشەکە دە بنەرِەتدا *bînekga** [bînek + ga] بووبێ، واتا شوێنی هەناسەکێشان. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بین bîn و↑بەربینگ berbîng [بەربینک berbînk].

**بینین** **bînîn** [ *bīnīn* ] - "دیتن": میبینم mībīnam (P.) "دەبینم"، wīn (MP.) "رەگی کردار ئێستا"، خزمە دەگەڵ -vaēna (Av.) "رەگی کرداری ئێستا"، vénati (OIn.) "دەرِوانێ، دەبینێ، چاو لێ دەکا"، سەر بە ریشەی -vay "دیتن، بینین"، دواتر سەر بە ریشەی **< *uei-* (IE.)** "دوای شتێک کەوتن، چاو لە دوو بوون".

بیور **bîwır** [ *bīwır* ] - "تەور": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑باڵتە balte "بیور".

بیهر **bîhır** [ *bīhır* ] - "تاسە و ئارەزووی زۆر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پەری perî "بوونەوەری ئەفسانەیی" و ئەو وشانەی لەوێدا باس کراون.

بێ **be** [ *be* ] - پرێپوزیسیۆن وپاشگر کە جیا بوون، ئازاد بوون و خاوەن نەبوون دەگەیەنێ، وەک بێکار، بیکەس، بێوان، بێ تۆ. بی bī (P.)، abē (MP.)، apaiy (OP.)، apa- (Av.). [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" ل. 224]. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە یەکێک لەم ریشانەی خوارەوە:

1- ریشەی *(IE.) *au-, *aue- >* "دووربوونەوە لە، بەرەو پێش". ↑حۆت ħot "تووک وەریو، سەر رووتەن" و west "خۆرئاوا" لەم ریشەوە هاتوون.

2- ریشەی *(IE.) *apo- >* "لە، دوور، ئاوا". ↑ئاوا awa "دوور بوونەوە، رۆیشتن" دەشێ لەم ریشەوە هاتبێ.

بێتر **betır** [ *betır* ]- "زۆرتر": بترbıtır و پتر pıtır یش دەگوترێن. بیشتر bīštar (P.) [بیش bīš + تر tar]. خزمە دەگەڵ ↑بۆش boş و ↑بەس bes و سەر بە خێزانە وشەیەک کە هێندێک مانای وەک "زۆری، چڕ و پڕی، هەڵمساوی" دەگەیەنێ.

بێچوو **beçu** [ *bečū* ] - "بەچکە، زارۆک": دە کوردمادیدا زۆرتر بۆ منداڵی ئاژەڵ بەکار دەهێندرێ. دە فارسیدا بچە beçҫe (P.) بە مانای "زارۆک" دێ. خزمە دەگەڵ ↑بچووک bıçûk.

[بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 177) دە فارسی ناویندا wač(č)ag (MP.) بووە و لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی ئێرانی کۆنی *(OI.) *vata* "بچووک"].

بێخوست **bexust** [ *bexust* ] - "بێ هەست": بڕوانە ↑خوست2 xust.

بێدار **bedar** [ *bedār* ] - "بەئاگا، بەخەبەر": بیدار bīdār (P.)، wigrād (MP.). وشەکە ئاڵوگۆری بەسەر دا هاتووە و فۆنێمەکان تووشی جێگۆڕکێ بوون. پێک هاتووە لە پێشگری *vi-* و **grāta-* سەر بە ریشەی *(IE.) *gar-, *grē(i)- >* "هەڵدان، بڵیند بوون، بەرز بوونەوە". [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 227].

بێر [1] **ber** [ *ber* ] - "بێڵ": ↑بێڵ bel.

بێر [2] **ber** [ *ber* ] - دەگەڵ "خێر" دێ [خێر و بێر xer u ber]. شێوەیەکی دیکە لە:

1- یان↑بەهرە behre. ئەوەندەی من لە یادم بێ، لە مەهاباد "خێر" بە مانای "قازانج و بەهرە"ش بە کار دەهات، بۆ وێنە کاتی کڕین و فرۆش فرۆشەر دەیگوت ئەو مامەلەیە خێرێ ناکا، واتا قازانجی تێدا نییە.

2- ↑بەر ber [بەرهەم، حاسڵ].

بێر [3] **ber** [ *ber* ] - "جێی دۆشینی مەڕ و بزن": بێرە bere ش دەگوترێ. هەروەها ↑بێری berî یان بێریڤان berîvanهەیە بە مانای "کیژی مەڕدۆش" و بەردەبێر berdeber هەیە کە شوان لەسەری دادەنیشێ و مەڕ و بزنەکە بۆ بێری رادەگرێ. لەوانەیە وشەکە دەگەڵ ژمارەیەک وشە خزم بێ کە ئاماژە بە "هەڵبژادن، جیا کردنەوە" دەکەن و مەبەست دە بنەڕەتدا جیا کردنەوەی مەڕ و بزنی شیاوی دۆشین بێ لەوانی دیکە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ئاوارتە awarte و ↑هەڵاواردن helawardın "جیا کردنەوە" [هەڵواردن helwardın و ↑هەڵبواردن helbuwardın یش دەگوترێن].

بێراڤک **beravık** [ *berāvıık* ] - "سەوڵی کەڵەکەوان": بیر + ئاڤک ber + avık، کەرتی ber شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بێڵ bel، تێکڕای وشەکە دەبێتە "بێڵی ئاو".

بێرایی **berayî** [ *berāyī* ] - "هەیوانۆکە": ↑بێلا bela.

بێرک **berk** [ *berk* ] - "گۆمیلکە": ↑برک bırık.

بێرکم **berkım** [ *berkım* ] - "قەفەس": خزمە دەگەڵ Bauer (G.) "بێرکم، قەفەس"، bur (Sw.) "دیوەلکەی بەندیخایە، قەفەس". ئەم وشانە دەگەڕێنەوە سەر ریشەیەک بەمانای "خانوو، جێی حەوانەوە" و

دوورتریش بۆ ریشەیەک بە مانای "بوون". دە زمانی کوردمادیدا وشەی"خانووبەرە" هەیە کە کەرتی دووەمەکەی، واتا ↑بەرە bere، لەو ریشەیە هاتووە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بۆتکە botke"دیوەلکە".

**بێری berî** *[ berī ]* - "کیژی دۆشەر": بێریڤان berîvan یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑بێر[3] ber "جێی دۆشینی مەڕ و بزن".

**بێز1 bez 1** *[ bez ]* - "حەز، مەیل، ئیشتیا": بێز هاتن یان بێز نەهاتن لە شتێک واتا حەز و مەیل کردن یان نەکردن لێی. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑واز waz "حەز، مەیل"، پێوەستە بە کرداری ↑ویستن wîstın.

**بێز2 bez 2** *[ bez ]* - بێز کردن لە شتێک واتا "حەز لێ نەکردن، ئیشتیا لێ نەبوون": زۆر جار دەگەڵ "ڤێز" دێ [ڤێز و بێز qez u bez]. وەک لە سەرەوە دیتمان "بێز"یک هەیە، واتا بێز[1] کە بە مانای "واز، حەز، ویست"ە و دەگەڵ کرداری یاریدەری هاتن [نەهاتن] ئەم مانایەی خۆی دەردەخا. بەلام کاتێک دەگەڵ کرداری کردن [نەکردن] بەکار دێ، ماناکەی پێچەوانە دەبێتەوە، واتا بێز هاتن دەبێتە "بێز لێ نەکردن" و بێز نەهاتن دەبێتە "بێز لێکردن"! کەواتە کاتێک بڵێین "بێزم نایە" مەبەست ئەوەیە *"واز* و مەیلم نایە"، بەڵام کاتێک بڵێین "بێز لەو شتە دەکەم" مەبەست دە بنەڕەتدا ئەوەیە "دووری لێدەکەم، دژی دەوەستم". ئەم "بێز"ەی دووەم وشەیەکی سەربەخۆیە، لە ریشەیەکی جیاوازەوە هاتووە و پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- *ویزە wîze* ↑و واز[5] waz سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێک جیا بوونەوە، دوور بوونەوە". لە زمانی ئەڵمانیدا wider (G.) "دژ، بەرەوروو" و widerwärtig (G.) "بێزراو، بێزهەستێن، ڤێزەون" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

2- وازە waze [↑پەڕەوازە perewaze] بە مانای "دوور بوونەوە، دووری کردن". لەم تێڕوانینەشەوە بێز کردن لە شتێک دەبێتە"دووری کردن" لێی.

**بێز3 bez 3** *[ bez ]* - "رەنگ": [ئەم قالییە لە بێزی هاوتاکەی نییە]. مامۆستا هەژار وشەکەی وەک "رەنگ" مانا کردۆتەوە. بەڵام وێ دەچێ وشەکە سەرەتا مانایەکی فراوانتری هەڵگرتبێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پنۆ(ک) pıno(k) "پەڵە، لەکە، خاڵ"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *peik- , *peig-*** "نەخش و نیگار کردن".

**بێزران bezran** *[ bezrān ]* - "لەبەر چاو کەوتن": ↑بێز2 bez 2.

**بێزوو bezu** *[ bezū ]* - "مەگیرانی، مەیلی توند": ↑بێز bez1 و ↑واز waz "حەز ، مەیل".

**بێژار bejar** *[ bežār ]* - "لەت و پەت": [کراسەکە بێژار بێژار بووە]. خزمە دەگەڵ هەڵوەشان helweşan [↑وەشان weşan]

**بێژتن1 bejtın 1** *[ beźtın ]* - "قسە کردن": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک ↑وشە wışe، ↑وێژە weje، ↑واچە waçe، ↑ئاواز a-waz، ↑ڤەقین veqîn "دەنگی خەمناکانەی رێوی" و هتد. vak- (Av.) "بێژتن"، vākâ- (OIn.) "ستران"، vox (L.) "دەنگ، وتە" و vocare (L.) "بانگ کردن، دەنگ هەڵبڕین" دەگەڵ وشە کوردمادییەکان بە خزم دەردەچن. voice (E.) "دەنگ" دەچێتەوە سەر وشە لاتینییەکە و گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *uek-*** " قسەکردن".

[کاک عەلی نانەوازادە ئاماژەی بە پێوەندی هێندێک لە وشە کوردمادییەکانی سەرەوە دەگەڵ یەکتر کردووە. بڕوانە "فەرهەنگی هەرمان"، ل. 480].

**بێژتن2 bejtın 2** *[ bežtın ]* - "جیا کردنەوە بە هێڵەک، بێژینگ...": لەگەڵ پێشگری "دا" دێ [دابێژتن dabêjtın، لە بێژینگ دان]. بێژان bejan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑بژاردن bıjardın "جیا کردنەوە".

**بێژینگ bejîng** *[ bežīng ]* - "ئامرازی دابێژتن": بێژ + ئینگ bej + îng [↑بێژان bejan]. کەرتی دووەم، واتا پاشگرێ îng, ıng هێندێک جار بۆ دروست کردنی ناوی ئامراز بەکار دەهێنرێ، وەک "برینگ"، "قولێنگ" [کولێنگ]، "رێژنگ" [رەشاش] و هتد.

**بێستان bestan** *[ bestān ]* - "شوێنی چاندنی تەرە و سەوزی": بێ + ستان be + sıtan، بێ be گۆڕدراوی ↑بۆن bonە، ستان sıtan پاشگری جێگایە، تیکڕا واتا "شوێنی بۆن و بەرامە". دە فارسیدا بوستان būstān (P.).

**بێش bêş** *[ beš ]* - دەگەڵ "خۆش" دێ [خۆش و بێش کردن]. خزمە دەگەڵ ↑باش baş.

**بێشە bêşe** *[ beša ]* - "جەنگەڵی چڕ و پڕ": بیشە bīše (P.)، Busch (G.)، bush (E.)، boskus (ML.)، bosko (It.) "بێشە"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *bh(e)u- >** "ماسین، با کردن، هەڵپزان". خزمیشە دەگەڵ ↑بۆش boş و ↑بەس bes "زۆر" و ژمارەیەک وشە کە ئاماژە دەکەن بە "هەڵمسان، زل بوون، زۆر بوون، چڕ و پڕ بوون".

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 229) سەبارەت بە ڕیشەی وشەکە دوو پێشنیار کراوە: 1- ڕیشەی *(IE.) *uei-* "چەمانەوە، هۆنینەوە، با دان"، 2- پێوەندی بە -vrksá (OIn.) "دار و درەخت"].

**بێشکە bke** *[ beška ]* - "لانکە": بێشک bêşk و بێشیگە bêşîge ش دەگوترێ. دە زمانی ئەڵمانیدا بە بێشکە دەگوترێ Wiege (G.) سەر بە کرداری be]wegen] "بزواندن، جوڵاندن، ڕاوەشاندن" و ئەمەش خزمە دەگەڵ وشەی ↑وەشان weşan [ڕاوەشان raweşandn] دە کوردمادیدا. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەردەکەوێ کە وشەی بێشکە پێک هاتووە لە بێش + کە ke + bêş و کەرتی بێش -bêş [پێشتر وێش -wêş یان وەش -weş] خزمە دەگەڵ Wiege (G.) "بێشکە". [سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی کۆنتری w بە b دە گەلێک وشەی کوردمادیدا هەڵی سەنگینە دەگەڵ وێژە و بێژە، واز و بێز، واشە و باشوو، واران و باران و هتد]. وەک دەبینرێ کوردمادی بوونی ئەم وشەیە بەتەواوی ئاشکرایە و وشەکە لە زمانی کوردمادییەوە چووەتە ناو زمانی تورکی. ناوی "د. بێشکچی" دەشێ لەم وشەیە وەرگیرابێ و ماناکەی دەبێتە "بێشکەساز" کە دەبێ ئاماژە بە کاری باو و باپیرانی بەرێزیان بێ].

**بێشۆ bêşo** *[ bešo ]* - "زۆر، لەرادەبەدەر": خزمە دەگەڵ ↑بەس *bes* و ↑بۆش boş " زۆر".

**بێڤل bevıl** *[ bevıl ]* - "لووت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بین bîn [بینە bîne] "هەناسە".

**بێگار begar** *[ begār ]* - "کاری بەخۆڕایی ڕەعێت بۆ ئاغا": بیگار bîgar (P.). دەشێ پێک هاتبێ لە بێ + گار be + gar، کەرتی گار gar لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑کرێ kıre. لەم تێڕوانینەوە بێگار واتا "بێ کرێ، بێمزد و هەقدەست".

**بێگانە begane** *[ begāna ]* - "دەرەکی، غەریبە": بیگانە bīgāne (P.)، bēgānag (MP.).

1- بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 230) وشەکە پێک هاتووە لە ڕیشەی -beg "دەر، دەرەوە" و پاشگری ئانە ane].

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێک هاتبێ لە بێ + گانە be + gane. گانە gane لەوانەیە هەر ↑خانە xane بێ و وشەکە دە ئەسڵدا "بێخانە" بەمانای "بێ ماڵ وحاڵ" بووبێ. شیاوی سەرنجە کە دە هێندێک شێوەزاردا وشەی خانە دەبێتە یانە yane و هەروەها وشەی بێگانە begane ش دەبێتە بیانی bıyanî. لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە بێخانە (بێ + خانە) دە بنەڕەتدا دەبێ ئاماژە بەو کەسە بووبێ کە سەر بە ماڵەوە نییە. وشەی foreigen (E.) "بێگانە" کە لە ڕیشەیەکی لاتینییەوە هاتووە، هەر لە چەشنی وشە کوردمادییەکە ساز کراوە و دە بنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە "لە دەرەوەی دەرگا" (دەرگای ماڵ). هەوەها دە زمانی کوردمادیدا وشەی بێوار bewar یش بە مانای "بێگانە" دێ کە لە وشەی ↑وار war "ماڵ، جێگەی ژیان" وەرگیراوە.

**بێڵ bel** *[ bel ]* - "پێمەڕە": بێر ber یش دەگوترێ. بیل bîl (P.).

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑باڵتە balte "بیور، تەور"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *bhei- >** "لێدان، لەت و کوت کردن".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ pale (L.)، palette (F.) "بێڵ".

[بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 230 لەوانەیە وشەکە بچێتەوە سەر ریشەی <
*bhedh- (IE.) "تێراکردن، کون کردن، هەڵکەندن" و خزم بێ دەگەڵ fodiō (L.) "هەڵکەندن"].

**بێلا bela** [ *belā* ] - "تراس، بەرهەیوان": خزمە دەگەڵ ↑وڵات wılat و ↑بڵاو bılaw. "بێلا" دەبنەڕەتدا ئاماژە بە "رووبەری زەوی، پانتایی" دەکا.

**بێلۆ belo** [ *belo* ] - "کوێرەکانی": خزمە دەگەڵ ↑برک bırk "حەوز، ئەستێل".

**بێلیتە belîte** [ *belīta* ] - "بەزم و گۆرانی": بێریتە berîte ش دەگوترێ. هەڵیسەنگێنە دەگەڵ ↑باڵەباڵ balebal "دەنگ و هەرای مەڕ و بزن".

**بێمار bemar** [ *bemār* ] - "نەخۆش، ناساز": بیمار bīmār (P.)، wēmār (MP.). بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 231) لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە amayavā- (Av.) "دەرد، ناخۆشی"، ama- (OIn.) "زۆر، هێز، زەخت"، ámīvā- (OIn.) "نەخۆشی، دەرد" و ámīti- (OIn.) "دەگوشێ، پاڵی پێوە دەنێ، تەنگاوی دەکا"، سەر بە ریشەی am- "بە توندی رەفتار کردن"، سەر بە ریشەی < ***om(ə)- (IE.)*** "زەخت بۆ هێنان".

**بێنژین benjîn** [ *benžīn* ] - "پشمین": بهنژین bıhınjîn و پنژین pınjîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑بین bîn [بینە bîne]، هەر وەک چۆن "پشمین" دەگەڵ "پشوو" خزمە. ئەم وشانە هەموو ئاماژە بە هەناسە و هەناسە دەرچوون دەکەن.

**بێوە bewe** [ *bewa* ] - "بێوەژن واتا ژنی مێردمردوو یان جیابۆوە لە مێرد": بیوە bīve (P.)، witwe (G.)، widow (E.)، vidua (L.)، vidhava (OIn.) "بێوە"، سەر بە ریشەی < ****widheua* (IE.)** "بێوە"، دواتر سەر بە ریشەی < ****widh-* (IE.)** "بەتاڵ بوون، کەمایەسی هەبوون".

ئەم ریشەیەش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری < ****ui-, *wi-* (IE.)** "لەیەکتر جیا بوونەوە، لە یەکتر دوور بوونەوە" و بەم شێوە وشەکە دەبێتە خزم بۆ وێنە لەگەڵ ↑واز[5] waz "کەمێکی جیا" (تاق و واز پەیدا بوون).

**بێوارە beware** [ *bewāra* ] - "بێگانە، نەناس": بێ + وارە be + ware، دەبنەڕەتدا واتا "بێ ماڵ وحاڵ" یان "لەسەرماڵ وحاڵی خۆ نەبوو" [↑وار war "ماڵ"].

**بێوەڵە bewele** [ *bewala* ] - "بێچووە ورچ": بێوە + لە bewe + le، کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑بەبە bebe، کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. لەوانە وشەکە بێبەلە **bebele* بووبێ و گوڕانی بەسەرداهاتبێ. [بەراوردی بکە دەگەڵ ↑بیبل bîbıl، تیتل و بیبل].

## پ ( P )

**پاپریک paprîk** *[ pāprīk ]* - "جۆرێک پەپوولە": ↑پەپوولە pepule، پرپریک pırpırîk و پەلپینە pelpîne ش دەگوترێ. گشتیان شێوەی جۆربەجۆرن لە یەک وشە.

**پاپل papıl** *[ pāpıl ]* - "وردەلکی دار": خزمە دەگەڵ ↑پۆپە pope "قیتکەی سەری پەڵەوەر".

**پاپۆڕ papor** *[ pāpor ]* - "کەشتی، گەمێ": لەوانەیە پێک هاتبێ لە پا pa + پۆڕ por. لەم تێڕوانینەوە کەرتێ "پا" شێوەیەکی دیکەیە لە پێ pe و "پۆڕ"یش پێوەندی پەیەدا دەکا بە ↑پەڕینەوە perînewe. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە کەرەستەی پێ پەڕینەوە، کەرەستەیەک کە پێی دەپەڕنەوە. لە زمانی ئەڵمانیدا Fähre ( .G ) بەم مانایە بەکار دێ و خزمیشە لەگەڵ پەڕینەوە perînewe.

**پاتاڵ¹ patal** *[ pātāl ]* - "مەر و ماڵات": پات + ئاڵ pat + al. کەرتی یەکەم دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑پەز pez "مەر".

**پاتاڵ2 patal** *[ pātāl ]* - "پیر و پەککەوتە": پاتال pātāl ( .P ).

1- لەوانەیە پێوەندی هەبی بە ریشەێ -*pāta* ( .OI ) "کەوتن". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "پەککەوتە".

2- بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 253 لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە پەخش paxš ( .P ) "پان، بڵاو، کوتراو".

**پاتاوە patawe** *[ pātāwa ]* - ↑پێتاو petaw "پێڵاو".

**پاتک1 patık** *[ pātık ]* - "پشت مل": بنەوشەی پات -pat دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑پاش paş.

**پاتک2 patık** *[ pātık ]* - "پارچەی پینە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پاتە¹ pate ¹ "ورتکە نان".

**پاتن patın** *[ pātın ]* - "برژان، پێژان، سووتان": شێوەیەکی دیکە لە↑ پێژان pejan.

**پاتوو patu** *[ pātū ]* - "1- کۆلووی نان 2- کولێرە": دەچێتەوە سەر ↑پاتن patın.

**پاتۆز patoz** *[ pātoz ]* - "ماشێنی دروێنە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پسان pısan.

**پاتیلە patîle** *[ pātīla ]* - "مەنجەڵی بچووک": پات + ئیلە pat + île.

1- لەوانەیەخزم بێ دەگەڵ Pott ( .G )، pot ( .Nl )، pot ( .Fr ) "مەنجەل". ئەم وشە ئەورووپییانە دەبردرێنەوە سەر potus ( .L ) "خواردنەوە".

2- لەلایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پیتکە pîtke.

3- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بادی(یە ) badî(ye) "دەفر".

**پاتە¹ pate ¹** *[ pāta ]* - "ورتکەنان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پسان pısan و ↑پاچین paçîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، کوتان، لەت کردن".

**پاتە² pate ²** *[ pāta ]* - "کەوشی شڕ": ↑پێتاو petaw و ↑پاتاوە patawe "پێڵاو"یش دەگوترێ.

**پاچ paç** *[ pāč ]* - "قوڵینگ": هەروەها ↑پاچڵە paçle هەیە بە مانای "سینگی تەنافی رەشماڵ". دیسانەکە ↑پیشک pîşk یان پیشکان pîşkan هەیە بە مانای "ئامرازی گیا هەڵکەندن". ئەم وشانە دەبێ پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ. جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ:

1- bicken ( .MG ) "تیڕا کردن، (دا) کوتان".

2- peik ( .MG ) "نووک، تیژ، چقڵ، نەقیزە".

3- ↑پاچین paçîn و↑پسان pısan، سەر بە ریشەیەک بەمانای "کوتان، لێدان، لەت کردن".

**پاچڤە paçve** [ *pāčva* ] - "وەرگێران، تەرجومە": پاچەڤە paçeve ش دەگوترێ. وێ دەچێ وەرگێرابێ لە ↑پێچان peçan. وەرگێران یان وەرگەڕاندن ئاماژە بەوە دەکا کە نڤیس یان بێژەیەک لە زمانێکەوە "وەردەسووڕێندرێتە" سەر زمانێکی دیکە. واتا لێرەدا چەمکی "سووڕان" لە ئارادایە. هەر بەم جۆرە پێچان و پێچاندنیش چەمکی "سووڕان" نیشان دەدا.

**پاچلە paçle** [ *pāčla* ] - "سینگی تەنافی رەشماڵ": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پاچ paç.

**پاچین paçîn** [ *pāčīn* ] - دەگەڵ پێشگری هەڵ -hel و دا -da بەکار دەهێنرێ، هەڵپاچین helpaçîn، داپاچین dapaçîn بە مانای "برین، لەت و کوت کردن". خزمە دەگەڵ ↑پسان pısan "کرتان، لەت بوون".

**پاداشت padaşt** [ *pādāšt* ] - "چاکە دانەوە": پاداش pādāš (P.). پێک هاتووە لە پێشگری -pati و -dāθna*سەر بە ریشەی -dā "دان، پێدان".["فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.236].

**پادشا padşa** [ *pādšā* ] - "خاوەنی تاج و تەخت": پادشاه pādšāh (P.)، pādixšā(y) (MP.). بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 237) پێک هاتووە لە دوو کەرتی -xšay "بەهێز بوون، بە دەسەڵات بوون" و پێشگری -pati "دەسەڵاتداری کردن، حکوومەت کردن". وشەکە خزمە دەگەڵ -xša(y) (Av.) "بەهێز بوون، بە دەسەڵات بوون"، -kşāy (OIn.) "حکوومەت کردن" و -xšaēta (Av.) "شازادە".

کەرتی یەکەمی وشەکە، -pad، خزمە دەگەڵ ↑پیت pît و↑ پتەو pıtew و هتد. بەم جۆرە مانای پادشا دەبێتە شای بەهێز یان دەسەڵاتداری بەتوانا .

**پادینگ padîng** [ *pādīng* ] - "سندۆڵ، ئامرازی چەڵتووک تێدا کوتانەوە": ↑دینگ dîng "ئامرازی چەڵتووک کوتان، دەسکاونگ"ە. بەم پێیە "پادینگ" دەبێتە ئەو بەشەی ژێرەوە کە شتەکەی تێدا دەکوترێتەوە و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پێ pe. وشەی پایین pāyīn (P.) دە زمانی فارسیدا بۆ "پا" دەگەڕێتەوە ومانای "خوارەوە، ژێر" دەبەخشێ. هەر لە کۆنەوە "سەر" هاومانای "بان، ژوور" بەکار هاتووە و "پێ"ش بە مانای "ژێر" [سەرتاپا].

**پار par** [ *pār* ] - "پارەکە،ساڵی پار": pārsāl (P.). خزمەدەگەڵ ↑بەر ber "پێش" و دە بنچینەشدا هەر بەو مانایە بووە. هەروەها خزمە دەگەڵ وشەکانی ↑پێرێ pere و ↑پێرار perar.

**پار(ە) par(e)** [ *pār(a)* ] - "تیکە، لەت، بەش": خزمە دەگەڵ pāre (P.)، part (E.)، pars (L.) هەر بەو مانایە. وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر زمانی لاتینی. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی وەک ↑پارچە pare، ↑پاروو paru، ↑پرتە pırte "خرتە و پرتە"،↑پل pıl، ↑پەرتاندن pertandın، ↑[هەڵ] پەرتاوتن pertawtın، ↑پرتک pırtık، پرتکان pırtıkan، ↑پرتووکیان pırtukyan "رزین و لەت وکوت بوون"، ↑پەرچقان perçıqan "ورد وخاش بوون" لەم بنەوشەوە هاتوون. بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 241) دەچێتەوە سەر ریشەی <- *(IE.) *per-* "دابەش کردن، فرۆشتن". بەم شێوەیە لەوانەیە وشەی ↑فرۆشتن fıroştın لەم ریشەوە هاتبێ و دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزم بێ.

**پاراستن parastın** [ *pārāstın* ] - "ئاگا لێبوون": پرهیختن perhīxten (P.) و پرهیز کردنparhīz kardan (P.) "خۆ پاراستن، پارێز کردن". دە زمانی فارسیدا دوو وشەی ↑پەرەستار *پەرەستار* perestar و ↑سەرپەرەست serperest هەن کە لە "پاراستن" ی کوردمادی وەرگیراون. ئەرکی پەرەستار و سەرپەرەست پاراستنی کەسانی ژێر چاوەدێری ئەوانە. ئەم دوو وشەیە چ پێوەندییەکیان بە وشەی "پەرەستن" [پەرستن] ەوە نییە، چونکوو ئەم وشەیە ماناکەی "عیبادەت کردن، دووعا کردن"ە و ئەمەش لە گەڵ ئەرک و کاری پەرەستار و سەرپەرست یەک ناگرێتەوە. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑پەری perî "بوونەوەری ئەفسانەیی".

2- ↑پەرێز perez "شوێنی بە لەمپەر دەور گیراو" [تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ währen "بەرگری کردن، پاراستن" و bewahren "پاراستن، هەڵگرتن و ئاگا لێبوون" دە زمانی ئەڵمانیدا

که خزمە دەگەڵ "وریا"ی کوردمادی و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای دەورگرتن و پاراستنی شوێنێک بە دارو دیوار].

3- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل.268) پرهیختن perhīxten یان پرهیز perhīz بە مانای "خۆ پاراستن، پارێز کردن" بردراوەتەوە سەر ریشەی ئێرانی کۆنی pati-raixt، پێکهاتوو لە پێشگری pati "رەها کردن، بەرهەڵدان، واز لێ هێنان" + ریشەی -raik "رشتن، جاری کردن". ئەم بۆچوونە وێ ناچێ لە جێی خۆیدا بێ، چونکوو "رشتن و جاری کردن" پێوەندییان بە چەمکی پاراستنەوە نییە. هەر لەم سەرچاوەیەدا بە پێی بۆچوونێکی دیکە بردراوەتەوە سەر para-xaiz- لە ریشەی xaiz-/ haiz- "ئاگا لێبوون، چاوەدێری کردن" و پێشگری para "دووری کردن". من لەناو ریشە هیندوئەورووپییەکاندا ریشەیەکی ئەوتۆم بە مانای "ئاگا لێبوون، چاوەدێری کردن" نەدۆزیوەتەوە.

**پاڕانەوە paranewe** [ *pārānawa* ] - "داوا کردنێکی بەتین (دە بەرانبەر هێزێکی گەورەدا)": خزمە دەگەڵ flehen (G.)، vleien (Nl.)، flīhōn (OG.) "پاڕانەوە، داوا کردنێکی بەتین و پێهەڵدەرانە"، (ga)plaihan (Gt.) "دڵدانەوە، دۆستانە دواندن". ریشەی ئەم وشە ئەورووپییانە ساخ نەکراوەتەوە.

**پاراو paraw** [ *pārāw* ] - "پاک، بێ خەوش": خزمە دەگەڵ ↑پاک pak، puta (OIn.) "پاک"، purus (L.) "پاک، خالیس"، سەر بە ریشەی *(IE.) *peue- >* "پاک".

**پارچە parçe** [ *pārča* ] - "1- تیکە 2- قوماش": pārče (P.)، پار + چە par + çe. کەرتی یەکەم هەر ↑پار par(e) ە بە مانای "تیکە، لەت"، کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. پارچە دەبێ لێرەوە مانای "قوماش"ی وەرگرتبێ کە سەرەتا بە پەڕۆ واتا لەت و کوتی قوماش گوتراوە کە بەتایبەتی بۆ دروونی جلک کەڵکی لێ وەرگیراوە. پاشان وشەکە مانایەکی گشتی وەرگرتووە. لەوانەیە ↑پەڕۆ pero ش دەگەڵ پارچە خزم بێ.

**پاردە parde** [ *pārda* ] - "دیواری کورت": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پەرێز perez "جێگەی دەغڵی درواو" و pairi-daiza- (Av.) "جێگەی دەور گیراو" [باغ، باغچە]. وشەی paradise "بەهەشت" دە زمانە ئەورووپییەکاندا ریشەکەی بۆ ئەم وشە ئەوێستاییە دەگەڕێتەوە. وشەکە لەرێگەی زمانی یۆنانی و پاشان لاتینی هاتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکانەوە.

**پارسە parse** [ *pārsa* ] - "گەدایی، خوازەڵۆکی": خزمە دەگەڵ ↑پرسین pırsîn و ↑پرسە pırse [دە بنەڕەتدا: پاڕانەوە بۆ مردوو].

**پارسەنگ parseng** [ *pārsang* ] - "کوتە بەردێکە بۆ تەرازکردنی تەراوزوو بەکاری دێنن": پارسەنگ pārsang (P.)، پار + سەنگ par + seng. کەرتی یەکەم واتا ↑پار par بەمانای "کوت، لەت، تیکە"یە و کەرتی↑ سەنگ seng بەمانای "بەرد، وەزن"ە.

**پاروو paru** [ *pārū* ] - "تیکە(ی خواردەمەنی)": خزمە دەگەڵ ↑پارە pare، ↑پارچە parçe، ↑پەڕۆ pero و هتد.

**پارە pare** [ *pāra* ] - "پووڵ، دراو": خزمە دەگەڵ پارە pāre (P.) "بەرتیل"، pāra- (Av.) و pōr (Pash.) "قەرز" و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پار par [پارە] بە مانای "بەش، تیکە" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.241]. لەوانەیە پارە سەرەتا نەک بەمانای "پووڵ" خۆی، بەڵکوو بە مانای وردە (وردەپووڵ) بەکارهاتبێ. چەمکی وردە دەگەڵ لەت یان پارە یەک دەگرێتەوە (ورد کردن، لەت کردن، پارەکردن)

**پارێز parez** [ *pārez* ] - "خۆ پاراستن، خۆ بواردن": ↑پاراستن parastın.

**پارێف paref** [ *pāref* ] - "گۆشتی دە تەنووردا پیشاو": دەشێ بچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *bher- >* "سووتان، کوڵان". وشەی ↑برژان bırjan و ↑پەڵوو pelu ش لەم ریشەوە هاتوون.

**پارێن paren** [ *pāren* ] - "گوێلپار": لە وشەی ↑پار par "ساڵی پار" وەرگیراوە و مەبەست گوێلکی یەکساڵەیە.

**پازدە pazde** [ *pāzda* ] - "دە و پێنج": پانزدە panzde ش دەگوترێ. پانزده pānzdah (P.). خزمە دەگەڵ panča-dasa- (Av.) و pánča-daśa- (OIn.) "پازدە"، پێک هاتووە لە دوو وشەی "پێنج" و"دە". [بڕوانە "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی"، ل. 248].

**پاس pas** [ *pās* ] - "ئاگاداری، بەوریایی لێڕوانین": پاز paz یش دەگوترێ. پاس pās (P.). خزمە دەگەڵ pātar- (Av.) و pātár (OIn.) "پاسەوان، چاوەدێر"، پاییدن pāyīdan (P.) "ئاگا لێ بوون، خستنە ژێر چاوەدێری" و پاشگری ↑وان (ڤان) wan- یان van- وەک لە وشەکانی باخەوان، شوان، گاوان دا. هەروها piemuō (Lit.) "شوان" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *pā- >** "ئاگا لێ بوون، چاوەدێری کردن".

**پاژ paj** [ *pāž* ] - "بەش، لەت": شێوەیەکی دیکە لە ↑بەش beş یان ↑پشک pışık.

**پاژینە pajîne** [ *pāžīna* ] - "کەپەکی ئارد، بنژیلی گەنم": دەبێ لە وشەی ↑پاش paş وەرگیرابێ و مەبەست ئەو شتە بێ کە وەک پاشماوە دەمێنێتەوە.

**پاسا pasa** [ *pāsā* ] - "1- شاراوە، نادیار 2- چاوپۆشی 3- سەرپۆش": بەراوردی بکە دەگەڵ ↑پەسار pesar و ↑پەسیو pesîw و هەروەها ↑پاش paş.

**پاش paş** [ *pāš* ] - "بەرانبەری پێش، دواوە": پس pes (P.) "پاش". 1- بەگوێرەی "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی" (ل. 272): paśćá (OIn.)، pasčaēta (Av.) "پاش، دوای" سەر بە ریشەی **(IE.) *pos(ko)- >** "پاش، دوای". 2- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ back (E.)، bak (OS.)، bak (ON.) "پاش".

**پاشاگەردانی paşagerdanî** [ *pāšāgardānī* ] - "دنیای بێ قانوون و پڕ ئاژاوە": پێک هاتووە لە دوو کەرتی پاشا + گەردانی paşa + gerdanî. کەرتی "گەردانی" خزمە دەگەڵ ↑گەڕان geran [میگردم -mī gardam (P.) "دەگەڕێم"]. مەبەست لە "پاشاگەردانی" *وەرگەڕانی* (تاج و تەخت)ی پادشا، واتا لە دەسەڵات کەوتنی پادشایە کە بەدوایدا قانوون و بڕیارەکانی دەسەڵات لەناو دەچن، ئازادییەکی بەربڵاو دێتە کایەوە کە لەپاڵەوەی ئاژاوە و ئاڵۆزیش روو دەدەن. شیاوی باسە کە وشەی گەڕان geran خزمیش دەگەڵ ↑گۆڕان goran.

**پاشتەرک paşterk** [ *pāštark* ] - "لای پشتەوەی زین": [هی ئەسپ و هەروەها هی دووچەرخە]. پاش + تەرک paş + terk، واتا تەرکی پشتەوە. ↑تەرک terk دەبنچینەدا بەمانای "رووبەر، سەتح" ە.

**پاقژ paqıj** [ *pāqıž* ] - "پاک، خاوێن": پاکیزه pākīze (P.). دەچێتەوە سەر ↑پاک pak. کەرتی دووەمی وشەکە رەنگە هەر ئەو پاشگرە بێ کە ئاماژە بە جەخت کردن دەکا و بە چەند شێوەی جۆربەجۆر خۆی دەر دەخا، وەک دە وشەکانی بزۆز، ئاڵۆز، چڵێس، قڕنیس و هتد. [بڕوانە ↑ئۆز -oz].

**پاقژە paqıje** [ *pāqıža* ] - "پەلەقاژە، دەست وپێ لێکدان": پا + قژە pa + qıje. کەرتی "قژە" هەر قاژە - qaje یە دە وشەی ↑پەلەقاژە peleqaje دا. دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ "پەل و پۆ" کە ئەم دوو وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "دەست و پێ" بوون. مەبەست لە پەلەقاژە لێکدانی دەست و مەبەستیش لە پاقژە لێکدانی پێیە، واتا لینگەفرتە کردن.

**پاک pak** [ *pāk* ] - "تەمیس، خاوێن": پاک pāk (P.). خزمە دەگەڵ puta (OIn.) "پاک"، purus (L.) "پاک، خالیس"، سەر بە ریشەی **(IE.) *peue- >** "پاک".

**پاکانە pakane** [ *pākāna* ] - پاکانە (بۆ) کردن واتا رەوایی دان بە کارێکی نەشیاو. دەچێتەوە سەر ↑پاک pak "تەمیس، خاوێن". مەبەست لە پاکانە کردن دە بنەڕەتدا پاک نیشاندان یاخود "پاک کردنەوە"ی کارێکی ناخاوێنە.

پاکتاو **paktaw** [ *pāktāw* ] - پاکتاو کرد ن واتا "لەناو بردنی یەکجاری، پاک کردنەوەی هەموو شوێن و رەددێک": ↑پاک pak + تاو taw. کەرتی taw- خزمە دەگەڵ ↑خاوێن xawen [گۆڕانی t بۆ x] و ↑تیف تیفە tîftîfe [تیف تیفە دان]. هەردوو کەرتەوشەکە یەک مانا دەبەخشن و ئەم شێوازە لە وشەسازی زمانی کوردمادی، دۆخی جەخت کردن دروست دەکا. هێندێکی تر لەم وشە جەخت کراوانە بریتین لە بانگاشە [بانگ و قیژە]، بانگەواز [بانگ + ئاواز]، بایەقووش، جەمبازە، رەشتاڵە، تەپلۆس، خڕخاڵ، سامۆتک، تارمایی، گۆنگەشە (گەنگەشە)، قرتماغە و هتد.

پاڵ1 **pal 1** [ *pāl* ] - "تەنیشت، قەراخ، لا": پهلو pahlū (P.)، parsəu- (Av.)، párśu- (OIn.) "پەراسوو، کەلەکە، تەنیشت"، سەر بە ریشەی ***perk-*** (IE.) < "پەراسوو، تەنیشت" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 296]. وشەکە شێوەیەکی تازەترە لە وشەی ↑پەراسوو perasu.

پاڵ2 **pal 2** [ *pāl* ] - "تەکان، تەوژم ، هێزخستنەسەر": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑فەیلی feylî [کۆنتر: پاڵی palî یان پاڵەیی paleyî] "ناوی هۆزێکی گەورەی کوردماد" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "هێز، گوشار، سەختی" دەکەن وەک ↑پاڵەوان palewan، ↑پەڵ pel "بەرد"، ↑پەڵان pelan "هەستی، ئێسک"، ↑پەلتین peltîn "سفت بوون"، ↑فلین fılîn "هەڵقرچان، گرژ بوون"، ↑فەلەک² felek "رەق بوونی ئەندام". ناوی ↑پەهلەوی pehlewî پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە سەر بە ریشەیەکن بە مانای "بەهێز بوون، سەخت بوون، زاڵ بوون". ئەم وشانە هەر وەها خزمن دەگەڵ verwalten (G.) [ver-walten] "بەڕێوە بردن، هەڵسووڕاندن، رێک و پێک کردن" [دە بنەڕەتدا: بە کارێک وێران، زاڵ بوون بەسەر کاردا]، سەر بە ریشەی ***uel-*** (IE.) < "سفت بوون، رەق بوون".

[تێبینی 1: پێوەندی وەک هی ئەو وشانەی سەرەوە دەگەڵ یەکتر دە تێوان دوو سێ خێزانەوشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، بۆ وێنە *زاخ* "بەرد"، *سەخت* "توند، پتەو"، *زەخت* "فشار، پاڵ، هێز"، *جەخت* "پێداگری، گوشار"، *زووخ* "هێز، توانایی، *زیخ* "بوێر"، *سۆغین* "ئەنجام دان، پێک ئانین" (دە بنەڕەتدا: بە کارێک وێران، زاڵ بوون بەسەر کاردا)، siegen (G.) "سەرکەوتن، زاڵ بوون". هەروەها ئەم وشانە: *خار* "سەخت"، *قەرسین* "سفت بوون، توند بوون"، *کەڕا* "بەرد"، *کارین* "توانین"، *کورد* "بەهێز، بوێر، پاڵەوان" و kratein (Gr.) "زاڵ بوون". تێبینی 2: دە زمانی لاتینیدا pellere (L.) "پاڵ پێوەنان، لێدان" و pallein (Gr.) "جووڵاندن، توند هاویشتن" هەیە. دە سەردەمانی زوودا مەکینەیەکی شەڕ هەبووە بەرد و ئاگریان پێ فڕێ داوەتە سەر هێزی دوژمن کە دە زمانی یۆنانیدا katapeltes (Gr.) و دە لاتینیدا katapulta (L.) بووە و پێوەندی هەیە بە کردارەکەی سەرەوە دە زمانی یۆنانیدا. بۆ من روون نییە کە ئایا پێوەندییەک لەتێوان ئەم وشانە و وشەی "پاڵ" لە ئارا دایە یان نا. تێبینی 3: وەک لە سەرەوە دەبینرێ، یەک لەو وشانەی دەگەڵ "پاڵ" خزمە، بریتییە لە فەلەک² felek "رەق بوونی ئەندام". وەک دەزانین دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکەش هەیە کە بریتییە لە فەلەک1 felek 1 "گەردوون". جێی ئاماژەیە کە ریشەی ئەم وشەیەش شێوەکەی لە ریشەی "فەلەک"ی دووەم دەچێ، واتا ***uel-*** (IE.) "سووڕان، خولان، بادران" و دەبێتە خزمە دەگەڵ *پێل* "مەوج" ].

پاڵ3 **pal 3** [ *pāl* ] - "زبڵ": دەگەڵ پەین دێ [پەین و پاڵ peyn u pal]. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑پەلە pele(پەلەپووش) [پووش و پەڵاش]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بەلال belal.

پاڵ4 **pal 4** [ *pāl* ] - دەگەڵ لاڵ دێ [لاڵ و پاڵ lal u pal]. پێوەندی هەیە بە ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە" و هێندێک وشەی سەر بەم خێزانە وەک ↑پسک pısık، ↑پەتە pete [لاڵەپەتە] و ↑فت fıt "سووتوو فڕێ دانی سەبیلە بە فوو، لەدەم دەراویشتن". چەمکی هاوبەشی ئەم وشانە پێکهاتنی دەنگێکە لە کاتی رەت بوونی هەوا بە دەمدا.

پاڵ⁵ **pal** [ *pāl* ] - دەگەڵ "پەڕۆ" دێ [پەڕۆ و پاڵ pero u pal]. خزمە دەگەڵ ↑پەردە perde، سەر بە ڕیشەی هیندوئەورووپی **(IE.) *pel- >** "داپۆشین، تێ پێچان". ↑پاڵ3 ش لەوانەیە پێوەندی بەم ڕیشەوە هەبێ.

**پاڵاخ palax** [ *pālāx* ] - "بێچووی گامێش": خزمە دەگەڵ folo (OG.)، foal (E.) "جوانوو"، puer (L.) "زارۆک"، پور pur (P.) "کوڕ"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *pou- >** "کەم، بچووک". وشەی ↑بچووک bıçûk [پچووک] و زۆر وشەی دیکەی زمانی کوردمادی لەم ڕیشەیەوە هاتوون.

**پاڵان Palan** [ *pālān* ] - "کورتان": پالان pālān (P.). خزمە دەگەڵ paiti-dāna- (Av.) "سپەر، زرێپۆش"، prati-dhāna- (OIn.) "جل، بەرگ"، پێکهاتوو لە پێشگری pāri "دەوروبەر، بەر" و dāna- سەر بە ڕیشەی dā- "دانان، تینان، جێگیر کردن" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 246].

**پاڵانە palane** [ *pālāna* ] - "تیسکە خوری هەڵنەپاچراو لەسەر پشتی بەران بۆ جوانی": پاڵانچە palançe ش دەگوترێ. هەروەها ↑پالیک palîk هەیە بە مانای "بەرسمێل، مووی سمێل کە دەکەوێتە سەر ردێن". دەشێ پێوەندیان بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑پۆڕ¹ por "قژ، کاکۆڵ".

2- ↑چەند وشەیەک دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بە مانای "پێست، پێستە"، وەک ↑پۆرگ porg و ↑پووڵەکە puleke.

**پاڵاوتن palawtın** [ *pālāwtın* ] - "خاوێن کردنەوە بەهۆی سەلە یان فیلتێر": پالودن pālūdan (P.). سەبارەت بەم وشەیە دەتوانین باس لە سێ شیمانە بکەین:

1- خزمایەتی دەگەڵ Filter (G.)، filz (OG.)، felt (OE.)، pileus (L.)، pilos (Gr.) "چندراوی لە موو و خوری بۆ پاڵاوتن" [ pilus (L.) واتا موو].

2- خزم دەگەڵ purare (L.) "خاوێن کردنەوە، پاڵاوتن".

3- بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 246) لەوانەیە دە ئێرانی کۆندا para-dūta- (OI.) بووبێ و پێک هاتبێ لە پێشگری para و dūta- سەر بە ڕیشەی *dav* "ڕاکردن، بزوان، جاری بوون".

**پاڵدانەوە paldanewe** [ *pāldānawa* ] - "قورسایی خۆ خستنە سەر شتێک": پاڵ + دانەوە pal + danewe ، کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑پاڵ1 pal "تەنیشت". دەبنچینەدا مەبەست لە پاڵ دانەوە ئەوە بووە کە مرۆڤ تەنیشت و کەلەکەی دەخاتە سەر شتێک. کەرتی دووەمی وشەکە دەچێتەوە سەر کرداری ↑دان dan.

**پاڵکی palkî** [ *pālkī* ] - "کەژاوەی سەر ئاواڵە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ ↑پاڵان palan "کورتان".

**پاڵوو palu** [ *pālū* ] - "چەرمێکە دەخرێتە ژێر کلکی ئەسپەوە": پاردم pardom (P.). دە ئەسڵدا پێک هاتووە لە *pari-dum(b)a-*. کەرتی یەکەمی وشەکە مانای "بەدەور" دەدا و کەرتی دووەم مانای "دووما، دوو، کلک". بەم شێوەیە مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە ئەو شتەی دەخرێتە دەوری کلک [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 239].

**پاڵوودە palude** [ *pālūda* ] - "نیشاستەی پاڵێوراو": پالوده pālūde (P.). سەر بە کرداری پاڵاوتن palawtın [پالودن pālūden (P.)].

**پاڵە¹ pale** [ *pāla* ] - "سەپان، ڕەنجبەر، کرێکار": ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ poor (E.) "هەژار". وشە ئینگلیزییەکە خۆی لە زمانی لاتینی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "کەم، بچووک" و خزمە دەگەڵ few (E.) "کەم". وا دیارە دە کلتووری کوردەواریدا وەک زۆر جێگای دیکە مرۆڤی ڕەنجبەر و کارکەر وەک کەسانی بچووک و کەم بایەخ چاولێ کرابن، بە پێچەوانەی کەسانی دەرەبەگ و دەوڵەمەند و بەناو "گەورەپیاو". لەوانەیە "پاڵە" ناوێک یان نازناوێک بووبێ بۆ "ڕەعێت" [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی گجە "ڕەعێت" و *هەژار* "نەدار" کە ئەوانیش پێوەندیان

هەیە بە چەمکی کەم و گچکە بوونەوە]. شیاوی باسە کە وشەی فلاح fallāħ (Arb.) "سەپان، وەرزێر" لە "پاڵە"ی کوردمادی وەرگیراوە. لەبەر نەبوونی فۆتیمی پ p دە زمانی عەرەبیدا، ئەم فۆتیمە کراوەتە ف fو فۆتیمی کۆتایی وشەکەش کراوەتە ħ. بۆ زانیاری زۆرتر لە سەر ریشەی وشەکە و وشە هاوپێوەندەکان بڕوانە ↑پوور pur "خوشکی باوک یان دایک".

**پاڵە2** [ *pāla* ] - "1- شاری گەورە 2- دەربار و دیوەخان": ئەم وشەیە بە پێچەوانەی "پاڵە[1]"ی سەرەوە کە ئاماژە بە "کەمی و گچکەیی" دەکا، مانایەکی پێچەوانە دەردەبڕێ واتا "زۆر و زەوندی و قەبەیی". دەچێتەوە سەر ریشەیەکی جیاوان، واتا ریشەی *(IE.) *p(e)l-* "زۆر، پڕ". دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑پەڵە pele ی باران واتا بارینی زۆر، پەڵە pele گیا "کۆما گیا، شوێنێکی پڕ لە گژ و گیا"، ↑پۆڵ por "دەستە، کۆمەڵ"، ↑پڕ *pır* "زۆر" و هتد. دیارە شاری گەورە و هەروەها دەربار و دیوەخانەکان وەک شوێنی گەورە و "زۆر و زەوند" سەیر کراون و هەر بۆیە ئەم ناوەیان لەسەر دانراوە. شیاوی باسە دە زمانی یۆنانیشدا polís (Gr.) "شار، حکوومەت" خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. هەروەها وشەی mētrópolis (Gr.) "شاری گەورە" پێک هاتووە لە دوو کەرت، یەکەمیان بە مانای "دایک" و دووەمیشیان "شار". کەوابوو مێترۆپۆل ماناکەی دەبێتە "دایکەشار".

**پاڵەوان palewan** [ *pālawān* ] - "مرۆڤی زۆر بەهێز": پهلوان pahlavān (P.). بنەوشەی پاڵ pal- هەڵسەنگێنە دەگەڵ walten (G.)، waltan (OG.)، waldan (Gt.)، wealdan (OE.)، walda (OFr.)، گشتیان بە مانای "زاڵ بوون، بەهێز بوون"، سەر بە ریشەی *(IE.) *wal- >* "بەهێز بوون، زاڵ بوون". valdet (Rus.) "زاڵ بوون، دەست بەسەردا گرتن"، (L.) "بەهێز بوون"، veldyti (Lit.) " دەسەڵاتدار بوون، خاوەن بوون"، follnathir (OIr.) "زاڵە، دەسەڵاتدارە"، walo (Toch.) "پادشا" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. دە زمانی ئەڵمانیدا Gewalt (G.) "زەبروزەنگ"، verwaltung (G.) "بەڕێوەبردنی ئیداری و حکوومی" لەو ریشەیەوە پەیدا بوون. وشەی پەهلەوی pehlewî یان ↑فەیلی feylî [کۆنتر: پاڵی، پاڵەیی] لە پێوەندی دەگەڵ ئەو وشانەی سەوەوەدا جێ دەگرن.

**پالیک palîk** [ *pālīk* ] - "بەرسمێڵ، مووی سمێڵ کە دەکەوێتە سەر ردێن". خزمە دەگەڵ ↑پاڵانە palane "تیسکە خوری هەڵنەپاچراو لەسەر پشتی بەران بۆ جوانی".

**پان pan** [ *pān* ] - "بەرین": پهن pahn (P.)، -paθana (Av.) "پان، بڵاو"، petēre (L.) "پان و بڵاو بوونەوەوە"، petys (Lit.) "شان"، سەر بە ریشەی *(IE.) *pet- >* "پان و بڵاو کردنەوە" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل.297)]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑fîter هەیە بەمانای " زەلام، زەبەلاح" [دە بنەڕەتدا: پان و پۆڕ؟] کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە زمانی لاتیندا expandere (L.) "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە" هەیە کە وێ دەچێ پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ.

**پانێ pane** [ *pāne* ] - "پاژنە، لای پشتەوەی پێ": خزمە دەگەڵ پاشنە pasne (P.)، parsni (OIn.)، fairzna (Gt.)، Ferse (G.) "پانێ"، سەر بە ریشەی *(IE.) *persna- >* "پانێ".

**پاوان pawan** [ *pāwān* ] - "قۆرخ، مێرگ یان باخی تایبەتی کەسێک": دەشێ دە بنەڕەتدا "پابەند pabend" بووبێ بە مانای "بەستراوە، وابەستە، سەر بە". لەم تێڕوانینەوە پاوان کردنی شتێک واتا بەستنەوەی ئەو شتە بە خۆ، واتا نەهێشتنی ماف و بەشی کەسانی دیکە بەسەر ئەو شتەوە. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ پاونە pawne بە مانای "بەندی پێ، کوت و زنجیر".

**پاوانە pawane** [ *pāwāna* ] - "پاموورە، خرخاڵی پێ": پا + وانە pa + wane. هەروەک چۆن "ملوانکە" شتێکە دەکرێتە ملەوە، بەم شێوەیەش "پاوانە" دە لاق دەکرێ. "وانە، وانکە" لەم وشانەدا وێ دەچێ جیا بێ لە "وانە، وانکە" لەناو وشەکانی "دەستەوانە، قامکەوانە، بەروانکە"دا. لەم نموونانەدا پاشگرەکە بریتییە لە پاشگری "پاراستن و ئاگاداری کردن" [بڕوانە پاشگری "-وان" لە وشەکانی باخەوان، دەرکەوان

دا]. "وان، وانکه" لە وشەکانی "پاوانە، ملوانکە"دا وێ دەچێ پێوەندی بە ↑بەند bend [وەند wend]ەوە هەبێ و مەبەست "بەستن"ی ئەو شتانە لە مل و پێ بێ، هەر وەک چۆن دەگوترێ "گەردن بەند".

**پاوەوی pawewî** *[ pāwawī ]* - "بەربووک": پا + وەوی pa + wewî. پا هەمان ↑پێ pe یە. وەوی wewî شێوەیەکی کۆنترە لە ↑بووک buk. مەبەست لە "پا" لێرەدا دەبێ هاورێی کردن، دەگەڵ رۆیشتن بێ. لەم تێروانینەوە "پاوەوی" ئەو کەسەیە هاورایی بووک دەکا لە کاتی گواستنەوەیدا.

**پایژی payjî** *[ pāyžī ]* - "لێکدانەوەی خەو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پشکنین pışkınîn. وەک لە ژێر وشەی "پشکنین"دا باس کراوە، ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا ئاماژە دەکا بە پەخش و بڵاو کردنەوی شتەکان بۆ دۆزینەوەی ئەو شتەی جێی مەبەستە. "پایژی" یش جۆرێکە لە "پشکنین" بۆ پەی بردن بە مەبەستی خەونەکە.

**پاییز payîz** *[ pāyīz ]* - "وەرزی گەڵاوەرین": پاییز pāyīz ‎(P.)‎. دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 250) لەم بارەوە چەند شیمانە باس کراوە کە لێرەدا ئاماژە بە دوویان دەکەین:

1- **pāti-z(a)ya* *(OI.)* "نیزیکی زستان، بەرەو زستان"، پێکهاتوو لە پێشگری *pāti* "نزیک" و *z(a)ya-** "زستان" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ zyam- ‎(Av.)‎ "زستان"]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ po-dzim ‎(Slav.)‎ "پاییز" [دە بنەڕەتدا: نیزیکی زستان].

2- **pāta-* *(OI.)* "کەوتن" [(دا)کەوتنی ساڵ یان گەڵا؟].

**پت pıt** - "لێدانی رەکێ": چەند وشەیەکی دیکەش هەن کە دەشێ دە پێوەندی دەگەڵ یەکتردا لێک بدرێنەوە. ئەم وشانە بریتین لە ↑پتە pıte "زەبرلێدان (بە قامک)"، ↑پیتک pîtık "کوتک"، ↑پتپتک pıtpıtık "چێشتی ساواری ورد (کراو)"، ↑پتەپت pıtepıt "پرتەی شۆقی چرا" [دە ئەسڵدا: لێدانی شۆق یان گڕی چرا، هەروەک لێدانی رەکێ]، ↑پچین pıçîn "شەق تێهەڵدان"، ↑پەلەپیتکە pelepîtke "ماشەی تفنگ". ئەم وشانە دەبێ خزمایەتییان هەبێ دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- یان دەگەڵ beat ‎(E.)‎، beatan ‎(OE.)‎، bozan ‎(OG.)‎، confutāre ‎(L.)‎، گشتیان بە مانای "لێدان"، سەر بە ریشەی < ****pu-, *fu-*** ***(IE.)*** "لێدان".

2- یانیش دەگەڵ ↑پسان pısan سەر بە ریشەی < ****bheid-*** ***(IE.)*** "کوتان، لێدان، لەت کردن". ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی < ****bhei-*** ***(IE.)*** هەر بەم مانایە.

**پتپتک pıtpıtık** - "چێشتی ساواری ورد(کراو)": خزمە دەگەڵ ↑پت pıt "لێدانی رەکێ"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، کوتان". وشەی "ساوار" خۆی دە ئەسڵدا بە مانای "هاڕاو، ورد کراو"ە.

**پتر pıtır** *[ pıtır ]* - "زۆرتر": ↑بێتر betır یش دەگوترێ و دەبێ ئەمەیان شێوەیەکی کۆنتری وشەکە بێ. دە فارسیدا دەبێتە بیشتر bīštar ‎(P.)‎. دەبنەڕەتدا پێک هاتووە لە بێش + تر bêş + tır. کەرتی بێش bêş بەمانای زۆرە و خزمە دەگەڵ ↑بەس bes و ↑بۆش boş و گەلێک وشەی دیکە.

**پترۆکە pıtroke** *[ pıtroka ]* - "قرتماغەی سەر برین": پترۆ ptro، پترۆخە pıtroxe و پەترۆ(کە) petro(ke) ش دەگوترێ. ئەگەر سەیری وشەکانی "قرتماغە"، "کەوەڕە" و "سارێژ" بکەین، دەبینین کە ئەم وشانە پێوەندیان بە چەمکی "سفت، سەخت" بوونەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست ئەوەیە کە پێستەکە خۆی گرتۆتەوە و سفت بۆتەوە. لەم تێروانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشە بە مانای "سەخت، بەهێز"، وەک ↑پەتڵین petlîn "خۆ گرتن، هێز تێدا بوون".

**پتە pıte** *[ pıta ]* - "لێدان (بە قامک)": خزمە دەگەڵ ↑پت pıt "لێدانی رەکێ".

**پتەپت pıtepıt** *[ pıtapıt ]* - "پرتەی شۆقی چرا": خزمە دەگەڵ↑پت pıt "لێدانی رەکێ". پرتە کردنی شۆق یان گڕی چرا هەروەک لێدانی رەکێ وایە، واتا لە هەر دوو دۆخدا جۆرێک "لێدان" لە ئارادایە.

**پتەو pıtew** *[ pıtaw ]* - "بەهێز، سەخت": خزمە دەگەڵ ↑پیت *pît* و ↑پیتاندن pîtandın.

**پچرین pıçrîn** [ *pıčrīn* ] - "دڕاندن": خزمە دەگەڵ ↑پسان pısan و ڕاپسکاندن rapıskandın.

**پچووک pıçûk** [ *pıčūk* ] - "چکۆڵە": شێوەیەکی کۆنتر لە ↑بچووک bıçûk.

**پچە pıçe** [ *pıča* ] - "سرتە":

1- لە لایەکەوەلەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پسک pısık و ئاماژە بە دەنگیکی کز بکا کە لەکاتی پچەپچ کردندا دروست دەبێ.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑بێژتن bêjtın ەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست قسە کردن بێ. شیاوی باسە کە بۆ وێنە هاواڵەکانی وشەی "سرتە" دە زمانەکانی دیکەدا مانای "قسە کردن" دەبەخشن. هەروەها "چپە" خزمە دەگەڵ وشەیەکی ئەڵمانی بە مانای "قسە کردن".

**پچین pıçîn** [ *pıčīn* ] - "شەق تێهەڵدان": دەشێ هاوپێوەند بێ دەگەڵ ↑پتە pıte.

**پچێک pıçêk** [ *pıček* ] - "کەمێک": پچ + یێک [یەک] pıc + yek. پچ واتا "کەم، چکۆڵە"، خزمە دەگەڵ پچووک [پچ + ئووک] یان ↑بچووک pıçûk/ bıçûk.

**پخە pıxe** [ *pıxa* ] - "جوان دە زمانی زارۆکدا":

1- هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پاک pak.

2- هەڵی سەنگینە دەگەڵ fegen (G.) "گەسک لێدان"، faga (OIs.) "خاوێن کردنەوە، بریقاندنەوە"، puost (Let.) "ڕازاندنەوە"، fagrs (Gt.) "لەبار، پەسەند". ئەم وشە ئەورووپییانە دەبردرێنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "جوان کردن"، سەر بە ریشەی ***IE.) *pok-, *pek-* >**. لەوانەیە ئەم ریشەیە دواجار دەگەڵ ریشەی وشەی ↑پاک pak بە یەک بگەنەوە.

**پڕ [1] pır** [ *pır* ] - "1- تژی 2- زۆر": پڕ por (P.)، voll (G.)، full (E.)، ful (OFr.)، plenus (L.)، purna (OIn.) "پڕ"، سەر بە ریشەی ***IE.) *pelu-* >** "پڕ، زۆر".

**پڕ2 pır** [ *pır* ] - پڕ پێداگرتن واتا بە توندی دەست دانە شتێک. خزمە دەگەڵ ↑پەل pel "دەست". وشەی "پەل" بە شێوەی "پیل" و "پیر"یش دەگوترێ [پیلم گرت واتا قۆڵم گرت، بەرەو پیر چوون یان بەرەو پیل چوون]. بەم جۆرە مانای پڕ پێدا گرتن دەبێتە "دەست یان چەنگێ پێدا گرتن".

**پڕاش pıraş** [ *pırāš* ] - پڕاش پڕاش واتا لەت لەت. شێوەیەکی دیکە لە ↑پڕش pırş یان پەڕژ / پڕژ / pırj perj [پەرژ و بڵاو، پڕژ و بڵاو، پڕش و بڵاو]. بڕوانە ↑پڕژان pırjan.

**پرت(ە) pırt(e)** [ *pırt(a)* ] - دەگەڵ "خرت" دێ [خرت و پرت یان خرتە و پرتە]. شێوەیەکی دیکە لە ↑پار par "لەت، کوت".

**پرتافین pırtafîn** [ *pırtāfīn* ] - "توند غار دان": ↑پرتاو/ پرتاف pırtaw / pırtaf.

**پرتاڵ pırtal** [ *pırtāl* ] - "1- کووتاڵ 2- پێخەف": هەروەها ↑پرتان pırtan هەیە بە مانای "پێخەف". خزمە دەگەڵ ↑پەردە *perde*.

**پرتان pırtan** [ *pırtān* ] - "پێخەف": خزمە دەگەڵ ↑پرتاڵ pırtal و دواتر دەگەڵ ↑پەردە *perde*.

**پرتاو pırtaw** [ *pırtāw* ] - "بزاوتی بەغار و بەپەلە": هەروەها ↑پرتافین pırtafîn هەیە بە مانای "توند غار دان". دە زمانی فارسیدا پەرت part (P.) و پەرتاب partāb (P.) هەیە بە مانای "فڕێ دان". ئەم وشانە دە ڕاستیدا مانای "دەرپەڕین" دەگرنە خۆ و خزمن دەگەڵ ↑پەلە pele و ↑پەڕین perîn.

**پرتکان pırtıkan** [ *pırtıkān* ] - "بەش بەش بوون، لەت لەت بوون": دەچێتەوە سەر↑ پارە par [پارە] "لەت، کوت".

**پرتوکیان pırtukyan** [ *pırtukyān* ] - "ڕزین": دەبنەڕەتدا واتا لەبەر یەک هەڵوەشان و لەت وکوت بوون [پرتک پرتک بوون، پارچە پارچە بوون، پارە پارە بوون]. بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑پرتکان pırtıkan.

**پرتە1 pırte** [ *pırta* ] - "باڵ لێدانی خێرا و پەیتا پەیتا، لێدانی ڕەگ، حاڵەتی نائارامی شۆقی چرا": خزمە دەگەڵ flattern (G.)، flatter (E.) بە هەمان مانا کوردمادییەکەی و Falter (G.) "پەپوولە" [وشە

ئەڵمانییەکە خزمە دەگەڵ "پەپوولە"]، سەر بە ریشەی ***pled-** > (**IE.**). دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑فرتە fırte [لینگە فرتە واتا لینگێ لێکدانی توندو خێرا] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانەی سەرەوە دەبێ دە پلەیەکی دوورتردا خزم بن دەگەڵ flackern (G.)، flakka (OIs.)، flaca (Sw.) و vlacken (Nl.) "لەرینەوەی توند و خێرا، پرتەپرت کردنی چرا"، سەر بە ریشەی > ***plak-,* plag-** (**IE.**) "پەڕ و باڵ لێدان" [دەبنەڕەتدا لێدانی توند و پەیتاپەیتا] . ئەم ریشەیە بەرهەڤ بکە دەگەڵ وشەی پلۆسین / پەڵۆخین plosîn/ peloxîn بە مانای "لێدان". دە زمانی کوردمادیدا ↑فرکە fırke ش لەم ریشەی سەوەوە هاتووە کە ماناکەی دەبێتە "بزاڤی خێرا و بەلەز". دە زمانی فارسیدا پلکیدن palakīdan (P.) بە مانای "توند و خێرا و بە فڕکەفڕك بە دەوروبەری شتێکدا خولانەوە" دێ و پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

پرتەقاڵ **pırteqal** [ *pırtaqāl* ] - "میوەیەك": پرتقال portaqāl (P.). ناوی ئەم میوەیە دەچێتەوە سەر ناوی وڵاتی "پرتەقاڵ".

[دە زمانی ئەڵمانیدا بردوویانەتەوە سەر ناوی وڵاتی چین و  پێی دەگوترێ Apfelsine (G.) "پرتەقاڵ"، دە بنەڕەتدا واتا "سێوی چین"].

پرچ **pırç** [ *pırč* ] - "مووی هونراو": خزمە دەگەڵ flechten (G.)، flehtan (OG.)، fläta (Sw.)، velechten (Nl.)، fleohtan (OE.)، گشتیان بەمانای "هۆنینەوە، تێکچنین، تێک هەڵکێشان"، سەر بە ریشەی > ***plek-** (**IE.**) "هۆنینەوە". plekein (Gr.)، plectere (L.) "چنین، هۆنینەوە" و flahta (Gt.) "پرچ، مووی هۆنراو" دەگەڵ وشە ژێرمانییەکانی سەوەوە خزمن. ئەم ریشەیەی سەرەوە خۆی دە پلەیەکی دوورتردا دەچێتەوە سەر ریشەی ***pel-** (**IE.**) " قەد، گنچ، چرچ و لۆچی" [بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑پلژیان pıljîan "سیس بوون"].

پرخاندن **pırxandın** [ *pırxāndın* ] - "هەناسە کێشانی بەدەنگەوە لەخەودا": دەگەڵ گەلێك وشەی وەك ↑پڕماندن pırmandın، ↑پشمین pışmîn، ↑فشقاندن fışqandın، ↑فسە fıse، ↑وژە wıje، فیڕە fîre و هیتر دەچنەوە سەر دەنگی *(IE.) *phu-,*fu-* "فوو". ئەو وشانەی لەم دەنگە کەوتوونەوە، گشتیان ئاماژە بە دەنگێ یان دۆخێك دەکەن کە لە کاتی دەرچوونی هەوادا پەیدا دەبێ. ئەم دەنگە وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی > ***b(h)u-** "باکران، ماسین، فش بوون(ەوە)"، ئەمیش خۆی دەیان وشەی لێ پێك هاتووە، وەك ↑هەڵپزان pızan، ↑فش fış، ↑پشوو pışû، ↑بۆق boq، ↑بەس bes و هتد.

پرد **pırd** [ *pırd* ] - "شوێنی پەڕینەوە بەسەر چەم دا": پل pol (P.). خزمە دەگەڵ Furt (G.)، forda (OE.)، ford (OIn.) "بوار، شوێنی پەڕینەوە"، peretauu (Av.) "بوار، پرد"، سەر بە ریشەی > ***per-** (**IE.**) "پەڕینەوە، رابووردن". وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بوار bıwar، ↑رابووردن raburdın، ↑پەرینەوە perînewe.

پردە **pırde** [ *pırda* ] - دەگەڵ وردە دێ [وردە و پردە]. ↑پرت(ە) pırt(e) [خرت وپرت یان خرتە و پرتە].

پردەڵە **pırdele** [ *pırdala* ] - "دارەڕای سەر خەرداری ئاش 2- دارێکی درێژە لە ئامرازی جۆڵاییدا": خزمە دەگەڵ ↑پەردوو perdu [دار و پەردوو].

پرز **pırz** [ *pırz* ] - "ریشۆلەی پارچە": پرز porz (P.) " کوڵکە، ریشۆڵە".

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە↑ پرووزان pruzanەوە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑برژانگ bırjang یان ↑برژۆل *bırjol*.

پرزە **pırze** [ *pırza* ] - "هێز، توان" [برستم نەماوە، پرزەم لێ براوە]. خزمە دەگەڵ ↑برست bırıst .

پرژان **pırjan** [ *pıržān* ] - "بڵاو بوونەوەی توندی شت (ی ورد یان ئاوەکی)": خزمە دەگەڵ sprühen (G.)، spray (E.)، sprejan (MG.)، sperein (Gr.) "پرژاندن". دەنگی s کە دە سەرەتای وشە ئەورووپییەکاندا دەبیندرێ، دە وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی >

*sp(h)er-* (IE.) "پرژاندن، وەشاندن، تەقاندن". وشەکانی شپرێو şprew و شپرزە şpırze کە دەنگی s تییاندا پارێزراوە [دە کوردمادیدا بووەتە ş]، هەر لەو ریشەوە هاتوون و دە بنچینەدا بە مانای "بڵاو، پرژ و بڵاو" بەکار هاتوون. دە زمانە ئەورووپییەکاندا هێندێک وشە لەو ریشەیە کەوتوونەوە، وەک springen (G.) "پەڕین، بازدان"، spritzen (G.) "دەرپەرینی ئاو، فیچقە کردن، دەرزی لێدان [دەبنەرەتدا ئاو دەرپەڕاندن]"، sprengen (G.) "تەقاندن، هەڵتەکاندن". گشت ئەم وشانە چەمکی "پەڕین، دەرپەڕین" واتا بزاوتێکی خێرا و بەپەلە بەیان دەکەن. لەبەرئەوە پێ دەچێ کە ریشەی *sp(h)er-* بە مانای پرژ و بڵاو بوونەوە شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی کۆنتری *preu-* بە مانای "پەڕین، دەرپەڕین"، چونکوو ریشەی یەکەم "بڵاو بوونەوە" بە مانا گشتییەکەی بەیان ناکا، بەلکوو بڵاوبوونەوەیەکی توند و خێرا، کە بەهۆی دەرپەڕینی وردەبەشەکانەوە پەیدا دەبێ. دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشەی وەک ↑پەڕین perîn و ↑پەلە pele و هیتر دەچنەوە سەر ریشەی *preu-*.

دە زمانی فارسیدا پراکندن parākandan (P.) "پرژاندن، بڵاو کردنەوە" هەیە کە دەبێ شێوەی فارسی وشەی "پرژاندن" بێ، بەڵام ئەم وشە فارسییە دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 256) بە چەشتێکی دیکە لێک دراوەتەوە و دەگەڵ "ئاخنین" بە خزم دانراوە. ئەمە وێ ناچێ لێکدانەوەیەکی راست بێ.

**پرسین pırsîn** [ *pırīsn* ] - "بەرسڤ خواستن": پرسیدن porsīdan (P.)، Frage (G.)، forsca (OG.)، "پرس"، Fragen (G.) "پرسین"، forschen (G.) "تۆیژینەوە" [دە بنەرەتدا پرسیارکردن، بە شوێن پرسیار کەوتن]، poscere (L.) "داوا کردن، لێکۆڵینەوە"، prccha (OIn.) "پرس"، سەر بە ریشەی < *prek-* (IE.) "پرسین".

**پرسە pırse** [ *pırsa* ] - "سەرەخۆشی، تازییە": وشەکە خزمە دەگەڵ ↑پەرستن perıstın و ↑پاڕانەوە paranewe. مەبەست دە بنەرەتدا دووعا کردن و پاڕانەوە بۆ مردوو بووە.

**پرش pırş** [ *pırš* ] - "پەرژ و بڵاو": پەرژ/ پرژ pırj / perj. ↑پرژان pırjan.

**پرشنگ pırşeng** [ *pıršang* ] - "1- تیشک 2- پریشکی ئاگر":

1- ئەم وشەیە وێکچووتیکی زۆر نیشان دەدا دەگەڵ prśni-h (OIn.) و perknós (Gr.) "رەنگاورەنگ"، سەر بە ریشەی < *perk-* (IE.) "پەڵەپەڵە، رەنگاورەنگ". Farbe (G.)، verf (Nl.) "رەنگ"، farawēr (OG.) "رەنگین" دەچنەوە سەر ئەو ریشەیەیە. دوور نییە دە زمانی کوردمادیشدا مەبەست لە پرشنگ دە بنەرەتدا "رەنگ" بووبێ و بۆ وێنە مەبەست لە "پرشنگی نیگا کاڵ" رەنگی کاڵی چاو بووبێ.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑پریشک pırîşık [ی ئاگر]. لەم تێڕوانینەوە "پرشنگی نیگا" ئاماژەیەکە بۆ نیگایەکی گەرم کە وەک ئاگر پریشکە دەهاوێژێ.

**پرگ pırg** - "1- پارچەزەوی 2- کەرتەمەڕ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *perk-* (IE.) "پچڕین، هەڵدڕین". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑برەک bırek "تیرەبەراز".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "پچڕین، هەڵدڕین" و "کەرت، پارچە" بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەکانی "کەرت" یان "ران" [گاڕان]. ئەم وشانەش پێوەندییان بەو ریشانەوە هەیە کە مانای "بڕین، پچڕین، رنین، لێکردنەوە" دەبەخشن].

**پرماندن pırmandın** [ *pırmāndın* ] - "دەنگی لووتی یەکسم": خزمە دەگەڵ ↑پرخاندن pırxandın.

**پرووزان pruzan** [ *pırūzān* ] - "سووتانی موو و خوری": ↑پرووکان prukan یش دەگوترێ.

1- جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Flaus (G.)، vlus (OG.)، vlies (NL.) "خوری، مەرەز"، هەروەها pluskos (Lit.) "موو، ریشۆلە"، سەر بە ریشەی < *pleus-* (IE.) "موو دەرکێشان، لێکردنەوەی موو و خوری". ↑پرز pırz بەمانای "کوڵکە، موو، ریشۆڵە" دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمە.

2- لەوانەشە خزم بێ لەگەڵ ↑برژان bırjan.

پرووسک **pırusk** [ *pırūsk* ] - دەگەڵ ئێسک دێ [ئێسک و پرووسک êsık û pırûk].

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Fleisch (G.)، fleisc (OG.)، vlees (Nl.)، flesh (E.) "گۆشت"، flesk (OIs.)، fläsk (Sw.) "گۆشت و بەزی بەراز"، pluta (Let.) "گۆشت، پێست". لەوانەیە دە زمانی کوردمادی کۆندا لەجیاتی گۆشت وشەی پرووسک بەکارهێندرابێ و دواتر جێگەی پێ لێژ کرابێ.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑پرووسکان pıruskan "لەبەر یەک هەڵوەشان" [دەبنەڕەتدا: پەڕژ و بڵاو بوون (ی لاشە)].

پرووسکان **pıruskan** [ *pırūskān* ] - "لەبەر یەک هەڵوەشان": وشەکە دەبنەڕەتدا بە مانای "پەڕژ و بڵاو بوون"ە و خزمە دەگەڵ ↑پڕژان pırjan. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ spritzen (G.) "پڕژان، فیچقان، دەرپەڕینی ئاو و ئاگر"، sprutze (G.) "پریشکی ئاگر". دە کوردمادیشدا پرووسکە pıruske بەمانای "پریشکی ئاگر، ئاورینگ" دێ.

پرووسکە **pıruske** [ *pırūska* ] - "ئاورینگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑پریشک / پریشکە pırîşk و هاوپێوەندە دەگەڵ ↑پرووسکان pıruskan.

پرووش **pırûş** [ *pırūš* ] - "چاوی کەمبین و نەخۆش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فرووزی fırûzî "زۆر وردیلە".

پرووشە1 **prûşe 1** [ *pırūša* ] - "کەم کەم خواردن" (بە حاڵ پرووشە دەکا). دەشێ خزم بێ دەگەڵ دەگەڵ ↑فرووزی fırûzî "زۆر وردیلە".

پرووشە2 **prûşe 2** [ *pırūša* ] - "وردە وردە بەفر بارین": خزمە دەگەڵ frieren (G.)، friosan (OG.)، vriezen (NL.)، freeze (E.)، frysa (Sw.) "بەستن لە سەرمان"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *preus-*** > "پرووشەکردنی بەفر، زوقم". هەروەها frius (Gt.) "سەرما، بەستەڵەک"، pruina (L.) "زوقم و بەستەڵەک"، prusva (OIn.) "زوقم، سەهۆڵ" و Frost (G.) "زوقم، بەستەڵەک" پێوەندییان بە وشەکانی سەوەوە هەیە.

پرووکان **prukan** [ *prūkān* ] - "1- نیوەسووتانی پێست و شتی دیکە 2- هەڵپرووزانی موو": لەگەڵ پێشگری "هەڵ" بەکار دێ: هەڵپرووکان helprukan. شێوەیەکی دیکە لە ↑پرووزان "سووتانی موو و خوری".

پرووکە **pırûke** [ *pırūka* ] - "دەنکی وردی بەفر": خزمە دەگەڵ ↑پرووشە prûşe "وردە وردە بەفر بارین".

پریتاندن **pırîtandın** [ *pırîtandın* ] - "توند بە زەویدا کوتان": [ڤەپریتاندن ve-pırîtandın]. پلیتاندن pılîtandın یش دەگوترێ [ڤەپلیتاندن ve-pılîtandın].

1- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑پلۆسین pılosîn "لێدان".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑فرێ fırê دان [پرت کردن pert kardan (P.)].

پریشک **pırîşk** [ *pırīšk* ] - "تیکەپارەی ئاگر و ئاو": خزمە دەگەڵ ↑پڕژان pırjan و پێوەندی بە پار(ە) بە مانای "لەت، تیکە"وە نییە، چونکوو پریشک تەنیا جۆرە تیکەیەکە بەهۆی پڕژان یان دەرپەڕینەوە پەیدا دەبێ.

پریکە **pırîke** [ *pırīka* ] - "تریقە، پێکەنین بە دەنگی بەرز": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ bark (E.) "وەڕینی سەگ". ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *(Gem.) *berkan*. ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە بە ڕوونی ساخ نەکراوەتەوە. لە زمانی فارسیدا وشەی پارس pars (P.) "وەڕینی سەگ" دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: زۆر لەو وشانەی دەنگی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەردەبڕن، دە بنەڕەتدا ریشەی هاوبەشیان هەیە. بۆوێنە "قووزە" واتا دەنگی درێژی سەگ خزمە دەگەڵ "قیژە"، "وەڕین" خزمە دەگەڵ "هاوار"، "حیلاندن" ی ئەسپ خزمە دەگەڵ "حیلکاندن"ی مرۆڤ، "قڕاندن"ی قەل و "دەمەقرە"ی مرۆڤەکان و هتد].

**پریواندن pırîwandın** *[ pırīwāndın ]* - "لێکردنەوەی شتی هیشک بوو بە دەست رێخشاندن": پرواندن pırwandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ reiben (G.)، riban (OG.)، wriven (MNl.) "رێخشاندن". ئەو وشە ئەڵمانییانە وا لێک دراونەوە کە دە بنەڕەتدا فۆتیمی w یان بە سەرەوە بوون و بەمانای "ورد کردنێکی بە سووڕاندنەوە یان بە سووڕاندنەوە ورد کردن" بە کار هاتوون. ئەم مانایە بەتەواوی دەگەڵ مانای وشە کوردمادییەکە یەک دەگرێتەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *wer- >** "سووڕاندن". rub (E.) "پاک کردن بە رێخشاندن، سرینەوە"، رفتن/ روبیدن rūbīdan / roftan (P.) "گەسک لێدان، خاوێن کردنەوە" [دەبنەڕەتدا: رێخشاندنی گەسک]، ↑ ribisen (MG.) "بەکێشەهاتن" [دەبنەڕەتدا: لێک کەوتن، **اصطکاک**] خزمایەتیان دەگەڵ وشەکانی سەوەوە هەیە. ئەو ریشەی هیندوئەورووپییەی سەرەوە دە زمانی کوردمادی و زمانە خزمەکانی دیکەدا لک و پۆیەکی یەکجار زۆری لێ دەبێتەوە، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑وڕ wır، ↑وەرانین weranîn، ↑وەروەرە werwere، ↑فڕفڕە fırfıre و هتد.

**پرێسکە preska** *[ preska ]* - "بوخچەی لە دەسرۆکە":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە byrsa (Gr.) "پێست، کیسەی چەرمین". ئەم وشەیە لە رێگەی زمانی لاتینی و پاشان فەرانسەیی هاتووەتە ناو زمانی هولەندی و ئەڵمانیش و وەک beurs و Börse بە مانای "توورەکە یان کیسەی پووڵ" بەکار دەهێنرێ. وشەی *بورس* "بازاری کاغەزی بایبدار" لە زمانە ئەورووپییەکاندا بۆ ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە.

2- لەوانەیە "پەرۆچکە peroçke" بووبێ بە مانای "پەرۆی چکۆڵە".

**پرێش pırêş** *[ pıreš ]* - "ریزاڵ، ریشاڵ، بزگوڕ، ورد و خاش": خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە مانای پەرت و بڵاو بوون، لەبەر یەک هەڵوەشان دەدەن، وەک ↑پرووسکان pırûskan "لەبەر یەک هەڵوەشان"، ↑پەرێشان perêşan "شپرێو" و پرژان pırjān "بەم لا و ئەو لادا بڵاو بوون".

**پز pız** *[ pız ]* - "بێچووی ناوزگ، تۆل": خزمە دەگەڵ ↑پس *pıs* "کوڕ" [پسمام واتا کوڕی مام]، ↑بێچوو [بێچ + ئوو] beçu، ↑بچووک [بچ + ئووک] bıçûk و گەلێک وشەی دیکە، گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بەواتای "کەم، چکۆڵە".

**پزان pızan** *[ pızān ]* - بڕوانە ↑هەڵپزان helpızan.

**پزدان pızdan** *[ pızdān ]* - "1- منداڵدان 2- باڵۆن، لەیستۆکی منداڵان": لە ↑پز pız "بێچووی ناوزگ، تۆل" وەرگیراوە: پز + دان [پاشگری تێدابوون] pız + dan. مانای دووەمی "پزدان" واتا "باڵۆن" لەوە ناچێ پێوەندی هەبێ بە "هەڵپزان" و ئەو وشانای مانای "با کردن، ماسین" دەبەخشن، چونکوو ئەوساکە دەبا لە جیاتی پاشگری "دان" شتێکی دیکە بەکار هێنرابایە. لێرەدا ئێمە نموونەیەک لە وشەسازی وەستایانەی زمانی کوردمادی دەبینین. "پزدان" دە ڕاستیدا ئەو پەردە ناسک و تەنکەیە کە دەناو منداڵداندا "پز" واتا "بێچوو"ەکەی تێدایە. باڵۆن وەک لەیستۆکی منداڵان شتێکی هێندە کۆن نییە. کاتێک ئەم لەیستۆکە هاتووەتە بازارەوە، لەبەر هاوشێوە بوونی بە "پزدان"، ئەم ناوەی لەسەر دانراوە کە پڕ بە پێستی خۆیەتی و ئیتر بە پێویست نەزانراوە ناوێکی تازەی بۆ دابتاشرێ.

**پزدووک pızdûk** *[ pızdūk ]* - "باپشکێو، چینچکەسڵاو": خزمە دەگەڵ ↑هەڵپزان helpızan، ↑پیشاو pîşaw [بۆقی پیشاو] و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "ئەستوور بوون، با کردن، ماسین".

پزوسک **pızusk** - "پروسک، پریشکە، ئاورینگ": بزیسک bızîsk و بژنگ bıjıng یش دەگوترێن. پشنگ pašang (.P). خزمە دەگەڵ ↑پژان pıjan. پزوسک ئەو تیکە وردیلانەیە کە لە ئەنجامی "پژان"دا دروست دەبێ، هەروەک چۆن "پریشک"یش دەگەڕێتەوە سەر کرداری "پرژان".

پزوو **pızû** *[ pızū ]* - "جێگەی دۆخین لە دەرپێ دا، جێگەی بەند لە کیسە و توورەکەدا": پزگ pızg یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هەڵپزان helpızan و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "با کردن، ماسین، ئەستوور بوون، زل بوون(ەوە)". پزووی دەرپێ یان توورەکە شوێنێکی فش و بۆش و هەڵپزاوە کە بەند یان دۆخینی تێرا دەکەن. هەموو ئەو وشانە واتا ↑فش fış و پزوو pızû و ↑بۆشboş و هەڵپزان helpızan پێکەوە خزمن و لە یەک ریشەوە پەیدا بوون.

پزە **pıze** *[ pıza ]* - "نەخۆشییەکی مەڕ": خزمە دەگەڵ ↑هەڵپزان helpızan.

پزیشکە **pızîşke** *[ pızīška ]* - "نووسەکە، نووسەنەک، بەری گیایەکی دڕکاوی کە بە خوری و جلکەوە دەنووسێ":

1- لەوانەیە پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە مانای موو و خووری دەبەخشن، وەک ↑پەز pez، ↑پەشم peşım، ↑بژ bıj [یاڵ و بژ]، ↑بووزوو buzu و هتد.

2- لەوانەشە دە پێوەندیدا بێ دەگەڵ هێندێک وشە کە مانای "تۆێکڵی دەخڵ و دان" دەبەخشن، وەک ↑پووش pûş، ↑پژ pıj "داسووکەی دەخڵ"، پژاڵ pıjal "پڕ و پووش" و هتد. لەوانەیە ئەم دوو دەستەوشەیە دواجار خزم و سەر بە یەک ریشە بن.

پزینک **pızînk** *[ pızīnk ]* - "بزمک، دەمبێنی بێچووی ئاژەڵ": پز + پاشگری ئینک pız + înk. کەرتی پز -pız بەشێوەی بز -bız لە وشەی ↑بزمک bızmık دا دەبینرێ. ئەم کەرتە خزمە دەگەڵ پوزە pūze (.P) و ↑قەمپۆز qempoz [قەم + پۆز] دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "دەم و لووتی ئاژەڵ".

پژ **pıj 1** *[ pıž ]* - "داسووکەی دەخڵ 2- لکی باریکی دار": پژاڵ pıjal یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑پووش puş. هەروەها پژ و پۆ pıj û po هەیە و پژن pıjın بە مانای "بە لک وپۆ".

پژ **pıj 2** *[ pıž ]* - "یاڵ": ↑بژ bıj [یاڵ و بژ] و پژوو pıjû ش دەگوترێن. هەروەها پژن pıjın هەیە بە مانای "پرچن" و پژنچە pıjınçe هەیە بە مانای "قاشاق، رنەک".

پژان **pıjan** *[ pıžān ]* - "پرژ و بڵاو بوون": پاشیدن pāšīdan (.P) "پژاندن". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا بەدی دەکرێن کە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، وەک ↑پەش peş "پەق، لێک بڵاوی"، ↑پەشیلان peşîlan "وێران بوون، رووخان"، ↑بەژقین bejqîn "ورد بوون لە ژێر شتی قورسدا"، ↑بژکین bıjkîn "پرژان، بڵاو بوون"، ↑پشکۆ pışko "پۆلووی گەشاوە" [بڵاو بۆوە]، ↑پشکووتن pışktın "کرانەوە"، ↑بشکۆژ bışkoj "شکۆفە"، ↑بژاڵ bıjal "بڵاوی و پەرێشانی"، ↑پەشێو peşêw "بیربڵاو"، ↑پشکنین pışkınîn و هتد. گشت ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە چەمکی "لەبەر یەک بڵاو بوونەوە، بەم لاو ئەولادا بڵاو بوونەوە". کاتێک لەناو وشە ئەورووپییەکاندا دەگەڕێین، تووشی وشەیەک دەبین کە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ، واتا pássein (.Gr) "پژاندن، پێوەر کردن، پرژاندن". وشەی pástē (.Gr) "هەویر، پەڵوو" پێوەندی بەم کردارەوە هەیە. روون نەکراوەتەوە کە چۆن لە مانای یەکەمەوە، مانای "هەویر" سەرچاوەی گرتووە. هەروەها ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە باس نەکراوە.

[دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 244) لە لایەکەوە وشەی پاشیدن pāšīdan بردراوەتەوە سەر ئەو ریشەیەی کە لە ژێر "پرژان"ی کوردمادیدا ئاماژەی بۆ کراوە. لە لایەکی دیکەوە پێوەندی دەگەڵ وشەی ↑بەش beş (بخش بە فارسی) پێشنیار کراوە. هیچکام لەم بۆچوونانە وە راست ناچن].

پژکاندن **pıjkandın** *[ pıžkāndın ]* - ڤەپژکاندن ve-pıjkandın واتا "راوەشاندن". خزمە دەگەڵ ↑وەشاندن weşandın. فۆتیمی k ناوگرە و دۆخێکی جەخت کردن بە کردارەکە دەبەخشێ، وەک لە کردارەکانی ئاڵۆزکان، بزرکان، پەشۆکان و هیتردا.

پژڵاندن **pıjlandın** [ *pižlāndın* ] - دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ، ڤەپژڵاندن vepıjlandın واتا "سوور بوو، مکوڕ بوون، پێداگرتن". ڤەپژڵان vepıjlan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑پشاوتن pışawtın و فشار fešār (P.) "زەخت" و فسردن fosordan (P.) "ڕێکگوشران، سەخت بوون". لەوانەیە وشەی ↑پەستاوتن pestawtın یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: پێوەندی نیزیک هەیە لەنێوان "پێداگرتن" و "هێز و فشار"دا. وشەی "مکوڕ" بە مانای "پێداگر" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هێز". هەروەها "جەخت" کردن خۆی خزمە دەگەڵ زەخت بە مانای "زۆر، فشار، هێز"].

پس **pıs** [ *pıs* ] - "کوڕ": [پسمام واتا کوری مام]. خزمە دەگەڵ ↑پز pız "بێچووی ناوسک"، ↑پیزە pîze "پیچ، کەم، هندک"، پچ pıç [↑پچێک pıçêk واتا کەمێک]، ↑بێچوو beçu، ↑بچووک bıçûk [بچ + ئووک] [یان پچووک pıçûk] و لە پلەیەکی دواتردا دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بار bar [بارەکەو] و ↑پوور *pur*. گشتیان سەر بە ریشەکن بە مانای "بچووک، وردیلە، کەم". دە زمانی فارسیدا پسر pesar (P.) مانای "کوڕ" دەدا. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *pau- >** "بچووک، وردیلە، کەم".

پسان **pısan** [ *pısān* ] - "لەت بوون، قرتان": بزدیان bızdîyan یش دەگوترێ [ڤەبزدیان]. گسستن gosastan (P.). دە زمانی فارسیدا فۆنیمی سەرەتای وشەکە گۆڕاوە و بووەتە g. ئەم وشەیە و هەروەها وشەی ↑پاچین paçîn [هەڵپاچین، داپاچین] و ↑پچرین pıçrîn دەشێ خزم بن دەگەڵ beißen (G.)، bizan (OG.)، bite (E.)، bitan (Gt.) "گەستن، قەپاڵ لێدان"، bita (Sw.) "گەستن، برین، برینداد کردن"، bhinatti (OIn.) "لەت دەکا، دەقەڵشێنێ"، findere (L.) "لەت کردن، قەڵشاندن" [دەنگی n خزاوەتە ناو وشە لاتینییەکەوە] سەر بە ریشەی **(IE.) *bheid- >** "کوتان، لێدان، لەت کردن". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑پەت² pet [لەت و پەت]، ↑پاتک patık "پەڕۆی پینە"، ↑پاتە pate "ورتکە نان"، ↑پاتۆز patoz "ماشێنی دروێنە" [لەت و پەتکەر]، ↑پیتک pîtık "کوتک" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. هەروەها لەوانەیە ↑پاچ paç "قووڵینگ" پێوەندی بەو وشانەی سەرەوە هەبێ.

پسپۆڕ **pıspor** [ *pıspor* ] - "لێزان، کارناس": لەوانەیە پێک هاتبێ لە دوو کەرتی پس + پۆڕ pıs + por. کەرتی یەکەم لەوانەیە پێشتر "وز wız" بووبێ و پێوەندی هەبێ بە ↑ئاوەز awez [a-wez ] "ئەقڵ، تێگەیشتن". کەرتی دووەمی وشەکە، واتا پوڕ por خزمە لەگەڵ ↑پڕ pır و بەم شێوەیە مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "پڕزانست، پڕئاوەز".

[تێبینی: لەباری ماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی فارسی "فرزانە" بە مانای "ئاوەزمەند، فرەزان". کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا "فرە"، خزمە دەگەڵ "پڕ"].

پستە **pıste** [ *pısta* ] - "بەرێکە لە چەشنی گوێز و بادام": پستە peste (P.)، فستق festeq (Arb.)، pistasie (G.)، pistakion (Gr.) "پستە".

[تێبینی: ئەم وشەیە ڕیشەکەی بردراوەتەوە سەر زمانی یۆنانی، بەڵام وشەکە وەک لە شێوەکەی دەردەکەوێ، وێ دەچێ لە زمانە ئێرانییەکانەوە چووبێتە ناو زمانی یۆنانییەوە و سەرەتا *پێستەک* **pestek* بووبێ. کەرتی ek- هەر ئەو پاشگرەیە کە تا ئەمرۆش دەورێکی چالاک لەو زمانانەدا دەبینێ].

پسک **pısık** [ *pısık* ] - "کەسێک نەتوانێ دەنگی s باش گۆ بکا": فسەزمان fısezıman یش دەگوترێ. ئەم وشەیە لەم خێزانەوشەیەدا جێ دەگرێ کە دەچێتەوە سەر ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە". مرۆڤی پسک لە کاتی گۆ کردنی دەنگی s دا هەوا لە کەلێنی ددانەکانیانەوە دەردەچێ و دەنگێکی تایبەتی دروست دەبێ. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑فیچ fîc "کۆڵۆس، کەسێک ددانی پێشەوەی کەوتبێ" و لەوانەشە دەگەڵ چەند وشەیەکی دیکەی وەک ↑پسەپس pısepıs "سرتەسرت" و ↑پچە pıçe.

پسکان **pıskandın** [ *pıskāndın* ] - "بەردەست بوون، هاتنە ژێر فەرمان": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەپسکان vepıskan]. هەروەها ڤەپسکاندن vepıskandın هەیە بە مانای "هێنانە ژێر فەرمان، کەوی

کردن“. ئەم وشەی دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەزین bezîn ”دۆران لە پێشبڕکێ و زۆرانبازی“دا. مانای ”پسکان“ دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە ئاژەڵێک دەستی لە ململانێ و سەرکێشی هەڵگرتووە و بەزیوە، واتا خۆی داوە بە دەستەوە. فۆتیمی k ناوگرە و کردارەکە دەخاتە ناو دۆخی جەخت کردنەوە. ئەم ناوگرە دەگەڵ ژمارەیەک کردار دێ، وەک ئالۆزکان، پەشۆکان، بزرکان و هتد.

**پسکە pıske** [ *pıske* ] - ”ئاخێزی راوکەر بەرەو تێچیر“: وێ دەچێ پێوندی هەبێ بە ↑باز(د) baz(d) و ↑بزوان *bızwan*.

**پسەپس pısepıs** [ *pısapıs* ] - ”سرتەسرت“: خزمە دەگەڵ ↑پچە piçe.

**پسوولە pısule** [ *pısūla* ] - ”قەبز، رەسید“:< *وصول wosūl* (.Arb) ”گەیشتن“. دە زمانی فارسیدا وشەی ”رسید“ بەکار دێ کە لە کرداری ”رسیدن“ وەرگیراوە بە مانای ”گەیشتن“.

**پسیک pısîk** [ *pısīk* ] - ”پشیلە، کتک“: شێوەیەکی دیکە لە ↑پشیلە pışîle.

**پش pış** [ *pıš* ] - ”1- فشەڵۆک، ناپتەو 2- سی، کیسەی هەناسە“: خزمە دەگەڵ ↑فش fış [فش و فۆڵ]، ↑بۆش boş”بەتاڵ“، ↑فس fıs ”بای لەش“، ↑پیش pîş ”هەناسە“، پۆز poz [↑قەمپۆز qempoz واتا لووتی ئاژەڵ]، ↑هەڵپزان helpīzan ”ماسین، با کران، ئەستوور بوون“، ↑بۆز boz ”نەخۆشی ماسینی چۆکی ئاژەڵ“، ↑پیس pîs ”بۆگەن“ [دەبنەڕەتدا: باکردوو].

[تێبینی: سەبارەت بە مانای ”سی، کیسەی هەناسە“، دەتوانین لەباری ماناوە هەڵیسەنگێنین دەگەڵ وشەی یۆنانی pneumon (.Gr) ”سی، کیسەی هەناسە“ کە دەچێتەوە سەر pneuma (.Gr) ”دەم، هەناسە“ و خزمیشە دەگەڵ *بینە* ”هەناسە“ لە زمانی کوردمادیدا و *بینی* ”لووت“ لە زمانی فارسیدا].

**پشاوتن pışawtın** [ *pıšāwtın* ] - ”گوشین، شێلان“: دەشێ خزم بێ دەگەڵ psáein (.Gr) ”رێخشاندن“.

[تێبینی: پێوەندی نیزیک هەیە لەتیوان چەمکەکانی ”پشاوتن، گوشین، شێلان“ و ”رێخشاندن“دا. بۆ وێنە ”مشتوماڵ“ دان بە مانای ”شێلان، پشاوتن“ پێوەندی هەیە بە ”ماشتن“ و ”ماڵین“ەوە کە ئاماژە بە رێخشاندنی گەسک بە سەر هەرددا دەکا].

**پشت1 pışt 1** [ *pıšt* ] - ”1- ئەو بەشەی لەش کە بەرەو دواوەیە 2- پاش“: پشت poşt (.P) ”پشت“، post (.L) ”پاش“.

**پشت2 pışt 2** [ *pıšt* ] - پشتەکەوا pıştekewa مانای ئەو برە پارچەیە کە کەوایەکی پێ دروست دەکەن. خزمە دەگەڵ ↑پەشت peşt ”بەن یا دەزووی بادراو، گشتەک“ و دواتر ↑*فاق2 faq 2* ”1- جورێک داو بۆ گرتنی پەلەوەر 2- جۆرێک پارچەی رەش بۆ چارشێوی ژنان“.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی ”بەن، دەزوو“ دەگەڵ ”پارچە“ دە وشەی ”داو“ و ”جاو“دا بە باشی دەبینرێ. ئەم دوو وشەیە خزمن، یەکەمیان مانای ”دەزوو“ و دووەمشیان مانای ”جۆرێک پارچە“ دەدا].

**پشتیوان pıştîwan** [ *pıštīwān* ] - ”پشتگیر، ئاریکار“: هەروەها پشتیوانە pıştîwane هەیە بە مانای ”دارێک کە دەخرێتە پشت دەرگا بۆ قایم کردنی“. پشت + ی+ وان [پاشگر] wan + î+ ↑پشت pışt. کەرتی ↑وانwan- ئاماژە بە ئاگاداری کردن و پاراستن دەکا بۆ وێنە لەم وشانەدا: شوان، گاوان، باخەوان، شۆڕشڤان و هتد.

**پشتێر pıştêr** [ *pıştêr* ] - ”تەویلە، گەوەڕ“: لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑پشکەڵ pışkel ”پیسایی بزن و مەڕ و هەندێک ئاژەڵی دیکە“.

**پشک1 pışık 1** [ *pıšık* ] - ”بەش“: خزمە دەگەڵ ↑بەش beş.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی ”سەرپشک“ و ”بن پشک“ بەکار دێن کە پێوەندییان بەم وشەوە هەیە. ”سەرپشک“ ئەو کەسەیە کە لە کاتی هەڵبژاردن (ی بەش) و بەش وەرگرتندا یەکەم کەسە، لە سەرووی ئەوی دیکە یان ئەوانی دیکەوە دەوەستێ و بەشی باشی پێ دەبرێ. ”بن پشک“ بە کیژێک دەگوترێ کە بدرێ بە ژن بۆ برای [زارا بن پشکی شاهۆیە]. لێرەدا زارای بێچارە لە پشک وەرگرتن و

بەش پێبڕاندا کەسێکی ژێرکەوتوو و بێدەسەڵاتە. ڕەنگە لەم تێڕوانینەوە بێ کە ناوی "بن پشك" بۆ ئەو کیژە دیاری کراوە، واتا "سەرپشك" کەسێکە پشکی خۆی هەڵدەبژێرێ و "بن پشك" کەسێکە کە مافی هەڵبژاردنی پشکی نییە و هەرچی وەبەری کەوتن دەبێ وەری بگرێ، بە داخەوە].

**پشك2 pışık** *[ pıšık ]* - "دارۆکەیەکە وەك پینە دە مشکەی کون بووی ڕادەکەن": پژك pıjık یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پژا pıj 1 "لکی باریکی دار".

**پشکنین pışkınîn** *[ pıškınīn ]* - "1- گەڕان لە شتێك، تەفتیش 2- هەڵوەشاندنی خوری و لۆکە": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە پەرژ و بڵاو بوون، پەرژ و بڵاو کردنەوە دەکەن، وەك وەك ↑پژان *pıjan*، ↑بەژقین bejqîn "ورد بوون لە ژێر شتی قورسدا"، ↑بژکین bıjkîn "پرژان، بڵاو بوون"، پشە pışe یان ↑بزیشك bızîşk "ئاورینگ، پریشکی ئاگر"، ↑پشکۆ pışko "پۆلووی گەشاوە"، ↑پشکووتن pışktın"کرانەوە"، ↑بشکۆژ bışkoj "شکۆفە"، ↑بژاڵ bıjal "بڵاوی و پەرێشانی" و هتد. پشکنین دە بنەڕەتدا بەو دۆخە گوتراوە کە مرۆڤ کۆمەڵێك شت یان کەلەپەل بەم لا و ئەو لادا بڵاو دەکاتەوە، بە وتەیەکی دیکە کۆمایەك یان کۆگایەك لەبەر یەك هەڵدەوەشێنێ، بۆ ئەوەی شتێکی تایبەتی بدۆزێتەوە.
[تێبینی: وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەیە کە مانای پشکنین دەدا و بریتییە لە ↑ڤەلۆ velo کردن. ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ "بڵاو" و هەروەها "ولو" دە زمانی فارسیدا. ئەم وشەیە شی کردنەوەی سەرەوە بە تەواوی پشتراست دەکا].

**پشکووتن pışkutın** *[ pıškūtın ]* - "لێك کرانەوە، لێك بوونەوە" [بۆ هێندێك شت بەکار دێ وەك خونچە، چاو]. پشکڤین pışkıvîn یش دەگوترێ. ئەم وشەی دوایی بە مانای "هەڵوەشانی دروومان"یش بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑پشکنین pışkınîn.

**پشکۆ pışko** *[ pıško ]* - "پۆلوو": لە ↑پشکووتن pışkutın وەرگیراوە. "پشکۆ" ئەو خەلووزەیە لە کاتی سووتاندا دەپشکوێ [لێك دەبێتەوە، ئاوەڵا دەبێتەوە].

**پشکەڵ pışkel** *[ pıškel ]* - "پیسایی بزن و مەڕ و هەندێك ئاژەڵی دیکە": پشك pešk / pošk (.P)، pača (.Pash). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ -purīşa (.OIn) "پشکەڵ، ریخ"، purvas (.Lit) "چڵك، کەمێڵ، پیسایی"، سەر بە ریشەی *(IE.) *prə- ,*perə- >* [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 277). بەگوێرەی بۆچوونێکی دیکە کە هەر لەم سەرچاوەیەدا باس کراوە، لەوانەیە "پشکەڵ" خزم بێ دەگەڵ ↑پەخش pexş]. دەشێ وشەکانی ↑پۆخڵ "چڵکن، پیس"، پۆخڵە poxle "بنی برین" و↑پەچەڵ peçel "پیس، پۆخڵ" و لەوانەیە ↑پشتێر pıştêr "تەویلە، گەوەڕ"یش پێوەندیان بەم "پشکەڵ"ەوە هەبێ.

**پشکیلان pışkîlan** *[ pıškīlān ]* - "گەمەیەکی شەو نشینییە کە ئەنگوستیلە لە باخەڵی یەکێك دا دەشارنەوە و دەستەی دیکە دەبێ بیدۆزێتەوە": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑پشکنین pışkınîn ەوە.

**پشمین pışmîn** *[ pıšmīn ]* - "دانەدەرەوەی هەوا بە پڕتاو لە دەم و لووتەوە": ↑پژمین pıjmîn و ↑پنژین pınjîn و ↑فشکین fışkîn یش دەگوترێن. پەیوەستن بە چەندین دەنگەوشەوە کە ریشەکەیان دەچێتەوە سەر دەنگی ↑فوو fu "با، هەوا، هەناسە". خزمە دەگەڵ ↑پیش pîş و ↑پشوو pışû "هەناسە".

**پشوو pışû** *[ pıšū ]* - "1- هەناسە 2- هەناسە دان، وچان دان": خزمە دەگەڵ ↑پیش pîş "هەناسە".

**پشیلە pışîle** *[ pıšīla ]* - "کتك": پشیك pışîk و پسیك pısîk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ fauchen (.G)، pfūchen (.MG) "فشکاندنی پشیلە، قیژەی هێرەشکەرانەی پشیلە". لەم تێڕوانینەوە ناوی "پشیلە" بۆ "قیژە و فشقاندنەکەی" دەگەڕێتەوە. خزمە دەگەڵ ↑فشقە fışqe.
[تێبینی: دە زمانی فارسیدا بە پشیلە دەگوترێ گربە gorbe (.P). ئەم ناوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ Welpe (.G) " بێچووی سەگ، ڕێوی و گورگ" کە ئەویش بە گوێرەی بۆچوونێك خزمە دەگەڵ hwelan (.OE)، hvellr (.OIs) "زیراندن، وەڕین، قیژاندن". وەك دەبینرێ، لێرەشدا ناوی ئاژەڵەکە لە دەنگەکەی وەرگیراوە].

**پشێو pışêw** *[ pıšew ]* - "پەرێشان": ↑پەشێو peşêw یش دەگوترێ.

**پف pıf** *[ pıf ]* - "فوو": پف کردن واتا فوو هێنانەدەر بۆ دوور کردنەوەی بۆنی ناخۆش. جگە لەمە پف کردن بە مانای "هەڵمسان و فوو تێکران"یش دێ. هەروەها "پف دان" هەیە بە مانای "فوو دان". دە فارسیدا پف و پیف pof و pîf (P.) دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑فو fu و↑پیش pîş "هەناسە". دە ئینگلیزیدا puff (E.) بە مانای "هەناسە، فوو" دێ. دە زمانی ئەڵمانیشدا puffen (G.) بەمانای "هەڵپزاندن، هەڵمساندن" بەکار دێ. چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشەوە پەیدا دەکەن وەک پفەک pıfek "ئامرازی فوو تێ کردن"، ↑پوفلک pufılk "پزدان"، پفەڵ pıfel "فشەڵۆک، متخلخل"، پفیو pıfîw "لەش گران"، پفکێ pıfkê "جتێوی ژنانە واتا گوشاد"، ↑پفە pıfe "خواردنی گەرم بە زمانی زارۆک" [دەبێ فووی لێ بکەی سارد بێتەوە].

**پفاندن pıfandın** *[ pıfāndın ]* - هەڵپفاندن helpıfandın واتا تەتەڵە کردن، هەڵتەکاندنی دەغڵ و تووتن بو پاک بوونەوە. خزمە دەگەڵ ↑پف pıf "فوو". مانای هەڵپفاندن دە بنەڕەتدا "بە با دان، دانە بەر با" یە بە مەبەستی جیا بوونەوەی زبڵ و زاڵ لە دەغڵ یان تووتن.

**پفە pıfe** *[ pıfa ]* - "خواردنی گەرم بە زمانی زارۆک": بڕوانە ↑پف pıf "فوو".

**پک pık** - "پشتەی جکێ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ back (E.)، bak (OS.)، bak (ON.)"پاش".

لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑پاش paş "بەرانبەری پێش، دواوە " [پس pes (P.) "پاش"].

**پل1 pıl** - دەگەڵ "دەم" دێ [دەم و پل dem û pıl]. خزمە دەگەڵ↑فلچ filç [دەم و فلچ] و هێندێک وشەی وەک ↑پرماندن pırmandın، ↑فرمک fırmık "کونی لووت "، ↑پاڵ pal [لاڵ و پاڵ] و دواجار خزم دەگەڵ ↑فوو fu [با، هەوا، هەناسە]. لەم تێڕوانینەوە پل یان فلچ دەبێتە شوێنی پێدا ڕەت بوونی هەوا [هەناسە].

**پل2 pıl** - "تیکە": [پلەگۆشت واتا تیکە گۆشت]، خزمە دەگەڵ ↑پار par یان پارە pare بە مانای "لەت، کوت".

**پل3 pıl** - "1- لێدانی ڕەکێ 2- چەقەنە بە پەنجە 3- تەزووی لەش": چەمکی هاوبەش لە هەموو ئەو مانایانەدا "لێدان"ە. چەندین وشە پێوەندی بە "پل"ەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑پلیک plîk یان ↑پلتۆک pıltok"پتە" [پڵتۆک هەروەها مانای "پەلەپیتکە"ش دەبەخشێ]، ↑پلپڵە pılpıle "لەرزانە" [خشڵێکە دەلەرێتەوە و *لێک دەدرێ*]، ↑پەپوولە *pepule* [یان پەڵپەلیسک pelpelîsk واتا پەڕ و باڵ لێکدەر]، ↑پلۆسین plosîn "لێدان"، ↑پلۆز ploz [ئالۆز و پلۆز واتا لێکدراو] و هتد.

**پلان1 pılan** *[ pılān ]* - "نەخشە، تەرح": ئەم وشەیە دە زمانە ئەوروپییەکانیشدا بەکار دێ و دەچێتەوە سەر *planta (L.)* < "بەری پێ، بن و تەختی خانوو" و دواتر "تەرحی خانوو". وشە لاتیینییەکە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑پەل pel، بڵاو bılaw و ↑*وڵات wılat*. دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها کرداری planen (G.)ی لێ دروست کراوە بە مانای "نەخشە کێشان، پلان دانان". دە زمانی کوردمادیدا شێوەیەکی دیکە لەم وشەیە، واتا ↑پیلان pîlan بە مانایەکی نیگاتیف بەکار دێ و ئاماژە بە نەخشەی نەیارانە دەکا.

**پلان2 pılan** *[ pılān ]* - "گلار بوون، خلۆر بوونەوە": ↑پلکان pılkan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑پێل pel "مەوج"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان".

**پڵاو pılaw** *[ pılāw ]* - "برینجی لێندراوی بە سەلەدا کراو": سەر بە کرداری ↑پاڵاوتن palawtın. لەبەرئەوەی برینجەکە بەسەلەدا دەکرێ [دەپاڵێورێ]، ناوی پڵاوی لێندراوە.

**پلپڵە pılpıle** *[ pılpıla ]* - "لەرزانە": خزمە دەگەڵ ↑ پل3 pıl "لێدانی ڕەکێ". پلپڵە خشڵێکە دەلەرێتەوە و *لێک دەدرێ* .

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لە چەشنی پلپڵە دروست کراون، وەک شەقشەقە، خولخولە، فڕفڕە، ودودە، غەرغەڕە، وەروەرە و هتد. لەم وشانەدا بنەوشەیەک دووبارە دەبێتەوە. ئەمە

شێوەیەکە کە لەباری رێزمانییەوە دۆخی جەخت کردن دروست دەکا و بەتایبەتی بۆ ئەو کەلوپەلانە بەکار دێ کە کردارێک تێیاندا دووبارە و چەند بارە دەبێتەوە].

**پڵتۆک pıltok** [ pıltok ] - "1- پتە 2- پەلەپیتکە": خزمە دەگەڵ ↑پل3 pıl "لێدانی رەکێ".

**پڵچ pılç** [ pılč ] - "پان، بڵاو": زۆرتر دەگەڵ پان دێ [پان و پڵچ]. فلچ fılç یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ (G.) platt، (OFr.) plat، (Gr.) platys "پان، تەخت، ساف". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑پەل pel "تەخت، نەقووڵ"، ↑وڵات *wılat* "سەرزەوی" [دەبنەڕەتدا: پانتایی زەوی] و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**پلژیان pılĵîyan** [ pılžīyān ] - "سیس بوون، چرچ بوون": پلاسیدن (P.) palāsīdan. خزمە دەگەڵ (G.) falten، (E.) fold، (Fr.) plisser، (L.) plicare "قەد بوون، چرچ بوون"، سەر بە ریشەی **< *pel- (IE.)** "قەد بوون، چرچ بوون".

**پلک pılk** - "پوور، خوشکی باوک": خزمە لەگەڵ ↑پوور pur و لەوانەشە دە بنەرەتدا پوور + ک (ı)k + purبووبێ و دواتر بووبێتە "پلک". پاشگری ık دەچێتە سەر چەندین وشەی دیکەش وەک دایک، باوک، خوشک، میمک، نەنک و هتد. ئەم پاشگرە لەم دۆخەدا پاشگری خۆش ویستن و ڤیاندنە.

**پلکان pılkan** [ pılkān ] - " گلان، گلۆر بوون": ↑پلان2 pılan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ پۆل pol یان ↑پێڵ pel "مەوج، شەپول" و ↑وێڵ wel "سەرگەردان، ئاوارە" و چەندین وشەی دیکەی سەر بە ریشەی **< *uel- , *wel- (IE.)** "سووڕان، خولان، با دران".

**پلکە pılke** [ pılka ] - "بسک و کەزی": خزمە دەگەڵ ↑پۆلکە polke "تۆێکڵی چەڵتووک، بلۆقی دەست"، (G.) Pelle "پێست، تۆێکڵ"، (G.) Fell، (Gt.) fill، (E.) fell، (L.) pellis، (Gr.) pella. "پێست، پێستە"، سەر بە ریشەی **< *pel- (IE.)** "داپۆشین، تێ پێچان".

[تێبینی: شیاوی باسە وشەی بسک bısık یش خزمە دەگەڵ ↑پێست pest و ↑پەشم peşım].

**پللار pıllar** [ pıllār ] - "دار(دەست) بۆ هاویشتن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Pfeil، (E.) pil، (L.) pilum "پللار". کەرتی ar- دە وشە کوردمادییەکەدا لەوانەیە پاشگر بێ.

**پڵنگیان plıngîyan** [ plıngīyān ] - "ئاڵۆزان و تێکهاڵان": خزمە دەگەڵ ↑پڵۆز pıloz [ئاڵۆز و پڵۆز واتا تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراو]. فۆتیمی n زێدەیە و خزواتە ناو وشەکەوە.

**پلوورە pılure** [ pılūra ] - "شەڵخە، هەنگەمێش": خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır،↑پۆل pol، ↑فرە fıre و هتد. هەڵی سەنگینە دەگەڵ (E.) plural "کۆ، چەندانە" کە دەچێتەوە سەر (L.) plūr "زۆر".

**پلووسک pılusık** [ pılūsk ] - "لووساوک": خزمە دەگەڵ (G.) fließen "جاری بوون"، (G.) Fluß "چەم"، (G.) Flut "سێڵاو، لێشاو"، (E.) fleet، (Sw.) flyta، (Lit.) plusti "جاری بوون"، سەر بە ریشەی **< *pleu- (IE.)** "جاری بوون".

**پلۆز pıloz** - "پرپۆڵە، ئارد و ئاوی تێکەڵ بۆ خۆراکی جووجە": خزمە دەگەڵ ↑پەلوو pelu.

**پڵۆز pıloz** - دەگەڵ "ئاڵۆز" دێ [ئاڵۆز و پڵۆز واتا تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراو]. دە فارسیدا دەگوترێ پلوغ (P.) plūġ [شلوغ پلوغ]. خزمە دەگەڵ ↑پلۆسین plosîn "لێدان". دیارە لێرەدا مەبەست "لێکدان"ە. [شیاوی سەرنجە کە وشەی شلووق یان شلۆقیش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و خزمیشە دەگەڵ "شەڵەقان"]. لێرەدا دەتوانین پەنجە بۆ وشەیەکی دیکەش رابکێشین کە ئەویش وشەی ↑قەرەباڵغ qerebalıġ ە. کەرتی باڵغ -balıġ دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و ئاماژە بە شلۆقی و تێکەڵ پێکەڵی حەشیمەت دەکا.

**پلۆسین plosîn** [ pılosīn ] - "لێدانی توند": ↑داپڵۆسین dapılosîn.

**پلەتسیان pıletsîyan** [ pılatsīyn ] - "سست و خاو بوونەوە": خزمە دەگەڵ ↑فل fil [شل و فل، فل بوون واتا ماندوو بوون، لە هێز کەوتن]. هەروەها پڵت pılt هەیە بە مانای "بڵ، نەرم، شل" کە دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ، سەر بە ریشەی **< *ple-, *pla- (IE.)** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە".

پڵیخان **pılîxan** [ *pılīxān* ] - "پڵیشان، پان و پڵچ بوونەوە": پەڵخین pelxîn و پەڵخان pelxan یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ گەلێک وشە کە ئاماژە بە "پان و بڵاو بوون" دەکەن. بڕوانە ↑وڵات wılat، سەر بە ریشەی < **(IE.)** ***ple-, *pla-*** "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە".

پڵیشان **pılîşan** [ *pılīšān* ] -"پڵیخان، پان و پڵچ بوونەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑پڵیخان pılîxan. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پەلشقە pelışqe "شل و شەوێق" [دەبنەڕەتدا: لەبەر یەک بڵاو بوو].

پلیک **plîk** [ *plîk* ] - "پتە": خزمە دەگەڵ ↑پل3 pıl "لێدانی رەکێ".

پلینگ **pılîng** [ *pılīng* ] - "دڕەندیەکی تیژ و چابوک": ئەم وشەیە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پەلە pele و↑پەڕین perîn سەر بە ریشەی < **(IE.)** ***preu-*** "بازدان، پەڕین". پڵینگ دڕەندەیەکی زۆر تیژ و خێرایە و بازدەکانی بەناوبانگە.

پن1 **pın 1** - "قرنوو، جانەوەرێکی چکۆڵەیە بە پێستی ئاژەڵەوە دەنووسێ": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "چکۆڵە، کەمووسکە" دەبەخشن، وەکوو ↑پنتک pıntık "گزمۆڵە، کەمووکەیەک لە قوڕ و ...." و ↑فنک *fınık* "جاش ئێستر". لەم تیروانینەوە "پن" دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "چکۆڵە، وردیلە" بووبێ.

پن2 **pın 2** - "خاڵ، پەڵە(ی چکۆڵە)": پنۆ pıno و پنت pınt یش دەگوترێ. هەروەها ↑پنۆک pınok و پەنی[2] penî یش هەن بە مانای "خاڵخاڵ، پەڵەپەڵە". دەشێ خزم بێ دەگەڵ pingere (L.)، pinkte (OIn.) "نەخش و نیگار کردن"، fāh (OE.)، fēh (OG.) "رەنگین"، سەر بە ریشەی < **(IE.)** ***peik-, *peig-*** "نەخش و نیگار کردن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بێز3 bez "رەنگ" [ئەم قالییە لە بێزی هاوتاکەی نییە]. جگە لەمە ↑پەقلە peqle هەیە کە دەگەڵ "شەقلە" دێ [شەقلە و پەقلە]. شەقلە ئاماژە بە شەقڵ و وێنە دەکا کە ئەویش ماناکەی دەگەڵ نەخش و نیگار یەک دەگرێتەوە.

[تێبینی: دە زمانە ئەورووپییەکاندا وشەیەک هەیە بە مانای "نوختە"، بۆ وێنە Punkt (G.)، point (E.). ئەم وشانە لە punctus (L.) وەرگیراون کە دەبنچینە دا مانای "تیژ" دەدا ، سەر بە کرداری pungere (L.) "تێڕاچوون". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی هاوشێوە هەن، واتا پن1 pın 1 و پنتک pıntık کە مانای "گزمۆڵە، چکۆڵە" دەدەن. زۆر رێی تێ دەچێ کە پن2 pın 2 [پنت، پنک] بە مانای "پەڵە، لەکە" پێوەندی بەم دوو وشەی دواییەوە نەبێ، بەڵکوو لەو ریشەی سەرەوە بە مانای "نەخش و نیگار" سەری هەڵدابێ. راستە دە زمانی ئەمڕۆدا خاڵ بە مانای "نوختە" بەکار دەهێنرێ، بەڵام خاڵ دە ئەسڵدا بە مانای "پەڵە، لەکە" بەکار هاتووە و پێوەندی بە "نوختە" و "چکۆڵە بوون"ەوە نەبووە].

پنت **pınt** - "خاڵ، پەڵەی بچووک، نوختە": بڕوانە ↑پن2 pın 2 "خاڵ، پەڵەی چکۆڵە".

پنتک **pıntık** - "گزمۆڵە، کەمووکەیەک لە قوڕ و ....": خزمە دەگەڵ ↑پن1 pın 1 و چەندین وشە دیکە کە مانای "کەمووکە، چکۆڵە" دەبەخشن. شیاوی باسە وشەی "گزمۆڵە"ش [گز + مۆڵە وەک گرمۆڵە] خۆی دە بنەڕەتدا بە مانای "چکۆڵە، خڕکەڵە"یە و خزمە دەگەڵ "گچکە".

پنج **pınc** [ *pınj* ] - "دەرز گرتنی دەفری سواڵەت": شێوەیەکی دیکە لە ↑پینە pîne. خزمن دەگەڵ ↑بەند bend، سەر بە ریشەی **(IE.)** ***bhendh-*** "بەستن". دەشێ پینە pîne پێشتر "پیندە pinde" بووبێ. هەروەها پنج و مۆر pınc û mor هەیە. دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا "پنج و مۆر" وەک "شات و شووتی بە درۆ" مانا کراوەتەوە. وێ دەچێ مانای بنەڕەتی وشەکە هەمان "بەستن، داخستن و مۆر لێدان" بێ، هەڵی سەنگینە دەگەڵ "مهر و موم" دە زمانی فارسیدا.

پنچک **pınçık** [ *pınčık* ] - "بنەگیا، دەوەن" بنچک bınçık یش دەگوترێ کە ئەمەیان شێوەی کۆنتری وشەکەیە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بنەچەک(ە) bıneçek(e).

پنژین **pınjîn** *[ pınžīn ]* - "پشمین": خزمە دەگەڵ fnesan ‏(OE.)، fnysa ‏(ON.)، hnjosa ‏(OIs.)، phnusen ‏(MG.)، niesen ‏(G.)، nysa ‏(Sw.)، niezen ‏(Nl.)، گشتیان واتا "پشمین، پنژین". ئەم وشەیە لەوانەیە دواجار دەگەڵ ↑پشمین pışmîn لە یەك ریشەوە هاتبێ.

پنۆ(ك) **pıno(k)** - "پەڵە، لەکە، خاڵ": بڕوانە ↑پن2 pın "خاڵ، پەڵەی چکۆڵە".

پنە **pıne** *[ pına ]* - "تەختەیەکە ئەنگوتکی نانی لەسەر پان دەکرێتەوە": خزمە دەگەڵ ↑پان pan.

پنیۆز **pınyoz** - "دوور کەوتن" (پتیوز بووە: ڕۆیوە و دێتەوە). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑پن1 pın و ↑پنتك pıntık بە مانای "کەمووسکە، چکۆڵە". کەرتی دووەمی وشەکە، ئۆز oz- پاشگرە.

[تێبینی: بێگومان لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە چ پێوەندییەك هەیە لە نێوان دوو چەمکی "ڕۆیشن، دوور کەوتن(ەوە)" و "کەم و چکۆڵە"دا. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویستە هەڵوەستەیەك بکەین. کاتێك مرۆڤ دەڕوا و دوور دەکەوێتەوە، ئیتر پەیکەری لەبەر چاوی مرۆڤەکانی وەستاو هەر دێ چکۆڵە و چکۆڵەتر دەبێتەوە [لە کزی و کەمی دەدا] تاکوو بە یەکجاری ون دەبێ [لە ناو دەچێ]. هەر بۆیە ئەم وشانەی دەربڕی ئەو چەمکانەی سەرەوەن، پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان بەیەکەوە هەیە. بۆ وێنە وشەکانی "کز"، "گچکە"، "کاس" [کەم و کاس] خزمە دەگەڵ "کووژانەوە" و "کوشتن" کە هەمان لەناو چوونە. ئەم خێزانەوشەیە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "کەم، گچکە". هەر بەم شێوەیە وشەی پنیۆز pınyoz لەوانەیە پێوەندی بە پن1 pın "کەمووسکە، چکۆڵە" پەیدا بکا].

پوار **puwar** *[ puwār ]* - "پاك، خاوێن": پێوەندی هەیە بە purus ‏(L.) "پاك، پاڵاوتە" و purare ‏(L.) "پاك کردن، پاڵاوتن". خزمە دەگەڵ یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پاراو paraw.

پواز **puwaz** *[ puwāz ]* - "هۆرە": پغاز poġāz ‏(P.). هەروەها دە زمانی فارسیدا بغاز boġāz ‏(P.) بە مانای "تەنگە"ی نێوان دوو دەریا بەکار دێ و ئەمەش لە راستیدا هەر هەمان وشەیە. ئەو شوێنەی ناو دەریا کە وەك "بغاز" یان "تەنگە" ناو دەبردرێ، شوێنێکە کە زەوی یان هیشکایی وەك پواز چووەتە ناو ئاوەکەوە.

1- جێی بەراورد کردن دەگەڵ poken ‏(MG.)، poke ‏(E.) "لێدان، تێڕاکردن، تێکوتان"، poken ‏(Nl.) "تێڵ دانی ئاگر" [بە تێوەژاندن؟]. ریشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە.

2- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑پاچ paç.

پوان **puwan** *[ puwān ]* - "ڕزین، گەنین": پوسیدن pūsīdan ‏(P.) "ڕزین، گەنین". خزمە دەگەڵ ↑بڵ bıl "میوەیەك کە بەرەو ڕزین دەچێ" و هەروەها ↑پیس pîs سەر بە ریشەی **< *pū- (IE.)** "گەنین".

پوخت **puxt** - "پاك، تەکووز": هەروەها پوختە puxte هەیە بە مانای "هەڵبژاردە، خۆلاسە": ئەم وشەیە چ پێوەندی بە "پختن"ی فارسییەوە نییە کە مانای " پێژان، کوڵاندن" دەدا. خزمە دەگەڵ ↑پاك pak. وشەکە هەڵسەنگینە دەگەڵ puta ‏(OIn.) "پاك". مەبەست لە کاری پوخت و پاراو دیارە ناتوانی کاری "پێژاو، کوڵاو" بێ، بەڵکوو کاری پاك و خاوێنە. هەروەها "پوختە" بریتییە لە "پاك کردە"، واتا باسێك یان وێژەیەك کە لە توێکڵەکەی، لە شتە زیادی و ناپێویستەکان پاك دەکرێتەوە و کاکڵەکەی دەخرێتە بەر دەست. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *peue- (IE.)** "پاك".

پونژین **punjin** *[ punžīn ]* - "خەو بردنەوە، وێژینگ دان": هەروەها پینۆك pînok و ↑پینەك pînek بەکار دێن بە مانای "وێژینگ، خەونوچکە". خزمە دەگەڵ پینکی زدن pīnkī zadan ‏(P.) "وێژینگ دان" و دەشێ پێوەندی هەبێ بە pennen ‏(G.) "خەوتن" [دە زمانی *ئاخافتنی* ئەڵمانیدا دا بەکاردەهێندرێ]. ریشەی وشە ئەڵمانییەکە ساخ نەکراوەتەوە.

پونگ **pung** *[ pung ]* - "گیایەکی بۆن خۆشە بۆ خواردن دەبێ": پنگ pıng یش دەگوترێ. پونە pūne ‏(P.). جێی هەکسەنگاندنە دەگەڵ fungus ‏(L.) "کارگ". ریشە؟

پوف **puf** - "1- سی، ئەندامی هەناسەکێشان 2- فووی بە هێز": شێوەیەکی دیکە لە ↑پف pıf. هەروەها ↑پوفلك pufılk هەیە بە مانی "پزدان".

[تێبینی: وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "دەرچوونی فوو، هەناسە، هەوا". بە لەربەر چاو گرتنی ئەوە کە سی وەك ئەندامی هەناسە کێشان کار دەکا، "پوف" وەك ناوی ئەو ئەندامەش بەکار دێ. لەم بارەوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ "بین" واتا هەناسە و "بینی" دە زمانی فارسیدا بە مانای "لووت" کە ئەویش ئەندامێکی هەناسە کێشانە و هەروەها pneumon "سی" دە زمانی یۆنانیدا. ئەم وشە یۆنانییە خزمە لەگەڵ "بین"ی کوردمادی و "بینی" ی فارسی].

پوفلك **pufılk** - "پزدان": بڕوانە ↑پوف puf.

پووت **put 1** *[ pūt ]* - "گیای گیرە کراو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑پەت pet [لەت و پەت].

2- بوتە būte (.P) "پنچکەگیا" و botane (.Gr) "گیا، وێنجە".

پووت **put 2** *[ pūt ]* - "1- ورد، چکۆلە، لاواز، بێنموود": پووتەکە puteke ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ pitinnus (.L) و pitulus (.L) "بچکۆڵە، کەموسکە". وشەی petty (.E) دەچێتەوە سەر ئەم وشە لاتینییانە. دە کوردمادیدا ↑پێت pet یش دەگوترێ [هێت و پێت] واتا ورد و خاش. هەروها بۆ وەسفی خۆلێکی زۆد ورد دەگوترێ خۆلەپۆتە xolepote یان خۆلە ↑پۆتینە potîne. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑بوودەڵە budele "بچووکی بێبایەخ" هەیە کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

پووت **put 3** *[ pūt ]* - "وەزنێکە بەرانبەری 16 کیلۆ":

1- دەفرێکی تەنەکەی گەورە هەیە کە بە زاراوەی موکریانی پێی دەگوترێ "چەلەنگ". بە فارسی پێی دەگوترێ پیت pīt (.P). ئەم دەفرە نیزیکی 16 کیلۆ شت دەبا و هەروەها وەك پێوانەی کێشان کەڵکی لێ وەردەگیرێ. وشەی "پووت" لەوانەیە سەرەتا ناوی دەفرەکە بووبێ و دواتر بووبێتە ناوی وەزنێك کە ئەو دەفرە هەڵیدەگرێ، واتا وەزنێکی 16 کیلۆیی. سەبارەت بە ریشەی وشەکە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑پاتیلە patîle و ↑پیتکە pîtke.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە Pfund (.G)، pond (.Nl)، pound (.E)، pund (.Sw) "یەکەیەکی کێش و قورسایی". ئەم وشانە دەچنەوە سەر pondo (.L). ئەمەش دەچێتەوە سەر pondus (.L) "وەزن، کێش" و pendere (.L) " هەڵواسین (بە ترازوو)، هەڵسەنگاندن، لە تەرازوو نان". وشەی pendulus (.L) "*پاندۆڵ*"یش لەم کردارە وەرگیراوە و دە بنەڕەتدا واتا "هەڵواسراو".

پووتەك **putek** *[ pūtak ]* - "زۆرخۆر و چڵێس": خزمە دەگەڵ Futter (.G)، fodder (.E)، foder (.Sw) "خۆراك، لەوەڕ"، fuottan (.OG)، fōdjan (.Gt)، feed (.E)، föda (.Sw) "لەوەڕاندن، دەرخوارد دان"، سەر بە ریشەی < ***pā(t)-** (.IE) "خواردن پێدان، لەوەڕاندن".

پووچ **puç** *[ pūč ]* - "بۆش، بەتاڵ، بێ ناوەرۆك": پوچ pūč (.P). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە کە ئاماژە بە فش و فۆڵ بوون، با کردن، ماسین، بۆش بوون دەکەن. هێندێك لەم وشانە بریتین لە ↑پووك puk "پووچ" [کەللەپووك]، ↑بۆش boş "ناوبەتاڵ، هەڵۆڵ"، ↑فش fış "کراوە، هەڵمساو، با کردوو"، ↑فزدووك fızdûk یان فزدەڵە fızdele "زیپکەی دەموچاوی جەوان"، ↑بووك buk "باپشکێو، ↑فیز fîz یان فیس fîs "بادیهەوایی، با دە خۆ کردن"، فشۆڵ fişol "زەوی سست و هەڵۆڵ"، فیسەڵ fîsel"پووچەڵ"، ↑هەڵپزان helpızan "هەڵمسان" و هتد. ئەم گشتە وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***bhu-** (.IE) "ماسین، با کردن". لێرەدا شیاوی ئاماژە کردنە کە وشەی ↑فەشەل feşel وشەیەکی رەسەنی زمانی کوردمادییە بە مانای "فیسەڵ، پووچەڵ". فەشەل بوون دە راستیدا هەمان پووچەڵ بوون یان پووچ بوونەوە. ئەم وشەیە کەوتووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە فشل fašal (.Arb).

پوود **pud** *[ pūd ]* - "ژنگ گرتوو، رزیو و کون کون": خزمە دەگەڵ ↑پوان puwan "رزین".

**پوور pur** *[ pūr ]* - "خوشکی دایك و باوك": پور pūr (.P) "کوڕ، فرزەند". ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا وەك یەکێك لە پاشگرە هەرە چالاکەکانی دروست کردنی "ناوی فامیلی، پاشناو" بە کار دەهێنرێ [حەسەنپوور، کەریمپوور، ئیسماعیلپوور و هتد]، سەر ریشەی ***pau** *(.IE)* "کەم، بچووك، گچکە". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە کە هەڵگری مانای کەمی و بچووکین، لەم ریشەوە هاتوون، وەك ↑پس pıs "کوڕ" [دە زمانی فارسیدا پسر pesar (.P)]، ↑پز pız "بێچووی ناوسك"، ↑بێچوو beçu، ↑بچووك bıçûk [کۆنتر: پچووك pıçûk] و دە پلەیەکی دورتردا هێندێك وشەی وەك ↑بار bar [بارەکەو]. few (.E)، fēawa (.OE)، fár (.ON) "کەم" و poor (.E) "هەژار" دەچنەوە سەر هەمان ریشە. ئەم وشەی دوایی لە زمانی لاتینی وەرگیراوە، بەڵام لە ریشەدا هاوبەشە دەگەڵ هەموو ئەو وشانەی سەرەوە.

[تێبینی: مانای ئەسڵی وشەکە دەبێ "زارۆك" بێ کە لەبەر گچکە بوونی بەم جۆرە ناودێر کراوە. دە زمانی کوردمادیدا ماناکە گۆڕانی بەسەرداهاتووە. ئەو وشانەی بۆ ناوی کەسوکار بەکار دێن، هێندێك جار ماناکانیان لە زماتیکەوە بۆ زماتیکی دیکە دەگۆڕدرێ. بۆ وێنە "دایك، دایە" دە فارسیدا بووەتە "دایی" بە مانای "برای دایك". دە زمانی فارسیدا بە دایك دەگوترێ "مام" (یان ماما، مامان) و دە کوردمادیدا "مام" دەبێتە"برای باوك". دە ئینگلیزیدا dad (یان daddy) ناوە بۆ باوك، دە کوردمادیدا "دادە" ناوی خوشکی گەورەیە. دە عەرەبیدا "اب" (ابو) ناوی باوکە، دە کوردمادیدا "ئاپ" (ئاپۆ) ناوێکی دیکەی بۆ "مام". دە کوردمادیدا "کوڕ" ناوی زارۆی تیرینەیە، دە ئینگلیزیدا girl زارۆی مێیینەیە. دە کوردمادیدا "نەوە" زارۆی فرزەند"ە، دە ئەڵمانیدا Neffe دەبێتە "کوڕی خوشك، کوڕی برا"].

**پوورسین pursîn** *[ pūrsīn ]* - "بوورانەوە": دەگەڵ پێشگری "ڤە" دێ [ڤەپوورسین vepursîn]. دەشێ شێوەی جەختکراو بێ لە ↑بوورانەوە buran(ewe).

**پووز puz** *[ pūz ]* - دەگەڵ "پا" دێ [پا و پووز pa u puz]. هەروەها پووزەوانە puzewane ش هەیە بە مانای "بەلەك پێچ". شێوەیەکی کۆنترە لە "پا" یان ↑پێ pe.

**پووش pûş** *[ pūš ]* - "وشکە گیا": [دەئەسڵدا تۆکلی دەغڵ و دان کە هیشك دەبێ و دەوەرێ]. خزمە دەگەڵ ↑پێست pest [پوست pūst (.P)] و لەوە دەچێ پێوەندییان هەبێ بە ↑پشم peşım و ↑بژ bıj و↑بسك bısık و چەند وشەیەکی دیکە کە دەبنەرەتدا بە مانای "خوری، تووك، موو" هاتوون. دەشێ بنەوشەکە سەرەتا بە مانای پەشم و خوری بەکارهاتبێ ، پاشان مانای "پێست" یشی وەرگرتبێ و لەوێشەوە مانای "پووش"ی لێ دروست بووبێ. شیاوی باسە کە دە فارسیدا بە تۆکلی دەغڵ و دان دەگوترێ پوستە pūste(.P). هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ↑ پۆشین poşîn. دە زمانی کوردمادیدا "پووش" چەندین وشەی لێ دروست کراوە، وەك پووشکە pûşke "چیلکە"، پووشڵە pûşle "چیلکەی سەر بە لۆکە"، پووشین pûşîn "لە پووش دروستکراو"، پووشینە pûşîne "زەنبیل، تریانی لە پووش چێکراو" و هتد.

**پووك puk 1** *[ pūk ]* - "شەویلکە، گوشتی بن ددان": فك fakk (.P) "شەویلکە"، هەروەها پك و پووزە pek o pūze (.P) "دەم و لەوسی ئاژەڵ". خزمە دەگەڵ Backe (.G)، beko (.OG) "گووپ، گۆنا، شەویلکە"، bucca (.L) "گووپ، گۆنا"، phagones (.Gr) "شەویلکە" و phagein (.Gr) "خواردن"، سەر بە ریشەی < ***bhag-** *(.IE)* "بەش کردن، بەش وەرگرتن". وشەی ↑بەش beş یش هەر لەم ریشەیەوە هاتووە.

**پووك puk 2** *[ pūk ]* - "پووچ، ناوبەتاڵ": پووك pūk (.P).خزمە دەگەڵ ↑پووچ puç. هەروەها پووکانەوە pukanewe هەیە بە مانای "پووچانەوە".

**پووك puk 3** *[ pūk ]* - "کرێوە": هەروەها پووگ pug هەیە بە مانای "رەشەبای سەخت". ئەم دوو وشەیە دەشێ دە بنەڕەتدا هەر یەك وشە بووبن و بە هێندێك گۆڕان دوو مانای جیاواز، بەڵام لێك نیزیکیان پەیدا کردووە. ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ریشەی < ***uei-b** *(.IE)* "چەمان، سووڕان، بەم لاو ئەولادا جووڵان". هێندێك وشە دە زمانی کووردیدا لەم ریشەوە هاتوون، وەك ↑بووك buk [بووك و زاوا]، ↑باویلکە bawîlke "پشیلە پاییزە"، ↑پاپلەکانێ paplekane "جۆلانە"،↑*بابۆڵە babole*"نانی پێچراوە

و لوول دراو"، ↑باو² baw "خول، سوور" [باوەخولێ bawexule] و هتد. دیارە شێوەی کۆنتری وشەکە برێک جیاواز بووە و دەبێ پێشتر شێوەیەکی وەک *پابک pabık**، پاپک papık** ی هەبووبێ.ئەم شێوە کۆنە دە وشەی ↑پەپکە pepke یان پاپۆکە papoke دا پارێزراوە. پەپکە یان پاپۆکە دانی مار ئەو دۆخەیە کە مار خۆی لێک دەهاڵێنێ و خۆی گرمۆڵە دەکا.

**پووکاوڵە pukawle** [ *pūkāwla* ] - "چەمبۆڵە، قژانکێ": وشەی "چەمۆڵە" و "قژانکێ" دەچنەوە سەر دوو ریشە بە مانای "خوار بوونەوە، چەمانەوە" [بەری دەست دەچەمێتەوە]. هەر بەم شێوەیە وشەی "پووکاوڵە"ش لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑بازنە bazne، ↑باسک bask، ↑*فیزانەوە fīzan(ewe)*، سەر بە ریشەی **< *bheug-* (IE.)** "خوار بوونەوە، چەمانەوە".

**پووڵ pul** [ *pūl* ] - "پارە، نەغدینە": پول pūl (P.). دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑پوولک pulık و پۆوڵەکە puleke ی ماسی. وشەکە دەبێ لە ریشەی **< *pel-* (IE.)** "داپۆشین، لێهاڵان" کەوتبێتەوە. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک وشە بە مانای "پێست، توێکڵ" لەم ریشەیەوە دروست بوون. دە زمانی کوردمادی وفارسیدا وشەی پووڵ دەبێ سەرەتا بەمانای "پێست" بەکارهاتبێ. پاشان ماناکە لە پێستەوە گوڕدراوە بۆ ئەو دانە خڕ و پان و بریقەدارانە کە بەسەر پێستی ماسییەوەن و دە زمانی ئەمڕۆ دا وشەی پووڵەکەی بۆ بەکار دێنین. ئەوجار سککەی زێر و زێو بەو شتە پان و بریقەدارەی سەر پێستی ماسی چوێندراوە و پێی گوتراوە پووڵ. شتێکی دیکە بۆ پشتراست کردنی ئەو بۆچوونەی سەرەوە ئەوەیە کە دە زمانی عەرەبیدا وشەی فلس fils (Arb.) هەم بەمانای "پووڵەکە ماسی" و هەم بەمانای "یەکەیەکی پووڵ" بەکاردێ. ئەم وشە عەرەبییە وێ دەچێ لە پوولک pulık ی زمانە ئێرانییەکان وەرگیرابێ.

**پووڵەکە1 puleke** [ *pūlaka* ] - "پۆرگی سەر پێستی ماسی": پوولک pulık یش دەگوترێ. دەشێ دەبنەڕەتدا بە مانای "پێست"ی ماسی بووبێ و خزمە دەگەڵ ↑پۆلکە polke "پۆرکێ، توێکڵ"، سەر بە ریشەی **< *pel-* (IE.)** "داپۆشین، لێهاڵان". دە زمانی فارسیدا هەم پولک pūlak (P.) و هەم فلس fels (P.) دەگوترێ. وشەی felıs شێوەیەکی دیکەیە لە pūlak و پێکەوە هاوریشەن.

**پووڵەکە2 puleke** [ *pūlaka* ] - "دانەی خر و پان و بریقەدار بۆ رازاندنەوەی جلوبەرگی ژنان": لە وشەی ↑پووڵ pul وەرگیراوە. [تێبینی: تا سی چل ساڵێک لەمەوبەر جل وبەرگی ژنان بۆ رازاندنەوە پووڵیان لێدەرا (لێ دەدوورا) و هەر بۆیەش وشەی پووڵەکە دەبێ ئاماژە بەو پووڵانە بووبێ. دواتر لەباتی پووڵ شتی کانزا و پلاستیکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دروست کرا، بەڵام ناوی پووڵەکەی هەر بە سەرەوە مایەوە].

**پۆ¹ po** [ *po* ] - دەگەڵ "پەل" دێ [پەل و پۆ pel u po]. پەل مانای "دەست" دەدا و "پۆ"ش شێوەیەکی دیکەیە لە↑ پێ pe. پەل و پۆ تێکڕا دەبێتە دەست و لاق. لە پەل و پۆ کەوتن ئاماژەیە بەوە کە مرۆڤ بەهۆی نەخۆشی یان ماندوویەتی دەست و لاقی لە کار دەکەوێ.

**پۆ2 po** [ *po* ] - دەگەڵ "تان" دێ [تان و پۆ tan u po]. پود pūd (P.) [تار وپود]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Faden (G.)، fadoms (OS.)، faedm (OE.)، fadmr (OIs.) "دەزوو، گەز [ی ئەندازە پێگرتن]"، fathom (E.) و famn (Sw.) "گەز"، سەر بە ریشەی **< *pet-* (IE.)** "لەبەر یەک کشانەوە، پان و بەرین بوونەوە، درێژ بوونەوە". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑پەت¹ pet "ریس، گوریس".

**پۆپ(ە) pop(e)** [ *popa* ] - "1- کاکۆڵ 2- قیتکەی سەری پەڵەوەر": هەروەها پۆپکە popke ش دەگوترێ. ئەم وشەی دوایی هەم بە مانای "کاکۆڵی پەلەوەر" دێ و هەم بە مانای "دوندی کێو". پێوەندی هەیە بە papille (L.) "گۆپکە، بالۆکە". ریشە؟

**پۆتەراک poterak** [ *potarāk* ] - "سەر وسیما": پۆتەلاک potelak یش دەگوترێ. وێ دەچێ وەرگیرابێ لە *portrait* (Fr.) < "وێنە و ئەسکی مرۆڤ" *pro-trahere* (L.) < "کێشانەوە بەرەوە، خستنە بەر چاو".

**پۆتی potî** [ potī ] - دەگەڵ "لۆتی" دێ [لۆتی و پۆتی lotî u potî]. دەچێتەوە سەر ↑پووت2 put "ورد، چکۆلە، لاواز، بێنموود".

**پۆتین potîn** [ potīn ] - "چەکمەی قورس": وشەیەکی وەرگیراوە، ئەسلی وشەکە < *(Fr.) botte* یە هەر بەو مانایە.

**پۆخ pox** [ pox ] - "خونچە": سەر بەو خێزانە وشەیە کە لە ریشەی < *(IE.) *b(h)u-* "ماسین، با کردن، هەڵپزان"ەوە پەیدا بووە و بە دەیان وشەی جوربەجۆر دەگرێتەوە، وەک ↑بۆق boq، ↑بێشە bêşe، ↑بەس bes، ↑فش fiş و هتد .

[دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا وشەکانی Blume "گوڵ" (G.)، Blüte "شکۆفە"، (G.) blühen (G.) "پشکووتن، گوڵ کردن، گەشانەوە" دەچنەوە سەر ریشەیەکی دیکەی هیندوئەرووپی، واتا ریشەی **bhel-*، کە ئەمیش هەر مانای "هەڵمسان، کرانەوە، هەڵپزان" دەدا].

**پۆخڵ poxıl** - "چڵکن، پیس": هەروەها پۆخڵە poxle هەیە بە مانای "بنی برین"، پێک هاتووە لە پوخ + پاشگری ل ıl + pox. کەرتی پۆخ -pox نیزیکی زۆر نیشان دەدا دەگەڵ ↑پشکەڵ pışkel [پشک poşk (P.)] و ↑پەچەڵ peçel "پیس، پۆخڵ". لە لایەکی دیکەوە دە زمانی تورکیدا pox (Tur.) هەیە بە مانای "پیسایی گیانلەبەر". ئەم وشەی تورکییەش دەشێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ.

**پۆڕ1 por** [ por ] - "کاکۆڵ، مووی سەر": خزمە دەگەڵ Bart (G.)، beard (E.)، baard (Nl.)، berd (OFr.)، barba (L.)، boroda (Rus.) گشتیان بە مانای "ردێن"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *bhar(s)-* "چقڵ، درک". هەروەها بڕوانە ↑فلچە fılçe.

**پۆڕ2 por** [ por ] – دەگەڵ "پان" دێ [پان و پۆڕ pan u por] "قەبە و ئەستوور". خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır. مەبەست دە سەرەتادا پڕ بوون بە وتەیەکی دیکە زۆر و زل بووە.

[تێبینی: پۆڕ بەمانای "پان" نییە، چونکوو ناتوانین بۆ وێنە بڵێین مەیدانی پان و پۆڕ یان شەقامی پان و پۆڕ. "پان و پۆڕ" تەنیا بۆ وەسفی قەوارە (حجم) بەکار دەهێندرێ، بۆ وێنە دەگوترێ کابرایەکی پان و پۆڕ، واتا لێرەدا مەبەست هەم پان بوون و هەمیش پڕ بوونە [پڕ بەمانای ماسوولکەداربوون، ئەستووربوون]. ئەم پێوەندییەی نێوان "پڕ" و "پۆڕ" دە دوو وشەی "تەژی" و "تەژە" شدا دەبیندرێ، یەکەمیان بەمانای "پڕ" دێ و ئەوەی دووەمیان بەمانای "زەلام، ئەستوور، پۆڕ"].

**پۆڕ3 por** [ por ] - "تاڵان": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑برو bıro [تاڵان و برو talan û bıro].

**پۆڕاندن porandın** [ porāndın ] - "ئاخنین": خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır. مەبەست دە سەرەتا دا پڕ کردن بووە.

**پۆرگ porg** [ porg ] - "تۆیکڵی چەڵتووک، پینەی دەست": ↑پۆلکە polke.

**پۆز1 poz** [ poz ] - "دەم و لووتی ئاژەڵ": پۆزە poze ش دەگوترێ. ↑لمبۆز lımboz و ↑قەمپۆز qempoz یش دەگوترێن. پوزە pūze (P.). پێوەندی هەیە دەگەڵ ↑پیش pîş "هەناسە".

[تێبینی: پێوەندی نێوان هەناسە و دەم و لووت بەرادەیەک نیزیکە کە زۆر جار ئەو وشانەی بۆیان بەکار دێ، لە ریشەیەکەوە هاتوون، بۆ وێنە بین bîn دەکوردمادیدا واتا "هەناسە" و دە فارسیدا بینی bînî (P.) واتا "لووت". دەم dem بە هەر دوو مانای "هەناسە" و "زار" بەکاردێ. "هەناسە" دە کوردمادیدا واتا "پیش، نەفەس" و بە ئەڵمانیش Nase (G.) واتا "لووت"].

**پۆز2 poz** [ poz ] - "ژێست و قەیافە گرتن": وشەیەکی وەرگیراوە، دەچێتەوە سەر < *(Fr.) pose* "حاڵەتی خۆ راگرتن، خۆ گرتن". ئەمەش دەچێتەوە سەر *(L.) ponere* "دانان، راگرتن".

**پۆشتە poşte** [ pošta ] - دەگەڵ "کۆک" دێ [کۆک و پۆشتە kok û poşte] واتا کەسێک جلوبەرگی تەواو و رێکوپێکی لەبەردابێ. لە کرداری↑پۆشین poşîn وەرگیراوە.

**پۆشین poşîn** [ pošīn ] - "لەبەر کردنی جلک": پوشیدن pūšīdan (P.).

1- لەلایەکەوە وا وێ دەچێ پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ وەک ↑پووش pûş، ↑پێست pest [پوست pūst (P.)]، پەشم peşım و هتد. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە چەمکی "داپۆشان" دەکەن، بۆ وێنە پووش دەنک دادەپۆشێ و پێست گۆشتی لەش.

2- لەلایەکی دیکەوە vestis (L.) "جلوبەرگ" و vaste (OIn.) "پۆشیویەتی" دەکرێ دەگەڵ وشە کوردمادییەکە هەڵبسەنگێندرێن.

**پۆقژە poqje** [ *poqža* ] - "وردە زیبکە": شێوەیەکی دیکە لە↑بۆقژە boqje.

**پۆل pol** [ *pol* ] - "کۆمەڵ (ی پەڵەوەر)": خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır و گەلێک وشەی کوردمادی سەر بەم خێزانە. دە زمانانی بیانیدا دەبێتە خزم دەگەڵ viel (G.) "زۆر، گەلێک" [پڕ دەبێتە voll (G.)]، poly (Gr.)، feala (OE.)، felo (OFr.) "زۆر"، polk (Rus.) "پۆل"، Volk (G.) "گەل، ئاپۆرەی خەلک" و populus (L.) "گەل" و هتد.

**پۆلا pola** [ *polā* ] - "کانزایەکی زۆر رەق": پولاد pūlād (P.). لەوانەیە پێوەندی پەیدا بکا بە ↑پەل pel[4] "بەرد" و ↑پاڵەوان palewan، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، بەهێز".

**پۆلکە polke** [ *polka* ] - "توێکڵی چەڵتووک، بلۆقی دەست": پۆرگ porg یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Pelle (G.) "پێست، پێستە"، Fell (G.) "پێست، توێکڵ"، fill (Gt.)، fell (E.)، pellis (L.)، pella (Gr.) "پێست، پێستە"، سەر بە ریشەی < *pel- (IE.) "داپۆشین، تێپێچان".

**پۆلوو polu** [ *polū* ] - "خەلووزی گەشاوە": خزمە دەگەڵ Feuer (G.)، fuir (OG.)، vuur (Nl.)، fire (E.)، fyrr (OIs.)، pyr (Gr.)، گشتیان بە مانای "ئاگر"، سەر بە ریشەی < *peuor- (IE.) "ئاگر". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها پەلگر pelgır هەیە بە مانای "ماشە، مقاش" و ↑پەلۆخ pelox بە مانای "گرگرتوو، داگیرساو". ریشەیەکی دیکەی هیندوئەورووپی هەیە [واتا ریشەی-*puon] کە مانای "ئاگر" دەبەخشێ و دەگەڵ ریشەکەی سەرەوەتر خزمە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی پەن/ پەنگر pen(gır) دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیەی دوایی.

**پەپکە pepke** [ *papka* ] - "1- جۆرێک کولێرە 2- خۆیانی خەرمان 3- خۆ لێکهاڵاندنی مار": بۆ "پەپکە دان"ی مار پاپۆکە papoke دانیش دەگوترێ. هەموو ئەو مانایانەدا چەمکی "سووڕاوی و خڕ و گرمۆڵە بوون" بەرچاو دەکەوێ. پێوەندی هەیە بە ↑پووک puk "کرێوە".

**پەپوو1 pepu 1** [ *papū* ] - "کوند": ↑بەبوو bebu [کوندە بەبوو]. "پەپوو" هەروەها وەک ناوی باڵدارێکی سەر بە کڵاوەش بە کار دێ [پەپووسلێمانی].

**پەپوو2 pepu 2** [ *papū* ] - "تەواو بوو، نەما" [بەزمانی زارۆک]. دەبێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "کەمی و بچووکی" دەبەخشن، وەک ↑بچووک bıçûk یان پچووک pıçûk سەر بە ریشەی < *pou- (IE.) "کەم، بچووک".

[تێبینی: دە نێوان دوو چەمکی "کەم و چکۆلە (بوون، بوونەوە)" لە لایەک و "تەواو بوون و نەمان و لەناو چوون"دا لەلایەکی دیکەوە پێوەندی نیزیک هەیە. ئەم پێوەندییە بۆ وێنە لە وشەکانی "کز"، " کچ"، "گچکە"، "کوشتن" و "کوژانەوە"شدا بەدی دەکرێ کە هەموویان سەر بە ریشەیەکن].

**پەپوولە pepule** [ *papūla* ] - "زیلەیەکی جوانە رەنگی جۆربەجۆری هەیە": پاپریک paprîk، پرپریک pırpırîk و پەلپینە pelpîne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Falter (G.)، fifaalter (OG.)، fifealde (OE.)، fifreld (Norw.)، papilo (L.)، گشتیان بە مانای "پەپوولە"، سەر بە ریشەی < *p(e)led- (IE.) "لەرانەوە، شەکانەوە، پەڕ و باڵ لێدان". ئەم ریشەیە، بەگوێرەی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی < *pelo- (IE.) "پڕ، فرە". ئەمەی دواییش دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا گەلێک لک و پۆی دیکەی لێ بۆتەوە و بە دەیان وشەی بە مانای جۆراوجۆر لێ پەیدا بووە، بۆ وێنە ↑فرین fırîn، ↑فلەتین filetîn، ↑پرتە pırte، ↑پلووسک pılusk و بەدەیانی دیکە.

پەت¹ **pet** [ *pat* ] - "گوریس": پەتک petık یش بە کار دێ.

1- لە لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Fessel (G.) "بەند، پەت"، fetel (OE.) "پشتێند"، fetill (OIs.) "پەتکی شان".ئەم وشانە خزمن دەگەڵ وشە ↑پێ pe و دە بنچینەدا مەبەست "بەندی پێ" بووە. pede (Gr.) "پێوەند، بەندی پێ"، -bibda (Av.) "پەتی دوولۆ"، impedire (L.) "بەرگرتن، بەربەست کردن"، petlja (Rus.) "قلْفە، گرێ" هەموو پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. لەوانەیە ↑فتیلە fıtlîe ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

2- لەلایەکی دیکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پۆ2 po [تان و پۆ].

پەت² **pet** [ *pat* ] - دەگەڵ "لەت" دێ [لەت و پەت let u pet]. خزمە دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑پاتک patık "پەڕۆی پینە"، ↑پاتە pate "ورتکە نان"، ↑پاتۆز patoz "ماشێنی دروێنە" [لەت و پەتکەر]، ↑پیتک pîtık"کوتک"، ↑پسان *pısan* و ↑پاچین paçîn [هەڵپاچین]، سەر بە ریشەی **< -bheid* (IE.)** "کوتان، لێدان، لەت کردن".

پەتا **peta** [ *patā* ] - "ئاهۆ، نەخۆشی گیرۆ": خزمە دەگەڵ pathos (Gr.) "ئازار، نەخۆشی". هەروەها پەتەر peter یش بەکار دێ بە مانای "بەڵا". دەزمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە هەن کە دەبێ دەگەڵ "پەتا" لە ریشەیەکەوە هاتبن، وەک ↑پەشیمان peşîman،↑ پەشۆکان peşokan و ↑پەژارە pejare.

[تێبینی: وشەی آفة āfa(t) (Arb.) وشەیەکی سەر بە زمانانی K.P. یە [ئاڵتێرناتیڤ بۆ "زمانە ئێرانییەکان"] و چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە: پێشگری ئا + فەت (پەت) *a + fet* *. وشە یۆنانییەکە خۆی دەچێتەوە سەر páshein (Gr.) "رەنج بردن، ئازار کێشان".

پەتاتە **petate** [ *patāta* ] - "سێڤ زەمینی، یارەڵماسی": *< patata (Sp.)* "پەتاتە".

پەتڵە **petle** [ *patla* ] - "ساوار، دانەوێڵە": [دانەوێڵەی وردکراو؟]. بەتڵە betle ش دەگوترێ. دوو وشەیەکی دیکەش لەم بارەوە سەرنج رادەکێشن، وەک ↑پیتە pîte "کای هەرزن و چەڵتووک"، پیتەپیتە pîtepîte " کەم کەمە، وردە ورودە".

1- لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑پیتک1 pîtık "1- کوتک 2- پتە".

2- یان لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑پیتک2 pîtık [ریتک و پیتک rîtık u pîtık واتا خرت و پرت].

پەتڵین **petlîn** [ *patlīn* ] - "خۆ گرتن، هێز پەیدا کردن" [ئەو منداڵە هێشتا دەست و لاقی نە پەتڵیوە].

1- یان خزمە دەگەڵ ↑پتەوpıtew، ↑پیت pît [پیتاندن]، ↑فیتەر fiter "زل و بەهێز"؟، پاد pad [↑پادشا padşaواتا شای بەهێز]، سەر بە ریشەی **< -pad* (IE.)** "بەهێز بوون".

2- یان دەنا شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑پەڵتین peltîn "توند بوون، سفت بوون"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون، بەهێز بوون" و خزم دەگەڵ ↑*پاڵەوان palewan* .

پەتوو **petu** [ *patū* ] - "جۆرێک چنراو بۆ بەخۆدادان": پتو patū (P.) < pat (In.) "جامە، کەوا"، pattū (In.) "جامەی خوری" *< -patta (OIn.)* "پارچە، جلک". دەشێ وشەی بطانیة batāniya (Arb.) لەم وشانە وەرگیرابێ. ["فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 25 ].

پەتە **pete** [ *pata* ] - پەتە دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا وەک "بلێت، جەواز، پسوولە" مانا کراوەتەوە. ئەوەندەی من بزانم "پەتە" ورقەیەکی کانزایی خڕ و پچووکی بەئەندازەی وردە پووڵ بوو کە لە قاوەچییەکان دەکڕدرا، بۆ وێنە پەنجا تا سەد دانەی لێ دەکڕدرا و ئەوجا لەبری هەر چەند دانە چایەک کە قاوەچییەکان دەیان هێنا بۆ دوکاندارەکان، ئەوەندە دانەیان "پەتە" پێ دەراوە. ئەوەندەی لە یادم بێ پەتەکان نیشانەیەکیان لێ درابوو. بە وتەیەکی دیکە "پەتە" شتێکی وەک "سککە"ی تایبەتی هەر قاوەخانەیەک بوو کە خودی قاوەچییەکان دروستیان کرد بوون یان بۆیان دروست کرابوو و ئەوان دەیان فرۆشت و دواتر لەبری چایەکان وەریان دەگرتەوە. ئەو شتە، واتا پەتە دە زمانی ئەڵمانیدا پێی دەگوترێ Marke. دە زمانی ئاخاوتندا وشەی Chip یش بەکار دێ کە لە زمانی ئینگلیزی وەرگیراوە.

مانای ئەسڵی وشەی Marke دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە "نیشانە". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "مارکە"ی کوردمادی کە بەو هێلکەیە دەگوترێ کە وەك نیشانەیەك بۆ مریشك لە شوێنی هیلکە کردنی ئەو دای دەتین. وشەکە هەروەها خزمە دەگەڵ Mark "پووڵی ئەڵمانی" [بەر لە یوورۆ]. ئەوەی لێرەدا گرینگە، ئەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا هەم Mark و هەم Marke دە بنەڕەتدا ئاماژە بەو شەقڵ و نشانەیە بووە کە لەسەریان هەڵکەندراوە. ئەگەر ئێمە سەیری وشەی "سکە" [سككە] ش بدەین، دەبینین هەر هەمان مەبەست لە گۆڕێ دایە و "سکە" خۆی دەبێتە خزم دەگەڵ "شەقڵ". هەرچی وشەی Chip ە، ماناکەی دەبێتە "تیکەیەکی تەنك کە لە ئەنجامی تاشین، بڕین یان کوتاندا دروست دەبێ"، واتا ماناکەی شتێکە وەك "تەڵەزم" دە زمانی کوردمادیدا. جا وشەی "پەتە"ش دە زمانی کوردمادیدا دەبێ دە بنەڕەتدا یان بە مانای "شەقڵ و نیشانە" بە کار هاتبێ یان بە مانای "تیکە، تەڵەزم". سەرنجراکێش ئەوەیە، کە وشەکە سەرەتا بە هەر مانایەك بەکار هاتبێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەت pet [لەت و پەت] و ریشەکەی دەگەڕێتەوە سەر <  *bheid- (IE.) "کوتان، لێدان، لەت کردن". لەم تێڕوانینەوە "پەتە" یان راستەوخۆ پێوەندی بە مانای ریشەکەوە هەیە و دە ئەسڵدا مانای Chip "تەڵەزم" دەگەیەنێ، یان بەمانای ئەو "شەقڵ و نیشانە"یە کە لەسەر تەنەکە (تەڵەزمەکە) بە کوتان و هەڵکەندن چێ کراوە. لێرەدا دیسان جێی ئاماژەیە کە وشەکانی "سکە" و "شەقڵ" یش دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بڕین، لێکردنەوە" و مەبەست لە سکە و شەقڵ ئەو خەت و وێنە و نیشانانە بوون کە بە بڕین، داتاشین و هەڵکەندن دروست کراون. وشەی "پەتە" دە زمانی عەرەبیدا بووەتە بطاقة bitāqa (Arb.) و بە مانای "بلێت" بەکار دێ.

**پەتەر peter** [ *patar* ] - "بەڵا، پەتا":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پەتا peta "نەخۆشی، ئاهۆ".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ batare (L.) "لێدان". جێی ئاماژەیە کە وشەی "بەڵا" دە ریشەدا مانای "لێدان" دەبەخشێ و خزمە دەگەڵ "فەلاقە" [فەللاقە].

**پەتی petî** [ *patī* ] - "رووت، رەبەق": مانای بنەڕەتی وشەکە "پاك، خاوێن"ە و وشەکە خزمە دەگەڵ puta (OIn.) "پاك". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پاك pak "تەمیس، خاوێن". وشەی "پەتی" پێوەندی نییە بە مەسەلەی "پەتك و گوریسەوە"! هەروەها کاتێکیش دەگوترێ کوردمادی "رەسەن"، لێرەشدا باس لە "ریس و گوریس" نییە، بەڵکوو مەبەست "ئۆریگیناڵ"ە [orīgin (L.) "رەگ و ریشە"]. وشەی "رەسەن" لەوانەیە دەگەڵ وشە لاتینییەکە خزم بێ.

**پەتیارە petyare** [ *patyāra* ] - "سەرشێت، نەیار": پتیارە patyāre (P.)، patyārag (MP.) < -paty *āraka- (OI.) پێکهاتوو لە پێشگری pati و -āraka* سەر بە ریشەی *-ar* "بزوان، جوولان" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ -ar (Av.) "جوولان، وە جووڵە کەوتن"]. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.251]. لەوانەیە وشەی ↑هار har [هار و هاج] پێوەندی بەم وشە ئەوێستاییەوە هەبێ.

**پەچنین peçnîn** [ *paçnîn* ] - "پڕ کردن بە زۆری": خزمە دەگەڵ:

1- یان ↑پشاوتن *pışawtın* "گوشین، شێلان، گوشار دان"،

2- یان دەگەڵ ↑پەستاوتن pestawtın. لەوانەشە هەر دوو وشەی سەرەوە دواجار خزم بن. هەروەها بەراوردی "پەچنین" بکە دەگەڵ ↑قەڵاپەچن qelapeçın [قەڵا + پەچن].

**پەچە1 peçe** [ *pača* ] - "رووبەندی ژنان":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑پۆشین poşîn ەوە هەبێ.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پێچ peç [دە خۆ پێچان]

**پەچە2 peçe** [ *pača* ] - "حەوشە، جێ خەوی مێگەل لە دەشت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑فاق2 faq "جورێك داو بۆ گرتنی پەلەوەر"، سەر بە ریشەی <  *pak-, *pag- (IE.) "بەستن، تێکخستن، چنین، تەنین".

**پەچەڵ peçel** [ *pačal* ] - "پیس، پۆخڵ": وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ↑پشکەڵ pışkel "پیسایی بزن و مەڕ و هەندێک ئاژەڵی دیکە".

**پەخ pex** [ *pax* ] - "پان، کوتراو، سواو": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑پەخشان pexşan.

**پەخشان pexşan** [ *paxşān* ] - "نەسری ئەدەبی، بەرانبەری هەڵبەست": دەشێ خزم بێ دەگەڵ پخش paxš (P.) "بڵاو". ئەم وشانە وێ دەچێ پێوەندییان هەبێ بە ↑پژان pıjan "بڵاو بوونەوە". بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 253) لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی < *paxš- و پێوەندی هەبێ بە paxš (MP.) "رەسین و پێگەیشتن، پیشان و لێک بڵاو بوونی میوە". ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی < *pak- "پێژان، پیشان". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پێژان pejan و ↑پیشان pîşan.

**پەڕ per 1** [ *par* ] - "تووکی پەڵەوەڕ": پر per (P.) "پەڕ"، parna (OIn.) "پەڕ و باڵ، پەلک، گەڵا"، petron (Gr.) "پەڕو باڵ"، Feder (G.)، feather (E.)، pero (KSlv.) "پەڕ"، pattar (Het.) "باڵ"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *pet-*** "فڕین، دەرپەڕین، خێرا بزووتن". وشەکانی píptein (Gr.) "ڕمان، کەوتن" و penna (L.) [*petna*] "وە خۆ کەوتن، وە ڕێ کەوتن" لەم ریشەوە هاتوون. شیاوی باسە کە وشەی ↑فەنەر fener "پارچەکانزای هەڵبەزدابەزکەر" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە، وەک "تەختی فەنەر". دە زمانی ئەڵمانیدا بەرانبەر هەر دوو وشەی "پەڕ" و "فەنەر" وشەی Feder بەکار دێ.

[تێبینی 1: دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 256) وشەکە بردراوەتەوە سەر ریشەی < ***por-*** ***(IE.) *no*** "پەڕ و باڵ" و لەوێشەوە بۆ ریشەی < ***(IE.) *per-*** "چوون بەرەوە، فڕین". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەرەوازە perewaze و چەند وشەیەکی دیکە. لەوانەیە ئەم دوو ریشەیە پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ. تێبینی 2: وەک لەسەرەوە دەبینرێ دە زمانی هیندی کۆندا وشەکە جگە لە مانای "پەڕ" مانای "پەلک، گەڵا"شی هەبووە. لە سەرچاوە ئێتیمۆلۆژییەکاندا پێوەندی ئەم دوو مانایە بەیەکەوە روون نەکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا "پەڕ" بە هەر دوو مانای سەرەوە بەکار دێ و بۆ وێنە دەگوترێ گوڵپەڕ gulper و لیلووپەڕ lîluper یان نیلووفەر nîlufer].

**پەڕ per 2** [ *par* ] - "وەرەق": parna (OIn.) "پەر و باڵ، وەرەق". پەل pel یش دەگوترێ: رووپەل rupel واتا "لاپەڕ(ە)".

1- وەک دەبینین دە زمانی هیندی کۆندا وشەی parna هەروەک "پەڕ" دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا هەردووک مانای "پەڕ و باڵ" و "گەڵا، وەرەق"ی گەیاندووە، بۆیە لەوانەیە ئەم وشەیە هەمان پەڕ[1] per بێ.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە ئەم "پەڕ"ە پێوەندی هەبێ بە ↑پەلک pelk "گەڵا".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ هەر دوو مانای "پەڕی کاغەز" و "گەڵا، پەلک" وشەی Blatt بەکار دەهێنرێ].

**پەڕ per 3** [ *par* ] - "ئاخر، دووما": خزمە دەگەڵ upari (Av.)، über (G.)، Over (E.) "سەر، لەسەر". وەک ئاشکرایە وشەی "سەر" دە زمانی کوردمادیدا جگە لە مانای "بان" مانای "هەوەڵ، ئاخر"یش دەدا، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ تاسەر، بەسەر بردن، سەرچاوە، سەرتاسەر و هتد. هەر بەم جۆرە "پەڕ"یش مانای "ئاخر" ی وەرگرتووە. ئەم مانایە لە وشەی ↑ئەوپەڕ ewper دا بەدی دەکەین واتا "ئەوج، نیهایەت، ئاخر". هەروەها کاتێک دەگوترێ "ماڵی فڵانکەس لەسەر پەڕێیە"، مەبەست ئەوەیە کە ماڵەکە لە هەوەڵ یان ئاخری کووچەیە، بەوتەیەکی دیکە لەم سەر یان ئەو سەری کووچەیە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑هەوار hewar و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە لای سەرەوە دەکەن.

**پەراسوو perasu** [ *parāsū* ] - "ئێسکی سینگ و کەلەکە": parsəu- (Av.)، párśu- (OIn.) "پەراسوو، کەلەکە، تەنیشت"، piršys (Lit.) "سینگی ئەسپ"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *perk-*** "پەراسوو، تەنیشت"

[بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 296]. هەروەها ↑پاڵ pal "تەنیشت" دەشێ شێوەیەکی تازەتر لەم وشەیە بێ.

**پەراگەندە peragende** [ *parākanda* ] - "ئاوەکی، ئاژەڵی لە مێگەڵ دوور کەوتوو": دەچێتەوە سەر > *parākande* (P.) "پرژ و بڵاو" سەر بە کرداری پراکندن *parkandan* (P.) "بڵاو بوونەوە، پرژ و بڵاو بوون". شێوەی وشەکە دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە ↑پرژان pırjan.

**پەراو peraw** [ *parāw* ] - "دەفتەر، دەفتەری پەڕەسیغار": ↑پەڕ[2] [وەرەق] + ئاو per + aw. کەرتی ئاو -aw خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا کە مانای "لێکبەستن، قایم کردن، پێوەنووساندن، پێکەوە نووساندن" دەبەخشن، وەک ↑ئیپە *îpe* "بەندێکە نیری پێ لە ئاموور دەبەستن" و ↑کیپ kîp کردن "قایم کردن، پێکەوە نووساندن". دە زمانی ئەڵمانشدا وشەی Heft (G.) "پەڕاو، دەفتەر" یەکێکە لەم وشانە و پێوەندی هەیە بە haften (G.) "پێوەنووسان، بەستراوە بوون".

**پەراوێز perawez** [ *parāwez* ] - "1- کەنارەی جلك 2- حاشییەی کتێب": پێك هاتووە لە دوو کەرتی پەڕ + ئاوێز per + awez. کەرتی پەڕ per دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پاڵ pal "تەنیشت" و ↑پەڕاسوو *perasu* "ئێسکی سینگ و کەلەکە". کەرتی ئاوێز -awez دەچێتەوە سەر کرداری ↑هەڵاوەسین hel-awesîn. لەم تێروانینەوە "پەڕاوێز" دەبێتە ئەو بەشە یان ئەو شتە کە بە ئاخری شتێك یان بە قەراخی شتێکەوە هەڵواسراوە.

[تێبینی: ئەم وشەیە لەباری چۆتیتی دروست بوونییەوە نیزیکی هەیە دەگەڵ Anhang دە زمانی ئەڵمانیدا بە مانای "پەیوەست، زەمیمە، ئەو شتەی لە دواوە دێ". وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر کرداری anhängen "هەڵواسین"].

**پەرپووت perput** [ *parpūt* ] - "کۆنەی دڕاو، رزیو": فەرفووت ferfut یش دەگوترێ. پەڕ + پووت per + put. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır و ↑فرە fıre بە مانای "زۆر". کەرتی دووەم دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پوان puwan "رزین" [پوسیدن pūsīdan (P.)].

**پەرتاندن pertandın** [ *partāndın* ] - "لەبەر یەك هەڵپچڕاندن": خزمە دەگەڵ ↑پارە pare "تیکە".

**پەرتاوتن pertawtın** [ *partāwtın* ] - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ [هەڵپەرتاوتن واتا پەڕاندنی لك و پۆی دار]. خزمە دەگەڵ ↑پارە pare "تیکە".

**پەڕتووك pertuk** [ *partūk* ] - "کتێب": پێك هاتووە لە دوو وشەی ↑پەڕ per [پەڕی کاغەز] و ↑تووك tuk. ئەم وشەی دوایی پێوەندی بە "پەڕ و تووکی" پەلەوەرە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ ↑تێك *tîk* [تێك و دروومان]، ↑تەقەڵ teqel، دوختن dūxtan (P.) "دروون(ەوە)" و هتد. مەبەست دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە "پەڕەکاغەزی (پێکەوە) درواو".

**پەرچاندنەوە perçandınewe** [ *parčāndınawa* ] - "خوار کردنەوە و گەڕاندنەوە (ی نووکی بزمار)": بنەوشەی پەرچ -perç دەبێ خزم بێ دەگەڵ flectere (L.) "خوار بوونەوە، چەمانەوە". وشەی reflex (Fr.) "کار دانەوە" دەچێتەوە سەر reflexus (L.) "خوار کردنەوە و گەڕاندنەوە، پەرچاندنەوە".

**پەرچقان perçıqan** [ *parčıqan* ] - "ورد و خاش بوون": خزمە دەگەڵ ↑پارە pare "تیکە".

**پەرچەم perçem** [ *parčam* ] - "مووی سەر هەتیی ژنان": وشەکە دەبێ خزم بێ دەگەڵ پرچم parčam (P.) "ئاڵا". هەرچەند مانای وشەکە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا جیاوازە، بەڵام هەردووکیان لەوەدا هاوبەشن کە بەدەم باوە دەلەرێنەوە [دەشەکێنەوە]. لەم تێروانینەوە دەشێ خزم بن دەگەڵ پلکیدن palakīdan (P.) و flackern (G.) "پرتە پرت کردن، شەکانەوە، جووڵانەوەی نائارام بەم لا و ئەو لادا" و Flagge (G.) "ئاڵا"، سەر بە ریشەی > ***(IE.) *plak-, *plag-*** "(پەڕ و باڵ) لێدان".

**پەرداخ perdax** [ *perdax* ] - "1- گلاس، لیوان 2- ساف و لووسکراو": کاغەزپەرداخ kağezperdax بەو کاغەزە زبرە دەگوترێ کە شتی پێ ساف و لووس دەکەن. خزمە دەگەڵ ↑بیرازتن bîraztın "ساف و

لووس کردنی زەوی بۆ چاندن“، سەر بە ریشەی *bher- > (IE.)* ”بەشتی تیژ کار کردن“. دەبێتە خزم لەگەڵ ↑برین[1] bırîn.

[تێبینی 1: وشەی پەرداخ بە مانای ”لیوان“ لەوەرا هاتووە کە لیوان وەک شتێکی ساف و لووسکراو (پەرداخکراو) لەبەرچاو گیراوە. شیاوی باسە کە وشەی ژێرمەنی ”گلاس“ دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای ”درەوشانەوە“ و ئەم چەمکەش دەگەڵ چەمکی ”ساف و لووس“ پێوەندی نیزیکی هەیە. تێبینی 2: کاغەزپەرداخ بە فارسی پێی دەگوترێ کاغەز سنبادە kāġaz e sonbāde [سمبادە sombāde]. ئەم وشەیە خزمە لەگەڵ سمین sımîn ی کوردمادی بە مانای ”کون کردن“ و ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەی *smei- (IE.)* ”داتاشین، برین، کار کردن بە ئامرازی تیژ“].

**پەردوو[1] perdu** [*pardū*] - ”ئەو تەختانەن کە لەژێرەوەرا لەدارەکانی میچی خانوو دەدرێن“: [دار و پەردوو]. خزمە دەگەڵ (G.) Brett، (OG.) bret، (OE.) bred ”تەختە“، (G.) Bord ”تەختەی دیوار، سەفحەی میچ، سەفحەی قەراخ“، (E.) board ”مێز، تەختە“، (Sw.) bord ”مێز“. ئەم وشە ژێرمەنییانە بە خزم دادەنرێن دەگەڵ (G.) bohren ”کون کردن“ [دە بنەڕەتدا: بە شتی تیژ کار کردن]. ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑برین bırîn دە زمانی کوردمادیدا. بەم جۆرە ”پەردوو“ دە بنەڕەتدا واتا ”بڕدراوە“.

**پەردوو[2] perdu** [*pardū*] - ”پەردەی بووک و زاوا“: شێوەیەکی دیکە لە ↑پەردە perde.

**پەردە perde** [*parda*] - ”پۆشش“: پردە (P.) parde، (MP.) pardag. بە گوێرەی ”فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی“ (ل.259) دەچێتەوە سەر ریشەی ئێرانی *par- و لەوێشەوە بۆ ریشەی هیندوئەورووپی > *pel- (IE.)* ”داپۆشین“. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پرتاڵ pırtal ”کووتاڵ، پێخەف“ و ↑پرتان pırtan ”پێخەف“.

**پەرژین perjîn** [*paržīn*] - ”لەمپەری بە درک و داڵ دروستکراو“: پرچین parčīn (P.).

1- بەگوێرەی ”فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی“، ل. 258، وشەی ”پرچین“ دەچێتەوە سەر ریشەی ئێرانی کۆنی *pari-činā- پێکهاتوو لە پێشگری pari و -činā کە ئەمەشیان لە ریشەی -kay ”لەسەر یەک دانان، هەڵچنین“ وەرگیراوە.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پرچ pırç سەر بە ریشەیەک بە مانای ”چنین، هۆنینەوە“. لەوانەیە ”پەرژین“ دە بنەڕەتدا بە مانای ”تێکچندراو“ بووبێ.

**پەرستار perestar** [*parastār*] - ”چاوەدێری نەخۆش و پەککەوتە“: پەرەستار perestar یش دەگوترێ. پرستار parastār (P.). ئەم وشەیە لە زمانی فارسی وەرگیراوە و وەک ناو بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنرێ کە لە نەخۆشخانەکان لەژێر دەستی پزیشکدا کار دەکەن و ئاریکاری نەخۆشەکان دەکەن. ئەم وشەیە خۆی دەبێ لە وشەی کوردی ↑پاراستن parastın وەرگیرابێ، واتا ریشەکەی بۆ زمانی کوردی دەگەڕێتەوە. دە زمانی فارسیدا کرداری ”پاراستن“ نییە و کردارەکە دەبێتە ”پرهیختن“ و ”پرهیز کردن“ و مانای وشەکەش ”پارێز کردن“ە، واتا خۆ دوور کردن لە شتێک. دە زمانی کوردیدا وشەکە هەم مانای وشە فارسییەکان دەدا و هەمیش مانای ”ئاگاداری کردن“. بۆ وێنە ”وڵاتپارێز“ کەسێکە لە هەمبەر دوژمندا ئاگای لە وڵات دەبێ. دە وشەنامەی فارسی ”فرهنگ عمید“دا باس لە وشەی parastār لە زمانی پەهلەویدا کراوە. بەڵام دە ”فەرهەنگی پەهلەوی“دا [ئامادەکراو لە لایەن کاک عەلی نانەوازادە] وشە پەهلەوییەکە بریتییە لە pahrēxtār بە مانای ”پارێزکار، پارێزەر“ و pahrēxtan ”پاراستن، بەر گرتن، ئاگا لێ بوون“. دە زمانی فارسیدا هەر بەم شێوەی سەرەوە وشەی سرپرست sarparast و سرپەرستی sarparastī دروست کراون. ”سرپرست“ کەسێکە کە بەسەررا دەگا و ئاگای لە کەسەکانی دیکە و کارو باری ئەوانە. ئەم وشەی دوایی دە زمانی کوردمادیدا وەک سەرپەرشتی serperîştî یش بەکار دەهێنرێ.

**پەرستن perıstın** [*parıstın*] - ”عیبادەت کردن“ [دەبنەڕەتدا: پارانەوە]. پەرەستن perestın یش دەگوترێ. پرستیدن parastīdan (P.). خزمە دەگەڵ ↑پرسین pırsîn.

[بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 260) دەچێتەوە سەر -pari-štā (OI.) پێکهاتوو لە پێشگری pari "قەراخ و دەور و بەر" و ڕیشەی -stā "وەستان". ئەم بۆچوونە ڕێی تێ ناچێ دروست بێ].

**پەرمووچان permuçan** [ parmūčān ] - "سیس بوون، چرچ بوون": دەشێ پێک هاتبێ لە پێشگری پەر per + مووچان muçan و ئەمەش خزم بێ دەگەڵ ↑مووچاندن mûçandın "داهێنانەوە، چەماندنەوە".

**پەرموون permun** [ parmūn ] - "وێران، باوەربەخۆیی": خزمە دەگەڵ ↑پەروا perwa و ↑وێران weran.

**پەروا perwa** [ parwā ] - "ترس": پروا parvā (P.). خزمە دەگەڵ fear (E.) "ترس"، Gefahr (G.) "خەتەر، مەترسی"، fara (OG.) "خستنە مەترسی"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *per- >* "ڕیسک کردن، زات هەبوون، وێران". خزمیشە دەگەڵ ↑وێران weran "ڕیسک کردن، نەترسان".

**پەروەردە perwerde** [ parwarda ] - پەروەردە کردن واتا بەخێو کردن و بار هێنان. پروردن parvardan (P.) "بەخێو کردن، بار هێنان". بەگوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 266) دەچێتەوە سەر -pari-barta* لە ئێرانی کۆندا، پێکهاتوو لە پێشگری pari و -barta سەر بە ڕیشەی -*bar* بە مانای "بردن، هەڵگرتن" و [دواتر بەرهەم هێنان]. دە زمانی فارسیدا هەروەها پروار pervar (P.) هەیە کە بۆ بەخێو کردن و قەڵەو کردنی مەڕ و بزن بەکار دەهێنرێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ بار bar هێنان دە زمانی ئەمرۆدا].

**پەڕۆ pero** [ paro ] - "کوتە پارچە": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑پارچە parçe "قوماش"

2- ↑پاڵ[5] pal [پەڕۆ و پاڵ pero u pal].

**پەرۆش peroş** [ paroš ] - "خەم، خەفەت": خزمە دەگەڵ ↑پەرێشان perêşan.

**پەرە pere** [ para ] - پەرە گرتن یان پەرە ستاندن واتا گەشە کردن، باڵا کردن، بەرەو ئاستێکی بەرزتر چوون. دە زمانی فارسیدا بالیدن bālīdan (P.) "گەشە کردن" هەیە و هەروەها فرا farā (P.) [فرارفتن، فراگرفتن] هەیە کە وەک پێشگری کردار دێ و مانای بەرەو پێش چوون و بەرەو سەر چوون دەبەخشێ. هەموو ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑باڵا bala "بلیندی، بەرزی". جێی ئاماژەیە کە وشەی وراء warā (Arb.) دەبێ لە فرا farā وەرگیرابێ.

**پەڕە per(r)e** [ par(r)a ] - "کوتەئاستێکی پانکەڵە کە لەناو ئاو یان هەودا دەسووڕێ": [پەڕەی فڕفڕە، پەنکە، ماتۆر]. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پەڕ1 per [پەڕ و باڵ]. ئەم کوتەئاسنە دەشێ بە پەڕ و باڵی پەلەوەر شوبهێنرابێ.

**پەرەسێلکە pereselke** [ paraselka ] - "ناوی پەلەوەرێک": پرستو parastū (P.)، پرستک parastok (P.) و فراشتروک farāštaruk (Pl.). دەزمانی کوردمادیدا فۆتیمی t سواوەتەوە و دەبێ پێشتر پەرەستێڵک *perestelk(e) بووبێ. ڕیشەی وشەکە بە وردی ڕوون نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونێک پێوەندی بە ↑پەڕ per ەوە هەیە. بە گوێرەی بۆچوونێکی دیکە لەوانەیە پێوەندی بە ↑پەرستن perestınەوە هەبێ.[بڕوانە"فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل.260]. لەوانەشە وشەکە لە کۆندا پێک هاتبێ لە دوو کەرتی farā و štaruk. کەرتی دووەم جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ Star (G.) "ناوی مەلێک". لەوانەیە سێرەوو (سار بە فارسی)ش لەم وشەوە هاتبێ. کەرتی یەکەم جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ "پەلە" و لەوانەیە ئاماژەی بە فڕینی خێرای پەلەوەرەکە کردبێ.

**پەرەم perem** [ param ] - "دەستە، پۆل، تاقم": [پەرەم پەرەم واتا پۆل پۆل]. خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır.

**پەرەنگ pereng** [ parang ] - "لەرزانەی گوارە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پەڕ2 per "وەرەق". دە زمانی کوردمادیدا پەڕ یان پەڕە pere بە مانای "پارچەکانزای تنک" بەکار دێ و لەوانەیە مەبەست لە "پەرەنگ" هەمان "پەڕە"ی گوارە بێ.

**پەرەوازە perewaze** [ *parawāza* ] - "پەڕیوە، رویشتوو، دوورکەوتوو، ون بوو": پەر(ە) + وازە waza + per(e) . کەرتی پەر -per دەگەڵ fern (G.)، ferro (OG.)، fairra (Gt.)، far (E.) بەمانای "دوور" یەک دەگرێتەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *per- <* "ئەوبەرتر بردن، تێپەڕاندن، تێپەڕین". لەم بارەوە هەروەها سەرنجی وشەی ↑پەڕیوە perîwe بدە بە مانای "دوور کەوتوو". کەرتی دووەمی وشەکە، واتا واز(ە) waz، خزمە دەگەڵ ↑بزووتن bızutın، ↑باز baz "رێگا"، ↑بازرە bazre، ↑بزر bızır وهیتر، سەر بە ریشەی *(IE.) *wegh- <* "بزووتن، جوولان، رویشتن" [و پاشان دوور بوونەوە]. بەم جۆرە وشەکە بەتەواوی دەگەڵ faraway (E.) یەک دەگرێتەوە، واتا کەرتی پەر دەگەڵ far (E.) و کەرتی واز دەگەڵ a-way (E.) "دوور" دەبێتە خزم. دە زمانی ئینگلیزیدا away (E.) "دوور" وway (E.) "رێگا" مانا دەدا، دە ئاڵمانیدا weg (G.) بە هەر دوو مانای "رێگا" و "دوور" بەکار دێ و دە زمانی کوردمادیشدا باز baz مانای رێگا دەدا [بازی بێریان] و وازە waze-ش مانای "رۆیشتن و *دوور* بوونەوە".
[تێبینی: دە زمانی فارسیدا پرواز parvāz (P.) هەیە کە دەبێ دەگەڵ وشە کوردمادییەکە هاوریشە بێ. وشە فارسییەکە مانای "فڕین، هەڵفڕین" دەدا، بەڵام دەبێ وشەکە سەرەتا هەر بەمانای "پەرەوازە"ی کوردمادی بووبێ و پاشان ماناکەی دەگەڵ وشەی پریدن parīdan (P.) "فڕین"، کە لە ریشەیەکی جیاوازەوەیە، لێکدرابێ و مانای فڕینی وەرگرتبێ].

**پەری perî** [ *parī* ] - "بوونەوەری ئەفسانەیی کە دۆست و پارێزگەری مرۆڤەکانە": پری parī (P.). ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ریشەی *(IE.) *prāi- <* "ئاگا لێبوون، پاراستن، خۆش ویستن". هێندێک لەو وشانەی دە زمانەکانی دیکەدا لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە، بریتین لە priyá-h (OIn.) "خۆشەویست"، prijati (OSl.) " لەبار و گونجاو بوون، پشتگر و ئاریکار بوون"، frijōn (Gt.) "خۆش ویستن"، frija (OG.)، frigg (OIs.) "خۆش ویستراو، حەز لێکراو" و هەروەها ناوی خواژنێک بووە، وەک خواژنی venus لای رۆمییەکان، freidjan (Gt.) "پاراستن"، fridu (OG.)، Frieden (G.) "پارێزراوی، ئاشتی، تەبایی"، Freund (G.) "دۆست، یار"، frei (G.) "ئازاد" [دەبنەڕەتدا: مرۆڤی خۆشەویست و پارێزراو، بە پێچەوانەی نەیارەکان کە ناپارێزرێن]. "پەری" دەبێ لای باپیرانی ئێمەش بە مانای "خواژنی خۆشەویستی" بەکار هاتبێ کە مرۆڤەکانی خۆش دەوێ و ئاگای لێیانە، وەک خواژنی venus لای رۆمییەکان. هەروەها وشەکانی ↑ئافەرین aferîn و ↑ئافرەت afret لەم ریشەوە هاتوون.

**پەڕین1 perîn 1** [ *parīn* ] - "بازدان، بزوانی توند و خێرا": پریدن parīdan (P.). وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *preu- <* "پەڕین، دەرپەڕین، هەڵبەزین، باز دان". دە زمانی ئەڵمانیدا چەندین وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک froh (G.) "شاد" [خۆ هەڵاویشتن لە خۆشیان]، Frosch (G.) "بۆق" و هتد. خزمە دەگەڵ ↑پەلە pele "لەز، تاڵووکە" و هێندێک وشەی دیکە.
[تێبینی: دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ئەو وشانە مانای "پەڕین" دەدەن، بۆ وێنە springen (G.) وspring (E.) دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *sp(h)er-* "پرژان، دەرپەڕین". کە لەوانەیە خۆی لە ریشەی یەکەمەوە پەیدا بووبێ، واتا بە هاتنەکایەی فۆتیمی s لە پێشەوەی وشەکەدا، مانایەکی تازە، بەڵام هاوپێوەند بەوەی پێشوو دروست بووبێ].

**پەڕین2 perîn 2** [ *parīn* ] - دەگەڵ پاشگری -ewe یان پێشگری -te دێ [پەڕینەوە perînewe یان تێپەڕین teperîn] بە مانای "رەت بوون، پێدا رۆیشتن، رابووردن". خزمە دەگەڵ ↑بووڕین burîn، ↑بوار buwar، ↑پرد pırd، سەر بە ریشەی *(IE.) *per- <* "تێپەڕین، رابووردن".

**پەڕین3 perîn 3** [ *parīn* ] - "سڕ بوون لە سەرمان": [دەستم لە سەرمان پەڕی]، خزمە دەگەڵ دەگەڵ frieren (G.)، friosan (OG.)، vriezen (NL.)، freeze (E.)، frysa (Sw.) "بەستن لە سەرمان"، سەر بە ریشەی *(IE.) *preus- <* "پرووشە کردنی بەفر، زوقم". frius (Gt.) "سەرما، بەستەڵەک"، pruina (L.) "زوقم و بەستەڵەک"، prusva (OIn.) "زوقم، سەهۆڵ" و هەروەها Frost (G.) "زوقم، بەستەڵەک" و

↑پرووشە prûşe "وردە وردە بەفر بارین" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. دیارە ئەم "پەڕین"ە بە مانای سڕ بوون، ناتوانی پێوەندی بە "پەڕین"ەکانی دیکەوە هەبێ، چەنکوو لەمەیاندا چەمکی بێجووڵەیی لە ئارادایە.

پەڕیوە **perîwe** *[ parīwa ]* - "ئاوارە، دوورکەوتوو": بنەوشەی پەڕ -per دەشێ بە مانای "دوور" هاتبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑پەرەوازە perewaze. لەوانەشە هەر شێوەیەکی دیکە بێ لە وشەی "پەرەوازە" و سوابێتەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا Fremd (G.) بەمانای "بیانی" خزمە دەگەڵ from (E.)، fram (OE.)، fram (OIs.). ئەم پرێپۆزیسیۆنە دووربوونەوە لە نوختەیەک نیشان دەدا. ئەم وشانە لێکچوونێکی زۆر دەگەڵ وشە کوردییەکە نیشان دەدەن [فۆنێمی m زۆرجار لە وشە کوردییەکاندا دەبێتە w / v]. دە زمانی ئەڵمانیدا گەلێک وشە دەبنە خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە، وەک früh (G.) "زوو، بەرێ"، vor (G.) "پێش، بەر"، fort (G.) "بۆ پێشەوە"، Fern (G.) "دوور"، Fürst (G.) "ئاغا، ئەرباب"، Frau (G.) "خانم" [کەسانی بەرەوە، کەسانێک کە لە پێشەوەن]، fahren (G.) "ئاژۆتن، بردنە پێش". هەروەها prae (L.) "پێش، بەر، لەبەرەوە"، pará (Gr.) "لەپاڵەوە، بەسەردا"، présbys (Gr.) "پیر، بەساڵداچوو" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە [بەراوردی ئەم وشەی دوایی بکە دەگەڵ "پیر"ی کوردمادی]. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *per- >*** "پێدا تێپەڕین، لەشوێنێکەوە تێپەڕین بەرەو". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون وەک ↑بەر ber "پێش"، ↑پرد pırd، ↑پەڕین[2] perîn [تێپەڕین]، ↑بووڕین *burîn* و هتد.

پەریهتن **perîhtın** *[ parīhtın ]* - "تولانەوە بە هۆی کوڵانی زۆر": لەوانەیە خزمە دەگەڵ ↑پەلیک pelîk یان ↑پەڵوو pelu "چێشتی زۆر کوڵاو".

پەرێز **perez** *[ parez ]* - "جێگەی دەغڵی درواو": پالیز palīz (P.) "بێستان"، خزمە دەگەڵ pairi-daiza- (Av.) "جێگەی دەورگیراو"، پێکهاتووە لە پێشگری pari "دەور و بەر، دەور گرتن" و ریشەی -daiz "لە سەر یەک هەڵچنین". ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانی عەرەبی، بووەتە فردوس ferdaws (Arb.) "بەهەشت" و هەروەها لە رێگەی زمانی یۆنانی و لاتینییەوە چووەتە ناو گەلێک لە زمانە ئەورووپییەکان وەک Paradis (G.) "بەهەشت". وشەی ↑دژ dıj "قەڵا" پێوەندی بە وشە ئەوێستاییەوەکەوە هەیە.

پەرێشان **perêşan** *[ parīšān ]* - "شێواو، شپرزە": پریشان parīšan (P.). ئەم وشەیە دە فەرهەنگێکی زمانی فارسیدا بەم مانایانە لێک دراوەتەوە: پەرژ و بڵاو، شێواو، شلوێ". ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا زۆرتر دەگەڵ هێندێک وشەی وەک "افکار، خیال، حواس و خاطر" بەکار دەهێنرێ و ئەمە نیشان دەدا کە مانای بنەڕەتی وشەکە "پەرژ و بڵاو"ە. لەم تێروانینەوە بە ئاسانی روون دەبێتەوە کە وشەکە پێوەندی هەیە بە ↑پرژان pırjan. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑پەرۆش peroş شێوەیەکی دیکەیە لە بنجی پەرێش -perîş.

پەز **pez** *[ paz ]* - "بزن و مەڕ": خزمە دەگەڵ Vieh (G.)، faihu (Gt.)، pasu (OIn.)، pasu (Av.) "بزن و مەڕ"، سەر بە ریشەی ***(IE.) * peku- >*** "پەز" و دوورتریش سەر بە ریشەی ***(IE.) *pek- >*** "موو، خوری". مەبەست لە وشەکە دە بنچینەدا ئەو ئاژەڵانە بوون کە خورییان لێ دەست دەکەوێ. ئەم وشانەی سەرەوە بەرهەڤ دەکرێن دەگەڵ pastus (L.) "لەوەڕ"، pastor (L.) "شوان". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەشم peşım، ↑بسک bısık، ↑بووزوو buzu، ↑رێوی rewî و هتد.

پەژ **pej** *[ paž ]* - "شلک و تورت و لەگەشە": خزمە دەگەڵ ↑پێز pez "هێز و گوڕ" و ↑بووژانەوە bujanewe.

پەژارە **pejare** *[ pažāra ]* - "خەم، ئازاری دەروونی": بنەوشەی پەش-/ پەژ- peş -/pej دە هێندێک وشەدا دەردەکەوێ، وەک ↑پەشیمان peşîman، ↑پەشۆکان peşokan. ئەم وشانە هەموویان حاڵەتێکی رەنج و ئازار نیشان دەدەن. دە زمانی لاتینیدا وشەی passio (L.) مانای "رەنج و ئازار" دەدا. وشەکانی

pati (E.) passion "ئێش، هەستێکی پڕئازار" و patient (E.) و (G.) "نەخۆش" دەچنەوە سەر بنەڕەتی (L.) "ڕەنج کێشان، بەرگە گرتن". ئەم وشە لاتینییە دەبێ پێوەندی بە pathos (Gr.) وە هەبێ بەمانای "نەخۆشی، ئازار". وشەکانی ↑پەتا peta "ئاهۆ، نەخۆشی"، ↑پەژیک pejîk و ↑پەسیڤ pesîv "هەڵامەت" دە زمانی کوردمادیدا هەر لەم چوارچێوەیەدا جێی لێکدانەوەن. دە زمانی فارسیدا هێندێک وشەی وەک پژمردن pažmordan (P.) "سیس بوون"، فسوس fosūs (P.) "خەم، خەفەت"، افسوس a-fsūs (P.) "داخ، مخابن" هەن کە بنەوشەی پەژ- بەشێوەی جوربەجۆر تێیاندا دەروەکەوێ و دەشێ پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەبێ.

**پەژراندن pejrandın** *[ pažrāndın ]* - "قەبووڵ کردن": pazīroftan (P.)، padīriftan (MP.) > pati-grfta-* (OI.) پێکهاتوو لە پێشگری pati و ڕیشەی -grab* "گرتن". [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 255].

**پەژیک pejîk** *[ pažīk ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑پەسیڤ pesîv "هەڵامەت".

**پەسا pesa** *[ pasā ]* - پەسا پەسا واتا "لە دوای یەک، بێ ناوبڕ": خزمە دەگەڵ پس pes (P.) "دوا، دوایە" و ↑پاش paş.

[لەباری چۆتیتی دروست بوون و مانای وشەکە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ پیاپی peyāpey (P.) دە زمانی فارسیدا کە دەچێتەوە سەر پی pey (P.) واتا "دوا"].

**پەسار pesar** *[ pasār ]* - "پەنا، حەشارگە": هەر وەک ↑پەسیو *pesîw* [پەنا و پەسیو] خزمە دەگەڵ ↑پاش paş [پس pas (P.)]. مەبەست شوێنێکە کە مرۆڤ لەپشتەوەی [لەپاشەوەی] خۆی حەشار دەدا.

**پەساردن pesardın** *[ pasārdın ]* - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دی" [هەڵپەساردن helpesardın واتا پاڵ وێدان: پێمەڕەکەی بە دیوارەوە هەڵپەسارد]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑پاش paş "بەرانبەری پێش، دواوە" [دە فارسیدا پس pes (P.)]. "پەس" لێرەدا مانای "رووی دواوە، دیوی پشتەوە" دەگەیەنێ و "پەساردن" ئەو دۆخەیە کە شتێک، بۆ ئەوەی بە حەواوە ڕابوەستێ، *پشتی* وە جێگایەک دەدرێ. لەباری ماناوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ "پاڵ وەدان، پاڵ وێ دان" واتا *کەڵەکە* یان تەنیشت خستنە سەر شتێک. هەروەک چۆن دە "پاڵ وەدان" دا کەلەکە و لای قەراخ دەخرێتە سەر شتێک، دە "پەساردن"یشدا رووی دواوە و پشتەوە ئەو ئەرکە دەبینێ.

**پەس پەسکەرە pespeskere** *[ paspaskara ]* - "جاڵجاڵووکە، جۆڵاتەنە": پسپسەکۆڵە pıspısekole ش دەگوترێ. بنجەوشەی پس -pes دەچێتەوە سەر ڕیشەی **(IE.) *pak-, *pag- >** "بەستن، تێکخستن، چنین، تەنین" و دەشێ خزم بێ دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑فاق2 faq "1- جورێک *داو* بۆ گرتنی پەلەوەر 2- جۆرێک پارچەی ڕەش بۆ چارشێوی ژنان"، ↑بازە baze "جۆرە کووتاڵێکی ئەستوور" و ↑بزگوڕ bızgur "کوتەپەڕۆ".

**پەست pest** *[ past ]* - "1-نەوی، نزم 2- دڵ تەنگ، (دڵ) ڕێکگوشراو 3- بێئابڕوو (نزم و نەوی لەباری ئەخلاقییەوە": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑پەستان pestan و ↑پەستاوتن pestawtın. مانای ئەسڵی وشەکە پاڵ پێوەنان، گوشار دان، هێز خستنە سەر"ە. دواتر ئەو مانایانەی سەرەوە بۆ وشەی "پەست" دروست بوون. وەک ئاشکرایە لەئەنجامی پەستاوتنی زەوەی، زەوییەکە ڕۆدەچێ و نزمایی دروست دەبێ، یان مرۆڤی دڵتەنگ دەروونی لەژێر پەستان و گوشارێکدایە. هەروەها کاتێکیش "پەست" بۆ مرۆڤی بێ ئابڕوو بەکار دەهێنرێ، ئەوە ئاماژەیە بە ڕۆچوون و نزم بوونی ئاستی ئەخلاقی ئەو کەسە. ئەم وشانە وێ دەچێ پێوەندییان هەبێ بە ↑پشاوتن pışawtın "گوشین، شێلان" و خزم بن دەگەڵ psáein (Gr.) "ڕێخشاندن". لەم تێڕوانینەوە تێکرای ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی فارسی وەک فشار fešār (P.) "پەستان"، فشردن fošrdan (P.) "پەستاوتن"، فسردن fosordan (P.) "توند بوون، ڕەق بوون،

زەمتین"، افسردە afsorde (P.) "دڵتەنگ، خەمگین". "گوشین" و "گوشار" دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەم وشانەوە نییە.

[تێبینی 1: شیاوی ئاماژەکردنە کە پێوەندی دوو چەمکی "گوشین، شێڵان" و "ڕێخشاندن" زۆر نیزیکە و بۆیە هێندێک وشە هەموو ئەو مانایانە پێکەوە دەردەبڕن، بۆ نموونە وشەیەکی دیکەی یۆنانی واتا mássein (Gr.) هەموو ئەو مانایانەی خوارەوە بەدەستەوە دەدا: "(هەویر)شێلان، گوشین (پشاوتن)، پەستاوتن، ڕێخشاندن، ئەسترین". ئەم وشە یۆنانییە خزمە لەگەڵ "ماشتن" دە زمانی کوردمادیدا کە هەم مانای (گەسک) ڕێخشاندن دەدا و هەمیش مانای مشتومالْ دان. تێبینی 2: دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەروەها وشەیەک هەیە بە مانای "توند، سفت"، بەم شێوەی خوارەوە: fest (G.)، fasti (OG.)، vast (Nl.)، fast (E.)، fast (Sw.) "توند، قایم، سەخت"، سەر بە ریشەی *pasto- (IE.) "توند، سفت، قایم". جێی لێکۆڵینەوەیە کە ئایا وشە یۆناییەکەی سەرەوە دەتوانێ پێوەندییەکی بەم ریشەوە هەبێ یان نا].

**پەسڵان peslan** [ *paslān* ] - ڕۆژی پەسڵان واتا ڕۆژی ئاخیرەت، پاشەڕۆژ. پەشڵان peşlan یش دەگوترێ. وشەکە سەرەتا پەسان/ پەشان pesan / peşan بووە و دەنگی ل/ l ی تێخزاوە و بووەتە پەسلان/ پەشڵان. دەچێتەوە سەر ↑پاش paş [دە فارسیدا پس pes].

**پەسە pese** [ *pasa* ] - ئەم وشەیە دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "کەرەستەی خواردەمەنی وەک ئارد و ئاو بۆ نان".

1- لەوانەیە دە ئەسڵدا بە مانای "هەویر" بێ و خزم بێ دەگەڵ pástē (Gr.) "هەویر، شلکێنە". شیاوی باسە دە زمانی ئەڵمانیدا Pasta (G.) بە مانای "هەویر" دێ و Paste (G.) بە مانای "شتی هەویرئاسا کە بۆ کار و باری غەیری خواردن کەڵکی لێ وەردەگیرێ". هەردووک وشە دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بوون کە ئەویش لە زمانی لاتینی وەرگیراوە و ریشەکەی دەچێتەوە سەر pástē (Gr.). ئەم وشە یۆنانییە دەچێتەوە سەر کرداری pássein (Gr.) "پرژاندن، پێوەر کردن".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑پشاوتن pışawtın "گوشین، شێلان" [هەویر شێلان] و خزم بێ دەگەڵ psáein (Gr.) "ڕێخشاندن".

**پەسەند pesend** [ *pasand* ] - "گونجاو، باش": پەسەند کردن واتا بە باش و گونجاو زانین. پسندیدن pasandīdan (P.) "پەسەند کردن". ئەگەر سەیری وشەی "خاس" بکەین دەبینین کە ئەم وشەی دە بنەڕەتدا ئەم مانایە بە دەستەوە دەدا کە شتێک لەناو کۆبەند و تێکەبەستێکدا بە باشی جێ خۆی گرتووە، واتا پاژێکی تەبا دەگەڵ گشتەکەیە. هەر بەم چەشنە ئەگەر لە وشەی "گونجاو" ورد بینەوە، دەر دەکەوێ کە ئەم وشەیە هەر ئەم مانایە بە دەستەوە دەدا کە شتێک لەناو قەوارەیەکدا بەباشی جێی خۆ دەکاتەوە. نها بەم پێوانەیە دەکرێ وشەی "پەسەند"یش شی بکەینەوە. ئەم وشەی دەشێ بچێتەوە سەر ریشەی ریشەی < *pak-, *pag- (IE.) "بەستن، تێکخستن، چنین، تەنین" و دەشێ خزم بێ دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑پەس پەسکەرە pespeskere "جاڵجاڵووکە، جۆڵاتەنە" و بەتایبەتی ئەو وشانەی لەژێر ↑فاق2 *faq* "1- جورێک *داو* بۆ گرتنی پەلەوەر 2- جۆرێک پارچەی ڕەش بۆ چارشێوی ژنان"دا ئاماژەیان پێ کراوە.

**پەسیسە pesîse** [ *pasīsa* ] - "چێشتی زۆر کوڵاوی لێکهاڵاو": خزمە دەگەڵ ↑پەسە pese.

**پەسیڤ pesîv** [ *pasīv* ] - "هەڵامەت": خزمە دەگەڵ ↑پەژارە pejare "خەم، ئازار".

**پەسیو pesîw** [ *pasīw* ] - دەگەڵ "پەنا" دێ [پەنا و پەسیو pena u pesîv] واتا شوێنی پەنا گرتن و خۆ حەشاردان. وشەکە دەچێتەوە سەر ↑پاش paş [پس pas دە فارسیدا]. دەبنەڕەتدا مەبەست ئەو شوێنە یان ئە شتە بوو کە لە پشتەوەی [لەپاش ئەو] خۆیان حەشار داوە.

**پەش peş** [ *paš* ] - "پەق، تۆقاندن و لێک بڵاو کردن": خزمە دەگەڵ ↑پژان pıjan.

**پەشت** **peşt** [ *pašt* ] - "بەن یا دەزووی بادراو، گشتەک": خزمە دەگەڵ ↑فاق *faq 2* "1- جورێک داو بۆ گرتنی پەلەوەر 2- جۆرێک پارچەی رەش بۆ چارشێوی ژنان".

**پەشک** **peşk** [ *pašk* ] - "دڵۆپ": خزمە دەگەڵ ↑پژان pıjan.

**پەشم** **peşım** [ *pašım* ] - "خوری": پشم pašm (.P). خزمە دەگەڵ ↑پەز pez و↑بژ bıj [یاڵ و بژ].

**پەشۆکان** **peşokan** [ *pašokān* ] - "پەشێوان، پەرێشان بوون": خزمە دەگەڵ↑ پەژارە pejare.

[تێبینی: فۆنێمی k لەناو وشەکەدا ناوگرێکی وشەسازییە کە دۆخی جەخت کردن بە کردارەکە دەبەخشێ، وەک ئاڵۆزکان، بزرکان، خلیسکان، پژکاندن (قەپژکاندن)، پسکان و هتد].

**پەشیلان** **peşîlan** [ *pašīlān* ] - "وێران بوون، رووخان": هەروەها پەشیل peşîl هەیە بە مانای "وێران، رووخاو". خزمە دەگەڵ ↑پژان pıjan. مانای بنەڕەتی وشەکە "لەبەریەک چوون و لێک بڵاو بوون"ە.

**پەشیمان** **peşîman** [ *pašīmān* ] - "داخ و پەژارە و نارەحەتی بۆ کارێکی خۆکردە": پەژیوان pejîwan یش دەگوترێ. پشیمان pašīmān (.P). بنەوشەی پەش/ پەژ pej / peş بە مانای "رەنج، ئازار" دە وشەکەدا دەبیندرێ. خزمە دەگەڵ ↑پەژارە pejare.

**پەشێو** **peşêw** [ *pašew* ] - "پەرێشان، بیربڵاو، شێواو": پشێو pışêw یش دەگوترێ. وەک لەژێر وشەی "پەرێشان"دا باس کراوە، "پەرێشان" دە بنەڕەتدا مانای "پرژ و بڵاو، شپرزە" دەگەیەنێ. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم مانایە دەبێ وشەی "پشێو" یان "پەشێو"یش دە بنەڕەتدا هەمان مانای هەبێ. وشەکە پێوەندی هەیە بە ↑پژان pıjan و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "هەڵوەشان و پەخش و بڵاو بوون" دەکەن. لەم تێروانینەوە پشێو یان پەشێو کەسێکی "بیربڵاو"ە یاخود دۆخی ژیانی شپرزە و لەبەریەک هەڵوەشاوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑پەشێوان peşêwan هەیە بە مانای "بیربڵاو بوون، فکر ئاڵۆز بوون، پەرێشان و شپرزە بوون". جگە لەمە پەشێوی peşêwî بەکار دێ بە مانای "ئاڵۆزی، شێواوی". ئەم وشەیەی دوایی شێوەیەکی دیکەشی وەرگرتووە، واتا ↑بشێوی bışêwî. لێرەوە دەردەکەوێ کە "بشێوی" پێوەندی بە کرداری "شێوان"ەوە نییە و لێکچوونی ئەم دوو وشەیە تەنیا شتێکی رووالەتییە. سەبارەت بە پاشگری ئێو ew- [پەش + ێو peş + ew] دەبێ بگوترێ کە ئەمە پاشگرێکی بە ئاوەڵناوکردنە و دە چەند وشەیەکدا بەدی دەکرێ و دەتوانرێ دە وشەسازی کوردمادیدا زۆرتر کەڵکی لێ وەربگیرێ. ئەم پاشگرە دە وشەکانی بزێو bızêw و شپرێو şıprêw یشدا دەبینرێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "شپرزە" کە ئەویش دە بنەڕەتدا مانای "پەرژ و بڵاو" دەگەیەنێ].

**پەقژ** **peqıj** [ *paqıj* ] - "زیبکەی ناو دەمی زارۆک": ↑بۆقژە boqje ش دەگوترێ. هەروەها پەقژک peqjık هەیە بە مانای "بڵق، بڵقی ئاو". وەک دەزانین پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان "بڵق" و "بلۆق"دا. هەر هەمان پێوەندیش لەنێوان "پەقژ" و "پەقژک" لەئارا دایە. گشت ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە "ماسین، با کردن".

**پەقلە** **peqle** [ *paqla* ] - دەگەڵ "شەقلە" دێ [شەقلە و پەقلە şeqle û peqle]. "شەقلە" هەمان شەقل şeql ە بە مانای "وێنە، نیگار، شێوە". پەقلە peqle ش دەچێتەوە سەر ریشەی < ***peig-** ، ***peik-** (.IE) "نەخش و نیگار کردن". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پنۆ(ک) pıno(k) "پەڵە، لەکە، خاڵ".

**پەقین** **peqîn** [ *paqīn* ] - "تەقین، تۆقین": [وشەکانی تەقین و تۆقین دە بنەڕەتدا خزمن دەگەڵ دڕان و دڕین]. هەر بەم جۆرە پەقین peqîn خزمە دەگەڵ ↑هەڵپەکاندن helpekandın "قەڵش قەڵش بوون، لەت لەت بوون". وەک ئاشکرایە لەکاتی تەقین یان پەقینی شتێک دا شتەکە لە بەر یەک هەڵدەپچڕێ و لەت لەت دەبێ. دواجار خزمە دەگەڵ ↑پژان pıjan "پرژ و بڵاو بوون".

**پەک** **pek** [ *pak* ] - "هێز، توان": هەروەها پەک کەوتن pek kewtın بە مانای "لەکار کەوتن، داماو بوون" بەکار دێ، بەڵام مانای بنەڕەتی دەبێ "لەدەست دانی هێز و توانایی" بێ. دەشێ خزم بێ لەگەڵ ئەو

وشانەی لەژێر ↑بووژانەوە *bujanewe* "گەش بوونەوە، هێز و گوڕ هاتنەوە بەر"دا باس کراون، وەک (L.) vegere "بووژاندنەوە، ژیاندنەوە"، (G.) wachen و (E.) wake "لەخەو هەستان"، (OIn.) vaja-h "هێز، گوڕ، چالاکی"، (Nl.) wakker "بەئاگا، هوشیار، چالاک، بەگوڕ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < (IE.) *ueg-, * weg- "تەڕ و تازە بوون، هێز و گوڕ تێدابوون".

**پەکاندن pekandın** [*pakāndın*] - ↑هەڵپەکاندن helpekandın.

**پەل 1 pel** [*pal*] - "نەقووڵ": خزمە دەگەڵ (G.) flach، (OG.) flah، (Nl.) vlak "پەل، نەقووڵ"، (E.) flat، (L.) plaga "رووبەر، پانتایی زەوی"، (L.) placidus "نەقووڵ، تەخت، ساف"، (Gr.) pelagos "رووبەری دەریا". ئەم وشانە و گەلێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پان، بڵاو، تەخت"، سەر بە ریشەی < (IE.) *ple-, *pla- "پان، پەل، بڵاو". خزمە دەگەڵ ↑بڵاو bılaw و ↑وڵات *wılat* و هتد.

**پەل 2 pel** [*pal*] - "دەست و لاق": مانای بنەڕەتی وشەکە "دەست"ە. ئەو مانایە دە وشەی کوردمادی ↑پیل pîl"قۆل، دەست"دا پارێزراوە. هەروەها کاتێک دەگوترێ "پەل و پۆ"، مانای وشەکە بە روونی دەردەکەوێ، چونکوو "پەل" دەبێتە دەست و "پۆ" ش هەمان "پێ" یان "پا"یە. خزمە دەگەڵ (E.) feel، (G.) fühlen، (Nl.) voelen "هەست کردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەبنەڕەتدا بە مانای "دەست لێدان، دەست لێخشاندن" بوون و پاشان مانای گشتی "هەست کردن"یان وەرگرتووە. دە زمانی لاتیندا ئەم مانا کۆنە دە وشەی (L.) palpo "دەست پێدا خشاندن، بەدەست لەمس کردن"دا پارێزراوە. جگە لەمە palma (L.)، (Gr.) palame "بەری دەست" مانای کۆنی وشەکە دەردەخەن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < (IE.) *pal- "پەل، دەست".

**پەل 3 pel** [*pal*] - "دڕکی دار، لکی دار":

1- بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ (G.) Pfeil، (E.) pil، (L.) pilum "پڵلار، تیری کەوان" و لەوانەشە ↑پڵلار pıllar "دار(دەست) بۆ هاویشتن". ریشە؟

2- هەروەها دەکرێ دەگەڵ چەند وشەیەک دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەڵی سەنگێنین، وەک (G.) barsch "تفت و تاڵ، تیژ"، (OIs.) barr "زوور، تیژ"، (G.) Borste "مووی زبر و رەق" و (G.) Bürste "فڵچە، برۆس" و (G.) Bart "ردێن"، سەر بە ریشەی < (IE.) *bhar- "تیژ، دڕک، چقڵ". (OIn.) bhrstí-h "گۆشە، دەرپەڕیوی، تیژایی" سەر بەم ریشەیە. لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پۆڕ por "کاکۆڵ، مووی سەر".

**پەل 4 pel** [*pal*] - "بەرد": یەکێک لە شێوە کۆنەکانی وشەی ↑بەرد berd. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ *pal* "هێز، گوشار"دا باس کراون.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "بەرد" و "هێز، پتەوی" لە وشەکانی "هەستی" و "ئاستەم"، هەروەها لە وشەکانی "تەوەنە" و "توانین"یشدا دەردەکەوێ].

**پەل(ە) pel(e)** [*pal*] - دەگەڵ "پووش" دێ و دەگوترێ پەلەپووش pelepûş.

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە(L.) palea "کا، پووش".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑پۆلکە polke "تۆیکڵی چەڵتووک، بلۆقی دەست".

**پەڵاس pelas** [*palās*] - "بەڕە": پلاس (P.) palās "1- بەرەی پشم 2- پەڕۆ و جلکی نەناسک": وشەکە خزمە دەگەڵ (G.) Flachs، (OG.) flahs، (Nl.) vlas، (E.) flax "لۆکە" [پنچکێک کە بەرهەمەکەی لۆکەیە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ (G.) flechten "هۆنینەوە، پرچ کردن"، (Gr.) plekein، (L.) plectere "چنین، هۆنینەوە" و (Gt.) flahta "پرچ، مووی هۆنراو"، سەر بە ریشەی < (IE.) *plek- "هۆنینەوە، (تێک)چنین". دە زمانی کوردمادیدا ↑پرچ *pırç* دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمە. ئەم ریشەیەی سەرەوە خۆی دە پلەیەکی دوورتردا دەچێتەوە سەر ریشەی < (IE.) *pel- " قەد، گنچ، چرچ و لۆچی". بەم

شێوەیە falten (G.) "قەد کردن، گنج کردن"، هەروەها ↑پلژیان pıljîan "سیس بوون" و پلاسیدن palāsīdan (P.) "سیس و چرچ بوون" دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمایەتی پەیدا دەکەن.

[تێبینی 1: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "لۆکە"، "دەزوو" و "رایەخ، بەڕە، پەڕۆ" بەراوردی بکە دەگەڵ وشەی "لەی". تێبینی 2: زۆر وێ دەچێ کە "پەڵاس" دە زمانی عەرەبیدا کرابێ بە فرش farš (Arb.) واتا زمانی عەرەبی لەبەر نەبوونی فۆنیمی p، ئەم فۆنیمەی کردووەتە f. دواتر زمانی کوردمادی و فارسی ئەم وشە عەرەبێنراوەیان وەرگرتووەتەوە و لەجیاتی وشە رەسەنەکەی خۆیان بەکاری دێنن. لەوەش سەرەنجراکێشتر ئەوەیە کە ئەم وشە عەرەبێنراوە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بۆ رایەخی جوان و بەنرخ بەکار دەهێنرێ و وشە رەسەنەکەش، ئەگەر شانسێکی هەبێ، وەک پەڕۆ و بەڕەی بێنرخ چاوی لێ دەکرێ. ئەمە نموونەیەکە لە گەلێک وشە کە بەم چارەنووسە تاڵە دووچار بوون. ئەمەش دە راستیدا رەنگدانەوەی چارەنووسی تاڵی نەتەوە ژێردەستەکانە کە لە زمان و فەرهەنگ و نرخ و بەهاکانی خۆیان بێگانە دەکرێن، هەرچی خودی بێ، بێنرخ دێتە بەرچاویان و بەهاکانی نەتەوەی سەردەست و هەروەها زمان و وشەکانیان وەک شتێکی بەنرخ و پێشکەوتوو بەسەریاندا زاڵ دەبێ].

**پەلاستیک pelastîk** [*palāstīk*] - "جیر": لاستیک lastîk یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر *plasticus* (*L.*) > "شێوەوەرگر، فۆرمگر" > *plássein* (*Gr.*) "ساز کردن، شێوە پێدان، دروست کردن لە شتی نەرم". ئەو کەرەستە دەستکردە لەبەر نەرم بوونی دەتوانرێ شێوەی جۆربەجۆری پێ بدرێ و هەر بۆیە وەسا ناو نراوە.

**پەڵاش pelaş** [*palāš*] - دەگەڵ "پووش" دێ [پووش و پەڵاش pûş û pelaş]، شێوەیەکی دیکە لە ↑پەل(ە) pel(e) "کا، پووش". لەوانەیە ئەم وشەیە هەر وەک "پەلەپووش" دە بنچینەدا لە دوو وشەی پەل(ە) + ئاش pel + aş پێک هاتبێ کە وشەی یەکەمیان مانای "پووش" دەدا و ئەوەی دووهەمیشیان، واتا ئاش aş- دەبێ هەر بە مانای "پووش، چیلکەو چاڵ بۆ سووتەمەنی" هاتبێ [بەراوردی بکە دەگەڵ وشەکانی ↑هەژگ hejg "چیلەوچاڵی سووتەمەنی"، ئازاڵە azale "ئاوردوو"، ↑هیشک/ ئیشک hîşk، ↑ ئێزینگ ezîng "داری سووتەمەنی"].

**پەلامار pelamar** [*palāmr*] - "هێرش، هەلەمار": پێک هاتووە لە دوو وشەی پەلە pele + مار mar. خزمە دەگەڵ ↑پەلە pele "لەز، خێرایی". پەلامار بزاوتێکی خێرا و بەپەلەیە بۆ سەر دوژمن. کەرتی دووەمی وشەکە، واتا mar- لە وشەی ↑هەلەمار helemar "پەلامار"یشدا دەبینرێ و خزمە لەگەڵ ↑ماردن mardın "لێدان و تێکشکاندن". لەم تێروانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە" لێدانی کوتوپڕ، زەبری خێرا". لە وشەی هەلەمار helemar یشدا هەر ئەو شێوەیە رەچاو کراوە، "هەلە" مانای "پەلە" دەدا [هەلەهەل و پەلەپەل] و کەرتی دووەمیش لە هەردوو وشەکەدا هاوبەشە.

**پەڵان pelan** [*palān*] - "هەستی، ئێسک": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ pal "هێز، گوشار"دا باس کراون.

**پەڵپ pelp** [*palp*] - "بیانوو، گڕوو، گڕنە": شیاوی باسە کە وشەکانی "گڕوو" و "گرنە" کە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وەک مانای "پەڵپ" باس کراون، خزمایەتیان دەگەڵ "گریان" هەیە کە ئەویش دەنگ هەڵبڕینە لەبەر ئێش وئازار. جا ئەگەر مانای بنەڕەتی پەڵپ هەمان گڕوو و گڕنە بێ، ئەوا ئەم وشەیە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ Welpe (G.)، welph (OG.)، welp (Nl.)، whelp (E.)، valp (Sw.) "بێچووی سەگ، رێوی و گورگ"، (h)wel (OG.) "بەدەنگەدەنگ، بە زاق و زیق"، hwelan (OE.) "زیقاندن" و hvellr (OIs.) "زرینگانەوە". دە زمانی کوردمادیدا ↑گڤر gıvır و ↑گورپە gurpe و دە فارسیدا گربە gorbe (P.) واتا "پشیلەی تیر" هەر ئەو وشانەی سەرەوەن کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بۆ بێچووی سەگ و رێوی و گورگ بەکار هاتوون و دە زمانی کوردمادی و فارسیدا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەتایبەتی فۆنیمی w بووەتە g کە ئەوەش لەم زمانانەدا زۆرجار بەرچاو دەکەوێ.

**پەلتین peltîn** [ *paltīn* ] -"توند بوون، سفت بوون": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ pal "هێز، گوشار"دا باس کراون.

**پەڵتە pelte** [ *palta* ] - "داری تیوان بەرد و کوڵەکە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پەل pel و ↑بڵاو bılaw و ئەو وشانەی ئاماژە بە "پان و بڵاو" بوون دەکەن. لەم تێڕوانینەوە "پەڵتە" ئەو تیکەدارە تەخت یاخود پەلەیە کە دەخرێتە ژێر کوڵەکەوە.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بالار balar "کاریتە".

**پەڵتەک peltek** [ *paltak* ] - "نەخۆشی گەرووی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە "خڕ بوون، ماسین و هەڵتۆقین" دەکەن، وەک ↑*باڵۆکە baloke*، ↑بلق bılıq، ↑بلۆق bıloq و هتد. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پەڵمین pelmîn.

**پەلخ pelıx** [ *palıx* ] - "بەچکەگامێش": خزمە دەگەڵ ↑بارِ bar "بێچووە مەلی بەهارە"، ↑بەرخ berıx [برە (P.) barre "بەچکەی مەڕ" و هەروەها دەگەڵ (Gr.) poule "ئاژەڵی جەوان، جوانوو" و (L.) pullus "ئاژەلی جەوان، مەلی جەوان"، (G.) Fohlen، (OG.) folo، (E.) foal، (Sw.) fale "جوانوو"، هەروەها (L.) puer"زارۆک" و پوور (P.) pūr "کوڕ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *pau- >** "بچووک، وردیلە، کەم".

**پەلشقە pelışqe** [ *palıšqa* ] - "شل و شەوێق": خزمە دەگەڵ ↑پلێشان pılîşan "پلێخان، پان و پلچ بوونەوە". مانای بنەڕەتی وشەکە "لەبەریەک بڵاوبوو، لەبەریەک هەڵوەشاو" بووە.

**پەلک pelk** [ *palk* ] - "گەڵا": وەلگ welg و وەرگ werg یش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا برگ barg (P.) دەگوترێ. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑بەلگە belge بە مانای "سەنەد" بەکار دێ کە دە فارسیدا دەبێتە برگە barge (P.) واتا "وەرەقە". "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 192، وشەی "بەرگ"ی فارسی لەگەڵ چەندین وشەی زمانە ئەورووپییەکان هەڵسەنگاندووە، وەک valká (OIn.) "تویکڵ"، voloknó (Rus.) "تاڵی موو"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uel- >** "جیا کردنەوە، لێکردنەوە، پچڕینەوە". [ئەم شی کردنەوەیە ڕێی تێ دەچێ، چونکوو دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەی Laub (G.) و leaf (E.) "گەڵا" دەچنەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە هەمان مانا و خزمیشن دەگەڵ "ئاڵف"]. بەم جۆرە "پەلک" دەبێتە خزمی چەندین وشە دە زمانی کوردیدا، بۆ وێنە ↑وەرساندن wersandın "پچڕاندن" و ↑گورگ gurg [واتا ئاژەڵی دڕەندە، داپچڕێنەر]. "گورگ" بەشێوەی وەرگ werg یش دە زمانی کوردمادیدا هەیە و ئەم وشەی دوایی هاوکات مانای "پەلک"یش دەبەخشێ و ئەمەش پێوەندی ئەم وشە و چەمکانە بە یەکەوە نیشان دەدا. شیاوی گوتنە کە زمانی عەرەبی وشە کوردمادییەکەی وەرگرتووە و کردوویە بە ورق waraq (Arb.).

**پەڵمین pelmîn** [ *palmīn* ] - "ماسین، ئەستوور بوون": پەڵمان pelmān یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پاڵ pal "هێز، گوشار"دا باس کراون.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "ماسین، ئەستوور بوون" و "پتەو و بەهێز بوون" لەم وشانەی خوارەوەشدا بەدی دەکرێ: ماسین "ئەستوور بوون" و مەیین "سفت بوون"، هەروەها "ئەستوور" هەم بە مانای "ماسیو، هەڵمساو" و هەم بە مانای "سەخت، بەهێز].

**پەڵوو pelu** [ *pelū* ] - "1- ئارد وئاوی لێکدراو بۆ جوجکە 2- چێشتیکە وردەهەویر و کووزەڵەی تێ دەکەن": پەڵووڵە pelule ش دەگوترێ. لەوانەیەخزم بێ دەگەڵ Brei (G.)، brio (OG.)، briw (OE.) "شلە، خواردنی شل و نەرم" [دە زمانی ئەڵمانیدا بەو شلەمەنییەی دەدرێ بە زارۆکی ساوا دەگوترێ Babybrei]، سەر بە ریشەی **(IE.) *bher- >** "کوڵاندن، سووتاندن، برژاندن". دە زمانی کوردمادیدا هەروها ↑پەلیک pelîk "چێشتی زۆر کوڵاو" و ↑پەریهتن perîhtın "توڵانەوە بە هۆی کوڵانی زۆر" هەن کە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

**پەلۆخ pelox** [ *pelox* ] - "گرگرتوو، داگیرساو": خزمە دەگەڵ ↑پۆلوو polu.

پەڵۆخ **pelox** *[ pelox ]* - "پیس": دە زمانی فارسیدا palašt (.P) و پلید palīd (.P) بە مانای "پیس، چڵکن، گەمار" بەکار دێن. دە زمانی رووسیدا ploxa (.Rus) بە مانای "پیس" دێ. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ black (.E) "رەش" و blakkr (.ON) "تاریک".

[تێبینی: لەنێوان چەمکەکانی "رەش" و "پیس"دا پێوەندی هەیە، هەر وەک چۆن لەنێوان "سپی" و "پاک"یشدا پێوەندی هەیە. ئەم پێوەندییە لەوەڕا هاتووە کە کاتێک شتێک بە چڵک و چەپەر و تۆز و خۆڵ چڵکن بووە، ڕەنگەکەی بەرەو ڕەش گۆڕاوە. نموونە لەم بارەوە وشەی schwarz (.G) "رەش"ە کە دەبێتە خزم دەگەڵ sordere (.L) "پیس بوون" (دە بنەڕەتدا: ڕەش بوون، تۆخ بوون)].

پەلۆخین **peloxîn** *[ paloxīn ]* - "لێدانی توند": شێوەیەکی دیکە لە ↑پلۆسین pılosn [داپلۆسین dapılosîn].

پەلە **pele** *[ pala ]* - "لەز، تالووکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ froh (.G) "خۆشحاڵ، شاد"، frao (.OG) و vro (.NL). ئەم وشە ژێرمانییە سەرەتا بە مانای "خوهەڵاویشتن، دەرپەڕین، پەلەکردن، بەجم و جۆڵ بوون" بووە. ئەم مانایانە دە هێندێک لە زمانەکاندا پارێزراون، بۆ وێنە frar (.OIs) "تیژ، چابوک، بەپەلە"، frow (.ME) "بەپەلە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *preu- >** "پەرین، هەڵبەزین". مانای "خۆشحاڵ" دە زمانی ئەڵمانیدا لێرەوە پەیدا بووە کە مرۆڤ لە کاتی خۆشحاڵیدا جم و جۆڵی تێ دەکەوێ و لەوانەشە خۆ هەڵاوێ، هەروەک چۆن بەپێچەوانەش لەکاتی خەم و ناخۆشیدا دادەهێزرێ و تێک دەتەپێ. سەبارەت بە پێوەندی دەنێوان دوو چەمکی پەڕین و هەڵبەزین لە لایەک و شادی و خۆشحالی لە لایەکی دیکەوە دە زمانی کوردمادیدا نموونەی بەرچاو هەیە کە بریتییە لە بەکارهێنانی دوو وشەی "شایی" (شادی) و "هەڵپەڕین" بە یەک مانا. بەم جۆرە دەتوانین هێندێک وشەی دیکەش ببەینەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑پەڕین perîn، ↑پڕ pır [پڕ پێداگرتن]، ↑پرتاو pırtaw، ↑پرتافین pırtafîn "غارپێکردن"، ↑پلینگ pılîng، ↑پەلامار pelamar و هتد.

پەڵە**1** **pele** *[ pala ]* - "لەککە": خزمە دەگەڵ Fleck (.G)، flekkr (.OIs)، fläck (.Sw) "پەڵە، لەککە". ئەم وشانە بەخزم دادەندرێن دەگەڵ plagella (.L) "پەڕۆ" و plaga (.L) "رووبەر، ئاستی زەوی" و ژمارەیەک وشەی دیکە دە زمانە ژێرمانییەکاندا کە ئاماژە بە چەمکی "بڵاو، بڵاو بوونەوە" دەکەن. کەواتە دەبنەڕەتدا وشەکە ئاماژەی بە "ئاست، رووبەر، پانتایی" کردووە. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑بڵاو bılaw، ↑پەل pel "نە قووڵ، تەخت" و هەروەها ↑وڵات wılat [دەبنەڕەتدا واتا "رووبەری زەوی، پانتایی سەر هەرد"]. هەروەها بڕوانە ↑پەڵە$^4$ pele "پارچەزەوی".

پەڵە**2** **pele** *[ pala ]* - دوای بارانێکی زۆر و تێراو بوونی زەوی دەڵێن "پەڵە"ی داوە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑پلووسک pılusk و لە ریشەی **(IE.) *pleu- >** هاتووە کە مانای "جاری بوون" دەدا و هێندێک مانای دیکەشی لێ کەوتۆتەوە، وەک وەسەر ئاو کەوتن، شوشتن، مەلە کردن. دە زمانە ژێرمانییەکاندا ئەو وشانەی بۆ چەمکەکانی "جاری بوون، سێڵاو، چەم" بە کار دەهێندرێن، لەم ریشەوە سەریان هەڵداوە، وەک Flut (.G) "سێڵاو، لێشاو"، fleet (.E) [بۆ نموونەکانی دیکە بڕوانە ↑پلووسک pılusk]. plauti (.Lit) "شوشتن" و pleo (.Gr) "مەلە دەکەم" هەر لەو ریشەیە هاتوون. بەم جۆرە گومان لەوەدا نامێنێ کە مەبەست لە "پەڵە دان" دە بنچینەدا ئەوە بووە کە دوای بارانی زۆر و تێراو بوونی زەوی ئاو بەسەر هەرد دا جاری دەبێ، بەوتەیەکی دیکە هەرد وەسەر ئاو دەگەڕێ یان دەشۆردرێتەوە. شیاوی باسە کە ریشەی *pleu-* دە بنەڕەتدا بە مانای "پڕ، زۆر" بەکارهاتووە [↑پڕ pır] و دواتر گەلێک مانای دیکەی لێ کەوتۆتەوە. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑پەڵە3 pele.

پەڵە**3** **pele** *[ pala ]* - دەگەڵ "گیا" دێ [پەڵەگیا]. لێرەشدا "پەڵە" دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *p(e)l- >** "زۆر، پڕ". پەڵە ئاماژە دەکا بە کۆما بوون، کۆگا بوون، زۆر بوون. بەم جۆرە خزمە دەگەڵ چەندین

وشەی وەک ↑پۆل pol، ↑پر *pır*، ↑فرە fre و هتد. ئەم ریشەیە لەپێوەندیدایە دەگەڵ ریشەی *pleu-** (.IE) "جاری بوون" و بەم شێوەیە وشەکە دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑پەڵە2 pele.

**پەڵە[4] pele** [ *pala* ] - "پارچەزەوی": خزمە دەگەڵ وەڵات یان ↑وڵات wılat واتا "سەرزەوی". هەڵی سەنگینە دەگەڵ Feld (.G) وfield (.E)، veld (.Nl)، fold (.OIs) "هەرد، زەوی، مەزرا". هەروەها دەبێتە خزم لەگەڵ flach (.G) "پەل" وFläche (.G) "رووبەر، سەتح" و چەندین وشە بەم مانایانە لە زمانە ژێرمەنییەکاندا. وشەکە ئاماژە بە رووبەر و پانتاییەک دەکا و لەوانەیە ببێتە خزم دەگەڵ ↑پەڵە1 pele "لەککە".

**پەلەپیتکە pelepîtke** [ *palapītka* ] - "ماشەی تفەنگ": پەل + ە + پیت + کە pel + e + pit + ke. "پەل" لەوانەیە↑پەل pel "دەست" بێ [پەل و پۆ]، یان لەوانەشە پێوندی بە ↑پل3 pıl و ↑پڵتۆک pıltok "پتە"ەوە هەبێ [پڵتۆک مانای "پەلەپیتکە"ش دەبەخشێ]. پیتکە pîtke خزمە دەگەڵ ↑پتە pıte سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان". لەم تێروانینەی دووەمەوە هەردوو کەرتی وشەکە هاومانا دەردەچن، واتا هەم "پەل" و هەم "پیتکە" دە بنەڕەتدا مانای "لێدان" دەبەخشن. وشەی لەم شێوەی دە زمانی کوردمادیدا کەم نین. ئەم جۆرە وشانە دۆخی جەخت کردن دەگەیەنن.

**پەلەقاژە pelaqaje** [ *palaqāža* ] - "دەست و پێ لێدان بۆ خۆ رزگار کردن": پێک هاتبێ لە دوو وشەی ↑پەل pel "پیل، دەست" و قاژ qaž. کەرتی دووەم لە وشەی پاقژە paqıje ش دا دەبیندرێ کە هەمان مانا دەبەخشێ. ئەم کەرتەوشەیە پێوەندی بە ↑هەژان hejan ەوە هەیە و مەبەست هەژاندن و لێکدانی پەل و پا بێ. "قاژ" لێرەدا بە مانای "*قاچ*، پێ، لینگ" نییە، چونکوو ئەگەر "قاژ" هەمان "قاچ" بایە، دەبوو بێژن "پەلەقاژە لێدان" [دەست و پێ لێدان]، نەک "پەلەقاژە کردن". کرداری "کردن" نیشان دەدا کە "قاژە" لە بنەڕەتدا "هەژە" بووە و مەبەست "پەلەهەژە" کردنە، هەر وەک "لینگەفرتە کردن".

**پەڵیت pelît** [ *palīt* ] - دەگەڵ "هەڵیت" دێ [هەڵیت و پەڵیت helît u pelît]. هەروەها پەڵەت pelet یش دەگوترێ [غەڵەت و پەڵەت ġelet û pelet]. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ flāh (.OE) و flār (.OIs) "فریودەر، هەڵە، ناراست". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑پارانەوە paranewe.

**پەلیک pelîk** [ *palīk* ] - "چێشتی زۆر کوڵاو": خزمە دەگەڵ ↑پەڵوو pelu "خۆراکی هەویرئاسا" و ↑پەریهتن perîhtın "توڵانەوە بە هۆی کوڵانی زۆر".

**پەمۆ pemo** [ *pamo* ] - "لۆکە": پنبە panbe (.P)، bambax (.MGr) "پەمۆ". [تێبینی: جاران جۆرە پارچەیەک هەبوو لە ناوچەی موکریان پێیان دەگوت "بامبازی". ئەمە لە وشە یۆنانییەکە زۆر نیزیکە].

**پەنا pena** [ *panā* ] - "پارێزراوی، شاراوەیی": پەنا بردن واتا چوونە شوێتێک یان داوا کردن بۆ خۆپاراستن و خۆ حەشاردان. پناە panāh (.P). دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسیی"دا (ل. 286) دوو بۆچوون لەم بارەوە ئاماژەیان پێ کراوە. 1- پێوەندی بە ریشەی ئێرانی -naθ (.Ir) "گەیشتن، پێ گەیشتن، بە دەست هێنان" کە ئەمیش دەچێتەوە سەر ریشەی هیندووئەورووپی **-nek (.IE) <** "گەیشتن(ەوە)، نیزیک بوونەوە". 2- پێوەندی بە -nāthá (.OIn) "پەنا، ئاریکاری و پشت گرتن" و-a-nāthá- (.OIn) "بێپەنا، بێباوک، سێوی". بۆچوونی یەکەم، واتا پێوەندیی بە چەمکی "نیزیک و نیزیک بوونەوە" زۆرتر رێی تێ دەچێ، چونکوو دە زمانی کوردمادی پەنا بە مانای "نیزیک"یش بەکار دەهێنرێ و بۆ وێنە دەگوترێ "وەرە پەنام، بە پەنامدا تێپەڕی، لە پەنای باوکی دانیشت" و هتد.

**پەناباد penabad** [ *panābād* ] - "ناوی سککەیەکی ئێرانی کە ئێستا نەماوە، بەرانبەری دە شایی بوو": پەناد penad یش دەگوترێ. پناباد penabad (.P). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Pfennig (.G)، pfending (.OG)، penny (.E)، pannig (.OFr) "ناوی سککەیەک" [ لە ئەڵمان نرخەکەی یەک سەدوومی مارک بوو]. ریشەی ئەم وشە ژێرمانییانە بەپێی شیمانەیەک دەگەڕێتەوە سەر pondus (.L) "قورسایی" و pendere

(L.) "کێشان، وەزن کردن". سەبارەت بەم وشە لاتینییانە هەروەها بڕوانە ↑پووت³ put "وەزنێکە بەرانبەری 16 کیلۆ ".

**پەنامەکی penamekî** [ *panamakī* ] - "بە نهێنی، بە دزییەوە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑پەنا pena.

**پەنجە pence** [ *panja* ] - "سەرجەمی قامکەکان": لە ئەژماری ↑پێنج penc وەرگیراوە و ئاماژەیە بە ژمارەی قامکەکان. خزمە دەگەڵ Finger (G.)، (E.)، (Sw.) و vinger (Nl.) و figger (Gt.) "قامك". ئەم وشە ژێرمانییانە سەرەتا بە مانای "پەنجە" هاتوون و پاشان ماناکەیان گۆڕدراوە بۆ "قامك".

**پەنجەرە pencere** [ *panjara* ] - "شوێنی پێداهاتنی رووناکی بۆ ناو ژوور": پنجرە panjare (P.). دە زمانی لاتینیدا fenstera (L.) هەیە بەو مانایە. وشە لاتینییەکە چووەتە ناو زمانی ئەڵمانی و بووەتە Fenster (G.) "پەنجەرە". ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**پەند pend** [ *pand* ] - "دەرس، ئامۆژگاری": دە بنەڕەتدا بە مانای "شوێنپێ، رێگا، رێباز" بووە و مەبەست لە "پەند وەرگرتن" دە راستیدا کەوتنەشوێن، رێگا (ی دروست) دۆزینەوە، گرتنەبەری رێباز بووە. "پەند دان" بە مانای ئامۆژگاری کردن و رێگا نیشان دان بووە. خزمە دەگەڵ ↑پەیدا peyde سەر بە ریشەی **< *pent-* (*IE.*)** "رۆیشتن، هەنگاو نان". دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"شدا ( ل. 287) وشەکە لەم چوارچێوەیەدا شی کراوەتەوە و گرێ دراوە بە paθī (OP.)، pand (MP.) و Pfad (G.) و path (E.) "رێگا، رێباز" و بردراوەتەوە سەر ئەو ریشەی سەرەوە.

**پەنگ peng** [ *pang* ] - پەنگ خواردن واتا راوەستان و کشانەوەی ئاو. خزمە دەگەڵ ↑پان pan. دەبنەڕەتدا مەبەست پان و بڵاو بوونەوەی رووبەری ئاوە بە هۆی بەربەست بوونی.

**پەن(گر) pen(gır)** [ *pangır* ] - "پۆلوو": خزمە دەگەڵ Funke (G.)، funcho (OG.)، vonk (Nl.)، vonke (ME.) "ئاورینگ"، fon (Gt.) "ئاگر"، سەر بە ریشەی **< *puon-* (*IE.*)** "ئاگر". دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا funken جگە لە مانا کۆنەکەی، واتا "ئاورینگ دان"، بە مانای "بروسکە لێدان، پەیام ناردن بە بێتەل"یش بەکاردەهێنرێ. وشەکە دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پۆلوو polu.

**پەنمان penman** [ *panmān* ] - "هەڵمسان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑*پان pan*، ↑پەنگ pang و pandere (L.) "لەبەریەك کشانەوە".

**پەنی¹ penî** [ *panī* ] - "دیار، ئاشکرا، *پەیدا*": خزمە دەگەڵ ↑پەیدا peyda. هەروەها نەپەنی nepenî هەیە بە مانای "نادیار، شاراوە".

**پەنی² penî** [ *panī* ] - "پەڵەی بچووك(ی سەر پێست)": شێوەیەکی دیکە لە ↑پنۆ(ك) pıno(k) "پەڵە، لەکە، خاڵ".

**پەنیر penîr** [ *panīr* ] - "جۆرێك شیرەمەنی": پنیر panīr (P.).بە گوێرەی فەرهەنگی ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 289، پێك هاتووە لە -pati-nī-ra*. کەرتی یەکەم پێشگر و کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ریشەی -nay "پشاوتن، لێدان (ژەندن)، کەرە گرتن" و وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ panīnas (Let.) "دۆ".

**پەهلەوی pehlewî** [ *pahlawī* ] - "ناوی زمانێکی کۆن": خزمە دەگەڵ ↑*پاڵەوان palewan* [پەهلەوان pehlewan] و دواجار ↑*پاڵ pal* "هێز، گوشار"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "سەخت بوون، بەهێز بوون". ئەم وشەیە شێوەیەکی عەرەبێندراوە، چونکوو کەرتی -wī نیشانەی وەپاڵ دان دە زمانی عەرەبیدایە. دەشێ شێوە کۆنەکە "پاڵی palî" [یان پاڵەیی paleyî] بووبێ کە بە زمانی ئەمڕۆیی و دیسان لەژێر کاریگەری زمانی عەرەبیدا بووەتە ↑فەیلی faylî. وێ دەچێ ئەو زمانەی کە ئەمڕۆ وەك زمانی پەهلەوی پێناسە دەکرێ، یەکێك لە شێوەزارەکانی زمانی کوردمادی کۆن بێ.

**پەی pey** [ *pay* ] - "شوێن، دوا": بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 297، دە بنەڕەتدا بەمانای "شوێنپێ"یە و خزمە دەگەڵ -paa (Av.)، -pada (OIn.) "قەدەم، هەنگاو". بەم جۆرە خزمە دەگەڵ ↑پێ pe "لاق".

پەیام **peyam** *[ payām ]* - "ڕاسپێری، خەبەر، مەساژ": پیام payām (P.) و پیغام payġām (P.). خزمە دەگەڵ ↑پەیڤ *peyf* و ↑پەیڤین peyvîn "قسە کردن" و لەوانەشە ↑پەیک peyk "قاسید، نامەبەر" [ئەو کەسەی پەیام (قسە) دەبا].

پەیت **peyt** *[ payt ]* - "توند، پتەو": خزمە دەگەڵ ↑پیت pît "بەرهەم، ڕێژەو" و ↑پتەو pıtew [دەبنەڕەتدا: هێز و بڕشت].

پەیتا **peyta** *[ paytā ]* - پەیتاپەیتا واتا بەردەوام، بەدوای یەکدا. پی در پی pey dar pey (P.). خزمە دەگەڵ ↑پەی pey.

پەیتووکە **peytuke** *[ paytūka ]* - "1- جۆرێک چۆلەکەی تیژفڕ 2- مرۆی بزۆز و نائارام": پێوەندی هەیە بە ↑پەیت peyt "توند، پتەو".

پەیچەڵ **peyçel** *[ payčal ]* - "ئاژەڵێک کە لە ڕۆیشتندا ئەژنۆ لێک دەدا": پێک هاتووە لە دوو کەرتی پەی + چەڵ çel + pey. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پێ pe "لاق". کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە چەمکی "لێدان و لێکدان" دەکەن، وەک ↑شڵە şıle، ↑شێلان şêlan، ↑زللە zılleو هتد. ژمارەیەک لەم وشانە لە ژێر ↑شڵەقان şıleqan دا باس کراون.

[تێبینی: هەڵی سەنگینە دەگەڵ پەیزەن peyzen "یەکسمێک کە لە ڕۆیشتندا پەل لە پەل دەدا"].

پەیدا **peyda** *[ paydā ]* - "دیار، بەدی هاتوو": پیدا paydā (P.). خزمە دەگەڵ finden (G.)، find(E.)، findan (OG.)، fintan (Gt.)، finna (Sw.) "دۆزینەوە، پەیدا کردن"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *pent- >* "ڕۆیشتن، هەنگاونان". pons (L.) "پرد"، patos (Gr.) "ڕێگا، ڕێچکە"، panthah- (OIn.) "ڕێگا و بان" دەچنەوە سەر ئەو ڕیشەیە. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا فۆتیمی n لە وشەکە دا نەماوە. هەر ئەم حاڵەتە لە وشەی fadi (OS.) "ڕۆیشتن"دا بەرچاو دەکەوێ. بەڵام دە وشەی کوردمادی ↑پەنی penî دا فۆتیمی n پارێزراوە [پەنی واتا پەیدا، دیار و نەپەنی واتا ناپەیدا، شاراوە"].

پەیژە **peyje** *[ payža ]* - "تیردیوان": پەیجە peyce ش دەگوترێ و دەبێ ئەمەیان شێوەی کۆنتری وشەکە بێ، بە مانای "جێ پێ، جێی پی"، واتا ئەو جێیەی پێیان لەسەر داناوە بۆ چوونە سەر. لەم تێڕوانینەوە وشەکە لە دوو کەرتی ↑پێ pe و ↑جێ ce پێک هاتووە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Treppe (G.) بە مانای "پلیکان" دێ و دەچێتەوە سەر کرداری trappen (G.) "پێ لێنان، هەنگاونان". هەروەها Stuffe (G.) "پلە، قۆناخ" هەیە کە خزمە دەگەڵ stopel (OE.) "شوێن پێ". وەک دەبینین دە زمانەکانی دیکەشدا دە تێوان دوو چەمکی "پلە و پلیکان" لە لایەک و "پێ و جێ پێ" لە لایەکی دیکەوە پێوەندی نیزیک هەیە].

پەیڤ **peyv** *[ payv ]* - "قسە، وتە": خزمە دەگەڵ ↑پەیام peyam "خەبەر، قسەی ناردراو یان ڕاسپێراو" و ↑پەیمان peyman "گفت، سۆز، بەڵێن".لەوانەیە "پەیمان" خۆی سەرەتا کردار بووبێ [لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ قارەمان، خەرامان] و شێوەی کۆنتری "پەیڤین" بێ، یان وشە کۆنەکە *"پەیامان"* **peyaman* بووبێ و دواتر دوو وشەی "پەیمان" و "پەیڤین"ی بە دوو مانای هێندێک جیاواز لێ کەوتبێتەوە. وەک دەزانین گۆڕانی فۆتیمی m بەv [یان w] دە زمانی کوردمادیدا زۆر باوە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بانگ bang "دەنگ، هەرا کردن، ڕاگەیاندن"، phone "دەنگ"، phānai (Gr.) "قسەکردن، ئاخافتن"، bhánati (OIn.) "قسە دەکا" و fama (L.) "قسە، باس، دەنگ، بانگ"، Bann (G.) "دەستوور، فەرمان، حوکم"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *bha >* "قسەکردن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑باوbaw [بەیت و باو]. شیاوی باسە کە وشەی پەیامبەر peyamber دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە پێودانی وشەی لاتینی propheta (L.) "پەیامبەر" داڕێژراوە. وشە لاتینییەکە دەچێتەوە سەر prophētēs (Gr.) "ڕاگەیێنەر، شیرۆڤەکەر" کە ئەویش دەچێتەوە سەر pro-phānai (Gr.) "پێش گۆتن، لە پێشەوە ڕاگەیاندن".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "قسە کردن، پەیڤین" و "بەڵێن، پەیمان" جێی بیرخستنەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا ئەو پێوەندییە زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێ. دە زمانی ئەڵمانیدا sprechen (G.) دەبێتە "پەیڤین" و Versprechen (G.) دەبێتە "پەیمان". هەر ئەم پێوەندییە لە وشەی "قەول"یشدا دەبینرێ کە دەچێتەوە سەر وشەیەکی عەرەبی بە مانای "گوتن"].

**پەیک peyk** [*payk*] - "قاسید، نامەبەر":

1- دە "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی"دا (ل. 307)، وشەکە دەگەڵ pad ی کۆن بە مانای "پا، پێ" و padika- (OIn.) "پیادە، سەربازی پیادە" بە خزم دانراوە. لەم تێڕوانینەوە مانای پەیک دەبێتە "پیادە". بەڵام ئەم تێڕوانینە گومان هەڵدەگرێ، چونکوو پەیک و نامەبەرەکان دە سەردەمانی کۆندا تەنیا کەسانی پیادە نەبوون و زۆرتر ئەرکی خۆیان بە سواری ئەسپ بەجێ گەیاندووە.

2 - لەوانەیە وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑پەیام peyam [پەیغام peyġam].

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Bote (G.) "پەیک، نامەبەر" دەگەڵ Gebot (G.) "حوکم، فەرمان، پەیام" دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش].

**پەیکەر peyker** [*paykar*] - "1-کۆتەل، هەیکەل 2- قالب، لەش": پیکر peykār (P.). پێک هاتووە لە pati- +kara-. کەرتی یەکەم پێشگرە و کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ریشەی kar-* "کردن، ئەنجام دان". دە سانسکریتدا prati-krti- (OIn.) بە مانای "رووخسار، وێنە" بەکار هاتووە. لەباری دروست بوون و ماناوە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ contre-fait (Fr.) "بەدەڵ، دەستکرد، وێنە"، کەرتی یەکەم پێشگرە و کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر کرداری faire (Fr.) "کردن، ئەنجام دان" [بڕوانە "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی، ل. 308].

**پەین peyn** [*payn*] - "پیسایی ماڵات": pehen (P.). بە گوێرەی بۆچوونێک کە لە "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی"دا (ل. 297) باس کراوە، پێوەندی هەیە بە pahn (P.) و ↑پان pan. ئەم بۆچوونە دەشێ راست بێ، چونکوو "پەین" شێوەیەک لە پیساییەکە کە هیشک و بڵاو بۆتەوە.

**پەیوەست peywest** [*paywast*] - "پێوەلکاو": پەی + وەست pey + west. بە گوێرەی "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارس"، ل. 312، لە کۆندا pati-basta-* بووە. کەرتی یەکەم پێشگر و کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ↑بەستن bestın. پەیوەست ئەو شتەیە کە بە دووما یان کۆتایی شتێکەوە دەبەسترێ یاخود دەلکێندرێ.

**پیادە pîyade** [*pīyāda*] - "بە پێ رۆیشتوو": پیاده pīyāde (P.)، pedes (L.). خزمە دەگەڵ ↑پێ pe.

**پیپ pîp** [*pīp*] - "سەبیلە": وشەکە لە زمانی فارسی وەرگیراوە و ئەویش لە زمانە ئەورووپییەکانی وەرگرتووە، بۆ وێنە pipe (E.)، Pfeife (G.) "سەبیلە"، دە ئەسڵدا بە مانای "شمشاڵ، نەی" بووە و دواتر مانای "سەبیلە"ی وەرگرتووە، دەچێتەوە سەر pipare (L.) "فیکاندن، فیتوو لێدان". خزمە دەگەڵ ↑فیکە fîke. دە کوردمادیدا هەروەها ↑پیپیک pîpîk بەکاردی بە مانای "فیتوو، فیکە".

**پیپیک pîpîk** [*pīpīk*] - "فیتوو، فیکە": خزمە دەگەڵ ↑پیپ pîp "سەبیلە".

**پیت pît** [*pīt*] - "فەڕ، بەرەکەت": دە زمانە کۆنەکاندا هێندێک وشە هەن کە چەمکی "هێز و توانایی" دەردەبڕن، وەک potere (L.) "بەهێز بوون"، potens (L.) "بەهێز و دەسەڵات"، despotes (Gr.) "خوندکار، دەسەڵاتداری بەزەبر"، pati-h (OIn.) "سەروەر، دەسەڵاتدار، شوو". هەوەها دە وشەی ↑پادشا padşa دا کەرتی پاد -pad هەر بەو مانایانەی سەرەوە بەکارهاتووە و مەبەست "شای بە هێز و بە دەسەڵات" بووە. بەم جۆرە دەبینین کە ریشەی **< *pad- (IE.)** دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بە مانای "هێز، گوڕ" لەگۆڕێدایە. وشەی پیت pît ی کوردمادی دەبێ دە بنەڕەتدا هەر بەومانایانەی سەرەوە هاتبێ و کاتێک بۆ وێنە باس لە زەوی بەپیت کراوە، مەبەستەکە "زەوی بە هێز و پێز" بووە کە بەر و بۆی زۆری داوە. لەبەر پێوەندی تیوان بەهێز و پێز بوونی زەوییەکە لەلایەک و بەرهەم دانی زۆری زەوییەکە

لەلایەکی دیکەوە پاشان مانای وشەکە گۆڕدراوە بۆ بەرهەم یان بەهرە وچونکوو ئەم بەرهەمدارییەش بە "خێر و بەرەکەت" زاندراوە، ئیتر وشەکە بە "فەڕ و بەرەکەت"یش مانا کراوەتەوە. وشەکە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پەیت peyt "توند، پتەو" و ↑پتەو pıtew "قەوی، سەخت، بەهێز".

**پیت pît** ‌[ *pīt* ] - "حەرف": دەشێ پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ بە مانای "لێدان"، وەک ↑پت pıt "لێدان"، ↑پیتک1 pîtık "کوتک" و هتد. "پیت" ئەو نەخش و نیشانانە بوون کە سەرەتا بە "لێدان" واتا هەڵکەندن و داتاشین لەسەر دار و بەرد دروست کراون. بۆیە زۆر ڕێی تێ دەچێ کە وشە کوردمادییەکە لەم پێوەندییەدا جێ بگرێ. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە تێبینی خوارەوە:

[وشەی حرف ħarf ‏(Arb.) لە زمانی عەرەبیدا دەبێ وشەیەکی وەرگیراو بێ لە gráphein ‏(Gr.) "هەڵکۆڵین، بڕ لێدان، نووسین". ئەم وشە یۆنانییە خزمە دەگەڵ kerben ‏(G.) "بڕ لێدان، هەڵکەندن، هەڵکۆڵین" و خەڵێف xelef "کونی مێشەنگوین" و کەلەبەر keleber. وشەیەکی دیکە کە دە زمانی کوردمادیدا هاومانای "پیت" بەکار دێ، بریتییە لە "تیپ" و ئەمەش بۆ ریشەک دەگەڕێتەوە بە مانای "لێدان" و بۆ وێنە خزمە دەگەڵ "تەپڵ"ی کوردمادی و "تایپ"ی ئەورووپی. وەک دەردەکەوێ لەم وشانەشدا چەمکی "حەرف" پێوەندی بە چەمکی "لێدان، هەڵکەندن" پەیدا دەکا].

**پیتک1 pîtık** [ *pītık* ] - "1- کوتک 2- پتە": خزمە دەگەڵ ↑پت pıt "لێدان".

**پیتک2 pîtık** [ *pītık* ] - دەگەڵ "ریتک" دێ [ریتک و پیتک rîtık u pîtık واتا خرت و پرت]. خزمە دەگەڵ ↑پووت put "گچکە، ورد". ریتک rîtık یش دەچێتەوە سەر ↑رێز(ە) rez(e) "کەمووکە، وردە"، ریز rīz ‏(P.) "ورد، گچکە".

**پیتکە pîtke** [ *pītka* ] - "دیزەی چکۆڵە": پیت + کە pît + ke. دە زمانی فارسیدا پیت pīt ‏(P.) بە "دەفری تەنەکە" دەگوترێ.

1- وشەکە لەوانەیە هاوپێوەند بێ دەگەڵ bytina ‏(Gr.) "دەفری شەڕاب" و butina ‏(ML.) "دەفر، بوتل". وشەی ↑بۆتە bote "دەفری کانزا تیدا تاواندنەوە"ش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. وشەی bottel ‏(E.) "دەفری شووشەیی" لە bouteille ‏(Fr.) وەرگیراوە و دە زمانی کوردمادیدا بووەتە بوتڵ butıl.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑بادە bade و ↑بادیە badîye "دەفر".

3- هەروەها بەراوردی ئەم وشانە بکە دەگەڵ -pātilī ‏(OIn.) "قابی چکۆڵە (بۆ گەدایی)".

**پیتۆڵ pîtol** [ *pītol* ] - "زۆرزان": پیت + ئۆڵ pît + ol . بنەوشەی پیت -pît دەگەڵ وەز wez- و ویژ -wîj یەک دەگرێتەوە [دە وشەکانی ↑ئاوەز a-wez و ↑ویژدان wîjdan دا]. بنەوشەکە مانای "تێگەیشتن، زانین" دەدا و دەچێتەوە سەر ریشەی (IE.) *weid- < "دیتن، (پێ) زانین، دۆزینەوە". هێندێک وشە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون، وەک wissen ‏(G.) "زانین"، Witz ‏(G.) "شۆخی" [پێشتر: لێزانی، زیرەکی، قسەزانی"، wit ‏(E.) "شۆخی" [پێشتر: هزر، تێگەیشتن"، vett ‏(Sw.) "ئا-وەز".

**پیتە1 pîte** [ *pīta* ] - "کای هەرزن و چەڵتووک": خزمە دەگەڵ ↑پەتڵە petle "ساوار، دانەوێڵە" [دانەوێڵەی وردکراو؟].

**پیتە2 pîte** [ *pīta* ] - پیتەپیتە pîtepîte واتا " کەم کەمە، وردە وروودە": بڕوانە ↑پیتە1 pîte 1.

**پیر1 pîr** [ *pīr* ] - "بەساڵداچوو، بەتەمەن": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑پەرێوە perîwe دا باس کراون. بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ présbys ‏(Gr.) "پیر". وشەگەلێکی زۆر دە زمانی کوردی و بەگشتی زمانە هیندوئەورووپییەکان دەچنەوە سەر ریشەی (IE.) *per- < "پێدا تێپەڕین، لەشوێتیکەوە تێپەڕین بەرەو، بەرەو پێش چوون". هەر لەم ریشەوە وشە بە مانای ↑بەر ber "پێش" دروست بووە. مەبەست لە "پیر" بریتییە لە "پێشین، بەرێ". دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"یشدا، ل. 301، وشەکە دە چوارچێوەیەکی وەسادا شی کراوەتەوە.

پیر2 **pîr 2** *[ pīr ]* - "پیل، قۆڵ": دەگوترێ بەرەو پیر چوون یان بە پیرەوە چوون. شێوەیەکی دیکەیە لە↑پیل pîl "پەل، قۆڵ". بە پیلەوە چوون یان برەو پیلی کەسێک چوون لەوەڕا هاتووە کە مرۆڤ لە کاتی پێشوازی کردنی بەرێزێکدا دەستی ئەوی گرتووە بۆ دەست لێدانەوە یان ماچ کردنی دەستی. هەروەها پیرایی pîrayî بەکار دەهێنرێ بە مانای "پێشوازی".

پیران **pîran** *[ pīrān ]* - "بوورانەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑بوورانەوە buran(ewe).

پیرۆت **pîrot** *[ pīrot ]* - "ناوێکی پیاوانە": دە زمانی فارسیدا دەگوترێ فیروز fīrūz (P.) "ناوێکی پیاوانە". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پیرۆز pîroz "بەفەڕ، مبارەک".

پیرۆز **pîroz** *[ pīroz ]* **-** "بەفەڕ، مبارەک": دە فارسیدا پیروز pīrūz (P.) مانای "سەرکەوتوو، زاڵ" دەدا. بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 303) وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی aujah "هێز، گوڕ" + (پێشگر) -pari، کەرتی ئەسڵی وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی -*aug* "بەهێز بوون، بە گوڕ بوون" و دواتر ریشەی **(IE.) *aug- <** "زۆر بوون، گەشە کردن، هەڵدان". بەم جۆرە "پیرۆز بوون" دە بنەڕەتدا مانای "بەگوڕ بوون، هێز و گوڕ هەبوون" دەدا و مەبەست لە پیرۆزبایی و جێژنەپیرۆزە کردن لە یەکتری ئەوە بووە کە خواستوویانە جێژنەکە بە هێز و گوڕەوە بەڕێوە بچێ. هەروەها مەبەست لە کەسێک یان شتێکی پیرۆزیش بەهێز بوونی ئەو کەس یان شتە (لەباری مەعنەوی)یەوە بووە و "پیروز"ی فاریش مانای بەهێز بوون و زاڵ بوونی مادی گەیاندووە.

[تێبینی: ئەم ریشەیە لەوە دەچێ دەگەڵ ریشەی **(IE.) *ueg- / *weg-** "تەڕ و تازە بوون، هێز و گوڕ تێدابوون" خزم بێ یان هەر یەک ریشە بن. لەم بارەوە بڕوانە ↑وزە wıze].

پیرۆزە **pîroze** *[ pīroza ]* - "بەردێکی شینی بەنرخ": فیروزە fīrūze (P.). پێوەندی هەیە بە ↑پیرۆز pîroz. وشەکە چووەتە ناو چەندین زمانی دیکە و لەوانە یۆنانی کۆن: sappirus (L.) و sáppheiros (Gr.) "پیرۆزە". بە پێی لێکدانەوەیەک مەبەست ئەوە بووە کە ئەم بەردە "هێز و سەرکەوتن" بۆ خاوەنەکەی دێنێ.

[تێبینی: دەکرێ لێکدانەوەیەکی دیکەش بۆ ئەم بەردە بکەین کە زۆرتر ڕێی تێ دەچێ. وەک لە چەند شوێنی دیکە باس کراوە چەمکەکانی "پتەو، سەخت، بەهێز"، "بەرد" و "بەهێز بوون، زاڵ بوون" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و هەر بۆیە وشەکانی دەربڕی ئەم چەمکانە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان پێکەوە هەیە، بۆ نموونە وشەی گە*وهەر* (گەوەر) "بەردی گرانبایی" خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی کە*ڤر* "بەرد" و خزمە دەگەڵ *قەمرین* "سفت بوون". نموونەی دووەم: *بەرد* [*وەرد* یان شێوە کۆنترەکەی *پەل*] خزمە دەگەڵ *پەلتین* "توند بوون، سفت بوون" و دەگەڵ *پاڵەوان* "زاڵ، بەهێز و سەرکەوتوو". هەروەها *زاخ* "بەرد" دەشێ خزم بێ دەگەڵ Sieg (G.) "زاڵ بوون، سەرکەوتن". بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە وشەی "پیرۆز" یان "پیرۆزە" هاوکات هەمووو ماناکانی "سەخت، پتەو"، "بەرد" و "زاڵ، سەرکەوتوو"ی پێکەوە گەیاندووە، واتا مەبەست لە پیرۆزە نەک بەردی گرانبایی شین، بەڵکوو بەرد بەگشتی بووە. بیرۆکەی ئەوە کە ئەم بەردە شینە سەرکەوتن بە دیاری دێنێ، شتێکە کە دواتر پەیدا بووە].

پیرە **pîre** *[ pīra ]* - "ئافەرین": [پیرە! کارێکی باشت کرد]. شێوەیەکی کۆنترە لە ↑ئافەرین aferîn [ئا-فەرین a-ferîn].

پیرەک **pîrek** *[ pīrak ]* - "ژن، ژنی بەشوو، هاوسەر": ئاشکرایە ئەم وشەیە ناتوانێ پێوەندی بە "پیر" و "بەساڵداچوودا" هەبێ. ئەم وشەیە هەروەک ↑پیرە pîre "ئافەرین" پێوەندی پەیدا دەکا بە ژمارەیەک وشە کە مانای "خۆش ویستن، پەسەند کردن، پاراستن" دەگەیەنن. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑ئافەرین aferîn، ↑*ئافرەت afret* و ↑پەری perî.

پیزاڵ **pîzal** *[ pîzāl ]* - "گیایەکە بۆ قاقەز دەبێ و دەشیچنن": لەم پێوەندییەدا چەند وشەی دیکە جێی سەرنجن کە بریتین لە پیزەڵ pîzel "جۆرێک باقەبێن"، پیزۆک pîzok "گیایەکە لە قۆپی و زەلکاو دا

دەڕوێ" و ↑بژاڵ bıjal "هەڵاش، چرپی". لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە ↑بژوێن *bıjwên* "سەوزەڵان".

**پیزۆکە pîzoke** [ *pīzoka* ] - "ورکەزیپکە": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە کە لەژێر ↑باژەڵە bajeleدا باس کراون.

**پیزە pîze** [ *pīza* ] - "پز، بێچووی ناو سک": شێوەیەکی دیکە لە ↑پز pız.

**پیزین pîzîn** [ *pīzīn* ] - "فزەفز کردن لە کەپۆڕا": خزمە دەگەڵ ↑پیش *pîş* و ↑پشوو pışû "هەناسە".

**پیس pîs** [ *pīs* ] - "گەمار، چڵکن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پوان puwan، پوسیدن pūsīdan (P.) "ڕزین، گەنین"، pus (Gr.) "چلکی برین". لەوانەیە ئەم وشانە بچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ماسین، با کردن" و ببنە خزم دەگەڵ ↑پیش pîş "هەناسە، نەفەس".

[تێبینی: وشەی "گەنین"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە هەمان مانا و خزمە دەگەڵ *ئاخنین* "هەڵمساندن"].

**پیسێر pîser** [ *pīser* ] - "تیفەکی دەرپێ": هەر وەک ↑پزوو pızû ی دەرپێ دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە ئاماژە بە "هەڵپزان، هەڵپفان" دەکەن.

**پیش pîş** [ *pīš* ] - "هەناسە، نەفەس": دە زمانی ئەڵلەمانی ناویندا pūst (MG.) بە مانای "هەناسە" بەکار هاتووە. خزمەکانی ئەم وشەیە دە زمانەکانی ئەڵمانی و هولەندیدا بەم شێوەیەن: pusten (G.) و کۆنتر pfausten (G.)، poesten (NL.) "فوو تیکردن، با کردن"، pfusen (G.) "هەناسەسوار بوون"، pusta (Sw.) "با کردن، فوو کردن، کۆخین" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *bh(e)u-, *b(e)u- >** "ماسین، با کردن، فوو کردن". ژمارەیەک وشەی زمانی کوردمادی کە ئاماژە بە دەرچوون و ڕەت بوونی هەوا دەکەن، پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک ↑پشوو pışû، ↑پشمین pışmîn، ↑پنژین pınjîn، ↑پیزین pîzîn "فزەفز کردن لە کەپۆ ڕا"، ↑پرمە pırme، ↑پرخە pırxe، ↑فسە fıse، ↑فشقە fışqe، ↑فشفشە fışfışe، ↑فیشەک fışek و هتد. وشەکانی سەرەوە لە لایەکی دیکەوە دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە، وەک ↑فش fış، ↑پزان pızan [هەڵپزان]، ↑فیز fîz، ↑بەس bes، ↑بۆش boş "زۆر" و هتد.

[تێبینی 1: دە سەرچاوە ئێتیمۆلۆژییەکاندا هەروەها باس لە بنچینەدەنگێک دەکرێ کە بریتییە *phu-* *یان *fu-* کە ئاماژە بە دەرچوونی یان تێچوونی با [هەوا] لە دەم یان هەر شتێکی دیکەوە دەکا. دوور نییە ئەو ریشەیەی سەرەوە بۆ ئەم بنچینەدەنگە بگەڕێتەوە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑فوو fū. تێبینی 2: هەر لەم پێوەندییەدا چەند وشەیکی وەک fauchen (G.) و pfauchen (G.) "هەناسەسوار بوون، کۆخەکۆخ کردن، پرماندن، فشقاندن، وژەوژ کردن" دە زمانە ژێرمەنییەکاندا جێی هەڵسەنگاندنن. وا باس دەکرێ کە ریشەی ئەم وشانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگێ بگەڕێتەوە. دوور نییە ئەم دەنگە لاساکراوە هەر ئەو بنچینەدەنگە بووبێ کە لەسەرەوە ئاماژەی پێ کرا].

**پیشان pîşan** [ *pīšān* ] - "کوڵان و پێگەیشتن بە هەوای داغ": خزمە دەگەڵ ↑پێژان pejan.

**پیشک pîşk** [ *pīšk* ] - "ئامرازی گیا هەڵکەندن": پیشکان pîşkan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑پاچ paç "قوڵینگ".

**پیفۆک pîfok** [ *pīfok* ] - "کیفۆک، گیایەکە سەلکەکەی بە کوڵاوی یان برژاوی دەخورێ": پەفک pefk، پەڤک pevk و پاڤک pavk یش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ پیواز pîwaz [پیڤاز pīvaz] و مەبەست "پیازچە" بێ. شیاوی سەرەنجە کە وشەی "کیفۆک"یش مانای "پیازچە" دەدا.

**پیک1 pîk 1** [ *pīk* ] - "کوتکی ئاسن":

1- لەوانەیە هەر ↑پیتک1 pîtık 1 بێ بە مانای "1- کوتک 2- پتە".

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پاچ paç.

پیک2 **pîk** [ *pīk* ] - "1- زمانەی سەری زورنا 2- لاسکی کلۆری گیا": بە هەر دوو ماناوە دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*bh(e)u** **(IE.)** "ماسین، با کردن". ئەم ریشەیە دە زمانی کوردمادیدا یەکێک لە پڕ لك و پۆترین ریشەکانە و گەلێك وشەی لێ بەرهەم هاتووە. دەستەیەك لەم وشانە مانای "فوو، با، هەناسە" دەردەبڕن، وەك ↑پیش *pîş* [پیش خواردنەوە] یان ↑پشوو pışû، ↑فوو fu، ↑پشمین pışmîn، ↑فیکەfîke و هتد. "پیك" بە مانای یەکەم لەپێوەندی دەگەڵ ئەو دەستەوشەیە دایە و بەو شتە دەگوترێ کە فووی تێ دەکەن یا خود پێی *دەفیکێنن*. دەستەیەکی دیکە لەم وشانەی لەو ریشەوە سەریان هەڵداوە، باسی فش و فۆڵ بوون، زۆر و هەراو بوون، هەڵۆڵ و هەڵمساو بوون دەکەن، وەك ↑فش fış [فش و فۆڵ]، ↑بۆش boş "1- زۆر، هەراو 2- هەڵۆڵ، بەتاڵ"، ↑بووك buk "باپشکێو"، ↑پووك puk "بەتاڵ، بێ ناوەرۆك"، ↑پووچ puç "هەڵۆڵ، بەتاڵ" و هتد. "پیك" بە مانا دووەمەکەی لە ریزی ئەم وشانەدا جێ دەگرێ.

پیل1 **pîl** [ *pīl* ] - "دەست، قۆل، باسك": شێوەیەکی دیکە لە ↑پەل pel "دەست".

[تێبینی: "بەرەو پیل چوون" کە دواتر دە هێندێك شێوەزاردا بووەتە "بەرەو پیر چوون"، بەمانای پێشوازی کردن دێ. ئەو مانایە لێرەوە پەیدا بووە کە لەکاتی پێشوازی کردندا بەرەو پیلی، واتا بەرەو دەستی کەسێك چوون تاکوو بە نیشانەی رێز گرتن دەستی دەگەڵ لێ بدەنەوە یان دەستی ماچ بکەن].

پیل2 **pîl** [ *pīl* ] - "باتری": پیل pīl (.P). دەچێتەوە سەر pólos (.Gr) وەرگیرابێ بە مانای "تەوەر، تەوەرە". ئەم وشە یۆنانییە لە رێگای زمانی لاتینییەوە هاتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان، بووەتە pol و بە مانای "قوتب، جەمسەر (ی زەوی)" بەکار دێ. وشەی "پیل" دەبێ دە بنەڕەتدا ئاماژە بە دوو جەمسەری پلوس و مینوسی باتری بێ.

پیلان **pîlan** [ *pīlān* ] - "1- نەخشە 2- کۆمپلۆ": وشەیەکی وەرگیراوە، ئەسڵەکەی plan (.Fr) بووە، دەبنەڕەتدا بەمانای "رووبەر". ئەمەش دەچێتەوە سەر planta (.L) "بەری پێ، رووبەر". [دە زمانی کوردمادیدا مانایەکی نێگاتیڤی وەرگرتووە، کەچی دە زمانە ئەورووپییەکاندا بەگشتی مانای "نەخشە، گەڵاڵە" دەدا، بڕوانە ↑پلان pıla].

پیلە **pîle** [ *pīla* ] - "ماڵی کرمی هاوریشم": دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل.309) ئەم وشەیە بەرهەڤ کراوە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانە جیاوازە هیندووئێرانییەکاندا بە ماناکانی "کیسە، توورەکە، زەنبیل، پووش و پەڵاش". ئەم بەرهەڤ کردنە رێی تێ دەچێ و هەموو ئەو وشانە دەبێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی **-*pel** **(IE.)** "داپۆشین، لێهاڵان". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون، وەك↑ پۆلکە polke "پۆرگ، تۆێکڵ"، پەڵاش pelaş، پیلەك pîlek یان ↑پووڵەکە puleke و هتد.

پیلەك **pîlek** [ *pīlak* ] - "دوگمە، قۆپچە": خزمە دەگەڵ ↑بۆل bol "دەنکەترێ". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑پێل2 pel "چاوزەق".

پینە **pîne** [ *pīna* ] - "کوتەپەڕۆیەك کە قەڵش و درزی جلکی پێ دەگرن": هەروەها ↑پنج pınc هەیە بە مانای "دەرز گرتنی دەفری سواڵەت". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑بەند bend، سەر بە ریشەی **-*bhendh** **(IE.)** "بەستن، گرێ دان". مەبەست لە "پنج" یان "پینە" کردن بەستنی قەڵش و درزە.

پینەك **pînek** [ *pīnak* ] - "وێژینگ، خەونوچکە": خزمە دەگەڵ ↑پونژین punjin "خەو بردنەوە، وێژینگ دان".

پیو **pîw** [ *pīw* ] - "بەز، چەوری": pîye (.P)، piva (.OIn)، piar (.Gr)، pingue (.L) "بەز، چەوری". ئەم وشانە دەبێ خزم بن دەگەڵ ↑بەز bez "چەوری".

پێ[1] **pe** [ *pe* ] - "ئەندامی پێ رۆیشتن": pa (.P)، Fuß (.G)، foot (.E)، fotus (.Gt)، fot (.Sw)، pes (.L)، pos (.Gr)، pat (.OIn)، -pada (.Av) "پێ"، سەر بە ریشەی **< -*ped-, *pod** **(IE.)** "پێ". لەوە دەچێ ئەم وشەیە کۆنتر لە زمانی کوردمادیدا ↑پووز puz بووبێ [پا و پوون، پووزەوانە].

پێ² **pe** [ *pe* ] - "پرێپۆزیسیۆن و پێشگر": [پێکەوتن، پێزانین...]، بڕوانە ↑وێ we.

پێت² **pet** [ *pet* ] - دەگەڵ "هێت" دێ [هێت و پێت het u pet واتا ورد و خاش]، شێوەیەکی دیکە لە ↑پووت2 put "کەم، وردیلە، بچووک".

پێتاو **petaw** [ *petāw* ] - پاتاوە patawe ش دەگوترێ. بڕوانە ↑پێڵاو pelaw .

پێچان(ەوە) **peçan(ewe)** [ *peçān(awa)* ] - "1- سووڕانەوە 2- لێهاڵاندن": پیچیدن pīčīdan (P.). فیچان fîçan یش دەگوترێ. هەروەها پێچ peç [فێچ feç] بە چەندین مانا دە زمانی کوردمادیدا لەم وشەوە هاتووە. ئەم وشەیە دەشە خزم بێ دەگەڵ ↑فیزانەوە fîzan(ewe) [فیچانەوە fîçan(ewe)] "چەمانەوە". دیارە دوو چەمکی "چەمانەوە" و "سووڕان" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، بۆ وێنە وشەکانی "بی" [دارەبی] و "با(د) دان" خزمن و ناوی دارەبی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لقەکانی بەباشی دەچەمێتەوە و بۆ کاری قەرتاڵە چنین کەڵکی لێوەردەگیرێ.

پێچکە1 **peçke 1** [ *peçka* ] - "1- چەرخی گاری 2- پایەی کورسی": پێ + چکە [پاشگری گچکاندن] ç(ı)ke + pe. ↑پێ pe هەمان "پا" واتا "لاق"ە و پێچکەش ماناکەی دەبێتە پێی بچکۆڵە، لاقەچکۆڵە.

پێچکە2 **peçke 2** [ *peçka* ] - "منداڵی ساوا": ئاماژەیە بە "پێچانەوە" و قۆنداخە کردنی زارۆکی شیرەخۆرە. دەچێتەوە سەر ↑پێچانەوە peçan(ewe).

پێخ **pex** [ *pex* ] - "ریپۆقی چاو": خزمە دەگەڵ ↑پیس pîs.

پێخوست **pexust** [ *pexust* ] - "پێشێل": ↑پێ pe "لاق" + ↑خوست1 xust.

پێخوێ **pexuwe** [ *pexuwe* ] - "1- ئەندازەیەک قوڕی سواخ 2- کلۆشی بەر پێی گاگیرە": پێوەندی هەیە بە پێخوست pexust [↑پێ pe (پا) + ↑خوست xust (شێلان، گڤاشتن)].

پێرار **perar** [ *perār* ] - "دووساڵ بەر لە ئێستا": پێر + ئار per + ar. پێر per شێوەیەکی دیکەیە لە ↑پار parو ↑بەر2 *ber* [بەرێ]. ar- شێوەی کۆنی وشەی ↑ساڵ sal ە. مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "پارساڵ، ساڵی بەرێ". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑پێرێ pere "دوو ڕۆژ بەر لە ئێستا".

پێرک **perk** [ *perk* ] - "گۆماوی خۆرسک لە چیا": بێرک berk و ↑برکا1 bırk "حەوز، ئەستێل" و بەهرک behrık یش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ ↑بیر bîr "چاڵاو".

پێرک **perk** [ *perk* ] - "هەرزاڵ": خزمە دەگەڵ ↑پەڕ3 per "ئاخر، دووما" [دە بنەڕەتدا: بان، لەسەر]، upari (Av.)، über (G.)، Over (E.) "سەر، لەسەر". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑هەوار hewar و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە لای سەرەوە دەکەن. "پێرک" ئەو شوێنەیە کە لە ئاستێکی بەرزتر [بانتر ] دایە، یاخود ئەو شوێنەیە کە شتی لە بان دادەنێن.

پێز **pez** [ *pez* ] - "هێز":

1- لەلایەکەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پەژ pej "شلک، تورت و لەگەشە" و ↑بووژانەوە bujanewe "هێز و گوڕ بە بەردا هاتنەوە".

2- لە لایەکە دیکەوە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑پیت pît [بەپیت].

پێژان **pejan** [ *pežān* ] - "لێنان، چێشت کردن": پختن poxtan (P.) "لێنان، کوڵاندن"، backen (G.)، back (E.)، bakken (Nl.)، baka (Sw.) "پێژان" [بۆ شتی وەک نان، کولێرە، باقلاوە بە کاری دەهێنن]. هەروەها phogein (Gr.) "برژاندن، سوور کردنەوە" خزمە دەگەڵ ئەم وشانە. وشەکانی ↑پیشان pîşan [و پیشاندن pîşandın "لێنان و پێگەیاندن بە هەڵم"] و ↑فەتین fetîn "پیش هەڵاتن" [دافەتان dafetan] سەر بەم خێزانەن.ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *bhē- *bhō-* > "گەرم کردن".

پێژن **pêjın** [ *pežın* ] - "بزوان، جووڵە، تەکان": شێوەیەکی دیکە لە بزوان bızwan یان ↑بزووتن bızûtın.

پێست **pest** [ *pest* ] - "چەرم، کەوڵ": پوست pūst (P.). خزمە دەگەڵ ↑پووش pûş.

**پێش pêş** *[ peš ]* - "بەر، بەرانبەر": پیش pîş (P.)، جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ vis (OFr.) "روو، دەموچاو"، سەر بە کرداری videre (L.) "روانین، دیتن". لەوانەیە ↑بیچم bîçım "روخسار"یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لەم تیڕوانینەوە "پێش" دەبێ سەرەتا بە مانای "دەموچاو، روو" هاتبێ و پاشان مانای گشتی "رووکار، لای پێشەوە، بەر"ی وەرگرتبێ.

[تیبینی 1: لە زمانی فارسیدا "پیشانی" بە مانای "هەنێ، تیوچاوان" بەکار دێ و ئەمەش دەگەڵ ماناکانی سەرەوە باشتر یەك دەگرێتەوە. تیبینی 2: لەباری چۆنیتی گۆڕانی مانای وشەکە لە "دەموچاو" بۆ "پێش، بەرەوە" دەتوانین دەگەڵ وشەی "پشت" بەراوردی بکەین کە هەم مانای "لای پاشەوەی لەش" دەدا و هەمیش مانای "پێچەوانەی پێشەوە": 1- پشتی وە ژان کەوت، کۆڵێکی خستە سەر پشتی 2- لەپشتەوە راوەستابوو، پشتی چوار رۆژان هاتەوە].

**پێشکە[1] pêşke** *[ peška ]* - "مێشوولە": بەهسك behsık یش دەگوترێ. پشه pašše (P.).

1- دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 277) دەگەڵ دوو وشە هەڵسەنگێنراوە: -paxšaka* "پشك، بەش" [مەبەست لێرەدا: ورد، وردیلە] و هەروەها دەگەڵ وشەی pakşa(ka) (OIn.) "پەڕ و باڵ".

[تیبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا دوو وشەی Fliege (G.) "مێش" و fliegen (G.) "فڕین، هەڵفرین" پێکەوە خزمن].

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە وشەی ↑پسان pısan "لەت بوون". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ beißen (G.)، beitan (Gt.)، bite (E.)، bita (Sw.) "گەستن، گاز لێدان، پێوەدان، بریندار کردن"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *bhei(d)-* "لێدان، کوتان".

[تیبینی: سەبارەت بە پێوەندی لێدان و کوتان دەگەڵ "پێشکە" دەتوانین ئاماژە بە سێ نموونەی دیکەش بکەین: 1- "تەپۆ" ناوی مێشوولەیەکی وردە کە پیس پێوە دەدا و ناوەکەی خزمە دەگەڵ "تەور" و چەندی وشە کە ئاماژە بە "لێدان" دەکەن. 2- "کوتان" دە زمانی کوردمادیدا بە جۆرێك لە "دەرزی لێدان" دەگوترێ. 3- "ژەنگەسوورە" واتا "سوور" ێك کە پێوە دەدا - کەرتی "ژەنگ" شێوەیەکی دیکەیە لە زەنگ (زەبر و زەنگ)].

3- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ bug (E.) "مێشوولە" و بقة baqqa (Arb.) "پێشکە". ریشە؟

**پێشکە[2] pêşke** *[ peška ]* - دەگەڵ "رەش" دێ [رەشکە و پێشکە کردنی چاو]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ picis (pix) (L.) "قەتران".

**پێکان pekan** *[ pekān]* - "لێدان بە تیر و گوللە، ئەنگاوتن": خزمە دەگەڵ ↑پیکان peykān (P.) "نووکی تیر و تیزە". دە بنەڕەتدا پێك هاتووە لە -pati + kāna-. کەرتی یەکەم پێشگرە. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ریشەی *-kan** "هەڵکەندن، هەڵکۆڵین" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 307]. لەم تیڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەندن kendın.

**پێل pel 1** *[ pel ]* - "شەپۆل": Welle (G.) هەر بەو مانایە دێ. وشە ئەڵمانییەکە دە گەڕێتەوە سەر wellan (OG.) "سووڕان، لوول خواردن" . خزمە دەگەڵ vilnis (Lit.) "پێل" و velti (Lit.) "سوور خواردن"، volvere (L.) "سووڕان، لوول خواردن"، eilo (Gr.) "دەسووڕێم". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑وێل wel و ↑وڵین wılîn و هتد.

**پێل pel 2** *[ pel ]* - "چاوزەق": پێڵە pele ش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ریشەی < *(IE.) *bhel-* "هەڵمسان، هەڵپڤان، ماسین". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە، وەك ↑*بۆل bol* "دەنکە ترێ"، ↑بلۆق bıloq، ↑بالۆکە baloke، ↑بڵق bılıq، ↑پیلەك pîlek "دوگمە، قۆپچە" و هتد.

**پێلاو pelaw** *[ pelāw ]* - "کەوش": پالیك pālīk (P.). خزمە دەگەڵ -a-padya (Av.) "پاپەتی، بێ پێڵاو"، -pādukā (OIn.) "پێڵاو"، pal (Pash.) "پێ، هەنگاو". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑پێتاو petaw، ↑پاتاوە patawe و ↑پاتە pate ش دەگوترێن و گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر

↑پێ pe.

**پێلوو pelu** [ *pelū* ] - "ئەو پێستەی بەسەرچاودا دەکشێ و دەیپارێزێ": پەلك pelk و پەلکَ pelg یش دەگوترێن. پلك pelk (P.).

1- دە زمانی لاتیندا palpebra (L.) بە مانای "پێلوو" هەیە و بوونی پێوەندییەك دەگەڵ وشە کوردمادییەکە بە زەیندا دێنێ. ئەم وشە لاتینە دەبردرێتەوە سەر palpo (L.) "دەست پێداهێنان، دەست پێداخشاندن".

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ پێوەندی بەو خێزانەوشەوە هەبێ کە ئاماژە بە چەمکی "لێدان، لێکدانی خێرا" دەکا [بڕوانە ↑پرتە pırte "لێدانی خێرا و پەیتاپەیتا"].

3- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *pel- (IE.)** "داپۆشین". لەم بارەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Lid "پێلوو" کە دە بنەڕەتدا بە مانای "سەرپۆش، قەپاخ" بووە و مەبەست سەرپۆشی چاو بووە. لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑پەردە perde.

**پێڵە pele** [ *pela* ] - "نیوە کەوانی، گەوز، نیوەجەغز": خزمە دەگەڵ ↑پێل1 pel "شەپۆل".

**پێڵەور pelewer** [ *pelawar* ] - "چەرچی، فرۆشەری گەڕۆك": پیلەور pīlevar (P.). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *pel- (IE.)** "فرۆشتن، بەدەست هێنان، دەرهێنان (ی داهات)". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑فرۆشتن fıroştın.

**پێمەڕە pemere** [ *pemara* ] - "بێڵی ئاسن": لە دوو کەرتی ↑پێ pe و ↑مەڕە *mere* پێك هاتووە. "مەڕە" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ماڵە male "ئامرازی ڕێخشاندن و پێ ساف کردن" و خزمە دەگەڵ کرداری ↑ماڵین malîn. تێکڕای وشەکە واتا "ماڵەی پێ".

**پێنج penc** [ *penj* ] - "ئەژمارێکە [چوارو یەك]": پنج penc (P.)، penta (Gr.)، panca (OIn.)، fünf (G.)، fimf (Gt.)، five (E.)، vijf (Nl.) fem (Sw.)، quinque (L.) گشتیان بەمانای "پێنج" و سەر بە ریشەی **< *penku- (IE.)** "پێنج".

[تێبینی: سەرنجی گۆڕانی فۆتیمی n بۆ m بدە لە وشە گۆتی و سوێدییەکەدا. گۆڕاتیکی لەم جۆرە لە هێندێك وشەی کوردمادیشدا بەدی دەکرێ، وەك هەنبانە و هەمبانە، ئەنبار و ئەمبار]

**پێوان pewan** [ *pewān* ] - "1- ڕێگە برین 2- ئەندازەگرتن": پیمودن peymuden (P.). بە گوێرەی "فرهنگَ ریشەشناختی زبان فارسی"، ل. 311، دەچێتەوە سەر شێوەی کۆنی *pati-māya-** بووە. کەرتی یەکەمی وشەکە پێشگر و کەرتی دووەم سەر بە ریشەیەك بە مانای "ئەندازە گرتن، پێوان، هەڵسەنگاندن". بۆ زانیاری زۆرتر لەسەر ئەم ریشەیە بڕوانە وشەی ↑مت mıt و ↑مانگَ mang. وەك لەژێر ئەم وشانەدا شی کراوەتەوە ریشەی **< *mē- (IE.)**

بە مانای "گەڕان، ڕێ پێوان، ڕێگە بڕین"ە و مانگَ بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێتەوە. هەروەها دواتر ریشەی **< *med- , *mod- (IE.)** "پێوان، هەڵسەنگاندن، ئەندازە گرتن" لەم ریشە کۆنترەوە سەرچاوەی گرتووە.

وەك دەبینین ئەم ریشەیە هەر لە کۆنەوە هاوکات هەردوو مانای "ڕێگە بڕین" و "ئەندازە گرتن"ی لەخۆ گرتووە.

**پێوانە pewane** [ *pewāna* ] - "ئامرازی ئەندازە گرتن": پیمانە peymāne (P.).خزمە دەگەڵ↑ پیوان pewan "ئەندازە گرتن".

**پێوەن(د) pewen(d)** [ *pewan(d)* ] - "1- زنجیری قاچی ئەسپ و زیندانی 2- ڕابیتە، ئیلاقە": پیوند peyvand (P.) "رەبت، رابیتە". بەپێی "فرهنگَ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 312) دە بنەڕەتدا *pati-banda-** بووە کە کەرتی یەکەمی پێشگرە و کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑بەن ben [بەند bend] سەر بە ریشەیەك بە مانای "بەستن(ەوە)، گرێ دان".

# ت (T)

**تا ta 1** [ *tā* ] - "هەتا، پرێپۆزیسیوتیکی کات و شوێن": تا tā (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:
1- to (E.)، zu (G.)، za (OG.)، te (Nl.) "بۆ، بەرەو". گریمانە دەکرێ ئەم وشە ژێرمەنییانە خزم بن دەگەڵ do (Rus.) "تا".
2- till (E.)، till (Sw.) "تا، تاکوو". بڕوانە ↑دال1 dal "جار، کەڕەت".

**تا ta 2** [ *tā* ] - "لابار" [تایەک گەنم]: خزمە دەگەڵ تا ta (P.) "دانە" ["دو تا" واتا دوو دانە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑تاک tak "یەک دانە، بەرانبەری جووت" و دەچنەوە سەر ریشەی < ***dai-* (IE.)** "بەش کردن، دابەش کردن". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی دیکەش دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑تاق[4] taq "بەشێک لە بیست و چوار بەشی ئاو"، ↑تەمەن temen "عومر، ماوەی ژیان"، ↑دەم dem، ↑تاف taf، ↑تاو taw [تاوێک]، ↑دانگ dang [شەش دانگی خانوو]، ↑دانگا danga "دەمێک، تاوێک" و ↑دانە dane [یەک دانە] و ↑*دان dan* "بەخشین".

**تا ta 3** [ *tā* ] - بەشێکە لە وشەی "ئەوەتا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ da (G.) کە ئاوەڵکرداری کات و شوێنە بۆ ئاماژە کردن بە "ئێرە، ئەوێ، ئەوسا".

**تا ta [4]** [ *tā* ] - "تێ، داغ بوونی لەش بە هۆی نەخۆشی": تب tab (P.). خزمە دەگەڵ ↑تاو taw و ↑تاوانەوە tawanewe.

**تابشت tabışt** [ *tābıšt* ] - "تاقەت": خزمە دەگەڵ ↑توانین tuwanîn.
[تێبینی: هەرئەو پێوەندییە کە دەتیوان توانین tuwanîn و تابشت tabışt دا هەیە، دەتیوان کارین karîn "توانین" و گوڕ gur "هێز"دا بەرچاو دەکەوێ].

**تابگە tabge** [ *tābga* ] - "جێی لەنگەر گرتنی گەمێ و بەلەم و کەڵەک، لەنگەرگا": وەک لە ژێر وشەی "لەنگەر"دا شی کراوەتەوە، "لەنگەر" پێوەندی هەیە بە"لەنگین"، بەم لا و ئەو لادا لار بوونەوە [لەرینەوە]، واتا بەلەم لەکاتی وەستانیدا لەسەر ئاو بەدەم شەپۆلی ئاو لارە و لار دەکا. هەر بەم جۆرە "تابگە"ش پێوەندی هەیە بە هێندێک وشە کە ئاماژە بە "جموجۆڵ، خوار بوونەوە، بەم لا و ئەو لادا سووران" دەکەن وەک تاب tab (P.) "خول، پێچ، سووڕ"، تاب بازی tābbāzī (P.) "جۆلانە"، هەروەها بنەوشە تاف -taf دە کرداری تافتن tāftan (P.) "چنین، هوندنەوە"]. بنەوشەکە دە چەندین وشەی زمانی کوردمادیدا خۆی نیشان دەدا. ژمارەیەک لەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "چنین، هۆنینەوە" دەکەن، وەک ↑تەون tewın، ↑تاوڵ tawıl، ↑تەبەنە tebene، ↑تابووت tabut و ژمارەیەکی دیکەش مانای بنەڕەتی ریشەکە، واتا "سووڕان، خوار بوونەوە" نیشان دەدەن، وەک ↑تاوێر tawer "بەردی خلۆرەوەبوو"، ↑تاوڵەمە tawleme "پن چەرخێن"، ↑تەبانە tebane "بانگردێن" و ↑تەوەنە دان tewene dan "لێکهاڵان". دە زمانە ئەڵمانیدا وشەیەکی لەچەشنی ئەم وشانەی سەرەوە بەرچاو ناکەوێ. دە "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی"دا، ل. 322، لەژێر وشەی تافتن tāftanدا باس لەوە کراوە کە ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی -tap "بادان، هوندنەوە" و ئەمەش دەچێتەوە سەر ریشەی< ***te(m)p-* (IE.)** "تەنین، لەبەر یەک کێشانەوە" و دواتر ریشەی < ***ten-* (IE.)** "لەبەر یەک کێشانەوە، تەنین". هەر لەوێدا وشەی tempti (Lit.) "پان و بڵاو کردنەوە" وەک نموونە دەگەڵ وشە فارسییەکە بەراورد کراوە. ئەم بۆچوونە، بۆچووتیکی جوانە و بەم جۆرە وشەکانی سەرەوە دەبنە خزم دەگەڵ ↑*تەنین tenîn* و ↑تەناف tenaf و ↑تانە tane و هتد.

**تابلۆ tablo** [ *tāblo* ] - "وێنەی سەردیوار": تابلو tāblo (P.). وشەیەکی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر tabella (It.) "تەختۆکە، تەختۆکەی لە دیوار دراو"، ئەمەش دەچێتەوە سەر tabula (L.) "تەختە". ئەم وشە لاتینییە خزمە دەگەڵ ↑تەبەق tebeq.

تابووت **tabut** [ *tābūt* ] - "دارەمەیت": تابوت tābūt ‏(P.)‏، ‏< *tēβūθā* ‏(*Aram.*)‏ "قوتوو، سندووق". زمانی ئارامیش وشەکەی لە زمانی میسری کۆن (tbt) وەرگرتووە. [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 315].

تابەن **taben** [ *tāban* ] - "شیرازەچن": خزمە دەگەڵ تافتن tāftan ‏(P.)‏ "چنین، هوندنەوە"]. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "چنین، هۆندنەوە" دەکەن، وەک ↑تەون *tewın*، ↑تاوڵ tawıl ؟، ↑تەبەنە tebene.

تاپاز tapaz [ *tāpāz* ] - "زەبەلاح، ئەستوور، زلحۆرت": دەچێتەوە سەر ریشەی ‏< *teu-, *tu-*‏ ‏(*IE.*)‏ "هێز، توان، ماسین، ئەستوور بوون" و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑تەڤا teva "وزە، هێز"، ↑توانین *tuwanîn*، ↑تابشت tabışt "تاقەت" و هتد.

تاپاڵ **tapal** [ *tāpāl* ] - "هەڕەشە، گەف": خزمە دەگەڵ وشەگەلێک کە مانای "لێدان، کوتان" دەبەخشن. بڕوانە ↑ تەپ *tep* [4] "پەلامار".

تاپر **tapır** [ *tāpır* ] - "تفەنگی راو": خزمە دەگەڵ ↑تفەنگ tıfeng.

تاپوو **tapu** [ *tāpū* ] - "کەندووی گەورە بۆ دەخڵ و دان": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک، رەهەند، گۆڕیچە".

تاپۆ1 **tapo 1** [ *tāpo* ] - "شەبەح، تارمایی": هەروەک چۆن وشەی "تارمایی" لە وشەی "تار" بە مانای تاریک و تەماوی وەرگیراوە، "تاپۆ"ش پێوەندی هەیە بە وشەی ↑تەپ tap "تەپ و تۆز".

تاپۆ2 **tapo 2** [ *tāpo* ] - "قەباڵە، سەنەد": دە بنچینەدا بە مانای "نوسراوە" هاتووە و خزمە دەگەڵ ↑تیپ tîp "حەرف، پیت".

تاپەڵە **tapele** [ *tāpala* ] - "گرانەتا، تیفوس": پێوەندی بە یەکێک لەم دوو وشانەوە هەیە:

1- ↑تاو taw "هایسانی خۆر، هایسانی لەش (تاو و تێ)" [کۆنتر: تاب -tab].

2- ↑تەپا tep 1 "تەپ و تۆز" و هەروەها typhus ‏(L.)‏ "تیفووس".

تاپی **tapî** [ *tāpī* ] - "خەندەک، رەهەند، گۆڕیچە": خزمە دەگەڵ tief ‏(G.)‏، tiuf ‏(OG.)‏، diup ‏(Gt.)‏، deep ‏(E.)‏، djup ‏(Sw.)‏، dubus ‏(Lit.)‏ "قووڵ، ڕۆچووک"، سەر بە ریشەی ‏< *dheu-b-*‏ ‏(*IE.*)‏ "قووڵ، هەڵۆڵ". خزمە دەگەڵ ↑تەپین tepîn "ڕۆچوون، ڕمان". تەپین [داتەپین] دە بنچینەدا بەو حاڵەتە گوتراوە کە رووبەرێک وەک سەربانی خانوو یان رووبەری هەرد رۆچووە و قووڵاییەک دروست بووە. هەروەها خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە وەک ↑دۆپ dop "1- نزم، نەوی 2- گەلی"،↑تاڤێر2 taver "قوڵکەبەردێک ئاوی بارانی تێدا کۆ دەبێتەوە" و ↑تاپوو tapu "کەندووی گەورە".

تات1 **tat 1** [ *tāt* ] - "1- بەردی لووس و پان 2- تەخت و راستایی": خزمە دەگەڵ ↑تەخت texıt.

تات2 **tat 2** [ *tāt* ] - "باوک": تاتۆ tato ش دەگوترێ. تاتە tate ش هەیە بە مانای "1- دادە، خوشکە گەورە 2- مام"، هەروەها تاتک tatık یش دەگوترێ بە مانان "دادە"، خزمە دەگەڵ dad(dy) ‏(E.)‏، tata ‏(Gr.)‏ و tata ‏(OIn.)‏ "باوک، بابە". وەک هێندێک وشەی دیکە (بابە، کاکە، مامە، نەنە و هتد) لە زمانی زارۆک واتا گڕوگاڵی زارۆک وەرگیراوە. ئەم جۆرە وشانە لە دووپات بوونەوەی دەنگێک پێک دێن.

تاج **tac** [ *tāj* ] - "1- کڵاوی پادشایان 2- کاکۆڵی پەلەوەر": دە فارسیدا تاج tāj ‏(P.)‏. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە پۆشین و داپۆشین دەکەن، بۆ وێنە ↑تاق [2] taq [تاقی خانوو].

[تێبینی: لە هێندێک وشەی کوردمادیدا فۆتیمی n دەکەوێتە تیوانی بزوێنیک، بە تایبەتی a و کۆنسۆنانتەکانی c و g ، بۆ وێنە تاج و تانج ، تاجی و تانجی ، قولاج، قولانج، جنین و ئەنجنین ، اماج (فارسی) و ئامانج، گام (فارسی) و هەنگاو و هتد].

تاجی **tacî** [ *tājī* ] - "سەگی تیژڕەو، سەگی باریکەڵەی راوچیان": تاژی tajî ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەی وشەکە تانجی tancî یە کە لەمەیاندا فۆتیمی n وەک پارسەنگێکی فۆتیتیکی کەوتووەتە ناو وشەکەوە. دە فارسیدا دەڵێن تازی tazî ‏(P.)‏. خزمە دەگەڵ ↑تەقاندن teqandın بە مانای "تیتەقاندن، غار دان".

[تێبینی: ناوی چەمی تانجەرۆ tancero هەر لەم پێوەندییەدا دەتوانین لێک بدەینەوە. وشەکە دەتوانێ بەم جۆرە گۆڕدرابێ: تاگەڕۆ ← تاجەڕو ← تانجەڕۆ بە مانای "چەمی تیژڕەو"] .

**تاخ tax** [ *tāx* ] - "گەڕەک، مەحەللە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑دێ de، دە deh (.P) "گوند"، deh (.Pl) "گوند، وڵات"، taxyu (.Av) "وڵات". ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ dehnen (.G)، den(n)en (.OG)، dennan (.OE)، teínein (.Gr) "لەبەر یەک کێشانەوە، تەنینەوە، بڵاو بوونەوە". ↑تەنین *tenîn* و ↑تەشەنا teşena و چەند وشەی دیکە دەگەڵ ئەو وشە ئەورووپییانە خزمن.

[تێبینی 1: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "وڵات" کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پان و بڵاو بوونە(ەوە)" و خزمە دەگەڵ "بڵاو". دیارە مەبەست لە هەر دوو وشەی "وڵات" و "تاخ" دە بنەڕەتدا پانتایی زەوی یان زەوییەکی پان و بەربڵاو بووە. تێبینی 2: لە بەردەنووسەکەی داریۆشی هەخامەنیشی خوێنرێژدا لەسەر چیای بیستوون وشەی "داهیو" بە مانای "وڵات" بەکار هاتووە. داریۆش بە ئاشکرا باس لەوە دەکا کە ئەو، شای وڵاتی پارس، تێکڕا 32 وڵات و لەوانە وڵاتی "ماد"ی بە شەڕ و کوشتار داگیر کردووە و هەموو ئەو وڵاتانە وەک کۆیلە و باج بدەی خۆی لە قەڵەم دەدا].

**تاخورک taxurk** [ *tāxuurk* ] - "عەرابەی بێ چەرخ کە بەسەر بەفردا رایدەکێشن": خزمە دەگەڵ ↑تاقم *taqım* "دەستە، گرووپ" [تاخم taxım یش دەگوترێ]، ↑تاخە taxe "باقە"، دەگەڵ ↑تۆق toq "مل بەند، ئاڵقەی مل"، سەر بە ریشەی **< -deuk* (.IE)** "کێشان، راکێشان".

**تاخە taxe** [ *tāxa* ] - "باقە": خزمە دەگەڵ ↑تاقم *taqım* "دەستە، گرووپ".

**تار tar** [ *tār* ] - "تەماوی": خزمە دەگەڵ ↑تاریک tarîk.

**تارا tara** [ *tārā* ] - "رووپووشی بووک": هەروەها ↑تەرحی terĥî "جۆرێک سەرپۆشی ژنانە" و تەرگە terge "کۆڵوانە، چارشێوشان" لەم پێوەندییەدا جێی شی کردنەوەن. ئەم وشانە دەشێ هاوریشە بن دەگەڵ tarnen (.G)، darian (.OE) "شاردنەوە، داپۆشین". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ تار tar و ↑تاریک tarîk.

**تاراندن tarandın** [ *tārāndın* ] - "رەواندن": دە فارسیدا تاراندن tārāndan (.P). خزمە دەگەڵ ↑تەرە tere "دوورخراو، دەرکراو".

**تارم tarım** [ *tārım* ] - "خۆیانی گیرەکراوی بەر با نەدراو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی **< -treu-d*** **(.IE)** "گوشین، پاڵ نان، زەخت خستنەسەر".

**تارمایی tarmayî** [ *tārmāyī* ] - " تاپۆ، شەبەح": تار + مایی tar + mayî. خزمە دەگەڵ ↑تاریک tarîk. کەرتی mayî لەوانەیە خزم بێ لەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑مژ mij دا شی کراونەوە. لەم تێروانینەوە هەردوو کەرتەوشەکە هاومانا دەردەچن. هاتنی دوو کەرتەوشەی هاومانا دۆخی جەخت کردن بە وشە لێکدراوەکە دەبەخشێ.

**تارمە tarıme** [ *tārıma* ] - "1- هەیوانی سەردانەپۆشراو 2- نەردەی بەرهەیوان": دە فارسیدا تارم tarom (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ tram (.E)، trame (.MG) "داری لە چوار لاوە داتاشراو". [بۆ راگرتن یان هەڵگرتنی بار]. دیارە ئەو دارانەش بۆ هەیوانی سەردانەپۆشراو یان نەردەی بەرهەیوان بەکار هاتوون و ناوەکە لێرەوە پەیدا بووە. ریشە؟

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی ئیتالیایی balkone "باڵکۆن" و وشەی ئەڵمانی Balken "داری لە چوار لاوە داتاشراو"].

**تاریک tarîk** [ *tārīk* ] - "نەڕووناک، نادیار": تاریک tārīk (.P)، dark (.E) و deork (.OE) هەر بەم مانایە. وشە ژێرمەنییەکە دەبردرێتەوە سەر ریشەیەکی ژێرمەنی کۆن بە مانای شاردنەوە و حەشاردان. وشەی tarkenen (.OG) "حەشاردان" لەم ریشەیەوە کەوتووەتەوە. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی < *-dark** *(.Gm)* "حەشاردان". وشەکانی ↑تار tar و↑ تارا tara دەبێ دەگەڵ ئەم وشانە خزم بن.

تازە **taze** *[ tāza ]* - "نوێ": دە فارسیدا tāze (P.). دە زمانە ژێرمەنییەکان و زۆر زمانی غەیرەژێرمەنیشدا وشەیەک کە بە مانای "نوێ" بەکار دێ، دەگەڵ "نوێ"ی کوردمادی بە خزم دەچێ. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی "تازە" دە زمانی کوردمادی و فارسیدا سەرەتا دەبێ بە مانایەکی هێندێک جیاواز بەکارهاتبێ و پاشان مانای "نۆی"ی وەرگرتبێ. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر پێوەندی دوو وشەی *بار* "بێچوو" و *باریک* "تەسک" لەبەرچاوبگرین، ئەوسا دەتوانین وای بۆ بچین کە دوو وشەی تازە taze و تەسک tesık [دە ئەسلدا *تازەک* *tazek*؟] پێوەندییان پیکەوە هەبێ و هەر دووکیان بچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تازەرسکاو، بێچوو، کەم تەمەن" و پاشان لەمەوە لە لایەک مانای "نوێ" و لەلایەکی دیکەشەوە مانای "چکۆڵە، تەسک، باریک" سەری هەڵدابێ. ئەگەر لەم گۆشە نیگایەوە سەیری وشەکە بکەین، ئەوسا دەتوانین بەرهەڤی بکەین دەگەڵ هێندێک وشە دە زمانەکانی دیکەدا بە مانای "زارۆک، منداڵ"، وەک thegan (OG.) "کورێژگە، منداڵی تیرینە"، degan (OE.) "کوڕ، لاو، خزمەتکار، شاگرد"، -tákman (OIn.) و téknon (Gr.) "زارۆک". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -tek*** **(IE.)** "بەرهەم هێنان، بەدونیا هێنان".

تازی1 **tazî** *[ tāzī ]* - "سارد، هەر بۆ ئاو دەگوترێ": دەچێتەوە سەر ↑تەزین tezîn.

تازی2 **tazî** *[ tāzī ]* - "رووت و قووت": خزمە دەگەڵ تاس tas [تاس و لووس].

تازی3 **tazî** *[ tāzī ]* - "نازناوێکی نەرێنی بۆ عەرەب": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تاجی/ تاژی tacî / tajî "سەگی تیژڕەو" و چەند وشەیەکی دیکە کە ئاماژە بە "را کردن، پەلە کردن، هەڵمەت بردن" دەکەن. دە زمانی پەهلەویدا tāzēnītan بە مانای "هێرش کردن" هاتووە و دە زمانی فارسیشدا تەک tek (P.) مانای "هێرش" و تاختن taxtan (P.) مانای "تیتەقاندن" دەدا. دەشێ وشەکە سەرەتا بە مانای "هێرشکەر" بەکارهێنرابێ.

تاژان¹ **tajan** *[ tāžān ]* - "لکی باریکی دار": خزمە دەگەڵ:

1- یان ↑تازە taze.

2- یانیش ↑تیژ tîj. هەروەها بڕوانە ↑تایە taye "نەمامی بی".

تاژان² **tajan** *[ tāžān]* - دەگەڵ "تاڵان" دێ [تاڵان و تاژان talan u tajan کردن]. [تێبینی: لەژێر وشەی "رووت" و "رووتاندنەوە"دا شی کراوەتەوە کە ئەم وشەیە دەگەڵ ژمارەیەک وشە خزمە، وەک *رەویتن* "تاشین، هەڵکەندن"، *رەوێشتن* "لە بەرد هەڵکەندن"، *رەوتین* "داوەرینی گوڵ و گەڵا" [رووت بوونەوەی دار و دەوەن، داڕندران] و *رەپاندن* "کوتان و نەرم کردنی شتی رەق"]. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەر دەکەوێ کە وشەی "تاژان"یش دەشێ بە مانای "تاڵان، رووتاندنەوە" پێوەندی بە کرداری ↑تاشین taşîn ەوە هەبێ. مەبەست لە رووت کردن، رووتاندنەوە و تاژان دە بنەڕەتدا ئەوە بووە کە هەموو شتێک داڕندراوە و لێ کراوەتەوە، هەر وەک چۆن گوڵ و گەڵای دارێک دەوەرێندرێ و دارەکە رووت دەکرێ.

تاس1 **tas** *[ tās ]* - "سەری بێموو": دە فارسیدا tās (P.). دە کوردمادیدا زۆرجار دەگەڵ "لووس" دەگوترێ [تاس و لووس tas u lus]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ↑تاشین taşîn.

تاس2 **tas** *[ tās ]* - "مۆرەی تەختەنەرد کە هەموو رووبەرەکانی ساف و داتاشراوە": دەچێتەوە سەر ↑تاس1 tas.

تاس3 **tas** *[ tās]* - "جام، دەفر": ئەم وشەیە لە رێی زمانی عەرەبییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان، بۆ وێنە Tasse (G.) "پەرداخ، فینجان". ریشەی وشەکە بردراوەتەوە سەر ↑تەشت taşt سەر بە زمانە ئێرانییەکان. دە زمانی کوردمادیدا وشەی تاسکڵاومان taskılaw هەیە (تاس tas + کڵاوkılaw) کە بە کڵاوی نەریتی ژنان دەگوترێ کە شێوەکەی لە تەشت دەچێ.

تاسان1 **tasan** *[ tāsān ]* - "وڕ بوون، گێژ بوون":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ dösen (G.) "تاسان، مێشک بەتاڵ بوون"، dösig (G.) "حۆڵ، حۆلانە"، doze (E.) "خەواڵوو بوون"، dysig (OE.) "گێژانە، حۆلانە" و ژمارەیەک وشەی وەک ↑تۆز *toz* و ↑دووکەڵ dukel و هیتر کە ئاماژە دەکەن بە بزاوتیکی تیکەڵ و پێکەڵ. مەبەست لەم وشانە دە بنچینەدا "تیکەڵ و پێکەڵ بوون" بووە.

2- لە لایەکی دیکەوە تاسان tasan دە زمانی کوردمادیدا بەشێوەی ↑تەواسان tewasan یش دەگوترێ. ئەم دوو وشەیەش دەتوانن دوو شێوەی دیکە بن لە ↑تەزین tezîn [تەڤزین tevzîn] "سڕ بوون". لەم تێڕوانینەوە تاسان یان تەواسان دەتوانێ دە بنەڕەتدا بە مانای "لە هەست و خوست کەوتن" بووبێ و بەم جۆرە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑تۆپین topîn "مردار بوون" [دە بنەڕەتدا سڕ بوون]. شیاوی سەرنجە هەموو ئەو وشانەش دەگەڵ وشەکانی خاڵی یەکەم دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش و دواجار دەگەڵ ↑تۆز *toz* بە خزم دەردەچن.

**تاسان2 tasan** [ *tāsān* ] - "خنکان، خەفە بوون": خزمە دەگەڵ ↑تینوو tînu.

**تاسە tase** [ *tāsa* ] - "حەن، حەسرەت، ئارەزووی بەتین و ژان": تاسوخ tasux و تاسوق tasuq یش دەگوترێ. تاسە tāse (P.) "دڵتنگی، خواستی بەتین".

1- وشەیەکی دیکە کە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بەکار دێ و لەوانەیە پێوەندی بە "تاسە"وە هەبێ، ↑ئەندێشە endêşe یە [اندیشە andīše (P.)]. ئەم وشەیە لە پێشگری"ئەن" + "دێشە" پێک هاتووە. "ئەندێشە" هەم بە مانای "هزر و بیر" بەکار دێ و هەم بە مانای "خەم و نیگەرانی". دیارە مانای دووەم لە مانای یەکەمەوە سەری هەڵداوە و مەبەست بیرکردنەوەیەک بووە کە ئێش و ئازاری لەگەڵدا بووە. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ dāht (MG.) "هزر و بیر" و هەروەها dacht - (G.) وەک رەگی کرداری رابوردوو سەر بە چاوگی denken (G.) "بیرکردنەوە"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *teng- >*** "بیرکردنەوە، هەست کردن". دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 136) "ئەندێشە" بردراوەتەوە سەر ریشەی ***(IE.) deik- >*** "نیشان دان".

2- لەلایەکی دیکەوە دە زمانی کوردمادیدا لەجیاتی تاسە، تارسە tarse ش دەگوترێ. لەوانەیە ئەمە شێوەیەکی کۆنتری وشەکە بێ. ئەگەر ئەمە راست بێ، دەتوانین دەگەڵ ↑تینوو tînu [تشنە tešna (P.)] هەڵیسەنگێنین. لەم تێڕوانینەوە تاسە دەبێتە "تینوویەتی" بۆ بە دەست هێنانی شتێک، بۆ وێنە دەگوترێ "تینووی ئازادی".

**تاش taş** [ *tāš* ] - تاشەبەرد واتا تەختەبەردی پان و لووس، تیشەشاخ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑تاس 1 tas "سەری بێموو". دە کوردمادیدا زۆرجار دەگەڵ "لووس" دەگوترێ [تاس و لووس]. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەکی دیکەش هەن کە لەوانەیە پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ، وەک ↑تات tat "بەری پان و لووس" [بەردی داتاشراو؟]، تەخت text "ساف، هەموار"، ↑تەختە texte "داری تەنک و داتاشراو" و ↑*تاشین taşîn* "تراشین، ساف کردن".

**تاشاندن taşandın** [ *tāšāndın* ] - "تەمبێ کردن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ dash (E.)، daska (Sw.)، daske (Dan.) "لێدان". بەپێی بۆچوونێک ریشەی وشە ژێرمەنییەکە لەوانەیە لاسا کردنەوەی دەنگ بووبێ.

**تاشتی taştî** [ *tāštī* ] - "نانی بەیانی": چاشت çaşt یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑چێشت çêşt.

**تاشک taşk** [ *tāšk* ] - "چوست و چالاک، مەزبووت". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تاوژین tawjîn "خەریک بوون بە کارێکەوە".

**تاشین taşîn** [ *tāšīn* ] - "لێدان و لێکردنەوە بە ئامرازێکی تیژ": دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا تراشین tıraşîn دەگوترێ. هەروەها دە زمانی فارسیدا تراشیدن terāšīdan (P.). لەلایەکی دیکەوە دە زمانی پەهلەویدا tāšītan (Pl.) هەبووە بە مانای "تاشین". بنەوشەی تاش -taş (Av.) دە زمانی ئەوێستاشدا هەر بە مانای "تاشین" بەکار هاتووە. وەک دەبینین دە وشەکانی کوردمادی سەروو و فارسیدا فۆتیمی r هەیە، کەچی دە وشەکانی کوردمادی ناوین، پەهلەوی و ئەوێستاییدا ئەو فۆتیمە دەرناکەوێ. روون نییە کە ئایا هەموو ئەو وشانە سەر بە ریشەیەکن یان نا. ئەگەر سەر بە یەک ریشە بن، ئەوا دەبێ فۆتیمی r دە هێندێکیاندا زێدە کرابێ یان بە پێچەوانە سوابێتەوە. بە باوەڕی من "تاشین" و "تراشین" دوو وشەی جیاواز و سەر بە دوو ریشەی جیاوازن. بەڵام ئەم دوو وشەیە لەباری شێوە و ماناوە زۆر لەیەکدی نیزیکن و هەر بۆیەش وەها تێکەڵ بە یەکدی بوون کە ناسینەوە و جیا کردنەوەیان هاسان نییە. ئەوەی من دەهێنێتە سەر ئەو باوەڕە کە ئەو دوو وشەیە جیاواز بن، وشەی تیشە tīše (P.) یە دە زمانی فارسیدا بە مانای "تەشوێ". وەک دەزانین دە زمانی فارسیدا وشەی "تاشین" نییە، بەڵکوو دەگوترێ "تراشین"، کەچی "تیشە"ی فارسی ناتوانێ پێوەندی بە "تراشین"ەوە هەبێ،

بەڵکوو پێوەندی بە "تاشین"ی کوردمادییەوە هەیە. لە لایەکی دیکەوە دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە هەن کە پێوەندییان دەگەڵ "تاشین" هەیە، نەک "تراشین"، بۆ وێنە ↑تاش taş "تاشەبەرد واتا تەختەبەردی پان و لووس" ↑تیشە tîşe [تیشەشاخ واتا شاخی راست و لووس لە چەشنی دیوار]، ↑تات tat [تاتەبەرد واتا تەختەبەرد]، ↑تەخت texıt و ↑تەختە texte [دەبنەڕەتدا واتا داتاشراو]، ↑تاس[1] tas [تاس و لووس، تاشراو، دە فارسیدا tās (P.) "سەری بێموو"]، ↑تاس tas [مۆرەی هەڵاویشتن کە لێک و لووس کراوە] و لەوانەشە ↑تەشوێ teşwê "ئامرازی داتاشین" و هتد. وێ دەچێ هەم دە زمانی کوردمادی و هەم فارسیشدا سەردەمێک دوو وشەی "تاشین" و "تراشین" لەپاڵ یەکدی هەبووبن کە لە شێوە و مانادا زۆر لێک نیزیک بوون. ئەو نیزیکییە وای کردوو کە ئەم وشانە تێکەڵ بکرێن و بەرەبەرە یەکیان جێگەی ئەوی دیکە بگرێتەوە. دە زمانی فارسیدا "تاشین" نەماوە، بەڵام "تیشە" ماوەتەوە. بە پێچەوانەوە دە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا "تراشین" بزر بووە و تەنیا "تاشین" بەکار دەهێنرێ. هەرچی وشەی "تراشین"ە، دە شێوەزاری کوردمادی سەرووشدا بەکار دێ و لە جێی خۆیدا شی کراوەتەوە. ئێستا پرسیار ئەوە کە "تاشین" خۆی لە کوێوە هاتووە. ئەم وشەیە دەبێ پێوەندی بە یەک لەم دوو وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑تاشاندن taşandın "تەمبێ کردن" [دەبنەڕەتدا: لێدان]،

2- یان دەگەڵ ↑تووش tûş [تووش بوون واتا وێککەوتن، لێکدران] سەر بە ریشەیەک مانای "لێدان، لێکدان، وێککەوتن". کەوابوو مانای "تاشین" دەبێ (زەبر) لێدان بووبێ بە مەبەستی تاشین، داتاشین واتا لێک و لووس کردنی شتێک. هەروەک چۆن "تراشین"یش خزمە دەگەڵ strike (E.) "زەبر".

**تاف taf** [ *tāf* ] - "هەڕەت، جەنگە": خزمە دەگەڵ ↑تاوtaw [تاوێکی دیکە]، ↑دەم dem، ↑تەمەن temen. گشتیان ئاماژە بە چەمکی "کات" دەکەن. مەبەست لە "تافی لاوێتی" دە بنچینەدا "دەمی لاوێتی، هەڕەتی لاوێتی"یە.

**تافاڵ tafal** [ *tāfāl* ] - "گوێسوانە": وشەیەکی پڕ کۆنە و دە بنەڕەتدا مانای "بەرزترین شوێن، چڵەپۆپە" دبەخشێ و خزمە دەگەڵ ↑تەپ2 *tep 2* "شاخ و بەرزایی بچووک"، top (E.)، topp (OE.)، top (Nl.)، topp (Sw.) "لای هەرە سەرەوە، دوند"، Zipfel (G.) "نووک". ئەم وشەی دوایی رێک لە وشە کوردمادییەکە دەچێ. جێی ئاماژەیە کە وشەی "گویسوانە"ش دە بنەڕەتدا "گۆشەبان" بووە و "گۆشە" ئاماژە بە نووک و دەرپەڕیوی دەکا و خزمیشە دەگەڵ "قووچ" [قووچکە].

**تافتە1 tafte 1** [ *tāfta* ] - "تەنراوێکە لە ئاوریشم": دە فارسیدا تافتە tāfte (P.) "تەنراو". خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın.

**تافتە2 tafte 2** [ *tāfta* ] - "قاڵکراو": خزمە دەگەڵ ↑تاوانەوە tawanewe.

**تافیتە** [ *tāfīta* ] - ↑تاڤگە tavge "ئاوهەڵدێر".

**تاڤ tav** [ *tāv* ] - شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تاو taw بە مانای "هێز، گوڕ". ↑تافە tafe یان تاڤی tavî بە مانای "ڕێژنە باران" دێ [تاوەباران، بارانی بە تاو، بە تەوژم]. هەروەها دە وشەکانی ↑تەوژم tewıjım و ↑تاڤگە tavge "ئاوهەڵدێر"دا دەبیندرێ. لە "تاڤگە"دا مانای وشەکە دەبێتە ئەو جێیەی ئاو بە تاو دەڕژێتە خوارەوە. خزمە دەگەڵ ↑توانین tuwanîn سەر بە ریشەیەک بەمانای "بەهێز بوون، ئەستوور بوون".

**تاڤگە tavge** [ *tāvga* ] - "ئاوهەڵدێر": ↑تاڤ + گە tav + ge. تاڤ بە مانای "هێز و گوڕ و جۆش" و کەرتی دووەمیش پاشگری شوێنە.

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا ابشار abşar بەکاردەهێندرێ کە لە دوو کەرتی "اب" بە مانای "ئاو" و"شار" پێکهاتووە و ئەم کەرتەی دووەم دەبێ دە بنچینەدا "فشار" بووبێ، واتا ئەو شوێنەی ئاو بە فشار و بە تاو دەڕژێتە خوارەوە].

**تاڤەبەر taveber** [ *tāvabar* ] - "قوڵکەبەردێک ئاوی بارانی تێدا کۆ دەبێتەوە": ئەم وشەیە بە شێوەی تاڤێر2 taver یش دەگوترێ کە شێوەیەکە سوانەوەی بەسەردا هاتووە. وشەکە پێک هاتووە لە تاڤە tave + بەر ber. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک، گۆڕیچە" و ↑تاوە tawe "دەفر"، سەر بە ریشەیەک بە مانای

"قووڵ، نزم". کەرتە دووەم ↑بەرد berd ە، تێکڕای وشەکە دەبێتە "قووڵکەبەرد، بەردی قووڵ". جگە لەمانە تاوێرەدەنک taweredenk هەیە بە مانای "ئەوەندە دەنکەی بە جارێک دە سێڵدا دەبرژێ".

**تاڤێر1 taver 1** [ *tāver* ] - "تابووت": شێوەیەکی دیکە لە ↑تابووت tabut.

**تاڤێر2 taver 2** [ *tāver* ] - بڕوانە ↑تاڤەبەر taveber "قوڵکەبەرد".

**تاڤێر3 taver 3** [ *tāver* ] - "بەردی پانی نان برژاندن لەباتی ساج": خزمە دەگەڵ ↑تاڤێر2 taver 2 [تاڤەبەر taveber "قوڵکەبەرد" و هەروەها ↑تاوە tawe "دەفری پەل". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قووڵ، نزم".

**تاق1 taq 1** [ *tāq* ] - "1- بەرانبەری جووت 2- بە تەنێ، بێ وێنە، بێ هەڤاڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑تاک tak.

**تاق2 taq 2** [ *tāq* ] - "میچی کەوانەیی": دە فارسیدا taq (P.) هەر بەو مانایە. خزمە دەگەڵ Dach (G.)، dak (Nl.) و (Sw.)، thatch (E.) "میچ"، tegos (Gr.) "میچ، ماڵ"، tago (L.) "میچ، سەرپۆش". ئەم وشانە و گەلێک وشەی خزمی دیکە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *teg-** > "داپۆشین، سەرپۆش نان، حەشاردان". دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑تاقەت taqet [تاقەت کردن] و ↑تاج tac و هتد.

**تاق3 taq 3** [ *tāq* ] - "کەوڵی مەڕ و بزن": خزمە دەگەڵ ↑تۆک (تۆکڵ) tokıl "توێکڵ".

**تاق4 taq 4** [ *tāq* ] - "1- بەشێک لە بیست و چوار بەشی ئاو 2- نیمرۆژە رێگە، داتیک": وەک دەبینرێ، وشەکە ئاماژە بە "بەشێک، ئەندازەیەک" دەکا، خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑دان dan [دانی بەیانی، دانی نیوەڕۆ]، ↑دانگ dang [یەک لە شەش بەش]، ↑دانگا danga "دەمێک، تاوێک"، ↑دانە dane [چەند دانە] وهتد.

**تاقتاقکەرە taqtaqkere** [ *tāqtāqkara* ] - "قژاوکە": وەک لەم ناوانە دەردەکەوێ، ناوی پەلەوەرەکە پێوەندی "قیژاندن"ەوە هەیە. تاق -taq شێوەیەکی دیکەیە لە زیق zîq و جیغ jīġ (P.) "قیژە". بڕوانە ↑زیقاندن zîqandın.

**تاقم taqım** [ *tāqım* ] - "دەستە، گرووپ": تاخم taxım یش دەگوترێ. تاقم هەروەها بە مانای (دەستیک) ددانی دەستکرد بەکار دێ. خزمە دەگەڵ team (E.) "دەستە، گرووپ"، tēam (OE.) "ئەسپ یان گای پێکەوە بەستراو، بنەماڵە، خێڵ"، taumr (ON.) "زنجیر بۆ تێکخستنی ئەسپ و گا"، töm (Sw.)، Zaum (G.) "هەوسار"، سەر بە ریشەی **(IE.) *deuk-** > "کیشان، راکیشان". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆق toq "مل بەند، ئاڵقەی مل" [دە زمانی فارسیدا طوق بندگی touq e bandagī بەکار دێ بە مانای "زنجیری بەندەگی"]، ↑تاخورک taxurk "عەرابەی بێ چەرخ کە بەسەر بەفردا رایدەکێشن"، ↑تاخە taxe "باقە"؟

**تاقە1 taqe 1** [ *tāqa* ] - "شوێنی شت لەسەردانان" : پێوەندی هەیە بە thēkē (Gr.) "شوێنی شت لێدانان یان شت تێنان"، سەر بەکرداری tithénai (Gr.) "دانان". وشەی bibliothek " کتێبخانە" دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچێتەوە سەر ئەم وشە یۆنانییە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑نیان nîyan [(دا)نان nan، کۆنتر: -nî-da] و -dádhāti (OIn.) "دادەنێ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *dhe-** > "دانان، جێگیر کردن".

**تاقە2 taqe 2** [ *tāqa* ] - "پارچەی کەوا، پشتەکەوا": خزمە دەگەڵ ↑دەق deq "تێکست". جێی ئاماژەیە کە هەم "تاقە" و هەمیش "پشتە" [پشتەکەوا] دە ریشەدا مانایەکی هاوشێوەیان هەیە.

**تاقەت taqet** [ *tāqat* ] - "تاقەت کردن واتا شاردنەوە، داپۆشین، ئاگا لێبوون": خزمە دەگەڵ bedecken (G.) [کەرتی be پێشگرە] و tegere (L.) "داپۆشین". مەبەست لە تاقەت کردن دە زمانی کوردمادیشدا دە بنچینەدا داپۆشین و حەشار دانی شتێکە کە دەبێتە هۆی پارێزران وباش راگیرانی ئەوشتە. دوو چەمکی داپۆشین و ئاگا لێبوون (پاراستن) پێوەندی نیزیکیان پێکەوەهەیە. بۆ وێنە وشەی protection (F.) "پاراستن، ئاگا لێبوون، پشت گرتن" کە لە ریشەیەکی لاتینی دێ، خزمە دەگەڵ "تاقەت"ی کوردمادی و دەگەڕێتەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. تاقەت دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆکڵ tokıl (توێکڵ) و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**تاقی taqi** [ *tāqī* ] - "ئەزموون": پێوەندی هەیە بە taxare (L.) "تاقی کردنەوە".

**تاک tak** [ *tāk* ] - "1- یەک دانە 2- بەرانبەری جووت": تاق taq یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تا2 ta "لابار".

**تاڵ1 tal 1** [ *tāl* ] - "دژی شیرن": تەلخ telıx یش دەگوترێ. تلخ talx (P.). وشەکە خزمە دەگەڵ ↑تار tar و تاریک tarîk. مانای بنەرەتی ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا پارێزراوە، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "رەش تاڵە" کە

ئاماژەیە بە ڕەنگێکی تاریک، یان کاتێک باس لە هەوایەکی "تاڵ و تووش" دەکرێ. لێرەدا مەبەست دە بنچینەدا تەماوی بوون و تار بوونی هەواکەیە بە هۆی هەور و هەڵا و با و بارانەوە. ئەم وشەیە دواتر مانای "توند"یشی وەرگرتووە و لەوێشەوە مانای "تامی دژی شیرن"، چونکە ئەم تامە بە تامێکی توند داندراوە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی نیوان چەمکەکانی "توند بوون" و "تار بوون" بڕوانە وشەی ↑تیر ter کە ئەویش خۆی خزمە دەگەڵ "تار" و "تاڵ"].

**تاڵ² tal** [ *tāl* ] - "تار، هەودا": دە فارسیدا تار tar (P.). هەروەها دە کوردمادیدا ↑تێل tel یان تەل tel هەیە بە مانای "سیم"[تاڵی کانزایی]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Draht (G.)، drāt (OG.)، draad (Nl.)، thread (E.)، trad (SW.) "تار، تاڵ، سیم" [دە بنەڕەتدا: دەزوو یان هەودای بادراو]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑تلان tılan و تلاندن بە مانای "بادان، سووڕاندن"، سەر بە ریشەی < *ter- (IE.) "سووڕان، با دران". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شریت şırît "بەن، کەندر، نەوار".

**تاڵا tala** [ *tālā* ] - "بەخت": ئەم وشەیە لە طالع taliɛ (Arb.)ی عەرەبی وەرگیراوە، بەڵام وشە عەرەبییە کە خۆی دەشێ لە ستارە setāre (P.) واتا ↑ئەستێرە esetre وەرگیرابێ. وەک دەزانین مرۆڤەکان هەر لە کۆنەوە بەخت و بەسەرهاتی خۆیان بە ئەستێرەکانەوە گرێ داوە و ئەم دیاردە دە دونیای مۆدێرنی ئەمرۆشدا درێژەی هەیە [Horoskop] و خەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێی هەیە. دە زمانی فارسی و کوردمادیدا باوە دەڵێن "ستارە بخت" یان "ئەستێرەی بەخت". هەر لەم پێوەندییەدا زمانی عەرەبیش وشەی "ستارە"ی کردووەتە طالع و بە مانای بەخت بە کاری هێناوە.

**تالار talar** [ *tālār* ] - "سەرسەرا، هۆدەی مەزن": تەلار telar یش دەگوترێ.

1- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Saal (G.)، sele (OE.)، zaal (Nl.)، sal (Sw.)، salr (OIs.)، salle (F.) بە هێندێک مانای وەک "هۆڵ، دیو، خانوو". ریشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە. بە گوێرەی بۆچوونێک لەوانەیە پێوەندی بە کرداری دانیشتن لەو زمانانەدا هەبێ.

2- لەوانەیە پێوەندی بە ↑دالان dalan ەوە هەبێ و ئاماژەی بە ڕووبەڕی تەخت و هەراو کردبێ.

**تاڵان talan** [ *tālān* ] - "ڕووت کردن، هەموو شتێک دزین و بردن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- stehlen (G.)، steal (E.)، stelan (OE.) و stilan (Gt.) "دزین". وەک زۆر نموونەی دیکە دەشێ لێرەشدا فۆتیمی s لە بەرایی وشە کوردمادییەکەدا سوابێتەوە یان لە زمانە ژێرمەنییەکاندا لێی زیاد کرابێ. سەبارەت بە ریشەی وشە ژێرمەنییەکە دوو بۆچوون هەیە: یان خزمە دەگەڵ stereo (Gr.) "ڕووت دەکەم، تاڵان دەکەم"، یان دەچێتەوە سەر بنەڕەتی هیندوویئەورووپی < *tel- (IE.) "لا بردن، هەڵگرتن". وەک دەبینین لەم ریشەیە دا فۆتیمی s نییە و ئەگەر وشە ژێرمەنییەکان لەم ریشەوە هاتبن، ئەوا ئەم فۆتیمەیان لێ زیاد کراوە.

2 - sylon (Gr.) "تاڵان و بڕو".

**تالخ talıx** [ *tālıx* ] - "سنوورن مەرز": پێوەندی هەیە بە télos (G.) "سنوور، ئارمانج، نیشانە". وشەی toll (E.) "گومرکێ" هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بۆ ئەم وشە یۆنانییە دەگەڕێتەوە. لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە ↑سیلە sîle [سیلە گرتن واتا نیشانە گرتن].

**تالووکە taluke** [ *tālūka* ] - "مەترسی، جێگەی مەترسی": لەوانەیە پێوەندی بە ریشەی < *dhel- (IE.) "قووڵکە، قووپاوی، قووڵایی". وشەی تەڵە tele ش هەر لەم ریشەوە هاتووە. لەم تێڕوانینەوە مانای "تالووکە" دە بنەڕەتدا دەبێتە "دە تەڵە کەوتن، دە تەڵەدا بوون".

**تاڵووکە taluke** [ *tālūka* ] - "لەز، پەلە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- tilian (OE.) "پەلە کردن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑سیلە sîle "نیشانە، ئامانج".

2- ↑چالاک çalak، سەر بە ریشەیەک بەمانای "بزوانی خێرا". هەروەها هەڵی سەنگینە لەگەڵ ↑تڵەکان tılekan [ڕاتڵەکان ratlekan].

**تام 1 tam** [ *tām* ] - "مەزە، چێژ": دە زمانی عەرەبیدا *طعم taεm* (Arb.) بە مانای "تام" هەیە کە خۆی لە پێوەندی دەگەڵ طعام taεām (Arb.) "خۆراک" دایە. ئەم وشەیە زۆر وێ دەچێ ریشەی کوردمادی هەبێ. لێرەدا چەند تێبینییەک: ئەگەر سەیری وشەی "کام، کاو" بکەین، دەبینین کە ئەم مانایانەی بۆ کراوە: "چێژ"، "ئارەزوو" و "دەم". مانای بنەڕەتی "دەم"ە و لەمەوە مانای "چێژ" پەیدا بووە. سەرەتا کاتێک گوتراوە "بە کامت خۆش بێ"، مەبەست ئەوە بووە کە "بە دەمت خۆش بێ". ئیتر پاشان لەمەوە مانای "چێژ بەخش بێ" و دواتریش "وەدیهێنەری ئارەزووت بێ" پەیدا بووە. لێرەدا پێوەندی دوو چەمکی "دەم" و "چێژ" بە باشی روون دەبێتەوە. ئەم جار دەتیوان دوو چەمکی "دەم" و "خۆراک"یشدا پێوەندی هەیە، چونکوو خۆراک بە رێگای دەمەوە وەردەگیرێ. وشەی "قەپاڵ"، واتا ئەو بەشەخۆراکەی بە گازێک لێ دەکرێتەوە، خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک *قەپ* "گاز لێدان بە ددان"، *گاپن* "نەوسن، زۆرخۆر" [دە بنەڕەتدا واتا کەسێک بەردەوام دەمی بۆ خواردن داپچڕیوە]، *حەبیشاندن* "خواردن بە هەڵپە و لەز"، *کەپۆ* و *زار* [دە بنەڕەتدا *زافەر*]. ئەم پێوەندییانەی سەرەوە شیمانەیەکی بەهێزمان لا دروست دەکا کە دە زمانی عەرەبیدا *طعم taεm* و طعام taεām لە دەم dem [کۆنتر: تەم tem ؟] وەرگیرابێ و لە مانای "دەم"ەوە، ماناکانی "خۆراک" و "چێژ" پەرەیان گرتبێ. لەم تیڕوانینەوە مەبەست لە طعام taεām "قەپاڵ" بووە، یان ئەو شتەی کە دە زمانی ئەڵمانیدا پێی دەگوترێ Bissen "تیکەیەک بۆ خواردن" و لە Imbiss "ساندویچخانە" وەردەگیرێ. ئەم وشەی دوایی دەچێتەوە سەر کردارێکی کۆنی ئەڵمانی کە ئێستا نەماوە، واتا enbīzan (OG.) "چێژ وەرگرتن بە خواردن یان خوادنەوە". لەم نموونەیەشدا پێوەندی چەمکەکانی "خۆراک" و "چێژ وەرگرتن" خۆی دەردخا.

**تام 2 tam** [ *tām* ] - تام دان tam dan واتا "رووکێش کردن بە زێڕ یان زێو": لەوانەیە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑تاماندن tamandın.

**تامار tamar** [ *tāmār* ] - "تەم": ↑تەم tem.

**تامان taman** [ *tāmān* ] - "دەر یان دیواری لە شووڵ تەنراو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە dämmen (G.)، temmen (OG.)، (faúr)dammjan (Gt.)، dam (E.) "بەربەست کردن". Damm (G.)، dam (E.) و هاوتاکانیان دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا مانای "سەدد، بەربەستی ئاو" دەدەن.

**تاماندن tamandın** [ *tāmāndın* ] - "پێوەند لێدانی دار": جێی بەرهەڤ کردن دەگەڵ:

1- ↑داو daw [تاو taw] و تەون tewın و هتد.

2- دەگەڵ ژمارەیە وشە بە مانای "دروون، تەقەڵ لێدان، تێکخستنەوە، گرێ دان"، وەک Saum (G.) "پەڕاوێز"، sew (E.)، siuwen (OG.) "دروون(ەوە)"، -syūman (OIn.) "تەقەڵ، بەن، تەسمە" و هتد. ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردی وەک ↑سیم sîm و ↑سوژن sujın.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمی s بۆ t نموونە کەم نییە، بۆ وێنە بڕوانەی وشەی "تەماڵ"].

**تامار tamar** [ *tāmār* ] - "تەم (لە دەوری شتێک)": ↑تەم tem.

**تامژاندن tamjandn** [ *tāmžāndın* ] - "فێر کردنی ساوا بۆ مەمک گرتن": هەروەها تامژین tamjn دەبێتە "فێر بوونی مەمک مژین". خزمە دەگەڵ ↑تام tam "چێژ".

**تامەزرۆ tamezro** [ *tāmazro* ] - "پێخۆش، حەزلێکەر، خوازیار": پێک هاتووە لە دوو وشەی ↑تام tam "مەزە، چێژ" و زرو zıro. کەرتی دووەم هەمان ↑زار zar "دەم". مانای تێکرای وشەکە دەبێتە "دەمەچێشتە"، دە بنەڕەتدا واتا کەسێک [یان ئاژەڵێک] کە دەمی بە خواردنی شتێک فێر بووە، چێژی لێ وەردەگرێ و حەزی لێ دەکا. وەک لەژێر وشەی "تام"دا شی کراوەتەوە، ئەم وشەیە خۆی دەشێ سەرەتا بە مانای "دەم" بووبێ و دواتر لەمەوە ماناکانی "خواردن" و "چێژ وەرگرتن" پەیدا بوون.

**تان tan** [ *tān* ] - "1- رایەڵی تەون 2- تامان، پەرژین": دەچێتەوە سەر ↑تەنین tenîn.

**تانج tanc** [ *tānj* ] - "1- کڵاوی پادشایان 2- کاکۆڵی کەڵەشێر": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تاج tac [فۆتیمی n کەوتووەتە نێوان بزوێنی a کۆنسۆنانتی c].

**تانۆک tanok** ] *tānok* [ - "پەرژین، دیواری نزمی لە شووڵ چندراو": خزمە دەگەڵ ↑تەنین tenîn.

**تانە1 tane 1** ] *tāna* [ - "پەڵەی سەرگلێنەی چاو کە لە ئەنجامیدا چاو باش نابینێ": خزمە دەگەڵ ↑تەنین tenîn. تانە بە تەوتێک چووێندراوە کە بەسەرچاو دەکشێ و چاو دەتەنێتەوە.

**تانە2 tane 2** ] *tāna* [ - "تەوس و توانج": لە *طعنة taεna* ‌(Arb.) بە مانای "لێدان، برین، بریندار کردن" وەرگیراوە.

**تاو1 taw 1** ] *tāw* [ - "1- هەتاو، تیشکی خۆر": خزمە دەگەڵ تابیدن tabîden ‌(P.) یان تافتن tāftan ‌(G.) "تیشک و گەرما بڵاو کردنەوە"، افتاب āftāb ‌(P.) "هەتاو"، تب tab ‌(P.) "تا(و) و تێ"، تابستان tābestān ‌(P.) "هاوین"، تف taf ‌(P.) "گەرما" و تفت taft ‌(P.) "گەرم". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ tap- (tápati) ‌(OIn.) "گەرم کردن" و tepēre ‌(L.) "شیلەوگەرم بوون"، سەر بە ریشەی **< -tep*** ‌**(IE.)** "گەرم بوون، هایسان، بڵێسە دان، درەوشانەوە" [بڕوانە "فرهنگ ریشه‌شناختی زبان فارسی"، ل. 321]. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم بارەوە دەبینرێن، وەک ↑تف2 tıf 2 "ئاگر، فەندەک"، ↑تفک tıfik "کوانوو، ئاگردان"، ↑تفت tıft [تفت و تاڵ tıft û tal]، ↑تەفایە tefaye "مەنقەڵی"، تا tā [↑تێ te] "گەرم بوونی لەش" و هتد.

[تێبینی: ئەم وشەیە دەشێ برێک هەڵوەستەی لەسەر بکەین، چونکوو لە لایەکەوە لەوانەیە بە چەشتێک پێوەندی بە هێندێک وشەی زمانە ژێرمەنییەکانەوە هەبێ و لە لایەکی دیکەشەوە بە هێندێک وشە دە زمانی کوردمادیدا. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا، تا ئەو جێیەی من ئاگادار بم، وشەیەکی لەم چەشنە و بەم مانایە نابینرێ. لەوانەیە ئەم ریشەی سەرەوە لەپێوەندی دەگەڵ یەکێک لەم ریشانەی خوارەوەدابێ: 1- ریشەی *dheu-** ‌(IE.) "درەوشانەوە، بریقانەوە" و دواتریش دەگەڵ ریشەی *dei-** ‌(IE.) "ڕووناک بوون، درەوشانەوە". سەبارەت بەم ریشەیە بڕوانە وشەی "خاوێن" (کۆنتر: تاوێن!). ئەگەر ئەم پێوەندییە ڕاست بێ، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تیف tîf (تیف تیفە دان واتا بریقاندنەوە) ئەم وشانەی سەرەوە لەباری فۆنولۆژییەوە، نەک لەباری ئێتیمۆلوژی، دەتوانین دەگەڵ ئەم وشە خواروە بەرهەڤ بکەین کە گشتیان سەر بە ریشەیەکن: تەپ، تەپاندن، دەبان، تەور، دەفە، تەپڵ. 2- ریشەی *dheu-** ‌(IE.) " دووکەڵ کردن، هەڵم و هاڵاوکردن" (دەبنەڕەتدا: جم و جۆڵی نائارام و تێکەڵ پێکەڵ کردن). ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، "تاو" دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تین tîn "گەرما"، ↑تەن ten "سیان" و ↑توون tun "ئاگردانی گەرماو"، ↑تەنوور tenur، ↑دووکەڵ dukel و چەندین وشەی دیکە کە لە ژێر ↑*دەوار² dewar* دا شی کراونەوە].

**تاو2 taw 2** ] *tāw* [ - "هێز و گوڕ": [تاو سەندن، تاو دانە شتێک]. خزمە دەگەڵ ↑توانین tuwanîn و tāvīsī ‌(OIn.) "تاو، تابشت، هێز"، سەر بە ریشەی **< -teu-, *tu*** ‌**(IE.)** "هێز، توان، ماسین، ئەستوور بوون".

**تاو3 taw 3** ] *tāw* [ - "دەمێک" [تاوێکی دیکە دێم]. خزمە دەگەڵ ↑دەم dem و ↑تەمەن temen.

**تاو⁴ taw** ] *tāw* [ - تاو کردن واتا "ساز کردن" [کابرا ئەو ژنەی تاو کردووە]. دەچێتەوە سەر ↑تاوژین tawjîn "خەریک بوون بە کارێکەوە".

**تاو⁵ taw** ] *tāw* [ - "داو، دەزوو": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*داو daw*. خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın و ↑جاو caw، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چنین، تەنین".

[تێبینی: دە زمانە ژێرمەنییەکاندا چەند وشەیەک لەم بارەوە سەرنج رادەکێشن وەک tow ‌(E.) "تاڵ، داو"، tou ‌(OS.)، to ‌(ON.) "پەشم" [مووی؟]، -tow ‌(OE.) "رستن". وشە کوردمادییەکە لەوە ناچێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو فۆتیمی w دە وشەی "داو"دا پێشتر m بووە و ئەمەش دە ریشەی وشەکەدا خۆی نیشان دەدا].

**تاوانەوە tawanewe** ] *tāwānawa* [ - "توانەوە، بوونە تراو (بەهۆی گەرماوە)": خزمە دەگەڵ tauen ‌(G.)، douwen ‌(OG.)، dooien ‌(Nl.)، thaw ‌(E.)، töa ‌(Sw.)، tajat ‌(Rus.) و tabere ‌(L.) "حەل بوون، تاوانەوە"، سەر بە ریشەی **< -ta(u)*** ‌**(IE.)** " تاوانەوە، حەل بوون، لێک بڵاو بوون، جاری بوون". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑تەفر tefır [تەفر و تونا بوون واتا حەل بوون و لە ناو چوون]، ↑تەپ⁵ tep "سلەگوو"، ↑تف tıf "ئاوی دەم"، ↑تەوش tewş "تراو، شل"، ↑تەڤژین1 tevjîn "1- شوولین، زکێ چوون 2- ریخی شل"، ↑تەبغە tebġe "کۆمای زبڵ و پەین"، ↑تەپاڵە tepale "ریخی هیشکەوە بوو"، ↑تەپار tepar "ریخ و قوڕ بۆ سواخ دانی دەمی خەڵفەمێش" و هتد.

وەک دەبینرێ دە هێندێک لە وشەکانی سەرەوەدا ئاماژە بە "پیسایی مرۆڤ و ئاژەڵ" دەکرێ و لێرەدا مەبەستەکە بریتییە لە "حەلکراو، هەزمکراو، هەڵتاوێنراو". شیاوی باسە دە زمانە ژێرمانییەکانیشدا هەم ئەو وشانەی مانای "تاوانەوە" دەدەن و هەم ئەوانەش مانای "هەزم کردن" دەدەن، لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە tauen (G.) "تاوانەوە" و verdauen (G.) "هەزم کردن، *هەڵتاواندن*". دیسان هەر لەم پێوەندییەدا بڕوانە ↑داوان dawan [هەڵەداوان heledawan].

**تاوژین tawjîn** [ *tāwžīn* ] - "خەریک بوون بە کارێکەوە": هەروەها ↑تاو[4] taw کردن هەیە بە مانای "ساز کردن" [کابرا ئەو ژنەی تاو کردووە]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- taugen (G.)، deugen (Nl.)، dugen (OE.)، duga (Sw.) "بەکار هاتن، بەکەڵک بوون"، tycheīn (Gr.) "گەیشتن بە ئارمانج"، techeuin (Gr.) "ساز کردن، ئامادە کردن، ئاوا کردن". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑تاشک taşk هەیە بە مانای "چوست و چالاک، مەزبووت". ڕاست بەم مانایە دە زمانی ئەڵمانیدا tüchtig (G.) دێ کە پێوەندی بە وشە ئەڵمانییەکەی سەرەوە هەیە. لەباری ماناوە بەراوردی "تاوژین" بکە دەگەڵ "کار" کە ئەویش دە ریشەدا بە مانای "ساز کردن، ئامادە کردن"ە.

2- taujan (Gt.) "کردن، ساز کردن، ئەنجام دان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ tou(we) (MG.) "ئامراز" و zouwen (OG.)، tawian (OE.) "ساز کردن، تەیار کردن"، tool (E.) "ئامراز، ئامێر"، Tau (G.) "گوریسی ئەستوور" [دە بنەڕەتدا: ئامراز، ئامرازی کەشتی]. ریشەی هیچکام لە وشە ژێرمەنییانەی سەرەوە ساخ نەکراوەتەوە.

**تاوس tawıs** [ *tāwıs* ] - "مەلێکی ڕەنگاوڕەنگە": دە زمانی یۆنانیشدا هەر taos (Gr.). ریشە؟

**تاوک tawık** [ *tāwık* ] - "دارێکی سەختی جەنگەڵی": خزمە دەگەڵ ↑تاو2 taw یان ↑تەڤا teva "هێز و گوڕ" [تاو سەندن، تاو دانە شتێک]. خزمە دەگەڵ ↑توانین tuwanîn و tāvīsī (OIn.) "تاو، تابشت، هێز"، سەر بە ریشەی < ***teu-, *tu-* (IE.)** "هێز، توان، ماسین، ئەستوور بوون".

**تاوڵ tawıl** [ *tāwıl* ] - "ڕەشماڵ، چادر":

1- لە لایەکەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەون tewın، دە بنچینەدا واتا "تەنراو".

2- لە لایەکی دیکەوە ئەگەر سەرنجی وشەی "ڕەشماڵ" و "دەوار" بدەین، دەبینین کە ئەم وشانە پێوەندییان بە ڕەنگی "ڕەش"ەوە هەیە، چونکوو تەنراوەکە ڕەنگێکی ڕەشی هەیە. ئەگەر لەم گۆشەنیگایەوە لێی بڕوانین، "تاوڵ" دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑دەوار[2] dewar "پارچەی ڕەشماڵ".

**تاوڵە tawle** [ *tāwla* ] - "تەختە[نەرد]": دە زمانی لاتیندا tabula (L.) بە مانای تەختەیە. بەڵام وێ ناچێ وشە کوردمادییەکە وەرگیراو بێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑دەپ *dep* "تەختە" و↑تەپڵەک teplek "1- تەختەی سەرکۆڵەکە 2- ژێرسیغار 3- کورسیلەی شت لەسەردانان" [تەپڵە (تاوڵە)ک].

**تاوڵەمە tawleme** [ *tāwlama* ] - "پیاڵەئاساییەکە خەڵووزی تێ دەکەن و هەڵی دەسووڕێنن تا خەڵووزەکە بگەشێتەوە، پن چەرخێن": دەچێتەوە سەر ریشەیەک کە مانای "سووڕاندن، با دان" دەبەخشێ. خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın و ↑تاوێر tawer "بەردی خلۆرەوە بوو".

**تاوە tawe** [ *tāwa* ] - "جۆرێک دەفر": tapak (pl.).

1- ئەم وشەیە زۆر وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ Topf (G.) "قابلەمە". دە فارسیدا بە "تاوە" دەگوترێ ماهیتابە mahītābe (P.). هەروەها دە فارسیدا وشەی افتابە āftābe (P.) هەیە کە دە کوردمادیدا دەبێتە ↑ئافتاوە aftawe. لەم تێڕوانینەوە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قووڵ، قووڵ بوون" و دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑تاپی tap "خەندەک" و هەروەها دەگەڵ ↑دەبوو debu "دەفری ڕزق"، تیڤسی tîvsî "بەلەمی چێشت".

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑تاو1 taw "هەتاو، تیشکی خۆر" هەبێ و ئاماژە بە گەرم کردن بکا.

**تاوێر1 tawer 1** [ *tāwer* ] - "بەردی خلۆرەبوو لە شاخ": تاڤێر taver یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın و گەلێک وشەی دیکە کە سەر بە ریشەیەکن بە مانای "سووڕان، با دان".

**تاوێر2 tawer 2** [ *tāwer* ] - "زەوی ڕەقەن، تەمتەمان": خزمە دەگەڵ ↑تاوک tawık "دارێکی سەختی جەنگەڵی".

**تایفی tayfî** [ *tāyfī* ] - "جۆرێک ترێ": تایەفی tayefî ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ توانەوە tuwanewe [↑تاوانەوە (tawan(ewe)]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "حەل بوون، لەبەر یەک بڵاو بوون، جاری بوون". ↑تولانەوە tulanewe، ↑تولخی tulxî، ↑تولخانەوە tulxanewe ش دەشێ لەم ریشەوە هاتبن.

**تایە taye** [ *tāya* ] - "نەمامی بی لە چەم دا": خزمە دەگەڵ تاک tāk (P.) "رەز"، tāk (Bal.) "گەڵا"، tāya (Pash.) "داری نارەون". وشەکە دە هێندێک زمان و زاراوەی دیکەدا بە مانا "دارەبی"، "لک، لکی دارەبی"، "تەناف لە پێستی دارەبی" بەکار دەهێنرێ. بە گوێرە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی (ل. 323) وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی < ***(s)tei-*** ***(IE.)*** "تیژ بوون، تیراچوون". لەوانەیە مەبەست لەم ریشەیە ****(s)teig-*** ***(IE.)*** "تیژ، نووکدار". بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تیخ tîx [تیغ tîĝ]. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑تاژان[1] tajan "لکی باریکی دار" هەیە کە لەوانەیە دەگەڵ ئەو وشانە خزم بێ.

**تایین tayîn** [ *tāyīn* ] - "شتەکە، فڵان": لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی < ****dei-*** ***(IE.)*** "رووناک بوون، درەوشان، دیارکەوتن"]. لەوانەیە وشەی ↑دیتن dîtın پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. لەم تێروانینەوە مانای "تایین" دەبێتە "موردنظر" دە زمانی فارسیدا.

**تبل tıbıl** - "قامک": وشەی تلی tılî ش دە زمانی کوردمادیدا هەر بەو مانایە هەیە کە دەشێ شێوەیەکی دیکەی وشەکە بێ. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک Daumen (G.)، thumb (E.) و هاوتاکانیان دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "قامکەگەورە"، tymel (OE.) "قامکەوانەی دروومان"، thýlos (G.) "تیلا، قیتکە، مێخ"، Dolle (G.)، thole (E.) و هاوتاکانیان دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "داری سەوڵ پێ ڕاگرتن لە قایق دا"، tumor (L.) "دوومەڵ، کوان"، túmara-h (OIn.) "قەڵەو، بە هێز". ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی < ****teu-, *tu-*** ***(IE.)*** "ماسین، ئەستوور بوون، بەهێز بوون". دە زمانی کوردمادیدا دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑توو tu [میوەی توو [تفی] کە شتیکی برێک قەڵەوەیە] و هەروەها ↑دوومەڵ dumel و دواتر ↑توانین tuwanîn.

**تخووب tıxub** [ *tıxūb* ] - "سنوور": بەلەبەرچاوگرتنی ئەو تێبینییەی خوارەوە دەکرێ دەگەڵ ئەم وشانە بەرهەڤی بکەین: token (E.)، teken (Sw.)، taiken (Gt.) "نیشانە، مۆرک".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا وشەی مرز merz "سنوور" و دە ئاڵمانیشدا Mark کە پێشتر بە مانای "سنوور" بە کار هاتووە، پێکەوە خزمن و دە بنەڕەتدا مانای "نیشانە"یان هەبووە و مەبەست نیشانە کردنی سنووری زەوییەک یان وڵاتیک بووە. دە سەردەمە کۆنەکاندا کاتیک باس لە "مەرز"ی نێوان دوو پارچەزەوی یان دوو وڵات کراوە، دە راستیدا مەبەست ئەو "نیشانە"یە بووە کە لەو شوێنە داندراوە].

**تخوون tıxun** [ *tıxūn* ] - وشەکە زۆرتر دە رستەی پرسیاری یان نەرێنی دا بەکار دێ [تخوونی نەکەوی واتا نیزیکی نەبی، دەستی لێ نەدەی]. ئەم وشەیە زۆر پێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ take (E.) "گرتن، هەڵگرتن". مانای بنەڕەتی وشە ئینگلیزییەکە "دەست لێدان، لەمس کردن" بووە و ئەم مانایە لە tekan (Gt.) دا دەبینرێ. تخوون کەوتن دە زمانی کوردمادیشدا ئەگەر بە وردی سەیری بکەین، بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ مانای "دەست لێدان، لەمس کردن" دەگەیەنێ. کاتێک دەگوترێ تخوونی ئەو کەسە یان ئەو شتە نەکەوی، مەبەست لەڕاستیدا ئەوەیە کە خۆتی لێ نەدەی، دەستت وێی نەکەوێ. بەوتەیەکی دیکە ئەم وشەیە نیزیک بووتیکی یەکجار زۆر، واتا لە رادەی "لەمس کردن"دا نیشان دەدا.

**تخێڵ tıxel** [ *tıxel* ] - تخێڵ بوون واتا "راکشان، درێژ بوون": خزمە دەگەڵ dagr (Pl.) "درێژ". وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑تاخ tax "گەڕەک"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەنینەوە، لەبەر یەک کشانەوە".

**تر tır 1** - "نیشانەی ئاوەڵناوی باڵاتر، سەرووتر": [وەک جوانتر، باشتر، پرتر]. تر tar (P.)، خزمە دەگەڵ هەر ئەم نیشانەیە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا، بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا: schöner (G.) "جوانتر"، besser (G.) "باشتر"، größer (G.) "مەزنتر" و هتد.

**تر tır 2** - "دیکە: رۆژێکی تر": ander (G.)، other (E.)، other (OF.) و antara (OI.) "تر، ئیتر"، سەر بە ریشەی < ****antero-, *ontero-*** ***(IE.)***.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا وشەکە دەشێ سەرەتا دیتر dıtır بووبێ، پاشان کورت بۆتەوە بۆ تر tır و پاشان لەمەوە وشەکانی ئیتر îtır/ هیترhîtır دروست بوون. لەم بارەوە بڕوانە ↑ئیدی îdî] .

**ترِ¹ tır** - "با لێ بوونەوە بە دەنگی توند": ئەم وشەیە و هەروەها ↑دردِر dırdır "دەنگی ماشێن و ماتۆڕ دە زمانی منداڵاندا" و↑ ترەترِ tıretır "دەنگی ماتۆڕ، دەنگ و هەرا کردن لە کاتی شەڕ و کێشەدا" [ترەترِ کردن] خزمن دەگەڵ dröhnen (.G) "دەنگی توند لێ هەستان"، dreunen (.Nl)، drynja (.OIs) "گوڕڕاندن، گرماندن". وشەکە دە زمانی ئاڵمانیدا بۆ دەنگی توند و ناخۆش بەکاردەهێندرێ وەک دەنگی ماتۆڕ، مووزیکی توند، قاقای توند و هیتر. دە زمانی پەهلەویدا drāy (.Pl) هەبووە بە مانای "زەنگ" و drāyītan (.P) بە مانای "بەرز قسەکردن، هەرا کردن" و drānāk (.Pl) "ستران" [دە فارسیدا ترانە tarāne (.P)]. ئەم وشانە بە باشێ رێک دەکەون دەگەڵ ↑ستران sıtran دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "گۆرانی". وەک دەزانین دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی دیکە هەن بە مانای "گۆرانی" کە ئەوانیش ریشەکانیان مانای "دەنگ و هەرا کردن" دەبەخشن، وەک گۆرانی، هۆرە، گەلۆ، ئاواز و هتد. لەوانەیە فۆتیمی س s بۆیە خرابێتە سەر وشەکەوە، تاکوو لەگەڵ وشەی "ترِ/ ترِان" جیاوازی دروست ببێ. ئەم جۆرە وردەکارییە لە زمانی کوردمادیدا شتێکی نامۆ نییە. بۆ وێنە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ئەنگوتن" یان "ئەنگاوتن". لەم وشانەشدا پێشگری "ئەن" [ئە + ن] خراوەتە سەر وشەکەوە تا کوو جیاوازی دروست ببێ دەگەڵ ئەو وشانەی کە"ناشیرین" دێنە بەرچاو.

[تێبینی: مەبەست لە "ترِ" دەبنچینەدا ئاماژە بە دەنگی توند بووە ومەبەست لە " ترەترِ مەکە"ش وێچواندنی قسەی لایەنی بەرانبەر بە "ترِ"، بە مانای ئەمڕۆیینی وشەکە نەبووە. ئەگینا دەبا گوترابا "ترەترِ مەکەنە"، چونکە کردارەکە "ترِ کەندن"ە، نەک ترِ کردن. مەبەست ئەوەیە کە "دەنگت هەڵ مەهێنە، هەرا و گرمەگرم مەکە]. دە زمانی کوردمادیدا ↑تریقە trîqe "دەنگی پێکەنینی بەرز" و ↑تریکە trîke "زریکە، قیژە" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. ریشەی وشەکە دەبنچینەدا لاسا کردنەوەی دەنگە.

**ترِ² tır** - دەگەڵ "تایفە" دێ [ترِ و تایفە]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تیرە tîre "تۆرەمە" [ بڕوانە ↑*تۆرەمە toreme* ].

**ترات¹ tırat** [ *tırāt* ] - "هاتوچوونی خێرای سوار لە مەیداندا": خزمە دەگەڵ treten (.G)، treden (.Nl)، tread (.E) "هەنگاو نان، بەسەردا رۆیشتن، پێ لێنان". دە ئینگلیزی کۆندا وشەکە بە مانای "کوتانەوەی دەخل و دان بە پێ" بە کار هاتووە.

**ترار tırar** [ *tırār* ] - "تاسوولکەی ئاوخواردنەوە": تەرار terar و ترگار tırgar یش دەگوترێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تراک tırak "قاپی پەل".

**تراز tıraz** [ *tırāz* ] - "جەرِ و مەنگەنە": خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕاندن".

**ترازان tırazan** [ *tırāzān* ] - "لێک جیا بوونەوە": خزمە دەگەڵ trennen (.G)، tornen (.Nl) "لێک جیا کردنەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*دران dıran*. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑دەرزی derzî و ↑درز dırzکە ئەوانیش سەر بەم خێزانەن.

**تراسکە tıraske** [ *tırāska* ] - "لە رێ لا دانی بارەبەر": هەروەها ↑تلاسان tılasan هەیە بە مانای "لە رێگە کلا بوون": خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان". بەم شێوەیە مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "وەرسووڕاندن"ی روو یان هەنگاو لە راستەڕێ بەرەو لایەکی دیکە.

[تێبینی: لە باری ماناوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ "چەپ"، "چەپە بوون" یان "وەرچەپین". وشەی "چەپ" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خوار، بادراو"].

**تراشین tıraşîn** [ *tıraşīn* ] - "تاشین": تراشیدن terāšīdan (.P). خزمە دەگەڵ streichen (.G)، strīhhan (.OG)، strijken (.Nl)، strike (.E) "لێخشاندن، پێداخشاندن، سترین، خوشین". ئەم وشەیە هەر لە کۆنەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "لێدان"یشی وەرگرتووە، بۆ وێنە Streich (.G) و stroke (.E) "زەبر". دە زمانی کوردمادیشدا هەردوو ماناکە بەدی دەکرێ، مانای یەکەم لە وشەی ↑ئەسترین astrîn [سترین sıtrîn، سڕینەوە] دا بەدی دەکەین، کە ئەمەیان مانا ئەسڵییەکەیە. مەبەست لە سترین یان ئەسترین ["ئە" پێشگرە] دە بنەڕەتدا

ئەوە بووە کە دەست یان شتێکیان لە شتێکی دیکە خشاندووە بۆ ئەوەی پاکی بکەنەوە یان سافی و لووسی بکەن. ئەم مانایە دە وشەی ↑دەرۆزان derozan "ماڵینی ژێر خەرمان"یشدا بەدی دەکرێ. دواتر ئەم دۆخی لێخشاندن یان پێداساوینە مانایەکی تازەی وەرگرتووە کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بووەتە "لێدان" و دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بووەتە "تراشین". دیارە دەتیوان دوو چەمکی "تراشین" و "لێدان"دا پێوەندی نیزیک هەیە. دە کوردمادیدا دەگوترێ "ردێن تاشین" یان "ردێن لێدان". ئەمەش لەوەڕا دێ کە تاشین جۆرە لێداتێکە کە رووبەری شتێک دەکاتە ئامانج، بۆ ئەوەی رووبەری شتەکە ساف و لووس بێ، نەک ئەوەی شتەکە بشکێ یان لەت و پەت بێ. دە زمانی لاتینییشدا چەند وشە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک striga (L.) "خەت، هێڵ، تیرە"، stringere (L.) "پێداخشاندن"، strigilis (L.) "رنەک، قاشاخ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *ster(ə)- (IE.)* "لێخشاندن، پێداخشاندن، راخوشین". هەر لەم ریشەوە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا چەندین وشەی دیکە دروست بوون کە پێوەندییان بە "تیشک" و "ئەستێرە"وە هەیە، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا ↑ئەستێرە estere، ↑تریفە tırîfe، ↑ترووسکە tırûske یان تریسکە tırîske یان ترووکە tırûke، ↑تریشقە tırîşqe، ↑تیرێژ tîrej، ↑تیرە tîre "خەت، هێڵ"، درەوشانەوە dırewşan(ewe) و هتد. [دە زمانی فارسیدا بە "درەوشانەوە" دەگوترێ درخشیدن deraxşīdan (P.). هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی فارسی تراشیدن terāšīdan (P.) "تراشین"]. هەروەک چوون ئەمڕۆ دە زمانی کوردمادیدا "راخوشینی ئەستێرە" دەگوترێ، هەر بەم شێوەیە لە سەردەمانی کۆندا ناوی "ئەستێرە" و "تیشک" بە چەمکی "راخوشین" [لێخشان]ەوە گرێ دراوە و وا بیر کراوەتەوە کە ئەستێرەکان لە ئاسمان دەخشێن یان تیشکی رووناکی بەسەر هەردا دەخشێ. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تیرێژ *tîrej* [دیسان لێرەدا بەراوردی "تیرێژ" بکە دەگەڵ "تراش" [تراشین]!

**ترافاندن tırafandın** [ *tırāfāndın* ] - "رەواندن، رەتاندن": ترافیاگ tırafyag دەبێتە "دەرکراو، رەتێنراو". خزمە دەگەڵ ↑تەرە[1] tere "دوورکەوتە، دوورخراو".

**تراک tırak** [ *tırāk* ] - "قاپی پەل": خزمە دەگەڵ Trog (G.)، troch (Nl.)، trag (Sw.) "قاپی دارین" و دواجار خزمە دەگەڵ ↑دار dar.

**تراو tıraw** [ *tırāw* ] - "شل، ئاوەکی": خزمە دەگەڵ Srtom (G.)، stroum (OG.)، stroom (Nl.)، stream (E.)، ström (Sw.) "جەریان (کردن)، جاری بوون"، strumen (Rus.) "جۆگە". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑سروە sırwe "شنەبا" [جەریانی با].

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆنۆلۆژییەوە لەتیوان وشە کوردمادییەکە و وشە ژێرمەنییەکاندا بەراوردی ئەم "تراو"ە بکە دەگەڵ "تراویلکە" لە خوارەوە].

**تراویلکە tırawîlke** [ *tırāwīlka* ] - "وێنەی درۆیینی ئاو لە سەحرا کە بە هۆی هەڵگەڕانەوەی تیشکی خۆر لەسەر هەرد دروست دەبێ": تراو + ئیلکە tıraw + ilke. کەرتی دووەم پاشگرە. بنەوشەی تراو tıraw خزمە دەگەڵ Traum (G.)، troum (OG.) و (Nl.)، dream (E.)، dram (OF.) گشتیان بە مانای "خەون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ وشەیەکی دیکەی ژێرمەنی [دە ئاڵمانیدا trügen (G.)] بە مانای "فریو دان". ئەم وشەیەش خۆی دەبێتە خزم دەگەڵ وشەی کوردمادی ↑درۆ dıro [یان درەو dırew] "ناڕاست"، سەر بە ریشەی < *dhreugh- (IE.)* "خەون، فریو، درۆ".

**ترپان tırpan** [ *tırpān* ] - "مەڵەغان، داسی دەسک درێژ": خزمە دەگەڵ treffen (G.)، drepan (OE.)، drepa (OIs.) "پێکگەیشتن". ئەم وشە ژێرمەنییانە دە بنچینەدا بە مانای "لێدان، وێککەوتن، لێکدران" بوون و ئەم مانایە دە زمانەکانی دیکەدا باشتر دەبینرێ، بۆ وێنە ga-drapan (Gt.) "کوتانەوە"، drobit (Rus.) "ورد کردن". خزمە دەگەڵ ↑دروون dırûn [گیادروون]، ↑دروێنە dırwêne [درو derou (P.)]، ↑درباشە dırbaşe "زەرگ، شیشی دەروێشان"، ↑درپشە dırpşe یان درەوشە drewşe "درێشە، کونکەری پینەچی" [درفش derafš (P.)]، ↑دربۆ dırbo "وشەی دنە دانی بەران بۆ شەڕەقۆچ"، ↑سرەواندن sırewandın "لێدان، کوتان". دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکە بەرچاو دەکەوێ کە ئەم خزمایەتییەی سەرەوە ئاشکرا دەکا و ئەویش ↑تەراف teraf کردنە بە مانای

"بڕینی باغ، هەڵپەرتاوتنی ڕەز". جگە لەمە زەرپ zerp و ↑زەرپاندن zerpandın هەیە بە مانای "لێدان، کوتان". هەروەها ئەم وشانەی خوارەوەش پێوەندییان بەم خێزانەوشەوە هەیە: ↑تەرپلین terpılîn "ساتمەبردن، هەڵەنگوتن، ڕەت بردن" [دەبنەڕەتدا: وێککەوتنی پێ و بەردی سەر ڕێ]، ↑درف dırıf "نیشانە، عەلامەت، لۆگۆ" و ↑درۆشم dıruşım "شیعار، شوعار" [دە بنەڕەتدا: نیشانە، شەقڵ]. لێرەدا بلا بزانین چۆن "درف" و "درۆشم" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. دە بنەڕەتدا درف و درۆشم هەر یەک وشەن بوون. دە زمانی فارسیدا باس لە درفش کاویانی derafš e kāwynī (P.) دەکرێ کە مەبەست ئاڵا یان نیشانەی سەر ئاڵای کاوەی ئاسنگەر بووە. ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی لێکەوتۆتەوە، یەکەمیان "درف" و دووەمیان "درۆشم". دیارە مەبەست لە "درۆشم" سەرەتا هەر نیشانە یان نیشانەی سەر ئاڵا بووە، چونکوو دە کوردمادیدا دەڵێن "درۆشم هەڵگرتن"، واتا نیشانەیەک یان ئاڵایەک وەک نیشانە هەڵگیراوە. وەک لەسەرەو بینیمان دە زمانی فارسیدا درفش derafš (P.) دوو مانای هەیە، یەکەمیان بە کوردمادی دەبێتە "درپشە، درەوشە، درێشە" و دووەمیان دە کوردمادیدا دەبێتە "درف" واتا "نیشانە، عەلامەت، لۆگۆ". ئەو مانایانە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان دەگەڵ یەکتر هەیە. هەر وەک چۆن *شەقڵ* "وێنە، عەلامەت" و *سکە* [دە بنەڕەتدا وێنەی سەر پارە] پێوەندیان بە وشەکانی وەک "شکاندن، چەقۆ"وە هەیە، هەر وەک چۆن *تیپ* "وێنە، شێوە، حەرف" پێوەندی بە "تەپان، تەور، تۆپ و تفەنگ"ەوە هەیە، هەر بەم جۆرەش "درف" پێوەندی هەیە بە "ترپان، درپشە، درباشە"ەوە. ئەگەر سەیری هەموو ئەو وشانە بکەین، دەبینین کە گشتیان لە یەک چەمکدا هاوبەشن و ئەویش چەمکی "لێدان، کوتان"ە. جا لەبەر ئەوەی وێنە، شێوە، شەقڵ، حەرف و عەلامەت بە هۆی لێدان و کوتان لەسەر دار و بەرد و ئاسن چێ کراون، ئیتر ئەمە بووەتە هۆی دروست بوونی پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک لەتیوان ئەو وشانەی باس لە "کوتان و لێدان" دەکەن و ئەو وشانەش کە باس لە "شەقڵ و عەلامەت" دەکەن. هەر لە درێژەی ئەم باسەدا پێویستە ئاماژە بە دوو وشەی دیکەش بکەین کە پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە بریتین لە ↑درووب dırûb [درووڤ dırûv] "وێچوون، هاوشێوەیی"، درووباندن dırûbandın "وێچواندن، شباندن، شوبهاندن" و هەروەها ↑درڤ dırıf بە مانای "ڕەگەز، بنەچەکە". وەک باسکرا، "درف" دە بنەڕەتدا بە مانای "شەقڵ، وێنە، شێوە، نەخش و نیگار" بووە، پاشان لەوێوە مانای "نشانە، عەلامەت" سەری هەڵداوە. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر مانای بنەڕەتی، ئەوسا دەردەکەوێ کە دیسان لەم مایایەوە مانای "هاوشێوەیی، شێوەی یەکتر دان" سەرچاوەی گرتووە. دە زمانی کوردمادیدا دەتوانین بڵێین "ئەو کیژە وێنەی دایکییەتی، (بە) شێوەی دایکی قسە دەکا"، هەروەها دەشتوانین بڵێین "ئەوکێژە هاوشێوەی دایکییەتی، وەک دایکی قسە دەکا". ئیتر لێرەوە دەردەکەوێ کە دوو چەمکی "وێنە، شێوە" دەگەڵ "وێکچوون، هاوشێوە بوون" پێوەندی تەواویان هەیە. لەمە سەرنجراکێشتر، وشەی ↑درڤ dırıf ە بە مانای "ڕەگەز، بنەچەکە". ئاخۆ پێوەندی ئەم وشەیە بە وشەکانی سەرەوە چۆنە؟ بۆ ڕوون بوونەوەی ئەم پێوەندییە پێویستە دیسان کەوانەیەک بکەینەوە و تێبینییەک بخەینەڕوو.

[وەک لەسەرەوە باسکرا وشەی تیپ type دە بنەڕەتدا بە مانای "شەقڵ، وێنە، نیشانە"یە و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان". لەم مانایەی سەرەوە، واتا "شەقڵ، شێوە" دواتر مانای "نەوع" سەری هەڵداوە، واتا "تیپ" بە دەستەیەک لە تاکەکان گوتراوە کە هاوشێوەیی، پێکیانەوە گرێ دەدا. بەم جۆرە "تیپ" یان "نەوع" مانایەک لەچەشنی ڕەگەز پەیدا دەکا [نەوعێک ئاژەڵ، ڕەگەزێک لە مرۆڤ]. وشەیەکی دیکە کە لەم پێوەندییەدا جێی ئاماژەیە، وشەی kind (E.) دە زمانی ئینگلیزیدایە بە مانای "تەرز، جۆر، شێوە". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Kind (G.) "زارۆک" و kind (OIs.) "ڕەگەز، بنەچەکە". ئەم وشانەش پێوەندی ئێتیمۆلۆژی لە تێوان دوو چەمکی "شێوە" و "ڕەگەز، بنەچەک" بە تەواوی دەردەخەن. هەروەها دیسان سەبارەت بە پێوەندی ئێتیمۆلۆژی تێوان دوو چەمکی "لێدان، کوتان" و "ڕەگەز" دەتوانین ئاماژە بە وشەی Geschlecht (G.) بکەین، کە دە زمانی ئەڵمانیدا مانای "ڕەگەز، تیرە" دەدا و خزمە دەگەڵ schlagen (G.) "لێدان" و دەگەڵ شەللاق şellaq ی کوردمادی].

**ترپە tırpe** [ *tırpa* ] - "دەنگی کەوتنی شتی قورس، دەنگی پێ": ریشەی وشەکە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ دەگەڕێتەوە. هەر لەم ریشەوە دە زمانی ئاڵمانیدا Treppe (G.) "پلیکان" و trappen (G.) هەیە بە مانای "رویشتنی بە تەپەتەپ" یان trippeln (G.) "پێ لە هەرد کوتان ".

**ترترک tırtırık** - "ستۆگرک، لوولەی ناو گەروو": جگە لەم وشەیە↑ ترترۆک tırtırok یش هەیە کە بە دوو مانای "ستۆگرک" و "پارچەیەک لە ریخۆڵە" بەکاردەهێنرێ. هەروەها ↑ترترە tırtıre هەیە کە ناوی گیایەگە لە سەوزی دەهاڵێ. گشت ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "سووڕان، لوول خواردن، پێچ خواردن" دەکەن و خزمن دەگەڵ تلین و ↑تلاندن tılandın سەر بە ریشەی **< *ter- (IE.)** "سووران، با دران". شیاوی باسە کە هەروەک ترترۆک tırtırok ی کوردمادی بە مانای "ریخۆڵە"، دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا وشەی "ریخۆڵە" هەر لەم ریشەوە دێ: Darm (G.)، darm (Nl.)، tarm (Sw.)، dearm (OE.) "ترترۆک، ریخۆڵە" [دە بنچینەدا واتا بادراو یان لوولدراو].

**ترترۆک trtrok** [ *tırtırok* ] - "1- ستۆگرک 2- پارچەیەک لە ریخۆڵە": ↑ترترک tırtırık.

**ترترە tırtıre** [ *tırtıra* ] - " گیایەکە لە سەوزی دەهاڵێ": خزمە دەگەڵ ↑ترترک tırtırık.

**ترخێنە tırxêne** [ *tırxena* ] - "1- شەلەمین، چێشتی شێلم و دان 2- گووشلەی زارۆک": دەشێ ئاماژە بە رەنگی تەڵخ و ناروونی شتەکە بکا و خزم بێ دەگەڵ ↑تەڵخ telx و ↑تار *tar*.

**ترس1 tırs** - "دڵەراوکێ، سڵەمینەوە": دە فارسیدا ترس ters (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ diržti (Lit.) و terrēre (L.) "ترسان، داچڵەکین". ریشە؟

**ترس2 tırs** - دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا دەگوترێ "نانی بترسی دەخۆم" واتا نانی بە هیشکی دەخۆم [نانی هیشکی، بێ پێخۆر]. ترس tırs خزمە دەگەڵ trocken (G.)، droog (Nl.)، dry (E.)، dryġe (OE.) "هیشک، وشک". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *drugi- (Grm.). بە پێی بۆچووتێک ئەم ڕیشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *dher- (IE.)** "راگرتن، وەستاندن" و لەم مانایەوە پاشان ماناکانی "خۆگرتوو، سفت، ڕەق و هیشک" سەریان هەڵداوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکەشمان هەیە کە لەوانەیە خزمایەتی دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە هەبێ. ئەم وشەیە بریتییە لە ↑چرووسان(ەوە) çırûsan(ewe) "لەڕ و لاوازبوون لەبەر رەنج و ئازاری زۆر". مەبەست لە چرووسانەوە دەتوانێ دە بنەڕەتدا سیس و هیشک بوون بووبێ.

[تیبینی 1: دە فەرهەنگە ئیتیمۆلۆژییە ئەڵمانییەکاندا باس لە ریشەیەکی هیندوئەورووپی دیکە دەکرێ، واتا ریشەی *ters- (IE.) "هیشک بوون، هیشک هەڵاتن". وشەی "تینوو" بۆ وێنە لەم ریشەوە هاتووە. بەڵام لەو فەرهەنگانەدا ئاماژەیەک بەوە نەکراوە کە ئەو وشە ژێرمەنییانەی سەرەوە پێوەندییان بەم ریشەوە هەبێ.
تیبینی 2: بەرانبەری فۆتیمی g ی ژێرمەنی دە وشە کوردمادییەکاندا زۆرجار فۆتیمەکانی س s، ش ş یان ز z خۆ نیشان دەدەن، وەک لە وشەکانی وەشان [راوەشان]، بێشکە، بزوان، باسک، بازنە و هیتردا].

**ترش tırş** [ *tırš* ] - "یەکێک لە مەزەکان کە بەهۆیە دەم وێک دێ": ترش torš (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ trocken (G.)، droog (Nl.)، dry (E.)، dryġe (OE.) "هیشک، وشک". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *drug- (Grm.). بەراوردی ئەم وشەیە بکە دەگەڵ ↑ترس2 tırs دە [نانی بترسی واتا نانی بە هیشکی]. شیاوی باسە دە زمانی ئەڵمانیدا بەو جۆرە لە شەراب کە مەزەکەی ترشە، دەگوترێ trocken، کەچی ئەم وشەیە خۆی مانای "هیشک" دەدا. وێ دەچێ هەر لە کۆنەوە پێوەندییەک لەتیوان مەزەی ترش و هیشک بووندا بەدی کرابێ. لەوانەیە مەبەست هەست کردن بە هیشک بوونی زمان بێ بەدوای خواردن یان خواردنەوی شتی ترشدا؟

**ترشتە tırışte** [ *tırıšta* ] - "تەشوێی بەننایی": تریشتە tırîşte ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تراشین tıraşîn .

**ترفاڵ tırfal** [ *tırfāl* ] - "تڵپی دانەی رۆن لێگیراو": خزمە دەگەڵ Treber (G.)، draf (Nl.)، draff (E.)، droba (Rus.) "تڵپی بەجێماو لە ترێ گوشین و هتد "، سەر بە ریشەی **< *dher- (IE.)** "تلپە، تڵتە، خڵتە". trüb (G.)

"لێڵ" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا لەم ریشەوە هاتوون. ↑تلپە tılpe ش شێوەیەکی دیکەیە لەم وشەیە.

[تێبینی: ئەم ریشەیە وێ دەچێ دە بنەڕەتدا دەگەڵ ریشەی سەرەوەتر واتا -dher* (.IE) "راگرتن، وەستاندن" هەر یەک بێ. وەک لە سەرەوە باس کرا، لە مانای "راگرتن، وەستاندن"ەوە پاشان ماناکانی "خۆگرتوو، سفت، ڕەق و هیشک" سەریان هەڵداوە. ئەم مانایانەش دەگەڵ مانای "ترفاڵ و تڵپە" تا رادەیەکی زۆر یەک دەگرنەوە].

**ترکاندن tırkandın** [ *tırkāndın* ] - "پێکانی نیشانە": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەترکاندن vetırkandın]. هەروەها ڤەترکان vetırkan هەیە بە مانای "پێکران". لەوانەیە مەبەست "بە تیر لێدان" بێ و لەم تیڕوانینەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- ↑ تیرا 1 tîr.

2- ↑تیرە² tîre "خەت، هێڵی تیوان".

**ترنجان tırıncan** [ *tırınjan* ] - "تیوەچوون بە گوشار": خزمە دەگەڵ dringen (.G) و (.Nl)، dringan (.OE) "زۆر بۆ هێنان، بە زۆر تینان، بە گوشار رێگە کردنەوە بە ناو شتیکدا". ئەم وشە ژێرمەنییانە بە خزم دانراون دەگەڵ drücken (.G)، drucchen (.OG)، drukken (.Nl)، đryccan (.OG) "گوشار دان، زەخت خستنەسەر"، سەر بە ریشەی **< -ter* (.IE)** "باد دان". دە زمانی کوردمادیدا دەشگوترێ: "بە جیرە (بە) بادان تینان" واتا بە زۆر و بە گوشار تینان.

**ترنجۆ tırınco** [ *tırınjo* ] - "تیخی تیژ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ترنجان tırıncan. ئەم کردارە مانای "چوونە ژووری بە گوشار" دەکا. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە دەگوترێ واتا Die Kugel drang ihm ins Herz "گوللەکە دڵی کون کرد".

**ترنگ1 tırıng 1** - "پلەو پایە": وەرگیراوە لە thronos (.Gr) "جێی دانیشتن، تەختی فەرمانڕەوا".

**ترنگ2 tırıng 2** - "پتە، پڵتۆک": دە فارسیدا تلنگر telenger (.P). لەوانەیە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑ترنجان tırıncan "تیوەچوون بە گوشار". "ترنجان" و وشە خزمەکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا چەمکی"زەخت، گوشار، پاڵەپەستۆ" دەگرنە خۆ و ئەم چەمکەش پێوەندی بە پتە و زەبرەوە هەیە. لەم تیڕوانینەوە "ترنگ" دەتوانێ دە بنەڕەتدا بە مانای "پاڵ، گوشار" بووبێ.

**ترنوسقاو tırnusqaw** [ *tırnusqāw* ] - "چەورایی سەر شۆرباو": چرنوسقاو çırnusqaw یش دەگوترێ. کەرتی تر -tır جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑تۆڵ tol "توند، سفت ".

2- ریشەی **< -dher* (.IE)** "راگرتن، وەستاندن". لەم مانایەوە پاشان ماناکانی "خۆگرتوو، سفت، ڕەق و هیشک" سەریان هەڵداوە [بڕوانە ترس2 tırs "هیشک" و ترفاڵ "تڵتە"].

کەرتی دووەمی وشەکە، واتا نووسقاو -nusqaw جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑نووسان nusan [پێکەوە نووسان].

**تروسکە tıruske** [ *tıruska* ] - "تیشک": تریسکە tırîske ش دەگوترێ. تروس/ تریس + کە tırîs / tırus + ke. بنەوشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تیرێژ tîrej و خزمیشە دەگەل ↑درەوشانەوە dırewşanewe.

**ترومپا tırumpa** [ *tırumpā* ] - "ئامرازی ئاو لە بیر دەرخستن": تلمبە tolombe (.P). مەبەست لە وشەکە دەبێ دە ئەسڵدا "لوولە، لوولک" بێ، خزمە یان دەچێتەوە سەر trompe (.OFr) "ترۆمپێت، زوڕنا". ئەم وشەیەی زمانی فەرانسەیی خزمە دەگەڵ Trommel (.G) ، trumba (.OG) "تەپڵ". دە بنەڕەتدا بە جۆرەتەپڵێک گوتراوە کە قەوارەیەکی لوولەیی یان ئوستووانەیی [وەردێنەیی] هەبووە کە هەدووک لای کەوڵی گوێلکی بەسەردا کیشراوە. Trommel دە زمانی ئەمرۆی ئەڵمانیدا هەروەها بەم مانایانە بەکار دێ: تیکەیەک لە دەزگا یان ئامرازێک کە شێوەیەکی وەردێنەیی هەبێ، دەفرێک کە شێوەیەکی ئوستووانەیی هەبێ. دە ئەڵمانی ناویندا trumbel (.MG) بەکار هاتووە. وشەی ↑ترۆمبێل tırombêl "ماشێن، سەیارە" دەشێ و رەنگە دە بنەڕەتدا

ئاماژە بە "سیلەندر"ی ماشێن کرابێ. ریشەی ئەم وشەیە لاسا کردنەوەی دەنگێ دیاری کراوە. خاڵێکی دیکەی سەرنجراکێش ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑تولوم tulum بە مانای "تەپەڵ" هەیە کە دەگەڵ وشە ئەڵمانییەکانی سەرەوە بە مانای "تەپڵ" رێک دەکەوێ.

**ترووشکان tırûşkan** [ *tırūškān* ] - "لەسەر چینچک دانیشتن": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ driusan (Gt.) و dreosan (OE.) "کەوتن"، drūsian (OE.) "نەوی بوون، چوونەخوار، لەهێز کەوتن، داکەوتن". لەوانەیە وشەی↑ترووکان [ی چاو] tırukan یش دە بنچینەدا بە مانای "داکەوتنی پێلووی چاو" هاتبێ. هەروەها دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑درۆزە dıroze "گەدایی".

**ترووکان tırukan** [ *tırūkān* ] - "لێکنانی چاو":

1- لەلایەکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑ترووشکان tırûşkan.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین هەڵیسەنگینین دەگەڵ drücken (G.)، drucchen (OG.)، drukken (Nl.)، đryccan (OG.) "گوشار دان". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تلان tılan و سەر بە ریشەیەک بە مانای"سووران، با دان".

**ترووکاندن tırukandın** [ *tırūkāndın* ] - "شکاندنی توێکڵە تۆو بە ددان":

1- لەوانەیە هەروەک ↑دەرز derız و ↑دڕاندن dırandın و هێندێک وشەی دیکە بچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دڕاندن، لێک جیا کردنەوە، قەڵشاندن".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ drücken (G.)، drucchen (OG.)، drukken (Nl.)، đryccan (OG.) "گوشار دان". چ

**ترووکە tıruke** [ *tırūka* ] - "رووناکی بە ئاستەمی ئاگر و چرا": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ترووسکە tıruske "تیشک" و ↑تیرێژ *tîrej*.

**ترۆ tıro** - ترۆ کردن واتا "دەرکردن بە سووکایەتی". خزمە دەگەڵ ↑تەرە tere "دوورخراو، دەرکراو".

**ترۆپک tıropk** - "دوند، لووتکە": چلۆپک çılopk یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ straff (G.) "شەق، لەبەریەک کێشراوە"، strabben (MG.) "لەبەریەک کێشانەوە"، streben (G.) "هەوڵ و تەقەلای زۆر دان"، streben (OG.) "هەڵکشان، لەبەر یەک کێشرانەوە". دە وشە کوردمادییەکەدا فۆنیمی s سواوەتەوە. ئەم وشەیە هەروەها هەڵسەنگێنە دەگەڵ ↑زراڤ zırav "باریک و بڵند". هەروەها بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑تلۆڤە tılove "قەڵاقووچکە".

**ترۆزی tırozî** [ *tırozī* ] - "خیارچەمبەر، چەمیلە": ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ter- >*** "سووڕاندن، با دان" . دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەک ↑تلاندن tılandın، ↑ترتڕە tırtıre. هەروەها دەتوانین دەگەڵ torquere (L.) "سووڕاندن، با دان" هەڵیسەنگێنین. لەو باوەڕە دام وشە لاتینییەکەش هەر لەم ریشەیەوە هاتبێ.

**ترۆقان tıroqan** [ *tıroqān* ] - "تۆقین": شێوەی پێشووتری ↑تۆقین toqîn. [دە وشەی "تۆقین"دا فۆنیمی r سواوەتەوە].

**ترۆمبێل tırombêl** [ *tırumbel* ] - "ماشێن، سەیارە": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑ترومپا tırumpa.

**ترەختان tırextan** [ *tıraxtān* ] - "چوارناڵە": خزمە دەگەڵ ↑ترات tırat و تراتین tıraten.

**ترەکین tırekîn** [ *tırakīn* ] - "درز بردن، قەڵشان، بێچوو هێنانی سەگ": ترک terek (P.) واتا "درز، قەڵش". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑درز dırız (دەرز) و دڕان (↑دڕاندن dırandın).

**ترياك tıryak** [ *tıryāk* ] - "مادەیەکی سڕکەر": تلیاک tılyak یش دەگوترێ. بەپێی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 339) وشەکە ریشەی یۆنانی هەیە و ماناکەی دەبێتە "دژەژەهر"، دە لاتینیدا بووەتە thēriacus (L.) و لەوێشەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان و زمانی دیکەشەوە. بنجی وشەکە thēr وەک "ئاژەڵی وەحشی، دڕندە" مانا کراوەتەوە و مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "ئەو شتەی لە ئاژەڵی وەحشی بە دەست دێ".

[تێبینی: من بەش بە حاڵی خۆم دڵم زۆر لەم شیکردنەوەیە ئاو ناخواتەوە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Droge (G.) و drogue (Fr.) "دەرمان، داو دەرمان" [هەروەها "مادەی سڕکەر"]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ trocken (G.) "هیشک". ڕیشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. مەبەست لەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا "مادە و گژ و گیای هیشککراو" بووە کە وەک داو و دەرمان بەکار هێنراوە].

**تریان(ە) tıryan(e)** [ *tıryāna* ] - "قەرتاڵە": ↑توولینە tulîne و تەریان teryan یش دەگوترێن.

**تریت tırît** [ *tırīt* ] - "تیگوشین، نانی دە شۆرباودا تەڕکراو": تلێت tılît یش دەگوترێ. تریت tarīt (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەڕ ter و↑تلیسانەوە tılîsanewe. تریت/ تلێت بەو نانە دەگوترێ کە دەناو شۆرباودا تەڕ دەکرێ و دەتلیسێتەوە.

**تریسکان tırîskan** [ *tırīskān* ] - "1- دەرپەڕین و تەرە بوون 2- لەبەر چاو ون بوون": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەتریسکان vetırîskan]. خزمە دەگەڵ ↑تەرە tere بوون. کەرتی sk لەناو وشەکەدا ناوگری جەخت کردنە.

**تریشقە tırîşqe** [ *tırīšqe* ] - "برووسکە": تریشکە tırîşke ش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە تریسکە/ ↑ترووسکە tırîske /tıruske.

**تریفە1 tırîfe** [ *tırīfa* ] - "تیشک (ی مانگ)": خزمە دەگەڵ streif(en) (G.)، stripe (MNl.) "خەت، نەوار، تیرە" [بە گشتی شتی باریک و درێژووکە]، strib (OIr.) "هێڵ، نەوار، تیشک " [فۆتیمی s دە وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە]. دە سەردەمانی بەرێدا مرۆڤ وای بیر کردۆتەوە کە تیشک لە هێڵ و تیرۆکەی باریک پێک هاتووە یان بەهۆی ئەو تیرۆکانەوە بەملا و ئەولادا بڵاو دەبێتەوە. خزمە دەگەڵ ↑درەوشانەوە dırewşan(ewe)، ↑ئەستێرە astere [e-stere]، ↑ئەستێرین estrîn [e-sıtrîn، سترین]، ↑تراشین tıraşîn و چەندین وشەی دیکە.

**تریفە2 tırîfe** [ *tırīfa* ] - "لوو لەناو گۆشتدا، نەخۆشییەکی ڕەشەوڵاخە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ derb (G.)، derp (OG.)، đeorf (OE.)، Þjarfr (OIs.) "سفت، ڕەق، پتەو، زبر، چیڕ"، سەر بە ڕیشەی < *(IE.) *(s)terp-* "سفت بوون". ئەم ڕیشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ڕیشەی < *(IE.) *(s)ter-* "سەخت، چیڕ، ڕەق". خزمە دەگەڵ ↑چیڕ çîr و چەندین وشەی دیکە.

**تریقە tırîqe** [ *tırīqa* ] - "دەنگی پێکەنینی بەرز": خزمە دەگەڵ ↑تڕ tır [دە بنچینەدا واتا دەنگی توند].

**تریکە tırîke** [ *tırīka* ] - "زریکە، قیژە": خزمە دەگەڵ ↑تریقە tırîqe.

**ترینە tırîne** [ *tırîna* ] - "دۆڵاش": هەروەک چۆن "دۆڵاش" پێوەندی بە "دۆڵ"ەوە هەیە، وێ دەچێ "ترینە"ش پێوەندی بە ↑دەرە dere وە هەبێ [دۆڵ و دەڕە].

**ترێ tıre** [ *tıre* ] - "هەنگۆر": ترە tıre ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Traube (G.) "ترێ". ڕیشەی وشە ئاڵمانییەکە بە دڵنیاییەوە ساخ نەکراوەتەوە. دە هێندێک دیالێکتی کۆن و نوێی زمانی ئاڵمانیدا وشەی لە چەشنی trauppen بەمانای "حەشیمەت، هێشوو، کۆگا" هەیە و گومان دەکرێ وشە ئاڵمانییەکان پێکەوە هاوڕیشە بن.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Truppe (G.) هەیە بە مانای "لەشکر، قۆشەن" (ژمارەیەکی زۆر سپایی). ئەم وشەیە لە زمانی فەرانسەیی - troupe (Fr.) - وەرگیراوە و ڕیشەکەی ساخ نەکراوەتەوە. وێ دەچێ ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی هێشوو hêşû -خوشە xūše (P.)- و قۆشەن qoşen - قشون qošūn (P.)- دە زمانی کوردمادیدا کە هەر دووکیان لە ڕیشەیەکەوە هاتوون].

**تزان tızan** [ *tızān* ] - "دەرکەوتن یان کۆ بوونەوەی تەڕایی لە شوێنێکدا": [بۆ وێنە دەگوترێ: دەستم خوێنی تێ تزاوە، فرمێسک لە چاوم تزا]. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ئاوەدز awedız بوون هەیە بە مانای کۆ بوونەوەی تەڕایی دەناو بریندا. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ziehen (G.)، ziohan (OG.)، tiuhan (Gt.)، tēon (OE.)، ducere (L.) "کێشان"، سەر بە ڕیشەی < *(IE.) *deuk-* "کێشان، ڕاکێشان". مەبەست لە تزان یان "دزین"ی تەڕایی "کێشان"ی تەڕاییە و پێوەندی بە "دزین"ی ماڵ و نەوت و سامانی خەڵکەوە نییە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆق toq و دە زمانانی دیکەشدا دەگەڵ چەندین وشە لەوانە Zug (G.) "قەتار"، Herzog

(G.) "دۆک، گراف" [دەبنەڕەتدا: سەرلەشکر، *ڕاکێشەری لەشکر*]، Dusche (G.) "دووشی گەرماو" [ڕاکێشەری ئاو] و هتد. ئەم وشەی دوایی لە زمانی فەرانسی وەرگیراوە و ڕیشەی لاتینی هەیە.

**تس tıs** - "بای سک": دە فارسیدا چس čos (P.). خزمە دەگەڵ ↑تۆز toz و گەڵێک وشەی دیکە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک کە ئاماژە دەکا بە هێندێک مانای وەک "تەپ و تۆز، دووکەڵ، هاڵاو، با، هەناسە". لەم بارەوە بۆ وێنە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ duša (Aslaw.) "هەناسە".

**تسقل tısqıl** - "قسقل، گزگل": کەرتەوشەی قل qıl یان گل gıl خزمە دەگەڵ ↑گلە gıle "دەنک، خڕێکی بچووک". دە وشەی "قسقل، گزگل"دا کەرتی یەکەمی وشەکە ئاماژە بە "چکۆڵە و ورد بوون" دەکا. بەم پێیە دەشی کەرتی تس پێوەندی بە ↑تازە taze ەوە هەبێ. ئەم وشەیەش دەشێ دە بنەڕەتدا ئاماژە بە پێکهاتوویەک بکا کە نها ڕسکاوە، نوێیە و هەر بۆیەش چکۆڵەیە، واتا وشەکە دە بنەڕەتدا مانای "چکۆڵە، نوێ ڕسکاو" بووە و لەمەوە مانای "تازە، نوێ" پەیدا بووە.

**تسیان tısyan** [ *tısyān* ] - دەگەڵ پێشگری "دا" دێ [↑داتسیان datısyan واتا داهاتن (ی نیزیک بە رووخان، دیوارەکە داتسیاگە]. خزمە دەگەڵ چەند وشە کە ئاماژە بە لای خوارەوە، نەوی بوون، تەخت بوون دەکەن، وەک پێشگری ↑*دا -da*، ↑تەشک teşk [تەشک و داوێن] و هتد.

**تشت tışt** [ *tıšt* ] - "کەلوپەل، بابەت، دۆز، کاروبار": دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا دەبێتە ↑شت şıt. دە زمانی فارسیدا چیز čiz (P.). خزمە دەگەڵ Sache (G.)، sahha (OG.)، zakk (Nl.)، sacu (OE.)، sak (Sw.) "تشت". ئەم وشە ژێرمەنییە دە بنەڕەتدا بە "تشت"ێکی تایبەتی گوتراوە، بە تشتێک کە بابەتی کێشەلەسەر و چەمکێکی دادوەری بووە، واتا بەو تشتە یان دۆزە گوتراوە کە بەدوادا چوونی بۆ کراوە، لێی کۆڵدراوەتە، دۆزینەوەی لەسەر کراوە. دواتر وشەکە مانایەکی گشتی وەرگرتووە و هەر وەک "تشت"ی کوردمادی بەکار هاتووە. وشەژێرمەنییەکان خزمن دەگەڵ ↑*دۆزین dozîn* دە زمانی کوردمادیدا. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑سەچتین seçtîn "پشکنین"، ↑سکاڵا sıkala "داد بردن، بەرز کردنەوەی کێشە" پێوەندیان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. وشەی ↑دۆسیە dosîye دەبێ وشەیەکی کوردمادی بێ و پێوەندی بە ↑دۆزین dozîn ەوە هەیە. تشت tışt شێوەیەکی کۆنترە لە دۆز doz، واتا ئەم دوو وشەیە و هەروەها دۆسیە dosîye دە بنەڕەتدا هەر یەکن. دیسان بەراوردێک بکە دەتیوان وشەکانی تشت tışt، چیز čiz (P.)، دۆز doz، دۆزین dozîn، دۆسیە dosîye، سکاڵا sıkala، سەچتین seçtîn و هتد.

**تف 1 tıf** - "ئاوی دەم": هەروەها وشەکانی تفین tıfîn و تفانەوە tıfan(ewe) ش وەک کردار بەکار دێن. خزمە دەگەڵ ↑تاوانەوە tawanewe "توانەوە، بوونە تراو، حەل بوون".

**تف 2 tıf** - "ئاگر، فەندەک": بڕوانە ↑تفک tıfık "کوانوو، ئاگردان".

**تفاق 1 tıfaq** [ *tıfāq* ] - "1- چەک 2- ئامراز، کەرەستە": زۆر جار دەگەڵ "چەک" دێ: چەک و تفاق çek û tıfaq. شێوەیەکی دیکەیە لە تفەک tıfek و ↑*تفەنگ tıfeng*، سەر بە کردار و ڕیشەیەک بە مانای "لێدان".

[تێبینی: مانای "ئامراز، کەرەستە" لە مانای یەکەمەوە سەرچاوەی گرتووە، واتا سەرەتا مەبەست ئامراز و کەرەستەی شەڕ بووە و لەمەوە مانای کەرەستە بەگشتی سەرچاوەی گرتووە. پێوەندییەکی لەم جۆرە دەتیوان دوو وشەی عەرەبی "جیاز" و "جیش"یشدا دەبینرێ کە هەردووکیان ڕیشەکەیان بۆ زمانی کوردمادی دەگەڕێتەوە].

**تفاق 2 tıfaq** [ *tıfāq* ] - "1- کا و گیای ماڵات بۆ زستان 2- ئازووقە": وەک لەژێر وشەکانی "لەوەڕ" و "ئاڵف"دا باس کراوە، ئەم دوو وشەیە کە بە یەکەوە خزمن، بۆ ڕیشەیەک دەگەڕێنەوە بە مانای "پچڕینەوە، لێکردنەوە، دادڕنین، بڕین(ەوە)". مەبەست لە "لەوەڕ" و "ئاڵف" گژ و گیایەک بووە کە دەپچڕێندرێ، دادەڕندرێ و لێ دەکرێتەوە. هەر بەم پێوانەیە ئەگەر سەیری وشەی "تفاق" بکەین، دەردەکەوێ کە ئەمەش پێوەندی بە بنجی تەپ -tep "لێدان"ەوە هەیە. لەم بارەوە بەتایبەتی هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تەپان tepan "تیلای گەڵا کوتان"،

↑تەور tewır [تبر tabar (P.)]، ↑تەپشۆ tepşo [تەوشوێ، تەشوێ] و هەروەها ژمارەیەک وشەی دیکە لەژێر ↑تەپ tep [4] دا. مانای "ئازووقە" لە مانای یەکەمەوە پەرەی گرتووە.

**تفت tıft** - دەگەڵ تاڵ دێ [تفت و تاڵ tıft û tal واتا تامی توند]. خزمە دەگەڵ ↑تاو2 taw "هەتاو". مەبەست تامێکی "سووتێنەر"ە.

**تفسک tıfsık** [ *tıfsık* ] - "هەنجیرە کێویلە": خزمە دەگەڵ تفی tıfî [↑توو tu].

**تفقی tıfqî** [ *tıfqī* ] - "قەڵەو، پڕگۆشت": خزمە دەگەڵ ↑تفسک tıfsık "هەنجیرە کێویلە"، تفی tıfî [↑توو tu]، دواتر ↑تاپاز tapaz "زەبەلاح" و ↑*توانین tuwanın* "بە هێز بوون".

**تفک tıfık** - "کوانوو، ئاگردان": هەروەها ↑تەفایە tefaye هەیە بە مانای "مەنقەڵی". خزمن دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑تاو taw [2] "هەتاو"دا باس کراون.

**تفنک tıfınk** - "لووت، دفن، کەپۆ": تونک tunık یش دەگوترێ، شێوەیەکی دیکە لە ↑دفن dıfın، سەر بە ریشەیەکە کە مانای "قووڵایی، قوڵکە" دەدا و دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک" و هێندێک وشەی لەم چەشنە یەک دەگرێتەوە.

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی "کەپۆ"ش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە کە ئەویش هەر مانای "قوڵکە، قووڵایی" دەدا].

**تفەنگ tıfeng** [ *tıfang* ] - "ئامێری گولەهاوێژ": تفەک tıfek یش دەگوترێ. تفنگ tofang (P.). هەروەها ↑دەمانچە demançe هەیە بە مانای "گولەهاوێژی بچووک" [کەرتی "چە" پاشگری گچکاندن؟]. وشەکە دە فارسیدا تەپانچە tapānče یە. بنجی ئەم وشانە *تەپ tep* [4] ە بە مانای "لێدان" کە دە گەلێک وشەی کوردمادیدا خۆی دەبینێتەوە، وەک ↑تەپان tepan "تێلای گەڵا کوتان"، ↑تەپاندن tepandn "کوتان بە لاق"، ↑تەپ tep دان "پەلامار دان"، ↑دەبان deb(b)an [خەنجەری دەبان]، ↑تاپڕ tapır "تفەنگی راو" و هتد. بۆ زانیاری زۆرتر هەروەها بڕوانە ↑تۆپ top. فۆتیمی p یان b دە وشەی "دەمانچە"دا گۆڕاوە و بووەتە m.

**تفنک tıfınık** - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑توانج tuwanc "تانە و تەشەر".

**تفیلک tıvîlık** [ *tıvīlık* ] - "کۆترەباریکە": تفیرک tıvîrık ش دەگوترێ. بنەوشەی تفی- tıvî خزمە دەگەڵ Taube (G.)، tūba (OG.)، dove (E.)، duva (Sw.) "کۆتر". وشەکە دە بنچینەدا ئاماژەیە بە رەنگی بۆر یان ئاماڵ رەشی پەڕەوڵەکە و خزمە دەگەڵ ↑تۆز toz، ↑توومان tuman و ↑دووکەڵ dukel و هتد.

**تکا tıka** [ *tıkā* ] - "خواهیش کردن، پاڕانەوە": خزمە دەگەڵ ↑تووک tuk "دووعا و پاڕانەوە".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا هەردووک وشەی beten "دووعا کردن" و bitten "تکا کردن" لە یەک ریشەوە دێن].

**تکان tıkan** [ *tıkān* ] - "چۆڕان، دڵۆپە کردن": دە فارسیدا چکیدن čekīdan (P.). خزمە دەگەڵ siekern (G.) و sicerian (OE.) "تکان، دەڵاندن"، seihen (G.)، sihan (OG.)، sion (OE.)، sia (OIs.) "پاڵاوتن، چۆڕاندنەوە"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *sei-*** "تکانەوە، چۆڕان".

**تل 1 tıl** - "خول، سووڕ": ↑تلان tıland.

**تل 2 tıl** - "ورگ": دەشێ دە بنچینەدا بە "ریخۆڵە" گوترابێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ترترۆک tırtırok "پارچەیەک لە ریخۆڵە". خزمە دەگەڵ ↑*تلان tılan "سووڕان"* و Darm (G.) "ریخۆڵە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران".

**تلاسان tılasan** [ *tılāsān* ] - "لەرێگە کلا بوون": خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan و تڵاندن سەر بەریشەیەک بە مانای "سووڕان". تلاسان بەر دانی رێگە و"با دانەوە" بە لایەکدایە. هەروەها ↑تراسکە tıraske هەیە بە مانای "لە رێ لا دانی بارەبەر"

**تلان tılan** [ *tılān* ] - "سووڕان، گەوزان": تلین tılîn ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ drehen (G.)، draaien (Nl.)، drawan (OE.) "سووڕاندن" سەر بە ریشەی < ***(IE.) *ter-*** "سووڕاندن، پڕیواندن، سمین". terere (L.) "سووڕاندن" و tornos (Gr.) "پەرگار، تەوەرە" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە

لەم خێزانەدا جێ دەگرن وەک: ↑ترترە tırtıre، ↑تروزی tırozî، ↑تەرسە terse "پێچەوانە، وەرسووڕاو"، ↑تراز tıraz "جەر و مەنگەنە"، ↑تلاسان tılasan "لە ڕێگە کلا بوون"، ↑تراسکە tıraske "لە ڕێ لادانی بارەبەر"، ↑دولاب dulab "1- چەرخی ئاوکێشان 2- خەرەک 3- تۆپی ئاش"، ↑دۆڵ2 dol "1-خلۆر، گلۆر 2- گاسنی سەر چەماو" و هتد.

**تلپە tılpe** [ *tılpa* ] - "تلتە، خلت و خاڵ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ trüb (.G)، droef (.Nl)، drof (.OE) "لێل، شلوێ"، سەر بە ریشەی **<** *dher-* (*IE.*) "تلتە، خلتە و خاڵ".

**تلتە tılte** [ *tılta* ] - "تلپە": خزمە دەگەڵ درد dord (.P) "تلتە، خلتە". لەوانەیە دە گەڵ ↑تلپە tılpe بچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەکی هاوشێوە دەبیندرێ، وەک dreg (.E) [پێشتر: dredges]، dreggjar (.ON) "تلتەی شەراب" [ئەم وشەی دوایی لە "دۆخی کۆ"دایە]. ریشەی ئەم وشەیە باس نەکراوە. لەوانەی پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ.

**تلژین tıljîn** [ *tılžīn* ] - "هەڵبژاردە": هەروەها تل tıl هەیە بە مانای "هەڵبژاردە". لەوانەیە "تلژین" دە بنەڕەتدا چاوگێ بووبی و دەگەڵ ↑تلیشاندن tılîşandın و هێندێک وشە بە مانای "(لێک) جیا کردنەوە". [بنجی "بژار" یان "وەژار"یش لە وشەکانی هەڵبژاردن و هەڵوەژاردندا ئاماژە هەر بەم مانایە دەکا. شتێک یان کەسێکی هەڵبژاردە لە راستیدا لە ئەوانی دیکە جیا کراوەتەوە].

**تلۆڤە tılove** [ *tılova* ] - "بەسەر یەکدا هەڵچنراو، قەڵاقووچکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ترۆپک tıropk "دوند، لووتکە".

**تلۆق tıloq** - "بلۆق": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە "ماسین، ئەستوور بوون، بە هێز بوون" دەکەن، وەک ↑تلی tılî، ↑تبل tıbıl "قامک"، ↑دومەڵ dumel و ↑*توانین tuwanîn*. جێی ئاماژەیە کە وشەی "بلۆق"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ماسین، با کران".

**تللۆر tıllor** - تللور بوونەوە واتا "گلۆر بوونەوە، تل خواردن". خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan.

**تلۆل tılol** - "قوڕ و چلپاو، لیتە": هەروەها ↑تلۆلۆک tılolok هەیە بە مانای "هەڵوا بە ئاردی برینج". دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **<** *dher-* (*IE.*) "تلپە، تلتە، خلتە" و خزم بێ دەگەڵ ↑ترفاڵ tırfal [↑تلپە tılpe].

**تلۆلۆک tılolok** - "هەڵوا بە ئاردی برینج": خزمە دەگەڵ ↑تلۆل tılol "قوڕ و چلپاو، لیتە".

**تڵ(ە) tıl(e)** [ *tıl(a)* ] - "1- سووتانەوەی برین 2- گڕپە و بڵێسەی ئاگر": [تڵەتڵی tıletıl ئاگر]. بە هەر دوو ماناوە پێوەندی هەیە بە ↑تڵەکاندن tılekandın "تەکان دانی توند". گڕپە و بڵێسەی ئاگر شتێکە لە راتڵەکاندایە و هەروەها برینی قووڵ و تازەش خۆی رادەتڵەکێنی، واتا چڵان دەدا.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی "برین" و "راتڵەکان" بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "ژان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "ژەنین" و "ژەندن" و مانای "لێدان، لێکدان" دەبەخشێ. ژان ئێشێکی تایبەتییە، واتا ئەو ئێشەیە کە بە دوای یەکدا لێ دەدا و دەچڵەکێ].

**تڵەکاندن tılekandın** [ *tılakāndın* ] - " ڕاتڵەکاندن واتا تەکان دانی توند": شێوەیەکی دیکە لە چڵەکاندن çılekandın [↑چەڵەکین çılekîn "ڕاچڵەکین"].

**تلیا tılya** [ *tılyā* ] - "ئاسوودە، راحەت": خزمە دەگەڵ ↑تلین tılîn "هێشتن، هێڵان".

**تلی tılî** [ *tılī* ] - "قامک": هەروەها تلەک tılek هەیە بە مانای "قامکەوانە". خزمە دەگەڵ Dolle (.G) و thole (.E) "داری سەوڵ پێ ڕاگرتن" و týlos (.Gr) "قیتکە، داردەست، مێخ" و هەروەها دەگەڵ ↑تبل tıbıl "قامک".

**تلیت tılît** [ *tılīt* ] - "تیکوشین": ↑تریت tırît.

**تلیسانەوە tılîsanewe** [ *tılīsānawa* ] - "زۆر تەر بوون": خزمە دەگەڵ ↑تەر ter. [تڵ + یس + ان + ەوە]. کەرتی "تڵ" شێوەیەکی دیکەیە لە "تەر". کەرتی "ئیس" îs لێرەدا وەک ناوگر دێتە کایەوە و خزمە دەگەڵ پاشگری↑ ئۆز oz- و هاوشێوەکانی کە دە گەلێک وشەی کوردمادیدا وەک پاشگری جەخت کردن خۆ نیشان دەدەن، وەک ئاڵۆز، بزۆز، تەکووز، چلێس، چکۆس، قرنیس و هتد.

**تلّیشان tılîşan** [ *tılīšān* ] - "دڕان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ڕیشەی *(IE.) *del(ə)- >* "قەڵشاندن، هەڵقەندن (لەسەر دار و بەرد)، لەت کردن، کوتان". هێندێک وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا لەم ڕیشەوە پەیدا بوون، وەک dāláyati (OIn.) "دەقەڵشێنێ"، dolare (L.) "کوتان"، dilti (Lit.) "سوانەوە، هەڵکڕان"، tal (Armen.) "شەقڵ، مۆر" [هەڵکەندراوی].

2- ڕیشەی *(IE.) *dail-* "لەت کردن، بەش کردن". ئەم وشانەی خوارەوە سەر بەم ڕیشەیەن: teilen (G.)، deal (E.)، da lan (OE.)، dailjan (Gt.) "لەت کردن، بەش کردن". دە کتێبە ئێتیمۆلۆژییەکاندا چ ئاماژەیەک بەوە نەکراوە کە پێوەندییەک لە نێوان ئەم دوو ڕیشەیەدا هەبێ. بەڵام لەوانەیە کە ئەو دوو ڕیشەیە پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا هەر یەک ڕیشە بن. لەوانەیە ↑تۆل tol دان "وێران کردن" هەر لەم چوارچێوەیەدا جێگەی لێکدانەوە بێ.

3- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ dreschen (G.)، thrash (E.)، tröska (Sw.) "کوتانی چەڵتووک و دەخڵ ودان" [بۆ قەڵشاندنی تۆێکڵ و دەرخستنی دانەکە]، su-treškinti (Lit.) "لەت کردن بە لێدان"، tresk (Rus.) "قرچە لێ هاتن". باس لەوە دەکرێ کە لەوانەیە ڕیشەی ئەم وشانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ بگەڕێتەوە.

**تلّین tılîn** [ *tılīn* ] - "1- هێشتن، هێڵان 2- خەڵتان بوون، تێوە گلان": تلیان tılyan یش دەگوترێ. ئەم مانایانە بە چەند قۆناخێک دروست بوون. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑*تلان tılan* "سووڕان، گەوزان، با دران" [تلّین tılîn یش دەگوترێ]، ↑تیل tîl "خوار، بادراو"، ↑تلۆر tılor "گلۆر، خلۆر"، ↑تلاسان tılasan "لە ڕێگە کلا بوون"، ↑دولاب dulab "1- چەرخی ئاوکێشان 2- خەڕەک 3- تۆپی ئاش"، ↑دۆڵ2 dol "1-خلۆر، گلۆر 2- گاسنی سەر چەماو" و هتد. پاشان لە مانای "تللۆر بوونەوە، خللۆر بوونەوە" مانای "خلیسکان، جاڵە بوونەوە"، واتا خوشیتێکی خیرا و هاسان بەسەر هەردا پەیدا بووە. جێی ئاماژەیە کە وشەی "تلۆر" دەگەڵ "جاڵە، گلۆر" بە یەک مانا دێ و ئەمەش نیزیک بوون و هاوشێوەیی ئەم دوو چەمکە نیشان دەدا. ئەمە لە کاتێک دایە کە "تلۆر" دە بنەڕەتدا مانای "تلخواردوو، تلدراو" دەبەخشێ و "جاڵە و گلۆر"یش دە بنەڕەتدا مانای "خلیسکان" و خزمیشن دەگەڵ خلیسکان. ئەوجار لە مانای "خلیسکان"ەوە مانای "کەوتن" پەیدا بووە. پێوەندی ئەم دوو چەمکە و دروست بوونی مانای تازەی کەوتن دە وشەی "گلان"دا بە باشی خۆی نیشان دەدا. ئەم وشەیە خۆی خزمە دەگەڵ "جاڵە، خلیسکان، خللۆر"، کەچی مانای "کەوتن"یشی وەرگرتووە. دە کوردواریدا دەبێژن "سوار تا نەگلێ، نابێتە سوار، یان سوار تا نەکەوێ، نابێتە سوار". دە بنەڕەتدا مەبەست لە "گلان"ی سوار خلیسکان و خلوۆر بوونەوە لەسەر پشتی ئەسپ بووە و دواتر ماناکە بووەتە "کەوتن". دواتر دیسان مانایەکی دیکە پەیدا بووە و ئەمەش بریتییە لە "هێشتن". وشەی "هێشتن" خۆی دە پێوەندی دەگەڵ وشەی "خستن"دایە و ئەمە نیشان دەدا کە چەمکەکانی "کەوتن، خستن" پێوەندییان بە "هێشتن، هێڵان"ەوە هەیە. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە مانای وشەی "تلین" [تلیان] ڕەوتێکی چەندقۆناخی پەرەسەندنی تێپەڕ کردووە، بەم جوارەی خوارەوە: سووڕان، گەوزان، تلۆر بوونەوە ← خلیسکان، جاڵە بوونەوە ← ڕەت بردن، کەوتن ← هێشتن، هێڵان [سەبارەت بە خزمایەتی دوو وشەی خستن و هێشتن بڕوانە "هێشتن"]. وەک لە سەرەوە دەبینرێ "تلین" هەروەها مانای خەڵتان بوون، تێوەگلان"یش دەبەخشێ. ئەم مانایەش دەگەڵ شیرۆڤەکەی سەرەوە یەک دەگرێتەوە. دە بنەڕەتدا مەتەست لە "تلانەوە، تێوەگلان" ئەوە بووە کە مرۆڤ کە*وتووەتە* بار و دۆخێکی ناخۆش و تێیدا تل دەخوا، وەک چۆن کەسێکی گوللەلێدراو دە خوێنی خۆیدا دەگەوزێ یان منداڵ دەناو خاک و خۆڵدا دەگەوزن و تل دەخۆن. ئەم مانایە دە زمانی فارسیدا وەک "اغشتن" مانا کراوەتەوە. سەرنجراکێشە کە ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ "خستن" و "هێشتن" و ئەم وشە فارسییەش جارێکی دیکە بۆچوونەکانی سەرەوە پشتراست دەکاتەوە. هەروەها دە زمانی فارسیدا تلو telou (P.) هەیە ["تلوتلو خوردن" واتا "ڕەت بردن یان ڕۆیشتنێکی بە لارەلاری کەسێک کە هەر بینا کەوت، وەک کەسێکی زۆر مەست"]. ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ "تل خواردن" و وشەکانی سەرەوە. دە زمانی کوردیدا "تل" هەروەها دەگەڵ "تەپ" دێ و دەگوترێ تەپ و ↑تل tep û tıl، واتا "ڕۆیشتن و کەوتن"، یان ↑تەپەتڕە tepetıre کە بە زارۆکێک دەگوترێ کە هەر دەڕوا و بەر دەبێتەوە. دەمێنێتەوە بڵێین کە دە زمانی

کوردمادیدا مانایەکی دیکەش پەیدا بووە و ئەمەش بریتییە لە ↑تلیا tılya "ئاسوودە، راحەت". "تلیا" دە بنەڕەتدا مانایەکی هەبووە وەك "تلۆر، رەها، ئازاد، بەردراو، بەرهەڵدا"، واتا شتێك كە نەبەستراوەتەوە، بەرهەڵست و گیر و گرفتی لەپێش نییە و بە كەیفی خۆی بەرێوەیە. ئا لەم مانایەوە مانای "ئاسوودە، راحەت" سەری هەڵداوە.

[تێبینی: هێندێك لەم پێوەندییانەی سەرەوە لەم وشانەی خوارەوەشدا بە دی دەكەین، كە هەموویان پێكەوە خزمن: lassen (G.) "هێشتن، هێڵان"، لۆژان lojan "1- راكشان، تخێل بوون، پاڵ كەفتن 2- راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا"، لۆژ loj "تەمبەڵ، تخێل، داكەوتوو، بەلاداهاتوو"، لۆژە loje "راژان، بزووتن بەم لا و ئەو لادا" (بە لۆژەلۆژ)، laß، lasch (G.) "لۆژ"، late (E.) "درەنگ" [وە دوا كەوتوو]، lat (Sw.) "تەپ، تەوەزەل"، lassus (L.) "ماندوو، داهێزاو" و هتد].

**تلێنگ tılnîg** [ *tılīng* ] - "تیفەك": دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "نوارێكی پارچە" بێ و خزم بێ دەگەڵ ↑تێرنج terınc "پەراوێز یاخود كەنارەی كراس و شمەكی دیكە".

**تماندن tımandn** [ *tımāndın* ] - "داهێنان، خواركردنەوە": ↑چەماندن çemandın.

**تمتم tımtım** - "زەوی رەق و بەردەڵان": ↑تەمتەمان temteman یش دەگوترێ.

[تێبینی: دە زمانی كوردمادیدا قەڵای دمدم qelay dımdım هەیە كە كاتی خۆی قەڵایەكی زۆر سەخت بووە و خانی لەب زێرین [لەپ زێڕین] لەدژی شاعەباسی سەفەوی دروستی كردبوو. وێ دەچی وشەی دمدم dımdım هەر تمتم tımtım بێ بە مانای "سەخت، ئاستەم، خۆراگر".

**تمتمە tımtıme** [ *tımtıma* ] - "نووكەمەزرەقی لە ئاسن": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تمتم tımtım "زەوی رەق و بەردەڵان" و ئاماژە بە رەقایی نووكی مەزرەق بكا.

**تنگێلە tıngêle** [ *tıngela* ] - "مەشكەی پڕاوپڕ لە ئاو": پێوەندی هەیە دەگەڵ ریشەی < ***(IE.) *ten-*** "تەنینەوە، درێژ بوونەوە، لەبەر یەك كشانەوە". وشەی تەنین tenîn، دواتر تەژی tejî "پڕ"، ↑تەژە teje "زل، زەبەلاح" و هەروەها ↑تەنگ *teng* پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. دە زمانی كوردمادیدا بە "زگی زل"یش دەگوترێ ↑تەنگە tenge.

**تنووك tınuk** [ *tınūk* ] - دەگەڵ "تاریك" دێ [تاریك و تنووك tarîk û tınûk]، خزمە دەگەڵ dunkel (G.)، tunkal (OG.)، donker (Nl.)، dokkr (OIs.) "تاریك"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *dhem-*** "هەڵم، دووكەڵ، تەم". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەم tem و لەوانەشە دەگەڵ ↑تانە tane "پەڵەی سەرچاو".

**تنۆك tınok** - "دڵۆپ، دە بنچینەدا واتا بڕێكی زۆر كەم، وردەیەك": دە زمانی كوردمادیدا هەروەها ↑دینۆك dînok ش دەگوترێ بە مانای "بڕێكی زۆر كەم، تۆزكاڵێك". بنەوشەی تن -tın یان دین -dîn خزمە دەگەڵ tiny (E.) "كەم، تۆزكاڵ". ریشەی ئەم وشە ئینگلیزییە روون نەكراوەتەوە. وێ دەچێ ئەم وشانە پێوەندیان هەبێ بە ↑تەنك tenık و هەروەها ↑توونا tuna [تەفر و توونا بوون واتا ورد وخاش بوون].

**تنۆكە tınoke** [ *tınoka* ] - "دەرپێی كورت، دەرپێ قوتە": پێوەندی هەیە بە tunica (L.) "پۆشش".

**توا tuw** [ *tuw* ] - "پارچەی براوی ناسك لە گۆشت یان چەرم": خزمە دەگەڵ ↑توێ toe "توێخ، توێژ".

**توار tuwar** [ *tuwār* ] - شێوەیەكی دیكە لە ↑توور tur [تەیر و توور teyır u tur].

**توانج tuwanc** [ *tuwānj* ] - "تانە و تەشەر": خزمە دەگەڵ ↑تەوس tews یان تەوزە tewze [تەوس و پللار]. شێوەیەكی دیكەی ئەم وشەیە دە زمانی كوردمادیدا تفنك tıfınık. شێوەی كۆنتری ئەم وشانە دەبێ *تەپانك* **tepanık* بووبێ بە مانای "لێدان، كوتان". ئەم شێوە كۆنە نیزیكە لە وشەی ↑دەمانچە demaçne [تپانچە tapānče (P.)] و هەروەها ↑تفەنگ *tıfeng* كە بەهۆیەوە تیر لە كەسێك دەدرێ. سەرنج بدە كە "تیر و توانج" دە كوردمادیدا دەگەڵ یەكتر دێن. دیارە ئەم وشەیە كۆنترە لە دەمانچە وەك ئامرازی شەڕ. دەشێ وشەكە دە كۆندا بە گشتی بە مانای "لێدان" یان "چەك، ئامێری لێدان" بەكار هاتبێ و پاشان كرابێتە ناو بۆ ئامێرێكی تایبەتی شەڕ. لە هەمان كاتدا وشەكە مانا كۆنەكەی خۆی بەردەوام كردووە كە ئەمڕۆ دە زمانی كوردمادیدا بە

شێوەی "توانج" و "تفنک" دەبینرێ و مانای "تانە و تەشەر" *لێدان* دەبەخشێ. لەوانەیە طنز tenz (Arb) لەم وشە کوردمادییە وەرگیرابێ. وشە عەرەبییەکە چ دە شێوە و چ دە مانادا نیزیکی زۆر دەگەڵ وشە کوردمادییەکە نیشان دەدا.

**توانین² tuwanîn** [ *tuwānīn* ] - "کارین": خزمە دەگەڵ ↑تاو² taw "هێز، گوڕ"، ↑تاڤگە tavge، ↑تەوژم tewıjım، ↑تابشت tabışt و túmara-h (OIn.) "قەڵەو، بە هێز"، سەر بە ریشەی *(IE.) *teu-/ *tu-* "هێز، توان، ماسین، ئەستوور بوون". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑*تبل tıbıl* "قامک".

**توتوک tutuk** - "شەیپوور": هەروەها تووتەک tutek هەیە بە مانای "تووزەلە" و دودک dudık بە مانای "شمشاڵ". دیارە ئەم وشانە دە بنەڕەتدا هەر یەک وشەن. خزمە دەگەڵ ↑تووڕاندن turandın "فوو کردن بە ئامرازی مۆسیقا دا"، سەر بە ریشەی *(IE.) *dheu- >* "دەم، هاڵاو، هەناسە".

**توخ tux** - "تۆز": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑تۆز toz.

2- ↑توخ tox "تاریک". سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "تۆز" و تاریکی" دەکرێ ئاماژە بە وشەی "مژ" بکەین کە دەگەڵ "مێش" [خۆڵەمێش] خزمە، هەروەها تەو "مەڕی بۆر، خۆڵەمێشی" خزمە دەگەڵ "تۆز".

**توخس tuxıs** - "سەرکێش، نادەستەمۆ، دەستنامۆ":

1- لە لایەکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑تۆسن tosın.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین دەگەڵ ↑تووش tûş پێکی بگرین بە مانای "بەد، بەدفەر"،

3- هەروەها دەکرێ هەڵیسەنگێنین دەگەڵ tuxšak (Pl.) "زیرەک، تێکۆش".

**توخم tuxm** - "1- تۆم، تۆو 2- رەچەڵەک، نەژاد": تخم toxm (P.). خزمە دەگەڵ Zucht (G.)، tucht (Nl.)، tyht (OE:)، züchten (G.) "نەژاد، نەسل، وەبەر هێنانی ئاژەڵ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ziehen (G.) و tiuhan (Gt.)، togenn (OIs.) "کێشان". پێوەندی ئەم وشانە بە چەمکی "کێشان" بە گوێرەی بۆچوونێک بۆ کێشانی بێچوو لە کاتی زاندا دەگەڕێتەوە. "توخم" خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی وەک ↑*تاقم taqım* [تاخم]، ↑تاخە taxe، ↑تۆق toq و هتد.

**تۆخماخ toxmax** [ *toxmāx* ] - "کوتکی سە زل، گۆپاڵ": وشەکە رواڵەتێکی تورکی هەیە، بەڵام دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەق teq [تەق تەق لە دەرکەی دا]. زور وشەی کوردمادی هەیە کە تورکێندراون و ئەمەش دەتوانێ یەک لەم وشانە بێ.

**تور tur** - "ڵالەپەتە، کەسێک زمانی دەگیرێ": تورت turt یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تووڕاندن1 turandın "فوو کردن بە ئامرازی مۆسیقادا"، سەر بە ریشەی *(IE.) *dheu- >* "↑تەم tem، دەم، هاڵاو، هەناسە، فوو". "تێی تووڕێنە" ماناکەی دەبێتە "فووی تێبکە". هەروەها ↑توور/ توار tuwar / tur "ئاژەڵی کێوی" دە بنچینەدا بە مانای "هەناسەکێش" واتا گیانلەبەر بووە. کەسێک کە دە قسە کردندا زمانی دەگیرێ، زۆرجار "فوو" لە دەمی دەردەچێن، واتا وەک کەسێک کە دەفیکێنێ.

**تور tur** - "هەلووک": خزمە دەگەڵ ↑دار dar.

**توربێن turben** [ *turben* ] - "تووروەکە": تور + بێن tur + ben. کەرتی تور -tur دە وشەی ↑تووروەکە tureke شدا دەبینرێ. کەرتێ بێن -ben خزمە دەگەڵ بەن ben / ↑بەند bend. مەبەست لە توربێن دەبێ تووروەکەیەک بێ کە لە خۆ دەبەسترێ، بە پێچەوانەی تووروەکەیەک کە بە دەست هەڵدەگیرێ.

**تورت1 turt 1** - "شەق و ناسک": ترد tord (P.)، خزمە دەگەڵ zart (G.) و (OG.) "تورت و ناسک". دە دیالێکتی باکووری ئەڵمانی ناویندا وشەکە tertel (MG.) بووە.

**تورت2 turt 2** - "ڵالەپەتە، کەسێک زمانی دەگیرێ": شێوەیەکی دیکە لە ↑تور tur.

**تورنج turınc** [ *turınj* ] - "میوەیەکە لە تیرەی نارنج و پرتەقاڵ": ترنج tırınc یش دەگوترێ. دەشێ بچێتەوە سەر *> (L.) citrus* "لیمۆ". ئەم وشە لاتینییە دە زمانی ئەڵمانیدا بووەتە Zitrone (G.) "لیمۆ".

**توشتیر tuştîr** [ tuštīr ] - "بزنی دووساڵە": تویشتیر tuwştîr و چویشتیر çuwştîr ش دەگوترێ. وێ دەچێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی توو tu [واتا ↑دوو du] + شتیرştîr. کەرتی دووەم جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Stier (G.)، steer (E.)، stiur (Gt.) "گا". ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرەتا بە مانای "گوێلک" بەکارهاتووە و خزمە دەگەڵ -staora (Av.) "ئاژەڵی گەورەیماڵی"، tauros (Gr.)، taurus (L.)، tauras (Lit.) "گا". هەروەها دەشێ ↑وشتر wıştır و ↑دەوار¹ dewar یش هەر لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرن.

**توشک tuşk** - "تۆژ، تۆکڵ": شێوەیەکی لە ↑تۆژ toj و ↑تۆکڵ *tokıl*.

**توڵانەوە tulanewe** *[ tulānawa ]* - "لەبەر یەک چوون بە کوڵینی زۆر": هەروەها ↑توڵخانەوە tulxanewe هەیە کە بە مانای "لەبەریەک چوونی میوەی تەڕ" بەکار دێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑تاوانەوە tawanewe "حەل بوون، لەبەر یەک بڵاو بوون، جاری بوون". لەم تێڕوانینەوە شێوەی کۆنتری وشەکە دەبێ یەکێک لەو وشانەی خوارەوە بووبێ. "تابلانەوە"، "تاولانەوە" یان "تافلانەوە". دواتر ئەم شێوە کۆنە سواوەتەوە و بووەتە "تووڵانەوە". نموونەی سوانەوەی لەم چەشنە دە زمانی کوردمادیدا زۆرە، بۆ وێنە زیواڵ و زۆڵ، گابار و گۆڕ، زەبر و زۆر، زفرین و سووڕان و هتد.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ verdriessen (G.) "ماندوو کردن"، Þrēatian (OE.) "تەنگەتاو کردن، زەخت کردن، لێدان"، Þraut (ON.) "زەحمەت، کێشە"، threat (E.) "گوشار، هەڕەشە"، Þrjōta (OIs.) "ماندوو کردن"، trudare (L.) "پاڵ نان، لێدان"، trudit'sia (Rus.) "زەحمەت کێشان، ماندوو بوون" سەر بە ریشەی < ***treu-d-** ***(IE.)*** "گوشین، پاڵ نان، زەخت خستنەسەر". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها بە کەسێک کە *هێز و چالاکی* پێویست نیشان نەدا، دەڵێن "ئەوە بۆ خۆت توڵاندۆتەوە". لەم تێڕوانینەوە دەتوانێ دە زمانی کوردمادیدا "توڵخاندنەوە" یان "توڵاندنەوە" سەرەتا بە مانای گوشین و زەخت خستنە سەر بەکار هاتبێ کە ئەمەش دەبێتە مایەی لەبەر یەک چوون و پان و بڵاو بوونەوە.

**توڵخ tulx** *[ tulx ]* - "ڕەشی ئاماڵ بۆر، ڕەشی ئاماڵ زەرد": خزمە دەگەڵ ↑تەڵخ telx و دواتر ↑تاریک tarîk.

**توڵخانەوە tulxanewe** *[ tulxānawa ]* - "لەبەر یەک چوونی میوەی تەڕ": خزمە دەگەڵ ↑توڵانەوە tulanewe.

**توڵخی tulxî** *[ tulxī ]* - "جۆرە ترێیەکە":

1- یان دەچێتەوە سەر ↑توڵخ tulx "ڕەشی ئاماڵ بۆر، ڕەشی ئاماڵ زەرد".

2- یانیش لە ↑توڵخانەوە tulxanewe وەرگیراوە [ترێیەک کە زوو دەتوڵخێتەوە؟]

**تەلوم tulum** - "تەپڵ": خزمە دەگەڵ خزمە دەگەڵ Trommel (G.)، trumba (OG.) "تەپڵ". trompe (OFr.) "ترۆمپێت، زوڕنا" خزمایەتی هەیە دەگەڵ ئەم وشانە. هەروەها خزمە دەگەڵ ترومپا tırumpa "ئامرازی ئاو لە بیر دەرخستن" [ تلمبە tolombe (P.)]. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑ترومپا tırumpa.

**توڵە tule** *[ tula ]* - "بێچووەسەگ": تیلە tîle ش دەگوترێ. توڵە tūle (P.). دە دیالێکتی باکووری زمانی ئاڵمانیدا Töle (G.) بە مانای "دێڵەسەگ" بەکارهاتووە. بە بیروڕای زماننasan ئەم وشەیە دەبێ لە ریشەی ئەنگلۆساکسۆنی -*tohila* "توڵەسەگ"ەوە هاتبێ. دە ئەڵمانی کۆندا وشەی zoha (OG.) بە مانای "دێڵە سەگ" هاتووە.

**تونجک tuncık** *[ tunjık ]* - "کاکۆڵ": خزمە دەگەڵ تانج tanc [دە ئەسڵدا ↑تاج tac].

**توند tund** - "1-قایم 2- پەیت 3- خێرا 4- بەهێز": تند tond (P.). وەک دەبینین وشەکە بە چەندین مانا بەکار دێ و ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێ کە وشەکە دەبێ دە بنەڕەتدا مانایەکی گشتی هەبووبێ و ئەوەش وای کردبێ کە وشەکە بە چەندین مانای جۆراوجۆر، بەڵام هەر لە چوارچێوەی مانا گشتییەکەدا بەکار بهێنرێ. لەم تێڕوانینەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ intensus (L.) "توند" و intendere (L.) "سفت کێشان(ەوە)" و ئەمیش دەچێتەوە سەر tendere (L.) "لەبەریەک کێشانەوە، تەنینەوە". ئەگەر ئەم شیمانەیە ڕاست بێ، "توند" دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەنین(ەوە) tenîn(ewe).

[تێبینی: وەك ئاشكرایە لە ئەنجامی كێشان و لەبەریەك كێشانەوەدا گرژی و توندی دروست دەبێ واتا شتەكە دۆخی ئارام، شل یان خاوی خۆی لە دەست دەدا. دە زمانی ئەڵمانیشدا anspannen بەمانای "توند و گرژ كردن" و پێچەوانەكەی entspannen بە مانای "خاو كردنەوە، هێور كردنەوە" بە كار دێ و ئەمانەش دەگەڕێنەوە سەر كرداری spannen بە مانای "تەنین(ەوە)"].

**تونگە tunge** [tunga] - "دەفری مل باریك": تنگ tong (P.). جێ بەراورد كردنە دەگەڵ:

1- tankh (In.) "دەفری ئاو". tank (E.) لەم وشە هیندییە وەرگیراوە.

2- دە زمانی كوردمادی و فارسیدا وشەكە بە دەفرێكی مل باریك دەگوترێ - دەفرێك كە ملی تەنگ بۆتەوە. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە وشەی ↑تەنگ tang ەوە.

3- Tonne (G.) > tunna *(L.)* "خومرە".

**تونە tune** [tuna] - "نەماو، نەبوو، نابوود": بڕوانە ↑توونا tuna [تەفر و توونا بوون/ تەرت و توونا بوون. دە شێوەزاری كوردمادی سەروودا لەجیاتی "نییە" و "نەبوو"ی كوردمادی ناوەڕاست دەگوترێ "تونەیە" و "تونە بوو".

**توو tu** [tū] - "میوەیەكە": توت tūt (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تبل tıbıl "قامك".

**تووتان tutan** [tūtān] - "هەڵتووتەكان": بنەوشەی تووت -tut خزمە دەگەڵ sit (E.)، sitzen (G.)، sitan (Gt.)، sitta (Sw.)، sidet (Rus.) "دانیشتن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑دانیشتن danîştın، ↑ساتان satan "سمت و ساتان"، ↑سەندەڵی sendelî و هتد.

**تووتك tutık** [tūtık] - "بەچكەسەگ": خزمە دەگەڵ ↑تووتە tute.

**تووتوو tutu** [tūtū] - "بە تووتووش وەدەست ناكەوێ"، واتا بە هیچ جۆرێك یان هەرگیز وەدەست ناكەوێ. تیتوو tîtu ش دەگوترێ. ئەم وشەیە لەوانەیە ناوێكی كۆن بۆ "خودا" بێ و مەبەست ئەوە بوویێ كە شتەكە ئەوەندە سەختە كە بە خوداش جێ بەجێ نابێ. لەم تێڕوانینەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Zeús (Gr.) "خوای ئاسمان"، deus (L.) "خوا"، deivos (L.) "ئاسمانی"، dyáu-h (OIn.) "ئاسمان"، dídēti (OIn.) "دەدرەوشێتەوە"، سەر بە ریشەی *(IE.) *dei- >* "رووناك بوون، درەوشانەوە، دیاركەوتن".

**تووتە1 tute** [tūta] - "1- قامكە چكۆڵە 2- زێدە گوشت لەچاو یان لە پێڵووی چاودا": خزمە دەگەڵ zitze (G.) و tutto (OG.)، titt (OE.) و titthe (Sw.)، (Gr.) "گۆپكەی مەمك". دە زمانی كوردمادیدا ↑چیچە çîçe "گۆپكی مەمك"، ↑چیچیلە çîçîle "نەرمەی گوێ"، ↑چەچە çeçe "دەستی منداڵی چكۆڵە" خزمن دەگەڵ تووتە. وەك دەبینین وشەكە دە ئەسڵدا ئاماژە دەكاتە نەرمەگۆشتێكی بچووك یاخود قیتاییەكی بچووك. دە زمانی فارسیدا چچولە čečūle (P.) بە مانای "میتكە" دێ. بنەوشەی تووت -tut / تیت -tît بەگشتی مانای "چكۆڵە"ی وەرگرتووە و ئەم مانایە لە هێندێك وشەی دیكەی كوردمادیدا خۆی دەردەخا، وەك ↑تووتك tutık "بێچووی سەگ" یان ↑تیتل tîtıl لە داستانی "تیتل و بیبل"دا. وشەی تیتل دەچێتەوە سەر "تووتە" یان " تیتە" و بیبل دەچێتەوە سەر "بەبە".

**تووتە2 tute** [tūta] - "خاڵ، نیشانە":

1- وەك لە سەرەوە باسكرا، تووتە بە مانای گۆپكە یان قیتكە گۆشتێكی چكۆڵە دێ. وێ دەچێ هێندێك خاڵی سەر پێست كەوا قووت دەبنەوە و وەك زێدە گوشتێك خۆ دەنوێنن، وای كردبێ كە ئەم وشەیە مانای خاڵ و هەروەها نیشانەش وەربگرێ.

2- لە لایەكی دیكەوە وشەیەكی لاتینی لەم بارەوە سەرنج رادەكێشێ و لەوانەیە وشە كوردمادییەكە پێوەندی بەمەوە هەبێ. دە زمانی لاتیندا titulus (L.) مانای "شەقڵ و نیشانە" دەدا. ریشە؟

**توودرك tudırk** [tūdırk] - "جۆرێك توویە لە پنچكێكی دڕكاوی دەڕوێ": ↑توو + ↑درك tu + dırk.

**توور1 tur 1** [ *tūr* ] - "جۆرێك لە سەوزی، ترپ": ترب torob ‏(P.)‏. شێوەی ترپ tırp دە زمانی کوردمادیدا دەبێ شێوە کۆنترەکە بێ. ئەم گیایە بنکێکی سفتی هەیە و دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< *(s)terp-*** ‏(IE.)‏ "سفت بوون". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تریفە[2] tırîfe "لوو لە لەشی وڵاخدا".

**توور2 tur 2** [ *tūr* ] - دەگەڵ "تەیر" دێ [تەیر و توور teyr u tur]. بە کەسێك کە بابەتەکان تێکەڵ بکا، دەڵێن "تەیر و توور تێکەڵ دەکا". دیارە ئەم " توور"ە چ پێوەندییەکی بە توور [ترب] کە بەرهەمێکی تەڕەکارییە، نەداوە، چونکوو تەیر و توارteyır u twar یشمان هەیە. "توار" شێوەیەکی دیکەیە لە "توور" [تەیر و توارێکی زۆری لێ کۆ بۆتەوە]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Tier ‏(G.)‏، tior ‏(OG.)‏، deer ‏(E.)‏، djur ‏(Sw.)‏. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە مانای "ئاژەڵ" دەدا، دە ئینگلیزیدا بووەتە "ئاسک، ئاسکەکێوی". وشە ژێرمەنییەکە دە بنەڕەتدا بە "ئاژەڵی وەحشی، ئاژەڵی کێوی" گوتراوە بۆ جیا کردنەوەی لە ئاژەڵی ماڵی و دەبردرێتەوە سەر ریشەی **< *dheu-*** ‏(IE.)‏ "هەناسە، رووح" [هەناسە کێش، رووح لەبەر یان جانەوەر]. لەم تێروانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz و↑ دەم dem "هەناسە، هاڵاو، فوو" و ژمارەیەك وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا. دە زمانی کوردمادیدا وشەکە بە شێوەی ↑تێروو teru ش دەبینددرێ بە مانای "ئاژەڵی درندە".

[تێبینی: پێوەندی ئێتیمۆلۆژیك لەنێوان چەمکەکانی "دەم، هەناسە، فوو"، "گیان، رووح" و "گیانلەبەر، جانەوەر" لەوەڕا هاتووە کە لە سەردەمانی زوودا هەناسە کێشان وەك نیشانەیەك یان رەنگدانەوەی "رووح و گیان" زاندراوە، واتا کاتێك هەناسەکە نەماوە، وا دەنراوە کە رووحەکە هاتووەتە دەر و لە لەش جیا بۆتەوە. ئەمە وای کردووە کە تەنانەت دوو چەمکی "هەناسە، دەم" و "رووح، گیان" وەك یەك شت چاو لێ بکرێن. ئەم پێوەندییە لەم وشانەی خوارەوەدا بە باشی دەر دەکەوێ: تۆز toz، Dunst ‏(G.)‏ "هەلم و هاڵاو"، tunst ‏(OG.)‏ "گەردەلوول"، dust ‏(E.)‏ "تۆز"، duša ‏(OSlaw.)‏ "هەناسە"، dhū-má-h ‏(OIn.)‏ "دووکەڵ"، thymós ‏(Gr.)‏ "رووح، تارمایی"، tūmōn ‏(OG.)‏ "هاڵاو، دووکەڵ، چرەچەمان" و هەروەها *تاپۆ* "رووح، تارمایی". هەموو ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *dheu-*** ‏(IE.)‏ "دووکەڵ کردن، هەڵم و هاڵاو کردن، هەناسە، با هاتن". شیاوی باسە کە ناوی "مها تما گاندی" بە زمانی هیندی دەبێتە "رووحی مەزن گاندی"). ئەم پێوەندییەی نێوان "هەناسە، دەم، هاڵاو، فوو" و "رووح" وای کردووە کە لە داستانەکانی ئافراندندا رووح وەك هەناسە یان فوویەك بە بەری مرۆڤدا بکرێ].

**توور tur** [ *tūr* ] - توور دان یان توور هەڵدان واتا "فڕێ دان": دە بنەڕەتدا ماناکەی "دوور فڕێ دان" بووە، هەروەك چۆن دە فارسیشدا دەگوترێ دور انداختن dūr andāxtan ‏(P.)‏. کەواتە "توور" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑دوور dur.

**تووڕان turan** [ *tūrān* ] - "جووتە هاویشتن": لەگەڵ پێشگری "هەڵ" بەکار دێ: هەڵتووڕان helturan یان هەڵتووڕاندن helturandın. خزمە لەگەڵ ↑تووڕە *ture* "قەڵس" و ↑تۆڕ tor "وەحشی".

**تووڕاندن1 turandın 1** [ *tūrāndın* ] - "فوو کردن بە ئامرازی مۆسیقا دا": دەشێ لە ریشەی **< *dheu-*** ‏(IE.)‏ "↑تەم tem، دەم، هاڵاو، هەناسە" وەرگیرابێ. کەوابوو "تێی تووڕێنە" ماناکەی دەبێتە "فووی تێبکە، دەمی پێوە بنێ". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑توور/ توار tuwar / tur "ئاژەڵی کێوی" [دە بنچینەدا: "هەناسەکێش" واتا گیانلەبەر].

**تووڕاندن2 turandın 2** [ *tūrāndın* ] - "فێراندن، بەلەفێرە گرتن": داتووڕاندن datûrandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تر[1] tır "با لێبوونەوە بە دەنگی توند". وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە دەکا بەو دەنگە کە لە کاتی بەلەفێرەدا دروست دەبێ.

**توورگ turg** [ *tūrg* ] - "چەقەڵ": توێری tuwerî یش دە گوترێ.

1- لەوانەیە لە ریشەی **< *der-*** ‏(IE.)‏ "دڕان"ەوە هاتبێ. لەم تێروانینەوە مانای وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێتە "هەڵدڕ یاخود دڕندە". دە زمانی پەهلەویدا وشەکە بە شێوەی tōrak بووە.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑توور tur "تەیر و توور".

تووڕە **ture** *[ tūra ]* - "قەڵس": خزمە دەگەڵ zorn (.G) و torn (.OE) "تووڕەیی". وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر ڕیشەی ژێرمەنی -*turna* "تووڕەیی"، سەر بە ڕیشەی **< *der- (.IE)** "دڕین". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆڕ tor "وەحشی" و ↑دڕین dırîn و ژمارەیەک وشەی دیکە.

توورەکە **tureke** *[ tūraka ]* - "کیسە بۆ شت تێدا هەڵگرتن": خزمە دەگەڵ tragen (.G)، tragan (.OG)، draw (.E)، draga (.OIs) "هەڵگرتن، بردن". ڕیشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە باس نەکراوە. هەروەها ↑تێر ter "کیسەی چنراوی گەورە" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ وشەی فارسی "توبرە" بە مانای توورەکە. ئەم وشەیە پێک هاتووە لە دوو کەرتی "تو" و "برە" کە دە بنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە "تێدابەر" سەر بە کرداری "بردن". هەروەها دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ Portemonnaie (.G) "کیف یان کیسەی پووڵ" کە خۆی دەچێتەوە سەر porte-monnaie (.Fr)، پێکهاتوو لە دوو وشەی porte "بردن، هەڵگرتن" و monnaie "پارە، سکە"].

تووز **tuz** *[ tūz ]* - "بیچم، قەڵافەت": ئەگەر سەرنجی وشەی "شەقڵ" یان "سەکوت" [سەر و سەکوت] بە مانای "شکڵ، وێنە، شێوە" بدەین، دەبینین کە ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ڕیشەیەک بە مانای "بڕین، شکاندن". هەروەها ئەگەر سەرنجی وشەی "تیپ" بدەین بە مانای "چەشن، وێنە" دیسان دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە پێوەندی بە ڕیشەیەکەوە هەیە بە مانای "لێدان، کوتان". هەروەها ئەگەر چاو لە وشەی "ڕەداڵ" بکەین [ڕوو و ڕەداڵ] هەمدیسان دەبینین کە وشەکە پێوەستە بە ڕیشەیەک بە مانای "ڕنین، داڕووشاندن، دڕاندن". بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەردەکەوێ کە وشەی "تووز" یش خزمە دەگەڵ ↑تاشین taşîn. ئەم پێوەندییانەی سەرەوە لێرەوە سەرچاوە دەگرن کە دروست کردنی "شەقڵ، وێنە، شێوە، نەخش و نیگار" دە بنەڕەتدا لە ڕێگەی "تاشین، لێدان، هەڵکەندن، ڕنین و ڕووشاندن"ەوە بووە. جگە لە "تووز"، ↑تەشک2 teşk یش بە هەمان مانا بەکار دەهێنرێ.

تووزاندن **tuzandın** *[ tūzāndın ]* - "داغ پێوەنان": "داغ کردن"، خزمە دەگەڵ dezītan (.Pl) ↑داغ/ داخ dax / daġ.

تووزەلە **tuzele** *[ tūzala ]* - "ئامرازێکی مۆسیقا": ↑دووزەلە duzele.

تووژگ **tujıg** *[ tūžık ]* - "کێرد، خەنجەر": توشک tuşk یش دەگوترێ. دشنە dašne (.P) "خەنجەر". ئەم وشانە و هەروەها ↑تەشوێ teşoê لەباری ئێتیمۆلۆژییەوە پێوەندییان بە "تیژ"ەوە نییە، بەڵکوو خزمن دەگەڵ ↑تاشین taşîn و دواتر بنجی ↑تەپ[1] -tep بە مانای "لێدان" و لە پلەیەکی دوورتردا دەبنە خزم دەگەڵ ↑تەور tewır و ↑دەبان deban.

تووش1 **tûş 1** *[ tūş ]* - تووش بوون واتا "ڕووبەڕوو بوون، وێککەوتن". خزمە دەگەڵ stoßen (.G)، stozan (.OG)، stautan (.Gt) "تووش بوون، وێککەوتن"، tudati (.OIn) "وە شتێک دەکەوێ"، سەر بە ڕیشەی **< *(s)teu- (.IE)** "لێکدان، وێککەوتن". فۆتیمی s دە بەرایی وشە کوردمادییەکە و وشە هیندییەکەدا دەرناکەوێ. وشەکانی ↑دۆق2 doq "1- زللە لە پشتمل 2- گۆپاڵ 3- لێدان، لێخستن"، ↑دووچار duçar و ↑تەوقە tewqe، ↑دەخش dexş "زللە، شەق" و هەروەها ↑تاشین taşîn یش پێوەندییان بە "تووش"ەوە هەیە.

تووش2 **tûş 2** *[ tūš ]* - "خراپ، بەد، بەدفەڕ، چەمووش": خزمە دەگەڵ duš (.Pl) و (.Av) "دژ، ناحەز، بەد". وشەکانی ↑دژ dıj، ↑دژێو dızew، ↑دشە dışe "جێگەی خراپ"، دشی dışî "ناحەزی، ناشیرنی" پێوەندییان بەم وشەوە هەیە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑دەخس dexs "ڕژدی، چاوچنۆکی، ئێرەیی"، ↑دەخسین dexsîn "ئێرەیی پێ بردن، پێ هەڵکاڵان"، ↑توخس tuxs "جنگن، چەمووش، بەدفەڕ"، ↑تۆسن *tosın* "تووڕە، وەحشی" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "هەڵچوون، دەرپەڕین".

تووک1 **tuk 1** *[ tūk ]* - "موو، پەڕ":

1- به شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ توێکڵ toekıl [↑تۆکڵ tokıl]. پێوەندی دوو چەمکی "توێکڵ" و "موو" لە دوو وشەی دیکەشدا بە دیار دەکەوێ، واتا "قاشڵ، قاشك" بە مانای توێکڵ و "قژ" بە مانای موو. ئەم پێوەندییە لەوەڕا هاتووە کە هەردووك شت لێ دەکرێنەوە، دەبڕدرێن، دەتاشرێن یان دادەرندرێن. "قاشك" و "قژ" خزمن دەگەڵ هێندێك وشەی وەك قاش1، ↑کووز، قوسان واتا "تاشین"، گوێزان و هتد. هەروەها ئەگەر سەیری وشەی "ردێن" [کۆنتر: رندێن] بکەین، دەبینین کە خزمە دەگەڵ وشەیەکی ئەڵمانی بەمانای "توێکڵ" و هەروەها خزمە دەگەڵ "رنین". لەم تیڕوانینەوە "تووك" دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تاشین taşîn. وشەکانی ↑تیسك tîsk "مووی درێژ" و ↑تیتك tîtk "بسك و پەرچەم" هەر لەم چوارچێوەیەدا جێی دەگرن.

2- لە لایەکی دیکەوە "تووك" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ tagl (Gt.) "موو". ئەم وشەیە دە هێندێك لە زمانە ئەورووپییەکاندا بە مانای "کلك" بەکارهاتووە، وەك ta g(e)l (OE.) و zagel (OG.)، tail (E.) "کلك".

**تووك2 tuk** [ *tūk* ] - " نووك، سەری شیش و دەرزی و هتد": خرمە دەگەڵ ↑تیك tîk [تیك و درووومان].

**تووك3 tuk** [ *tūk* ] - دەگەڵ دووعا یان نزا دێ و مانایەکی نێگاتیفی هەیە [تووك و دووعا یان تووك و نزا لێکردن]. کاك عەلی نانەوازادە ئەم وشەیەی پێوەند داوەتەوە بە "یاتووك"ی پەهلەوی yatuk (Pl.) بە مانای "جادوو". وشەی ↑جادوو cadu دە زمانی کوردمادی و فارسی ئەمڕۆدا خۆی شێوەیەکی گۆڕدراوی ئەم وشەیە و دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "دووعا (کردن )" بووبێ. وشەی ↑تکا tıka بەمانای "خواهیش، پاڕانەوە" ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا. هەروەها وشەی ↑تەکێ teke [شوێنی دووعا کردن] دەبێ بە رەسەن وشەیەکی زمانی کوردمادی بێ کە چووەتە ناو زمانی عەڕەبییەوە.

**تووك4 tuk** [ *tūk* ] - "باڵدارێکی شەوبێدار": خزمە دەگەڵ ↑تاقتاقکەرە taqtaqkere.

**تووکاندن tukandın** [ *tūkāndın* ] - "1- هێلکە بە دەنووك شکاندن 2- ئەزموونی هێلکە بە ددان": 1- لەوانەیە شێوەیەکی کورتکراوە بێ لە ↑ترووکاندن tırukandın و دواتر ↑دڕین dırîn سەر بە کردارێك بە مانای "لێك جودا کردنەوە". "تووکاندن" هەڵسەنگینە دەگەڵ تۆقاندن toqandîn [ toqîn یان ↑تەقین teqîn] "بە تەوژم لە بەر یەك پچڕان". ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ "دڕین" و "دڕان".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە تووك2 tuk "نووك، سەری شیش و دەرزی و هتد".

**توول tul** [ *tūl* ] - شێوەی کۆنتری ↑تۆڕ1 tor "پارچەی زۆر تەنك".

**تووڵ1 tul** [ *tūl* ] - "شووڵ، لکی ناسکی دار": ئەم وشەیە جێی هەڵسەنگاندن دەگەڵ:

1- ↑تاڵ tal [↑تار tar] کە شتێکی درێژ و باریکە. لەوانەیە لەمەوە مانای "لکی ناسك، شووڵ" پەرەی گرتبێ.

2- ↑دار dar. دە زمانی فارسیدا بە شووڵ دەگوترێ ترکە tarake (P.) کە خزمە دەگەڵ "دار".

**تووڵ2 tul** [ *tūl* ] - دەگەڵ "رێ" دێ و دەگوترێ توولەرێ tulere و هەروەها "مار": توولەمار tulemar، بە مانای رێگا یان ماری باریك. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑تووڵ1 tul "شووڵ، لکی ناسکی دار".

2- ↑تۆل tol "پیزە، بێچووی ناو سك". لەم تیڕوانینەوە دەشێ لە مانای "پیزە، تۆل" مانای "باریك، چکۆڵە" سەری هەڵدابێ. لەم بارەوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "باریك" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "باڕ" [باڕەکەو، بێچووەکەو].

3- دوال dawāl (P.) دە فەرهەنگە فارسییەکاندا وەك "بەندی چەرمین، بەندی کەمەر" مانا کراوەتەوە. ئەم وشەیە دە کوردمادیدا دەبێتە ↑زۆڵ zol [زۆڵەچەرم zoleçerm واتا باریکەیەکی بڕدراو لە چەرم، زوێڵ zoel و دوێڵ doel یش دەگوترێ]. لەوانەیە "توولە" ئاماژەی بە شتی باریکی وەك "زۆڵەچەرم، بەندی چەرم" کردبێ.

**توولەك tulek** [ *tūlak* ] - "وەرینی مووی لەش": [رێوی گەزیزەخواردوو توولەك دەکا]. ئەم وشەیە خزمە یان باشتر بڵێین شێوەیەکی تازەترە لە ↑تەپڵەك2 teplek "زکێ دان" [دە ئەسڵدا: توێخ بەردان] و خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشە وەك ↑توێخ toex، ↑*تۆکڵ tokıl* و بە شیمانەیەکی بەهێز هەروەها دەگەڵ ↑تووك tuk "موو".

**توولینە tulîne** *[ tūlīna ]* - "قەرتاڵەی چکۆڵە": تەریان teryan، ↑تریان(ە) tıryan(e) و تلیان(ە) tılyan(e) یش دەگوترێن.

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑تووڵ/ توول tul "لقەداری ناسك" کە قەرتاڵەکەی پێ دروست کراوە.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تلان tılan "سووڕان"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "سووڕاندن، با دان".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "قەرتاڵە" و "سووڕاندن، با دان" دەتوانین بەرهەفی بکەین دەگەڵ وشەی vandhúra-h (OIn.) "سەندەڵی داشقە" [دە بنەڕەتدا: قەرتاڵەی تێدا دانیشتن] کە خزمە دەگەڵ winden (G.) "با دانەوە، هۆندنەوە" و "هۆندنەوە"ی کوردمادی]

**توومان tuman** *[ tūmān ]* - دەگەڵ "تەپ" دێ [تەپ و توومان tep u tuman]. خزمە دەگەڵ ↑تەم tem و هەروەها ↑تۆز toz. بە تایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ tūmōn (OG.) "هاڵاو، دووکەڵ، چڕەچەمان".

**توون tun** *[ tūn ]* - "ئاگردانی گەرماو": خزمە دەگەڵ ↑تەن ten "سیان، قورم"، ↑تین tîn "گەرمای ئاگر" [دەبنەڕەتدا: هاڵاوی ئاگر] و چەندین وشەی دیکە کە لەژێر ↑دەوار[2] dewar "پارچەی رەشماڵ"دا شی کراونەوە. هەر سێ وشەی "تەن"، "توون" و "تین" بەتایبەتی هەڵسەنگینە دەگەڵ Dunst (G.) "هەڵم، هاڵاو" و tunst (OG.) "تۆفان". هەم هاڵاو و هەمیش تۆفان دوو شتن کە دە حەوادا جم و جۆڵێکی نائارامیان هەیە.

**توونا tuna** *[ tūnā ]* - زۆرتر دەگەڵ "تەفر" یان "تەرت" دێ [تەفر و توونا بوون tefr u tuna/ تەرت و توونا tert u tuna بوون واتا بە یەکجاری لەناو چوون]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تەنك tenık "ناسك". وشەی "تەنك" دە بنچینەدا بە مانای "کز، ناسك، باریك، تەنك" بووە. دە زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا هێندێك جار وشەی بە مانای "لەناو چوون" دەچنەوە سەر ئەو وشانەی کە مانای "ورد، کز، چکۆڵە، کەم" دەدەن، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا "ورد و خاش بوون" هەیە بە مانای لەناو چوون. هەروەها " کز" و "کووژانەوە" و "کوشتن" سەر بە یەك خێزانن. لەم تێروانینەوە توونا دەبێتە "لەتەنکی دان، لەکزی دان، کەم بوونەوە یان ورد بوون و لەناو چوون". دوو وشەی "تەفر" و "تەرت" کە دەگەڵ توونا دێن، ئەم بۆچوونە پشتراست دەکەن. تەفر واتا "حەل بوون، لەبەریەك هەڵوەشان، لێك بڵاوبوون" و تەرت واتا "دەرپەرین و دوور بوون و چکۆڵە بوونەوە و ون بوون". لەوانەیە tiny (E.) "کەم، چکۆڵە" پێوەندییەکی بە وشەکانی "توونا" و "تەنك "ەوە هەبێ. دە شێوەزاری کوردمادی سەرووودا ↑تونە tune بوون و "تونە کردن" هەیە بە مانای لەناو چوون و لەناو بردن. هەروەها لەجیاتی "نییە" [ئەو شتە نییە] دەگوترێ "توونەیە" [ئەو تشتە توونەیە واتا ئەو شتە نامەوجوودە- توونە واتا نامەوجوود، مەعدووم].

**تۆ to** - "ئەتۆ، کەسی دووەمی تاك": دە هێندێك دیالێکتدا توو tu و te ش دەگوترێ. to (P.)، du (G.) و (Sw.)، tu (Gt.) و (L.)، thou (E.) [دە زمانی ئینگلیزی ئەمڕۆ دا ئیتر بەکار ناهێنرێ]، ty / sy (Gr. ) سەر بە ریشەی ***tu- > (IE.)*** "تۆ".

**تۆپ[1] top** - "1- گۆی یاری کردن 2- ئامرازی شەر": توپ tūp (P.).

1- لە لایەکەوە تۆپ دەتوانێ لە ریشەیەکەوە هاتبێ بە مانای "لێدان"، واتا "تۆپ" گۆیەك بووە کە لێی دراوە، یان بە شەق [تۆپتۆپێن]، یان دواتر لە شێوەی تۆپی شەر سازیان کردووە و بۆ لێدان و کوتانی یەکتر بەکاریان هێناوە. ئەم وشەیە بە چەشنێکی دیکە لە وشەکانی ↑تفنگ tıfeng [ tofang (P.)] و ↑دەمانچە demaçne [tapançe (P.)] شدا دەردەکەوێ کە ئەوانیش ئامرازی لێدانن. دە زمانی فارسیدا توپ و تشر tūp u tašar (P) و توپیدن tūpīdan (P.) هەیە بە مانای "لێدان بە تانە و تەشەر، پەلامار دان و کوتان بە قسە". ئەم وشە فارسییانە ئەو پێوەندییانەی سەرەوە بە باشی روون دەکەنەوە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەپ *tep*[4] "پەلامار". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها تۆپ دان top dan هەیە بە مانای "شکست دان" و ئەمەش هەر پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و دە بنەڕەتدا مەبەست "لێدان" بووە.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑تەپ(ە) tep(e) "گرد، تەپۆڵک"ەوە هەبێ. پێوەندی دوو چەمکی "خڕ بوون" و "تەپە" دە وشەی "گرد"یشدا دەردەکەوێ کە هەر دوو مانای سەرەوە بە دەستەوە دەدا. وشەی "تۆپەڵە" بە شێوە و مانا زۆر نیزیکە لە ↑تۆفلە tofle "خونچە، شکۆفە".

**تۆپ² top** - "لوولە": دە زمانی کوردمادیدا کاتێک دەڵێن "تۆپێک پارچە"، بێگومان ناتوانێ مەبەستەکە پێوەندی بە "تۆپ1" بە مانای "گۆی تۆپێن"ەوە هەبێ، بەڵکوو مەبەست لە تۆپێک پارچە ئەوەندە پارچەیە کە لە دەوری لوولەیەک هەڵکراوە. کەوابوو تۆپە پارچە واتا پارچەی لوولە کراو. تۆپ بەم مانایە دەشێ پێوەندی هەبێ بە tubus و tuba (L.) "لوولە".

**تۆپز topız** - " کوتەکی سەر بە بزمار": توپوز topoz (P.) "گۆپاڵ". خزمە دەگەڵ ↑تەپان tepan "تیڵای گەڵا کوتان" و ↑تەپ *tep⁴* "پەلامار".

**تۆپین topîn** *[ topīn ]* - "مردنی ئاژەڵێک کە گۆشتی نەخورێ": دە زمانی ئاڵمانیدا کرداری betäuben (G.) هەیە بە مانای "سڕکردن" [کەرتی -be لە وشەکەدا پێشگری کردارە]. ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ taub (G.) و deaf (E.) و döv (Sw.) بە مانای "کەڕ" [دە بنەڕەتدا ئەوکەسەی گوێی سڕ و بێهەستە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑تەپ tep و ↑تۆز toz و سەرەتا مەبەست ئاماژە بە دۆخێکی "تەپ و تۆزاوی، تەمگرتوویی، ناهەستیار، وڕ و گێژی" کراوە. وشەی doof (G.) "گەمژە، ساویلکە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. "تۆپین" دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ئەم وشە ژێرمەنییانە و سەرەتا هەر بە مانای "سڕ بوون، لە هەست و خوست کەوتن" بووە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها تەزین tezîn و تەڤزین tevzîn بەکار دێن بە مانای "سڕ بوون". شێوەی تەڤزین tevzîn شێوەی کۆنتری وشەکەیە و دە کوردمادی تیوەراستدا فۆتیمی v سواوەتەوە [هەروەک "زستان" و "زڤستان"]. ئەم فۆتیمە دەبێ سەرەتا b بووبێ کە دە وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوەدا دەیبینین. کەوابوو تەزین tezîn و تەڤزین tevzîn دەبێ دە بنەڕەتدا تەبزین *tebzîn** بووبێ و ئەمەش دەگەڵ taub (G.) "سڕ" یەک دەگرێتەوە. لەم تیروانینەوە هەم "تۆپین" و هەمیش "تەڤزین" دوو وشەی خزمن کە لە یەک بنەوشە سەرچاوەیان گرتووە و سەرەتا هەردووک بە مانای "سڕ بوون" بەکار هاتوون، دواتر جیاوازییەک دە ماناکانیاندا پەیدا بووە. وشەیەکی دیکەش کە لەم پێوەندییەدا سەرنج رادەکیشێ، ↑تەوشین tewışîn ە [ڤەتەوشین vetewışîn "سەر سووڕمان، واق وڕ مان"]. وەک دەردەکەوێ، ئەم مانایەش دەگەڵ ماناکانی سەرەوە وەک "وڕ و گێژی، ناهەستیاری، سڕی" بە باشی رێک دەکەوێ، چەنکوو مرۆڤی سەرسوڕماو وەک ئەوە وایە کە تووشی وڕی و گێژی و سڕی بووبێ و لە دەمی سەر سووڕماندا توانای کاردانەوەی ژیرانەی لێ بزر دەبێ و بە دیتنی دۆخێکی سەیر و سەمەرە لە جێی خۆی رەق دەبێ، هەڵی سەنگینە دەگەڵ doof (G.) "گەمژە، ساویلکە" کە لەسەرەوە ئاماژەی پێ کراو.

[تیبینی 1: زۆر لەو وشانەی کە ئەمڕۆ لە پێوەندی دەگەڵ ئاژەڵ بەکار دێن و بەکار هێنانیان بۆ مرۆڤ وەک ئەتک و بێ رێزی سەیر دەکرێ، لە سەردەمانی کۆندا وشەی نۆیتراڵ و بێلایەن بوون. ئەم وشانە یان بە گشتی بۆ هەردوو لا بەکار هاتوون، یان وشەیەکی گشتی گۆڕاتیکی بچووکی تێدا کراوە، بە مەبەستی ورد کردنەوەی زۆرتر دوو شێوەی لێ دروست کراوە و ئەو دوو شێوەش لە تیوان مرۆڤ و ئاژەڵدا بە یەکسانی بەش کراون! وێ دەچێ مرۆڤی کەونارا هێندەی رۆڵەکانی ئەمڕۆیان بەفیز و لەخۆبایی نەبوون و مانای رێز و بێ رێزییان دە شتی دیکەدا دۆزیوەتەوە! بۆ نموونە بەراوردی ئەم وشانەی خوارەوە بکە: هۆرە [جۆرێک گۆرانی] و وەڕین، قڕە [دەمەقڕە] و قورسکە [زیقەی سەگ]، قیژە و بایەقووش، شیوەن و سۆنە، کەپۆ و قەپۆز، پیش یان پشوو و پۆز [لمبۆز]، گەنج [لاو] و کەندۆ [پارێن، پاتیر]، سەولە [نانی سەگ] و زبرە یان گەورە، حەپین یان گەفین [بۆ سەگ] و حەپەسان، قۆنداخە [زارۆکی شیرەخۆر] و کوند [کوندەبەبوو]، کورتان [جلی کەر] و کورتەک [کەوای پیاوانە]، تف [ئاوی دەم] و تەڤژین [ریخی شل]، لەپ [بەری دەست] و لووشک [کۆنتر: *لەپچک]، قرنوو و گەرناس و بە دەیانی دیکەش! تیبینی 2: بۆزانیاری پتر لەسەر پێوەندی دوو چەمکی "مردن" و "سڕ بوون" دەتوانین ئاماژە بکەینە وشەی sterben (G.) "مردن" کە دە بنچینەدا بە مانای "رەق هەڵاتن" بووە].

**تۆپاندن topandın** *[ topāndın ]* - "1- مردارکردن 2- لێدانی زۆر": دە زمانی ئەڵمانیدا و بێگومان دە زمانەکانی دیکەشدا هێندێک جار وشەی وا بەرچاو دەکەون، کە لە تیکەڵاوی یان لەژێر کارتیکەری دوو وشەی جیاواز بەڵام شێوەنیزیکدا دروست بوون. وشەی "تۆپاندن" دە زمانی کوردمادیدا دەشێ وشەیەکی ئەوتۆ بێ. ئەم وشەیە لە لایەکەوە پێوەندی بە گەلێک وشەوە هەیە کە مانای "لێدان، کوتان" دەبەخشن [بڕوانە ↑تەپ[4] *tep* و ↑تۆپ top]، لە لایەکی دیکە پێوەندی بە ↑تۆپین topîn "مردار بوون"ەوە هەیە. ئەم وشانە هەر کامیان سەر بە ریشەیەکی جیاوازن و ماناکانیشیان جیاوازە، بەڵام لە هەمان کاتدا شێوەی وشەکان لە یەکتری دەچن و جۆرێک پێوەندی ماناییش لە نیوانیاندا دروست بووە، واتا لێدانی زۆر دەبێتە هۆی مردار بوون [یاخود تۆپین]. بە وتەیەکی دیکە "تۆپاندن" دە ئەسڵدا بە مانای "لێدان" بووە و سەرەتا هەم بۆ مرۆڤ و هەم بۆ ئاژەڵ وەک یەک بەکار هاتووە. ئەوجار کاتیک لە ئەنجامی تۆپاندن [لێدان]ی ئاژەلێک ئەو ئاژەڵە تۆپیوە [مردووە]، ئیتر "تۆپاندن" مانایەکی تازەی وەرگرتووە و بووەتە "مردار کردنی ئاژەڵ بە هۆی لێدانەوە".

**تۆخ 1 tox** - "تاریک رەنگ": [سووری تۆخ واتا سووری ئاماڵ رەش]. خزمە دەگەڵ dusk ‏(.E)، dosk ‏(.ME)، dox ‏(.OE) "تاریک رەنگ، تۆخ"، doxian ‏(.OE) "تاریک بوون لە رەنگدا، تۆخ بوون"، tusin ‏(.OG) "تاریک رەنگ"، سەر بە ریشەی **(.IE) *dhuskos- <** "تاریک، رەش". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑دێز dez "1- رەش، رەشی ئاماڵ بۆر 2- شووم 3- بەدبەخت" و **طوسی** tūsī ‏(.P) "بۆر".

**تۆخ 2 tox** - "قەڵەو، توند، بەهێز": خزمە دەگەڵ چاق çaq ‏(.P)، dick ‏(.G)، thick ‏(.E)، tjock ‏(.Sw) "قەڵەو"، سەر بە ریشەی **(.IE) * tegu- <** "قەڵەو، بەخۆدا هاتن". دە عەرەبیدا ضخم zexm ‏(.Arb) "ئەستوور، زڵ" دەشێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ. هەروەها دە کوردمادیدا ↑تۆکمە tokme "پتەو، بەهێز" لەوانەیە بچێتەوە سەر ئەم ریشەیە. لەوانەیە وشە عەرەبییەکە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**تۆخ 3 tox** - "جوقەی کڵاوی پادشایان": خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تاج tac "کڵاوی پادشایان". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑تۆک tok و تۆیخ و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "داپۆشین" دەگەن.

**تۆڕ 1 tor** - "پارچەیەگی کون کون": تور tur ‏(.P) و tüll ‏(.G). ئەم پارچەیە لە شارێکی فەرەنسی بەناوی tulle دروست کراوە و بەناوی شارەکە کراوە.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا وشەکە مانایەکی بەرینتری وەرگرتووە بە هەموو ئەو شتە چنراوانە دەگوترێ کە کونکون یاخود تان و پۆ دار بن، وەک تۆڕی ماسیگرتن، تۆڕی چراتۆڕ و تەنانەت تۆڕی کارەبا و ئینتیرنێت].

**تۆڕ 2 tor** - "وەحشی، نادەستەمۆ، دەستنامۆ": خزمە دەگەڵ ↑توورە ture "قەڵس" و پێکەوە دەچنەوە سەر ریشەیەک بەمانای "دڕین" [هەڵدرین].

**تۆراخ torax** *[ torāx ]* - "ماستی ئاولێگراوی توندکراو": خزمە دەگەڵ Quark ‏(.G)، twarc و zwarg ‏(.MG). وشە ئاڵمانییەکە لە زمانە سڵاڤییەکانەوە وەرگیراوە: twarog ‏(.Pol )، tvaroh ‏(.Chek). دە زمانی ئەوێستادا turaii ‏(.Av) و دە یۆنانیدا tyros ‏(.Gr) بە هەمان مانا بەکار هاتوون.

**تۆران toran** *[ torān ]* - "رەنجان": هەروەها تۆراندن هەیە بە مانای "رەنجاندن". خزمە دەگەڵ thole ‏(.E) "رەنج، ئازار"، tholian ‏(.OE)، dolēn ‏(.OG)، tulan ‏(.Gt) "رەنج کیشان". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی **(.IE) *tol-, *tel- <** "هەڵگرتن، تەحەممول کردن".

**تۆراندن torandın** *[ torandın ]* - "توورە کردن": ↑توورە ture.

**تۆرتۆ torto** - "قەیچی، مەقەست": خزمە دەگەڵ ↑دڕان dıran و دڕاندن.

**تۆرکە torke** *[ torka ]* - "تۆڵەکە، نانە حاجی لەکەلەکە": ئەم وشەیە دە فارسیدا وەک "پنیرک" مانا کراوەتەوە ["فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"، ل. 153]. ئەگەر ئەم شتە لە زمانی فارسیدا بە "پەنیر" چوێنرابێ، دەشێ دە زمانی کوردمادیشدا تۆرکە torke پێوەندی بە ↑تۆراخ torax ەوە هەبێ.

**تۆره1 tore** [ *tora* ] - "فرزەندی هەوێ": هەروەها دەگەڵ "سۆرە" دێ [سۆرە و تۆرە sore u tore]. لە لایەکی دیکەوە وەک بنەوشە لە ↑تۆرەمە toreme دا دەیبینین بە مانای "بنەچەکە". خزمە دەگەڵ تیرە tîre (P.) "تایفە، بنەچەکە". ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ وشەی ↑دار dar.

[تێبینی: دە زمانی ئاڵمانیدا Stamm "تەنە" (دەبنچینەدا تەنەی دار) جگەلەم مانایە، هەرلە کۆنەوە مانای "خێڵ، تیرە و تایفە"شی وەرگرتووە. ئەم وێچواندنەش بە هۆی ئەوەوە بووە کە تەنەی دار لک و پۆپی زۆری لێ دەبێتەوە، هەروەک چۆن تیرەیەکی مرۆڤیش گەلێک نەوە و نەتیجەی لێ دەکەوێتەوە. هەروەها دە زمانی کوردمادی و فارسیدا وشەی "شەجرەنامە" بەکار دێ کە پێوەندی بنەماڵەکانی سەر بە تیرەیەک نیشان دەدا - "شجرە" وشەیەکی عەرەبییە بە مانای دار].

**تۆره2 tore** [ *tora* ] - "ئەدەب": وشەکە هەم بە مانای "نەزاکەت" بەکار دێ و هەم بە مانای "وێژە، ئەدەبیات". تۆرەڤان torewan دەبێتە "ئەدیب، وێژەوان". [سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "نەزاکەت" و "وێژە" بڕوانە شی کردنەوەی وشەی "ئەدەب"]. هەرچی "تۆرە"یە، دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تیرە tîre و ↑تۆرەمە *toreme*"ئەسڵ و نەسەب" و هەروەها ↑تۆره1 tore. دە بنەڕەتدا کاتێک گوتراوە فڵانە کەس بە تۆرەیە، مەبەست ئەوە بووە کە ئەو کەسە بە ئەسڵ و نەسەبە یان نەجیب زادەیە. لێرەوە دواتر مانای "نەجابەت، نەزاکەت"، واتا "ئەدەب" پەیدا بووە و دواتریش لەمەوە مانای "وێژە و ئەدەبیات".

[تێبینی: دیارە دە سەردەمانی کۆن و بە داخەوە دە سەردەمی ئێستاشدا تۆێژی دەسەڵاتدار لە ڕێگای قەڵەم بەدەستان و مێشک فرۆشانی سەر بە دیوان و دیوەخانەکان وایان بردووەتە ناو مێشکی مرۆڤەکان کە ئەدەب و نەزاکەت و نەجابەت پێوەندی بە ئەسڵ و نەسەبەوە هەیە و ئەو کەسانەی لە ئەسڵ و نەسەبی دیار و بەرچاون، واتا لە بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانەوە پەیدا بوون، کەسانی نەجیب و نەجیب زادەن. پێوەندییەکی لەم چەشنە دە زمانی ئەڵمانیشدا بەرچاو دەکەوێ: وشەی edel (G.) "ئەسڵ، ڕەسەن، بەنرخ" خزمە دەگەڵ Adel (G.) "نەجابەت، ڕەسەنایەتی، ئەشراف زادەیی" و adlig (G.) "ئەشرافی، نەجیب زادە". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ وشەی "ئەسڵ"].

**تۆرەمە toreme** [ *torama* ] - "بنەچەکە": خزمە دەگەڵ ↑تۆره tore "تیرە، تایفە".

**تۆز toz** - "گەرد": توخ tux یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Dunst (G.) "هەلم و هاڵاو"، tunst (OG.) "گەردەلوول"، dust (E.) "تۆز"، duša (OSlaw.) "هەناسە"، dhū-má-h (OIn.) "دووکەڵ"، thymós (Gr.) "رووح، تارمایی"، tūmōn (OG.) "هاڵاو، دووکەڵ"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *dheu- >*** "دووکەڵ کردن، هەڵم و هاڵاوکردن، هەناسە، با هاتن" [دە بنچینەدا ریشەکە ئاماژە بە حاڵەتی پڕ لە جم و جۆڵی نائارام و تێکەڵ بوون و خوولانەوەی با، هەڵم، دووکەڵ و تەپ و تۆز دەکا. هەربۆیەش گەلێک وشە دە زمانە هیندوئەوروووپییەکاندا کە ئاماژە بەم حاڵەتانە دەکەن، دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە]. وشەی ↑تەم tem "هەڵم، مژ" یش بە خۆی و بە ریشەکەیەوە دە پلەیەکی دوورتردا هەر دەبێتەوە خزم دەگەڵ ئەو زنجیرە وشانەی سەرەوە.

**تۆزین tozîn** [ *tozīn* ] - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ، هەڵتۆزین heltozîn واتا تووڕە بوون و هەڵچوون. خزمە دەگەڵ ↑تۆسن tosın و دە پلەیەکی دواتردا دەگەڵ ↑تۆز toz.

**تۆژ toj** [ *tož* ] - "لایەی سەرەوەی هێندێک شت": تووژ tuj، توێژ tuej، توشک tuşk یش دەگوترێ. بڕوانە ↑تۆکڵ tokıl.

**تۆسن tosın** - "تووڕە": دە کوردمادیدا زۆرتر دەگەڵ وشەی "تووڕە" دێ [تووڕە و تۆسن tûre û tosın]. دە فارسیدا زۆرتر مانای " تۆڕ، وەحشی" دەدا [ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ هاوریشە بوونی دوو وشەی تۆڕ و تووڕە]. توسن tousan (P.) "وەحشی، نادەستەمۆ، سەرکێش". خزمە دەگەڵ tosen (G.) "دەنگە دەنگی توند لێهەستان، هەڵچوون"، tys (OE.) "تۆفان"، thyo (Gr.) "شاڵاو دەبەم"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *dheus- >*** "هەڵچوون، دەرپەڕین". دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz.

**تۆشڵ toşıl** - "تۆکڵ": شێوەیەکی لە ↑تۆژ toj و ↑تۆکڵ *tokıl*.

**تۆف 1 tof** - "وارشی باغ و بێستان": خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın. تۆف بەو دیوارە یاخود بەربەستە گوتراوە کە بە دار و چرپی تەنراوەتەوە.

**تۆف 2 tof** - "کرێوە، باپێچ": ↑تۆفان tofan.

**تۆفاڵ tofal** [ *tofāl* ] - "توێژی تەنک لە مس کە لە کوتاندا دەوەرێ": خزمە دەگەڵ ↑تۆفل tofıl "تۆکڵ، توێژ" و ↑*تۆک/ تۆکڵ tok / tokıl*.

**تۆفان tofan** [ *tofān* ] - "بای توند و وێرانکەر": خزمە دەگەڵ toben (G.)، dofian (OE.) "شلۆقی کردن، بە توندی جوڵانەوە، خۆ بەم لا و ئەولادا دان". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ taub (G.)، daufs (Gt.)، deaf (E.)، dōv (Sw.) "کەڕ، سڕ" [دەئەسڵدا تەماوی، تۆزاوی] و هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz.

**تۆفانە tofane** [ *tofāne* ] - "پێشکە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑تەپ tep[4] "لێدان"دا باس کراون، بۆ وێنە ↑تەپۆ tepo "مێشوولەیەکی وردە کە پیس پێوە دەدا".

**تۆفل tofıl** - "تۆکڵ، تیخوڵ": خزمە دەگەڵ تاول tāwal (P.) "توێخ و بلۆقی دەست بە هۆی کاری سەخت یان سووتان" و ↑تۆکڵ tokıl.

**تۆفلە tofle** [ *tofla* ] - "خونچە، شکۆفە": خزمە دەگەڵ ↑زۆپ zop و ↑زیپکە zîpke و دواتر ↑*تەپ(ە) tep(e)* "گرد، شاخ". هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە "زەق و دەرپەڕیو بوون" دەکەن.

[تێبینی: پێوەندییەکی لەم چەشنەی سەرەوە دە تیوان ئەم وشانەی خوارەوەشدا بەدی دەکرێ کە پێکەوە خزمن: *زەق "دەرپەڕیو"*، *سیچکە* "خونچەی دار"، *سیچکەسڵاو* "باپشکێو، زیپکەی بان مژۆڵ" و *شاخ* "1- کێو 2- قۆچ"].

**تۆفە tofe** [ *tofa* ] - "چینەی دیوار لە قوڕ": خزمە دەگەڵ ↑تۆفل tofıl "تۆکڵ، تیخوڵ"، ↑تۆفاڵ tofal "توێژی تەنک لە مس کە لە کوتاندا دەوەرێ" و ↑تۆکڵ tokıl. هەموو ئەم وشانە مانای "چین و توێژ" دەگەیەنن.

**تۆڤ tov** - "جۆر، شێوە": [چتۆڤ واتا چۆن، چلۆن، چتور]. خزمە دەگەڵ وشەی یۆنانی typos (G.) [بڕوانە ↑تیپ tîp] و هەروەها تۆر tor [چتۆر] یان تەور tewır [چتەور] و دواتر ↑تەبارە tebare.

**تۆق[1] toq** - "ئاڵقەی مل": تەوق tewq یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تاقم taqım "دەستە" سەر بە ریشەیەک بە مانای "کێشان، راکێشان".

**تۆق[2] toq** - "تەپڵەسەر، بڵیندترین شوێن": تەوق tewq یش دەگوترێ و ئەمەش شێوەی گۆڕدراوی ↑تەپک tepk"تەپۆڵک، گردی بچووک"ە و لەوێشەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەپە *tepe* و ↑تۆپ top. [تەپک← تەوک ←تەوق ←تۆق].

**تۆقلە toqle** [ *toqla* ] - "پۆرکێ، توێخی پێست": خزمە دەگەڵ ↑تۆک/ تۆکڵ tok / tokıl.

**تۆقین 1 toqîn** [ *toqīn* ] - "1- تەقین 2- ترسانی لەڕادەبەدەر": شێوەیەکی دیکە یە لە ↑تەقین teqîn بە واتای "لەبەریەک هەڵوەشانی توند و خێرا". مانای "ترسانی زۆر" بۆ ئەم وشەیە دەبێ لێرەوە پەیدابووبێ کە وا بیرکراوەتەوە بەهۆی ترسی لەڕادەبەدەر کیسەی زراوی مرۆڤ دەتەقێ. دە فارسیدا "زهرە ترک شدن" هەیە بەمانای "زراو چوون لە ترسان" [زراو تەقین]. وشەی ترک tarak (P.) ی فارسی دەچێتەوە سەر کرداری ترکیدن terakīdan (P.) "تەقین" و دە گەڵ وشەی کوردمادی "تەقین" خزمە. فۆتیمی r دە وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە. ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا بە شێوەی ↑ترۆقان tıroqan یش بەر چاو دەکەوێ کە تییدا فۆتیمی r پارێزراوە.

**تۆقین[2] toqîn** [ *toqīn* ] - لەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ [↑هەڵتۆقین heltoqîn "قیتەوە بوون، دەرپەڕین"]. "تۆقین" بەم مانایە چ پێوەندییەکی بە *تۆقین*[1] "تەقین"ەوە نییە. ئەم "تۆقین"ە خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑دەکە deke، ↑دوکان dukan، ↑دەکەل dekel، ↑دوگمە dugme، ↑دۆخ dox "تیری کەوان"، ↑دووخ dux "ئاستێکی نووک تنژ لە خەڕەکدا" و هتد. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە "دەرپەڕین، زەق بوون" دەکەن و خزمن لەگەڵ ↑*زەق zeq*.

**تۆك(ڵ) (tok(ıl** - "پێستی دار، گژ و گیا و میوە": تیکوڵ/ توێکڵ toekıl / tekul یش دەگوترێ. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەك هەن کە بە چەند مانای هێندێک جیاواز بەکاردەهێنرێن، بەڵام مانا و شێوەکانیان دەری دەخەن کە هەموویان سەر بە یەك خێزانە وشەن، وەك تۆ to یان ↑توێ tue، ↑توێخ tuex، ↑توێژ / تۆژ toj / toej، ↑تۆشڵ toşıl، توشك tuşk، ↑تۆفل tofıl "تۆکڵ، تیخوڵ"، ↑تۆفاڵ tofal "توێژی تەنك لە مس کە لە کوتاندا دەوەرێ"، ↑تۆقلە toqle "پۆرکێ، توێخی پێست"، ↑تەفشك tefşık "1-تەڵاش لە بەرد یان لە دار 2- کرێژی سەر"، ↑تەوشك tewşık "کەش، جەوو، هەوای دەوری زەوی"، ↑تیفشاڵ tîfşal "توێژاڵك" و هتد. وەك دەبینرێ چەمکی گشتی لەم وشانەدا بریتییە لە شتێك کە لێ دەکرێتەوە، دەتاشرێ، دادەنڕێ. پێوەندی ئەم چەمکانە بە یەکەوە لە چەندین وشەی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ. وشەی "چین" [چین و تۆژ] خزمە دەگەڵ "شکاندن" [بە فارسی "چین و شکن" واتا قەد، لۆ، گنج، واتا چەند تۆژێك کە دەکەونە سەر یەکدی]. وشەی "قاشك" یان "قاشڵ" بە مانای تۆکڵ خزمە دەگەڵ "قاش"، "قوسان" بە مانای تاشین و "گوێزان". دە زمانی ئەڵمانیدا Rinde "تۆکڵەدار" خزمە دەگەڵ "ردێن" [رندێن] و "رەندە" و "رنین". کاتێك لەم پێوەندییانە ورد بینەوە، بەم ئەنجامە دەگەین کە وشەکانی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *(s)teu- >* "لێکدان، وێککەوتن". لەم ریشەوە گەلێك وشەی بە مانا "لێدان" پەیدا بوون کە ژمارەیەکیان لەژێر ↑تەپ[4] tep "پەلامار" و ↑تەپاندن tepandın "لێدان"دا باس کراون. چەندین وشەی دیکەش لەم ریشەوە هاتوون، وەك ↑تاشین taşîn، ↑تووش tûş [تووش بوون واتا وێککەوتن]، ↑تەوقە tewqe [دەست لێدانەوە] و بە شیمانەیەکی بەهێز هەروەها ↑تووك tuk "قژ". [جێی ئاماژەیە کە "قژ" خزمە دەگەڵ چەند وشە کە سەرتر باس کران، وەك "قاش"، "قوسان" بە مانای تاشین و "گوێزان"]. بەم جۆرە دەر دەکەوێ کە "تۆکڵ" و گشت وشە هاوشێوە و نیزیکەکانی، دە بنەڕەتدا ئاماژەیان بەو شتە کردووە کە بە هۆی تاشین و لێدان لێ کراونەوە [جودا کراونەوە]. دە زمانی فارسیدا لەم پێوەندییەدا وشەی تاول tāwal (.P) هەیە کە ماناکەی دەبێتە "توێخ و بلۆقی دەست بە هۆی کاری سەخت یان سووتانەوە". ئەم وشانەی سەرەوە بە شێوەیەکی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا پارێزراون کە بریتییە لە تەبەق tebeq یان ↑تەبەقە tebeqe "نهۆم" [دە بنەڕەتدا: چین و توێژی خانوو]. ↑تەبەق tebeq یان تەبەك tebek هەروەها ناوی "نەخۆشییەکی ئاژەڵە" کە دەشێ پێوەندی بە "تۆیخ بەردان"ەوە هەبێ. شێوەی کۆنتری ئەم وشانەی دوایی "تەبەك" یان "تەپەك" بووە کە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و پاشان شێوە عەرەبێنراوەکە، واتا "تەبەقە" هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و فارسی، هەر وەك چۆن لە وشەی "هاڵقە" و گەلێك وشەی دیکەشدا ئەم دیاردەیە رووی داوە.

**تۆکمە tokme** [ *tokma* ] - "بەهێز، پتەو":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تۆخ tox "بەهێز، توند".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑تەژی *tejî* "پڕ" و ↑تەژە teje "زل و زەبەلاح".

[تێبینی: دە زمانی ئەوێستادا taxma (.Av) بە مانای "چڕ، توند، پەیت" بەکار هاتووە و بە گوێرەی بۆچووتێك ئەم وشەیە پێوەندی بەم وشە ژێرمەنییانەوە هەیە کە لەژێر تەژی tejî دا باس کراون].

**تۆڵ[1] tol** - تۆل دان واتا "وێران کردن". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تلێشان tılîşan.

**تۆڵ[2] tol** - "پیزە، بێچووی ناو سك": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تۆڵ tol "توند، سفت". مەبەست ئەوەیە کە بێچووەکە خۆی گرتووە، واتا لە دۆخی "شلك و ئاوەکی" بوونەوە گەیشتووەتە دۆخێکی سفت و جێگرتوو.

**تۆڵ tol** - دە گەڵ "توند" دێ [توند و تۆڵ tund u tol]. خزمە دەگەڵ tulgus (.Gt) "توند، سفت". ئەم وشەیە دەبردرێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *stei- >* "رەق بوون، مەیین". stéār (.Gr) و Talg (.G) "رۆنی پاڵاوتەی مەییو" و هاوتاکانی ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا دەبردرێنەوە سەر ئەم ریشەیە. جگە لەمە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑تۆلا tola بە مانای "پێکەوەنووسان و رەق بوونی شتی ورد" و هەروەها ↑تۆل tol بە مانای "پیزە، بێچووی ناوسك" دێ. ئەم وشانە پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و مەبەست لە تۆل بە مانای "پیزە"ش خۆ گرتن و سفت بوونی پیزەیە لە ناو منداڵدانی دایکدا.

[لەباری پێوەندی دوو چەمکی "توند و تۆڵ، ڕەق" و "پێکەوەنووسان" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی *خار* "ڕەق" و *گرسە* "تولا". ئەم دوو وشانەی دواییش پێکەوە خزمن].

**تۆلا tola** *[ tolā ]* - "پێکەوەنووساوی ڕەق بوو": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تۆڵ tol [توند و تۆڵ].

**تۆڵە tole** *[ tola ]* - "1- قەرەبوو 2- ئینتیقام": تۆڵ tol یش دەگوترێ: ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ڕیشەی < *(IE.) *tol-, *tel-* "لا بردن، هەڵگرتن، تەحەممول کردن، تەحمیل کردن، بردنە ژێربار". دە زمانی یۆنانیدا télos (Gr.) لەم ڕیشەوە هاتووە و ماناکەی دەبێتە "تەحمیل کردن، *بژاردن*، پیتاک". وشەی Zoll (G.) "گومرگ" دەچێتەوە سەر ئەم وشە یۆنانییە. لەرووی مانای ڕیشەکەوە و هەروەها مانای وشە یۆنانییەکە دەردەکەوێ کە "تۆڵ" یان "تۆڵە" دە ڕاستیدا چوونە ژێر بار یان بردنە ژێر باری لایەنی بەرانبەرە واتا داسەپاندنی سزا، جەریمەی نەغدی، بژاردن [قەرەبوو]، بەرپرسیارەتی یان پیتاکە. کەوابوو کاتێک مرۆڤ تۆڵەی شتێک دەداتەوە، ئەوە بەو مانایەیە کە ئەو دەچێتە ژێر باری بەرپرسیارەتی ئەو کارە و ناچار دەبێ لە بەرانبەردا شتێک بە ئەستۆ بگرێ یاخود تەحەمموول بکا. هەروەها کاتێک باس لە تۆڵە کردنەوە [دروستر: تۆڵە ستاندنەوە- تۆڵە دانەوە و تۆڵە ستاندنەوە] دەکرێ، ئەوە بریتییە لەوەی کە لایەنی بەرانبەر دەبردرێتە ژێر باری بەرپرسیارەتی و ناچار دەکرێ بە جۆرێک ئەم بارە لەسەر خۆی *لا ببا*، جا یان بە دانی پیتاک، قەرەبووی ماڵی یان بە شێوەی دیکە. ئەم وشەیە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆران toran "ڕەنجان" و هەروەها ↑دۆڕان doran "بەزین، شکست خواردن". کەسێک کە لە کایە یان لە شەڕدا دەدۆڕی، بێگومان ناچارە باجی دۆڕانەکەی بە جۆرێک بدا. هەروەها لەوانەیە ↑بەرتیل bertîl "ڕیشوە"ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی نێوان *تۆران* "ڕەنجان" و تۆڵە "ئینتیقام" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ Bürde (G.) و aufbürden (G.). وشەی یەکەم بە مانای "باری قورس، ڕەنج، خەم و گوشار"ە و وشەی دووەمیش کە لەوەی یەکەمەوە وەرگیراوە، ماناکەی دەبێتە "خستنەژێر باری بەرپرسیارەتی یان تاوان". جێی سەرنجە کە ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ "بردن" دە زمانی کوردمادیدا و دەچێتەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *bher-* "هەڵهێنان، هەڵگرتن، بردن". وەک دەبینین هەم ڕیشەی ئەم وشانە و هەم ڕیشەی وشەکانی "تۆلە" و تۆران" ئاماژە بە مانای "هەڵگرتن، حەمل کردن" دەکەن].

**تۆمار tomar** *[ tomār ]* - دە فارسیدا تومار tūmār (P.). مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە "پێچراوە" بووە و بۆ کاغەزی پێچراوە بەکاریان هێناوە. [ڕەنگە سەرەتا بۆ شتی دیکەش بەکاریان هێنابێ]. دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا "تۆمار کردن" هەروەها بۆ هەڵگرتنەوەی دەنگ و وێنە لەسەر نەوار بەکاردەهێنرێ و ئەوەش دیسان پێوەندی هەیە بە سووڕان و "پێچرانەوە"ی نەوارەکە. بنەوشەی تۆم -tom بە چەند شێوەیەک دە هێندێک وشەی دیکەشدا دەبیندرێ وەک ↑توومان tuman "تەپ و تۆز"، ↑تەموو temu "تۆپی ئاش"، ↑تۆمپز tompız "سەرمەقولات"، ↑تەمباڤ tembav "گێژاو"، ↑تەمەرە temere "بەڵا و گیرەوکێشە" [دە ئەسڵدا ئاژاوە و بشێوی؟]. چەمکی هاوبەش لەم وشانەدا "سووران، خول خواردن "ە. هەرلەم پێوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بکەین بە tūmōn (OG.) "دەناو جەغزێکدا سووڕانەوە" و taumeln (G.) "گێژ بوون، بە لادا هاتن ". گشت ئەم وشانە دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz.

**تۆمپز tompız** - "سەرمەقولات": تۆم + پز tom + pız. کەرتی یەکەم ئاماژە بە چەمکی"سووڕان" دەکا [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تومارtomar]. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە بز/ بەز و پێوەستە بە کرداری ↑بزووتن bızutın. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە بزاڤێکی تێکەڵ بە سووڕان [خۆ سووڕاندن].

**تۆو tow** - "دەنکی چاندن و بەرهەم هێنان": تۆم tom و توو tu ش دەگوترێ. شێوەی نوێتری ↑توخم tuxm.

**تۆێ 1 toe** *[ toe ]* - "تۆێخ": خزمە دەگەڵ ↑تۆک(ڵ) tok(ıl).

**تۆێ 2 toe** *[ toe ]* - "هەناو": ["لەتوێ" باسەکەدا، واتا لەناو باسەکەدا]. تو tū (P.). خزمە دەگەڵ ↑تێ² te "پێشگری کردار"، وەک تێکردن te-kırdın واتا دەناو کردن، کردنە ناو، تێخستن te-xıstın واتا دەناو خستن، خستنە ناو ...

**تۆی toy** [ toe ] - "شایی، زەماوەند": هەروەها تۆیانە toyane هەیە بە مانای "نوقڵ و شیرنی کە دەگەڵ جیاز بەڕێ دەکرێ". سەر بەو خێزانەوشەیە کە مانای "با دان، لێکهاڵاندن، بەم لا و ئەو لادا جوڵاندن" دەگەیەنێ، وەک ↑تابەن taben "شیرازەچن"، ↑تەون tewın، ↑تەواندن tewandın "نووشتاندنەوە، قەد کردن، پێچانەوە، لوول دان"، ↑تەوەنە tewene "کۆگا، تۆپەڵ"، ↑تاوڵەمە tawleme "پن چەرخێن" و چەندین وشەی دیکە. دە فارسیدا وشەی تاب tab (P.) "خول، پێچ، سووڕ" شێوەیەکی دیکەیە لە بنەوشەی تاف -taf دە کرداری تافتن tāftan (P.)دا. ئەم کردارە مانای "تەون کردن، چنین" دەدا. کاری چنین و تەون کردن دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە پێچاندن و سووڕاندن بەن و میل. بەم جۆرە مانای "شایی و زەماوەند" یان لە پێوەندی دەگەڵ چەمکی "خول، پێچ، سووڕ" دایە، وەک سەما کردن و جوڵاندنەوەی لەش بەم لا و ئەو لادا، یان لە پێوەندی دەگەڵ چەمکی "کۆگا، تۆپەڵ، لێکهاڵان".

[تێبینی: سەبارەت بەم پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین ئاماژە بە وشەی "سەما" بکەین کە پێوەندی بە "جمین"ەوە هەیە، واتا جووڵان. هەروەها وشەی جوڵان دەتوانێ هەمان وشەی "دیلان" بێ. دیلان [دیلانە، دیلانێ] هەم مانای "هەڵپەڕین" دەدا و هەمیش بە مانای "جۆلانە" کە ئەمەی دوایی بە فارسی پێی دەگوترێ تاب بازی tābbāzī. وشەی فارسی تاب tāb (P.) خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە و لەوانە تۆی toy "زەماوەند"].

**تۆێتکە toetke** [ toetka ] - "ئارامی، ئۆقرە": توتکە tutke ش دەگوترێ. تۆێتکە یان توتکە گرتن واتا "ئارام گرتن، هەدا دان". دەچێتەوە سەر ↑تووتان tutan [هەڵتووتەکان heltutekan] واتا "دانیشتن". **تۆێژ toej** [ toež ] - "تۆێخ": خزمە دەگەڵ ↑تۆک(ڵ) tok(ıl).

**تۆێخ toex** [ toex ] - "تۆێژ، پێست": خزمە دەگەڵ ↑تۆک(ڵ) tok(ıl) (تۆکڵ/ تۆێکڵ).

**تۆێڵ toel** [ toel ] - ↑تەوێڵ tewel.

**تهنوشک tıhnuşk** [ tıhnušk ] - "ئاڵوو هاتن، ماسینی بادامەی گەروو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ teşene "هەڵدان، پەرە سەندن، بڵاو بوونەوە".

**تەبا teba** [ tabā ] - "یەکگرتوو، بەهەڤرا، کۆک، تیوانخۆش": دەچێتەوە سەر ↑تەڤ tev "دەگەڵ".

**تەبارە1 tebare 1** [ tabāra ] - "1- لەمپەر، تیغە 2- هەرزاڵ": خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın بە مانای "تەنین، چنین، تیکخستنەوە".

**تەبارە2 tebare 2** [ tabāra ] - تەبار tebar یش دەگوترێ. دە "فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە"دا وەک "بارست" و فارسییەکەشی وەک "حجم" مانا کراوەتەوە. وێ دەچێ مانای بنەڕەتی وشەکە "قەوارە" بە مانای "هەیکەل، فۆرم، پێکهاتە" بێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تیپ tîp "شەقڵ، شێوە، حەرف" و typos (Gr.) "فۆڕم، شێوە، پێکهاتە، هەیکەل، مۆدێل". دە زمانی کوردمادیدا ↑تەوور tewır [تەویر tewîr] یش بە کار دێ بە مانای "جۆر، شێوە". وێ دەچێ ئەم وشەیە دە ئەسڵدا هەمان "تەبار" بووبێ کە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. هەروەها ↑ئەتوار etwar [ئەدا و ئەتوار e + t(ı)war] کە ئەویش دە بنەڕەتدا مانای "شکڵ و شێوە دەر هێنان" دەبەخشێ.

**تەبانە tebane** [ tabāna ] - "بانگردێن": خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın.

**تەبغە tebġe** [ tabġa ] - "سەرانگوێلک، کۆمای زبڵ و پەین": خزمە دەگەڵ ↑تەپاڵە tepale.

**تەبوور tebur** [ tabūr ] - "شەن، شەنە": بنەوشەی تەب -teb هەروەک تیف tîf [تیف تیفە] دەچێتەوە سەر کرداری ↑ساوین sawîn "سوونەوە، ساف و لووس کردن".

**تەبەتۆر tebetor** [ tabator ] - "جاڵجاڵووکە": تەبە + تۆر tebe + tor. کەرتی یەکەم پێوەندی بە ↑تەون tewın ەوە هەیە بە مانای "چنین، تەون کردن" و تیکڕای وشەکە مانای " تۆڕچن یان تەونگەر" دەدا.

**تەبەش tebeş** [ tabaš ] - "مەڕی تیوچاوان سپی": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تیپ tîp "حەرف" [دە ئەسڵدا واتا "شەقڵ، نیشانە"].

**تەبەق1 tebeq 1** [ tabaq ] - " سینی دار، تەختەی شت لەسەر دانان": تەبەک[1] tebek یش دەگوترێ کە شێوەی کۆنترە. خزمە دەگەڵ tabula (L.) "تەبەق، تەختە، مێز"، table (E.) "مێز"، Tafel (G.) "مێز، تەختە". وشە

ئینگلیزییەکە لە زمانی فەرانسەیی وەرگیراوە و ئەویش دەچێتەوە سەر وشە لاتینییەکە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی زمانی کوردمادی وەک ↑دەپ dep "تەختە"، ↑داب dab "یاسا، خەت، نووسراو" و دواتر ↑ئەدەب *edeb*.

**تەبەق2 tebeq** [ *tabaq* ] - "نەخۆشییەکی ئاژەڵە": تەبەک² tebek یش دەگوترێ کە شێوەی کۆنترە. خزمە دەگەڵ ↑تەبەقە tebeqe "قات، چین و توێژ" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑تۆکڵ *tokıl* دا باس کراون. ئەم وشانە بە گشتی چەمکی "تۆژ، توێخ" لەخۆ دەگرن. بەم جۆرە "تەبەق" دەبێ نەخۆشییەک بێ کە بە هۆیەوە تۆیخ لێ دەبێتەوە.

**تەبەقە tebeqe** [ *tabaqa* ] - "قات، چین و توێژ": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑تۆکڵ tokıl دا باس کراون.

**تەبەک1 tebek** [ *tabak* ] - "تەشتی یان سینی دارین": شێوەی کۆنتری ↑تەبەق1 tebeq.

**تەبەک2 tebek** [ *tabak* ] - بڕوانە ↑تەبەق2 tebeq "نەخۆشییەکی ئاژەڵە".

**تەبەنە tebene** [ *tabana* ] - "درزی درشت": خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın.

**تەپ1 tep** [ *tap* ] - "تەپ و تۆز":

1-دەتوانێ هاوریشە بێ دەگەڵ Staub (G.) "تۆز"، stieben (G.) "تۆز کردن" و typhos (Gr.) "دووکەڵ، تەپ و تۆز" و typhein (G.) "دووکەڵ کردن، تەپ و تۆز کردن، هەڵم و هاڵاو کردن". ناوی نەخۆشی تیفووس tîfus کە لە ڕێگەی زمانی لاتینییەوە هاتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان، بۆ ئەم وشە یۆنانییە دەگەڕێتەوە. مەبەست لەم وشەیە ئەوەیە کە مێشک و زەینی نەخۆشەکە دۆخێکی تەپ و تۆزاوی یان تەم و مژاوی پەیدا دەکا، واتا نەخۆش بە تەواوی ئاگای لە خۆی نامێنێ. ڕیشەی ئەم وشانەی سەرەوە باس نەکراوە.

2-لە لایەکی دیکەوە دەتوانین بەرهەڤی بکەین دەگەڵ dub (OIr.) "ڕەش"، ↑تەو tew "مەڕی بە ڕەنگی خۆڵەمێشی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Taube (G.) "کوتر" [دە بنەڕەتدا: بۆرەکە]، toben (G.) "شێتانە بەم لا و ئەو لادا جووڵانەوە"، Dunst (G.) "تەم، هەڵم" و دە زمانی کوردمادیشدا دەگەڵ ↑تۆز toz و ↑توومان tuman.

**تەپ2 tep** [ *tap* ] - "شاخ و بەرزایی بچووک": تەپە و تەپپە tepe و teppe ش دەگوترێ. تپە teppe (P.). خزمە دەگەڵ top (E.)، topp (OE.)، top (Nl.)، topp (Sw.) "لای هەرە سەرەوە، دوند". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ( ) "پرچ" [دە بنەڕەتدا: کاکۆڵ]، Zipfel (G.) "نووک" و Zapfen (G.) "تەپەدۆڕ"، zapfo (OG.) "دارۆکەی نووک تیژ بۆ بەستنی زارکی شت". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑زیپکە zîpke و ↑زۆپ zop و ژمارەیەک وشەی دیکە. ڕیشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ئاماژەی پێ نەکراوە. جێی ئاماژەیە کە وەک لە سەرەوە دەر دەکەوێ، دە هێندێک زمانی ژێرمەنیدا کۆنسۆنانتی p بە شێوەیەکی تایبەتی بێژە دەکرێ و هەر بۆیە پیتەکە دوو جار دەنووسرێ. دە زمانی کوردمادیشدا دۆخێکی لەم چەشنە لە ئارا دایە.

**تەپ3 tep** [ *tap* ] - "تەنبەڵ، لەشگران": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- tapfer (OG.) "قورس، گران، گرینگ" [دە زمانی ئەمڕۆی ئاڵمانیدا ماناکەی بووەتە "زیرەک، بەوەرە"]. گریمانە دەکرێ وشە ژێرمانییەکە پێوەندی هەبێ بە debelyj (Rus.) "قەڵەو".

2- ↑تەڤزین tevzîn "تەزین، سڕ بوون". ئەندام و لەش بەگشتی لە ئەنجامی تەڤزیندا قورس و نەجووڵ دەبێ. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە تێبینی ژێر وشەی "سڕ".

**تەپ⁴ tep** [ *tap* ] - "پەلامار": تەپ دان tep dan واتا پەلامار دان. وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "لێدان"ە. دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشەی هاوپێوەند بەرچاو دەکەون کە لە خوارەوە ئاماژە بە هێندێکیان دەکرێ: ↑تەپان tepan "تیلای گەڵا کوتان"، ↑دەبان deban [خەنجەری دەبان]، ↑تۆپز topız "زۆر، زەبر و زەنگ، کوتەک"، ↑تۆپ top "1-ئامرازی گەمە 2- ئامرازی شەڕ"، ↑تەور tewır [تبر tabar (P.)]، ↑تەپاندن tepandın "شێلان، کوتان"، ↑تەپڵ tepıl "1- سازی لێدان 2- شەقڵ و نیشانە"، ↑دەفە defe "سازی لێدان"، ↑تەپشۆ tepşo [تەمشوێ، تەوشوێ]، ↑تەپەسەر tepeser "سەرکوت، سەرزەنشت"، ↑تەپساندن tepsandın "داپڵۆسین، سەرکوت کردن"،

↑تەوس tews یان تەوز(ە) tewz(e) "تانە و تەشەر"، ↑تەپۆ tepo "مێشوولەی دندووك درێژ" [دە بنەڕەتدا واتا "لێدەر، پێوەدەر"]، ↑تەپس teps "شێلان بە پێ" [سەرنج بدە "شێلان" خۆی دە ئەسڵدا بە مانای "لێدان"ە]، ↑تفەنگ tıfeng، ↑دەمانچە demaçne [تپانچە tapānče (P.)]، ↑توانج tuwanc "تیر و توانج" [دەبنەڕەتدا *تەپانج *tepanc] و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر *(s)teu- (IE.) > "لێکدان، وێککەوتن" > تەوقە tewqa "دەست لێدانەوە". Typtein (Gr.) "لێدان"، tupfen (G.) "پەڵەپەڵە دانان (بە لێدان)"، tippen (G.)، dippen (Nl.)، tip (E.) "لێدان بە ئەسپایی"، Tüpfel (G.) و topho (OG.) "پەڵە، خاڵ" [دە بنەڕەتدا: پەڵە خستنە سەر بە لێداتیکی هێواش] لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی فارسیدا تپیدن tapīdan (P.) بە مانای "لێدان(ی دڵ)" دێ و پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. لە لایەکی دیکەوە دەشێ ئەم وشانە پێوەندی دەگەڵ دەستەوشەیەکی دیکە پەیدا دەکەن کە لەژێر ↑تیپ tîp "حەرف"دا باس کراون. هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑تووش[1] tûş [تووش بوون]، ↑تووك tuk و گەلێك وشەی دیکە.

[تێبینی: لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا وشەیەکی دیکەی ژێرمەنی سەرنج رادەکێشێ کە بریتییە لە Dübel (G.)، dowel (E.)، tubil (OG.)، deuvik (Nl.)، dubb (Sw.)، "مێخی دارین، هۆرە، رۆڵپلاك". ئەم وشانە دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "لێدان". ئەم کردارە ئەمڕۆ دە دیالێکتی خوارووی زمانی هولەندیدا ماوەتەوە کە دەبێتە doffen (Nl.). دە سەرچاوەیەکی ئەڵمانیدا وشە ژێرمەنییەکەی سەرەوە دەگەڵ typhos (Gr.) "هۆرە" بەرهەڤ کراوە، بەڵام ئاماژە بە ریشەی وشەکان نەکراوە. دە سەرچاوەیەکی دیکەدا ئەم وشانە بردراونەوە سەر ریشەی *dub- (IE.) > "لێدان". من لەو باوەڕە دام کە ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوو لە ریشەکەی سەرەوەیە و ریشەیەکی سەربەخۆ نییە. هەر سەبارەت بەو وشە ژێرمەنییانەی لەسەرەوە هاتوون، خاڵێکی دیکە جێی سەرنجە. دە وشەکانی زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا پاشگری -el بە بنجی وشەکە لکاوە: Dübel (G.)، dowel (E.)، دە سوێدیدا پاشگرەکە دەرناکەوێ. سەرنجراکێش وشە هولەندییەکەیە کە بە پاشگری -ik کۆتایی دێ: deuvik (Nl.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا پاشگری -el بۆ دروست کردنی ناوی زۆر لە کەلوپەل و ئامراز کەڵکی لێوەر دەگیرێ. بەڵام پاشگری -ik دەگمەنە. بە پێچەوانەوە دە زمانی کوردمادیدا بە گشتی پاشگری -ek/ ık لەم بارەوە بەکار دەهێنرێ و پاشگرەکەی دیکە زۆر کەمترە، وەك دەسك، گەسك، خەڕەك، رنەك و دەمبیل].

**تەپ[5] tep** [*tap*] - "سلەگوو":

1- لە لایەکەوە دەشێ پێوەندی هەبێ بەو وشانەی لەژێر ↑*تاوانەوە tawan(ewe)* "توانەوە، حەل بوون، جاری بوون"دا هاتوون.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑تەپ[2] tep [تەپك، تەپە] ەوە هەبێ.

**تەپ[6] tep** [*tap*] - "گزی، گەڕ": شێوەیەکی دیکە لە ↑دەبە debe [دەببە debbe].

**تەپ[7] tep** [*tap*] - دەگەڵ "تل" دێ و دەگوترێ: تەپ و تل tep û tıl واتا هەستان و کەوتن، جووڵان و کەوتن. تەپ خزمە دەگەڵ ↑داوان dawan [هەڵەداوان] و ↑تاوانەوە tawan(ewe)، سەر بە ریشەیەك بە مانای "حەل بوون، جاری بوون" و دویدن davīdan (P.) "را کردن". کەرتی تل tıl خزمە دەگەڵ ↑تلۆر tılor و ↑*تلین tılîn* [تلیان tılyan] "هێشتن، هێڵان". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑تەپەتڕە tepetıre هەیە بە مانای "ساوای تازە پێ گرتوو کە دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە".

**تەپار tepar** [*tapār*] - "ریخ و قوڕی تێکەڵ بۆ سواخ دانی کونی خەڵیفەمێش": خزمە دەگەڵ ↑تەپاڵە tepale.

**تەپاڵە tepale** [*tapāla*] - "ریخی هیشکەوەبوو": دە فارسیدا تپالە tapāle (P.). بنەوشەی تەپ -tep دە هێندێك وشەی دیکەشدا دەبیندرێ، وەك ↑تەپ[5] tep "سلەگوو"، ↑تەبغە tebġe بە مانای "سەرانگوێلك، کۆمای زبڵ و پەین"، ↑تەپار tepar "ریخ و قوڕی تێکەڵ". چەمکی هاوبەش لەم وشانەدا "ریخ، شیاکە"یە. هەروەها ↑تەڤژین tevjîn هەیە بە مانای "1- زگچوون 2- شیاکە".

**تەپان1 tepan** [*tapān*] - "1- ژێردەرانە 2- چەپەری پشتیوانەی دەرگا": خزمە دەگەڵ ↑دەپ dep "تەختە".

**تەپان2 tepan** [ *tapān* ] - "تیلای گەڵا کوتان": خزمە دەگەڵ ↑تەپ[4] tep "پەلامار".

**تەپاندن tepandn** [ *tapāndın* ] - "تیئاخنین، شێلان": خزمە دەگەڵ ↑ تەپ[4] *tep* "پەلامار" و ↑تەپان tepan "تیلای گەڵا کوتان".

**تەبخ tebıx** [ *tabıx* ] - "تەپیو": تەپس tepıs یش دەگوترێ.

1- یان خزمە دەگەڵ ↑تەپین tepîn.

2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑تەپاندن tepandn.

**تەپس tepıs** [ *tapıs* ] - "تەپیو، شێلدراو": ↑تەبخ tebıx.

**تەپساندن tepsandın** [ *tapsāndın* ] - "داپڵۆسین، سەرکوت کردن": خزمە دەگەڵ ↑تەپ[4] tep "لێدان".

**تەپسی tepsî** [ *tapsī* ] - "دەڤر": تیڤسی tîvsî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "قووڵ، قووڵایی" دەدەن، وەک ↑تاپی tapî "خەندەک".

**تەپشوو tepşû** [ *tapšū* ] - "تەشوێ": خزمە دەگەڵ ↑تەپ[4] tep "لێدان".

**تەپک1 tepık** [ *tapık* ] - "گردۆلکە، بەرزایی چکۆڵە": ↑تەپ + ک tep + ık. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە. تەپکە tepke ش دەگوترێ.

**تەپک2 tepık** [ *tapık* ] - "دەوە، تەپاڵەی شێلدراو": شێوەیەکی دیکە لە ↑دەوە dewe. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑تەپاندن tepandın "شێلان، ئاخنین، پەستاوتن".

2- ↑تەپاڵە tepale "دەبنەڕەتدا واتا حەلکراو، هەزمکراو، هەڵتاوێنراو".

**تەپکە tepke** [ *tapka* ] - "داوی لە تەختە کوتراو بۆ گرفتار کردنی مەل": خزمە دەگەڵ ↑داو daw "1- دەزوو، هەودا، نەخ 2- تەپکە".

**تەپڵ1 tepıl** [ *tapıl* ] - "تەوق، شۆینی هەرەبەرز [تەپڵەسەر واتا بەرزترین شوێنی سەر] . تەپ + ڵ tep + ıl. خزمە دەگەڵ ↑تەپ tep (تەپە tepe) "شاخ و بەرزایی بچووک".

**تەپڵ2 tepıl** [ *tapıl* ] - "زەرب، ئامرازێکی مۆسیقا": تەپ + ڵ tep + ıl. کەرتی دووەم پاشگرە. کەرتی تەپ tep دە هێندێک وشەی دیکەی کوردمادیشدا هەیە وەک ↑تەپان tepan، ↑تەورtewır، ↑تۆپز topız و خزمە دەگەڵ typtein (Gr.) "لێدان، کوتان". ناوەکەی دیکەی ئەم ئامێرە مۆسیقییە، واتا "زەرب" لە وشەیەکی عەرەبی وەرگیراوە کە ئەویش هەر بە مانای "لێدان"ە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەپ[4] *tep* "پەلامار".

**تەپڵ3 tepıl** [ *tapıl* ] - "شوێن پەنجە، جێ قامک":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تیپ tîp "حەرف" [دە ئەسڵدا: شەقڵ، نیشانە].

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تبل tıbıl "قامک".

**تەپلک1 teplık** [ *taplık* ] - "بەنەئاسن بۆ دروونەوە [گاو لێدان]ی شتی شکاو": خزمە دەگەڵ ↑*داو daw*"دەزوو" و ↑تەپکە tepke.

**تەپلک2 teplık** [ *taplık* ] - بڕوانە ↑تەپلەک2 teplek "زگێ دانی دیوار".

**تەپلک3 teplık** [ *taplık* ] - "بەرکەندال": خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک، رەهەند".

**تەپلۆس teplos** [ *taplos* ] - "تەنبەڵ، تەوەزەل": تەپ + لوس tep + los. ↑تەپ tep واتا "قورس و گران"، لوس - los دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑لۆژ loj "تەنبەڵ، تخێڵ".

**تەپلە[1] teple** [ *tapla* ] - "کڵاوی لباد، جۆرێک کڵاوی ژنانە": خزمە دەگەڵ ↑تەپڵ tepıl [ی سەر].

**تەپلە[2] teple** [ *tapla* ] - "کەلارە، دەفری لە شیاکە":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەپسی tepsî و دەفر defır.

2- لە لایەکی دیکەشەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "ریخ، شیاکە" دەدەن، وەک ↑تەپاڵە tepale.

**تەپڵەک1 teplek** [ taplak ] - "1- تەختەی نێوان کۆڵەکە و میچ 2- ژێرسیگاری 3- کورسیلەی شت لە سەردانان": خزمە دەگەڵ ↑دەپ *dep* و ↑تەبەق tebeq "تەختە، تەختەی بەڕیز لەسەر یەک دانراو".

**تەپڵەک2 teplek** [ taplak ] - "زگێ دانی دیوار": ↑تەپڵک1 teplık یش دەگوترێ. سەرەتا پێویستە روونی بکەینەوە ئەم مانایە چۆن پەیدا بووە. تەپڵەک یان تەپڵک ئەو دوخەیە کە سواخی دیوار [لە قوڕ، گێچ یان سمیت] لە شوێنێکی دیوارەکە جیا دەبێتەوە، واتا بۆشایی و ڤالاییەک لەنێوان سواخ و دیوارەکەدا پەیدا دەبێ. ئەم دۆخە بە شێوەی جۆرێک لە "زگێ دان" و ماسین خۆی نیشان دەدا. هەروەها ئەم دۆخە ئەو کاتەش دەبیندرێ کە کاغەزدیواری لە شوێنێک لە دیوار دەبێتەوە و "زگێ دان"یک لەو شوێنە پەیدا دەبێ. کەوابوو مانای ئەسڵی وشەکە "زگێ دان و ماسین" نییە، بەڵکوو جیا بوونەوەی ↑تۆژ toj یکە لە دیوار کە بەشێوەی زگێ دان دەردەکەوێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ تاول tawel (.P) دە زمانی فارسیدا بە مانای "تۆیخ بەردان و بلۆق کردنی دەست بەهۆی کاری سەخت یان سووتان"، ↑تۆفل tofıl "تۆکڵ"، ↑تەفشک tefşık "1- تەڵاش 2- کرێژی سەر" و چەندین وشە کە ژێر ↑*تۆکڵ tokıl* دا شی کراونەوە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑توولەک tulek "وەرینی مووی لەش" و دواتریش ↑تەپڵەک1 teplek "تەختە".

**تەپڵەک3 teplek** [ taplak ] - "تاسکڵاوی ژنان": خزمە دەگەڵ ↑تەپڵ1 tepıl "تەوق، شۆینی هەرەبەرز" و دواتر ↑تەپ² *tep* [تەپک tepık، تەپەtepe، تەپپە teppe]. "تەپڵەک" واتا ئەو شتەی لەسەر تەپڵی سەر دانراوە.

**تەپۆ¹ tepo** [ tapo ] - "رووەمەت تێک قووپاو بە هۆی بێددانی": خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک" و ↑تەپین tepîn "رۆچوون".

**تەپۆ² tepo** [ tapo ] - "مێشوولەی لاق و دەنووک درێژ": خزمە دەگەڵ ↑تەپان tepan و ئەو وشانەی لە ریشەیەک دێن بە مانای "لێدان".

[تێبینی: لە باری دروست بوونی وشەکەوە دەتوانین دەگەڵ "ژەنگەسوورە" بەراوردی بکەین، کە لەویشدا بنەوشەی ژەن -jen دەچێتەوە سەر ریشەیەک بەمانای "لێدان". دیارە مەبەست لە "لێدان" ی تەپۆ و ژەنگەسوورە "پێوەدان"ە].

**تەپۆخ tepox** [ tapox ] - "هەڵەنگوتن، ساتمە کردن": مانای بنەڕەتی وشەکە "وێکەوتن"ە، ئەو شتەی دە فارسیدا دەبێتە "برخورد کردن". تەپۆخ بریتییە لەوەی کە لاق دە شتێک هەڵدەنگوێ، واتا وێی دەکەوێ. هەر بۆیە وشەکە خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑تەپ⁴ tep دا باس کراون و مانای "لێدان" دەبەخشن. وشەی ↑تووش¹ tûş یش هەر لەم خێزانەوشەیەدا جێ دەگرێ. تووش بوون مانای "وێک کەوتن" دەدا.

[تێبینی: وشەی "ساتمە"ش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێکدران، وێککەوتن". مەبەست لە ساتمە یان تەپوخ ئەوەیە کە دوو شت وێک دەکەون، وەک چۆن لە رۆیشتندا پێ لە بەردێک دەکەوێ (دەدرێ) و مروڤ هەڵدەنگوێ].

**تەپە1 tepe** [ tapa ] - بڕوانە ↑تەپ² tep² "گرد، شاخی بچووک".

**تەپە2 tepe** [ tapa ] - "1- دەنگی کەوتنی شتی قورس و نەرم 2- دەنگی پێ لە رۆیشتندا": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- tap (.E) "بە هێواشی لێدان" [وەک لە دەرکە دان]. دە ئینگلیزندا teppe (.E) ش گوتراوە. لەوانەیە وشەکە بە لاسا کرنەوەی دەنگێ دروست کرابێ.

2- ↑تەپ⁴ tep "پەلامار" سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، کوتان". لەم تێڕوانینەوە تەپە تەپ کردن بریتییە لە (پێ) کوتان بە شوێنێکدا.

**تەپە3 tepe** [ tapa ] - تەپە دان واتا "بەسەر یەکدا هەڵچنین، کۆما کردن": دەچێتەوە سەر ↑تەپە1 tepe "گرد، شاخی بچووک". شیاوی باسە کە وشەی "گرد"یش هەم مانای "تەپە" دەدا و هەمیش مانای "خڕکراوە، وەسەریەک نراو".

**تەپەترە tepetıre** [ *tapatıra* ] - "ساوای تازە پێ گرتوو کە دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە": تەپە + ترە tepe + tıre. بڕوانە شی کردنەوەی ژێر ↑تەپ[7] tep [تەپ و تل].

**تەپەدۆر tepedor** [ *tapador* ] - "زاربێنی شووشە لە داری نەرم": تەپە + دۆر tepe + dor. دە زمانی ئاڵمانیدا پێی دەگوترێ Zapfen (G.) و دە ئینگلیزیدا tap (E.). ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەشدا هەیە. ئەگەر وشە کوردمادییەکە وشەیەکی وەرگیراو یان داتاشراو نەبێ، ئەوسا دەتوانین بە هاوریشەی دابنێین دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان. کەرتی دۆر dor دە وشە کوردمادییەکەدا دەچێتەوە سەر ↑دارdar

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا وشەی "چوب پنبە" بەکاردێنن کە لەویشدا چەمکی "دار" بەدی دەکرێ].

**تەپەسەر tepeser** [ *tapasar* ] - "سەرکۆنە، سەرزەنشت": وشەی "سەرزەنشت " لە دوو کەرتی سەر و زەنشت پێک هاتووە [بنەوشەی زەن- یان ژەن- مانای "لێدان" دەدا]. هەربەم جۆرەش وشەی "تەپەسەر" لە دوو کەرتی تەپ[4] tep بە مانای "لێدان" و سەرser پێک هاتووە و دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑تەپ[4] tep "لێدان"، ↑تەپان tepan "تیلا، کوتەک" و هتد.

**تەپین tepîn** [ *tapīn* ] - "رۆچوون، ڕمان": خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک، رەهەند". هەردووک لە ریشەیەکەوە دێن کە مانای "قووڵ بوون، ڕۆچوون" دەدا.

**تەتک1 tetık** [ *tatık* ] - "لەپک، دەستکێش": خزمە دەگەڵ Tatze (G.)، tatze (MG.) "پەنجەی ئاژەڵی راوکەر، بەتایبەتی هی ورچ". دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی زمانی ئەڵمانیدا باس لەوە دەکرێ کە ئەم وشەیە تەنیا لە زمانی ئەڵمانیدا بەدی دەکرێ و روون نییە لە چییەوە هاتووە. وەک دەبینین ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیشدا هەیە. بێگومان وشەکە دە زمانی کوردمادیدا پێشتر *تەت tet** یان *تەتە tete** بووە بە مانای "لەپ، پەنجە" و ئەوجار پاشگرێکی خراوەتە سەر و مانای "لەپک، دەستکێش"ی وەرگرتووە [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "لەپ" واتا "دەست" و "لەپک" واتا "دەستکێش"]. بەگوێرەی فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی زمانی ئەڵمانی لەوانەیە وشەکە لە زمانی زارۆک وەرگیرابێ. هەر لەم پێوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی دیکەی زمانی کوردمادیش بکەین کە بریتین لە ↑تەتە tete "خێشک بۆ زەوی لووس کردن" و ↑تەتەڵە2 teteleکردن "هەڵتەکاندنی دەغڵ و دان بۆ پاک کردنەوە". پێش ئەوەی باسی پێوەندی ئەم وشانە بەیەکەوە بکەین، پێویستە بە کورتی ئاوڕێک لە وشەی "چەنگاڵ" بدەینەوە. ئەم وشەیە هەم دە کوردمادی و هەم دە فارسیدا بە دوو مانا بە کار دێ، یەکەم بە مانای "چەنگ و پەنجەی ئاژەڵی راوکەر" و دووەم ئامرازێکە لە دار یان ئاسن کە وەک قامکەکانی پەنجە چەند لقی لێ دەبێتەوە و وەک ئامرازێک بۆ خواردن کەڵکی لێ وەردەگرن. بۆ ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا ↑چەتاڵ çetal یش دەگوترێ. بنەوشەی چەت çet- دە وشەی چەتاڵ çetal دا خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە تەت tet، کەوا لەسەرەوە ئاماژەی پێ کرا. کەوابوو "چەت" یان "تەت" خۆی دە بنەڕەتدا بە مانای "پەنجە، چەنگ"ە و تەتە tete "خێشک" و چەتاڵ çetal "چەنگاڵ" و تەتەڵە tetele "شەنە" ئەو ئامرازانەن کە شێوەیان لە "چەنگ" دەچێ و بە مانای چەنگاڵ و چەنگەک و شەنە بەکار هێنراون. هەر لێرەدا جێی ئاماژە کردنە کە "شەنە"ش خۆی پێوەندی هەیە بە "چەنگ"ەوە. خاڵێکی دیکە کە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەوەیە کە "تەتەڵە کردن" ماناکەی چیتر نییە جگە لە "شەن کردن" واتا دەغڵ و دان بە شەنە هەڵتەکاندن [هەڵاویشتن] بۆ ئەوەی پووش و دەنکی لێک جیا بێتەوە. نها دەگەڕێینەوە سەر ئەو گومانەی ئێتیمۆلۆگە ئەڵمانییەکان کە دەڵێین لەوانەیە وشەی Tatze ی ئەڵمانی لە زمانی زارۆک وەرگیرابێ. دە راستیدا ئێمە دەبێ دەستخۆشی لەو ئێتیمۆلۆگانە بکەین بۆ ئەو شیمانەیەی دەریان بڕیوە. ئەوان لە کاتێکدا ئەو شیمانەیان دەربڕیوە کە تەنیا یەک وشەی ئەڵمانیان لەبەردەست دابووە، بە بێ پێوەند دانەوەی بە هیچ وشەیەکی هاوشێوە، نە لە زمانی ئەڵمانی و نە لە هیچ زمانێکی دیکەدا! ئێمە دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەمان لەم بارەوە لەبەر دەست دایە و گرنگتر لە هەمووانیش ئەو وشەیەی زمانی زارۆکمان لە بەر دەستدایە کە ئێتیمۆلۆگە ئەڵمانییەکان بە دوایدا دەگەڕێن و ئەویش ↑چەچە çeçe یە بە مانای "دەست" دە زمانی زارۆکدا! بەڵام باسەکە هەر بەوەندە کۆتایی نایە و دەشێ هێندێکی دیکە لەسەری بەردەوام بین و بزانین

"چەچە" خۆی لە کوێوە هاتووە. چەچە خزمە دەگەڵ ↑تووتە1 tute "1- قامکەچکۆڵە 2- زێدە گوشت لەچاو یان لە پێلووی چاودا"، خزمە دەگەڵ zitze (G.) و tutto (OG.)، titt (OE.) و (Sw.)، titthe (Gr.) "گۆپکەی مەمک" و هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑چیچە çîçe "گۆپکی مەمک"، ↑چچک çıçık "1- گوانی مەمک، گۆپکەی مەمک 2- میتکە"، ↑چیچیلە çîçîle "نەرمەی گوێ"، [چچولە čečūle (P.) "میتکە"]. لەم وشانەدا دەبینین کە ئاماژە دەکرێ بە نەرمەگۆشتێکی بچووک. بەم جۆرە ئێمە دەتوانین لێرەدا رەوتی سەرهەڵدان و پەرەگرتنی وشەکە جارێکی دیکە بە کورتی بخەینەوە بەر چاو. زارۆکی شیرەخۆرە کاتێک مەمکی دایکی مژیوە و لەوانەشە دەستی لە گۆپکەی مەمکی دایکی دابێ، هاوکات دەنگی تەتە tete ی لەخۆی دەرهێناوە، هەر وەک چۆن دەنگی "مەمە" و چەندین دەنگی دیکەشی دەرهێناوە. لێرەوە لەرووی ئەو دەنگە دەرهێنانەی منداڵەکەوە ناوی "تەتە" یان "تیتە" دراوە بە "گۆپکەی مەمک". پاشان ناوەکە مانایەکی فراوانتری پەیدا کردووە و بۆ چەند گۆشتێکی ورد و بچکۆڵانەی دیکەش بەکار هاتووە، وەک "نەرمەی گوی"، "زێدە گۆشت لە چاو"، "میتکە" و هەروەها دەستی زارۆکی شیرەخۆرە کە نەرمە گۆشتێکی چکۆڵەیە. پەرەگرتنی مانای وشەکە هەر بەوەندە نەوەستاوە و لە پلەیەکی دواتردا بەگشتی مانای "چکۆڵە"ی وەرگرتووە. ئەم مانایانە دە وشەکانی ↑تووتە tute [قامکە تووتە qamke tute واتا قامکە چکۆڵە]، ↑تووتک tûtık [تووتکەسەگ واتا بێچووی سەگ، گچکەی سەگ]، ↑تیتل tîtıl [بێچووی چکۆڵە، تیتل و بیبل]، ↑تیتە tîte "بەروولە خیار، خیاری چکۆڵە" و هیتردا دەبینرێ. لێرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە بۆچی "تەتە" دە زمانی کوردمادیدا نەک هەر مانای "خێشک" دەدا، بەڵکوو بە مانای "بووکەڵەی لە قوڕ یان هەویر"یش بەکار دێ. ئاشکرایە کە بووکەڵە قەوارەیەکی بچووککراوی مرۆڤە، "مرۆڤ"ی بچکۆلانەیە و هە لەبەر ئەوەش پێی گوتراوە "تەتە" واتا "بچکۆڵانە".

[تێبینی: ناوێکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا بۆ بووکەڵە بریتییە لە "بیبی". ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر "بەبە" بە مانای "زارۆکی چکۆڵە". لێرەشدا دەبینین کە "بووکەڵە" وەک "بەبە" واتا وەک مرۆڤێکی بچکۆڵانە سەیر کراوە و بۆیە ناوی "بیبی" پێدراوە. بیبی دەبێتە خزمیش دەگەڵ "بیبل" [تیتل و بیبل] و هەروەها "بیبیلە"ی چاو. ناوی بیبیلە بۆ "رەشێنە"ی چاو لەوەرا هاتووە کە مرۆڤ شێوە و قەڵافەتی خۆی لەناو رەشێنەی چاوی کەسێکی بەرانبەریدا وەک بووکەڵەیەک بینیوە، واتا رەشێنەی چاو ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ وێنەی خۆی بە بچکۆڵەیی، وەک بووکەڵەیەک تێدا دەبینێ].

**تەتک2 tetık** *[ tatık ]* - "سمت و ساتان": تەتی tetî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تووتان tutan و هەڵتووتەکان بەمانای "دانیشتن".

**تەتن tetın** *[ tatın ]* - "قوڕ، حەری": دەشێ پێوەندی بە ↑تەن[1] ten "لەش"ەوە هەبێ.

**تەتە1 tete** *[ tata ]* - "پوور، خوشکی باوک": خزمە دەگەڵ ↑تات tat "باوک".

**تەتە2 tete** *[ tata ]* - "بووکەڵەی لەقوڕ یان هەویر": خزمە دەگەڵ ↑تووتە tute و تیتە tîte بە مانای "وردیلە، چکۆڵە" [بووکەڵە یان تەتە واتا چکۆڵەی مرۆڤ]. [بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەتک[1] tetık].

**تەتە2 tete** *[ tata ]* - "خێشک بۆ ساف کردنی زەوی": [بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەتک[1] tetık].

**تەتەر teter** *[ tatar ]* - "1- نامەبەر، پەیک 2- قۆچاخ": بە مانای دووەم شاتر şatır یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑*شاندن şandın* و ↑جادە cade.

**تەتەڵە1 tetele** *[ tatala ]* - "پارچە تەختە یان پارچە بەردی پانکەڵە": خزمە دەگەڵ ↑تات tat "بەردی پان" و ↑تەخت texıt "ساف، بێ کەند و لەند".

**تەتەڵە2 tetele** *[ tatala ]* - تەتەڵە کردن واتا هەڵتەکاندنی دەخڵ و دان بۆ لێک جیا کردن و پاک کردنەوەی. [بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەتک[1] tetık]

**تەتی 1 tetî** *[ tatī ]* - "1-سمت و ساتان 2- ئاودەست": خزمە دەگەڵ ↑تووتان tutan [هەڵتووتەکان heltutekan] واتا دانیشتن.

**تەتی2 tetî** *[ tatī ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑دادە dade.

**تەجیر tecîr** [ *tajīr* ] - "تامان، چەپەر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو ریشانەی خوارەوە:

1- *(IE.) *tek-* "با دان، چنین، هۆنینەوە". ↑دەق deq "تێکست" لەم ریشەوە هاتووە.

2- *(IE.) *teg-* "داپۆشین، تاقەت کردن، حەشاردان". ↑تاقەت taqet لەم ریشەوە هاتووە.

**تەحت teħt** [ *taħt* ] - "لباد، نمەد": تات tat یش دەگوترێ. لباد تەنراوێکی سفت و چڕ و پڕە و هەر بۆیە وشەی تەحت teħt دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑تەژی *tejî* "چڕ و پڕ" و ↑تەحین teħîn دا هاتوون، وەك dicht (G.) "چڕ و پڕ"، tight (E.) "توند، سفت"، diht (OE.) "قەڵەو، بەهێز"، techt (OIr.) "توند بوو، مەییو"، سەر بە ریشەی > *(IE.) *te(n)k-* "توند بوون، چڕ بوون".

[تێبینی: لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ پەستەك pestek کە ئەویش تەنراوێکی سفتە و وشەکەی خزمە دەگەڵ پەستاوتن pestawtın].

**تەحرە teħre** [ *taħra* ] - "جەنگەی گەرمای نیوەڕۆ": [گەرمای زۆر و توند]. هەروەها ↑تەشلەخە teşlexe هەیە بە مانای "هەڕەت و جەنگەی سەرما". خزمە دەگەڵ ↑تەخەر texer "زۆرینە، زۆرتر، پڕانی".

**تەحسین teħsîn** [ *taħsīn* ] - "خلیسکان": هەروەها تەحس teħs هەیە بە مانای "خلیسك"، خزمە دەگەڵ ↑تاس[1] tas [تاس و لووس]. پێوەندی دوو چەمکی "لووس" و "خلیسکان" بەیەکەوە ئاشکرایە. "لیز" دە زمانی فارسیدا خزمە دەگەڵ "لووس" و مانای "لووس، لیچق" دەدا و "لیز خوردن"یش مانای "خلیسکان" دەدا.

**تەحفیل teħfîl** [ *taħfīl* ] - "خاوین بوونەوەی پیس بە شوشتن": خزمە دەگەڵ taufen (G.) "خستنە ناو ئاو، ئاو پێدا کردن". ئەم وشەیە دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ کردەیەکی ئایینی بەکار دێ کە تێیدا زارۆکی ساوا لەلایەن قەشەوە بە ئاو تەڕ دەکرێ. رەنگە پێشتر زارۆکی ساوایان دە ئاو هەڵکێشابێ. وشەکە خزمە دەگەڵ toufan (OG.)، dauopjan (Gt.)، dīepan (OE.) "نقوم کردن، دە ئاو هەڵکێشان". خودی ئەم کردارانە خزمن دەگەڵ tief (G.)، deep (E.)، djup (Sw.) "قووڵ"، ↑تاپی tapî "خەندەك" و ↑دۆپ dop "1- نەوی، نزم 2- گەلی، شیو"، تە tah (P.) "ژێرەوە، بنەوە" و پێشگری ↑دا da [دانیشتن، دابەزین، داکوتان...]، سەر بە ریشەی > *(IE.) *dheu-b-* "قووڵ، نزم".

**تەحین teħîn** [ *taħīn* ] - "توندەوەبووی شیرەی کونجی": وشەیەکی رەسەنی کوردمادییە و خزمە دەگەڵ ↑تن *ten* "لەش، بەدەن". دەشێ کۆنتر "تەهین tehîn" بووبێ. خزمیشە دەگەڵ ↑تەقن teqın "جێگەی پڕ لە قوڕ و لیتە"، خزمە دەگەڵ Ton (G.) "گڵی تایبەت بو چێ کردنی گۆزە"، dāha (OG.)، thāhin (OS.)، dōhe (OE.) "قوڕ، لیتە"، ↑تەژی tejî "چڕ و پڕ"، ↑تەقتەق teqteq "زەوی بەردین" [دە بنەڕەتدا: سفت، چڕ و پڕ]

**تەخت text** [ *taxt* ] - "ساف، پەل، یەکسان، هەموار": ئەم وشەیە و هەروەها ↑تەختە texte، کە ئەویش رووبەرێکی ساف و هەمواری هەیە، پێکەوە خزمن. هێندێك وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەك ↑تات tat "بەردی پان و ساف" و ↑تەتەلە tetele "تەختەدار یان تەختەبەرد". جگە لەمە وێ دەچێ وشەکانی ↑تاس tas "سەری ساف و بێموو"، ↑تاس tas "مۆرەی تەختە کە هەموو رووبەرەکانی ساف و داتاشراون"، ↑تیشە tîşe "بەردی پان و لووس لە چیا" لەم خێزانە وشەیەدا جێ بگرن. وێ دەچێ ئەم وشانە بچنەوە سەر ↑تاشین taşîn [تراش دان، ساف و لووس کردن، تەخت کردن].

**تەخسیر texsîr** [ *taxsīr* ] - "ژنێك کە مێرد سەر جێیی ناکا": وێ دەچێ وشەکە دە ئەسڵدا *تاکسەر *takser* [↑تاك tak + ↑سەر ser] بووبێ، بەم مانایە کە کەسێك بە تاکی سەر دەنێتەوە، واتا بە تەنیا دەخەوێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی هاوسەر hawser کە بەو مانایە دێ کە دوو کەس پێکەوە دەخەون یاخود لە سەریندا هاوبەشن.

**تەخش texış** [ *taxıš* ] - "تیری کەوان": شێوەیەکی دیکە لە↑ تیر tîr. خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑تیخ tîx و ↑تیژ tîj.

**تەخشان texşan** [ *taxšān* ] - دەگەڵ پەخشان دێ [تەخشان و پەخشان کردن واتا بەم لا و ئەولادا بڵاو کردنەوە]. خزمە دەگەڵ ↑ تیچان tîçan "بڵاو بوون".

تەخنک **texnık** *[ taxnık ]* - "قاپی گەورەی لە مس": خزمە دەگەڵ teganon ‏(Gr.)‏ "تاوە". ↑تیان tîyan یش شێوەیەکی دیکەیە لەم وشەیە.

تەخەر **texer** *[ taxar ]* - "زۆرینە، زۆرتر، پڕانی": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تەژی tejî "پڕ". وشەی ↑تەخار texar ‏[تەغار teğar] یش دەبێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و مەبەست لەم وشەیە دەبێ "ئەندازەیەکی زۆر" بێ.

تەخار **texar** *[ taxār ]* - "کێش و پێوانەیەکی دەغڵە، لە موکریان چوار تەنەکە و لە کوردستانی باشوور 64 تەنەکەیە": تەغار teğar یش دەگوترێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها تەخاراو texaraw هەیە بە مانای "کووپەی زەلامی سەرئاوەڵە بۆ ئاو". وەک لەم مانایانە دەردەکەوێ، "تەخار" دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "کێش یان قەبارەیەکی زل و زەبەلاح" بێ. دە زمانی فارسیدا تغار tağār ‏(P.)‏ وەک "قەبارەیەک بەرانبەری سەد مەن" مانا کراوەتەوە.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تەخەر texer "زۆرینە، پڕانی".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە پێشگری ↑دا -da و تە tah ‏(P.)‏ "خوارەوە، بنەوە، قووڵایی". دە زمانی کوردمادیدا زۆر لەم وشانەی مانای "دەفر" و بەتایبەتی دەفری زل دەبەخشن، لە پێوەندی دەگەڵ ئەو وشانە دان کە مانای "قووڵایی، قووڵ بوون" دەبەخشن، بۆ وێنە *کوار* "کەندوو"، "جەواڵ" [گواڵ، گواڵە] خزمن دەگەڵ "قووڵ" و دواتر *خوار* "ژێر". لەم نموونەیەدا دەبینین کە لە مانای "قووڵایی"یەوە لە لایەکەوە مانای "خوارەوە" و لە لایەکی دیکەوە مانای "دەفر" پەیدا بووە. ئەگەر پێوەندی "تەخار" بەم وشانەی باسکراو دروست بێ، ئەوسا دەبێتە خزم دەگەڵ *دەبوو* [دەببە] "دەفری رزق، خیگە یان تەنەکە و کووپەی رۆن و پەنیر".

تەڕ1 **ter 1** *[ tar ]* - "ئاودار، شێدار": دە فارسیدا تر tar ‏(P.)‏. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە دەگەڵ وشەی تەڕ بە خزم دەردەچن کە بریتین لە ↑دڵۆپ dılop، ↑دەڵاندن delandın "تەڕایی دانە دەرەوە"، ↑تریت tırît ‏(تڵیت tılît)‏ "تیکوشین، نانی تەڕکراو"، ↑تڵیسانەوە tılîsanewe. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Tropfen ‏(G.)‏، drop ‏(E.)‏ و ‏(Nl.)‏، stalagma ‏(Gr.)‏ "دڵۆپە"، triefen ‏(G.)‏، drip ‏(E.)‏، drypa ‏(Sw.)‏ "دڵۆپەکردن، تڵیسانەوە". ریشە؟ وشەی ترشح taraşşuh ‏(Arb.)‏ لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

تەڕ2 **ter 2** *[ tar ]* - وشەیەکە واتای زۆر باش دەدا، بەڵام بۆ گاڵتە پێکردن بەکار دەهێنرێ، بۆ نموونە: تەڕت زانی واتا چاکت زانی، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە هیچت نەزانی! دەشێ خزم بێ دەگەڵ:

1- ↑تۆڵ [توند و تۆڵ]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، پتەو". شیاوی باسە وشەی "چاک"یش [تەڕت زانی، چاکت زانی] دە بنەڕەتدا هەر ئەم مانایە دەدا.

2- یانیش ↑تیر ter [تیڕ و پڕ]. "تیر و پڕ" دە زمانی کوردمادیدا مانای "زۆر و زەوەند"یش دەدا [تیڕ و پڕی لێدا، تیڕ و پڕی چاو لێ کرد]. لەم روانگەوە مانای "تەڕ زانین" دەبێتە "تیرو پڕ زانین" یاخود "زانینی زۆر و زەوەند"، دیارە بە گاڵتە.

تەرا **tera** *[ tarā ]* - زۆرتر دەگەڵ "تاک" دێ: تاک و تەرا tak u tera واتا "بەتەنیا، دوور و جیا لە ئەوانی دیکە". خزمە دەگەڵ ↑ تەرە tere "دوورخراو، دەرکراو".

تەرات **terat** *[ tarāt ]* - "1- پێستی کەلەکە 2- چەرمە چەقاڵتە": تەراد terad یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schwarte ‏(G.)‏، zwoerd ‏(Nl.)‏، sward ‏(E.)‏، svorđr ‏(OIs.)‏. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا بە مانای پێستی (تووکداری) سەری مرۆڤ و پێستی ئاژەڵ بووە.

تەراتین **teraten** *[ tarāten ]* - "هاتوچۆی ئەسپ لە مەیدان": خزمە دەگەڵ Tritt ‏(G.)‏ "هەنگاو، پێلاقە"، treten ‏(G.)‏، tretan ‏(OG.)‏، treden ‏(Nl.)‏، tread ‏(E.)‏، trudan ‏(Gt.)‏، trođa ‏(OIs.)‏ "هەنگاو نان، پێ لێنان، بەسەردا رۆیشتن، بە پێ تێ کوتان". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییانە دیاری نەکراوە.

تەراخوم **teraxum** *[ tarāxum ]* - "نەخۆشییەکی چاو": دەچێتەوە سەر وشەیەکی یۆنانی: < *trachoma (Gr.)* "زووری، زبری"، سەر بە ئاوەڵناوی trachys ‏(Gr.)‏ "زبر، گرنی گرنی".

تەراز **teraz** *[ tarāz ]* - "هاوئاست، هەموار":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ stracks (G.)، "ڕاستەوڕاست، یەکسەر" strack[ "ڕاست، هەموار، یەکسان، (لەبەریەک)کێشراوە" دە دیالێکتی ناویندا]، straks (Nl.) "یەکسەر"، strecken (G.)، streccen (OG.)، strekken (Nl.)، stretch (E.)، streććan (OE.) "ڕاست و تەخت کردن، لەبەر یەک کێشانەوە". ڕیشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە. وەک دەبینین ئەم وشانە ئاماژە دەکەنە دۆخێکی لەبەر یەک کێشانەوە کە لە ئەنجامیدا خوار و خێچی و بەرز و نزمی نامێنێ و هەمواری و یەکسانی دێتە ئاراوە و بە وتەیەکی دیکە دۆخێکی "تەراز" پێک دێ. ئەگەر ئەم شیمانەیە ڕاست بێ، ئەوا دەبێ فۆتیمی s دە وشە کوردمادییەکەدا سوابێتەوە یان دەرنەکەوتبێ. ئەم دیاردەیەش دە چەندین وشەی دیکەدا دەبینین وەک مڵ [مڵ و مۆ]، مژین، تریفە، تیخ، تاشین و هتد. لەم وشانەشدا فۆتیمی s بە پێچەوانەی خزمە ژێرمەنییەکانیان دەرناکەوێ.

[تێبینی: شیاوی سەرنجە strack دە دیالێکتی ناوینی ئەڵمانیدا بۆ کەسێکیش بەکار دێ کە بە تەواوی مەست بێ. ئەمەش ڕێک دەگەڵ ئەو گوتنە یەک دەگرێتەوە کە دە فارسی و کوردمادیشدا بە مرۆڤی مەست دەڵێن "میزانی؟" - میزان بە واتای تەراز].

2 - لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑تراشین tıraşîn "تاشین"ەوە. لەم تێڕوانینەوە "تەراز کردن" دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای تاشین [تراش دان] ی ڕووبەرێکی ناهەموار و یەکدەست کردنی ئەو ڕووبەرە بەکار هاتبێ.

**تەراف teraf** *[ tarāf ]* - "مێورە، لکی هەڵپەرتاوتراوی ڕەز": هەروەها تەراف کردن teraf kırdın هەیە بە مانای "بڕینی ڕەز، بڕینی باغ": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑دروێنە dırwêne و ↑دروون dırûn [دروون یان دروونەوەی گیا]. یان باشتر بڵێین هەردووک وشە دەچنەوە سەر وشەیەکی کۆنتر لە چەشنی *تەرپان terpan* / تەرفان *terfan** و لەم وشەیە دواتر وشەی "دروون" [گیادروون] و "تەراف" بە مانای "ڕەز بڕین" پەیدا بوون. دیارە وشەی "دروون" هێندێک ئاڵوگۆڕی بەسەرداهاتووە، تا گەیشتووەتە ئەم شێوەی ئێستای. بەڵام وشەی "تەراف" هاوشێوەیی خۆی دەگەڵ وشە کۆنەکە بەتەواوی پاراستووە. ئەم وشانە هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑*ترپان tırpan* "داسی دەسکدرێژ" و خوارتر ↑تەڕپلین terpılîn.

**تەڕپلین terpılîn** *[ tarpılīn ]* - "ساتمە بردن، هەڵەنگوتن، ڕەت بردن": ئەگەر سەرنجی وشەی "ساتمە" بدەین، دەبینین کە ئەو وشەیە دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "لێکدان، وێککەوتن". هەر بەم چەشنە وشەی "تەڕپلین"یش خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "لێدان، وێک کەوتن، لێکدران" وەک ↑ترپان tırpan "مەڵەغان، داسی دەسکدرێژ"، دروێنە dırêwne "لێدانی گیا" و ↑تەراف teraf "هەڵپەرتاوتنی ڕەز". ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ treffen (G.)، drepan (OE.)، drepa (OIs.) "پێکگەیشتن" [دەبنەڕەتدا: وێککەوتن] و هەوەها ga-drapan (Gt.) "کوتانەوە". لێرەدا دەشێ ئاماژە بە وێکچوونێکی دیکەش بکەین.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا treffen (G.) بە مانای "ئەنگاوتنی نیشانە"ش بەکار دێ. کاتێک تیر، پەڵڵار یان گوللە نیشانەیەک دەپێکێ، ئەمە دەراستیدا بریتییە لە "وێککەوتن"ی ئەو دوو شتە. دە زمانی کوردمادیدا ئێمە وشەی "ئەنگاوتن" بۆ ئەم مەبەستە بەکار دێنین و وشەی "ئەنگووتن" [هەڵەنگووتن] یش بە مانای "ساتمە بردن" بەکار دێنین. هەر دوو وشەی "ئەنگاوتن" و "ئەنگووتن" دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون و دەچنەوە سەر وشەی "کەوتن". لێرەشدا دەبینین کە ئەم وشانە مانای "وێککەوتن" دەردەبڕن. هەروەها کاتێک دەگوترێ "هەتاو ئەنگووت" یان "چاوی (بە دونیا) ئەنگووت" لیرەشدا ئاشکرایە کە مەبەست کەوتنی تیشکی خۆر لەسەر هەرد (وێککەوتنی تیشک و زەوی) یە، یان چاو بە دونیا کەوتن (ویککەوتنی چاو و دونیا) یە].

**تەرت¹ tert** *[ tart ]* - "پەرژ و بڵاو، دەرپەڕیو": دەگەڵ "توونا" دێ [تەرت و توونا tert u tuna بوون]. هەروەها تەرت کردن tert kırdın واتا "دوور کردنەوە، دەرکردن، دەرپەڕاندن". خزمە دەگەڵ ↑تەرە tere "دوورخراوە، تارێندراو".

**تەرت² tert** *[ tart ]* - "کەمرە": خزمە دەگەڵ ↑تەرس ters.

**تەڕچک terčık** *[ tarčık ]* - "شینکە، سەوزە": لە ↑تەڕ ter وەرگیراوە [تەڕ و تازە] .

**تەرجومان tercuman** [ *tarjumān* ] - "وەرگێڕ، پاچڤەر": دەچێتەوە سەر< *tūrgemānā* (*Aram.*) "تەرجومان". ئەم وشەیە کەوتووەتە ناو چەندین زمانی دیکەوە، لەوانەیە زمانەکانی عەرەبی، پەهلەوی، یۆنانی، لاتینی و هتد [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل.334].

**تەرحی terhî** [ *tarhī* ] - "جۆرێک سەرپۆش ژنانە": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑تارا tara "رووپۆشی بووک".

**تەرز terz** [ *tarz* ] - "لکی داوەبەن ئاسای رەز و برگە بێستان": خزمە دەگەڵ دەگەڵ ↑تاڵ tal [تار tar].

**تەرزە terze** [ *tarza* ] - "گللێرە، تەیرۆک": وشەکە دە ئەسڵدا ↑تەزرە tezre یە و فۆتیمەکانی z و r جێگۆرکێیان کردووە. تەترەک tetrek یش دەگوترێ [گۆڕانی z بۆ t].

**تەرس ters** [ *tars* ] - "پیسایی یەکسم": ↑تەرت tert یش هەیە بە مانای "کەمرە". خزمە دەگەڵ Dreck (G.)، dreax (OE.)، drek (Nl.) "چڵک، پیسی"، träck (Sw.)، sterganos (Gr.)، stercus (L.) "کوود، پەین" سەر بە ریشەی **< -*(s)ter (IE.)** "پەین، پیسی". لەلایەکی دیکەوە هەروەها dirt (E.) هەیە بە مانای "پیسایی، پیسی"، dreet (Nl.)، drita (ON.). ئەم وشانەش لەوانەیە پێوەندییان بە وشەکانی سەرترەوە هەبێ. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑چڵک çılık یش دەتوانین لەم چوارچێوەدا لێک بدەینەوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی تەرسەقول tersequl یش بەکار دێ. کەرتی قول qul شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گلە gıle [دەنکەترێ] و ↑*گلوو gılû*، ↑کلۆ kılo و چەندین وشەی دیکە بە مانای "رێککوشران، توپەڵە بوون". بەم جۆرە "تەرسەقول" دەبێتە "تۆپەڵەیەکی سەخت و پەیت" بە پێچەوانەی ریخی شل و ئاوەکی.

**تەرستین terıstîn** [ *tarsītn* ] - "ساخ بوونەوە، لە نەخۆشی هەستانەوە، چاک بوونەوە": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەتەرستین veterıstîn]. ڤەترستین vetırıstîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑دروست dırust.

[تێبینی: هەم وشەکانی "ساخ" و "چاک" و هەمیش "دروست" دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "سەخت، پتەو، بەهێز" دەبەخشن. مەبەست لە ساخ و ساخ بوونەوە یان تەرستین و دروست بوونەوە دە بنەڕەتدا "پتەو و بەهێز" بوون و دەربازبوون لە لاوازی و شەوێقییە.

**تەرسە terse** [ *tarsa* ] - "پێچەوانە، بەراوەژی": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە چەمکی "سووڕان، با دران، چەمانەوە" دەکەن، وەک ↑تلان tılan، ↑ترۆزی tırozî، ↑ترترە tırtıre و هتد. مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "وەرسووڕاو".

**تەرش terş** [ *tarš* ] - "کەرتکە ئاژەڵ، بەشێک لە مێگەڵ": هەروەها تەرشداری بە مانای "ئاژەڵداری" بەکار دێ. ئەگەر سەیری وشەی "کەرت، کەرتکە" بکەین دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە پێوەندی بە "کرتاندن، قرتاندن" و "کێرد"ەوە هەیە و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، جودا کردن". هەر بەم چەشنە وشەی "تەرش" لەوانەیە پێوەندی بە چەند وشەی وەک ↑دەرز derz، ↑دەرزی derzî، ↑دڕین dırîn ەوە هەبێ کە ئەمانیش دەچنەوە سەر ریشەی **< -*der (IE.)** "دڕین، بڕین، قەڵشاندن، جودا کردن". trünne (MG.) "مێگەڵ، تەرش، کەرتکەئاژەڵ" سەر بەم ریشەیە.

**تەرفک terfık** [ *tarfik* ] - "داوەدەزوو، تیکەیەک دەزوو": خزمە دەگەڵ ↑دروون dırûn و ↑*تەریب terîb*. "تەریب" شێوەیەکی کۆنترە لە وشەی "دروون(ەوە)".

**تەرک terk** [ *tark* ] - "رووبەری خوارەوەی هۆدە، بەرانبەری میچ": هەروەها دە وشەی پاشتەرک paşterk دا دێ و بە مانای "بەشی دواوەی زین کە هەگبەی لەسەردا دەبەستن" یان بە شوێنی شت لێ بەستن لە پشتەوەی دووچەرخە دەگوترێ. ئەم وشەیە دە بنچینەدا مانای "رووبەر، رووبەری هەرد" دەدا و خزمە دەگەڵ ↑داڵان dalan و چەند وشەیەکی دیکە.

**تەڕک terk** [ *tark* ] - "داردەست": خزمە دەگەڵ ترکە tarke (P.) "شووڵ"، دەچنەوەی سەر وشەی ↑دار dar و ↑تیلا tela.

**تەرگە terge** [ *targa* ] - "کۆڵوانە، چارشێوشان": خزمە دەگەڵ ↑تارا tara.

**تەڕڵان terlan** [ *tarlān* ] - "مەلێکی راوکەڕ لە تیرەی باز و شەهێن"؛ دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑داڵ dal و هەروەها ↑خەرتەل xertel [xer-tel]. جگە لەمانە تەرەوەژە tereweje هەیە کە ئەویش ناوی باڵدارێکە.

**تەرم terım** [ *tarım* ] - "لاشەی مرۆڤ، جەنازە"؛ جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ریشەی **(IE.) *ters- <** "هیشک بوون، هیشک هەڵاتن"؛ چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکان وک ↑تینوو tînu ی کوردمادی و dürr (G.) "هیشک هەلاتوو، رق هەڵاتوو، چرووساوە، مردوو" لەم ریشەوە هاتوون.

2- ریشەی **(IE.) *dher- <** "راگرتن، وەستاندن". لەم ریشەیە دواتر مانای "هیشک بوون، مەیین، رەق بوون" پەیدا بووە. ↑ترس2 tırs [*نانی بترسی* "نانی بە هیشکی"] و trocken (G.) "هیشک" و Droge (G.) "دەرمان" لەم ریشەوە پەیدا بوون. مەبەست لەم وشەی دوایی دە بنەڕەتدا "گژ و گیای هیشک کراو" بووە. لەوانەیە ↑دەرمان derman یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**تەرواڵ terwal** [ *tarwāl* ] - "سەکۆی لە دار دە رەشماڵدا"؛ تەلوار telwar یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑دار dar و ↑تێلا tela.

**تەرە¹ tere** [ *tara* ] - "دوورکەوتە، دوورخراو"؛ دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەمان هەیە کە دەگەڵ تەرە خزمن، وەک ↑تاران taran "دوور بوونەوە، ون بوون"، تاراندن tarandın "رەواندن، دوور کردنەوە، تەرەکردن"، ↑تەرا tera "تاک و تەرا، دوور لە ئەوانی دیکە"، ↑تەریک terîk "دوورەپەرێز"، ↑ترۆ کردن tıro "دەرکردن بە سووکایەتی"، ↑تەرت کردن tert "دوورخستنەوە" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی ژێرمەنی کە ماناکەیان بەتەواوی یاخود زۆر نیزیکە لە ماناکانی سەرەوە. treiben (G.) "تاراندن، دوور کردنەوەی بە زۆر، رەواندن، بەرەو پێش بردن". [دە زمانی ئەڵمانی دا وشەی vertrieben (ver پێشگرە) بۆ خەڵکی دەرکراو و لە ماڵ و حاڵی خۆ دوورخراوە بەکاردەهێنرێ]. triban (OG.)، dreiban (Gt.)، drive (E.). دەزمانی ئینگلیزیدا وشەکە زۆرتر بە مانای "لێخوڕین، ئاژۆتن" بەکار دەهێنرێ. لەوانەیە ناوی کێوی تەرەغە tereġe دە ئەسڵدا "تەرەگە" بووبێ و ئاماژە بە شوێنی کەساتیک بووبێ کە تەرە بوون یان تارێندراون و دوور لە خەڵکی ئاوایی ژیاون. هەروەها وشەی ↑جەردە cerde دەبێ گۆڕدراوی ↑تەریدە terîde بێ و پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە زمانی کوردمادیدا شێوەیەکی کۆنتری وشەکە پارێزراوە کە بریتییە لە ↑ترافاندن tırafandın "رەواندن، رفاندن". ترافیاگ tırafyag دەبێتە "دەرکراو، رەتێنراو". وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە ریشەکەیان ساخ نەکراوەتەوە.

**تەرە² tere** [ *tara* ] - "قووڵکەیەک بۆ تیداڕاگرتنی میوە"؛ خزمە دەگەڵ ↑دەرە dere و ↑*دۆڵ dol* و ↑تەڵە tele. گشتیان ئاماژە دەکەن بە قووڵکە و قوڵایی.

**تەڕەدین teredîn** [ *taradīn* ] - "شێتۆکە، دەلوو"؛ تەڕ(ە) ter(e) + ↑دین² dîn "شێت". کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑دەلوو delû "گیل، ئەقڵ سووک"، tol (OG.)، dol (Nl.)، dull (E.) "دەلوو"، dwals (Gt.) "ساکار، دەلوو"، dall (OIr.) "کوێر"، tholerós (Gr.) "لێل، تیکەڵ، گێژ"، هەروەها دەگەڵ Tor (G.) "سەرشێت". تیکڕای وشەکانی سەرەوە دواجار دەگەڵ یەکتر بە خزم دەردەچن و دەبنە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz. لەم تێڕوانینەوە "دین، دەلوو، تەڕەدین" ئەو کەسەیە کە مێشکی تیکەڵە یان ئاوەزێکی روون و زەلالی نییە و "تەپ و تۆز" یاخود "تەم و مژ" مێشکی داگرتووە. وەک دەبینرێ دە وشەی "تەڕەدین"دا دوو وشە بەکار هاتوون کە هاومانان و ئەمەش نیشانەی جەخت کردنە. دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشەی لەم چەشنە دروست کراون. لەم بارەوە بۆ وێنە بڕوانە "بانگەشە" یان "بانگەواز".

**تەڕەزن terezın** [ *tarazın* ] - "مێرگی زۆر ئاودار"؛ بڕوانە ↑زنە zıne "چیمەنی ئاودەڵێن".

**تەرەس teres** [ *taras* ] - "پەست، بێناموس"؛ دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەرس ters "پیسایی یەکسم". ئەم وشەیە خۆی خزمە دەگەڵ Dreck (G.)، dreax (OE.)، drek (Nl.) "چڵک، پیسی"، träck (Sw.)، sterganos (Gr.)، stercus (L.) "کوود، پەین". دە زمانی ئەڵمانیدا Dreck هەروەها وەک جنێو بۆ مرۆڤی پەست و بێناموس بەکار دێ.

**تەری terî** *[ tarī ]* - "1- کلێنجە 2- دووکێ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ tail (.E)، tagl (.Gt) و (ON)، zagal (.OG) "کلك". هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ تالی tālī (.Arb) "دووایی، دوومایی". وەك دەبینرێ لێرەشدا چەمکی "کلك، دوو(ما)" خۆی حەشار داوە. ریشە؟

**تەریب terîb** *[ tarīb ]* - "دروون بە تەقەڵی درشتی قیچەڵفاچ": ئەم وشەیە دەشێ دە ئەسڵدا وشەیەکی کوردمادی بێ، چووبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە و لەوێدا چەند وشەی وەك "اریب" و "مورب"ی لێ دروست کرابێ. وەك لەژێر وشەی ↑ترپان tırpan "مەڵەغان، داسی دەسك درێژ"دا شی کراوەتەوە، لە کۆندا کردارێکی وەك "تەرپاندن" یان "دەرپاندن" بە مانای "لێدان، کوتان" هەبووە. ئەم وشەیە دە زمانی ئەمڕۆدا وەك ↑زەرپاندن zerpandın بەکار دێ. وشەی ↑دەربە derbe "زەربە" دە زمانی ئەمڕۆدا بۆ ئەم کردارە دەگەڕێتەوە. ئەم وشەیە و کردارەکەی دە زمانی عەرەبیدا بووەتە ضربة zarba (.Arb) و ئەمجار بەو جۆرە تەقەڵە کە هێڵەکانی بەشێوەی قیلەوقاچ، واتا وەك "زەبدەر" لە یەك دەدەن، گوتراوە "تەریب".

**تەریدە terîde** *[ tarīda ]* - "چەتە، رێگر": خزمە دەگەڵ ↑تەرە tere "دەرکراو، دووخراوە".

**تەریق terîq** *[ tarīq ]* - تەریق بوونەوە واتا "خەجالەت بوونەوە، شەرم داگرتن". چەمکەکانی "شەرم کردن"، "تەریق بوونەوە" دەگەڵ "ترسان"، "سڵ کردن"، "رەوینەوە، رەوەك بوون" پێوەندی نیزیکیان هەیە. هەر بۆیە دەشێ ئەم وشەیە خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەك کە ئاماژە بە دەرپەڕین و دوور بوونەوە دەکەن، وەك ↑تەرە *tere* و ↑تەریك terîk "تاك، دوور کەوتوو، هەڵبراو".

[تێبینی: دە وشەنامەی ئەڵمانیدا وشەی schüchtern (G) " کەمرو، شەرمێون" و scheu (.P) "شەرمێون" پێکەوە خزمن. وشەی دوایی دە وشە نامەی ئەڵمانیدا ئەم مانایانەی بۆ کراوە: ترسەنۆك، شەرمێون، رەوەك، سڵ". ریشەی ئەم وشە ئەڵمانییانە ساخ نەکراوەتەوە].

**تەریك terîk** *[ tarīk ]* - "دوورەپەرێز": خزمە دەگەڵ ↑تەرە tere.

**تەرێف teref** *[ taref ]* - "پیس، گەمار": خزمە دەگەڵ trüb (.G)، truobi (.OG)، droef (.Nl)، drōf (.OE) لیخن، لێڵ". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەر لەم پێوەندییەدا کردار هەبووە بە مانای "لیخن کردن، شڵەقاندن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *dher- (.IE)** "تڵپە، لیتە و لەجەن، پیسایی". ↑ترفال tırfal [تڵپە tılpe] لەم ریشەوە هاتووە.

**تەزرە tezre** *[ tazra ]* - "تەرزە، تەیرۆك": خزمە دەگەڵ تگرك tagark (.P). وشەی ↑تەیرۆك teyrok یش شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی تەزرە. بنەوشەی تەزر / تەیر -tezr / -teyr یان دە فارسیدا تگر -teger گشتیان دە بنچینەدا هەریەکن و دەچنەوە سەر وشەی ↑تیر tîr [تیر دە بنەڕەتا tigrai بووە] و ئەمیش دەچێتەوە سەر ریشەی **< -*(s)teig (.IE)** "تیژ بوون و تیرا چوون". گەلێك وشەی وەك ↑تیر tîr، ↑تیژ tîj، ↑تیخ tîx وهتد لەم ریشەوە هاتوون. مەبەست لە تەزرە یان تەیرۆك دە بنچینەدا دەبێ "تیری گچکە" بووبێ.

**تەزوو tezu** *[ tazū ]* - "مچوورك": لە↑تەزین tezîn ەوە هاتووە.

**تەزین tezîn** *[ tazīn ]* - "سڕ بوون": خزمە دەگەڵ ↑تۆپین topîn.

**تەژ tej** *[ taž ]* - "ژێرجلی بارەبەر": خزمە دەگەڵ ↑دۆق doq. دە زمانی پەهلەویدا teškanak (.Pl) بە مانای "ژێرکراس" و teškūk (Pl) بە مانای "کراسی پیرۆز" بەکارهاتوون.

**تەژگ tejg** *[ tažk ]* - "کەتان": خزمە دەگەڵ ↑تەژ tej.

**تەژە1 teje** *[ taža ]* - "کۆڵەکە، ئالوودار": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ téktōn (.Gr) "وەستای خانوو"، táksan (.OIn)، táksati "دروست دەکا، خانوو دروست دەکا "، texere (.L) "چنین، هۆنینەوە، تێکخستنەوە، دروست کردن".

**تەژە2 teje** *[ taža ]* - "زل و زەبەلاح": خزمە دەگەڵ ↑تەژی tejî بە مانای "پڕ". سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "زل و زەبەلاحی" و "پڕی" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "پۆڕ" [پان و پۆڕ] کە شێوەیەکی دیکەیە لە "پڕ".

**تەژی tejî** *[ tažī ]* - "پڕ": تژی tıjî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ dicht (G.) "چڕ و پڕ"، tight (E.) "توند، سفت"، diht (OE.) "قەڵەو، بەهێز"، techt (OIr. ) "توند بوو، مەییو"، taxma (Av.) "چڕ، توند، سفت" [تۆکمە؟] سەر بە ریشەی ***(IE.) *te(n)k- >*** "توند بوون، چڕ بوون". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑تەژە teje هەیە بە مانای "زڵ، پان و پۆڕ" کە بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێتەوە. [وشەی " پۆڕ" لە "پڕ" وەرگیراوە و پێوەندی دوو چەمکی "پان و پوڕ" و "پڕ" لە نێوان دوو وشەی "تەژی" و "تەژە"شدا دەبیندرێ]. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا لەم ریشەیەوە هێندێک وشە پەیدا بوون وەک thīhan (OG.) "هەڵدان، پەرە سەندن"، dijen (Nl. ) "ماسین، زل بوون"، dīon (OE. ) "هەڵدان، پێگەیشتن"، tanákti (OIn.) "چوونە ناویەک، توند و چڕ بوون"، tánkus (Lit.) "توند، چڕ"، con-téici (OIr.) "مەیین، توند بوون". دە زمانی کوردمادیشدا وشەیەکمان هەیە کە پێوەندی تەواو بەم وشانەی سەرەوە نیشان دەدا و هەم لەباری دەنگسازی و هەم لە باری ماناوە بە تایبەتی دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان یەک دەگرێتەوە. ئەم وشەیە ↑تەشەنا / تەشەنە teşena / teşene یە کە بە مانای "پەرە سەندن، تەنینەوە، زۆر بوون" بە کار دەهێندرێ. وشەکە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەسەل tesel [تیر و تەسەل واتا تیر و پڕ] و چەندین وشەی دیکەش وەک ↑تەقتەق teqteq "زەوی بەردین" و ↑تەقن teqın "جێگەی پڕ لە قوڕ و لیتە".

**تەژیر tejîr** *[ tažīr ]* - "هۆڵەمەڕ": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تەژە teje "کۆڵەکە، ئاڵوودار".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی "خانوو" و "داری خانوو" دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا نموونەیەک هەیە کە پێوەندی تەژیر و تەژە دە زمانی کوردمادیدا پشتراست دەکا. دە زمانی ئاڵمانیدا Zimmer بە واتای "دیو، هۆدە" دێ و دە زمانی ئینگلیزیدا timber کە دەستەخوشکی وشە ئەڵمانییەکەیە، بە مانای "داری خانوو" بەکار دێ].

**تەسک tesık** *[ tasık ]* - "باریک": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تازە taze.

**تەسمە tesme** *[ tasma ]* - "کوتەچەرمێکی پانی درێژووکە، بەندی پان لە چەرم": تسمە tasme (P.). هەروەها ↑تیسماڵک tîsmalk هەیە کە بچووککراوی وشەی "تسمە، تیسمە"یە. خزمە دەگەڵ ↑تیسک tîsk "مووی درێژ" و ↑تیتۆڵ tîtol "کوتە(پەڕۆ)" و ↑تۆژ toj [تۆێژ toej]، دە بنەڕەتدا بە مانای "تیکە یان توێژێک کە بە هۆی وێککەوتن و لێدان لێ دەکرێتەوە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "وێککەوتن، پێکدادران". جێی ئاماژەیە کە وشەکانی "کوت"، "لەت"، "تیکە"ش دە ریشەدا مانایەکی لەم چەشنە دەبەخشن.

**تەسە1 tese 1** *[ tasa ]* - "1- تەبەکی نان 2- تەشتی هەویرشێلان": خزمە دەگەڵ ↑تاس tas "دەفر" و↑ تەشت teşt.

**تەسە2 tese 2** *[ tasa ]* - "هەڵەنگوتن، ڕەت": خزمە دەگەڵ ↑تووش1 tûş [تووش بوون واتا وێککەوتن، وێکەوتن]، دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەسە1 tese 1.

**تەسەل tesel** *[ tasal ]* - زۆرتر دەگەڵ "تیر" دێ [تیر و تەسەل ter u tesel واتا تیر و پڕ]. تەس + ئەل tes + el. کەرتی دووەم پاشگرە. کەرتی تەس- tes- دەچێتەوە سەر ↑تەژی tejî بە مانای "پڕ".

**تەش teş** *[ taš ]* - "ئاگر": ئەم وشەیە بە وێنەی تەز tez و تەژ tej یش دەبیندرێ. دەفارسیدا اتش ātеš (P.) "ئاگر" [ā + taš]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑داخ dax [داغ daġ].

**تەشبریق** ***teşbrîq*** *[ tašbrīq ]* - "هەورەبرووسکە": ↑تەش + بریق teş + b(ı)rîq. کەرتی یەکەم بە مانای "ئاگر، تیشک" دێ و کەرتی دووەمیش دەچێتەوە سەر کرداری ↑بریقانەوە bırîqanewe.

**تەشت teşt** *[ tašt ]* - "جۆرێک دەفر": teşt (P.)، tašta (Av.)، testa (L.) "جام، دەفر، تەشت". وشە لاتینییەکە دەشێ لە ئەوێستاییەکە وەرگیرابێ. هەروەها ↑تەسە tese "تەشتی هەویرشێلان" و ↑تاس tas "جام" پێوەندییان بەم وشەوە هەیە. لەوانەیە ئەم وشانە خزم بن دەگەڵ ↑دەشت deşt و دواجار ↑تەشک *teşk* [تەشک و داوێن].

[تێبینی: دە زمانی کوردیدا وشەی گۆڕ "دەشت" پێوەندی هەیە بە "قووڵ، کوور" و مەبەست دە بنەڕەتدا شوێنی نزم و قووڵ بووە، بە پێچەوانەی شاخەکان. هەر لەم پێوەندییەدا وشە بە مانای "دەفر"یش هاتووەتە ئاراوە، وەک "کوار" یان "کۆدک"، واتا لێرەشدا چەمکی قووڵایی بۆ ناو لێنانی جۆرەکانی دەفر بەکار هاتووە. بەم

شێوەیە دوور نییە کە وشەی "تەشت" و "دەشت"یش پێوەندییان بە چەمکی "نزمایی، خوارەوە، قووڵایی"یەوە هەبێ].

**تەشق teşq** [taşq] - تەشقی ئاسمان واتا بنی ئاسمان. خزمە دەگەڵ ↑تەشك teşk "داوێنی کراس" [تەشك و داوێن].

**تەشقەڵە teşqele** [tašqala] - "گەڕ، دەبە، شڵتاغ":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ täuschen (G.)، tūschen (MG.)، tuisen (Nl. dial.) "فریو دان، گۆڕین، دەبە کردن". ریشەی ئەم وشانە دیاری نەکراوە.

2- لەوانەشە هەمان وشەی شڵتاغ şıltaġ بێ و ئاڵوگۆری بەسەردا هاتبێ.

**تەشك1 teşk** [tašk] - "داوێنی کراس": زۆرتر دەگەڵ "داوێن" دێ [تەشك و داوێن teşk û dawên]. خزمە دەگەڵ تە teh (P.) "خوارەوە، بن"، tah (Pl.) "ژێر، بن" و ↑دا -da ی پاشگر دە زمانی کوردمادیدا کە ئاماژە بە لای خوارەوە دەکا [دانیشتن، دابەزین، داکەوتن و هتد]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەك ↑ئاتەگ ateg [a + teg]، ↑ئەتك etik [e + tık] و هتد.

**تەشك2 teşk** [tašk] - "تەرح، شێوە، بیچم": لەژێر وشەکانی ↑تیپ tîp "1- حەرف، نیشانە 2- جۆر، نەوع"، ↑تۆڤ tov [چتۆڤ]، تۆر tor [چتۆر]، تەبارە[1] tebare دا شی کراوەتەوە کە ئەم وشانە پێکەوە و هەروەها دەگەڵ کرداری ↑تەپاندن tepandın "لێدان" خزمن. شەقڵ و شێوە، وێنە و نیشانەکان سەرەتا بە لێدان لەسەر دار و بەرد دروست کراون. هەر بەم شێوەیە تەشك2 teşk پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑تاشین taşîn. مانای "تەشك" دە بنەڕەتدا دەبێتە "داتاشراو"، واتا ئەو وێنەیە یان پەیکەرەی داتاشراوە. خودی وشەی "تاشین" دواجار خزمە دەگەڵ "تەپاندن".

**تەشلەخە teşlexe** [tašlaxa] - "هەڕەت و جەنگەی سەرما": [دەمێك سەرما دەگاتە ئەوپەڕی خۆی]. خزمە دەگەڵ ↑تەحرە teḧre "جەنگەی گەرمای نیوەڕۆ".

**تەشوی teşwê** [tašwe] - "ئامرازی دار تاشین": دە فارسیدا تیشە tīše (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ یەکێك لەم وشانە:

1- ↑تاشین taşîn.

2- ↑تیژ tîj.

3- ↑داس das.

**تەشە1 teşe** [taša] - "ڕۆچنە": توش tūš (P.). خزمە دەگەڵ ↑داخ dax [داغ daġ].

**تەشە2 teşe** [taša] - "تاقەت، هێز و توان": توش tūš (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەشە teşe "ڕۆچنە" و ↑تەش teş "ئاگر"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "سووتان". لەباری ماناوە دەکرێ دەگەڵ "تین" هەڵی سەنگێنین: تین و توان، تین و گوڕ.

**تەشەنە teşene** [tašana] - "تەنینەوە و زیاد کردن": تەشەنا teşena ش دەگوترێ. خزمە ↑دەگەڵ tejî "پڕ". وشەکە دە بنچینەدا بەمانای "گەشە کردن، زیاد کردن، پەرە گرتن"ە.

**تەشی teşî** [tašī] - "ئامێری رستن": دوك dūk (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ dehse (MG.) "تەشی". بە گوێرەی بۆچووتێك دە زمانی ئەڵمانیدا Eidechse (G.) "مارمێلکە" پێوەندی بەم وشەی ئەڵمانی ناوینەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیشدا وشەی "تەشی" دە ناوی "کلکەتەشی"دا هەیە کە بە بێچووی بۆق دەگوترێ کە تازە لە هێلکە دەهاتووە و شێوەکەی لە تەشێ دەچێ.

**تەشیرە teşîre** [tašīra] - "ڕەورەوە": بڕوانە ↑تەشیلە teşîle "1-هەڵمات، کەلا 2- غەڕغەڕە".

**تەشیلە teşîle** [tašīla] - "1-هەڵمات، کەلا 2- غەڕغەڕە": هەروەها ↑تەشیرە teşîre هەیە بە مانای "ڕەورەوە" [دە بنەڕەتدا: پێچکەی ڕەورەوە] و تەشیلان teşîlan "هەڵماتین". چەمکی هاوبەش لەم وشانەدا "تل خواردن"ە،

واتا هەر سێ شت بە دەم تل خواردنەوە دەبزون. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێ خزم بێ دەگەڵ تەحس teħs "خلیسک" و ↑تەحسین teħsîn "خلیسکان".

[تێبینی 1: لەباری پێوەندی ماناکانی سەرەوە دەتوانین دەگەڵ وشەکانی خوارەوە هەڵی سەنگێنین: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Rolle (G.) سەرەتا بە مانای "کەلا، پێچکە، غەرغەرە" و بەگشتی بۆ شتێکی خڕ یان لوولەئاسای چکۆڵە کە تڵ دەخوا، بەکار هاتووە. پاشان ئەم وشەیە مانای "رۆڵ، دەور"ی لە کایەی تیاتردا پەیدا کردووە و گوتوویانە فڵانە کەس ئەو رۆڵە یاری دەکا. مەبەست لەم قسەیە سەرەتا ئەو کاغەزە پێچراو و لوول دراوە [تۆمار] بووە کە نەخش و دەوری کایەکەرەکەی تێدا نووسراوە. پاشان وشەکە بەگشتی مانای "دەور، نەخش، رۆڵ"ی وەرگرتووە و بەم مانایە کەوتووەتە ناو زمانی کوردیشەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها rollen (G.) هەیە بە مانای "تڵ خواردن، گلۆر بوونەوە"ی شتێکی خڕ یان لوولەیی کە ئەمەش پێوەندی بە وشەکەی سەرەوە هەیە. هەروەها Rollator (G.) هەیە کە وشەیەکی تازەیە و بە مانای "رەورەوی پیران" بەکار دەهێنرێ. ئەم وشە ئەڵمانییانە ریشەی فەرانسەیی و دواتر لاتینییان هەیە (< rotulus "پێچکە، چەرخۆکە") و دەبنە خزمیش دەگەڵ Rad (G.) "چەرخ، ئارەبە" و رێ re 1 "شەقام، شوێنی پێدارۆیشتن" و رەت ret [رەت بوون واتا تێپەڕین، رەت دان واتا هەڵخلیسکان]، سەر بە ریشەی **< *ret(h)- (IE.)** "گەڕان، رۆیشتن، تلان، خلۆر بوونەوە". تێبینی 2: رەنگە پڕ بە پێستی خۆی بێ ئەگەر ئێمە وشەی "رەورەوە"، هەر وەک ئا ئێستا باوە، بۆ ئەوەی منداڵان بەکار بێنین و وشەی "تەشیلە" بۆ رەورەوەی پیرەکان، واتا بەرانبەر بە وشەی ئەڵمانی Rollator. بەم شێوە ئێمە دەتوانین لە وشەیەکی رەسەن و کۆن بۆ چەمکێکی تازە کەڵک وەربگرین و پێویستیمان بە وشە داتاشین نەبێ].

**تەعەو teɛew** [ *taɛaw* ] - "تاوک، دارێکی سەختی جەنگەڵی": تاغ tāġ (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەژی *tejî* "پڕ" [دە بنەڕەتدا: چڕو پڕ، سفت] و ↑تەژە teje "زەبەلاح" [دە بنەڕەتدا: قەبە، بەهێز].

[تێبینی: وەک دەبینرێ، ناوێکی دیکەی ئەم دارە "تاوک"ە. ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ تاو taw [تاو دان واتا زەخت و هێز خستنەسەر] و توانین tuwanîn و تاپاز tapaz "زەبەلاح"].

**تەغژ teġj** [ *taġž* ] - "جۆرێک ترێ رەشکە": خزمە دەگەڵ ↑تۆخ[1] tox "تاریک رەنگ، رەش".

**تەف tef** [ *taf* ] - "میر هاتنی جگێ، کەوتنی جگێ بە بارێ (لووسدا ؟)": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵ، نزم".

**تەفاری tefarî** [ *tafārī* ] - "جۆرێک هەنجیر": هەروەها ↑تەڤزک tefzık یش هەیە بە مانای "جۆرێک هەنجیر". خزمە دەگەڵ ↑توو tu [تفی tıfî].

**تەفاریک tefarîk** [ *tafārīk* ] - "مسکینی تازە هاتوو": دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی "رەشایی" و "مسکین" و "قەرە" بە مانای گوندنشینی بێ گا و جووت بەکار هاتوون، واتا نەدارترین و پلە نزمترین تۆژ. هەر سێ وشە ئاماژە بە رەنگی "رەش" دەکەن. مسکین خزمە دەگەڵ مشکی "خۆڵەمێش". هەر بەم شێوەیە "تەفاریک"یش دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "رەش، ئاماڵ رەش" دەکەن، وەک ↑تەو tew "مەڕی بۆر"، ↑تەفسە tefse "پەڵەی (رەشی) دەموچاو" و ↑*دەوار*[2] *dewar* "رەشماڵ" و هتد.

**تەفایە tefaye** [ *tafāya* ] - "مەنقەڵی، وەجاق": خزمە دەگەڵ ↑تفک tıfık "کوانوو، ئاگردان".

**تەفتیک teftîk** [ *taftīk* ] - "کوڵکە، تووکی نەرمی بنەوە": خزمە دەگەڵ ↑تووک tuk و دواتر ↑تۆکڵ tokıl.

**تەفر tefır** [ *tafir* ] - دەگەڵ "توونا" دێ، تەفر و توونا tefr u tuna بوون واتا لەناو چوونی تەواو و یەکجارەکی. خزمە دەگەڵ ↑تاوانەوە tawanewe "حەل بوون، لەبەریەک بڵاوبوونەوە". دەشێ خزمیش بێ دەگەڵ تباه tebah (P.) و tepāh (Pl.) "خراب بوون، نابوود بوون".

**تەفرە tefre** [ *tafra* ] - "فریو": تەفرە دان واتا فریو دان، خاپاندن. خزمە دەگەڵ ↑دەبە debe [دەببە debbe] "تەشقەڵە، گەڕ".

**تەفسە tefse** [ *tafsa* ] - "پەڵەی دەموچاو": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە ئاماژە بە رەنگی بۆر یان ئاماڵ رەش دەکەن، وەک ↑تفیلک tıfîlık "کۆترەباریکە"، ↑تەوار tewar "بازی مێ"، ↑تەو tew "پەزی بۆر" و هتد. بەراوردی

ئەم وشانە بکە دەگەڵ dub (.OIr) بە مانای "ڕەش". ئەم وشانە هەروەها دە پلەیەکی دووورتردا دەبنە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz، ↑توومان tuman، ↑دووکەڵ dukel و هتد، کە ئەوانیش بە ڕەنگێکی خۆڵەمێشی یان ئاماڵ ڕەش خۆدەنوێنن. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑*دەوار²* *dewar* "پارچەی ڕەشماڵ".

[تێبینی: شیاوی باسە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ماڵە male ش بە مانای "پەڵەی دەموچاو" دەگەڵ mélās (.Gr) "ڕەش" لە یەک ریشەوە دێن].

**تەفشک tefšık** [ *tafşık* ] - "1- تەڵاشی دار یان بەرد 2- کرێژی سەر": خزمە دەگەڵ ↑تەفشوو tefšū "تەشوێ". بڕوانە ↑تەپشوو tepşû، خزمە دەگەڵ ↑تەپ⁴ tep "لێدان". "تەفشک" ئەو لەت و پەتانەیە کە بەهۆی "لێدان"ەوە پەیدا دەبن، هەروەک چۆن "تەڵاش" یان "تەڵەزم" بەرهەمی "تراشین"ە.هەروەها دەبێتە خزمیش دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*تۆکڵ tokıl* دا هاتوون.

**تەفشوو tefšū** [ *tafşû* ] - "تەشوێ": تەفشی tefşî و تەفشوێ tefşuwê ش دەگوترێن. بڕوانە ↑تەپشوو tepşû، خزمە دەگەڵ ↑تەپ⁴ tep "لێدان".

**تەفک tefık** [ *tafik* ] - "گێلۆکە، دەبەنگ": دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەر لە ریشەی ***(IE.) *dheu-*** > کە ئاماژە بە "بزاڤێکی پڕجم وجۆڵ، نائارام و تیکەڵ و پێکەڵ و پڕ لە خولان و سوورانەوە" دەکا، چەند وشەیەک دروست بوون کە مانای "گێل، گێژ، شێت، دەلوو و هتد" دەبەخشن، وەک doof (.G) "گەمژە". ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ taub (.G)، deaf (.E)، döv (.Sw) "کەڕ". مەبەست لەم وشانە دە ئەسڵدا "گێلۆکە، گەمژە" بووە، چونکوو مرۆڤی کەڕ لەبەر نەبیستن و نەتوانینی کاردانەوەی پێویست وەک "گەمژە" سەیر کراوە. هەرلەم ریشەی سەرەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەکانی Tor و toll (.G) و dull (.E) "سەرشێت، سەرسەری" پەیدا بوون کە خزمن دەگەڵ ↑دەلوو delu "گێلۆکە".

**تەڤ tev** [ *tav* ] - "1- گشت، هەموو 2- دەگەڵ، وێکڕا": مانای ئەم وشەیە دەشێ بەم شێوە دروست بووبێ. "تەڤ" خزمە دەگەڵ ↑تۆڤ tov و ↑تەور tewr و هەروەها ↑تیپ tîp بە مانای "شکڵ، شێوە". پاشان لە مانایەوە مانای "نەوع، دەستەیەکی هاوشێوە" پەیدا بووە. هەر دوو ئەم مانایە لە وشەی Typ (.G) دا دەبینرێ کە ریشەکەی بۆ زمانی یۆنانی دەگەڕێتەوە و خزمیشە دەگەڵ وشە کوردییەکانی سەرەوە. دیسان لەم مانایەوە مانایەکی تازەتر سەری هەڵداوە، واتا مانای "گشت، هەموو" و لەمەشەو مانای "پێکەوە، وێکرا، دەگەڵ". پێوەندی ئەم دوو یان سێ مانایەی دوایی لە دوو وشەی "گەل" و "دەگەڵ" و هەروەها لە دوو وشەی "هاو/ هەم" و "هەموو"دا دەبینرێ. کەوابوو پەرەسەندنی مانا جیاوازەکان بەم جۆرە بووە: شکڵ، شێوە، وێنە ← دەستە یان کۆمەڵێکی هاوشێوە، نەوع ← گشت، هەموو، هەمووان ← "دەگەڵ، بەهەڤڕا، (هەموو) پێکەوە". ئەم وشانەی خوارەوەش پێوەندی بەم باسەوە پەیدا دەکەن: ↑تەڤایی tevayî "ئاشتی، دۆستایەتی" [دە بنەڕەتدا: پێکەوە بوون، یەکگرتن]، ↑تەبا teba ش دەگوترێ [تەبا و ڕەبا teba u reba بوون واتا "دەگەڵ یەکتر کۆک بوون، هاودەنگ و یەکگرتوو بوون"، "ڕەبا" شێوەیەکی دیکە لە "ڕەوا" یان "ڕەڤا" بە مانای "عادڵانە"]، ↑تەڤلی tevlî بوون "بەشدار بوون" [دە بنەڕەتدا: بە هەڤڕا بوون، پێکەوە بوون]، ↑تەڤگەر tevger "بزاڤ" [دە بنەڕەتدا: یەکگرتوویی، هاوبەندی، بەشداری کۆمەڵانی گەل لە شۆڕشدا".

**تەڤا teva** [ *tavā* ] - "وزە، هێز": خزمە دەگەڵ ↑توانین tuwanîn.

**تەڤایی tevayî** [ *tavāyī* ] - "ئاشتی، دۆستایەتی": خزمە دەگەڵ ↑تەڤ tev.

**تەڤزاندن tevzandın** [ *tavzāndın* ] - "داپۆشین": خزمە دەگەڵ ↑تۆژ tož یان تۆێژ toej.

**تەڤزک tefzık** [ *tafzık* ] - "جۆرێک هەنجیر". خزمە دەگەڵ↑تەفاری tefarî "جۆرێک هەنجیر" و ↑توو tu [تفی tıfî].

**تەڤزین tevzîn** [ *tavzîn* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑تەزین tezîn "سڕ بوون".

**تەڤزینە tevzîne** [ *tavzīna* ] - "دڕوویەکە دەکرێتە پەرژین": خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın.

**تەڤژین1 tevjîn** [ *tavžīn* ] - "1- شوولین، زگچوون 2- ریخی شل": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تاوانەوە tawanewe سەر بەریشەی *< -tau* ( *IE.*) "حەل بوون، لێک بڵاو بوون". شیاوی باسە دە زمانە ژێرمانییەکانیشدا هەم ئەو وشانەی مانای "تاوانەوە" دەدەن و هەم ئەوانەش مانای "هەزم کردن" دەدەن، هەر لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە tauen (.G) "تاوانەوە" و verdauen (.G) "هەزم کردن، هەڵتاواندن".

**تەڤژین2 tevjîn** [ *tavžīn* ] - "پێ بوونی ئاگر": خزمە دەگەڵ ↑تاو¹ taw "هەتاو، تین و گەرما".

**تەڤگەر tevger** [ *tavgar* ] - "بزاڤ، بزوتنەوە": [تەڤگەرا ئازادی]. خزمە دەگەڵ ↑تەڤ tev "وێرا، بەهەڤرا، پێکەوە".

**تەڤلی tevlî** [ *tavlī* ] - تەڤلی بوون واتا "هاتنەناو، بەشدار بوون". دەچێتەوە سەر ↑تەڤ tev "وێرا، بەهەڤرا، پێکەوە".

**تەڤنک tevnık** [ *tavnık* ] - "داوی جاڵجاڵووکە": تەڤنەپیر tevnepır و تەڤناپیرێ tevnapîre ش دەگوترێ، خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın [تەڤن tevın].

**تەق teq** [ *taq* ] - "دەنگی لێدان یان لێکدان و پێکدادان": تەقە teqe ش دەگوترێ، بۆ وێنە "تەق تەقteqteq لە دەرگای دا" یان "تەقەتەق teqeteq ی دەرگا". ئەم وشەیە پێوەندی بە "تەقین و تەق و تۆق"ەوە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ ↑تووش1 tûş [تووش بوون واتا "وێککەوتن"]. وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبێ و بووەتە دق daq (.Arb) [دقالباب واتا دەرگاکوت]. ↑تەکمیش tekmîş "بنکۆڵ کردنی رەز" دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ، چونکوو ئەم کارە بریتییە لە جۆرێک لێدانی زەوی. لەوانەیە ↑تەکان tekan یش پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

**تەقاندن teqandın** [ *taqāndın* ] - دەگەڵ پێشگری"تێ" دی: تێتەقاندن têtaqandın واتا هەڵاتنی خێرا. خزمە دەگەڵ تاختن tāxtan (.P) "رەتاندن، غار پێکردن"، tákti (.OIn) "پەلەدەکا" و takvá-h (.OIn) "بەپەلە، خێرا"، tachy (.Gr) "خێرا، بەپەلە" و tachos (.Gr) "خێرایی"، سەر بە ریشەی *< -tek** (*IE.*) "راکردن". دە زمانی کورددی وشەی ↑تاجی tacî (تاژی/ تانجی) "سەگی تیژرەوی راوچی" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. دەبێتە خزمیش دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑تەقلە teqle "یاری جلیتبازی" و تەقلەکوت teqlekut "هەڵاتن، غار دان". هەروەها دە فارسیدا وشەی تک tak (.P) هەیە بە مانای "هەڵمەت، پەلامار".

[تێبینی: لەباری پێوەندی مانایی دوو چەمکی "هەڵمەت" و "خێرایی" لە زمانی کوردمادیشدا دوو وشەی "پەلە" و "پەلامار" هەن کە لە یەک ریشەوە سەرچاوە دەگرن].

**تەقالک teqalk** [ *taqālk* ] - "1- سەرەتەشی کە تەختەیەکی خڕ و پان و بچووکە 2- خڕی پانی بچووک وەک قورسی نەعنا 3- قاشە هارۆی لە پانەوە بڕاو": وەک دەبینرێ لە هەموو ماناکاندا "خڕێکی پانکەڵە" مەبەستە. خزمە دەگەڵ هێندێک وشە وەک ↑تۆژ toj، ↑تاس tas و ↑*تاشین taşîn* و لەوانەشە ↑تیس tîs "سواپ، بەردی خڕی پانکەڵە".

**تەقتەق teqteq** [ *taqtaq* ] - "زەوی بەردین": بنەوشەی تەق -teq خزمە دەگەڵ ↑تەژی tejî و ↑تەژە teje. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک کە مانای "چڕ بوون، رەق بوون، توند بوون" دەبەخشێ. هەر لەم ریشەوە ماناکانی "سەخت و خورت و بەهێز" یش سەریان هەڵداوە.

**تەقتەقۆک teqteqok** [ *taqtaqok* ] - "چەقەنەی ئاش، چەقچەق": تەقەنە teqene ش دەگوترێ.

1- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چەقەنە çeqene و چەقچەق çeqçeq.

2- خزمە دەگەڵ ↑تەکان tekan [تەکەتەک teketek کردن واتا لەرینەوە].

**تەقتەقیلە teqteqîle** [ *taqtaqīla* ] - "(پێڵاوی) سەرپایی": پێوەندی هەیە بە ↑تەق teq "دەنگی لێدان یان لێکدان و پێکدادان". "تەقتەقیلە" دە بنەڕەتدا سەرپاییەک بووە کە بنەکەی لە دار بووە و لە کاتی رۆیشتندا تەقەتەقی لێ هاتووە.

[تێبینی: چەشنی ئەم وشەیە لەباری وشەسازییەوە جێی سەرنجە و دەشێ لە ساز کردنی وشەی تازەدا کەڵکی لێ وەربگیرێ. لەم وشەیەدا بنەوشەکە دووبارە کراوەتەوە و پاشگری پێوەی لکاوە، teq + teq + île. هێندێک جار وشەی لەم چەشنە بەبێ پاشگری île ساز دەبێ وەک چەکچەکی "شەمشەمەکوێرە" ].

**تەقلە1 teqle** [ *taqla* ] - "یاری جلیتبازی": بنەوشەی -teq بە مانای "را کردن، هەڵمەت بردن" لە وشەی ↑تەقاندن teqandın یشدا بە مانای " تێتەقاندن" دەبینین. جگە لەمە تەقڵەکوت teqlekut هەیە کە مانای "هەڵاتن، غار دان" دەدا، هەروەها تەق و دەو teq u dew یان تەق و ڕەو teq u rew بە مانای "کۆچی بەکۆمەڵ".

**تەقلە2 teqle** [ *taqla* ] - "سەرمەقولات، خۆ وەرسووڕاندن لە حەوادا": [کۆتری تەقڵەباز]. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ریشەی *(IE.) *qeqlo- >* "چەرخ، چەرخان". وشەی ↑چەرخ çerıx خۆی دە ئەسڵدا چەخەر čaxar بووە و بۆ ئەم ریشەی سەرەوە دەگەڕێتەوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکەش لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ، کە ئەویش ↑چەقڵە çeqle یە [چەقڵەسەما]. "چەقڵە" لەوانەیە ئاماژە بە خۆ با دان و جم و جۆڵی تیکەڵ بە سووڕان لە کاتی سەما کردندا بکا. لەوانەیە "چەقڵە" وشە کۆنترەکە بێ و پاشان وشەی "تەقڵە" بۆ مانایەکی تایبەتی، واتا "خۆ وەرسووڕاندن دە حە*وا* دا" لەمەوە سەری هەڵدابێ. بەراوردی "چەقڵە" بکە دەگەڵ cyclus (L.) و kúklos (Gr.) "چەرخ".

**تەقن teqın** [ *taqın* ] - "جێگەی پڕ لە قوڕ و لیتە": خزمە دەگەڵ Ton (G.) "گڵی تایبەت بو چێ کردنی گۆزە"، dāha (OG.)، thāhin (OS.)، dōhe (OE.) "قوڕ، لیتە". وشەکە لە ریشەدا لەگەڵ ↑تەژی tejî "چڕ و پڕ" بە خزم دەردەچێ.

**تەقەڵ teqel** [ *taqal* ] - "تیک، باقیە": خزمە دەگەڵ ↑تیک tîk [تیک و درووومان].

**تەقەلا teqela** [ *taqalā* ] - "کۆشش، تێکۆشان": تەقللا teqella ش دەگوترێ. تقلا taqallā (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەکینەوە tekînewe "کشانەوە" و ↑*تۆق* [1] *toq* "ئاڵقەی مل" [بۆ راکێشان] و چەندین وشەی دیکەی بە مانای "کێشان، راکێشان".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ straggle دە زمانی ئینگلیزیدا کە ئەویش خزمە دەگەڵ stretch بە مانای "کێشان، لەبەریەک کێشان"، هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "کێشان" و "کۆشین" (تێکۆشین)].

**تەقەوانە teqewane** [ *taqawāna* ] - "کون کە ئاژەڵ بۆ خۆ رزگار کردن دایناوە": هەروەها تەقیو teqîw هەیە بە مانای "تەرە، هەڵاتوو". خزمن دەگەڵ ↑تەقاندن teqandın [تێتەقاندن têtaqandın واتا هەڵاتن].

**تەقیلە teqîle** [ *taqīla* ] - "کڵاوی لە پەڕۆ و دەزوو": ئەم وشەیە و هەروەها ↑تەژ tej "ژێرجلی بارەبەر" دەتوانین بە دوو جۆر لێک بدەینەوە:

1- لەلایەکەوە دەتوانین پێوەندیان بدەین بە ↑دەق deq و بیانبەینەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چنین و هۆنینەوە".

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین بە خزمیان بزانین دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەو وشانەی کە مانای "داپۆشین، سەر نانەوە، شاردنەوە" دەدەن. هێندێک لەم وشانە لە ژێر ↑تۆک/ تۆکل tok(ıl) دا باسکراون، بۆ وێنە بەراوردی وشەی ↑تەکلە tekle "دەرخۆنە، سەرپۆش" بکە دەگەڵ تەقیلە teqîle "سەرپۆشی مرۆڤ".

**تەقین teqîn** [ *taqīn* ] - "لەبەریەک هەڵوەشانی توند و لەنەکاو": دە فارسیدا ترکیدن terakīdan ( .P). دە کوردمادیدا فۆتیمی r سواوەتەوە. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە کە پێوەندییان بە وشەی ↑دڕان/ دڕاندن dıran وە هەیە و دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *der- >* "دڕان، لێک جیا بوونەوە".

**تەک1 tek** - "لە تەک" بە مانای "لەگەڵ" بەکار دەهێنرێ.

1- دە زمانی پەهلەویدا تیهەک tehak (Pl.) بە مانای "تیغە، لێوار و قەراخ" بەکارهاتووە و خزمیشە دەگەڵ ↑تیخ tîx. لەم تێڕوانینەوە "لە تەک بوون" لەوانەیە سەرەتا بە مانای "لە کن بوون، لە پاڵ بوون، لە تەنیشت بوون" بەکارهاتبێ.

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک وشە کە مانای "قەراخ، کەنار" دەدەن، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "تیژی و دەرپەڕیوی" دەدەن، چونکوو قەراخ ئەوشوێنەیە لە شتێک کە دەردەپەڕێ یان تیژ دەبێتەوە، بۆ وێنە خودی وشەی "قەراخ" دە کوردمادیدا، Kante "قەراخ" دە ئاڵمانیدا، gran دە رووسیدا بە مانای "سنوور" واتا قەراخەکانی وڵاتێک. ئەم وشە رووسییە دەبێتە "قورنە" دە کوردمادیدا و "کران" دە فارسیدا].

2- لەوانەشە کورتکراوی ↑هەتەک hetek "تەک، نزیک، لا" بێ و ئەمیش پێوەندی هەبێ بە ↑هەت1 *het 1* "کن، نک، جەم".

**تەک2 tek** - "سەلە، سوزمە": خزمە دەگەڵ ↑تکان(ەوە) tıkan(ewe).

**تەکان tekan** [*takān*] - "لەرینەوە و جم وجۆل": لەم بارەوە سێ شیمانە دەخەینەروو:

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ducken (G.)، tucken (MG.) "بزاوتێکی خێرا" (بەرەوخوارەوە). ریشەی ئەم وشە ژێرمانییە نەدۆزراوەتەوە.

2- دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ↑شەکانەوە şekanewe "لەرانەوە، تکان خواردن".

3- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ziehen (G.)، tiuhan (Gt.)، tēon (OE.) "کێشان"، togenn (OIs.) "کێشراو"، سەر بە ریشەی < *deuk-* (IE.) "کێشان".

**تەککوو tekku** [*takkū*] - "وشەی سەر سوڕمان": بە چەند شێوە دەگوترێ: تەح teḧ، تەحا teḧa، تەححا teḧḧa، تەقوو tequ و هتد. [تەککوو لەو درۆیە!]. دەشکرێ بڵێین "وەی لەو درۆیە". وشەی "وەی" باس لە ئێش و ئازار دەکا [وەی چەند ساردە، وەیش چەند ساردە]. وێ دەچێ وشەی تەح یان تەکوو پێوەندی بە ↑داخ dax ەوە هەبێ کە ئەویش باس لە ئێش و ئازار دەکا [داخەکەم، بە داخەوە]. بەم پێیە مەبەست لە "تەککوو لەو درۆیە" دەشێ سەرەتا ئەوە بووبێ کە درۆکە هێندە زلە کە مرۆڤ ئازار دەدا.

**تەکلە tekle** [*takla*] - "دەرخۆنە، سەرپۆش": تەک + لە tek + le. بناخەی وشەکە دەچێتەوە سەر ئەو ریشەیەی ئاماژە بە "داپۆشین، سەر نانەوە، شاردنەوە" دەکا. دە زمانی ئالمانیدا Deckel (G.) بە مانای "سەرپۆش، دەرخۆنە" دێ.کەرتی el- لێرەشدا هەروەک لە وشە کوردییەکەدا پاشگری بە ئامراز کردنە. ئەم وشەیە دەناو خێزانە وشەی ↑تۆک (تۆکڵ) tok(ıl) دا جێ دەگرێ.

**تەکمە tekme** [*takma*] - "فەرەنجی، پەستەک": تەکەمە tekeme ش دەگوترێ. بە فارسی وەک "نیمتنە نمدی" مانا کراوەتەوە. خزمە دەگەڵ ↑تەحت teḧt "لباد، نمەد" و taxma (Av.) "چڕ، توند، سفت" [تۆکمە؟] سەر بە ریشەی < *te(n)k-* (IE.) "توند بوون، چڕ بوون". لباد تەنراوێکی سفت و چڕ و پڕە و هەر بۆیە وشەکانی سەرەوە لەم ریشەوە وەرگیراون. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑تەژی *tejî* "چڕ و پڕ"، dicht (G.) "چڕ و پڕ"، tight (E.) "توند، سفت"، diht (OE.) "قەڵەو، بەهێز"، techt (OIr. ) "توند بوو، مەییو".

[تێبینی: لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ پەستەک pestek کە ئەویش تەنراوێکی سفتە و وشەکەی خزمە دەگەڵ پەستاوتن pestawtın].

**تەکمیش tekmîş** [*takmīš*] - "بنکۆڵ کردنی رەز": دەشێ وشەیەکی بە ئەسڵ کوردی بێ و لەوانەیە تورکیندرابێ. بنجی تەک -tek شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تەق *teq* "دەنگی لێدان یان لێکدان و پێکدادان". [تەق تەق teqteqلە دەرگای دا یان تەقەتەق teqeteq ی دەرگا]. تەکمیش کردن بریتییە لە لێدانی زەوی بۆ سست و نەرم کردنی. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑تاشین taşîn کە ئەویش دە بنەڕەتدا "لێدان و وێکەوتن"ە.

**تەکووز tekuz** [*takūz*] - "رێک و پێک، بە نەزم و تەرتیب": دەبێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی تەک + ئووز uz + tek. کەرتی دووەم پاشگرە [بڕوانە ↑ئۆز -oz ]. بنەوشەی تەک -tek لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی < *tek-* (IE.) "چنین، هۆنینەوە"، یان < *tek-* (IE.) "توند بوون، چڕ بوون". چەمکی "رێک و پێکی و نەزم و تەرتیب" دەتوانێ پێوەندی بە چەمکی "چنین، هۆنینەوە" هەبێ، بۆ وێنە دە فارسیدا بە هۆنراوە دەگوترێ نظم nezm

(P.)، هەروەها دەتوانێ پێوەندی بە چەمکی "توند و چڕ بوون"ەوە هەبێ، بۆ وێنە وشەی بەیت "جۆرێک هۆنراوە" دەشێ دەگەڵ پەیت "توند، خەست" خزم بێ.

**تەکە teke** [ *taka* ] - "لەرە": [تەکەتەک teketek واتا لەرەلەر] بڕوانە ↑تەکان tekan.

**تەکینەوە tekînewe** [ *takīnawa* ] - "دوور کەوتنەوە، کشانەوە": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ziehen (G.)، tiuhan (Gt.)، tēon (OE.) "کێشان"، togenn (OIs.) "کێشراو"، سەر بە ریشەی < *deuk-* (IE.) "کێشان". لەوانەیە مەبەست لە تەکاندنەوە و تەکینەوە دە بنچینەدا هەر "کێشانەوە" و"کشانەوە" بێ. وشەکە خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی کوردمادی، لەوانە ↑تۆق toq، ↑تاقم taqım، ↑تەقەلا teqela و هتد.

[تێبینی: پێوەندییەک کە لەنێوان دوو چەمک و دوو وشەی "کێشان" و "کۆشین" (تێکۆشین)دا هەیە، بە هەمان شێوە دەتوان دوو وشەی "تەکینەوە" و "تەقەلا"شدا بەرچاو دەکەوێ].

**تەکێ teke** [ *take* ] - "شوێنێکە بوّ دووعا و عیبادەت": خزمە دەگەڵ ↑تکا tıka "خواهیش کردن، پاڕانەوە" و ↑تووک tuk "دووعا و پاڕانەوە". وەک بە ئاشکرایی دەبینرێ، ئەم وشەیە بە ئەسڵ عەرەبی نییە و وشەیەکی رەسەنی کوردمادییە.

**تەگە tege** [ *taga* ] - "تێری": خزمە دەگەڵ Ziege (G.)، ziga (OG.)، diza (Gr.) "بزن"، ticca (OE.) "کاریلە"، tik (Arm.) "پێستە". هەروەها دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەک şek "مەڕی دووساڵە".

**تەگەر teger** [ *tagar* ] - "چەرخی عارەبانە": "تەگەر، چەرخ". بەگوێرەی فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئۆکسفۆرد لەوانەیە ئەم وشەیە پێوەندی هەبێ بە *tyre* (E.) "تەگەر" > : tire (E.) "ساز کردن، *تەیار* کردن". ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەیار teyar "ساز، ئامادە".

**تەگەرە tegere** [ *tagara* ] - "1- دارێکە دە کونی بەرداشی ژێروو کوتراوە 2- بەربەست، لەمپەر":

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ Deich (G.)، dijk (Nl.)، dīc (OE.) "بەربەست، دیوار"، سەر بە ریشەی < *dhēig-* (IE.) "تێراچوون، تێراکردن، چەقاندن". مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکان دەبێ دە بنەڕەتدا چەقاندنی دارو تەختە بووبێ بۆ لەمپەرکردن. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تیغە tîĝe "دیوار، لەمپەر".

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ پێوەندی هەبێ بەو وشانەی لەژێر ↑تیخ tîx دا هاتوون. ئەم ڕیزەوشەیە دەچنەوە سەر ریشەی < **(s)teig-* (IE.) "تێڕاچوون، تیهەڵچەقین". دوور نییە ئەم دوو ریشەیە لە پلەیەکی دوورتردا ببنە خزم دەگەڵ یەکتر.

**تەل tel** [ *tal* ] - "تێل، سیم": خزمە دەگەڵ ↑تاڵ² tal "داو، دەزوو".

**تەڵ1 tel 1** [ *tal* ] - "چڵ، لاسکەگیا": [دڵی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە، کە لەژێر سێبەری تووەڕکا خامۆشە - گۆران]. هەردووک وشەی تەڵ tel و ↑چڵ çıl دوو شێوەن لە وشەیەک و خزمن دەگەڵ Stiel (G.) و stilus (L.) "دەسک، لاسک، دیرەک". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑شتڵ şıtıl هەیە کە شێوەی کۆنتری وشەکانی سەرەوەیە و دە زمانی ئەمڕۆدا لەباری ماناوە کەمێک جیاوازی پەیدا کردووە

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆنیمەکانەوە بەراوردی "تەڵ" و "چڵ" بکە دەگەڵ "تەڵەمە" و "چەڵەمە" یان "تکە"ی کوردمادی و "چکە"ی فارسی].

**تەڵ2 tel 2** [ *tal* ] - "پارچەیەکی تەنک لە بەرد": [تەڵەبەرد]. هەروەها ↑دەڵوو delu هەیە بە مانای "توێخی بن بن نینۆک کە لێ دەبێتەوە": دەشێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑تلێشان tılîşan "دڕان"دا باس کراون.

**تەڵا tela** [ *talā* ] - "زێڕ": طلا talā (P.). ئەم وشەیە دەشێ لە Taler (G.) وەرگیرابێ. ئەمە ناوی سکەیەکی زێوین بووە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی 16ەوە لە Joachimstal [دۆڵی یۆاخیم] لێدراوە و پاشان ئەم ناوە لە زۆر وڵاتی ئەورووپیدا بەکار هاتووە. وشەی دۆلار Dollar ی ئەمریکیش بۆ ئەم ناوە دەگەڕێتەوە. کەرتەوشەی Tal، کە وشەیەکی ئەڵمانییە، خزمە دەگەڵ ↑دۆڵ dol ی کوردمادی.

[تێبینی: شیاوی باسەی وشەی "قڕان"یش کە ناوی یەکەیەکی پووڵی ئێرانی بووە، لە زمانە ژێرمەنییەکانەوە وەرگیراوە].

**تەلاس telas** [ *talās* ] - "پێ زیاد لە رادە راکێشان، سەرچڵی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ تلاش talāş (P.) "تەقەلا، کۆشش". خزمە دەگەڵ ↑تۆران toran "رەنجان" هەروەها تۆراندن بە مانای "رەنجاندن" [ thole (E.) "رەنج، ئازار"] سەر بە ریشەی **< *tel-, *tol- (IE.)** "بردن، هەڵگرتن، تەحەممول کردن". لەباری ماناوە پێوەندی نیزیک هەیە لەتیوان "تەقەلا" و "رەنج و زەحمەت"دا. ئەم مانایانە دە وشەی "تلاش"ی فارسیدا بەباشی بەرچاو دەکەوێ. وشەی "تەلاس" دە کوردمادیدا ماناکەی هێندێک جیاوازە، بەڵام ئەویش هەر پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشەیە وەک "سەرچڵی" مانا کراوەتەوە واتا "زێدەرۆیی، ئیفرات". خودی وشەی "سەرچڵی" لە "سەرچڵ" وەرگیراوە کە شوێن یان بەشی هەرە بەرزی دار و درەختە. کەوابوو مەبەست لە سەرچڵی کردن ئەوەیە کە کەسێک لە کارێکدا وەک سەرچڵی دارێک دەگاتە ئەوپەر یان شوێنی هەرە بەرز، واتا ئاستی ئاسایی تێدەپەڕێنێ. لەم تێڕوانینەوە "تەلاس" پێوەندی پەیدا دەکا بە ریشەکەی سەرەوە بە مانای "بردن، هەڵگرتن" [وەک چۆن وشەی "بەرز"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە هەمان مانا و خزمە دەگەڵ "بردن"]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تەلان telan "کێو، بەرزایی".

**تەڵاش telaş** [ *talāš* ] - "ئەو پارچە تەنکانەی لە کاتی دارتاشیندا هەڵدەوەرن": تراشە tarāše (P.). خزمە دەگەڵ ↑تراشین tıraşîn.

**تەلان telan** [ *talān* ] - دەگەڵ "کێو" دێ [کێو و تەلان kew u telan]. هەروەها تەلانتەرە telantere هەیە بە مانای "گیایەک کە لە بەرزایی دەروێ". سەبارەت بەم وشەیە دوو شیمانە رێی تێ دەچێ:

1- پێوەندی بە ریشەی **< *tel- (IE.)** "لا بردن، هەڵگرتن". [لەم بارەوە بەراوردی کە دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Berg"کێو" کە خزمە دەگەڵ وشەکانی "بەرز" و "بردن" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بردن، هەڵهێنان، هەڵگرتن".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ steil (G.) "هەوراز"، سەر بە ریشەی **< *steigh- (IE.)** "سەر (هەوراز) کەوتن، پێهەڵگەڕان".

**تەلخ telıx** [ *talıx* ] - "1-رەشی ئاماڵ زەرد 2- رووگرژ": خزمە دەگەڵ ↑تار tar و ↑تاریک tarîk.

**تەلسک telısk** [ *talısk* ] - "زەنگەتە ترێ": تلک tılık یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەڵ2 tel "پارچەیەکی تەنک لە بەرد" [تەڵەبەرد]، ↑تەڵەزم telezm و لەوانەشە ↑تلێشان tılîşan "دڕان، لەت بوون".

**تەڵفیس telfîs** [ *talfîs* ] - "گاڵتە و گەپ، حەنەک": تەڵفیز telfîz یش دەگوترێ. تەڵ tel + فیس fîs. کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا تەڵ -tel خزمە دەگەڵ ↑دەلکی delkî "جەفەنگ باز، قسەخۆش" و دواتر دەگەڵ ↑*دۆڵگە dolge* "هەڵبەستی پێهەڵگوتن". کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑فشە fişe "جەفەنگ، حەنەک".

**تەڵە tele** [ *tala* ] - "ئامرازی راو": دە فارسیدا تلە tale (P.). پێوەندی هەیە بە چەند وشەیەکی وەک ↑دۆڵ dol و دەرە dere سەر بە ریشەی **< *dhel- (IE.)** "قووڵکە، قووپاوی، قووڵایی". تەڵە دە بنچینەدا دەبێ بەو قوڵکە سەرداپۆشراوە گوترابێ کە بۆ تێکەوتنی ئاژەڵ دروست کراوە.

[تێبینی: دوو بەڵگە ئەم بۆچوونە پشتگیری دەکەن: یەکەم، کرداری "کەوتن" [دە تەڵە کەوتن]. دووەم، دە زمانی ئاڵمانیدا Falle "تەڵە" دەچێتەوە سەر کرداری fallen بە مانای "کەوتن، تێکەوتن"].

**تەڵەزم telezm** [ *talazm* ] - "تەڵ، تەڵاش": خزمە دەگەڵ ↑تەڵ2 tel "پارچەیەکی تەنک لە بەرد" [تەڵەبەرد]، ↑دەڵوو delu "توێخی بن نینۆک کە لێ دەبێتەوە" [دەڵوو بەر دان] و لەوانەشە دەگەڵ ↑تلێشان tılîşan "دڕان".

**تەلەس teles** [ *talas* ] - "مەست، سەرخۆش": خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan "سووڕان، گەوزان"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووڕان". کەرتی دووەمی وشەکە، واتا ئەس -es پاشگرە و شێوەیەکە لە پاشگری ↑ئۆز -oz.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا وشەی "گێژ"یش بە مانای "تەلەس، مەست" بەکار دێ و ئەویش خزمە دەگەڵ گێژ "سەرسووڕاو" و *گێزان* "لێکدران، تێک وەردران، شڵەقان". وەک ئاشکرایە دە دۆخی مەستی دا مرۆڤ سەری دەسووڕێ یاخود دە گێژەوە دێ].

**تەلەف telef** [ *talaf* ] - "لەناوچوو، خرابوو، بەفیرۆچوو": ئەم وشەیە دەشێ وشەیەکی کوردمادی بێ و کەوتبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە. لە لادێیەکان بەتایبەتی بۆ مردن و لە دەست چوونی ئاژەڵ بەکاری دێنن. خزمە دەگەڵ derb (G.)، derp (OG.)، đeorf (OE.) "رەق، سفت"، verderben (G.) "خرا بوون، گەندەڵ بوون"، verderben (MG.) "لەناو چوون، مردن"، deorfan (OE.) "تەقەلا کردن، لە مەترسیدا بوون، مردن"، dirbti (Lit.) "کار کردن". وەک دەبینرێ مانای بنەڕەتی وشەکە "رەق، سفت"ە، لەمەوە مانای دەشێ مانای "مردن" [دە بنەڕەتدا: رەق هەڵاتن] پەیدا بووبێ و دواتر یش ماناکانی لەناو چوون، خراب بوون و هتد.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "رەق، سفت" و "مردن" دە وشەی sterben (G.) "مردن"دا بەرچاو دەکەوێ. ئەم وشە ئەڵمانییە سەر بە ریشەیەکە بە مانای "رەق، پتەو، سفت". لەم ریشەوە مانای مردن پەیدا بووە و ئەمەش دە بنەڕەتدا ئاماژە بە رەق بوونی لەش (لاشە) بووە. دە زمانی کوردمادیشدا "رەق هەڵاتن، رەق بوونەوە" بە مانای "مردن لە سەرمان" بەکار دێ].

**تەڵەکە teleke** [ *talaka* ] - "گزی، فێڵ":

1- لە لایەکەوە دەتوانین بیبەستینەوە بە وشەی درۆ dıro و ↑تراویلکە tırawîlke سەر بەریشەی > ***(IE.) *dhereug-*** "خەون، درۆ، فریو" [شتی ناڕاست].

2- لەلایەکی دیکەوە جێی بەراوردکردنە دەگەڵ Trick(G.) و trick (E.) "فەند و فێڵ" کە دەچنەوە سەر trique (ONorm.) "فێڵ، گزی". ریشە؟

3- هەروەها دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ ↑تەڵە tele [تەڵە نانەوە، دە تەڵە خستن].

**تەلیس telîs** [ *talīs* ] - "گۆنی":

1- لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ سەر وشەی ↑تاڵ tal "داو، دەزوو".

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑توورەکە tureke وە.

**تەلیسم telîsm** [ *talīsm* ] - "دووعای جادووگەر": ریشەی یۆنانی هەیە: > *(MGr.) telesma* "شتی پیرۆزکراو" > *(Gr.) teleīn* "پیرۆز کردن".

**تەلێر teler** [ *taler* ] - "زکێ زل، ورگن": خزمە دەگەڵ ↑تل2 tıl "ورگێ".

**تەم tem** [ *tam* ] - "هاڵاو، مژ": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- Dämmerung (G.) و demar (OG.) "بوومەلیل"، temel (OIn.) "تاریکی"، dem (MIr.) "رەش، تاریک"، temere (L.) "کوێرانە"، سەر بە ریشەی > ***(IE.) *tem(ə)-*** "تاریک". دوو وشەی تەم و مژ زۆرجار پێکەوە دێن، "مژ"یش دە بنەڕەتدا مانای "رەشایی، تاریکایی" دەبەخشێ و خزمە دەگەڵ "مێش" [خۆڵەمێش].

2- Dampf (G.) "هەڵم"، steam (E.) "هەڵم" و damp (E.) "نم" و dhamati (OIn.) "با هاتن، فوو کردن"، گشت ئەم وشانە دەچنە سەر ریشەی > ***(IE.) *dhem-*** "هەڵم و هاڵاو لێ هەستان، دووکەڵ کردن، تەپ و تۆز هەستاندن، با هاتن". دە زمانی کوردمادی و فارسیدا وشەی دەم dem [دە کوردمادیدا دێم dem ش دەگوترێ] هەیە کە بۆ پێگەیشتنی چا و برینج لە سەر ئاگر بە کاردەهێندرێ [چایەکە دەمی هێناوە] . ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەرئەم ریشەیەی سەرەوە و مەبەست لە دەم هێنان دە بنچینەدا "هەڵم وهاڵاو لێهەستان" بووە. جگە لەمانە دە کوردمادی و فارسیدا وشەی ↑دەم dem "نەفەس، هەناسە" و↑ دەماندن demandın "فوو تیکردن، با تیکردن" لەم ریشەوە هاتوون و مەبەست لە دەم (هەناسە) ئەو هەڵم وهاڵاو یاخود بایە کە لە زار و لووتی مرۆڤ دەردەچێ.

**تەماتە tamate** [ *tamāta* ] - "بەرهەمێکی کشت و کاڵی": ئەسڵی وشەکە tomtal بووە لە زمانی سوورپێستانی مێکزیکیدا. وشەکە لە رێگەی زمانی سپانییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان و لەوێشەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردمادی.

**تەماشا temaşa** [ *tamāšā* ] - "روانین": دەشێ خزم بێ لەگەڵ ↑مێزاندن mêzandın "تەماشا کردن".

**تەماڵ temal** [ *tamāl* ] - "کەروێشک": ئەم وشەیە لە کاتی دۆزینەوەی کەروێشک لە لاندا بەکار دێنن. [تەماڵێکی دۆزییەوە واتا کەروێشکێکی لە لاندا دۆزییەوە]. خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک ↑سەواڵ sewal [یان کەواڵ kewal ] "مەڕ و ماڵات"، ↑گەماڵ gemal "سەگی تیر".

**تەمباڤ tembav** [ *tambāv* ] - "گێژاو": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تەموو temu "تۆپی ئاش".

**تەمبەڵ[1] tembel** [ *tambal* ] - "تەوەزەل، لەشگران": دە فارسیدا تنبل tanbal (P.). [دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا tambal یش دەگوترێ]. دە زمانی ئاڵمانیدا وشەیەک کە مانای تەمبەڵ دەدا، وشەی faul (G.) ە کە دە ئەسڵدا بە مانای "بڵ، رزیو" دێ. دە زمانی کوردمادیشدا زاراوەی "لەش داڕزاو" هەیە کە بە مرۆڤی تەمبەڵ دەگوترێ. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە بۆی هەیە کە وشەی تەمبەڵ [دە ئەسڵدا تەنبەڵ] لە دوو کەرت پێک هاتبێ: تەن + بەل ten + bel. تەن بەواتای "لەش" و بەل بە واتای "↑بڵ bıl، رزیو".

**تەمبەڵ[2] tembel** [ *tambal* ] - "کۆڵەکەیەک دەخرێتە بن دیوار بۆ راگرتنی کاریتە": خزمە دەگەڵ ↑تەمەڵە temele "بەردی بناخە، یەکەم ریزی هێم".

**تەمبوور tembur** [ *tambūr* ] - تنبور tanbūr (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەمر temır "مۆری پۆست" [تمبر tember (P.)] و ↑تەمغە *temġe* "مۆری ئیداری".

**تەمتەمان temteman** [ *tamtamān* ] - "رەقەن، بەردەڵان": تمتمان tımtıman یش دەگوترێ. ناوی قەڵای بەناوبانگی ↑دمدم dımdım دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و مەبەست "قەڵای سەخت" بێ. جێی ئاماژەیە کە دوو چەمکی "قەڵا" و "سەخت، پتەو" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و ئەمە لە وشەی "شاهیندێژ، ساینقەڵا"ش دا دەبینرێ، کە کەرتی یەکەمەکەی خزمە دەگەڵ "سەخت" و "شاهۆ". بنجی تەم/ دم -dım , -tem خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "هێز، سەختی، قەڵەوی" دەکەون، وەک tumor (L.) "دوومەڵ، کوان"، -túmara h (OIn.) "قەڵەو، بەهێز"،↑توو tu [تڤی tıvî] کە شتێکی برێک قەڵەوەیە، هەروەها ↑دوومەڵ dumel و دواتر ↑توانین tuwanîn، ↑تاو2 taw "هێز و گوڕ" [تاو سەندن، تاو دانە شتێک]، tāvīṣī (OIn.) "تاو، تابشت، هێز"، سەر بە ریشەی < *teu-, *tu- (IE.) "هێز، توان، ماسین، ئەستوور بوون".

2- ↑تەمەڵە temele "بەردی بناخە، یەکەم ریزی هێم".

**تەمر temır** [ *tamır* ] - "مۆری پۆست": تمبر tember (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەمغە temġe "مۆری ئیداری".

**تەمراندن temrandın** [ *tamrāndın* ] - "1- ژێر خاک کردن، داپۆشین لە ژێر خاک 2- کووژاندنەوەی ئاگر یان چرا": تەمارتن temartın یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ چەندین وشە دە زمان ئەورووپییەکاندا بە مانای "تاریکی" وەک Dämmerung (G.) و demar (OG.) "بوومەلیڵ"، temel (OIn.) "تاریکی"، dem (MIr.) "رەش، تاریک"، temere (L.) "کوێرانە"، سەر بە ریشەی < *tem(ə)- (IE.) "تاریک". بەم جۆرە لە مانای "تاریک کردن"ەوە دەتوانێ ماناکانی "کووژاندنەوە" و "داپۆشین" سەری هەڵدابێ. dämmern (G.) دە زمانی ئەڵمانیدا وەسا مانا کراوەتەوە: "هێواش هێواش رووناک بوون یان تاریک بوون". dim (E.) دەبێتە "کز کردن یان لێڵ کردنی شۆق و رووناکی". ئەو وشانە هەروەها لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑تەم tem [تەم و مژ].

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "داپۆشین" و "تاریکی" سەرنجی وشەی "چادر" بدە کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تاریکایی"، هەروەها بڕوانە وشەی "کوێر"].

**تەمغە temġe** [ *tamġa* ] - "مۆری دەوڵەتی": داغمە dağme ش دەگوترێ، ئەمەیان دەبێ شێوەی ئاڵوگۆڕکراوی ئەوەی پێشتر بێ. خزمە دەگەڵ ↑چۆماخ çomax [چۆماغ çomaġ ] "تیلا، گۆپاڵ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ stumpf (G.)، stomp (Nl.) "کول، بەبێ نووک و بێ تیژایی"، Stumpf (G.)، stomp (NL.) "بنە، کۆلکە"، Stummel (G.)، stommel (MNl.) "قونچک"، stampfen (G.)، stampen (Nl.)، stamp (E.)، stampa (SW.) "کوتان، کوتانەوە"، stampf (OG.) "دەسکاونکێ، کوتک"، Stempel (G.) "مۆر" [دە بنەڕەتدا: دارۆکەی مۆر لێدان]، سەر بە ریشەی < *stemb(h)- (IE.) "لێدان، کوتان(ەوە)". ئەم ریشەیە خۆی دەبردرێتەوە سەر ریشەی <

(IE.) *stēb(h)- "راوەستاندن، کۆڵەکە وەبەردان، قیت کردن(ەوە)". وەک دەبینین دە زمانی ئەڵمانیدا ئەو وشەیەی بە مانای "مۆر" و دواتر "مۆر لێدان" بەکار دێ، سەرەتا بە مانای "کولکەدار، دەسکاونکێ، کوتک" بووە کە شتی پێ کوتراوەتەوە. دواتر کوتەدارێکی چکۆڵە لە شێوەی دەسکاونکێ وەک مۆر بەکار هاتووە و لێرەوە ئەو پێوەندییە لە نێوان "کولکەدار، گۆپاڵ" و "مۆر" دروست بووە. دە زمانی کوردمادیشدا پێوەندی وشەکانی "تەمغە" واتا "مۆر" دەگەڵ "چۆماغ" ئاشکرایە. هەروەها وشەی ↑تەمر temır [بە فارسی تمبر tember (P.) واتا "مۆری پۆست"] پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە. چەند وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەو وشانەوە هەیە کە بریتین لە ↑زۆمپ zomp "کوتکی زلی ئاسن"، ↑دەمبل dembıl "ئامرازێکە بۆ هەڵهێنان و وەرزش پێکردن"،↑دمبەک dımbek و ↑تەمبوور tembur کە ئەوانیش پێوەندیان بە چەمکی "ژەنین، لێدان، کوتان"ەوە هەیە.

**تەموو temu** [*tamū*] - "تۆپی ئاش": خزمە دەگەڵ tūmōn (OG.) "لەناو جەغزێکدا سوورانەوە" و taumeln (G.) "گێژ بوون، بەڵادا هاتن". خزمە دەگەڵ ↑تۆز toz و ↑توومان tuman و هتد.

**تەمەرە temere** [*tamara*] - "1- بەڵا، گێرە و کێشە 2- ئاژاوە، بشێوی": تەوەرە tewere ش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- dämlich (G.) "گەمژانە"، tām (Mir.) "نەخۆشی، مەرگ"، tomit (Rus.) "شکەنجە کردن، تەنگەتاو کردن". لە پێوەندی دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکاندا باس لە ریشەی ژێرمەنی *þam* کراوە بە مانای "تەڤزین، تەزین، لە پێ کەوتن". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑تەڤزین tefzîn و ↑تۆپین topîn.

2- ↑چەمەر çemer "شین و شەپۆڕ".

2- هەروەها "تەمەرە" بە مانا دووەمەکەی، واتا "ئاژاوە، بشێوی" جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تەوەر(ە) tewer(e) "میحوەر".

**تەمەڵە temele** [*tamala*] - "بەردی بناخە، یەکەم ریزی هێم": تەم + ە [ناوگر] + ڵە [پاشگر] tem + e + le. خزمە دەگەڵ Damm (G.)، Tamm (nG.)، tam (MG.)، Dam (Nl.)، damm (E.)، (Sw.) "1-ژێرکاری رێگا و بان کە لە گڵ و خۆڵی وەسەریەک نراو و شێلدراو پێک دێ 2- سەدد، بەربەستی لافاو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی (IE.) *dhe- > "دانان، جێگیر کردن". خزمە دەگەڵ ↑تەمبەڵ[2] tembel "کۆڵەکەیەک دەخرێتە بن دیوار بۆ راگرتنی کاریتە"، ↑دێڵێ dele "تەختەبەردی میچ پۆش"، ↑دێڵەبەن deleben "میچی خانووی بە بەرد داپوشراو"، ↑دیمەک dîmek "داری ناودیوار بۆ قایم کردنی"، ↑دۆمە dome "پشتێندی رەشماڵ بۆ پاراستن لەبەر بای بەهێز" و لەوانەشە ↑تەمتەمان temteman "رەقەن، بەردەڵان".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "بەرد، رەق، بەردەڵان" و "جێگیر بوون، قایم بوون" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی *خار* "سەخت" و *گیرسانەوە* "جێگیر بوون". ئەم دوو وشەیە لە ریشەیەکەوە هاتوون. سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "رەق، سەخت" ، "بەرد" و "بناخە" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی خوارەوە کە بەیەکەوە خزمایەتییان هەیە: *هەپروون* "ئاستم، سەخت"، *کەڤر* "بەرد"، *هیم* "بەردی زل" و *هێم* "بناخە"].

**تەمەن temen** [*taman*] - "عومر، ماوەی ژیان": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا، وەک ↑دەم dem، ↑تاف taf، ↑تاوtaw. ئەم وشانە بە هێندێک جیاوازی لە مانادا گشتیان ئاماژە دەکەن بە چەمکی "دەم، کات". دەبنە خزم دەگەڵ time (E.)، tīma (OE.) "دەم"، ti- (Arm.) "تەمەن". وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی ژێرمەنی tīman- سەر بە ریشەی (IE.) *di-, *dai- > "لەت کردن، بەش بەش کردن". وشەی زمن zaman (Arb.) پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و دوور نییە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.
هەروەها tid (Sw.)، Zeit (G.)، zit (OG.) "دەم، کات" لەم ریشەی سەرەوە وەرگیراون.

**تەن1 ten 1** [*tan*] - "بەدەن، قەوارە، پەیکەر": tan (P.)، tanū (Av.)، tanū (OIn.) "تەن"، سەر بە ریشەی (IE.) *tenu- > "باریک، تەنک" و دواتر (IE.) *ten- > "لەبەر یەک کشانەوە، تەنینەوە" [بڕوانە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 347]. لەو باوەڕە دام وشەکە پێوەندی بە چەمکی "باریک، تەنک"ەوە نەبێ و

راستەوخۆ لە ریشەی -ten* (IE.) "لەبەر یەک کشانەوە، تەنینەوە" وەرگیرابێ. لەم تیروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانەکاندا کە ئاماژە بە "هەڵدان، گەشە کردن، تیر و تەسەل بوون، چڕ و پڕ بوون" دەکەن، وەک dicht (G.) "چڕوپڕ، سفت"، gedeihen (G.) "گەشە کردن، هەڵدان"، Ton (G.) [کۆنتر: tahen، than] "قوڕی دیزە و گۆزە"، dāha (OG.)، thāhin (OS.)، dōhe (OE.) "قوڕ، لیتە"، ↑ ↑تەقن teqın "جێگەی پڕ لە قوڕ و لیتە"، ↑تەژی tejî "چڕ و پڕ"، ↑تەقتەق teqteq "زەوی بەردین" [دە بنەڕەتدا: سفت، چڕ و پڕ]، ↑تەتن tetın "قوڕ" و ↑تەشەنە teşene "بڵاو بوونەوە، پەرە سەندن". مانای "قوڕی دیزە و گۆزە" بەم چەشنە لێک دراوەتەوە کە ئەم قۆڕە بە هیشک بوونەوەی، توند و سفت دەبێ. بەڵام لەوانەشە مەبەست چیری و سفتی قوڕەکە خۆی بووبێ. هەر لێرەدا مانا و ریشەی ↑تەحین teħîn یش بۆمان روون دەبێتەوە. "تەحین" دە راستیدا شتێک نییە جگە لە "توندەوەبوو"ی شیرەی کونجی.

[تێبینی: دەکرێ سەبارەت بە مانای بنەڕەتی وشەی "تەن" دوو شیمانە بهێنینە گۆڕێ: لەوانەیە دە بنەڕەتدا مەبەست شتێک بێ کە هەڵدەدا و گەشە دەکا. لەوانەشە مەبەست "پێکهاتەیەک لە قوڕ" بێ. مرۆڤەکانی کەونارا وایانزانیوە کە مرۆڤ لە قوڕ پێک هاتووە، هەر وەک چۆن خۆیان بووکەڵەیان لە قوڕ ساز کردووە. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا وشەیەک بە مانای "مرۆڤ" هەیە کە بریتییە لە gomo (OG.)، homo (L.)، guma (Gt.)، gumi (OIs.) و زاوا zawa، زاڤا zava ی کوردمادی. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ زەوی zewî و مانای "هەرد، خاک" دەگەیەنێ و مەبەست دە بنەڕەتدا "بوونەوەری خاکی" بووە (بوونەوەرێک کە لە خاک دروست بووە و دەبێتەوە خاک؟). لەوانەیە بیرۆکەی دروست بوونی "لەش، تەن"ی مرۆڤ لە قوڕ لەم وشانەشدا رەنگی دابێتەوە].

**تەن2 ten 2** [ *tan* ] - "سیان، قورم": تەنی tenî یش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا وشەی "دودە" بە مانای سیان لە "دود" وەرگیراوە کە مانای "دووکەڵ" دەدا. ئەم پێوەندییەی نێوان "سیان" و "دووکەڵ" دە زمانی کوردمادیشدا بە چەشتێکی دیکە خۆ نیشان دەدا. تەن خزمە دەگەڵ ↑توز toz و دەچێتەوە سەر ریشەیەک کە ئاماژە بە "هەڵم و هاڵاو، دووکەڵ، تەپ و تۆز" دەکا. جگە لە "تەن" چەند وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا هەن کە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشن و پێوەندییان بەم خێزانەوشەوە هەیە وەک ↑توون tun بەمانای "ئاگردانی گەرماو"، تین tîn بە مانای "گەرما" [دە بنەڕەتدا: هاڵاوی گرما]، تەندوور/ تەنوور tenur و چەندین وشەی دیکە کە لە ژێر ↑دەوار² dewar "پارچەی رەشماڵ"دا [دە بنەڕەتدا: پارچەی "رەش"] باس کراون.

**تەناف tenaf** [ *tanāf* ] - "گوریس": خزمە دەگەڵ ↑تەنین tenîn.

**تەنا tena** [ *tanā* ] - "ئاسوودە، راحەت": هەروەها تەناهی tenahî بە مانای"ئاسایش، ئارامی، راحەتی" دێ.

1- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە وشەی ↑سانا sana بە مانای "هاسان".

2- یان لەوانەیە پێونەدی هەبێ بە ↑تەنین tenîn، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لەبەر یەک کشانەوە، لەبەر یەک بڵاو بوونەوە، درێژ بوونەوە". چەمکی "بڵاو بوون(ەوە)" و "درێژ بوون(ەوە)" دەتوانێ پێوەندی بە چەمکی "حەسانەوە و راحەتی و ئارامی"یەوە هەبێ، بە پێچەوانەی چوونەناو یەک و وێکهاتن کە گرژی و سفتی دروست دەکا. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "شل و ول". "ول" خزمە دەگەڵ "بڵاو" و شل بوونەوە نیشان دەدا. ئاشکرایە شتێک کە شل دەبێتەوە، هاوکات بڵاویش دەبێتەوە.

**تەنزیل tenzîl** [ *tanzīl* ] - "پارچەیەکی سپی تەنک بۆ برین پێچان": تنزیب tanzīb (P.). کەرتی یەکەم لە هەردوو وشە کوردمادی و فارسییەکەدا هاوبەشە و ئاماژە بە تەنراو دەکا [↑تەنین tenîn]. کەرتی دووەم دە وشە کوردمادییەکەدا خزمە دەگەڵ ↑سەلە sele و دە هی فارسییەکەدا خزمە دەگەڵ↑ زیپzîp . هەردووکی ئەم وشانە ئاماژە بە "دڵۆپاندن، چۆڕاندن" دەکەن. ئەم تەنراوە سەرەتا وەک پارچە بۆ پاڵاوتن سەیر کراوە و ناوەکەی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە.

**تەنک tenık** [ *tanık* ] - "ناسک، بەرانبەری ئەستوور": تنک tonok (P.). خزمە دەگەڵ dünn (G.)، thunni (OG.)، thin (E.)، tunn (Sw.)، tenuis (L.)، tanvi (OIn.)، tinuku (OSlav.)، tana (OIr.)، گشتیان بە مانای "ناسک،

تەنک"، سەر بە ریشەی > *ten- (IE.) "تەنینەوە، درێژ بوونەوە".[دە بنەڕەتدا مەبەست لەبەریەک کشانەوە و درێژ بوونەوە بووە، کە بە هۆیەوە شتێک تەنک و ناسک دەبێتەوە]. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەنین tenîn و ↑توونا tuna [تەفر و توونا].

**تەنگ teng** [ tang ] - "بەرانبەری فش و فرەوان، ڕێکگوشراو": تنگ tang (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ریشەی > *tenk- (IE.) "وێکهاتن، چوونە ناو یەک، ڕێکگوشران، توند بوون، چڕ بوون". ↑تەژی tejî "پڕ" [دە بنەڕەتدا: چڕ، پەیت]، dicht (G.)، tánkus (Lit.) "چڕ و پڕ"، tánakti (OIn.) "وێک دێ" لەم ریشەوە هاتوون. ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی > *ten- (IE.) "تەنینەوە، لەبەریەک کشانەوە". چەندین وشەی دە زمانی کوردمادیدا بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێنەوە، وەک ↑تەنک tenık، ↑تونا tuna [تەفر و تونا] و هتد.

[تێبینی: لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە چۆن لە ریشەیەک بە مانای "تەنین، لەبەر یەک کشانەوە" ریشەیەکی دیکە بە مانای "وێکهاتن، ڕێکگوشران" دروست بووە. ئەم دوو مانایە هەرچەند بەڕواڵەت دژ بە یەکن، بەڵام ئەگەر بە وردی سەیری بکەین، پێوەندیشیان بەیەکەوە هەیە، واتا مانای دووەم دەتوانێ لەراستیدا لە مانای یەکەمەوە پەیدا بووبێ. ئەگەر ئێمە بافتێک (تەوتێک)، بۆ وێنە شوێتێک لە پێستی دەست یان لاقمان بکێشین [لەبەر یەکی بکێشینەوە]، ئەوا لە هەمان کاتدا پێستەکە تەنک و "تەنگ" دەبێتەوە و هەرچی زۆرتر لەبەر یەکی بکێشینەوە، ئەوەندە زۆرتر تەنک و تەنگ دەبێتەوە. وشەی "تونا"ش بە مانای "لەناو چوون" لەم پێوەندییەدا دروست بووە. دە زمانی کوردمادیدا ئەو وشانەی ئاماژە بە "نەمان و لەناو چوون" دەکەن، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە باس کە "کز، کەم، بچووک" بوونەوە دەکەن، واتا مەبەست سەرەتا "لە کزی دان، لە کەمی دان" بووە و لە مەوە مانای "لەناو چوون" پەیدا بووە. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی "کوشتن" و "کووژانەوە"، هەروەها پەپوو2 "تەواو بوو، نەما" (بەزمانی زارۆک)].

2- Zange (G.)، tang (Nl.)، tongs (E.)، tang (Sw.) "گاز(ی شت پێ دەرکێشان)، کەلبەتان"، getenge (E.) "گوشاردەر"، سەر بە ریشەی > *denk- (IE.) "سفت بە شتێکەوە نووسان، توند قەرار گرتن لەسەر شتێک".

**تەنگوچەڵەمە tenguçeleme** [ tangūčalama ] - "دژواری، ناخۆشی": "تەنگە" بەو کەمەربەندە دەگوترێ کە باری پێ لەسەر بارەبەر قایم دەکەن. "چەڵەمە" دارێکە لە شێوەی V کە بۆ قایم کردنی تەنگە یان قەیاسە کەڵکی لێ وەردەگرن. تەنگە و چەڵەمە ئەو دوو ئامرازەن کە بۆ بەستن و شەتەک دانی بار لەسەر پشتی بارەبەر بەکار دەهێنرێن. جا کاتێک بار یان بارەبەر تەنگە و چەڵەمە دەکرێ، ئەوە دەراستیدا بارەبەرەکە دەخرێتە ژێر زەخت و تەوژمی بار بە هۆی توند کردنی تەنگە لە دەوری. ئەم دۆخە شەتەکدراو و دژوارەی بارەبەر پاشان مانایەکی گشتی وەرگرتووە و بە مانای "گیر و گرفت، دژواری" بەکار دەهێنرێ.

**تەنگە tenge** [ tanga ] - "زگی زڵ": خزمە دەگەڵ ↑تنگێلە tıngêle "مەشکەی پڕاوپڕ لە ئاو"، تەژی tejî "پڕ"، ↑تەژە teje "زل، زەبەلاح" و هەروەها ↑تەنگ teng، سەر بە ریشەی > *ten- (IE.) "تەنینەوە، درێژ بوونەوە، لەبەر یەک کشانەوە".

**تەنوا tenwa** [ tanwā ] - "چڵک، پیسایی، گەمار": خزمە دەگەڵ ↑تەن ten "سیان، قورم".

**تەنوور tenur** [ tanūr ] - "قووڵکەی نان تێدا پێژان": تەندوور tendur یش دەگوترێ [فۆتیمی d زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە]. دە فارسیدا تنور tanūr (P.). خزم بێ دەگەڵ ↑تەن ten "سیان، قورم" [دە بنەرەتدا: دووکەڵ]. وەک پێشتر باس کرا، تەن دەگەڕێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "دووکەڵ کردن، تەپ و تووز کردن". لە وشەی تەندوور/ تەنوور دا ئەم مانا بنەڕەتییە بە باشی دەردەکەوێ، چونکە وشەی "تەنوورە" دەگەڵ "گێژەڵووکە"، واتا بای پڕ لە تەپ و تۆز بەکاردەهێندرێ [تەنوورە کردنی گێژەڵووکە]. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑دەوار² *dewar* "پارچەی رەشماڵ".

**تەنەکە teneke** [ tanaka ] - "کانزایەکی سپی تەنکە": دەشیی خزم بێ دەگەڵ tin (E.)، (OE.) و (ON.)، zinn (G.) "تەنەکە". ریشە؟

تەنین **tenîn** [ *tanīn* ] - "چنین": تنیدن tanīdan (P.) خزمە دەگەڵ dehnen (G.)، dennan (OE.)، tänja (Sw.) "لەبەر یەک کیشانەوە، تەنینەوە"، teinein (Gr.) و tendere (L.) "تەنین، تەنینەوە، لەبەر یەک کێشانەوە"، سەر بە ریشەی < ***ten-*** ***(IE.)*** "کیشان، لەبەر یەک کیشانەوە، تەنین(ەوە)". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑تەنک tenık، ↑تان tan "رایەڵی تەون"، ↑تەناف tenaf "گوریس"، ↑تووونا tuna و هێندێکی دیکە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

تەنیا **tenya** [ *tanyā* ] - "تاک، بێ هاودەم، یەک تەنە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەن ten "بەدەن".

تەو1 **tew 1** [ *taw* ] - "پەزی رەنگ بۆر، مەڕی بە رەنگی خۆڵەمێشی": دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑توومان tuman [دوومان duman] و ↑دووکەڵ dukel کە بە رەنگیکی بۆر یان ئاماڵ رەش خۆ دەردەخەن. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑*دەوار²* *dewar²* "پارچەی رەشماڵ".

[تێبینی: دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ئەو وشەی بە مانای "کۆتر" دێ، بۆ وێنە Taube (G.) دەچێتەوە سەر هەمان ریشە کە لە کوردمادیدا وشەکانی تۆز و دووکەڵی لێ کەوتۆتەوە. هەر لەم ریشەوە dub (Ir.) بە مانای "رەش" کەوتۆتەوە].

تەو2 **tew 2** [ *taw* ] - "وشەی پەسەند و ئافەرین بۆ گۆرانیبێژ": خزمە دەگەڵ ↑توانین tuwanîn و ئارەزوو کردنە بۆ ئەوەی گۆرانیبێژ لە خوێندندا هەر بەهێز و گوڕ بێ.

تەوار **tewar** [ *tawār* ] - "بازی مێ": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تەو tew "پەزی بۆر"، ↑تفیلک tıfîlık "کۆترەباریکە". ئەم وشانە دە بنچینەدا ئاماژە بە رەنگی خۆڵەمێشی یان [ئاماڵ] رەش دەکەن.

تەواسان **tewasan** [ *tawāsān* ] - "1-گێژ و مەنگ بوون 2- ناهومێد بوون": شێوەی پێشووتری ↑تاسان tasan یاخود شێوەیەکی دیکە لەم. هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑تەڤزین tevzîn و ↑تەزین tezîn "سڕ بوون، بێ هەست بوون"، taub (G.) "کەڕ". [وشەی "کەڕ" خۆی خزمە دەگەڵ "سڕ" و مەبەست کەسێکە کە گوێی سڕە و هەستی تێدا نییە]. دە زمانی ئەڵمانیدا betäuben (G.) [be-täuben] "*تەڤزاندن*، سڕ کردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑تەپ *tep* [تەپ و مژ، تەپ و تۆز]. ماناکانی تاسان، گێژ و مەنگ بوون، تەزین لەوەڕا هاتوون کە هەستی مرۆڤ لەم دۆخانەدا بەوە چوێنراوە کە جۆرێک تەپ و مژ مێشکی داگرتووە و مێشکی یان لەشی تووشی ناڕوونی و تێکەڵ پێکەڵی هاتووە. بۆ هێندێک زانیاری دیکە لەم بارەوە بڕوانە ↑*دەوار²* "پارچەی رەشماڵ".

تەواش **tewaş** [ *tawāš* ] - "چەورایی، زەرنووقایی": دەچێتەوە سەر ریشەی < ****teu-, *tu-*** ***(IE.)*** "هێز، توان، ماسین، ئەستوور بوون" و دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑توانین tuwanîn دا باس کراون.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "هێز، سفت، ئەستوور بوون" و "چەوری" دەتوانین ئاماژە بە وشەی fett (G.) "چەور" بکەین کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ماسین، هەڵاتن" (وەک هەڵاتنی هەویر). هەروەها Talg (G.) "پیو" و stéār (Gr.) "چەوری، پیو" دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سفت بوون، مەیین" و لەوانەیە خزمیش بن دەگەڵ تۆڵا tola "پێکەوەنووسان و رەق بوونی شتی ورد" و تۆڵ tol (توند و تۆڵ) دە زمانی کوردمادیدا].

تەواندن **tewandın** [ *tawāndın* ] - "1- قەد کردن 2- لوول دان": خزمە دەگەڵ ↑تەون tewın و چەندین وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دان".

تەوخ **tewıx** [ *tawıx* ] - "زاخە، هۆڵەمەر دە بن هەرد دا": خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک، رەهەند". وشەکە دەشێ سەرەتا *تاپەک* *tapek** بووبێ و گۆڕدرابێ بە "تەوخ". نموونەی ئەم گۆڕانە دە وشەکانی زمانی کوردمادیدا زۆرە [تاپەک tapek ← تاوەک tawek ← تاوک tawık ← تەوخ tewıx].

تەور1 **tewır 1** [ *tawır* ] - "ئامرازی داربڕین": تەڤەر tever یش دەگوترێ. هەروەها تەوەرزین tewerzîn هەیە کە جۆرێکە لە "تەور". دە فارسیدا تبر tabar (P.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا Dübel (G.)، tubil (OG.)، dowel (E.)، dubb (Sw.)، deuvik (Nl.) هەیە کە بە مانای "سینگ، گوڵمیخ" بە کار دێ. dübeln

(G.) بە مانای "هۆرە لێدان، سینگ‌ێ داکوتان" دێ و دە هێندێک دیالێکتی ئەڵمانی و هولەندیدا duven و doffen بە مانای "لێدان" بەکاردێن. ئەم وشانە بەراورد دەکرێن دەگەڵ typhos (Gr.) "هۆرە، پواز" . ئەم وشە ئەورووپییانە دەبردرێنەوە سەر ریشەی *dub- < (IE.) "لێدان". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەک ↑دەف def، ↑تەپل tepıl، ↑تەپان tepan، ↑تۆپز topız. هەموو ئەم وشانە پێوەندییان بە چەمکی "لێدان"ەوە هەیە.

**تەور2 tewır** [ tawır ] - "جۆر، شێوە": تەویر tewîr یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تەبار tebar "بارست، حەجم". دە زمانی کوردمادیدا ↑چتۆ çıto هەیە بە مانای "چلۆن، چەوا" [چ تەور çı tewır ←چتۆر çı tor ← چتۆ çıto]. دە فارسیدا četor (P) "چتۆ، چەوا" واتا "بە چ شێوەیەک".

**تەورک tewrık** [ tawrık ] - "بللور، جۆرێک شووشە": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑*توانین tuwanîn* دا باس کراون و لەوانەشە دەگەڵ ↑تەوەن tewen "بەرد"، دەچێتەوە سەر ریشەی *teu-, *tu- < (IE.) "ماسین، ئەستوور بوون، بەهێز بوون، پتەو بوون".

[پێوەندی چەمکەکانی "شووشە" و "سەخت، پتەو، بەرد" دە وشەی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە "مینا"ی (ددان) خزمە دەگەڵ minerale (ML.) "کان، کانزا، کانەبەرد"، یان "شووشە" [شیشە] خزمە دەگەڵ زیخ zîx و سیکە sîke (سیکەتۆرە واتا توورەکەی بەرد)].

**تەوس tewıs** [ tawıs ] - "تیز و تانە": تەوزە tewze ش دەگوترێ. وشەکە هەرچەند دەگەڵ "تیز" هاومانایە، بەڵام ریشەکەی جیایە لەم و خزمە دەگەڵ ↑توانج tuwanc. بنجی وشەکە ↑تەپ tep ە و شێوەی کۆنتری وشەکە "تەپس"ە. ئەم بنجە دە وشەی ↑تەپساندن tepsandın "لێدان، سەرکوت کردن"دا دەردەکەوێ [ تەپس teps ← تەوس tews].

**تەوژم tewıjım** [ tawıžım ] - "هێز، گوڕ": خزمە دەگەڵ ↑تاو/ تاڤ taw / tav "هێز، گوڕ".

**تەوش tewış** [ tawıš ] - "شل، تراو": خزمە دەگەڵ ↑تاوانەوە tawanewe [توانەوە].

**تەوشک tewşık** [ tawşık ] - "کەش، هەوای دەوری زەوی، ئاتمۆسفێر": خزمە دەگەڵ ↑تۆژ toj و ↑*تۆکڵ tokıl*. ئاماژەیە بە "تۆکڵ"ی دەوری زەوی.

**تەوشین tewışîn** [ tawıšīn ] - دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەتەوشین vetewışîn] واتا "سەر سووڕ مان". دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑تەڤزین tevzîn [شێوەی کۆنتری ↑تەزین tezîn "سڕ بوون"] و ↑*تۆپین topîn*.

**تەوق tewg** [ tawq ] - "تەوقەسەر واتا تەپڵەسەر": وشەکە دەبنەڕەتدا تەپک *tepık** بووە، واتا لەجیاتی تەپڵەسەر، دەبێ "تەپکەسەر" گوترابێ و پاشان تەپکە گۆڕدراوە بە "تەوق" و دواتریش "تۆق". بەم جۆرە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەپڵ1 tepıl "تەوق، شۆینی هەرەبەرز" [تەپک tepık ← تەوک tewık ← تەوق tewıq ← تۆق toq].

**تەوقە tewqe** [ tawqa ] - "دەست لێدانەوە": خزمە دەگەڵ ↑تووش tûş "وێککەوتن، لێکدران" [تووش بوون واتا وێککەوتنی دوو شت یان دوو کەس].

**تەوقەتە tewqete** [ tawqata ] - "بەرزترین شوێن": تەوقەن tewqen یش دەگوترێ. بڕوانە ↑تەوق tewıg.

**تەون tewın** [ tawın ] - "چندراو، فەرش چنین": دە فارسیدا تافتن tāftan (P.) "چنین". [دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک لەو وشانەی بە مانای "چنین، هۆنینەوە" دێن، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "سووران، با دان" دەبەخشن، هەروەک خودی کرداری "هۆنینەوە"، کە دەچێتەوە سەر ریشەیەکی ئەوتۆ. ئەم پێوەندییە لێرەوە پەیدا دەبێ کە لە کاری چنین و هۆنینەوەدا سووڕاندن و با دانی بەنەکان بە دەوری یەکتردا روو دەدا]. ئەگەر لەم تێڕوانینەوە بۆ ساخ کردنەوەی وشەکە بچین، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ کە دە فارسیدا وشەی تاب tab (P.) "خول، پێچ، سووڕ" شێوەیەکی دیکەیە لە بنەوشەی تاف taf- دە کرداری تافتن tāftan (P.). ئەم بنەوشەیە دە زمانی کوردمادیشدا بەشێوەی خۆی بەدی دەکرێ و دە ناو گەلێک وشەدا خۆی نیشان دەدا. ژمارەیەک لەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "چنین، هۆنینەوە، تێک چنین" دەکەن، وەک ↑تەون tewın،

↑تەبەنە tebene، ↑تابووت tabut و ژمارەیەکی دیکەش مانای بنەڕەتی ریشەکە، واتا "سووران، با دان" نیشان دەدەن، وەک ↑تاوێر tawer "بەردی خلۆرەوەبوو"، ↑تاوڵەمە tawleme "پن چەرخێن"، ↑تەبانە tebane "بانگردێن"،↑تەوەنەدان tewene dan "لێکهاڵان"، ↑تەواندن tewandın "قەد کردن، لوول دان". سەبارەت بە ریشەی ئەم وشانە بڕوانە ↑*تابگە* *tabge* "لەنگەرگا".

**تەوەرە** **tewere** *[ tawara ]* - "میحوەری بەرداش": دڤری dıvrî یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ستراندن sıtrandın "شێلانی هەویر".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑تۆمار tomar و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**تەوەزەڵ** **tewezel** *[ tawazal ]* - "تەمبەڵ": دەشێ لە ↑تەپ tep وەرگیرابێ بەمانای "لەشگران". کەرتی زەل zel لەوانەیە هەمان ↑شل şıl بێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە لە دوو کەرت [دوو وشە] ی هاومانا پێکهاتووە و دۆخی جەخت کردن پەیدا دەکا. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تەپلۆس teplos.

**تەوەل** **tewel** *[ tawal ]* - "سەرسەری، بەدفەڕ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- dämlich (G.) "گەمژانە"، tām (Mir.) "نەخۆشی، مەرگ"، tomit (Rus.) "شکەنجە کردن، تەنگەتاو کردن". ریشە؟

2- toll (G.) "1- گەمژە 2- سەرسەری، هار و هاج"، tol (OG.) "گەمژە"، dull (E.) "کول، ناهەستیار"، dol (Nl.) "هار و هاج"، dwals (G.) "ساویلکە، گەمژە"، duls (Let.) "تەزیو (تەڤزی)، تاریک"، dall (OIr.) "کوێر"، tholerós (Gr.) "لێڵ، شێواو". [سەرنج بدە کە چۆن ماناکانی "تاریک، کوێر، لێڵ، شێواوی، گەمژەیی" پێکەوە پێوەندی پەیدا دەکەن]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑دەلوو delu "گەمژە، شێتۆکە" و هەروەها ↑تەڤزین tevzîn [تەزین tezîn].

[تێبینی 1: بەپێی ئەم وشانە دەردەکەوێ کە مەبەست لە "گەمژە" کەسێکە کە تێگەیشتنێکی روون، تیژ و هەستیاری نییە، بەڵکوو کەسێکە مێشک و تێگەیشتنێکی تەزیوی هەیە یان تەم و مژ و تاریکی بەسەر مێشکیدا زاڵ بووە. تێبینی 2: dall (OIr.) کە دە زمانی ئیرلەندی کوندا بە مانای "کوێر" بەکار هاتووە، خزمە دەگەڵ dub (OIr.) دە هەمان زماندا بە مانای "رەش" و خزمیشە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردمادی وەک ↑دەوار2 dewar "پارچەی رەشماڵ، رەشماڵ". تەوەل tewel "سەرسەری، بەدفەڕ" لەوانەیە پێوەندی بەم وشەوە هەبێ].

**تەوەن** **tewen** *[ tawan ]* - "بەرد، کەڤر": هەروەها تەوەنتاش tewentaş "بەرتاش، کەڤرتراش" و تەوەنەفڕێ tewenefırê "بەردەفڕکێ" دە زمانی کوردمادیدا بەکار دێن:

1- بە شیمانەی هەرە زۆر خزمە دەگەڵ ↑تەورک tewrık "بللور، جۆرێک شووشە" و ژمارەیەک ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑*توانین* *tuwanîn* باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەی **(IE. ) *teu-, *tu- >** "ماسین، ئەستوور بوون، بەهێز بوون، پتەو بوون". لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "بەرد" [وەرد] کە خزمە دەگەڵ "پاڵەوان" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پتەو بوون، بەهێز بوون". ئەم پێوەندییە هەروەها دە تیوان وشەکانی *خار* "سەخت"،*کەراکی* "گاشەبەرد"، *خورت* "بەهێز" و *کارین* "توانین"دا بەدی دەکرێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تەپان tepan و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی "لێدان" دەکەن.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "بەرد" و "لێدان" دەتوانین ئاماژە بە وشەی Hammer دە زمانی ئەڵمانیدا بکەین بە مانای "چەکوچ، کوتک". ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "بەرد" بووە و خزمە دەگەڵ "کەڤر" و "کەمرە"ی کوردمادی. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا *سەنگ* "بەرد" خزمە دەگەڵ زەنگ "زەبر و زەنگ، لێدان"].

**تەوێل** **tewel** *[ tawel ]* - "تیوچاوان، هەنی": توێل tuwel و تۆڵ tol و تێڵ tel یش دەگوترێ. شێوەی کۆنی وشەکەدەبێ "تەبەڵ tebel یان تەبێڵ tebel" بووبێ، پاشان گۆڕاوە بۆ "تەوێل" و دواتر "تۆڵ، تێڵ". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑دەپ dep "تەختە" و ↑تەبەک tebek "سینی، کەشەف" و ئاماژەیە بە "تەخت"ی تیوچاوان، هەروەک

تەختی سینگێ. شێوەی وشە کوردییەکە هەڵ سەنگینە دەگەڵ tabula (L.) "تەبەق، تەختە، مێز" و table (E.) "میز" [دە بنەڕەتدا: تەختە].

[تێبینی: ناوی شاری تەوێڵە tewele دەبێ یان پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ یان بە تەویلە tewîle. ئەگەر شارەکە لە شوێنێکی تەخت و پان و بەرین هەڵکەوتبێ، ئەوسا دەبێتە خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە، ئەگەریش لە شوێنێکی نزم یان قووڵ هەڵکەوتبێ، دەبێتە خزم دەگەڵ "تەویلە"].

**تەویلە tewîle** [*tawīla*] - "گەوەڕ، هۆدەی ئاژەڵان": تەوڵە tewle و تیوڵە tıyûle ش دەگوترێ. tawīle (P.). ئەگەر سەیری وشەی "گەوەڕ" بدەین، دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "گابار" و "گۆڕ" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "قوڵکە، قووڵایی، هەڵۆڵ" دەکەن. هەر بەم شێوەیە دەشێ "تەویلە"ش پێوەندی هەبێ بە ریشەی > ***dheu-b- (IE.)*** "قووڵ، هەڵۆڵ" و خزم بێ دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑تاپی tapî "خەندەک، گۆڕیچە" و ↑دۆپ dop "نزم، قووڵ، گەلی". کەوابوو "گەوەڕ" یان "تەویلە" ئاماژە بە قوولایی، ڤاڵایی و هەڵۆڵ بوونی شوێنێک دەکەن کە دەرکە یان زارکێکی هەیە و لە پشت ئەم زارکەوە ئیتر قووڵاییەک دەست پێ دەکا. دیارە لێرەدا زۆرتر قووڵایی ئاسۆیی مەبەستە تا هی ئەستوونی. جێی ئاماژەیە کە دوو وشەی "هەڵۆڵ" و "هۆڵ" [هۆڵەمەڕ]یش پێکەوە خزمن.

**تەها teha** [*tahā*] - "بێوێنە": شێوەیەکی دیکە لە ↑تەک tek و ↑تاقانە taqane.

**تەهرە tehre** [*tahra*] - "دەسرە، دەستەسڕ": خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک ↑درەوشانەوە dırewşan(ewe)، ↑ئەستڕین estırîn، ↑تراشین tıraşîn، ↑تیرێژ *tîrej* و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پێداخشاندن، ڕێخشاندن".

**تەهسین tehsîn** [*tahsīn*] - "خلیسکان": تەهس tehıs خۆی وەک وشەیەکی سەربەخۆ بە مانای "جێگەی لووس و خلیسک" دێ و دەبێ هاوپێوەند بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑تیشە [شاخ] tîşe، ↑تاس tas "ساف، بێموو، داتاشراو" و هتد.

**تەهۆڵ tehol** [*tahol*] - "ڕەهۆڵ، درزی قووڵ و پان لە زەویدا": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑تەحفیل teħfîl دا باس کراون.

**تەی tey** [*tay*] - "کەدی، ڕام": ↑تەیەو teyew.

**تەیاخ teyax** [*tayāx*] - "پەیاخ، داردەست": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تایە taye "نەمام".

**تەیار teyar** [*tayār*] - "ساز، ئامادە": ئەم وشەیە دەبێ وەرگیرابێ لە > *tire (E.)* "ساز کردن، تەیار کردن"، ئەمەش خۆی دەچێتەوە سەر > *a tire (OF.)* "مرەتەب، تەرتیبدراو، ئامادە".

**تەیان teyan** [*tayān*] - "خزمەتکاری ژن، کلفەت": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ dienen (G.) و (Nl.)، tjäna (Sw.) "خزمەت کردن"، سەر بە ریشەی > ***tek- (IE.)*** "ڕا کردن، پەلە کردن". وشە ژێرمانییەکان دەبنە خزم دەگەڵ ↑تەقاندن teqandın بە مانای "تێتەقاندن، غار دان".

[تێبینی: ئەم وشەیە دەبێ جیا بێ لە ↑دایەن dayen (دایەن tayen). ئەمەیان خزمە دەگەڵ دایە daye و ↑دایک dayk].

**تەیجە teyce** [*tayja*] - "سەوەتە، قەرتاڵە": تەیکە teyke ش دەگوترێ. هەروەها تەیچە teyçe هەیە بە مانای "سەلە". ئەم دوو وشەیە دەبێ دە ئەسڵدا هەر یەک وشە بن، پێوەندییان هەیە بە ریشەی > ***dhēig- (IE.)*** "تێرا چوون، تێڕا کردن، چەقاندن" و خزمن دەگەڵ ↑تیغە tîğe "دیواری تەنک" و ↑داغ daġ [*چارداغ* "کۆخی ناو باخ و بێستان"]. لەباری ماناوە بەراوردی ئەم وشانە بکە دەگەڵ *سەوەتە* "قەرتاڵە" و *سابات* "کەپر".

**تەیرۆک teyrok** [*tayrok*] - "تەزرە یان تەرزە": شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑تەزرە tezre.

**تەیسین teysîn** [*taysīn*] - "بریقانەوە": بنەوشەی تەیس -teys بە شێوەیەکی دیکە لە وشەی ↑تیشک tîşık دا دەبینین.

**تەیوانە teywane** [*taywāna*] - "خۆراک لە ماڵی زاواوە بۆ ماڵی بووک": بڕوانە ↑تۆی toy "زەماوەند".

**تەیەو teyew** *[ tayaw ]* - "رام، ڕاهێندراو": شێوەیەکی دیکەی وشەکە ↑تەی tey یە بە مانای "کەدی، رام". خزمە دەگەڵ zahm ‏(G.)، tam ‏(Nl.) و ‏(Sw.)، tame ‏(E.) "کەدی، رام". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر وشەیەک بە مانای "ماڵ" و دە بنەڕەتدا مەبەست ماڵی کردنی ئاژەڵ بووە. [خزمیشن دەگەڵ ↑دیو dîw ی کوردمادی بەمانای "هۆدە" - دە بنەڕەتدا خانوو، ماڵ]. دە زمانی فارسیدا وشەی دام dam ‏(P.) "مەڕ و ماڵات " پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

**تیان tîyan** *[ tīyān ]* - "مەنجەڵ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ teganon ‏(Gr.) "تاوە".

**تیبا tîba** *[ tībā ]* - "تارمایی": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تاپۆ tapo.

**تیپ1 tîp 1** *[ tīp ]* - "حەرف": ئەم وشەیە هێندێک جار بەجێگای "پیت" بەکاردەهێنرێ. خزمە دەگەڵ dīp ‏(Pl.) بە مانای "نووسراوە" و dapīr بە مانای "دەبیر، نووسەر". ئەم وشەیە چەند شوینەوارێکی دیکەشی دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەیە وەک ↑دەبستان debıstan "خوێندنگە"، ↑دیباچە dîbaçe "پێشەکی کتیب، پێشوتار"، ↑دەفتەر defter [بە هەردوو ماناکەیەوە واتا شوێنی تێدا نووسین]، ↑دەبیر debîr ‏(P.) "نووسەر، مامۆستا"، ↑تاپۆ tapo "سەنەد، قەباڵە" [دە ئەسڵدا "خەت، نووسراوە"]. وشەی تیپ و ئەم وشانەی لەو وەرگیراون، خزمن دەگەڵ typós ‏(Gr.) بە مانای "شەقڵ، نیشانە، وێنە، نموونە"، سەر بە کردارێک بە مانای "لێدان، کوتان". دیارە دە کۆندا شەقڵ و وێنە و نیشانە و هەروەها حەرفەکان کە خۆیان جۆرێک وێنە و نیشانە بوون، بە لێدان و کوتان واتا بە هەڵکەندن و داتاشین لەسەر دار و بەرد دروست دەکران. ئەم مانا بنەرەتییە، واتا "لێدان"، دە چەندین وشەی زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا پارێزراوە [لەم بارەوە بڕوانە ↑تەپان tepan]. هەروەها مانای "شەقڵ و نیشانە" ش دەتوانین دە وشەکانی ↑تەپڵ tepıl "شوێن پەنجە، جێ قامک" و ↑تەبەش tebeş "مەڕی تیوچاوان سپی"دا بەدی بکەین. شیاوی باسە کە دە زمانە ئەورووپییەکانیشدا وشەی تیپ/ تایپ type بە مانای "شەقڵ، نیشانە، مۆر، حەرف" بەکاردێ و دەچێتەوە سەر وشە یۆنانییەکە.

**تیپ2 tîp 2** *[ tīp ]* - "دەستە، تاقم": ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ↑تیپ1 tîp 1. وەک باس کرا "تیپ" دە بنەڕەتدا بە مانای "شەقڵ، مۆرک، وێنە، شێوە، ئەسک، فۆرم" بووە. پاشان لەم مانایەوە مانای "جۆر، نەوع" سەری هەڵداوە، واتا دەستە یان کۆمەڵێک کە تایبەتمەندی هاوبەشیان هەیە لە "شێوە و وێنە"دا. لێرەشەوە دواتر مانای "دەستە، گرووپ" پەیدا بووە.

**تیت(ک 1 tît(k) 1** *[ tīt(k) ]* - "زولف، بسک و پەرچەم": خزمە دەگەڵ ↑تیسک tîsk "مووی درێژ" و ↑تووک tuk "موو، پەڕ".

**تیتک2 tîtk 2** *[ tītk ]* - "1- تووتک 2- میتکە": خزمە دەگەڵ ↑تووتە tute "چکۆڵە، وردیلە".

**تیتک3 tîtk 3** *[ tītk ]* - "خشڵی ناوچاوان": تیتە² tîte ش دەگوترێ. هەروەها تیتن tîtın هەیە بە مانای "پلپلە و لەرزانە". لەژێر وشەی "خشڵ"دا شی کراوەتەوە کە ئەم وشەیە پێوەندی بە "قژ" و "خەز"ەوە هەیە. هەر بەم پێوانەیە "تیتک³"یش پێوەندی بە ↑تیت(ک 1 tît(k) "زولف، بسک" پەیدا دەکا.

**تیتک⁴ tîtk⁴** *[ tītk ]* - "هەنێ بەندی زارۆک": خزمە دەگەڵ ↑تیتۆل tîtol.

**تیتل tîtıl** *[ tītıl ]* - "بێچوو ی ئاژەڵ": دەگەڵ "بیبل" دێ: [تیتل و بیبل tîtıl û bîbıl- ناوی بەناوبانگترین داستانی منداڵانەی کوردمادی]. تیت + ل tît + ıl . کەرتی یەکەم -tît، بەجۆرێکی دیکە لە وشەی ↑تووتە tute یان توتک tutık دا دەبینرێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تەتک *tetık* "لەپک، دەستەوانە".

**تیتۆل tîtol** *[ tītol ]* - "کوتەپارچە": تیت + ئۆڵ tît + ol. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە:

1- بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک توێژ toej [↑توژ toj]، ↑*تۆکل tokıl*، تووک tuk، ↑تیسک tîsk "مووی درێژ"، تیت(ک) (tît(ık "زوڵف، پەرچەم"، ↑تیتک tîtık "هەنی بەندی زارۆک"، ↑تەسمە tesme، ↑تیسماڵک tsmalk و هتد. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە تیکە یان توێژێک دەکەن کە بە لێدان و (دا)تاشین لێ دەکرێنەوە و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "وێککەوتن، پێکدادران" [لێدان]. خودی وشەی ↑تاشین taşîn سەر بەم خێزانەوشەیە.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ tatan (Pl.) بە مانای "چنین، تەنین".

**تیتە1 tîte** [ *tīta* ] - "بەڕوولەخیار": وشەیەکە ئاماژە بە چکۆڵە بوون دەکا، خزمە دەگەڵ ↑تووتە tute [قامکەتووتە] یان توتک tutık [توتکەسەکێ] و هەروەها دەگەڵ ↑تەتک *tetık* "لەپک، دەستەوانە".

**تیتە2 tîte** [ *tīta* ] - "خشڵی ناوچاوان": بڕوانە ↑تیتک3 tîtk "خشڵی ناوچاوان".

**تیچان tîçan** [ *tīčān* ] - "بڵاو بوون": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ tēsan (OE.) "شێ کردنەوە، هەڵوەشاندنەوە" (ریشە؟). دە زمانی کوردمادیدا ↑تەخشان texşan یش هەیە [تەخشان و پەخشان کردن] کە دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**تیغ tîx** [ *tīx* ] - "1- ئامرازێکی بڕین 2- دەمی شیر وچەقۆ": شێوەیەکی دیکەی وشەکە تیغ tîġ ە. دە فارسیدا تیغ tīġ (P.) . دە فارسیدا مانای "دڕک، چقڵ"یش دەدا. خزمە دەگەڵ stich (G.)، stih (OG.)، stiks (Nl.)، steek (E.)، stizen (Gr.)، stinguere (L.) "تیراچوون، تیهەڵچەقین"، سەر بە ریشەی **> *(IE.) *(s)teig-*** "تیراچوون، تیهەڵچەقین". دە زمانی فارسیدا وشەی ستیغ setīġ (IE.) هەیە بە مانای "دوند" [تیژترین شوێنی بان کێو]. ئەم وشەیە دە کوردمادیدا بووەتە ↑چیخ çîx و چیخ کردن بە مانای "داڕووشاندن" دێ. دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە کە ئاماژە بە چەمکەکانی "تیژی و تیراچوون" دەکەن، دەگەڕینەوە بۆ ئەم ریشەی سەرەوە، وەک ↑چەقین çeqîn، ↑چقڵ çıqıl، (بەر) ↑چیغ çîġ، ↑سینگ sîng، ↑تیژ tîj، ↑تیشک tîşk، ↑تەزرە tezre و هتد.

**تیر1 tîr** [ *tīr* ] - "ئەو دارە تیژەی لە کەوان دەردەچێ": تیر tîr (P.)، tigraii (Av.). وشەی tiger "بەبر" و tigris "دیجلە" [واتا چەمی توند و تیژ] لە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر ریشەی **> *(IE.) *(s)teig-*** "تیژ بوون، تیراچوون". تیر خزمە دەگەڵ ↑تیژ tîj و ↑تیغ tîx و↑ تەزرە tezre و گەلێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکاندا.

**تیر2 tîr** [ *tīr* ] - دەگەڵ "توانج" دێ و دەگوترێ تیر و توانج tîr u tuwanc لێدان.

1- لە لایەکەوە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ teal (OE.) بە مانای "سەرکۆنە کردن، بەدگۆیی کردن".

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ مەبەست "تیر"ی هاویشتن بێ هەر وەک چۆن "تەوس و *پلار* پێدان" یش دەگوترێ.

**تیر3 tîr** [ *tīr* ] - "ئێزەدی تیر، ناوی هەسێرەی تیر، فریشتەی باران، ناوی چوارەمین مانگی ساڵ، سێزدەهەمین رۆژی هەرمانگێک": tištrya (Av.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەی سێشەمە، وەک Tuesday (E.)، tyrsdagr (ON.) دەچێتەوە سەر ناوی خواوەندی ئەستێرەی مارس و ئەم خوایەش دە زمانە ژێرمەنییە کۆنەکاندا بە چەند جۆرێک هاتووە: Tīw (OE.)، Zīo (OG.)، Tyr (ON.) و (OIs.) سەر بە ریشەی ژێرمەنی *(Grm.) *tiwaz*. ئەم وشەیە دە ریشەدا دەگەڵ deus (L.) بەمانای "خودا" یەک دەگرێتەوە. وشە کوردمادی و فارسییەکە دەبێ پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ، بەتایبەتی کە ئەم وشەیە دە زمانە ئێرانییەکانیشدا هەم وەک ناوی خوداوەند [فریشتە]، ناوی مانگێ، ناوی هەسێرە و ناوێ یەکێک لە رۆژەکان بەکارهاتووە. وشەکانی دی dey (P.)، dathuš (Av.) "خودا، ناوی مانگێ و ناوی رۆژ" و ↑دێو dew [دە بنچینەدا خودا، فریشتە] پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

[تێبینی: کاتێ بیر کردنەوە لەم وشانەی سەرەوە سەرنجم بۆ لای مەلک تاووس melek tawus راکێشرا کە فریشتەیەکی هەرە پیرۆزە لە ئۆلی ئەزداییدا. لە ئۆلی ئەزداییدا پەلەوەری "تاووس" وەک سیمبۆلێکی پیرۆز دێتە ئەژماردن و وێنە ئەم پەلەوەرە تەنانەت وەک سیمبۆلی ئۆلی ئەزدایی لەسەر زۆر شتاندا نەخش و نیگار دەکرێ یان پەیکەری لێ دروست دەکرێ. ئەم "تاووس"ەی ئۆلی ئەزدایی دە بنەڕەتدا دەبێ پێوەندی بەو وشانەی سەرەوە هەبێ، بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ ریشەی ژێرمەنی *(Grm.) *tiwaz* "خواوەندی ئەستێرەی مارس" و هەروەها deus (L.) "خودا". سەبارەت بەوە کە چۆن دواتر لە ئۆلی ئەزداییدا "خواوەند یان فریشتەی تاووس" (مەلکێ تاووس) دەگەڵ "پەلەوەری تاووس" پێوەندی پەیدا کردووە، دەتوانین سێ شیمانە بخەینە روو:

یەکەم، وەک دەزانین تاووس پەلەوەرێکی جوان و رەنگینە و لەوانەیە بە زانا بوون ئەم "تاووس"ە لەگەڵ "تاووس"ی ئەسڵی لێک درابێ و کرابێ بە سیمبۆلی ئەو. دووەم، لەوانەیە لەژێر ناوی پەلەوەری تاووس ناوی خواوەندە کۆنەکە شاردرابێتەوە و بەم جۆرە وشە پیرۆزەکە پارێزرابێ. سێهەم، لەوانەشە بە هەڵە وا بیر کرابێتەوە کە ئەم دوو وشەیە هەر یەکن و بەم جۆرە پێوەندی لەتیوان هەر دوو تاووسەکەدا دروست کرابێ، واتا دوو وشەکە تێکەڵ بەیەکدی کرابن].

**تیراوێ tîrawe** [ *tīrāwe* ] - "بریناره‌ش": دە فارسیدا دەگوترێ "سیاە زخم" واتا برینی رەش. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە کەرتی یەکەمی وشەکە، تیر -tîr دەشێ خزم بێ دەگەڵ↑ تار tar و ↑تاریک tarîk و ↑تیر ter. کەرتی دووەمی وشەکە دەبێ ئاو aw بووبێ و تێکرا مەبەست برینێک بێ کە ئاوێک [زووخاوێکی] تیرە و تاری لێ دێتە دەر.

**تیروو teru** [ *terū* ] - ↑توور tur [تەیر و توور].

**تیرۆژوو tîroju** [ *tīrožū* ] - "پارچەی درێژوکە دە کراسی ژنانەدا": تیریژ tîrîj یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑تیرنج terınc "پەراوێزی کراس". فۆتیمی n زێدەیە و خزاوەتە ناو وشەکەوە.

**تیرۆک tîrok** [ *tīrok* ] - "دارۆکەیەکە بۆ پان کردنەوەی ئەنگوتک": خزمە دەگەڵ ↑دار dar.

**تیرە¹ tîre** [ *tīra* ] - "تایفە": دە فارسیدا تیرە tīre (P.) .لە ژێروشەی ↑تۆرەمە toreme دا شی کراوەتەوە.

**تیرە² tîre** [ *tīra* ] - "خەت، هێڵی تیوان": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Strich (G.)، striks (Gt.)، streek (Nl.)، streak (E.)، streck (Sw.) "خەت، تیرە، هێڵ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Strahl (G.) "تیشک". ئەم وشەیەی دوایی دە سەردەمە کۆنەکاندا بە مانای "تیری کەوان" بەکار هێنراوە و خزمە دەگەڵ strela (Rus.) "تیری کەوان". فۆتیمی s دە سەرەتای وشە کوردمادی و فارسییەکە دا سواوەتەوە. ئەم وشەیە سەر بە ریشەیەکە کە گەلێک لک و پۆی لێ دەبێتەوە، بۆ وێنە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی ↑تیرێژ tîrej، ↑تریفە tırîfe، ↑(ئە)سترین(ەوە) sıtrîn، ↑ئەستیرە estere. پێوەندی دوو چەمکی "تیر" و "تیشک" لەوەدایە کە تیشک بەو خەت و هێڵە درێژ و باریکانە شوبهێندراوە کە بە دەور و بەردا بڵاو دەبنەوە و لەبەریەک دەکشێنەوە. [ئەم پێوەندییە دە زمانی لاتینیشدا بەدی دەکرێ: radius (L.) هەم مانای "داردەست، بەرچیغ " دەدا و هەم مانای "تیرێژ"].

**تیرەگە tîrege** [ *tīraga* ] - تیرەگەی پشت ئەو ئەستوونەیە کە لە مۆرەکانی پشت پێکدێ. دە زمانی فارسیدا دەبێژن "ستون فقرات" کە لە وشەی "ستوون، ئەستوون" وەرگیراوە. دە زمانی عەرەبی و ئالمانی و ئینگلیزیشدا بۆ ئەم بابەتە ئەو وشانە بەکاردەهێنن کە مانای "ئەستوون، کۆڵەکە" دەدەن. بەم پێیە تیرەگە دەبێ هەمان ↑دیرەک/ دیرەگ dîrek /dîreg بێ کە ئەویش دەگەڵ ↑دار dar خزمە.

**تیرێژ tîrej** [ *tīrež* ] - خزمە دەگەڵ ↑درەوشان(ەوە) dırewşan(ewe) " تیشک دان" [دە فارسیدا درخشیدن deraxšīdan (P.) - بەراوردی بنەوشەی -deraxš (P.) بکە دەگەڵ تیرێژ tîrej]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Strahl (G.)، strāla (OG.)، straal (Nl.)، stra l (OE.) "تیشک" کە لە سەردەمەکانی زووتردا بە مانای "تیر، پڵار" یش بەکارهاتوون. [هەر هەمان پێوەندی دە زمانی لاتینیشدا بەدی دەکرێ: radius (L.) هەم مانای "داردەست، بەرچیغ " دەدا و هەم مانای "تیرێژ"]. هەروەها strela (Rus.) "تیر، پڵڵار" خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی (IE.) *ster(ə)- > "پێداخشاندن، لێک خشاندن، درێژ و هەراو کردنەوە، بڵاو کردن". دە زمانی کوردمادیدا فۆتیمی s لە هێندێک وشەدا سواتەوە، بەڵام لە چەندین وشەدا پارێزراوە، وەک ↑(ئە)سترین (e)stırîn، ↑(ئە)ستیرە (e)stere. لە سەردەمە کۆنەکاندا وا لێک دراوەتەوە کە تیرێژ یان تیشکی رووناکی لە خەت و هێڵی درێژووکە [تیر، تیرە] پێک هاتوون کە بەم لا و ئەولادا درێژ و بڵاو دەبنەوە و دە فەزا دا دەخوشێن [رادەخوشێن]. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا گەلێک وشەی جۆربەجۆر لەم ریشەوە پەیدا بوون، وەک Stern (G.) "ئەستیرە"، Stirn (G.) "هەنی، تیوچاوان" [دەبنەڕەتدا: رووبەری پان و بڵاو"]، Srich (G.) "خەت، تیرە، هێڵ"، streichen (G.) "(ئە)سترین"، streuen (G.) "پێوەرکردن، بڵاوکردنەوە"، Stroh (G.) "کا"

[ده بنەڕەتدا: پێوەرکراو، بڵاوکراوە]، (G.) Straße "شەقام، خیابان"، (OIn.) strnāti "پێوەردەکا، بڵاو دەکاتەوە"، (L.) sternere "پرژ و بڵاو کردنەوە". دیسان لە پێوەندی دەگەڵ بنەوشەی درخش -deraxš (P.) و تیرێژ tîrej ی کوردمادی پێویستە لێکچوونیان دەگەڵ وشەکانی Strich (G.) و streichen (G.) بخەینە بەر سەرنج. دە وشە کوردمادی و فارسییەکەدا فۆتیمی s لە سەرەتای وشەکاندا سواوەتەوە. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑تریفە1 tırîfe "تیشکی مانگ"، ↑ترووسکە tırûske یان تریسکە tırîske، ↑تریشقە tırîşqe [هەورەتریشقە]، ↑تیرە tîre "خەت، هێڵ"، ↑ستیرپژیان stêrpıjyan "راخوشینی ئەستێرە"، ↑ستیرمە stîrme "سەرایەت" [بڵاو کردنەوە و گرتنەوەی نەخۆشی] و هتد. ئەم وشانە دواتر دەبنە خزم دەگەڵ ↑تراشین tıraşîn.

**تیز tîz** [ *tīz* ] - "تەوس، تانە": خزمە دەگەڵ tease (E.)، teasan (OE.)، teezen (NL.)، zeisan (OG.) "مەسخەرە کردن، گاڵتە پێکردن، قەڵس کردن" *teisan (wGm.)* >. ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە باس نەکراوە.

**تیزانگ tîzang** [ *tīzāng* ] - "1- پزدان (پیزەدان) 2- میزەڵدان 3- باڵۆنی منداڵان بۆ کایە کردن": وەک لە هەموو ماناکان دەردەکەوێ، وشەکە پێوەندی بە چەمکی "ماسین، با کران"ەوە هەیە، واتا توورەکەیەکی باکراو. خزمە دەگەڵ ↑تس tıs "هەوا، با (ی لەش)".

**تیزۆ tîzo** [ *tīzo* ] - "تووڕە، قەڵس": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تۆسن tosın [تووڕە و تۆسن]، خزمە دەگەڵ ↑تۆزین tozîn [هەڵتۆزین heltozîn واتا تووڕە بوون] و دواجار دەگەڵ ↑*تۆز toz*.

**تیژ tîj** [ *tīž* ] - "1- بڕەر 2- توند، خێرا": دە فارسیدا تیز tīz (P.). خزمە دەگەڵ ↑ تیخ/ تیغ tîx / tîġ. مانای "خێرا" دەبێ لەوەڕا هاتبێ کە شتی تیژ خێرا بەرەو پێش دەڕوا، وەک تیر لە حەوا دا یان چەقۆ و تیزە بەناو قەوارەیەکدا.

**تیس¹ tîs** [ *tīs* ] - "تیسوو، گیایەکی دڕکاوی": خزمە دەگەڵ ↑تیژ tîj.

**تیسماڵک tîsmalk** [ *tīsmālk* ] - "کوتیک، لەتیک، تیکەیەکی پانی درێژووکە": بڕوانە ↑تەسمە tesme.

**تیس² tîs** [ *tīs* ] - "سواپ، بەردی پانکەڵە و لووس":

1- لە لایەکەوە دەتوانین بیبەینەوە سەر discos (Gr.) "سواپ، دەفری پەل"، سەر بە کرداری diskeīn (Gr.) "فڕێ دان". مەبەست لە discos دە بنەدەتدا بەرد یان شتی پانکەڵە بۆ فڕێ دان بووە. دە زمانی فارسیدا دیس dîs بە مانای "دەفری پەل" بەکاردێ. زمانە ژێرمەنییەکان لە ڕێگای زمانی لاتینییەوە وشە یۆنانییەکەیان خواستۆتەوە ["قواستۆتەوە"] و بە چەند مانایەکی نیزیک بە یەک بە کاری دەهێنن، وەک Tisch (G.) "مێز"، dish (E.) "دەوری" و disk "سواپ".

2- لەلایەکی دیکەوە دەکرێ وشەکە ببەستینەوە بە ↑تیش tîş یان تاش taş [تاشەبەرد، بەردی راست و لووس لە چیا].

**تیسک1 tîsık** [ *tīsık* ] - "چەپکەمووی درێژ": خزمە دەگەڵ ↑تووک tuk.

**تیسک2 tîsık** [ *tīsık* ] - "زەنگەتەترێ": خزمە دەگەڵ ↑تیسماڵک tîsmalk "کوتیک، لەتیک، تیکەیەکی تەنکی درێژووکە" و ↑تەسمە tesme "بەندی تەنک و درێژووکە لە چەرم" و لەوانەشە ↑تیس² tîs "سواپ، بەردی پانکەڵە و لووس". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*تۆژ toj* [توێژ toej] و ئاماژە بە پارچە یان چیتێک دەکەن کە لێ دەکرێتەوە [بە برین، رنین، (دا)تاشین و لێدان...]. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑تیسک1 tîsık "چەپکەمووی درێژ".

**تیسوێ tîswe** [ *tīswe* ] - "گیایەکی دڕکارە کە دەخورێ": تیسوو tesu ش دەگوترێ. بە لەبەر چاو گرتنی ئەوە کە گیایەکە دڕکارە، پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑تیخ tîx و ↑تیژ tîjەوە.

**تیش tîş** [ *tīš* ] - "1- بەردی بڵیند و هەڵچوو لە چیا 2- جگی لووس کراو( تاس )": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تاس "ساف، بێموو".

**تیشک tîşık** [ *tīšık* ] - "تیرێژ": دە زمانی پەهلەویدا tēġ (Pl.) و tēh (Pl.) بە مانای "تیشک" بەکارهاتوون. دە فارسیدا اتش ateş بە مانای "ئاگر" دێ. [کەرتی a پێشگرە]. ئەم وشە یە دە کوردمادیدا بەوێنەی ↑تەش / تەژ /

تەز teş / tej / tez بەرچاودەکەوێ و مانای "ئاگر" دەدا. دە کوردمادیدا ↑تەشە teşe هەیە بە مانای "رۆچنە، رۆژنە" و ↑تەشبریق teşbırîq [تەش + بریق] بە مانای "هەورەبرووسکە". گشت ئەم وشانە دە پێوەندی دەگەڵ یەکتر دان و خزمن دەگەڵ ↑داغ daġ سەر بە ریشەیەک بە مانای "سووتان".

**تیشە tîşe** *[ tīša ]* - "رەگی (چووزەرە؟) تازەڕواوی دەغڵ": خزمە دەگەڵ ↑تاژان[1] tajan "لکی باریکی دار".

**تیغە tîğe** *[ tīġa ]* - "دیواری تیوانگر": خزمە دەگەڵ ↑چارداغ çardaġ "کۆخی ناو باخ و بێستان" [چار + داغ çar + daġ]. داغ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تیغە tîğe "دیوار، لەمپەر".

1- یان خزمە دەگەڵ (G.) Deich ،(Nl.) dijk ،(OE.) dīc "بەربەست، دیوار"، سەر بە ریشەی **(IE.) *dhēig- >** "تیراچوون، تیراکردن، چەقاندن". [لەوانەیە دوورەخزم بێ دەگەڵ ↑تیخ tîx]. مەبەست دەبێ دە بنەڕەتدا چەقاندنی دار و تەختە بووبێ بۆ لەمپەرکردن.

2- یان دەشێ خزم بێ دەگەڵ (Gr.) teīchos "دیوار، تیغە"، (Gr.) toīchos "دیوار، مۆرە"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *deiĝh-** "قوڕ گرتنەوە و دەکار کردن، هەویر شێلان". هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑دیزە dîze. هەروەها وشەکانی (OIn.) dēha-h و (L.) figura "لەش، پەیکەر" لەم ریشەوە هاتوون و سەرەتا مەبەست دروست کردنی پەیکەر و پێکهاتە لە قوڕ بوو.

**تیغەرە tîğere** *[ tīġara ]* - تیغەرەی پشت واتا سەرجەمی مۆرەکانی پشت. لە وشەی تیغ tîġ بە مانای "دڕک، شتی تیژ" وەرگیراوە. ئاماژەیە بە دەرپەڕین و تیژ بوونی مۆرەکانی پشت.

[تێبینی: دە زمانی ئاڵمانیدا وشەی Rückgrat و دە زمانی لاتینیشدا spina بە مانای "تیغەرەی پشت" ئاماژە بە چەمکی "دەرپەڕین و تیژ بوون" دەکەن. Grat دە ئاڵمانیدا و spina دە لاتینیدا بە مانای "دڕک، نووک" دێن].

**تیف تیفە tîftîfe** *[ tīftīfa ]* - تیف تیفە دان واتا "1- تیغ پێداهێنانەوە 2- ساف و لووس کردن، جوان کردن". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑خاوێن xawen دا شی کراونەوە، [کۆنتر: تاوێن tawen]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە، بریقە دان".

**تیفشاڵ tîfşal** *[ tīfšāl ]* - شێوەیەکی دیکە لە تۆژاڵ tojal [توێژاڵ toejal]، بڕوانە ↑تۆژ toj و ↑تۆکڵ *tokıl*.

**تیف tîv** *[ tīv ]* - "گێزە، دەنگی گوللە": وشەکە پێوەندی هەیە بەو وشانەی کە لەژێر ↑تەپ[4] *tep* "پەلامار"دا شی کراونەوە، بۆ وێنە ↑تفەنگ tıfeng.

**تیڤرگ tîvrıg** *[ tīvrıg ]* - "چوڕەپۆپنە، پەلەوەرێکی کاکۆڵ بەسەر": خزمە دەگەڵ ↑تەپ(ە) tep(e) "گرد، پەپۆلک"، (G.) Zipfel و(OG.) zipf ،(Nl.) tip ،(E.) tip ،(Sw.) tipp "دوند، نووک، چلەپۆپە"، (G.) Zopf "پرچ" [دە بنەرەتدا: کاکۆڵ].

**تیفسی tîfsî** *[ tīfsī ]* - "بەلەمی چێشت، دەوری گەورە": خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک" و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵ".

**تیڤل tîvıl** *[ tīvıl ]* - "1- قسەی بە توێکڵ، تەوس 2- توێکڵ": خزمە هەم دەگەڵ ↑تەوس tews و هەمیش ↑توک(ڵ) tok(ıl).

**تیقەل tîqel** *[ tīqal ]* - "رزیوی دڕاو": هەروەها تیقەلۆ tîqelo هەیە بە مانای "شڕۆڵ، جل شڕ": خزمە دەگەڵ ↑تیکە tîke [تیکە و پار، لەت و پار].

**تیک tîk** *[ tīk ]* - "باقیە، تەقەڵ": زۆرتر دەگەڵ "دروومان" دێ [تیک ودروومان tîk û dırûman]. دە وشەی تەقەڵ teqel یشدا بنەوشەی تەق -teq شێوەیەکی دیکەیە لە "تیک". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑تیخ tîx و لە ریشەیەکەوە دێن بە مانای "تیراکردن، تیهەڵچەقاندن". دە زمانی فارسیدا بنەوشەکە بە شێوەی دوز -dūz یان دوخ -dūx دە کرداری دوختن (P.) dūxtan "دروون" دا دەبینین. مەبەست لە تیخ دە بنەڕەتدا هەمووو شتێکی تیژ بووە کە تیرا دەچێ یان تیرا دەکرێ و مەبەست لە تیک یاخود تەقەڵیش تیراکردنی دەرزی بووە [شیاوی باسە کە وشەی "دروومان" یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "برین" و دە بنەرەتدا مەبەست "هەڵبڕینی

"کوتەپارچەکان" بووە لە کاتی دروست کردنی جلکدا]. ئەم وشانەی سەرەوە دەبنە خزم دەگەڵ sticken (G.)، stikken (Nl.)، stitch (E.) "گوڵدۆزی کردن، دروون، تەقەڵ لێدان".

[تێبینی: فۆتیمی s دە وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە یان دەرناکەوێ. ئەم دیاردەیە دە چەندین وشەی دیکەشدا دەبینین وەک مڵ [مڵ و مۆ]، مژین، تریفە، تاشین، تیکە و هتد. لە سەرەتای ئەم وشانەدا فۆتیمی s بە پێچەوانەی خزمە ژێرمەنییەکانیان دەرناکەوێ].

**تیکان tîkan** [ *tīkān* ] - "درک، چقڵ": خزمە دەگەڵ تیغ tîğ (P.) بە مانای "درک". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە کە ئاماژە بە چەمکی "تیژی و تیراچوون" دەکەن، وەک ↑تیخ tîx، ↑تیژ tîj و هتد.

**تیکە tîke** [ *tīka* ] - "کوت، لەت": تکە tekke (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ Stück (G.)، stuki (OG.)، stuk (Nl.)، stycce (OE.)، stycke (Sw.) "تیکە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑تووش1 tûş [تووش بوون] سەر بە ریشەی < ***(s)teu-** **(IE.)** "لێکدان، وێککەوتن". بەم پێیە "تیکە" دە بنەڕەتدا بەو لەت و کوتە گوتراوە کە لە ئەنجامی لێکدان و وێککەوتندا پەیدا بووە.

**تیل tîl** [ *tīl* ] - "1- خوار 2- خێل": وشەی تیلاوتیل tîlawtîl بە مانای "خوارەوخوار" و تیل کردن tîl kırdın بە مانای "خوار کردن" دێ. خزمە دەگەڵ تل tıl و ↑تلان tılan و سەر بەو خێزانەوشەیە کە ئاماژە بە چەمکی "سووڕان، با دران" دەکا.

**تیلاگ tîlag** [ *tīlāg* ] - "(گۆشەی) کەللەسەر": [کلاوی بە (لا)تیلاگی سەرییەوە نابوو]. خزمە دەگەڵ تارک tarek (P.) "دوند، شوێنی هەرەبەرز"، thólos (Gr.) "گومبەز". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑دۆڵ dol سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەماوی، قووپاوی".

**تیلمە tîlme** [ *tīlma* ] - "نەواری پارچە، کوتە پارچەی باریک و درێژ": تیلماسک tîlmask یش دەگوترێ کە شێوەی بچووککراوی وشەکەیە.

1- بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ ↑تەڵ2 tel "پارچەیەکی تەنک لە بەرد" [تەڵەبەرد]، ↑دەڵوو delu "توێخی بن نینۆک کە لێ دەبێتەوە" [دەڵوو بەر دان]، ↑تەڵەزم telezm و لەوانەشە دەگەڵ ↑*تڵیشان tılîşan* "دڕان".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ thrum (E.) "جەمسەری پەت و گوریس، سەرە پەتک، کەنارە"، Trumm (G.) "لەت و پەت و قەراخ و بیجاری شت". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ térma (Gr.) "جەمسەر، کۆتایی".

**تیمچە tîmçe** [ *tīmça* ] - "بازارچەی ناو قەیسەری": دە فارسیدا tīmče (P.). خزمە دەگەڵ ↑دیو dîw "هۆدە" [دە بنەڕەتدا بە مانای خانوو].

**تین tîn** [ *tīn* ] - "1- گەرما 2- هێز، تابشت 3- هیم، بناخە": لەوە دەچێ مانای ئەسڵی وشەکە "گەرما" نەبێ، بەڵکوو "هێز، وزە" بێ. لەم مانایەوە دەتوانرێ ماناکانی دیکە بە دەست بێ. چەمکی"هیم، بناخە" پێوەندی بە "هێز و پتەوی" هەیە و ئەم پێوەندییە لە وشەکانی *سۆکین* "بناخە" و *سەخت* "پتەو"یشدا دەبینرێ کە خزمایەتییان بەیەکەوە هەیە. هەروەها مەبەست لە تینی ئاگر دەشێ سەرەتا هێز و توندی ئاگرەکە بووبێ، چونکوو تین تەنیا لەپێوەندی دەگەڵ ئاگر یان سەرچاوەی گەرمادا باس دەکرێ، نەک لە پێوەندی دەگەڵ گەرما بەگشتی. بۆ وێنە ئەگەر ژوورێک زۆر گەرم بێ، نابێژن گەرمایەکی بەتینی هەیە، یان ژوورەکە زۆر بەتینە، بەڵام ئەگەر سۆپە بهاییسێ، دەڵێن سۆپەکە زۆر بە تینە، یان گەرماکەی زۆر بەتینە. بەم پێیە وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ thīhan (OG.) "هەڵدان، پەرە سەندن"، dijen (Nl.) "ماسین، زل بوون"، dīon (OE.) "هەڵدان، پێگەیشتن"، tanákti (OIn.) "چوونە ناویەک، توند و چڕ بوون"، tánkus (Lit.) "توند، چڕ"، con-téici (OIr.) "مەیین، توند بوون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*تەژی tejî* "پڕ" [دە بنەڕەتدا: چڕ و پڕ] و تەژە "زەبەلاح" [دە بنەڕەتدا: "بەهێز"]، سەر بە ریشەی < ***te(n)k-** **(IE.)** "توند بوون، چڕ بوون". ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑تەقتەق teqteq "زەوی تەمتەمان، بەردەڵان" و پێوەندی ئەم مانایانەش دەگەڵ چەمکی "هیم، بناخە" ئاشکرایە.

**تینگ tînig** [ *tīnıg* ] - "ئاڵوو، بادامەی لامل": ئەم وشەیە لەوانەیە دە ئەسڵدا بە مانای "ئاڵوو هاتن"، واتا ماسینی بادامەکان بێ کە جۆرێک تەنگی و رێککوشراوی لە گەروودا دروست دەکا. لەم تێروانینەوە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەنگ teng.

[تێبینی: سەبارەت بەم پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "خناق" دە فارسیدا بەراوردی بکەین کە ناوی نەخۆشییەکە، بەکوردی دەبێژن "دووشاخە" [ماسین و زەق بوونی دوو ئاڵووەکە وەک دوو شاخ] کە دەبێتە هۆی رێککوشرانی قورگ. وشەی "خناق" لە "خنکان" وەرگیراوە و ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ eng (G.) "تەنگ".]

**تینوو tînu** [ *tīnū* ] - "نیازمەندی ئاوخواردنەوە": دە زمانی فارسیدا tešne (P.). دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا تیهنی tehnî دەگوترێ واتا h جێگای š ی وشە فارسییەکە دەگرێتەوە. دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا فۆتیمەکە بەتەواوی سواوەتەوە. دە زمانی کوردمادی و فارسی ئەمڕۆدا جگە لەمە ئاڵو گۆڕێکی دیکەش بەسەر وشەکەدا هاتووە و فۆتیمی r کە دە ئەسڵی وشەکەدا هەبووە، نەماوە. وشەکە دە زمانی ئەڤێستادا taršna (Av.) بووە. ئەم وشەیەی زمانی ئەڤێستا بەتەواوی دەگەڵ ئەو وشە ژێرمەنییانە یەک دەگرێتەوە کە مانای "تینوویەتی" دەدەن: Durst (G.)، thirst (E.)، törst (Sw.) "تینوویەتی". ئەم وشانە دەگەڕێنەوە سەر ڕیشەی < ***ters-*** (***IE.***) بە مانای "هیشک بوون" واتا هیشک بوونی گەروو لە تینووان. خزمە دەگەڵ ↑تاسان tasan بە مانای "خنکان، خەفە بوون". [ شێوەی کۆنتری تاسان دەبێ "تارسان" بووبێ ].

**تینی tînî** [ *tīnī* ] - "نەفس خواردنەوەی بلوێرژەن": خزمە دەگەڵ ↑تەن ten "قورم، سیان" [دە بنەڕەتدا: دووکەڵ"، ↑توون tun "ئاگردانی گەرماو" [دە بنەڕەتدا: شوێنی هەڵم و هاڵاو]، تونک tıwınk [↑تفنک tıfnık] "لووت" [شوێنی هەناسە کێشان" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑تۆز toz "گەرد"دا باس کراون.

**تیووڵ tîyul** [ *tīyūl* ] - "ناسک و تەنک": [تەنک و تیووڵ]. خزمە دەگەڵ ↑تووڵ tul [تووڵەنەمام، تووڵەڕێ واتا ڕێگایەکی باریک، تووڵەمار و هتد].

**تێ¹ te** [ *te* ] - "داغ بوونی لەش" [تا و تێ]. خزمە دەگەڵ ↑تاو1 taw "1- هەتاو، تیشکی خۆر2- تین و گەرما (تاو سەندن، تین و تاو)".

**تێ² te** [ *te* ] - "پێشگرێکی کردارە": خزمە دەگەڵ تو tū (P.). ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا هەم بە مانای "هندور، لەناو" بەکار دێ [توی اتاق] و هەمیش وەک پرێپۆزیسیۆن بە مانای "دە" [ بە فارسی "بریز توی لیوان" ماناکەی دەبێتە: دە لیوانەکەی بکە، بیکە ناو (کۆنتر: بیکە دەناو) لیوانەکەوە]. دە زمانی کوردمادیدا وشەکە وەک پێشگری کردار دەور دەبینێ. لە هەمان کاتدا ئەم وشەیە بە شێوەی ↑تۆێ toe ش بەکار دێ [لەتوێی باسەکەدا، واتا لەناو باسەکەدا]. ئەم وشەی دوایی تا ڕادەیەک لەگەڵ وشەی "تۆێ" بە مانای "تۆێژ" تێکەڵ بووە و بۆ وێنە هێندێک جار دەگوترێ لە دوو تۆێی فڵانە شتدا. ڕیشەی وشەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە.

**تێر ter** [ *ter* ] - "تەسەل، پڕ": دە فارسیدا sîr (P.).

[بۆ شی کردنەوەی ئەم وشەیە پێویستە سەرەتا تێبینییەک بخەینەروو و پاشان بێینەوە سەر وشەکە خۆی. دە زمانی ئینگلیزیدا وشەی sad (E.) "خەمگین" دە بنەڕەتدا ماناکەی لێڵایی و تەم و تاری بەسەر دەموچاودا هاتن بووە. ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنی و غەیرەژێرمانییەکاندا مانای "تێر" دەدا و مانا بنەڕەتییەکەشی هەر ئەمە بووە، بۆ وێنە satt (G.)، sadr (OIs.) "تێر"، satis (L.) "بەس، کافی"، sotus (Lit.) "تێر". لێرەدا ئەم پرسیارە سەرنج ڕادەکێشێ کە چ پێوەندییەک لە نێوان دوو چەمکی "خەمگین" و "تێر بوون"دا هەیە کە وای کردووە وشەکە دە زمانی ئینگلیزیدا ماناکەی بۆ "خەمگین" بگۆڕدرێ. پێوەندییەکە دەبێ لێرەدا بێ کە بە هۆی تێر کردن واتا تەواو خەست کردنی تراوێک، ڕەنگی ئەو تراوە توندتر و لێڵتر دەبێ، واتا "تار"تر دەبێ. کاتێکیش مرۆڤ خەمگین دەبێ هەربەم چەشنە ڕوخساری *تار* دەبێ، بە وتەیەکی دیکە تێوچاوانی *تاڵ* دەبێ. وشەی "تاڵ"یش خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە "تار" و دەبێتە خزم دەگەڵ "تێر"].

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر وشەی "تیر" و دەتوانین بڵێین کە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا وشەکە پێوەندی بە ↑تارtar و ↑تاریک tarîk وە هەیە، واتا مەبەست لە "تیر" سەرەتا ئاماژە بە لێڵ بوون [تاربوون] ی تراو بووە بە هۆی تەواو خەست کردنی. دە زمانی کوردمادیدا وشەی تیر بە مانای "رەنگی توند و تۆخ"یش بە کاردێ و ئەمە مانای کۆنتری وشەکە نیشان دەدا. دە زمانی فارسیدا وشەکە خۆی بەدوو شێوە دەردەخا، یەکەمیان تیرە tîre (P.) "تار، تاریک، رەنگی تیر" و دووەمیش سیر sîr (P.) بە مانای "تیر". بەم جۆرە دەبینین کە لە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەک سەرەتا بە مانای تیر و تەسەل، بەس، کافی بووە و دواتر مانای خەمگینی واتا تیرە وتار بوونی دەموچاوی لێ کەوتۆتەوە. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە پیچەوانەوە لە مانای تیرەو تارەوە وشەی تیر بە مانای "تەسەل، بەس، کافی" پەیدا بووە.

**تێڕ ter** [ *ter* ] - " کیسەی چنراوی گەورە": تێرک terk یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تووڕەکە tureke "کیسە بۆ شت تێدا هەڵگرتن".

**تێرنج terınc** [ *terınj* ] - "پەراوێز یاخود کەنارەی کراس و شمەکی دیکە":

1- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑تیرە² tîre "خەت، هێڵ". Streifen (G.) "تیلمە، کوتە پارچەی باریک و درێژ" خزمە دەگەڵ "تیرە"ی کوردمادی [فۆنیمی s دە وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە].

2- لە لایەکی دیکەوە جێی بەراورد کردنە دەگەڵ ↑تیلمە tîlme "نەواری پارچە، کوتە پارچەی باریک و درێژ":

**تیروو1 teru** [ *terū* ] - "ئاژەڵی دڕندە": شێوەیەکی دیکە لە ↑توور tur / توار twar [تەیر و توور یان تەیر و توار].

**تیروو2 teru** [ *terū* ] - "دارێکی جەنگەڵی": تیروێ tîrwe یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑دار dar.

**تێزۆ tezo** [ *tezū* ] - "قەڵس و تووڕە": خزمە دەگەڵ ↑تۆسن tosın.

**تێزە teze** [ *teza* ] - "نووکی باریک": دەچێتەوە سەر ↑تیژ tîj.

**تێژک tejk** [ *težk* ] - "بەچکەساوای ئاژەڵی دڕندە": خزمە دەگەڵ ↑تازە taze.

**تێشوو têşû** [ *tešū* ] - "بژێوی رێگا و سەفەر": توێشوو tuwêşû ش دەگوترێ. توشە tūše (P.).

1- لە لایەکەوە دەکرێ بەرهەڤی بکەین دەگەڵ Tasche (G.) "گیرفان" و tasca (OG.) "توورەکە". لەوانەیە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا مەبەست لە "تێشوو" سەرەتا ئەو توورەکەیە بووبێ کە بژێوی سەفەریان تێ ناوە و بە کۆڵ یان بەسەر شانیاندا داوە.

2- لە لایەکی دیکە لەوانەیە پێوەندی بە ↑دۆش doş "کۆڵ، سەرپشت"ەوە هەبێ.

**تێک tek** [ *tek* ] - پێشگرێکی لێکدراوی کردارە: ↑دە + ↑یەک de + yek [دە یەک نان de yek nan ← تێک نان tek nan، دە یەک چوون de yek çun ← تێک چوون tek çun]

**تێکسمران teksımran** [ *teksımrān* ] - "قەڵەو و بەهێز بوون": تێک + سمران tek + sımran. [بڕوانە ↑سمراو sımraw].

**تێکوشین tekuşîn** [ *tekušīn* ] - "تلێت کردن": تێ + ↑کوشین te + kuşîn.

**تێکۆشان têkoşan** [ *tekošān* ] - "هەوڵدان": تێ + ↑کۆشان te + koşan.

**تێکەڵ tekel** [ *tekal* ] - "لێکدراو، ئاڵۆز": کورتکراوی ↑تێکەڵاو tekelaw [تێکهاڵاو].

**تێکەڵاو tekelaw** [ *tekalāw* ] - "لێکدراو، ئاڵۆز": دە بنچینەدا: تێک + ئاڵاو (هاڵاو) tek + alaw. دەچێتەوە سەر کرداری تێکهاڵان tekhalan "لێکدران" [↑هاڵان halan].

**تێل tel** [ *tel* ] - "سیم، هەودای کانزایی": ↑ تەل tel.

**تێلا tela** [ *telā* ] - "داردەست":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑دار dar.

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑تەل² tel "چڵ، لاسکەگیا".

**تیمیسک temîsık** *[ temīsık ]* - "زیبکەیەکە هێندێک کات، وەک لە کاتی تا وتێ یان ترس و داچڵەکین دا، لە دەوری دەم ولێو پەیدا دەبێ": تێ + میس + ک te + mîs + ık. کەرتی یەکەم ↑تێ te یە بە مانای داغ بوونی لەش بە هۆی نەخۆشی. کەرتی دووەم، لە ↑ماسین masîn [مسان، هەڵمسان] ەوە هاتووە. کەرتی کۆتایی پاشگرە. تیکرای وشەکە واتا "ماسین بە هۆی تێ".

**تیورووکان tewırukan** *[ tewırūkān ]* - "لە دەوورری شتیک هاڵان": تیمرووکان temırukan یش دەگوترێ. تێ + وروکان te + wırukan. بنەوشەکە ور -wır ە. بنەوشەی *wer- , wır-* دە ژمارەیەک لە وشەکاندا خۆ نیشان دەدا و ئاماژە بە چەمکی "سووڕان، هاڵان" دەکا، وەک ↑ وڕ wır واتا "گێژ" یان ↑*وەرانین weranîn* "لێهاڵاندن، تیپێچان".

**تیوەردان tewerdan** *[ tewardān ]* - "ئاو دە دەفردا گەڕاندن": تێ + وەر + دان te + wer + dan. تیک وەردان tek werdan یش هەیە بە مانای " لێکدان، تیکەڵ کردن". ↑وەر³ wer بنجی سەرەکی کردارەکەیە [ئاوی تێ وەر دە، دە ئاوی وەر دە]. دە فارسیدا دەگوترێ "اب توش بگردان". ئەم "وەر"ە خزمە لەگەڵ هێندێک وشەی زمانی کوردمادی وەک ↑*وەرانین weranîn*، ↑وەردێنە werdene [وەردانە werdane]، ↑وەرد (دانەوە) werd danewe و هتد. هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "سووڕاندن(ەوە)، گەڕاندن(ەوە)" دەکەن. کرداری گەڕاندن gerandınیان گەرداندن gardāndan (.P) شێوەیەکی گۆڕدراوە لە کردارێکی کۆنتری وەک "وەرداندن werdandın"، واتا فۆتیمی g فۆنێمێکی تازەیە و گۆڕدراوی فۆتیمی w/ v یە.

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی w/ v/ b بۆ g بڕوانە ئەم نموونانەی خوارەوە: وەژاردن/ بژاردن، بەراز/وەراز، برسی، بۆش (فش) و ... کە دە فارسیدا دەبنە "گزیدن، گراز، گرسنە، گشاد"].

# ج (C)

**جا ca** [ *jā* ] - وشەیەکە بۆ جەخت کردی بەکار دەهێنرێ: "جا وەرە خۆت مەکووژە"، "جا با بزانین"، "جا ئەویش هات؟"، "جا چۆن وا دەبێ؟" و هتد. کورتکراوەی ↑*جار car* [جار و بار]. ئەم وشەیە پێوەندی بە چەمکی "کات"ەوە هەیە. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ گەیاندنی مانای "جا" و هەروەها "دا" [دا وەرە، دا با بزانین] وشەی Mal بەکار دێ، کە خۆی مانای "جار" دەدا: komm mal "دا وەرە"، hör mal "دا گوێ بگرە"، mal sehen "جا با بزانین، دا با بزانین" و هتد. وشەکە دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑سا sa [سا وەرە] و هەروەها ↑دیسان dîsan "جارێکی دیکە".

[تێبینی: وەک چۆن وشەی"جا" خزمە یان دەچێتەوە سەر "جار"، هەر بەم شێویە "دا" خزمە دەگەڵ دال1 dal "جار"].

**جاترە catre** [ *jātra* ] - "گیایەکە": شاترە šātare (P.). [وشە فارسییەکە پێک هاتووە لە شا + تەرە tare + šā واتا "شاسەوزی"]. ئەم وشەی دە زمانی عەرەبیدا بووەتە زعتر zaεtar (Arb.).

**جاجک cacık** [ *jājık* ] - "چەقە، بتێشت": دە فارسیدا سقز saqqez (P.). وشەی ↑چەقە çeqe ش دەبێ شێوەیەکی دیکە لە جاجک بێ. ئەم وشەیە دەتوانین دەگەڵ دوو وشەی ژێرمەنی بەرهەڤ بکەین:

1- ↑سەق seq و چەندین وشە کە ئاماژە بە "سەخت و پتەو بوون" دەکەن. بتێشت ئەگەر بە شتیکەوە نووسا، بە توندی پێوەی دەنووسێ و بە سەختی لێ دەبێتەوە.

2- zäh (G.)، zāch (OG.)، tough (E.) "سفت و پێکەوەچەسپاو، ئەو شتەی وا بە هاسانی لەبەریەک ناکێشرێتەوە" (ریشە؟). دیارە جاجک یان بتێشت سەرەتا شتیکی سفت بووە و بە جووتن خۆش کراوە، واتا بە جووتن لەو حاڵەتە سفتەی دەرهێنراوە یاخود کاتیک بە شتیکەوە نووساوە، وا بە سفتی پێوەی نووساوە، کە بە هاسانی لێی جیا نەکراوەتەوە. **جاجم cacım** [ *jājım* ] - "تەنراوێکە جۆڵا دروستی دەکا": خزمە لەگەڵ ↑شاشک şaşık "مێزەر".

**جادوو cadū** [ *jādū* ] - "سێحر، ئەفسوون": جادوو cadū (P.)، yātūk (Pl.)، yātav (Av.).
رەنگە پێوەندی بە ↑یاد yad یشەوە هەبێ.

**جادە cade** [ *jāda* ] - "رێگە و بان": جادە cāde (P.). خزمە دەگەڵ sit (OE.)، sint (OG.)، set (OIr.) "رێگە، جادە، رەوت". خزمە دەگەڵ ↑شاندن şandın "ناردن، رەوانە کردن".

**جار car** [ *jār* ] - "1-کەڕەت، هەل 2- کات": خزمە دەگەڵ jāvar (Pl.) "جار، کات"، هەروەها دەگەڵ jāvītān (Pl.) وجاوید jāvīd (P.) "هەرمان، هەمیشەیی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ewig (G.)، euwig (Nl.)، "هەرمان"، je (G.) "هەر"، aiws (Gt.) و aevi (OIs.) "کات، هەرمانەتی"، aevum (L.)، aión (Gr.) "کات، هەرمانەتی، ژین"، سەربە ریشەی < *aiu-,*aiw- (IE.)* "ماوەی ژیان، کاتی دوورو درێژ، هەرمانەتی". ئەم ریشەیە خۆی بەگوێرەی بۆچووتیک شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەیەکی کۆنتر کە دەبێتە *jeu- (IE.)* "لکاندن، بەستنەوە". لەم مانایەوە، واتا لکان و بەسترانەوە، سەرەتا مانای "بێ برانەوە و بەردەوامی" سەری هەڵداوە و ئەوجار "کات، هەرمان و هەمیشەیی".

**جاڕ1 car** [ *jār* ] - "بانگ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زاری zarî "گریان"، Kar (G.)، care (E.)، chara (OG.) "خەم و خەفەت"، سەر بە ریشەی *gar- (IE.)* > "بانگ کردن، هاوار کردن، هەرا کردن".

**-جاڕ2 -car** [ *-jār* ] - پاشگرێکە ئاماژە بە پڕانی و زۆر و زەوندی دەکا، وەک تیرگسجار، کەماجاڕ و هتد. ئەم پاشگرە هەروەها بەشێوەی ↑زار zar یش هەیە، وەک گوڵزار، مێرغوزار. دیسان بەشێوەی ↑سار sar یش بەدی دەکرێ، وەک کۆسار. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Schar (G.)، scara (OG.)، schaar

‏(Nl.) "پرانی". دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا وشەکە بۆ "ژمارەیەکی زۆری گیانلەبەر" بەکار دێ کە پێکەوە بن، وەکوو *شارەمێروو*، یان ژمارەیەکی زۆری ماسی، پەلەوەر و هتد. دە زمانی ئینگلیزی کۆندا scearu (OE.) بەم مانایانە بەکار هاتووە: تەرزی موو لێدان، بەش، ناوچە [دەڤەر]، سنوور. دە زمانی ئەمڕۆی ئینگلیزیدا share بەمانای "بەش، پشک" بەکار دێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑زار3 zar هەیە بە مانای "تووکەبەر" [موی زهار mūy e zahār (P.)] و دیسان زار2 zar یکی دیکە کە دەگەڵ زەوی دێ [زەوی و زارzewî u zar]. جگە لەمانە ↑شار2 şar [شارەمێروو]، جاڕ3 car "1- زەوی نەکێڵراو 2- جێگەی دەخڵی دروێنەکراو" گشتی پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *(s)ker-*** "بڕین، لەت کردن، جودا کردن".

[تێبینی: هێندێک لەم وشانەی کە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا بەمانای "گرووپ، دەستە" بەکار دێن، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە مانای "لەت کردن، جودا کردن" دەبەخشن، وەک "کەرتک، کەرتکە"، "ران" [گاڕان] دە زمانی کوردمادیدا. ئەم پێوەندییە لێرەوە سەرچاوەی گرتووە کە گرووپ یان دەستە وەک "لەتێک" لە "گشتێک" لەبەر چاو گیراوە یان وەک کەرتێک جیا لە کەرتەکانی دیکە].

**جاڕ3 car** *[cār]* - "1- زەوی نەکێڵراو 2- جێگەی دەخڵی دروێنەکراو": بڕوانە ↑جاڕ2 car-.

**جاڕز carız** *[jārız]* - "وەڕەز، قەڵس": جارس carıs یش دەگوترێ. هەروەها ↑زرز zırız هەیە بە مانای"تووڕە، زوێر" کە دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە جارز. خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قەڵس qelıs.

**جاش caş** *[jāš]* - "خائین بە گەل، نیشتمانفرۆش، خۆفرۆش بە بێگانە":

ئەم وشەیە بە پێچەوانەی بۆچوونێک کە باوە، چ پێوەندی بە "کەر و جاشە کەر"ەوە نییە. کەر و جاشەکەر ئاژەڵی بێ ئازار و لە هەمان کاتدا بۆ مرۆڤ زۆر بەسوودن. زۆر ناڕەوا و دوور لە ئاوەز دەبێ ئەگەر ناوی ئەم ئاژەڵە باشانە بۆ خۆفرۆشان بە بێگانە کە قێزەوەنترین کەسانی ناو کۆمەڵگان، بەکار هێنرابێ. هەروەها ناشکرێ لەبەر "نەزانی و گەوج بوون"ی کەر و جاشەکەر- کە دیارە ئەویش راست نییە- ناوی ئەو ئاژەڵە درابێ بە خائینی گەل. بەشی هەرە زۆر خائینانی گەڵ کەسانی نەزان نین و بگرە کەسانی بەهۆشن کە زۆر بەئاگا، زیرەکانە هەلپەرستانە، بۆ پارە و پلەو پایە خۆیان دەفرۆشن. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر ناوی "جاشی نیشتمانفرۆش" پێوەندی بە نەسلی "کەرە"وە - بە داوای لێبووردن لە کەرەکان- هەبایە، دەبایە ناوی "کەر"یان لەسەر دابنرایە، کە ئاژەڵێکی تەواو و پێگەیشتوویە، نەک ناوی بێچووە بەستەزمانەکەی کە هەم ئاژەڵێکی جوانە و هەمیش گچکە و ناپێگەیشتوویە. ئەمجار دە زمانی کوردمادیدا بە بەچکەی کەر زۆرتر دەگوترێ "جاشک" یان "جاشەکەر"، نەک "جاش". کەوابوو وشەی *جاش* "نیشتمانفرۆش" دەبێ پێوەندی بە شتێکی دیکەوە هەبێ. ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- وشەی "جاش" دەگەڵ هێندێک وشە بەکار دەهێنرێ و مانای "وەکوو، لە شێوەی، ئاماڵ" دەبەخشێ، واتا شتێک کە لە شتێکی دیکە دەچێ، بەڵام تەواو وەک ئەو نییە. دە زمانی فارسیدا وشەی "شبهە" ئەم مانایە دەردەبڕێ، وەک "شبهە جزیرە"، "شبهە نظامی"، واتا شتێک کە لە جەزیرە یان لە نیزامی دەچێ، بەڵام تەواو خۆشی نییە. وشەی "شبهە" لە زمانی عەرەبی وەرگیراوە و پێوەندی بە تشبیە و تشابە (Arb.) "هاوشێوەیی" هەیە. بەڵام وشەکە خۆی لە زمانی کوردمادی یان فارسی ورگیراوە و دەچێتەوە سەر "شێوە" و دواجا دەچێتەوە سەر "ساوین" [کۆنتر: "سابین"، بڕوانە "سابیدن" دە زمانی فارسیدا]. مانای "شێوە" دە بنەڕەتدا "شەقڵ، فۆرم، پەیکەر، وێنە" بووە کە بە "ساوین"ەوە، واتا رێخشاندن [داتاشین، داڕنین] لەسەر دار و بەرد یان قوڕ دروست کراوە. دە زمانی ئەڵمانیدا Geschöpf (G.) "ئافەریدە، مەخلووق" و schöpfung (G.) "ئەفراندن" [دە بنەڕەتدا: شێوە پێدان، دروست کردنی پەیکەر یان شێوەیەک] پێوەندی پەیدا دەکەن بە schaben (G.) "ساوین، داتاشین، هەڵکۆڵین". ئەم وشەی دوایی

خزمە دەگەڵ "ساوین" دە زمانی کوردمادی و "سابیدن" دە زمانی فارسیدا. ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر وشەی "جاش"، دەبینین کە دوو وشەی گرینگ دە زمانی کوردمادیدا لەم بارەوە سەرنج رادەکێشن، کە بریتین لە ↑تووز tuz و ↑تەشک2 teşk "تەرح، شێوە، بیچم". پێوەندی ئەم وشانە بە وشەی ↑تاشین taşn ئاشکرایە، واتا "تووز" و "تەشک" ئەو شێوە و پەیکەرانە بوون کە بە (دا)تاشین دروست کراون. وەک لەسەرەوە باس کرا، وشەی "جاش" دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ چەند وشەیەک دێ و مانای "شێوە، ئاماڵ" دەگەیەنێ، وەک جاش پۆلیس caçpolîs [ئەم وشەیەم بە منداڵی لە مەهاباد زۆر گوێ لێ بووە]، جاش پاڵتەو caşpaltew و هتد. مەبەست لەم وشانە ئەوەیە کە کەسێک لە پۆلیس دەچێ [ئاماڵ پۆلیس]، یان جامەیەک کە پاڵتەوێکی تەواو نییە، بەڵام لەو دەچێ [ئاماڵ پاڵتەو]. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەی "جاش" گۆڕدراوی "تاش"ە و ئەمەش لە "تاشین"ەوە هاتووە و ئاماژە بە "شێوە، فۆڕم" دەکا. دەمێنێتەوە ئەوە کە چۆن ئەم وشەیە مانای "نیشتیمانفرۆش"ی وەرگرتووە. ئەسڵی وشەکە دەبێ سەرەتا جاش پۆلیس caçpolîs بووبێ کە ئەمانە کەسانی ناوخۆیی بوون و دواتر کەرتی "پۆلیس" لە وشەکەدا سواوەتەوە و بە کورتی بووەتە "جاش". سەبارەت بە سوانەوە و کورت بوونەوەی وشەی لەم چەشنە، چەندین نموونە هەیە، بۆ وێنە "کۆسە" خۆی سەرەتا ناوی ماسی نەبووە و وشەکە "کۆسەماسی" بووە، دواتر ماسییەکە لا بردراوە و کورت کراوەتەوە بۆ "کۆسە". هەروەها "کەمەر"ی قایش کە لە پشت دەبەسترێ، دە بنەڕەتدا "کەمەربەند" بووە، دواتر کورت بووەتەوە بۆ "کەمەر". یان "کەللە" سەرەتا دەگەڵ "سەر" هاتووە، واتا وشەکە "کەللەسەر" بووە و کورت بووەتەوە بۆ "کەللە". هەر بەم شێوەیەش "کوردماد" بووەتە "کورد" و هتد.

[تێبینی: ئێستا کە بۆمان روون بۆوە کە وشەی "جاش"ی خۆفرۆش نە لەباری مەنتقییەوە و نە لەباری ئێتیمۆلۆژییەوە هیچ پێوەندییەکی بە "جاش"ەکەرەوە نییە، تکایە با چیتر ئەم دوو وشەیە تێکەڵ نەکرێن. زۆرجار دەبینین، بە تایبەتی ئێستا لەسەر فەیسبووک، کاتێک باس لە جاشەکان دەکرێ، لە هەمان کاتدا وێنەی کەر یان جاشکێک دادەندرێ. زۆرجاریش کەر یان جاشکی بەستەزمان بە فۆتۆشاپ هەزار ئەتک و بەڵای بەسەر دەهێنرێ. ئەم کارە، واتا هاوشان کردنی کەر و جاشک دەگەڵ خۆفرۆشەکان، نەک هەر ستەمێکی گەورەیە کە دەرهەق بە کەر و جاشکی بەدبەخت دەکرێ، بەڵکوو دەتوانێ هاوکات هەست و هەڵسوکەوتی دژەئاژەڵ کە خۆی لە خۆیدا بەداخەوە لەناو ئێمەدا زۆرە، زیاتر پەرە پێ بدا و ببێتە هۆیەک بۆ رەفتاری ناپەسەند و توند و تیژی زۆرتر بەرانبەر بەم ئاژەڵانە و هەروەها ئاژەڵانی دیکەش. با قێز و نفرەتی خۆمان بەرانبەر بە جاشەکان بە شێوەکانی دیکە نیشان بدەین و تێبکۆشین سۆز و خۆشەویستیش بۆ ئاژەڵەکان لەناو کۆمەڵگاکەماندا پەروەردە بکەین].

**جاشک caşk** *[ jāšk ]* - "بەچکەی کەر": جاش caş یش دەگوترێ [جاشە کەر]، هەروەها داشک daşk دەگوترێ [گۆڕانی فۆتیمی c بۆ d]. خزمە دەگەڵ Esel (G.)، esol (OE.)، asilus (Gt.)، asne (OF.)، es (Arm.)، asinus (L.) "کەر". بنەوشەی es / as، دە کوردمادیدا بووەتە caş. کەرتی -ک -ık دە وشە کوردمادییەکەدا پاشگرە، هەروەک چۆن دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا ئەم پاشگرە بە وێنەی el- / ol- دەبنیدرێ. دە زمانی تورکیشدا êşek (Tur.) دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبی و لەوانەیە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**جاف caf** *[ jāf ]* - "ناوی هۆزێکی کورد": مامۆستا هەژار ئەم ناوەی بردووەتەوە سەر وشەی ↑گا ga و بەگوێرەی ئەو، "جاف" لە ناوی هۆزی گاوان gawan [گاوانی؟] کەوەتۆتەوە. [بڕوانە "هەنبانە بۆرینە"، ل. 180]. ئەم وشەیە هەروەها لەوانەیە پێوەندی بە بنجێکەوە هەبێ کە لە چەندین وشەدا بە دیار دەکەوێ، وەک ↑گەورە gewre. ریشەی ئەم وشانە لە کوردمادی بەرێدا گەب -geb یان گەپ -gep بووە. وشەی "گەپ" لە شێوەزاری کوردمادی خوارووودا بە مانای "گەورە"ی کوردمادی ناوەراست دێ و ئەمانە دوو شێوەن لە وشەیەکی کۆنتر. لەم تێڕوانینەوە "جاف" دەتوانێ گۆڕدراوی "گەپ، گاپ" بێ. ئەم

تیروانینه به باوەڕی من زۆرتر ڕێی تێ دەچێ، چونکوو ناوی زۆرێک لە تیرە و هۆزە کوردەکان پێوەندییان بەو ڕیشانەوە هەیە کە مانای "بەهێز و گوڕ، سەخت، قورس و قایم" دەبەخشن.

**جاڵ cal** *[ jāl ]* - خزمە دەگەڵ Seil (G.)، sāl (OE.)، zeel (Nl.) "پەت، بەن، ڕیس". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ڕیشەی ***(IE.) *sei-*** > "بەستن(ەوە)، دروون، گرێ دان". لەم تیروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑شاڵ şal، ↑جۆڵا cola، ↑زیلۆ zîlo، ↑جاڵجاڵووکە calcaluke و هتد. šilo (Rus.) "درێشەی پینەچی" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**جاڵجاڵووکە calcaluke** *[ jāljālūka ]* - " کاکڵەمووشان، پسپسەکۆڵە": بنەی وشەکە جاڵ-cal ە بە مانای "ڕیس" [بڕوانە ↑جاڵ cal].

**جاڵە¹ cale** *[ jāla ]* - "دار یان تەختەی بە سەر ڕووباردا ڕایەڵ کراو بۆ پەڕینەوە": خزمە دەگەڵ Schwelle (G.)، swella (OG.)، sill (E.)، syll (Sw.) "دار یان تەختەی بەر دەرگا"، sélma (Gr.) "داری خشتکراو"، súolas (Lit.) "تەختی دانیشتن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی ***(IE.) *s(u)el-*** > "داری خشتکراو، تەختە".

**جاڵە² cale** *[ jāla ]* - "خلۆر، گلۆر": هاوڕیشەیە دەگەڵ غلت ġalt و غلتیدن ġaltīdan (P.) "گەوزین، خلۆر بوونەوە" و gleiten (G.) "خلیسکان". خزمە دەگەڵ ↑خلیسکان xılîskan، ↑گلان gılan و هتد.

**جام cam** *[ jām ]* -"1- قاپ، دەفر 2- شووشە": دە فارسیدا جام jām (P.). دەشێ پێوەندی هەبێ بەو وشانەی لە ژێر ↑حەمرین ħemîrn دا باس کراون [کۆنتر: *kemrîn**]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "بەرد" و دواتر لەم ڕیشەوە "مانای "ڕەق، سەخت" پەیدا بووە. مەبەست سەرەتا دەبێ "سواڵەت" [سفال بە فارسی] بووبێ و ئاماژە بە قاپە گڵینانە کرابێ کە لە کڵدا سوور کراونەوە و بە بەرد کراون. مانای دووەمی وشەکەش، واتا "شووشە" هەر لەم پێوەندییەدا جێی لێکدانەوەیە. ئەم وشەیە خۆی دە بنەڕەتدا مانای "سەخت، بەردین، بەردکراو" دەگەیەنێ. وشەکانی ↑ئامان1 aman "قاب و قاچاخ"، ↑هەوەڕ hewer [هەوڕ hewır] "ئێربار، دەفری لە سواڵەت" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی1: لەم بارەوە دەتوانین دەگەڵ "سەکرە"ی کوردمادی ("ساغر" بە فارسی) "جامی بادە" هەڵیسەنگێنین کە دەبیتە خزم دەگەڵ "سەخت" و گەلێک وشە کە لەژێر "سەق"دا باس کراون. تێبینی 2: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمەکانی h و c بڕوانە "جامە" و ئەو وشانەی لەوێ باس کراون].

**جامانە camane** *[ jāmāna ]* - "ئاغابانو، پێچی لەسەرنان": جامەدانی camedanî یش دەگوترێ. [دە ئەسڵدا جامە + دان came + dan]. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑جامە came.

**جامباز cambaz** *[ jāmbāz ]* - "فێڵباز": ↑جام cam + باز baz. مەبەست لەم وشەیە دەبێ دە بنەڕەتدا ئەو کەسە بووبێ کە بە دووسێ دانە جام کایە دەکا (↑بازی bazî دەکا)، واتا شتێک لەبن یەک جامدا دەشارێتەوە، بەڵام وا بە زرینگی و تەڕدەستی دەیکا کە بینەر نازانێ شتەکە لەبن کام جامدا شاردراوەتەوە. لێرەوە کابرای جامباز وەک نموونەی "چاوبەستی و فێڵبازی" لەبەر چاو گیراوە و مانای وشەکە گشتێنراوە.

**جامبازە cambaze** *[ jāmbāza ]* - "دەست بڵیند کردن و هەڵبەزینی ئەسپ": بنەوشەی جام -cam پێوەندی هەیە بە ↑گاو² gaw "شەقاو، لۆقاو" [دە بنەڕەتدا: دەست، لاق، بە فارسی گام gam (P.)]. کەرتی بازە -baze پێوەندی هەیە بە هەڵبەزین helbezîn [بەزین bezīn] و دواجار ↑بزوان *bızwan*.

**جامە came** *[ jāma ]* - "جلوبەرگ": دەگەڵ چەند وشەیەکی دیکەش دێ وەک جامەدانی camedanî یان ↑جامانە camane، ↑چەمەدان çemedan [دەبنەڕەتدا هەر "جامەدان"]، هەروەها دێوجامە dewcame. کەرتی "جامە" بە مانای جلوبەرگە و ئەم وشەیە دە زمانی فارسیدا هەر بەو مانایە پارێزراوە. دە زمانی کوردمادیدا ↑جۆمە come بە مانای "کراس" بە کار دەهێنرێ. دە زمانی پەهلەویدا وشەکە yamek (Pl.) بووە. جامانە یاخود جامەدانی کوردمادی دە بنچینەدا شمەک و جلوبەرگیان تێناوە و بۆیە ئەوها ناو

نراوه. ده زمانی فارسی و کوردمادیدا ↑چەمەدان çemaden یش هەیە کە جامە و جلوبەرگی تێدا هەڵدەگیرێ [چەمە + دان] . وشەی جامە came خزمە دەگەڵ Hemd (G.)، hemde (OE.)، hamethe (OF.) "کراس، جۆمە". ئەم وشانەی دوایی هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑شەمەد şemed "پۆپەشمین" دە زمانی کوردمادیدا. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ‎*kem- <‎ (IE.) "داپۆشین، تێوەپێچان". وشەکانی hamo (OE.) "تێپێچ" [پێچ] hama (OE.) "جلوبەرگ، پێست(ە)، پارچە" لەم ریشەوە هاتوون. دە هێندی کۆندا samula- (OIn.) بە مانای "کراسی پەشمی" هاتووە. زمانی لاتینی camisole "کراس"ی لە زمانە ژێرمەنییەکان وەرگرتووە و ئەم وشە لاتینییەش دە زمانی عەرەبیدا بووەتە قمیص qamīs (Arb.) بە مانای "کراس". سەبارە بە وشەی قماش qumaş (Arb.) یش بە مانای "پارچە" دەتوانین بڵێین کە پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە. جا ئەم وشەیە لە رێگەی یەکێک لە زمانەکانەوە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "داپۆشین، تێوەپێچان" دەکەن، خزمایەتییان دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە هەیە، وەک ↑دەمامک demamk [دەم + ئامک]، ↑بڵامک bılamık [بل + ئامک]، ↑بزمک bızmık [بز + (ئا)مک]، ↑قەمتەر qemter "دەمبێن"، ↑قەمتک qemtık"دەسرۆکەی سەری ژنان" و ↑قەمتاندن qemtandın "بابۆڵەپێچ کردنی زارۆک". هەروەها وشەکانی خوارەوە لەم چوارچێوەیەدا جێ دەگرن: ↑خام xam "پارچەی سپی"، ↑شەمل şemıl "جاجم یان هەر کرێک کە دە خۆیەوە دە پێچن"، ↑شەملک şemılk "1- بەرماڵ 2- فۆتە، داپۆشی خوار لە کەمەر"، ↑شەمەد şemed، ↑شەمراندن şemrandın "شاردنەوە" و هتد.

**جان can** *[ jān ]* - "گیان، رووح": خزمە دەگەڵ ↑ژین *jîn* و ↑ژیان jîyan.

**جانتا canta** *[ jāntā ]* - "کۆڵەپشتی": لە ↑چنتە çente "توورەکە" وەرگیراوە و دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە جانتا jāntā (Arb.). دە زمانی کوردمادیدا هەم وشە ئەسڵییەکە بەکار دێ و هەم وشە عەرەبێنراوەکە. [بروانە ↑چەنتک çentık].

**جانگ cang** *[ jāng ]* - "قەراخی دەموچاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ cheek (E.)، ċēoce (OE.)، ziake (OFris.)، kaak (Nl.) "(لا)جانگ". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *ka kōn* (Grm.). ریشەی هیندو ئەورووپی ئەو وشانە باس نەکراوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑شنک şınık [یان جنیک cınîk] هەیە بە مانای "بان مەڵاشوو، پێشەسەر" کە پێوەندی بە "جانگ"ەوە هەیە.

**جانوو canu** *[ jānū ]* - ↑جوانوو cuwanu.

**جاو caw** *[ jāw ]* - "پارچەی کەتان": خزمە دەگەڵ ↑داو daw "دەزوو". [دە زمان فارسیدا بە "داو" دەڵێن نخ nax و بە "جاو"یش دەڵێن نخ / نخی nex / naxī. ئەم پێوەندییە دە زمانی فارسیدا هەروەک پێوەندی "داو" و "جاو"ە دە زمانی کوردمادیدایە].

**جاوی cawî** *[ jāwī ]* - "شیرەی دار": ↑جەوک cewık.

**جاوین cawîn** *[ jāwīn ]* - "جووتن، بە ددان ورد کردن": جووتن cutın یش دەگوترێ. جویدن cavīdan (P.) و هەروەها خائیدن xāīdan (P.)، chew (E.)، kauen (G.)، kiuwan (OG.)، سەر بە ریشەی ‎*geu- <‎ (IE.) "جووتن". هێندێک وشە دە زمانی کوردمادیدا دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑شەویلکە şewîlke، ↑کاوێژ kawej.

**جبە cıbe** *[ jıba ]* - "چەک و چۆڵ": دە فارسیدا جبە cabe (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ Waffe (G.)، weapon (E.)، vapen (Sw.)، wēpn (Gt.) "چەک". ریشەی ئەو وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە فۆتیمی سەرەتای وشەکە دە زمانی کوردمادی و فارسی یان دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ئاڵوگۆری بەسەرهاتبێ.

**جخار cıxar** *[ jıxār ]* - "خەم، کوڵ و کەسەر": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑جەحنین ceħnîn "توورە بوون".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "کول و کەسەر" دەگەڵ "تووڕەیی" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی *ئازار* "ئێش"، *ئاژر* "تووڕە" و *غەزرین* "تووڕە بوون" یان دەگەڵ *کەد* "زەحمەتی، نارەحەتی" و *خەیدین* "رق هەستان، تووڕە بوون"].

**جدەو cıdew** [ *jıdaw* ] - جدەوبوون واتا لە کار کەوتنی ئەندام بەهۆی ئازار پێگەیشتن یان گوشاری زۆر. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ steif (G.)، stiff (E.)، stijf (Nl.) "رەق، توند، بێجوولە". دە زمانی ئاڵمانیدا وشەکە بۆ رەق بوون و لە جوولە کەوتنی ماسوولکەکانی لەش بەکار دەهێنرێ و ئەمەش زۆر نیزیکە لە مانای وشەکە دە زمانی کوردمادیدا. دە زمانەکانی دیکەشدا ئەم وشەیە دەبینرێ، وەک stipti (Lit.) "رەق بوون"، stípare (L.) "پێکەوەنووسان، توند تێکچرژان". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *stifa- (Gm.)*. رێی تێ دەچێ ریشە هیندوئەورووپییەکە بچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری **< *stai- (IE.)*** "مەیین، رەق بوون، چڕ بوون".

**جڕ[1] cır** [ *jır* ] - جڕ دان واتا دڕاندن. دە فارسیدا جر دادن jer dādan.

1- "جڕ" دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە بنجی دڕ dır- دە کرداری ↑دڕاندن dırandın دا.

2- یان لەوانەیە پێوەندی بە ↑شڕ şır ەوە هەبێ.

**جڕ[2] cır** [ *jır* ] - دەگەڵ "جانەوەر" دێ [جڕ و جانەوەر]. "جڕ" وشەیەکی کۆنترە لە "جانەوەر" و خزمە دەگەڵ Tier (G.) "جانەوەر". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑توور tur [تەیر و توور].

**جڕان cıran** [ *jırān* ] - "دڕان":

1- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑دڕان dıran.

2- یان خزمە لەگەڵ ↑شڕ şır [شڕ و دڕ]

**جرت1 cırt** [ *jırt* ] - دەگەڵ "فرت" دێ [جرت و فرت cırt û fırt] واتا بزۆزی، هەڵبەزدابەز. خزمە دەگەڵ ↑شەردین şerdîn "ئاوارە بوون، بڵاڤ بوون" و لەوانەشە دەگەڵ ↑شرت şırt [شرت و گوم]. "فرت"یش خزمە دەگەڵ "فرتە" یان "پرتە". تێکڕای وشەکە واتا "هەڵبەزینەوەی زۆر، خۆ بەم لا و ئەولادا دان".

**جرت2 cırt** [ *jırt* ] - جرت راداشتن واتا "دەنگی تڕ" دەرهێنان. دە فارسیدا زرت zert (P.). هەروەها دە کوردمادیدا ↑زرت zırt هەیە بە مانای "خۆ هەڵکێشان، قسەی بێتام کردن، تڕ دان بە دەم، هەڕەشە کردن" و بەو کەسەش زڕت بدا، دەگوترێ زڕتک zırtık یان زرتۆک zırtok. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەند وشەی زمانە ژێرمەنییەکان، وەک grell (G.) "قەڵس، توند، قیژەکەر"، grellan (MG.) "قیژاندن، دەنگ هەڵبڕین لە تووڕەییان"، griellan (OE.) "تووڕە بوون، دەم داپچڕین"، Groll (G.) "تووڕەیی"، grollen (MG.) "تووڕە بوون، بۆڵاندن، .زرینگانەوە"، Grüß (G.) "سڵاو" [دەبنەڕەتدا: "بانگ"]، grüßen (G.)، groeten (Nl.)، gra tan (OE.) "سڵاو کردن، بانگ کردن، قسە دەگەڵ کردن"، grētan (Gt.) "گریان" [دە ئەسڵدا: زیراندن، قیژاندن]. ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە. شیاوی باسە دە زمانی کوردمادیدا وشەیەک هەیە بە مانای "تووڕە" کە بە چەند شێوەی زرز zırız، ↑جارز carız، جارس carıs و ↑قەڵس qelıs خۆی نیشان دەدا. لەوانەیە ئەم وشانە و هەروەها ↑زاری zarî "گریان" و ↑زەراندن zerandın یش هەر لەم چوارچێوەیەدا جێی لێکدانەوە بن.

[تێبینی: رەنگە هەموو ئەم وشانە و گەلێک وشەی لەم جۆرە وەک ↑قڕاندن qırandın [قیڕاندن]، ↑گوڕڕاندن gurrandın، ↑گریان gıryan و↑جارcar [جارکێشان] دواجار بچنەوە سەر ریشەیەکی دووری هاوبەش بە مانای "دەنگ هەڵبڕین، هەرا کردن"].

**جرجە cırce** [ *jırja* ] - دەگەڵ "مشک" دێ [جرجەمشک cırcemışık]. دەشێ ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا زەردە zerde بووبێ و مەبەست ئاماژە کردن بە مشکی زەرد بێ بەپێچەوانەی مشکی رەش یان ئاماڵ رەش [بڕوانە ↑زەرد zerd].

جرووکه **cıruke** [ *jırūka* ] - "دەنگی چۆڵەکە": زرووکە zıruke ش دەگوترێ، خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑زرووقان zıruqan و ↑زریکاندن *zırîkandın* و هتد

جرینگه **cırînge** [ *jırīnga* ] - "دەنگی شتی کانزایی وەک زنجیر و زێرو زێو": دە فارسیدا جرنگ jerang (P.) و جرنگیدن jerangīdan (P.). ↑خرینگه xırînge، ↑زرینگه zırînge ش دە بنچینەدا دەگەڵ جرینگه هەر یەک وشە بوون و دواتر چەند شێوەی برێک جیاوازیان پەیداکردووە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Klang (G.) "دەنگ و سەدا، زرینگە"، klingen (G.)، klingan (OG.)، klinken (Nl.)، clink (E.) "زەنگ لێدران، جرینگە لێهاتن". ریشەی ئەم وشانە دەچێتەوە سەر< *(IE.) *ĝal-* ە کە دە بنچینەدا لاسا کردنەوەی دەنگەکەیە. دە زمانی کوردمادیدا کردارەکە دەبێتە زرینگانەوە zırîngan(ewe).

جریوه **cırîwe** [ *jırīwa* ] - "ترووکە ترووکی ئەستێرە": سریوە srîwe و زریوە zrîwe ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ glühen (G.)، gluoen (OG.)، glow (E.)، glo (Sw.) "درەوشانەوە". هەروەها دەگەڵ glimmen (G.) و (Nl.)، glimma (Sw.)، gleam (E.) "درەوشانەوە"، سەر بە ریشەی *( IE.) *ghel- >* "درەوشانەوە، ترووسکانەوە". [فۆتیمی m ی ئەم وشە ژێرمەنییانە دە وشە کوردمادییەکەدا بووەتە w و ئەمەش گۆڕاتیکی باوە دە زمانی کوردمادیدا]. چەندین وشەی وەک زێڕ zer و ↑زەرد zerd دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

جز **cız** [ *jız* ] - "دەنگی هەڵقرچانی رۆنی داغ": هەروەها جززە cızze هەیە کە بە زمانی زارۆک ئاماژە بە شتی داغ دەکا و وریایی دان بە زارۆکە بۆ دوور کەوتنەوە لە شتی داغ. خزمە دەگەڵ ↑چزاندن çızandın و هەروەها ↑کزانەوە *kızan(ewe)*.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە وەک ناوی دەنگ بەکار دێن [دەنگەوشە] و وا بیر دەکرێتەوە تەنێ لاسا کردنەوەیەکی سادە و بێ مانای دەنگەکان بن. بەڵام دە راستیدا ئەم وشانە ریشەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ وشەی کۆن و مانادار. هێندێک لەم وشە مانادارانە دە زمانی ئەمرۆی کوردمادیدا شوێنەواریان کز بووەتەوە و بە باشی ناناسرێنەوە، بۆ وێنە شەقە، شڵقە، جڵقە، فلقە، تەقە، فرە ، وڕە و هتد. گشت ئەم "دەنگەوشانە" پێوەندییان بە وشەی ماناداری کۆنەوە هەیە کە لق و پۆیان دە زمانی کوردمادیدا و زمانە خزمەکاندا پارێزراوە].

جزقه **cızqe** [ *jızqa* ] - "زەنگەتە(ترێ)": خزمە دەگەڵ ↑جۆخین coxîn "کۆی خەرمان" و ↑جەغز ceğız "بازنە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "یەکخستن، لێکبەستن". لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "زەنگەتە" کە دەبێتە خزمی "شەنگڵە" [دوو میوەی پێکەوەنووساو].

جڤین[1] **cıvîn** [ *jıvīn* ] - "کۆم بوون، کۆبوونەوە": جەمین cemîn و جەمیان cemyan یش دەگوترێن [ڤەجەمین، ڤەجەمیان]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ انجمن anjoman (P.) [an + joman] بە مانای "جڤات"، samanon (OG.)، samnian (OE.)، samna (OIs.) بە مانای "کۆ کردنەوە، یەکخستن، بە یەک گەیاندن"، سەر بە ریشەی *(IE.) *sem- <* "یەک". ئەم مانایە، واتا مانای کۆ کردنەوە یاخود یەکخستن دە وشەی ↑سەرجەم sercam یشدا پارێزداوە [ ser + cam] بە مانای "تێکڕا، هەمووی بەیەکەوە". ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وەک ئاوەڵکردداریش بە کار هاتووە: saman (OG.)، samman (Sw.) "لە لای، لەجەم، پێکەوە"، (to)samne (OE.)، zusammen (G.) "پێکەوە، دەگەڵ یەکتر". هەر هەمان شت دە زمانی کوردمادیشدا دە ئاوەڵکرداری "لەجەم" le cem دا پارێزراوە بە مانای "لەلای". خاڵێکی دیکەی پێویست بە باسکردن ئەوەیە کە وشەی جڤین cıvîn بە شێوەیەکی دیکە، واتا بە شێوەی ↑ژوان juwan یش، بە مانای "پێکگەیشتن" بەکار دەهێندرێ و ئەمەش دەگەڵ مانای بنەرەتی ریشەکە دەگونجێ. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑جڤات cıvat، ↑جڤاکی cıvkî و ↑شەماتە şemate "کۆمەڵگا، خەڵک، ئاوایی" پێوەندییان بە "جڤین"ەوە هەیە. وا دەردەکەوێ دە زمانی عەرەبیشدا وشەی جمع cemɛ (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و لەوانەشە لە زمانە ئێرانییەکان وەرگیرابێ] .

جڤین² cıvîn [ jıvīn ] - "جمین": ↑جمین cımîn "جوولّان، تەکان خواردن".

جق cıq [ jıq ] - "ئامالّ": وشەی ئامالّ خۆی دەگەلّ هاوالّ/ ئاوالّ دە بنچینەدا هەریەکە و بۆ وێنە مەبەست لە رەنگی ئامالّ شین رەنگێکە کە هاوالّی شین بێ واتا وەک ئەو بچێ. هەربەم جۆرە وشەی جق cıq خزمە دەگەلّ yuxta (.Pl) و (.Av) بە مانای "جووت، هاوتا، هاوالّ". ئەم وشە ئەڤێستاییە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە وێنەی ↑ئوخت uxt [اخت oxt (.P)] خۆ نیشان دەدا بەمانای "جووت، هاوالّ". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەلّ ↑جۆخین coxîn "کۆی خەرمان" سەربە ریشەیەک بە مانای "یەک بوون، لێک بەسترانەوە".

جقە cıqe [ jıqa ] - "قیتکەی پشت پەنجەی کەلّەشێر": خزمە دەگەلّ ↑چقل çıqıl "درک".

جگ cıg [ jıg ] - "قاپ، ئێسکێکی سێجایە بۆ کایە کردن": جیک cîk، چک çık، چوو çu، شەق şeq و ↑شەگە şege ش دەگوترێن. هێندێک لەم وشانە، ناوی جگن لە دۆخێکی تایبەتیدا، بۆ وێنە "شەگە" واتا جگی لەسەر لاتەنیشت وەستاو. جگ cıg خزمە دە زمانی کوردمادیدا دەگەلّ چەندین وشەی وەک ↑شەق şeq [لاق]، ↑چۆک çok، ساق sāq (.P) "لای خوارەوەی لاق" و دواتر دەگەلّ چەندین وشەی دیکە وەک زەند zend، گوێزینگ guwezîng [ گۆ go + زینگ zîng]، ↑چەنگ *çeng* و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(s)keng- <** "خوار و خێچ". جگ ئێسکێکە لە جومگەدا جێی گرتووە و لەوانەیە ناو لێنانەکەی پێوەندی بەمەوە هەبێ.

[تێبینی: ئەگەر سەرنجی وشەی "قاپ" یان "کاب" [قاببازی، جگین] بدەین، دەبینین کە ئەم وشەیەش پێوەندی هەیە بە cubus (.L) "جگ" و ئەویش دەچێتەوە سەر kybos (.Gr) "جگ". ئەم وشانە خزمن دەگەلّ Hüfte (.G) "ئێسکی سمت، جومگەی سمت" و هەروەها ↑کەفەلّ kefel دە زمانی کوردمادیدا سەر بە ریشەی *(IE.) *keu-* "چەمانەوە، خوار بوونەوە"].

جگە cıge [ jıga ] - "جیا": جگا cıga ش دەگوترێ. جگا مانای "بەش" یش دەدا [جگاجگا واتا بەش بەش، جوداجودا]. "جگە" و هەروەها ↑جوێ coe [↑جیا cîya] دە بنچینەدا یەک وشەن و فۆتیمەکانیان ئالّوگۆڕیان بەسەردا هاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ ریشەی **(IE.) *skei- <** "بڕین، جیا کردنەوە، لێکردنەوە، قەلّشاندن". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە لەم ریشەوە سەریان هەلّداوە، بۆ وێنە ↑جەو cew "برینگ"، ↑جۆگە coge [دە بنەڕەتدا: هەلّکەندراوی، قەلّش لە زەویدا] و↑جودا *cuda* هتد.

جگەر cıger [ jıgar ] - "جەرگ": جگر jegar (.P)، iecur (.L). ریشە؟

جل cıl [ jıl ] - "بەرگ، لیباس": ↑جلک cılk یش دەگوترێ. دە فارسیدا جل col (.P) .دەشێ خزم بێ دەگەلّ Kleid (.G)، cloth (.E)، kleed (.Nl) "جلوبەرگ". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان بە گوێرەی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *klei- <** "پێوەنووسان، چەسپین". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑کراس kıras، ↑خەلّات xekat و ↑خەرگە xerge دەبێ پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ. دوور نییە جلد cîld (.Arb) بە مانای "پێست، چەرم" پێوەندی یان خزمایەتی دەگەلّ ئەو وشانەی سەرەوە هەبێ

.

جلّف cılf [ jılf ] - "هەرزە، سووک": دە ئەسلّدا مەبەست لە وشەکە "لووس"ە. لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەلّ "هەرزە" و پێچێک کە هەرز واتا لووس دەبێ. هەروەها خزمە دەگەلّ ↑شەلف şelıf "ژنی خۆفرۆش" و ↑شەلّفین şelfîn "هەلّەنگوتن، رەت دان، خلیسکان". ئەو وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "خلیسکان، تەڕ و لووس و لیچق بوون". دە زمانی ئاخاوتنی فارسیدا بە منداڵێک کە بەزمگر و بێ ئەدەب بێ، دەلّێن "خودتو لوس نکن" واتا خوت لووس مەکە. هەروەها دە کوردیدا "چەقاوەسوو" [سەر بە کرداری سوانەوە، ساف بوون] بە کەسێک دەگوترێ کە بێشەرم و بێ چاووڕوو بێ. رەنگە وشەی جلّف بۆ کەسایەتی سووک و بێشەرم لەوڕا هاتبێ کە ئەم جۆرە کەسانە لە گوتار و کرداردا زوو "هەلّدەخلیسکێن"، واتا کەسایەتییەکی قورس و قایمیان نییە.

جڵق **cılq** *[ jılq ]* - دەگەڵ "فلْق" دێ. جلق و فلْق cılq û fılq دەرهاتن واتا بە هۆی گوشارەوە پلێشان و ناوسك دەرهاتن. دە فارسیدا جلق celq (P.) بە واتای "دەسپەڕ" دێ. هەروەها دە کوردمادیدا ↑جڵقە cılqe بە مانای "دەنگی قوڕ و لیتە" و ↑جلیق cılîq بە مانای "لیچق" بە کاردێ. مانای هاوبەش دە هەموو وشەکانی سەرەوەدا "لیچق بوون، تەر و لووس بوون، خلیسك بوون"ە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *(s)lei- (IE.)* "لیچق بوون، لووس و خلیسك بوون". جگە لەم وشانە کۆمەڵێك وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە ↑جۆل col "رەوانیی ئاو"، ↑جلە cıle "گیایەگی قەوزەئاسا"، ↑جەللە celle "ریخ، شیاکە"، ↑چلم çılım، ↑چلپاوçılpaw، ↑زەل zel "هەردی تەڕ و شل و خلیسك" و ↑زەلین zelîn "خلیسکان" و↑سل sıl "بڕی پیسایی" [دە بنچینەدا ئەو بڕەی کە لیچقە یان بە خلیسك دەردەچێ] و هتد. بگەڕێینەوە سەر "جڵق و فلْق دەرهاتن" بە مانای ناوسك دەرهاتن. ئەم مانایە لێرەوە پەیدابووە کە ئەوشتانەی ناوسك کە لەکاتی پلێشان دا دەر دێن و بڵاو دەبنەوە، هەموو تەڕ و لووس و لیچقن. وشەی "فلْق"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تەڕ".

جلگا **cılga** *[ jılgā ]* - "جۆرێك ماسی": هەروەها ↑جوری curî یش هەیە کە ئەویش ناوی ماسییەکە. لەوانەیە هەردوو ناوەکە دە بنچینەدا هەریەك بن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑جلە cıle "گیایەکی قەوزەئاسا".

جلوا **cılwa** *[ jılwā ]* - "سیس و ژاکاو": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ schal (G.) "چیر، بێتام"، schal (Nl.) "هیشك، رەق"، skäll (Sw.) "چیر، ترشاو، (زەوی) بێ پێز"، schallow (E.) "تەنك" [دە بنەرەتدا چۆڕاوە، ئاو لەبەر رۆیشتوو]، skellein (Gr.) "هیشك بوون" و skeletos (Gr.) "لەشێك کە تەنیا ئێسکەکانی بە بەرەوە ماوە" [دە بنەڕەتدا واتا هیشك هەڵاتوو]، سەر بە ریشەی < *(s)kel- (IE.)* "هیشك بوون".

جلە1 **cıle 1** *[ jıla ]* - "1- هەشت پێ 2- رەگ و ریشەی دارەبی کە پێش بە ئاو دەگرێ": لە رووی ماناکانی ئەم وشەیە دەروەکەوێ کە جلە بەو شتانە گوتراوە کە لێك دەهاڵێن، گرێ دەخۆن و تێك دەچرژێن. بەم پێیە وشەکە دەبێ خزم بێ دەگەڵ Schlange (G.) "مار" و Schlinge (G.) "قڵفە"، سەر بە ریشەی < *slenk- (IE.)* "با دران، لێکهاڵان". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑چەلومل çelumıl هەیە بە مانای "بەڵای دەست هەڵنەگر" [چەل + مل]. کەرتی یەکەمی وشەکە دەگەڵ جلە دە بنچینەدا هەریەکە و لەوانەیە مەبەست "هەشت پێ" بووبێ کە ئەگەرشتێکی بەرچەنگ کەوت، ئیتر ئەو شتە لێی رزگار نابێ. کەرتی دووەمیش دەشێ "مار" بووبێ، کە ئەویش لە دەوری چێشتەی خۆی دەهاڵێ و رێگەی دەرباز بوونی پێ نادا.

جلە2 **cıle 2** *[ jıla ]* - "گیایەکە وەك قەوزە سەر ئاو دەتەنێتەوە": دە فارسیدا جل وزغ jole vazeġ و جلبك jolbak (P.). دە ئیسلەندی کۆندا بە قەوزە گوتراوە sly (OIs.). دە ئەڵمانی و ئینگلیزی کۆندا slio (OG.) و sliw (OE.) ناوی جۆرە ماسییەك بووە کە لەو چۆم و ئاوانەدا ژیاوە کە بنیان لەجن بووە. بەراوردی ئەم وشانەی دوایی بکە دەگەڵ وشە کوردمادییەکانی ↑جلگا cılga "جۆرێك ماسی" و هەروەها ↑جوری curî کە ئەویش ناوی ماسییەکە. هەموو ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *(s)lei- (IE.)* "تەڕ و لیچق بوون".

جڵەو **cılew** *[ jılaw ]* - "هەوسار": دە زمانی فارسیدا جلو jelou (P.) بە مانای"پێش، پێشەوە" و جلو گرفتن jelou gereftan (P.) بە مانای "پێش گرتن، پێش پێگرتن" دێ. ئاشکرایە کە دە زمانی فارسیدا مانای وشەکە گۆڕانی بەسەرداهاتووە، چونکە "هەوسار گرتن" دەتوانێ ماناکەی بۆ "پێش گرتن" بگۆڕدرێ، بەڵام پێچەوانەکەی کەمتر رێی تێ دەچێ. دە زمانی کوردمادیدا جڵەو کردن، جڵەو بەر دان، جڵەو شل کردنەوە هەیە و ئەمانە نیشان دەدەن کە مەبەست لە جڵەو هەمان هەوسارە. جگە لەمە تیروانینی ئێتیمۆلۆژیکیش ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێ. جڵەو پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەیە:

1- یان ↑جەلە cele بە مانای "ماڵاتی بە زنجیر تیکخراو" و دە بنچینەدا بە مانای "بەن، پەت، گوریس".
2- یان Schleife ‹G.›، slouf ‹OG.› "قڵفە، بەن یان پەتی گرێدراو". وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **< ‹IE.› *sleu-** "خزین، خلیسکان". ئەگەر ئەم پێکگرتنە راست بێ، جڵەو دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قلفە qılfe یان ↑کەڵاف kelaf. هەوسار یان جڵەو لە راستیدا هەر ئەو "قڵفە"یە کە دەیخەنە ملی بارەبەر.
[تێبینی: فۆتیمی w / v دە وشە کوردمادی و فارسیدا زۆر جار بەرانبەری f دەوەستێ دە وشە ژێرمەنییەکاندا، بۆ نموونە جدەو cıdew دە کوردمادیدا و steif "رەق، سفت" دە ئەڵمانیدا، قەڵەو qelewدە کوردمادیدا و Kraft "هێز" دە ئەڵمانیدا].
جلیت **cılît** ‹*jılīt*› - "پلاری سوارکاران لە گەمەی جلیتیندا": جریت cırît یش دەگوترێ. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑جەل cel "چەڵاک، داری گوێز تەکاندن".
جمک **cımık** ‹*jımık*› - "دووانە":
1- ئەم وشەیە لەلایەکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ geminus ‹L.› "جمک".
2- لەلایەکی دیکەوە وشەکە بە باشی دەگەڵ ↑جڤین cıvîn سەر بە ریشەی -sem بە مانای "کۆ بوونەوە، پێکەوەبوون، یەکخستن" رێک دەکەوێ. لەم تێروانینەوە "جمک" ئەو دوو منداڵەن کە پێکەوە لە دایک بوون بە وتەیەکی دیکە جمک بوون واتا پێکەوە بوون.
جمگە **cımge** ‹*jımga*› - "شوێنی نووشتانەوەی ئێسکەکانی لەش": ↑جومگە cumge ش دەگوترێ. جم + گە cım + ge. لە کرداری ↑جمین cımîn وەرگیراوە بە مانای "جوولان، بزوان". جمگە ئەو شوێنەیە کە تێیدا ئێسکەکانی لەش دەجمن یان بەهۆی جمگەوە ئێسکەکان دەجووڵێنەوە.
جمە **cıme** ‹*cıma*› - "جووڵە و تەکان": سەر بەکرداری ↑جمین cımîn "جووڵان، تەکان خواردن".
[تێبینی: دە فەرهەنگی "هەنبانە بۆرینە"دا "جم" بە مانای "بزاو، جووڵە" مانا کراوەتەوە، کەچی لە مانا کردنەوەی "جمە"دا نووسراوە: "کۆمەڵ و پڕایی خەڵک (بازاڕەکە جمەی دێت)". دیارە هەردووک وشە یەک مانایان هەیە و ئەویش "بزاو و جووڵە"یە. کاتێک دەگوترێ "بازاڕەکەی جمەی دێت"، مەبەستی ئەسڵی "کۆمەڵ وپڕایی خەڵک" نییە، بەڵکوو ئەو بزاو و جووڵەیە کە ئاپۆرەی خەڵک دروستی دەکا. دە فارسیدا دەگوترێ جنب و جوش jonb o jūš. "جنب" شێوەی فارسی"جم"ە].
جمین **cımîn** ‹ *jımīn* › - "بزووتن، جووڵان": ↑جڤین² cıvîn یش دەگوترێ و ئەمەیان دەبێ شێوەی کۆنتری وشەکە بێ. دە فارسیدا جنبیدن jonbīdan ‹P.›. خزمە دەگەڵ schwingen ‹G.›، swing ‹E.›، swingan ‹OE.› "جوڵانەوە، لەرانەوە"، سەر بە ریشەی **< ‹IE.› *suen-** "چەمینەوە، جوولانەوە، خولانەوە".
جندۆکە **cındoke** ‹ *jındoka* › - "بوونەوەرێکی ئەفسانەیی": جن + د + ئۆکە cın + d + oke. جنۆکە cınoke ش دەگوترێ، واتا بەبێ ناوئاخنی d. دە فارسیدا جن jenn ‹P.›. وشەکە دە زمانی عەرەبیشدا بە شێوەی جن cînn ‹Arb.› هەیە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ genius ‹L.› "رووحی پارێزەر" [دواتر رووحی بەدیهێنەر]. وشەی génie ‹F.› بە واتای "بلیمەت" بۆ ئەم وشە لاتینییە دەگەڕێتەوە. دە زمانی کوردمادیشدا وشەکە جۆرێک لە مانای زۆرزانی و زرینگی تێدایە.
جندە **cınde** ‹ *jında* › - "ژنی خراپە": دە فارسیدا جندە jende ‹P.›. هاوریشەیە دەگەڵ Schande ‹G.›، scanta ‹OG.›، skande ‹OF.›، skanda ‹Gt.› "نەنگێ، شوورەیی"، سەر بە ریشەی **< ‹IE.› *(s)kam-** "داپۆشین".
[تێبینی: لەباری پێوەندی "جندە" دەگەڵ چەمکی "شوورەیی"، هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "قەحبە" و "قەباحەت" دە زمانی عەرەبیدا].

جندی **cındî** [ *jındī* ] - "1-ئازا، بەکار 2- جوان، سپەهی 3- باش، چاك": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ sinnen (G.)، sinnan (OG.)، sinnan (OE.)، "بیر خستنە سەر شتێك، ئارەزوو کردن ، تەقەلا کردن، چوون بەرەو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑شاندن şandn و ↑جادە cade سەر بە کرداری ***sent-*** **(IE.)** "ڕۆیشتن، چوون، سەفەر کردن". هەر لەم ریشەوە و لەپێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا ئەم وشانەی خوارەوە پەیدا بوون: Sinn (G.) "مانا، مەفهووم، دەرك"، sensus (L.) "هەست، دەرك، تێگەیشتن"، sentire (L.) "هەست کردن، تێگەیشتن"، sintéti (Lit.) "بیر کردنەوە".

جنقین **cınqin** [ *jınqīn* ] - "راپەڕین لە خەو": جنقان cınqan و جنکان cınkan یش دەگوترێن [هەروەها ڤەجنقین، ڤەجنقان]. بنەوشەی -cın بەشێوەی -çen دە کرداری چەنین [↑راچەنین raçenīn (çenīn + ra)] دا بەدی دەکرێ.

[تێبینی: فۆتیمی q دە وشەی "جنقین"دا پاشگری جەخت کردنە و دە هێندێك کرداری کوردمادیدا خۆ دەردەخا، وەك هەڵبزووقین، هەڵپرووزقان، هەڵپرسقاندن، مرقاندن، مەرچقاندن و هتد. ئەم پاشگرە هەروەها بە وێنەی k و j دەبیندرێ، وەك ئالۆزکان، بزرکان، تریسکان، جنکان، پڕژان، چرژان، مەرژین، کەرمژین و هتد].

جنك **cınık** [ *jınık* ] - "شمەك، جلوبەرگ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑چنین1 cinîn "تەنین، هۆنینەوە، دروون".

جنگ **cıng** [ *jıng* ] - "جم، بزاڤ": خزمە دەگەڵ ↑جنقین cınqin "راپەڕین لە خەو" و ↑چندك *çındık* "وەزاق دان، هەڵبەزین". دواتر خزمە دەگەڵ ↑جەنگ ceng "شەڕ".

جنین **cınîn** [ *jınīn* ] - "بڕین، ورد کردن": ئەنجنین encınîn ش دەگوترێ. [پێشگری ئەن + جنین ]. دە فارسیدا انجیدن anjīdan. خزمە دەگەڵ schneiden (G.)، snidan (OG.)، snitan (OE.)، snita (OF.) "بڕین، لەت کردن"، سەر بە ریشەی **< *sneit-*** **(IE.)** "جنین، بڕین". chinatti (OIn.) "قەڵشاندن، لەت کردن" لەم ریشەوە هاتووە.

جتیو **cınew** [ *jınew* ] - "ناو و نیتکەی خراپ لێنان": دە فارسیدا دشنام došnām (P.). دە بنەڕەتدا پێك هاتووە لە دوو کەرتی دوژ/ دوج + ناو (تیو). کەرتی دوژ/ دوج duj /duc خزمە دەگەڵ ↑تووش tûş، ↑دژ dıj، ↑دزێیو dızew و ↑ دوژمن dujmın. دە بنچینەدا بە مانای "بەد، ناحەز، بەدکار" هاتووە. کەرتی دووەم وشەی ناو/ تیو naw / new ە. بەم جۆرە تێکڕای وشەکە دەبێتە "ناوی خراپ، ناوی دزێو". دە وشە کوردمادییەکەدا فۆتیمی d دە بەرایی وشەکەدا سواوەتەوە.

جوان1 **juwan** [ *juwān* ] - "رند، خۆشیك": خزمە دەگەڵ schön (G.)، sconi (OG.)، schoon (Nl.) "جوان"، sheeny (E.) "درەوشاوە"، سەر بە ریشەی **< *(s)keu-*** **(IE.)** "سەرنج دان، چاو لەسەر بوون". جوان دە بنەڕەتدا واتا شتێك کە مرۆڤ حەز لە دیتنی دەکا. دە زمانی کوردمادیدا ↑شێن şên یش بە مانای "جوان" دێ، کە شێوەیەکی دیکەی ئەم وشەیە نیشان دەدا. لەوانەیە ↑شەنگ şeng یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دە زمانی فارسیدا آذین āzīn (P.) هەیە بە مانای "جوان کردن، رازانەوە". ئەم وشە فارسییە دەبێ پێك هاتبێ لە ā + zīn. کەرتی یەکەم پێشگرە و کەرتی دووەمیش خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی سەرەوە. هەروەها دە زمانی عەرەبیدا زینة zīna(t) (Arb.) بە مانای "جوانی و رازاوەیی" دێ کە دەشێ لەم وشانەی سەرەوە وەرگیرابێ.

جوان2 **juwan** [ *juwān* ] - "لاو": دە فارسیدا جوان jawān (P.). شێوەیەکی دیکە لە ↑جەوان cewan.

جوێ **cuwe** - "جودا": ↑جیا cîya و ↑جودا *cuda* ش دەگوترێ. دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا سوا sawā (P.) هەر بەم مانایە بەکار دێ. .

جودا **cuda** [ *judā* ] - "لێك هەڵبڕاو": دە فارسیدا جدا jodā (P.). خزمە دەگەڵ scheiden (G.)، skeidan (OG.)، sceadan (OE.)، shed (E.) "جوداکردن"، سەر بە ریشەی **< ** skei-*** **(IE.)** "جودا کردن،

لێکردنەوە، قەڵشاندن، لەت کردن". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی لەم خێزانەدا خۆیان دەبینەوە، کە ئاماژە بە لێک دابڕان و جوێ بوونەوە دەکەن، وەک ↑جگە cıge، ↑جۆگە coge [جوی jūy (P.)]، ↑جوێ coe [جیا cîya]، ↑شێ şê [شێ کردنەوە]، ↑ژێ je [سەر ژێ کردن] و هتد.

[تێبینی 1: دوو فۆتیمی -sk، کە دە بەرایی ریشەکەی سەرەوەدا هەیە، دە وشە کوردییەکاندا گۆڕاوە بە c یان ş. دە زۆرینەی وشەکانی زمانی ئەڵمانیدا بووەتە ş. فۆتیمی ş دە زمانی ئەڵمانیدا بە سێ پیتی sch دەنووسرێ، واتا ئەم سێ پیتە پێکەوە فۆتیمی ş دەردەبڕن. تێبینی 2: جگە لەم ریشەی سەرەوە ریشەیەکی دیکەی هیندوئەورووپی هەیە، واتا *sek- (IE.) کە ئەویش هەر ئەو مانایەی سەرەوە دەبەخشێ و ژمارەیەک وشەی کوردمادی و ژێرمەنی لەم ریشەوە هاتوون، وەک "چەقۆ"، "چاک"، "شاقەل"، "شەق" [شەق کردن، شەق و شڕ] و هتد. هەروەها ژمارەیەک وشەی کوردمادی هەیە کە هاسان نییە ساخیان بکەینەوە سەر بە کام ریشە لەم دوو ریشەیەی سەرەوەن، وەک *شاش* "لێک جودا"، *زام* ["زخم" بە فارسی]، *شۆم* ["شخم" بە فارسی]، جۆم "کەندال، ئاودڕ" و هتد. لەو باوەڕە دام کە ئەم دوو ریشەیە خۆیان پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و دەشێ دواجار یەک ریشە بووبن].

**جوڕنە curne** *[ curna ]* - "حەوزۆکەی گەرماو": ↑کوڕان kuran یش دەگوترێ. وشەکە لە کۆندا "کەڤران kevran، گەڤران gevran" بووە و هەر دوو وشەکەی سەرەوەی گۆڕدراوی ئەم وشە کۆنەن [کەڤران ← کوڕان ← جوڕنە]، خزمە دەگەڵ دەیان وشەیە کە ژمارەیەکیان لەژێر ↑کون *kun* و ↑جەواڵ cewal [جواڵ cuwal، گواڵە guwale]دا ئاماژەیان پێ کراوە.

**جوری curî** *[ jurī ]* - "ناوی ماسییەکە": خزمە دەگەڵ ↑جلە2 *cıle 2* "گیایەکە وەک قەوزە سەر ئاو دەتەتیتەوە" و ↑جلگا cılga "جۆرێک ماسی".

**جوغز cuğız** *[ juğız ]* - "هێڵێک کە بە دەوری شتێکدا دەکێشرێ": جەغز ceğız یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای"بەستنەوە، لێکبەستن، یەکخستن". جەغز یان جوغز بەو هێڵە گوتراوە کە بەدەوری شتێکدا کێشراوە، واتا ئەو هێڵەی کە دەگاتەوە یەکتر [مەرج نییە هێڵەکە تەواو بازنەیی بێ]. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑جۆخین coxîn "خۆیان، کۆی خەرمان".

**جول cul** *[ jul ]* - "رەوانیی ئاو":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑جلق cılıq سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەڕ، لیچق، خلیسک".

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شل şıl "رەوان".

**جومگە cumge** *[ jumga ]* - ↑جمگە cımge.

**جوو cu** *[ jū ]* - "نەتەوەی یەهوود": Jude (G.)، jew (E.)، یهود yehud (Arb.). ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی هۆزی juda.

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا جوولەکە (جوو+ لەکە) ش دەگوترێ. پاشگری "-لەکە" پاشگری گچکاندنە و بە مەبەستی نزماندن و داشکاندنیش بەکاردەهێنرێ. دیارە ئەم پاشگرە بە شێوەیەکی ناڕەوا لەژێر کارتێکەری شۆڤینیزمی عەرەبی- ئایینیدا خراوەتە پاڵ ناوی ئەم نەتەوەیە یاخود ئەو ئایینەوە. بۆیە پێویستە و تکایە با ئەو پاشگرە ئیتر وەلا بنرێ و لەمە بەدواوە تەنیا بگوترێ "نەتەوەی جوو"، "جووەکان" یان "جوویەکان"، هەر وەک چۆن دەگوترێ "عەرەبەکان" یان "نەتەوەی عەرەب" یان "فەلەستینییەکان"].

**جووت cut [1]** *[ jūt ]* - "هاوتا، دوودانە پێکەوە": جفت joft (P.)، yuxt(ak) (Pl.)، yuxta- (Av.). دەشێ ئەم وشەیە لە ریشەی **(IE.) *jeu- >** "لێکبەستن، یەکخستن"ەوە هاتبێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی yōg (Pl.) کە دە پەهلەویدا و هەروەها دە زۆر لە زمانە هیندوئەورووپییەکانی ئەمرۆشدا بە مانای "نیر" دێ، واتا ئامێری یەکخستن و جووت کردنی دوو گاجووت. لەم تێڕوانینەوە جووت بوون لە سەرەتا دا دەبێ بە مانای"یەکبوون، بەیەکەوە بەسترانەوە، کەوتنە پاڵ یەکدی" بەکارهاتبێ و ئەوجار لەمەوە جووت

مانای "هاوتا"ی وەرگرتبێ. بەم جۆرە جووت دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑ئوخت uxt، ↑جوغز cuġız یان جەغز، ↑ئەوك ewk، ↑یەخە yexe یان ئێخە، ↑جۆخین coxîn "کۆی خەرمان"، ↑جووق cuq "دەستە، کۆمەڵ" و هتد.

**جووت[2] cut** *[ jūt ]* - جووت کردنی دەرگا واتا پێوەدانی یا خود داخستنی دەرگا. بروانە ↑چەفت2 çeft. وشەی چەفت لە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا گۆڕاوە و بووەتە "جووت".

**جووجە cuce** *[ jūja ]* - "بێچووی مەل": دە فارسیدا jūje (P.). خزمە دەگەڵ küken (G.)، chicken (E.)، kuiken (Nl.) "جووجە، جووجك". ریشەی وشەکە دەگەڕێتەوە سەر لاسا کردنەوەی دەنگی جووجکە [جیکە جیك یان جووکە جووك].

**جووشك cûşık** *[ jūšık ]* - "ئاژەڵێکی دڕکن": ژیشك jîşık، ژووشك jûşık، ژووژوو juju و ژیژی jîjî یش دەگوترێن. پێك هاتووە لە بنەوشەی جوو/ ژوو/ ژی -cu- / ju- / jî + پاشگری ك ık. خزمە دەگەڵ Igel (G.)، igil (OG.)، igul (ON.)، echinos (Gr.)، ёž (Rus.)، ozni (Arm.)، ežys (Lit.)، ježĭ (OIn.) و (OSl.) "ژووشك"، سەر بە ریشەی **> *(IE.) *eĝhi-*** "مار، کرم". دە بنەڕەتدا ئەم ئاژەڵە وەك "مارخۆر، کرم خۆر" ناودێرکراوە. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بنەوشەکە پاشگری -ol /- el وەرگرتووە و دە زمانی کوردمادیشدا پاشگری ık. هەروەها پێوەندی هەیە بە ↑حەزیا ȟezya و ↑زهار zıhar و↑ئەژدیها ejdîha کە ئەوانەش بە مانای "ماری گەورە" دێن.

**جووق cuq** *[ jūq ]* - "دەستە، کۆمەڵ": دە فارسیدا جوخە jūxe (P.). خزمە دەگەڵ ↑جۆخین coxîn "کۆمای گیای گیرەکراو".

**جووقە cuqe** *[ jūqa ]* - "هەست و خوست" [جووقەوار واتا گیانلەبەر]. خزمە دەگەڵ ↑ژین jîn و ↑جیو cîw "ژین، بوون". هەڵی سەنگینە دەگەڵ kvick (Sw.)، keck (G.)، quick (E.) "خێرا، چوست و چالاك" [دە بنەڕەتدا بە مانای "زیندوو، سەرزیندوو"]، سەر بە ریشەی **> *(IE.) *guei-*** "ژین، ژیان".

**جووکەنە cukene** *[ jūkana ]* - "گیاندان، گیانەلا": جوو(ك) + کەنە cu(k) + kene. "جوو" یان "جووك" شێوەیەکی دیکە لە ↑جووقە cuqe، سەر بە ریشەی **> *(IE.) *guei-*** "ژین، ژیان، جان، گیان". دە کوردمادیدا گیانکەنیشك gîyankenîşk یش دەگوترێ. دە فارسیدا جان کندن jān kandan (P.).

**جووکاندن cukandın** *[ jūkāndın ]* - "دەنگێ لێوە هاتنی جووجکە": جووکەجووك کردن cukecuk یش دەگوترێ. دە فارسیدا جیك جیك jīkjīk (P.). خزمە دەگەڵ ↑جووجە cuce [جووجك]. بێچووەمەل بەهۆی جووکەجووك کردنەوە ناوی "جووجە"ی لەسەر دانراوە.

**جووڵان(ەوە) culan(ewe)** *[ jūlān(awa) ]* - "بزوان":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی **> *(IE.) *kuel-*** "سووڕان، بەم لا و ئەولادا جوولانەوە". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کۆڵ kol "شان و مل".

2- لەوانەیە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ cillere (L.) "جووڵاندن". ریشە؟

3- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑چلّیان[1] çılyan "لێدان، تەکان، هەژان" [بۆ وێنە کاتێك برینێکی تازە چلّان لێ دەدا یان دەچلّێ].

**جۆ co** *[ jo ]* - "جۆرێك دانەوێڵە": جە ceh و جەو cew یش دەگوترێن. جو jou (P.)، جەو cew (Pahl.)، yava (Av.). [دە شێوەزارەکانی زمانی کوردمادیدا ئەم وشەیە بە شێوەی ↑یەو yew یش دە بینرێ]. خزمە دەگەڵ Hafer (G.)، haver (Nl.)، havre (Sw.) "جەو". وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **> *(IE.) *habra-*** "بزن". مەبەست لە وشەکە سەرەتا "گیابزن" بوو، واتا گیایەك کە بزن پێی خۆشە.

**جۆخین coxîn** *[ joxīn ]* - "خۆیان، کلۆشی گێرەکراوی کۆمکراو": ئەم وشەیە و هەروەها وشەکانی ↑جوغز/ جەغز cuġız / ceġız "هێڵی بازنەیی"، ↑جێز cez "کۆی خەرمان"، ↑جزقە cızqe "زەنگەتە ترێ"، ↑جووق cuq "کۆمەڵ، دەستە" [دە فارسیدا جوخە jūxe (P.)] سەر بەیەك خێزانن. ئەم وشانە دە چەمکی

"یەکبوون، یەکخستن، خڕ بوونەوە، بەسترانەوە"دا هاوبەشن و ئەو مانایەش بە تەواوی دەگەڵ ریشەیەکی هیندوئەورووپی یەك دەگرێتەوە کە بریتییە لە ریشەی (IE.) *jeu- > "بەستنەوە، لێکبەستن، یەکخستن". وشەکانی iungere (L.) "لێکبەستن"، yóga-h (OIn.) "بەستنەوە، لێکبەستن"، junta (Sp.) "جڤات، کۆ بوونەوە" [دواتر هەروەها بە مانای "خونتا"ی لەشکری]، Joch (G.) و یوغ yūġ (P.) و هاوشێوەکانی دە زۆرێك لە زمانە هنیدوئەورووپییەکاندا بە مانای "نیر" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. "نیر" ئەو شتەیە کە دوو گاجووت تێك دەخات و لێکیان دەبەستێ. ئەم وشەیە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی دیکەش وەك ↑جووت cut، ↑ئوخت uxıt، ↑ئەوك ewık، ↑ئاوقان awqan، ↑یەخە yexe، ↑یەغنی yeġnî "گیشەی گیا یان گەنم و جۆ" و هتد. شیاوی سەرنجە وشەی ↑خۆیان xoyan کە هاوواتای جۆخینە، دەشێ شێوەیەکی دیکە لە وشەی "جۆخین" بێ. گوڕانەکە دەبێ بەم شێوەیە بووبێ: یۆخان [شێوەی کۆنتری جۆخین] ← خۆیان [جێگۆڕکێی دوو فۆتیمی y و x].

[تێبینی: هەر سەبارەت بە پێوەندی "جۆخین"ی خەرمان دەگەڵ جووق cuq "کۆمەڵ، دەستە" - جوخە jūxe (P.)- هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی دیکەی زمانی کوردمادی کە ئەوانیش دەگەڵ یەکتر خزمن و هەمان پێوەندی سەرەوە نیشان دەدەن. ئەم دوو وشەیە بریتین لە "گیشە" گیا و "قۆشەن" واتا لەشکر].

**جۆر cor** [ *jor* ] - "شێوە، نەوع، چەشن": جوور cur و ↑گۆر gor یش دەگوترێ. جور jūr (P.). دە زمانی کوردمادیدا ↑گۆرین gorîn  هەیە بە مانای "فڵان" [کابرای گۆرین واتا فڵانە کابرا، کابرایەکی ئەوهایی]. هەروەها ل گۆر lıgor یان بەگوێرە beguwerey دەگوترێ کە ئەمەش لەوانەیە پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. کاتێك دەگوترێ "ل گۆر ئەم نووچەیە" یان "بەگوێرەی ئەم هەواڵە"، دە راستیدا ئاماژە کردنە بە جۆرێك لە جۆرەکانی هەواڵەکە، یان ئاخێوەر دەیهەوێ بڵێ ئەوجۆرەی هەواڵەکە نیشان دەدا. ئەم وشەیە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Sorte (G.) "جۆر، چەشن". وشە ئەڵمانییەکە لەرێگەی زمانی فەرانسەیییەوە دەچێتەوە سەر sors (sortis) (L.) "جێگە و پێگە، ریز" و دواتر "جۆر، شێوە". وشەکە خزمە دەگەڵ series (L.) "ریز، تەرتیب، ریزبەندی" و eírein (Gr.) "بەدوای یەکدا ریز بوون"، con-sors (L.) "هاوسەر، هاوچەشن"، in-serere (L.) "تێکخستنەوە"، سەر بە ریشەی (IE.) *ser- > "تێکخستنەوە، بەدوای یەکدا ریز بوون". بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە لە مانای "ریز، ریزبەندی، جێگە و پێگە"وە مانای "جۆر، چەشن، شێوە" سەری هەڵداوە و لێرەدا مەبەست نیشان دانی وێکچوون و هاوشێوەیی ئەو شتانە بوون کە لە یەك ریز و ئاستدا بوون، واتا ئەو شتانە وەك یەك "جۆر" لەبەر چاو گیراون. وشەی سرة sira (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و وێ دەچێ وشەیەکی وەرگیراو بێ. وشە کوردمادییەکە یان لە زمانی لاتینی وەرگیراوە یان لەوانەیە راستەخۆ لە ریشەکەی سەرەوە پەیدا بووبێ. هەروەها وشەی وەرگیراوی سێریاڵ seryal پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا کردارەکانی جۆر کردن، جۆر بوون و جۆر هاتنەوە مانای ریشەکەی سەرەوە بەدەستەوە دەدەن. کاتێك دوو یان چەند شت [کەرت، پاژ] وێك بچن و هاوشێوە بن، تێك دەخرێنەوە یان دەچنە ریزێك [ریزبەندییەك]ەوە، بەڵام ئەگەر ناتەبا بن یان پێوەندییان بەیەکەوە نەبێ، ناتوانرێ تێك بخرێنەوە و بە وتەیەکی دیکە دەگەڵ یەکتر جۆر نایەنەوە."جۆر" خزمە دەگەڵ ↑جەڵە cele [جەلەکردن واتا "تێکخستنی ماڵات"].

**جۆڕ cor** [ *jor* ] - "بن جلی پووش تێئاخنراوی بارەبەر": خزمە دەگەڵ ↑جل cıl.

**جۆرك(ە) cork(e)** [ *jorka* ] - "توورەکە": خزمە دەگەڵ ↑جەواڵ cewal.

**جۆریان coryan** [ *joryān* ] - "گۆڕان": شێوەیەکی دیکە لە ↑گۆڕان goran. هەروەها بڕوانە ↑جۆر *cor*.

**جۆشان coşan** [ *jošān* ] - "کوڵان": دە فارسیدا جوشیدن jūšīdan (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- sieden (G.)، siodan (OG.)، sjuda (Sw.)، seethe (E.) "جۆشان، کوڵان". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە، بەڵام بەراورد دەکرێ دەگەڵ siausti (Lit.) "هەڵچوون، قەڵس بوون" و sauts (Gt.) "ئەو شتەی وەک قوربانی دەکوڵێندرێ". لەوانەیە وشەی↑ زەواد zewad پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.
2- jesan (OG.) "هەڵاتن، تەخمیر بوون"، yasyati (OIn.) "کوڵان، جۆشان"، zéō (Gr.) "دەکوڵێنم"، ias (Kymr.) "کوڵاندن، جۆشاندن"، سەر بە ریشەی < *ies- (IE.) "کوڵان، جۆشان".

جۆگە **coge** [ *joga* ] - "کەنداڵ، ئاودڕ": جوی jūy (P.). خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی کە ئاماژە بە لێک دابڕان و جوێ بوونەوە دەکەن، وەک ↑جوێ coe [جیا cîya]، ↑شێ şê [شێ کردنەوە، شی şî کردنەوە]، ↑ژێ je [سەر ژێ کردن]، ↑جەو cew "برینگ" و ↑جودا *cuda*.

جۆل **col** [ *jol* ] - "بەشێک لە مێگەڵ": وشەکە دە بچینەدا بە مانای "بەشێک یان دەستەیەک لە کۆمەڵێک" بەکار هاتووە و دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی < *(s)kel- (IE.) "قەلشاندن، بڕین، لێک جودا کردنەوە" و دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑چاڵ çal "قوڵکە".

[تێبینی: چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "بەشێک لە مێگەڵ" یان "دەستەیەک ئاژەڵ" بەکار دێن کە ریشەکانیان مانایەکی وەک ئەو ریشەی سەرەوەی هەیە، وەک "کەرک"، "کەرت(کە)"، "ران"، "شار" (شارەمێروو)].

جۆڵا **cola** [ *jolā* ] - "تەونگەر": جیلا cîla ش دەگوترێ [جۆڵایی، جیلایی]. رەنگەی ئەمەی دوایی شێوەی کۆنتری وشەکە بێ. خزمە دەگەڵ ↑جاڵ cal "پەت، بەن، ریس".

جۆڵانە **colane** [ *jolāna* ] - "دیلەکانی": دەچێتەوە سەر جووڵە cule و ↑جووڵان culan.

جۆم **com** [ *jom* ] - "ئاودڕ، کەنداڵ": خزمە دەگەڵ ↑زام zam "برین" و ↑شۆم şom [هەردی کێڵدراو واتا "لێک جیاکراو، بڕ لێدراو"] و↑زام "برین". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑جودا *cuda*.

[تێبینی: دە زمانی ئینگلیزیشدا shore (E.) "رۆخی چەم و دەریا" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای بڕین و مەبەست سەرەتا ئەوە بووە کە ئەو شوێنە بەهۆی رەوت و تەوژمی ئاو بڕدراوە].

جۆمە **come** [ *joma* ] - "کراس": خزمە دەگەڵ ↑جامە came.

جۆنگ1 **cong 1** [ *jong* ] - "پێ لەجێ چوونی وڵاخ": خزمە دەگەڵ hinken (G.) و (Nl.)، hincian (OE.)، skinka (Sw)، skázein (Gr.) "شەلین"، سەر بە ریشەی < *(s)keng- (IE.) "خوار وخێچ، لار، چەوێل".

جۆنگ2 **cong 2** [ *jong* ] - دەگەڵ "جڕ" دێ [جڕ و جۆنگ cır û cong واتا جڕ و جانەوەر]. پێوەندی هەیە بە جان can [گیان gîyan].

جە **ce** [ *ja* ] - "پرێپۆزیسیۆتیکە": شێوەیەکی دیکە لە↑ژ jı. [ژ مالا خۆ دەرکەتم].

جەبە **cebe** [ *jaba* ] - "1- سڵ، قوشقی 2- یاغی، سەربزێو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ şep دا باس کراون. ئەو وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *skeu(h)- (IE.) "هاویشتن، پاڵنان، ڕادان، دەرپەڕین، دەرپەڕاندن".

[تێبینی: "جەبە" بە مانای یاغی لەباری ماناوە هەڵسەنگینە دەگەڵ "جەردە". جەردە دە ئەسڵدا "تەردە" یان "تەریدە" بووە واتا کەسێکی "تەرە"، تارێنراو، دوورکەوتە و دوورخراو لە کۆمەڵ. وشەکانی "تەرە"، "تەرا" [تاک و تەرا]، "ترۆ" [ترۆ کردن]، "تاراندن" [رەواندن، دەرپەڕاندن] خزمن دەگەڵ treiben (G.) "تاراندن، دوور کردنەوەی بە زۆر، رەواندن، بەرەو پێش بردن" و vertrieben "دەرکردن و دەرپەڕاندنی خەڵک لە ماڵ و حاڵی خویان].

جەبەش **cebeş** [ *jabaš* ] - "شووتی، گندۆرە": ↑زەبەش zebeş.

جەحنین **ceħnîn** [ *caħnīn* ] - "تووڕە بوون، رق هەستان": دە زمانی فارسیدا ژیان žīyān (P.) هەیە بە مانای "تووڕە، تۆسن". ئەم وشەیە دە زمانی فارسی ئەمڕۆدا تەنیا دەگەڵ وشەی "شێر" بەکار دێ و دەگوترێ شیر ژیان šīr e žīyān (P.)، واتا "شێری تووڕە و هورووژاو". هەروەها وشەیەکی دیکەی

کوردمادی هەیە کە بە چەند شێوە بەرچاو دەکەوێ، واتا ↑سێهرا sehra "قەڵس، تووڕە"، ↑جەهر cehır "قەڵسی، تووڕەیی" و ↑دەهری dehrî "زۆر تووڕە". هەروەها دوو وشەی دیکەش پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە کە بریتین لە ↑قار qar "1- تووڕەیی 2- خەم" و ↑گۆڕین[2] gorîn [کۆنتر: قهرین qehrîn، گەهرین gehrîn] "زوێر بوون، زیز بوون"، [لە یەکتر گۆڕین واتا زوێر بوون و قسە نەکردن یان لەیەکتر تووڕە بوون و قسە نەکردن]. دەشێ لەناو ئەم وشانەدا سێهرا sehra شێوەی کۆنتری وشەکە نیشان بدا و سەرجەم وشەکان خزم بن دەگەڵ ↑جەخار1 *cexar* "کەسەر، ئێش و ئازار"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "ئێش، ئازار". وا پێ دەچێ کە لە کۆندا کردارێکی بنەڕەتی هەبووبێ لە چەشنی "*سە(ه)ران se(h)ran*" کە دواتر چەندین گۆڕانی بەسەردا هاتبێ و گشت ئەو وشانەی لێ پەیدا بووبێ.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "ئێش و ئازار" و "تووڕە بوون" لەم وشانەی خوارەوەشدا بەدی دەکرێ:
*ئازار* "ئێش"، *ئاژر* "تووڕە" و *غەزرین* "تووڕە بوون"].

**جەخار1 cexar** [ *jaxār* ] - "کەسەر، ئێش و ئازار": جخار cıxar و جغار cıġar یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی خوارەوە:

1- سوک sūk (P.) [یان سوگ sūg] "خەم، ماتەم" و سوگوار sūgwār (P.) "ماتەمبار، تازیەدار". دە زمانی کوردمادیدا ↑جەحنین ceħnîn هەیە بە مانای "تووڕە بوون، رک هەستان". ئەم وشەیەش دەشێ پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ و پێوەندی هەبێ بە ریشەی هیندوئەورووپی ***sai- > (IE.)*** "ئێش و ئازار". هێندێک وشەی ئەورووپی لەم ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە، وەک sēre (MG.) "بەژان و ئێش، توند، سامناک"، sēro (OG.) و (OE.) "بە ژان و ئێش"، sēr (OG.)، zeer (Nl.)، sore (E.)، sar (Sw.) "زام، برین"، sair (Gt.) "ئێش و ئازار"، saevus (L.) "تووڕە، تۆقێنەر، سامناک"، sāeth (OIr.) "نەخۆشی، ئازار". لەوانەیە دە زمانی کوردمادیدا ↑ناسۆر nasor یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ [نا + سۆر ؟].

2- ↑زەخت zext و ↑جەخت cext بە مانای "گوشار، سەختی، تەوژم".

**جەخار2 cexar** [ *jaxār* ] - "ساتۆڕ": دەچێتەوە سەر ریشەی ***(s)ker- > (IE.)*** "بڕین، لەت کردن، جودا کردن" و دەبێتە خزم بۆ وێنە دەگەڵ ↑کێرد kerd.

**جەخت cexıt** [ *jaxıt* ] - "تەئکید، پێداگری": خزمە دەگەڵ ↑زەخت zext "گوشار، زۆر، پاڵەپەستۆ".

**جەڕ cer** [ *jar* ] - دەگەڵ "مەنگەنە" دی [جەڕ و مەنگەنە cer u mengene]. "ئامرازی توندکردنی کتێب بۆ بەرگ تێگرتن". لەجەرو مەنگەنە دان هەروەها بە مانای "ئەشکەنجەدان"یش دێ. دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "با دان، رێکگوشین". خزمە دەگەڵ ↑جەڕاندن cerandın "با دانی توند". دە وشەی چێوجەلە çewcele دا جەڕ cer گۆڕاوە بە جەل cel. چێوجەلە دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە" دا ئاوا مانا کراوەتەوە: ئامرازی ئازار دانی زیندانی، دار دەخەنە ناو قامکەکانی و رێکی دەکوشن.

**جەڕان ceran** [ *jarān* ] - "بێچوو هێنانی بەدژواری": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*جڕان cıran* و لەوانەشە ↑دڕان dıran. مەبەست لێرەدا دڕان واتا لێک هەڵبڕانی لەشی ئاژەڵە لەکاتی زانی دژواردا.

**جەڕاندن cerandın** [ *jarāndın* ] - "بادانی توند": خزمە دەگەڵ Strang (G.) و string (E.) "ریس، بەنی بادراو"، stranc (OG.)، streng (OIs.) "چنراو، هۆنراو"، stringere (L.) "گوشین، رێک گوشین"، srangos (Let.) "بادراو"، strangale (Let.) "ریس، بەنی بادراو"، stranx (Let.) "گوشراو"، stringt (Let.) "توند بوون، سفت بوون"، streng (G.) "سەختگیر، دەمارگرژ"، سەر بە ریشەی ***stren(k)- > (IE.)*** "بادراو، گوشراو، توند و گرژ بوون". ئەم ریشەیە خۆی دە پلەیەکی دوورتر دا دەچێتەوە سەر ریشەی ***(s)ter- (IE.)*** "رەق بوون، توند بوون، چڕ بوون". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە پێوەندییان بە خێزانە وشەوە هەیە، وەک ↑جیر cîr "کێش، پلاستیک"، ↑جیڕ cîr [جیرە بە با دان]، ↑چیڕ çîr "توند، سفت" [ددان چیڕ کردن یان دە چیڕەوە بردن واتا توند کردنی ددانەکان لە یەکتری و گرژ کردنیان] و ↑جەڕ cer [جەڕ و مەنگەنە]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زرینگ zrîng و لەوانەشە دەگەڵ ↑ئەستوور estur.

جەرجەڕ **cercer** [ *jarjar* ] - "1- جەنجەڕ، ئامرازی ورد کردنی کلۆش 2- چەرخی ئاو هەڵکێشان": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑جەڕاندن cerandın "با دانی توند، سووڕاندن".

جەردە **cerde** [ *jarda* ] - "ڕێگر، تاڵانکەر":

1- لەوانەیە دە ئەسڵدا تەریدە tar(ī)da بووبێ، بە مانای کەسێک کە تەرت کراوە یان تەرە بووە و لە کۆمەڵ هەڵبراوە. وشەکە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑تەرت tara، ↑تەرە tara. ↑تەرا tarā [تاک و تەرا] و هتد.

2- هەروەها دەکرێ دەگەڵ وشەی ↑شاردنەوە şardn(ewe) هەڵی سەنگینین. لەم تێڕوانینەوە، جەردە واتا کەساتێک کە خۆیان لە خەڵک (یان دەوڵەت) شاردۆتەوە.

جەرگ **cerıg** [ *jarıg* ] - وشەکە دە ئەسڵدا ↑جگەر cıger ە و فۆتێمەکان جێگۆرکێیان کردووە.

جەرگە **cerge** [ *jarga* ] - "ناوەڕاست": دوو ئەندامی جەرگ و دڵ هەر لە کۆنەوە وەک ناوەندی لەش چاویان لێ کراوە و بەم پێیە مانای "چەق، ناوەڕاست"یان وەرگرتووە. دە زمانی ئاڵمانیدا "دڵ" ئەو مانایە دەبەخشێ.

جەرە **cere** [ *jara* ] - "گۆزەی گەورە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ galla (OF.)، kar (OG.) [ریشە؟]. وشەی gallon دە زمانە ئەورووپییەکاندا دەچێتەوە سەر وشە فەرانسییەکە.

جەریفک **cerîfk** [ *jarīfk* ] - "گەسک": دە فارسیدا جارووب jārūb (P.) [جا + رووب]. کەرتی یەکەم بە مانای "جێ"یە. کەرتی دووەم دە فارسیدا دەچێتەوە سەر کرداری روفتن roften (P.) "ماڵین". ئەم کردارە خزمە دەگەڵ ↑پریواندن pırîvandın.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبیدا وشەی "جاروب"ی فارسی کراوەتە جاروفة jārūfa (Arb.) و لەمەشەوە کرداری جرف jarafa (Arb.) دروست کراوە بەمانای "ماڵی، ماشتی"].

جەریە **cerîye** [ *jarīya* ] - "گیرەی چەرم دروون": خزمە دەگەڵ ↑جەڕ cer [جەڕ و مەنگەنە].

جەستە **ceste** [ *jasta* ] - "لەش" : < جسد *jasad (Arb.)* "لەش". لەوانەیە ئەم وشەیە ریشەی کوردمادی هەبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑جاش caş [دە بنەڕەتدا: شێوە، پەیکەر].

جەغز **ceğız** [ *jağız* ] - ↑جوغز cuğız.

جەفەنگ **cefeng** [ *jafang* ] - "گاڵتە، حەنەک": پێک هاتووە لە دوو کەرتی جەف + ئەنگ cef + eng. کەرتی "جەف" شێوەیکی دیکەیە لە ↑گەپ gep [گاڵتە و گەپ]. کەرتی eng- پاشگرە و بۆ وێنە لە وشەی ↑نەهەنگ neheng یشدا بەدی دەکرێ [کەیف و نەهەنگ]. ئەم پاشگرە وێ دەچێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ پاشگری ing- (E.) یان ung (G.)].

جەل **cel** [ *jal* ] - "چەلاک، داری گوێز پێ تەکاندن": دەگەڵ ↑جەلد celd بە مانای "داردەستی درێژ و باریک" و ↑جلیت cılît "داردەستی سوارکاران" دەبێ سەر بە ریشەیەک بن.

1- لە لایەکەوە دەکرێ دەگەڵ ↑جالە cale "دار یان تەختەی بەسەر چۆمدا رایەڵ کراو" بەراوردیان بکەین.

2- لەلایەکی دیکەوە دەتوانین بەراوردیان بکەین دەگەڵ Dolle (G.) و thole (E.) "داری سەوڵ پێراگرتن" و týlos (Gr.) "قیتکە، داردەست، مێخ". ئەم وشانەی دوایی خزمن دەگەڵ ↑تلی tılî tıbıl "قامک".

جەڵتە **celte** [ *jalta* ] - "خوێنی مەییو":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑جلق cılq سەر بە ریشەیەک بە مانای "تەڕ و لیچق". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "دەڵەمە". وشەی "دەڵەمە" خزمە دەگەڵ "تەڕ".

2- یان لە وانەیە خزم بێ دەگەڵ kalt (G.) و ↑گلێرە gılêre و ↑سارد sard، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەستن، گلوو بوون لە سەرمان".

جەلد **celd** *[ jald ]* - "داردەشتی درێژ": خزمە دەگەڵ ↑جەل cel "چەلاک".

جەڵد **celd** *[ jald ]* - "لیزگەماسی بە شووڵەوەکراو": خزمە دەگەڵ ↑جەلە cele کردن بە مانای "تێکخستنەوە".

جەڵدە **celde** *[ jalda ]* - "قامچی، شەللاق": خزمە دەگەڵ slahta (OG.) "گوشتن"، slieht (OE.) "لێدان، گوشتن"، slacc (OIr.) "شمشێر"، سەر بە ریشەی **< *slak- (IE.)** "لێدان". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑شەللاق şellaq و ↑زللە zılle ش لەم ریشەوە دێن. دە زمانی عەرەبیدا سلاح sīlāḥ (Arb.) "چەک" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

جەلغە **ceġle** *[ jalġa ]* - "سەهۆڵی خۆنەگرتوو":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑جلق cılq سەر بە ریشەیەک بە مانای "لیچق".

2- یانیش پێوەندی هەیە بە glacies (L.) "سەهۆڵ". ئەم وشە لاتینییە دوورە خزمە دەگەڵ ↑سارد sard.

جەللە **celle** *[ jalla ]* - "ریخ، شیاکە": خزمە دەگەڵ ↑جلق cılq سەر بە ریشەیەک بە مانای "لیچق".

جەلۆ **celo** *[ jalo ]* - "هەرزەپیاو": خزمە دەگەڵ ↑جلف cılıf "هەرزەژن".

جەڵە **cele** *[ jala ]* - جەلەکردن واتا "تێکخستنی ماڵات": هەروەها "سەرجەلە" هەیە بە مانای یەکەم ریزی ئاژەڵی جەلەکراو. خزمە دەگەڵ ↑جۆر cor.

جەڵەب **celeb** *[ jalab ]* - "کۆمەڵێک مەڕ و ماڵات، کۆمەڵەسوار":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*گلوو gılu* دا باس کراون، بە مانای "لێکهاڵان و تۆپەڵە بوون، رێککوشران". ↑گلۆپ gılop، ↑کلۆ kılo و ↑گلۆفین gılofîn، ↑گلۆت gılot "سندەگل" و رەنگە ↑گەل gel "ئاپۆرە، حەشیمەت" سەر بە ریشەیەکن و مانای "پێکەوەنووسان، لێکهاڵان، تۆپەڵە بوون" دەبەخشن. لەباری شێوەی وشەکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑قولاپ qulap یان کولاب kulab "ئاسنی سەرچەمێنراو" کە ئەویش دواجار دەگەڵ وشەکانی سەرەوە بە خزم دەردەچێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ وشەی ↑گرووپ gırûp. ئەم وشەیە لەرێگەی زمانی فەرانسەییەوە چووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانی دیکە و دەچێتەوە سەر gruppo (It.) و ریشەکەی ساخ نەکراوەتەوە.

جەم$_1$ **cem** *[ jam ]* - "لا، ئاڵ، کن، نک": ["ل جەم بابێ خۆ" واتا لای باوکی خۆ، یان "هاتنە جەم هەڤ" واتا هاتنە کن یەکتر]. ئەم وشەیە پێوەندی بە "جمع" یان بە "جڤین"ەوە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ سمت samt (P.) "لا، ئاڵ" [سمت و سو samt o sū (P.)]. وشەکە دە هێندێک شێوەزاردا بووەتە ↑*دیو$^2$ dîw* [ئەم دیو و ئەو دیو واتا ئەم بەر و ئەو بەر]. مانای کۆنتری ئەم وشەیە بریتی بووە لە "قەراخ، کەنار". ئەم مانایە لە وشەی "جەم"یشدا دەردەکەوێ. کاتێک دەگوترێ "ل جەم"، وەک ئەوە وایە بگوترێ "لەکن، لە کەنار". ئەم مانا بنەڕەتییە لە وشەی زیڤار zîvar یان ↑زێوار zewar دا دەر دەکەوێ کە ماناکەی دەبێتە "قەراخ، پەراوێز". دە فارسیدا زوار zawār (P.) دەگوترێ ["زوار دررفتە" واتا قەراخەکانی لەپاڵ یەک هاتووەتە دەر، هەڵوەشاو]. وشەکە خزمە دەگەڵ Saum (G.)، zoom (Nl.)، seam (E.)، söm (Sw.) "زیڤار، پەراوێن، قەراخ"، سەر بە ریشەی **< *siu- , *sei- (IE.)** "بەستن، دروون". مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا قەراخی دووراو (درواو) بووە. لەم مانایەوە دواتر مانای گشتی "قەراخ" پەرەی گرتووە و دواتریش مانای "لا، ئاڵ". ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑چمک çımk "گۆشە(ی دەسماڵ)" و ↑چەمک çemk "مەفهووم، تێرم".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "قەراخ" و "لا، ئاڵ" دەکرێ دەگەڵ نموونەیەک دە زمانی ئەڵمانیدا هەڵی سەنگێنین. دە زمانی ئەڵمانیدا seite (G.) مانای "قەراخ" دەبەخشێ و لە هەمان کاتدا مانای "لا"یش دەردەبڕێ، بۆ کاتێک دەگوترێ لای چەپ، لای راست. خودی وشەی "لا" دە زمانی کوردمادیدا مانای "قەراخ"یش دەگەیەنێ، کاتێک دەگوترێ "لە لاوە" یان "لاوەکی"].

**جەم[2] cem** [ *jam* ] - ”کاتی نان خواردن“: ژەم jem یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑دەم dem بە مانای ”کات“. مەبەست لە جەم دە بنچینەدا جەمی خواردن [دەمی خواردن] بووە.

**جەمام cemam** [ *jamām* ] - ”رەق بوون و ماسینی ماسوولکە“: جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ túmara-h (OIn.) ”قەڵەو، پتەو“، tumere (L.) ”هەلمسان“، tuméti (Lit.) ”قەڵەوبوون“. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *tēu-, *tū- <** ”ماسین، ئەستوور بوون“.

**جەمسەر cemser** [ *jamsar* ] - ” لای هەرە سەرەوە“ : ↑جەم + ↑سەر cem + ser. کەرتی یەکەم پێوەندی هەیە بە ↑جەم[1] cem ”لا، ئاڵ“ و مەبەست لە وشەکە لای ئەم سەر و ئەو سەرە.

**جەمقان cemqan** [ *jamqān* ] - ”لێکدرانی تراو“: شێوەی جەختکراوی ↑جمین cımîn. ناوگری q دۆخی جەخت کردن بە وشەکە دەبەخشێ.

**جەمك cemık** [ *jamık* ] - ”برەبرە مژاندنی بێچوو لە گوانی دایك“ [گۆلکێ جەمك کە]: خزمە دەگەڵ schmeken (G.)، smack (E.) ”چێژو مەزە دان“، پاشان هەروەها بەمانای مەزە لێدان، چێشتن“، سەر بە ریشەی **(IE.) *smeg(h)- <** ”چێشتن، مەزە لێدان“.

**جەمینۆك cemînok** [ *jamīnok* ] - ”کۆ بوونەوە بۆ کەین و بەین“: دەچێتەوە سەر ↑جڤین cıvîn ”کۆم بوون، پێك گەیشتن“.

**جەنازە cenaze** [ *janāza* ] - ”لاشە، کەلاك، جەندەك“: ئەم وشەیە دەشێ لە دوو کەرت پێکهاتبێ. کەرتی یەکەم پێوەندی بە ”جان“ [گیان]ەوە هەیە. لەوانەیە وشەکە دە ئەسڵدا ”جانوازە“ [جانبازە] بووبێ و کورت بووبێتەوە بۆ ”جەنازە“ و مەبەست ”وازە“ بوونی جان بێ واتا دوورکەوتنەوەی جان لە لەش. لەم تێڕوانینەوە جەنازە دەبێتە ئەو لەشەی کە جان تێیدا وازە بووە بە وتەیەکی دیکە گیانی تێدا نەماوە. سەبارەت بە وشەی ”وازە“ بڕوانە ↑وەزگ wezıg دان واتا ”مردن“.

**جەنجەڕ cencer** [ *janjar* ] - ”ئامێری وردکردنی گیا“: دەچێتەوە سەر وشەی ↑جنین cınîn ”وردکردن، ئەنجن ئەنجن کردن“.

**جەندەك cendek** [ *jandak* ] - ”لاشە، کەلاك“: دەچێتەوە سەر کرداری ↑ژین jîn و ↑گیان/ جان can/ gîyan. دە زمانی کوردمادیدا ↑زەندەك zendek یان زەندەق zendeq ش بە کار دێ کە مانای ”ورە و هێزی دڵ“ دەبەخشێ و دە بنەڕەتدا مەبەست ”ژیان، هێزی ژیان“ بووە. لەوانەیە مانای جەندەك لە ”ژیان، گیان“ەوە بۆ ”لەش، لاشە“ گۆڕابێ. ئەم گۆڕانە دە وشەی ”گیان“یشدا بەدی دەکەین. وشەی گیان خۆی دە بنەڕەتدا مانای ”ژیان، جان“ دەبەخشێ و پاشان مانای ”لەش“ یشی وەرگرتووە [هەموو گیانم دێشێ، هەموو گیانی تێك شکاند]. هەر بەم جۆرە جەندەك دەتوانێ دە بنەڕەتدا بە مانای ”ژیان، گیان، زیندەگی“ بووبێ و لەوێوە ماناکەی گۆڕابێ بۆ ”لەش“ و دواتریش ”لاشە“. لە لایەکی دیکەوە جەندەك دەتوانێ لە دوو کەرتی جان can + دەك dek پێك هاتبێ بە مانای کەسێك کە جانی *داوە*. لەم تێڕوانینەوە کەرتی ”دەك“ پێوەست دەبێ بە کردار ↑دان dan. هەروەها وشەی ↑جنازە cenaze ش پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**جەنگ ceng** [ *jang* ] - ”شەر، لێکدان“: دە فارسیدا جنگ jang (P.). دەچێتەوە سەر ریشەیەك کە مانای ”لێدان، لێکدان“ دەدا. ئەم ریشەیە بە شێوەیکی دیکە دە وشەی ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن jendın دا دەبینین. خزمە دەگەڵ ↑زەنگ zang [زەبر و زەنگ] و چەندین وشەی دیکە.

**جەنگەڵ cengel** [ *jangal* ] - ”لێڕەوار“: جنگل jangal (P.)، jangala (OIn.). وشەکە لە رێگەی زمانی ئینگلیزییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیش. ریشە؟

**جەو cew** [ *jaw* ] - ”برینگ “: خزمە دەگەڵ ↑جوێ coe [جوێ کردنەوە دە بنەڕەتدا واتا لێکردنەوە، لێك کردنەوە] و دواتر ↑*جودا cuda*.

جەواڵ **cewal** [ *jawāl* ] - "تێری یەک لایی": جواڵ cuwal و گواڵە guwale ش دەگوترێن. جوال jowāl (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑گابار gabar "کون و کەلێن، شکەفت". خودی ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑کون *kun* و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەم داپچڕین". لەم ریشەوە و لەم مانا بنەڕەتییەوە دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە بە مانای جۆربەجۆر سەریان هەڵداوە. زۆرینەی ئەم وشانە ئاماژە بە کون و کەلێن، قووڵکە، قووڵایی دەکەن [بەگشتی بە شوێنێک یان شتێک کە *زارکی* هەیە و جێی تێدا بوون یان تێکردنە]. هێندێک لەم وشانە بریتین لە ↑قەپ qep "گاز، دەم داپچڕین"، ↑گەپین gepîn "حەپین، وەڕین"، ↑گاپن gapın "نەوسن" [زاردابچڕاو بۆ خواردن]، ↑گەپە gepe "بۆشایی زار" [گوپ؟]، ↑کەپۆ kepo "لووت"، کوور kur [↑قووڵ qul]، ↑کوار kuwar "کەندوو"، ↑گۆڕ gor "قەبر"، ↑گەبەڵ gebel "زەلکاو، تاڵاو"، ↑گۆل gol "ئەستێرک، دەریاچە"، ↑کاپان kapan "نەقەب"، ↑کاڤلان kavlan "بەرگی خەنجەر"، ↑کوڕان kuran "حەوز، جوڕنە"، ↑کۆل kol "ئاوەخۆری ئاژەڵ لە بەرد یان دار"، ↑جۆرک(ە) cork(e) "توورەکە"، ↑جەوەندە cewende "توورەکەی چەرمینی ئاو"، ↑کوندە kunde "توورەکەی زلی چەرمین بۆ ئاو کێشان" [دە بنەڕەتدا: "کەوەندە kewende"]، ↑قەولک qewlık "توورەکەی بچووک" و هتد.

جەوان **cewan** [ *jawān* ] - "لاو": جوان javān (P.)، jung (G.)، young (E.)، geong (OE.)، yuvan (OIn.)، iuvenus (L.)، گشتیان بە مانای "جەوان"، سەر بە ریشەی ***ju(w)n-** > **(IE.)** "جەوان".

جەوک **cewık** [ *jawık* ] - "شیرەی دار": جاوی cawî، جەوی cewî و جیوە² cîwe ش دەگوترێ. هەروەها وشەی ↑جەوهەر cewher دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا بە مانای "شیرە"ی دار و دەوەن بووە [وەک چناری جەوهەردار واتا چناری شیرەدار] و پاشان بەو شیرەیەش گوتراوە کە بۆ نووسین و نیگار کێشان کەڵکی لێ وەرگیراوە و دواجار کردوویانەتە ناو خودکار و خودنویسەوە. دەشێ خزم بێ دەگەڵ Saft (G.)، saf (OG.)، sap (E.) و (Nl.)، safi (OIs.)، sapa (L.) "شیرەی دار، شیرەی میوە"، سەر بە ریشەی *** sew-** > **(IE.)** "گوشین". وشە کوردمادییەکان هەروەها دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑گوێنی goenî [گەوەن gewen].

[تێبینی: سەبارەت بە گۆڕانی فۆتیمەکان هەڵی سەنگینە دەگەڵ "گۆڕین، قار، قەهرین"، "جەهر" و "جەخار"، سەر بە ریشەی **sai-* *(IE.)* "ئێش، ئازار، نەخۆشی"].

جەوهەر **cewher 1** [ *jawhar* ] - "ڕەنگێ بۆ نووسین و بەن و ریس": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جەوک cewık "شیرەی دار" [دە بنەڕەتدا مەبەست تراوێک بووە کە لە دار و گژ و گیا وەرگیراوە].

جەوهەر **cewher 2** [ *jawhar* ] - "1- زات، بوێری 2- ناوەرۆک": شێوەیەکی دیکە لە ↑گەوهەر gewher [گەوەر gewer]. وێ دەچێ "جەوهەر" شێوەی عەرەبێنراوی وشەکە بێ.

جەوەرە **cewere** [ *jawara* ] - "سەرمای زۆر": جەبەرە cebere ش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Schauer (G.)، scūr (OG.)، skūra (Gt.)، shower (E.)، skur (Sw.) "با وبۆران، تاوەباران، تەرزەبارین". ئەم وشە ژێرمەنییانە بەرهەڤ دەکرێن دەگەڵ caurus (L.)، šiaurys (Lit.) "بای باکوور"، cʿurt (Arm.) "سەرما، با و بۆران". بەگوێرەی بۆچوونێک ئەم وشانە دەتوانن ریشەیەکی لەم چەشنەیان هەبێ: ***(s)kēwro-** > **(IE.)**.

2- لە لایەکی دیکەوە وشەکە دەتوانێ پێوندی هەبێ بە schwer (G.)، swa r (OE.)، svar (Sw.)، svarus (Lit.) "سەخت، گران، ئاستەم". ئەگەر ئەم هەڵسەنگاندنە لە جێی خۆی بێ، ئەوا وشەکە پێوەندی پەیدا دەگا دەگەڵ ↑زەبر zebır و ↑زۆر zor.

جەوەندە **cewende** [ *jawanda* ] - "توورەکەی چەرمین": خزمە دەگەڵ ↑جەواڵ cewal.

جەهر **cehır** [ *jahır* ] - "قەڵسی، تووڕەیی": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑جەحنین ceĥnîn "تووڕە بوون، رق هەستان"دا باس کراون.

**جەیش cayş** [*jayš*] - "سوپا، لەشکر". ئەمە وشەیەکی عەرەبییە، کە لە کوردیشدا بەکار دەهێنرێ [جیش jayš (Arb.) "سوپا، لەشکر"]. ریشەی ئەم وشەیە بۆ زمانی کوردمادی دەگەڕێتەوە، بۆیە بە پێویست زانرا، بخرێتە ناو فەرهەنگەکەوە، تاکوو هەم کوردمادی بوونی وشەکە نیشان بدرێ و هەمیش نیشان بدرێ کە چۆن و بە چ زیرکییەك زمانی عەرەبی وشەی زمانی ئێمە و زمانەکانی دیکەی وەرگرتووە و گۆڕیویەتی. با بزانین چۆن: وشەی Armee (G.) و army (E.) "جیش، سوپا" ریشەی لاتینییان هەیە و دواجار دەچنەوە سەر arma (L.) "دەزگا، ئامراز". (ئەم وشە لاتینییە خزمە لەگەڵ Arm (G.) "قۆڵ، پیل" و هەرمە herme "شان و پیل" و ئامێر amer یان ئاموور amur دە زمانی کوردمادیدا). وەك دەبینرێ وشە لاتینییەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "دەزگا، ئامێر" بووە و دواتر کرداری armare (L.) دروست بووە بە مانای "تەجهیز کردن، بە ئامێر کردن، بە دەزگا و ئامێر تەیار کردن". لەمەوە دواتر وشەکە بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ "دەزگا و ئامێری شەڕ" و "تەجهیز کردن بۆ شەڕ" بەکار هێنراوە و دواتریش مانای "سوپا" وەرگرتووە. وشەیەك کە دە زمانی فارسی و کوردمادیدا بە مانای "دەزگا و ئامێر" بە گشتی و هەروەها "ئامێری شەڕ" بەکار هاتووە، بریتییە لە ساز saz. "ساز" بەگشتی مانای "دەزگا، ئامێر، ئامراز" بووە، بۆ وێنە کاتێك باس لە سازی مووزیك دەکرێ مەبەست ئامرازە. دە زمانی فارسیدا ساز و برگَ sāz o barg (P.) بە مانای "دەزگا و کەرەستەی (شەڕ)" بەکار دێ. وشەی "ساز" خۆی دەچێتەوە سەر کردارێك کە دە زمانی فارسیدا دەبێتە ساختن saxtan (P.) "دروست کردن، ساز کردن" و هەروەها خزمیشە دەگەڵ ساخ sax "تەندروست"ی خۆمان. زمانی عەەبی وشەی "ساز"ی وەرگرتووە و کردوویەتی بە جهاز jihāz (Arb.) "ئامێر، دەزگا". هەروەها وشەکانی "تجهیز" و "مجهز" و هیتری لێ دروست کردووە، لەلایەکی دیکەوە "ساز" یان "جهاز"ی گۆڕیوە بو جیش jayš بە مانای "سوپا". وەك دەبینن هەمان پێوەندی کە دە زمانی لاتینیدا لەتێوان دوو چەمکی "دەزگا، ئامێر" و "سوپا" دا هەبووە، لە زمانی عەرەبیشدا بە کەڵك وەرگرتن لە "ساز"ی کوردمادی و فارسی دروست کراوە.

**جیا cîya** [*jīyā*] - ↑جوێ coe و ↑جودا *cuda* ش دەگوترێ.

**جیات(ی) cîyat(î)** [ *jīyāt(ī)* ] - ئەم وشەیە دەگەڵ پرێپۆزیسیۆنی لە le بەکار دێ و دەگوترێ لەجیات(ی) lecîyat(î) واتا "لەجێگای، بەجێگای". خزمە دەگەڵ Statt (G.)، stat (OG.)، stead (E.)، stad (Sw.) "شوێن، جێگا". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ stsis (Gr.) "پێگە، جێگە"، statio (L.) "شوێن، جێگە". هەروەها خزمن دەگەڵ ↑-ستان *-sıtan* [کوردستان] و ↑ئوستان ustan "پارێزگا" و Stadt (G.) "شار". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑زێد zed [کۆنتر: زاد zad] هەیە بە مانای "وڵات، نیشتمان". ئەم وشەیە لەوانەیە پێوەندی بە "زادگا"وە نەبێ، بەڵکوو وشەیەکی کۆن و سەربەخۆ بێ بە مانای "وڵات، نیشتمان" و لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوەدا بێ. وەك دەبینین ئەم وشانە دە بنەڕەتدا بەمانای "شوێن و جێگا(ی لێبوون)" بەکار هاتوون و پاشان مانای "شار" و "وڵات"یان پەیدا کردووە. ریشەی وشەکان دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *st(h)ā- >** " وەستان، جێگیر بوون، قەرار گرتن". ↑وەستان westan ی کوردمادی لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی ئەڵمانیدا راست وەك زمانی کوردمادی بە مانای "جیات"ی کوردمادی بە کار هاتووە و بۆ وێنە گوتراوە an meiner statt واتا "لەجیاتی من". هەروەها لە سەدەی پانزدەوە وشەکە دە زمانی ئەڵمانیدا وەك پرێپۆزیسیۆن- anstatt (G.) "لەجیات(ی)" بەکار دێ و لە سەدەی هەفدەوە بەشێوەی کورتکراوی statt یش بەکار دێ. [لێرەدا دەبێ ئافەرین بە ئەڵمانییەکان بڵێین کە توانیویانە تەنانەت زۆرینەی وشەکانیان وەها ساخ بکەنەوە کە لە فڵانە سەدە و فیسارە سەردەمدا چۆن بەکار هاتووە و هەر گۆڕانە لە چ سەردەمێکدا رووی داوە]. هەروەك دە زمانی کوردمادیدا پرێپۆزیسێونی لە le بە وشەکەوە لکاوە، دە زمانی ئەڵمانیشدا پرێپۆزیسێونی an دەگەڵ وشەکە دێ. دە زمانی ئینگلیزیدا دەگەڵ پرێپۆزیسیۆنی in و بۆ وێنە دەگوترێ in my stead. ورد بوونەوە لەم پێوەندییانەی سەرەوە دەمانگەیەنێتە ئەم ئەنجامە کە وشەی ↑جێ ce [جا jā (P.)] واتا

"جێگا" خزم بێ دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە یان دەبنەڕەتدا یەك وشە بووبن و دوو شێوەی جیاواز و دوو مانای هاوپێوەنیان لێ بەرهەم هاتبێ. لەوانەیە ئەم وشە کۆنە "*جات cat*" بووبێ و لەلایەکەوە بووبێتە "جیات" و لە لایەکی دیکەشەوە بووبێتە "جا" یان "جێ". ئەگەر هێندێکی دیکە بە ناخی باسەکەدا رۆبچین، بە شیمانەیەکی ئەوتۆ دەگەین کە وشەی ↑شار şar یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. وشەی شار دە زمانی پارسی کۆندا "ساتر" یان "خشاتر" بووە و دەبێ دە زمانی مادیشدا هەروا بووبێ. ئەم وشەیە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە یەك دەگرێتەوە. بەم جۆرە دەبینین کە دە زمانی کوردمادی و فارسییشدا وشەی "شار" دەچێتەوە سەر هەمان ریشەی سەرەوە و دەبێتە خزم دەگەڵ وشەی ئەڵمانی Stadt (G.) "شار".

**جیاز cîyaz** [ *cīyāz* ] - "کەلوپەلی بووك کە دەگەڵ خۆی دەیبا": وشەکە دەچێتەوە سەر جهاز jihāz (Arb.) "شتومەك، دەزگا، ئامراز". وشە عەرەبییەکە خۆی لە ↑ساز1 saz ی کوردمادی و فارسی وەرگیراوە بە مانای "ئامادە، مجەهەز". سەرنج بدە کە ↑ساز2 saz دە کوردمادی و فارسیدا مانای "*ئامرازی مووزیك*" دەدا و ساز و برگ sāz o barg (P.) دە زمانی فارسیدا مانای "*تەجهیزات*" دەبەخشێ. ئەمە نیشان دەدا کە "ساز" پێشتر بە گشتی بە مانای "ئامێر، ئامراز" بەکار هاتووە و ئەم مانایە ئەمڕۆ لە مانای "ئامرازی مووزیك"دا بەرتەسك بۆتەوە.

**جیر[1] cîr** [ *jīr* ] - "کێش، بەنی پلاستیك، پلاستیك": جیل cîl یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑جیڕ[2] cîr [جیرە بە با دان] و هەروەها دەگەڵ ↑چیڕ *çîr* "توند، سفت، گرژ". ئەم بەنە پلاستیکییە یان بە گشتی کەلوپەلی پلاستیکی لەبەر ئەوەی چیڕ بووە و بەئاسانی نەهاتووەتە قەتاندن یان شکاندن، ئیتر ناوی "جیر"ی بۆ دانراوە.

[تێبینی: دە زمانە ژێرمەنییەکاندا strang بەمانای "تەناف، گوریس" لە ریشەیەکەوە دێ کە "جیر"ی کوردمادیش هەر لەو ریشەیە سەرچاوەی گرتووە. بەڵام وێ ناچێ "جیر" پێوەندی راستەوخۆی بەم وشەوە هەبێ و پێوەندییەکە تەنیا دە هاوبەش بوونی ریشەکەیان دایە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑زرینگ zrîng].

**جیڕ[2] cîr** [ *jīr* ] - "دەگەڵ "با دان" دێ [جیڕە(بە) با دان] بە مانای با دانی بە گوشار، با دانی توند. هەروەها شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چیڕ çîr "توند، سفت، گرژ".خزمە دەگەڵ ↑*جەڕاندن cerandın* "بادانی توند و بە گوشار".

**جیرە cîre** [ *jīra* ] - "مووچە، بەرات": دە زمانی کوردمادیدا "مووچە و بڕانە"ش دەگوترێ و وشەی بڕانە دەچێتەوە سەر "بڕین" و دە بنچینەدا واتا ئەو بەشەی بۆ یەکێك دەبڕدرێتەوە. وشەی جیرە cîre ش خزمە دەگەڵ share (E.) "بەش" و دەچێتەوە سەر ریشەی **> *sker-* * (*IE.*)** "بڕین، لەت کردن، لێکردنەوە". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑جاڕ2 car- "پاشگری پڕانی و زۆر و زەوندی" [کەماجاڕ، گیاجاڕ].

**جیڕە cîre** [ *jīra* ] - "دەنگی شتی لە تەختە دروست کراوی شەق و شڕ": خزمە دەگەڵ gieren (G.) "جیڕە کردن". رەنگە وشەکە دە بنچینەدا لاسا کردنەوەی دەنگ بووبێ.

**جیق cîq** [ *jīq* ] - "جیق دەرهاتن" بە مانای "مردن" بەهۆی گوشار و پاڵەپەستۆ بە کار دێ. وشەکە زۆرجار دەگەڵ "فیق" دێ [جیق و فیق cîq u fîq]. وشەی جیق cîq هەمان زیقە zîq(e) یە، [دە فارسیدا: جیغ jīġ (P.)]. "فیق"یش هەمان فك "گریان"ە و پێوەندی بە *فکین* "گریان وناڵین"ەوە هەیە. دە بنەڕەتدا مەبەست زیقاندن و گریان لەبن زەخت و زۆردا بووە. دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئەم دوو مانایەی خوارەوە بۆ "جیق" کراوە: 1- هەناو، بە فارسی: "امعا و احشا"، [ئەو لام تات و ئەم لام تات، وەی بابە جیقم دەرهات] 2- دەنگی ناچاری لە زۆر بۆ هاتن [بجیقێنی بفیقێنی پووڵ چەرموگم پێ داوی، هەر ئەتخۆم]. وەك ئەم مانای دووەمە ئاشکرای دەکا، "جیق" و "زیق" دوو شێوەی جیاواز لە یەك وشەن.

سەبارەت بە مانای یەکەم دەتوانین ئەم شیمانە بخەینە ڕوو کە لەوانەیە دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی "جیق" هەبووبێ، لەبەر هاوشێوەیی و پێوەندی ماناکان بەیەکەوە، واتا "زیقاندن و پان و پلّچ بوونەوە لەبن زەختدا"، ئەم دوو وشەیە لێکدرابن و وەك یەك وشەیان لێ هاتبێ. ئەگەر ئەم شیمانەیە ڕاست بێ، ئەوا "جیق"ەکەی دیکە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑جووقە cuqe "ژیان، گیان" و لەم مانایەشەوە مانای "هەناو، ناوسك" سەری هەڵدابێ.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "گیان" و "سك" دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی خوارەوە بکەین کە پێکەوە خزمن، واتا Leben (G.) "ژیان" و Leib (G.) "لەش، سك". دە زمانی کوردمادیشدا "گیان" بە مانای لەش بەکار دەهێنرێ و بۆ وێنە دەگوترێ "هەموو گیانی بریندار بووە"].

**جیقنە cîqne** [ *jīqna* ] - "ریخنە، پیسایی پەڵەوەر": بنەوشەی -cî(q) خزمە دەگەڵ ↑شیاکە sîyake "ریخ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ scheißen (G.)، shit (E.)، skita (Sw.)، schijten (Nl.)، scizan (OG.) "رین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *skei- >** "لێبوونەوە، جوێ بوونەوە". دیارە مەبەست لە وشەکە دە بنچینەدا ئەو شتە بووە کە لە لەشی گیانلەبەر جیا دەبێتەوە یا خود لێی دەردەچێ. دە زمانی کوردمادی دا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑جودا cuda و ↑شێ şê [شێ کردنەوە واتا لێك جودا کردنەوە] و گەلێك وشەی دیکە. وێ دەچێ دە زمانی کوردمادی بەرێدا وشەیەك هەبووبێ وەك "جیقان" یان "شیکان" بە مانای "ریان". ئەوەی ئەم بۆچوونەمان لا دروست دەکا، وێکچوونی وشە کوردمادییەکە دەگەڵ ئەو کردارانەیە کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "ریان" دەبەخشن.

**جیقە cîqe** [ *jīqa* ] -" 1- دەنگی لاواز بە هۆی رێکگوشینەوە2- جووکەی پەڵەوەر": دە فارسیدا بۆ هەردوو مانا جیك jīk (P.). خزمە دەگەڵ ↑جووکە cuke.

**جیکڵدان cîkıldan** [ *jīkıldān* ] - "سیکەتۆرە": جیك + ڵ + دان cîk + ıl + dan. چیکڵدان çîkıldan یش دەگوترێ کەرتی جیك -cîk شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سیق sîq یان سیك sîk کە لە وشەی ↑سیکەتۆرە sîketore دا دەیبینین و هەروەها شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زیخ zîx "ورکەبەرد". پاشگری -ıl پاشگری گچکاندنە. کەرتی ↑دان dan ئاماژە بە "تیدا بوون، جێگیر بوون" دەکا، وەك لە وشەکانی "چادان"، "خوێدان"، "قەندان" و هتد. "جیکڵدان" ئەو شوێنەیە کە خیز و ورکەبەردی هەزم نەکراوی ناو سکی پەلەوەر تییدا کۆ دەبێتەوە. "سیکەتۆرە"ش کە وشەیەکی دیکەیە بۆ ئەم مەبەستە، دە بنەڕەتدا بە مانای "توورەکەی سیق یان زیخ"ە. لە لایەکی دیکەوە وشەی "جیکڵدان" دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "سەبر، بەرگە، حەوسەلە"ش بە کار دەهێنرێ. ئەم مانایە لەمەوە هاتووە کە مرۆڤی بەسەبر و بەرگەگر دەتوانی شتی سەخت و ناخۆش [گیرە و کێشە] لەناو خوێدا رابگرێ [هەڵبگرێ] و ورەوردە بەسەریدا زاڵ بێ و حەلی بکا، هەروەك چۆن پەلەوەریش زیخەکانی ناوسکی لە شوێنێکدا هەڵدەگرێ و بەرەبەرە دەیان تاوێنێتەوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Geduld (G.) بە مانا "سەبر و حەوسەلە" بەکار دێ و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بلیند کردن، *هەڵگرتن*، هەڵسەنگاندن". وشەی "بەرگە"ی کوردمادیش پێوەندی بەم چەمکەوە هەیە].

**جیل cîl** [ *jīl* ] - "لاستیك": شێوەیەکی دیکە لە ↑جیر[1] cîr.

**جینچك cînčık** [ *jīnčık* ] - "هەڵترووشکان": بڕوانە ↑چینچکان çînçıkan "هەڵترووشکان".

**جینگڵ cîngıl** [ *jīngıl* ] - جینگڵ لە خۆدان واتا خۆبادان، خۆ هەڵسووراندن. ئەم وشەیە بۆ تلانەوە و جم و جۆڵ وخۆ وەرسووڕانەوەی مرۆڤ لە کاتی خەوزڕاندا و هەروەها بۆ جووڵانەوەی تایبەتی مار بەکاردەهێنرێ کە خۆی بەم لا و ئەولادا تەکان دەدا [جینگڵان دەدا]. وشەکە بە شێوەی ↑گینگڵ gîngıl و ↑شنگڵ şıngıl یش دەگوترێ. هەروەها دەڵێن فڵانە کەس شنگڵێکی لە خۆ دا واتا بزاڤێك و تەکانێکی (بەهێزی) بە خۆی دا بە مەبەستی ڕاپەڕاندنی کارێك و نیشان دانی کارامەیی لەم کارەدا. هەروەها

وشەکە خزمە دەگەڵ ↑شەنگۆڵ şengol "شاد و بەکەیف، وە زەوق و شەوق هاتوو" [دەبنەڕەتدا: وە جم وجۆڵ کەوتوو لە خۆشیان]. ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ چەند وشەی ژێرمەنی وەک schwingen (G.)، swingan (OG.)، swingen (MNl.)، swing (E.) "بە هێز تەکان دان یان لەراندنەوە"، Schwingung (G.) "لەرە، نەوەسان"، Schwung (G.) "بزاڤێکی بەهێز و خێرا"، seng (OIs.) "باریک، زراڤ، شلومل" [شەنگ؟]، schwanken (G.) "بزووتن بەم لا و لادا، نەوەسان کردن، لەنجە و لار کردن"، zwenken (NL.) "وەرسووران"، svencan (OE.) "لێدان، شکەنجەدان" [دە بنەڕەتدا: خۆ بادان و خۆ بەم لاو ئەو لادا وەرسووڕاندن لە بەر ئێش و ئازار؟]، schwach (G.) "بێهێز،لاواز" [دە بنەڕەتدا: شل و *شەوێق*، لەق و تەق]، سەر بە ریشەی *(IE.) *suen-* > "چەمانەوە، جوولانەوە، لەرینەوە، جمین". بەلەبەرچاوگرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە بەو ئەنجامە دەگەین کە دەبێ وشەکانی ↑شەنگ şeng [شۆخ و شەنگ] و هەروەها شنگ şıng [یان↑ئەسپینگ (e)spîng]، ↑شنە şıne "لەرەی بایەکی سووک" و لەوانەشە ↑شنگ ışng "زۆر، هێز، تاقەت" پێوەندیان بەم ریشەوە هەبێ. خاڵی هاوبەشی "شەنگ" [شەنگەبێری] و "شنگ" [ئەسپینگ] و "شنە"ی با لەوەدایە کە ئەوانە هەموویان زراڤ، ناسک، شلومل و بە لەنجە و لارن. جگە لەمانە چەند وشەیکی دیکەش پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە، وەک ↑جمین cımîn "بزووتن، جووڵان" و چەندین وشەی دیکە وەک ↑سەما sema [خۆ با دان لە خۆشیان] و ↑چمە çıme "کلک" و ↑*دوو* *dū* "کلک" و هتد.

**جینگن** **cîngın** [ *jīngın* ] - "شەڕانی": دەچێتەوە سەر وشەی ↑جەنگ ceng.

**جیو** **cîw** [ *jīw* ] - "ژیان": خزمە دەگەڵ ↑ژین jîn و↑جیوە cîwe و↑جووقە cuqe.

**جیۆه1** **cîwe 1** [ *jīwa* ] - "ناوی کانزایەک": ↑ژووڤە juwe و ↑زاوق zawıq ش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا جیوە cîve و زیبق zeybeq (P.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ناوی ئەم کانزایە دەبێتە Quecksilber (G.)، cwicseolfor (OE.)، quicksilver (E.) و هتد. مانای ئەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا دەبێتە "زێوی (سەر) زیندوو، زێوی چالاک و بزۆز". ئەم کانزایە رەنگێکی زێوینی هەیە و بە ناوبانگە بە چالاک و بزۆز بوون و هەر بۆیەش بەم جۆرە ناودێر کراوە. دە زمانی کوردمادیشدا بە کەسێک زۆر بزۆز بێ، دەگوترێ "دەڵێی جیوەی تێ کراوە". کەرتی دووەمی وشە ژێرمەنییەکان مانای "زێو" دەدا و کەرتی یەکەم خۆی بە تەنیا مانای "چوست و چالاک، خێرا" دەدا [دەبنەڕەتدا بە مانای "زیندوو، سەرزیندوو"]، خزمە دەگەڵ جیۆه cîwe یان زاوق zawıq و دواتر دەگەڵ ↑ژین jîn ، ↑ژیان jîyan و↑گیان gîyan دە زمانی کوردمادیدا و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ژیان"، سەر بە ریشەی *(IE.) * guei-* > "ژین، ژیان، گیان". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑جیو cîw "ژیان".

**جیۆه2** **cîwe 2** [ *jīwa* ] - "شیرەی دار": ئەم وشەیە چ پێوەندییەکی بە "جیوە"ی کانزاوە نییە و شێوەکانیان تەنیا بە رێکەوت لێک دەچێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑جەوک cewk یان جەوی cewî.

**جیهان** **cîhan** [ *jīhān* ] - "گەردوون": جهان jahān (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ sein (G.)، sin (OG.) "بوون"، sánti (OIn.) "هەن"، سەر بە ریشەی *(IE.) *es-* > "بوون".

**جێز** **cez** [ *jez* ] - "کۆی خەرمان": خزمە دەگەڵ ↑جۆخین coxîn.

**جێژن** **cejın** [ *ježın* ] - "رۆژی پیرۆز و شادی": جەشن ceşın و گێژن gêjın یش دەگوترێ. جشن jaşn (P.). دەچێتەوە سەر yasn (Pl.) و yasna (Aw.) "پەرەستن، دووعا، جەژن"، yast و yašt (Pl.) "دووعا"، yaştan و yazītan (Pl.) و -yaz (Aw.)، -yad (OP.) "دووعا کردن، پەرستن، عیبادەت کردن". [بڕوانە عەلی نانەوازادە، فەرهەنگی پەهلەوی، ل. 319]. وەک دەردەکەوێ "جێژن" دە بنەڕەتدا ئاهەنگی دووعا و پەرەستن بووە کە باو و باپیرانی کوردان و گەلانی دیکەی ئەم دەڤەرە لە رۆژ یان رۆژاتیکی دیاریکراودا بەرێوەیان بردووە کە بێگومان لەپاڵ لایەنە ئایینەکەدا لایەنی شادی کردنی بەکۆمەڵیشی هەبووە، هەر وەک جێژنە ئایینەکانی ئەم سەردەمە. لەپێوەندی دەگەڵ ئەم وشەیەدا چەند وشەی

ئەمرۆی زمانی کوردمادی وەک ↑یەزدان yezdan و یەزیدی yezîdî [ئێزیدی ezdî] سەرنج رادەکێشن. دە "فەرهەنگی پەهلەوی"دا هەروەها ئەم وشانەی خوارەوە باس کراون: yazat (Pl.) و yazata (Aw.) "ئێزەد، فریشتە، شیاوی پەرستن"، yaztān (Pl.) و yazatanam (Aw.) "یەزدان، خودا". پێوەندی هەموو ئەم وشانەی سەرەوە بەیەکدی روون و ئاشکرایە. وادیارە "یەزدان" بە مانای "پەرستراو، خودا" و "یەزیدی" یان "ئێزیدی" بە مانای "پەرستکار، پێڕەوی ئایین، یەزدانپەرەست" بەکار هاتوون. سەبارەت بە ریشەی ئەو وشانە پێویستە ئاوڕێک لە وشەی "پەرستن" بدەینەوە، تاکوو بزانین ئەو وشە لە چ ریشەکەوە هاتووە و ئەوجار بگەڕێننەوە سەر وشەی "جێژن".

[وشەی پەرستن perestın خزمە دەگەڵ چەند وشە دە زمانی کوردمادیدا، وەک پرسە pırse (پرسە بۆ مردوو واتا ئاهەنگی دووعا کردن، داوا کردن و پارانەوە بۆ مردوو)، پارسە parse "سواڵ، گەدایی" (داوا کردن، پاڕانەوە)، پرسین pırsîn. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ fragen (G.) "پرسین"، forschen (G.) "تۆێژینەوە"، prccháti (OIn.) "دەپرسێت"، poscere (L.) "داوا کردن، داخواز کردن"، precari (L.) "تکا کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *per(e)k- (IE.) "بە شوێندا گەڕان، تۆژینەوە، پرسین، داوا کردن، تکا کردن، پارانەوە"].

پاش ئەم تێبینییە و بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەتوانین شیمانەی ئەوە بکەین کە وشەی "جێژن" و وشە خزمەکانی ئەویش لە ریشەیەکەوە هاتبن کە مانەیەکی ئەوتۆی هەبێ. گەر سەیری ریشە جیاوازەکان بکەین، تووشی ریشەیەک دەبین کە چ لە باری شێوە و چ لەباری ماناوە نیزیکی زۆر دەگەڵ ئەم وشانە نیشان دەدا، واتا ریشەی **< *ais-** ***(IE.)*** "وە شوێن کەوتن، تێکۆشان بۆ، حەز کردن". چەندین وشە دە زمانی کوردمادی و زمانەکانی دیکەدا لەم ریشەوە هاتوون کە وێکچووتیکی زۆر دەگەڵ وشەکانی بەرباس نیشان دەدەن، وەک ↑حەز ħez "ئارەزوو، خواستی و داوای بەتین، ئەڤین"، دە زمانی فارسیدا āz (P.) "تەماحکار، حەریس، چاونەزێر"، کاش kāš (P.) "خۆزگە"، heischen (G.)، eiscōn (OG.)، ask (E.)، āscian (OE.) "داوا کردن، پرسین"، iskat (Rus.)، iskati (OSl.) "وە شوێن کەوتن، داوا کردن"، iccháti (OIn.) "وە شوێن کەوتن، حەز و ئارەزوو کردن". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی "یەزدان" دەبێتە ئەو هێزەی کە داوای لێکراوە [پەرستراوە، حەزی لێکراوە] و "جێژن" یش دەبێتە ئاهەنگی داواکاری یاخود تکا و پاڕانەوە لە یەزدان.

لە کۆتایی ئەم باسەدا پێویستە ئاوڕێک لە بنەوشەی yaz- (Aw.) و yad- (OP.) "دووعا کردن، پەرستن، عیبادەت کردن" بدەینەوە. بنەوشەی yad- بە تەواوی دەگەڵ وشەی ↑یاد yad "بیر، بیرەوەری" دە زمانی کوردمادی و فارسیدا رێک دەکەوێ. زۆر وێ دەچێ کە "یاد" شێوەیەکی دیکە بێ لە حەز ħez. لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە "یاد کردن" دە بنەڕەتدا حەز کردن لە شتێک یان کەسێک بووە، واتا کاتێک کەسێک یان شتێک بزر بووە، ئارەزوومەندانە بیری لێ کراوەتەوە و خۆزگەی دیتنەوەی کراوە.

**جێڵ cel** *[ jel ]* - "لاو، جوان، جەوان": کورتکراوەی جحێڵ cıħêl. "جحێڵ" خۆی دەچێتەوە سەر ***جاهل*** *jahil* (Arb.) "نەزان". مەبەست ئاماژە کردنە بە کەم ئەزموونی مرۆڤی لاو. دە زمانی عەرەبیدا جیل jīl (Arb.) بە مانای "بەرە، وەچە، نەسل" بەکار دێ. ئەم وشەیە دەشێ لە جێڵ cel وەرگیرابێ، واتا هەرچەند وشەکە خۆی ریشەی عەرەبی هەیە، بەڵام وشە کوردێنراوەکە بە مانایەکی برێک جیاواز دیسان چۆتەوە ناو زمانی عەرەبی.

[تێبینی: دوو چەمکی "لاو، جوان" و "بەرە، وەچە، نەسل" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و هەر بۆیە ئەو وشانەی دەربڕی ئەم چەمکانەن، لە ریشەیەکەوە پەیدا بوون. بۆ وێنە وشەی وەچە "نەسل" خزمە دەگەڵ "بێچوو". وشەی Generation "نەسل" دە زمانە ئەورووپییەکاندا ریشەی لاتینی هەیە و خزمە لەگەڵ "زان" و "زارۆک" دە زمانی کوردمادیدا].

# چ (Ç)

**چ** **çı** [ *čı* ] - "جێناوێک": ده فارسیدا چه če (P.). خزمه دەگەڵ هێندێک جێناوی دیکه وەک ↑چەوا çewa، ↑کوا kuwa، ↑کوو ku (چوو çu)، ↑کەی key، ↑کێ ke و هتد. ئەم وشانه دەگەڵ هاوتاکانیان ده زمانه ژێرمەنییەکاندا دەچنەوه سەر ریشەی **(IE.) *k(w)i- >** "چی، چەوا، کەی".

**چا** **ça** [ *čā* ] - "بەری پنچکێکه ده ئاوی کوڵاو دا دەمی دەکەن": چایی çayî یش دەگوترێ. ئەسڵی وشەکه ده زمانی چینیدا chha (Chin.) یه. زۆربەی زمانه هیندوئەورووپییەکاندا ئەم وشەیان وەرگرتووه وبه شێوەی جۆربەجۆر بەکاری دێنن.

**چابوک** **çabuk** [ *čābuk* ] - "خێرا، لەش سووک": ده فارسیدا چابک čābok (P.). خزمه دەگەڵ ↑سووک suk/ سڤک sıvık [سبک sebok (P.)].

**چاپ** **çap** [ *čāp* ] - "1- شەقڵی خەرمان 2- نووسینی به دەزگا": ده فارسیدا چاپ çap "نووسینی به دەزگا". [له پێشدا تێبینییەک: ده زمانی ئاڵمانیدا چاپ کردن دەبێته drucken (G.). ئەم وشەیه خزمه دەگەڵ Druck (G.) "گوشار، پاڵ، پەستان". ده زمانی ئینگلیزیدا press (E.) "چاپ" به کار دەهێندرێ که ده بنەڕەتدا مانای "گوشار و پاڵەپەستۆ" دەدا. ئەم پێوەندییه لێرەوه دروست بووه که سەرەتا له پیشەسازی چاپدا به پێچەوانەی نووسینی به دەست، شەقڵی پیتەکان، چێ کراو لەسەر تەخته یان ئاسن، به گوشار خراوەنەته سەر کاغەز]. ئەگەر ئەم پێوەندییانه لەبەرچاو بگرین، دەگەینه ئەو ئەنجامه که ده زمانی کوردمادی و فارسیشدا وشەکه دەبێ سەرەتا مانایەکی لەم چەشنەی هەبووبێ. ئەم مانایه ده زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا ده هێندێک وشەدا دەبینرێ. ژمارەیەک لەم وشانه لەژێر↑شەپ şep دا باس کراون و دەچنەوه سەر ریشەی **(IE.) *skeub- >** "پاڵ پێوەنان، ڕاماڵین، هاویشتن، پێدادان".

**چات[1]** **çat** [ *čāt* ] - "لەتەپەڕۆ، شریتی پاک کردنەوەی تفەنگ": خزمه دەگەڵ ↑چەتفه çetfe.

**چات[2]** **çat** [ *čāt* ] - چات کرد ن واتا "پەڕاندن، تیر هاویشتنه سەر مێ". خزمه دەگەڵ ↑چات[1] çat "لەتەپەڕۆ، شریتی تفەنگ پاک کردنەوه". ئەم دوو "چات"ه هەرچەند له مانادا زۆر لێک جیاوازن، بەڵام ده ریشەدا دەگەنەوه یەک. هەردووک وشه دەچنەوه سەر ریشەی **(IE.) *(s)kēu- >** "دەرپەڕاندن، به زۆر ناردنه پێش، ره پاڵ نان، راو نان، پەله کردن".

**چاتمه** **çatme** [ *čātma* ] - "پێک هەڵپەساردنی تفەنگان": خزمه دەگەڵ stemmen (G.) و (Nl.)، forstemmen (OE.)، stämma (Sw.) "وەستاندن، پاڵ پێوەدان"، سەر به ریشەی **(IE.) ste(h)ā- >** "وەستان، وەستاندن، دانان". هەروەها بڕوانه ↑ساتمه satme "هەڵەنگوتن".

**چاخ 1** **çax** [ *čāx* ] - "سەردەم، رۆژگار": ئەم وشەیه، تا ئەو جێگەی من زانیاریم هەبێ، به مانای "دەم، کات" نییه، بەڵکوو به مانای "سەردەم، دەوران" بەکار دێ، بۆ وێنه دەگوترێ "چاخی بەردین"، بەڵام ناگوترێ "چاخی نان خواردنی بەیانی"! واتا وشەکه ئاماژه به "دەورەیەکی زەمانی" دەکا، نەک به "دەمێکی کورت و کەمخایەن". لەم تێڕوانینەوه وشەکه دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چەرخ çerx [کۆنتر چەخر çexır بووه]. "چەرخ"یش ده زمانی کوردمادیدا به مانای "سەردەم، سەدە" بەکار دەهێنرێ، وەک "چەرخی بیستەم".

**چاخ 2** **çax** [ *čāx* ] - "ساز، تەیار، چێکراو": [سەبیلەکه چاخ که]. شێوەیەکی دیکه له ↑ساز saz. ↑چاک çak و↑ ساخ sax یش لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن.

**چاخ 3** **çax** [ *čāx* ] - "قەباڵەی مڵک": ↑بنچاخ bınçax یش دەگوترێ. کەرتی بن bın له وشەی "بنچاخ"دا وەک پێشگری -ur ده زمانی ئەڵمانیدا وایه و ئاماژه دەکا به دەسپێک و بنەڕەت [وەک Urkunde "بنچاخ،

سەنەد، مەدرەك"، Ursprung "سەرچاوە، بنەچەکە" و هتد]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "شەقڵ، مۆر، وێنە، ئەسک" دەکەن، وەك ↑شەقڵ şeqil "مۆر"، ↑ئەسک esık [ئە- سک] "وێنە، عەکس". کەوابوو چاخ یان بنچاخ ئاماژەیە بەو وێنە یان مۆرە فەرمییە کە لەسەر قەباڵەکە دراوە و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ و لەوانەیە پشتاوپشت وەك سەنەد و مەدرەك پشتی پێدەبەسترێ.

چاخان **çaxan** [ *čāxān* ] - "لاف و گەزاف": چاخان čāxān (P.). خزمە دەگەڵ سخن soxan (P.) و ↑سۆز soz [سوێز suwez] واتا "قسە". دە کوردمادیدا باوە دەڵێن "ئەو قسانە هەمووی سوێزن"، واتا ئەو قسانە هەر قسەن و ناچنە بواری کردەوە.

چاخمە **çaxme** [ *čāxma* ] - "ئاڵقەی کانزا کە دەخرێتە کونی کەمەربەندەوە": بنەوشەی چاخ -çax دەشێ پێوەندی هەبێ بە هێندێك وشەی وەك ↑جەغز ceğız، ↑یەخە yexe، یوغ yūġ (P.) "کەڵەوە". ئەم وشانە هەموو ئاماژە بە فۆرمی ئاڵقەیی دەکەن.

چاتۆڵ **çatol** [ *čātol* ] - "خێوەتی تەنکی هاوینە": شێوەیەکی دیکە لە ↑چادرçadır.

چادر **çadır** [ *čādır* ] - "1- پەڕۆی داپۆشین 2- خێوەت": دە فارسیدا چادر čādor (P.) "چارشێو". خزمە دەگەڵ Schatten (G.)، scato (OG.)، shade و shadow (E.)، scadus (Gt.)، schaduw (Nl.)، scath (OIr.) "سێ، سایە"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *skot-*** "تاریکایی، سێبەر". skodde (Nor.) "تەم و مژ" دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیە [ڕەنگە وشەی scottland لێرەوە هاتبێ بە مانای "وڵاتی تەم و مژ، وڵاتی سێبەر یان تاریک"؟]. هەروەها skotos (Gr.) "تاریک" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑چەتر çetır و ↑چادر çadır "خێوەت، پەڕۆی داپۆشین"، ↑ستر2 sıtır "(دا)پۆشینی نهێنی"، ↑سترە sıtre "کەوای کورتی سەر جلیقە". دیارە "چادر" و "چەتر" سێبەر و تاریکایی دروست دەکەن و بۆیەش وەسا بەناو کراون. شیاوی سەرنجە کە دە زمانی یۆنانیدا skotos (Gr.) "تاریک"، skiđ (Gr.) "سێبەر" پێوەندی ئەم چەمکانە بەیەکەوە نیشان دەدەن.

چار1 **car 1** [ *čār* ] - "ئەژماری چوار": ↑چوارcuwar.

چار2 **car 2** [ *čār* ] - کورتکراوی ↑چادر çadır دە هێندێك وشەدا وەك چارشێو، چارۆکە.

چار3 **çar 3** [ *čār* ] - "مەڕی ڕەش، مەڕی ڕەشی گوێ سپی": خزمە دەگەڵ ↑چوڕ çur [چوڕی شیر "سپیایی بێگەردی شیر"].

چارچەقڵی **çarçeqlî** [ *čārčaqlī* ] - "چوارپەل": چار çar [↑چوار cuwar] + چەقڵی çar + çeqlî. "چەقڵی" خزمە دەگەڵ ↑شەق şeq "لاق". شیاوی باسە کە ↑چاق çaq دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "لینگ، لاق" بەکار دێ.

چارداغ **çardaġ** [ *čārdāġ* ] - "کۆخی ناو باخ و بێستان": چار + داغ çar + daġ. داغ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تیغە tîġe "دیوار، لەمپەر". لەم تێڕوانینەوە چارداغ ماناکەی دەبێتە "چواردیواری".

چارشێو **çarşêw** [ *čāršew* ] - "پەڕۆی بەخۆ دادانی ژنان": دە فارسیدا چادرشب čādoršab (P.). پێك هاتووە لە چار [چادر] + شێو çar + şêw. شێو şêw شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شەو şew. مەبەست لە "چادرشەو" یاخود چارشێو ئاماژە بە ڕەنگی ڕەشی پەڕۆیە.

چارك **çark** [ *čārk* ] - "برینگ": خزمە دەگەڵ Schere (G.)، shears (E.)، skra i (OIs.) "چارك، برینگ، مەقەست"، scār (OG.) "کێرد، چارك"، scheren (G.) "هەڵپاچین"، skriti (Lit.) "هەڵپاچین، لێکردنەوە"، scaraim (OIr.) "لێی دەکەمەوە، جوێی دەکەمەوە". ئەم وشانە دەچێتەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *(s)ker-*** "برین، هەڵپاچین". ئەم ریشەیە یەکێکە لەو ریشانەی کە چ دە زمانی کوردمادیدا و چ دە زمانە هیندوئەورووپییەکانی دیکەدا گەلێک لک و پۆی لێ بۆتەوە و بە دەیان وشەی جۆربەجۆری لێ کەوتۆتەوە. هێندێك لەم وشانە دە زمانی کوردمادیدا بریتین لە ↑کێرد kerd، ↑شڕ şır [شڕ و دڕ]، ↑کەرت kert "لەت، پاژ، دەستە"، ↑کرتاندن kırtandın [قرتاندن qırtandın]، زار zar [زەوی و زار zewî u

-zar "زار" - دە بنەڕەتدا واتا "کەرتەزەوی"، ↑هەوجاڕ hewcar [هەو-جاڕhew-car] "ئاسنی کێڵانی زەوی"، ↑شیر şîr "ئامێری شەڕ" و هتد.

**چاروە çarwe** [ *čārwa* ] - "چەقەنە، دوو پارچە کانزا بۆ دەنگ لێهێنان دە قامکەکانی دەکەن و لێکی دەدن": بنەوشەی چار-çar خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑چرکیان çırkîyan "بزوان، تەکان خواردن".

[تێبینی: ناوەکەی دیکەی ئەم ئامرازە چەقەنە çeqene یە و ئەمیش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "راوەشاندن، تەکان دان"].

**چار1 care 1** [ *čāra* ] - "دەموچاو، سوورەت": چڕ çır یش دەگوترێ [چڕ و چاو çır û çaw یان چڕ و تیوچاوان]. دە فارسیدا چهره čehre (.P). ئەم وشەیە لە ↑چار car بە مانای "چوار" وەگیراوە و دە بنچینەدا مەبەست وێچواندنی دەموچاو بە شتێکی چوارلایی یاخود بە وێنەیەکی ئەندازەیی لاکیشەییە. دە زمانی فەرانسەییشدا carré (.Fr) بە مانای "چوارگۆش" و هەروەها بە مانای "چار(ە)" دێ. ئەم وشەیەی زمانی کوردمادی چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە **صورة** sūra(t) (.Arb). دیارە زمانی عەرەبی فۆتیمی ç ی تێدا نییە و بۆیە ئەم فۆتیمە لەوێدا بووەتە s. ئەگەر وشەکە بە ئەسڵ عەرەبی بایە، پێویست نەدەبوو فۆتیمی s دە کوردمادیدا بکرێتە ç.

**چار2 çare 2** [ *čāra* ] - "1- عیلاج، چاک کردن(ەوە) 2- بەخت": چارە čāra (.P)، čar (.Pl)، čārā (.Av). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ heil (.G) "ساغ" و heilen (.G) "چاک کردنەوە، ساغ کردنەوە"، whole (.E) "تەواو، گشت، ساغ" و hale (.E) "تەرو تازە، دانەهێزراو"، hel (.Sw) "تەواو، گشت"، Heil (.G) و heill (.OIs) "ساغی، بەخت، بەختەوەری، رزگاری". لەم تێڕوانینەوە چارەکردن دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای *چاک کردنەوە* (ساغ کردنەوە) ی کەسێکی ناساخ یان رزگار کردنی کەسێک لە رەوشێکی نالەبار و یان *چاک کردنی* بارودۆخێکی ناهەموار بووبێ. ئەم وشە ژێرمەنییانە بەگوێرەی بۆچوونێک دەچنەوە سەر ریشەی < *(IE.) *keilos-* "تەواو، گشت". چڵ çıl [نیوەچڵ واتا نیوە لە گشت، ناتەواو]. دە زمانی کوردمادیدا ↑چڵ çıl "ساز، تەواو، دروست کراو" [نیوەچڵ واتا ناتەواو، نیوەساز] و هەروەها ↑چڵیان çılîyan "دروست بوون، ساز بوون، تەواو بوون" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە. وەک لە مانای وشە ژێرمەنییەکاندا دەبینین، وشەکە هاوکات مانای "بەخت" یش دەدا. ئەم مانایە دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا پارێزراوە، کاتێک دەڵێین چارەرەش çarenus، ↑چارەنووس çarenus، بێچارە beçare. دیارە لەم وشانەدا "چارە" ئاماژە بە "بەخت" دەکا، بەختێکی رەش یان بەختێکی لەپێشەوە نووسراو [دیاریکراو] و هتد.

**چارەنووس çarenus** [ *āčranūs* ] - "بەخت و بەسەرهات": چارە + نووس çare + nus. ↑چار2 çare 2 واتا "بەخت" و "چارەنووس" واتا بەختی نووسراو. مەبەست ئەوەیە بەختی هەر کەس لە پێشەوە دیاری کراوە.

**چاق1 çaq 1** [ *āčq* ] - "قەڵەو": چاق çaq (.P). شێوەیەکی دیکە لە ↑تۆخ2 tox 2 "قەڵەو، توند، بەهێز".

**چاق2 çaq 2** [ *āčq* ] - "لینگ، لاق": خزمە دەگەڵ ↑شەق şeq "پێڵاقە" [دە بنەڕەتدا لاق لێدان یان بە لاق لێدان]، ↑چۆک çok و *ساق* saq (.P) "لای خوارەوەی لاق".

**چاک1 çak 1** [ *čāk* ] - "باش، دروست، ساز": ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا بە چەند شێوەیەک [و بە چەند مانایەکی بڕێک جیاواز، بەڵام هاوپێوەند] خۆ نیشان دەدا، وەک چاک çak، ↑چاخ çax، ↑*ساخ sax*(ساغ saġ)، ↑ساز saz. دە زمانی فارسیدا بنەوشەکە بە دوو شێوەی ساخ -sax و ساز -saz دە کرداری ساختن sāxtan (.P) و می سازم mīsāzam (.P) دا دەردەکەوێ و ماناکەی دەبێتە "ساز کردن، چێ کردن، دروست کردن". وا دەردەکەوێ مانای بنەڕەتی وشەکە "دروست کردن، چێ کردن" بووبێ و لەوێوە ماناکانی دیکە وەک ساغ [تەندروست] و چاک [راست و دروست] و چاکە [راستی و دروستی] پەیدا

بووبن. ده زمانی فارسییدا چاق čāq (P.) یش هه‌یه [چاق سلامتی čāqsalāmatī واتا "چاك و خۆشی"]. ئه‌م "چاق"ه ی زمانی فارسی پێوه‌ندی به "چاق" به مانای "قه‌ڵه‌و" نییه. مه‌به‌ست له "چاق سلامتی" و "چاك و خۆشی" کوردمادی ده‌بنه‌ڕه‌تدا ئه‌وه‌یه که مرۆڤ له کاتی پێك گه‌یشتندا له *ساغی* و ته‌ندروستی یه‌کتر ده‌پرسێ و هه‌روه‌ها ساغی و خۆشی بۆ یه‌کتر ئاره‌زوو ده‌کا.

**چاك2 çak** [ *čāk* ] - "گۆڕی مرۆڤی پیرۆز، گۆڕی چاکه‌کار": ئه‌م وشه‌یه ده‌گه‌ڕێته‌وه سه‌ر ↑چاك çak به مانای "باش، دروست، ساغ، ته‌واو".

[تیبینی: سه‌باره به پێوه‌ندی چه‌مکه‌کانی باش، چاکه، ساخی، ته‌واو بوون و پیرۆز بوون ده‌توانیین چه‌ند وشه‌یه‌ك له زمانه ژێرمه‌نییه‌کان به نموونه بهێنینه‌وه، بۆ وێنه وشه‌ی heil (G.) "ساغ" و heilen (G.) "چاك بوونه‌وه، ساغ بوونه‌وه"، whole (E.) " ته‌واو، گشت، ساغ" و hale (E.) "ته‌رو تازه، دانه‌هێزراو"، hel (Sw.) "ته‌واو، گشت"، Heil (G.) و heill (OIs.) "ساغی، به‌خته‌وه‌ری، رزگاری" و heilig (G.) و holy (E.) "پیرۆز" (ئه‌وشته‌ی ساخی و به‌خته‌وه‌ری دێنێ ؟). هه‌روه‌ها شیاوی باسه که گشت ئه‌م وشه ژێرمه‌نییانه ده‌چنه‌وه سه‌ر ریشه‌ی **(IE.) *keilos-** < "ته‌واو، گشت". هه‌ڵی سه‌نگینه ده‌گه‌ڵ ↑چڵ çıl "ساغ، ته‌واو" و "نیوه‌چڵ" به مانای "ناته‌واو"].

**چاك³ çak** [ *čāk* ] - "قه‌ڵش، ده‌رز": ده فارسیدا چاك čāk (P.). ئه‌م وشه‌یه به تایبه‌تی بۆ ده‌رز و قه‌لش له داوێنی کراس و شتی وا به کار ده‌هێندرێ. ده زمانی کوردمادیدا ↑چاکه‌ڵ/ ↑شاقه‌ل çakel /şaqel به‌و له‌ته شۆڕ و درێژانه‌ی داوێنی جلوبه‌رگ ده‌گوترێ که به هۆی ده‌رز تێخستن و هه‌ڵبرین له یه‌کتر جوێ ده‌کرێنه‌وه. خزمه ده‌گه‌ڵ ↑چه‌قۆ çeqo و ↑شه‌ق şeq [شه‌ق و شڕ]،↑شه‌قارşeqar، ↑شێ şê، ↑جیا cîya و گه‌لێك وشه‌ی دیکه سه‌ر به ریشه‌ی **(IE.) *(s)kei-** < "بڕین، قه‌ڵشاندن، لێك جیا کردنه‌وه".

**چاکڵ(ه) çakıl** [ *čākıl* ] - "داری سه‌ری گوریس": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑زه‌ق zeq "ده‌رپه‌ڕیو". وشه‌ی ↑چوکڵه çukle "نیشانه‌ی سه‌ر پیت ده ئه‌لفبێی کوردمادیدا" پێوه‌ندی به‌م وشه‌وه هه‌یه. ئه‌م نیشانه‌یه شێوه‌که‌ی له "چاکڵه" ده‌چێ.

**چاکه‌ت çaket** [ *čākat* ] - "جۆرێك کۆت": ده ئه‌سڵدا ده‌چێته‌وه سه‌ر jacques (F.). ئه‌م وشه‌یه نازناوێك بووه بۆ جووتیارانی فه‌رانسه‌یی و دوایه‌ش بووه‌ته ناوی ئه‌و جلکه تایبه‌تییه‌ی ئه‌وان له‌به‌ریان ده‌کرد. ئه‌م وشه‌یه که‌وتووه‌ته ناو زمانه ئه‌ورووپییه‌کانی دیکه و هه‌روه‌ها زمانی کوردمادیش.

**چاڵ1 çal** [ *čāl* ] - "قوڵکه": ده فارسیدا چاله čāle (P.). خزمه ده‌گه‌ڵ skalein (Gr.) "چاڵ دروست کردن، هه‌ڵکه‌ندن" و skakis (Gr.) "قووڵینگ"، سه‌ر به یه‌کێك له دوو ریشه‌ی **(IE.) *(s)kel-** < "قه‌لشاندن، بڕین ، لێك جودا کردنه‌وه" یان **(IE.) *skel-** < "خوار". [قووپاوییه‌ك له زه‌ویدا ؟].

**چاڵ2 çal** [ *čāl* ] - "پووش": ده‌گه‌ڵ "چیلکه" یان "چڵته" دێ [چیلکه و چاڵ çîlke u çal یان چڵته و چاڵ]. هه‌م چاڵ çal و هه‌م ↑چڵته çılte خزمن ده‌گه‌ڵ ↑چه‌ڵتووك çeltuk "برینجی به توێکله‌وه".

**چاڵاغ çalaġ** [ *čālāġ* ] - "سڵ، تووش، ره‌وه‌ك": شێوه‌یه‌کی دیکه له ↑چڵه‌ك çılek.

**چالاك çalak** [ *čālāk* ] - "چوست و خێرا": خزمه ده‌گه‌ڵ هێندێك وشه که ئاماژه به جم و جۆلی خێرا [یان خێرایی ده جموجۆڵ دا] ده‌که‌ن، وه‌ك ↑چه‌ڵه‌کین çılekîn [راچڵه‌کین]، ↑چڵه‌ك çılek "ئاژه‌ڵی ره‌وه‌ك"، ↑چلاپه çılape "قه‌ڵه‌مباز، په‌ڕین" و هتد.

**چالوو çalu** [ *čālū* ] - "کوره‌به‌ش": چوالوو çuwalu و چالگ çalıg یش ده‌گوترێ. ناوی ئه‌م ئاژه‌ڵه به فارسی"گورکن"ه واتا "گۆڕهه‌ڵکه‌ن". لێره‌وه به‌و ئه‌نجامه ده‌گه‌ین که ده زمانی کوردمادیشدا ناوی ئاژه‌ڵه‌که ده‌چێته‌وه سه‌ر وشه‌ی ↑چاڵ çal "گۆڕ، قوڵکه".

[تیبینی: له ناوه‌که‌ی دیکه‌ی ئه‌م ئاژه‌ڵه‌شدا، واتا "کوره‌به‌ش"، که‌رتی "کور" خزمه ده‌گه‌ڵ وشه‌کانی قووڵ (قووڵکه) و گۆڕ. که‌رتی "به‌ش" ده‌شێ خزم بێ له‌گه‌ڵ "پشکنین"، واتا ئاژه‌ڵێك که گۆڕ ده‌پشکنێ].

**چام çam** [ *čām* ] - "خواری و پێچ": شێوەیەکی دیکەیە لەچەم çem سەر بە کرداری ↑چەمانەوە çemanewe.

**چان1 çan** [ *čān* ] - "1- باگردێنی دارین بۆ ورد کردنی کلۆش 2- جەنجەڕ": خزمە دەگەڵ ↑جنین cınîn "ورد کردن، بڕین".

**چان2 çan** [ *čān* ] - "گەسکی لە شووڵ چندراو بۆ جۆماڵ": چانە çane ش دەگوترێ. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑چنین çınîn، مەبەست لێرەدا چنینی ئامرازەکەیە.

**چان3 çan** [ *čān* ] - "زەنگوڵەی ئاگادار کردنەوە": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زەنگ zeng. وەک بنەوشە لە ↑چانکوچ çankuç "زەنگوڵە لێدان کاتی کۆچ کردنی کاروان" و ↑چانکوش çankuş "زەنگ لێدەری کلیسا" دا دەیبینین.

**چاند çand** [ *čānd* ] - "فەرهەنگ": دەچێتەوە سەر کرداری ↑چاندن çandın. [تێبینی: دە زمانە ئەورووپییەکاندا وشەی فەرهەنگ بۆ وێنە Kultur (G.) یان kulture (E.) دەچێتەوە سەر cultura (L.) بە مانای "کشتوکاڵ کردن". دە زمانی کوردمادیشدا ئەم پێوەندییە ڕەچاو کراوە].

**چانکوچ çankuç** [ *čānkuč* ] - "زەنگوڵە لێدان کاتی کۆچ کردنی کاروان": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑چان3 çan.

**چانکوش çankuş** [ *čānkuš* ] - "مجێور یان زەنگ لێدەری کلیسا": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑چان3 çan. کەرتی دووەمی وشەکە - کوش- لەوانەیە پێوەندی بە "کێشان"ەوە هەبێ، چونکوو زەنگی کلیسا پەتێکی پێوەیە کە بۆ زەنگ لێدان رایدەکێشن.

**چاندن çandın** [ *čāndın* ] - "تۆو وەشاندن": شاندن şandın یش دەگوترێ. هەروەها ↑شانین şanîn هەیە بە مانای "فڕێ دان". بنجی چان -çan / شان -şan خزمە دەگەڵ säen (G.)، saian (Gt.)، saw (E.)، sa (Sw.) "چاندن"، سەر بە ریشەی <  *se(i)- (IE.)* "وەشاندن، پرژاندن، پێوەرکردن، فڕێ دان". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑چنجک çıncık "دەنک"، ↑دان dan، ↑دەنک denık و ↑تۆوtow و هەروەها ↑هەت1 *het* "کن، نک، چەم".

**چاو çaw** [ *čāw* ] - "ئەندامی پێ دیتن": لەوانەیە پێوەندی بە یەکێک لەم ریشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ریشەی < **(s)keu- (IE.)* "سەرنج دان، ئاگا لێبوون، وشیار بوون". ئەم وشانەی خوارەوە لەم ریشەوە هاتوون: schauen (G.) "چاو لێکردن، سەرنج دان"، schouwen (Nl.) "چاو لێکردن"، show (E.) "نیشان دان"، skygn (OIs.) "وردبین، زیت"، skygna (OIs.) "سیخوڕ". ↑سیخوڕ sīxur "شۆڤار، جاسووس" دەشێ دەگەڵ ئەم وشانە خزم بێ. هەروەها وشەی جوان1 juwan "خۆشیک" [دە بنەڕەتدا: سەرنجڕاکێش] پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

2- ریشەی < **sek- (IE.)* "هەست پێکردن، دیتن": ئەم وشانەی خوارەوە لەم ریشەوە هاتوون. sehen (G.)، sehan (OG.)، saíhan (Gt.)، see (E.)، se (Sw.) "دیتن"، مانای بنەڕەتی ریشەکە بریتییە لە"چاو بە دوودا گێڕان، (بەچاو) شوێن کەوتن". sequi (L.) "شوێن کەوتن، بەدوادا هاتن"، sácatē (OIn.) "دوای دەکەوێ، ڕەگەڵ دەکەوێ، بە دوادا دێ"، sekt (Let.) "شوێن کەوتن، شۆپاندن" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. بەم پێیە دەبینین کە لە مانای "شوێن کەوتن"ەوە مانای "بەچاو شوین کەوتن" و دواتر "دیتن" پەیدا بووە. زۆر ڕێی تێ دەچێ وشەی "چاو" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو دە زمانی کوردیدا وشەی ↑سەرچاوە serçawe هەیە کەئەم شیمانەیە بەهێز دەکا. "سەرچاوە" ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ بە شۆپاندن و شوێن کەوتنی شتێک، بۆ وێنە جۆگەلەئاوێک، پێی دەگا. ئەگەر دە نێوان ئەو دوو چەمکەی سەرەوە، واتا "دیتن" و "شۆپاندن"دا پێوەندی نەبێ، چۆن دەتوانین لە وشەی "چاو"ڕا بە وشەی "سەرچاوە" بگەین کە باس لە ژێدەر و دەسپێکی شتێک دەکا؟

3- ریشەی < (IE.) *soku- "گوتن" [کۆنتر: "دیتن، نیشان دان"]. ↑سۆز soz "1- گفت، بلێن 2- قسە" لەم ریشەوە هاتووە.

**چاوبز çawbız** [ *čāwbız* ] - "چاوزەق": چاو + بز çaw + bız. کەرتی بز bız- خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بۆق boq، ↑بەس *bes*، ↑بۆش boş، ↑فیز fîz و↑فش fış هتد. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < (IE.) *bhu- "ماسین، هەڵپزان، فش و فۆڵ بوون".

**چاوگ çawıg** [ *čawıg* ] - "بنەمای وشە، مەسدەر": پێوەندی هەیە بە ↑سەرچاوە serçawe و دواتر ↑*چاو* *çaw*.

**چاونەزێر çawnezer** [ *čāwnazer* ] - "بە ئێرەیی، بە تەماح، چاوبرسی": چاو + نە + زێر çaw + ne + zer. کەرتی زێر zer- شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تێر ter [دە فارسیدا سیر sîr (P.)]. تێکڕای وشەکە دەبێتە ئەو کەسەی چاوی تێر نییە، واتا چاوبرسییە.

**چاوە çawe** [ *čāwa* ] - دەگەڵ "خانوو" دێ [چاوەخانوویەک واتا ژوورێک لە خانوو]. چاوە دەبێ ئاماژە بە "پەنجەرە" بکا لە هۆدەیەکدا کە دەبێتە مایەی رووناکایی و دیتنی دیوی دەرەوە، هەر وەک چۆن "چاو" یش لە لەشدا ئەو ئەرکەی هەیە. جا لەبەر ئەوەی هۆدەکانی پێشوو یەک پەنجەرەیان تێدابووە، ئیتر "چاوە" بووەتە هێمای هۆدەکە و چاوەیەک بە مانای ژوورێک بەکار هاتووە.

[تێبینی: لەباری مانا و چۆنیەتی دروست بوونی وشەکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ augatora (OG.) و augadauro (Gt.) "پەنجەرە" - دە ئەسڵدا: دەرگایەکی چاوئاسا - و vindauga (OIs.) "پەنجەرە" - دە ئەسڵدا: چاوی پێداهاتنی با واتا هەوا. وشە ئیسلەندییەکە دە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە window].

**چاوەزار çawezar** [ *čāwazār* ] - "دەرد لە چاوی پیسەوە": چشم زخم češmzaxm (P.). وەک دەبینین وشەکە دە زمانی فارسیدا "زخم"ی لەگەڵە، واتا "زام، برین". کەوابوو کەرتەوشەی "زار" دە وشە کوردمادییەکەدا چ پێوەندییەکی بە "زار" بە مانای "دەم"ەوە نییە. بەڵکوو دەبێ بە مانای "زام، برین، ئێش و ئازار" بێ. کاتێک کەسێک "چاوی پیس" لە کەسێک دەدا و ئەو کەسە تووشی "چاوزار" دەکا، مەرج نییە کەسی "چاوپیس" قسەیەکی بە دەمدا هاتبێ. ئەو دەتوانێ هەر بە فکر و بیر و بەبێ زار کردنەوە "چاوی پیس لێ بدا". کەوابوو "زار" دە وشەی "چاوزار"دا، هەروەک باس کرا، ماناکەی "زام، ئێش و ئازار"ە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ↑جەخارا1 cexar "کەسەر، ئێش و ئازار".

**چایگ çayıg** [ *čāyıg* ] - "سارد و فێنک: چیاگ çîyag یش دەگوترێ. هەروەها ↑چایین çayîn و ↑چایمانی çaymanî هەن بە مانای "سەرما بوون، نەخۆش کەوتن لە سەرمان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سایقە sayqe [سایەقە sayeqe] "بەستەڵەک"، دواتر دەبنە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زستان zıstan [زڤستان zıvstan]دا باس کراون. وشەکە دەشێ بەم جۆرە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ: زاماک zamak← ساماک samak ← ساواک sawak ← سایاک sayak ← چایگ çayıg. لەم بارەوە بەتایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی ↑زما zıma "سەرما" و ↑زماک zımak "نسار".

**چپە çıpe** [ *çıpa* ] - "سرتە": سرپە sırpe ش دەگوترێ. چپاندن çıpandın و سرپاندن sırpandın بە مانای "سرتە کردن" دێ. هەروەها ↑چفاندن çıfandın هەیە بەمانای "سەرکۆنە کردن" [دەبنەڕەتدا: قسە پێگوتن]. وشەکە دە ئەسڵدا بە مانای "قسە کردن"ە و ئەم مانایە دە وشەکانی دواندن duwandın [↑دوان duwan] و ↑بەرسڤ bersıv [ber-sıv] "وەڵام"دا پارێزراوە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ sprächen (G.)، sprehhan (OG.)، sprecan (OE.)، speak (E.) [سەرنجی سوانەوەی فۆتیمی r بدە لە وشە ئینگلیزییەکەدا لەچاو ئینگلیزی کۆن]، spreken (Nl.) "قسە کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < (IE.) *(s)p(h)er- بانگ کردن، دەنگدانەوە، زرینگانەوە". spraka (Sw.) و spraka (OIs.) "خشەخش کردن، تەپەتەپ کردن" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها چەندین وشە هەن کە مانایان لە وشە سوێدییەکە نیزیکە، وەک ↑شپ şıp یان شەپە şepe "خشە" [شپەشپ،

شەپەشەپ]، ↑شاڤین şavîn "باقاندنی کەروێشک" و هتد. دە وشەی "چپە"دا، هەروەک speak ی ئینگلیزی، فۆتیمی r سواوەتەوە. ئەسڵی وشەکە دە زمانی کوردمادیدا دەبێ "سپره *spre" بووبێ و دواتر بووەتە سرپە sırpe و پاش چەند ئاڵۆگۆڕێک وشەکانی دیکە پەیدا بوون.

**چتۆ çıto** [ *čıto* ] - "چلۆن، چەوا": četor (P)، چ + تۆ (ر) çı to(r) واتا بە چ شێوەیەک، بە چ ئاوایەک. پێوەندی هەیە بە ↑تەور2 tewır "جۆر، شێوە". وشەکە ئەم گۆڕانەی بەسەردا هاتووە: چ تەور çı tewr ← چتۆر çı tor ← چتۆ çıto.

**چتیر çıter** [ *čıter* ] - "بزنی دوو ساڵە": چتۆرçıtor و چۆشتیر çoştîr و تووشتیر tûştîr یش دەگوترێن. [↑ تووشتیرtûştîr].

**چچک çıçık** [ *čıčık* ] - "1- گوانی مەمک، گۆپکەی مەمک 2- میتکە": بروانە ↑تەتک tetık "لەپک".

**چڕ1 çır** [ *čır* ] - دەگەڵ "تیوچاوان" دێ [چڕ و تیوچاوان çır û newçawan]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چارە çare "دەموچاو، بیچم".

**چڕ2 çır** [ *čır* ] - "توند، سفت، خەست" [چڕ و پڕ، چڕەچەمان، چڕەدووکەڵ]. هەروەها ↑چیڕ çîr "توند، سفت" هەیە. دە زمانی فارسیدا چیره čīre (P) "زاڵ، بەدەسەڵات" مانا دەدا.

[تیبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "توند، سفت" و "زاڵ، بەدەسەڵات" دەتوانین وشە خزمەکانی خوارەوە بە نموونەن بهێنینەوە: بەرد berd و پاڵەوان palewan یان سەخت sext ی کوردمادی و Sieg (G) "زاڵ بوون" یان خار xar و کورد kurd "پاڵەوان، بەهێز"].

**چڕ3 çır** [ *čır* ] - چڕ دان واتا بەستنی توند [چڕی دە، با نەکرێتەوە]. خزمە دەگەڵ ↑جەڕاندن cerandın "با دانی بە گوشار".

**چرا çıra** [ *čırā* ] - " کەرەسەی رووناکی بەخش": چراغ čerāġ (P)، citra-h (OIn).

1- دە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئەڵمانیدا وشە هیندییەکە لەگەڵ heiter (G) "رووناک، بە شەوق" هەڵسەنگێندراوە کە ئەمەش دەبێ دەگەڵ ↑شاد şad [دە بنەڕەتدا: گەشاوە] خزم بێ.

2- لە لایەکی دیکەوە رێی تێ دەچێ وشەکەخزم بێ دەگەڵ Strahl (G)، strāla (OG)، straal (Nl)، strael (OE) "تیشک"، سەر بە ریشەی *(IE) *ster- >* "لەبەر یەک کشانەوە، پەل هاویشتن، بڵاو بوونەوە". وشەی ↑(ئە)ستێرە (e)stere لەم ریشەوە هاتووە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تیرێژ tîrej

**چراڤ çırav** [ *čırāv* ] - "زنە، زەل": چر + ئاڤ çır + av. بنەوشەی "چر" لێرەدا لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە زەل zel سەر بە کرداری ↑زەلین zelîn، تێکرای وشەکە واتا زەلاو [زەلکاو].

**چراوک çırawk** [ *čırāwk* ] - "مەشخەڵ": چراوڵە çırawle ش دەگوترێ. بڕوانە ↑چرا çıra.

**چرپی çırpî** [ *čırpī* ] - "شووڵ، لقەداری باریک": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ scripus (L) "گیایەکی پرلق وپۆ" و Schlif (G) "قامیش". بەپێی بۆچووتیک وشە ژێرمەنییەکە لە وشە لاتینییەکە وەرگیراوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑خەڵف xelıf یشمان هەیە بە مانای "لقەداری یەکساڵە". ئەم وشەیە هەر لەپێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرەوە دایە و زۆریش لە وشە ئەلمانییەکە دەچێ.

**چرتان çırtan** [ *čırtān* ] - "لەجێ چوونی ئێسک": خزمە دەگەڵ ↑چرتیان çırtîyan بە مانای "دەرپەڕین، هەلبەزین" و دە بنچینەدا دەبێ مەبەست "دەرچون یاخود دەرپەڕینی ئێسک" بووبێ.

**چرتاندن çırtandın** [ *čırtāndın* ] - "قرتە لێ هێنانی پەلە پیتکە": خزمە دەگەڵ ↑چرتیان çırtîyan بە مانای "دەرپەڕین، هەلبەزین". دە بنچینەدا مەبەست دەرپەراندنی پەلەپیتکەیە دوای کێشان و بەردانی.

**چرتک çırtık** [ *čırtık* ] - "قەڵەمباز": خزمە دەگەڵ ↑چرتیان çırtîyan "دەرپەڕین، هەڵاتن، ون بوون".

**چرتە çırte** [ *čırta* ] - "جووڵە، بزاڤ [یکی کەم]: خزمە دەگەڵ ↑چرتیان çırtîyan بە مانای "دەرپەڕین، هەڵبەزین، هەڵاتن". وشەکە دە سەرەتادا بە گشتی بە مانای "هەڵبەزین، بزاڤی توند وخێرا " بووە و پاشان ماناکەی کەمێک گۆڕدراوە و بووەتە "بزاڤێکی کەم". رەنگە مەبەست لە "کەم" سەرەتا کەم بوون

لەباری کاتییەوە واتا بزاڤێکی خێرا، زۆر کورت و کەمخایەن بووبێ و دواتر لێرەوە مانای "بزاڤێکی کەم مەودا" سەری هەڵدابێ.

**چرتیان çırtîyan** *[ čırtīyān ]* - "دەرپەڕین، هەڵاتن و ون بوون": دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەی دیکەشمان هەیە کە دەگەڵ چرتیان خزمن، وەک ↑چرتک çırtık "قەڵەمبان، هەڵبەزدابەز"، ↑چرتی çırtî "بزۆز، بەهەڵبەزدابەز"، ↑چرتان çırtan "لەجێ چوونی ئێسک" [دەرچوون یاخود دەرپەڕین لە جێی خۆی]، ↑جرت cırt [جرت و فرت]، ↑چرتە çırte "جووڵە، بزاڤ"، ↑چرتاندن çırtandın "قرتە لێ هێنانی پەلەپیتکە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ start (E.) "دەست پێکردن". ئەم وشە ئینگلیزییە دە بنەڕەتدا بە مانای "بەرێ کەوتن، دەرپەڕین، بازدان، هەڵبەزین" بووە [styrtan (OE.)]. ئەم مانایانە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا پارێزراون، بۆ وێنە stürzen (G.)، storten (Nl.) "کەوتن، کەوتنەسەر، بەپەلە خۆ پێدادان"، sterzen (MG.) "زەق بوون، دەرپەڕین"، Sterz (G.) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بە مانای "کلک"، سەر بە ریشەی **< *ster- (IE.)** "سفت، توند، راست، شەق ".

**چرتی çırtî** *[ çırtî ]* - "بزۆز، بە هەڵبەز و دابەز": خزمە دەگەڵ ↑چرتیان çırtîyan "دەرپەڕین، هەڵاتن، ون بوون".

**چرچ çırıç** *[ ıçrıč ]* - "ژاکاو، چین وچرووک دار": هاوریشەیە دەگەڵ shrink (E.)، skrynka (Sw.)، skrekka (Nor.) "چرچ بوون"، hrukka (OIs.)، rynke (Norw.)، rynka (Sw.) "قەد، لۆ، چرچ و لۆچی". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەی دیکەش پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑چرووک çıruk، ↑چرمقین çırımqîn "هەڵقرچاو"، ↑چرمسین çırımsîn یان چلمسین çılımsîn "ژاکاو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schräg (G.) "خوار و خێچ" و ↑ریق rîq "سیس هەڵاتوو، ژاکاو"، سەر بە ریشەی **< *(s)ker- (IE.)** "با دران، خوار بوون". وشەکانی چرمقین çırımqîn، ↑چرمسین çırımsîn یان چلمسین çılımsîn دەتوانین دەگەڵ ئەو وشە ژێرمەنییانەی خوارەوەش بەراورد بکەین: Schrumpfen (G.)، schrumpen (Nl.)، skrumpe (Dn.)، shrimp (E.)، skórbnut (Rus.)، skirbti (Lit.) "چرچ بوون، ژاکان"، سەر بە ریشەی **< *skremp- (IE.)** "خوار بوون، با دران، چرچ بوون". ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەکەی سەرەوە، واتا *(IE.) *(s)ker-* "با دران، خوار بوون".

[تێبینی: سەبارەت پێوەندی چرچ بوون دەگەڵ خوار بوون و با دران، سەرنج بدە کە دوو وشەی "چرچ و لۆچ" زۆر جار پێکەوە دێن- لۆچ بە مانای خوار و بادراوە].

**چرزەڵە çırzele** *[ čırzala ]* - " چووزەڵە، چووزەرە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چرو çıro.

**چرژ çırıj** *[ čırıž ]* - چرژ دان واتا "قەڵشان و درز بردنی شووشە". شێوەیەکی دیکەیە لە ↑درز/ دەرز dırız / deriz "قەڵش".

**چرژان çırıjan** *[ čırıžān ]* - دەگەڵ پێشگری "تێک" دێ [تێک چرژان واتا چوونە ناویەکەوە، تێک بەزین و چڕ و توند بوون]. دەچێتەوە سەر وشەی ↑چڕ çır "توند، پڕ، پەیت".

**چرسین çırsîn** *[ čırsīn ]* - "رەشکە و پێشکە کردنی چاو": دە فارسیدا وشەی *سیەچردە* sīyahčarde "هەیە بە مانای "رەش تاڵە". وەک دەبینین کەرتی čarde دە وشە فارسییەکەدا دەبێ بە مانای "تار، تاریک" بێ. دەتوانین وای بۆ بچین کە بنەوشەی چەرس -çers/ چەرد -çerd پێوەندی بە کرداری ↑شاردنەوە şardınewe هەبێ.

**چرک çırk** *[ čırk ]* - "دۆشاوی خەستی دوو جار کوڵاو": دەچێتەوە سەر وشەی ↑چڕ çır "توند، پڕ، پەیت".

چرکاندن **çırkandın** [ *čırkāndın* ] - "دڵۆپە کردن": هەروەها چرکەمیزە çırkemîze[چڵکەمیزە çılkemîze] هەیە بە مانای دڵۆپ دڵۆپ میز لێ تکان. خزمە دەگەڵ ↑چۆڕانەوە (çoran(ewe "ئاو لەبەر رۆیشتنی کەم کەم" [چلانیدن čelānīdan (.P) "چۆڕاندنەوە"].

چرکە **çırke** [ *čırka* ] - "1- تەکان و بزاڤێکی کەم 2- سانیە": دە بنچینەدا دەبێ بە مانای تەکان یان بزاڤێکی توند و خێرا بووبێ. خزمە دەگەڵ ↑چرکیان çırkîyan "تەکان خواردن" و ↑چڵەکین çılekîn [داچڵەکین]. مانای "سانیە" لێرەوە پەیدا بووە کە "سانیەژمار"ی سەعات هەرجارەی بزاڤێکی زۆر کەم و خێرا دەکا.

چرکیان **çırkîyan** [ *čırkīyān* ] - "بزووتن، تەکان خواردن": خزمە دەگەڵ ↑چڵەکین çılekîn [راچڵەکین]. هەروەها ↑چرکاندن çırkandın هەیە بە مانای "چرتاندن، بزواندنی پەلەپیتکە".

چرنووک **çırnuk** [ *čırnūk* ] - "نینۆکی جانەوەر": ↑چر + ↑نووک çır + nuk . کەرتی چر بەمانای "توند، سفت، گرژ "ە. مەبەست لە وشەکە دەبێ نینۆکی چربۆوە بێ [لێرەدا بە مانای گرژ بۆوە]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ "ددان دە چیرەوە بردن".

چروسکە **çıruske** [ *čırūska* ] - ↑تروسکە tıruske.

چرووسان **çırusan** [ *čırūsān* ] - "درەوشانەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑درەوشان (ەوە) (dırewşan(ewe و خزمە دەگەڵ ↑تروسکە tıruske و ↑تیرێژ tîrej.

چرووسان(ەوە) **çırusan(ewe)** [ *čırūsānawa* ] - "لەڕ و لاواز بوون لەبەر رەنج و ئازاری زۆر":

1- لە لایەکەوە مەبەست لە چرووسانەوە دەتوانێ دەبنەڕەتدا سیس بوون و هیشک هەڵاتن بە هۆی کار و کوێرەوەری زۆر بێ. ئەگەر ئەمە راست بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ trocken (.G)، droog (.Nl)، dry (.E)، dryġe (.OE) "هیشک، وشک". بۆ زانیاری زورتر بڕوانە ↑ترس2 tırs "هیشک" [نانی بترسی واتا نانی بە هیشکی].

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی پەیدا بکا بە ↑چرووک çırûk و ↑چرچ *çırıç* "ژاکاو، چین وچرووک دار".

چرووک **çırûk** [ *ıčrūk* ] - "لۆ، قەد، چرچی": خزمە دەگەڵ ↑چرچ çırıç "ژاکاو، چین وچرووک دار".

چرۆ **çro** [ *čro* ] - "چەکەرە، لکەداری ساوا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Spross (.G) "چرۆ، چەکەرە"، sprota (.OE) "لک، چرۆ، نینۆک"، sproti (.OIs) "لک، شوول". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑شپرزە şpırze و ↑پرژان *pırjan* سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڵاو بوون(ەوە)".

[شیاوی گوتنە کە فۆتیمەکانی sp و st زمانە ژێرمەنییەکان زۆر جار دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە ç، بۆ وێنە دە وشەکانی "چۆلەکە، چپە، چەپەر[3]، چرتیان، چۆڕانەوە، چیا، چڵ، چێڵ" و هیتردا.

چریکە **çırîke** [ *čırīka* ] - "دەنگی تیژی گۆرانی": خزمە دەگەڵ shrieke (.E)، scrīc (.OE)، schrīk (.MG) "قیژەی تیژ".

چرین1 **çırîn 1** [ *ıčrīn* ] - "گۆرانی گوتن، دەنگ هەڵبڕین": خزمە دەگەڵ ↑شیراندن şîrandın "قیژاندن، زیراندن".

چرین2 **çırîn 2** [ *ıčrīn* ] - دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەچرین veçırîn واتا هەڵپچرین، بە زۆر لێکردنەوە". هەروەها ڤەچراندن veçırandın هەیە بە مانای "شی کردنەوە و لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەی خوری و لۆکە". خزمە دەگەڵ ↑*دڕین dırîn* یان ↑جران cıran.

چرێش **çırêş** [ *čıreš* ] - "جۆرێک چەسپ": هەروەها ↑زرێچ zıreç هەیە بە مانای "چەسپ". دە فارسیدا سریش serīš (.P). دەتوانێ پێوەندی بە یەکێک لەم دوو ریشەیانەوە هەبێ:

1- ‪(IE.) *glei- >‬ "پێوە نووسان، پێکەوە نووسان، تێهەڵسوون". ئەگەر وشەکە لەم ڕیشەوە هاتبێ، ئەوسا دەبێتە خزم دەگەڵ Klebe (G.) "چەسب" و دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک ↑گڵ gıl و ↑گلوو gılu و هتد.

2- ‪(IE) *(s)lei- >‬ "لیچق بوون، تەڕ و لووس بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سل sıl و ↑چڵپاو çılpaw و ↑چڵم çılım.

**چزاندن1 çızandın** [ čızāndın ] - "داغ کردن": هەروەها جزرە cızze هەیە کە بۆ "دەنگدان و ئاگادار کردنەوەی زارۆک لە شتی داغ" بەکار دێ. خزمە دەگەڵ سۆزیان sozyan [↑سووتان sutan، شەوتین şewtîn].

**چزاندن2 çızandın** [ čızāndın ] - "پێوەدانی دووپشک و زەرگەتە": خزمە دەگەڵ ↑چزوو çızu "نووکی پێوەدانی دووپشک و زەگەتە و...".

**چزوو çızu** [ čızū ] - "نووکی پێوەدانی دووپشک و زەرگەتە و...":

1- دەتوانێ سەر بەو خێزانەوشەیە بێ کە ئاماژە بە چەمکی تێڕاچوون و تێهەڵچەقین دەکا و کۆمەڵێک وشە دەگرێتە خۆی، وەک ↑تیژ tîj، ↑چیغ çîġ، ↑تیخ tîx، ↑چقڵ çıqıl و هتد. [دە زمانەکانی دیکەشدا وشەی هاوتای "چزوو" دەچنەوە سەرئەو ڕیشانەی مانای "تیژی یان تێڕاچوون" دەبەخشن، بۆ وێنە دە فارسیدا چزوو دەبێتە "نیش" کە خۆی دەگەڵ "نووک" هاوریشەیە.

2- هەروەها ئەم وشەیە دەتوانێ پێوەندی بە ↑چووزە çuze "تیرتکی تازەی گیا"ەوە هەبێ. "چووزە" دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانا "دەرپەڕین، زەق بوون". چزووی مار و دووپشک شتێکی زەق و دەرپەڕیوە و هەروەها کاتی پێوەدان دەدەپەڕێ و دەهاوێژرێ و ئەمەش شیمانەی پێوەندی وشەکە بەم خێزانەوشەوە زۆرتر دەکا.

**چزیلک çızîlk** [ čızīlk ] - "دووگی سوورەوە کراو": چزڵێک çızlîk یش دەگوترێ. هەروەها چزوبز çızûbız هەیە کە ناوی خواردنێک بوو لە ورگی لەت و پەت کراو و سوورەوەکراو دروست دەکرا و زستانان ئێمەی منداڵ لە بازار دەمان خوارد و چێژێکی تایبەتی هەبوو! بنجی چز -çız دەچێتەوە سەر ↑چزاندن1 çızandın "داغ کردن". کەرتی بز -bız دەچێتەوە سەر ↑پێژان pejan.

**چش çış** [ čıš ] - "هیچ، هیچ نییە": خزمە دەگەڵ چس čos (P.) و ↑تس tıs "با، هەوای سک". ئەم وشانە دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ *پووچ* (هیچ و پووچ) و *بۆش* "هەڵوڵ" کە دەبنە خزم دەگەڵ *فس* "بای سک" و *پیش* "هەناسە، بای دەم"].

**چغا çıġa** [ čıġā ] - "گرد، تەپە": خزمە دەگەڵ ↑شاخ şax "کێو".

**چغر çıġır** - "پڕایی، تێکچڕژاوی" (دارستان): خزمە دەگەڵ ↑چغوورçıġûr "دارستانی چڕ و پڕ" و ↑چڕ2 çır "توند، سفت، خەست".

**چغوورçıġûr** [ čıġūr ] - "دارستانی چڕ و پڕ": خزمە دەگەڵ ↑چغرçıġır "چڕ و پڕی (دارستان)" و ↑شخەل şıxel "بێشەی دەم ڕووبار"، ↑چەقاڵە çeqale "میوەی نەگەیشتوو" کە سفت و چیرە وەک چەقالەبادام، ↑چەقاڵتە çeqalte "سفت" [چەرمە چەقاڵتە]، ↑چەقە çeqe "بتێشت" [دە بنەڕەتدا چیر، نەپس]. هەروەها وشەی ↑چقر çıqır م بیستووە کە بۆ ڕەنگ بەکاری دێنین [ڕەنگی چقر: ڕەنگی توند، تیر وپڕ؟]. دە زمانی فارسیدا ئەم وشانە سەرنج ڕادەکێشن: چقرمە čeqerme (P.) "سفت، چەسپاوی"، چگال čegāl (P.) "چڕی"، چگامە čegāme یان چکامە čekāme (P.) "هۆنراوە" [دە بنەڕەتدا وشەی تێکچڕژاو، وشەی چڕ و پڕ- هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی ئەڵمانی dicht "چڕ و پڕ" و Gedicht "هۆنراوە"]، چگل čegel (P.) "لیتە و لەجەن" و چغل čeġel (P.) "چەقاڵتە". لە لایەکی دیکەوە چەند وشەیەکی کوردمادی دیکە هەن کە پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە، وەک شخلی şıxlî "کەڵەکەبوو"، ↑شخرە şıxre "بارەگیا"،

↑شخلین şıxlîn "کەڵەکە کردن"، ↑شخەل şıxel "بێشەی دەم رووبار". لە گشت ئەم وشانەی سەرەوەدا دوو مانای سەرەکی بەدی دەکەین، یەکەم، سفت، توند، چپڕ و خەست بوون و دووەمیش، زۆر بوون، کەڵەکە بوون، مشە بوون. دیارە دە تیوان ئەو دوو مانایەدا پێوەندی نیزیک هەیە، بۆ وێنە لە ئەنجامی تیر و پڕی تراوێکدا یان دووکەڵدا خەستی دروست دەبێ. [ئەم پێوەندییە بە باشترین شێوە لە دوو وشەی هاوریشەی تەژی tejî ی کوردمادی بە مانای "پڕ" و dicht ئەڵمانی بە مانای "چڕ، سفت، خەست" دا دەبیندرێ]. دەکرێ شیمانەی ئەوە بکەین کە پێوەندییان بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑سەخت sext و ↑سەق *seq*.

2- وشەی ئەوێستایی (Av.) staxra "سفت، سەخت".

**چغە çıġe** [ *čıġa* ] - "وشەیە بۆ دەنگدانی سەگ": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑سەگ seg.

[تێبینی: هێندێک وشە دە زمانی کوردمادیدا کە بۆ بانگ کردن یان دەنگ دانی ئاژەڵەکان بە کار دێن، وەک "پشە"، "ختتە"، "وەححا" دە بنچینەدا پێوەندییان بە ناوی ئاژەڵەکەوە هەیە].

**چڤ[1] çıv** - "چەم": ↑چڤان çıfan "چەمین".

**چڤ[2] çıv** - شێوەیەکی تازەتر لە چپە çıpe [↑چپاندن çıpandın].

**چڤان çıfan** [ *çıfān* ] - "چەمانەوە": شێوەی دیکە لە ↑چەمان(ەوە) çeman(ewe).

**چڤاندن1 çıfandın 1** [ *çıfāndın* ] - "سەرکۆنە کردن":

1- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ schimpfen (G.) "جنێو دان" و skimpfen (OG.) "گەمە کردن، گاڵتە (پێ) کردن، مەسخەرە کردن". ئەم وشەیە دە زمانی ئەڵمانی و هوڵەندیدا هەیە و ریشەکەی ساخ نەکراوەتەوە.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تەپاندن tepandın "لێدان".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا "سرزنش" هەیە و بە کوردمادی بووەتە سەرزەنشت. لەم وشەیەشدا مانای "لێدان" خۆی حەشار داوە].

**چڤاندن2 çıfandın 2** [ *çıfāndın* ] - "دەر کردن بە سووکایەتی": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ şep دا باس کراون و دە بنەڕەتدا مانای "پاڵنان، دەرپەڕاندن، رادان" دەبەخشن.

**چڤاندن3 çıfandın 3** [ *çıfāndın* ] - شێوەیەکی دیکە لە چەماندن çemandın. بڕوانە ↑چەمان(ەوە) çeman(ewe).

**چڤیک çıvîk** [ *čıvīk* ] - "چۆلەکە، چێشکە": شێوەی کۆنتری ↑چۆلەکە çoleke یە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها چووک çuk یش هەیە بە مانای "چۆلەکە". بنەوشەکە چڤ -çıv ە کە دە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا بووەتە چۆ -ço یان چوو -çu. ئەم بنەوشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "جم و جۆڵی خێرا، نائارام بوون" دەکەن، وەک ↑زەپرتی zepırtî "بزۆز، ئۆقرەنەگر" و ↑*زڤرین zıvrîn*[↑سووڕان suran]. پاشان پاشگری گچکاندنی ئیک îk- و لەکە leke- خراونە سەر بنەوشەکەوە. ئەم پەلەوەرە لەبەر بێئۆقرە بوونی ئەم ناوەی پێ دراوە.

**چق çıq** [ *čıq* ] - "1- لکی بچووکی دار 2- قیتکەی پاتیی کەڵەباب": خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq "دەرپەڕیو".

**چقر çıqır** - بۆ رەنگ بەکاری دێنین [رەنگی چقر: رەنگی توند؟]. خزمە دەگەڵ ↑چغوور çıġûr "دارستانی چڕ و پڕ".

**چقڵ çıqıl** [ *čıqıl* ] - "درک": خزمە دەگەڵ Stachel (G.)، stachilla (OG.) "چقڵ" و هەروەها گەڵ Stiech (G.)، stih (OG.)، steek (Nl.)، stitch (E.) "تێراچوون"، Stichel (G.)، stekel (Nl.)، sticel (OE.) "چقڵ، نووک، ئامرازێکی هەڵکۆلین". تێکرای ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑چەقین çeqîn و لە ریشەیەکەوە هاتوون بە مانای "تێراچوون، تێهەڵچەقین".

چکال **çıkal** [ *čıkāl* ] - "پڕ و پووش": خزمە دەگەڵ ↑چقڵ çıqıl، دە بنەرەتدا مەبەست "دڕک و داڵ" بووە.
چکرم **çıkrım** [ *čıkrım* ] - "داری دە هەرد چەقێنراو": دەچێتەوە سەر کرداری ↑چەقین çeqîn.
چکۆس **çıkos** [ *čıkod* ] - "خەسیس": چکۆد çıkod یش دەگوترێ. دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی چک + ئۆس [پاشگری زێدەرۆیی] çık + os. کەرتی یەکەم لەوانەیە بچێتەوە سەر چکە çıke "دڵۆپە" [↑تکان tıkan]. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە کە پاشگری ↑ئۆز oz- و بە چەندین شێوە و دە زۆر وشەدا دەبینرێ، وەک بزۆز، ئاڵۆز، چڵێس، قڕنیس، کەڵۆس، ↑کنۆس و هتد. لەم تێروانینەوە چکۆس ئاماژەیە بە کەسێک کە بە "دڵۆپ" خەرج دەکا، واتا زۆر بە کەمی و بە دەست پێوەگرتێکی لەرادەبەدەر.
چکۆڵە **çıkole** [ *čıkola* ] - "گچکە، وردیلە": چک + ئۆڵە çık + ole . کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چووک çuk. [لەوانەشە دەبنەڕەتدا وشە "چووکەلە" بووبی و بووبێتە چکۆڵە].
چکی **çıkî** [ *čıkī* ] - "دەرد و ژانی کەلەکە، برک": دە زمانی ئالمانیدا Seitenstich بە مانای "برک، چکی" بە کار دێ کە لە دوو کەرتی Seite ( G. ) "تەنیشت، کەلەکە" و Stich ( G. ) "تیراچوون" پێک هاتووە. ئەم ئێشە وەک تیرا چوونی شتێکی تیژ یان وەک برانی کەلەکە بە شێکی تیژ وایە و هەربۆیەش دە زمانی کوردمادیدا ناوە نراوە "برک" یان "چکی". "چکی" خۆی خزمە دەگەڵ Stich ی ئەڵمانی بە مانای تیراچوون]. خزمە دەگەڵ ↑چقڵ ıçlıq "دڕک" و ↑چەقین çeqîn [تیهەڵچەقین].
چل **çıl** [ *čıl* ] - "چوار جار دە": چهل çehel (P.)، čahil (Pl.). خزمە دەگەڵ ↑چوار çıwar.
چڵ **çıl 1** [ *čıl* ] - "لاسکی گیا، لکەداری باریک": دە وشەی ↑چیلکە çîlke دا وەک بنەوشەی چیل -çîl خۆی نیشان دەدا. خزمە دەگەڵ Stiel (G.)، stil (G.)، stilus (L.)، steola (OE.)، stiaelke (OSw.) "لاسکی گژ وگیا". دە زمانی کوردمادیدا ↑شتڵ şıtıl هەیە بە مانای "لاسکەگیا یان نەمامی بە دەست تێژراو" کە شێوەیەکی کۆنتر لە وشەکە نیشان دەدا. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تەڵ² tel [تەڵی وەنەوشە].
چڵ **çıl 2** [ *čıl* ] - "ساز، ئامادە": دەگەڵ "نیوە" دێ [↑نیۆچڵ nîweçıl واتا ناتەواو، تەواو ساز نەبوو]. خزمە دەگەڵ ↑چڵیان çılîyan "دروست بوون، ساز بوون".
چلاپە **çılape** [ *čılāpa* ] - "قەڵەمباز، بازدی بە تەوژم": خزمە دەگەڵ ↑چڵەکین çılekîn [ڕاچڵەکین]. دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵبەزین، پەڕین".
چڵانە **çılane** [ *čılāna* ] -"بە ماڵاندا گەڕان و خۆراک وەرگرتن": خزمە دەگەڵ ↑چڵە/ ↑چەرە çıle /çere
چڵاو **çılaw** [ *čılāw* ] - "برینجی بە سەلەدا کراو": دە فارسیدا چلو čelou (P.). خزمە دەگەڵ ↑سەلە sele. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چۆڕاندنەوە، دڵۆپاندن". مەبەست لێرەدا ئەوەیە برینجەکە پاش کوڵاندنی، بە سەلەدا دەکرێ و ئاوەکەی هەڵدەچۆڕێندرێ.
[تێبینی: وشەی پڵاو pılaw یش کە هەر ئەم مانایە دەدا، خزمە دەگەڵ پاڵاوتن palawtın و لێرەشدا مەبەست چۆڕاندنەوەی ئاوی برینجەکەیە].
چڵپاندن **çılpandın** [ *čılpāndın* ] - "1- مژینی مەمک بە هەڵپە و پەلەپەل 2- دەنگی ئاوخواردنەوەی سەگ و پشیلە": خزمە دەگەڵ Schlürfen (G.)، slorpen (Nl.)، slorpe (Nor.) "هەڵقوڕاندن، چڵپاندن". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑لرفاندن lırfandın یش هەیە بە مانای "قوت دانی بە پەلە" کە دەشێ دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە خزم بێ. لەم تێروانینەوە بە هەڵسەنگاندن دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان دەتوانین بڵێین کە دە وشەی "چڵپاندن"دا فۆتیمی r و دە وشەی "لرفاندن"دا فۆتیمی s سواونەوە. ریشەی ئەم وشانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگێ دەگەڕێنەوە.
چڵپاو **çılpaw** [ *čılpāw* ] - "قوڕاو، قوڕ و لیتە": شڵپاو şılpaw یش دەگوترێ. چلپ + ئاو çılp + aw. کەرتی چلپ -çılp یان -şılp خزمە دەگەل ↑شڵپە2 şılpe "پڵاوی زۆر چەور" و ↑*شەڵپین* *şelpîn* "ڕەت بردن، خلیسکان، کەوتن"، ↑شلف şılıf "تیژایی دەمی تیغ"، schleifen (G.)، slifan (OG.)، slijpen (Nl.)

"سوونەوە، تیژ کردن" [دە بنەڕەتدا: *لووس کردن*]، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)lei- >** "لووس، خلیسک، لیچق". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە وەک ↑زەل zel، ↑لووس lus، ↑جلف cılıf، ↑چڵم çılım، ↑لیتە lîte و هتد. دە زمانی ئاڵمانیدا بە قوڕ و چڵپاو دەگوترێ Schlamm (G.) کە ئەویش دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمە.

**چڵتە çılte** [ *čılta* ] - دەگەڵ "چاڵ" دێ [چڵتە و چاڵ çılte û çal]. خزمە دەگەڵ ↑چەڵتووک çeltuk.

**چلچەنگ çılçeng** [ *čılčang* ] - "1- قولاپێکی چوارسەر بۆ دەرهێنانەوەی شتی دە چاڵاو کەوتوو 2- قوڵاپەئاستیکە دەگەڵ تەڵەدا و لە زەوی گیر دەکا". هەروەها چلچنگ çılçıng هەیە کە بە مانای "شانەی سەر" بەکار دێ. دەچێتەوە سەر ↑چەنگ çeng یان چنگ çıng بە مانای "پەنجەی دەست". هەڵی سەنگینە دەگەڵ چەنگە çenge و ↑چەنگاڵ çengal "قوڵاپ". وشەی چل çıl لێرەدا دەشێ ئاماژە بێ بۆ زۆر بوونی ددانەکان یان گەورە بوونی چنگاڵەکە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "چلچرا" و "چلمێر(دە)".

**چلک çılık** [ *čılık* ] - "گەمار، پیسی": دە فارسیدا čerk (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ Dreck (G.)، dreax (OE.)، drek (Nl.)"چڵک"، träck (Sw.)، sterganos (Gr.)، stercus (L.) "کوود، پەین"، سەر بە ریشەی **> (IE.) *(s)ter-** "پەین، پیسی". لەلایەکی دیکەوە هەروەها dirt (E.) هەیە بە مانای "پیسایی، پیسی، چڵک"، dreet (Nl.)، drita (ON.). ئەم وشانەش دەشێ پێوەندییان بە وشەکانی سەرترەوە هەبێ. دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑تەرس terıs "پیسایی ئەسب و کەر" و ↑تەرت terıt "کەمرە" دەبێ سەر بەم خێزانە بن.

**چللی çıllî** [ *čıllī* ] - "دەزووی برین دروونەوە": خزمە دەگەڵ ↑چەلە çele "گوریس، پەت".

**چڵکەمیزە çılkemīze** [ *čılkamīza* ] - "میز لێ تکان": بنەوشەی چڵ- خزمە دەگەڵ ↑چڵاو çılaw "برینجی بە سەلەدا کراو" و ↑چۆڕانەوە çoran(ewe) "دڵۆپان، تکان".

**چلم çılım** [ *čılım* ] - "ئاوی لووت": کلّم kılım یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Schleim (G.)، slime (E.)، slīm (OIs.) و (OG.) "تراوی لیچق و چەسپ"، سەر بە ریشەی **> (IE.)*(s)lei-** "تەڕ بوون، لیچق بوون". دە کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لە ژێر ↑جلّق cılıq باس کراون.

**چلمسین çılımsîn** [ *čılımsīn* ] - "چرچ بوون، ژاکان": خزمە دەگەڵ ↑چرچ çırıç.

**چلوورە çılure** [ *čılūra* ] - "سەهۆڵێک کە بە گوێسوانە دا شۆڕ دەبێتەوە":

1- بە شیمانەیەکی بەهێز پێوەندی بە چەمکی "بەستن، رەق هەڵاتن لە سەرمان"ەوە هەیە و لەم تیروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گلێرە gılêre.

2- بنەوشەی چل- çıl- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑شل şıl [شل و شۆڕ]. لەم تیروانینەوە مانای چلوورە دەبێتە "شۆڕەوەبوو". هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی ↑شلێرە şılêre کە ناوی گوڵێکە بەرەوخوار شۆڕ دەبێتەوە. هەر دوو وشەی "شل" و "شۆڕ" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، بۆ وینە لە وشەی "شۆڕەژن"دا ئاماژە بە بەژنێکی شل و مل دەکرێ.

**چلۆپک çılopk** [ *čilopk* ] - "ترۆپک، بلیندترین شوێنی دار": ↑ترۆپک tıropk و چلووک çılûk یش دەگوترێن. ئەم وشانە پێوەندییان بە "چڵ" بە مانای "لاسک، لک"ەوە نییە، چونکوو ئەگەر ئەوها بووایە، مانای "بلیندترین شوێن" بە دەست نەدەهات. ئەم وشانە پێوەندییان بە ریشەیەکی دیکەوە هەیە کە لەژێر ↑ترۆپک tıropk دا باس کراوە.

**چلۆک çılok** [ *ıčlok* ] - دەگەڵ چەور دێ [چەور و چلۆک]. چلیک çılîk یش دەگوترێ. دەبێ خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانە:

1- ↑چڵک çılık.

2- ↑سل sıl، ↑چڵم çılım، ↑چڵپاوçılpaw و هیتر سەر بە ریشەیەک بەمانای "تەڕ و لیچق بوون".

**چلە çıle 1** ‌[ *čıla* ] -"خواردەمەنی" [بەتایبەتی خواردەمەنی تیوان جەمان]. شێوەیەکی دیکە لە چەلە/ ↑چەرە çele /çere.

**چلە çıle 2** [ *čıla* ] - چلەدان یان ↑چلّیان çılyan واتا "پەرینی پێلووی چاو، لیدانی دڵ یان شوێنی بریندار": خزمە دەگەڵ ↑چلەکین çılekîn [راچلەکین].

**چلەک çılek** [ *čılak* ] - "سڵ، قوشقی": بنەوشەی چل -çıl هەروەک لە وشەکانی ↑چلەکین çılekîn، ↑چرکیان çırkîyan و ↑چلّیان çılyan دا دەیبینین، مانای "تەکان و بزاڤێکی خێرا" دەدا و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵبەزین، هەڵبەزینەوە، پەرین". دیارە ئاژەڵی چلەک بۆیە ئاوا ناو نراوە، چونکە بەهۆی ترس دووچاری جموجۆڵی توند و هەڵبەزینەوە دەبێ. وشەی ↑سڵ sıl بە مانای "چلەک، قوشقی" خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە بنەوشەی چل -çıl کە دە وشەکانی سەرەوەدا دەبینرێ.

**چلەکین çılekîn** [ *čılakīn* ] - "راچەنین": زۆرتر دەگەڵ پێشگری"دا" یان "را" دێ [داچلەکین daçılekîn، راچلەکین raçılekîn]. هاوریشەیە دەگەڵ schrecken (G.) "ترسانی زۆر" [دە بنەرەتدا واتا هەڵبەزینەوە یان سڵەمینەوە لەترسان]، scricken (OG.) "پەرین، هەڵبەزین"، schrikken (Nl.) "ترساندن، تۆقاندن"، skrikka (Nor.d.) "هەڵبەزین"، سەر بە ریشەی **< *(s)ker-* (IE.)** "باز دان، پەرین". دە زمانی کوردمادیدا ↑چلەدان çıle و ↑چلّیان çılyan هەیە بە مانای "پەرینی پێڵووی چاو یان لێدان و هەڵبەزینی دڵ و دەمارەکان"، هەروەها ↑چرکە çırke و↑چرکیان çırkîyan "تەکان خواردن"، ↑چلاپە çılape "قەلەمباز".

**چلیان çılyan 1** [ *çılyan* ] - "چلەدان، پەرینی پێلوو، لێدانی دڵ یان دەمار": خزمە دەگەڵ ↑چلەکین çılekîn [راچلەکین].

**چلیان çılyan 2** [ *çılyan* ] - "دروست بوون، ساز بوون": هەروەها چلاندن çılandın هەیە بە مانای "ساز دان، ئامادە کردن، دروست کردن". خزمە دەگەڵ ↑چڵ çıl [نیوەچڵ واتا ناتەواو، شتێک کە بە تەواوی ساز یان دروست نەکراوە]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چارە çare. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک کە چەند مانای برێک جیاواز، بەڵام هاوپێوەند دەدا، وەک تەواو، تەواو کردن، دروست کردن، چاک کردن، ساز کردن، ساغ [شتێک کە تەواوە و کەم و کورتی نییە] و هتد. دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا وشەی "نەچلیان" هاتووە بە مانای "پێک نەهاتن، سەرنەگرتن". دیارە ئەمەش هەر "چلیان" ە کە بە یارمەتی نیشانەی "نە" نەرێنی کراوە و مانای پێچەوانەی وەرگرتووە.

**چلیچلی çılîçılî** [ *čılīčılī* ] - "چەکچەکی، شەمشەمە کوێرە": خزمە دەگەڵ ↑چلەکین çılekîn [راچلەکین] و سەر بە ریشەیەکە کە مانای "پەرین، هەڵبەزینەوە" دەدا. لەم ریشەوە چەندین وشە پەیدا بوون کە ئاماژە بە "جم وجۆڵی خێرا" دەکەن، وەک ↑چلەک çılîek یان↑سڵ sıl بە مانای "رەوەک"، ↑چلاپە çılape"قەلەمباز" و هتد. شیاوی باسە کە وشەی "چەکچەکی"یش، کە ناوێکی دیکەی ئەم ئاژەڵەیە، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "راوەشاندن، لەرزاندن، شەکاندنەوە" و خزمە دەگەڵ "شەکانەوە". دە وشەی "چلی چلی"دا مەبەست پەر و باڵ بزاوتنی خێرایە و لە وشەی "چەکچەکی"شدا مەبەست شەکاندنەوەی پەر و باڵە.

**چلیک çılîk** [ *čılīk* ] - "تووی فەرەنگی": شلیک şılîk یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بەم وشانەی کە مانای "تەر و لیچق بوون" دەدەن، وەک ↑جلیق cılîq "لیچق"، ↑جلە cıle "گیایەگی قەوزەئاسا"، ↑جەللە celle "ریخ، شیاکە"، ↑چلم çılım [دە بنەرەتدا واتا: تەر و لیچق] و چلیک çılîk یان چلۆک çılok "چڵکن، چەور" [چەور و چلۆک]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)lei-* (IE.)** "لیچق بوون، لووس و خلیسک بوون".

**چلێس çıles** [ *čıles* ] - "نەوسن، زۆرخۆر": دوو لێکدانەوە بۆ ئەم وشەیە رێی تێ دەچێ:

1- خزم دەگەڵ schlecken (G.) "لێستنەوە" [لەخوارووی ئەڵمان هەروەها بەمانای "مەزەمەزە کردن، بەچێژەوە شت خواردن"]، sleikja (OIs.) "لێستنەوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑لێستنەوە lestınewe.

2- چڵ(ە) + ێس cıl (e) + ês . لەم تێڕوانینەوە کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر چڵە/ ↑چەرە çere/ çıleبە مانای "خواردەمەنی". کەرتی دووەم پاشگری جەخت کردنە کە دە وشە کوردمادییەکاندا بە چەند شێوە خۆ نیشان دەدا، وەک بزۆز، تەکوون، ئالۆز، چکۆس، قرنیس، نگریس و هتد. [بڕوانە ↑ئۆز oz].

**چمام(ک) çımam(k)** [ *čmāmk* ] - "مەتەڵۆک": لە ↑چما çıma وەرگیراوە بە مانای "ئایا، بۆچی".

**چمک çımık** [ *čımık* ] - "گۆشە[ی بەرە و دەستماڵ و هتد]": چم + ک çım + ık . خزمە دەگەڵ Saum (G.)، zoom (Nl.)، seam (E.)، söm (Sw.) "پەراوێز، قەراخ و لێواری درواو"، سەر بە ریشەی *< *sei-*, **siu- (IE.)* "بەستن، دروون". ↑چەمک çemık بە مانای "مەفهووم، تێرم" لەم وشەیە وەرگیراوە.

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی terma (Gr.) خۆی بە مانای "جەمسەر"ە و خزمیشە دەگەڵ Trumm (G.) "قەراخ و بیجاری شت". دەبینین کە لە باری ماناییەوە هەر وەک "چەمک" وایە کە ئەویش بە مانای "پەراوێز و قەراخ"].

**چمە çıme** [ *čıma* ] - "دونبەڵان، دومەڵان": شێوەی پێشووی ↑دوو du [دە فارسیدا دم dom (P.) "کلک"]. خزمە دەگەڵ ↑جمین cımîn. چمە یان دوو [دووگە، دونبەڵان] لەبەر ئەوە بەم جۆرە ناونراوە، چونکە ئەو ئەندامەی ئاژەڵ بە شێوەیەکی تایبەتی لە جمین و جوڵانەوە دایە.

**چنار çınar** [ *čınār* ] - "ناوی دارێک": وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑سنەوبەر sınewber "ناوی دارێکی دەرزیدار".

**چناندن çınandın** [ *čınāndın* ] - "کون گرتن بە تەقەڵ": خزمە دەگەڵ ↑چنین çınîn.

**چنجرووک çıncırûk** [ *čınjırūk* ] -"چەنگاڵ، پەنجەی ئاژەڵ": بنەوشەکە ↑چنج çınc ە و ئەمەش شێوەیەکی دیکەیە لە چنگ / ↑چەنگ çeng.

**چنچک1 çınçık** [ *čınčık* ] - "تۆو، دان، دەنک": چن + چک çın + çık [یان چنچ + ک çınç + ık، دە بنەڕەتدا "چاندک" ؟]. شێوەیەکی دیکەیە و دەشێ شێوەی پێشووی وشەی ↑دەنک denık بێ. دەچێتەوە سەر کرداری ↑چاندن çandın. وشەی ↑دان dan [دەغڵ و دان] یش هەر لە چاندنەوە هاتووە.

**چنچک2 çınçık** [ *čınčık* ] - "پلەگۆشت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەنگل şengıl "پێکەوە نووسان".

**چندک çındık** [ *čındık* ] - "وەزاق دان، هەڵبەزین": دە زمانی فارسیدا چندش čandeš (P.) هەیە بە مانای "لەرز، موچڕک" و چندش اور čandešāwar (P.) "داچڵەکێنەر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑چەنین çenîn [ڕاچەنین raçenîn] واتا "هەڵبەزینەوە، ڕاچڵەکین"، ↑جنقین cınîqn یش دەگوترێ هەر بە مانای "ڕاپەرین لە خەو، ڕاچەنین". دیسان هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑جنگ cıng "جم، بزاڤ، تەکان". مەبەست لە هەموو ئەم وشانە جۆرێک تەکان خواردن و هەڵبەزینەوەیە کە زۆرتربە هۆی دیتنی شتێکی زۆر ناخۆش روودەدا.

**چنگ çıng** [ *čıng* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑چەنگ çeng.

**چنگزین çıngızîn** [ *čıngızīn* ] -"خۆ مات کردن": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑چینچکان çînçıkan "هەڵترووشکان" و چندک زدن čondak zadan (P.) "هەڵترووشکان".

**چنگلە çıngle** [ *čıngla* ] - "قەرتاڵە": خزمە دەگەڵ ↑چنین çınîn [دە بنەڕەتدا واتا "چندراو"].

**چنگنی çıngınî** [ *čıngını̄* ] - "جاڵجاڵۆکە": خزمە دەگەڵ ↑چنین çınîn. [مەبەست تەون کردن یاخود تۆڕ چنینی جاڵجاڵۆکەیە].

**چنگە çınge** [ *čınga* ] - "دەسکی دیزە و گۆزە": هەروەک چۆن "دەسک" [دەستک] لە "دەست" وەرگیراوە، "چنگە"ش دەچێتەوە سەر "چنگ" یان ↑چەنگ çeng بە مانای "دەست، پەنجە".

**چنوور çınur** [ *čınūr* ] - "گیایەکی بۆن خۆشە گەڵای لە شویت دەکا":

1- جێی بەراورد کردنە دەگەڵ Knorren ‹G.› knorre ‹MG.› knor ‹Nl.› knar ‹E.›، chnorz ‹OG.›، knort‹Norw.› "هەڵمساوی یان هەڵتۆقاوییەکی گرێ ئاسا، چرۆ، لوو". ئەم وشەیە هەروەها هەڵ سەنگینە دەگەڵ ↑کتیرە knere "ناوی گیایەک" و ↑قوتیر quner "کوان". ئەم وشانە ئاماژە بە "خڕەکە بوون" دەکەن و لەوانەیە مەبەست لە "چنوور" ئاماژە کردن بە بنکی گیایەکە بێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑چنار çınar.

**چنۆک çınok** *[ činok ]* - "دەسقووچاو": چاوچنۆک çawçınok یش دەگوترێ. هەروەها ↑چەنجووز çencuz "1- لەڕ و لاواز 2- رژد و خەسیس" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ genau ‹G.› "ورد، دەقیق"، genou ‹MG.› "کەم، ورد، تەنک". ئەم وشە ئاڵمانییە دەچێتەوە سەر وشەیەکی کۆنی ژێرمەنی کە بۆ وێنە بەم شێوانە خۆی نیشان داوە: hneaw ‹OE.› و hnoggr ‹OIs.› "دەسقووچاو، چنۆک". هەروەها hniuwan ‹OG.› بە مانای "رێخشاندن، سوونەوە، ورد کردن" و knyein ‹Gr.› بە مانای "سوانەوە، رنینەوە" دەگەڵ وشەکانی سەرەوە خزمن. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کنۆس *kınos*. هەردووک وشەی چنۆک و کنۆس وێ دەچێ دە بنەڕەتدا یەک وشە بووبن و دوو شێوەی جیاوازیان پەیدا کردبێ.

[تێبینی: سەبارەت پێوەندی دوو چەمکی "کەم، ورد" لە لایەک و لە لای دیکەوە "ڕێخشاندن، سوونەوە" دەبێ بڵێین کە لە ئەنجامی رێخشاندن یان سوونەوەدا دەتوانرێ شتێک ورد بکرێ بۆ وێنە سندەگڵ یان کلۆبەفر یان توڵا گەزۆ بەهۆی سوونەوە ورێخشاندنیان دە ناو قامکەکانی دەست دا ورد دەبن. هەر ئەم پێوەندییە لە نێوان دوو وشەی ↑مرِ mır "ورد" (خۆڵەمرِە) و ↑مالین malîn "گەسک دان" (دە بنچینەدا رێخشاندن، سوونەوە) هەیە]

**چنین1 cınîn** *[ činīn ]* - "تەنین، هۆنینەوە، دروون": خزمە دەگەڵ Schnur ‹G.› "بەن، دەزوو" و nähen "دررون، تەقەڵ لێدان"، Nadel ‹G.› "دەرزی"، snōrōj "قەرتاڵە، تۆر"، snēre ‹OE.› "ژێ، سیم"، سەر بە ریشەی ***(s)ne-** ‹IE.› < "چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی دیکەش دەتوانین لەم چوارچێوەیەدا لێک بدەینەوە، وەک ↑چناندن çınandın "پینە کردن"، ↑چەنی çenî "دەرزی"، ↑چنگڵە çıngıle "قەرتاڵە"، ↑زەمبیل zembîl (دە بنەڕەتدا زەنبیل zenbîl بە مانای "قەرتاڵە")، ↑چنگنی çıngınî "جاڵجاڵۆکە"، ↑چنیک çinîk "گوڵدۆزی"، ↑چەنتک çentık (↑چەنتە çenta) "توورەکەی شان".

**چنین2 cınîn** *[ činīn ]* - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ [هەڵچنین helçınîn بە مانای چین چین لەسەر یەک دانان]:

1- لەوانەیە وشەیەکی سەربەخۆ بێ و بچێتەوە سەر ↑چین çîn "توێژ"،

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑چنین1 cınîn "تەنین، هۆنینەوە، دروون" بێ و مەبەست تەنینەوە، تێکچنین و تێکچرژاندنی دار و بەرد و شتی ئەوها بێ لەسەر یەکتر.

**چنین3 cınîn** *[ činīn ]* - دەگەڵ پێشگری "هەڵ" دێ [هەڵچنین helçınîn بە مانای مشتن و راکێشانی ئاو وتەڕایی لە سەر رووبەرێک بە هۆی پەڕو و شتی دیکە]. وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی ***skei-** ‹IE.› < "برین، قەڵشاندن، جوێ کردنەوە، لێکردنەوە". لە بنەوشەی چین -çîn دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑چینە çîne هەیە بە مانای "قاش، کووز" و هەروها ↑چین çîn بە مانای "توێژ" [دە بنەڕەتدا: تەڵەزم، ئەو توێژەی جیا دەبێتەوە]. بنەوشەی چین دە زمانی فارسیشدا مانای "لێکردنەوە" دەدا، بۆ وێنە "گل می چینم" gol mī- čīnam واتا " گوڵ لێدەکەمەوە". لە وشەی "هەڵچنین"دا بە مانای "مشتن و راکێشانی تەڕایی" دە بنەڕەتدا *جیا کردنەوەی* ئاو و تەڕایی لە رووبەرێکی دیاریکراو مەبەست بووە.

**چوار çuwar** *[ čuwār ]* - "ئەژماری 4": چار ăčr یش دەگوترێ. چهار čahār ‹P.›، cátur- ‹OIn.›، četyre ‹Rus.›، cethair ‹OIr.›، quattuor ‹L.›، vier ‹G.›، four ‹E.› سەر بە ریشەی ***ketuer-** ‹IE.› < "چار"،

چوار". دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەورووەها وشەی ↑چەتۆر çetor بەکار دێ بە مانای "بەشێك لە چوار بەش". ئەم وشەیە دەبێ شێوەی کۆنتری وشەی چوار بێ.

**چوارمەشقە çıwarmeşqe** *[ čuwārmašqa ]* - "جۆرێك دانیشتنە كە تییدا مرۆڤ لە ئەژنۆ بەرەخوارەوەی دەخاتە بن خۆی": کەرتی مەشقە meşqe دەبێ دە بنەڕەتدا مەچکە meçke [↑مەچەك meçek] بووبێ. مەبەست لە مەچەك دەبێ جومگەكانی ئەژنۆ و پێ واتا چوار جومگە بێ كە بەم جۆرە دانیشتنە، تێکڕایان دەنووشتێنەوە.

**چوالوو çıwalu** *[ čuwālū ]* - ↑چالوو çalu.

**چۆی čuwe** *[ čuwe ]* - "برین، زام": هەرووەها چوێدار çuwedar هەیە بە مانای "بریندار". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی كە ئاماژە بە لێکدابڕان و جوێ بوونەوە دەکەن، وەك ↑جوێ cuwe [جیا cîya]، ↑شێ şê [شێ کردنەوە، شی şî کردنەوە]، ↑ژێ je [سەر ژێ کردن]، ↑جەو cew "برینكێ"، ↑زام zam "برین"، ↑شۆم şom‌یان ↑شێو şêw "زەوی گاسن لێدراو"، سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)kei- >* "بڕین، قەڵشین، جودا کردن"

**چوختی çuxtî** *[ čuxtī ]* - "چوست و چالاك": خزمە دەگەڵ ↑چوست çust.

**چوڕ çur** *[ čur ]* - "سپیایی زۆر، سپی بوونی تەواو": دە بنەڕەتدا دەبێ مەبەست سپیاییەکی زۆر روون و بێگەرد بووبێ. خزمە دەگەڵ schier (G.) "بێگەرد، خالیس، روون"، skeirs (Gt.) "زەلال، روون"، sheer (E.) و skir (Sw.) هەر بە هەمان مانا. ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ هێندێك وشەی ژێرمەنی دیکە، وەك scheinen (G.) و shine (E.) "درەوشانەوە". دە زمانی کوردمادیدا ↑چار çar "مەڕی رەش، مەڕی رەشی گوێ سپی" دەتوانین لەم چوارچێوەیەدا لێك بدەینەوە.

**چوخساندن çuxsandın** *[ čuxsāndın ]* - "لێدان و دەرپەڕاندنی كەلا دە یاری مێشێندا": [دە کایەی مێشێندا هێندێك جار كە مەڕمەڕێك بەشێوەی گۆرت (زەبری هەوایی توند، نەك خشکەیی) دەهاوێژرێ و مەڕمەڕی کایەکەری بەرانبەر دەردەپەڕێنێ و خۆی لە جێی وی جێ دەگرێ، مەمەڕهاوێژ بە خۆشییەوە دەڵێ "چوخساندم"]. خزمە دەگەڵ جەستن jastan (P.) "دەرپەڕین" و جهانیدن jahānīdan (P.) "دەرپەڕاندن" و جهش jaheš (P.) "بازد". خزمە دەگەڵ ↑چووزێن çuzen "گاڵتەی ریز کردن و بە كەلا لێدانی چەو یان جكێ".

**چوست çust** *[ čust ]* - "چالاك، گورج و گۆڵ، بەڕاپەڕ": خزمە دەگەڵ ↑چووزێن çuzen سەر بە ریشەیەك بە مانای "هاوێژران، دەرپەڕین".

**چوکڵە çukle** *[ čukla ]* - "1- سووچ، گۆشە 2- دەنەی پیت 3- نیشانەیەکە لەسەر هێندێك پیتی ئەلفبێی کوردمادی دادەنرێ": خزمە دەگەڵ ↑زەق *zeq*، ↑سووچ suç، ↑گۆشە goşe و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە كە تییاندا مانای "دەرپەریو بوون، زەق بوون، گۆشە هەبوون" بەدی دەکرێ. هەرووەها خزمە دەگەڵ ↑چاکڵ(ە) çakıl "داری سەری گوریس".

**چوو çu** *[ čū ]* - "چەوا، چۆن، کوو": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑کوو ku بە مانای "چەوا". دە دیالێکتی موکریانیدا "چووزانم" دەگوترێ بە مانای" کوو بزانم، چۆن بزانم، چ بزانم". [دە فارسیدا دەگوترێ "چە بدانم" واتا چ بزانم، چووزانم]. وشەکانی ↑چ çı، چووçu، ↑کوو ku، ↑چەوا çewa و هیتر گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *k(w)i- >* "چی، کێ، کەی".

**چووچ çuç** *[ čūč ]* - "ئەندامی تیرینەی منداڵی ساوا": خزمە دەگەڵ ↑چیچە çîçe "گوپکەی مەمك" و ↑تووتە tute "قامکە چکۆلە".

**چووڕ çur** *[ čūr ]* - "تەشقەڵە، گەڕ": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە گیرە/ گەڕ gîre / ger "تەشقەڵە، شڵتاغ". هەرووەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑شەڕ şer.

چووز(ەرە) **çuz(ere)** [ *čūzara* ] - "چرۆ، تیرتکی تازە دەرهاتووی گیا": خزمە دەگەڵ Schoβ (G.)، schoz (OG.)، schot (Nl.) "چرۆ". ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ئەو ریشەیەی کە لە ژێر ↑چووزێن çuzen دا باس کراوە و مانای "دەرپەڕین، هاویشتن" دەگەیەنێ. بەم جۆرە چووز(ەرە) دە بنەڕەتدا واتا "شتێکی دەرپەڕیو" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چووزێن çuzen و ↑چوخساندن çuxsandın واتا "دەرپەراندن".

چووزێن **çuzen** [ *čūzen* ] - "کایەی ریز کردن و بە کەلا لێدانی چەو یان جکێ": خزمە دەگەڵ schießen (G.)، sciozan (OG.)، schieten (OE.)، shoot (E.)، skjuta (Sw.) "هاویشتنی بە توندی یان لێدان بەو شتانەی کە دەهاوێژرێن [وەك پللار، تۆپ، تیر، گوللەو هتد] سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)keud- >* "هاویشتن، دەرپەڕاندن، پەلە کردن". خزمیشە دەگەڵ ↑چوخساندن çuxsandın واتا "دەرپەراندن".

چووك **çuk** [ *čūk* ] - "گچکە": کورتکراوی ↑بچووك/ پچووك bıçûk /pıçûk.

چوون **çûn** [ *čūn* ] - "رویشتن": خزمە دەگەڵ شدن šodan (P.) "بوون [بوونە شتێك]". ئەم کردارە پێشان دە زمانی فارسیشدا وەك کوردمادی هەنووکە بە مانای "چوون" بووە ["امد و شد" بە فارسی واتا "هاتوچۆ"]. خزمە دەگەڵ skehan (OG.)، scōon (OE.) "پەلەکردن، را کردن، پێش هاتن، قەومان"، skočit (Rus.) "بازد دان"، skok (Rus.) "بازد". هەروەها وشەی Geschichte (G.) "چیرۆك، دیرۆك (مێژوو)" پێوەندی بەم وشانە هەیە و دە بنەرەتدا مەبەست ئاماژەکردن بە "رێکەوت و پێشهات"ەکان بووە، واتا ئەو شتانەی پێش دێن و رادەبرێن [دێن و دەڕۆن]. هەروەها schicken (G.) "ناردن" و Schiksal (G.) "قەدەر، چارەنووس" [ئەو رووداوەی بەسەردا تێدەپەڕێ] لە پێوەندی دەگەڵ ئەم وشانە دان. ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە دیاری نەکراوە.

چۆپ **çop** [ *čop* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑چەپ çep. هەروەها ↑چۆپە çope هەیە بە مانای "چەپلەر، چەپدەست".

چۆپریان **çopıryan** [ *čopıryān* ] - "بڵاو بوون، پرژان": خزمە دەگەڵ ↑شپرێو şıprêw و ↑شپرزە şıpırze بە مانای "پەرژ و بڵاو".

چۆپە **çope** [ *čopa* ] - "چەپلەر، چەپدەست": ↑چەپ çep.

چۆپی **çopî** [ *čopī* ] - "شایی، هەڵپەڕین": چەپی çepî یش دەگوترێ. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- hüpfen (G.)، hüppen (Nl.)، hoppian (OE.)، hop (E.)، hoppa (Sw.) "خۆهەڵاویشتن، بازدان، هەڵبەزین". وەك دەبینین وشەی "هەڵپەڕین" پێوەندی بە کرداری"پەرین"ەوە هەیە کە ئەویش هەر بە مانای "بازدان و خۆ هەڵاویشتن"ە. هەر بەم چەشنە بۆی هەیە "چۆپی"یش دە بنچینەدا بە مانای "پەڕین و خۆ هەڵاویشتن" بووبێ. ئەم وشە ژێرمەنییانە بە پێی بۆچوونێك دەچنەوە سەر دەنگی **hup-* کە مرۆڤ بۆ دەربڕینی بزاڤێك بەرەو سەرەوە بەکاری هێناوە. بە گوێرەی بۆچوونێکی دیکە وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *keu- >* "چەمانەوە". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هەرلەم ریشەوە ژمارەیەك وشە سەریان هەڵداوە کە مانای "بڵیندی، بەرزی" دەگەیەنن، وەك hoch (G.)، high (E.) "بەرز" یان ↑قۆز qoz دە کوردمادیدا [قیت و قۆز].

2- ↑چەپ çep "دەست". چۆپی هەڵپەڕینێکە تێیدا بەشداران *دەستی* یەکتر دەگرن و دوور نییە بەهۆی ئەم تایبەتمەندییەوە ناونرابێ. دە زمانی کوردیدا کرداری "گرتن" دەگەڵ "سەرچۆپی" بەکار دەهێنرێ [سەرچۆپی گرتن]. لێم روون نییە کە خودی "چۆپی" بە تەنیا چ کردارێکی بۆ بەکار دەهێنرێ [چۆپی گرتن یان چۆپی کردن ؟]. ئەگەر "گرتن" بێ، ئەوسا شیمانەی دووەم بەهێزتر دەبێ و مانای وشەکە دەکاتە "دەست گرتن" کە تایبەتمەندی هەڵپەرکێی کوردییە.

چۆڕانەوە **çoran(ewe)** [ *čorānawa* ] - "ئاو لەبەر رۆیشتنی کەم کەم": خزمە دەگەڵ چلانیدن čelānīdan (P.) "چۆڕاندنەوە"ی شمەکی شۆڕاو بە گوشین". پێوەندی هەیە بە یەکێك لەم وشانەوە:

1- stilla ‏(L.)‏ و stile ‏(Gr.)‏ "دلۆپ"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *st(a)i- >* "توند بوون، خەست بوون". دە لاتینیدا destillare "داچۆڕاندن، چۆڕاندنەوە" لە stilla بە مانای "دلۆپ" وەرگیراوە.
2- ↑سەلە sele "کەرەسەی داچۆڕاندن".

**چۆشتیر çoştîr** *[ čoštīr ]* - "بزنی دووساڵە": ↑تووشتیر tûştîr.

**چۆغە çoğe** *[ čoğa ]* - "سەرکەوای لە بووزوو": چۆخە çoxe و چۆغک çoğık و چۆخک çoxıkیش دەگوترێن.

1- لەوانەیە شێوەیەکی گۆڕدراو بێ لە ↑شاپک şapık [یان شەپک şepık] "چۆغە" [شاپک ← چاوک ← چۆک ← چۆغ ← چۆغە].

[تێبینی: دە ژمارەیەک وشەی کوردمادیدا گۆڕانی فۆنۆلۆژیکی لەم چەشنە بەدی دەکەین، وەک سڤک sıvık، شەبەق şebeq و گەبەل gebel لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە سووک suk، شۆق şoq و گۆل gol. ئەم چەشنە گۆڕانە دە هەموو شێوەزارەکانی زمانی کوردمادی و هەروەها دە زمانی فارسیشدا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا زێدەتر بەرچاو دەکەوێ].

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ chozzo ‏(OG.)‏ و kotze ‏(MG.)‏ "پەستەک". وشەی coote ‏(Fr.)‏ "کۆت" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**چۆڤ çov** *[ čov ]* - "داردەست": ↑چێو çew "دار".

**چۆقاندن çoqandın** *[ čoqāndın ]* - "داغ کردنی ڕۆن": بنەوشەی چۆق -çoq شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چز -çız [بڕوانە ↑چزاندن çızandın].

**چۆقیان çoqîyan** *[ čoqyān ]* - "هەڵلەرزین لە نۆبەتێ دا": جگە لەمە چەق و چۆ çeq u ço پێداهاتن یان چەق و چۆ گرتنیش هەیە هەر بەم مانایە [دە بنچینەدا چەق و چۆق]. بنەوشەی چەق/ چۆق -çeq- /çoq خزمە دەگەڵ ↑شەکانەوە şekanewe. بنەوشەکە دەئەسڵدا شەک -şek ە بە مانای "لەرزین" و خزمە دەگەڵ shake ‏(E.)‏ "لەرزاندن، ڕاوەشاندن".

**چۆک çok** *[ čok ]* - "ئەژنۆ": خزمەدەگەڵ ↑چاق çaq "لینگ، لاق"، ↑شەق şeq "پێڵاقە" [دە بنەڕەتدا لاق]، ↑شەققە şeqqe "دارێک کە شەل یان لاق شکاو پێی دەڕوا" [لاقی دارین] و ساق sāq ‏(P.)‏ "لاق".

**چۆڵ1 çol** *[ čol ]* - "بەتاڵ، واڵا، نائاوەدان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ still ‏(G.)‏ "ئارام، بێدەنگ، بێجووڵە" و دەگەڵ ↑ژێر jîr [ژێرکردنەوە واتا ئارام کردنەوە]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "بێجووڵەیی" بووە و لە مەوە دواتر مانای "ئارامی، بێدەنگی" و هەروەها "نائاوەدانی" سەری هەڵداوە. بەم شێوەیە دەبێتە خزمیش دەگەڵ ↑چۆڕانەوە çoran(ewe) "ئاو لەبەر ڕۆیشتنی کەم کەم"، [چلانیدن čelānīdan ‏(P.)‏ "چۆڕاندنەوە"ی شمەکی شۆڕاو بە گوشین"] و دەگەڵ stilla ‏(L.)‏ و stile ‏(Gr.)‏ "دلۆپ"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *st(a)i- >* "توند بوون، خەست بوون".

[تێبینی: پەرە گرتنی ماناکانی سەرەوە لە ڕیشەیەکی بەرایی بە مانای "توند بوون، خەست بوون" نموونەی دیکەشی دە زمانی کوردمادیدا هەیە، بۆ وێنە وشەی کڕ [کڕ و کپ، قڕ و ڤپ] خزمە دەگەڵ *خار* "سەخت، ڕەق"].

**چۆڵ2 çol** *[ čol ]* - دەگەڵ چەک دێ [چەک وچۆڵ]. خزمە دەگەڵژمارەیەک وشە کە دە بنەڕەتدا مانای "لێدان" دەبەخشن، وەک ↑زڵلە zılle، ↑شەللاق şellaq، ↑*شڵەقان şıleqan*، ↑کلان kılan "ژاندنی مەشکە" ["ژاندن"یش دە بنەڕەتدا مانای "لێدان" دەبەخشێ]، ↑شێلان şêlan و ↑کەلخانە kelxane "دووکانی شیرگەر و تفەنگساز" و هتد.

**چۆلەکە çoleke** *[ čolaka ]* - "چڤیک، چێشکە": چۆ(لە) + کە ke + ço(le). کەرتی چۆل ço(le) شێوە کۆنترەکەی دە وشەی ↑چڤیک çıvîk دا پارێزراوە کە بریتییە لە چڤ -çıv. چویچ çuwîç یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Sperling ‏(G.)‏، sparo ‏(OG.)‏، sparrow ‏(E.)‏، sparv ‏(Sw.)‏، sparásion ‏(Gr.)‏ "چڤیک،

چۆلەکە"، spergoulos (Gr.) "پەلەوەری بچووک"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *sper- <** "جم و جۆڵی خێرا و نائارام کردن". وشەکانی sphurati (OIn.) "دەردەپەڕێنێ، ڕادەوەشێنی" و spairen (Gr.) "جووڵانەوەی خێرا و نائارام" و speīra (Gr.) "شپیراڵ، هێڵی مارپێچی" بۆ ئەم ڕیشەیە دەگەڕێنەوە. دەشێ ↑زڤرین zıvrîn [سووڕان suran] دە زمانی کوردمادیدا سەر بەم ڕیشەیە بێ. وەک دەبینین دە وشە ئەڵمانی و یۆنانییەکەدا پاشگری گچکاندن بە وشەکەوە لکاوە. ئەم دیاردەیە دە وشە کوردمادییەکەشدا بەرچاو دەکەوێ.

[تیبینی: لەباری گۆڕانی فۆتیمیەکانی -sp ژێرمەنی بە چ ç دە زمانی کوردمادیدا هەڵی سەنگینەدەگەڵ "چیە" ی کوردمادی و sprechen ئەڵمانی بە مانای "قسەکردن" یان دەگەڵ "چرۆ" و Spross ی ئەڵمانی بە مانای "چرۆ"].

**چۆلەمە çoleme** *[ čolama ]* - "1- ئیسکێکی دوو فلیقانە دە تیوان شان وملدا": ↑چەلەمە çeleme ش دەگوترێ.

**چۆماخ çomax** *[ čomāx ]* - "1- تیلا، گۆپاڵ 2- زللە": چۆماغ çomaġ یش دەگوترێ. چماق čomaq (P.). خزمە دەگەڵ stumpf (G.)، stomp (Nl.) کول، بە بێ نووک و بێ تیژایی" [دە بنەڕەتدا: قووڵە کراو]، Stumpf (G.)، stomp (NL.) "بنە، کۆڵکە"، Stummel (G.)، stommel (MNl.) "قونچک"، stampfen (G.)، stampen (Nl.)، stamp (E.)، stampa (SW.) "کوتان، کوتانەوە"، stampf (OG.) "دەسکاونکێ، کوتک"، Stempel (G.) "مۆر" [دە بنەڕەتدا: دارۆکەی مۆر لێدان] سەر بە ڕیشەی **(IE.) *stemb(h)- <**. ئەم ڕیشەیە خۆی دەبردرێتەوە سەر ڕیشەی **(IE.) *stēb(h)-** "ڕاوەستاندن، کۆڵەکە وەبەر دان، قیت کردن(ەوە)". Stab (G.)، stav (Sw.)، staff (E.) "داردەست"، stabas (Lit.) "دیرەک" لەم ڕیشەوە هاتوون. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑تەمغە temġe "مۆری دیوانی"، تەمر temır "مۆر"، دەمبل dembıl "ئامرازێکی وەرزش"، ↑دمبەک dımbek "جۆرێک ئەپڵ"، ↑زۆمپ zomp "کوتکی زل" و هتد. هەموو ئەم وشانە چەمکی "کوتان" لە خۆ دەگرن.

[تیبینی: دە زمانی کوردمادیدا دوو فۆتیمی st لە سەرەتای وشەکەدا گۆڕاون بە چ ç. ئەم دیاردەیە دە گەلێک وشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، وەک چیا، چڵ، چێڵ، چرتیان و هتد].

**چۆن çon** *[ čon ]* - "چەوا، کوو، چوو [چووزانم]": دە فارسیدا چگونە čegūne (P.). دەشێ دە کوردمادیشدا چگۆن çıgon بووبێ و بووبێتە چۆن، پێک هاتووە لە چ + گۆن gon + çı. کەرتی گۆن gon دە زمانی ئەمڕۆدا بە شێوەی ↑گوێن guwen یش دەبیندرێ. [لەگوێن واتا لەجۆری، لەنەوعی]. بەم پێیە "چۆن" دە بنچینەدا بە مانای "چجۆر" بووە.

**چەپ1 çep** *[ čap ]* - "بەرانبەری ڕاست": دە فارسیدا چەپ čap (P.).

[سەرەتا تیبینییەک: دە زمانی ئالمانیدا بۆ لای ڕاست وشەی recht (G.) بە کار دێ کە دە بنچینەدا بە مانای "ڕاست، با نەدراو، نەخوار"ە و دەگەڵ "ڕاست" ی کوردمادی هاوریشەیە. بۆ وشەی چەپ link (G.) بەکاردەهێندرێ و ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ "لەنگین" و "لەنجە"ی کوردمادی. ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە سەرنجراکیشە، ئەوەیە کە دە تیوان دوو چەمکی "چەپ" و "شەلین" یاخود "لەنگین"دا پێوەندییەک هەیە. ئەم پێوەندییە لێرەدایە کە مرۆڤی شەل خوارەوخوار دەڕوا یان لاقی خوار و با دراوە].

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ هەروەک چۆن "(لای) ڕاست" لە وشەی "ڕاست" وەرگیراوە، دەبێ وشەکەی بەرانبەریش، واتا "چەپ" دە بنەڕەتدا بە مانای "خوار" بووبێ. ئەم مانا بنەڕەتییەی "چەپ" دە زمانی کوردمادیدا بە ئاشکرا دیارە، بۆ وێنە کاتیک دەگوترێ "چەپ و چیر" بە مانای خوار و خێچ، یان "چەوت" [دە بنەڕەتدا بە مانای نەڕاست، خوار و خێچ] و چەوێل çewel "خوار، گیر". دە فارسیدا *چپە شدن* čape šodan (P.) بە مانای "وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل" بە کار دێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "لە ڕێ لا دان، ڕێگە خوار کردن" بووە. بەم پێیە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە وشەی چەپ خزمە دەگەڵ schief (G.)، scāf

skaios ،"شەل، شەپلەلێدراو" (Gr.) skimbós و "خوار"، (Let.) škibs ،(MG.) shep ،(Sw.) skev ،(OE.) (Gr.) و scaevus (L.) "چەپ" سەر بە ریشەی *skeip- < (IE.) "خوار، بادراو، چەپ". دە پلەیەکی دوورتردا دەچێتەوە سەر ریشەی *sqei- < (IE.) "خوار، چەوێل، شەل، شەپلەلێدراو". وشەی چەپ دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑شەپلە şeple، ↑چەوت çewıt [چەفت çefit، چەپت çepıt]، ↑چەوێل çewel، ↑نشێو nışêw [ن nı + شێو šew] واتا هەردی خوار یان رووبەری خوار.

**چەپ2 çep** [ čap ] - "دەست، لەپی دەست": دە هێندێک وشەی وەک ↑چەپۆک çepok، ↑چەپلە çeple، ↑چەپاڵە1 çepale "بست"دا دەبیندرێ. دە فارسیدا کف kaf (P.). "کف زدن" دە فارسیدا واتا چەپک لێدان، چەپلە لێدان. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *kapho- , *kopho- < (IE.) "سم، دەست".

**چەپ3 çep** [ čap ] - "چەپک": ↑چەپک çepık "باقە، تیسکە موو".

**چەپاڵە1 çepale** [ čapāla ] - "بست": دەچێتەوە سەر ↑چەپ2 çep [چەپلە، چەپۆک] "دەست، لەپی دەست".

**چەپاڵە2 çepale** [ čapāla ] - "پەنا و پەسیو": خزمە دەگەڵ ↑چەپەر çeper[3] "سەنگەر".

**چەپاڵە3 çepale** [ čapāla ] - "شەپازللە، شەپەلاغە":

1- دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شەپەلاغە şepelaġe.

2- دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە ↑چەپ çep "دەست، بەری دست" و ↑چەپۆک çepok و هیتر.

**چەپاو çepaw** [ čapāw ] - "تاڵان، راماڵین": [چەپاو کردن]. چاپیدن čāpīdan (P.) "تاڵان کردن". بڕوانە ↑چەپۆ çepo.

**چەپلە ceple** [ čapla ] - "چەپک، دەست ": چەپ + لە çep + le. چەپلە لێدان واتا دەست لێکدان بە مەبەستی ئافەرین گوتن و هان دان. ئەم وشەیە و هەروەها ↑چەپک cepık کە دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا بە مانای چەپلە دی و هەروەها ↑چەپۆک cepok "دەست، بەری دەست " لەیەک ریشەوە دێن. خزمن دەگەڵ کف kef (P.) "لەپی دەست". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *kapho- , *kopho- < (IE.) "سم، دەست".

**چەپک1 çepık** [ čapık ] - "چەپلە": چەپ + ک çep + ık. [↑چەپلە çeple].

**چەپک2 çepık** [ čapık ] - "1- دەستە، باقە 2- تیسکەموو": چەپ + ک çep + ık. بنەوشەی چەپ çep خۆی بە تەنیاش بەکاردێ و هەر ئەم مانایانە دەدا. خزمە دەگەڵ Schopf (G.) "چەپکی موو"، scuft ،(OG.) skopt (OIs.) "چەپک، باقە"، sheaf (E.) "باقەگیا، گیشەگیا، خۆیان"، čub (Rus.) "چەپکە موو"، سەر بە ریشەی *(s)keu-b, p- < (IE.) "باقە". ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑سمێڵ sımêl و ↑زووف zuf "زوڵف".

**چەپکەن1 çepken** [ čapkan ] - "کراسی داوێن درێژی ژنانە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سیپاڵ sîpal دا هاتوون. ئەم وشانە مانای "چنین، تەنین" دەبەخشن.

**چەپکەن2 çepken** [ čapkan ] - "رێگەی بنهەرد، نەغمە": کەرتی یەکەمی وشەکە دەشێ پێوەندی هەبێ بە zufr (Pl.) و jafra (Av.) "قووڵ" [بڕوانە ↑کون kun]. کەرتی دووەمی وشەکە دەشێ لە ↑کەندن kendın [هەڵکەندن]ەوە هاتبێ. لەم تێڕوانینە مانای وشەکە دەبێتە "قووڵ هەڵکەنراو".

**چەپۆ cepo** [ čapo ] - "تاڵان": چەپاوçepaw یش دەگوترێ. دە فارسیدا چپاول čapāvol (P.) "تاڵان" و چاپیدن čāpīdan (P.) "تاڵان کردن". لەوانەیە وشەکە دەگەڵ ↑ساوین sawîn و سابیدن sabîden (P.) "سوونەوە" [هەروەها بە مانای سترین، پاک کردنەوە] خزم بێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دە بنچینەدا دەبێ بەو مانایە هاتبێ کە لەکاتی تاڵاندا هیچ شتێکیان بەجێ نەهێشتبێ و بە وتەی ئەمڕویی "گەسکیان لە ماڵەکە دابێ".

چەپۆک **cepok** ⌈ *čapok* ⌉ - "دەست، پەنجە": خزمە دەگەڵ ↑چەپ2 çep "دەست، لەپی دەست" و ↑چەپڵە "çeple"، سەر بە ریشەی **(IE.)** ***kapho-, *kopho- >*** "سم، دەست". خزمە دەگەڵ ↑چەپڵە çeple و ↑چەپۆک çepok.

چەپە **çepe** ⌈ *čapa* ⌉ - "سەوڵی بەلەم لێخوڕین": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ şep دا باس کراون، سەر بە ریشەی **(IE.)** ***skeu(h)- >*** "هاویشتن، پاڵنان، ڕادان، دەرپەڕاندن". "چەپە" هەڵسەنگینە دەگەڵ Schippe (G.) "پێمەڕە، بێڵ" و ↑سەوڵ sewıl یش هەڵسەنگینە دەگەڵ Schaufel (G.) "پێمەڕە، خاکەنداز" دە زمانی ئەڵمانیدا. لەم تێروانینەوە "چەپە" یان "سەوڵ" دە بنەڕەتدا واتا "بێڵ"ی ڕادانی ئاو.

چەپەر1 **çeper** ⌈ *čapar* ⌉ - دەگەڵ "چڵک" دێ [چڵک و چەپەر çılk û çeper]. خزمە دەگەڵ Schuppe (G.)، scuoba (OG.) "کرێژ"، skove (Nor.) "توێخی ڕەق بوو، قرتماغە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ سوانەوە [↑ساوین sawîn] و دە بنچینەدا مەبەست ئەوشتە بووە کە بە سوانەوە لێ دەکرێتەوە. دە زمانی کوردمادیدا دەبێ مەبەست ئەو توێژە چڵکە ڕەقبووی سەر پێست یان جلوبەرگ بێ و هەربۆیەش وشەکە زۆرتر دەگەڵ چڵک بەکاردێ. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑چەپەڵ çepel "گەمار، پیس، چڵکن.

چەپەر2 **çeper** ⌈ *čapar* ⌉ - "تامان، دیواری لەشووڵ": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەپر kepır "سابات، سەیوانی بەدار و پەلکەگیا چنراو".

چەپەر3 **çeper** ⌈ *čapar* ⌉ - "سەنگەر": شێوەیەکی دیکە لە ↑سپەر sıper "بەربەست بۆ خۆپاراستن".

چەپەڵ **çepel** ⌈ *čapal* ⌉ - "گەمار، پیس، چڵکن": خزمە دەگەڵ ↑چەپەر[1] çeper [چڵک و چەپەر].

چەت **çet** ⌈ *čat* ⌉ - چەت تێخستن واتا کار تێکدان، خراپ کردنی کاری کەسێک. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑چەتە çete "ڕێگر".

چەتارە **çetare** ⌈ *čatāra* ⌉ - "پارچەی ئاوریشم": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ:

1- شەدە şede،

2- چەتفە çetfe "دەسماڵی سەری عارەبان".

چەتاڵ **çetal** ⌈ *čatal* ⌉ - "1- چەنگاڵ، هاواڵی کەوچک 2- دار یان ئاسنێکی دوولک بۆ لەسەر دانانی تفەنگ": [بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑تەتک tetık].

چەتر **çetır** ⌈ *čatır* ⌉ - "شتێکە بۆ خۆپاراستن لە بەفر و باران یان تیشکی هەتاو لە بان سەر ڕادەگیرێ": دە فارسیدا چتر čatr (P.). خزمە دەگەڵ ↑چادرçadır "خێوەت، پەڕۆی داپۆشین".

چەتفە **çetfe** ⌈ *čatfa* ⌉ - "دەسماڵی سەری عارەبان": خزمە دەگەڵ ↑چەتر çetır و دواتر دەگەڵ ↑کەتیفە *ketîfe* "سوانە" و ↑*چادرçadır* "خێوەت، پەڕۆی داپۆشین".

چەتوون **çetun** ⌈ *čatūn* ⌉ - "دژوار": > *(Gr.) stenos* "تەنگی" [مەبەست لە چەتوون دەشێ دە بنەڕەتدا "تەنگ و چەڵەمە" بووبێ].

چەتۆر **çetor** ⌈ *čator* ⌉ - "یەک لە چوار بەش": شێوەیەکی کۆنترە لە وشەی ↑چوار çuwar. **چەتە çete** ⌈ *čata* ⌉ - "ڕێگر": هەروەها ↑چەتلەمەر çetlemer هەیە بە مانای "دەسبڕ و فێڵباز". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ gaday (Pl.) و gadōk (Pl.) و gađa (Av.) "دز، چەتە". هەروەها قەدەغە qedeğe [یان ↑قەدەخە qedexe] کە بەهەڵە بە وشەیەکی تورکی ناسراوە، پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. دە زمانی عەرەبیدا "حرام" هەیە بەمانای شتێک کە خراپ و قەدەخەیە و هەروەها "حرامی" هەیە بە مانای "چەتە و ڕێگر". وەک دەیبینین دە زمانی عەرەبیشدا پێوەندی تیوان "قەدەخە" و "دز و ڕێگر" لە ئارادایە. وێ دەچێ دە زمانە ئێرانییە کۆنەکانیشدا وشەکە سەرەتا بە مانای "خراپ، قەدەخە" بووبێ و لەوێوە وشەی "چەتە" سەری هەڵدابێ بە مانای ئەو کەسەی کاری نەشیاو و قەدەخە دەکا. لەم تێروانینەوە ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ Schaden (G.)، scado (OG.)، schade (Nl.)، sceađa

(OE.)، skada (Sw.) "زەرەر و زیان، ناحەقی"، سەر بە ریشەی *skath- > (IE.) "زیان گەیاندن". دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی دیکەش هەن کە پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن و راست و دروستی ئەو بۆچوونەی سەرەوە دەسەلمێنێ. یەکەمیان وشەی ↑شەتە şete یە بە مانای "پەتای گیا و رووەک"، واتا ئەو شتەی زەرەر و زیان بە گیا دەگەیەنێ، دووەمیش وشەی ↑زەدە zede یە بە مانای "عەیب، کەمایەسی" [دەبنەڕەتدا: زیان پێگەیشتوویی]. هەروەها وشەی **خطا** xatā (Arb.) مانای "هەڵە، کاری نەباش" پێوەندی بە وشەکانی دیکەوە هەیە و لەوانەیە زمانی عەرەبی لە زمانە ئێرانییەکانی وەرگرتبێ. هەر لەم پێوەندییەدا دیسان وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا سەرنج رادەکێشێ کە ئەویش ↑چەت çet ە [چەت تێخستن]. ئەم وشەیە دەبنەڕەتدا بە مانای خراپ کردن و تێکدانی کارێک یان زەرەر و زیان لێدان بە کار و بارێکە لە لایەن نەیارەوە. لەلایەکی دیکەوە وشەی ↑سادە sade دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا.

**چەچە** **çeçe** [ *čača* ] - "دەست دە زمانی زارۆکدا": خزمە دەگەڵ ↑چیچە çîçe و ↑تووتە tute "پلەگوشت، گچکە".

**چەخەر** **çexer** [ *čaxar* ] - "نیشانەی رێ و بان، کێلکا سەر رێ": مەبەست لە چەخەر دەبێ کێڵەبەرد یان بەردی هەڵچندراو لەسەر رێگە بووبێ بۆ نیشانە کردن و ناسینەوەی شوێنی پێداروێشتن.
1- ئەم وشەیە ئەگەر دە بنەڕەتدا بە مانای "نیشانە" بێ، ئەوا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەقڵ şeqıl. 2- خۆ ئەگەر مانای بنەڕەتی وشەکە "بەرد" بێ، دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑چەقەن çeqen و ↑زاخۆر zaxor بە مانای "بەرەڵان".

**چەرت** **çert** [ *čart* ] - "جیا بوون، هەڵبڕان": خزمە دەگەڵ ↑چرتیان çırtîyan "پەڕین، هەڵاتن، ون بوون".

**چەرچی** **çerçî** [ *čarčī* ] - " فرۆشیاری گەڕیدە": پێ دەچێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی چەر + چی çer + çî. کەرتی چەر -çer دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑جاڕ car "بانگ، هەرا". کەرتی دووەم پاشگرە. لەم تێڕوانینەوە چەرچی [جارچی؟] بەو کەسانە گوتراوە کە بانگ و هەرایان کردووە بۆ راکێشانی کڕیار و فرۆشتنی شتەکانیان.

**چەرخ** **çerx** [ *čarx* ] - "رەورەوە": چرخ čarx (P.). وشەکە ئاڵوگۆری بەسەردا هاتووە و دە زمانە کۆنە ئێرانییەکاندا چەخەر čaxar بووە. خزمە دەگەڵ cakrá (OIn.)، kúklos (Gr.)، cyclus (L.)، hweōl (OE.)، wheel (E.)، hvél (ON.) "چەرخ"، سەر بە ریشەی *qeqlo- > (IE.) "چەرخ، چەرخان". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قاقیلۆک qaqîlok "دەزووی لەسەر مقەبیا هەڵکراو" و ↑تەقڵە teqle "سەرمەقوولات".

**چەردە** **çerde** [ *čarde* ] - "رەشتاڵە": سیەچردە sīyahčarde (P.). "رەشتاڵە" لە دوو وشەی "رەش" و "تاڵ" پێک هاتووە، کەرتی "تاڵ" شێوەیەکی دیکەیە لە "تار" [تاریک، تەماوی]. هەر بەم چەشنە وشەی "سیەچردە"ی فارسی لە دوو بەشی "سیە" واتا "رەش" و "چردە" پێک هاتووە کە دەبێ مانایەکی وەک تاڵ یان تاری هەبێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑شاردنەوە şardınewe. دیارە پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان دوو چەمکی "تار" و "شاراوە"دا. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑چرسین çırsîn هەیە بە مانای "رەشکە و پێشکە کردنی چاو" [تار بوونی چاو].

**چەرم** **çerım** [ *čarım* ] - "پێست": چرم çerm (P.)، çareman (Av.)، cárman- (OIn.)، corium (L.) "چەرم". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Schirm (G.)، scirm (OG.)، scherm (Nl.) "چەتر". وشە ژێرمەنییەکان دە بنەڕەدا بە مانای "کەوڵ یان بەرگی چەرمینی مەتاڵ" بووە. پاشان لەوێوە مانای "مەتاڵی شەر" و دواجار "چەتر" دروست بووە. دە ریشەدا دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشە کە مانای "بڕین، جیا کردنەوە، لێکردنەوە" دەبەخشن، وەک ↑کێرد kerd، ↑شڕ şır.

**چەرموو çermu** ] *čarmū* [ - "سپی": چەرمگ çermıg یش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی بە ↑چوڕ çur "سپیایی، روونی"یەوە هەبێ.

**چەرووەشێن çerweşên** ] *čarwašen* [ - "لووشك هاوێژ، جووتەوەشێن": چەر + وەشێن çer + weşên. کەرتی "چەر" خزمە دەگەڵ skélos (.Gr) "ران، لاق"، skélis "سمت". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ skoliós (.Gr) "خوار"، scheel (.G) "خێل" و ↑شەل şel لەم ریشەوە هاتوون. کەوابوو "چەرووەشێن" دەبێتە "لاق وەشێن" یان "لەقە وەشێن".

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی شەقاو [قەدەم، پێ]، چۆك، چەنگ، زەند و زینگ [گوێزینگ] و هیتریش گشتیان سەر بە ریشەیەکن بە مانای "خوار، بادراو].

**چەرە çere** ] *čara* [ - "خواردەمەنی، لەوەڕ": چەرەز çerez و چەلە çele ش دە گوترێ. پێوەندە بە کرداری ↑چەرین/ چێرین çerîn /çerîen "لەوەڕین".

**چەرەس çeres** [ *čaras* [ - "بەنگ، حەشیش": حەشیش دە زمانی عەرەبیدا بە مانای "گیا"یە و هەروەها بەو " گیا"یەش دەگوترێ کە بۆ کیشان و بەنگ بوون بەکاردەهێنرێ. هەر بەم جۆرە دە زمانی ئاڵمانیدا Gras (.G) بە هەردوو مانا بەکاردێ. دە زمانی کوردمادیدا چەرەس çeres خزمە دەگەڵ وشە ئاڵمانییەکە و دە بنەڕەتدا بە مانای "گیا، لەوەڕ" بووە. چەرەس خزمە دەگەڵ ↑چەرە çere و ↑چەرین çerîn.

**چەرەگە çerege** ] *čaraga* [ - "بەرچیغ، ئەو دارانەی بە پاڵ چیغەوە دەچەقێن": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑چەلاك çelak "داری درێژی میوە تەکاندن".

**چەرین çerîn** ] *čarīn* [ - "لەوەڕین": دە فارسیدا چریدن čarīdan (.P). بنەوشەی چەر -çer دەشێ خزم بێ دەگەڵ Gras (.G) "گیا" [دە بنچینەدا "لەوەڕ"]، grastis (.Gr) "گیای خواردن، لەوەڕ"، grasati (.OIn) "خواردی، لەوەڕا "، سەر بە ریشەی ***ghro-** < ***(IE.)*** "شین بوون، هەڵدان، گەورە بوون". وشەکانی چەرە çere، چەرەز çerez بە مانای "خواردەمەنی" دەشێ پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑گەلا gela.

**چەست çest** ] *čast* [ - "سڵاو کردنی سوپایی": ئەم وشەیە و هەروەها ژێست jest "پۆز و قیافە گرتن" دەچنەوە سەر gestus (.L) "جموجۆل و هەلسوکەوتی شانۆگەرانە".

**چەشن çeşın** ] *čašın* [ - "جۆر، نەوع، جینس": چسان česān (.P) "چەوا، چجۆر". پێك هاتووە لە دوو کەرتی چە + شن çe + şın. شن [سان sān (.P)] شێوەیەکی دیکەیە لە گۆن gon [↑گوێن guwen] و هەموو ئەوانەش دەبنە خزم دەگەڵ genos (.Gr)، genus (.L) "نەوع، جینس، تیرە، تۆرەمە". شیاوی باسە جنس jins (.Arb) وەك بە روونی دیارە، لە وشە یۆنانی یان لاتینییەکە وەرگیراوە. ئەم وشانەی سەرەوە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ kind (.E) "جۆر، نەوع"، Kind (.G) "زارۆك" و هەروەها ↑گەنج *genc*"لاو". دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑زان zan.

**چەفت1 çefıt** ] *čafıt* [ - چەپت çepıt یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چەوت çewıt "خوار، ناراست".

**چەفت2 çefıt** ] *čafıt* [ - "دارۆکە [یان ئاسنۆکەیە] دەرگای پیٚ دادەخەن": دە فارسیدا چفت (.P) و هەروەها چفت و بست čeft u bast (.P). خزمە دەگەڵ Schaft (.G)، shaft (.E)، skaft (.Sw) "دەسك" [دەبنەڕەتدا "دەستگیرەی تیژە"]، skēptron (.Gr) "چێو، داردەست"، scāpus (.L) "دەسك". [مەبەست ئەو دارۆکەیە کە وەك دەسك بەکار دەهێنرێ، وەك دەسکەپێمەڕە یان دەسکەچەقۆ و هتد]. دە ریشەدا خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn "سوونەوە، داتاشین، ساف و لووس کردن". دە زمانی کوردمادیدا "جووت کردنی دەرگا " هەیە کە لێرەدا وشەی ↑جووت² cut شێوەیەکی گۆڕدراوە لە "چەفت". جووت کردنی

دەرگا [پێشتر چەفت کردنی دەرگا] بە مانای داخستنی دەرگا و قایم کردنی بەهۆی ئەو دارۆکەیە بووە کە خراوەتە پشتییەوە.

[تێبینی: لەباری پێوەندی نێوان چەفت و چەفت کردن واتا جووت کردن دەتوانین بەراوردێك بکەین دەگەڵ دوو وشەی Riegel و riegeln دە زمانی ئەڵمانیدا، یەکەمیان بە مانای "چەفت" و دووهەمیشیان بە مانای "چەفت کردن"].

**چەفتە çefte** [ *čafta* ] - "1- درۆ، بوختان 2- بنەمێو کە لە دار دەهاڵێ": خزمە دەگەڵ ↑چەواشە çewaşe. [دە بنەرەتدا: قسەی ناراست، قسەی چەپ و بادراو]. ئەگەر سەیری مانا دووەمەکەش بکەین، ئەوە دیسان ئاماژە دەکرێ بە با دران و خوار و خێچ بوونی بنەمێوەکە بەدەورا داردا.

**چەق1 çeq** [ *čaq* ] - "ناوەند، نێوەراست، مەرکەز" [بۆ وێنە چەقی رێگا]. ئەم وشەیە وەك بنەوشە دە ↑چەقین çeqîn و ↑چقڵ çıqıl یشدا دەبیندرێ و دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تێراچوون، تێهەڵچەقین".

[تێبینی: سەبارەت بە پەیدابوونی مانای "ناوەند ونێوەراست" بۆئەم وشەیە دەتوانین دەگەڵ وشەیەکی یۆنانی بەراوردی بکەین کە مانای "ناوەند، نێوەڕاست"ی وەرگرتووە، بەڵام خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تێهەلچەقین". وشەی centrum (.L) "ناوەند، نوختەی ناوەندی" دەچێتەوە سەر kentron (.Gr) "چقڵ، نەقیزە" و ئەمەشیان دەچێتەوە kentein (.Gr) "تێراچوون، تێهەڵچەقین". وشەی kentron ی یۆنانی هەر دە زمانی یۆنانیدا جگە لە مانای "چقڵ و نەقیزە" بە مانای "نوختەی نێوەڕاست لە ناو بازنە"دا بەکارهاتووە و ئەم مانایەش لەمەوە سەرچاوەی وەرگرتووە کە نوختەی تیژی چقڵ یان دارێکی تیژکراو دەکەوێتە نێوەڕاستی ئەوشتەوە (ئەگەر لەسەرەوەڕا سەیری نوختەکە بکەین]. دە زمانی کوردمادیشدا هەر ئەم پێوەندییە لۆژیکییە دە نێوان چەمکەکانی "چقڵ و تێهەڵچەقین" لە لایەك و لە لای دیکەشەوە "چەق" بە مانای "نێوەڕاست، مەرکەز" دا هەیە].

**چەق2 çeq** [ *čaq* ] - دەگەڵ "چۆ" دێ [چەق و چۆ çeq u ço]. چەق و چۆ گرتن یان چەق و چۆ پێداهاتن واتا هەڵلەرزین لە نۆبەتێ دا. خزمە دەگەڵ ↑شەکانەوە şekanewe "لەرزین".

**چەق3 çeq** [ *čaq* ] - "سەرسەخت و لاسار": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شەق şeq [کەللەشەق واتا سەرسەخت]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑سەخت sext، زەخت zext، جەخت cext و هتد. ئەم وشانە ئاماژە بە "سەختی، گوشار، توندی" دەکەن.

**چەقا çeqa** [ *čaqā* ] - "لەوساوە، لەودەمەوە": خزمە دەگەڵ ↑چاخ çax "کات، دەم".

**چەقاڵە çeqale** [ *çaqāla* ] -"میوەی نەگەیشتوو": [سفت و چیڕ وەك چەقالە بادام]. چغالە čaġāle (.P). خزمە دەگەڵ ↑چغوور çıġûr "(دارستانی) چڕ و پڕ"].

**چەقاڵتە çeqalte** [ *čaqālta* ] - "سفت، چیڕ": [چەرمە چەقاڵتە]، خزمە دەگەڵ ↑چغوور çıġûr "(دارستانی) چڕ و پڕ"].

**چەققاڵ çeqqal** [ *čaqqāl* ] - دەگەڵ "بەققاڵ" دێ [بەققاڵ و چەققاڵ]. دەچێتەوە سەر ↑چەقە çeqe/çeqqe. مەبەست لە چەققە کردن دەنگێ و هەرا کردنە بۆ راکێشانی کڕیار و خورد کردنەوەی شتومەك.

**چەقچەق çeqçeq** [ *čaqčaq* ] - "چەقەنەی ئاش": خزمە دەگەڵ ↑چەقەنە çeqene.

**چەقڵە1 çeqle** [ *čaqla* ] - دەگەڵ "سەما" دێ [چەقڵە سەما çeqlesema]:

1- لەوانەیە شێوەی کۆنتری ↑تەقڵە2 teqle بێ واتا "سەرمەقولات، خۆ وەرسووڕاندن لە حەوادا" [کۆتری تەقڵەباز]، سەر بە ریشەی بە ریشەی (IE.) *qeqlo- > "چەرخ، چەرخان". لەم تێڕوانینەوە "چەقڵە" بریتییە لە خۆ با دان و جم و جۆڵی تێکەڵ بە سووڕان لەکاتی سەماکردندا.

2- لەوانەشە "چەقڵە" پێوەندی بە بنەوشەی ↑چەق2 -çeq ەوە هەبێ بەمانای "لەرزین، راوەشاندن، تەکان دان". لەم تێڕوانینەوە دەبێ مەبەست خۆ لەراندن لە کاتی سەمادا بێ.

**چەقڵە2** [ *čaqla* ] **çeqle** - "چڵکن، گەمار": بنەوشەی چەق -çeq لەم وشەیەدا بەجورێکی دیکە لە وشەی ↑جیقنە cîqne "پیسایی پەڵەوەر"دا دەبیندرێ.

**چەقۆ** [ *čaqo* ] **çeqo** - "کێرد": دە فارسیدا čāqū (P.). خزمە دەگەڵ Säge (G.)، zaag (Nl.)، saw (E.) "مشار"، سەر بە ریشەی ***sek-* (IE.) >** "بڕین، بڕینەوە". secare (L.) "بڕین، لەت کردن"، seč (Rus.) "بڕین" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

**چەقە[1]** [ *čaqa* ] **çeqe** - "قسەکردنی زۆر و بە دەنگی بەرز": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زیقە zîqe.

**چەقە[2]** [ *čaqa* ] **çeqe** - "بنێشت": چەققە çeqqe ش دەگوترێ. سقز saqqez (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑جاجك cacık.

2- ↑چڕ2 çır [چغر çığır، چقر çıqır] "توند، سفت، خەست".

**چەقەرە** [ *čaqara* ] **çeqere** - "تیرتکی تازە دەرهاتووی گیا": ↑چەکەرە çekere ش دەگوترێ.

**چەقەساو** [ *čaqasāw* ] **çeqesaw** - "تیژکردنی داس": بنجەوشەی چەق- -çeq خزمە دەگەڵ زاخ[1] "بەرد". هەروەها ↑سەق seq هەیە بە مانای "سۆهان لێدان، هەسان لێدان". کەرتی دووەمی وشەکە واتا ساو saw دەچێتەوە سەر ↑ساوین sawîn [سوون، سوونەوە]. چەقەساو واتا ساوین بە بەرد [هەسان لێدان] بە مەبەستی تیژ کردن. جگە لەم وشەیە ↑چەقەسوو çeqesu یان چەقاوەسوو çeqawesu بە مانای "بێچاووڕوو، بێشەرم" هەیە، کە ئەمەش پێوەندی بەوشەکەی سەروە پەیدا دەکا. مەبەست لەم وشانە ئەوەیە کە کەسێك هێندە دەگەڵ ئەم و ئەو تێکەوتووە و تووشی شەڕەقسە بووە کە ئیتر سواوەتەوە و هەرز بووە [هەرزە بووە].

[تێبینی: مەبەست لە هەر دوو وشەی "هەسان" و "سۆهان" یش دە ئەسڵدا "بەرد"ە، یەکەمیان خزمە دەگەڵ "ئاش" و دووەمیان دەگەڵ "سەق"].

**چەقەسوو** [ *čaqasū* ] **çeqesu** - "بێچاووڕوو، بێشەرم": خزمە دەگەڵ ↑چەقەساو çeqesaw.

**چەقەڵ1** [ *čaqal* ] **çeqel** - "تۆرِك": دە فارسیدا شغال şoğal (P.)، śrgālá-h (OIn.). ئەم وشەیە لە رێگەی زمانی تورکییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیش: Schakal (G.)، jackal (E.) و هتد. ریشە؟

**چەقەڵ2** [ *čaqal* ] **çeqel** - "پێچك، پێچکی کورسی": چەق + ئەل çeq + el. چەق شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چاق çaq "لاق". کەرتی دووەم پاشگرە.

**چەقەن** [ *čaqan* ] **çeqen** - "رەقەن، تەمتەمان": خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑زاخان zaxan و ↑زاخۆر zaxor "بەردەڵان"، ↑سخارsıxar "زەوی نەکێڵ، رەقەن" و بە شیمانەیەکی بەهێز دەگەڵ ↑سەق *seq*یش.

**چەقەنە** [ *čaqana* ] **çeqene** - "1- دوو پارچە زەردەی چکۆڵە کە سەماکەر دە دەستی دەکا و لێکیان دەدا و دەنگیان لێ دێنێ 2- پل لێدان، دەنگێ دەرهێنان بە لێکدانی قامکەکان لە سەمادا 3- یەکێکە لە ئامرازەکانی ئاش": خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑چەق و چۆ çeq u ço، ↑چۆقیان çoqîyan، ↑شەقشەقە şeqşeqe، ↑چەکچەکی çekçekî، ↑شەکانەوە şekanewe و هتد . گشت ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "لەرزین، راوەشاندن، تەکان دان" دەکەن.

**چەقین** [ *čaqīn* ] **çeqîn** - "قایم بوون، تیراچوون، تیراکران": خزمە دەگەڵ stechen (G.)، stehhan (OG.)، steka (Ofrs.)، steken (Nl.) "پێوەدان بە نووکی تیژ، تیراکردن، تیهەڵچەقاندن"، سەر بە ریشەی **> *(s)teig- (IE.)** "تیراچوون، تیهەڵچەقین". دە زمانە ئەورووپییەکاندا گەلێك وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەك steizo (ON.) "بە سیخەوە کردن، بە شیشەوە کردن"، stiks (Gt.) "نوختە" [دە بنچینەدا شوێنی هەرە ورد و تیژ]، stizo (Gr.) "خاڵ داکوتان لەسەر پێست"، instingare (L.) "تیوەژاندن ، تیراکردن"، -tigma (OIn.) "تیژ"، stock (G.) و sticca (OE.) "بەرچیخ، داردەست"، stega (Lett.) "سینگی

داکوتان"، stoža (.Rus) "دار، کۆڵەکە، ستوون". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زور وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑تیخ tîx، ↑تیژ tîj، ↑چیغ çîġ، ↑سینگ sîng، ↑چقڵ çıqıl، ↑چەقەرە çeqere و هتد. دە زمانی کوردمادیدا چەقین و چەقاندن دیارە مانەکەیان تەواو بەندە بە مانای ریشەکەوە کە دەبێتە "تیراچوون یان تیراکردن". مەبەست لە چەقاندنی دار یان سینگ دە بنچینەدا تیراکردنی ئەوشتە لە هەرد یان دیوار بووە. ئەم مانا بنەڕەتییە دە وشەکانی "هەڵچەقین و هەڵچەقاندن" دا خۆی باشتر نیشان دەدا. دە زمانی ئالمانیشدا stecken (.G) کە بە مانای "(دا)چەقاندن، قایم کردن" دێ، خۆی دەچێتەوە سەر stechen (.G) "تیراکردن، تیهەڵچەقاندن".

**چەک 1 çek** ‎*[ čak ]*‎ - "1- ئامرازی لێدان و کوشتن 2 - مشتەی دەستی هەللاج": دە فارسیدا چک çek (.P) بە مانای "زللە" دێ و چکاچک çekaçek بە مانای "دەنگی وێککەوتنی شمشێر لە شەڕ دا". جگە لەمە بنەوشەی چەک دە وشەی ↑چەکوچ çekuç [چەکوش] دا دەبیندرێ. ئەم وشانە دەشێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە خزم بن کە لەژێر ↑سەق *seq* دا شی کراونەو ە و مانای بنەڕەتییان "سەخت، بەهێز"ە و لەمەوە چەندین مانای دیکە وەک "بەرد، گۆپاڵ، کوتک، چەکوچ" [ئامرازەکانی لێدان]، "لێدان"، "زەبر و زەنگ"، "زەخت و زۆر" سەرچاوەیان گرتووە. دە زمانی فارسیدا هەروەها چکاندن ماشە čekāndan e māše (.P) بە مانای "داگرتنی پەلەپیتکە"ی تفەنگ و دەبانچە بەکار دێ. لەم کردارە فارسییەدا چەمکی "لێدان" خۆی حەشار داوە، هەر وەک چۆن دە وشەی "پەلەپیتکە" یان "تفەنگ"یشدا ئەم چەمکە لەئارا دایە. هەروەها "شلیک"ی فارسی خزمە دەگەڵ "شەللاق" و ئەویش چەمکی لێدان دەردەبڕێ.

**چەک 2 çek** ‎*[ čak ]*‎ - "کەوشی کۆنی لەبەریەک چوو": هەروەها چەک و پووش çek û pûş هەیە بە مانای "وردە و پردە". خزمە دەگەڵ ↑چەقۆ çeqo سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێکرنەوە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑شەق şeq [شەق و شڕ şeq û şır].

**چەک 3 çek** ‎*[ čak ]*‎ - "قاقەزی بانکی": چک çek (.P) < ‎*(E.) check*‎ " کونترۆڵ کردن" < ‎*(OFr.) echec*‎ "شەترەنج" < ‎*(P.) šāh*‎ "شا، پادشا". زمانی فەرەنسەیی وشەکەی بە مانای "شەترەنج" وەرگرتووە وەک "شاخ مات" دە عەرەبیدا. ئەم وشەیە پاشان چووەتە ناو زمانی ئینگلیزی و سەرەتا بە مانای "نەزم و سیستەمی دەسەڵاتداری" و پاشان بە مانای "کونترۆڵ کردن" بەکار هاتووە. وشەکە دیسان لەباری ماناوە پەرەی سەندووە و مانای "قاقەزی بانکی" وەرگرتووە کە سەرەتا مەبەست قاقەزێک بووە کە بانک کۆنترۆڵی دەکا. دواجا وشەکە بەم مانایانەی کە دە زمانە ئەوروپییەکاندا پەیدای کردووە، هاتۆتەوە ناو زمانی فارسی و کوردمادی.

**چەکچەکی çekçekî** ‎*[ čakčakī ]*‎ - "شەمشەمەکوێرە": بنەوشەی چەک -çek، بە چەند شێوەیەک، دە هێندێک وشەی دیکەشدا دەبیندرێ، وەک ↑چەق و چۆ çeq u ço، ↑شەقشەقە şeqşeqe، ↑شەکانەوە şekanewe و هتد. گشت ئەم وشانە ئاماژە بە چەمکی "لەرزین، راوەشاندن" دەکەن. مەبەست لە ناوی چەکچەکی ئاماژە کردنە بە پەڕ و باڵ لێکدانی خێرا [پەڕ و باڵ راوەشاندن].

[تێبینی: ناوی ئەم گیانلەبەرە دە زمانی ئاڵمانیدا دەبێتە Fledermaus (.G) و دە بنەڕەتدا واتا "مشکی پەڕ و باڵ لێکدەر"].

**چەکمە çekme** ‎*[ čakma ]*‎ - "کەوشی تا ئەژنۆ": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑سوخمە suxme "کولێجە"، Schuh (.G)، scuoh (.OG)، skōhs (.Gt)، shoe (.E)، sko (.Sw) "کەوش، پێڵاو"، سەر ریشەی **‎*(IE.) *(s)keu-*‎ >** "داپۆشین".

2- ↑چاق çaq [ساق sāq (.P) ] بە مانای "لای خوارەوەی لاق"، چۆک çok "ئەژنۆ"، ↑شەق şeq [دەبنەڕەتدا بە مانای "لاق، پێ"] و دواتر دەگەڵ ↑زەنگاڵ *zengal* "بەلەک پێچ". چەکمە، چاق [واتا لاق تا نیزیک چۆک] دادەپۆشێ.

چەکوچ **çekuç** [ *čakuč* ] - "ئامرازێکی کوتان و شکاندن": چەکوش çekuç یش دەگوترێ. چکش čakkoš (P.) čakuč، (Pl.) čakuš، (Av.). خزمە دەگەڵ ↑چەک çek.

چەکە1 **çeke 1** [ *čaka* ] - "مشتووی هەلاج": خزمە دەگەڵ ↑چەک *çek* و ↑چەکوچ çekuç.

چەکە2 **çeke 2** [ *čaka* ] - "لەرزە" [هەر چەکەی سەری دێ]. خزمە دەگەڵ ↑چەق çeq، ↑چوقیان çoqîyan و ↑شەکانەوە şekanewe. گشتیان بە مانای "لەرزین، لەرینەوە، راوەشاندن".

چەکەرە **çekere** [ *čakare* ] - "تیرتکی تازە دەرهاتووی گیا": خزمە دەگەڵ ↑چووزەرە çûzere. هەروەها پێوەندی پەیدا دەکا بەو وشانە کە لە ژێر ↑زەق zeq دا باس کراون.

چەل1 **çel 1** [ *čal* ] - "جار، کەڕەت":

1- لەوانەیە گۆڕدراوی ↑جار car بێ.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑گل³ gıl "جار".

چەل2 **çel 2** [ *čal* ] - "هەشتپێ": شێوەیەکی دیکە لە ↑جلە cıle. چەلومل çelumel بە مانای "بەڵای دەست هەڵنەگر" لەم وشەیە وەرگیراوە. کەرتی "مەل" لەم وشەی دواییدا دەبێ هەر "مار" بێ و بەگشتی وشەکە ئاماژەیە بە بەڵایەک کە وەک مار و هەشتپێ لە مرۆڤ دەهاڵێ و بەری نادا.

چەلاک **çelak** [ *čalāk* ] - "داری درێژی میوە تەکاندن": خزمە دەگەڵ ↑جەل cel.

چەلاندن **çelandın** [ *čalāndın* ] - دەگەڵ پێشگری "دا" دێ [داچەلاندن daçelandın: شۆڕکردنەوە، شل کردن]. خزمە دەگەڵ ↑شل şıl.

چەلاو **çelaw** [ *čalāw* ] - "1- شورباو 2- زەلکاو": خزمە دەگەڵ ↑چراڤ çırav و ↑زەڵ zel "زەلکاو"، ↑چڵپاو çılpaw و هێندێک وشەی دیکە، سەر بەریشەیەک بە مانای "لیچق بوون، تەڕ و لووس بوون".

چەڵتووک **çeltuk** [ *čaltūk* ] - "برینجی بە توێکڵەوە": دە فارسیدا شلتوک šaltūk (P.). ئەم وشەیە و هەروەها وشەکانی ↑چاڵ çal [چیلکەو چاڵ] و ↑چڵتە çılte [چڵتەو چاڵ] خزمن دەگەڵ Schale (G.)، scala (OG.)، scealu (OE.)، schel (Nl.)، skel (OIs.)، shell (E.) "توێکڵ". [توێکلی دەغڵ ودان و هی میوە]، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kel- >** "قەڵشاندن، جیا کردنەوە، لێک کردنەوە". مەبەست ئەوشتەیە کە لە دان یان لە میوەکە جیا دەکرێتەوە.

چەلقوو **çelqu** [ *čalqū* ] - "لەڕ و لاواز": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جلوا cılwa "سیس و ژاکاو"، دە بنەرەتدا بە مانای "هیشکبوو".

چەلومل **çelumıl** [ *čalūmıl* ] - "بەڵای دەست هەڵنەگر": خزمە دەگەڵ ↑جلە1 cıle 1 "1- هشت پێ 2- رەگ و ریشەی دارەبی کە پێش بە ئاو دەگرێ".

چەلە **çele** [ *čala* ] - "گوریس، پەت": خزمە دەگەڵ Seil (G.)، zeel (Nl.)، sāl (OE.) "بەن، ریس، پەتک"، saīlas (Lit.) "بەن، بەند"، silo (Rus.) "قلفە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *sēi- >** "بەستن، لێکبەستن". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑چیلان çele "ئەنگوچکە سۆرانی باریک"، ↑چللی çıllî "دەزووی برین دروونەوە"، ↑جاڵ cal "داو، هەودا"، ↑جۆڵا cola و ↑جالّجالّۆکە calcaloke و هیتر پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

چەلەک **çelek** [ *čalak* ] - "چەماو، داهاتووە": وشەکە سەر بە ریشەیەکە بە مانای "خوار" و دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑*شەل* *şel*، ↑خێل xel، ↑چەڵەمە çeleme و هتد.

چەڵەمە **çeleme** [ *čalama* ] - "1- کەڵەمە، کەلەوە 2- ئالقەی سەری قەیاسە 3- ئیسکێکی دوو فلیقانە دەتیوان شان وملدا": شێوەیەکی دیکە لە ↑کەلەوە kelewe / ↑*کەلەمە* *keleme*. وشەکە بە مانای سێهەم وەک ↑چۆڵەمە çoleme ش دەگوترێ. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "رێککوشین". دە زمانی کوردمادیدا ئەم پێوەندییە بەرچاوە [تەنگێ و چەڵەمە]. چەڵەمە یان کەڵەمە ئەو دارەیە کە

بەهۆی ڕێککوشینەوە (هەردوو سەری) وێک هاتۆتەوە. وێ دەچێ مانای سێیەمیش لەمەوە هاتبێ کە ئەو ئێسکەی پەلەوەر ئێسکێکی خوارە، واتا دوو سەرەکەی وێک هاتۆتەوە.

**چەلەنگ 1** **çeleng** [ *čalang* ] - "چوست و ئازا": خزمە دەگەڵ یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- زرینگ zrîng "ئازا، بەکار، هەڵسووڕ".

2- ↑چالاک çalak.

3- schlank (G.)، slank (Nl.) "قەدباریک". مانای وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بووە بەوەی کە شتێک بە هۆی شل و مل بوون با دەدرێ و دەچەمێتەوە. slingan (OG.) "بەم لا و ئەولادا جووڵانەوە، بەم لا و ئەو لادا با دانەوە"، slingan (OE.) "با دانەوە، خوشین"، slyngva (OIsl.) "هاویشتن، فڕێ دان"، Schlange (G.) "مار" وێڕای وشەکانی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەی < ***slenk-,-g-*** ***(IE.)*** "بادان، بەم لا و ئەو لادا جووڵانەوە". لەم تێڕوانینەوە "چەلەنگ" دەبێتە کەسێکی بەجووڵە و بەراپەڕ، بەپێچەوانەی مرۆڤی لەشگران.

**چەلەنگ 2** **çeleng** [ *čalang* ] - "دەفری گەورەی تەنەکە": وشەکە دە ئەسڵدا "چەلیک" بووە و فۆتیمی n خزاوەتە ناوی. بڕوانە ↑چەلیک çelîk.

**چەلیپا** **çelîpa** [ *čalīpā* ] - "خاچ، سەلیب": وشەی عەرەبی صلیب salīb (Arb.) لەوانەیە ریشەکەی بۆ زمانی کوردمادییە بگەڕێتەوە. شتێک کە ئەم شێمانەیە بەهێز دەکا، وشەکانی ↑زولوبیا zulubya "جۆرێک شیرینی"، ↑زولف *zulf* و ↑قلفە qılfe یە. ئەگەر سەرەنجی شێوەی ئەم شتانە بدەین، جۆرێک "تێهەڵکیش بوون" بەدی دەکرێ کە بە هۆیەوە دۆخێکی "لێکدران و "زەربدەری" بەرچاو دەکەوێ. دیارە "خاچ"یش دە بنەڕەتدا بریتییە لە دۆخێکی "لێکدران و "زەربدەری". [دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ سێ چەمکی "زەربدەر"، "خاچ" و "چوارڕێیان" وشەی Kreuz بەکار دەهێنرێ کە ریشەی لاتینی هەیە و دە زمانی لاتینیدا مانای خاچ دەدا].

**چەلیک** **çelîk** [ *čalīk* ] - "ئاسنی پتەو": چلیک çılîk یش دەگوترێ. چلیک čelīk (P.) دە زمانی فارسیدا بە ↑چەلەنگ çeleng دەگوترێ، واتا "دەفری لە کانزا، دەفری تەنەکە". ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ لەگەڵ Stahl (G.)، stahal (OG.)، staal (Nl.)، steel (E.)، stal (Sw.) "ئاسنی پتەو کراو، پۆڵا". ئەم وشە ژێرمەنییانە بە خزم دانراون لەگەڵ staxra (Av.) "ڕەق، سەخت"، سەر بە ریشەی < ***st(h)ā-*** ***(IE.)*** "وەستان، ڕاوەستان، جێگیر بوون، قایم بوون".

[تێبینی: لە وشە کوردمادییەکەدا دوو فۆتیمی st لێکدراوە و بووەتە ç. ئەم گۆڕانە لە چەندین وشەی دیکەشدا بەدی دەکرێ، وەک "چیر"، "چیغ"، "چاتمە"، "چۆماخ" و "چەقین" و هتد].

**چەم** **çem** [ *čam* ] - "ڕووبار": چۆم çom یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Schwimmen (G.)، swimman (OG.)، zwemmen (Nl.)، swim (E.)، svim(m)a (OIs.)، simma (Sw.) "مەلە کردن". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها Sumpf (G.) هەیە بە مانای "زۆنگ، باتڵاق" و ئەویش خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. ئەم وشەیە دە ئەڵمانی کۆندا sunft (OG.) بووە.

[تێبینی: لەنێوان چەمکەکانی "کانی، جۆگە، باتڵاق، چەم، دەریا"دا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک لە ئارادایە. دە زمانی ئەڵمانیدا Moor (G.) وشەیەکی دیکەیە بە مانای "باتڵاق" و خزمە دەگەڵ Meer (G.) "دەریا". هەروەها Bruch (G.) وشەیەکی دیکەیە بۆ "زۆنگ" و بە لای منەوە خزمە دەگەڵ وشە کوردمادییەکانی بێرک berk "گۆمیلە لە چیا" و بیرکم bîrkım "گۆل، دەریاچە" و بیر bîr "چاڵاو". دە زمانی ئینگلیزیدا brook (E.) مانای "جۆگە" دەدا و دیسان دە زمانی ئەڵمانیدا Brunnen (G.) دەبێتە "کانی"].

**چەمان** **çeman** [ *čamān* ] - "دووکەڵ": [چڕە چەمان واتا دووکەڵی خەست]. خزمە دەگەڵ Schmauch (G.)، smok (E.)، smook (Nl.) "دووکەڵ"، smýchein "دەماندن"، سەر بە ریشەی < ***smeu-g-*** ***(IE.)*** "دووکەڵ کردن". وەک دەبینین وشەکە پێک هاتووەلە بنەوشەی چەم + ئان çem + an. پاشگری an دە

زمانە ئێرانییەکاندا چاوگ و کردار دروست دەکا [دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەبێتە en]. لەوانەیە لەم وشە کوردمادییەشدا پاشگرەکە، پاشگری کردار بێ و بەم جۆرە وشەکە سەرەتا وەک چاوگ بەکارهاتبێ بە مانای "دووکەڵ کردن"، هەروەک smocian (.OE) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بە مانای "دووکەڵ کردن".

**چەمان(ەوە) çeman(ewe)** [ *čamānawa* ] - "کووڕ بوون، خواربوون": ↑چفان çıfan یش دەگوترێ. دە فارسیدا چمیدن čamīdan (.P). ئەم وشەیە دەبێ بچێتەوە سەر ریشەی-*kam(p)* < (.IE) "چەمانەوە". ئەو وشە ژێرمەنییانەی خوارەوە دەبردرێنەوە سەر ئەم ریشەیە: hamalōn (.OE)، hamelian (.OE)، hamla"سەقەت کردن، فەلەج کردن". Hammel (.G) "بەرانی یەختە کراو" دەچێتەوە سەر hamal (.OG) "سەقەت، گیڕ". چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بە "چەمانەوە" هەیە، وەک ↑کەوان kewan "1- دارێکی چەماوە تیری پێ دەهاوێژن 2- شتی چەماوە" [کمان kamān (.P)]، ↑گاو gaw "ئاڵقە"، ↑ کەمە keme "داری دەوری دەفە"، ↑کەمەند kemend، ↑کەمەرkemer، ↑گەمارۆ gemaro و هتد.

**چەمبۆڵە çembole** [ *čambola* ] - "پووکاوڵە، چنگاوڵ": خزمە دەگەڵ ↑چەنگ çeng. لەوانەیە وشەکە دە بنچینەدا چەنگبۆڵە *çengbole ‎چەنگبۆڵە*‎ بووبێ و گۆڕدرابێ بە "چەنبۆلە" و پاشان "چەمۆڵە". ئەگەر وابێ، ئەوسا کەرتی بۆڵە مانای "خڕ بوونەوە" دەدا واتا چەنگێکی خڕبۆوە. بەراوردی کەرتی "بۆڵە" بکە دەگەڵ ball "تۆپ" دە زمانە ئەورووپییەکاندا، Beule (.G) "هەڵمساوی، هەڵتۆقاوی" و دەگەڵ ↑بۆل bol "دەنکەترێ" و ↑بالیف balîf دە زمانی کوردمادیدا کە ئاماژە بە شتی خڕ و هەڵمساو دەکەن.

**چەمبەر çember** [ *čambar* ] - "ئاڵقە": چەمەر çemer یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑چەمانەوە çemanewe.

**چەمچە çemçe** [ *čamča* ] - "ئەسکوێ، کەوچکی گەورە": چەمچک çemçık و چمچە çımçe و کەمچە kemçeش دەگوترێ. [کەمچە هەم بە مانای چەمچە دێ و هەم ئامرازێکی قوڕەکاریشە کە وەک کەوچک دەچێ و قوڕی پێ هەڵدەگرن]. جگە لەمە↑کەوچک kewçık و ↑کەفچک kefçık یشمان هەیە کە دوو شێوەی دیکەی وشەکانی سەرەوەن. بنجی ئەم وشانە، چەم/ کەم -çem- /kem- خزمە دەگەڵ ↑جام cam و بەم جۆرە مانای چەمچە [کەمچە، کەڤچی، کەڤچک، کەوچک] دەبێتە "جامی بچووک، قاپووچکە، جامۆلکە".

**چەمک çemık** [ *čamık* ] - "تیرم، مەفهووم": خزمە دەگەڵ ↑چمک çımık بە مانای "قەراخ، گۆشە" [چمکی دەسماڵ].

[تێبینی: ئەم وشەیە هاومانایە دەگەڵ term دە زمانە ئەورووپییەکاندا. term وشەیەکە بۆ تاریف کردن و دەربڕینی بابەت یان مەبەستێک بەکاردێ. ریشەی ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر زمانی یۆنانی و دە بنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە "جەمسەر، قەراخ، سنوور". بە هۆی تیرم سنوورەکانی بابەتێک دیاری دەکرێن و لە شتەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە].

**چەمووش çemûş** [ *čamūš* ] - "سەرشێت": چموش čamūš (.P). چەمووش بە یەکسمی لەقەهاوێژ و گازگر دەڵێن. هەروەها بۆ منداڵی بەدفەڕ و نەعاملاویش بەکاری دێنن. جگە لەمە ↑چەموور çemur یش هەیە بە مانای "لاسار". خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر ↑گەمژە gemje و ↑گەوز *gewz* دا باس کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا مانای "خواری، خوار بوون، چەمانەوە" دەبەخشن. "چەمووش" چووەتە ناو زمانی عەرەبی و کراوە بە شمبوز šambūz (.Arb). دیارە لەبەر نەبوونی فۆتیمی چ ç دە زمانی عەرەبیدا، ئەو فۆتیمە کراوە بە ش ş و فۆتیمی ش ş ی کۆتاییش لەبەر هاسان بێژی کراوە بە z.

**چەموور çemur** [ *čamūr* ] - "لاسار": خزمە دەگەڵ ↑چەمووش çemûş "سەرشێت، بەدفەڕ".

**چەمەر çemer** [ *čamar* ] - "شین و شەپۆڕ": هەروەها چەمەری çemerî هەیە بە مانای "لاواندنەوەی مردوو کە بە دەهۆڵ لێ دەدرێ". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- Schmerz (G.)، smart (Nl.)، smart (E.) "ئێش". وشەکە دە زمانی ئینگلیزیدا ماناکەی "زیرەک"یشی پەیدا کردووە. ئەم مانایە بەم جۆرە پەیدا بووە کە سەرەتا ئاماژە بە ئێشی تیژ کراوە، ئێشێک کە دەبڕێ، دەگەزێ یان تێڕادەچێ. دە زمانی کوردمادیشدا بۆ وێنە لە پێوەندی دەگەڵ شتی زۆر توند و تیژدا دەڵێن "جەرگ دەبڕێ"، واتا ئاماژە بە توند و تیژ بوونی ئێشەکە دەکرێ. هەروەها وشە "کزانەوە" لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ "گاز، گەستن" و ئاماژە بە ئێشێک بکا کە "دەگەزێ". پاشان دە زمانی ئینگلیزیدا لەم مایایەوە مانایەکی دیکە، واتا "تیژ، زیت، زیرەک" سەری هەڵداوە. سەرنج بدە کە وشەی "زیت"ی کوردمادیش خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "تیژ، دەرپەڕیو"، وەک *سیخ*، *زی* "دڕک"، *زەخت* "نەقیزە، مامزە" و هتد. وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)mer- >*** "ڕێخشاندن، ڕێککوشین، پشاوتن، ورد کردن، هاڕین". ژمارەیەک لە وشە خزمەکان لەژێر ↑مەڕە *mere* [پێمەڕە]دا باس کراون. هەروەها ئەم وشانەی خوارەوەش لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن: smerdnós (G.) "سامناک، داچڵەکێنەر" [دە بنەڕەتدا: ڕێخشێنەر، هاڕێنەر]، mordere (L.) "گەستن". وشەی مردوو و ↑مردن mırdın یش لەم ریشەوە هاتوون.

2- چامە čāme (P.) "شێعر، هۆنراوە". لەوانەیە مەبەست لە "چەمەر" دەبنەڕەتدا ئەو شێعر و پێهەڵگوتنە بێ کە لە کاتی شین گێڕاندا بۆ لاواندنەوەی مردوو گوتوویانە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑سیاچەمانە sîyaçemane هەیە کە ناوی جۆرە ئاوازێکی لای هەورامانە. بنەوشەی چەم -çem لێرەشدا ئاماژەیە بە "هۆنراوە، گۆرانی" ومانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "گۆرانی ڕەش". مەبەست لە ڕەش دەبێ ئەوە بێ کە ئەم گورانییە دە بنەڕەتدا بۆ گێڕانەوەی بابەت و ڕووداوە ناخۆشەکان هاتبێتە ئاراوە.

[تێبینی: سەبارەت پێوەندی "شێعر و گۆرانی" و "شین گێڕان" دەتوانین ئاماژە بە وشەی لاوژە lawje دە کوردمادیدا بکەین کە بە مانای "گۆرانی" بەکاردێ. دە فارسیدا روضه rouze بە مانای "هەڵبەست و گۆرانی شینگێرانە بۆ ئیمامان" بە کار دێ کە دەشێ شێوەی عەرەبێنراوی وشەکە بێ کە هاتۆتەوە ناو زمانی فارسی].

3- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑چەمبەر çember یان چەمەر(ە) çemer(e) بە مانای "ئاڵقە". لەم تێڕوانینەوە لەوانەیە مەبەست "ئاڵقەی شینگێڕی" بێ، واتا کۆ بوونەوەی شینگێڕان لە دەوری جنازە یان کۆتەل و هتد.

**چەمەدان çemedan** *[ čamadān ]* - "سندووقچەی جلوبەرگ تێنان": دە فارسیدا چمدان čamedān (P.). چەمە + دان çeme + dan. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑*جامە came* "جلک" یان ↑جوومە cume "کراس". کەرتی دووەم پاشگرە.

**چەمەن çemen** *[ čaman ]* - "مێرگ، بژوێن": چیمەن çîmen یش دەگوترێ. دە فارسیدا چمن čaman (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ hamm (OE.) "چەمەن". ریشە ؟

**چەمیلە çemîle** *[ čamīla ]* - "ترۆزی": دەچێتەوە سەر ↑چەمان(ەوە) çeman(ewe). وشەی "ترۆزی"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە کە ئەویش مانای "با دران، سووڕان" دەدا.

**چەنتک çentık** *[ čantak ]* - "توورەکەی شان". چەنتە çenta ش دەگوترێ. چنتە čante (P.). خزمە دەگەڵ ↑چنین çınīn.

**چەنتە çente** *[ čanta ]* - "هەگبە، توورەکە": چەنتک çentık یش دەگوترێ. دە فارسیدا چنتە çente (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چنین çınîn. چەنتک شتێکی چنراو بووە و لەبەر ئەوە ناوەکەی بۆ "چنین" دەگەڕێتەوە. وشەی ↑جانتا canta شێوەیەکی بە عەرەبی کراوە لە چەنتە.

**چەنجووز çencuz** *[ čanjūz ]* - "1- لەڕ و لاواز 2- ڕژد و خەسیس": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑چنۆک çınok "دەسقووچاو"دا باس کراون.

**چەند çend** [ *čand* ] - "ژمارە و ئەندازەی شت: چند čand (P.)، čand (Pl.)، çvant (Av.) دەبێ خزم بێ دەگەڵ quantus (L.) "چەند". وشەکانی ↑هەند/ هێند hand /hend [هەندێک/ هێندێک] و هەروەها ↑ئەندازە endaze پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

**چەنگ çeng1** [ *čang* ] ـ "دەست، پەنجە": چنگ çıng و چنچ çınc یش دەگوترێ. دە فارسیدا چنگ čang (P.)، خزمە دەگەڵ Schenkel (G.)، scanca (OE.)، shank (E.)، skank (Sw.) "لاق، قاچ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑زەنگاڵ zengal. وشەکە دە زمانی کوردمادیدا مانای "دەست، پەنجە" دەدا و هەروەها بە دەسکی [دەستکی] کووپە و گۆزەش دەگوترێ ↑چنگە çınge یان چنگۆڵە çıngole. لە پاڵ مانای "دەست" وشەکە مانای "پەنجۆڵ و نینۆک"یشی وەرگرتووە و ئەم مانایانە بە تایبەتی لەم وشانەدا دەردەکەوێ: ↑چەنگ[2] çeng "ئامرازێکی مۆسیقی کە بە قامک یان نینۆک لێدەدرێ" و چەنگاڵ çengal بە مانای "1- پەنجۆڵی ئاژەڵ 2- قوڵاپی ئاسن 3- ئامرازێک بۆ شت پێ خواردن" [کەوچک و چەنگاڵ]. "چەنگ" هەروەها بە مانای "مامزەی چەکمەی سواران" یش دێ و پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑زەنگۆ zengo "رکێف"، ↑زەنگوو zengu "گوێزینگ" و ↑زەنگە zenge "لای خوارەوەی لاق، بەلەک".

**چەنگ çeng 2** [ *čang* ] - "ئامرازێکی مۆسیقی کە بە قامک یان نینۆک لێ دەدرێ": پێوەستە بە ↑چەنگ[1] çeng "دەست، پەنجە".

**چەنگاڵ çengal** [ *čangāl* ] - "1- پەنجۆڵی ئاژەڵ 2- قوڵاپی ئاسن 3- ئامرازێکە بۆ شت پێ خواردن"[کەوچک و چەنگاڵ]: دەچێتەوە سەر ↑چەنگ çeng "دەست، پەنجە".

**چەنگلفە çenglıfe** [ *čanglıfa* ] - "دەست بڵاوی": چەنگ + لفە çeng + lfe. کەرتی ↑چەنگ[1] çeng بە مانای "دەست"ە. کەرتی لفە lıfe خزمە دەگەڵ ↑لەپ lep [لەپی دەست واتا بەری دەست، پانتایی دەست"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "پان و بڵاو".

**چەنە çene** [ *čana* ] - "لای خوارەوەی دەموچاو": چەنەگە çenege ش دەگوترێ. چانە čāne (P.)، Kinn (G.)، chin (E.)، génys (Gr.)، hanu (OIn.) "چەنە"، gena (L.) " گۆنا"، سەر بە ریشەی ‎*ĝenu-* < ***(IE.)*** "چەنە". خزمە دەگەڵ ↑گۆنا gona "روومەت".

**چەن(ی) çen(î)** [ *čan* ] - "دەرزی": خزمە دەگەڵ ↑چنین çınîn.

**چەنی çenî** [ *čanī* ] - "دەگەڵ، پێرا": خزمە دەگەڵ ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوەنووسان، گلوو بوون".

[تێبینی: لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "گەڵ" [دە-گەڵ] بەرهەفی بکەین کە بە شیمانەیەکی بەهێز دەگەڵ وشەی "گلوو" خزمە [گلوو بوون واتا پێکەوەنووسان، لێکهاڵان، گرمۆڵە بوون].

**چەنین çenîn** [ *čanīn* ] - ↑راچەنین raçenîn.

**چەو çew** [ *čaw* ] - "خێز، ورتکەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑کەڤر kevır "بەرد" و ئەمەش خزمە دەگەڵ Hammer (G.) "کوتک، چەکوچ" [وشە ئەڵمانییەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "بەرد، کەڤر" بووە].

**چەوا çewa** [ *čawā* ] - "چۆن، کوو": هەر سێ وشەی چەوا، ↑چۆن و ↑کوو çewa / çon / ku دە بنچینەدا یەک وشە بوون و خزمن دەگەڵ qua (L.)، wie (G.)، hwio (OG.)، how (E.)، haiwa (Gt.) "چەوا، چۆن". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑چ çı (چی)،↑کێ ke، ↑کەی key، ↑کوا kuwa و هتد.

**چەواشە çewaşe** [ *čawāša* ] - چەواشە کردن بە مانای "تەحریف کردن" بە کار دەهێنرێ. وێ دەچێ وشەکە پێک هاتبێ لە چەو + واشە. کەرتی یەکەم خزمە لەگەڵ ↑چەپ çep کە دە بنچینەدا بە مانای "خوار، بادراو"ە. کەرتی واشە waşe لە وشەی ↑ئاوەژوو aweju [ئاوەژی a-wejî] دا دەبنیرێ و ئەمیش هەر ئەو مانایەی سەرەوە دەدا. بەم جۆرە ئەم وشەیە وشەیەکی لێکدراوە کە لە دوو کەرت پێک هاتووە و هەر دوو ئەو کەرتانەش مانایەکی هاوبەش دەبەخشن. لە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە بەم جۆرە دروست کراون، وەک بانگاشە، جەمبازە، پاکتاو، رەشتاڵە، تەپلۆس، تارمایی و هتد. ئەم وشانەی دۆخی جەخت کردن پێک دێنن، واتا وشەکە مانایەک بە جەختکراوی دەردەبرێ.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبیشدا وشەی"**تحریف**" خزمە دەگەڵ "**انحرف**" بە مانای "لا دان، کلا بوون". "کل" (کلا) پێوەندی بە چەمکی "خوار بوون"ەوە هەیە و ئەم چەمکە لە وشەی "چەواشە"دا دەبینرێ].

**چەوری çewrî** [*čawrī*] - "بەز، رۆن": دە فارسیدا چربی čarbī (P.). [فۆتیمەکان دە زمانی کوردمادیدا جێگۆڕکێیان کردووە]. خزمە دەگەڵ sarpi (OIn.) "چەوری"، Salbe (G.)، salva (OF.)، salve (E.)، zalf (Nl.) "رۆن، چەوری، مەلحەم"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *selp-, *solp-*** "چەوری".

**چەوساندن(ەوە) çewsandın(ewe)** [*čawsāndınawa*] - "رەنج دان، بەری رەنج خواردن": مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ هەمان "رنج دان، ئازار دان" بووبێ و دواتر مانای وشەکە پەرەی گرتبێ بۆ "بەرهەمی کار و رەنجی کەسی دیکە خواردن". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑چەپ çep و ↑چەوت çewıt سەر بە ریشەیەك بە مانای "خوار، بادراو". وشەی چەوسان(ەوە) دە بنەڕەتدا ئاماژە بووە بە خوار بوون و چەمانەوە مرۆڤ لەبن باری رەنج و کاری گراندا، هەروەك چۆن کاریتە یان کۆڵەکە دە ژێر باری گراندا خوار دەبێ و دەچەمێتەوە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "شکەنجە" (ئەشکەنجە)].

**چەوەڵ çewel** [*čawal*] - "دەنکەکای *درشتی* بەرماو لە ئاخوڕدا": خزمە دەگەڵ ↑زبڵ zıbıl [دە بنەڕەتدا واتا "درشتە"].

**چەوەندەر çewender** [*čawandar*] - "بەرهەمێکە شەکری لێ دەگرن": چغندر čoġandar (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ sákcharon (Gr.) شەکر"، سەر بە ریشەی < *(OIn.) śárkarā* "خیز، شەکر". بەم شێوەیە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەکر şekır.

**چەوێڵ çewel** [*čawel*] - "خوار، گێڕ": خزمە دەگەڵ ↑چەپ çep و ↑چەوت çewıt "خوار".

**چیا çîya** [*čīyā*] - "شاخ، کێو": خزمە لەگەڵ Stein (G.)، ston (E.)، sten (Sw.)، stains (Gt.) "بەرد"، sten (Rus.) "دیوار"، stear (Gr.) "رۆنی مەییو" [رۆنی رەق]، stia (Gr.) "بەردۆکە، خیز"، styayate (OIn.) "رەق بوون، سفت بوون، مەیین"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *staī-*** "رەق بوون، سفت بوون، توند بون". ئەم وشانە هەروەها خزمن لەگەڵ ↑"ئاستەم "سەخت". ئەم وشانە هەڵسەنگینە هەروەها دەگەڵ ↑سێتە sete"چیا" و ↑سیتەك sîtek "بەردەڵان و تمتمان".

[تێبینی: لەنێوان دوو چەمکی "شاخ" و "بەرد"دا پێوەندی هەیە. بۆ وێنە وشەی "داش" کە ریشەی تورکی هەیە (تاش: بەرد)، دە زمانی کوردیدا بە مانای شاخ بەکار دەهێنرێ، وەك "داشا مەجید" (لە مەهاباد) یان "سووورداش" و هتد].

**چیت1 çît 1** [*čīt*] - "پارچەی تەنك و رەنگاورەنگ": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑چەتفە çetfe "دەسماڵی سەری عارەبان".

**چیت2 çît 2** [*čīt*] - "قامیش": چیتك çıtık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زی zî [دڕکەزی] و ↑زەخت zext [یان زیخت zîxt] "نەقیزە" و چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیێک بە مانای "دەرپەڕین، زەق و دەرپەڕیو بوون".

**چیچ çîç** [*čīč*] - "بەچکەی مەل، جووجە": شێوەیەکی دیکە لە ↑چیك çîk و ↑جووجە cuce. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑چێشکە çêşke "چۆلەکە".

**چیچك1 çîçık 1** [*čīčık*] - "خونچە": بنجی چیچ -çıç خزمە دەگەڵ ↑چووزە(رە) çuze(re) و ئەو وشانەی لەژێر ↑زەق *zeq* دا هاتوون.

**چیچك2 çîçık 2** [*čīčık*] - "چوێلەکە، چۆلەکە": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑چێشکە çêşke.

**چیچە çîçe** [*čīča*] - "گۆی مەمك": ↑چیچکە çîçke و چیچیلە çîçîle "نەرمەی گوێ" و چچك çıçık یش بەکار دێن، پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- ↑تووتە tute [تیتە tîtte]، zitze (G.)، teat (E.)، titt (OE.) "چیچە، گۆپکی مەمك".

2- ↑چیچكـ çîçık 1 یان ↑سیچكه sîçke "خونچەی تازە" و هەروەها سیچقەسڵاو sîçqesılaw یان ↑سیتكەزەلام sîtkezelam "باپشكێو". بنجی چیچ- çîç- / سیچ- sîç- ئاماژە بە شتی زەق دەكا و دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *(s)keu- >* "دەرپەڕاندن، پاڵ نان، راو نان، لەزگین بوون]. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑سووچ suç "گۆشە" [دە بنەڕەتدا شوێنی زەق و دەرپەڕیو] و ↑چووزە(رە) çuze(re) و ئەو وشانەی لەژێر ↑زەق *zeq* دا هاتوون.

**چیچیله çîçîle** [ *čīčīla* ] - "نەرمەی گوێ": خزمە دەگەڵ ↑چیچە çîçe. دە زمانی فارسیدا چچوله čečūle (P.) دەبێتە "میتكە".

**چیخ çîx** [ *čīx* ] - چیخ كردن واتا "داڕووشاندن". خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای تێڕاچوون و تێهەڵچەقین دەبەخشن [↑چەقین çeqîn].

**چیڕ1 çîr** [ *čīr* ] - "سفت، توند، گرژ": [میناك: نانەكە چیڕە، ناجووترێ واتا سفتە، ددانی دە چیڕەوە دەبا واتا ددانەكانی سفت دەكا یان بە توندی لێكتریان دەسوێنێ]. خزمە دەگەڵ ↑جیڕ cır [یان جەڕ] و↑جەڕاندن *cerandın* "با دانی توند". دە زمانی فارسیدا چیره čīra (P.) هەیە بەم مانایانە: زاڵ، زرینگ، دلێر، چوست و چالاك. هەموو ئەم مانایانە پێوەندییان بە چەمكی "توندی، سفتی، (سەر)سەختی"یەوە هەیە. "چیڕ" هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زرینگ *zrîng*، ↑زریزە zırîze "زنجیری زۆر باریك" و چەند وشەیەكی دیكە و لەوانەشە دەگەڵ ↑ئەستوور estur.

**چیڕ2 çîr** [ *čīr* ] - دەگەڵ "چەپ" دێ [چەپ و چیڕ çep u çîr واتا خوار وخێچ]. شێوەیەكی دیكەیە لە↑جیڕ cîr [بەجیرەبادان] و خزمە دەگەڵ ↑جەڕاندن cerandın "با دانی بەنهێم، با دانی بە گوشار". لە تێڕوانینەوە مانای جیڕ یان چیڕ دەبێتە"بادراو، گرژكراو".

**چیڕك çîrk** [ *čīrk* ] - "لەتكە، لەتكەمیوەی هیشك كراو": هەروەها چیڕك çîrk هەیە بە مانای "بڕەی مافوور". خزمن دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "بڕین، لێكردنەوە" دەدەن وەك ↑شڕ şır [شەق و شڕ]، ↑چارك *çark* "برینگ"، ↑كیرد kerd، ↑كرتاندن kırtandın و هتد.

**چیڕۆك çîrok** [ *čīrok* ] - "داستان": لە ↑دیرۆك dîrok وەرگیراوە بە مانای "مێژوو".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمكی مێژوو و داستان لێرە دایە كە داستانەكان دە بنەڕەتدا گێڕانەوەی باسی رووداو و بەسەرهاتەكانی مێژووی كۆمەڵگا بوون. ئەم پێوەندییە دە زمانی ئاڵمانیشدا دەبیندرێ. دە زمانی ئاڵمانیدا Geschichte (G.) هەم بەمانای "چیڕۆك، داستان" و هەم بە مانای "دیرۆك، مێژوو" بەكاردەهێندرێ و دەچێتەوە سە ریشەیەك بە مانای "روودان، قەومان"].

**چیغ çîġ** [ *čīġ* ] - "پەردەی دەوری رەشماڵ كە لە *قامیش* دروست دەكرێ". هەروەها دەگەڵ "بەر" دێ [بەرچیغ واتا پەیاغ، داردەست]. بەم جۆرە دەردەكەوێ كە وشەكە دە بنچینەدا بە مانای "شتی تیژ" بەكارهاتووە. خزمە دەگەڵ ↑چەقین çeqîn، ↑تیژ tîj، ↑تیخ tîx و هتد. دە زمانە ئەورووپییەكانیشدا ئەم پێوەندییە دە هێندێك وشەدا دیارە، وەك Stecken (G.) "دار، شووڵ، قامیش"، stagaras (Lit.) "لقەدار، قامیش"، stick (E.) "داردەست"، sticka (Sw.) "تەلەزم، تەڵاش" و steken (Nl.) "تێڕاكردن، تێهەڵچەقاندن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چیخ çîx كردن "داڕووشاندن".

**چیڤ çîv** [ *čīv* ] - "خۆهەڵكێشان": خزمە دەگەڵ ↑گیف gîf [هەڕ و گیف].

**چیق çîq** [ *čīq* ] - "قاچی جانەوەر": ↑چاق çaq "قاچ، لاق".

**چیك çîk** [ *čīk* ] - "جوجك": خزمە دەگەڵ ↑جووجە cuce.

**چیكەنە çîkene** [ *čīkana* ] - "ئامرازی پەمۆ پاك كردن": چی + كەنە çî + kene، یان چیك + ەنە çîk + ene. كەرتی چی( ك) çî(k) دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑شی/ ↑شێ şî /şê، ↑جوێ cuwe و گەلێك وشەی دیكەی سەر بە ریشەیەك بە مانای "قەڵشاندن، لێككردنەوە، جوێ كردنەوە". كەرتی دووەم پاشگرە. لەم تێڕوانینەوە دەتوانین بڵێین كە چیكەنە ئەو دەزگایەیە پەمۆكە لە شتەكانی دیكە جۆی دەكاتەوە.

**چیلان1 çîlan** [ *čīlān* ] - "ئەنگوچکەسۆرانی باریک": خزمە دەگەڵ Seil (G.)، zeel (Nl.)، sāl (OE.) "بەن، ریس، پەتک"، saīlas (Lit.) "بەن، بەند"، silo (Rus.) "قڵفە"، سەر بە ریشەی **< *sēi- * (IE.)** "بەستن، لێکبەستن". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑چەلە çele "گوریس، پەت"، ↑جاڵ cal "داو، هەودا" دەشێ پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

**چیلان2 çîlan** [ *čīlān* ] - "قفڵ و کلیل": [چیلانگەر واتا قفڵساز، کلیلساز]، خزمە دەگەڵ ↑کلیل kılîl.

**چیلک çîlık** [ *čīlık* ] - "1- میتکە 2- گۆپکەی مەمک": ↑گلک2 gılık یش دەگوترێ. هەروەها ↑زیلک zîlık هەیە بە مانای "میتکەی یەکسم". ئەم وشەیە وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ↑*کلک kılık* سەر بە ریشەیەک بە مانای "قوت و زەق بوون".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "بەلووکە" واتا "باڵابووگی بچووک" و هەروەها "میتکە" بە مانای "قیتاییەکی بچووک"].

**چیلکە çîlke** [ *čīlka* ] - "چێوی باریک و گچکە": چیل + کە çîl + ke. چیل çîl و چیلە çîle ش دەگوترێن [دەستەچیلە]. کەرتی چیل خزمە دەگەڵ ↑چڵ çıl "لاسکی گیا، لکەداری باریک" [چڵەریحانە]. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە.

**چیمەنتۆ çımento** [ *čīmanto* ] - "سمیت، کەرەسەیەکی قوڕەکاری": وشەکە دە فەرانسەیی کۆندا ciment (OF.) بووە و لە رێگەی زمانە ئەوروپییەکانەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردمادیش. ریشەی وشەکە دەچێتەوە سەر cedere (L.) "کوتان، لێدان". مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا ئەو ورتکەبەردانە بوون [لەت و کوتی چکۆڵەی بەرد] کە تێکەڵ بە قسڵ کراون و لە قوڕەکاریدا کەڵکیان لێ وەرگیراوە.

**چین çîn** [ *čīn* ] - "لۆ، توێژ": دە زمانە ژێرمەنییەکاندا چەند وشەیەک هەن کە زۆر لە وشە کوردمادییەکە دەچن. لە باری ماناوە ئەم وشە ژێرمەنییانە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەڵام مانا بنەڕەتییەکەیان دەگەڵ مانای وشە کوردمادییەکە یەک دەگرێتەوە. ئەم وشانە بریتین لە Schiene (G.) "ئەو ئاسنەی قەتار بە سەریدا دەڕوا"، shin (E.) و scheen (Nl.) "قەڵەمی لاق"، skener (Sw.d.) "تەڵەزمی دار، تیکەئاسنی باریک". مانای بنەڕەتی ئەم وشانەی سەرەوە "تەڵەزم" بووە. [ئەو توێژاڵەی لە دار و بەرد و ئاسن جوێ دەبێتەوە]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *skei- (IE.)** "قەڵشین، بڕین، لێکردنەوە". دە زمانی ئاڵمانیدا Schicht (G.) بە مانای "چین، تۆژ" بەکاردێ و ئەمیش خۆی خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. مانای بنەڕەتی چین çîn لە وشەی ↑چینە çîne دا باشتر دەبینین کە بە مانای "قاش، کووز"ە.

**چینچک çînçık** [ *čīnčık* ] - "1- باپشکێو، زیپکە 2- نەرمەی گوێ 3- پلەگۆشت 4- کەمۆکە": پێکهاتووە لە چی(ن) + چک یان چی(ن) چ + ک çî(n) + çık / çî (n)ç + ık. بە هەموو ماناکانییەوە خزمە دەگەڵ ↑چیچە çîçe و↑تووتە tute بە مانای [خڕەکەی بچکۆڵە، قیتەکەی گچکە". کەرتی دووەم پاشگرە. فۆتیمی n زێدەیەکە وەک ناوگر خزاوەتەوە ناو وشەکەوە.

**چینچکان çînçıkan** [ *čīnčıkān* ] - "هەڵترووشکان": جنچکان cınçıkan یش دەگوترێ. دە فارسیدا چندک زدن čondak zadan (P.)، بنەوشەی جنچ/ چینچ -cınç- /çînç پێوەندی هەیە بە ↑زەنگ zeng "لاق، تیوان گوێزینگ و ئەژنۆ" [↑زەنگاڵ zangal] و↑چەنگ çeng "دەست، پەنجە" سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار".

**چینە çîne** [ *čīna* ] - "قاش، کووز": خزمە دەگەڵ ↑چین çîn "توێژ" [دە بنەڕەتدا "تەڵەزم"]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەک بە مانای "بڕین، قەڵشاندن، لێکردنەوە".

**چینی çînî** [ *čīnī* ] - "سرامیک، قاپ و قاچاخی سرامیک": وشەکە پێوەندی هەیە بە ناوی وڵاتی چین çîn ەوە. وێ دەچێ ئەو جۆرە قاپ و قاچاخە یەکەم جار لە وڵاتی چین دروست کرابێ.

چێر **çer** [ *čer* ] - دەگەڵ "مێر" دێ [چێر و مێر çer u mer]. خزمە دەگەڵ شوهر (P.) šouhar. [بڕوانە ↑شوو şû].

چێرک **çêrık** [ *čerık* ] - "لەتەمیوەی هیشک کراو": خزمە دەگەڵ ↑چەرە çere "چڵە، چەلە، چەرەز".

چێرین **çerîn** [ *čerīn* ] - "لەوەڕین": ↑چەرین çerîn.

چێژ **çej** [ *čež* ] - "تام، مەزە، لەززەت": دەچێتەوە سەر کرداری ↑چێشتن çêştın "مەزە کردن".

چێشت **çêşt** [ *češt* ] - "خواردن (ی کوڵاو)": دەچێتەوە سەر کرداری ↑چێشتن çêştın.

چێشتەنگاو **çêştengaw** [ *češtangāw* ] - "کاتێکە تیوان بەیانی و نیوەڕۆ": چێشت + ئەنگاو engaw + çêşt. کەرتی یەکەم، چێشت بە مانای خواردنی دروستکراوە. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ هنگام hengām (P.) "کات، دەم". تێکڕای وشەکە دەبێتە "کاتی چێشت" [چێشت خواردن یان چێشت لێنان؟].

چێشتن **çeştın** [ *češtın* ] - "مەزە کردن": چشیدن češīdan (P.). خزمە دەگەڵ kosten (G.)، kostian (OE.)، kosta (OIs.)، gustare (L.) "چێشتن، چێژ وەرگرتن"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *geus-* "چێشتن، تاقی کردنەوە، مەزە کردن". هێندێک کرداری دیکەش دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەچنەوە سەر ئەم ریشەوە، وەک kiesen (G.)، kiosan (OG.)، kiusan (Gt.)، choose (E.)، tjusa (Sw.)، kjusa (OSw.) "تاقی کردنەوە، (بە تاقی کردنەوە) هەڵبژاردن". وەک دەبینین لەم زمانانەدا پێوەندییەک لە تیوان چەمکەکانی چێشتن، تاقی کردنەوە و دواتریش هەڵبژاردندا دروست بووە.

چێشکە **çêşke** [ *češka* ] - "چقیک، چۆلەکە": گنجشک gonješk (P.). وشە فارسییەکە لە دوو کەرتی گن gon + جشک ješk پێک هاتووە. کەرتی دووەمەکەی هەمان "چێشکە"یە دە زمانی کوردمادیدا. کەرتی یەکەم دەبێ کورتکراوی گندە gonde (P.) بێ، واتا دە بنەڕەتدا وشەکە *گندجشک *gondješk* بووە. گندە gonde دە زمانی فارسی ئەمرۆدا مانای "گەورە، قەڵەو" دەدا، بەڵام مانای ئەسڵی وشەکە "گەورە" نییە، بەڵکوو "قەڵەو، کورتەبنە، خڕەکە، خرپن"ە. ئەم مانایە دە گەڵێک وشەی کوردمادیدا پارێزراوە، بۆ وێنە ↑قۆتیر quner "کوان، دومەڵ"، ↑کوندر kundır "کوولەکە"، ↑قۆنداخ qondax"پێچراوەی خڕەکە"، ↑خونچە xunçe "گوڵی پێچراو و خڕەکە، نەکراوە"، ↑کوندەبوو *kundebu* [یان کوندەبەبوو kndebebu]، کوندەفسک kundefısık "چڵەنۆک، کورتەباڵا" [دەبنەڕەتدا: قەڵەوەی بچکۆڵە]. هەم دە وشەی "گنجشک"ی فارسیدا و هەمیش دە "کوندەبوو"ی کوردمادیدا کەرتی یەکەمی وشەکە ئاماژەیە بە قەڵەو بوون [قووڵەبنە بوون، خرپن بوون]ی پەلەوەرەکان. هەرچی کەرتی "چێشکە"یە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە جیکەجیک cîkecîk ی پەلەوەرەکە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑چیچ çîç "بەچکەی مەل، جووجە" و ↑چیچک çîçık "چوێلەکە، چۆلەکە".

چێل¹ **cel** [ *čel* ] - "مانگا": چێر çer یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Stier (G.)، steer (E.)، stiur (Gt.)، tjur (Sw.)، þjōrr (OIs.) و هتد بە مانای "گا". ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرەتا بە مانای "گوێلک" بەکارهاتووە و خزمە دەگەڵ staora- (Av.) "ئاژەڵی گەورەی ماڵی"، tauros (Gr.)، taurus (L.)، tauras (Lit.) "گا". وشەکانی ↑وشتر wıştır، ↑ئێستر estır و ↑دەوار dewar پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. سەرچاوەی ئەم وشانە ناڕوونە.

چێل² **cel** [ *čel* ] - "تەلەسەنگ، تاوێرەبەرد": خزمە دەگەل ↑جاڵە cale. چێل ئەو بەردەیە کە جاڵە دەبێتەوە و تل دەخوا.

چێل3 **cel** [ *čel* ] - "خاڵخاڵ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شڵە şıle.

چێل **cel** [ *čel* ] - "خوار":

1- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چیر čīr [چەپ و چیر].

2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑*شەل şel* "لاق خوار" و ↑خێل xel "چاوخوار".

**چێڵکڕ celkır** [ *čelkır* ] - "مەلی کورك": چێڵ + کڕ çel + kır. چێڵ çel دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑ژێر jîr "ئارام، بێدەنگ" [ژێر کردنەوە] و هەروەها دەگەڵ ↑چۆل çol [چۆل و هۆل]. کەرتی دووەمی وشەکەش، واتا ↑کڕ kır مانای "کڕ و کپ" دەدا. هەردووك کەرتی "چێل" و "کڕ" مانایان یەکە و وشەیەکی لێکدراویان ساز کردووە کە دۆخی جەخت کردن نیشان دەدا. چەند وشەیەکی لێکدراوی لەم چەشنە کە هەردووك کەرتیان هاومانان، بریتین لە بانگاشە، جەمبازە، چەواشە، پاکتاو، رەشتاڵە، تەپلۆس، خڕخاڵ، تارمایی، گەنگەشە و هتد.

**چێنکە çenke** [ *čenka* ] - "پەڵەسەوزایی دەناو پووش و پاڵدا": دەشێ پێوەندی بە وشەی ↑شین şîn [شینایی] یەوە هەبێ.

**چێو çew** [ *čew* ] - "چۆڤ، داردەست": چوب čūb (P.). خزمە دەگەڵ scipio (L.)، skípōn (Gr.) "داردەست" [دە بنەڕەتدا: لقەداری لێکراوە]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Scheibe (G.)، scība (OG.)، schijf (Nl.)، shive (E.)، skiva (Sw.) "سواپ، سەفحە". مەبەست لەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا تیکەداری خڕ و تەخت بووە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سیپ(ە) sîp(e) "تەختەی ناسك و پان". شێوەیەکی زۆر کۆن لە وشەی "چێو" دە زمانی کوردمادیدا ماوەتەوە کە بریتییە لە ↑سکپ sıkıp "بن ڕێسمە، داری بنەوە دە چوارچێوەی دەرگادا".

**چێودار çewdar** [ *čewdar* ] - "مەڕدار": چوبدار çubdar (P.). چێو çew [چوب čūb دە فارسیدا] لەوە ناچێ پێوەندی بە "چێو" بە مانای "دار" هەبێ، بەڵکوو دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schaf (G.)، sheep (E.)، schaaf (Nl.) "مەڕ". ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە نەدۆزراوەتەوە.

**چێوراندن çêwrandın** [ *čewrāndın* ] - "وەرگێران، وەرگەڕاندن لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سووڕاندن/ زفراندن surandın /zıfrandın.

**چێوشەقە çêwşeqe** [ *čewšaqa* ] - "داری بن هەنگڵی قاچ شکاو": دەشێ وشەکە پێك هاتبێ لە چێو + شەقە çew + şeqe، ↑چێو çew بە مانای دارە و ↑شەقە şeqe خزمە دەگەڵ ↑شەق şeq "لاق" و ساق saq "لاق" (P.). بەم جۆرە مانای چێوشەقە دەبێتە "دارلاق" واتا لاقی دارین. ئەم وشەیە بە کورتکراوەییش بەکار دەهێنرێ و دەگوترێ ↑شەقە şeqe.

# ح (Ħ)

**حاچە haçe** *[ ħāča ]* - "لکەدار، فاقە": ↑هاچە haçe.

**حان ħan** *[ ħān ]* - "دەم، وەخت": بڕوانە ↑ئان an.

**حاند ħand** *[ ħānd ]* - وشەکە دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا وەک "جێگەیەکی دیار" مانا کراوەتەوە. ئەم مانایە تەواو نییە. مانای ئەسڵی وشەکە "ڕووبەڕوو، بەرانبەر"ە. مانای "لەحاند کەسێک یان کارێک" دەبێتە لە بەرانبەر، لەپێش، ڕووبەڕوو. خزمە دەگەڵ ↑هەنێ hene [ئەنیا enya] "تیوچاوان".

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا بە "هەنێ" دەگوترێ "پیشانی" کە ئەویش پێوەندی بە "پێش"ەوە هەیە].

**حاوانەوە ħawanewe** *[ ħāwānawa ]* - "(دەگەڵ یەک) ژیان بردنە سەر": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑هێورین2 hewrîn "پەنا گرتن، حاوانەوە، جێ دەستکەوتن".

2- ↑حەوشە ħewş(e).

**حایشان ħayşan** *[ ħāyšān ]* - "وا بۆ چوون": [ئەز ولۆ دحایشینم]. دەچێتەوە سەر حیس ħīs (Arb.). دە ئەسڵدا ماناکە بریتییە لە "من وا حیس دەکەم". خودی وشە عەرەبییەکە دەچێتەوە سەر وشەی یۆنانی < *(Gr.) aisthánesthai* "حیس کردن، هەست کردن". ↑هەست hest دە زمانی کوردمادیدا لەم وشەیە وەرگیراوە.

**حندرحۆ ħındırħo** - "هەڵڵادۆشە، هیلاهۆپ": [ئامرازێکی کایەی منداڵانە کە دوو زارۆک، هەر کام لە لایەک لەسەری دادەنیشن و هەر جارەی یەکیان دەچێتە سەرەوە و ئەوەی دیکە دێتە خوارەوە].

حیندرحۆ ħîndırħo و هەندرهۆ hendırho ش دەگوترێ کە ئەمەی دوایی شێوەی کۆنتری وشەکەیە. هەم وەشەی "حندرحۆ" و هەمیش "هەڵڵادۆشە" پێوەندی بە دوو چەمکی "لای سەرەوە" و "لای خوارەوە" یان بە کورتی "سەرو خواروە" هەیە. وشەکە پێک هاتووە لە حندر ħındır + حۆ ħo. کەرتی یەکەم خزمە لەگەڵ unter (G.)، untar (OG.)، under (E.)، under (Sw.) "لەژێر، لەخوار". ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم لەگەڵ ↑هندور hındur "تیوان، ناوەوە". کەرتی دووەمی وشەکە دەبێ بە مانای "سەرەوە" بێ و جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑هاف2 haf "1- ڕووکاری سەرەوەی بان 2- نهۆمی سەرەوەی خانوو"، ↑هووپ hup [هووپ کردن واتا باز دان لە بڵیندییەوە]، up (E.)، auf (G.)، op (Nl.)، ūf (OG.)، uup (Sw.) "لەسەر، سەرەوەی"، hypo (Gr.) "لەخوار، ژێر، خوارەوەی" سەر بە ریشەی < ***(IE.) *eup-, *up-*** "لە خوارەوە بەرەو سەر چوون یان لەسەر بوون". لەم تێڕوانینەوە وشەکە ئاماژە دەکا بە چوونە سەر و هاتنەوەخوارە لە کایەکەدا.

[تێبینی: لە زمانی فارسیدا بۆ ئەم مەبەستە وشەی الاکلنگ allākolang (P.) بەکار دێ. لەم بارەوە بڕوانە وشەی کوردمادی خوار2 xuwar "بەرانبەری سەر، ژێر"].

**حولی ħulî** *[ ħulī ]* - "لووس، خلیسک": هولی hulî یش دەگوترێ. هەروەها حوللوور ħullûr [حللوور ħıllûr] هەیە کە دەگەڵ "بللوور" دێ [حللوور بللور ħıllûrbıllûr]. دیارە بللوور شتێکی ساف و لووسە و بۆیە بووەتە هاوالی "حللوور". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑خلیسک xılîsk.

**حویل ħuwîl** *[ ħuwīl ]* - "سووری کەمرەنگ، سووری کاڵ": خزمە دەگەڵ ↑کاڵ kal "کەمرەنگ".

**حووج ħûc** *[ ħūj ]* - "زۆر درێژ": دە کوردمادیدا بە مرۆڤی زۆر درێژ دەگوترێ "دەڵێی حووجە" یان "حووجی بنی مەعەللەق"! عووج εûc یش دەگوترێ. لەم وشانەوە مرۆڤ وا تێدەگا کە حووج ناوی کابرایەکی درێژ یان بوونەوەرێکی ئەفسانەیی بووبێ واتا وشەکە بۆ ناوی کەسێک بگەڕێتەوە. بەڵام

لەراستیدا حووج ناو نییە بەڵكوو ئاوەڵناوێكە بە مانای "زۆر بالا بڵیند". ئەم مانایە لە فارسییدا بە روونی دەردەكەوێ، كاتێك دەگوترێ برج عاج (P.) borj e ɛaj. دیارە مەبەست لێرەدا عاجی فیل نییە، بەڵكوو مەبەست بورجێكە كە زۆر بڵیندە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ hoh (OG.)، hoch (G.)، hauhs (Gt.)، heah (OE.)، high (E.)، hög (Sw.) و häch (OF.) "بەرز، بڵیند". دە زمانی كوردمادیدا هەروەها ↑ئاجووج acuc و ماجووج [یان عاجووج و ماجووج ɛacuc u macuc] وەك ناوی بوونەوەرانی ئەفسانەیی بەكار دێن. كەرتی ئاج- یان عاج -(ɛ)ac- لێرەشدا هەمان عاج یان حووجی سەرەوەیە و ئاماژە بە بەرزی [باڵابەرزی] دەكا. كەرتی ماج -mac یش خزمە دەگەڵ مەزن mezın واتا گەورە. بەم پێیە ئاجووج و ماجووج واتا بەرز و گەورە. ئەم وشانە دە زمانی كوردمادیدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑قۆز qoz "جوانچاك" [جەوانی چاك، دە بنەڕەتدا قیت و قۆز، باڵابەرز] و چەندین وشەی دیكە.

**حۆت ḧot** - "كەسێك كە تووكی سەری وەریوە": خزمە دەگەڵ öd(e) (G.)، ōdi (OG.)، īeđe (OE.)، öde (Sw.) "چۆل، تەریك، بەیات، بێتام"، aútōs (Gr.) "بێهوودە، هیچ و پووچ"، áva (OIn.) "لە شتێكەوە"، au (L.) "دوور(بوونەوە)، پێش (چوون)". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***< *au-, *aue- (IE.)*** "دوور بوونەوە لە، بەرەو پێش". هەروەها وشەی West(en) "رۆژئاوا" دە زمانە ژێرمەنییەكاندا پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و دە ئەسڵدا بە مانای ئەو شوێنە بووە كە رۆژ بەرەو ئەوەی دەچێ، بەرەو ئەوەی دوور دەبێتەوە و ئاوا دەبێ. لەم تێڕوانینەوە "حۆت" ئەو كەسەیە كە سەری "چۆل" بووە، سەری "هیچ"ی پێوە نەماوە، موویەكانی لێ بووەتەوە. لەوانەیە وشەی ↑هیچ hîç پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑بەرەهووت berehut "چۆلگە".

**حۆری ḧorî** *[ ḧorī ]* - "ژنی ناو بەهەشت": هۆری ḧorî یش دەگوترێ. وشەكە وەك وشەیەكی عەرەبی ناسراوە، بەڵام لەوانەیە بە ئەسڵ عەرەبی نەبێ. لەباری ریشەوە خزمە دەگەڵ Hure (G.)، hoer (Nl.)، whore (E.)، hora (Sw.) "ژنی خراپە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر huor (OG.) "زینا" و huorōn (OG.) "زینا كردن، دەگەڵ غەیری ژن یان مێردی خۆ نووستن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ carus (L.) "خۆشەویست، گرانبەها"، kārs (Let.) "لەزەت بردن، حەز كردن"، سەر بە ریشەی ***< *karo-s- (IE.)*** "خۆشەویست، حەز، دلبەر" و دواتر ریشەی ***< *ka- (IE.)*** "حەز كردن، خۆش ویستن، تامەزرۆ بوون". دە زمانی كوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەكە وەك ↑كەڵ *kel* [وە كەڵ هاتوو واتا وە زەوق هاتوو، تامەزرۆ بوون]، ↑كەڵكەڵە kelkele "ئارەزوو" و لەوانەشە دەگەڵ خەی xay [↑ئۆخەی oxey: وشەی خۆش ویستن].

**حۆل ḧol** - "گێل، گێژ": هوویل huel ش دەگوترێ. هل hol (P.) "دەستپاچە، شێواو، پەشۆكاو". دەچێتەوە سەر ریشەی ***< *uel-, *wel- (IE.)*** "سووران، با دران" و دەبێتە خزم لەگەڵ ↑هۆل2 hol "1- كرێوە و مژ 2- مزراق"، ↑خولانەوە xulan(ewe)، ↑وێل wel "سەرگەردان" و هتد.

**حۆیلانێ ḧoylnê** *[ ḧoylāne ]* - "هەوایەكی گۆرانی جافەتی": زۆرینەی ئەو وشانە دە زمانی كوردمادیدا مانای "گۆرانی دەدەن (وەك گۆرانی، گەلۆ، ئاواز، هۆرە، حەیران) دە بنەڕەتدا دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "دەنگ و هەرا كردن، هات و هاوار كردن". لەم تێڕوانینەوە دەشێ وشەكەی سەرەوە پێوەندی هەبێ بە ↑هۆلین holîn "قوولە كردن، گریانی بە دەنگ".

**حەب ḧeb** *[ ḧab ]* - "1- دەنك، دان 2- دەنكەدەرمان": دەشێ بە ئەسڵ وشەیەكی كوردمادی بێ و چووبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە. بڕوانە ↑هەب heb.

**حەپ ḧep** *[ ḧap ]* - "قووت دان بە زمانی منداڵان": خەپ xep یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑قەپ qep "گاز لێدان بە ددان".

**حەپش ḧepş** *[ ḧapş ]* - "گێل، حۆل": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑حەپەسان ḧepesan "واق ورمان، سەر سوڕمان".

حەپوو **ĥepû** *[ ĥapū ]* - وشەیەکە بە مانای "نەما، تەواو بوو" دە زمانی زارۆکدا. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑ئاو2 awa "ون، دوور"دا شی کراونەوە. ئەم وشانەی مانای "دوور بوونەوە، ون بوون، تێپەڕین [بەسەر چوون]، ئاوا بوون" دەبەخشن.

حەپۆل **ĥepol** *[ ĥapol ]* - "کەم ئاوەن، گەمژە": قەپۆل qepol یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑حەپەسان ĥepesan "واق وڕمان، سەرسوڕمان". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑حەپش ĥepş "گێل، حۆل".

حەپ(ە) **ĥep(e)** *[ ĥap(a) ]* - "وەڕینی سەگ": عەف εef و عەو εw یش دەگوترێن [عەف عەف، عەوعەو]. هەروەها حەپاندن ĥepandın هەیە بە مانان "حەپەکردن، وەڕین"، خزمە دەگەڵ ↑قەپ qep "گاز لێدان بە ددان"، دە بنەڕەتدا بە مانای "زار داپچڕین".

حەپەسان **ĥepesan** *[ ĥapasān ]* - "واق وڕمان، سەر سوڕمان": عەبەسان ebesan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑حەپ(ە) ĥep(e) "وەڕینی سەگ" و چەندین وشەی دیکە وەک ↑قەپ *qep* "گاز لێدان بە ددان". ئەم وشانە هەموو مانای "زار داپچڕین" نیشان دەدەن. "حەپەسان" ئاماژەیە بەو زار داپچڕینە کە مرۆڤ لە کاتی سەر سوڕمانی توندا تووشی دەبێ. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەک دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وەک gaffen (G.) "بە سەرسوڕمانەوە ڕوانین" [دە ئەسڵدا واتا بە دەمی کراوە تێڕامان، هەمان حەپەسان]، gappen (MG.) "دەم داپچڕین" بە کوردمادی نەوسنی ↑گاپن gapın واتا نەوسنی دەم داپچڕاو!]، jappen (G.)، japsen (G.) "دەم داپچڕین بۆ هەوا هەڵمژین لە کاتی پشووسواریدا"، gapen (Nl.) "دەم داپچڕین، حەپەسان"، gapa (Sw.) "گەروو دادڕین، دەم پێکدادان، قیژاندن".

[تێبینی: جێی سەرنجە کە فۆتیمی s دە وشەی ئەڵمانی japsen هەر ئەو ڕۆڵە دەبینێ کە s دە وشەی حەپەسان hepesan دا هەیەتی، واتا ئەو فۆتیمە شێوەیەکی جەختکراو (توند و تیژکراو) دەبەخشێ بە کردارەکە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "خلیسکان"].

حەپیشاندن **ĥepîşandın** *[ ĥapîşāndın ]* - "خواردن بە هەڵپە و لەز": خزمە دەگەڵ ↑قەپ qep "گاز لێدان بە ددان"، دە بنەڕەتدا بە مانای "زار داپچڕین".

حەتار **ĥetar** *[ ĥatār ]* - "کوتکی گێچ کوتان": هەروەها حەترەک ĥetrek هەیە بە مانای "لێدان بە توندی" [ئەک ek وەک پاشگری ناو، بەتایبەتی ناوی تشت و ئامراز]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ cudere (L.) "لێدان، کوتان". ئەم وشە لاتینییە خزمە دەگەڵ ↑هاونگ hawıng [دەسکاونگ].

حەری **ĥerî** *[ ĥarī ]* - "قوڕ": شێوەیەکی دیکە لە ↑قوڕ qur.

حەز **ĥez** *[ ĥaz ]* - "ئارەزوو، خواستی بە تین، ئەڤین": ↑هاش haş یش دەگوترێ. هەروەها دە کوردمادیدا ↑قەشقە qeşqe هەیە بە مانای "ئارەزوو" و ↑کاش1 kaş بە مانای "خۆزگە، خۆزی". دە زمانی فارسیدا āz (P.) هەیە بە مانای "تەماحکار، حەریس، چاونەزێر". ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ وشە کوردمادییەکە، بەم جیاوازییە کە وشەکە دە زمانی فارسیدا مانای خواست و ئارەزوویەکی نەرێنی وەرگرتووە. هەروەها دە زمانی عەرەبیشدا عشق εašq (.Arb) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و لەوانەیە وشەیەکی وەرگیراو بێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ heischen (G.)، eiscōn (OG.)، ask (E.)، āscian (OE.) "داوا کردن، پرسین"، iskat (Rus.)، iskati (OSl.) "وە شوێن کەوتن، داوا کردن"، iccháti (OIn.) "وە شوێن کەوتن، حەز و ئارەزوو کردن"، سەر بە ریشەی < *ais- (IE.)* "وە شوێن کەوتن، تێکۆشان بۆ، حەز کردن".

حەزیا **ĥezya** *[ ĥazyā ]* - "هەژدیها": عەزیا εezya ش دەگوترێ. بڕوانە ↑ئەژدیها ejdîhā و هەروەها ↑جوشک *cûşık*.

حەساس **ĥesas** *[ hasās ]* - "ئێشکگر(ی شەوانەی شار)": حەسحەس ĥesĥes یش دەگوترێ. عسس εasas (.Arb). لەوانەیە وشەکە لەبنەڕەتدا وشەیەکی کوردمادی بێ. بڕوانە ↑هەست hest [هەس hes]. وشە کوردمادییەکە دەتوانێ کۆنتر هەسهەس heshes بووبێ، واتا بە دووبارە کردنەوەی بنجی هەس -hes

دروست کرابێ، یان پاشگری بە ئاوەڵناو کردنی ئاس as- خرابێتە سەر "هەس"ەوە [هەسەس hes + es]، وەك دە وشەی "گەڕناس" [گەرن + ئاس] دا.

**حەسانەوە ħesanewe** [ *ħasānawa* ] - "پشوو دان، ماندوویەتی دەر کردن، راحەت بوون": اسودن āsūdan (.P). دەبێ دە زمانی کوردیدا پێشتر "هەسان(ەوە)" یان "ئاسان(ەوە)" بووبێ. وشەی ↑هاسان hasan / ئاسان asan لەم پێوەندیەدا جێ دەگرێ. کەرتی حە ħe/ ها ha/ ئا a پێشگرە، بڕوانە پێشگری ↑ئا[2] a. وشەی "هاسان" دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "راحەت" بووبێ. بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی" (ل. 27) خزمە دەگەڵ -sāy (.Av) و -śáye (.OIn) "راکشان، پاڵ کەوتن"، سەر بە ریشەی < *(IE.) *kei-* "راکشان، پاڵ کەوتن".

[ئەم ریشەیە لەوانەیە دەگەڵ ریشەی *(IE.) *kei-* "جێگیر بوون، حەوانەوە لە شوێنێک" لە پێوەندیدا بێ و یان دە بنەڕەتدا یەك ریشە بووبن. شتێك کە ئەم شیمانەیە بەهێز دەکا، پێوەندی دوو چەمکی "حەوانەوە" و "حەسانەوە"یە. ئەم پێوەندییە بۆ وێنە لەم وشانەی خوارەوەدا بەدی دەکرێ کە پێکەوە خزمن: Ruhe (.G) "حەسانەوە، راحەتی" و Rast (.G) و (.OG) "حەسانەوە، راحەتی، وچان، قۆناغ" و rest (.E) "حەسانەوە، حەوانەوە لە شوێنێك". هەروەها وشەی "هێورین" دە زمانی کوردمادیدا هەر دوو مانا بە دەستەوە دەدا، واتا "ئارام بوون(ەوە)، راحەت بوون" و "پەنا گرتن، جێ دەست کەوتن" و لەوانەشە ئەم وشەیە خزم بێ دەگەڵ "حاوانەوە، حەوانەوە"].

**حەشار ħeşar** [ *ħaşār* ] - "1- نەدیار 2- بۆسە": حە ħe + شار şar. هەشار heşar یش دەگوترێ کە شێوە دروستتر و کۆنترەکەیە [پێشگری هە he + شار şar]. خزمە دەگەڵ ↑شاردنەوە şardınewe. کەرتی یەکەم پێشگرێکە کە بە چەند شێوەی هە he، ئە e، ئا a، ها ha لەبەر چەند هۆیەك بە ژمارەیەکی زۆر لە وشەکانەوە دەنووسێ وەك ئاواز، ئاخێز، ئارام، هەشین، هەناو، هەنگاو، ئاستەم، ئاهەنگ و هتد.

**حەشیمەت ħeşîmet** [ *ħašīmat* ] - "ئاپۆڕە، خەڵکی زۆر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هێشوو ħêşû و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "ئاپۆرە بوون، زۆر بوون، کۆم بوون" دەکەن، وەك ↑گیشە gîşe، ↑قۆشەن qoşen، ↑گشت *gışt* و هتد.

**حەفیان ħefyan** [ *ħafyān* ] - "1- زۆرخۆر 2- وەڕین": خزمە دەگەڵ ↑حەپیشاندن ħepîşandın "خواردن بە هەڵپە و لەز" و دەگەڵ ↑قەپ *qep* "گاز لێدان بە ددان"، دە بنەڕەتدا بە مانای "زار داپچڕین".

**حەلان ħelan** [ *ħalān* ] - "تاوێرەبەرد، جاڵە": خزمە دەگەڵ ↑گلان *gılan* "و گللۆر gıllor و ↑خلّلۆر xıllor و هەروەها ↑جاڵە cale.

**حەلحەلە ħelħele** [ *ħalħala* ] - "تەشقی ئاسمان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ئاڵ[4] al "قامکی هەرە درێژ" و ↑ئاڵا ala "پەرچەم، بەیداخ" [دە بنەڕەتدا واتا بەرز راگیراو].

**حەلك ħelk** [ *ħalk* ] - "قسەی خۆش، قسەخۆش": خزمە دەگەڵ ↑حیلکە ħîlke "پێکەنین".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ حەنەك ħenek "شۆخی، قسەی خۆش" کە ئەویش وێ دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑کەنین kenîn [پێکەنین pekenîn] و خەنە xene [زەردەخەنە].

**حەلکی ħelkî** [ *ħalkī* ] - "هێژا، بەنرخ": دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "بەرز، بلیند" بێ و مەبەست کەسێك یان شتێکە رێز و قەدری لە سەرەوەیە. خزمە دەگەڵ هێندێك وشە کە ئاماژە بە "بەرز بوون، بلیند کردن" دەکەن وەك ↑ئاڵ[4] al "قامکی هەرە درێژ".

**حە(ل)لەق ħel(l)eq** [ *ħal(l)aq* ] - "دەگەڵ مەللەق mel(l)eq دێ [حەللەق مەللەق ħelleqmelleq واتا قسەی خۆڕایی، بێمانا]. الکی alakî (.P) "خۆڕایی، بێمانا". لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑هەڵە hele.

**حەمرین ħemrîn** [ *ħamrīn* ] - "ناوی زنجیرەکێوێکە دەکەوێتە سنووری باشووری کوردستان دەگەڵ عێراق": ئەم زنجیرەکێوە دە گەلێك سەرچاوەی کوردی و بیانیدا وەك هێڵی سنووری باشووری کوردستان و عێراقی عەرەب ئاماژەی پێ کراوە. ناوی ئەم کێوە وشەیەکی کوردمادییە و هیچ

پێوەندییەکی بەسەر زمانی عەرەبییەوە نییە. کوردمادی بوونی ئەم ناوە هەروەها بەڵگەشە بۆ کوردستانی بوونی ئەم شوێنە. وشەکە پێک هاتووە کە لە دوو کەرتی حەمر + ین ħem(ı)r + în. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی زمانی کوردمادی وەک ↑قەمرین qemrîn "بەستن، بوونەسەهۆڵ"، ↑کەمر kemır یان ↑کەڤر *kevır* "بەرد" [گۆڕانی m بۆ v]، هەروەها کەمر kemır "خەڵووزی بەردین" و ↑کەمرە kemre "ریخی پەستراو و رەق بوو"، ↑کەمێڵ kemel "چڵمی رەق و هیشک بوو"، ↑گەمرە gemre [یان ↑کەپرە kepre، ↑کەوەرە kewere] "پەترۆی برین"، ↑گەمر gemr "نیوەکوڵیو" [هێشتا رەق]، ↑قومری qumrî "داشکەلەم" [کەلەمی بەردین، کەلەمی رەق]، ↑خاو xaw "نەکوڵیو، پێنەگەیشتوو" [بە فارسی: خام xam]، ↑کەورک kewırk "هەرمێی رەق"، ↑قەوار qewar "کاکڵی گوێز و بادام" [دە بنەڕەتدا: بەرد، هەستی، رەقایی ناوکی میوە]، ↑قەورە qewre "بەردی تیژ کردن، سۆهان"، ↑زەمر zemır "تەوەزەل، لەشگران" [قورس]، ↑هەپروون heprun [چیایەکی هەپروون بە هەپروون واتا زۆر سەخت و ئاسێ، فۆتیمی p لە سەرەوە دە وشەی ↑کەپرە kepre شدا دەبیندرێ]. هەروەها دوو وشەی دیکەش لەم بارەوە جێی هەڵسەنگاندنن کە بریتین لە ↑هەبلین heblîn "قەبز بوون" [رەق بوونی ناو سک؟]، ↑هۆپەڵ hopel "تۆپەڵ" [پێکەوەنووسان، سەخت بوون، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی "تۆلا" و "گرسە"، ئەوانیش ریشەکانیان مانای "توند، سەخت"دەدا]. وەک دەبینرێ چەمکی هاوبەش لە هەموو ئەم وشانەدا "رەق و سەخت" بوونە. ئەوەی لێرەدا بەتایبەتی شیاوی باسە، ئەوەیە کە ناوی زۆرینەی چیا بەرز و سەرکەشەکانی کوردستان دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە ئاماژە بە "سەخت بوون" دەکەن، وەک سیپان، ئاسۆس، زاگرۆس، زاپ، سەفین، ساسۆن، پیرەمەگروون، گارێ و هتد. کەوابوو سروشتییە کە چیای حەمرینیش لەسەر ئەم بنەمایە ناو نرابێ و دەگەڵ چەمکی سەخت و بە هێز و قایم بوون گرێ درابێ. لە سەرەوە وشەی قەورە qewre باس کرا کە دە فارسیدا "سوهان"ی پێ دەگوترێ. "سۆهان"یش خزمە دەگەڵ چەندین وشەی زمانی کوردمادی بە مانای "بەرد، سەخت" [بڕوانە "سەق"]. کەرتی دووەمی وشەی حەمرین ħemrîn، واتا în- هەمدیسان پاشگر یان نیشانەیەکی زمانی کوردمادی و بە گشتی زمانە ئێرانییەکانە، کە ئاوەڵناو دروست دەکا، وەک بەردین، دارین، گڵین، ئاسنین، زێڕین و هتد، یانیش ئەو نیشانەیە کە کردار دروست دەکا، وەک پرسین، کڕین، فڕین، تاشین، ناسین و هێندێک جاریش ناو دروست دەکا، وەک برین، سۆکین. دواجار دەمێتێتەوە ئەوە بڵێین کە فۆتیمی سەرەتای ئەو وشانەی سەرەوە بە چەندین شێوە دەردەکەون، وەک ħ ،h ،q ،z ،g ،k. فوتیمی ħ دە زمانی کوردمادیدا فۆتیمێکی رەسەن نییە و لەوانەیە لەژێر کارتێکەری زمانی عەرەبیدا پەیدا بووبێ کە لە ژمارەیەک وشەی دیکەی زمانی کوردمادیشدا دەبینرێ، واتا ئەو وشانەی بە ئەسڵ کوردمادین و فۆتیمەکەیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، وەک حەز، حاند، حاوانەوە، حوشتر، حولی، حەپین، حەشار و هەموو ئەو وشانەی لەم فەرهەنگە لەژێر پیتی ħ دا ریز کراون.

**حەمزەڵ ħemzel** [ *ħamzal* ] - گەمەیەکە دەستەیەک دادێنەوە و دەستەکەی دیکە بە سەر پشتیاندا باز دەدەن". بنەوشەی حەمز -ħemz خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑گەمژە gemje، ↑گەوز *gewz*، ↑کەوان kewam و هیتربە مانای "با دان، خوار بوون، چەمین".

**حەمکە ħemke** [ *ħamka* ] - "ئەندازەیەکی زۆر": دەچێتەوە سەر ↑هەموو ħemû.

[تێبینی: پێوەندی نیزیک لەنێوان دوو چەمکی "هەموو" و "زۆر"دا هەیە. ئەم پێوەندییە بۆ وێنە لە دوو وشەی "گشت" و "گیشە"دا دەبینرێ کە ئەمەی دوایی بۆ ئەندازەیەکی زۆر لە گیا بە کار دێ].

**حەوا ħewa** [ *ħawā* ] - "لای سەرەوە، بڵیندتر لە ئاستی زەوی، ئاسمان، فەزا":

1- یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هەوا1 hewa "با، گازی هەناسەکێشان"، سەر بە ریشەی > ***(a)ue- / *hwe-*** ***(IE.)*** * "با هاتن، شنینەوەی با، با کران". ئەوەی شیاوی سەرنجە ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا "هەوا" و "حەوا" وەک دوو وشەی بە تەواوی جیاواز بەکار دێن، بەڵام دە زمانی فارسی و هەروەها زمانەکانی

دیکەدا هوا (P.) hawā یان وشەکانی هاوتا هێندێک جار بە مانای "حەوا"ی کوردمادیش بەکار دێن، بۆ وێنە دە فارسیدا دەگوترێ "بە هوا پرتاپ شد" واتا "حەوا درا، دە حەوا کرا" یان نیروی هوایی nīrū ye hawāyī (P.) و air force (E.) دەبێتە هێزی هەوایی واتا هێزی ئاسمانی و هتد.

2- یان لەوانەیە خزمە دەگەڵ heaven (E.)، heofan (OG.)، heban (OS.)، himinn (OIs.)، himins (Gt.)، himil (OG.)، Himmel (G.) "ئاسمان"، سەر بە ریشەی <*kem- (IE.)* "داپۆشین، تیوەپێچان". حەوا یان ئاسمان ئەو شتەیە کە دەوری ئەرزی گرتووە و دایپۆشیوە. ئەگەر "حەوا" پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ، ئەوسا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە، بۆ وێنە ↑جامە came، ↑کەمک kemık "دەسرۆکە"، ↑شەمەد şemed "پۆپەشمین" و هتد. هەروەها وشەی ↑*ئاسمان asman* خۆی پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**حەوت hewt** [*ħawt*] - "ئەژمارێکە": هفت haft (P.)، sieben (G.)، sibun (OG.)، seven (E.)، sju (Sw.)، septem (L.)، heptá (Gr.)، saptá (OIn.) سەر بە ریشەی <*septm- (IE.)* "حەوت، هەفت".

[تێبینی: دو زمانی عەرەبیدا وشەی سبت sabt (Arb.) "شەمبە" یان لە زمانی لاتینی یان لە زمانە کۆنەکان وەرگیراوە. ئەگەر رۆژی یەکشەمبە وەک یەکەم رۆژی حەفتە دابنێین (یەک شەمبە)، ئەوسا رۆژی شەمبە دەبێتە حەوتەمین رۆژی حەفتە. لەوانەیە بەر لە زاڵ بوونی ئیسلام، لە ناو گەلانی ناوچەدا رۆژی حەوتەم واتا رۆژی شەمبە رۆژی پشوو دان و رۆژی ئایینی بووبێ].

**حەوز hewz** [*ħawz*] - "شوێنی ئاو تێدا کۆ کردنەوە": حوض hawz (Arb.). وێ دەچێ وشەکە بە ئەسڵ عەرەبی نەبێ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑حەوشە hewşe "حەسار".

**حەوشە hewşe** [*ħawša*] - "1- حەساری ماڵ 2- جێ شەوێنی ئاژەڵ": حەوش hewş یش دەگوترێ. هەروەها ↑هەڤێز hevez یش دەگوترێ بە مانای "حەوشەمەڕ". خزمە دەگەڵ Haus (G.)، house (E.)، hus (Sw.)، hausen (G.)، hūsōn (OG.) "لە ماڵ نیشتەجێ بوون، حاوانەوە، بەڕێوە بردنی ماڵ و منداڵ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی <*(s)keu- (IE.)* "دەورگرتن، لێهاڵاندن، تاقەت کردن، داپۆشین". لەوانەیە وشەی ↑حەوز hewz یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و مەبەست "حەسار"یک بێ بۆ کۆ کردنەوەی ئاو.

**حەیران heyran** [*ħayrān*] - "هەوایەکی گۆرانی": پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانە:

1- ↑هۆرە hore [هەوایەکی گۆرانی] و ↑*هاوار hawar* "بانگ، هەرا".

2- aria (It.) "گورانییەک یەک کەس وێرای مووزیک دەیخوێنێ". ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانی دیکەش و دە زمانی فەرانسەییدا بووەتە air (Fr.) "هەوا، ئاواز". ریشە؟

**حیز hîz** [*ħīz*] - "1- چاوباز، سووک 2- ترسەنۆک": هیز hîz و خیز xîz یش دەگوترێ. هیز hīz (P.) "چاولەوەڕێن، سووک، بێئابڕوو". مانای ئەسڵی وشەکە وێ دەچێ پێوەندی بە هەوەس و خواستی جینسییەوە هەبێ و سەرەتا بۆ ئەو کەسانە بەکار هاتبێ کە بە هۆی زێدەخوازی لەم بارەوە سنوورە کۆمەڵاتییەکانیان بەزاندووە. ئا لێرەوە پاشان ماناکانی دیکە وەک "بێئابڕوو، سووک" و دواتریش "ترسەنۆک" سەریان هەڵداوە. ئەگەر ئەم تێڕوانینە راست بێ، ئەوسا وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑حەز hez "ئارەزوو، داوای بەتین".

[تێبینی: لەباری پێوەندی باسکراو هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی Hure (G.) "جندە" و کەڵ kel[بەکەڵ، وەکەڵ هاتووە] و کەڵکەڵە kelkele "ئارەزوو، خولیا". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ یەکتر و لە ریشەیەکەوە هاتوون].

**حیشی hîşî** [*ħīšī*] - "گوریسی پان و درێژ": خزمە لەگەڵ ↑هەژگ hejg "رەشکە، تۆڕی کا کیشان".

**حیلکە hîlke** [*ħīlka*] - "پێکەنین بە دەنگی بڵیند": هەروەها حیلکاندن hîlkandın هەیە بە مانای حیلکە کردن.

**حیلاندن** **ĥîlandın** [ *ĥīlāndın* ] - ”دەنگێ هەڵبڕینی ئەسپ“: خزمە دەگەڵ ↑حیلکە ĥîlke ”پێکەنین بە دەنگی بڵیند“.

**حینجە** **îĥnce** [ *ĥīnja* ] - ”خوێندنەوەی بە سەر و بۆرەوە“: هەروەها دەگەڵ ”فینجە“ دێ [حینجە و فینجە ĥînce û fînce] سەر بە < **هجا** *ĥija* (*Arb.*) ”گوتنی وشەیەك پیت بە پیت یان بەش بە بەش“.

**حینچك(ە)** ĥînçık(e) [ *ĥīnčık(a)* ] - ”کوت، لێ ژەنین“: دەشێ کۆنتر ”هەنچك hençık“ بووبێ، پێشگری هەن hen + چك çık. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx و سك sok (P.) ”نەقیزە، داری نووك تیژ“ و ↑زەق zeq. مەبەست تێکوتانی شتێکی زەقە.

## خ (X)

خاپاندن **xapandın** [ *xāpāndın* ] - "فریو دان": لەوانەیە پێوەندی بە ↑خەوتن xewtın [خەفتن xeftın]ەوە هەبێ و مەبەست دە بنەڕەتدا "خەواندن" بە مانای "هۆش لێ برین، هۆش لێ ئەستاندن" بووبێ.

خاپوور **xapur** [ *xāpūr* ] - "1- وێران 2- ناوی چەمیك لە كوردستان": شێوەیەكی كۆنترە لە ↑كاول kawıl "وێران". ناوی چەمەكە خابوور xabur یش دەگوترێ. وشەكە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "دەم داپچڕین" و لەوێوە چەندین وشە بە ماناكانی وەك "كون، كەلێن، شكێڕ، بۆشایی، قووڵایی" سەریان هەڵداوە. لەم تێڕوانینەوە چەمی خابوور یان خاپوور بە مانای چەمی قووڵە. هەروەها مانای "وێران" لێرەوە پەیدا بووە كە خانوو بە هۆی رمان و تێك تەپینەوە، میچ یان دیوارەكانی لێرە و لەوێ كەلێن و كەلەبەر و لەئەنجامدا قووڵاییان تێدا دروست دەبێ. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑كون kun.

خات **xat** [ *xāt* ] - "وشەی رێزگرتن لە ژن": ↑خاتوون xatun یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Gatte (.G)، gade (.Nl)، gada (.OE) "هاوسەر، هاواڵ". خزمە دەگەڵ ↑*خاس xas* "باش". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *ghedh- >** بە مانای"پێكەوە گونجان، دەگەڵ یەكتر هاتنەوە، بۆیەكتر (باش) بوون، جۆش خواردن، یەكانگیر بوون". هەروەها gatilinic (.OG) "خزم"، gadiliggs (.Gt) "ئامۆزا و خاڵۆزا"، gaedeling (.OE) "خزم، هاواڵ" دەچنەوە سەر هەمان ریشە. دە زمانی كوردمادیدا وشەكانی ↑خزم xızım و ↑خێزان xezan یش پێوەندییان بە وشەكانی خات xat و خاس xas ەوە هەیە و هەر لەو ریشەوە هاتوون.

خاچ **xaç** [ *xāč* ] - "نیشانەی كریستیانەكان": خاچ xāč (.P). دە زمانی ئەڵمانیدا Kreuz هەم بە مانای "خاچ" دێ و هەمیش بە مانای "زەربدەر" واتا دوو هێڵ كە خوارەوخوار یەكتر دەبڕن، هەروەها بەمانای "چوارڕێیان"ی رێگا و بانیش بەكار دێ. دە زمانی كوردمادیدا بۆ ئەو دۆخی "زەربدەر" یان دوو هێڵی خوارەوخواری یەكتربڕ ↑قیلەوقاچ qîlewqac بەكار دێ. لێرەوە دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین كە "خاچ" دە بنەڕەتدا هەمان "قاچ" یان "خێچ"ە كە ئاماژە دەكا بە خوارەوخوار بوونی دوو هێڵەكە.

[تێبینی: وشەی Kreuz ی ئەڵمانی دەچێتەوە سەر crux (.L) "خاچ". وێ دەچێ ئەم وشە لاتینییەش سەر بە ریشەیەك بێ بە مانای "خوار" و لەوانەشە دەگەڵ "خوار" یەك ریشەی هەبێ].

خار **xar** [ *xār* ] - "رەق، سەخت": خزمە دەگەڵ hart (.G)، hard (.E)، karara (.OIn)، kararoi (.Gr)، بەواتای"سەخت، رەق". وشەكانی kratu (.Gr)"هێز" و kratys (. Gr) "بە هێز، بەدەسەڵات" دەچنە وە سەر ریشەیەكی هاوبەش، واتا ریشەی **(IE.) *kar- /*ker- >** "خار، سەخت". هەروەها بڕوانە ئەو وشانەی لەژێر ↑كورد kurd دا هاتوون.

خاران **xaran** [ *xārān* ] - "سەخت بوون": ↑خار xar.

خازتن **xaztın** [ *xāztın* ] - "ویستن، داوا كردن": خزمە دەگەڵ ↑حەز ħez "ویست و ئارەزوو".

خاس **xas** [ *xās* ] - "باش، چاك": وشەكە هەروەها مانای "تایبەتی" و "ئەسڵ"یشی وەرگرتووە. خزمە دەگەڵ gut (.G)، good (.E)، god (.Sw) سەر بە ریشەی **(IE.) * ghedh-** "گونجان، چوونە پاڵ یەكەوە، جووت بوون، یەكانگیر بوون، دەگەڵ یەك هاتنەوە". مەبەست لە وشەی خاس سەرەتا "لەبار و گونجاو" بووە و پاشان ماناكە بووەتە "باش، پەسەند". -ā-gadhita (.OIn) "لەیەكدی گیر بوون، یەكانگیر بوون" دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیە. دە كوردمادیدا خزمە دەگەڵ چەندین وشە وەك ↑سترا1 sıtır "پەیژە، تیردیوان" [داربەست، تێكبەست]، ↑*خات xat* [خاتوون]. مەبەست لە "خات" دە بنچینەدا ئاماژە بەو

کەسەیە کە دەگەڵ مرۆڤ دەگونجێ، دەگەڵی دێتەوە یان دەگەڵی یەکانگیر دەبێ، بەوتەیەیەکی دیکە دەگەڵی جووت و هاواڵە. وشەکانی ↑خزم xızım و ↑خێزان xezan یش سەر بەم ریشەیەن. هەروەها وشەی ↑گان gan دە ئەسڵدا بە مانای "جووت بوون، یەکانگیر بوون"ە و پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشەیە دە زمانی پەهلەویدا gātan (Pl.) بووە و گاتار gatar (Pl.) یش بە مانای "شوو، مێرد" هاتووە.
[تێبینی: وشەی خاص xas (Arb.) "تایبەت" دە زمانی عەرەبیدا دەبێ لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوبێ. مانای ئەسڵی وشەکە وەک باس کرا "باش، گونجاو" بووە و لەوێوە دواتر مانای "تایبەت، هەڵبژاردە، جیا لەوانی دی" سەری هەڵداوە. زمانی عەرەبی وشەکەی بەم مانایە وەرگرتووە، یان مانای وشەکەی بەم جۆرە گۆڕیوە. بەپێچەوانەشەوە وشەی تایبەت taybet دە زمانی کوردمادیدا دەبێ لە طیب، طیبة tayyib(et) (Arb.) عەرەبی وەرگیرابێ بە مانان "باش، چاک"، واتا زمانی کوردمادیش مانای وشە عەرەبییەکەی کەی هەر بەم جۆرە گۆڕیەوە کە زمانی عەرەبی مانای وشە کوردمادییەکەی گۆڕیوە].
**خاش1 xaş** [ *xāš* ] - دەگەڵ "ورد" دێ [ورد و خاش wırd û xaş]. لەوە دەچێ ئەم وشەیە جیا بێ لە خاش2 "قاش، کووز، لەت"، چونکوو بردران و لەت لەت بوون دەگەڵ "ورد و خاش بوون" جیاوازی هەیە. ئەم وشەیە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:
1- ↑خاک xak.
2- ↑خک xık "دارکاری کردنی زۆر".
**خاش2 xaş** [ *xāš* ] - "قاش": ↑قاش qaş.
**خاشیل xaşîl** [ *xāšel* ] - "چێشتی گەنمە کوتاو": لە ↑خاش[1] xaş بە مانای "ورد، وردکراو" وەرگیراوە. لێرەدا مەبەست ورد و خاش کردنی گەنمەکەیە.
[تێبینی: هەڵی سەنگینە دەگەڵ "ساوار" کە پێوەندی بە "ساوین"ەوە هەیە، "هەریس" کە پێوەندی بە "هاڕین"ەوە هەیە و هەروەها "کفتە" کە پێوەندی بە "کوتان"ەوە هەیە].
**خاک xak** [ *xāk* ] - "1- خۆڵ 2- هەرد، زەوی": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئاخ ax "خاک".
[تێبینی: سەبارەت بە ئەوە کە وشەی خاک بە هەر دوو مانای "خۆڵ" و " هەرد، زەوی" بە کار دێ، دەتوانین دەگەڵ وشەی ئاڵمانی Erde (G.) بەراوردی بکەین کە ئەویش بە هەردوو مانای "هەرد، زەوی" و "خاک و خۆڵ " بەکاردەهێندرێ].
**خافوور xafur** [ *xāfūr* ] - "ڤاڵا، ناوبەتاڵ": خزمە دەگەڵ ↑کون kun.
**خاڤک xavık** [ *xāvık* ] - "1- کەلەکە، خاڵیگە 2- کوتاڵی رزیوی دڕاو": بنەوشەی خاڤ -xav خزمە دەگەڵ ↑خافوور xafur "ڤاڵا، ناوبەتاڵ" و دواجار ↑کون kun.
[تێبینی: دە فارسیدا "تهیگاه" هەیە بە مانای "خاڵیگە، بەرسک" کە دەچێتەوە سەر وشەی "تهی" بە مانای "بەتاڵ"].
**خاڵ1 xal** [ *xāl* ] - "برای دایک": شیاوی باسە کە دە زمانی کوردمادیدا لەجیاتی خاڵۆ، ↑ئاڵۆ alo ش دەگوترێ. هەروەها وشەی ↑کاڵ kal هەیە بەمانای "پیر". بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەشێ ئەم وشانە خزم بن دەگەڵ alt (G.)، old (E.) "پیر"، alan (Gt.) "هەڵدان و گەورە بوون"، altus (L.) "بەرز، بڵیند"، ala (OIs.) و alare (L.) "بژێو پێدان، بەخێو کردن، گەورە کردن". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *al- >** "گەورە بوون، گەورە کردن".
**خاڵ2 xal** [ *xāl* ] - "نەخش و نیشانەی سەر پێست، ماڵە": خزمە دەگەڵ ↑کاڵ kal "رەنگی رووناک، سپی واش" [کاڵ بوونەوە واتا ڕەنگ لە دەست دان و سپی بوونەوە]. دە زمانی کوردمادیدا سەرەتا بە پەڵەی رەش و تاریکی سەر پێست گوتراوە "ماڵە" و ئەم وشەیە تا ئەمرۆش دە زمانی کوردمادیدا هەرماوە و ماناکەی خۆشی پاراستووە. دە هێندێک لە زمانە هیندوئەورووپییەکانیشدا وشەیەک کە بۆ ئەم مەبەستە بە کار دێ، خزمە دەگەڵ "ماڵە"ی کوردمادی. کەواتە جێی پرسیارە چۆن دە زمانی کوردمادیدا وشەی

خاڵ کە دە ئەسڵدا ماناکەی بە پێچەوانەی "ڕەش و تاریک"ە، بە مانای ماڵە بەکاردەهێندرێ و تەنانەت جێگاشی بەم وشە کۆنە لێژ کردووە. ئەم دیاردەیە دەتوانین ئاوا لێک بدەینەوە کە سەرەتا "ماڵ، ماڵە" بە پەڵەی ڕەش و تاریک گوتراوە و "خاڵ"یش بە پەڵەی سپی، بەتایبەتی هی سەر پێستی ئاژەڵ. دواتر وشەی خاڵ ماناکەی دەگەڵ ماڵ [ماڵە] تێکەڵ بووە و بە هەردووک مانا بە کار هێندراوە. دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا وشەی ↑خاڵومیل xal u mîl مان هەیە بە واتای "نەخش و نیگار" کە تێیدا هەردوو وشەکە بەدیار دەکەوێ و دە بنچینەدا مەبەست پەڵەی ڕەش و سپی بووە.

**خاڵ3 xal** *[ xāl ]* - دەگەڵ "خڵتە" دێ و دەگوترێ خڵتە و خاڵ xılte û xal. دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑خۆڵ xol.

**خاڵومیل xalumîl** *[ xālumīl ]* - "نەخش و نیگار": پێک هاتووە لە دوو وشەی ↑خاڵ xal و میل mîl. وشەی یەکەم واتا "خاڵ" دە بنەڕەتدا بە مانای "پەڵە یاخود نەخشی سپی" بووە و وشەی "میل"یش شێوەیەکی دیکەیە لە ماڵ، ↑ماڵە male بە واتای "پەڵە یان نەخشی ڕەش". تێکڕای وشەکە واتا نەخشی ڕەش و سپی.

**خاڵووزە xaluze** *[ xālūza ]* - "پەتایەکی گەنمە، ڕەشی هەڵدەگیرێ": خزمە دەگەڵ ↑خەڵووز xeluz.

**خام xam** *[ xām ]* - "پارچەی لە دەزوو": خزمە دەگەڵ kamilos (.Gr) "داو، دەزوو". ئەم وشانە دەبێ پێوەندییان بە جامە came وە هەبێ [بڕوانە ↑جامە came].

**خام xam** *[ xām ]* - "1- قەنەوز، پارچەیەکی بنەوشە 2- قوماشی سپی": هەروەها خامک xamk هەیە بە مانای "کای کونجی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑جامە came.

**خامۆش xamoş** *[ xāmoš ]* - "کووژاوە": بڕوانە ↑خەمتین xemtîn "کز بوونی ئاگر".

**خامە xame** *[ xāma ]* - "1- قەلەم 2- شووڵ [قەڵەمە]": دە فارسیدا خامە xāme (.P) بە هەمان مانا. خزمە دەگەڵ ↑قامک qamık [qam + ık] "ئەنگوست".

**خان xan** *[ xān ]* - " گەورە و سەرۆکی خێڵ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ canus (.L) "سپی، سەرسپی، بەڕێز".

**خانوو xanu** *[ xānū ]* - "ماڵ، هۆدە": دە فارسیدا خانە xāne (.P). بنەوشەکە خان -xan ە. دەشێ خزم بێ دە گەڵ Heim (.G)، home (.E)، hem (.Sw) "ماڵ، خانوو"، komē (.Gr) "دێ، گوند"، sem’ja (.Rus) "خانەوادە، بنەماڵە"، سەر بە ریشەی ***kei- <*** ***(.IE)*** "شوێنی حەوانەوە". خزمە دەگەڵ ↑یانە yane "ماڵ، خانوو، جێگەی حەسانەوە". هەروەها بنەوشەی -ke(d) دە وشەکانی ↑کابان kaban و ↑کوێخا kuwexa دا دەچنەوە سەر ئەم ریشە هیندوئەورووپییە.

[تێبینی: لەبەرانبەر فۆتیمی m ی زمانە ئەورووپییەکان دە وشە کوردمادییەکەدا فۆتیمی nدەردەکەوێ. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ خوێن xuwen (خوون xun، خێن xen، هوون hun) دە زمانی کوردمادیدا و haima (.Gr)، هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ڕۆن ron و Rahm (.G)، ream (.OE)، room (.Nl) بە واتای "خامە"].

**خانەقا xaneqa** *[ xānaqā ]* - "ماڵی شێخ و مریدەکانی": دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی خان(ە) + قا xan(e) +qa. کەرتی دووەم هەمان پاشگری گا ga- یە کە ئاماژە بە شوێن دەکا وەک زانینگا، فرۆشگا، دەرمانگا و هتد. کەرتی یەکەم پێوەستە بە کرداری ↑خوێندن xuwendın [خاندن xandın، خێندن xendın] و مەبەست لە تێکڕای وشەکە دەبێتە شوێنی خوێندن. دیارە مەبەست خوێندن (یان بە دەنگ و ئاواز خوێندنەوە)ی دەقە دینییەکان بووە.

**خاو1 xaw** *[ xāw ]* - "شل، سست، بێ هێز": خاڤ xav یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ کەوتن kewtın. مەبەست لە "خاو" بریتییە لە شتێکی شل و شۆڕ و *داکەوتوو*.

خاو² **xaw** [ *xāw* ] - دەگەڵ "خێزان" دێ [خاو و خێزان xaw u xezan]. پێوەندی هەیە بە ↑حاوانەوە ħawan(ewe) "دەگەڵ یەک ژیان بەسەر بردن، پێکەوە رابواردن".

خاو3 **xaw** [ *xāw* ] - "پێنەگەیشتوو، نەکوڵیو، نائامادە": خام xām (.P). خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑حەمرین ħemrîn دا باس کراون و بە گشتی مانای "سەخت، رەق" دەبەخشن.

خاوان **xawan** [ *xāwān* ] - "سەرگەرم بوون، خافڵان": هەروەها خاواندن xawandın هەیە بە مانای "سەرگەرم کردن". خزمە دەگەڵ ↑حاوانەوە ħawan(ewe) "جێگیر بوون و سازگار بوون، ژیان بەسەر بردن، رابواردن".

خاوس **xaws** [ *xaws* ] - دەگەڵ "پێ" دێ و دەگوترێ پێخاوس pexaws [یان پێخواس pexuwas] بە واتای "پێپەتی". خزمە دەگەڵ ↑خاوێن xawen "پاک".

تێبینی: دە وشەی "پێپەتی"شدا کەرتی "پەتی" مانای "پاک" دەدا، کوردی پەتی واتا کوردییەکی پاک و خاوێن".

خاولی **xawlî** [ *xāwlī* ] - "پەرۆی خۆ پێ هیشک کردنەوە": خاڤلوو xavlu ش دەگوترێ. حولە houle (.P). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ zwehle (.G) "دەسرە" [دە دیالێکتی ناوینی زمانی ئەڵمانیدا Quehle ش دەگوترێ] و towel (.E)، dwaal (.Nl ) "خاولی، دەسرە". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *twaha-* (*.Gm*) "شوشتن، حەمام کردن". tva (.Sw) "شوشتن" لەم ریشەوە هاتووە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑خاوێن xawen "پاک، تەمیس".

خاوەن **xawen** [ *xāwan* ] - "ساحیب": دە زمانی کوردمادیدا بە چەند شێوە دەردەکەوێ، وەک خودی xodî، خاوەن xawen، خودان xudan، خێوxew و هتد. ئەم فۆرمانە گشتیان پێوەستن بە وشەی ↑خوداوەند xudawend بە مانای "خاوەن". وشەکە لە خوداوەند ەوە گۆڕدراوە و بووەتە "خاوەند"، پاشان "خاوەن"، پاشان "خێو". لە لایەکی دیکەوە خوداوەند گۆڕدراوە بە "خودان". وشەی خوداوەند دەشێ بچێتەوە سەر ↑خودا xuda "ئەفرێنەر و خاوەنی جیهان". کەرتی دووەمی وشەکە دەشێ هەمان ↑بەندە bende بێ [خودابەندە xudabende ؟] و مانای بنەڕەتی وشەکە بریتی بێ لە ئەو کەسەی بەندەی هەیە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Herr (.G) بە مانای "رێزدار، ئاغا، مستر" بەکار دێ. مانای ئەم وشەیە دە کۆندا "بەڕێز، خاوەن مەزنایەتی" بووە و لەوانەیە دەگەڵ "قەیرە"ی خۆمان خزم بێ. ئەم وشە ئەڵمانییە هاوکات بە مانای "خاوەن"، "خونکار" [خواوەندکار] و "خودا"ش بەکار دێ].

خاوێن **xawen** [ *xāwen* ] - "پاک، تەمیس": ئەم وشەیە لەوانەیە دەگەڵ ↑خاوس xaws [پێخاوس واتا پێپەتی] هاوریشەبێ. دەشێ خزم بن دەگەڵ -dav (.Av)، -dhāv (.OIn) "پاک کردن، خاوێن کردنەوە"، سەر بە ریشەی **< -dheu*** (**.IE**) "درەوشانەوە، بریقانەوە". بە گوێرەی "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی، ل. 135" وشەی اندودن andūdan (.P) "تیهەڵسوون، سواخ دان" پێوەندی بەم وشانەی زمانی ئاڤێستا و سانسکریت هەیە. وشەی ↑خاولی xawlî یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. وەک دەبینرێ فۆتیمی کۆنی d لەم وشە کوردییانەدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووەتە x. بەڵام فۆتیمە کۆنەکە لە چەند وشەی دیکەدا پارێزراوە، وەک ↑پاکتاو paktaw، ↑تیف تیفە tîftîfe "ساف و لووس کردن". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ریشەی هیندوئەورووپی وشەکانی towel (.E)، dwaal (.Nl ) "خاولی، دەسرە" دیاری نەکراوە و تەنیا باس لەوە دەکرێ کە ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە ریشەی ژێرمەنی *twaha-* *(*.Gm*) "شوشتن، حەمام کردن" و خزمن دەگەڵ tva (.Sw) "شۆردن". بە شیمانەیەکی بەهێز دەتوانین باس لەوە بکەین کە ئەم ریشە ژێرمەنییە بە مانای "شوشتن" خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنی هیندوئەورووپی کە دەبێ هەر ئەو ریشەیەی سەرەوە بێ. بەم جۆرە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا لە مانای بنەڕەتی "درەوشاندنەوە، بریقە دان"، دواتر ماناکانی "پاک کردن، خاوێن کردنەوە"، هەروەها

"ساف و لووس کردن"، "سوونەوە، تیهەڵسوون" و دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا مانای "شوشتن" پەیدا بوون.

[تیبینی 1: چەمکەکانی "شۆردن"، "خاوێن کردنەوە"، "سوونەوە، ڕێخشاندن" پێوەندی نیزیکیان دەگەڵ یەکتر هەیە. بۆ وێنە وا پێ دەچێ کە وشەی "شۆردن"ی کوردمادی خزم بێ دەگەڵ scheuern (G.) "خاوێن کردنەوە بە سوونەوە و ڕێخشاندن".تیبینی 2: وشەکانی towel (E.)، dwaal (Nl.) "خاولی، دەسرە" وەک دەبینرێ بە "دەسرە"ش مانا کراونەوە. وشەی "دەسرە" کورتکراوی "دەستەسڕ"ە، واتا ئەو پەڕۆیەی بۆ سترینەوە و خاوێن کردنەوەی دەست بەکار دەهێنرێ. لێرەدا پێوەندی چەمکەکانی "سترین(ەوە)" [ڕێخشاندن] دەگەڵ "خاوێن کردنەوە" دیسانیش دەردەکەوێ. تیبینی 3: دە زمانی ئەڵمانی ئەمرۆدا بەرانبەری خاولی وشەی Handtuch (G.) بەکار دێ کە ماناکەی دەقاودەق دەبێتە "پەڕۆی دەست". بەڵام دە دیالێکتی ناوینی زمانی ئەڵمانیدا Quehle ش دەگوترێ، لە جیاتی towel (E.)، dwaal (Nl.). وەک دەبینین دە زمانی ئەڵمانیشدا فۆتیمی d / t گۆڕاوە بە q و ئەمەش لە وشەی "خاولی" کوردمادی گەلێک نیزیکە. نموونەیەکی دیکە لەم چەشنە گۆڕانە، وشەی "تۆراخ"ە کە دە زمانی ئەڵمانیدا بووەتە Quark، واتا فۆتیمی t لە سەرەتای وشە ئەڵمانییەکەدا گۆڕاوە و بووەتە q. تیبینی 5: ریشەی *dheu- (IE.) "دەرەوشانەوە، بریقانەوە" دەشێ خۆی پێوەندی هەبێ بە ریشەی *dei- (IE.) "ڕووناک بوون، دەرەوشانەوە، دیارکەوتن". تیبینی 6: دە زمانی فارسیدا حولە ĥoule (P.) بەکار دێ کە دەشێ شێوەی عەرەبێنراوی وشەکە بێ].

**خایاندن xayandın** [ *xāyāndın* ] - "پێچوونی کات": خزمە دەگەڵ گەیاندن geyandın و ↑گەیشتن geyîştın. بنەوشەی -gey لەم وشەیەدا بووەتە -xa(y) . کرداری گەیاندن ئاماژە دەکاتە جۆرێک لە گواستنەوە دە شوێن و دە دۆخدا [بۆ وێنە دەگاتە ئێرە یان چێشتەکە پێ دەگا]. کرداری خایاندن کردارێکی گواستنەوەیە دە کاتدا، واتا گەیاندنێکە لە نوختەیەکی زەمەنییەوە بۆ نوختەیەکی دیکە.

**خپر xıpır** - "کۆڵینەوە": خزمە دەگەڵ کاویدن kāvīdan (p.) "کۆڵین(ەوە)، هەڵکۆڵین". بنەوشەکە دە زمانی کوردمادیدا خپ -xıp و دە فارسیدا کاو -kav ە. پێوەندی بە ↑خاپوور xapr وە هەیە، واتا "قووڵ". گشت وشەکانی سەرەوە و هەروەها ↑قووڵ qul [پێشتر ↑کوور kur] و کۆڵین(ەوە) kolîn(ewe) [قووڵ کردن] پێوەندییان بە یەکەوە هەیە.

**خپە xıpe** [ *xıpa* ] - "خۆ لە شتێک مات کردن": [خپە کردن]. شێوەیەکی دیکە لە ↑خەفتان xeftan.

**خت xıt** - "بێدەنگ و جووڵە": دە بنەڕەتدا بە مانای "بێجووڵە، ڕەق بوو". خزمە دەگەڵ چەندین وشە و لەوانە ↑چاتمە çatme "پێک هەڵپەساردنی تفەنگان"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "وەستان" [لە جووڵێ وەستان].

**ختتە xıtte** [ *xıtta* ] - "وشەی دەنگدانی پشیلە": خزمە دەگەڵ ↑کتک kıtık "پشیلە".

**ختۆکە xıtoke** [ *xıtoka* ] - "قدیلە، قدیلکە": خت + ئۆکە xıt + oke. پاژی دووهەم پاشگری گچکاندنە. بنەوشەی -xıt بە چەشنی -qıd دە وشەی ↑قدیلە qıdîle شدا هەیە و خزمە دەگەڵ kitzeln (G.)، kizzilon (OG.)، cetelian (OE.)، kittelen (Nl.)، kittla (Sw.) "قدیلە دان". ریشەی وشەکە بەتەواوی ساخ نەکراوەتەوە.

**خدە xıde** [ *xıda* ] - دەگەڵ "خوو" دێ و دەگوترێ خوو و خدە xû û xıde. خەدە xede ش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ Sitte (G.)، sidu (OE.)، side (OFr.)، sidus (Got.)، sed (Sw.)، svadha- (OIn.) "عادەت، خوو و خدە". خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑جەلە cele [جەلەکردن واتا بە گوریس تێکخستنەوە]، ↑ژێ je "تاڵی ساز" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > *sei- (IE.)* "بەستن، بەستنەوە". لەم تێروانینەوە خدە واتا بەسترانەوە یان خۆبەستنەوە بە ئاکارێک. لەوانەیە عادة εade (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

خڕ **xır ¹** - "گرد":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kreis ‏(G.) "جەخز، دایرە، دەڤەر"، kreit ‏(MG.)، krijt ‏(Nl.) "جەجز، مەیدانی شەڕ و زۆرەوانی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ kritzeln ‏(G.) و kratzen ‏(G.) "کڕاندن، رووشاندن". مەبەست لە سەرەتادا جەخزێک یان کێرێکی ئاڵقەیی بووە کە بە کڕاندن و داررووشاندنی هەرد دروست کراوە. خزمە دەگەڵ ↑کڕاندن *kırandın*.

2- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ schräg ‏(G.)، curvus ‏(L.) "خوار"، krikos ‏(Gr.)، circus ‏(L.) "جەغز"، Ring ‏(G.)، (h)ring ‏(OG.) "هاڵقە"، krug ‏(Rus.) "جەغز، قەوان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)ker- >** "سووڕان، خوار بوون، با دران". هەروەها ئەم وشانە بەرهەڤ بکە دەگەڵ ↑خەڕەک xerek "چەرخی پەمۆ رستن".

[تیبینی: وشەی "خڕ" یان "گرد" نەک هەر چەمکی "جەغز و ئاڵقە" لە خۆ دەگرێ، بەڵکوو هەروەها دەربڕی چەمکی "پێکەویی، جڤات، کۆم بوون"ە، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "گرد بوونەوە". پێوەندی ئەم دوو چەمکەی سەرەوە بەیەکەوە زۆر نیزیکە. لەم بارەوە دەتوانین ئاماژە بە وشەی جەغز "دایرە، هێڵی کەوانی" بکەین کە خزمە دەگەڵ جووخە "دەستە" [سەرجووخە واتا سەردەستە]. یان ئەگەر سەیری وشەی "دایرە" بکەین، دەبینین دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ "دەستە و دایەرە" (دایرە)].

خڕ **xır ²** - دەگەڵ "بتوون" دێ [خڕ و بتوون واتا تەواو، هەموو]. ئەم "خڕ"ە لەوانەیە پێوەندی بە خڕ[1] xır "گرد"ەوە نەبێ و وشەیەکی سەربەخۆ بێ. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ whole ‏(E.)، heel ‏(Nl.)، heil ‏(G.)، celyj ‏(Rus.) "ساخ، تەواو، گشت، یەکپارچە" سەر بە ریشەی **< (IE.) *keilos-** "تەواو، گشت". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑چارە² *çare* و ↑چڵ içl [نیوەچڵ واتا نیوە لە گشت، ناتەواو]. کل kull ‏(Arb.) "تەواو، گشت" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑خێر xer.

خراپ **xırap** *[ xırāp ]* - "1- نەباش 2- وێران 3- لەکار کەوتوو": خراب xırab و خراو xıraw یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خەرابە xerabe "کاول، وێران".

خراندن **xırandın** *[ xırāndın ]* - ↑هەڵخراندن helxırandın.

خرپن **xırpın** - "قەڵەوی کورت، خڕەکەی چکۆڵە": دەشێ لە دوو کەرتی ↑خڕ xır و ↑پان pan پێک هاتبێ.

خرت **xırt** - "گرۆڤەر لوولەیی، خڕی لوولەیی": شێوەیەکی دیکە لە ↑گرد gırd.

خرتک **xırtık** - "جومگە": خرتکە xırtke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گردک gırdık "ماسوولە، زیپەڕ" و ↑گرتک gırtık "ئێسک، هەستی"(؟) [پیاوی گرتک ئەستوور].

خرتە1 **xırte 1** *[ xırta ]* - دەگەڵ "پرتە" دێ [خرتە و پرتە xırte û pırte]. شێوەیەکی دیکە لە ↑ورد/ هورد/ خورت wırd /hurd /xurt.

خرتە2 **xırte 2** *[ xırta ]* - "زەوی رەقەن و نەکێڵ": خزمە دەگەڵ ↑خار xar "رەق، سەخت".

خرتەک **xırtek** *[ xırtak ]* - "پێچکەعارەبە":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑گرد gırd واتا "خڕ"ەوە هەبێ.

2- لەوانەیە پێوەندی بە ↑گەردوون gerdun ەوە هەبێ کە دە بنەڕەتدا بە مانای "چەرخ"ە و پاشان مانای "جیهان"ی وەرگرتووە.

3- هەروەها جێی بەراورد کردنە دەگەڵ Rad ‏(G.)، rota ‏(L.)، roth ‏(Ir.)، ratas ‏(Lit.) "خرتەک، چەرخ"، سەر بە ریشەی **< (IE.) * roto-** "خرتەک، چەرخ" و دواتریش سەر بە ریشەی **< (IE.) * ret(h)-** "رۆیین، گەڕان، چەرخان، رەت بوون". لەم گوشە نیگایەوە وشەکە لەوانەیە ئاراتەک a-ratek یان هەراتەک he-ratek؟ بووبێ واتا پێشگری a یان he ی هاتبێتە سەر.

خرتی **xırtî** *[ xırtī ]* - "تەژەی مل ئەستوور": خزمە دەگەڵ ↑خورت xort "بەهێز".

خرچ **xırç** *[ xırč ]* - "دەنگی داکرۆشتن"؛ هەروەها خرتە xırte هەیە بە مانای "دەنگی بزووتنەوەی گیانداری بچووك" و خرچین xırcîn "بە مانای "دەنگی شکاندنی دار، دەنگی فڕینی بە کۆمەڵی کوللە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ krachen (G.)، kraken (Nl.)، crack (E.) "دەنگی شکان و دڕان". وشە ژێرمەنییەکان دە بنچینەدا لاسا کردنەوەی دەنگن. دیسان هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑کرۆشتن kıroştın "جووتن و کرتە لێ هێنانی شتی سفت".

خڕچە **xırçe** *[ xırča ]* - "کاڵەکی بچووك"؛ خڕ + چە xır + çe. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑خڕ xır "گرد". کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە.

خڕخاڵ **xrxal** *[ xırxāl ]* - "بازنە، پاوانە"؛ دەشێ بەم شێوەیە پێك هاتبێ: خرخ xrıx + پاشگری ئاڵ al. [وەکوو گۆپاڵ، تۆڕاڵ، فەساڵ...]. بنجی وشەکە خزمە دەگەڵ schräg (G.)، curvus (L.) "خوار"، krikos (Gr.)، circus (L.) "جەغز"، Ring (G.)، (h)ring (OG.) "هاڵقە"، krug (Rus.) "جەغز، قەوان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)ker- >** "سووڕان، خوار بوون، با دران". ئەم وشانە لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑خەڕەك xerek "چەرخی پەمۆ ڕستن".

خڕۆشان **xıroşan** *[ xırošān ]* - "هەڵچوون و هاوارکردن"؛ دە فارسیدا خروشیدن xorūšīdan. خزمە دەگەڵ ↑هورووژان/ ورووژان hurujan /wırujan. مانای وشەکە دە فارسیدا تۆزێك گۆڕاوە، واتا دە زمانی کوردمادیدا مانا ڕەسەنەکە باشتر پارێزراوە.

خریان **xıryan** *[ xıryān ]* - "لە ڕێ دەرچوون، بە هەڵە چوون"؛ جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- ↑کل kıl 1 "خوار"، کل بوون واتا خوار بوون. [لەباری ئالوگۆڕی فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "هەڵخلاندن" و "هەڵخڕاندن"]

2- ↑خوار xuwar.

خریکین **xırîkîn** *[ xırīkīn ]* - "گریانی بە دەنگ"؛ خزمە دەگەڵ ↑گریان gıryan.

خرینگە **xırînge** *[ xırīnga ]* - "دەنگی وێککەوتنی خشڵ"؛ شێوەیەکی دیکە لە ↑جرینگە cırînge و ↑زرینگە zırînge. خزمە دەگەڵ ring (E.)، hringan (OE.)، hringja (ON.) "زەنگ لێدان، زرینگانەوە". ریشە؟

خرێنە **xırene** *[ xırena ]* - "خلێنە، کاکیلە"؛ خلێنە xılêne ش دەگوترێ. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ناوی ئەم ددانانە دە زمانی فارسی و هەروەها زمانە ئەورووپییەکاندا پێوەستە بە چەمکی "هاڕین"ەوە (خرێنە، هاڕێنە) [ددانی "هاڕێنە" وەك "دندان اسیاب" دە فارسیدا، کە وەك ئاش دەهاڕێ]. وشەی "خرێنە" وشەیەکی زۆر کۆن و کۆنترە لە "هاڕین". بڕوانە ئەو وشانەی لەژێر "هاڕین"دا ئاماژەیان پێ کراوە، بۆ وێنە grind (E.) "هاڕین".

خزار **xızar** *[ xızār ]* - "شەقەمشار، هەڕەی دوو کەسی"؛ بنەوشەی خز -xız دەشێ خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەك وشەی دیکە کە ئاماژە دەکەنە چەمکی "بڕین، لەت و کوت کردن" وەك ↑قاش qaş، ↑کووز kuz، ↑کەت ket، ↑کوت kut، ↑قەتاندن qetandın، ↑گاز gaz، ↑گەستن gestın و هتد.

خزڵك **xızılk** - "زەنگەتە ترێ"؛ خز + ڵك xız + ılk. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر وشەی ↑هێشوو hêşû[دە فارسیدا خوشە xūše (P.)].

خزم **xızım** - "کەس و کار"؛ دە فارسیدا خویش xīš (P.). دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑خات xat [خاتوون: دە بنچینەدا بە مانای "هاواڵ، جووت، یەکانگیر"].

خزن **xızın** - "مەزار و مەرقەدی پیاوچاکان"؛ قسن qısın یش دەگوترێ. لە صحن seħn (Arb.) وەرگیراوە و گۆڕانی تێدا کراوە. بۆ ریشەی وشە عەرەبییەکە بڕوانە ↑شانۆ şano.

**خزین xızîn** [ *xızīn* ] - "خوشین، خلیسکان": ده فارسیدا خزیدن xazīdan (P.). خزمه دەگەڵ ↑خشان xışanو ↑خوشین xuşîn. هەروەها خزاکَ xızag هەیه به مانای "عارەبەیەک کە بەسەر بەفردا رای دەکێشن".

**خژین xıjîn** [ *xıžīn* ] - "کیشه و هەرا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گژ gıj [بە گژدا چوون].

**خستن xıstın** - "کەواندن، بەر دانەوە": خزمه ده زمانی کوردمادیدا دەگەڵ ↑هێشتن hêştın "لێگەران، رێگه دان، بەردان" [بهێڵه با بڕوا، بەری ده با بڕوا].

1- له لایەکی دیکەوه زۆر وێ دەچێ کردارەکه پێک هاتبێ له پێشگری هه he + شتن ştın، چونکوو ئەم کرداره به شێوەی ↑ئاستن astın یش دەگوترێ [پێشگری ئا a + ستن stın]. ئەگەر ئەمه راست بێ، کەرتی دووەم دەتوانێ پێوەندی بەو وشانەوه پەیدا بکا که لەژێر ↑هەت¹ het "کن، جەم"دا باس کراون و سەر بە ریشەیەکن به مانای "هاویشتن، فرێ دان، وەشاندن".

2- له لایەکی دیکەوه جێی هەڵسەنگاندنه دەگەڵ cast (E.) "فرێ دان" و kasta (ON.) هەر بەو مانایه. ریشەی وشه ژێرمەنییەکه باس نەکراوه.

[تیبینی: ده زمای ئەفغانیدا "خستن" به مانای "خەوتن" بەکار دێ، هەروەها به گیلەکی دەگوترێ "خسم" واتا "دەخەوم". ئەم وشانه خزمن دەگەڵ "خستن"ی کوردمادی. ئەم خزمایەتییه لەوەڕا بەدیار دەکەوێ که دەتیوان دوو چەمکی "خەوتن" و "بەر بوونەوه و شل و شۆر بوونەوه"دا پێوەندی هەیه. ده زمانی ئەڵمانیدا schlaff دەبێته "شل و شۆر، داکەوتوو، داهێزراو" و schlafen دەبێته "خەوتن" و ئەم دوو وشەیه له یەک ریشەوه دێن به مانای "شل و شۆر و داهێزراو بوون". ئەگەر ده زمانی کوردمادیدا سەیری پێوەندی و خزمایەتی وشەکانی "خستن"، "هێشتن"، "داهێشتن" و "داهێزران" بکەین، ئەوسا بۆمان روون دەبێتەوه که وشەی "خستن" ده زمانی کوردمادی و ئینگلیزیدا مانای "کەواندن، بەر دانەوە"ی پەیدا کرووه و ده زمانی ئەفغانی و گیلەکیدا مانای "خەوتن، پاڵ کەوتن"].

**خسک xısk** - "تۆوی پیواز": هەروەها خسکەپیواز xıskepîwaz بەم جۆره مانا کراوەتەوە: "پیوازی زۆر ورد که لەباتی تۆو دەیچێنن". خزمه دەگەڵ ↑گچکه gıçke.

**خشان xışan** [ *xıšān* ] - دەگەڵ پێشگرەکانی "لێ، رێ، لێک" دێ، بۆ وێنه لێکخشاندن واتا "لەیەک ساوینی دوو شت ". جێی هەڵسەنگاندنه دەگەڵ wischen (G.) "سرینەوه، خشاندن، رێخشاندن"، هەروەها به مانای "بزووتنی خێرا". ئەم مانایەی دوایی زۆر نیزیکه له مانای وشەکانی ↑خوشین xuşîn و ↑خزین xızîn. چونکه ئەم وشانه هەرلەو کاتەدا که لێکخشانی دوو شت نیشان دەدەن، بزووتنەوەیەکی خێراش بەسەر رووبەرێکدا دەردەخەن. گشت ئەم وشانه دەچنەوه سەرریشەیەک. ریشەی وشەئاڵمانییەکه دەبردرێتەوه سەر **(IE.) *weis- , *ueis- >** "سووڕان، با دان". ئەم ریشەیه خۆی له ریشەی کۆنتری **(IE.) *uei-** "چەمان، سووڕان، با دان" سەرچاوەی گرتووه. بەم پێیه وشەکانی سەرەوه له پلەیەکی دوورتردا دەبنه خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکه وەک *وێزنین* (هەڵوێزنین)، *وەکَ* "چاخ، هەڕەت"، *ویسک* "لاواز" و هتد.

[تیبینی: سەبارەت گۆڕانی فۆتیمەکانی w و x هەڵی سەنگینه بۆ وێنه دەگەڵ "وشک"، "ورچ" و ده زمانی فارسیدا "خشک" و "خرس"].

**خشپیلانه xışpîlane** [ *xıšpīlāna* ] - "خونجیلانه، چکۆڵەی جوانکیله": ↑قشپیلانه qışpîlane، خشپیله xışpîle و خشتیله xıştîle ش دەگوترێن. هەروەها خشپن xışpın هەیه به مانای "خرپن". بنەوشەی خش -xış دەشێ پێوەندی هەیه به ↑گچکه gıçkeوه. فۆتیمەکانی p و t له وشەکانی "خشپیلانه" و "خشتیلانه"دا وێ دەچێ زێدەی فۆتیتیکی بن و خزابنه ناو وشەکانەوه.

**خشت xışt** [ *xıšt* ] - "1- ئاجور، کارپووچ 2- راست بڕدراو":

1- له لایەکەوە مانای بنەڕەتی وشەکە دەتوانێ "ڕاست بڕدراو" بێ و وشەکە پێوەندی بە چەمکی "بڕین"ەوە هەبێ [خشت بڕین؟]. مەبەست لەم وتەیە دەشێ بڕینی تۆپەڵەقوڕێک بێ، بە شێوەیەک کە قەراخەکانی ڕاست دەربێن. لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ خاش xaş [↑قاش qaş].

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە مەبەست "ڕەق بوون"ی قوڕەکە بێ و وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑*خەست xest* "توند"، ↑هەستی hestî "بەرد، ئێستک، ئێسک" و ↑کەستەک kestek "سندەگڵ، قورسە، دە قالب کراوی توندەوە بووک".

**خشک xışık** *[ xıšık ]* - "زێلوو، هەزارپێ": خشکێ xışıg و خشۆک xıšok یش دەگوترێن. دەچێتەوە سەر وشەکانی ↑ خشان xışan و ↑خوشین xuşîn.

**خشکۆک xışkok** *[ xıškok ]* - "خۆشیک، جوان": دە بنەڕەتدا خۆش + کۆک xoş + kok.

**خشڵ xışıl** *[ xıšıl ]* - "زێڕ و زێو بۆ ڕازاندنەوە": خزمە دەگەڵ ↑خێز xez "زێر و زێو" و دواتر هێندێک وشەی وەک ↑خەزەڵ xezel "گەڵا"، ↑قاشڵ qaşıl "توێکڵ" و ↑قاشکێ qaşıg "پەترۆکە" [توێکڵی سەر برین" و ↑قاشە qaşe "جۆرێک ماسی" [ئاماژە بە پوولەکەی واتا "توێکڵ"ی ماسییەکە] و هتد. ئێستا بزانین پێوەندی ماناکانی ئەم وشانە چۆناوچۆنە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە دەتوانین سەرنجی دەستەوشەیەکی دیکە بدەین کە لەوانیشدا هەر ئەم پێوەندی بەرچاو دەکەوێ. ئەم وشانە بریتین لە *پۆلکە* "توێکڵی چەڵتووک" و هەروەها "پینەی دەست"، *پوولەکە* "پێستی ماسی" و "پەترۆکە، توێکڵی سەر برین". وشەی "پووڵ" دە بنەڕەتدا دەبێ بە "سککە" گوترابێ و ئەمەش لەبەر وێکچوونی سککە بە پوولەکەی ماسی. چونکوو هەردووکی ئەم شتانە بریتین لە شتێکی بریقەداری تەنک و خڕ و پانکەڵە. هەر هەمان پێوەندیش سەبارەت بە "خشڵ" لە ئارادایە، واتا دە بنەڕەتدا وشەیەکی دیکەش بۆ پوولەکەماسی بەکار هاتووە کە بریتی بووە لە "قاش، قاشڵ، خشڵ" و دواتر لەمەوە وشەکە مانای "سککە"ی زێڕ و زێوی پەیدا کردووە. وشەی قزڵ qızıl و ناوی ماسی قزڵ ئالا qızılala ریشەی کوردمادی هەیە و لەم وشانەی سەرەوە وەرگیراون.

**خک xık** - "دارکاری کردنی زۆر": خکێ xıg یش دەگوترێ. جێی بەراوردکردنە دەگەڵ Hacke (G.) "ئامرازێکی کشتوکاڵە بۆ خۆش کردنی زەوی و نەرم و ورد کردنی هەردی ڕەق"، هەروەها کرداری hacken (G.)، hack (E.)، haccon (OG.) "ورد کردن، لەت وکوت کردن، قیمە کردن". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراونەوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑خاش[1] xaş [ورد و خاش].

**خلانکە xılanke** *[ xılānka ]* - "بازنەی داری بێشکە": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑قەڵان qelan "چەمانەوە لە کایەی حەمزەلدا"، ↑قەڵانکێ qelang "ئاسن و داری سەر خوار بۆ میوە چنین و کاری دیکە" و دواجار دەگەڵ ↑*کل kıl* "خوار، داهاتوو".

**خڵتە xılte** *[ xılta ]* - "زبڵ و زاڵی ناو تراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Salz (G.)، salt (E.)، salt (Sw.)، halz (Gr.)، sal (L.)، sol (Rus.) "خوێ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *sal- (IE.)** "بۆرێکی پیس، ئاماڵ ڕەش، لێڵ". لەبەر ئەوەی "خوێ" لە سەردەمە کۆنەکاندا وەک ئەمڕۆ سپی و پاک و پاڵاوتە نەبووە و بۆر و پیس بووە، بە جۆرە ناوزەد کراوە. دە هێندێک لە زمانە ئەورووپییەکاندا وشە بە مانای "بۆر، پیس، ڕەش" دەچنەوە سەر ئەم ریشەی سەرەوە، وەک salu (OE.) "ڕەش، تەڵخ، تار"، solr (OIs.) "پیس"، solovyj (Rus.) "بۆری ئاماڵ زەرد".

**خل(لۆر) xıl(lor)** - شێوەیەکی دیکە لە ↑گللۆر gıl(l)or "جاڵە، تل خواردوو".

**خل(ل)ە xıl(l)e** *[ xıl(l)a ]* - "دەنگی ورکەشت لەناو دەفرێکی تەکاندراو": خلە xıle ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ klingen (G.)، klingan (OG.)، klinken (Nl.)، clink (E.) "دەنگێ و سەدا لێ هەستان" **< *gal- (IE.)** "دەنگێ و سەدا لێ هەستان". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑گلێیی gıleyî و چەند وشەیەکی دیکە.

خلنگین **xılıngîn** [ *xılıngīn* ] - "لەنجە و لار کردن": شێوەیەکی دیکە لە ↑لەنگین *lengîn* و ↑لەنجە lance.

خلۆخە **xıloxe** [ *xıloxa* ] - "واڵا، پووک، ناوبەتاڵ": خزمە دەگەڵ ↑هەڵۆڵ helol، ↑کلۆر kılor و ژمارەیەک وشەی دیکە.

خلۆک **xılok** - "گلۆڵەبەن": شێوەیەکی دیکە لە ↑گلۆڵە gılole.

خلی **xılî** [ *xılī* ] - "سست و لەش داهێزراو": خزمە دەگەڵ ↑شل[1] şıl.

خلیچک **xılîçk** [ *xılīčk* ] - دەگەڵ "خاو" دێ و دەگوترێ خاو و خلیچک xaw û xılîçk "شل و تەڕ و لیچق". خزمە دەگەڵ ↑خلیسک xılîsk. دیارە دەتیوان دوو چەمکی "لیچق" و "خلیسک"دا پێوەندی هەیە، چونکوو شتی لیچق هاوکات "خلیسک"یشە.

خلیسکان **xılîskan** [ *xılīskān* ] - "ڕەت بردن لە سەر هەردی لووس": دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش: ↑خللۆر xıllor، ↑خلیان xılyan، ↑گلان gılan، ↑گللۆرgıllor، ↑خەڵتان xeltan، ↑خەلان xelan "ترازانی ئێسکی لەش". ئەم وشانە مانای "ڕەت بردن، خلیسکان، جاڵە بوون" دەگرنە خۆ و خزمن دەگڵ غلتیدن ġaltīdan (P.)، gleiten (G.)، glijden (Nl.)، glide (E.) هەر بەو مانایەی سەرەوە. خەڵتان xeltan ی کوردمادی دە فارسیدا دەبێتە غلتان ġaltān (P.) بە مانای "لە حاڵی تل خواردن و خللۆر بوونەوە دا". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ĝhel- <*** "بریقانەوە". بەم پێیە لە مانای بنەڕەتی "بریقانەوە" مانای "ساف و لووس" و دواتریش مانای "هەڵخلیسکان" سەری هەڵداوە.

[تێبینی: "خلیسکان" شێوەیەکی جەختکراو یان توند و تیژ کراوە لە "گلان". ئەم گۆڕانکارییە دە وشەی ئەڵمانی gleiten و glitschen دا بەدی دەکرێ کە شێوە دووەمەکە شێوەی جەختکراوە (بە ئەڵمانی پێی دەگوترێ Intensivbildung). ئەم شێوە جەخت کردنە دە ژمارەیەک کرداری دیکەی کوردمادیشدا دەبینرێ کە بە یارمەتی ناوگری ک k، ق q، ژ j، ز z یان س s دروست دەبێ، وەک ئالۆزکان، بزرکان، پەشۆکان، هێندێک جار ناوگرەکە لە دوو دانە لەو فۆتیمانە پێک دێ، وەک لە خلیسکان xılîskan دا کە هەم s و هەم k پێکەوە بوونە ناوگر].

خلێزە **xılêze** [ *xıleza* ] - "شیرەی گیایەکە بە دەستەوە دەنووسێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گڵ *gıl* "خۆڵی تەڕ" و Klei (G.)، clay (E.) "گڵ، قوڕ"، glia (Gr.) "چەسپ، چرێش"، glej (Rus.) "قوڕ، لم، لیتە".

خلێف **xılêf 1** [ *xılef* ] - "پلوورە،ماڵی مێشەنگوین": ↑خەلێف xelef ش دەگوترێ.

خلێف **xılêf 2** [ *xılef* ] - "تۆێخێک کە لە پێستی گیاندار لێ دەبێتەوە": بە داخەوە دە وشەنامەدا روون نەکراوەتەوە کە مەبەست چ گیاندارێک و چۆن تۆێخێکە. دە زمانی ئەڵمانیدا کاتێک پەلەوەر یان زیندەوەرێک هێلکەکەی کون دەکا و دەخوشێتە دەرەوە، کرداری schlüpfen (G.) بەکار دێنن بە مانای "خزین یان خوشین بە ناو کوتێکدا"، دەچێتەوە سەر slupfen (OG.) و خزمە دەگەڵ sliofan (OG.)، sliupen (Nl.)، slūpan (OE.) "خوشینی سەگ بە ناو کونی ڕێویدا بۆ گرتنی تەماڵ". بەم پێیە ئەگەر "خلێف" تۆێخێک بێ کە زیندەوەرێک بە ناویدا بخوشێ و لێی بێتە دەر، ئەوسا پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا.

خلێنە **xılene** [ *xılena* ] - "ددانی پشتەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑خرێنە xırene.

خم **xım** - ↑خوم xum.

خنان(ەوە) **xınan(ewe)** [ *xınānawa* ] - "پێکەنینی نەرم و بە ئەسپایی": خزمە دەگەڵ ↑کەنین kenîn [↑پێکەنین pekenîn : پێ + کەنین] و هەر وەها دەگەڵ ↑شنینەوە şınînewe "پێکەنین و تریقەی منداڵی ساوا".

**خنخنك xınxınk** [ *xınxınk* ] - "کونەلووت": ئەم وشەیە و هەروەها خن xın "دەنگی هەناسە" و ↑ گن gın"لووتگیراو لە قسەکردندا" خزمن دەگەڵ ژمارەیەك وشە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا، وەك schnarchen (G.) و snorken (Nl.) "پرخاندن"، schnauben (G.)، snuivan (Nl.) "پڕماندن"، schnaufen (G.)، snuven (Nl.) "بە خنەخن هەناسە کێشان"، Schnauze (G.)، snout (E.) "لمبۆز، لووتی ئاژەڵ" وهتد. وا لێك دراوەتەوە کە ریشەی ئەم وشانە لاسا کردنەوەی دەنگە.

**خنکان xınkan** [ *xınkān* ] - "پشوو بڕان، خەفە بوون": خزمە دەگەڵ eng (G.)، enge (OE.)، ang (Norw.) "تەنگ"، سەر بە ریشەی ***(IE.) * anĝh- >*** " تەنگ، تەنگاندن، ڕێك گوشین". دە زمانە جیاوازەکاندا هێندێك وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەك Angst (G.) "ترس"، angere (L.) "توند بوون، تەنگ بوون"، ágchein (Gr.) "خنکاندن"، -ámhas (OIn.) "ترس، تەنگەتاوی".

**خنگلین xınglîn** [ *xınglīn* ] - "بە شەلەشەل ڕۆیشتن، بەم لا و ئەو لادا کەوتن": خزمە دەگەڵ hinken (G.)، hinkan (OG.)، hinken (Nl.)، hincian (OE.)، hinka (Ois.)، skinka (Sw.) "شەلین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)keng- >*** "خوار و خێچ، گیر". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چەنگ çeng و کۆمەڵێك وشەی دیکە کە لە ژێر ↑زەنگاڵ zengal دا شی کراونەوە.

**خنووس xınûs** [ *xınūs* ] - "1- گوشاد 2- کووپەی گەورەی زارزل": پێك هاتووە لە خن + ووس us + xın. بنجی وشەکە دەچێتەوە سەر ↑کەندن kendın [هەڵکەندن] و ئاماژە بە قووڵکراوی و کۆڵدراوی دەکا. وشەی ↑کەندوو kendu "دەفری گڵینی زل"ش هەر ئەم چەمکە لەخۆ دەگرێ و پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. کەرتی دووەمی وشەکە پاشگرە. لەم بارەوە بڕوانە پاشگری ↑ئۆز oz-.

**خواجە1 xuwace** [ *xuwāja* ] - "نازناوە بۆ مەلا و مامۆستایان": خۆجە xoce ش دەگوترێ. خواجە xāje (P.) "بەڕێز، مامۆستا، ئاغا". لەوانەیە پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑خواستن xuwastın [خازتن xaztın] "ویستن، حەز کردن، داوا کردن". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "حەزلێکراو، خۆشەویست". ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، لەباری ماناوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ *گراوی* "دەسگیران، حەز" و "گرامی" دە زمانی فارسیدا بە مانای "ئازیز، خۆشەویست".

2- ↑خاس xas "باش، چاك". ئەم وشەیە هەروەها مانای "تایبەتی" و "ئەسڵ"یشی وەرگرتووە، وەك خاسەکەو.

**خواجە2 xuwace** [ *xuwāja* ] - "مرۆڤی خەسێنراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خەساندن xesandın.

**خوار1 xuwar** [ *xuwār* ] - "نەڕاست، چەماوە، بادراو": خزمە دەگەڵ xvāhr و xvihl (Pl.) "خوار". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ quer (G.) و twerh (MG.) "خوار". وشەی ↑کووڕ kur یش لەوانەیە گۆڕدراوی "خوار" بێ. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە باس نەکراوە.

**خوار2 xuwar** [ *xuwār* ] - "بەرانبەری سەر، ژێر": دە زمانی فارسیدا خوار xar (P.) مانای "سەرشۆڕ، ئەتککراو" دەگەیەنێ و خزمە دەگەڵ وشە کوردییەکە. مانای وشە فارسییە دە بنەڕەتدا بریتییە لە "نزم" بوون یان نزم کردنی کەسایەتی کەسێك. وشەی "ئەتك"یش هەر ئەم مانایە دەگەیەنێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ gawr (Pl.) "1- دۆڵ 2- کون و کەلێن، قووڵکە 3 - دەشت " وهەروەها ↑کوور kur دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا و ↑قووڵ qul دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا. بەم جۆرە وشەی "خوار" سەرەتا ئاماژەی بە نزمایی و قوڵایی کردووە. وشەی ↑گەوەڕ gewer "کەلێنەشاخ" و↑گۆر gor بە مانای "1- قەبر [قووڵکە] 2- دەشت [نزمان]" و کویر kawīr (P.) "سەحرا" [دەشت، نزمان] هەرلەم پێوەندییەدا جێی لێکدانەوەن. وەك دەردەکەوێ لە مانای "قوول، قووڵایی"یەوە مانای "نزم، نزمان" و دواتریش مانای "ژێر، لای بنەوە" پەیدا بووە. هەر ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەشێ دەتیوان وشەکانی "تەشك" [تەشك و داوێن]، "دەشت" و "ئەتك"یشدا لە ئارادا بن.

[تێبینی: ئەم مانایە لە زمانی فارسیش لە وشەی الاکلنگ allākolang (P.) "هەڵڵادۆشە"دا دەبینرێ. کەرتی allā لەگەڵ "هەڵڵا" خزمە و ئاماژە بە "لای سەرەوە، بڵیندی" دەکا. کەرتی کلنگ kolang (بنجی کول kol + ئەنگ eng) پێوەندی هەیە بە قووڵ qul یان "خوار"ی کوردمادییەوە. پاشگری ئەنگ eng- لە وشە فارسییەکەدا مانای "ئامراز" بە وشەکە دەبەخشێ، وەک "قوڵینگ" لە زمانی کوردمادیدا].

**خواردن xuwardın** [ *xuwārdın* ] - "جاوین و قووت دان": خوردن xordan (P.)، govarītān (Pl.).دە فارسیدا وشەی گوارا govārā (P.) "خۆش بۆ خواردن" و دە پەهلەویدا goyot (Pl.) بە مانای "لەوەڕگە" هەیە. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ورگ wırg [↑هوور *hur*]".

**خواستن xuwastın** [ *xuwāstın* ] - "ویستن": خازتن xaztın یش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا خواستن xwāstan (P.) دەنووسرێ، بەڵام خاستن xāstan دەگوترێ. دیارە شێوە نووسراوەکە شێوەی کۆنتری وشەکە نیشان دەدا. ئەم شێوەیە دواتر سواوەتەوە، بەڵام شێوە کۆنەکە دە نووسیندا پارێزراوە، هەروەک  چۆن سەدان وشەی ئینگلیزی سەردەمی ئەمڕۆ بێژە کردنیان جیاوازە لە شێوەنووسینیان کە شێوەی کۆنتری وشەکان نیشان دەدەن. دە زمانی پەهلەویدا xvāstan (Pl.) گوتراوە. ئەم وشەیە دە زمانی کوردیدا بەشێوەی ↑هەویستن hewîstın یش دەردەکەوێ کە ئەویش شێوەیەکی دیکەی وشە کۆنەکەیە. هەر لەم وشانەوە وشەی ↑هەوەس hewes دروست بووە کە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە. تێکڕای ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ویستن wîstın. فۆتیمی x و دواتر h دەبێ وەک زێدەیەکی فۆتیتیکی بەوشەکەوە لکینرابێ.

**خواستنەوە xuwastın(ewe)** [ *xuwāstın(ewe)* ] - "وەرگرتن": بۆ وێنە دەگوترێ فڵانە زمان ئەو وشەیەی لە فیسارە زمان خواستۆتەوە، یان دەگوترێ "وشەی خوازراو" واتا وەرگیراو. لێرەدا وشەکە چ پێوەندی بە *خواستن* "ویستن"ەوە نییە، بەڵکوو شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قۆستنەوە qostınewe بە مانای "گرتن، وەرگرتن".

**خوان xuwan** [ *xuwān* ] - "1- سفرەی ئامادەکراو 2- تەبەق، سینی": دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەی دیکەش هەن کە لەم وشەیە وەرگیراون، وەک خوانچە xuwançe [خوان + چە] بە مانای "تەبەق یان سینی بچووک"، ↑خوانک xuwank "دەرخۆنە"، خوانە xuwane "پنە، تەختەی ئەنگوتک لەسەر پان کردنەوە"، خۆنە xone [دەرخۆنە derxone واتا سەرپۆشی دیگ و دەفر، تەختەی سەرنانەوە]. دە زمانی فارسیدا خوان xan (P.) بە مانای "مێزی لەسەرخواردن"ە [دە بنەڕەتدا: تەختە یان سینی لەسەر خواردن]. بۆ زانیاری زێدەتر بڕوانە ↑دەرخۆنە derxone "سەرپۆشی دەفر، سەرپۆشی تەنوور".

**خوانچە xuwançe** [ *xuwānča* ] - "سینی یان تەبەقی بچووک": ↑خوان + چە xuwan + çe.

**خوت xut** - دەگەڵ "خۆرایی" دێ [خوت و خۆڕایی]، هەروەها دەگەڵ "خافڵ" دێ [خوت و خافڵ]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گوت gut [گوت و گۆمبەز] و دواجار ↑قوت qut [قوت بوونەوە واتا دەرپەڕین، سەروەدەرنانی خێرا].

**خوترە(ک) xutre(k)** [ *xutra(k)* ] - "کوتکی لەدار": دەچێتەوە سەر ↑کوتان kutan.

**خوچۆک xuçok** [ *xučok* ] - "چکۆڵە": شێوەیەکی دیکە لە ↑گچکە gıçke [کوچک kūčak (P.)].

**خود xud** - "خۆ": دە فارسیدا خۆد xod (P.)، xvat (Pl. ). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ auto (Gr.) "خود".

**خودا xuda** [ *xudā* ] - دە فارسیدا خدا xodā (P.). خزمە دەگەڵ Gott (G.)، god (E.)، gud (Sw.). ریشەی ژێرمەنی وشە ژێرمەنییەکان guda- بووە کە تەواو لە وشە کوردمادییەکە دەچێ. ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشانە بەپێی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *ghau-*** "بانگ کردن، قاو کردن" [مەبەست دووعا کردن بووە]. بە بۆچوونێکی دیکە ریشەکە < ***(IE.) *gheu-*** بووە بە مانای

"خوێن بۆ ڕژێنراو، قوربانی بۆ کراو". ئەگەر لە ڕیشەی یەکەمەوە هاتبێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قاو qaw "بانگ".

خودان **xudan** [ *xudān* ] - "خاوەن": شێوەیەکی دیکە لە ↑خاوەن xawen.

خوڕ **xur** - "1- تەوژم، هێز، زەخت 2- بە تەوژم، توند، بەهێز": [چەمێکی خوڕ، باراتیکی بە خوڕ]. ↑خۆڵ[3] xol یش شێوەیکی دیکەیە لەم وشەیە [خەست و خۆڵ]. هەروەها ↑خوڕێن xuren دەچێتەوە سەر ئەم وشەیە [ئاوی ئەم چەمە خوڕێنە]. شێوەیەکی دیکە لە ↑گوڕ gur "هێز، تین و توان" و دواجار پێوەندی بە ↑خار xar "سەخت"ەوە پەیدا دەکەن.

خوراندن **xurandın** [ *xurāndın* ] - "کڕاندن": دە زمانی فارسیدا خاراندن xārāndan (P.). خزمە دەگەڵ ↑کڕاندن kırandın و چەند وشەیەکی دیکە. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ kratzen (G.)، krassen (Nl.)، kratta (Sw.) "خوراندن، کڕاندن"، سەر بە ڕیشەی ***gradi-** > **(IE.)** "کڕاندن".

خورپان **xurpan** [ *xurpān* ] - "کەوتن": دەگەڵ پێشگری دا- da- دێ، داخورپان daxurpan واتا داکەوتن [دڵم داخورپا]. وشەکە بە مانای گشتی "کەوتن" بە کار نایە و تەنیا لە پێوەندی دەگەڵ "داکەوتنی دڵ"دا بەکار دێ. دەچێتەوە سەر ↑خورپە xurpe.

خورپە **xurpe** [ *xurpa* ] - "ڕاتڵەکانی دڵ، تەپەی دڵ" [خورپە لە دڵمەوە هات]. هەروەها دەگوترێ دڵەخورپە dılexurpe "نیگەرانی زۆر" [دەبنەڕەتدا: ڕاتڵەکان و تەپەتەپی دڵ لەبەر نیگەرانی زۆر]. ↑گورپە1 gurpe ش دەگوترێ [گورپەگورپ]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑غەڵبە *ġelbe* و ↑قوڵپ qulp "دەنگی توندی گریان"، ↑کڵپە kılpe "دەنگی بڵێسە"، ↑شڵپە şılpe "دەنگی وێک کەوتنی پێلی ئاو، دەنگی کەوتنە ناو ئاو" و هتد.

خورت **xurt** [ *xurt* ] - "بەهێز": خزمە دەگەڵ xruždā (Av.)، xružd (Pl.) "بەهێز، پتەو"، گرد gord (P.) "پاڵەوان". خزمە دەگەڵ kratos (Gr.) "هێز، دەسەڵات" و kratein (Gr.) "زاڵ بوون، دەسەڵاتدار بوون"، hart (G.) و hard (E.) "سەخت، پتەو". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*خار xar* "سەخت" و خاران xaran "سەخت بوون" و هەروەها ↑کورد kurd.

خورتە **xurte** [ *xurta* ] - دەگەڵ "سرتە" دێ [سرتە و خورتە sırte û xurte یان سرت و خورت]. خزمە دەگەڵ یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ورتە wırte.

خوڕڕەم **xurrem** [ *xurram* ] - "توندی و تەوژمی با و باران": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خوڕ xur، ↑خوڕین xuren و ↑*خورت xurt*.

[تێبینی: خرم xorram (P.) دە زمانی فارسیدا زۆرجار دەگەڵ "خوش" دێ - xoš o xorram (P.)- و مانایەکی وەک "چاک، ساخ، سەرزیندوو، بەکەیف، بەپێز، بووژاوە" دەگەیەنێ. مانای بنەڕەتی وشەکە بەڵام دەبێ "بەهێز، پتەو" بێ و لەوێوە ماناکانی دیکە سەریان هەڵدابێ. ئەگەر سەرنجی وشەکانی "چاک" یان "ساخ" بدەین، دەبینین کە مانای بنەڕەتی ئەم وشانە دەبێتە "پتەو، بەهێز". هەروەها ئەگەر سەرنجی وشەی "پێز" و "بووژانەوە" بدەین، دەبینین کە خزمن دەگەڵ وشەی "هێز"].

خورم **xurım** - "ئاڵقەیەکی دارینە لە ڕەشماڵ بەستن و بارکردندا بەکار دێ": خزمە دەگەڵ krum (G.)، chrump (OG.)، crumb (OE.)، krom (Nl.) "خوار، چەماو"، krimphan (OG.) "خوار بوون، چەمین"، Kringel (G.) "جەغز، شێوەی ئاڵقەیی"، kringr (OIs.) "جوغز، ئاڵقە"، krinc (MG.) "جەغز، ئاڵقە، دەڤەر، دەوروبەر" [گەڕەک؟]، Kranz (G.) "تاجەگوڵینە" [ئاڵقەی لەگوڵ] و ژمارەیەک وشەی دیکە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی ***ger-** > **(IE.)** "سووڕان، چەمان، با دران، خوار بوون". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەک وشە لەم ڕیشەوە هاتوون، بۆ وێنە ↑قرمان qırman [تێک قرمان واتا تێکەوەچوون، خواربوونەوە]، ↑قرمچین qırımçîn "چرچ و لۆچ بوون"، ↑کورمان kurman [هەڵکورمان]،

↑گیڕ ger، ↑قرۆت qırot "گۆج"، ↑قەڵەو qelew و چەندین وشەی دیکە. لەوانەیە ↑خۆڕم xorım "شەغرەگیا، بارەگیا"ش پێوەندی بەم وشەوە هەبێ و مەبەست گرد کردن و پێچانەوەی بارەگیا بووبێ.

**خوری xurî** [ *xurī* ] - "پەشم، مووی ئاژەڵ": هری hırî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Haar (G.)، hair (E.)، har (Sw.)، haar (Nl.) "موو". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *hēra-* * "موو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ šerst (Rus.) "خوری" سەر بە ریشەی **< (IE.) *ker(s)-** "زوور، سیخ بوون". خزمیشە دەگەڵ ↑کورک kurk، کرک kork (P.) "کورک، کوڵکە".

**خوریت xurît** [ *xurīt* ] - "قەڵسی و تووڕەیی": خوورژی xurjî ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑هورووژان hurujan.

**خوڕین xuren** [ *xuren* ] - "بەتەوژم، بەهێز": [بۆ ڕەوتی چۆم و ئاوان بەکاردێ]. بنەوشەی خوڕ -xur دە وشەی ↑خوڕڕەم xurrem یشدا دەبیندرێ کە بۆ بارانی توند بەکاردێ. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑خورت xurt "هێز، دەسەڵات، توانایی".

**خوزێن xuzen** [ *xuzen* ] - "کایەی تۆپ قواستنەوە": خزمە دەگەڵ ↑قۆستنەوە qostın(ewe).

**خوست1 xust 1** - دەگەڵ "پێ" دێ و دەگوترێ ↑پێخوست pexust واتا "پێشێل". دە پەهلەویدا خڤەستەن xvastan هەیە بەمانای "پێخوست کردن، شێلان" و خڤەست xvast "جادە و ڕێگای کوتراو". دە شێوەزاری کوردمادی سەرووودا وشەکە بە شێوەی گڤاشتن gıvaştın ە و دە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا بووەتە ↑گوشین guşîn یان کوشین kuşîn.

**خوست2 xust 2** - دەگەڵ "هەست" دێ [هەست و خوست hest u xust ]. وشەی هەست hest دەچێتەوە سەر < *aisthánesthai* *(Gr.)* "هەست کردن، هەست پێکردن". دە زمانە ژێرمەنییەکان و هەروەها زمانی کوردمادیشدا وشەیەک هەیە کە ئەویش جۆرێک لە "هەست کردن" نیشان دەدا و بریتییە لە ↑چێشتن çeştın "مەزە کردن"، چشیدن češtīdan (P.)، kosten (G.)، kostian (OE.)، kosta (OIs.)، gustare (L.) "چێشتن"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *geus-** "چێشتن، تاقی کردنەوە، مەزە کردن". کەوابوو "خوست" یەکێک لە شێوەکانی هەست کردنە و کاتێکیش دەگوترێ "هەست و خوست" ئەوا مانایەکی گشتی وەردەگرێ.

[تێبینی: لەم بارەوە دەتوانین دەگەڵ fühlen (G.) و feel (E.) "هەست کردن" دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بەراوردی بکەین. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ "پەل" و "پیل"ی کوردمادی بە مانای "دەست". مەبەست لە وشە ژێرمەنییەکان دەبنەڕەتدا دەست لێدان، دەست لێخشان بووە، واتا ئاماژە بە "حیسی لامیسە" کراوە، بەڵام دواتر وشەکە مانایەکی گشتی پەیدا کردووە و هەموو جۆرە هەستەکانی گرتۆتەوە].

**خوشک xuşık** [ *xušık* ] - "کچی باوک و دایک": خووچ xuç و خوە xoh ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ خواهر xaher (P.)، xvah و xvaher (Pl.)، xvanghar (Av.)، svásar (OIn.)، soror (L.)، sestra (Rus.)، schwester (G.)، swester (OG.)، swistra (Got.)، sister (E.)، syster (Sw.) و هیتر، گشتیان بە مانای "خوشک"، سەر بە ریشەی **< (IE.) *suesor-** "خوشک". دە زمانی کوردمادیدا شێوەیەکی دیکەی وشەکەش ماوەتەوە کە خوار xvar ە [خوارزا xwarza واتا زارۆکی خوشک]. دە وشەی "خوشک"دا فۆتیمی کۆتایی ریشەکە، واتا r پەڕیوە و پاشگری ık- چووەتە جێگای. ئەم پاشگرە دە وشەکانی "دایک"، "باوک"، "نەنک"، "میمک" و هیتردا دەبیندرێ و وەک پاشگری خۆش ویستن دەور دەگێڕێ. دە وشەی "خوار"دا [وەک خوارزا] فۆتیمی r ماوەتەوە.

**خوشین xuşîn** [ *xušīn* ] - "خزین، خشان": خوشیان xuşyan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خشان xışan و ↑خزین xızîn.

**خولانەوە xulan(ewe)** [ *xulānawa* ] - "سووڕان(ەوە)": خزمە دەگەڵ ↑گێل1 gel 1 "گەشت، گەڕان":

خولیا **xulya** [ *xulyā* ] - "حەن، واز، ئارەزوو". گیوڵ gêwıl و ↑گیڤل gêvıl ش هەن بە مانای "ئیشتیا، واز، مەیل، تامەزرۆیی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ wollen (G.)، wellen (OG.)، will (E.)، vilja (Sw.)، velle (L.) "ویستن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *uel-, *wel- <** "ویستن، هەڵبژاردن".

[تێبینی: لە وشە کوردمادییەکانی سەرەوەدا فۆتیمی سەرەتای ریشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەم جۆرە گۆڕانە دە زمانی کوردمادیدا هێندێک جار هەڵدەکەوێ، وەک دە وشەی "خولانەوە"دا].

خوم **xum** - دە فەرهەنگی "هەنبانە بۆرینە"دا جارێک "خم" هاتووە بە مانای "بەری گیایەکە نیلی پێ دەڵێن، خام و بەنی پێ شین دەکەن". جارێکی دیکی "خوم" هاتووە بە مانای"1- خم 2- کووپە". بەگوێرەی ئەم فەرهەنگە دەبێ دوو وشە و دوو مانا لە ئارادا بن. بەڵام دە فەرهەنگی فارسیدا یەک خم xom (P.) هەیە کە وەک "کووپەی گڵینی گەورە" مانا کراوەتەوە. دە فارسیدا هەروەها خمرە xomre (P.) هەیە بە مانای "کووپەی گڵین بۆ شەراب". بە ورد بوونەوە لەم پێوەندییانە وا دەردەکەوێ کە دە زمانی کوردمادیشدا "خم" یان "خوم" هەر یەک وشە بێ و هەر یەک ماناشی هەبێ. ئەم مانایە دەبێ هەمان "کووپەی گڵین" بێ. پاشان ماناکە هێندێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بەو ماددەیەش گوتراوە کە دە "کووپەی گڵین"دا گرتوویانەتەوە و بۆ رەنگ کردن بەکاریان هێناوە. بەم پێیە سەرەتا کاتێک گوتراوە "لە خم نانی بەن"، مەبەست ئەوە بووە کە بەنەکەیان ناوەتە ناو کووپەکەوە بۆ ئەوەی رەنگ بگرێ. دواتر وا بیر کراوەتەوە کە "خم" رەنگەکەیە و پێیان وابووە "لەخم نان" واتا "لە رەنگ نان". لە لایەکی دیکە هەر دە زمانی کوردمادیدا "خمخانە" هەیە بە مانای "دووکانی رەنگرێژی" و "خمگەر" بە مانای "وەستای رەنگرێژ". دیارە وەستا لە خمخانەدا تەنیا رەنگی شین دە کار ناکا و چەند رەنگیکی دیکەش بە کار دێنێ. کەوابێ "خم" دە ئەسڵدا بەری گیایەک نییە کە خام و بەنی پێ شین بکەن، بەڵکوو وەک باس کرا کووپەی گڵینە. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ دەگەڵ یەک لەم وشانەی خوارەوە خزم بێ:

1- ↑جام cam "1- دەفر 2- شووشە" و ↑خام xam "نەکوڵیو، پێنەگەیشتوو" [دە بنەڕەتدا: رەق]. ئەم وشانە دەگەڵ ژمارەیەک وشە خزمن کە لەژێر ↑حەمرین ħemrîn دا باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەرد" و ئاماژە بە "سەخت بوون، بەردین بوون" دەکەن. ئەم مانایە دە هەر دوو مانای "جام"دا خۆی نیشان دەدا، چ جام وەک دەفری سەاڵەت [قوڕی بەردکراو] و چ جام وەک شووشە کە ئەویش دیسان هەر قوڕێکە و بەردین دەکرێ.

2- وشەی دەفر defr "قاپ" خزمە دەگەڵ zufr (Pl.) و jafra (Av.) "قووڵ" و ژمارەیەک وشە کە دە بنەڕەتدا مانای "زار داپچڕین، دەم کردنەوە" دەکەن، وەک gapen (MG.) "زار داپچڕین"، gapen (Nl.) "زارداپچڕین، باوێشک هاتن"، gapa (Sw.) "باوێشک هاتن، گەروو پچڕاندن، قیژاندن"، gap (E.) "کەلێن، کون، کەلەبەر، قەڵش، ڤاڵایی" [دە بنەڕەتدا: شوێتێکی زارداپچڕاو]، ↑کەپۆ kepo، ↑گوپ gup، ↑قەپ qep [ڤەپاڵ qepal] و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑کون *kun* دا باس کراون و و دواجار دەچنەوە سەر ریشەی **< (IE.) *ĝhēi-, *ĝhan-** "دەم کردنەوە". دە زمانی کوردمادی و زمانە خزمەکاندا چەند وشەیەکی دیکەش هەن کە ئاماژە بەو چەمکانەی سەروە دەکەن و ئەوانیش بۆ ئەم ریشەیە دەگەڕێنەوە، وەک ↑کام2 kam "1- نەخۆشییەکی ناو زاری ئاژەڵ 2- ئاڵ بوونەوەی ددان" [دە بنەڕەتدا: دەم، زار]، Gaumen (G.)، goumo (OG.)، gom (Sw.) "مەڵاشوو"، gums (E.) "پووک"، gomurys (Gr.)، gamurs (Let.) "قوڕگ، لوولەی هەناسەکێشان" و دەگەڵ ↑قەمپۆز qempoz [ qem + poz ] و ↑کاو2 kaw "چێژ، ئیشتیا". بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەتوانین ئەم شیمانەیەش بهێنینە ئاراوە کە مەبەست لە "خوم" و "خومرە" دەفر بووبێ، پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ و ئاماژەی بە شتێکی قووڵ و بۆش کردبێ کە زارکی هەیە و "زاری داپچڕیوە". لەم بارەوە هەروەها بەراوردی بکە دەگەڵ ↑قوم² qum [قوم لێدان] و ↑قومقومە qumqume. دە زمانی کوردمادیدا ↑قوم3 qum هەروەها بەم مانایانەش دێ: "1- کووپەڵە، بستووکە 2- سوێنە 3- جێگەی ئاودانی ماڵات لە دار یان قوڕ، کۆڵ".

[سەرنج بدە وشەی "کۆل" خزمە دەگەڵ "قووڵ"]. ئەم مانایانە ئەم بۆچوونە پشتراست دەکەن کە وشەکە دە بنەڕەتدا پێوەندی بە چەمکی "قووڵایی، بۆشایی، کون و کەلێن"ەوە هەیە.

[تێبینی: ریشەی **(IE.) *ĝhēi-, *ĝhan- >** "دەم کردنەوە، زار داپچڕین" دەشێ خۆی پێوەندی هەبێ بە ریشەی *(IE.) *ghē(i)* "لێکبوونەوە، بەتاڵایی کەوتنە نێوان، جێ هێشتن، چوونەپێش"].

**خومار xumar** [*xumār*] - "لێڵ، خەواڵوو": دە فارسیدا خمار xomār. دەشێ خزم بێ دەگەڵ Jammer (G.) "گریان، نالەناڵ"، jammar (OG.)، geomor (OE.) "پەرێشان، دڵتەنگ، لێڵ، شێواو". وشەی خەم/ غەم ġem /xem یش هەر لەم پێوەندییەدا جێی هەڵسەنگاندنە. ریشە؟

**خومخۆرک xumxork** - "قەڵشی عەرز": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑خوم xum.

**خوممین xummîn** [*xummīn*] - "دەربەدەر بوون، ئاوارە بوون": خزمە دەگەڵ ↑گوم gum "ون".

**خوناوە xunawe** [*xunāwa*] - "1- نم نمی باران 2- شەونم": خزمە دەگەڵ ↑خونقین xunqîn بە مانای "بارینی نم نم". دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑*فێنک fenık*[دە فارسیدا خنک xonak (P.)].

**خونچە xunçe** [*xunča*] - "گوڵی نەپشکوتوو": خزمە دەگەڵ ↑قنچ qınc.

**خونجیلانە xuncîlane** [*xunjīlāna*] - "چکۆڵەی جوانکیلە": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑*قنچ qınc*و ↑خونچە xunçe.

**خونقین xunqîn** [*xunqīn*] - "بارینی نم نم": خزمە دەگەڵ ↑خوناوە xunawe "نم نمی باران".

**خونکار xunkar** [*xunkār*] - "فەرمانڕەوا": خداوندگار xodāvandgār (P.) "خودا، دەسەڵاتدار، فەرمانڕەوا". بڕوانە ↑خوداوەند xudawend.

**خوو xu** [*xū*] - "عادەت، مەیل": دە فارسیدا خو xū (P.). هۆ -ho و ↑هووک1 huk یش دەگوترێ. بڕوانە ↑*هۆگر hogır* "ئەو کەسەی خووی بە شتێک گرتووە".

**خووز xuz** [*xūz*] - "هێز، وزە": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هێز و ↑وزە hez و wıze.

**خووس xus** [*xūs*] - "زوقم": خوێز xuwez و خووسار xusar یش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خووساندن xusandın.

**خووساندن xusandın** [*xūsāndın*] - "تەڕ کردنی زۆر، نەرم کردن دە ئاودا": دە فارسیدا خیساندن xîsanden (P.). خزمە دەگەڵ gießen (G.)، giozan (OG.)، geotan (OE.)، gjuta (Sw.) "(ئاو) تێرشتن، ئاو داشتن". دەشێ وشەکە سەرەتا بە مانای "ئاو تێرشتن، ئاوداشتن" بووبێ و لەوێوە ماناکەی بووبێتە "نەرم کردن دە ئاودا"، سەر بە ریشەی **(IE.) *gheu- >** "(ئاو) تێرشتن، ئاو داشتن".

**خووک xug** [*xūg*] - "بەرازی ماڵی": خوک xūk (P.) "بەرازی ماڵی". خزمە دەگەڵ Sau (G.)، su (OE.)، sow (E.)، sugga (Sw.)، syr (OIs.)، hys (Gr.)، sus (L.) "(دێڵە)خووک"، سەر بە ریشەی **(IE.) *su-s >** "بەراز(ی ماڵی)".

**خۆدی xodî** [*xodī*] - "شێوەیەکی دیکە لە ↑خاوەن xawen [دە بنەڕەتدا خوداوەند].

**خۆر xor** - "هەتاو": دە فارسیدا خورشید xoršīd (P.). خزمە دەگەڵ sol (L.) و (Sw.)، helios (Gr.)، sygil (OE.)، saule (Lit.)، sun (E.) و Sonne (G.) و هتد. گشتیان بە مانای "خۆر"، سەر بە ریشەی **(IE.) *sauel- >** "خۆر".

**خۆڕایی xorayî** [*xorāyī*] - "1- بێهۆ، لە هیچی 2- بەلاش": وشەکە لە بنەڕەتدا بەم چەشنە بەکارهاتووە: لە + خۆ+ ڕا le + xo + ra . ئەسڵی وشەکە "خۆ" [خود] ە. کەرتی لە le سەرەتا پرێپۆزیسیۆن و کەرتی ڕا ra تەواوکەری پرێپۆزیسیۆنەکەیە، هەروەک چۆن دەگوترێ "لە ماڵێ ڕا". مەبەست لە "لەخۆڕا " یان "لە خۆوە" ئەوە بووە کە کارێک یان ڕووداوێک سەبەبی (دەرەکی) نەبووە، بێ عیللەت بووە، بە وتەیەکی دیکە لەخۆڕا بووە یان لە هیچەوە بووە [لە هیچ و خۆڕایی]. ئەمجار وشەی " لەخۆڕا" پاشگری ناوی واتایی î خراوەتەوە سەر و بووەتە خۆڕایی xorayî. دواتر وشەکەی

مانای "بەلاش"یشی وەرگرتووە و ئەم مانایەش لێرەوە پەیدا بووە کە کاتێک کەلوپەلیان بەبێ مەبەستی فرۆشتن و پارە وەرگرتن داوەتە کەسێک، ئەم کارە وەک کارێکی بێ سەبەب چاو لێکراوە.

**خۆرت xort** - "لاو، جەوان": پێوەندی بە ↑خورت xutr ەوە هەیە بە مانای "بەهێز، پتەو".

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا ئەو وشانەی بە مانای جەوان بەکاردێن، وەک لاو، جحێل، هەرزە، هەرکامیان ئاماژە بە تایبەتمەندییەکی مرۆڤی جەوان دەکەن، بۆ وێنە "جحێل" لە وشەی جاهیلی عەرەبی وەرگیراوە و مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤی جەوان زانیاری و ئەزموونی کەمە، یان وشەی "لاو" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤی لاو ئامادەیی فۆرم گرتنی بۆ شێوەی جۆربەجۆر تێدایە. هەربەم شێوەیە وشەی "خۆرت" ئاماژە دەکا بە لایەنی فیزیکی جەوان وەک مرۆڤێکی بە هێز].

**خۆزگە xozge** [ *xozga* ] - "حەز و ئارەزوو": خۆزی xozî و خۆزیا xozya ش دەگوترێن. دە فارسیدا خۆشا xošā (P.)، دەچێتەوە سەر ↑خۆش xoş.

**خۆش xoş** [ *xoš* ] - "شاد(کەر)، چێژبەخش": خوش xoš (P.)، xvaš (Pl.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑خواستن xuwastın و دواتر ↑ویستن wîstın. لەم تێروانینەوە مانای ئەسڵی وشەکە دەشێ "خوازراو، بەگوێرەی حەز و ئارەزوو، دڵخواز" بووبێ. بە شێوەزاری هەورامی وەش weş دەگوترێ کە شێوەکەی دەگەڵ ویستن wîstın باشتر یەک دەگرێتەوە.

**خۆڵ1 xol** - "خاک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ solum (L.) "خۆڵ، خاک"، hyle (Gr.) "خڵتە و خاڵ، لیتە"، hal (Kymr.) "پیسایی، زەلکاو"، soloti (Rus.) "زەلکاو". ریشە؟

**خۆڵ2 xol** - دەگەڵ "خڕ" دێ و دەگوترێ خڕ و خۆڵ xır û xol. خزمە دەگەڵ خول xul "سوڕ" و دواتر ↑گێڵ1 gel "گەشت، گەڕان، خولانەوە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چەمانەوە".

[تێبینی: دوو چەمکی "چەمانەوە" و "قەڵەوی" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. لەم بارەوە بۆ نموونە بڕوانە ئەو وشانەی لەژێر "گێپەر"دا باس کراون].

**خۆڵ3 xol** - دەگەڵ "خەست" دێ و دەگوترێ خەست و خۆڵ xest u xol. خزمە دەگەڵ ↑خوڕ xur.

**خۆمین xomîn** [ *xomīn* ] - "کۆما کردن": ↑کۆما koma.

**خۆنە xone** [ *xona* ] - "پنە، تەختەی ئەنگوتک لەسەر پان کردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑خوان xuwan "تەختە، میزی لەسەر خواردن"، ↑خوانچە xuwaçne و هەروەها ↑*دەرخۆنە derxone*.

**خۆە xoh** - "1- ئارەقە 2- ئاونگ، شەونم": خزمە دەگەڵ Schweiß (G.)، sweat (E.)، swāt (OE.)، zweet (Nl.)، sveda (OIn.)، hidos (Gr.) "عارەقە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *sueid- >** "عارەقە کردن".

[تێبینی: ئەم ریشەیە دەشێ خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوو بێ لە ریشەی *(IE.) *(a)ued-* "تەڕ کردن، دەڵاندن، جاری بوون". لەم تێروانینەوە وشەکە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هووت[1] hut "شە، تەڕایی" و ↑وەشتەی weştey "بارین"].

**خۆیان xoyan** [ *xoyān* ] - "کلۆشی گێرەکراوی کۆکراوە": شێوەیەکی دیکە لە وشەی ↑جۆخین coxîn.

**خوی xuwe** [ *xuwe* ] - "ماکەی سوێر": خێ xe ش دەگوترێ. دەبێ خزم بێ دەگەڵ وشەی ↑سوێر suwer.

**خوێری xuwerî** [ *xuwerī* ] - دە ئەسڵدا خۆڕی xorî [خۆ + ری xo + rî] واتا ئەو کەسەی لە ترسان خۆی پیس دەکا.

**خوێن xuwen** [ *xuwen* ] - "تراوی ناو رەگەکان": خوون xun، خێن xen و هوون hun یش دەگوترێن. دە فارسیدا خوون xūn (P.). خزمە دەگەڵ haima (Gr.) و sanguis (L.) "خوێن". ریشە؟

**خوێندن xuwendın** [ *xuwendın* ] - خێندن xendın و خاندن xandın یش دەگوترێن و ئەمانە شێوەی کۆنتر وشەکە نیشان دەدەن. دە فارسیدا خواندن xāndan (P.). دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Hahn (G.) "کەڵەباب" هەیە و ئەم وشەیە و هێندێک وشەی وەک singen (G.)، sing (E.) و canere (L.) "گۆرانی گوتن" دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *kan- >** "گۆرانی خوێندن". دە زمانی کوردمادیشدا وشەی

"خوێندن" سەرەتا هەر بەمانای "گۆرانی گۆتن و ستران بێژان" بووە و ئەم مانایە تا ئێستاش بە باشی دە زمانەکانی کوردمادی و فارسیدا پارێزراوە. بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا کەڵەباب دەخوێنێ، کەو دەخوێنێ، خۆشخوان بە مانای خۆش ئاواز بەکار دێ و دە زمانی فارسیشدا بە گۆرانی بێژ و دەنگخۆش دەگوترێ خواننده xānande (.P). وشەی خوێندن دواتر دە زمانی کوردمادی و فارسیدا ماناکەی فراوانتر بۆتەوە و بە مانای to read و to study ئینگلیزیش بەکارهێنراوە. ئەمە لێرەوە سەرچاوەی گرتووە کە سەرەتا نووسراوەکان یاخود بابەتەکانی فێر بوون بە دەنگ و سەدا واتا بە شێوەی گۆرانی خوێندراونەوە و ئەم داب ونەریتە ئەمڕۆش لە خوێندنەوەی دەقە ئایینییەکاندا هەرماوەتەوە. دە زمانی عەرەبیشدا وشەی غنا ġina (.Arb) "گۆرانی" پێوەندی بە هەمان ریشەی سەرەوە هەیە و دوور نییە زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی لە زمانە ئێرانییەکان یان لە زمانی لاتینی وەرگرتبێ.

خەبات **xebat** [ *xabāt* ] - "کار و تێکوشان": خزمە دەگەڵ -aps (.OIn) "کار، کردەوەی ئایینی"، -apas (.OIn) "کار، کردەوە"، opus (.L) " کار" و operari (.L) "کارکردن، خەریک بوون"، üben (.G) "تەمرین کردن"، uoben (.OG) "کێڵان، کار کردن، جێبەجێ کردن"، efnan (.OE) و efna (.OIs) "جێبەجێ کردن"، uobo (.OG) "وەرزێر، پاڵە"، uop (.MG) "کشتو کاڵ، داب و نەریت". ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی < -*op (.IE) "جێبەجێ کردن" [بە تایبەتی بۆ کاری کشتو کاڵ و ئەرکی ئایینی].

خەبتین **xebtîn** [ *xabtīn* ] - "کار کردن": ↑خەبات xebat.

خەبار **xebar** [ *xabār* ] - "خەتەر، مەترسی": خزمە دەگەڵ Gefahr (.G) "مەترسی"، gevāre (.MG)، Fāra (.OG) "کەمین، بۆسە، فریو"، fārēn (.OG) "کەمین کردن، خەفتان، تەڵە نانەوە، هەوڵ دان بە نیازێکی نەباش"، fear (.G) "ترس". دواجار ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ↑وێران weran "زات کردن". وشە کوردمادییەکە سەرەتا پێک هاتووە لە پێشگری هە [ئە] + بار he + bar.

خەبس **xebs** [ *xabs* ] - "1- رەنج 2- دەسرەنج": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑خەبات xebat "کار و تێکوشان".

2- ↑قۆستنەوە qostınewe "گرتن، وەرگرتن".

خەبسین **xebsîn** [ *xabsīn* ] - "پەشێو بوون، سەر لێ تێکچوون": شێوەیەکی دیکە لە↑حەپەسان ħepesan [عەبەسان].

خەپار **xepar** [ *xapār* ] - "1- خۆش بوونی کێڵگە بۆ چاندن 2- بژار": خزمە دەگەڵ ↑خەپر xepır "وەرد دانەوە، دووبارە کێڵان" و ↑خپر *xıpır* "کۆڵینەوە".

خەپر **xepır** [ *xapır* ] - "وەرد دانەوە، دووبارە کێڵان": خزمەدەگەڵ ↑خپر xıpır "کۆڵینەوە".

خەپراندن **xeprandın** [ *xaprāndın* ] - "تێکوەردانی ئاگر بۆ خۆش کردنی": خزمە دەگەڵ ↑خپر xıpır "کۆڵینەوە".

خەپرە **xepre** [ *xapra* ] - "پاپۆکە، خۆ لێک هاڵاندن"، بە تایبەتی بۆ سەگ و پشیلە لەکاتی خەوتندا بەکار دێ. خەپەرە xepere ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خەپکە xepke "گەو، ئاڵقە" و دواجار لەوانەیە پێوەندییان بە ↑زڤرین zıvrîn ەوە هەبێ. وشەی spiral (.E) "ئاڵقەی مارپێچی" پێوەندی بە "زڤرین"ەوە هەیە.

خەپشە **xepşe** [ *xapša* ] - "ئەندامی مێینە": [دەبنەڕەتدا: کەلێن، قەڵش(ی لەشی ژن)]. خزمە دەگەڵ ↑کون kun "کولێن، قووڵایی، ناوبڕاوی". کەرتی -شە -şe پاشگری گچکاندنە. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ gap (.E)"کون و کەلێن".

خەپک **xepık** [ *xapık* ] - "تەڵە": خەفک xefık و هەڤک hevık یش دەگوترێ.

1- لەو لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑کون kun "کولێن، قووڵایی". وشەی "تەڵە"ش پێوەندی هەیە بە "دۆڵ" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قووڵکە، قووپاوی، قووڵایی".

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ پێوەندی بە چەمکی "گرتن، گیر کردن"ەوە هەبێ و خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ئیپە îpe دا باس کراون. وشەی capture (E.) "دیل گرتن، داگیر کردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**خەپکە xepke** [ *xapka* ] - "گەو، ئاڵقە": هەروەها ↑خەپرە xepre [خەپەرە xepere] هەیە بە مانای "پاپۆکە، خۆ لێک هاڵاندن" [بە تایبەتی بۆ سەگ و پشیلە لەکاتی خەوتندا].

**خەپلە1 xeple 1** [ *xapla* ] - "کورتەباڵای قەڵەو و ئەستوور": هەپلە heple ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خەپە xepe.

**خەپلە2 xeple 2** [ *xapla* ] - "گیلۆکە": شێوەیەکی دیکە لە ↑ئەبلە eble.

**خەپە1 xepe 1** [ *xapa* ] - "1- قەڵەوە، خڕ و پڕ 2- کولێرە لە هەرزن [کولێرەیەکی ئەستوور]": خزمە دەگەڵ ↑قەبە qebe "ئەستوور"، ↑گەپ² gep "زل، قەبە" و ئەو وشانەی لەژێر ↑گوڤین guvîn "مەیین"دا هاتوون.

**خەپە2 xepe 2** [ *xapa* ] - "1- درمغ، دارێکی ددانەدارە کلۆشی پێ کۆ دەکەنەوە 2- هەپە، شانەی تەون کوتان": ↑هەپە hepe ش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە دەشێ پێوەندی بە ↑چەپ çep [کەپ1 kep 1، چەپۆک čepok] ەوە هەبێ بە مانای "دەست". ئەم ئامرازە وەک دەستێک وایە کە چەند قامکی هەیە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "چەنگاڵ" و "چەنگە(ک)" کە خزمن دەگەڵ چەنگ "دەست". هەروەها دیسان لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "چەتاڵ" و"تەتەڵە" کە خزمن دەگەڵ چەچە "دەستی زارۆک".

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شڤنە şıfne "خێشک" و ↑شەپنە şepne "درمغ، شەنە".

**خەت xet** [ *xat* ] - "کیر، دێر، هێڵ، بڕ": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑کەت ket و ↑کوت kut و دەچێتەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش کە مانای "بڕین" دەگەیەنێ.

[تێبینی: خەت بە مانای "دێڕی نووسین" دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە "بڕ لێدان" لەسەر دار و بەرد، واتا هەڵکەندن، کۆڵین و تاشین. سەبارەت بە پێوەندی ئەم چەمکانە دەگەڵ چەمکی "نووسین" بڕوانە *ریش* "ردێن"].

**خەتا xeta** [ xatā ] - "کاری هەڵە و نەشیاو": ئەم وشەیە دەشێ وشەیەکی بە ئەسڵ کوردمادی بێ و دو زمانی عەرەبیدا کرابێ بە خطاء xatā (Arb.). هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑چەتە çete "رێگر".

**خەتەنە xetene** [ *xatana* ] - دە فارسیدا ختنه xatane (P.). دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑خەت xet، ↑کەت ket و ↑کوت kut دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش کە مانای "بڕین" دەگەیەنێ.

**خەجلین xeclîn** [ *xajlīn* ] - "شڵەژان":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑هەژان hejan ەوە هەبێ و لەپێشدا "هەژلین hejlîn" بووبێ، بە هاتنە کایەی فۆنیمی ل l وەک ناوگری جەخت کردن. شیاوی باسە کە "شڵەژان" دە بنەڕەتدا مانای "لێدران، لێکدران" دەبەخشێ و "هەژان"یش ئەم مانایە دەگەیەنێ.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑خەزرین xezrîn "تووڕە بوون".

**خەرابە xerabe** [ *xarāba* ] - "وێرانە، کاول": ↑کەلاوە kelawe ش دەگوترێ کە شێوەیەکی دیکە لە وشەکە نیشان دەدا. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانی کوردی و زمانە خزمەکاندا، وەک Kerbe (G.) "کەلەبەر"، kerben (G.)، kerven (Nl.)، carv (E.) "کەلەبەر تێخستن"، gráphein (Gr.) "نووسین" [دەبنەڕەتدا: خەت لێدان، هەڵکۆڵین، کڕاندن]، graben (G.) "هەڵکەندن" Grab (G.)، graf (Nl.)، gra f (OE.) "قەبر، گوڕ"، Grube (G.)، grōba (Got.)، groeve (Nl.)، grōf (OIs.) "قووڵکە، کولێن، ئەشکەوت". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < *(IE.) *grebh-* "کۆڵین، هەڵکەندن، کڕاندن". دە زمانی کوردیدا چەندین وشە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک ↑کەرەفتوو kereftu [غاری کەرەفتوو]. وێ دەچێ

وشەی "کەرفتوو" لە کۆندا بە گشتی بە مانای "غار، ئەشکەوت" بەکار هاتبێ و دواتر کەرەفتوو بووەتە ناوێکی تایبەت بۆ ئەشکەوتەکە. جگە لەمە ↑قەڕابە qerabe "دەفری گەورەی ئارەق و شەراب" و چەندین وشەی دیکە لەم خێزانەوشەیەدا خۆیان دەبیننەوە. گشت ئەم وشانەی سەرەوە ماناکانی "هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، قوڵکە، کون و کەلێن، ئەشکەوت" دەردەبڕن. بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە وشەی "خەرابە" یان "کەڵاوە" دە بنەڕەتدا ئاماژە بووە بۆ ئەو شوێنانە کە وەک قووڵکە، کون وکولێن و ئەشکەوت بوون. کاتێک لە هۆنراوەکاندا باس لە "پیری خەرابات" کراوە، مەبەست ئاماژە بەو شوێنانە بووە کە پیر و پیاوچاکان ژیانیان تێدا کردوون و خۆیان لە دنیای دەرەوە جیا کردۆتەوە. دە هۆنراوە کۆنەکاندا هەروەها باس لە "دێری موغان" دەکرێ. وشەی "دێر" خزمە دەگەڵ "دۆڵ" و "دەڕە" و دەچێتەوە سەر ریشەی *dhel- (IE.) "قووڵکە، قووپاوی، قووڵایی". [تێبینی: دوور نییە وشەکانی "خەرابات" و "دێر"ی سەردەمانی کۆن لە چەمکی ئەمڕۆیی "ژێرزەوی" [زێرزەمینی، underground] نیزیک بووبن، واتا جۆرێک خۆ شاردنەوە لە دەسەڵات و جاشەکانیان بووبێ]. وشەیەکی دیکە کە هەر لەم پێوەندییەدا دەبێ هەڵوەستەی لەسەر بکرێ، ↑خراپ xırap [خراب xırab]ە، بە مانای "نەباش، کاول، لەکار کەوتوو". ئەم مانایەش دە بنەڕەتدا پێوەندی بە مانای ریشەکەوە هەیە. خراب کردن دە بنەڕەتدا بریتی بووە لەوە کە بە ئامرازێک لە شتێکیان داوە، هەڵیان کەندووە، خەتیان تێخستووە، قووڵیان کردووە، قووپاندوویانە و هتد. بۆ وێنە کاتێک خانوویەکیان خەراپ کردووە، بە پاچ و پێمەڕە کەوتوونەتە سەری و لەسەربانەوە بگرە تا دیوارەکانی، لێیان داوە و رووخاندوویانە. یان کاتێک ئاماژە بە خراپ بوونی شتێکی باش و جوان کراوە، دە بنەڕەتدا مەبەست ئەوە بووە کە خەتی تێ کەوتووە، داڕووشاوە یان قووپاوە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە وشەی ↑خەرفان xerfan [خەراب بوونی مێشک].

**خەرامان xeraman** [*xarāmān*] - "لەنجە و لار": وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "لەنگین، لار رۆیشتن" [خوار رۆیشتن] بووە. خزمە دەگەڵ krumm (G.)، krom (Nl.)، krumb (OE.) "خوار" و krümmen (G.)، krimphan (OG.) "خوار بوون". وشەکە دەبێ دە زمانی کوردمادیدا خزم بێ دەگەڵ ↑قرمان qırman.

**خەرتە xerte** [*xarta*] - "کێڵانی وشکەزەوی دوورەباران": خزمە دەگەڵ گەلێک وشە کە دەچنەوە سەر ریشەی < *(s)ker- (E.) "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن، لێکردنەوە". هێندێک لەم وشانە دە زمانی کوردمادیدا بریتین لە ↑کێرد *kerd*، ↑کەرت kert، ↑کرتاندن kırtandın [قرتاندن qırtandın]، ↑شڕ şır [شڕ و دڕ]، ↑زار3 zar [زەوی و زار، کەرتەزەوی، قەتعەزەوی]، ↑جاڕ3 car "زەوی نەکێڵراو"، جاڕ car [↑هەوجار hewcar "ئامرازی کێڵان"] و هتد.

**خەرتاندن xertandın** [*xartāndın*] - "لە رەگ و ریشەوە دەرکێشان": خزمە دەگەڵ ↑خەرتە xerte.

**خەرتەل xertel** [*xartal*] - "داڵاش": خەرداڵ xerdal یش دەگوترێ. خەر + تەل xer + tel. "خەر" شێوەیەکی دیکەیە لە کەر و ئاماژە بە گەورە بوون دەکا [وەک چۆن دەگوترێ خەربار، خەرپشت و هتد]. کەرتی تەل tel- شێوەیەکی دیکەیە لە ↑داڵ dal "داڵاش". لەم تێڕوانینەوە خەرتەل واتا داڵی گەورە.

**خەرخەشە xerxeşe** [*xarxaša*] - "کێشە و هەرا، قەرقەش": لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑گێرە و کێشە gêre û kêşe.

**خەرز xerz** [*xarz*] - "جووت بوونی ئاژەڵ": هەروەها ↑خەڕرەمە xerreme هەیە بە مانای "تێرەکەری فەحل": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- érōs (Gr.) "هەوەس، مەیل بە دڵداری" و erōtikó (Gr.) "پێوەندیدار بە هەوەس و عیشقبازی". دە زمانی عەرەبیدا وشەی عروس εarūs (Arb.) دەبێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ. هەروەها لەوانەیە دە زمانی کوردمادیشدا ↑ئارەزوو arezu پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

2- ↑کەڵ ²kel [بەکەڵ، وەکەڵ هاتوو] سەر بە ریشەی <  *karo(s)  *(IE.)* "تامەزرۆ بوون".

**خەرساندن xersandın** ⌊ xarsāndın ⌋ - "خەملاندن، بەراورد کردن": ↑قەرساندن qersandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ارز erz ( .P ) "نرخ، دراو" و ارزیدن arzīdan ( .P ) "نرخدار بوون ". مەبەست لە وشەکە دە ئەسڵدا "نرخاندن" بووە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە↑ هێژا heja و ↑هەرزان *herzan*.

**خەرسەك xersek** ⌊ xarsak ⌋ - "کلۆگڵ، سندەگڵ": خزمە دەگەڵ ↑گرسە gırse "تۆلا، پێکەوەنووساوی توندبوو".

**خەرفان xerfan** ⌊ xarāfn ⌋ - "خەراب بوونی مێشك": خرفت xereft ( .P ) "خەرفاو". لەوە دەچێ ئەم ناوە بۆ نەخۆشی فەرامۆشی لە تەمەنی سەرەوودا بەکار هاتبێ کە بە هۆیەوە نەخۆشەکان زۆر شتیان لە بیر نامێنێ و بە داخەوە لە کۆندا وەك جۆرێك گەمژە بوون سەیر کراوە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑غوڕ(ڕ)اب ġur(r)ab.

**خەرقە xerqe** ⌊ xarqa ⌋ - "باڵاپۆشی دەروێشان": خرقە xarqe ( .P ). خزمە دەگەڵ rail ( .E )، hra ġ(e)l ( .OE )، hregil ( .OG ) "باڵاپۆش". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە روون نەکراوەتەوە.

**خەرقین xerıqîn** ⌊ xarıqīn ⌋ - "خلیسکان": خزمە دەگەڵ ↑گلان gılan و ↑*خلیسکان xılîskan*. فۆتیمی ق q دە وشەی "خەرقین"دا و هەروەها ك k دە وشەی "خلیسکان"دا دەوری "ناوگر" دەبینن. ئەم ناوگرانە دە ژمارەیەك کرداری دیکەشدا هەن و ئاماژە بە دۆخی جەخت کردن دەکەن، بۆ وێنە˚ ئاڵۆزکان، بزرکان، پەشۆکان، دامرکان، زرووقان، مرقاندن، هەڵبزووقین و هتد.

**خەرك xerk** ⌊ xark ⌋ - "1- دارێکە تاوانباری لەسەر بەر قامچی دەدەن 2- دوو تای دارین کە لەسەر پشتی باربەر دادەنرێ بۆ بەرد کێشان": خزمە دەگەڵ Galgen ( .G )، galge ( .MG )، galga ( .Gt )، gallows ( .E )، galge ( .Sw ) "دار، سێدارە"، jalk ( .Arm ) "شووڵ، لکەدار"، žalga ( .Lit ) "داری درێژ" [وەك داری ئاڵا]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی <  *ĝhalg-  *(IE.)* "دار، پەیاغ، شووڵ".

**خەرمان xerman** ⌊ xarmān ⌋ - "1- دەغڵ و دانی کۆمکراو و بەسەریەکدا کراو 2- تریفەی دەوری مانگ": خرمن xarman ( .P ). دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکە کە بۆ خەرمان بەکار دێ، بریتییە لە "جۆخین". ئەم وشەیەش خۆی خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەك "یەخە"، "یوغ"ی فارسی "کەڵەوە"، جەغز "دایرە" و هتد. وەك دەبینرێ لێرەدا پێوەندییەك دەتیوان دوو چەمکی "خەرمان" و "دایرە، کەوانە"دا دروست دەبێ. ئەگەر لەم تێڕوانینەوە بۆ ساغ کردنەوەی وشەکە بچین، دەبێ بیبەستینەوە بە ↑خەرامان xeraman "لەنجە و لار"، "لەنگین، لار روێشتن" [خوار رۆیشتن]، ↑قرمان qırman "خوار بوونەوە، چەمانەوە"، ↑خورم xurım "ئاڵقەیەکی دارینە لە رەشماڵ بەستن و بارکردندا بەکار دێ" و هەروەها خزمە دەگەڵ krum ( .G )، chrump ( .OG )، crumb ( .OE )، krom ( .Nl ) "خوار، چەماو"، krimphan ( .OG ) "خوار بوون، چەمین"، Kringel ( .G ) "جەغز، شێوەی ئاڵقەیی"، kringr ( .OIs ) "جوغز، ئاڵقە"، krinc ( .MG ) "جەغز، ئاڵقە، دەڤەر، دەوروبەر" [گەڕەك؟]، Kranz ( .G ) "تاجەگوڵینە" [ئاڵقەی لەگوڵ] و ژمارەیەك وشەی دیکە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی <  *ger-  *(IE.)* "سووڕان، چەمان، با دران، خوار بوون".

**خەڕەك xerek** ⌊ xarak ⌋ - "ئامێری پەمۆرستن، ئامێری هەڵوێزنینی بەن": پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- ↑غەرغەرە ġerġere، سەر بە ریشەی <  *ger-  *(IE.)* "سووڕان، بادران"

2- schräg ( .G )، curvus ( .L ) "خوار"، krikos ( .Gr )، circus ( .L ) "جەغز"، Ring ( .G )، (h)ring ( .OG ) "هاڵقە"، krug ( .Rus ) "جەغز، قەوان"، سەر بە ریشەی <  *(s)ker-  *(IE.)* "سووڕان، خوار بوون، با دران".

**خەڕەم(ە) xerem(e)** ⌊ xaram(a) ⌋ - "تیرەکەری فەحل": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑خەرز xerz "جووت بوونی ئاژەڵ".

خەریتە **xerîte** [ *xrīta* ] - "نەخشە": ئەم وشەی دەچێتەوە سەر chártēs (.Gr) "کاغەزی پاپیرۆسی میسری". ئەم وشەیە دواتر مانای "کاغەز و کارت"ی وەرگرتووە و کەوتووەتە ناو زۆرێک لە زمانەکانی جیهانەوە. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە هێندێک وشەی لێ دروست کراوە وەک Spielkarte "کارتی کایە، وەرەقی قومار"، Landkarte "نەخشەی جوگرافی" و هیتر.

خەریک **xerîk** [ *xarīk* ] - "سەرگەرم بوون بە کارێک": وشەکە دە بنچینەدا دەبێ "کاریک" karîk [ îk + kar ] بووە، سە بەوشەی ↑کار kar. کەرتی دووەم پاشگرێکی کۆنە کە دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆییدا سواوەتەوە و دەنگی k یەکەی فەوتاوە.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبیشدا وشەی "مشغول" بە مانای خەریک دەچێتەوە سەر وشەی "شغل" بە مانای کار. دە زمانی ئەڵمانیشدا هەر هەمان پێوەندی لەئارادایە: beschäftigt "خەریک" و Geschäft "کار و کاسبی"].

خەرین **xerîn** [ *xarīn* ] - "پرخە کردن": خزمە دەگەڵ خرناس xarnās (.P) "پرخە". بنەوشەی خەر -xer دەشێ پێوەندی هەبێ بە وشەکانی ↑گەروو geru، ↑گەردن gerdın، ↑قورگ qurıg و ↑قورقورۆچکە qurquroçke و هتد.

خەز **xez** [ *xaz* ] - "پێستە": هەروەها گەز gez یش دەگوترێ بە مانای "خەز، پارچەی ئاوریشم". خزمە دەگەڵ ↑قژ qıj [گیس gīs (.P)]. پێوەندی نێوان دوو وشەی "خەز" و "قژ" وەک پێوەندییەکە دەنێوان دوو وشەی "بژ" [یاڵ و بژ] و "بسک"دا.

خەزان **xezan** [ *xazān* ] - "پاییز": دە فارسیدا خزان xazān (.P). لەوە دەچێ وشەیەکی وەرگیراو بێ، پێوەندی هەیە بە xantos (.Gr) "زەرد". لەم تێڕوانینەوە خەزان دەبێ بە مانای "وەرزی زەردایی" بەکار هاتبێ.

خەزایی **xezayî** [ *xazāyī* ] - "ناوی پەلەوەرێک": ↑کەشۆیلە keşoyle ش دەگوترێ. هەر دوو وشەکە شێوەی جیاوازن لە یەک وشە کە پێوەندی بە ↑قاژوو qažū هەیە. ئەم وشانە ئاماژە بە قاژ و قیژی پەلەوەرەکە دەکەن. ناوی چەندین پەلەوەری دیکەش بەم جۆرە دروست بوون، وەک قەل، قشقەڵە، زیقاولە، کوڕکوڕە، بولبول، کەکلێ و هتد.

خەزرین **xezrîn** [ *xazrīn* ] - "قەڵس و تووڕە بوون": پێوەندی هەیە بە ↑ئاژر ajır "تووڕە، رق هەستاو". ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ خشم xeşm (.P) "تووڕەیی" و هەروەها دەگەڵ Geist (.G)، ghost (.E)، geest (.Nl) "رووح، رەوان". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *ĝheis-** < "وروژاو، قەڵس، تووڕە". us-gaisjan (.Gt) "داچڵەکاندن"، geiskafullr (.OIs) "سامناک" لەم ریشەوە پەیدا بوون. هەروەها -zaēša (.Av) "قێزەوەن" بە دەگەڵ ئەو وشە ژێرمەنییانە خزم دانراوە.

خەزن1 **xezın 1** [ *xazın* ] - "ژن خوشک، خوشکی ژن": بڕوانە ↑خەزوور xezur "باوکی هاوسەر".

خەزن2 **xezın 2** [ *xazın* ] - "هەڵگرتن و ئەنبار کردن لە شوێنێک": بڕوانە ↑خزێنە xezene.

خەزنە **xezne** [ *xazna* ] - ↑خەزێنە xezene.

خەزوور **xezur** [ *xazūr* ] - "باوکی هاوسەر": هوسیرە husîre ش دەگوترێ. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Schwager (.G) هەیە بە مانای "هێوەر یان ژن برا". لە هەمان کاتدا لە دیالێکتی ناویندا Schwäher (.G) هەیە بە مانای "خەزوور". [بەراوردی ئەم وشەیە بکە دەگەڵ شوهر şouhar (.P) دە زمانی فارسیدا - دە زمانی کوردمادیدا ↑شوو şû]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر sweher (.MG)، swehur (.OG)، swēor (.OE)، svēr (.OSw)، socer (.L)، svekor (.Rus)، śvāśura-h (.OIn) "خەزوور". دەبێ وشەکە دە زمانی کۆنی کوردمادیدا شتێکی وەک *خڤازورا *xvazura* بووبێ. لە هەمان کاتدا چەند وشەیەکی دیکەی زمانی کوردمادیش دەبێ پێوەندییان بەم وشەیەوە هەبێ. یەکەمیان وشەی ↑خەسوو xesu "دایکی هاوسەر"ە کە چ لە باری مانا و چ لەباری شێوەی وشەکەوە پێوەندییەکەی بە "خەزوور"ەوە ئاشکرایە. هەروەها

وشەی↑زڕ zır "نائەسڵ" [زڕباب، زردایک]. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Schwieger (.G) کە پێوەندە بە وشە ئەڵمانییەکەی سەرەوە، دەگەڵ هێندێک وشەی وەک دایک، باوک، کوڕ و کچ بە کار دەهێندرێ و دەبێتە Schwiegervater (.G) "خەزوور، باوکی مێرد" [بە وتەیەکی دیکە باوکێک کە هی خۆت نییە، باوکێکی زڕە"]، Schwiegermutter (.G) "خەسوو"، Schwiegersohn(.G) "مێردی کچ، زاوا"، [کوڕی نە هی خۆت]"، Schwiegertochter (.G) "ژنی کوڕ، بووک" [کچی نەک هی خۆت]. پێ دەچێ دە زمانی کوردمادیشدا سەرەتا وشەی زڕ zır وەک ئاماژە کردن بە "هی خو نەبوون واتا بردنەوەی پێوەندییە خزماییەتییەکە بۆ سەر "خەزوور و خەسوو" بە کار هێندرابێ. بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە وشەی ↑هێوەر hewer "برای مێرد" [بە وتەیەکی وردتر "کوڕی خەزوور"] ە کە ئەمیش دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هاوریشەیە، هەروەها ↑خەزن xezın "ژن خوشک، خوشکی ژن".

**خەزەڵ xezel** [ *xazal* ] - "گەڵای زەرد هەڵگەڕاو": خزمە دەگەڵ ↑خشڵ xışıl "زێڕ و زێو بۆ رازاندنەوە". مانگی خەزەڵوەر xezelwer واتا مانگی هەڵوەرینی گەڵا [گەڵارێزان]. ئەم وشەیە پێوەندی بە وشەی خەزان "پاییز"ەوە نییە و وێکچوونی وشەکان و نیزیکایەتی ماناکانیان رێکەوتە.

**خەزێم xezem** [ *xazem* ] - "خشڵی لووت": وێ دەچێ وشەیەکی وەرگیراو بێ، پێوەندی هەیە بە kosmētikós (.Gr) "پێوەندیدار بە رازاندنەوە" و ئەمەش دەچێتەوە سەر *kosmēīn* (.Gr) "رێک و پێک کردن، رازاندنەوە". وشەی kósmos (.G) دە بنەڕەتدا بە مانای "رێک و پێکی، رازاوەیی" بووە و لەمەوە مانای "نەزم و تەرتیبی جیهان" و دواتر "جیهان" بە دی هاتووە. دە زمانی کوردمادیشدا وشەی "رازاندنەوە" پێوەندی هەیە بە "رێک" و "راست"ەوە [رێک و پێکی، نەزم و تەرتیب].

**خەزێنە xezene** [ *xazena* ] - "1- گەنج، گەنجینە 2- حەوزی حەمام": خەزنە xezne ش دەگوترێ. وەک لەژێر وشەی گەنج "خەزینە"دا شی کراوەتەوە، ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ گەنجە "خەڵوەتی" و "گنجە"ی فارسی بە مانای "دۆڵاب، شکاف". ئەم وشانەی سەرەوە دواتر خزمن لەگەڵ وشەکانی "کان" و "هەڵکەندن" و دە بنەڕەتدا بەو قووڵکە و هەڵکەندراوییە گوتراوە کە زێر و زێو و پارەی تێدا حەشار دراوە یان ئاوی حەمامی تێدا کۆ کراوەتەوە. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە مانا و ریشەی وشەی ↑خەزنە xezne یان ↑خەزێنە xezene ش روون دەبێتەوە. وەک دەزانین ئەم وشانە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەم مانای "حەوزی حەمام" و هەمیش مانای "گەنج، گەنجینە" دەبەخشن. لێرەوە ئەمە دەردەکەوێ کە مانای بنەڕەتی "خزنە، خەزێنە" چ پێوەندییەکی بە زێڕ و زێو و پارەوە نەبووە، بەڵکوو شوێنێکی هەڵکەنراو [کۆڵدراو] بووە بۆ تێدا کۆ کردنەوە و تێدا راگرتن بە گشتی. وشەی ↑گەزنە gezne "خەڵوەتی" ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا. جا هەروەک چۆن وشەی "شکاف" یان "شکەفت" پێوەندی بە ریشەیەکەوە هەیە بە مانای "بڕین، قەڵشین، کەلێن تێخستن"، هەر بەم شێوەیەش وشەی "خەزنە" پێوەندی پەیدا دەکا بە ریشەیەکی دیکە کە هەمان مانا دەردەبڕێ. بەم جۆرە "خەزنە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑کزن kızın "گوڵبێبە، باکێش، کونی با"، ↑گاز gaz "شکێڕ، شکەفت، دەۆڵی تەنکێ"، ↑کاژێرا kajer 1 "1- قوژبن 2- تاقە لە دیواردا 3- ئۆدەی خەڵوەت لە تەکیەدا"، ↑کەزیگە kezîge "جۆگە"، ↑کۆزک kozk "کولانەی مامر، خەندەک". ئەم وشانە لە لایەکی دیکەوە دەبنە خزم دەگەڵ هێندێک وشە وەک ↑گاز gaz "قەپ"، ↑قاش qaş و↑کووز kuz "بڕ"، ↑گوێزان goezan "تیغی سەر تاشین"، ↑*گەستن gestın* "بریندار کردن (بە قەپ لێدان)".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "بڕین، قەڵشین"، "کون و کەلەبەر" و "ئەنبار، خەڵوەتی" دەتوانین ئاماژە بە وشەی klofi (.OIs) "کەلێن، کەلەبەر، خەڵوەتی، ئەنبار" بکەین کە دەبێتە خزم دەگەڵ klieben (.G) "قەڵشین، لەت بوون"، Kluft (.G) "قەڵش، کەلێن" [کۆنتر هەروەها: گاز، *کەلبەتان*، قەیچی]، cleft (.E) "قەڵش، کەلێن، شیو و دۆڵی تەنکێ"، klobe (.MG) "داری قەڵش قەڵش کراو، چەتاڵ، چەنگەک و هەروەها بە مانای "دەستە، باقە، گیشە"، glubere (.L) "توێکڵ کردن"، glyphein (.Gr)

”هەڵکۆلین، داتاشین“، گوڵبێنە gulbene ”کوتێکە لە بنەوەی تەنوور، باکێش“، گەڵپ gelp ”بەتاڵایی لاشەویلکە“. هەروەها لەوانەیە خزم بن دەگەڵ کەلەبەر keleber و کەلبەتان kelbetan وخەڵوەتی xelwetî. شێوەی ئەم وشەی دوایی هەڵسەنگێنە بە تایبەتی دەگەڵ کەلبەتان kelbetan].
بەم جۆرە دەبینرێ کە لە ریشەیەکەوە بە مانای ”بڕین، قەڵشین“ چەند وشەیەك ساز بوون کە ئاماژە بە کون و کەلێن و کەلەبەر دەکەن و دواتر لەم مانایەوە ماناکانی ”کەڵەکە کردن“ و ”ئەنبار“ [شوێنی شت تێدا کۆم کردن و هەڵگرتن] پەیدا بوون. زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی لە زمانی کوردمادی خواستۆتەوە و ”خزن“ و ”مخزن“ و هیتری لێ دروست کردووە. دیسان دواتر وشەی ”مەخزن“ی عەرەبی لە رێگەی زمانی ئیتالیاییەوە چووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان و وشەی ”مەگازین“ - بۆ وێنە Magazin (G.) - دروست بووە کە بە دوو مانا بەکار دێ: 1- خەڵوەتی، ئەنبار 2- گۆڤار (شوێنی کۆم کردنەوە و ئەنبار کردنی نوسراوەکان)].
**خەسار(ە) xesar(e)** [*xasr(a)*] - ”داری ژێر کاریتە بۆ پاراستنی دیوار لە قورسایی“: خزمە دەگەڵ ↑کۆترە kotre ”داری تێوان ئەستووندەك و داری سەربان“ و هەروەها خاس ”باش“ [دە بنەڕەتدا: گونجاو، باش جێی خۆ جێگرتوو]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”تێکبەزین، چوونەناو یەك، یەکانگیر بوون، دەگەڵ یەك هاتنەوە“.
**خەساندن xesandın** [*xasāndın*] - ”1- یەختەکردن 2- سەرلك پەڕاندنی دار“: بنەوشەی خەس -xes خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا کە مانای ”بڕین، بڕاو“ دەدەن، وەك ↑قاش qaş، ↑کووز kuz، ↑کەت ket، ↑کوت kut، ↑قەتاندن qetandın، ↑گاز gaz، ↑گەستن gestın و هتد. خەساندن شێوەیەکە لە برینکاری یان نەشتەرگەری و پێوەندی بە چەمکی ”بڕین“ەوە هەیە. دە وشەی ↑خەتەنە xetene شدا کە خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە، پێوەندی بنەوشەکە بە چەمکی ”بڕین“ خۆی نیشان دەدا. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑خزار xızar ”مشاری دوو کەسی“ هەیە کە پێوەندی بەم خێزانەوشەوە هەیە.
**خەست xest** [*xast*] - ”توند، پەیت“: هەس hes و هەست hest یش دەگوترێ. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گشت2 gışt ”گرژ، توند، چالاك“ [هەڵپەڕینی گشت]، ↑کەستەك kestek ”1- سندە 2- قورسە، دە قاڵب کراوی توندەوەبووكَ“ و ↑کەسکوون keskun ”توخ، توند“. هەروەها دە پلەیەیەکی دواتردا دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑ئەستوورestur، ↑*ئاستەم astem*، ↑ئاستەنكَ asteng و هتد. ئەم وشانە گشتیان ئاماژەدەکەن بە چەمکی ”سەخت، سەختی“. لەوانەیە ↑خشت xışt یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، چونکوو ئەویش قوڕێکی لەقالبدراوی توند و سفتە و چ بە رواڵەت و چ بە ناوەرۆك دەگەڵ وشەکانی سەرەوە یەك دەگرێتەوە. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***staī-* (IE.)** ”رەق بوون، سفت بوون، توند بوون“.
[تێبینی: وشەکانی gistorchanen (OG.) ”توند بوون، رەق بوون، مەیین“، gastaurkanan (Gt.) ”هیشك و رەق هەڵاتن“، stark (G.)، (E.)، (Sw.) ”سەخت، بەهێز“ دەچنەوە سەر ریشەی **(s)ter-* *(IE.)* ” توند بوون، سفت بوون“. پێ دەچێ ئەم ریشەیە خۆی پەرەگرتووی ریشەی سەرووتر بێ].
**خەستە xeste** [*xasta*] - ”نەخۆش“: دە زمانی کوردمادیدا زۆرتر دەگەڵ وشەی ”خانە“ دێ و دەگوترێ خەستەخانە xestexane ”نەخۆشخانە“. دە زمانی فارسیدا خستە xaste (P.) بە مانای ”ماندوو“ دێ. خزمە دەگەڵ ↑خستن xıstın ”بەردانەوە، کەواندن“. پێوەندی ماندوو بوون و کەوتن ئاشکرایە و ئەم پێوەندییە لە وشە ”شەکەت“ یشدا بەدی دەکەین کە لە سقط (Arb.) وەرگیراوە و وشە عەرەبییەکەش مانای ”کەوتن“ دەبەخشێ. خەستە بە گشتی دەبێ بە مانای ”کەوتوو، پەك کەوتوو، داکەوتوو، لەپێ کەوتوو“ بووبێ. ئەم مانایە هەم مرۆڤی ماندوو و هەم نەخۆشیش دەگرێتەوە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑هێشتن hêştın ”لێگەران، رێگە دان“.

**خەسوو xesu** [ *xasū* ] - "دایکی هاوسەر": خزمە دەگەڵ وشەی↑خەزوور xezur.

**خەش xeş** [ *xaş* ] - "کەمایەسی، عەیب": خزمە دەگەڵ ↑خاش xaş [ورد و خاش] و ↑خاك xak [خاك و خۆڵ]. دە فارسیدا خاش xāš (.P) بە مانای "خڵتەو خاڵ، زبڵ و زاڵ" دێ و هەروەها بە مانای "هاڕە، بڕە" [واتا ئەو خاك و خۆڵ یان زبڵ و زاڵەی بە هۆی هاڕین یان بڕینەوە پەیدا دەبێ]. دیسان دە فارسیدا خاشاك xāšāk (.P) هەیە بە مانای "زبڵ وزاڵ ". لەلایەکی دیکەوە دە فارسیدا "غل و غش" هەیە کە دە قامووسە فارسییەکاندا بە "فێڵ و تەڵەکە" مانا کراوەتەوە. ئەم مانا لێدانەوە هەڵەیە لێرەوە پەیدا بووە کە دە زمانی فارسیدا بە مرۆڤی ساف و ساکار دەگوترێ "بی غل و غش"، واتا کەسێك کە "غل و غش" ی نییە یان "غل و غەش " دە کارەکەیدا نییە. لێرەوە فەرهەنگنووسە فارسەکان وای بۆ چوون کە "غل و غەش" دەبێ بە مانای "فێڵ و تەڵەکە" بێ. کەچی "غل و غەش" ی فارسی هەمان "خۆڵ" و " خەش، خاش" ی کوردمادییە بەمانای خاك وخۆڵ یان زبڵ و زاڵ. جا ئەم وشانە سەرەتا بۆ مرۆڤ یان بۆ ئامێر و کەرەسە و شتی وا بەکار نەهاتوون، بەڵکە بۆ شتی وەك شیر و ماست و پەنیر و ڕۆن بەکار هاتوون و مەبەست لە "بێ خەش بوون" یان "بی غل و غش" بوونی فارسی ئەوە بووە کە شتەکە ساف و پاڵاوتەیە، پاك و خاوێنە و خاك و خۆلی تێدا نییە. دە زمانی کوردمادیدا هەم خەش xeş بەکاردێ کە شێوەی دروستتری وشەکەیە و هەم ↑خەوش xewş کە شێوەیەکی گۆڕدراوی وشەکەی پێشوویە.

**خەشاب xeşab** [ *xašāb* ] - "قوتووی هەڵگری فیشەك": خەشاب لەگەڵ دەرچوونی هەر گوللەیەك فیشەکێکی تر ڕادەداتە پێشەوە. بۆیە دەبێ ناوەکە بۆ ئەم سیفەتە بگەڕێتەوە. لەم ڕوانگەوە خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ şep دا هاتوون، سەر بە ڕیشەیەك بە مانای "لێدان، دەرپەڕاندن، هاویشتن، ڕەپاڵ نان، ڕادان". کەرتی خە xe دە وشەکەدا لەوانەیە گۆڕدراوی پێشگری e [he] بێ و یان زێدەیەکی فۆنێتیکی بێ کە هێندێك جار دە وشە کۆنەکاندا خۆی دە دەخا.

**خەشکین xeşkîn** [ *xaškīn* ] - "خلیسکان": خزمە دەگەڵ↑ خشان xışan و ↑خوشین xuşîn.

**خەفتان xeftan** [ *xaftān* ] - "خۆ مات کردن لە شتێك": ↑خپە xıpe کردنیش دەگوترێ. خەفتان ئەو دۆخەیە کە ئاژەڵ یان مرۆڤی ڕاوکەر جووڵە لە خۆی دەبڕێ بۆ ئەوەی نێچیرەکەی هەستی پێ نەکا. خزمە دەگەڵ هێندێك وشە کە لەژێر ↑کپ kıp [کڕ و کپ]، ↑کۆپین kopîn "ئارام بوون" و ↑گوڤین *govîn* "مەیین" [دە بنەڕەتدا: ڕەق بوون، لە جووڵە وەستان].

**خەفك xefık** [ *xafik* ] - "تەڵەی ئاسن": ↑هەڤك hevık یش دەگوترێ.

**خەفە xefe** [ *xafa* ] - ئەم وشەیە بە چەند مانا بەکار دێ، بەڵام ماناکان پێوەندییەکی نیزیکیان بەیەکەوە هەیە و مانای بنەڕەتی وشەکەمان بۆ ساخ دەکەنەوە. "خەفە کردن" بۆ کز کردنی گڕی ئاگر بە کار دێ، جگە لەمە مانای خنکاندن، پشوو لێ بڕین یاخود بێدەنگ کردن دەدا و هەروەها بۆ فەزای تەنگ و کەم هەوا بەکار دێ. ئەگەر سەرەنجی ئەو مانایانە بدەین، دەبینین خاڵی هاوبەش لە هەمووواندا "نەبوونی بزاو و جووڵە"، بەواتایەکی دیکە ئارامی، قڕ و قپ بوون و دامرکانە. کاتێك چرا یان ئاگرێك خەفە دەکرێ، مەبەست کز کردنی شەبەق یان ئاگرەکە تا ئەورادەیە کە گڕەکە لە جووڵە و تەکان بوەستێ و ئارام بگرێ. خەفە بوونی کەسێك بە دوو مانا دێ، هەم بە مانای بێدەنگ بوون و هەم بە مانای "خنکان و پشوو لێ بڕان" کە ئەویش هەر کۆتایی هاتنە بە جووڵە و تەکان کە نیشانەی ژیانە. دیسان کاتێك باس لە خەفە بوونی شوێنێك دەکرێ، دە بنەڕەتدا ئاماژە دەکرێ بە نەبوونی جووڵە و بزاڤی هەوا بە هۆی تەنگی شوێنەکە یان بە هۆی قورسایی هەوا. کەوابێ گومان لەوەدا نامێنێ کە "خەفە" خزمە دەگەڵ ↑کپ kıp یان قپ qıp [کڕ و کپ، قڕ و قپ]، ↑کۆپین kopîn "ئارام بوون" و ↑گوڤین *govîn* "مەیین" [دە بنەڕەتدا: ڕەق بوون، لە جووڵە وەستان] و دواجار ↑خەپە xepe "قەڵەو" [دە بنەڕەتدا: سەخت، ئەستوور، بەهێز]

**خەڵات xelat** [ *xalāt* ] - "1- جلوبەرگی بەنرخ 2- پاداشت (لە شێوەی جلوبەرگ) 3- دوایین کراس": خزمە دەگەڵ ↑کراس kıras.

**خەڵ(ان) xel(an)** [ *xal* ] - "کۆزی لە بەرد بۆ ئاژەڵ 2- سەنگەر": خزمە دەگەڵ ↑خەلەک xelek "ئاڵقە"."خەڵ" ئاماژەیە بە ئاڵقەیی بوونی شوێنەکە کە بە هۆی هەڵچنیننی بەردەکان دروست دەبێ.

**خەلان xelan** [ *xelyan* ] - "ترازانی ئێسکی لەش": خەلیان xelyan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑گلان gılan و ↑خلیسکان xılîskan.

**خەڵتان xeltan** [ *xaltān* ] - "گەوزان": دە فارسیدا غلتان ġaltān (P.). دە بنەڕەتدا بە مانای "خلبوو، لە دۆخی خل بوونەوەدا". خزمە دەگەڵ ↑خلیسکان xılîskan. "خەڵتانی خوێن"، واتا ئەو لێدراو یان کوژراوەی دەناو خۆینی خوێدا خل دەبێتەوە، تل دەخوا یان دەگەوزێ.

**خەلف xelıf** [ *xalıf* ] - "شوول، لکی باریک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schilf (G.)، scliuf (OG.) قامیش، نەی". ئەم وشە ئەڵمانییە دەبردرێتەوە سەر scirpus (L.) "نەی، قامیش". ریشە؟

**خەڵوەتی xelwetî** [ *xalwatī* ] - "ئەنبار، دیوی پشتەوە": هەروەها ↑خەڵۆتە xelote هەیە بە مانای "ئەشکەوت". دەشێ خزم بن دەگەڵ klofi (OIs.) "کەلێن، کەلەبەر، خەڵوەتی، ئەنبار"، (G.) "قەڵشین، لەت بوون"، Kluft (G.) "قەڵش، کەلێن" [کۆنتر هەروەها: گاز، *کەلبەتان*، قەیچی]، cleft (E.) "قەڵش، کەلێن، شیو و دۆڵی تەنگ"، klobe (MG.) "داری قەڵش قەڵش کراو، چەتاڵ، چەنگەک"، glubere (L.) "توێکڵ کردن"، glyphein (Gr.) "هەڵکۆلین، داتاشین". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑گولبێنە gulbene "کوتیکە لە بنەوەی تەنوور، باکێش"، ↑گەڵپ gelp "بەتاڵایی لاشەویلکە" و لەوانەیە ↑کەلبەتان kelbetan "گاز". سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "هەڵکەندن، قەڵشاندن" و "خەڵوەتی" بڕوانە وشەکانی "خەزێنە" و "گەنج".

**خەڵووز xeluz** [ *xalūz* ] - "رەژی، زووخاڵ": خزمە دەگەڵ Kohle (G.)، Kolo (OG.)، coal (E.)، kol (Sw.)، kool (Nl.)، gūla (Ir.) و carbo (L.) "خەڵووز". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کۆڵوو kolu "نانی سووتاوی بووگەرەژی" و ↑کۆڵەوەژ kolewej "ئامرازی تێک وەردانی رەژی". بەپێی بۆچوونێک ئەم وشانە دەبێ لە ریشەیەکەوە هاتبن بە مانای "ئاگر، هایسان". هەروەها وشەی ↑کل kıl "خۆڵەرەشەی چاوڕشتن" لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**خەڵۆتە xelote** [ *xalota* ] - "ئەشکەوت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑خەڵوەتی xelwetî.

**خەلە xele** [ *xala* ] - "دەغڵ و دان": لەوانەیە وشەیەکی بە ئەسڵ کوردمادی بێ، بڕوانە ↑کەڵپک kelpık 1 "1- تۆکڵی دەخڵ و دانی هاڕاو 2- قرتماخەی سەر برین (تۆێخ)".

**خەلەف xelef** [ *xalaf* ] - "تیکولی دار، گەڵای دەوری گوڵی دار": خزمە دەگەڵ ↑خەلە xele "دەغڵ و دان" و ↑کەڵپک kelpık 1 "1- تۆکڵی دەخڵ و دانی هاڕاو". لەوە دەچێ وشەی غلاف ġalāf (Arb.) لەم وشەیە وەرگیرابێ.

**خەلەک xelek** [ *xalak* ] - "ئاڵقە": شێوەیەکی دیکە لە ↑هاڵقە/ ئاڵقە alqe /halqe.

**خەلیش xelîş** [ *xalīš* ] - "دارستانی چڕ و پڕ": خزمە دەگەڵ ↑کلۆش kıloş.

**خەڵێف xelef** [ *xalef* ] - "پلوورە، ماڵی مێشەنگڤین": ↑خلێف[1] xılêf یش دەگوترێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑گوربک gurbık و گوربە gurbe بە مانای "خەڵێف، کونی مێشەنگوین" بەکار دێ. لەوە دەچێ ئەم وشانەی دوایی شێوەیەکی کۆنتر لە ↑خەڵێف xelef بن. خزمن دەگەڵ ↑خەرابە xerabe و ↑کەلاوە kelawe و چەندین وشەی دیکە بە مانای "قووڵکە، کون و کەلێن" کە لەژێر ↑غوڕاب *ġurab* دا باس کراون.

**خەم xem** [ *xam* ] - "پەشێوی، دڵتەنگی": غەم ġem یش دەگوترێ. ġam (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑خومار xumar "لێڵ، داگیراو".

خەمتین **xemtîn** [ *xamtīn* ] - "کز بوونی ئاگر": هەروەها ↑خامۆش xamoş هەیە بە مانای "کووژاوە، ئارام، بێدەنگ". ئەم وشانە دەبێ پێوەندییان بە ↑کەم kem ەوە هەبێ.

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "کەم" و "کووژانەوە" بڕوانە ↑کز kız]

خەمڵاندن **xemlandın** [ *xamlāndın* ] - "خەرساندن، بەراورد کردن": خزمە دەگەڵ hamār (.Pl) و امار amar(.P) "هەژمار، ژمار". بنەوشەی خەمڵ -xemıl خزمە دەگەڵ ↑ژمار jımar. خەمڵین **xemlîn** [ *xamlīn*] - "جوان بوون": خزمە دەگەڵ gammeln (.G) "رزین، بڵ بوون، بێکەڵک بوون"، gammeln (.MNl) "پیر بوون"، gamol (.OE)، gammal (.Sw)، gammel (.Den) "پیر". ریشەی ژێرمەنی یان هیندوئەورووپی وشەکانی سەرەوە ساخ نەکراوەتەوە. وێ دەچێ وشەکە دە بنەڕەتدا مانای "پێگەیشتن یان پیر بوون"ی هەبووبێ. ئەم مانایە دە زمانی کوردمادیدا دە وشەی ↑گەمبۆڵ gembol دا پارێزراوە کە دەبێتە "1- گۆڵەسەگی پیر 2- زۆر پیری مووچەرمگ". دەشێ دواتر وشەکە دە زمانی کوردمادیدا مانای "بەخۆدا هاتن، جوان بوون"ی پەیدا کردبێ. ئەو وشانە هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ جمال camāl (.Arb) "جوانی" و کمال kamāl (.Arb). لەوانەیە ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەبێ.

خەنان **xenan** [ *xanān* ] - "پشکووتوو، کراوە": خزمە دەگەڵ ↑کەنین kenîn [پێکەنین pekenîn] سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەم کردنەوە".

[تێبینی: هەڵی سەنگینە دەگەڵ "باز" بە مانای "کراوە" و "بزە" بە مانای "زەردەخەنە"].

خەنجەر **xencer** [ *xanjar* ] - "کێردی تایبەتی شەڕ": خنجر xanjar (.P). دەشێ پێوەندی بە ↑ئەنجنین encınîn [هەنجنین] ەوە هەبێ.

خەنە **xene** [ *xana* ] - "بەری گیایەکە بۆ رەنگ کردنی موو بە کاری دێنن". هنە hıne و هەنە hene ش دەگوترێ. حنا ḧanā (.P). وشەکە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانیش و بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا henna (.G) دەگوترێ. بەگوێرەی فەرهەنگە ئەڵمانییەکان دەچێتەوە سەر ḧinna (.Arb). بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی خەنە رەنگێکی زەردی ئاماڵ سوور دروست دەکا، پێ دەچێ ئەسڵی وشەکە بچێتەوە سەر ریشەی هیندوئەورووپی < -*kn(e)ko* (.IE) "رەنگی زێڕ، زەردی وەک زێڕ"، ↑هەنگوین hengwîn و ↑کەنشت kenışt "جۆرێک مۆمی هەنگوین" لەم ریشەوە هاتوون.

خەوتن **xewtın** [ *xawtın* ] - "نووستن": خەفتن xeftın یش دەگوترێ. دە فارسیدا خفتن/ خوابیدن xābīdan (.P)/ xoftan (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ hypnos (.Gr) "خەو"، sopor (.L) "خەوی قووڵ"، sopire (.L) "خەو بردنەوە" سەر بە ریشەی < -*su(e)p* (.IE) "خەوتن". دە شێوەزاری زازاییدا بە خەو دەگوترێ هەون hewın.

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "خۆر"].

خەوخان **xewxan** [ *xawxān* ] - "وەڕەز و سست بوون": خزمە دەگەڵ ↑خاو xaw "شل و داکەوتوو".

خەوش **xewş** [ *xawiš* ] - "کەمایەسی، زەدە": دەشێ دەبنەڕەتدا ↑خەش xeş بووبێ و گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

خەون **xewın** [ *xawın* ] - "وێنەکانی کاتی خەوتن": دەچێتەوە سەر ↑خەوتن xewtın.

خەی **xey** [ *xay* ] - "وشەی دەربڕینی خۆشی و خۆشەویستی": ئۆخەی oxey یش دەگوترێ [ئۆ + خەی، دە فارسیدا اوخ āwax (.P)]. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑کەل *kel* و↑کەلکەلە kelkele "حەز و خولیا"، سەر بە ریشەی < -*ka** (.IE) "پێخۆش بوون، حەز لێبوون". ئەم ریشەیە دواتر ریشەیەکی نوێتری لێ دروست بووە کە بریتییە لە ریشەی -*karo** (.IE) "خۆش ویستن، حەز لێکردن". چەند وشەی وەک ↑کەل kel و↑کەلکەلە kelkele بۆ ئەم ریشە نوێیە دەگەڕێنەوە.

خەیار **xeyar** [ *xayār* ] - "هارۆ، هارووێ": شێوەیەکی دیکە لە هارۆ haro یان ↑هارووێ harwe.

**خەیدین xeydîn** [ *xaydīn* ] - "تووڕە بوون، رق هەستان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Haß (G.)، hatis (Gt.)، hete (OE.)، hate (E.)، hat (Sw.) "رق، بێزاری"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *kad- >*** "رق، پەژارە، ئازار". وشەی kedos (Gr.) "خەم، خەفەت" لەم ریشەوە پەیدابووە. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ héda- (OIn.) "تووڕەیی". لەوانەیە ↑خەجڵین xeclîn "شڵەژان"یش پێوەندی بەوشەکانی سەرەوە هەبێ.

**خیچ xîç** [ *xīč* ] - "فرۆ، ژەکی کوڵاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کشک keşık.

**خیچان xîçan** [ *xīčān* ] - "دۆڕان": [بۆ هێندێک کایە بە کاری دێنن وەک خەستەکێن]. لەوانەیە پێوەندی بە ↑هیچ ȟîçan ەوە هەبێ و مەبەست "بوونەوە بە هیچ"، "هیچ بۆ مانەوە" بێ.

**خیز xîz** [ *xīz* ] - "زیخ، چەو": خزمە دەگەڵ kies (G.) و kiesel (G.) و ceosel (OE.) "خیز"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *geis- >*** "خیز".

**خیزار xîzar** [ *xîzār* ] - "شەقەمشار، هەڕەی دووکەسی": خزار xızar یش دەگوترێ. بنەوشەی خیز -xîz بە شێوەی دیکە دە وشەکانی ↑خاش xaş [قاش qaş]، ↑کووز kuz، ↑گوێزان guwezan و هیتردا دەبیندرێ.

**خیزک xîzık** [ *xīzık* ] - "جەغز": شێوەیەکی دیکە لە ↑کۆز koz .

**خیزە xîze** [ *xīza* ] - "پێستەی روون تێکردن": ↑خیگە xîge ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خەز xez "پێستەی ئاژەڵ".

**خیزەران xîzeran** [ *xīzarān* ] - "لکی تازە دەرچووی دار": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑خێزیان xezyan "راست بوونەوە، هەراش بوون، باڵا کردن".

**خیگە xîge** [ *xīġa* ] - "پێستەی روون و پەنیر تێکردن": شێوەیەکی دیکە لە ↑خیزە xîze و خزمە دەگەڵ ↑خەز xez "پێستەی ئاژەڵ".

**خیلانگ xîlang** [ *xīlāng* ] - "دڕکێکە بۆ ئاگر کردنەوە بەکاری دێنن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەلەندر [کەلەندی kelendî] "مەڵەغان".

**خیم1 xîm 1** [ *xīm* ] - "بناخە، بەردی بناخە": شێوەیەکی دیکە لە ↑هیم hîm و دواجار ↑کەڤر *kevır* "بەرد".

**خیم2 xîm 2** [ *xīm* ] - "سینگ، گوڵمیخ": خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک کە ئاماژە بە "کوتان" دەکەن، وەک ↑قەمە *qeme*، ↑قیمە qîme، قەمچی qemçî [↑قامچی qamçî] و هتد.

**خێچ xeç** [ *xeč* ] - دەگەڵ "خوار" دێ و دەگوترێ خوار و خێچ xwar u xeç. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەکی دیکەشمان هەیە کە خزمن دەگەڵ ئەم وشەیە، وەک ↑خێس xes "مل خوار"، ↑قیچ qîç "خوار"، ↑گێژ gej "دە بنەڕەتدا واتا سەرسووڕاو، بەلاداهاتگ"، ↑کاس kas "سەر دە گێژەوە هاتوو" و هتد. دە فارسیدا کج kac (P.) "خوار" و گوژ gūž (P.) [گوژپشت واتا پشتکوور]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑کەژ kej "بلندایی، کێو"، ↑قۆز qoz "قیت و قنج". هەموو ئەو وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *keu- >*** "چەمانەوە، خوار بوون".

**خێر xer** [ *xer* ] - "چاک، چاکە": هەروەها نەخێر nexer هەیە وەک وڵامی دژی بەڵێ. کاتێک داخوازێک وڵامی ئەرێنی پێ دەدرێ، دەگوترێ"بەڵێ" یان "باشە". بەپێچەوانەوە وڵامی نەرێنی دەبێتە نەخێر [نە ne + خێر xer واتا "نەباشە"]. دیارە ئەم وەڵامی "نەخێر"ە، بەتایبەتی دە زمانی فارسیدا هێندێک جار کورت دەکرێتەوە و تەنیا دەگوترێ "خێر" [خێر وا نابێ واتا نەخێر وا نابێ]. وشەی "خێر" وێ دەچێ وشەیەکی بە ئەسڵ کوردمادی بووبێ، چونکوو ئەم وشەیە دە زمانە ئەوروپییەکانیشدا هەر لە کۆنەوە هەبووە. خێر خزمە دەگەڵ heil (G.)، wohl (E.)، hails (Gt.)، celyj (Rus.). ئەم وشانە بەم مانایانە بەکار دێن: "تەواو، باش، چاک، ساخ، دروست، بێ کەم و کورتی". هەموو ئەم مانایانە پێوندی تەواویان بەیەکەوە هەیە. بۆ وێنە "قسەکەت زۆر تەواوە" مانای ئەوەیە "قسەکەت زۆر باشە" یان

"تەندروستی" هەمان لە "لەش ساخی"یە، یان "چاك کردنەوەی شتێك یان نەخۆشی" جگە لە "ساغ کردنەوە و نەهێشتنی کەم و کورتی" چیتر نییە. مانای "باشی و چاکی" دە وشە ژێرمەنییەکاندا پڕ بەرچاوە، بۆ وێنە heilen (G.) "چاك کردنەوەی نەخۆش"، heilig (G.)، holy (E.) "پیرۆز". دە زمانی کوردمادیشدا "چاك" مانای "پیرۆز" دەبەخشێ [چاك و پیر] و ژنان بەتایبەتی دەچنە سەر چاك و پیران تاکوو بەختیان چاك بێ یان لە نەخۆشی چاك ببنەوە. Heil (G.)، ha l (OE.) دەبێتە "بەختی چاك، بەختەوەری". Heil Hitler سڵاو کردن لە هیتلێر بووە بە مەبەستی بەخت و چاکەخوازی بۆی [یان بەو مەبەستە کە ئەو چاك و پیرۆزە و سەر چاوەی خێر و بەختەوەرییە بۆ گەل؟]. دە زمانی کوردمادیدا "بەخێر"یش بەفراوانی بەکاردێ: بەخێر هاتی، بەخێر چی، بەخێر گوزەرا و هتد. لەم بارەوە دوو وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا سەرنج رادەکێشن کە دەبێ ئەوانیش لەم پێوەندییەدا لێك بدرێنەوە، واتا ↑چارە *çare* "1- بەخت 2- ساخی" [چارە کردن واتا ساخ کردنەوە]، و↑چلیان çılyan "دروست بوون". ئەوەی لێرەدا زۆر سەرنجراکێشە ئەوەیە کە مرۆڤانی کەونارا بە شێوەیەکی ئاوەزمەندانە چەمکەکانی "بەخت و بەختەوەری، ساخی و تەندروستی، چاکە و پیرۆزییان" خستووەتە ناو یەك چوارچێوەی فیکرییەوە!

**خێرا xera** [ *xerā* ] - "بەپەلە، گورج و گۆڵ، تیژڕەو": خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑هەڕا hera [هەڕا کردن]، ↑هێرش herış و هتد.

**خێز xez** [ *xez* ] - "خشڵ، زێر و زێو": خزمە دەگەڵ ↑خشڵ xışıl و هەروەها ↑خەزێنە xezene.

**خێزان xezan** [ *xezān* ] - "ماڵبات، بنەماڵە": خزمە دەگەڵ خویش xīš (P.) بە مانای"خزم". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان بە ↑خات xat ەوە هەبێ [خات یان خاتوون دە بنچینەدا بە مانای جووت، هاواڵ، هاوسەر بووە].

**خێزیان xezyan** [ *xezyān* ] - "1- هەستان، رابوون 2- هەراش بوون، باڵا کردن": بڕوانە ↑ئاخێز axez.

**خێس xes** [ *xes* ] - "مل خوار": هێس hes ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑خێچ xeç.

**خێشاندن xêşandın** [ *xešāndın* ] - "وە درەنگی خستن": خزمە دەگەڵ ↑کیشان kêşan [درێژە کیشان].

**خێشك xêşk** [ *xešk* ] - "تەختەی هەموار کردنی شێوەرد": هەروەها خێش xêş هەیە بە مانای "شەنەی دەم بە قولاپ کە شتی گرانی پێ رادەگرن". خیش xīš (P.) "ئامرازی دەمخوار بۆ کێڵانی زەوی". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑هێچك heçk "قوڵفەداری سەری گوریس".

**خێل xel** [ *xel* ] - "چاوخوار": خزمە دەگەڵ scheel (G.) دە بنەڕەتدا بەمانای "خێل" و schielen (G.)، scīelan (OE.) "خێل بوون" و skelgja (OIs.) "خێل کردن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)kel- >*** "خوار و خێچ، بادراو، وەرگەڕاو". خزمە دەگەڵ ↑شەل şel و ژمارەیەك وشەی دیکە.

**خێڵ1 xel** [ *xel* ] - "هۆز، عەشیرە": مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "حەشامەت و ئاپۆرە"یە. هەروەك چۆن وشەکانی حەشامەت و ئاپۆرە دە بنچینەدا ئاماژە بە مانای "زۆری و پڕانی" دەکەن، هەربەم جۆرەش "خێڵ" دەتوانێ پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑گەل gel "1- زۆری، پڕانی، فرەیی 2- ئاپۆرە، خەڵك".

2- خیلی xeylî (P.) "زۆر، گەلێك".

3- ↑کەیل keyl "پڕ". ["پڕ" خزمە دەگەڵ "ئاپۆرە"].

[تیبینی: شیاوی باسە گەلێك لەو وشانەی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا مانای "کۆمەڵێك مرۆڤ یان ئاژەڵ" دەبەخشن، دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی ئاماژە بە چەمکی "زۆر و زەوەندی" دەکەن، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا وشە ئاپۆرە، پۆل، پلوورە وهیتر دەچنەوە سەر وشەی "پڕ" بە مانای زۆر و زەوەندی].

**خێڵ2 xel** [ *xel* ] - "خول": دڵ دە خێڵەوە هاتن واتا دڵ شێوان. شێوەیەکی دیکە لە ↑خول xul و هەروەها ↑خێل xel "چاوخوار".

**خێلی xelî** [ *xelī* ] - "1- رووبەند، پەچە 2 - سێبەر، تەم 3- تارای بووک":

1- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Schleier (G.)، sleier (MG.) "پەچە، تارا، چارشێوی راهیبەکان". ریشەی ئەم وشە ئەڵمانییە ساخ نەکراوەتەوە.

2- لە لایەکی دیکە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ هالە hale (P.) "خەرمانەی مانگ، تەم و مژی دەوری مانگ" [بروانە ↑ هاڵان halan].

**خێو xew** [ *xew* ] - "خاوەن": شێوەیەکی دیکە لە ↑خاوەن xawen.

**خێوران xewran** [ *xewrān* ] - "توانەوە(ی خۆراکی)": [دە بنەڕەتدا: ورد بوون، هاڕدران]، خزمە دەگەڵ ↑هێڤڕ hêvır "هاڕین، ورد کردن"، هێڤران hevran "باراش، زمهەڕ"، ↑کەڤر kevır "بەرد"، ↑کەمرە kemre و ↑حەمرین *ħemrîn* و چەندین وشەی دیکە بە مانای "سەخت، رەق، بەردین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(a)k(a)men- (IE.)** "بەرد". وشەی ↑ئاش aş یش هەر لەم ریشەوە هاتووە و دە بنەڕەتدا مەبەست "بەرداش"ی ئەمڕۆ بووە. هەروەها هەسان hesan "بەردی تیژکەرەوە" لەم ریشەوە هاتووە. مەبەست لە "هێڤڕ" کردن لە بنەڕەتدا کوتان و ورد کردن بە بەرد [بەرداش] بووە. وشەی هێڤڕ hêvır "هاڕین، ورد کردن" بە شێوەیەکی دیکەش گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووەتە ↑هەپروون heprun "ورد و خاش" [هەپروون بە هەپروون بوون، واتا ورد و خاش بوون]. دە زمانی ئەڵمانیشدا Hammer (G.) "چەکوچ، کوتک" و hämmern (G.) "کوتان، کوتک لێدان" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "توانەوە (خۆراک)" و "ورد کردن، ورد کران" هەڵی سەنگینە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە کە بەیەکەوە خزمن: *هەرستاندن* "ورد و خاش کردن، شکاندن"، *هەرشان* "لەبەر یەک بڵاو بوون، پلیخانەوە، هەلا بە هەلا بوون"، *هەرسەک* "هەزم، تاوانەوەی خۆراک". هەروەها سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "ورد کردن" و "ئاش" بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشە خزمەکانی خوارەوە، واتا ماردن mardın [مارین marîn، ماردین mardîn] "کوتان، لێدان، شکاندن، ورد کردن"، مەردان "چەکوچ"، ↑مەرچاندن merçandın "پڵیخاندنەوە"، سمەر sımer "ساقەتەدەغڵی وردکراو، کا". ئەم وشانە دەگەڵ Mühle (G.) "ئاش" خزمایەتی پەیدا دەکەن].

## د (D)

**د1 da** ﹝dā﹞ - پێشگری کردار بۆ ئاماژە کردن بەلای خوارەوە [بۆ وێنە دانان، دانیشتن، داگەڕان وهتد]. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی کە ئاماژە بە قووڵایی یان بە لای خوارەوە دەکەن، وەک↑تەشک teşk[تەشک و داوێن]، ↑تەشق teşq [تەشقی ئاسمان واتا بنی ئاسمان، قووڵایی ئاسمان] و تە tah ﴾P.﴿ "بنەوە، خوارەوە". دواتر خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî "خەندەک، رەهەند، گۆڕیچە"، tief ﴾G.﴿، tiuf ﴾OG.﴿، diup ﴾Gt.﴿، deep ﴾E.﴿، djup ﴾Sw.﴿، dubus ﴾Lit.﴿ "قووڵ، رۆچووک"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *dheu-b- >*** "قووڵ، هەڵۆڵ". وشەی عەرەبی تحت taħt ﴾Arb.﴿ "لەژێر، لەخوار" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. لەوانەیە وشە عەرەبییەکە وەرگیراو بێ.

**د2 da** ﹝dā﹞ - [دا بدە da bıde، دا وەرە da were ...]. دە زمانی ئاخافتنی فارسیدا de ﴾P.﴿ دەگوترێ [د برو de boro، د بیا de bīyā]. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑دە[3] de [ dı ] وەک نیشانەی کردار لە کاتی ئێستادا [دەڕۆا derwa، دەبات debat، دەگرێ degre و هتد]. ئەم وشانە ئاماژە بە برگەیەکی زەمانی دەکەن، واتا کاتێکی داریکراو. خزمن دەگەڵ هێندێک وشە وەک ↑دەم *dem*، ↑تەمەن temen، ↑تاو taw، ↑تاف taf ﴾تافی لاوی﴿، ↑دال1 dal "جار، کەڕەت" و هتد.

[تیبینی 1: دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ گەیاندنی مانای "دا" [دا وەرە] وشەی Mal بەکار دێ، کە خۆی مانای "جار" دەدا: komm mal "دا وەرە"، hör mal "دا گوێ بگرە"و هتد. [Mal ی ئەڵمانی لەباری مانا و شێوەی دارشتنەوە بەراورد بکە دەگەڵ دال1 dal]. دەبینین دە زمانی ئەڵمانیدا وشەیەک بە مانای "جار" لە جێگەی "دا"ی کوردمادی بەکار دەهێنرێ. چەمکی "جار" و "دا" [واتا دەم، دەمێکی دیاریکراو] پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و هەر بۆیە وشەکانی دەربڕی ئەم دوو چەمکە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا خزمن. وشەی "جار" بۆ وێنە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی ئەو زمانانە بە مانای "دەم، تەمەن". هەر کام لە وشەکانی "دا / دە" و "جار" سەرەڕای هاوپێوەندی لە مانادا دەچنەوە سەر ریشەیەکی تایبەت بە خۆیان. نیشانەکانی "دا" [دا وەرە]، "دە" [دەڕۆم]، ↑دێ[2] de [دێ بچم dê bıçım]، دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا بۆ ئاماژە بە کاتی داهاتوو] هەمووی پێوەندی بە چەمکی "دەمێکی دیاریکراو" پەیدا دەکەن و خزمن دەگەڵ وشەی "دەم". دە زمانی فارسیدا لەجیگەی "دە" [دەڕۆم] لە نیشانەی می mī ﴾P.﴿ کەڵک وەردەگیرێ، بۆ وێنە می روم mī ravam ﴾P.﴿ "دەڕوم". ئەم نیشانە فارسییە خزمە دەگەڵ وشە ئەڵمانییەکەی سەرەوە، واتا Mal ﴾G.﴿. وەک دەبینرێ لە زمانی کوردمادی و فارسیدا کەڵک لە دوو وشەی جیاواز وەردەگیرێ، بەڵام ئەم وشانە هەردووکیان پێوەندی بە چەمکی "کات(ێکی دیاریکراو)" پەیدا دەکەن. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑محەل mıħel "1- دەم، کات 2- جار، کەڕەت" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. جێی ئاماژەیە کە وشە "محەل" هاوکات هەر دوو مانای "دەم" و "جار" لە خۆ دەگرێ و ئەمەش پێوەندی ئەم دوو چەمکە بە یەکەوە پشتراست دەکاتەوە. تیبینی 2: بەکار هێنانی وشەی ئینگلیزی now "نها" لە رستەی کاتی ئێستادا شتێکە وەک نیشانەی "دە" [دەڕۆم] دە زمانی کوردمادیدا و ئەویش ئاماژە بە چەمکی کاتی ئێستا لە رستەکەدا دەکا. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی gerade بەکار دەهێنرێ، وەک Ich gehe gerade nach Hause "من نها دەچمەوە ماڵ". خودی وشەی gerade بەڵام دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "رۆیشتن، خلۆر بوونەوە، بزوانێ بە لەز و خێرا" [خزمە دەگەڵ "رێ"] و دە بنەڕەتدا بە مانای "بەپەلە، خێرا" هاتووە و مەبەست گەیاندنی مانایەکی وەک "زوو، بێ دواکەوتن" بووە، وەک ئەوەی بڵێی "من هەر ئێستا دەرۆم"].

داب **dab** *[ dāb ]* - "ڕەسم، یاسا و ڕێسا"؛ دەگەڵ "نەریت" دێ [داب و نەریت]. داپ dap یش دەگوترێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی کە چەمکی "نووسین و نووسراوە" دە خۆیان دەگرن، وەك ↑دەبیر debîr، ↑دەفتەر defter، ↑دیباچە dîbaçe، ↑دەبستان debıstan، ↑دیوان dîwan [دیوانی وەفایی]، ↑ئەدەب *edab* و هتد. دە زمانی پەهلەویدا dīp (.Pl) بە مانای "نووسراوە" هاتووە. بەم پێیە دەردەکەوێ کە وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "نووسراوە" بووە و دیارە لێرەدا مەبەست لە نووسراوە یاسا و قانوون بووە، بە وتەیەکی مەبەست ئەو قانوون یان قانوونانە بوون کە نووسراونەتەوە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "یاسا" کە وشەیەکی تورکییە و دە ئەسڵدا مانای "نووسین" دەدا. وشەکە هەروەها دەگەڵ "دەستوور" دێ [داب و دەستوور]. مانای "دەستوور"یش هەر وەك "داب" دەبنەڕەتدا "نووسراو(ە)" بووە و لەوێوە دواتر مانای "فەرمان، یاسا و قانوون" سەری هەڵداوە.

دابڕسکان **dabırıskan** *[ dābırıskān ]* - "پەلامار بردن (بۆ ڕفاندن)"؛ داپڕسکان dapırıskan یش دەگوترێ. هەروەها ↑دابەڕزاندن daberzandın هەیە بە مانای "هەڵمەت بردن". دا + برسکاندن da+ bırıskandın. خزمە دەگەڵ ↑پڕووسکان pıruskan "لەبەر یەك هەڵوەشان" [دەبنەڕەتدا: پەرژ و بڵاو بوون]. و دەگەڵ ↑پرژان pırjan، پڕووسکە pıruske "پڕیشکی ئاگر، ئاورینگ"، spritzen (.G) "پرژان، فیچقان، دەرپەڕینی ئاو و ئاگر"، sprutze (.G) "پڕیشکی ئاگر". ئەم وشانە وێ دەچێ دواجار دەگەڵ ↑پەڕین perîn پێوەندییان هەبێ.

دابەڕزاندن **daberzandın** *[ dābarzāndın ]* - شێوەیەکی دیکە لە ↑دابڕسکان dabırıskan.

دابەزین **dabezîn** *[ dabazīn ]* - "هاتنەخوار"؛ پێك هاتووە لەپێشگری دا + بەزین da + bezîn. کەرتی "بەزین" خزمە دەگەڵ ↑بزوان bızwan [بزووتن bızûtın] و چەندین وشەی دیکە بە مانای "جووڵان، ڕۆیشتن". پێشگری "دا" ئاماژە بە لای خوارەوە دەکا. بەم جۆرە "دابەزین" ماناکەی دەبێتە بزوان، جووڵان بەرەو خوارەوە.

دابین **dabîn** *[ dābīn ]* - "1- ساز، ئامادە، پێکهاتوو 2- ئارام، ئۆقرەگرتوو"؛ دەشێ وشەیەکی خوازراو بێ < *تامین ta'mīn* (.Arb).

داپڕۆسکان **dapıroskan** *[ dāpıroskān ]* - "ڕووت بوونەوەی لکەدار یان هێشوو لە گەڵا یان دەنك"؛ داپڕۆزقان dapırozqan و داپڵۆسکیان dapıloskîyan یش دەگوترێ.

1- بینجی وشەکە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑وەرساندن wersandın "پچڕاندن" و ↑وێرت wert "لەوەڕگە".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑پڕووسکان pıruskan "لەبەر یەك هەڵوەشان".

داپسکان **dapıskan** *[ dāpıskān ]* - "1- بەکزی کرۆشمە کردن 2- فس خواردنی مریشك بۆ کەڵەشێر"؛ دا + پسکان da + pıskan. کەرتی یەکەم پێشگرە. کەرتی پسکان pıskan خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە چەمانەوە، داهاتنەوە و خوار بوونەوە دەکەن، وەك ↑فس² fıs خواردن، ↑فیزانەوە fîzanewe، ↑بەزین² bezîn "دۆڕان" [دەبنەڕەتدا: داهاتن، چەمانەوە] و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەك وشەی دیکە وەك ↑*بازنە bazne* و ↑باسك bask.

داپلۆخان **dapıloxan** *[ dāpıloxān ]* - "پێست فڕێ دان بەهۆی سووتانەوە"؛ دا + ↑پلۆخان da + pıloxan. پێشگری "دا" دە چەندین کرداری دیکەشدا ئاماژە بە "لێبوونەوە" دەکا، وەك داکەندن، دارنین، داتاشین، داهێزان و هتد. پلۆخان pıloxan خزمە دەگەڵ ↑پۆلکە polke [پۆرگ porg] و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بەمانای "پێست" یان بەگشتی ئەوەی شتێك دادەپۆشێ.

داپڵۆسین **dapılosîn** *[ dapılosīn ]* - "لێدانی توند، دارکاری کردن"؛ پێشگری دا + پڵۆسین da +pılosîn. خزمە دەگەڵ fluchen (.G) "نەفرین کردن" [دە بنەڕەتدا: "لێدان، بەدەست لە سینگی خۆ دان لە کاتی تووك و نزا کردندا"]، flocan (.OE)"لێدان"، flokan (.Gt)"سکاڵا کردن [دەبنەڕەتدا: "خەمگینانە لە سینگی

خۆ دان"]، plage (L.)"زەبر" و plangere (L.)"لێدان، خەمبار بوون"، plessein (Gr.)"لێدان"، سەر بە ریشەی *(IE.) *plak- >* "لێدان، بریندارکردن". وشەی ↑بەڵا bela ش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و مەبەست دە بنەڕەتدا "زەبر و زیان"ی چارەنووس و رۆژگارە.

داپیتن **dapîtın** [ *dāpītın* ] - "هەڵپەرتاوتن، لێدانی لك و پۆپی دار": پێشگری دا + پیتن da + pîtîn. کردارەکە خزمە دەگەڵ ↑پاچین paçîn [هەڵپاچین helpaçîn، داپاچین dapaçîn].

داترووسکان **datırûskan** [ *dātırûskān* ] - "راچەنین لە ترسان": دا + ترووسکان da + tırûskan. "ترووسکان" لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ترس1 tırs "دڵەراوکێ، سڵەمینەوە".

داتسیان **datısyan** [ *dātısyān* ] - "داهاتن (ی نیزیك بە رووخان)" [دیوارەکە داتسیاگە]. پێشگری دا + ↑تسیان da + tısyan.

داتەپین **datepîn** [ *dātapîn* ] - "قووپاو، رۆچوو": داتەپکین datepkîn ش دەگوترێ. بڕوانە ↑تەپین tepîn.

داچەکان **dačekan** [ *dāçakān* ] - "سیس و مل کز بوون": پێشگری دا + چەکان da + çekan. کرداری چەکان çekan شێوەیەکی دیکە لە ↑ژاکان jakan.

داچەلاندن **daçelandın** [ *dāčalāndın* ] - "شۆڕ کردنەوە، شل کردن": ↑دا da + ↑چەلاندن çelandın.

داخ **dax** [ *dāx* ] - "1- ↑داغ daġ 2- کوڵ و کەسەر": وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "سووتان"ە و لێرەوە مانای "کەسەر"یش دروست بووە، چونکە خەم و کەسەر و ناخۆشی وەك سووتانی دڵ و دەروون چاو لێکراوە. دە زمانی کوردمادیدا هێندێك ئیدیۆم ئەم پێوەندییە بەباشی دەردەخەن، وەك زگ پێ سووتان، جەرگ سووتان، داخ لەدڵ، داخ لەسەردڵ دانان و هتد.

داخورپان **daxurpan** [ *dāxurpān* ] - "ترسان و شڵەژانی توند بە خەبەری ناخۆش، دڵ داکەوتن": بڕوانە ↑خورپە xurpe.

داد **dad** [ *dād* ] - "حوکمی رەوا، عەداڵەت": پێش ئەوەی بچینە سەر شی کردنەوەی وشەکە، پێویستە تێبینییەك بخەینە روو:

[دە زمانی ئەڵمانیدا چەند وشەیەك لە پێوەندی دەگەڵ ئەم باسەدا سەرنج رادەکێشن. ئەم وشانە بریتین لە Teil (G.) "بەش، تیکە"، teilen (G.) "بەش کردن، لەت کردن"، verteilen (G.) "بڵاو کردنەوە، دابەشین، وەشاندن"، erteilen (G.) "دان، پێدان"، mitteilen "(پێ)راگەیاندن"، Urteil (G.) "حوکم"، verurteilen (G.) "مەحکووم کردن"، beurteilen (G.) "حوکم دان، داوەری کردن" و هتد. وەك لەم وشانەدا بۆمان دەردەکەوێ، دە زمانی ئەڵمانیدا چەمکی "حوکم و داوەری" [دادوەری] پێوەندی هەیە بە چەمکی "بەش کردن، دابەشین، پێدان". دە ڕاستیدا "حوکم"ی دادگا یان جڤاتێکی یاسایی وەك شتێك سەیر کراوە کە دراوە یان بەش کراوە [دابەشراوە] بەسەر لایەن یان لایەنەکانی کێشەیەکدا].

دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا دەبێ پێوەندییەکە هەر بەم چەشنە بووبێ. وشەی "داد" دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "حوکم" بووبێ، واتا ئەو قەرارە کە جڤاتی یاسایی *داویەتی*. پاشان وشەکە ماناکەی لە "حوکم"ەوە گۆڕاوە بۆ "عەداڵەت". ئەو گۆڕانەش بێگومان لەوەڕا هاتووە کە دەسەڵاتداران و کاربەدەستانی گوێڕایەڵی ئەوان لە هەموو سەردەمەکاندا حوکم و قەراری خۆیان وەك شتێکی رەوا و دادپەروەرانە بردووەتە ناو مێشکی مرۆڤەکان و بەم جۆرە ئیتر "حوکم" مانای "عەداڵەت"ی وەرگرتووە و تەنانەت جێگەی ئەویشی گرتۆتەوە! لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دان dan "پێدان، بەش دان". وشەی ↑دانەر daner [دانەر بەمانای "حاکم" و دانەر کردن بە مانای "محاکەمە کردن"] دە زمانی کوردمادیدا ئەو بوچوونەی سەرەوە پشتراست دەکا. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا وشەی "داد" هەروەها مانای "هاوار"یشی وەرگرتووە. دە کوردمادیدا بۆ وێنە دەڵێن "هەی داد لە دەست چەرخی چەپگەرد، هەی داد لە دەست زاڵم و زۆردار، هەی داد لە دەست پیاوی نامەرد، هەی داد لە دەست کوردی

خۆفرۆش" و هتد. لەم رستانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە "داد" دەگەڵ "هاوار" بە مانا گشییەکەی خۆی یەکسان نییە، بەڵکوو هاوارێکە لە دەست نارەوایی و نادادپەروەری، هاوارێکە بۆ گەیشتن بە ماف و حەقی رەوا. ئەم مانایە دەبێ لێرەوە سەرچاوەی گرتبێ کە مرۆڤەکان لە کاتی تووش بوون بە ناڕەوایی مەزندا بە دەنگی بەرز هاواریان کردووە و گوتوویانە "هەی داد"، واتا مەبەستیان "بانگ کردن"ی عەداڵەت بووە، مەبەستیان ئەوە بووە بڵێن "عەداڵەت لە کوێیە"، "کوا عەداڵەت کە ئێمە لەم دۆخە نارەوایە رزگار ناکا". ئیتر لێرەوە مانای وشەکە گۆڕاوە بۆ "هاواری ئاریکاری خواستن" [دە ئەسڵدا: هاواری دادخوازی] و دواتریش "هاوار" بە گشتی. دە کوردمادیدا دەگوترێ "بە داد گەیشتن"، دە فارسیدا "بە داد رسیدن" be dād rasīdan (P.) واتا "بە هاوارەوە چوون، بە فریا گەیشتن". دە فارسیدا مانای وشەکە گۆڕاتیکی زۆرتری بەسەردا هاتووە و هەروەها بەگشتی بە مانای "قیژە، زیقە"ش بەکار دێ: داد زدن dād zadan (P.) "قیژاندن، زیقاندن" [جا بە هەر هۆیەکەوە بێ].

دادار **dadar** *[ dādār ]* - دە فەرهەنگی فارسیدا وشەکە دوو مانای بۆ دیاری کراوە: 1- عادڵ، دادوەر(انە) 2- بەدیهێنەر". وشەکە دەشێ پێوەندی بە ↑داد dad "عەداڵەت"ەوە هەبێ. مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "حوکمدەر، قەراردەر، حاکم" بووبێ. دواتر کاتێک باس لە "داداری جیهان" کراوە، مەبەست "خودا" بووە کە لە روانگەی خوداپەرستانەوە حوکم و قەراری جیهانی بە دەستەوە و بڕیاری رەوا لەسەر هەموو کار و باری جیهاندا دەدا. کەوابوو وشەکە دە ئەسڵدا بە مانای "بەدیهێنەر" نییە و ئەم مانایە دواتر پەیدا بووە.

دادە **dade** *[ dāda ]* - "خوشکی گەورە": وشەکە لە زمانی زارۆک وەرگیراوە و لە دووبارە بوونەوەی دەنگێک دروست بووە کە زارۆک گڕ و گاڵی دەکا. دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا و بەتایبەتی دە زمانی کوردمادیدا چەندین ناوی کەسانی سەر بە بنەماڵە بەم چەشنەی سەرەوە دروست دەبن، وەک بابە babe، کاکە kake، مامە mame، نەنە nane، یایە yaye. هێندێک جار ئەم ناوانە ماناکەیان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە دەگۆڕدرێ، بۆ وێنە "دادە" دە کوردمادیدا "خوشکی گەورە"یە، دە ئینگلیزیدا daddy ناوە بۆ "باوک"، یان "مامە" دە کوردمادیدا "برای باوک"ە، دە فارسیدا "ماما" ناوە بۆ "دایک".

دار **dar** *[ dār ]* - "درەخت": دە فارسیدا درخت deraxt (P.). خزمە دەگەڵ tree (E.)، treo (OS.)، trin (Got.)، dóry (Gr.)، derevo (Rus.) "دار"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *deru- >*** "دار". وشەی ↑درەخت dırext یش کە دە زمانی کوردمادیدا لە لاوە بەکار دێ، هەرلەم ریشەوە هاتووە.

[تێبینی: شیاوی باسە دە کتێبی شانامەی فیردەوسیدا وشەی دار هەروەک ئەمڕۆی زمانی کوردمادی بەکارهاتووە و گوتراوە "دارودرخت" [دار و درەخت] و "داروبرد" [دار و بەرد]. بەڵام وێ دەچێ زماناسە فارسەکان لە وشەی "دار" تێ نەگەیشتبن، یان بەزانین بە لایدا تێ پەڕیبن. لە کتێبێکی شانامە کە لەبەردەستم دایە (وەشانخانەی امیرکبیر، 1369هەتاوی) "دارو برد" وەک "سازوبرگ جنگی" واتا کەرەسەی جەنگی مانا کراوەتەوە! لە حاڵێکدا "داروبەرد"ەکەی شانامە هەر ئەو دار و بەردەیە کە دە زمانی کوردمادیدا هەیە و لە کاتی شەڕ، بەتایبەتی شەری پاڵەوانانی کەونارادا بەکار هێنراوە و تەنانەت لە سەردەمی ئێستاشدا، کاتێک دوو یان چەند کەس دەگەڵ یەکتر بە شەر بێن، ئەگەر دار و بەرد لەبەر دەستدا بێ، بۆ کوتانی یەکتر بەکار دەهێنن].

دارا **dara** *[ dārā ]* - "خاوەن": هەروەها دارایی darayî "سامان" و نەدار nedar بە مانای "هەژار، بێ سامان" بەکار دێ. دە زمانی فارسیدا وشەکە وەک کرداریش بەکار دێ: دارم dāram "هەمە"، داشتم daštam"هەمبوو". ئەم وشەیە دەبێ پێوەندی بە کرداری ↑دان dan ەوە هەبێ [پێدان]. رەنگە دە بنەرەتدا مەبەست لە "دارا" هەمان "پێدراو" بووبێ واتا کەسێک کە لە لایەن دەسەڵاتێکەوە سامانی پێ دراوە. شیاوی سەرنجە کە دە کوردەواریدا کەسانی ساماندار بە وشەی "خواپێدراو"یش بەناو دەکرێن.

دارانەوە **daranewe** [ *dārānawa* ] - "بوورانەوە، لەسەر خۆ چوون": دە فارسیدا بە دارانەوە یان بوورانەوە دەگوترێ "غش کردن". ئەم وشە فارسییە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک "گەشکە" [گەشکە گرتن]، "کاس" [کاس بوون]، "گێژ" و هتد. ئەم چەند وشەیە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، خوار بوونەوە، با دران". دۆخی بوورانەوە دۆخێکە کە مرۆڤ سەری دە *گێژەوە* دێ و بە لادا دێ [*خوار* دەبێتەوە]. هەر بەم جۆرە وشەی "دارانەوە" خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑تلان tılan "سووڕان"دا باس کراون و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سووڕان، با دران".

داڕسان **darısan** [ *dārısān* ] - "پەلامار بردن": دارسکان darıskan یش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ ↑راسان2 rasan "هەستان، راست بوونەوەی خێرا". ["لێی راسا" واتا لێی هەستایە سەر پێیان بە مەبەستی پەلامار دان].

دارسکاندن **darıskandın** [ *dārıskāndın* ] - "گرتن و بە زۆر بە زەویدا راکێشان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رەسین resîn "پێگەیشتنی میوە و دەغڵ" و رسیدن resîdan (.P) "گەیشتن"، سەر بە ریشەی < *reg- *(IE.)* "لەبەر یەک کشانەوە، درێژ بوونەوە". بەم جۆرە مانای بنەڕەتی وشەکە "کێشان، راکێشان"ە.

دارۆ **daro** [ *dāro* ] - "دەرمان(ی حەمام) بۆ تووک هەڵگرتن": دارو dārū (.P) "دەرمان". دەشێ خزم بێ دەگەڵ drouge (.Fr) "دەرمان". شیمانەی ئەوە دەکرێ کە وشە فەرەنسەییەکە خزم بێ دەگەڵ trocken (.G) "هیشک" و دە بنەڕەتدا مەبەست "شتی هیشکراو" بووبێ. لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ترس[2] tırs "هیشک" [نانی بترسی واتا نانی بە هیشکی].

دارۆغە **daroġe** [ *dāroġa* ] - "بەڕێوەبەری ئاسایشی شار": داروغە dārūġe (.P). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Truchseß (.G) "بەڕێوەبەری کاروباری دەربار و دیوەخان" [لە سەدەکانی ناویندا]. ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر ریشەیەک کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای "گەل، ئاپۆڕە" بەکار هاتووە، وەک truht (.OG)، dryht (.OE)، drōtt (.OIs). ئەم وشە ژێرمەنییانە هەروەها جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ ↑ترێ tırê. مەبەست لە ترێ دە بنەڕەتدا "هێشوو" بووە، واتا "هەشیمەتێک" لە دەنکەکان.

دارە(دارە) **dare** [ *dāradāra* ] - دارەدارە کردن واتا تازە پێ گرتنی زارۆک. دەچێتەوە سەر ریشەی < *dher- *(IE.)* "راگرتن، وەستاندن". وشەی dry (.E) "هیشک" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەچنەوە سە ریشەیەکی ئەوتۆ و سەرەتا مەبەست لەم وشانە "خۆگرتوو، لە شلکی هاتنەدەر و رەق بوون" بووە. دیارە مەبەست لە دارەدارە کردنی زارۆک ئەوەیە کە ئەو وردەوردە هەڵدەستێتە سەر پێ، خۆی رادەگرێ و دەورەی شلکیی ساوایی تەواو دەکا.

دارێ **dare** [ *dāre* ] - "داسی دروێنە": خزمە دەگەڵ ↑دڕاندن dırandın "لەت کردن، پچڕاندن"، سەر بە ریشەی < *der- *(IE.)* "دڕاندن، قەڵشاندن، لێکردنەوە".

داس **das** [ *dās* ] - "ئامرازی دروێنەوان": داس dās (.P). وشەیەکی دیکەش کە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشێ، ↑تەشوێ teşwe یان دە فارسیدا تیشە tīša (.P) یە. هەروەها داسوو(کە) dasu(ke) هەیە بە مانای "پرزەی گوڵی گەنم و جۆ". ئەم وشەیەش دەگەڵ "داس" خزمە و ئاماژە دەکا بە "بڕین و تیژ چوون". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ.

1- ↑تاشین taşîn. لەم تێروانینەوە "داس" دەبێتە ئامرازی "تاشین"ی گژ و گیا، هەروەک چۆن "کوتک" ئامرازی "کوتان"ە، "ترپان" ئامرازی "دروێنە"یە، یان "چەقۆ" ئامرازی "شەق" کردنە.

2- dáśati (.OIn) "دەگەزێ" و dáknein (.Gr) "گەستن".

[تێبینی: پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان دوو چەمکی "گەستن" و "لێدان و قرتاندن"دا. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ "گەستن" وشەی beißen بەکاردێ کە خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان، قرتاندن، قەڵشاندن" و خزمیشە دەگەڵ "پسان"ی کوردمادی. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا "گاز" هەم مانای "گەستن" دەدا و هەمیش ئامرازێکە بۆ "قرتاندن"].

**داستان dastan** [ *dāstān* ] - "حیکایەت": داستان dāstān (.P) و دستان dastān (.P). ئەم وشەیە دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "پەرتووک، تیکەیەکی نووسراو، نووسراوی ناو پەرتووک" بووبێ. پاشان لەم مانایەوە مانای "حیکایەت" سەری هەڵداوە و سەرەتا مەبەست حیکایەتی نووسراو و هی ناو کتێبەکان بووە. کاتێک لەم وشەیە ورد دەبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە وشەکە پێوەندی بە ↑دەستوور destur ەوە پەیدا دەکا و مەبەست لەمیش سەرەتا "خەت، نقیس، نووسراو" بووە و دواتر مانای"فەرمان، یاسا"ی وەرگرتووە. ["یاسا" خۆی وشەیەکی تورکییە و سەر بە کردارێکە بە مانای "نووسین"]. "دەستوور" بریتی بووە لە نووسراوەیەک کە دەوڵەت یان دەسەڵات دەری کردووە. وشەکە پێوەندی هەیە بە چەندین وشەی دیکە بە مانای "شەقڵ، نیشانە، مۆر"، واتا مەبەست لە "نووسین" سەرەتا نیشان دان یان بەکار هێنانی "شەقڵ و نیشانە" بووە. وشەکانی سەرەوە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "نیشان دان، بەدیار خستن". وەک دەردەکەوێ ڕەوتی پەرە گرتنی ماناکان بەم جۆرەی خوارە بووە: "نیشان دان، بەدیار خستن"، پاشان "شەقڵ، مۆر، نیشانە، پیت"، پاشان "نووسین". لەم مانایەی دواییش دوو مانای دیکە سەریان هەڵداوە، یەکەم "قانوون، یاسا" و دووەم "حیکایەت".

[تێبینی: هەر ئەم پێوەندییانەی سەرەوە لە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا دەر دەکەوێ. بۆ وێنە وشەی ئەڵمانی buch یان بە ئینگلیزی book "پەڕتووک" سەرەتا بە مانای "نیشانە، هێما" بووە. لە زمانی ئەڵمانیدا Buchstabe مانای "پیت" دەبەخشێ و پێوەندی چەمکەکانی "نیشانە، شەقڵ"، "نووسین" و "پەرتووک" بەیەکەوە نیشان دەدا. هەروەها لە زمانی لاتینیدا littera مانای "پیت" دەبەخشێ و litteratura "ئەدەبیات، شتی نووسراو، وێژەوانی" لەم وشەیە وەرگیراوە. هەروەها ئەگەر لە وشەی کوردمادی "داب" (داب و دەستوور) بنوارین، دەبینین کە خزمە لەگەڵ "تیپ" (واتا پیت) و "دیباچە"، "دەفتەر"، "دەبستان"، "دەبیر" و هیتر کە گشتیان چەمکی "نووسین و وێژەوانی" لەخۆ دەگرن].

**داسوو dasu** [ *dasū* ] - "پرزەی گوڵی گەنم و جۆ": داسووکە dasuke و داسە dase ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑داس das.

**داش1 daş** [ *dāš* ] - "کوورەی ئاسنگەر و پیشەسازان": خزمە دەگەڵ ↑تەش teş "ئاگر".

**داش2 daş** [ *dāš* ] - "مۆرە لە کایەی دامەدا": [داشەهارە]. وەک لەژێر وشەی "مۆرە"دا باس کراوە، ئەم وشەیە ئاماژە دەکا بە "شەقڵ و شێوە". هەر بەم جۆرە "داش"یش خزمە دەگەڵ ↑دژ2 dıj "شەقڵی خەرمان". لەوانەیە ئەم پارچەدار و تەختانە دە بنەرەتدا شێوەیان لە "مۆر" یان "شەقڵ" چووبێ و بۆیە ناوی "مۆر" یان "داش"یان لەسەر نرابێ، یان لەوانەیە وێنە و نەخش و نیگاریان لەسەر هەڵکەنرابێ و لەبەر ئەوە پێیان گوترابێ "مۆرە" یان "داش".

**داشقە daşqe** [ *dāšqa* ] - "ئامرازێکی گواستنەوەیە ئەسب رایدەکێشێ": درشکە doroške (.P). وشەکە لە زمانی رووسی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر drožki (.Rus) "داشقە". ئەم وشەیە کەوتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکان و ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ trochiscus (.L) و trokhiskos (.Gr) "چەرخی گچکە"، گچکێنراوی > *trokhos (.Gr)* "چەرخ". ئەم وشە یۆنانییە رەنگە خزم بێ دەگەڵ ↑تلان tılan سەر بە ریشەی > ***ter-** (.**IE**)* "سووڕاندن".

**داعووران daεuran** [ *dāεūrān* ] - "قووت دان": دا + عووران da + εuran. کەرتی "عووران" شێوەیەکی دیکەیە لە قووران quran [↑قووڕاندن[2] qûrandın، هەڵقووڕاندن helqûrandın].

**داغ daġ** [ *dāġ* ] - "زۆرگەرم": داخ dax یش دەگوترێ. داغ daġ (.P). خزمە دەگەڵ Tag (.G)، dags (.Got)، day (.E)، dag (.Sw) "رۆژ" [بەرانبەری شەو]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > ***dhegu-** *(.**IE**)* " سووتان، داغ بوون، هایسان". لەم ریشەوە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشە بە مانای رۆژ واتا بەرانبەری شەو داندراوە و مەبەست ئاماژە کردن بە کاتێک بووە کە بەهۆی سووتان و هایسانی خۆرەوە هەرد گەرم دادێ. لەو ریشە هیندو ئەورووپییەی سەرەوە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا

هێندێک وشە کەوتوونەوە کە ئاماژە دەکەن بە سووتان و داغی و گەرم بوون، وەک dáhati- (OIn.) "داغ بوون، سووتان"، degti (Lit.) "سووتان"، dagas (Lit.) "هاوین، گەرمای هاوین" و لەوانەشە توش tûş (P.) "1- داغی 2- تین و هێز" و اتش ateş (P.) "ئاگر" [a + teş] وهتد.

[تێبینی: شیاوی باسە کە ئەگەر دە زمانە ژێرمەنییەکاندا تین و گەرمای خۆر وەک بنەمای دیاری کردن و ناو لێنانی رۆژ داندراوە، دە زمانە ئێرانییەکاندا دیاردەی تیشک و رووناکایی خۆر کراوەتە بنەما و وشەی "رۆژ" دە بنچینەدا ئاماژە دەکاتە چەمکی تیشک و رووناکی].

**دافەتان dafetan** [ *dāfatān* ] - "هەڵوەشان، داوەشان، لەبەریەک چوون": دا + ↑فەتان da + fetan.

**داکاسان dakasan** [ *dākāsān* ] - "ئارام گرتن، هەدا دان": دا + ↑کاسان da + kasan. جێی بەراورد کردنە دەگەڵ کز کردن kez kardan (P.) "هەڵکورمان، مات بوون".

**دال1 dal 1** [ *dāl* ] - "جار، کەرەت": خزمە دەگەڵ time (E.)، Zeit (G.) "دەم، کات"، timme (Sw.) "سەعات" [کاتی دابەشکراو، بەش بەشکراو، ئەندازەگیراو]، tide (E.) "جەزر و مەد، هەستان و نیشتنەوەی ئاوی دەریا" [دەبنەڕەتدا: کاتی دیاریکراو]، Zeile (G.) "دێڕ" [دەبنەڕەتدا: ریزێکی دابەشکراو]، Ziel (G.) "نیشانە، ئامانج" [دەبنەڕەتدا: دابەشکراو، ئەندازەگیراو]، till (E.)، till (Sw.) "تا، تاکوو". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دال2 dal 2 "بەردی نیشانە لە بەردەفڕکێدا" و ↑سیلە sîle [سیلە گرتن واتا نیشانە گرتن] و لەوانەشە ↑تا ta [هەتا، تاکوو]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *dā(i)- >*** "دان، بەشین، دابەشین، بەش بەش کردن". بەم جۆرە دەبنە خزمیش دەگەڵ ↑دان dan.

**دال2 dal 2** [ *dāl* ] - "بەردی نیشانە لە بەردەفڕکێدا": خزمە دەگەڵ ↑تیلە "مەڕمەڕ، مت" و ↑سیلە sîle [سیلە گرتن واتا نیشانە گرتن].

**داڵ1 dal 1** [ *dāl* ] - "خەرتەڵ": مەبەست دەبێ پەڵەوەری گەورەی راوکەر بێ. "داڵ" دە وشەی ↑داڵاش dalaş و بە جۆرێکی دیکە دە وشەی ↑خەرتەل xertel [داڵ، تەل]دا دەبینرێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑توور *tur* [تەیر و توور].

**داڵ2 dal 2** [ *dāl* ] - "دەنک لێکجودا": [ئەم هێشووە داڵە]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑تلێشان tılîşan دا باس کراون، بە مانای "لەت کردن، بەش کردن، قەڵشاندن".

**داڵاش dalaş** [ *dālšā* ] - "خەرتەل": ↑داڵ dal + ئاش aş. کەرتی aş- دە وشەی فارسی کرکس kerkes (P.) "داڵاش"دا دەبیندرێ. ئەم کەرتە وشەیە خزمە دەگەڵ Aas (G.) "گۆشتی کەلاک"، ās (MG.)، æs (OE.) "گۆشتی کەلاک، گۆشت بۆ خواردنی سەگ و باز" و æt (OE.) و āt (OIs.) "خۆراک، چێشت". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ essen (G.) "خواردن" و دەگەڵ ↑ئاش aş یان ↑ئاز az ی زمانی کوردمادی، ↑ئازووقە azuqe و چەند وشەیەکی دیکە.

**داڵان dalan** [ *dālān* ] - "رێگە و راهڕەوی سەرداپۆشراو": دالان dālān (P.). خزمە دەگەڵ Diele (G.)، dilla (OG.)، deel (Nl.)، dille (OE.)، tilja (Sw.) "راهرەو، داڵان، پێشخانە"، tel (OIs.) "هەرد، تەرکی زەوی"، tala-m (OIn.) "رووبەر، پانتایی"، tellus (L.) "تەرک، رووبەرە هەرد"، tiles (Lit.) "تەختەی بنی گەمێ"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *tel- >*** " رووبەر، پانتایی، تەرک". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەک ↑تاڵار talar، ↑تەرک terk "رووبەرە هەردی هۆدە"، تۆێڵ tuwel یان ↑تۆڵ tol "تیوچاوان"، ↑دۆڵ³ dol "پارچەزەوی راست" و هتد.

**داڵدە dalde** [ *dālda* ] - "پەنادان، وە خۆ گرتن": خزمە دەگەڵ dulden (G.)، dulten (OG.)، dolēn (OG.)، thole (E.)، tala (Sw.) "تەحەممول کردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ tolerare (L.) و tlēnai (Gr.) "تەحەممول کردن". بەم پێیە "داڵدە" دە بنەڕەتدا واتا تەحەممولی کەسێک یان شتێک کردن و پاشان ماناکە بووەتە تەحەممولی کەسێکی پەناخواز. شیاوی سەرنجە کە دە زمانی ئەڵمانیدا وشەکە لەپاڵ مانا گشتییەکەی هەروەها بۆ ئەو پەنابەرانەش بەکار دێ کە مانەوەیان لە ئەڵمان لە

لایەن دەوڵەتەوە تەحەممول دەکرێ، بەلام هێشتا کارو باری مانەوەی یەکجاریان ساخ نەبۆتەوە. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیدا geduldig ‏(G.) "بەسەبر و حەوسەلە" [بە تەحەمموول] پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *tel(ə)- >** "هەڵگرتن، هەڵسەنگاندن، تەحەممول کردن".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی "هەڵگرتن" و "تەحەممول کردن" هەڵی سەنگینە دەگەڵ زمانی کوردمادی کاتێک بە کەسێك دەڵێین "ئەو شۆخی هەڵناگرێ" واتا تەحەممولی گاڵتە ناکا].

**دالگە dalge** *[ dālga ]* - "شار لە گەمەدا": پێوەندی هەیە بە ↑دال2 dal "بەردی نیشانە لە بەردەفڕکێدا" و خزمە دەگەڵ ↑تیلە "مەڕمەڕ، مت" و ↑سیلە sîle [سیلە گرتن واتا نیشانە گرتن، کردنە ئامانج]. "داڵگە" ئەو شوێنەیە کە لە کایەدا وەك ئامانج دیاری کراوە.

**داڵوچان daluçan** [ dālučān ] - "شۆڕ بوونەوە، داکەوتن". داڵوچاندن: شۆڕ کردنەوە، داهێشتن. دا + ↑لوچان luçan+ da.

**داڵۆسکە daloske** *[ dāloska ]* - "چلوورە، شووشەسەهۆڵ": خزمە دەگەڵ داڵوچان daluçan [داڵۆزان dalozan] "شۆڕ بوونەوە، داکەوتن". بڕوانە ↑لوچان luçan.

**دالەقاندن daleqandın** *[ dālaqāndın ]* - "هەڵاوەسین": دا + ↑لەقاندن da + leqandın.

**دام dam** *[ dām ]* - دەگەڵ "دەزگا" دێ و دەگوترێ دام و دەزگا. شێوەی کۆنتری ↑دیو dîw ە بە مانای "هۆدە، خانوو". دام و دەزگا دە کوردمادیدا ئاماژە دەکا بە خانووبەرە، بۆ وێنە کاتێک باس لە دامودەزگای دەوڵەتی دەکرێ، دە بنەڕەتدا مەبەست ساختومانە ئیدارییەکان بوون. پاشان ماناکە بەرفراوانتر بۆتەوە و سیستەمی ئیداری و بەڕێوەبەرایەتی (ناو ئەو خانووبەرانەش) دەگرێتەوە. هەروەها بە کەسێک کە خانووبەرەی زل و زەبەلاحی ساز کردبێ، دەڵێن فلان کەس عەجەب دام و دەزگایەک [دەم و دەزگایەک]ی لێداوە.

**دامران damıran** *[ dāmırān ]* - "تەمران، کووژانەوەی ئاگر": پێشگری دا + مران da + mıran. کەرتی "مران" خزمە دەگەڵ ↑*مردن mırdın* "نەمان، فەوتان" [سەرنج بدە کە ئەو پێوەندییەی دەتیوان وشەکانی "دامران" و "مردن"دا هەیە، دەتیوان وشەکانی "کووژانەوە" و "کوشتن"یشدا هەیە]. دە زمانی کوردمادیدا دوو وشەی دیکەش هەن کە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە و بریتین لە ↑دامرکان damırkan "1- ئارام بوونەوە، ئۆقرە گرتن 2- دامرانی ئاگر" و ↑دامەرزان damerzan [گۆڕاوە بۆ دامەزران damezran] "1- ئارام بوون، ئۆقرە گرتن 2- جێگیر بوون 3- دانیشتن لەسەر پلە و پایەیەک". وەک دەبینین هەموو ئەو وشانە و ماناکانیان پێوەندی توند و تۆڵیان پێکەوە هەیە. مانای بنەڕەتی "مردن"ە، دواتر لەم مانایەوە ماناکانی "کووژانەوە"، "لە جم و جۆڵ و چالاکی کەوتن" واتا "ئۆقرە گرتن"، "دانیشتن"، "جێگیر بوون" و "ئیستیخدام بوون" [جێگیر بوون لە پلە و پایەیەکدا] پەرەیان گرتووە.

[تێبینی: لەباری پێوەندی ئەم مانایانەی سەرەوە دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ وشەکانی *خەفە* (خەفە بوون واتا مردن) و *کپ* "کڕ و کپ" و *کۆپین* "ئارام بوون"].

**دامرکان damırkan** *[ dāmırkān ]* - "1- ئارام بوونەوە، ئۆقرە گرتن 2- کووژانەوە": خزمە دەگەڵ ↑دامران damıran.

**داموچاندن damuçandın** *[ damūčāndın ]* - "کەوی کردن، ڕاهێنان": دا + مووچاندن da + muçandın. بنەوشەی مووچ -muç بە شێوەی -moj لە وشەی ↑ئامۆژگاریدا amojgarî وهەروەها دە وشەی ↑دەستەمۆ destemo دا دەبینین.

**دامە dame** *[ dāma ]* - ناوی گەمەیەکە لەسەر تەختەیەک دەیکەن کە خانەخانەی لەسەر کێشراوەتەوە. وەک بیستوومە وشەکە لە زمانی رووسی وەرگیراوە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑دام dam [دامودەزگا] و ↑دیو dîw دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "خانە، خانوو".

**دامەرزان damerzan** [ *dāmarzān* ] - "جێگیر بوون": خزمە دەگەڵ ↑دامران damıran.

**دامەزران damezran** [ *dāmazrān* ] - فۆتیمەکانی z و r پاش و پێش بوون، شێوە کۆنترەکەی ↑دامەرزان damerzan ە کە لە هێندێک شێوەزاردا ماوەتەوە.

**دان1 dan** [ *dān* ] - "1- بەخشین، پێدان 2- بەشێک لە چەند بەش [دانی نیوەڕۆ]": dādan (P.). خزمە دەگەڵ dōnō (L.) و dare (L.)، didonai (Gr.) "دان، بەخشین". وشەی daiomai (Gr.) "دابەش کردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر **(IE.) *da(i)- >** "بەش، بەش کردن، دابەشینەوە، بەخشین". پێوەندی چەمکی بەش کردن و دابەش کردن دەگەڵ چەمکی دان [پێدان] دە زمانی کوردمادیدا زۆر بەئاشکرا دیارە، چونکە وشەی "بەخشین" کە هەمان مانای "دان" دەگەیەنێ، خۆی خزمە دەگەڵ "بەش". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ژمارەیەکی زۆر وشە لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا ↑داشتن/ دێران daştın / ↑deran، ↑دەم dem "کات"، ↑دانگ dang و هتد.

**دان2 dan** [ *dān* ] - "ددان، ئەندامی جووتن": ددان dıdan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ دندان dandān (P.)، dens (L.)، dan (OIn.)، tand (Nl.)، tooth (E.)، tand (Sw.)، Zahn (G.)، odōn (Gr.)، dantis (Lit.) "دان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *don’t- >** "دان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *ed- >** " خواردن، جووتن".

**دان3 dan** [ *dān* ] - "دەغڵ و دان": ↑دانە dane و ↑دەنک denık یش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چاندن çandın "تۆو وەشاندن". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەکانی بە مانای دان "تۆو" و "چاندن" لە یەک ریشەوە دێن و دەشێ دە زمانی کوردمادیشدا هەروا بێ. بەڵگەش بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑چنچک çınçık یش بە مانای "تۆو، دەغڵ و دان" دێ کە لەوێدا پێوەندی وشەکە بە وشەی "چاندن"ەوە ئاشکرایە. لەم وشەیەدا کەرتی چن -çın دەبێ سەرەتا *چان* *çan** بووبێ و دواتر گۆرابێ بە دان dan.

**-دان4 -dan** [ *dān* ] - پاشگرێکە مانای "تێدا بوون، دەفرایەتی" دەگەیەنێ [چادان، قەند(د)ان، خوێدان]. خزمە دەگەڵ ↑دانان danan [↑*نان nan*، نیان nîyan]، سەر بە ریشەی **(IE.) *dhe- >** "دانان، جێگیر کردن، قەرار دان".

**دانان danan** [ *dānān* ] - "قەرار دان، نیان": دا + ↑نان da + nan.

**دانگ dang** [ *dāng* ] - "بەشێک لە شەش بەشی موڵک یان مسقاڵ": خزمە دەگەڵ ↑دانە dane "بەش".

**دانگا danga** [ *dāngā* ] - "دەمێک، تاوێک" : هەروەک وشەکانی ↑دەم dem، و ↑تاو taw و ↑تەمەن temen و ↑دانگ dang "بەش" دەگەڕێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *da(i)- >** "بەش کردن، دابەش کردن". وشەی "دانگ" ئاماژە دەکاتە بەش بەش کردنی موڵک یان وەزنێک و وشەی "دانگا"ش بەشێک لە بەشەکانی کات نیشان دەدا.

**دانە1 dane** [ *dāna* ] **-** "دەغڵ و دان، تۆو، چنچک": ↑دان[3] dan "تۆو".

**دانە2 dane** [ *dāna* ] - "بەش": دانە dāne (P.). دەکوردمادیدا ↑دەنک denık یش دەگوترێ. کاتێک دەگوترێ یەک دانە، دوودانە و... ، لێرەدا مەبەست ناتوانێ دانە/ دەنک بە مانای "تۆو، چنچک یان ناوکی میوە" بێ، بەڵکە مەبەست "بەش"ە واتا بەشێک لە چەند بەش. دانە یان دەنک بەم مانایە وشەی سەربەخۆن و چ لەباری مانا و چ لەباری ریشەوە پێوەندییان بەو "دەنک و دانە"وە نییە کە مانای "تۆو" یان "ناوکی میوە" دەبەخشێ. ئا بەم مانایە دانە و دەنک پێوەندییان هەیە بە ↑دان[1] dan و ↑دانگ dangو ↑دانگا danga و هتد کە گشتیان ئاماژە دەکەن بە چەمکی "بەش و بەش کردن".

**دانەواندن danewandın** [ *dānawāndın* ] - "چەماندنەوە، خوار کردنەوە": دانواندن danıwandın یش دەگوترێ. دا (پێشگر) + نەواندن da + newandın. شێوەی کۆنتری "نەواندن" بریتی بووە لە "نەماندن nemandın"، واتا فۆتیمی m گۆڕاوە بۆ w و ئەمەش لە زۆر وشەی زمانی کوردیدا روو دەدا. ئەم وشەیە دواتر بە دوو شێوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە لایەکەوە کرداری "نەواندن" دروست بووە، لە لایەکی

دیکەوە و بە مانایەکی برێک جیاواز کرداری ↑نووشتانەوە nûştan(ewe) پەیدا بووە، بە مانای "قەد بوون، داهاتنەوە". بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ↑مووچاندن mûçandın.

دانەوێڵە **danewele** *[ dānawela ]* - "دەخڵ و دان": پێک هاتووە لە دوو وشەی دان[3] dan "دەنک" و وێڵە wele-. ئەم پاشگرە بەشێوەی ↑واڵە[1] wale- ش بەکار دێ.

دانیشتن **danîştın** *[ dānīštın ]* - "ڕۆنیشتن": دا + ↑نیشتن da + nîştın.

داتێر **daner** *[ dāner ]* - "حاکم": خزمە دەگەڵ ↑داد dad "عەداڵەت".

داو **daw** *[ dāw ]* - "1- دەزوو، هەودا، نەخ 2- تەپکە": هەروەها ↑جاو caw هەیە بە مانای "پارچەی نەخی". [دە زمانی فارسیدا بە داو دەڵێن "نخ" و بە جاو دەبێژن "نخی"]. هەر دوو وشەی "داو" و "جاو" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. دە زمانی فارسیدا دام dam (P.) "تەپکە، داو" هەیە و "بە دام افتادن" دەبێتە "دە داو کەوتن". وەک دەبینرێ مەبەست لە وشەکانی "دام"ی فارسی و "داو"ی کوردی هەر ئەو دەزوو یان بەنەیە کە لاقی پەلەوەری بێچارەی تێ دەگیرێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ تەون، تەبەنە، سەر بە ریشەی **(IE.) *te(m)p-** > "تەنین، لەبەر یەک کێشانەوە". هەر لێرەدا سەرەنەخی وشەی ↑تەپکە tepke ش بۆمان ئاشکرا دەبێ. پێوەندی ئەم وشەیە بە ریشەکەوە بە باشی دیارە و دەردەکەوێ کە هەر دوو وشەی "داو" و "تەپکە" خزمن و لەوانەشە هەردووکیان بۆ وشەیەکی کۆنتر بگەڕێنەوە و دواتر دوو شێوەیان پەیدا کردبێ.

[تێبینی 1: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "تەنین، چنین دروون" و "بەن، ریس" دەتوانین ئاماژە بە نموونەی دیکەش بکەین: وشەی "دەزوو" دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ وشەی فارسی "دوختن" (دروون) و "می دوزم" (دەدرووم). وشەی "نەخ" خزمە دەگەڵ nähen (G.) "دروون". وشەی Schnur (G.) "ریس، بەن" خزمە دەگەڵ "چنین" دە زمانی کوردمادیدا. "سیم" خزمە دەگەڵ "سوژن" و sew (E.) "دروون" و siula (OG.) "درێشە، درپشە" و هەروەها دەگەڵ "جۆڵا"ی خۆمان. تێبینی 2: فۆتیمی m دە ریشەکەی سەرەوەدا دە وشە کوردمادییەکاندا، وەک "تەون" و "داو" گۆڕاوە بە w. ئەمەش دە زمانی کوردمادیدا گۆڕاتیکی باوە و زۆرجار دەبیندرێ].

داوا **dawa** *[ dāwā ]* - "خواست، داخواز": > دعوة *daɛwa* (Arb.). هەروەها ↑داوەت dawet "شایی، بانگهێشتن" پێوەندی بەم وشە عەرەبییەوە هەیە.

داوان **dawan** *[ dāwān ]* - دەگەڵ هەڵە hele دێ و دەگوترێ هەڵەداوان heledawan "هەڵاتنی خێرا". "هەڵە" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هەلە hele [هەلەهەل helehel و پەلەپەل، هەلەمار helemar واتا پەلامار". وەک دەبینرێ ئەم وشەیە مانای "لەز، پەلە" دەدا. بنجی داو -daw لە وشەی "داوان"دا خزمە دەگەڵ دو dou و دویدن douvîdan (P.) "هەڵاتن، غار دان" و دواتر دەبێتە خزم دەگەڵ توانەوە twanewe [↑تاوانەوە tawanewe] "جاری بوون".

[تێبینی: ئەم پێوەندییەی سەرەوە دەتیوان وشەکانی "داوان" و "تاوانەوە"دا دە زمانی ئەڵمانیشدا بە جۆرێکی دیکە دەبینرێ. دە زمانی ئەڵمانیدا rennen (G.) ماناکەی دەبێتە "هەڵاتن، ڕا کردن، خزمە دەگەڵ "ڕا" کردن] و rinnen (G.) دەبێتە "جاری بوون" و خزمە دەگەڵ ڕۆندک "فرمێسک"].

داوەت **dawet** *[ dāwat ]* - "شایی، بانگهێشتن": پێوەندی هەیە بە ↑داوا dawa.

داوەڵ **dawel** *[ dāwal ]* - "پێکهاتەیەکی مرۆڤ ئاسا لە دار و پەڕۆ بۆ ترساندنی پەلەوەر لە کێڵگە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Teufel (G.)، tiufal (OG.)، devil (E.)، duivel (Nl.) "شەیتان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر > *(Gr.) diá-bolos* "تەوهینکەر، تۆمەت لێدەر، نەیار، دوژمن"، سەر بە کرداری diabállein (Gr.) "تۆمەت لێدان، هەڵخڕاندن، شەڕ هەڵایساندن، دوژمنایەتی دروست کردن". ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیشدا دەشێ سەردەماتێک بە مانای "شەیتان" [بوونەوەری نەیار و ناحەز] بەکار هاتبێ و پاشان بەو پێکهاتە ناحەز و ترسێنەرەیان گوتبێ کە لە کێڵگە و باغ و بێستان دروستییان کردووە.

[تێبینی: وشەی "شەیتان" ڕیشەی عیبری هەیە و ئەویش بە مانای "نەیار، دوژمن، بەدفەڕ"ە].

**داوێن dawen** [ *dāwen* ] - "لای خوارەوە": داوێنی کێو، داوێنی جلوبەرگ". دامن dāman (P.).

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ down (E.)، dūn (OE.) "لای خوارەوە". ئەم وشە ئینگلیزییە ڕیشەکەی ساخ نەکراوەتەوە.

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑دا da "پێشگری کردار بۆ ئاماژە کردن بەلای خوارەوە" [بۆ وێنە دانان، دانیشتن، داگەڕان وهتد].

**داهێزان dahezan** [ *dāhezān* ] - "1- هێز تێدا نەمان، شل و ماندوو بوون 2- شل بوونی هەوێر": پێشگری دا + هێزان da + hezan. ↑داهێزران dahezran یش دەگوترێ [داهێزاوم، داهێزراوم]. لە یەکەم ڕوانیندا مرۆڤ وا بیر دەکاتەوە کە وشەکە پێوەندی بە "هێز"ەوە هەبێ و مەبەست "لەدەست دانی هێز" بێ. بەڵام ئەم تێڕوانینە ڕاست نییە. ئەگەر سەیری ئەو ڕیزەکردارانە بکەین، دەبینین کاتێک کردارێک پێشگری "دا" وەردەگرێ، مانا و ناوەرۆکی پێچەوانە نابێتەوە، بەڵکوو وردتر و ئاشکراتر دەبێتەوە، وەک گرتن و داگرتن، تاشین و داتاشین، ڕزان و داڕزان و هتد. دە کرداری "هێزان" دا شتەکە وەسا نییە، واتا ئەگەر کردارەکە پێوەندی بە وشەی "هێز"ەوە هەبێ، ئەوسا نە "هێزان" و نە "داهێزان" ناتوانن مانای "بێهێز بوون" وەربگرن، بەڵکوو دەبێ مانای "هێزدار" بوون وەربگرن. بە وتەیەکی دیکە وشەی "هێز" ناتوانێ ببێتە ڕەگی کردارێک کە مانای "بێهێزی" بدا. خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە ئێمە لەپاڵ "داهێزان"دا، "داهێزران" یشمان هەیە کە هەردووکیان دوو شێوەی یەک وشەن. لەوەناچێ ئەسڵی کردارەکە "داهێزان" بووبێ و پاشان لەخۆڕا فۆتیمی r خزابێتە ناوی و بووبێتە "داهێزران"، بەڵکوو دەبێ بەپێچەوانەوە ئەسڵی وشەکە "داهێزران" بووبێ کە هێندێک جار یان دە هێندێک شێوەزاردا فۆتیمی r تێیدا دەسوێتەوە و دەگوترێ "داهێزان". ئەو وشەیە خزمە دەگەڵ ↑داهێشتن dahêştın "بەرەوخوار شۆڕ کردنەوە". دە زمانی کوردمادی و زمانە خزمەکاندا ئەو وشانەی بە مانای"داهێزران، سست بوون" بەکار دێن، پێوەندییان بە ڕیزەوشەیەکەوە هەیە کە باس لە "شل و شۆڕ بوون" و "داکەوتن" دەکەن. وەک نموونە دە زمانی کوردمادیدا دەتوانین ئاماژە بکەین بە وشەکانی "دالەقان" بە مانای "هەڵواسران، شۆڕ بوونەوە"، "داڵوچان" [داڵۆزان] بە مانای "شۆڕ بوونەوە، داهێشتراو یاخود *داهێژراو* بوون، ڕاهێڵکراو بوون"، "لۆژ" بە مانای "تەمبەڵ، تخێڵ، داهێزراو، بەلاداهاتوو". بەم جۆرە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەسڵی وشەکە و شێوە دروستەکەی "داهێزران"ە نەک "داهێزان"، وشەکە پێوەندی هەیە بە "داهێشتن" و پێشتر دەبێ "داهێشتران، داهێژران" بووبێ و هەروەها مانای بنەڕەتی وشەکەش دەبێتە "شل و شۆڕ بوونەوە، داکەوتن، بەلاداهاتن" و چ پێوەندی بە وشەی "هێز"ەوە نییە.

**داهێزران dahezan** [ *dāhezān* ] - شێوەی ئەسڵی و دروستی ↑داهێزان dahezan.

**داهێشتن dahêştın** [ *dāheştın* ] - "بەرەوخوار شۆڕ کردنەوە": پێشگری دا + هێشتن da + hêştın. دە فارسیدا دەبێتە فروهشتن forūheštan (P.) [ڕۆهێشتن- پێشگری فارسی فرو -forū (P.) دە کوردمادیدا دەبێتە ڕۆ -ro]. سەرەتا پێویستە تێبینییەک بخەینەڕوو:

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا laß، lasch (G.) "*لۆژ*، تەنبەڵ، تخێڵ"، late (E.) "درەنگ" (دەبنەڕەتدا: هێواش، بە ئەسپایی، تەپلۆس)، lat (Sw.) "تەپ، تەوەزەل"، lassus (L.) "ماندوو، داهێزراو" خزمن دەگەڵ lassen (G.)، let (E.)، lētan (Gt.)، lata (Sw.) "هێشتن"، سەر بە ڕیشەی < *lē(i)-d-* *(IE.)* "شل بوون، شۆڕ بوون، داهێزران، سست بوون، هێشتن". لەوانەیە پێوەندی دوو چەمکی "شل بوونەوە، سست بوون" دەگەڵ "هێشتن" لەوەڕا هاتبێ کە دە بنەڕەتدا کاتێک کەسێک هێشتوویەتی ئاژەڵێک بڕوا یان جموجۆڵێک بکا، یان کەسێکی ژێردەستی چالاکییەک بنوێنێ، دەڕاستیدا وەک ئەوە وابووە کە جڵەوی بۆ شل بکاتەوە، یان دەسەڵاتی خۆی لەسەر ئەو سست بکا].

بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە دە زمانی کوردمادیشدا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک هەیە دەتیوان ↑هێشتن hêştın "لێگەڕان، ڕێگە پێدان" و داهێشتن dahêştın "شۆڕ کردنەوە، شل کردنەوە بەرەو خوار" و هەروەها ↑داهێزران dahezran "سست بوون، شل بوونەوە"دا.

**دایک dayk** [ *dāyk* ] - "مێیینەی زارۆکدار": دای + ک day +(ı)k. دالک dalık یش دەگوترێ و هەروەها دایە daye لە کاتی بانگ کردندا. دای (ە) day(e) خزمە دەگەڵ dhayati (OIn.) "شیرمشتن" و thesai (Gr.) "شیردان"، سەر بە ریشەی **<** ***dhei-*** **(IE.)** "شیرمشتن، شیردانە مشتن".

[تیبینی: شیاوی باسە دە زمانی لاتینشدا femina (L.) "مێ، دایکە، ژن" دەگەڕێتەوە سەر وشەی felare (L.) "شیردان"].

بەم جۆرە مانای بنەڕەتی دایک دەبێتە "شیردەر". پاشگری ک (ı)k کە لێرەدا دەکەوێتە کۆتایی وشەی دایک، لە کۆتایی چەند وشەیەکی دیکەش وەک باوک و خوشک و میمک و نەنک دا دەرکەوێ. ئەم پاشگرە پاشگری "خۆش ویستن"ە.

**دچ dıç** [ *dıč* ] - "1-سووچ، قوژبن 2- ددانە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تیژ tîj. هەم "سووچ، گۆشە" و هەم "ددانە" دوو شتن کە پێوەندییان بە چەمکی "تیژی"یەوە هەیە.

**دراخە dıraxe** [ *dırāxa* ] - "مەڵۆی دەخڵ، باوەشێک گیای دروێنەکراو": دەرزە derze ش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑توورەکە tureke سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەڵگرتن، بردن، حەمل کردن". tragen (G.) "هەڵگرتن، حەمل کردن"، Trage (G.) "وەسیلەی پێ هەڵگرتن، ئەو شتەی هەڵدەگیرێ"، Tragetasche (G.) "کیف یان توورەکەی دەستی"، trehtec (MG.) "بار، باری ناوسک، حامیلەگی" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

**دڕاندن dırandın** [ *dırāndın* ] - "لەت کردن، پچڕاندن": دڕین dırîn یش دەگوترێ. دریدن darīdan (P.). خزمە دەگەڵ tear (E.) "دڕاندن"، trennen (G.) "لێک جیا کردنەوە، قەڵشاندن"، zeran (OG.) "پچڕاندن"، táiran (Got.) "دڕین"، dérein (Gr.) "کەوڵ کردن"، drnati- (OIn.) "دەدڕێ"، سەر بە ریشەی **<** ***der-*** **(IE.)** "دڕاندن، قەڵشاندن، جیا کردنەوە". دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەکی زۆر وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە، وەک ↑درز dırz، ↑دڕک dırk، ↑دەرزی derzî، ↑چڕژان çırjan، ↑ترەکین tırekîn، ↑تەقین teqîn و هتد.

**درباشە dırbaşe** [ *dırbāša* ] - "زەرکێ، شیشی دەروێشان": خزمە دەگەڵ ↑درپشە dırpşe "درێشە" [درفش derafš (P.)] و ↑*ترپان tırpan* "داسی دەسکدرێژ".

**دربۆ dırbo** - "وشەی دنە دانی بەران بۆ شەڕەقۆچ": خزمە دەگەڵ ↑*ترپان tırpan* "داسی دەسکدرێژ".

**درپشە dırıpşe** [ *dırıpša* ] - درەوشە dırewşe و درێشە dırêşe ش دەگوترێن. درفش derafš (P.)]. خزمە دەگەڵ ↑ *ترپان tırpan* "داسی دەسکدرێژ".

**دردۆنگ dırdong** - "دوودڵ": وێ دەچێ وشەکە هەروەک "دوودڵ" پێک هاتبێ لە دوو کەرتی دڕ dır واتا ↑دڵ dıl و "دۆنگ dong"، وەرگیراو لە وشەی ↑دوو du.

**درز dırz** - "قەڵش، کەلێن": دەرز derz یش دەگوترێ. درز darz (P.). خزمە دەگەڵ ↑دڕاندن dırandın سەر بە ریشەی **<** ***der-*** **(IE.)** "دڕاندن، قەڵشاندن، لەت کردن".

**درشت dırışt** [ *dırıšt* ] - "قەبە، گەورە": درشت doršot (P.). خزمە دەگەڵ ↑درێژ dırej.

[تیبینی: دوو چەمکی درشت و درێژ پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا بە مرۆڤی باڵابەرز دەگوترێ groß، کەچی وشەکە دە زمانی ئەڵمانیدا و دە بنەڕەتدا مانای "گەورە، درشت" دەدا].

**درف dırf** - "نیشانە، عەلامەت، لۆگۆ": دورف durf یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ترپان tırpan "مەڵەغان، داسی دەسک درێژ".

**درڤ dırv** - "ڕەگەز، بنیچە، بنەچەک": لەپێوەندی دەگەڵ ↑درف dırıf "نیشانە، عەلامەت" دایە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑ترپان trpan.

**درکاندن dırkandın** [ *dırkāndın* ] - "دەرپەڕاندنی قسە، ئاشکرا کردنی نهێنی":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑درز dırz "قەڵش، کەلێن". دە فارسیدا درز کردن darz kardan (P.) هەیە بە مانای "ئاشکرا بوونی نهێنییەک" [دە بنەڕەتدا مەبەست ئەوە بووە کە قسەکە بە کون و کەلێتیدا هاتووەتە دەر و ئاشکرابووە]. لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە درکاندن "درز خستنە دەم" واتا دەم کردنەوە بووبێ بۆ ئاشکرا کردنی قسە و باسێک، بە پێچەوانەی حاڵەتی "دەم گرێدان" کە ئەمیان بۆ ڕاگرتن و دەرنەبڕینی قسەیەکە.

2- یان لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑دەر1 der "لەبەرانبەری ناوەوە". لەم تێڕوانینەوە درکاندن واتا "دەردان یاخود دانە دەرەوی قسەیەک". دە زمانی ئەڵمانیدا äußern (G.) هەیە بە مانای "دەربڕین، بەیان کردن" کە دەچێتەوە سەر außer (G.) "بەدەر لە، جیا لە". ئەم وشە ئەڵمانییە لە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بەم جۆرەیە: ūtor (OE.)، ūtar (OIs.) و (OSac.). ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ↑دەر1 der.

**درگان dırgan** [ *dırgān* ] - "شەنە": وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ↑درک dırk.

**دڕگە dırge** [ *dırga* ] - "جەزیرە": دوڕگە durge و ئاودڕ awdır یش دەگوترێن. پێوەندی بە کرداری دڕین و ↑دڕاندن dırandın ەوە هەیە. مەبەست ئەوەیە کە هیشکایی زەوی *دڕی* بە ئاوەکە داوە.

**درم dırım** - "دەنگی دەهۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑زرمە zırme "دەنگی لێککەوتنی شتی قورس".

**درمغ dırmıġ** - "خەپە، شەنە بۆ کۆ کردنەوەی کلۆش": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑تارم tarım "خۆیانی گیرەکراوی بەر با نەدراو".

2- ↑تارمە tarıme "1- هەیوانی سەردانەپۆشراو 2- نەردەی بەرهەیوان"، ئەم وشانە خزمن دەگەڵ tram (E.)، trame (MG.) "داری داتاشراو، میلە، دەسک (ی پێمەڕە و هتد)، نەردەی نەردیوان (دارەئاسۆییەکان)".

**درن dırın** - "بۆنی تەگە لەکاتی تێبەرداندا، بۆنی ماسی، بۆنی گرانی لەش، بۆنی قاچ و بنهەنگڵ": ↑بۆدڕ bodır یش دەگوترێ. ئەگەر سەیری ماناکان بکەین، دەبینین کە دە گشتیاندا پێوەندی بە "تەڕایی، ئارەقە" لە ئارادایە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تەڕ ter.

**درنج dırınc** [ *dırınj* ] - دەگەڵ "دێو" دێ [دێو و درنج dêw û dırınc]. خزمە دەگەڵ Drache (G.)، drake (E.) و (Sw.) "ئەژدیها". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر draco (L.) و لەوێشەوە بۆ drákōn (Gr.) "ئەژدیها".

**دروست dırust** - "ڕاست، ڕەوا، ساز، ئامادە، تەواو، ساخ": دوروست dorost (P.). خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: Trost (G.)، troost (Nl.)، tröst (Sw.) "دڵنەوایی، دڵدانەوە" trusti (Gt.) "پەیمان، هاڤبەندی"، traustr (OIs.) "بەهێز، سەخت، پتەو"، trösten (G.) "دڵنەوایی کردن، دڵدانەوە"، tra ster (MG.) "دڵنەواییکەر، پشتگر، پشتیوان، زامن"، fertrōsten (OG.) "زەمانەت کردن". ئەم وشانە خۆیان خزمن دەگەڵ treu (G.) "ئەمەکێ، وەفاداری"، trauen (G.) "دەخۆ ڕادیتن، بەخۆ ڕاپەڕموون"، Vertrauen (G.) "ڕاپەڕموون، ئیعتیماد"، triggws (Gt.) "وەفادار، جێگەی دڵنیایی"، trīewe (OE.) "وەفادار، ڕاست و دروست"، true (E.) "ڕاست، دروست"، trygg (Sw.) "جێی دڵنیایی"، drūtas (Lit.) "سەخت، بەهێز، قەڵەو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی > ***(IE.) *dreu-*** "دار، داربەڕوو". چەمکی گشتی دە هەموو ئەم وشانەدا "بەهێز و پتەو بوون"ە، جا یان لەباری فیزیکی یان لەباری دەروونییەوە. بەم جۆرە مەبەست لە وشەی "دروست" دە بنەڕەتدا "سەخت کردن، قایم کردن، ساز کردن"ی شتیکی ناتەواو، خۆنەگرتوو و شل

و شەوێقە، شتێک کە جێگەی دڵنیایی نییە. لەمەوە پاشان مانای وشەکە پەرەی سەندووە بۆ ڕاست و دروستی باری دەروونی مرۆڤەکان.

[تێبینی: شیاوی باسە کە دە "فرهنگ جامع فارسی- المانی" (ل. 302) لەژێر وشەی "درستکار" dorost-kar (P.) دا ئاماژە بە چەند مانا کراوە و یەک لەوانە وشەی ئەڵمانی treu، کە لەسەرەوە باس کرا و ماناکەی دەبێتە "ئەمەگ، وەفا". لە لایەکی دیکەوە بە ورد بوونەوە لەم پێوەندییانەی سەرەوە گومان لەوەدا نامێنێ کە دوو وشەی "ساخ" و "سەخت"یش پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، واتا "ساخ"یش دە بنچینەدا ئاماژەیە بە "بەهێز و پتەو بوون"، بەپێچەوانەی شتی ناساخ و ناتەواو کە هێشتا هێز و توانایی پەیدا نەکردووە یان هێز و توانایی خۆی لەدەست داوە. هەر لەم پێوەندییەدا دەتوانین وشەی "زۆخ" [زووخ] بە مانای "هێز، توانایی" بە باشی شی بکەینەوە].

**دروشم dıruşım** [ *dırušım* ] - دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا دوو وشەی "دروشم" و "درۆشم" لەپاڵ یەکدا باس کراون، یەکەمیان بە مانای "بیچم، شکڵ" و دوومیان بە مانای "نیشانەی تایبەتی، ئارم". ئەو دوو وشەیە دە ڕاستیدا هەر یەک وشەن و مانای بنەرەتی وشەکە "شەقڵ، شێوە، وێنە"یە. مانای "نیشانە" یان "ئارم" دواتر پەیدا بووە و ئەمەش بەم جۆرە بووە کە وێنە یان شەقڵێک وەک نیشانە بۆ شتێک دیاری کراوە، بۆ نموونە وەک نیشانەی سەر ئاڵا، یان سەر تۆمار و هتد. دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا "دروشم" زۆرتربە مانای

"شیعار، شوعار" بەکار دێ. دیارە لێرەشدا سەرەتا مەبەست شوعاری نووسراو و نەخشکراو لەسەر پەڕۆ یان کاغەز بووە کە وەک نیشانە بەرز کراوەتەوە [شوعار *هەڵگرتن*] و دواتر بەو شەعارانەش گوتراوە کە هاوار کراون. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑ترپان tırpan "مەڵەغان، داسی دەسک درێژ".

**درۆ dıro** - " قسەی نەڕاست، قسەی فریودەر": درەو dırew یش دەگوترێ. دروغ dorūġ (P.). خزمە دەگەڵ Betrug (G.) [Be-trug] "فێڵ و تەڵەکە" و trügen (G.) و driegen (MNl.) "خاپاندن، فریو دان"، Traum (G.) "خەون" [واتا وێنەی درۆیین، ناراست]، -druj (Av.) "درۆ، فریو"، drauger (OIs.) "شەوە، تارمایی" [واتا وێنەی درۆیین]. دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑تراویلکە tırawılke "وێنەی درۆیینی ئاو یاخود وێنەی فریودەری ئاو لە بیابان". شیاوی باسە کە فۆتیمی کۆتایی وشەکە کە دە زمانی فارسیدا غ/ ġ یە و دە وشە ئەڤێستاییەکەدا ج/ j بووە، دە وشەی درۆزن dırozın ی کوردمادیدا بەشێوەی ز/ z پارێزراوە (درۆز + ن dıroz + ın).

**درۆزە dıroze** [ *dıroza* ] - "گەدایی": دریوزە daryūze (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ driusan (Got.) "(دا) خستن"، dreosan (OE.) "کەوتن"، drusian (OE.) "مات و داماو بوون، داچەمان". خزمە دەگەڵ ↑ترووشکان trûşkan [هەڵترووشکان]. هەروەها لەوانەیە وشەی ↑دەروێش derwêş پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. دەروێش دە زمانی کوردمادیدا بە دوو مانا دێ کە دیارە لە پێوەندی دەگەڵ یەکتر دان. مانای یەکەم "عەوداڵ، بێ ماڵ و حاڵ، ڕەبەن"ە و مانای دووەم "مریدی شێخ". دە زمانی فارسیدا درویش darvīş (P.) وەک "هەژار، بێنەوا، عەوداڵ" مانا کراوەتەوە. مانای دووەم دە زمانی کوردمادیدا لەوانەیە لەمەوە سەرچاوەی گرتبێ کە کەسانی عەوداڵ و بێماڵ و حاڵ پەنایان بردووەتە بەر تەکیە و خانەقای شێخان و لەوێ بوونە مرید و پێرەو.

**دروێنە dıroene** [ *dıroena* ] - "گیا دروونەوە": خزمە دەگەڵ ↑دروون dırun و ↑*ترپان tırpan*.

**دڕوو dıru** [ *dırū* ] - "چقڵ": ↑دڕک dırk یش دەگوترێ. "دڕک" و "دڕوو" دەشێ دە بنچینەدا هەر یەک وشە بن. ئەسڵی وشەکە لەوانەیە شێوەیەکی وەک *دڕووک dırûk** ی هەبووبێ و پاشان دوو شێوەی لێ پەیدا بووبێ.

1- لە لایەکەوە دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ Dorn (G.)، thorn (E.)، torn (Sw.)، trnu (Oslav.)، "دڕک"، térnax (Gr.) "لاسکی کاکتۆس". بە پێی بۆچوونێک ئەم وشانە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ ڕیشەی ***ter-***

که دەبێ بەمانای"تیهەڵچەقین" بووبێ، بە پێی بۆچوونێکی دیکە پێوەندی هەیە بە ریشەی *(s)ter- (IE.) "سەخت، توند، لەبەر یەک کیشراو" [شتێک کە لەبەر یەک بکێشرێتەوە، شەق و توند دەبێ].

2- لە لایەکی دیکەوە وشە کوردمادییەکە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە وشەی دڕین/ ↑دڕاندن dırandın ەوە سەر بە ریشەی هیندو ئەورووپی > *der- (IE.) "دڕین".

درووب **dırûb** [ dirūb ] - "وێچوون، هاوشێوەیی": درووڤ dırûv یش دەگوترێ. هەروەها درووباندن dırûbandınهەیە بە مانای "وێچواندن، شباندن، وەک ئەو زانین". خزمە دەگەڵ ↑درف dırıf و دواجار ↑ترپان *tırpan*.

درووامان **dıruman** [ dirūmān ] - "جلک دروون": دروو + مان dıru + man. کەرتی "دروو" سەربە کرداری ↑دروون dırun ە. کەرتی مان man- پاشگرە کە دە هێندێک وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ وەک "سووتمان"، "گریمان" یان "گریمانە"، "شیمانە" و هتد.

دروون1 **dırun 1** [ dirūn ] - "دروێنە کردن" (گیا دروونەوە): درویدن derovīdan (P.). خزمە دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑ترپان *tırpan* "داسی دەسکدرێژ"، ↑درباشە dırbaşe "زەرگی دەروێشان" و ↑درپشە dırıpe [←درەوشە← درێشە]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان، وێککەوتن". پاشان دە زمانە جۆربەجۆرەکاندا چەند مانای وەک "پێکگەیشتن، تووش بوون، کوتان، کوتانەوە، ورد کردن، بڕین، کون کردن" سەریان هەڵداوە.

[تێبینی: هەر لەم چوارچێوەیەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە وێ دەچێ دەتیوان دوو وشەی "تووش" بوون (بەیەکدی گەیشتن، بەرخورد کردن) و "تاشین"دا پێوەندی ئێتیمۆلۆژی هەبێ].

دروون2 **dırun 2** [ dirūn ] - "تەقەڵ لێدان": سەرەتا تێبینییەک:

[دە زمانی فارسیدا کرداری "دوختن" بە مانای "دروون، تەقەڵ لێدان" بەکار دێ. بۆ کرداری کاتی ئێستا بنجی کردارەکە دەبێتە "دوز-" وەک "میدوزم" واتا "دەدرووم". بنجی "دوخ-" یان "دوز-" خزمە دەگەڵ وشەی کوردییەکانی "تیک" [تیک و درووامان] و هەروەها "تیخ" و "تەقەڵ". هەموو ئەم وشانە ئاماژە بە شتی تیژ (وەک دەرزی) دەکەن کە تێرادەچێ و کون دەکا. کەوابوو کرداری "دوختن"ی فارسی و تەقەڵ لێدانی خۆمان دە بنەڕەتدا بریتییە لە دەرزی تێڕا کردن لە پارچە و قوماش].

ئێستا ئەگەر بەم تێڕوانینەوە سەیری وشەی "دروون" بکەین، بێ سێ و دوو، واتا یەکجێ بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم "دروون"ە پێوەندی بە ↑*دروون1 dırun 1* ەوە هەیە بە مانای "گیا دروون، درەوێنە کردن". وەک لەژێر دروون1 dırun 1دا شی کراوەتەوە، چەندین وشە لە چەشنی ↑درباشە dırbaşe "زەرگی دەروێشان" و ↑درپشە dırpışe [درەوشە، درێشە] پێوەندی بە وشەکەوە پەیدا دەکەن. ئەمە نیشان دەدا کە لە کۆندا وشەیەکی بنەڕەتی وەک "دربان/ ترپان" هەبووە کە چەند مانایەکی وەک "لێدان، بڕین، هەڵپاچین، تێڕاکردن، تیکوتان، تیهەڵچەقاندن"ی گەیاندووە. پاشان لەمەوە چەند وشەیەک سەریان هەڵداوە کە دەستەیەکیان پێوەندییان بە گیادروون و دروێنە وە هەیە، وەک "ترپان، دروێنە، دروون: dırûn ← dırwên(e) ← dırwan ← tırpan. ئەم گۆڕانکارییانە بەتەواوی دەگەڵ رێساکانی فۆنۆلۆژیکی زمانی کوردی یەک دەگرنەوە و بە دەیان نموونەیان لە زمانی کوردیدا هەیە. لە لایەکی دیکەوە دەستە وشەیەکی دیکە دروست بوون کە باس لە دەرزی و تەقەڵ لێدان دەکەن، وەک درپشە dırpışe "درێشە" [dırpışe ← درەوشە dırewşe ← درێشە dırêşe] و "دروون" و ↑تەریب terîb. لێرەدا هەروەها بەباشی دەردەکەوێ کە "تەریب" وشەیەکی خۆماڵییە و لە راستیدا شێوەی کۆنتری وشەی "دروون"ە. زمانی کوردی وەک لە زۆر نموونەی دیکەدا هەر دوو شێوەی کۆن و نوێی وشەکە بەکار دێنی، بەڵام بە دوو مانای برێک جیاوازەوە. دە زمانی ئەمڕۆدا "تەریب" بە جۆرێک لە دروون/ درووامان دەگوترێ کە هێڵەکانی قیلەوقاچ بن. ئەمەش یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێشەکانی زمانی کوردییە کە زۆرێک لە وشە کۆنەکانی بەم جۆرە پاراستووە.

**درەم drem** *[ dram ]* - "یەکەی پارە": دە کوردمادیدا وەک یەکەی "وەزن" یش بەکار دێ. درهمdarham (P.)، drachm(a) (E.) < *drakhmé (Gr.)* "یەکەی وەزن و پارە" پێوەست بە کرداری drássesthai (Gr.) "گرتن، هەستاندن".

**درەنگ dıreng** *[ dırang ]* - "زۆر پێچوونی کات" : خزمە دەگەڵ ↑درێژ drej. درەنگ بوون دە بنەرەتدا ئاماژە بە درێژ بوونەوەی کات دەکا.

[تێبینی: لەم بارەوە دەتوانین دەگەڵ وشەی spät ی ئەڵمانی بەراوردی بکەین، کە بە مانای "درەنگ"ە و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پان و بڵاو بوونەوە، لەبەر یەک کێشرانەوە، تەنینەوە". دیارە دە وشە ئەڵمانییەکەدا مەبەست لەبەریەک کێشرانەوەی "کات"ە. ئەم وشە ئەڵمانییە خزمە دەگەڵ "ئەسپایی" کوردمادی کە ئاماژە بە "هێواش بوون، بە درەنگی کەوتن و درێژ بوونەوە دە کاتدا دەکا].

**درەوشان(ەوە) dırewşan(ewe)** *[ dırawšān(awa) ]* - "ترووسکانەوە، بریقانەوە": خزمە دەگەڵ ↑تیرێژ tîrej "تیشک، شەبەق".

**درەوشە dırewşe** *[ dırawša ]* - شێوەی کۆنتری ↑درێشە dırêşe و خزمە دەگەڵ ↑ *ترپان tırpan* "داسی دەسکدرێژ".

**درەهی dırehî** *[ dırahī ]* - "زەوی شەقارشەقار": پێوەندی هەیە بە دڕین/ ↑دڕاندن dırandın.

**دری dırî** *[ dırī ]* - "شەرم، فەدی": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تەریق terîq [تەریق بوونەوە].

**درێژ dırej** *[ dırež ]* - "بەرانبەری کورت": دراز derāz (P.)، drīgah- (OIn.)، dlĭgŭ (Oslav.)، dolichos (Gr.)، ilgas (Lit.)، lang (G.)، long (E.) و هتد. گشتیان بە مانای "درێژ"، سەر بە ریشەی **< -deleg *** **(IE.)** "درێژ". وشەی ↑درەنگ dıreng یش لەم ریشەوە هاتووە و درەنگ بوون دە بنەرەتدا ئاماژە بە درێژ بوونەوەی کات دەکا.

**درێشە dırêşe** *[ dıreşa ]* - شێوەی سواوەی ↑دریپشە dırıpşe یان درەوشە dırewşe. درفش derafš (P.)]. خزمە دەگەڵ ↑ *ترپان tırpan* "داسی دەسکدرێژ".

**درێخ drex** *[ drex ]* درێغ dreġ ش دەگوترێ. دریغ darīġ (P.). ئەم وشەیە دە "فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە"دا بە مانای "قسوور، کۆتایی" لێکدراوەتەوە. بەڵام ئەمە مانای راست و دروستی وشەکە نییە. لە "فرهنگ جامع المانی بە فارسی"دا- بڕوانە سەرچاوەکان- ئەم وشەیە بە دروستی و بە تێر و تەسەلی مانا کراوەتەوە. ئەم فەرهەنگە ئەم مانایانەی بۆ وشەکە داناوە: ئەفسوس، داخ و ئەسەف، پەشیمانی، خودداری، ئاە و ناڵە. وەک دەبینین مانای بنەرەتی وشەکە دەبێ "داخ و ئەسەف" بێ. ئەم مانایە بە تەواوی دەگەڵ ئەو"دریغ و دریغا" یانە رێک دەکەوێ کە زۆر لە شاعیرانی فارس دە هۆنراوەکانیاندا بۆ دەربڕینی داخ و ئەسەفی خۆیان هێناویانەتەوە. پێچەوانەی "دریغا"ش دە هۆنراوەکانی شاعیرانی فارسدا "خۆشا"یە کە هۆنەر بۆ دەربڕینی خۆزگە و ئارەزووەکانی بەکاری هێناوە. ئەگەر لەم تێڕوانینەوە بۆ ساغ کردنەوەی ریشەی وشەکە بچین، بەو ئەنجامە دەگەین کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ trauern (G.)"ماتەم گرتن، dreary (E.) خەمبار، داخدار"، driusan (Gt.) "کەوتن"، dreosan (OE.) "کەوتن، بەچۆکدا هاتن"، drūsian (OE.) "مات و بێهێز بوون، داهێزران"، drēorig (OE.) "خەفەتبار، خەمبار". ریشەی ژێرمەنی ئەم وشانە وەک *-drus* *(Grm.)* "کەوتن" ساخ کراوەتەوە. سەبارەت بە ریشەی هیندوئەورووپی وشەکان چ زانیارییەک باس نەکراوە. بەراوری بکە دەگەڵ ↑ترووشکان trûşkan [هەڵترووشکان] "لەسەر چینچک دانیشتن" و هەروەها ↑تەریق terîq بوونەوە.

[تێبینی: وەک باس کرا وشەکە لەپاڵەوە بە مانای "کۆتایی، قسوور" یان دە فارسیدا "خودداری" ش دێ، بۆ وێنە کاتێک دە کوردمادیدا دەگوترێ "درێخ کردن" یان دە فارسیدا "دریغ داشتن". ئەم مانایە مانای بنەڕەتی وشەکە نییە و دواتر پەیدا بووە. پەیدا بوونەکەش دەبێ بەم جۆرە بووبێ کە کاتێک کارێک بە نابەدڵی و ناقایلی بۆ کەسێک کراوە، مرۆڤی بکەر کارەکەی پێ درێخ بووە، پێی حەیف بوو. لە

بەرانبەردا مرۆڤێك كە پێویستی بە كارێك هەبووە، داوای كردووە كە كارەكە درێخی لێ نەكرێ، بە درێخەوە كارەكە نەكرێ، نەبێتە جێگەی داخ و ئەسەف، واتا مرۆڤی بكەر پێی (بە) داخ نەبێ كە ئەو كارە دەكا].

**دز dız [1]** - "كەسێ ماڵی مەردم بەنهێنی دەبا": زۆرجار دەگەڵ "حیز" دێ [دز و حیز dız û ĥîz]. دزد dozd (P.).

1- جێی بەرهەڤ كردنە دەگەڵ Dieb (G.)، diob (OG.)، thief (E.)، tjuv (Sw.)، ?iubs (Gt.) "دز"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *teip-*** "خۆ مات كردن، هەڵتroوشكان". tūpi (Lit.) و tupt (Let.) "هەڵترووشكان" لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی كوردمادیدا هەروەها دژ دامان dıj daman یان دۆش دامان doş daman هەیە بەمانای "كز و مات دانیشتن". لەوانەیە ئەم وشەیەش پێوەندی بەو ریشەوە هەبێ و مەبەست دەستەوئەژنۆ دانیشتن بێ. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ترووشكان" [هەڵترووشكان] كە ئەویش دەگەڵ "درێخ" واتا "داخ و پەژارە" هاوریشەیە.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑دزێو dızêw "بەد، بەدكار".

[تێبینی: لەوانەیە ریشەی *(IE.) *teip-* "خۆ مات كردن، هەڵترووشكان" پێوەندی هەبێ بە ریشەی *dheu-* *(IE.) *b-* "قووڵ، نزم". ئەگەر ئەم پێوەندییانەی سەرەوە راست بن، "دۆش، دژ" دەبێتە خزم دەگەڵ تەشك teşk [تەشك و داوێن] و تەشق teşq "قووڵایی ئاسمان"].

**دز dız 2** - دەگەڵ "ئاو" دێ و بۆ وێنە دەگوترێ "برینی دەستم ئاوەدز awedız بووە". دیارە ئەم "دز"ە چ پێوەندییەكی بە "دز"ی سەرەوە نەداوە. راستە لێرەشدا برین ئاوی دزیوە، بەلام ئەم دزینە "بردنی ماڵ مردم بە نهێنی" نییە! دز یان دزین لێرەدا پێوەندی بە ↑تزان tızanەوە هەیە كە ئاماژە دەكا بە راكێشانی تەڕایی لە شوێنێكدا، وەك فرمێسك لە چاو تزان یان خوێن تێ تزانی دەست.

**دزان dızan** *[ dızān ]* - "ناخۆش ویستن، حەزلێ نەكردن": خزمە دەگەڵ ↑دژ dıj "زیدد، نەیار". [میوانی دەدزێ و خانەخوێ هەردووك لا]!

**دزێو dızêw** *[ dızew ]* - "ناحەز، بەد، بەكار": خزمە دەگەڵ ↑دژ1 dıj "دوژمن، نەیار، بەدكار".

**دژ1 dıj** *[ dıž ]* - "زید، دوژمن، نەیار": خزمە دەگەڵ ↑تووش *tûş*، ↑دزێو dızew و ↑دزان dızan "ناخۆش ویستن" و ↑دوژمن dujmın و هتد. ئەم وشانە دەگەڕێنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بەد، خراب".

**دژ2 dıj** *[ dıž ]* - "شەقڵی خەرمان": خزمە دەگەڵ Zeichen (G.)، taikan (Got.)، token (E.)، tecken (Sw.)، tja (OIs.)، deiknynai (Gr.) "نیشانە، شەقڵ"، diśáti (OIn.) "نیشانی دا"، سەر بە ریشەی < ***deik-*** ***(IE.)*** "نیشان دان، بەدیار خستن". دە پلەیەكی دوورتردا دەچێتەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *dei-*** "رووناك بوون، درەوشان، دیاركەوتن" و بەم جۆرە خزمایەتی پەیدا دەكا دەگەڵ ↑دیتن dîtın "بینین" و↑دیار dîyar و↑ دیاری dîyarî.

[تێبینی: سەبارەت پێوەندی چەمكەكانی "نیشانە" و "نیشان دان" و "بینین" بڕوانە ئەو وشانەی لەژێر "مێزاندن"دا باس كراون].

**دژ3 dıj** *[ dıž ]* - "قەڵا": دێژ dej یش دەگوترێ. دژ dež (P.). بەشێكە لە ناوی چەندین شار، وەك سنەندەژ، رەواندز، شاهیندێژ و هتد. دژبان dejbān (P.) دە زمانی فارسیدا وشەیەكی ئەرتەشییە و ماناكەی دەبێتە "دژ(ە)وان، قەڵاپارێز". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑پەرێز perez و pairi-daiza- (Av.) "جێگەی دەورگیراو"، پێكهاتووە لە پێشگری pari "دەور و بەر، دەور گرتن" و ریشەی daiz- "لە سەر یەك هەڵچنین". پەرێز دە زمانی كوردیدمادیدا هەم مانای "جێگەی دەخڵی دورواو" و هەمیش مانای "رەبەت، بۆسە" دەدا. مانای دووەم دەگەڵ چەمكی قەڵا یەك دەگرێتەوە. ئەم ریشە ئەوێستاییە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ئەو ریشە هیندوئەورووپییانە كە لەژێر ↑تیغە tîġe "دیواری تیوانگر"دا ئاماژەیان پێ كراوە.

**دژ[4] dıj** [ *dıž* ] - دژ دامان dıj daman یان دۆش دامان doş daman مانای "کز و مات دانیشتن" دەبەخشێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کە ئاماژە بە "قووڵ بوون، نزم بوون" دەکەن، وەک ↑تەشک teşk[تەشک و داوێن] و ↑تەشق teşq "قووڵایی ئاسمان"] و هتد. دژ دانیشتن جۆرێک لە مات دانیشتن یان هەڵترووشکانە کە خۆ چەماندنەوە و خۆ نزم کردنەوەی پێوە دارە. لەوانەیە خزمیش بێ دەگەڵ ↑دز[1] dız کە زەمانی بەرێ بە خۆ مات کردن و سەری خۆ دانەواندن کاری خۆی دەکرد بۆ ئەوەی نەبینرێ.

[تێبینی: "دژ دانیشتن" لەباری ماناوە هەڵسەنگینە دەگەڵ وشەی "ترووشکان، هەڵترووشکان" کە ئەویش دە بنەڕەتدا ئەم مانایانە دەبەخشێ: "نەوی بوون، چوونەخوار، لەهێز کەوتن، داکەوتن"].

**دژێن dıjên** [ *dıjen* ] - "لوو، گرێی گۆشت": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تەژی *tejî* "پڕ" و ↑تەشەنە teşene و dicht (G.) "چڕو پڕ، چیڕ، سەخت، توند".

**دشت dışt** [ *dıš* ] - "ناشیرن، دزێو": خزمە دەگەڵ زشت zêşt (P.) "ناحەز و ناشیرن". لەوانەیە پێوەندییان بە ↑دژ dıjەوە هەبێ.

**دشە dışe** [ *dıša* ] - "جێگەی خراب": خزمە دەگەڵ ↑دژ dıj.

**دشی dışî** [ *dıšī* ] - "ناحەزی، ناشیرنی":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑دشت dışt "ناشیرن، دزێو".

2- هەروەها دەگەڵ ↑دژ dıj.

**دفتە dıfte** [ *dıfta* ] - "کەرکیت، شەی پۆ کوتان": خزمە دەگەڵ دەگەڵ ↑تەپاندن tepandın "لێدان". شیاوی باسە "کەرکیت"یش پێوەندی بە "کوتان"ەوە هەیە.

**دفن dıfın** [ *dıfin* ] - "1- کەپۆ، لووت 2- لە گۆڕ نان (کفن و دفن)": دەفن defın یش دەگوترێ. بە مانای یەکەم ↑تفنک tıfınk یش دەگوترێ. بە هەردوو ماناوە دەچێتەوە سەر ریشەی < ***dheu-b-*** **( IE. )** "قووڵ، رۆچوون، چوونەخوار". سەبارەت بە مانای یەکەم هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "کەپۆ" یان "زار" کە ئەوانیش پێوەندی پەیدا دەکەن بە چەمکی "قووڵایی، کون و کەلێن". سەبارەت بە مانا دووەمەکەش هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "گۆڕ" [کۆنتر: گابار، گەبەر واتا قەبر] کە خۆی دە ریشەدا خزمە دەگەڵ "کەپۆ". بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەکانی "دفن" و "قەبر" وشەی سەر بە زمانە ئێرانییەکانن. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑*تاپی tapî* "خەندەک، رەهەند، گۆڕیچە" و چەندین وشەی دیکە.

[تێبینی: هەر لێرەدا شیاوی ئاماژە کردنە کە وشەی "کفن"یش وشەیەکی سەر بە زمانە ئێرانییەکانە و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک "کەپەن" یان "کەپەنک" بە مانای "باڵاپۆش". کەوابوو مانای کفن و دفن کردن دەبێتە "داپۆشین" (بە "خەڵات" - کە ئەمەش هەر وشەیەکی کوردمادییە) و خستنە ناو قووڵاییەوە واتا خستنە ژێر خاک].

**دڤە dıve** [ *dıva* ] - "راستەی بەننا، تەراز": لەژێر وشەی "تەراز"دا شی کراوەتەوە کە ئەم وشەیە دەگەڵ وشەی "تراشین" خزمە و پێوەندی بە چەمکی "لێدان"ەوە هەیە. [دوو چەمکی "تراشین" و "لێدان" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، هەر بۆیە "ردێن لێدان" بە مانای "ردێن تاشین" بەکار دێ، یان وشەی "تاشین" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان". هەروەها وشەی "دروون" (گیادروون، تراشینی گیا) دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و هتد]. بە لەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دڤە dıve ش دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دەپ dep "تەختە" و دواجار تەپ[4] tep "لێدان". "دڤە" یان "تەراز" دە بنەڕەتدا تەختەیەک بووە کە هەرد و دار و دیواریان پێ راست کردووە.

**دڤەدڤ dıvedıv** [ *dıvadv* ] - "گژەگژی با": خزمە دەگەڵ ژمارەیک وشە کە ئاماژە بە جووڵانی و لێکهاڵانی نائارام دەکەن، ↑وەک تۆز toz، ↑دووکەڵ dukel، ↑تۆف(ان) tof(an). ژمارەیەک لە وشەکانی ئەم خێزانە مانای "بۆر، رەش"یان وەرگرتووە، وەک ↑*دەوار2 dewar* "پارچەی رەشماڵ"، ↑تەو tew "پەزی بۆر" و هتد.

دکن **dıkın** - "چڵکەسوو، چڵکێک کە بە شوشتن پاک نابێتەوە": دکین dıkîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "چڕ و پڕ بوون، سفت بوون" دەکەن، وەک ↑تەژی tejî، ↑تەقن teqın و هتد.

دگدگە **dıgdıge** [ *dıgdıga* ] - "1- نووکی مەزرەقی کول 2- باپشکێو، چیچکەسڵاو": خزمە دەگەڵ ↑دوگمە dugme.

دڵ **dıl** [ *dıl* ] - "ئەندامێکی هەناو": دل del (P.). خزمە دەگەڵ zered (Av.)، Herz (G.)، Heart (E.)، hjärta (Sw.)، kardia (L.)، cor (Gr.)، serdce (Rus.) گشتیان بە مانای "دڵ"، سەر بە ریشەی **< *kerd-** ***(IE.)*** "دڵ".

دڵۆ **dılo** [ *dılo* ] - " تەڵەزمی بچووک لە پێست": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑تلێشان tılîşan،

2- ↑*دڕاندن dırandın* سەر بە ریشەی **< *der-** ***(IE.)*** "دڕاندن، قەڵشاندن، جیا کردنەوە".

دڵۆپ(ە) **dılop(e)** [ *dılop(a)* ] - "چکەئاو": درۆپ dırop یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ drop (E.) و (Nl.)، Tropfen (G.)، droppe (Sw.) "دڵۆپ(ە)". ریشەی وشە ژێرمەنییەکان ساخ نەکراوەتەوە ولەم بارەوە تەنیا یەک وشەی ناژێرمەنی بۆ هەڵسەنگاندن دۆزراوەتەوە کە drúcht (Mir.) ە بە مانای "نم، شەونم"، کەچی وشەی هاوتای دە زمانی کوردمادیدا زۆر روون و ئاشکرایە! وشەکانی ↑دەڵاندن delandın "تەڕایی دانە دەرەوە، ئاو لێ هاتن" و ↑تەڕ ter لە پێوەندی دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوەدان.

دلۆرە **dılore** [ *dılora* ] - "راکشان، درێژ بوون": شێوەیەکی دیکە لە ↑تلۆر tıl(l)or.

دمبەک **dımbek** [ *dımbak* ] - "جۆرێک تەپڵ": دمبەگ dımbeg و دومبەک dumbek و دنبەک dınbek یش دەگوترێ. تنبک tonbak (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑زۆمپ zomp "کوتکی زلی ئاسن" و چەند وشەیەکی دیکە کە پێوەندیان بە چەمکی "لێدان و کوتان"ەوە هەیە.

دمبێن **dımbên** [ *dımben* ] - "زاربەند، زارک بەند": دم [↑دەم dem "زار"] + بێن ben. "بێن" دەچێتەوە سەر ↑بەند bend، سەر ریشەیەک بە مانای "بەستن".

دملی **dımlî** [ *dımlī* ] - "شێوەزاری زازایی": هەروەها دنبلی dınblî هەیە بە مانای "زازا، هۆزێکی کورد". دەشێ ناوی ئەسڵی ئەم هۆزە *دمبلی dımblî** بووبێ و پێوەندی هەیە بەم وشانەی کە لە ژێر وشەی ↑تەمر temır "مۆری دەوڵەتی" [تمبر tember (P.)] و ↑*تەمغە temġe* "مۆری ئیداری"دا شی کراونەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان، کوتان". وشەی ↑تەمبوور tembur یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و سازێکە بۆ "لێدان". زۆر وێ دەچێ ناوی ئەم هۆزە لە وشەی تەمبوور tembur وەرگیرابێ، چونکوو تەمبوور سازێکی باو و خۆشەویستە لە لای ئەم خەلکە و لەوانەیە بە ناوی ئەم سازی مووزیکەوە بانگ کرابن.

تەمغە **temġe** [ *tamġa* ] - "مۆری دەوڵەتی": داغمە dağme ش دەگوترێ. خزمە لەگەڵ ↑تەمر temır "مۆری دەوڵەتی".

دندووک **dınduk** [ *dındūk* ] - "نووکی پەڵەوەر": دەندووک denduk و دوندووک dunduk و دەنووک denuk یش دەگوترێن. شێوە کۆنترەکەی دەبێ دوندووک بێ. [دوند + ئوک dund + uk]، واتا دوندی چکۆڵە. ↑دوند dund واتا "نووک، شت یان شوێنی تیژ و دەرپەڕیو"، دە بنەڕەتدا واتا "ددان".

دنگە **dınge** [ *dınga* ] - "کۆڵەکەی لە قوڕ و بەرد": خزمە دەگەڵ ↑دۆمە dome "پشتێندی رەشماڵ".

دنە **dıne** [ *dına* ] - دنە دان dıne dan واتا "هان دان، هەڵخڕاندن". دە بنچینەدا تینە دان tîne بووە و پێوەستە بە وشەی ↑تین tîn "هێز، گەرما".

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا anfeuern بە مانای "دنە دان، هان دان" دێ کە دەچێتەوە سەر وشەی Feuer "ئاگر". هەرلێرەوە بیر بۆ ئەوە دەچێ کە وشەی "هەڵخڕاندن"یش بە مانای دنە دان دە بنەڕەتدا "هەڵگڕاندن" بووبێ سەر بە وشەی گڕ gır "بڵێسەی ئاگر". وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردیدا بە مانای

هان دان دێ کە بریتییە لە "زیخاندن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ زیخ "بوێر، ئازا"، Sieg (G.) "سەرکەوتن، زاڵ بوون" و ژمارەیەک وشەی کوردمادی کە چەمکی "هێز، پتەوی" لە خۆ دەگرن و لەژێر "سەق"دا باس کراون].

**دوە dıwe** [ *dıwa* ] - "تینی هەتاو کە هاوینان لە زەوی هەڵدەستێ": خزمە لەگەڵ ↑دەم² dem "نەفەس، هەناسە، هاڵاو".

**دوان duwan** [ *duwān* ] - "قسە کردن": بنجی دو(و)- duw- خزمە دەگەڵ سڤ- sıv- [↑بەرسڤ *bersıv* واتا وەڵام]، هەروەها دەگەڵ چپ- çıp- [چپە çıpe، چپاندن çıpandın]. بنجی ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قسە کردن". لەم تێڕوانینەوە وشەی "دوان" دەبێ ئەم ئاڵوگۆڕانەی بەسەردا هاتبێ [چپان ← چڤان ← چوان ← دوان]. دە زمانی کوردمادیدا ↑چڤ çıv و ↑چڤاندن çıvandın بە کار دێن بە مانای "چپە" و "سەرکۆنە کردن".

**دوایی duwayî** [ *duwāyī* ] - "1- پاشان 2- کۆتایی، پایان": ↑دوومایی dumayî و دووماهی dumahî یش دەگوترێن و ئەمانە شێوەی کۆنتری وشەکە پێشان دەدەن. وشەکە دەچێتەوە سەر↑ دوو² du بە مانای " کلک، ئەندامی پاشەوە و کۆتایی ئاژەڵ". [بە پێچەوانەی "سەر" کە وشەی "سەرەتا"ی لێ دروست بووە].

**دۆینێ dö(ne)** [ *dö(ne)* ] - "رۆژی بەرێ": دۆیکە döke ش دەگوترێ. هەروەها دۆیشەو döşew مانای "شەوی بەری" دەبەخشێ. دی dī (P.) [دیروز، دیشب]. وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ دی dî و ↑ئیدی îdî [شەوادی]

**دوچک duçk** [ *dučk* ] - "ترۆپک، قووچکە": ئەم چەند وشەی خوارەوە هەموویان خزمن و دەچنەوە سەر وشەیەکی بنەڕەتی: ↑سووچ suç، ↑گۆشە goşe، ↑قووچ quç [قووچکە quçke]، ↑دوچک duçk، ↑کۆچک koçk [کۆچکە koçke]، ↑ئەنگوچک enguçk [ئەنگوچکەسۆرانی]، ↑دوگمە dugme و هتد. وشە بنەڕەتییەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەرپەڕین، دەرپەڕیو بوون، زەق بوون". بۆ زانیاری پتر بڕوانە ↑زەق *zeq*.

**دودک dudık** - "شمشاڵ": بڕوانە ↑توتوک tutuk "شەیپوور". لە مەهاباد ئەوکات کە ئێمە منداڵ بووین، بە سیگناڵی ترۆمبێلمان دەگوت دیدی dîdî. کردارەکە دەبوو بە "دیدی لێدان". ئەم وشەیە ئاماژەیە بە شەیپووری ماشێنەکە. دیارە سیگناڵی ماشین سەرەتا بە جۆرێک شەیپوور لێدراوە.

**دوز duz** - "بوزوو، شاڵ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تەژ tej "ژێرجلی بارەبەر"، ↑تەژگ tejg "کەتان"، ↑دۆق1 doq "گوڵەباتون کە لە قەراخی جلکی دەدروون" و دەگەڵ ↑*تەقیلە teqîle* "جۆرێک کڵاو".

**دوژ1 duj** [ *duž* ] - "کز و سیس": بڕوانە ↑دۆش doş [دۆش دامان].

**دوژ2 duj** [ *duž* ] - "گوریش، تەناف": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑دەزوو dezu.

**دوگمە dugme** [ *dugma* ] - "قۆپچە، پشکوژ": دگمە dıgme ش دەگوترێ. دگمە dogme (P.) یان تکمە tokme (P.). جگە لەمە ↑دەکە deke یان دکە dıke هەیە بە مانای "سەکۆ"، هەروەها ↑دگدگە dıgdıge هەیە بە مانای "1- نووکی مەزرەقی کول 2- باپشکیو، چیچکەسڵاو". چەمکی هاوبەش لە هەموو ئەم مانایانەدا "دەرپەڕین، بەرجەستە بوون، قوت بوون"ە. هەروەها ئەگەر چاو لێ بکەین، دەبینین کە دوو وشەی "دکە" و "سەکۆ" نەک هەر مانایان یەکە، بەڵکوو شێوەشیان زۆر لەیەک دەچێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑زەق zeq و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە کە مانای "دەرپەڕین، دەرپەڕیو بوون" دەگەیەنن. دە زمانی فارسیدا چەندین وشە لەم بارەوە سەرنج رادەکێشن. ئەم وشانە نیشان دەدەن کە قۆتیمی z یان s دە وشەکانی زەق zeq و سەکۆ seko دا دە ژمارەیەک وشەی دیکەدا گۆڕاون بە d یان t. ئەم وشانەی زمانی فارسی بریتین لە دک کردن dak kardan (P.) "دەرپەڕاندن"، دکل dakal [دگل dagal] (P.) "داری بڵندی کەشتی"، دک و پوز dek ū pūz (P.) "لووت و لمبۆز"، دگنک daganak (P.) "دار، گۆپاڵ". چەمکی "دەرپەڕین، دەرپەیوی" لە هەموو ئەم وشانەدا ئاشکرایە. خاڵێکی دیکە کە لێرەدا جێی سەرنجە، ئەوەیە

که وشەی ↑دەکە deke "سەکۆ" دە زمانی فارسیدا [دکە dake (P.)] هەم وەک "سەکۆ" و هەم وەک ↑دووکان dukan مانا کراوەتەوە. ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەری دەخا کە مەبەست لە "دووکان" دە بنەڕەتدا هەر "دەکە" واتا سەکۆ بووە کە فرۆشەر کەلوپەلی خۆی بۆ فرۆشتن لەسەر داناوە. پاشان "دەکە" مانایەکی بەربڵاوتری بەخۆوە گرتووە و بەو هۆدەیەش گوتراوە کە شتی تێدا دەفرۆشن، یان سەکۆکانی لێ دادەنرێ. بەم جۆرە گومان لەوەدا نامێنێ کە وشەی ↑دووکان dukan وشەیەکی سەر بە زمانی کوردمادییە کە چووەتە ناو زمانی عەرەبییەوە، نەک بە پێچەوانەوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بە "دووکان" دەگوترێ Laden (G.). ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر laden (MG.) "تەختە، سەکۆی لە تەختە دروستکراو، تەختەی شت لەسەر فرۆشتن (تەبەق، خوانچە)". Latte (G.) "تەختەی ئەستوور" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە].

دولاب **dulab** *[ dulāb ]* - "1- چەرخی ئاوکێشان 2- خەرەک 3- تۆپی ئاش": خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan "سووڕان".

دوڕڕ **durr** *[ durr ]* - "مرواری" [دوڕڕ و گەوهەر]. در dorr (P.). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑تڵتە tılte [دە فارسیدا: درد dord (P.)]، چونکوو دوڕڕ لە ئەنجامی کۆما بوونی خڵتە و خاڵی ئاهەکی لە ناو سەدەفدا دروست دەبێ.

دوڕڕە **durre** *[ durra ]* - "دوورەگە": دورگە dorage (P.). پێک هاتووە لە دوو + ڕە(گە) re(ge) + du. مەبەست ئەوەیە کە کەسێک بەرهەمی تێکەڵاویی دوو ↑رەگەز regez بێ.

دوژمن **dujmın** *[ dužmın ]* - "نەیار، ناحەز، نەتەوی": دژمن djmn یش دەگوترێ. دشمن došman (P.). پێک هاتووە لە دوو کەرتی دوژ + من duj + mın. کەرتی دوژ duj خزمە دەگەڵ ↑دژ dıj و دە بنەڕەتدا بە مانا "بەد، خراپ"ە. کەرتی من mın- یان پاشگرێک بووە، یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە Meinung (G.) "مەبەست"، meaning (E.) "مانا"، mīan (OIs.) "ئارەزوو، داخواز". ئەگەر ئەم پێوەندییە ڕاست بێ، ئەوسا مانای وشەی دوژمن دە بنەڕەتدا دەبێتە "خاوەنی مەبەست و ئارەزووی بەد". ئەم مانایە دەگەڵ وشەکانی "ناحەز و نەتەوی" باش دەگونجێ کە ئەوانیش دەگەڵ دوژمن مانایان یەکە و ئاماژە دەکەنە کەسێک کە حەزی لە مرۆڤ نییە، مرۆڤی خۆش ناوێ.

دولک **dulk** - "داری قۆچەقانی": دە ئەسڵدا دوو + ↑ لک du + lık، مەبەست ئەوەیە دارەکە دوو دانە لکی لێ دەبێتەوە یاخود دوو دانە لقی هەیە.

دومەڵ **dumel** *[ dumal ]* - "کوان، قوتیر": domal (P.). پێوەندی هەیە بە کرداری tumere (L.) "هەڵمسان" و tumor (L.) "کوان، دومەڵ"، سە بە ریشەی **< *tu- (IE.)** "هەڵمسان، ئەستوور بوون".

دوند **dund** - "نووک، ترۆپک": خزمە دەگەڵ ↑دان dan [ددان]. دە زمانی ئەڵمانیشدا zinne (G.) و zinke (G.) بە مانای "دوند، جەمسەری تیژ و دەرپەڕیو" دەچنەوە سەر Zahn (G.) "ددان". دە زمانی ئینگلیزی کۆندا tind (OE.) "نووک، جەمسەری دەرپەڕیو" هەبووە کە زۆر لە وشە کوردمادییەکە دەچێ. وشەکانی ↑ددانە dıdane، ↑دەندە dende و ↑دندووک dınduk [دەنووک: دەن(د) + ئووک ] سەر بەم خێزانە وشەن. گشت ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە "نووکدار بوون، دەرپەڕین و تیژایی".

[تێبینی: دوویەمین فۆتیمی d دە وشەکانی دوند و دەندە و دەندووک دا دە هێندێک لە زمانە ئەورووپییەکاندا دەکەوێتە کۆتایی ئەو وشەی مانای "دان/ ددان" دەبەخشن. بڕوانە ئەو وشانەی لە ژێر وشەی دان dan دا باس کراون. بۆیە ئەم فۆتیمە دەبێ بە بەشێک لە وشە کۆنەکەی دابنێین، نەک ئەوەی دواتر خرابێتە سەر وشەکانەوە].

دوو **du 1** *[ dū ]* - "یەک و یەک": دو do (P.)، two (E.)، twai (Got.)، tva (Sw.)، zwei (G.)، dýo (Gr.)، duo (L.)، dvau (OIn.) سەر بە ریشەی **< *duō(u)-, *duai- (IE.)** "دوو".

**دوو2 du 2** [ *dū* ] - "1-کلک، پاشەڵ 2- پاش": دووڤ duv و دوما duma [دما dıma] ش دەگوترێ. دم dom (P.). دە زمانی ئەڵمانیدا schwingen (G.) هەیە بە مانای "جووڵانەوە" (ی بەم لاو ئەولادا، جووڵانی گەوزی). هەروەها وشەی Schwanz (G.) "کلک" هەیە کە پێوەستە بە کرداری باسکراو، چونکە کلک شتێکە یان ئەندامێکەبەم لا وئەولادا دەجووڵێتەوە و لەبەرئەوە ئەوها ناونراوە. ئێمە دە زمانی کوردمادیدا وشەی جمین/ جڤین cımîn /cıvîn مان هەیە کە خزمی وشە ژێرمەنییەکەی سەرەوەیە. دە زمانی فارسیدا وشەکە دەبێتە جنبیدن jonbīdan (P.). ئەگەر لە وشە فارسییەکەوە بڕوانینە کێشەکە، بۆمان دەردەکەوێ کە دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا، هەروەک ئەڵمانییەکە، وشەی دوو duدەچێتەوە سەرئەو کردارانەی سەرەوە. وەک دەبینین بنەوشەی کردارەکە دە زمانی ئەڵمانیدا -schwing و دە فارسیدا -conb ە. دە زمانی فارسیدا کلک دەبێتە دنب/ دم donb/ dom. [فۆتیمی ج / c لە بەرایی بنەوشەکەدا گۆڕاوە و بووەتە د / d]. ئەم وشەیە بە شێوەیەکی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا هەیە کە تێیدا فۆتیمە کۆنەکە باشتر دەردەکەوێ و ئەویش وشەی ↑چمە çıme یە بەمانای "دوو(ڤ)، کلک".

دە زمانی فارسی ئەمڕۆدا وشەی دم dom بە مانای کلک بەکاردێ ولە هەمان کاتیشدا شێوە کونترەکە، واتا دنب donb دە وشەکانی دنبلان donbalān (P.) "دووگە" و دنبال donbāl (P.) "دوا، دوو" و دنباله donbāle (P.) "کلکە، پاشەڵ، دوایی"دا دەبیندرێ. زمانی عەرەبیش ئەم وشەیەی وەرگرتووە و کردوویە بە ذنب zenb (Arb.) "کلک، کلکە". دە زمانی کوردمادیدا وشەکە پێشتر دووم dum بووە [هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی دوومایی dumayî یان دووماهی dumahî]، پاشان بووەتە دووڤ duv و دە شێوەزاری کوردمادی ناوەراستدا بووەتە دوو du. [du ← duv ← dum ← dunb]. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی دوو du دەگەڵ Schwanz (G.) "کلک" خزمە و هەر دووک وشە بۆ یەک ریشە دەگەڕێنەوە. وشەی دوو du "کلک" دە زمانی کوردمادیدا لە باری شێوە و ماناوە دیسان گۆڕاتیکی دیکەی بەسەرداهاتووە و بووەتە ↑دوا duwa [duwa ← duva ← duma]. کاتێک دەگوترێ "بەدوادا گەڕان" و "وەدوا کەوتن"، دەبینین کە وشەکە دیسان مانایەکی تازەتری وەرگرتووە. ئەم مانایەش لێرەوە دروست بووە کە کلکی ئاژەڵ پاشترین شوێنە کە دەبیندرێ و وەک نیشانە و ئاسەوارێک وایە بۆ ئاژەڵەکە. بە وتەیەکی دیکە مەبەست لە"بە دوادا گەڕان" و "بە دوا کەوتن" دەبنەڕەتدا "دۆزینەوەی کلک" بووە! چونکە بە دۆزینەوەی کلکەکە ئەوا ئاژەڵەکەش خۆی دەدۆزرێتەوە. دە زمانی فارسیشدا بۆ ئەم چەمکانەی سەرەوە "دنبال کردن" و "دنبال رفتن" دەگوترێ کە دەگەڵ شێوە کوردمادییەکان یەک دەگرێتەوە. هەروەها وشەی دوا duwa نەک هەر مانای پشتەوە واتا شوێنی پاشەوە دەدا [بە ئینگلیزی: behin]، بەڵکوو مانای "پاش"ی زەمانیشی وەرگرتووە [بە ئینگلیزی: after] واتا ئاماژە دەکاتە کاتێکی نەهاتوو یان داهاتوو. جگە لەمانە دە زمانی کوردمادیدا دوومایی/ دوایی dumayî /duwayî هەیە کە بە مانای "پایان، کۆتایی" بەکاردێ. پەیدا بوونی ئەم مانایەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دوو du، واتا کلکی ئاژەڵ ئاخرین شوێنی ئەوە و ئەم شوێنە وەک " کۆتایی لەشی ئاژەڵ" و پاشان بە گشتی وەک "ئاخر و کۆتایی" لەبەرچاو گیراوە، بە پێچەوانەی "سەر" کە "سەرەتا"ی ئاژەڵەکەیە.

[تێبینی: هەر لەم پێوەندییەدا شیاوی باسە کە وشەی Ende و end "کۆتایی" دە زمانەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزیدا خزمن دەگەڵ هەنێ hene ی کوردمادی و antios (Gr.) "هەنێ" و ئەم شوێنە وەک ئاخرشوێنی مرۆڤ و وەک "کۆتایی" چاوی لێ کراوە].

**دووبەڵا dubela** [ *dūbalā* ] - دەگەڵ "ئاستەم" دێ [بە ئاستەم و دوو بەڵا واتا بە سەختی، بە زەحمەت].ئەسڵی وشەکە دەبێ ↑باڵ bal یان ↑پەل pel بێ و ئاماژەیە بە "دەست". لەم تێڕوانینەوە مانای "دوو بەڵا" دەبێتە "بەهەر دوو دەستان". رەنگە دە بنەڕەتدا ئەو وشەیە بۆ رۆیشتنی مرۆڤ دە تاریکیدا بەکارهاتبێ، واتا کاتێک مرۆڤ لەبەر تاریکی پەلەکوتێ دەکا و دەست بەم لاو ئەو لادا دەخشێنێ.

**دووپشک** dûpışık [ *dūpišık* ] - "زیندەوەرێکی پێوەدەر، دەمارەکۆڵ": هەردووک وشەی "دووپشک" و دەمارەکۆڵ demarekol بە یەک چەشن دروست کراون ولە دوو بەش پێک هاتوون. دە وشەی "دووپشک"دا کەرتی یەکەم وشەی ↑دوو du واتا "کلک"ە، لە وشەی "دەمارەکۆڵ"دا کەرتی یەکەم بووەتە دەمار demar. "دەمار" ئاماژە بە "کلکی" دووپشکە، کەرتی دووەم لە یەکەمیاندا "پشتک" pıştık بووە و بووەتە پشک pışık. مەبەست ئاماژە کردنە بەوە کە زیندەوەرەکە کلکی دەخاتە سەر پشتی. لە ناوەکەی دیکەی ئەم زیندەوەرەدا لەجیاتی پشت، "کۆڵ" داندراوە، واتا کلکی دەخاتە سەر کۆڵی. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە وشەکانی ↑دوو du "کلک"، ↑پشت pışt و ↑کۆڵ kol.

**دووتن** **dûıtn** [ *dūtın* ] - "سواخ دان، تێهەڵسوون": اندودن andūdan (P.) [پێشگری ان + دودن dūdan + an، ئەم پێشگرە دە زمانی کوردمادی و فارسیدا باوە و بە گەلێک کردارەوە دەلکێ، بڕوانە پێشگری ↑ئا -a]. خزمە دەگەڵ ↑خاوێن xawen.

**دووچار** **duçar** [ *dūčār* ] - "تووش": دچار dočār (P.). دووچ + ئار duç + ar. کەرتی دووچ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تووش tûş [تووش بوون].

**دووخ** **dux** [ *dux* ] - "ئاستێکی نووک تیژ لە خەڕەکدا": خزمە لەگەڵ ↑دۆخ dox "تیری کەوان".

**دوور** **dur** [ *dūr* ] - "بەرانبەری نیزیک، دەست پێڕانەگەیشتوو": دور dur (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ tele (Gr.) "دوور". ریشە؟

**دووزەڵە** **duzele** [ *dūzala* ] - "ئامرازێکی مووزیکی کوردمادی": پێک هاتووە لە دوو وشەی دوو + ↑زەل du + zel. ئامرازەکە دەبێ لە دوو دانە زەل "نەی، قامیش" دروست کرابێ. تووزەلە tuzele ش دەگوترێ.

**دووفلیقانە** **duflîqane** [ *dūflīqāna* ] - "قۆچەقانی": دوو + فلیقانە du + flîqane. فلیق fılîq خزمە دەگەڵ Fork (E.)، force (OE.)، furcha (OG.)، furca (L.) "چەنگاڵ، چەتاڵ، بوونە دوو فاق". "دوو فلیقانە" لەسەر شێوەی bifurcus (L.) یان two-forked (E.) دروست کراوە.

**دووکان** **dukan** [ *dūkan* ] - "فرۆشگا": خزمە دەگەڵ ↑دوگمە dugme.

**دووکەڵ** **dukel** [ *dūkal* ] - "تەمی ئاگر":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑دوومان duman و ↑تoومان tuman. دە فارسیدا دود dūd (P.). لەوانەیە وشە کوردمادییەکە لە دوو کەرتی du + kel یان duk + el پێک هاتبێ و کەرتی یەکەم بنجی وشەکە بێ. دوو -du یان دووک -duk دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تۆز toz و ↑تەن ten "قورم، سیان" و ↑توون tun و ↑تین tîn و ژمارەیەک وشەی دیکە.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ریشەی هیندوئەورووپی ***(IE.) *dheuk-, *dhuk- >*** "جووڵانەوی خێرا، سووڕانەوە بەم لا و لادا". ducken (G.) "بزاڤێکی خێرا (بەرەو خوار) کردن" و tauchen (G.) "شیرزە لێدان، خۆ دە ئاودا نقوم کردن" دە زمانی ئەڵمانیدا لەم ریشەوە هاتوون.

[تێبینی: جگەرەیەکی دانیمارکی هەیە کە ناوی dukel ە و ئەمەش شتێکی سەرنجڕاکێشە. جێی لێکۆڵینەوە کە ئایا ناوی ئەم جگەرەیە پێوەندی بە "دووکەڵ"ی کوردمادییەوە هەیە یان نا؟]

**دووگە** **duge** [ *dūga* ] - "پاشەڵی مەر": دنبە donbe (P.). خزمە دەگەڵ ↑دوو du "کلک".

**دوومایی** **dumayî** [ *dūmāyī* ] - شێوەی پێشووتری ↑دوایی duwayî.

**دوویساندن** **dûysandın** [ *dūysāndın* ] - "شێلان و تەپاندن بە قاچ و دەست": دە ئەسڵدا "تەپساندن tepsandın" بووە و شێوەی جەختکراوی ↑تەپاندن tepandın ە. [ناوگری s یەکێک لەو ناوگرانەیە کە دۆخی جەخت کردن بە هێندێک ئاوەڵناو یان کردار دەبەخشێ، بە ئەڵمانی بەم دۆخە دەگوترێ (Intensivbildung). نموونەی دیکە لەم جۆرە کردارانە بریتین لە خلیسکان، تلێسانەوە، هەڕستاندن و هتد.

دو¹ **do** - "ماست و ئاوی لە مشکەدا ژنراو": دوغ dūġ (P.). لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑دۆشین doşîn و دۆشاو doşaw.

دو² **do** - "کیژ": کورتکراوەی ↑دۆت dot.

دۆبە **dobe** *[ doba ]* - "1-خشت و خاڵی هەنگوین 2- هەنگوینی قاڵکراو": پێوەندی بەم وشانەوە هەیە کە مانای "رەش، ئاماڵ رەش، بۆر" دەدەن. بڕوانە ↑دەوار² dewar "پارچەی رەشماڵ". دە زمانی ئیرلەندی کۆندا dub (OIr.) بە مانای "رەش" بووە.

دۆپ **dop** - "1- نزم، نەوی 2- گەلی، شیو": خزمە دەگەڵ ↑تاپی tapî و ↑تەپین tepîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵ".

دۆت **dot** - "کچ": ↑دۆ do ش دەگوترێ [دەستی دۆ گرتن دە رەشبەڵەکدا]. خزمە دەگەڵ doxtar (P.) "کچ" و دوشیزە dūšīza (P.) "کچ"، Tochter (G.)، daúhtar (Gt.)، daughter (E.)، dotter (Sw.)، duhitar (OIn.)، thygátēr (Gr.)، duktē (Lit.) گشتیان بە مانای "کچ"، سەر بە ریشەی **< *(IE.) *dhug(h)eter-*** "کچ". شیاوی باسە کە دە زمانی کوردمادیدا وشەی "کچ" یان "دۆ(ت)" بە گشتی بە مانای "کچ" بە کار دێ واتا چ کچ بە مانای "فرزەندی مێیینەی مرۆڤ" بێ و چ کچ بە مانای "مێیینەی کەمتەمەن یان شوو نەکردوو"، واتا چ پێوەندی خزمایەتی مەبەست بێ یان نەبێ. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دوو وشە هەیە کە یەکەمیان ئەوانەی سەرەوەن و بۆ ئاماژەکردن بە فرزەندی مێیینە بەکاردێ و دوومیان بە مانای مێیینەی شوو نەکردوو. بۆ ئەم مانایەی دووەم بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا Mädchen هەیە، دە ئینگلیزیدا girl هەیە. دە زمانی فارسیدا وشەی "دختر" ئەمرۆ بۆ هەردوو ماناکە بە کار دەهێنرێ و لە هەمان کاتدا وشەی"دوشیزە" بۆ کچی جەوان و شوونەکردوو بە کاردەهێنرێ. دەشێ دە زمانی کوردمادیدا "دۆت" سەرەتا وەک زمانە ژێرمەنییەکان، تەنیا بە مانای "فرزەندی مێیینە" بەکار هاتبێ و لایەنی خزمایەتییەکەی گەیاندبێ و بۆ مانای دووەمیش، واتا مێیینەی شوو نەکردوو، وشەی "کچ " بەکار هێنرابێ.

دۆچ **doç** *[ doč ]* - "گیایەکە بۆ خەلە خراپە": خزمە دەگەڵ ↑تووش tûş و ↑دووچار duçar [تووش بوون، دووچار بوون، بەرخورد کردن]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "وێککەوتن، بە یەکدا دران". هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "بەڵا" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان". بەم جۆرە مانای"دۆچ" هەر وەک مانای "بەڵا" وایە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ "ژەنگ" بە مانای "بەڵای گیا" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و خزمە دەگەڵ زەنگ [زەبر و زەنگ].

دۆخ **dox** - "وەزع، چلۆنایەتی": [بار و دۆخ]. هەروەها دۆخیان doxyan هەیە بە مانای "هەرەت، جەنگە". وێ دەچێ مانای ئەسڵی وشەکە ئەمەی دوایی بێ و لەمەوە مانای "وەزع، چلۆنایەتی" پەیدا بووبێ. دەشێ سەرەتا ئاماژە بە هەرەت و ئەوجی پێک هاتنی کارێک یان حاڵەتێک کرابێ و دواتر ماناکە بۆ "وەزع، حاڵەت" گۆڕابێ [بۆ وێنە: دۆخ یان دۆخیانی هەڵگرتنەوەی بەر و بووم لە باغ واتا هەرەتی... و دواتر: باغەکە لەدۆخی هەڵگرتنەوەی بەروبووم دایە]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە thīhan (OG.)، đion (OE.)، gedeihen (G.)، gedijen (Nl.) "هەڵدان، پەرە سەندن، تەشەنە کردن"، gedigen (MG.) "پێگەیشتوو، قورس و قایم، سفت و سۆڵ". کەرتی -ge دە وشە ژێرمەنییەکاندا پێشگرە. دە زمانی کوردمادیدا ↑تەشەنە teşene و ↑تەژی *tejî* "پڕ" [لەبنەڕەتدا "چڕ"] پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا ↑دەق3 deq یش بەکار دێ کە پێوەندی بە "دۆخ"ەوە هەیە [کارەکە هەر لەسەر دەقی جارانە، هیچ نەگۆڕاوە].

[تێبینی: وشەی هەرەت heret یش خزمە لەگەڵ alt (G.) و old (E.) "پیر" و سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەڵدان، گەورە بوون، پێگەیشتن"].

دۆخ 2 **dox** - "تیری کەوان": خزمە لەگەڵ ژمارەیەک وشە ↑دەکە deke، ↑دووکان dukan، ↑تۆقین ²toqîn [↑هەڵتۆقین heltoqîn "قیتەوە بوون، دەرپەڕین"]، دەکەل dekel، ↑دوگمە dugme دووخ dux "ئاستیکی نووک تیژ لە خەرەکدا" و هتد. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە "دەرپەڕین، زەق بوون" دەکەن و خزمن لەگەڵ ↑زەق *zeq*.

دۆخین **doxîn** [ *doxīn* ] - "بەندی پانتۆڵ": خزمە دەگەڵ Docht (G.) "فتیله"، taht (MG.)، tattr (OIs.) "تیل، دەزوو، دۆخین". دە دیالێکتەکانی ئەڵمانیدا dahen و doche ش دەگوترێ. دە دیالێکتی سویسیدا dägel هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر سەر بە ریشەی **> *tek- (IE.)** "(لێک) بادان، چنین، هۆنینەوە". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑دۆق doq، ↑دەق deq و لەوانەیە ↑دەزوو dezu و هێندێک وشەی دیکە لەم ریشەوە هاتوون.

دۆڕان **doran** [ *dorān* ] - "بەزین، شکست خواردن": خزمە دەگەڵ ↑تۆڵە tole.

دۆزاخە **dozaxe** [ *dozāxa* ] - "قەڵسی، وەڕەزی، جارزی": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تۆسن tosın [تووڕە و تۆسن].

دۆزەخ **dozex** [ *dozax* ] - "جەهەننەم": دۆژە doje ش دەگوترێ. دوزخ dūzax (P.).

1- لە لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تووش2 tûş "خراپ، بەد"، سەر بە ریشەی **> *dheus- (IE.)** "هەڵچوون، دەرپەڕین". لەم تێڕوانینەوە مانای "دۆزەخ" دەبێتە شوێنێکی بەد و ناخۆش، یان شوێنی کەسانی تووش و دژ و بەدکار.

2- لە لایەکی دیکەوە ئەگەر سەیری وشەی "دەرەک" بکەین، کە ئەویش مانای دۆزەخ دەدا، دەبینین، کە ئەم وشەیە پێوەندی بە "دەرە" [دۆڵ و دەرە] ەوە هەیە. دە زمانی فارسیدا باس لە "درک اسفل السافلین" دەکرێ، واتا دۆزەخی هەرە ژێرەوە یان قووڵترین شوێنی دۆڵەکە. هەروەها شۆتێک (گوندێک) لە سەرووی تاران هەیە بە ناوی فارسی "درکە" [دەرەکە] کە پێوەندی بە دۆڵ و دەرەوە هەیە. پێوەندی تێوان دوو چەمکی "دۆڵ، نزمایی، قووڵایی" و "دۆزەخ" لە وشەی ↑دۆزەقدەرە dozeqdere شدا بەرچاو دەکەوێ کە ناوی گوندێکە لای مەهاباد. ئەوەی لێرەدا جێی رامانە، پێوەندی دوو چەمکی "دۆڵ، دەرە" و "دۆزەخ"ە. لە هزری مرۆڤانی کەونارادا پێوەندییەکی لەم جۆرە لەئارادا بووە، هەر بۆیە باوەڕیان بە "پردێک"یش هەبووە کە دروستکاران بەسەریدا دەپەڕنەوە و بۆ بەهەشت دەچن و بەدکارانیش ناتوانن بپەڕنەوە و دەکەونە خوارەوە (بۆ ناو دۆڵەکە). دە زمانی ئەڵمانیدا دۆزەخ دەبێتە Hölle (G.) و ئەمەش خزمە لەگەڵ hohl (G.) "کون" [کون و کەلێن]. لەوانەیە ئەو پێوەندییەی سەرەوە لای هۆزە ژێرمەنییەکانیش لە ئارادا بووبێ. ئێستا ئەگەر ئەو پێوەنییانەی سەرەوە لەبەر چاو بگرین، دەگەینە ئەم شیمانەیە کە وشە دۆزەخ [دۆژەک) دەتوانێ پێوەندی بە ↑تەشک teşk هەبێ بە مانای "خوارەوە، بنەوە، قووڵایی". [تەشک و داوێن، تەشقی ئاسمان واتا قووڵایی ئاسمان]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەی **> *dheu - (IE.)** "قووڵ، هەڵۆڵ". [وشەی "هەڵۆڵ" خزمە دەگەڵ وشە ئەڵمانییەکانی سەرەوە].

دۆزین **dozîn** [ *dozīn* ] - "پشکنین، بە شوێندا گەڕان": هەروەها دوزینەوە dozînewe هەیە بە مانای "پەیدا کردن"، بەڵام مانای وشەکە دە بنەڕەتدا "بە شوێندا گەڕان" بووە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑سەچتین seçtîn هەیە بە مانای "پشکنین" و ↑سۆسە sose کردن بە مانای "بە گومان دۆزینەوەی نەهێنی". دە زمانی فارسیدا جستن jostan (P.) و جستجو jostoju (P.) هەیە بە مانای "دۆزین، بە شوێندا گەڕان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ suchen (G.)، suohhen (OG.)، sōkjan (Gt.)، seek (E.)، söka (SW.) "بەدوادا گەڕان، دۆزین، پەیدۆزی کردن"، سەر بە ریشەی **> *sag- (IE.)** "دۆزین، سەچتین". sagire (L.) "هەست کردن، سۆسە کردن"، saigim (OIn.) "دەیدۆزم، بە شوێندا دەگەڕێم"، hēgeīsthai (Gr.) "بەرەو پێش چوون"، خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑تشت *tışt* "شت".

دۆژە **doje** [ *doža* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑دۆزەخ dozex "جەهەننەم".

دۆسیە **dosîye** [ *dosyīa* ] - "مەلەف، پەروەندە، کێشەی دادوەری": خزمە دەگەڵ ↑دۆزین dozîn و ↑تشت *tışt*. لەم تێڕوانینەوە "دۆسیە" ئەو بابەتەیە کە دۆزینەوەی لەسەر دەکرێ، بە وتەیەکی دیکە "دۆز"ی پێش دادوەر. وەک دەبینین وشەکە بە ئەسڵ وشەیەکی کوردمادییە.

دۆش **doş** [ *doš* ] - دەگەڵ "دامان" دێ [دۆش دامان یان دژ dıj دامان واتا کز و مات دانیشتن لە بێدەسەڵاتی]. هەروەها لە وشەنامەدا ↑دوژ duj هاتووە بە مانای "کز و سیس". لەوانەیە وشەکە دە ئەسڵدا بە مانای "کز و مات، سیس" نەبێ. "دامان" مانای "تێدا مانەوە، گیر کردن، ڕێگەی دەرچوون نەبوون" دەدا. ئەگەر "دۆش" بە مانای "کز و سیس" بێ، باشتر بوو بگوترێ "دۆش و داماو بوون"، نەک "دۆش دامان". لەوانەیە وشەکە پێوەندی بە ↑تووش tûş "بەد، خراپ"ەوە هەبێ و مەبەست "بەد گیر کردن، پیس پێوە بوون" بە دەست بار و دۆخێکەوە بێ کە مرۆڤ لە بەرانبەریدا بێچارە و بێدەسەڵاتە.

دۆشین **doşîn** [ *došīn* ] - "گوشین و هەڵچۆڕاندن": خزمە دەگەڵ saugen ‹G.›، sugan ‹OG.› و ‹OE.›، zuigen ‹Nl.›، suck ‹E.›، sugere ‹L.› "مژین"، سەر بە ریشەی **< -*seu** ‹ **IE.** › "مژین، گوشین، هەڵقوراندن".

دۆشەک **doşek** [ *došak* ] - "ڕاخەری ئاخنراو بۆ لەسەر نووستن": دۆشەگ doşeg یش دەگوترێ. تشک toşak ‹P.›. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "ژێرەوە، لای خوارەوە" دەکەن، وەک ↑تەشک teşk [تەشک و داوێن]، ↑هەڵلادۆشە helladoşe "حندرحۆ" [سەر و خوارکەر]. لەم تێڕوانینەوە مانای دۆشەک دەبێتە ئەو شتە کە کە لە ژێرەوە رادەخرێ، شتێک وەک وشەی "زیرانداز" دە زمانی فارسیدا کە بە مانای "دۆشەک"یش بەکار دەهێنرێ.

دۆق1 **doq 1** - "گوڵەباتوون کە لە قەراخی جلکی دەدروون، پەڕاوێزی جلک": خزمە دەگەڵ ↑تاقە taqe "پارچەی پشتەکەوا"، ↑دەق deq " تێکست" [چنراو، تەنراو]، ↑دەزوو dezu و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەی **< -*tek** ‹ **IE.** › "چنین، هۆنین، تێکخستن".

دۆق2 **doq 2** - "1- زڵلە لە پشتمل 2- گۆپاڵ 3- لێدان، لێخستن": خزمە دەگەڵ ↑تەوقە tewqe "دەست لێدانەوە" و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "وێککەوتن، لێکدران".

دۆل **dol** - "بێچوو، نەوە و نەوەچرک": خزمە دەگەڵ ↑توڵە tule "بێچووەسەگ".

دۆڵ1 **dol 1** - "1- دەڕە، شیو 2- کیسەی چەرمین بۆ ئاو 3- دەفری گەنم کوتان بۆ ساوار": هاوریشەیە دەگەڵ Tal ‹G.›، dale ‹E.›، dal ‹Sw.›، dol ‹Rus.› "دۆڵ"، Delle ‹G.› "قووپاوی، رۆچوویی"، tholos ‹Gr.› "گومبەز"، سەر بە ریشەی **< -*dhel** ‹ **IE.** › "چەمانەوە، قووپانەوە، هەڵتۆقان". دە زمانی فارسیدا وشەکە بووەتە دڕە darre ‹P.› و ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیشدا دەگەڵ دۆڵ بەکاردێ و دەگوترێ دۆڵ و دەڕە dol u dere.

دۆڵ2 **dol 2** - "1-خلۆر، گلۆر 2- گاسنی سەر چەماو": خزم دەگەڵ ↑تلان tılan "سووڕان، گەوزان"، سەر بە ریشەی **< -*ter** ‹ **IE.** › "سووڕاندن".

دۆڵ3 **dol 3** - "پارچە زەوی ڕاست": خزمە دەگەڵ ↑داڵان dalan "ڕێگە و ڕاهڕەوی سەرداپۆشراو"، سەر بە ریشەی **< -*tel** ‹ **IE.** › " رووبەر، پانتایی، تەرک".

دۆڵ **dol** [4] - "وشەی دنە دانی زارۆک بۆ میز کردن": دە زمانی ئاخاوتنی فارسیدا doldol ‹P.› دەگوترێ بە مانای "سیرەتی زارۆک". دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە جێی هەڵسەنگاندنە:

1- ↑تلی tılî "قامک"، Dolle ‹G.› و thole ‹E.› "داری سەوڵ پێ ڕاگرتن" و týlos ‹Gr.› "قیتکە، داردەست، مێخ". ئەم وشانە خزمن هەروەها دەگەڵ ↑تبل tıbıl "قامک".

2- ↑توول tul [توولەنەمام، توولەڕێ] بە واتای "باریک".

دۆڵاب **dolab** ⌊ *dolāb* ⌋ - "جێگەی جلو بەرگ لە دیواردا": خزمە دەگەڵ ↑دۆڵ dol سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵایی، قوپاوی".

دۆڵپا **dolpa** ⌊ *dolpā* ⌋ - "هەشتپێ، چەلومەل": دوالپا dawālpā ‎(P.)‎. وشەی دوال dawāl ‎(P.)‎ دە فەرهەنگە فارسییەکاندا وەک "بەندی چەرمین، بەندی کەمەر" مانا کراوەتەوە. ئەم وشەیە دە کوردمادیدا دەبێتە ↑زۆڵ zol [زۆڵەچەرم zoleçerm واتا باریکەیەکی بڕدراو لە چەرم، زوێل zuwel و دوێل duwel یش دەگوترێ]. لەوانەیە خزمیش بێ دەگەڵ ↑توول tul [توولەنەمام، توولەمار، توولەرێ]. ئەم وشانە ئاماژە بە باریک و درێژ بوون دەکەن. لەم تێڕوانینەوە "دوڵپا" ئاماژەیە بە باریک و درێژ بوونی لاقەکانی ئەو جانەوەرە.

دۆڵچە **dolçe** ⌊ *dolča* ⌋ - "سەتڵی چەرمین": خزمە دە گەڵ ↑دۆڵ dol سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵکە، قووپاوی".

دۆلکە **dolke** ⌊ *dolka* ⌋ - "دەفری ئاو": خزمە دەگەڵ ↑دوڵچە dolçe "سەتڵی چەرم".

دۆلکان **dolkan** ⌊ *dolkān* ⌋ - "خوارەکە و پێچەکە": خزمە دەگەڵ ↑تلان tılan "سووڕان".

دۆلگە **dolge** ⌊ *dolga* ⌋ - "هەڵبەستی پێهەڵگوتن": دۆلکە dolke ش دەگوترێ. بنەوشەی دۆل -dol جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ tell ‎(E.)‎ "گوتن، گێڕانەوە، باس کردن"، Zahl ‎(G.)‎ "ئەژمار"، zala ‎(OG.)‎ "ئەژمار، ئەژماردن، گێڕانەوە، وتار"، taal ‎(Nl.)‎ "زمان"، tale ‎(E.)‎ "گێڕانەوە"، tale ‎(Dän.)‎ "قسە، وتە، وتار"، tellen ‎(Nl.)‎، zählen ‎(G.)‎ "ئەژماردن"، erzählen ‎(G.)‎ "گێڕانەوە، باس کردن" و Erzählung ‎(G.)‎ "گێڕانەوە، داستان". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *del(ə)- <*** "قەڵشاندن، رووشاندن، هەڵکۆلین، کوتان". dālāyati ‎(OIn.)‎ "دەقەڵشێنێ"، dolare ‎(L.)‎ "لێدان، کوتان" و dílti ‎(Lit.)‎ "سوانەوە"، tal ‎(Arm.)‎ "شەقڵ، نیشانە" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. وەک دەبیندرێ لە مانای "رووشاندن، هەڵکۆڵین"ەوە، مانای "نیشانە، عەلامەت"، دواتر مانای "ئەژمار" و "ئەژماردن" و پاشانیش مانای "قسە و باس و گێڕانەوە" سەریان هەڵداوە. دە زمانی کوردمادیدا ↑دەلکی delkî "جەفەنگ باز، قسەخۆش"، ↑دیلۆک dîlok "ستران"، ↑دیلەک dîlek "تکا کردن و پاڕانەوە بۆ کەسێک" پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە. هەروەها دەشێ ئەم وشانەی خوارەوەش سەر بە ریشەی باسکراو بن: ↑تەلە tel(e) [تەلەبەرد واتا پارچەبەرد]، ↑تەڵەزم telezm، ↑تەلسک telısk [پارچەیەک لە هێشووەترێ]، و لەوانەشە ↑تلێشان tılîşan و ↑تیلمە tîlme "پارچەی بڕاوی باریک".

دۆڵە **dole** ⌊ *dola* ⌋ - "تەشتی دارین بۆ هەویرشێلان": خزمە دەگەڵ ↑دۆڵچە dolçe.

دۆم **dom** - "قەرەچی، هۆزێکی کۆچەر": لەوانەیە وشەکە پێوەندی بە ↑زۆم zom ەوە هەبێ بە مانای "هۆبە، کۆمەڵەرەشماڵ". لەم تێڕوانینەوە وشەکە ئاماژەیە بە ژیانی کۆچەری و رەشماڵی ئەم هۆزە.

دۆمە **dome** ⌊ *doma* ⌋ - "پشتێندی رەشماڵ لەبەر بای بەهێز": خزمە دەگەڵ Damm ‎(G.)‎، dam ‎(E.)‎، dam ‎(Nl.)‎، damm ‎(Sw.)‎ "سەد، بەربەستی لافاو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *dhe- <*** "دانان، جێگیر کردن". خزمە دەگەڵ کرداری do ‎(E.)‎ و tun ‎(G.)‎ "کردن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی وەک ↑تەمەڵە temele "بەردی بناخە، یەکەم ریزی هێم" [ئەو بەردەی دیوارەکانی لەسەر جێگیر دەکرێ] و هەروەها ↑دنگە dınge "کۆڵەکەی لە قوڕ و بەرد".

دۆنم **donm** - "پێوانەیەکی زەوییە، یەکەیەک بۆ پێوانی زەوی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑دان1 dan "پێوانەی کات" [دانی نیوەڕۆ].

دهن **dıhın** - "رۆنی زەنگ، رۆنی قاڵکراو": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Sahne ‎(G.)‎ "خامە". ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر sain ‎(OFr.)‎ "رۆن" و دواجار دەچێتەوە سەر sagina ‎(L.)‎ "رۆن".

دە1 **de** ⌊ *da* ⌋- "دوو جار پێنج": دە dah ‎(P.)‎، ten ‎(E.)‎، zehn ‎(G.)‎، tio ‎(Sw.)‎، dasa ‎(OIn.)‎، deka ‎(Gr.)‎، decem ‎(L.)‎ سەر بە ریشەی ***(IE.) *dekm- <*** "دە".

**ده de 2** [ *da* ] - پرێپۆزیسیۆتیکە ئاماژە دەکاتە ناوەوە [دە دڵدا، دە ڕۆژی هەینیدا]. خزمە دەگەڵ ↑هندور hındur، در dar (P.) و اندر andar (P.)، antar (Av.)، inter (L.)، antar (OIn.) "دە ناو، دەتیوان".
دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای وشەکە برێک جیاوازە: unter (G.)، under (E.) و (Sw.) و هتد بە مانای "لەژێر، لەبن". پرێپۆزیسنۆنی in (G.) و (E.) و (Got.)، I (Sw.) و en (Gr.) "دە" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. ریشەی هەموو ئەم وشانە دەگەڕێتەوە بۆ ریشەیەکی کۆنی **(IE.) *en- >**. لەوێوە پاشان دوو ریشەی دیکە سەریان هەڵداوە، یەکەمیان **(IE.) *entos-** کە وشەکانی سەرەوەی لێ پەیدابووە و هەروەها ریشەی **(IE.) *[e] nei-** کە ئاماژە دەکاتە "نزمایی و لە ژێرەبوون". هەر لەم بارەوە باس لە ریشەیەکی دیکەش دەکرێ کە بریتییە لە *(IE.) *ndheri-* "ژێر، خوارەوە". ئەمیش پێوەندی بەو ریشانەی سەرەوە هەیە.

**ده de 3** [ *da* ] - "نیشانەی کردار لە کاتی ئێستادا" [دەڕوا derwa، دەبات debat، دەگرێ degre و هتد]. بڕوانە ↑د2 da [دا بدە da bıde، دا وەرە da were].

**دەبان deban** [ *dabān* ] - دەگەڵ خەنجەر دێ [خەنجەری دەبان]. دەببان debban یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە کەرەسەی شەر دەکەن ↑دەمانچە demançe [دەبانچە debançe] ، ↑تفەنگ tıfeng، ↑تۆپ top و هتد. بڕوانە ↑تەپ[4] *tep* "پەلامار".

**دەببە deb(b)e** [ *dabba* ] - "دەفری زل": شێوەیەکی دیکە لە ↑دەبوو debu .

**دەبدەبە debdebe** [ *dabdaba* ] - "شکۆ و جەلال": دەگەڵ سەنتەنە sentene دێ [سەنتەنە و دەبدەبە sentene u debdebe]. مانای ئەسڵی هەر دوو وشەکە "لێدان"ە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑تۆپ top. لەژێر وشەی سەنتەنە sentene شی کراوەتەوە کە چۆن مانای "شکۆ و جەلال" پەیدا بووە. وەک دەبینرێ، وشەکان بە ئەسڵ وشەی کوردمادین.

**دەبستان debıstan** [ *dabıstān* ] - "خوێندنگە": خزمە دەگەڵ ↑داب dab "رەسم، یاسا و رێسا" [کۆنتر: خەت، نووسین].

**دەبوو debu** [ *dabū* ] - "دەفری رزق، خیگە یان تەنەکەی رۆن و پەنیر": دبە debe و دەببە debbe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک ↑تاوە tawe، ↑تیڤسی tîvsî. گشت ئەم وشانە بەمانای "دەفر"ن و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قووڵ".

**دەبە debe** [ *daba* ] - "1-تەشقەڵە، گەڕ 2- دیوارێک کە سکی داوە 3- ئاژەڵی سکپڕ": بە مانای یەکەم دەببە debbe ش دەگوترێ. چەمکی هاوبەش دە هەموو ئەو مانایانەدا "خواری" واتا "ناراستی"یە. تەشقەڵە کردن یان دەبە کردن هەمان "خواری کردن" واتا ناراستی کردنە دەگەڵ کەسێک. هەروەها دیوارێک کە سکی داوە یان ئاژەڵی سکپڕ جۆرێک لە خواری و چەماوی بە خۆیەوە دەبینێ، واتا رووبەرێکی ناراست پەیدا دەکا. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە مانای "خوار بوون، سووڕان، با دران" دەدەن، وەک ↑تەون *tewın* و ↑تاوێر tawer "بەردی خللۆرەوە بوو"، ↑تەواندن tewandın "قەد کردن، لوول دان" و هتد.
[تێبینی: هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "گزی" بە مانای "فێڵ، کەڵەک" کە خزمە دەگەڵ "خێچ" (خوار و خێچ)].

**دەبەنگ debeng** [ *dabang* ] - "گێل، گەمژە": هەروەک چۆن وشەکانی "گێل"، "حۆل"، گەمژە" و "گێژ" دە ریشەدا بە مانای "سووڕاو، بادراو"ن، دەبێ "دەبەنگ"یش لە ریشەیەکی ئەوتۆوە هاتبێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دەبە debe "تەشقەڵە، گەڕ".

**دەبیر debîr** [ *dabīr* ] - "میرزا، مامۆستا": خزمە دەگەڵ ↑داب dab "رەسم، یاسا و رێسا" [کۆنتر: خەت، نووسین].

دەپ **dep** *[ dap ]* - "1-تەختە 2- تەختەزەوی بچووک": خزمە دەگەڵ tabula (L.) "تەختە، تەبەق". وشەکانی tablette (Fr.)، table (E.)، Tafel (G.) "تەختە، مێز، سینی" پێوەندییان بەم وشە لاتینییەوە هەیە. بنەوشەی -teb دە زمانی کوردمادیشدا چەندان وشەی لێ دروست کراوە وەک دەپ/ دەب، ↑تەبەک/ تەبەق tebek / tebeq، ↑تەپڵەک teplek "1- تەختەی سەرکۆڵەکە 2- ژێرسیغار 3- کورسیلەی شت لەسەردانان"، ↑تەپان tepan "1- ژێردەرانە 2- چەپەری پشتیوانەی دەرگا"، ↑تاوڵە tawle "تەختەی کایەکردن" و هتد. وەک دەبینین لە هەموو ئەم وشانەدا مانای "تەخت، تەختە" هاوبەشە. من ئاگادار نیم کە ئایا وشە لاتینییەکە لەباری ئێتیمۆلۆژیکەوە شی کراوەتەوە یان نا. لەم باوەڕە دام ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑داب dab [داپ dap یش دەگوترێ] "رەسم، یاسا و رێسا" [کۆنتر: خەت، نووسین]، سەر بە ریشەی < *(IE.) *(s)teu-* "لێکدان، وێککەوتن". لەم ریشەوە چەندین وشە دە زمانە جیاوازەکاندا بە مانای "لێدان" و "تاشین" پەیدا بوون، بۆ وێنە ↑تەپاندن tepandın "لێدان"، ↑*تاشین tāşîn* "بە لێدان ساف و تەخت کردن"، ↑تەخت text و ↑تەختە texte. دەپ یان تەختە ئەو شتەیە کە لەرێگەی تەپاندن و تاشینی دار و بەرد دروست دەکرێ. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەکانی "دەپ" و "تەختە" دواجار خزمن و لە یەک ریشەوە هاتوون، هەر وەک چۆن وشەکانی "تەپاندن" و "تاشین"یش.

[تێبینی: شیاوی ئاماژەیە کە چەمکی "نووسین" پێوەندی بە چەمکی "لێدان، تاشین، کڕاندن"ەوە هەیە، چونکوو کرداری نووسین شتێکە کە سەرەتا لەم رێگایانەوە ئەنجام دراوە و تەنانەت ئەمڕۆش "تایپ کردن" مانای "لێدان" دەبەخشێ و خزمە دەگەڵ "تەپاندن". دە زمانی ئینگلیزیدا وشەی writhe (E.) "نووسین" خزمە دەگەڵ ritzen (G.) "کڕاندن، دڕاندن"، ↑ریت rît "1-تیتۆڵ 2- بیچم و وێنە"، ↑رایشان rayşan "لەبەر نووسینەوە"، ↑راچیتە raçîte "نوسخەی پزیشک"، سەر بە ریشەی **uer- (IE.)* "کڕاندن، دڕاندن، قەڵشاندن". هەروەها وشەی "خەت" دەبێتە خزم دەگەڵ "کەت"، "قەتاندن"، "کوت" و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "بڕدراوی" سەر دار و بەرد دەکا].

دەجا **daca** *[ dacā ]* - "جا کەوایە": [دەجا وەرە]. دەسا desa ش دەگوترێ. دە + جا de + ca. "دە" وشەی جەخت کردن یان ئاگادار کرنەوەیە. [دە لێی گەڕێ]. "جا" کورتکراوی ↑جار car [جا وەرە، جا هەستە].

[تێبینی: لەم بارەوە وێچووتێکی تەواو لەنێوان زمانی کوردمادی و زمانی ئەڵمانیدا هەیە. بۆ ئەم دۆخە دە زمانی ئاخافتنی ئەڵمانیدا وشەی Mal (G.) بەکار دەهێنرێ. وشەکە دە زمانی ئەدەبیدا بە مانای "جار"ە. دە زمانی ئاخافتندا بۆ وێنە "جا وەرە" دەبێتە komm mal، "جا بزانین" mal sehen].

دەخدەخا **dexdexa** *[ daxdaxā ]* - "نووکی مەزرەق": خزمە دەگەڵ ↑*دوگمە dugme* سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەرپەڕین، زەق بوون"، دەبنەڕەتدا شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑زەق zeq.

دەخس **dexs** *[ daxs ]* - "1- رژد، چرووک، چاونەزێر 2- بەئێرەیی، حەسوود 3- رکوونی": دەخەس dexes یش دەگوترێ. هەروەها کرداری دەخسین dexsîn هەیە بە مانای "ئێرەیی پێ بردن، پێ هەڵکاڵان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑توخس tuxs و تۆسن tosın و دەچێتەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *dheus-*** "هەڵچوون، دەرپەڕین"، ئەم ریشەیەش خۆی دە پلەیەکی دوورتردا دەچێتەوە سەر ریشەی < ****dheu- (IE.)*** " دووکەڵ کردن، هەڵم و هاڵاو کردن، هەناسە، رووح"، دەبنەڕەتدا: "جم و جۆڵی نائارام و تێکەڵ پێکەڵ".

دەخش **dexş** *[ daxš ]* - "زللە، شەق": خزمە دەگەڵ ↑تووش1 tûş.

دەخڵ **dexl** *[ daxl ]* - "1- خەلە، دانەوێڵە 2- داهاتی دووکان": [دەخڵ و دان یان دەغڵ و دان]. دەچێتەوە سەر < *دخل daxl (Arb.)*. مەبەست لە دەخڵ و دان هەمان داهات و حاسڵی زەوییە.

دەر1 **der 1** *[ dar ]* - "بەرانبەری ناوەوە": خزمە دەگەڵ außer (G.)، üzer (OG.)، ūtor (OE.)، ūtar (OIs.) "بەدەر لە" و ūzaro (OG.)، outer (E.)، yttre (Sw.) "دەرەکی"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *ūd-*** "بەرەو دەرەوە". خزمیشە دەگەڵ پرێپۆزیسیۆنی ↑ژ j1 دە شێوەزاری کوردمادی سەروو و جە ce دە هەورامیدا.

**دەر2 der** ⌈*dar*⌉ - دەگەڵ "دەشت" دێ [دەشت و دەر deşt û der].

1- "دەر" لێرەدا مانای ئارا، گۆڕ [واتا دەشت] دەبەخشێ و لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑تەرک terk "رووبەر، رووبەری زەوی"، سەر بە ریشەی *tel- *(IE.)* "رووبەر(ی زەوی)". وشەی ↑توێڵ twel یان ↑تۆڵ tol "تەختی تیوچاوان" پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑دەر1 der "بەرانبەری ناوەوە" هەبێ.

**دەر3 der** ⌈*dar*⌉ - ئەم وشەیە ئاماژە بە "شوێن و جێگە"یەکی دیاریکراو دەکا [لە وێ دەرێ یان لەوێندەرێ، لە کوو دەرێ یان لە کوێندەرێ]. وێ دچێ پێوەندی هەبێ بە there (.E)، thār (.OS)، dār (.OG)، da (.G). ئەم وشانە ئاماژە بە "شوێنی دوورتر لە ئێرە" دەکەن. "دەر" یان "دەرێ" دەبنەڕەتدا بەرانبەر "ئێرە" بووە، هەر وەک چۆن دە ئینگلیزیدا دەگوترێ here و there. بە وتەیەکی دیکە سەردەمێک دە زمانی کوردمادیشدا دەبێ گوترابێ "ئێرە و دەر(ێ)" بە مانای "ئێرە و ئەوێ". وشەی "ئێرە" هەر وەک سەردەمی کۆن دە زمانی کوردمادیدا ماوەتەوە و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. بەڵام "دەر(ێ)" گۆڕانی بەسەردا هاتووە و جێگای خۆی داوە بە "ئەوێ" [ئێرە و ئەوێ]. لەگەڵ ئەوشدا شوێنەواری وشەکە هەر ماوەتەوە، کاتێک دەگوترێ "لەوێ دەرێ، لەوێندەرێ". لێرەدا هەم وشە تازەکە و هەمیش کۆنەکە وێکڕا بەکار دێن. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ the (.E) و تا ta [↑ئەوەتا eweta] و دەچنەوە سەر ڕەگەجێناوی *(IE.) *to-, *tod- >*. شیاوی سەرەنجە کە هەر ئەو ئاڵوگۆڕەی بە سەر "دەر(ێ)" دا هاتووە، بە سەر "ئەوەتا"شدا هاتووە. دە سەردەمێکی کۆندا "تا" هەروەک that (.E) و da (.G) خۆی بە تەنیا بەکار هاتووە و وەک جێناوێکی سەربەخۆ ئاماژەی بە شتەکان کردووە. بەڵام دواتر ئەویش گۆڕانی بەسەرداهاتووە، ئەرک و شوێنی بەرتەسک بۆتەوە و کراوە بە "ئەوەتا". [ئەوەتا دەفتەرەکەت!].

**دەرابە derabe** ⌈*darāba*⌉ - "دەرگایەک کە هەڵدەدرێتەوە": خزمە دەگەڵ ↑دەرکە/ دەرگا derke/ derga.

**دەراندن derandın** ⌈*darāndın*⌉ - "پەرژ و بڵاو کردن، تەخشان و پەخشان کردن":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑دەر1 der "بەرانبەری ناوەوە". لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "خرج" و "خارج" دە زمانی عەرەبیدا،

2- لە وانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑تەرە[1] tere "دوور کەوتە، دوورخراو" و ↑تەرت کردن tert "دوورخستنەوە".

**دەراو deraw** ⌈*darāw*⌉ - "بوار، جیگەی پەڕینەوە لە چەم": پێوەندی هەیە دەگەڵ drome (.Gr) "ڕەوت، ڕویین". شیاوی باسە کە وشەی "بوار"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای تێپەڕین و ڕەت بوون بە شوێنێکدا.

**دەرباز derbaz** ⌈*darbāz*⌉ - "تێپەڕ": دەرباز بوون واتا تێپەڕ بوون. دەر + باز der + baz. کەرتی یەکەم پێشگری "دەر"ە کە ئاماژە دەکاتە دەرەوە. کەرتی باز baz- خزمە دەگەڵ ↑بزووتن bızutın و ↑بازدان bazdanو ↑پەڕەوازە perewaze و هێندێک وشەی دیکە کە ئاماژە دەکەن بە "جموجۆڵ، ڕۆیشتن و دوور کەوتنەوە". بەم پێیە دەرباز بوون دە بنەڕەتدا واتا "تێپەڕین یان دەرچوون".

**دەربیجە derbîce** ⌈*darbīja*⌉ - "ڕۆچنە لە دەرگا و پەنجەرەدا": دەر + بیجە der + bîce. کەرتی یەکەم پێوەندی بە ↑دەرگا derga وە هەیە. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ باجە bāje (.P) "ڕۆچنە، کولانە". ئەم وشەیەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑بز3 bız "کراوە، ئاوەڵا" [باز baz (.P) "ئاواڵە"]. لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی "دەربیجە" یان "باجە"ی فارسی دەبێتە شوێنێک یان کوتیکی "کراوە".

**دەرخ derx** ⌈*darx*⌉ - "نەمام، شتڵ": خزمە دەگەڵ ترکە tarake (.P) "شووڵ" و دواجار ↑دار dar.

**دەرخۆنە derxone** [ *darxona* ] - "سەرپۆشی دەفر، سەرپۆشی تەنوور": ئەم وشەیە بە چەند شێوەی دیکەش دەبینرێ، وەک دەرخوون derxue، دەرخوونە derxune، دەرخووینک derxuwînk، خوانکە xuwanke. بەڵام شێوەیەکی کۆنی ئەم وشەیە دە شێوەزارەکانی زمانی کوردمادیدا ماوەتەوە کە بریتییە لە ↑دەرگڤانک dergıvank، پێک هاتوو لە سێ کەرتی دەر + گڤان + ک der + gıvan + ık. کەرتی یەکەم، واتا پێشگری "دەر" ئاماژە دەکا بە "تێدا بوون"، وەک لەم وشانەی خوارەوەدا: دەرماڵە، دەرپێ، دەردەست، دەربارە، دەربەست و هتد. کەرتی دوایی، واتا پاشگری ک ık یان ئەک (e)k(e) دە زمانی کوردمادیدا ناوی "ئامراز"، ناوی "کەلوپەل" یان بە گشتی ناوی "تشت" دروست دەکا، وەک دەستک [دەسک]، جلک، خەرەک، هێچک، بێشکە، خەڵەک، گەرەک، تەبەک، تەرک، گەسک و هتد. [هێندێک جار فۆتیمی k دەبێتە g وەک زەرگ]. بەڵام بنجی وشەکە دە وشەی "دەرخۆنە" یان "دەرگڤانک"دا بریتییە لە گڤان gıvan. ئەمەش شێوەی کۆنتری وشەی ↑کون *kun* ە. کەوابوو مانای وشەکە دەبێتە "ئەوشتەی دە کوتێکدا جێگیر دەکرێ"، واتا ئەو شتەی سەری کونەکەی پێ دەبەسترێ. سەرنج بدە کە هەردوو وشەی "کون" و "خۆن، خوون" زۆر وێک دەچن.

[تێبینی: سەبارەت بە چەشنی گۆڕانی فۆنۆلۆژیک دە وشەی گڤان gıvan دا بۆ خۆن xon یان خوون xun هەڵی سەنگێنە بۆ وێنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: گڤاشتن gıvaştın و گوشین gûşîn، زاڤەر zaver (زابەر zaber) و زۆر zor، چڤی çıvî (چڤیک çıvîk) و چۆ ço (چۆلەکە çoleke)، زڤران zıvran و سووڕان suran، دووڤایی duvayî (دوومایی dumayî) و دوایی duwayî، زبر zıbr و زوور zur و هتد].

**دەرفەت derfet** [ *darfat* ] - "مەجال، هەل": وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "رێگا یان بواری دەرباز بوون" بووبێ. کەوابێ "دەرفەت" واتا بواری تێپەربوون لە دۆخێک یان لە ئاستەنگێک یان بواری تێپەڕاندنی ئیش و کارێک. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی دەر + فەت fet + der. کەرتی یەکەم دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دەرگا derga. کەرتی دووەم دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) weit، (OG.)wit، (E.) wide ، (Nl.) wijd، (Sw.) vid "دوور، بەربڵاو" [دەبنەڕەتدا: ئاوەڵا، لێک کراوە] سەر بە ریشەی < **(IE.) *ui-itós-** "لەبەریەک ترازان، لێک بوونەوە". بەم جۆرە مانای "دەرفەت" دەبێتە دەرگای کراوە و دەرفەت هەبوون واتا کرانەوەی دەرگا بۆ ئەنجامدانی کارێک. ئەم وشانە هەروەها هەڵسەنگێنە دەگەڵ پێشگری ↑وە we / ڤە ve یان پاشگری (ە)وە (e)we [ ڤەکرن، کردنەوە، هاتنەوە] و هەروەها دەگەڵ باز (P.) bāz "کراوە، ئاوەڵا".

**دەرق derq** [ *darq* ] - "جیقنە، ریقنە": پێوەندی هەیە بە ↑دەر1 der "بەرانبەری ناوەوە". مەبەست ئەو شتەی کە لە لەش *دەردەچێ*.

**دەرگا derga** [ *dargā* ] - "شوێنی پێداچوونە ژوور": دەرک derk و دەرکە derke ش دەگوترێن. در der (P.)، door (E.)، Tür (G.)، deur (Nl.)، dörr (Sw.)، thyrā (Gr.)، durys (Lit.)، dvarah (OIn.) سەر بە ریشەی < **(IE.) *dhuer-, *dhwer-** "دەرک، دەرگا". هەروەها دەرگانە dergane [دەرکانە derkane] هەیە بە مانای "ورودیە"ی فارسی، واتا پارەیەک کە کاتی چوونەژوور دەدرێ.

**دەرگووش dergûş** [ *dargūš* ] - "1- لانک، بێشکە 2- جۆلانە": دەکووش dekûş یش دەگوترێ [سوانەوەی فۆتیمی r] ؟

1- لەوانەیە وشەکە وەسا پێک هاتبێ: دەرگ derg / دەرک derk + ئووش ûş. لەم تێڕوانینەوە کەرتی دەرگ /دەرک دەچێتەوە سەر ریشەی < **(IE.) *dhel-** "قووڵکە، قووپاوی، قووڵایی" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دۆڵ dol و ↑دەرە dere. بەم شێوەیە مانای وشەکە دەبێتە "قوڵکە یان قووڵاییەکی چکۆڵە" کە بەبەی تێدا دەخەوێنن. جێی ئاماژەیە کە هەر سی وشەی "لانکە"، "ماتک"ی کوردمادی و "گهوارە"ی فارسی دە بنەڕەتدا ئاماژە بە هەمان چەمک و مانا دەکەن.

2- یان لەوانەیە وشەکە بەم جۆرە پێک هاتبێ: دەر der + گووش gûş. ئەگەر ئەمە راست بێ، وشەکە ئاماژە بە مانای "راژان، راوەشان" دەکا. هەروەک چۆن "بێشکە" پێوەندی بە "وەشان" [راوەشاندن]ەوە هەیە و "جۆلانە" پێوەندی بە "جوولان"ەوە هەیە، هەر بەم چەشنەش "دەرگووش" لەوانەیە پێوەندی بە ↑گۆزان gozan و ↑گێزان gezan "راوەشان، راتلەکان"ەوە هەبێ و مەبەست لە وشەکە ئەو شتەیە کە "دە دۆخی گێزان" دایە.

**دەروازە derwaze** [ *darwāza* ] - "دەرکەی گەورە": دروازە darvāze (P.). دەر + وازە der + waze. کەرتی دەر هەمان ↑دەرگا dergā یە. کەرتی وازە waze- دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑بزووتن bızutın و ↑باز baz [پێشتر: واز] "رێگا" و هیتر کە ئاماژە دەکەن بە ماناکانی "جموجۆڵ، هاتوچۆ". لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ doorway (E.) "دەروازە". وشە ئینگلیزییەکە دروست وەک وشە کوردمادییەکە ساز کراوە و لە دوو کەرت پێک هاتووە. کەرتی door مانای "دەرگا" دەبەخشێ و کەرتی way یش هەمان "وازە"ی کوردمادییە کە لێرەدا مانای رێگا دەبەخشێ. دەروازە ئەو دەرگایەیە کە لەسەر رێگای هاتوچۆ جێگیر دەبێ واتا دەرگای دەرەوەیە بەپێچەوانەی دەرگاکانی ناوەوە.

**دەروێش derwêş** [ *darweš* ] - "1- عەوداڵ، بێماڵ و حاڵ 2- پێرەوی شێخ": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑درۆزە dıroze "گەدایی".

**دەروو1 deru 1** [ *darū* ] - "دۆڵی تەنگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑دەرە dere "دۆڵ" و هەروەها ↑*دۆڵ dol*.

**دەروو2 deru 2** [ *darū* ] - "دەروو" بە ڕوودا کرانەوە واتا رێگا بۆکرانەوە و رزگاربوون. خزمە دەگەڵ دەرکە/ ↑دەرگا derke /derga.

**دەروون derun** [ *darūn* ] - "ناوەوە": دروون darūn (P.). خزمە دەگەڵ ↑دە de [در dar (P.)].

**دەرۆزان derozan** [ *darozān* ] - "ماڵینی ژێر خەرمان": خزمە دەگەڵ ↑تراشین traşîn.

**دەرۆست derost** [ *darost* ] - "دەرقەت هاتن، (پێ)وێران" [دەرۆست هاتن: دەرۆستمان نایەن، واتا پێمان ناوێرن یان دەرۆست ئەو کارە نایەن، واتا ناتوانن ئەو کارە بکەن]. خزمە دەگەڵ ↑هەندرین hendırîn "ئارام بوون، ئۆقرە گرتن".

**دەرە dere** [ *dara* ] - "دۆڵ": دەگەڵ "دۆڵ" دێ [دۆڵ و دەرە dol u dere]. درە darre (P.). خزمە دەگەڵ ↑دۆڵ dol.

**دەرەبەگ derebeg** [ *darabag* ] - "خان، ئاغای دێ و دێهات": دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا وەک "مەزنی زۆر بە دەسەڵات" مانا کراوەتەوە. دەرە + بەگ der(e) +beg، واتا بەگی "دەر". پێم وایە وشەی دەرەبەگ وشەیەکی نەرێنییە، واتا ئەم ناوە لە لایەن خەڵکەوە دراوە بە بەگەکان و ئەوان بە خۆیان نابێژن "دەرەبەگ". ئەگەر مانای راستی وشەکە "مەزن" یان "بەدەستەڵات" بووایە، ئەوسا بەگەکان بە خۆشحالییەوە ئەو ناوەیان بۆ خۆیان بەکار دەهێنا. کەوابوو کەرتەوشەی دەر der دەبێ مانایەکی نەرینی هەبێ. دیارە تایبەتمەندی سەرەکی بەگەکانیش درەندەیی، بێبەزەیی بوون، زەبر و زەنگ و ستمکاری بووە، ئەڵبەتە دەرهەق بە خەڵکی هەژار و بێچارە، دەنا لەئاست دەوڵەتەکاندا زۆرینەی هەرەزۆریان هەردەم لارەمل و کاسەلێس و گوێ لەمست بوون. جا ئەگەر لەم تێڕوانینەوە وشەکە ساخ بکەینەوە، بەو ئەنجامە دەگەین کە کەرتەوشەی دەر der دەشێ پێوەندی هەبێ بە یەک لەم دوو ریشانەی خوارەوە:

1- ریشەی < *(IE.) *der-* "درین، دراندن". بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە "بەگی در، درەبەگ" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دراندن dırandīn.

2- ریشەی < *(IE.) *(s)ter-* "سەخت، توند، رەق، چیر". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، ئەوا مانای وشەکە دەبێتە "بەگی دڵرەق و ستمکار" و وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑تۆڵ tol [توند و تۆڵ]، تەڕ[2] ter

[تەرت لێدا] و ↑چیر çîr "توند، سفت". [وشەی "ستم" خۆشی دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "سەخت، رەق"].

**دەرەقەت dereqet** [ *daraqat* ] - "(پێ)وێران، زات کردن، توانین، کارین" [دەرەقەت هاتن: دەرەقەتمان نایەن، واتا پێمان ناوێرن یان دەرەقەت ئەو کارە نایەن، واتا ناتوانن ئەو کارە بکەن]. خزمە دەگەڵ ↑هەندرین hendırîn "ئارام بوون، ئۆقرە گرتن".

**دەرەك derek** [ *darak* ] - "دۆزەخ، دۆژە": درك darak (P.). پێوەندی هەیە بە ↑دەرە dere "دۆڵ". دە زمانی فارسیدا باس لە "درك اسفل السافلین" دەکرێ، واتا دۆزەخی هەرە قووڵ. ئەمە نیشان دەدا کە دۆزخ لە بیر و باوەری مرۆڤی کەوناراداا جێگەیەکی قووڵە و ئەمەش دەگەڵ مانای"دۆڵ و دەرە" یەك دەگرێتەوە. هەروەها ئەگەر سەرنجی "پردی سیرات" بدەین کە دەڵێن لە موو باریکتر و لە ئەڵماس تیژترە و خواش بۆ خۆی دەزانێ کە چەندە بڵیندە، ئەوا دەبینین کە کەسانی بێباوەڕ ناتوانن بەسەریدا بڕۆن و لەوسەرەوە دەکەونە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخەکە. لێرەشدا دەبینین کە دۆزەخ دەبێ دۆڵ و دەرەیەکی قووڵ بێ کە مرۆڤەکان لەسەر پردەکەوە تیی دەکەون. جگە لەمانە گوندێك لە کوردستان هەیە بە ناوی "دۆزەقدەرە" و ئەمەش دیسان پێوەندی دوو چەمکی "دۆزەخ" و "دەرە" بەیەکەوە نیشان دەدا. بڕوانە "دۆزەخ".

**دەریا derya** [ *daryā* ] - "بەحر": دریا daryā (P.)، zarēh (Pl.) "دریا". وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زێ ze "چەمی گەورە" و ئەمەش جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ See (G.)، sē(o) (OG.)، sea (E.)، sjö (Sw.)، saiws (Gt.) "دەریاچە، دەریا". ریشەی هیندوئەورووپی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. ریشەی ژێرمەنی وەك *-saiwi-, saiwa* (*Grm.*) دیاری کراوە.

**دەزبلین dezbılîn** [ *dazbılīn* ] - "دەسرازە": پێك هاتووە لە دەست dest + بلین bılîn. کەرتی "بلین" خزمە دەگەڵ ↑وڵین wılîn "تێکوشین، هەڵشێلان، هەڵگڵۆفین"، وێڵ wel "سەرگەردان"، سەر بە ریشەی < *-uel- , *wel** (*IE.*) "سووڕان، خولان، بادران". دەزبڵین ئەو پەتەیە کە لە لانکە دەهاڵێندرێ و دەس و لاقی زارۆکی بەستەزمانی پێ لە شەتەك دەدرێ.

**دەزگا dezga** [ *dazgā* ] - "جیهاز، ئامێر": دەستگاه dastgāh (P.). مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێتە "شوێنی دەست پێگرتن". دە بنەڕەتدا مەبەست لە "دەزگا" ئەو دەستك و میلە و پارچانەی ئامێرەکە بوون کە دەستیان پێوە گیراوە، یان بە دەست کونترۆڵ کراون.

**دەزوو dezu** [ *dazū* ] - "داو، هەودا": دەزگ dezıg یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- teag (OE.) "دەزوو". ریشە؟

2- ↑تیك tîk و ↑تەقەڵ teqel [تیك و درووومان].

3- ↑تەژ tej "ژێرجلی بارەبەر" و ↑تەژگ tejg "کەتان"، ↑دۆق[1] doq و ↑دۆخین doxîn "بەندی تایبەت بۆ پانتۆڵ"، سەر بە سەر ریشەی < *-tek** (*IE.*) "چنین، هۆنینەوە، رستن". دەزوو یان دەزگ تاڵێکە لە لۆکەی رێسراو.

**دەژ dej 1** [ *daj* ] - "دەکار نەکراو، دەست لێنەدراو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑تازە taze.

**دەژ dej 2** [ *daj* ] - "داغ": هەروەها دەژاندن dejandın هەیە بە مانای "داغ کردنی ددانی بە ئێش". خزمە دەگەڵ ↑*داغ dağ*، ↑چزاندن çızandın "سوور کردنەوە" و ↑تووزاندن tûzandın "داغ کردن، ئوتوو کردن" و چەندین وشەی دیکە.

**دەسا desa** [ *dasā* ] - "جا کەوایە" [دەسا بڕۆ]. شێوەیەکی دیکە لە ↑دەجا daca.

**دەست dest** [ *dast* ] - "پەل، پیل": دست dast (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە:

1- dáktylos (Gr.) "قامك"، digitus (L.) "قامك" پێوەندی بە وشە لاتینییەکەوە هەبێ.

2- tactilis "بە دەست پێدا خشاندن"، سەر بە کرداری tangere (L.) "(دەست) لێخشاندن، لەمس کردن".
[تێبینی: جێی ئاماژەیە کە پێوەندی دوو چەمکی "لەمس" و "دەست" لە وشەی "پەل" یان "پیل"یشدا دەر دەکەوێ. ئەم وشەیە مانای دەست دەدا و دە زمانی ئینگلیزیدا feel دەبێتە "هەست کردن"، یەڵام لە کۆندا بە مانای "لەمس کردن، دەست لێخشاندن" بووە].

**دەستوور destur** [ *dastūr* ] - "فەرمان، قانوون": دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑دەستەر dester یان دەستەرە destere هەیە بە مانای "شەقڵ" [مۆری دارینی خەرمان]. ئەم دوو وشەیە خزمن بەیەکەوە. مەبەست لە دەستوور سەرەتا "نووسراوی دەربار و دیوان" بووە کە وەک "فەرمان و قانوون" ناسراوە. ئەم دیاردەیە دە وشەی "یاسا"شدا دەبینین کە مانای قانوون دەبەخشێ و دەچێتەوە سەر کردارێکی زمانی تورکی بە مانای "نووسین". هەروەها دە وشەی "داب"یشدا [داب و دەستوور] هەمان پێوەندی لە ئارادایە. وشەی "داب" خزمە دەگەڵ "دەفتەر، دەبیر، دیباچە، دەبستان، (ئە)دەب" و گشت ئەم وشانە پێوەندییان بە چەمکی "نووسین"ەوە هەیە. کەوابوو بنەوشەی دەست -dest دە وشەکانی "دەستەرە" و "دەستوور" دە بنەڕەتدا بە مانای "شەقڵ، وێنە، حەرف، خەت" بووە. وەک ئاشکرایە نووسینیش خۆی پێکهاتەیەکە لە شەقڵ و وێنەکان [حەرفەکان]. بەم جۆرە مانای بنەوشەکە سەرەتا "شەقڵ، وێنە، مۆر، نیشانە" بووە، دواتر مانای "حەرف، خەت، نووسین" پەرەی گرتووە و لەمەشەوە مانای "فەرمان، قانوون" واتا نووسراوی دیوانی سەری هەڵداوە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە ئەم بنەوشەیە لە چ ریشەیەکەوە پەیدا بووە. وێ دەچێ ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە ↑دژ 2 dıj "شەقڵی خەرمان" و هەروەها Zeichen (G.)، taikan (Got.)، token (E.)، tecken (Sw.)، tjā (OIs.) "نیشان دان"، deiknynai (Gr.) "نیشانە، شەقڵ"، diśáti (OIn.) "نیشانی دا"، سەر بە ریشەی **< *deik- (IE.)** "نیشان دان، بەدیار خستن".

**دەستەر(ە) dester(e)** [ *dastar(a)* ] - "شەقڵ" [مۆری دارینی خەرمان]. خزمە دەگەڵ ↑دەستوور destur "فەرمان، قانوون".

**دەستەمۆ destemo** [ *dastamo* ] - "ئاژەڵی ماڵی، ڕاهێنراو" [دەبنچینەدا واتا بەدەست فێرکراو، فێرەدەست کراو]. دستاموز dastāmūz (P.). کەرتی ئامۆ amo [دە فارسیدا ئاموز āmūz] خزمە دەگەڵ ↑ئامۆژگاری amojgarî "فێرکردن".

**دەشت deşt** [ *dašt* ] - "تەختان، گۆڕ، ئارا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تەشت teşt.

**دەشنە deşne** [ *dašna* ] - "قەمە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تاشین taşîn.

**دەغەز deġez** [ *daġaz* ] - "نەخۆشی، ناسازی": خزمە دەگەڵ ↑دیق dîq "دەردەباریکە".

**دەف def** [ *daf* ] - دەف دان واتا لێدانی دڵ. خزمە دەگەڵ تپیدن tapīdan (P.) "لێدان (ی دڵ)". خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑دەفە defe و ↑تەپڵ tepıl.

**دەفتەر defter** [ *daftar* ] - "1- نووسینگە 2- پەڕاو": دە هەر دوو مانای وشەکەدا چەمکی "نووسین" بەدی دەکرێ. خزمە دەگەڵ ↑داب dab.

**دەفر defır** [ *dafır* ] - "زەرف، قاب و قاچاخ":

1- لە لایەکەوە دەتوانین ئەم وشەیە دەگەڵ ظرف zerf (Arb.) "دەفر" بەرهەڤ بکەین. وشەی زەرف خۆی وشەیەکی سەر بە زمانە ئێرانییەکانە و خزمە دەگەڵ ژرف žarf (P.) "قووڵ". مەبەست لە zerf دە بنەڕەتدا گەیاندنی قووڵ بوونی شتەکە بووە. وشە فارسییەکە خۆی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەگەڕێتەوە بۆ وشەیەکی کۆنتر و ئەم وشەیە دە زمانی ئاڤێستاییدا بە شێوەی jafra (Av.) بووە بە مانای "قووڵ" و دەفر defır ی کوردمادیش دەبێ پێوەندی بەم وشەیەوە هەبێ.

2- لە لایەکی دیکەوە دەفر دەتوانێ دەگەڵ Topf (G.) "مەنجەڵ، قابلەمە" بەرهەڤ بکرێ کە ئەمەیان خزمە دەگەڵ tief (G.) و deep (E.) "قووڵ" و دەچێتەوە سەر ریشەی **< *dheu-b- (IE.)** "قووڵ،

قووپاو". دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا دەفر بووەتە ↑دەوری dewrî و بەمانای "قاپی پەل" بەکار دەهێنرێ.

**دەفرە defre** [ *dafra* ] - "زۆرەوانی": شیوەیەکی دیکەیە لە ↑زۆر² zor "زەخت، پاڵەپەستۆ".

[تێبینی: لەباری گۆڕانی فۆنۆلۆژیک دە وشەکانی "دەفرە" و "زۆر" [کۆنتر: زاڤەر]دا هەڵیسەنگینە دەگەڵ *دەفر* "قاپ" و jafra (Av.) "قووڵ"].

**دەفە defe** [ *dafa* ] - "ئامێرێکی مووزیکی کوردمادی": دف daf (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەپڵ tepıl. بنەوشەی تەپ/ دەف -tep-/ def دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان".

**دەڤلی devlî** [ *davlī* ] - "ئاگاداری، راگەیەنراو": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑چپاندن çıpandın [دە بنەڕەتدا واتا ئاخافتن].

**دەڤەر dever** [ *davar* ] - "ناوچە": وێنەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑دەورdewır. لێرەدا مەبەست "دەورانبەر، دەوروبەر"ە.

[سەرەتا تێبینییەک: دە زمانەکانی دیکەشدا وشەی وەک دەور(انبەر) بە مانای "ناوچە و مەڵبەند" بە کاردێ، بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا Kreis هەم بە مانای "جەغز و دایرە" و هەمیش بە مانای "ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو" بەکار دەهێنرێ کە شارێکی گەورە و چەندین شار و شارۆچکە و گوندەکانی ناوچەکە دەگرێتەوە. هەروەها وشەی Bezirk دیسان هەر دە زمانی ئەڵمانیدا بە مانای "ناوچەیەکی ئیداری دیاریکراو" دێ و دەگەڕێتەوە بۆ circus (L.) "جەغز، دایرە، بازنە، چەرخ، سیرک"]. وەک ئاشکرایە ئەم چەمکانە، واتا جەغز، دایرە، بازنە، چەرخ پێوەندییان بە چەمکی "سووڕان"ەوە هەیە.

وشەی "دەور" دە زمانی عەرەبیدا ئاماژە بە چەمکی سووڕان دەکا، ئەم وشەیە دەشێ لە وشەی کوردمادی ↑زڤرین zıvrîn وەرگیرابێ کە دە شێوەزاری ناوەڕاستدا بووەتە سووڕان suran. بنجی وشەکە دەبێ پێشتر -*zever** بووبێ و ئەمەش دەگەڵ وشەی دەور dewır و دەڤەر dever بەتەواوی یەک دەگرێتەوە.

**دەق1 deq** [ *daq* ] - "تێکست": خزمە دەگەڵ texere (L.) "چنین، هۆنینەوە، تێکخستنەوە، دروست کردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *tek- >** "(لێک) بادان، چنین، هۆنینەوە". وشەی text "دەق" خۆی لەم ریشەوە هاتووە.

**دەق2 deq** [ *daq* ] - "شەق، ساف، بێ گنج": شێوەیەکی دیکە لە ↑شەق² şeq.

**دەق3 deq** [*daq* ] - "بار و دۆخ": [کارەکە هەر لەسەر دەقی جارانە، هیچ نەگۆڕاوە]. شێوەیەکی دیکە لە ↑دۆخ dox "چلۆنایەتی، بار و دۆخ".

**دەق⁴ deq** [ *daq* ] - "قەد، بەسەریەکدا نووشتاندن": تا tā کردن (P.) "قەد کردن". دە فارسیدا هەروەها تکیدە takīde (P.) هەیە واتا "چرچ، چرووساوە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ژاکان jakan "سیس بوون". هەروەها بڕوانە ↑دیق dîq "1- دەردەباریکە 2- نەخۆشی بەهۆی خەمی زۆرەوە".

**دەقاندن deqandın** [ *daqāndın* ] - "خاڵ کوتان": سەر بەو خێزانەوشەیە کە گەلێک وشەی وەک ↑چەقین çeqîn و ↑تیغ tîğ و↑ تیژ tîj و هیتر دەگرێتە خۆ. stizo (Gr.) "خاڵ کوتان" هاوریشەیە دەگەڵ ئەم وشە کوردمادییانە.

**دەقڵ deql** [ *daql* ] - "زەوی سەخت و تەمتەمان": بڕوانە ↑تەقتەق teqteq.

**دەقلووس deqlus** [ *daqlūs* ] - "سەرمەقولات": بڕوانە ↑تەقڵە teqle [کۆتری تەقڵەباز].

**دەک dek** [ *dak* ] - دەگەڵ دێم dem دەگوترێ: دەکودێم dekudem "روخسار، دەموچاو". کەرتی دێم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑دەم dam "1- زار 2- لووت، کەپۆ". کەرتی دەک dek دە زمانی فارسیشدا، دە جووتەوشەی دەک و پووز dak ū pūz (P.)دا بەکار دەهێنرێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑دەکە deke

"سەکۆ" و ↑دەگ deg "داری بلیندی ناو کەشتی" و ژمارەیەک وشەی دیکە بە مانای "زەق، دەرپەڕیو". لووتی مرۆڤ یان دەم و لووتی ئاژەڵ [پۆز، لمبۆز] بەهۆی زەق و دەرپەڕیو بوونی ناو نراوە "دەک". لەباری ماناوە دەگەڵ دوو وشەی "لووت" و "لوتکە"ی کیو بەرهەڤی بکە کە هەردووکیان زەق بوون دەردەخەن.

**دەکە deke** [ *daka* ] - "سەکۆ": دکە dıke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑دوگمە dugme.

**دەگ deg** [ *dag* ] - "داری بلیندی ناو کەشتی کە بادەوەی لێ دەبەستن". دگل dagal (P.). خزمە دەگەڵ ↑دوگمە dugme.

**دەگمەن degmen** [ *dagman* ] - "بێوێنە، نایاب": دەگ + مەن deg + men. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تاک tak [تاق] واتا "بێ جووت، بێ هاوتا". کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑مینا mîna [دە فارسیدا مانند mānand (P.)]. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "تاک ئاسا".

**دەگەر deger** [ *dagar* ] - "1-زەبربەدەستی، کارامەیی 2- توان و تابشت": خزمە دەگەڵ ↑دەگەنەک degenek. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑تەخەر texer "زۆرینە، پڕانی".

**دەگەڵ degel** [ *dagal* ] - "وێڕا": ↑لەگەڵ legel یش دەگوترێ. دە + گەڵ de + gel. ↑دە de خۆی بە تەنیاش وەک پرێپۆزیسیۆن دەور دەبینێ و لێرەدا وێڕای گەڵ gel پرێپۆزیسیۆنیکی لێکدراو دروست دەکا. "گەڵ" شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گەل gel بە مانای "کۆ، کۆمەڵ". وشەکە دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "پێکەوە" بەکار هاتبێ.

**دەگەنەک degenek** [ *daganak* ] - "1- زۆر بەهێز 2- زەبەلاح": "دەگەنەکی" واتا "بەزۆر، بەخورتی". ئەم وشەیە هەروەها دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑دەگەرdeger. دەشێ خزم بێ دەگەڵ:

1- ↑تەژە teje "زەلام، زەبەلاح"، ↑*تەژی tejî* "پڕ" و ↑تەشەنا / تەشەنە teşena / teşene "پەرە سەندن، تەنینەوە، زۆر بوون"

2- یان لەوانەشە دەگەڵ ↑تۆخ2 tox "قەڵەو، توند، بەهێز".

**دەڵ del** [ *dal* ] - دەگەڵ "بەڵ" دێ [دەڵ و بەڵ del u bel واتا "نەرم بوون و نیزیک بە رزینی میوە"]. شێوەیەکی دیکەی لە ↑تەڕ ter. بەڵ bel یش شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بڵ bıl.

**دەلاش delaş** [ *dalāş* ] - "بەرخۆڵەی ساوا": دەڵ(ە) -(del(e دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تولە tule. فۆتیمی ş پاشگری گچکاندنە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑دەیلاخ deylax "بەچکەوشتر".

**دەلاڤ delav** [ *dalāv* ] - "گۆمیلکە 2- جیگەی ئاودانی پەز": تالاب tālāb (P.) "حەوز، گۆمیلکە". دەل + ئاڤ del + av. کەرتی یەکەمی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑دۆڵ dol و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "قووڵایی، قووپاوی، هەڵکەنراوی". بەم جۆرەی مانای "دەلاڤ" دە بنەڕەتدا دەبێتە "قووڵکەی ئاو،گۆلاو".

**دەلاقە delaqe** [ *dalāqa* ] - "رۆچنە، کون دە دیواردا":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑*دۆڵ dol*، سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵایی، قووپاوی، هەڵکەنراوی". شیاوی باسە وشەکانی ↑تەڵە tele و ↑تەڵەکە teleke ش پێوەندییان بەم "دۆڵ"ەوە هەیە.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑*لووهین luhîn* "نەقەب، رێی بن هەرد"، Loch (G.)، loh (OG.) "کون، کەلێن، غار"، Lücke (G.) "کەلێن"، usluk (Gt.) "زارک، کون، دەلاقە"، lock (E.) "دەرخۆنە، بەستراوی، داخراوی"، lock (Sw.) "دەرخۆنە". ئەگەر وشە کوردییەکە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، ئەوا دەبێ هەر وەک وشەی usluk (Gt.) "زارک، کون، دەلاقە" لە دوو کەرت پێک هاتبێ، واتا پێشگرێک و کەرتی ئەسڵی وشەکە [دە de + لاقە laqe]. لەباری پێشگرەکەوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "دەلینک" بەرهەڤی بکەین.

**دەلاک delak** [ *daālk* ] - "1- کیسەکیش 2- سەرتاش": خزمە دەگەڵ ↑تراشین traşîn و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێخشاندن، پێداخشاندن". فۆتیمی r گۆڕاوە بە l.

دەلال **delal** *[ dalāl ]* - "جوان، لەبەردڵان": دەبێ پێوەندی بە ↑دڵ dıl ەوە هەبێ و مەبەست شتێک بێ کە بە دڵەوە دەنووسێ.

دەڵاندن **delandın** *[ dalāndın ]* - "تەڕایی دانە دەرەوە، ئاو لێ هاتن": تراویدن teravîden (.P). خزمە دەگەڵ↑ تەرter و↑دڵۆپ(ە) dılop(e). هەروەها drain (.E) و drēahnian (.OE) "دەڵاندن" خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

دەلکی **delkî** *[ dalkī ]* - "جەفەنگ باز، قسەخۆش": [نەقڤاڵ]. دلقک delqak (.P) "قردک". خزمە دەگەڵ ↑دۆلگە dolge "هەڵبەستی پێهەڵگوتن".

دەللە**1** **delle** *[ dalla ]* - دەگەڵ "قەللە" دێ [قەللە و دەللە qelle u delle واتا فێڵ و تەڵەکە]. شێوەیەکی دیکە لە ↑تەڵەکە teleke. "قەللە"ش شێوەیەکی دیکە بێ لە "کەڵەک".

دەللە**2** **delle** *[ dalla ]* - "قاوەجۆش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑دۆڵ dol سەر بە ریشەیەک بە مانای "قووڵکە، قووڵایی، قووپایی". هەڵی سەنگێنە دەگەڵ↑دۆلکە dolke "دەفری ئاو"، ↑دۆڵچە dolçe "سەتڵی چەرمین" کە ئەوانیش سەر بەم ریشەیەن.

دەلوو **delû** *[ dalū ]* - "گێل، ئەقڵ سووک": خزمە دەگەڵ tol (.OG)، dol (.Nl)، dull (.E) "دەلوو"، dwals (.Gt) "ساکار، دەلوو"، dall (.OIr) "کوێر"، tholerós (.Gr) "لێڵ، تێکەڵ، گێژ".

ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*تەفک tefik* "گێلۆکە، دەبەنگ" و دواجار خزمن دەگەڵ ↑تۆز toz. لەم تێڕوانینەوە "دەلوو" ئەو کەسەیە کە مێشکی تێکەڵە یان ئاوەزێکی روون و زەلالی نییە و "تەپ و تۆز" یاخود "تەم و مژ" مێشکی داگرتووە.

دەڵوو **delu** *[ dalū ]* - "توێخی بن نینۆک کە لێ دەبێتەوە": [دەڵوو بەر دان]. خزمە دەگەڵ ↑تەڵ2 tel "پارچەیەکی تەنک لە بەرد" [تەڵەبەرد]، ↑تەڵەزم telezm و لەوانەشە دەگەڵ ↑تلێشان tılîşan "دڕان"دا باس کراون.

دەلۆش **deloş** *[ daloš ]* - "بێئەمەگ، بێوەفا": وشەی "ئەمەگ" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەهێز بوون، قورس و قایم بوون". مەبەست لە "ئەمەگ" دە بنەڕەتدا پێوەندییەکی پتەو و بەهێزە یاخود پتەو بوون لە پێوەندیدا. بە پێچەوانەوە "دەلۆش" واتا مرۆڤی بێوەفا دەبێ پێوەندییەکەی بە (کەسێک یان شتێکەوە) سست و لەرزۆک بێ. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑دەڵەک delek "تەکان". کەرتی oş- دە وشەکەدا پاشگرە و شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ئۆز oz-.

دەڵەک **delek** *[ dalak ]* - "پاڵ، تەکان": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑دەڵەکانێ delekane "جۆلانەی گوریس" و ↑*تلەکاندن tılekandın* [راتلەکاندن ratılekandın] واتا راوەشاندن. هەروەها دەڵەدەڵ deledel هەیە بە مانای "بەم لا و ئەو لادا کەوتن" [دەبێ ماناکە تەکان خواردن بەم لا و ئەو لادا بێ].

دەڵەکانێ **delekane** *[ dalakane ]* - "جۆلانەی گوریس": خزمە دەگەڵ ↑*تلەکاندن tılekandın* [راتلەکاندن ratılekandın] "راوەشاندن".

دەڵەمە **deleme** *[ dalama ]* - "مەیینی تراو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشەی وەک ↑تۆل tol "پیزە، پز، نوتفە"، ↑تۆڵا tola "پێکەوە نووساو و توندبووک" [تۆڵاگەزۆ]، ↑*تۆڵ tol* [توند و تۆڵ].

دەلینگ **delîng** *[ dalīng ]* - "ئەو بەشەی پانتۆڵ کە دە لاق دەکرێ". دە + لینگ de + lîng. دەرەلنگ derelıng یش دەگوترێ. مەبەست ئەوە بووە کە شتەکە دە لینگ دەکرێ واتا دەکرێتە لینگەوە [دەکرێتە لاقەوە]. بڕوانە ↑لینگ lîng.

[تێبینی: وشەی دەرپێ derpe ش هەر لەسەر ئەم رێبازە دروست بووە، واتا ئەو شتەی دە پێ دەکرێ، دەکرێتە "پێ"وە].

**دەم dem 1** - "زار": دە فارسیدا دماغ damāġ (P.) هەیە بە مانای "لووت". دەبێ پێوەندی هەبێ بە ↑دەم2 dem "هەناسە، فوو".

[تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "هەناسە" و "لووت" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی کوردمادی و ئەڵمانی "هەناسە" وNase (G.) "لووت" کە پێکەوە خزمن یان دەگەڵ دوو وشەی "بین(ە)" دە کوردمادیدا بە مانای هەناسە و بینی bīnī (P.) بە مانای "لووت"].

**دەم dem 2** [ *dam* ] - "هەناسە، فوو": دم dem (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەم tem و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵم، هاڵاو".

**دەم dem 3** [ *dam* ] - "کات و سات": دم dem (P.) "کاتێکی کەم". خزمە دەگەڵ ↑تەمەن temen و ↑تاو taw[تاوێکی دیکە] و ↑تاڤ tav [تاڤی لاوێتی] و هتد.

**دەمار demar** [ *damār* ] - "1-رەگی ئەستوور 2- عەسەب 3- دارۆکەی ناو گەڵاتووتن و هتد". دامار damar و تەمار temar یش دەگوترێن. دە زمانی فارسیدا دمار damār (P.) چەند مانایەکی بۆ کراوەتەوە کە هیچیان پێوەندییان بە مانا کوردمادییەکەوە نییە. ئەو مانایانە بریتین لە "تیداچوون، وێران، لەناو بردن، دوژمنایەتی، تۆڵە". وێ دەچێ ئەو مانایانە هیچیان مانای ئەسڵی وشەکە نەبن، بەڵکوو دواتر لەگەڵ بەکار هێنانی وشەکە بە شێوەی جۆراوجۆر و لەپێوەندی جۆراوجۆردا دروست بووبن. ئەگەر لە مانا کوردمادییەکەوە بۆی بچین، ئەوا دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ Daumen (G.)، duim (Nl.)، thumb (E.)، tumme (Sw.) "قامکەگەورە، قامکە قەڵەوە"، túmara-h (OIn.) "قەڵەو، قەوی"، tumere (L.) "هەڵمساو و باکراو بوون"، tumor (L.) "تومۆر، هەڵمساوی، *دومەڵ*"، tuméti (Lit.) "قەڵەو بوون"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *tēu-, *tū-*** "ماسین، قەڵەو بوون، ئەستوور بوون". لەم تێڕوانینەوە "دەمار" بۆیە وەسا ناو نراوە، چونکوو لەبن پێست یاخود لەناو ماسوولکەدا وەک شتێکی هەڵمساو و قەڵەو خۆ دەنوێنێ. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑توو tu یان تڤی tıvî و تمشک tamešk (P.) "توودڕک".

**دەمارەکۆڵ demarekol** [ *damārakol* ] - "دووپشک": پێک هاتووە لە دوو وشەی ↑دەمار demar + ↑کۆڵ kol. لەم وشەیەدا کلکی دووپشک وەک "دەمار" چاو لێ کراوە کە لەسەر کۆڵی زیندەوەرەکە رادەوەستێ. لەم بارەوە بڕوانە ↑دووپشک dûpışık.

**دەماخ demax** [ *damāx* ] - "1- لووت 2- مێشک 3- باری دەروونی، رووحییە": دەماغ demaġ یش دەگوترێ. دماغ damġ (P.) دە فارسیشدا هەر ئەو مانایانە دەبەخشێ و هەروەها دماغی damġî (P.) وەک "مێشکی، رووحی" مانا کراوەتەوە. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ↑دەم2 dem "هەناسە، فوو". ئا لەم مانایەوە دواتر وشەکانی ↑دەم1 dem "زار" [دەم و لووت] و دەماخ demax (P.) "لووت" پەیدا بوون، چونکوو ئەم ئەندامانە شوێنی "هەناسە کێشان، فوو کردن"ن. [تێبینی: لەباری پێوەندی دوو چەمکی "هەناسە" و "لووت" هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی کوردمادی و ئەڵمانی "هەناسە" و Nase (G.) "لووت" کە پێکەوە خزمن یان دەگەڵ دوو وشەی "بین(ە)" دە کوردمادیدا بە مانای هەناسە و بینی bīnī (P.) "لووت"].

ئێستا بزانین مانای سێیەم، واتا "باری دەروونی، رووحییە"، چۆن پەیدا بووە. چەمکی رووح هەر لە کۆنەوە پێوەندی دەگەڵ "دەم، فوو، هەناسە" پەیدا کردووە، بۆ وێنە وا بیر کراوەتەوە کە هێزێک بە فوویەک رووحی بە بەر گیاندارەکاندا کردووە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی "تاپۆ" بە مانای "شەوە، رووح، تارمایی" بەکار دێ و خزمە دەگەڵ "تەپ" [تەپ و تۆز] کە خۆی ماناکەی نیزیکە لە "دەم" [یان تەم و مژ] و لەوانەیە ریشەکەشیان یەک بێ. ئەگەر چاوێک بە وشەی "تۆز"دا بخشێنین، لەوێدا دەبینین کە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکی تەواو هەیە لە نێوان چەمکەکانی "هەناسە"، "تۆز" و "رووح"دا. ئەم پێوەندییە بۆ مانایەک دەگەڕێنەوە کە ئاماژە دەکا بە حاڵەتی پڕ لە جم و جۆڵی نائارام و تێکەڵ بوون و خوولانەوەی

با، هەڵم، دووکەڵ و تەپ و تۆز. هەر لە درێژەی ئەم باسەدا شیاوی بیر هێنانەوەیە کە ناوی "مهاتما" [گاندی] مانای "رووحی مەزن" دەبەخشێ و کەرتی یەکەمی ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "مەزن" و کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ "دەم" [تەم] و هەروەها "دەماخ". بەم جۆرە دەردەکەوێ کە لە مانای "فوو، هەناسە"ەوە مانای "رووح" پەرەی گرتووە و دواتریش مانای "رووحییە، باری رووحی و دەروونی". هەروەها مانای "مێشک"یش دواتر لەم مانایانەی دوایی سەری هەڵداوە.

**دەمامک demamk** ⌊ *damāmk* ⌋ - "لووت پێچ، ماسک": دەم + ئامک + dem + amk. کەرتی ئامک [دەبنەڕەتدا: amek] خزمە دەگەڵ ↑جامە came سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑بڵامک bılamık و ↑بزمک bızmık "پۆزەبەند".

**دەمانچە demançe** ⌊ *damāčna* ⌋ - "ئامرازی تەقە لێکردن و کوشتن": تەوانچە tewançe و دەبانچە debançe ش دەگوترێن. تپانچە tapānča (P.). خزمە دەگەڵ ↑تەپڵ tepıl و ↑تەور tewır و ↑دەفە defe و هێندێک وشەی دیکە کە لە ریشەیەکی هاوبەشەوە دێن بە مانای "لێدان".

**دەماوەند demawend** ⌊ *damāwand* ⌋ - "1- ناوی بەرزترین شاخی ئێران 2- ناوی گوندێکیش لە کوردستانی باشوور": کەرتی یەکەمی وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەم tem [تەم و مژ] و کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑بەند bend. مانای وشەکە دەبێتە شوێنێک کە بە تەم دەوری گیراوە یان تەم و مژ دەوری داوە.

**دەمبل dembıl** ⌊ *dambıl* ⌋ - "ئامرازێکە بۆ هەڵهێنان و وەرزش پێکردن": دمبل dambel (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "کوتان" دەکەن، وەک ↑زۆمپ zomp "کوتکی زلی ئاسن"، ↑چۆماخ *çomax* "تیلا، گۆپاڵ" و چەندین وشەی دیکە. "دەمبل" دە پێشوودا قوڵەدارێکی گۆپاڵ ئاسا بووە کە بۆ کاری "کوتان" کەڵکیان لێ وەرگرتووە. دە وشەی ئەڵمانی stampf (OG.) "دەسکاونگ، کوتک" و Stempel (G.) "مۆر" [دارۆکەی مۆر لێدان لە شێوەی گۆپاڵێکی چکۆڵە] دا ئەم مانا کۆنە بە روونی دەردەکەوێ. پاشان هەر لەسەر ئەم بنەمایە گۆپاڵێکی تایبەتی بۆ وەرزش کردن دروست کراوە کە تا ئەمڕۆش لە زۆرخانەکاندا بەکار دەهێنرێ و ئەم گۆپاڵەش ناوە کۆنەکەی لەسەر دانراوە. دواتر ئەم ناوە هەروەها بۆ ئەو ئامرازەش بەکار هێنراوە کە دوو سەری خڕی ئەستوور و دەسکێکی باریکتری دە ناوەراستدا هەیە.

**دەمبێن demben** ⌊ *damben* ⌋ - "1- زاربەندی ماڵات 2- ئەوشتەی زارکی مەشکە و هەنبانەی پێ دەبەستن": دەم + بێن dem + ben. کەرتی دەم بە مانای زارە و کەرتی بێن ben- خزمە دەگەڵ ↑بەن ben و ↑بەند bend و مانای بەستن دەگەیەنێ.

**دەمڵە demle** ⌊ *damla* ⌋ - "شەپلە": دامڵە damle ش دەگوترێ. دەشێ خزمە بێ دەگەڵ ↑شەمزان şemzan "ژاکان، سیس بوون".

**دەمنە demne** ⌊ *damna* ⌋ - "داری جگەرەکێشان": ↑دەم + نە dem + ne. کەرتی "نە" هەمان نای nay یان ↑نەی ney یە واتا "قامیش". بەم جۆرە وشەکە دە بنەڕەتدا واتا "نەیی دەم".

**دەمەلاسکە demelaske** ⌊ *damalāska* ⌋ - "لاسا کردنەوە لەرێگەی ئەدا دەرهێنان بە دەم": ↑دەم[1] dem "زار" + لاسکە laske. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ↑لاسا(یی) (lasa(yî.

**دەندە dende** ⌊ *danda* ⌋ - "جێگەی گاسن": خزمە دەگەڵ ↑دان dan "ددان" و ↑دوند dund "نووک".

**دەنک1 denık** ⌊ *danık* ⌋ - "دانە، بەش": کاتێک دەگوترێ چواردەنک سێو، لێرەدا مەبەست چوار "دەنکە سێو" نییە، بەڵکە چوار عەدەد سێوە. کەواتە ئەم وشەیە جیاوازە لە "دەنک" بە مانای "تۆو، چنچک، دانەی دەغڵ و دان". لێرەدا دەنک یان ↑دانە dane مانای تا ta ی فارسی ["چهارتا" واتا چواردانە] و Stück ی ئەڵمانی "بەش، دانە، تیکە" دەگەیەنێ. وشەکانی دانە و دەنک بەم مانایە و هەروەها تا ta ی فارسی گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی < *dai- (IE.) "(بەش) کردن، دابەش کردن". دە زمانی کوردمادیدا

هێندێک وشەی دیکەش دەچنەوە سەر ئەم ڕیشەیە، وەک ↑دانگ dang [شەش دانگی خانوو]، ↑دانگا danga "دەمێک، تاوێک"، ↑دەم dem "کات" و ↑دان dan "بەخشین".

**دەنک denık 2** [ *danık* ] - "تۆو، ناوکی میوە": دەچێتەوە سەر ↑دان dan "دەغڵ و دان". دە زمانی کوردمادیدا ↑چنچک çınçık یش هەر بە مانای "دەنک" دێ و دەشێ گشتیان بۆ وشەی ↑چاندن çandın بگەڕێنەوە.

**دەوار dewar 1** [ *dawār* ] - "بارەبەری یەکسم": خزمە دەگەڵ ↑چیل çel "مانگا".

**دەوار dewar 2** [ *dawār* ] - "پارچەی ڕەشماڵ، ڕەشماڵ": ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە ڕەنگی "کەوە، خۆڵەمێشی، ئاماڵ ڕەش" دەکا و خزمە دەگەڵ Taube (G.) "کۆتر". دە زمانی کوردمادیشدا ناوی کەو و کۆتر خزمە دەگەڵ ڕەنگی کەوە. "دەوار" خزمە دەگەڵ ↑تەو tew "مەڕی بۆر، مەڕی کەوەڕەنگ"، ↑تەوار tewar "بازی مێ"، ↑تاپۆ tapo "تارمایی"، ↑تەفسە tefse "پەڵەی دەموچاو"، ↑دڤەدڤ dıvedıv "گژەگژی با"، ↑تەواسان tewasan "گێژ و مەنگ بوون"، ↑تەڤزین tevzîn [شێوەی کۆنتری "تەزین"]، ↑دۆبە dobe "هەنگوینی قاڵکراو" [هەنگوینی ئاماڵ ڕەش]، ↑دووکەڵ dukel، ↑توون tun "ئاگردانی گەرماو" [دە بنەڕەتدا: تفن *tıfin*؟]، ↑تفک tıfık "ئاگردان، وەجاق"، ↑تەفایە tefaye "مەنقەڵی"، ↑تەن2 ten 2 "سیان، قورم"، ↑تەنوور tenur "ئاگردانی نان پێژان" و هتد. هەموو ئەم وشانە دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑تۆز toz [تەپ و تۆز] و لەوانەشە ↑تەپ tep و دەچنەوە سەر ڕیشەی < ***(IE.) *dheu-*** "هەڵم و هاڵاوکردن، فوو کردن، دووکەڵ کردن، دە جم و جۆڵی نائارام و تێکەڵ پێکەڵدا بوون، هەناسە، ڕووح". وەک دەبینین لەم مانا سەرەکییەوە چ دە زمانی کوردمادی و چ دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "ڕەش، ئاماڵ ڕەش" سەری هەڵداوە و ئەمەش بۆ ڕەنگی تەپ و تۆز و دووکەڵ دەگەڕێتەوە. دە زمانی ئیرلەندی کۆندا dub (OIr.) بە مانای "ڕەش" بووە.

**دەوال dewal** [ *dawāl* ] - "دزی شەوانە": خزمە دەگەڵ Dieb (G.)، diob (OG.)، thief (E.)، tjuv (Sw.)، iubs? (Gt.) "دز"، سەر بە ڕیشەی < ***(IE.) *teip-*** "خۆ مات کردن، هەڵترووشکان".

**دەواڵ dewal** [ *dawāl* ] - "پەلە، لەز": خزمە دەگەڵ ↑داوان dawan [هەڵەداوان].

**دەور dewır** [ *dawır* ] - "خول، گەڕ": وشەیەکی سەر بە زمانە ئێرانییەکانە، شێوەیەکی دیکەیە لە زڤر zıwır [زڤرین zıwrîn واتا ↑سووڕان suran].

**دەوس dews** [ *daws* ] - "جێ پێ": هەروەها دەوساندن dewsandın هەیە بە مانای "پێ لێنان". خزمە دەگەڵ ↑دوویساندن dûysandın "شێلان و تەپاندن بە قاچ و دەست".

**دەوە dewe** [ *dawa* ] - "تەپاڵەی شێلدراو و پان و تەخت کراو": شێوەیەکی نوێتر لە ↑تەپک2 tepık 2 "دەوە، تەپاڵەی شێلدراو".

**دەهری dehrî** [ *dahrī* ] - "قەڵس، تووڕە": هەروەها ↑سێهرا sehra بوون بە مانای "تووڕە بوون" بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑گۆڕین² gorîn "زوێر بوون، زیز بوون"، ↑قار qar "1- تووڕەیی 2- خەم" [قەهرین]. دواجار پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑جەحنین *çeħnīn* و ↑جەخار çexar ەوە.

**دەهۆ deho 1** [ *daho* ] - "گزی، فێڵ": دهۆ dıho ش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ڕیشەی < ***(IE.) *dheu-*** "هەڵم و هاڵاوکردن، هەناسە، ڕووح" [دەبنەڕەتدا: جووڵانەوەی نائارام و تێکەڵ پێکەڵ]. وشەکانی ↑تووش *tûş*، ↑دژ dıj، ↑دزێو dızêw، ↑توخس tuxs و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە "خراپی و دزێوی" دەکەن، لەم ڕیشەوە هاتوون.

**دەهۆ deho 2** [ *daho* ] - "جاجمی هەڵدووراو بۆ دانەوێڵە": خزمە دەگەڵ ↑تەژ tej "ژێرجلی بارەبەر".

**دەهۆڵ dehol** [ *dahol* ] - "نەقارە، تەپڵی گەورە": کاتێک لە وشەی "نەقارە" یان "نەقرا" بە مانای دەهۆڵ ورد دەبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە پێوەندی بە چەمکی "قووڵی"یەوە هەیە و مەبەست قووڵ بوونی تەپڵەکەیە. بەم پێیە دەبێ وشەی "دەهۆڵ"یش لە دوو کەرت پێک هاتبێ، کەرتی دەە deh +

پاشگری ئۆڵ ol- کە پاشگری دروست کردنی ناوە. کەرتی دەە deh خزمە لەگەڵ هێندێک وشەی کە مانای "نزم، قووڵ، خوارەوە" دەبەخشن، وەک ↑تەشک teşk [تەشک و داوێن] یان ↑تەشق teşq [تەشقی ئاسمان واتا قووڵایی ئاسمان].

**دەیلاخ deylax** *[ daylāx ]* - "بەچکەوشتر": خزمە دەگەڵ ↑دەلاش delaş "بەرخۆڵەی ساوا". دەڵ(ە) del(e)- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑توڵە tule. فۆتیمی ş پاشگری گچکاندنە.

**دیار dîyar** *[ dīyār ]* - "بەرچاو، ئاشکرا": دەچێتەوە سەر کرداری ↑دیتن dîtın "بینین".

**دیاری dîyarî** *[ dīyārī ]* - "شتێک کە لەکاتی سەردان و *دیدار* کردندا پێشکێش دەکرێ": دەچێتەوە سەر کرداری ↑دیتن dîtın "بینین".

**دیباچە dîbaçe** *[ dībāča ]* - "پێشەکی کتێب": بنەوشەکە دیب -dîb ە کە پاشگری چە -çe وەک پاشگری گچکاندن پێوەی لکاوە. "دیب" یان دەب deb یان ↑داب dab دە بنەڕەتدا بە مانای "شەقڵ، وێنە، نیشانە"یە و لەمەوە مانای "خەت، نووسراو، نووسین" سەری هەڵداوە. بەم جۆرە مانای "دیباچە" دەبێتە "نووسراو یان نقیسی بچووک" کە لە سەرەتای پەرتووکدا دێ، بەپێچەوانەی نقیس یان نووسراوی مەزن کە بابەتی ئەسڵی پەرتووکە.

**دیتن dîtın** *[ dītın ]* - "بینین": دیدن dīdan (.P). هەم دە زمانی کوردمادی و هەم فارسیدا دوو ڕەگی کرداری دی- و بین- هەن کە یەکەمیان کرداری کاتی رابوردووی لێ دروست دەکرێ [دیتم، دیتت، دیتی ...] و ئەوەی دیکە کرداری کاتی ئێستا [دەبینم، دەبینی، دەبیتێت...]. دە راستیدا ئەو دوو ڕەگەکردار یان بنجەوشەیە بۆ دوو وشەی جیاواز دەگەڕێنەوە و لەباری ئێتیمۆلوژییەوە چ پێوەندییەکیان پێکەوە نییە. بەڵام زمانی کوردمادی و فارسی وەک لە چەندین چاوگی دیکەشدا دەبینرێ، هەر دوو وشەکەیان پاراستووە و ئەو وشانە بە یەک مانا و لە دوو دۆخی جیاوازدا بەکار دێنن. ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **(IE. )*dhei(ə)- >** "دیتن". وشەکانی ↑دین dîn و ↑ئایین ayn و ↑ئاوێنە awene [ئایینە āyīna] پێوەندی بەم وشەوە هەیە. فۆتیمی d لە وشەکانی "ئایین" و "ئاوێنە"دا سواوەتەوە. زمانی عەرەبی وشەی دین dīn (.Arb) ی لە سەردمە کۆنەکاندا وەرگرتووە و لەوێدا فۆتیمەکە پارێزراوە. مانای بنەڕەتی ئەم وشەیە "تێڕوانین، جیهانبینی، روانگە" بووە. ئەم ریشەی سەرەوە دەشێ لەپێوەندی دەگەڵ ریشەیەکی دیکەدا بێ کە بریتییە لە ریشەی **(IE. ) *dei- >** "رووناک بوون، درەوشان، دیارکەوتن".

**دیجلە dîcle** *[ dījla ]* - "ناوی یەک لە دوو رووباری هەرە گەورەی کوردستان": ناوی ئەم چۆمە لە زمانە ئەوروووپییەکاندا Tigris ە، کە ئەوان لە زمانی یۆنانی کۆن وەریان گرتووە و زمانی یۆنانیش بەگوێرەی وشەنامە ئەوروووپییەکان لە زبانی پارسی کۆن وەری گرتووە. بەڵام ئاشکرایە کە پارسەکان نە 2500 ساڵ بەر لە ئێستا و نە ئێستاش هەرگیز لەو وڵاتە کە ئەم چۆمەی پێدا تێ دەپەڕێ، نەژیاون و تەنیا لەکاتی هێرشکارییەکانیاندا پێیدا دەرباز بوون و دواتر بۆ وڵاتی خۆیان گەڕاونەوە کە دەکەوێتە ناوەندی "ئێران"ی ئێستا. ئەم چۆمە لە وڵاتێک سەرچاوەی گرتووە کە نەتەوەی ماد تێیدا نیشتەجێ بووە. سەرچاوەی ئەم رووبارە لەو شوێنەیە کە ئەمرۆ پێی دەگوترێ باکووری کوردستان کە بەشێک لە وڵاتی مادی کۆن بووە و پێتەختی باکووری کوردستانیش شاری ↑ئامێد amed [ئامەد amed] ئاماژە بە ناوی ماد دەکا. کەوابوو مادەکان لەم وڵاتە ژیاون و هەر ئەوانیش بوون کە ناویان لەسەر چۆمەکەی خۆیان داناوە. ئاشکرایە هەم لەبەر ئەوەی مادەکان لەم وڵاتە ژیاون و هەمیش لەبەر ئەوەی ئەوان 200 ساڵ بەر لە پارسەکان دەسەڵاتداری ناوچەکە بوون، ناوی ئەم چۆمە لەباری ریشەوە ناتوانێ بۆ زمانی پارسی کۆن بگەڕێتەوە، بەڵکوو پارسەکان ئەم ناوەیان لە مادەکان وەرگرتووە و لای خۆیان بەکار هێناوە. ئەمەش شتێکی زۆر سروشتییە و هەر وەک ئەمە وایە کە ئێمەی کورد بۆ وێنە ناوی چۆمی "زایندەرود"مان لە پارسەکان و زمانی ئەوان وەرگرتووە و وەک خۆی بەکاری دەهێنین. لە ویکیپێدیا بە

زمانی ئەڵمانیدا شێوە جۆربەجۆرەکانی ناوی ئەم چۆمە لە چەندین زمانی ناوچەکەدا وەک ئاشووری، عیبری، ئارامی، عەرەبی و هیتر باس کراوە، کە هەموویان کەم و زۆر پێوەندییان بە ئەسڵی وشەکەوە پێوە دیارە. وشەی Tigris “دیجلە” خزمە دەگەڵ tiger “بەبر” دە زمانە ئەورووپییەکاندا کە لە زمانی یۆنانی و لاتینی وەرگیراوە و ئەوانیش دیسان بەگوێرەی وشەنامە ئەورووپییەکان لە وشەی پارسی کۆنی tīgrī “تیر” [تیری کەوان] وەریان گرتووە. دیارە لە ئیوان دوو زمانی مادی کۆن و پارسی کۆندا لانی کەم لە باری وشەکانەوە جیاوازییەکی زۆر لە ئارادا نەبووە و هەر بۆیە بە دڵنیاییەوە مادەکانیش بە “تیر”یان گوتووە tîgrî و چۆمەکەیان لەبەر توند و تیژ بوونەکەی بە شتێکی وەک “تیر” شوبهاندووە، بەم مانایە کە چۆمەکە یان وەک تیر توند و تیژ دەڕوا و یان وەک تیر لەش دەبڕێ. ئەم ناو لێنانە بە پێچەوانەی ناوی چۆمی “فورات” [فەرات، فرات] بووە کە هەمدیسان لە لایەن مادەکانەوە دانراوە و ئاماژە بە نەرمتر بوونی ڕەتی چۆمەکە دەکا، بە جۆرێک کە مرۆڤ بە باشی توانیویەتی لێی بپەڕێتەوە.
هێندێک لەم وشانەی کە دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا بەدی دەکرێن و دەگەڵ ناوی چۆمی tîgra “دیجلە” خزمن، بریتین لە ↑تیر tîr [ فۆتیمی g سواوەتەوە]، ↑تیغ tîġ، ↑تیژ tîj، ↑تەزرە tezre [دواتر گۆڕاوە بۆ تەرزە terze، بەرهەڤی بکە دەگەڵ تگرک tagark ی فارسی]، تیک tîk [تیک و درووومان]، ↑تەقەڵ teqel، ↑تیس tîs یان تیسوو tîsu “گیایەکی دڕکاوی”، ↑تیکان tîkan “دڕک”، ↑تیغەرە tîġere [تیغەرەی پشت واتا تیژایی مۆرەکانی پشت]، ↑تەگەرە tegere “دارێکە دە کونی بەرداشی ژێروو کوتراوە” و هتد. وەک دەبینین لە هەموو ئەم وشانەدا چەمکی تیژ بوون و تێڕاچوون بەدی دەکرێ. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑چەقین *çeqîn* [تێ هەڵچەقین] و دەچنەوە سەر ریشەی ***(s)teig-** < **(IE.)*** “تیژ بوون و تێڕاچوون”. ئەم روون کردنەوەیە بە تەواوی دەری دەخا کە وشەی دجلة dijla (Arb.) [دیجلە dîcle] شێوەیەکی عەرەبینراو لە وشەی tîgra یە، و بەم شێوە عەرەبێنراوە هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و فارسی. سەبارەت بەو وشانە کە بە ئەسڵ کوردمادی یان فارسین و دوای عەرەبێندران، بە شێوەی عەرەبێنراو هاتوونەوە ناو ئەم زمانانە نموونە زۆرە.
[تێبینی: فۆتیمی g لە وشە مادییەکەدا دە زمانی عەرەبیدا بووەتە ج j، چونکوو زمانی عەرەبی خاوەنی فۆنێمی g نییە و ئەم فۆتیمە دەگۆڕێ بە ج j. چەند نموونە لەم بارەوە بریتین لە وشە لاتینی و کوردمادییەکانی خوارەوە: **مجوس** magus ، **جنس** genus، **حرج** urgere، **جوز** (گوێز، گۆز)، **جوهر** (گەوهەر)، **جاموس** (گامێش) و هتد.

**دیرۆک dîrok** [ *dīrok* ] - “مێژوو”: دەچێتە چوارچێوەی یەکێک لەم لێکدانەوەی خوارەوە:
1- دەتوانێ پێک هاتبێ لە دیر + ئوک dîr + ok. دیر dīr (P.) دە زمان فارسیشدا هەیە و هەم مانای “زوو” دەبەخشێ [دیرزمان واتا زەمانی زوو] و هەم مانای “درەنگ” [“دیر کردن” واتا درەنگ کردن]. مەبەست لە وشەی دیرۆک بە مانای مێژوو دەتوانێ “زەمانی زوو”، واتا ئەو ڕووداوانە بێ کە سەردەمانی دێرین قەوماون. ئەم وشەیە گۆڕاتێکی تێدا کراوە و بووەتە ↑چیرۆک çîrok و بەم شێوەیە بە مانای “داستان” بەکاردێ، واتا وشەکە دە زمانی کوردمادیدا بە دوو شێوەی جیاواز بە مانای “مێژوو” و بە مانای “داستان” بەکاردێ. [دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Geschichte هەم مێژوو و هەم داستان مانا دەدا و دە بنەڕەتدا بە مانای “ڕووداو، قەوماو” بووە]. لەم تێڕوانینەوە وشەی دیرۆک [↑دێریک derîk] دەچێتەوە سەر وشەی دیر/ ↑دێر der. ئەم وشەیە خوّی خزمە دەگەڵ ↑درەنگ dıreng و ↑درێژ dırej، سەر بە ریشەیەک بە مانای “درێژ، درێژ بوونەوە، لەبەریەک کێشرانەوە”. [وەک بەرهەڤ کردن دەتوانین ئاماژە بکەینە وشەی lang (G.) یان long (E.) کە بە مانای “درێژ” دێ و لە هەمان کاتیشدا تێرمی for a long time دە ئینگلیزیدا بۆ گەیاندنی سەردەمێکی دێرین بەکار دەهێندرێ].
2- لە لایەکی دیکەوە دوور نییە وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑دیلۆک dîlok “ستران” و ↑دۆلگە dolge “هەڵبەستی پێهەڵگوتن”. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای

"قسە و باس، گێڕانەوە، داستان" بەکار دێن. [شیاوی باسە کە وشەی history (E.) ڕیشەی یۆنانی هەیە و مانا بنەڕەتییەکەی دەبێتە "ئاگادار بوون لە ڕێگەی گێڕدرانەوە". وشەی *اسطورة* astūra (Arb.) "ئەفسانە، داستان" لە وشە یۆنانییەکە وەرگیراوە].

**دیزە dîze** [ *dīza* ] - "مەنجەڵی بچووک": دیگ dīg (P.) "مەنجەڵ" و هەروەها دیزی dīzī "مەنجەڵی چکۆڵە" [بۆ شۆرباو]. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ tegula (L.) و téganon (Gr.) "قابلەمە، مەنجەڵ"، سەر بە ریشەی *deiĝh- > (IE.)* "قوڕ گرتنەوە و دەکار کردن، هەویر شێلان". شیاوی باسە وشەی ↑تیان tîyan "مەنجەڵ" دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەو وشە یۆنانییەوە هەیە.

**دیسا(ن) dîsa(n)** [ *dīsā(n)* ] "جارێکی دی": دی + ↑سا dî + sa. کەرتی یەکەم هەمان دی dî یە لە وشەی ↑دیکە dîke دا. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑جا ca [↑جار *car*]. وشەکە "دیجار" بووە، بووەتە "دیجا" و پاشانیش "دیسا، دیسان"، واتا "جارێکی تر". فۆتیمی n زێدەیە و لە هێندێک زاراوەدا بۆ هاسانبێژی لە ڕستەدا بە وشەکەوە دەلکێ و دەبێتە "دیسان". هەڵی سەنگینە دەگەڵ "دەسا" کە ئەویش پێشتر "دەجا" بووە.

[تیبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا nochmal بە مانای "دیسان" بەکار دێ، کە کەرتی دووەمەکەی مانای "جار" دەبەخشێ و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "جارێکی دیکە"].

**دیق dîq** [ *dīq* ] - "1- دەردەباریکە 2- نەخۆشی بەهۆی خەمی زۆرەوە": دق deq (P.). تەق teq یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑دەق deq "گنج، قەد"، ↑دەغەز deġez "نەخۆشی"، تکیدە takīde (P.) "چرووساوە" و ↑ ژاکان *jakan*↑.

**دیل dîl** [ *dīl* ] - "یەخسیر": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Seil (G.)، sāl (OE.)، zeel (Nl.) "پەت، بەند"، sa lan (OE.) "بە پەت بەستن، پەت کردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەستن(ەوە)، گرێ دان، دروون، چنین" و خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی وەک ↑جاڵجاڵوکە *calcaloke* و ↑جۆڵا cola. لەم تیڕوانینەوە مانای "دیل" دەبێتە "بەندی، بەندکراو".

1- ↑تاڵان "راووڕووت، غەنیمە و دەسکەوتی شەڕ". لە سەردەمانی کۆندا دیلەکان وەک غەنیمە هەژمار کراون.

**دیلۆک dîlok** [ *dīlok* ] - "ستران": خزمە دەگەڵ ↑دۆلگە dolge "هەڵبەستی پێهەڵگوتن".

[تیبینی: وشەکانی "لاوک" و "لاوژە"ش دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پێهەڵگوتن، حەز لێکردن].

**دیلە dîle** [ *dīla* ] - "قورم، سیان، دوودە": خزمە دەگەڵ ↑دووکەڵ dukel. بنەوشەی دی -dî هەر ئەوەیە کە وەک دوو -du دە وشەی "دووکەڵ"دا دەبینرێ.

**دیلەک dîlek** [ *dīlak* ] - "تکا کردن و پاڕانەوە بۆ کەسێک": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑دۆلگە dolge "هەڵبەستی پێهەڵگوتن".

[تیبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "پێهەڵگوتن" و "پاڕانەوە" بەرهەڤی بکە دەگەڵ دوو وشەی خوارەوە کە پێکەوە خزمن: *لاواندنەوە* "پێهەڵگوتن" و *لاڤایی* (بە فارسی "لابە") بە مانای "پاڕانەوە"].

**دیلان dîlan** [ *dīlān* ] - "1- سەما و هەڵپەڕکێ 2- گێژ و دەبەنگ 3- جۆلانە": پێوەندی هەیە بە یەک لەم وشانەوە:

1- ↑جووڵان(ەوە) culan(ewe).

2- ↑تلەکان tılekan "تەکان خواردن، راژان". لەوانەیە ئەم وشەیە خۆی دەگەڵ "جووڵان" خزم بێ.

3- ↑تلان tılan سەر بە ریشەی *ter- > (IE.)* "سووڕان، با دان". [سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "جووڵان" و "تلان" بڕوانە ↑تلین tılîn "1- هێشتن، هێڵان 2- خەڵتان بوون، تیوە گلان"]

**دیلەکانی dîlekanî** [ *dīlakānī* ] - "جۆلانە": بڕوانە ↑دیلان dîlan.

دیمەک **dîmek** [ *dīmak* ] - "داری ناو دیوار بۆ قایمی": خزمە دەگەڵ ↑تەمەڵە temele.

دیمەن **dîmen** [ *dīman* ] - "شوێن یان شێوەی بەرچاو": لە کرداری ↑دیتن dîtın "بینین" وەرگیراوە.

دین¹ **dîn¹** [ *dīn* ] - "ئۆل، ئایین": خزمە دەگەڵ ↑دیتن dîtın یان دین dîn واتا "بینین"، سەر بە ریشەی > ***(IE.)*dhei(ə)-*** "دیتن، تیرین". مەبەست لە "دین" دە بنەڕەتدا هەر ئەو شتە بووە کە ئەمرۆ پێی دەگوترێ "روانگە، جیهانبینی". شێوەیەکی دیکە لە وشەی "دین" بریتییە لە ↑ئایین ayîn [ > *a-* **dayana-* (OI.)] کە ئەمەیان شێوەیەکی تازەترە و فۆتیمی d تێیدا سواوەتەوە.

دین² **dîn²** [ *dīn* ] - "شێت": خزمە دەگەڵ dumm (G.)، dum (Sw.) "دین، گێژ و حۆل". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک ↑دووکەڵ dukel، ↑دوومان duman، ↑تۆز toz، تین tîn و توون tun و هتد. لەم تیروانینەوە وشەکە دە بنچینەدا بەو مانایە بووە کە کەسێک مێشکی یان هەستەکانی تەماوی و تێکەڵ پێکەڵ بووبێ.

دینار **dînar** [ *dīnār* ] - "1- سەدیەکی قراتیکی ئێرانی 2- پارەی ولاتانی عەرەب":
وشەکە ریشەی لاتینی- یۆنانی هەیە و بۆ وێنە لە وشەی denarius-grossus "دیناری قەڵەو"دا دەبیندرێ.
[لەم بارەوە بڕوانە وشەی *قرۆش* "پووڵی سکەی کەم نەرخ"].

دینگ **dîng** [ *dīng* ] - "ئامرازی چەڵتووک کوتان، دەسکاونگ": دنگ dıng یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Dengel (G.) "تیغە"(ی داس و مەڵەغان) و tangol (OG.) "چەکوچ، کوتک". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە باس نەکراوە.

دینۆک **dînok** [ *dīnok* ] - "کەمێک، تۆزکاڵێک": شێوەیەکی دیکە لە ↑تنۆک tınok.

دیو1 **dîw 1** [ *dīw* ] - "هۆدە، ژوور": خزمە دەگەڵ Zimmer (G.) "دیو، هۆدە"، timmer (Sw.) و timber (E.) "داری خانوو"، timmer (MNl.) "خانوو، کەرەسەی خانوو"، dom (L.) و (Rus.) "خانوو"، demein (Gr.) "خانوو کردن"، سەر بە ریشەی > ***(IE.) *deme-*** "خانوو کردن، ماڵ دروست کردن". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا ریزەوشەیەکی دیکەش دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە کە بریتین لە tame (E.)، zahm (G.)، tam (Sw.) بە مانای "ئاژەڵی ماڵی". دە فارسیشدا دام dam بەمانای "ئاژەڵی ماڵی" بەکار دێ. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑دیوان dîwan و ↑دیوەخان dîwexan دەچنەوە سەر دیو¹ dîw و لەوانەیە ↑دیوار dîwar یش هەر لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرێ. شێوەی کۆنتری وشەی "دیو" دە زمانی کوردمادیشدا پارێزراوە، کاتێک دەگوترێ "دام و دەزگا". ↑دام dam لێرەدا بە مانای "ساختومان، خانووبەرە"یە. دە زمانی فارسیدا هەروەها تیمچە tîmçe (P.) هەیە بە مانای "حەوش و داڵانی سەرداپۆشراو،

دیو2 **dîw 2** [ *dīw* ] - "لا، ئاڵ": [بەم دیوەدا واتا بەم لایەدا، بەم بەرەدا]. ئەم وشەیە جیایە لە *دیو1* "هۆدە، ژوور". شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑جەم¹ cem "لا، کن، نک". ["ل جەم بابێ خۆ" واتا لای باوکی خۆ، یان "هاتنە جەم هەڤ" واتا هاتنە لای یەکتر، کن یەکتر].

[تێبینی 1: سەبارەت بە گۆڕانکاری فۆنۆلۆژیک لەم وشەیەدا هەڵیسەنگێنە دەگەڵ وشەکانی "جەم"، "ژەم"، "دەم"، "تاو"، "تاف" کە گشتیان پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بوون.
تێبینی 2: لە سەردەمی شای ئێراندا وشەی "ئەودیو" لە موکریان بۆ "باشووری کوردستان" بەکار دەهات. ئەگەر کەساتێک لە دەست زوڵم و زۆری رەژیمی شا رایان کردبایە باشوور، ئەوا خەڵک دەیانگوت "لەو دیوە" یان "چووەتە ئەودیوی"، واتا "ئەو لا، ئەوبەر"ی (سنووری دەستکرد). بەم شێوەیە ئاخێوەران بە شێوەیەکی نیهادی یان بە زانایی خۆیان لە ناسینی کوردستان وەک بەشێک لە ئێران یان عێراق دەبوارد. ئەمە نیشان دەدا کە پێناسە کردنی کوردستان وەک وڵاتێکی جیاواز لە وڵاتانی داگیرکەران و وەک وڵاتێکی لەت لەتکراو، لە هزر و هەستی کوردەکاندا بە بەردەوامی لە ئارادا بووە و تەنیا لە نیو سەدەی

رابردوودا رووناکبیرانی کورد کڵاویان چووە سەر و مخابن گەلیشیان دەگەڵ خۆیان تووشی سەر لێشێواوی کردوو]. 

**دیوار dîwar** *[ dīwār ]* - "هەڵچنراوی لە دار و بەرد بۆ خانوو کردن": دیوار dīvār (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑دیو dîw "هۆدە، ژوور".

2- ↑تەمەڵە temele.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "خانوو، دیو" و "دیوار" سەرنجی وشەی "وار" بدە کە بە مانای "ماڵ، شوێنی ژیان" دێ و دە بنەڕەتدا مەبەست لێی "دیوار، بەربەست" بووە و خزمە دەگەڵ "وارش"].

**دیوان dîwan** *[ dīwān ]* - "بارەگا، کۆشک": دیوان dīvān (P.). خزمە دەگەڵ ↑دیو dîw.

**دیوەخان dîwexan** *[ dīwaxān ]* - "ژووری دانیشتنی ئاغا": لە دوو وشەی ↑دیو dîw "هۆدە" و ↑خان xan "بەگ، ئاغا" پێک هاتووە و مەبەست "هۆدەی ئاغا" یە.

**دێ de 1** *[ de ]* - "گوند": دە deh (P.) "گوند"، deh (Pl.) "گوند، وڵات"، taxyu (Av.). خزمە دەگەڵ ↑تاخ tax "گەڕەک".

**دێ de 2** *[ de ]* - "نیشانەی کردار لە کاتی داهاتوودا": ئەم نیشانەیە دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا بەکار دەهێنرێ [دێ بچم، دێ بخوم]. خزمە دەگەڵ ↑دە de 3 "نیشانەی کردار لە کاتی ئێستادا" [دەڕۆ derwa، دەبات debat، دەگرێ degre و هتد] و هەروەها خزمە دەگەڵ ↑دا *da 2* [دا بدە da bıde، دا وەرە da were].

**دێر der 1** *[ der ]* - "درەنگ": دیر dīr (P.). بڕوانە ↑درەنگ dıreng.

**دێر der 2** *[ der ]* - "شوێن و پەناگای رەبەن": دیر deyr (P.). دە هۆنراوە کۆنەکاندا باس لە "دێری موغان" دەکرێ. وشەی "دێر" خزمە دەگەڵ "دۆڵ" و "دەرە" و دەچێتەوە سەر ریشەی **< *dhel- (IE.)** "قووڵکە، قووپاوی، قووڵایی". هەم وشەی "دێر" و هەمیش وشەی "خەرابە" [پیری خەرابات] دە بنەڕەتدا ئاماژە بۆ شوێنگەلێک بوون وەک قووڵکە، کون وکولێن و ئەشکەوت کە پیر و پیاوچاکان ژیانیان تێدا کردوون و خۆیان لە دنیای دەرەوە جیا کردۆتەوە یان حەشار داوە. بۆ زانیاری زۆرتر هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی "خەرابە".

**دێڕ der** *[ der ]* - "سەتر، ریزی نووسراوە":

1- لەلایەکەوە لەوانەیە دێڕی نووسین بە ↑دێراو deraw ی کێڵگەو بێستان چوێنرابێ، چونکە دێراو بە شێوەیەکی ریزکراو و رێک وپێک هەڵدەبەسترێ.

2- لە لایەکی دیکەوە دەکرێ دەگەڵ Zeile (G.) "ریز، دێڕ" بەرهەڤی بکەین، سەر بە ریشەی **< *da(i)- (IE.)** "بەش، بەش کردن، دابەش کردن". وشەی ↑دان dan [پێدان] و ↑دێران deran [ئاودێری] و ↑دەم dem "کات" و چەندان وشەی دیکەی کوردمادیش هەر لەم ریشەوە هاتوون.

**دێران deran** *[ derān ]* - داشتن daştın یش دەگوترێ. ئاو داشتن/ ئاو دێران واتا ئاو دان. هەڵداشتن هەمان "هەڵدان"ە و لێرەشەوە "هەڵدێران" وەک کرداری پەسیڤ (نادیار) دروست بووە. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە "داشتن" یان "دێران" دەچێتەوە سەر ↑دان dan.

**دێراو deraw** *[ derāw ]* - "جۆگەلەی هەڵکەنراو بۆ ئاوداشتن": پێک هاتووە لە دوو وشەی دێر + ئاو aw + der.

1- دێر der یان دەچێتەوە سەر ↑دێران deran و دە بنچینەدا سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەش بەش کردن، دابەش کردن، دان".

2- یان خزمە دەگەڵ ↑دۆڵ dol و ↑دەرە dere سەر بە ریشەی **< *dhel- (IE.)** "قووڵکە، قووپاوی". لەم تێڕوانینەوە دێراو دەبێتە قوڵکە یاخود هەڵکەندراویی بۆ ئاو.

دێریک **derîk** [ *derīk* ] - "1- مێژوو 2- ناوی شارێکە لە کوردستان": شێوەیەکی دیکە لە ↑دیرۆک dîrok.

دێز **dez** [ *dez* ] - "1- رەش، رەشی ئاماڵ بۆر 2- شووم 3- بەدبەخت": لەرووی ماناکانەوە دەردەکەوێ کە وشەکە دە بنچینەدا بە مانای "رەش، ئامال ڕەش" بەکار هاتووە و لەمەشەوە مانای "شووم " و "بەدبەخت" پەرەی گرتووە، چونکە ئەم چەمکانە پێوەندییان پێکەوە هەیە. دە زمانی فارسیدا وشەی دیزە dīza و شبدیز šabdīz (.P) هەیە بە مانای "رەش، بۆری ئامال رەش" و هەروەها تووسی tūsī (.P) "بۆر، ئامال ڕەش". وا پێ دەچێ ئەم وشانە پێوەندییان بە دێزە dez ەی کوردمادییەوە هەبێ و ئەم وشەیە سەرەتا بە مانای "رەش، ئامال رەش" هاتبێ و دواتر ماناکانی "شووم" و "بەدبەخت" ی وەرگرتبێ. ئەم وشانە دەبێ خزم بن دەگەڵ dusk (.E)، dosk (.ME)، dox (.OE) "تاریک رەنگ، تۆخ"، doxian (.OE) "تاریک بوون لە رەنگدا، تۆخ بوون"، tusin (.OG) "تاریک رەنگ"، سەر بە ریشەی < ***dhuskos-*** (.IE) "تاریک، رەش". دە کوردمادیدا هەروەها ↑تۆخ tox هەیە بە مانای "تاریک رەنگ" و ئەم وشەیە لێچووتیکی تەواوی هەیە دەگەل dox (.OE) بەمانای "تۆخ". هەروەها بڕوانە ↑دێزک dêzık "بێ تالع، بەدبەخت".

[تێبینی: دە وشەنامەی فارسی "فرهنگ عمید"دا وشەی "دیز(ە)" دوو مانای بۆ دانراوە: "رەنگ" و "رەنگی رەش و بۆر". هەروەها دە وشەنامەی "فرهنگ جامع فارسی - المانی"دا "دیز" وەک "رەنگ" مانا کراوەتەوە. وەک گەلێک وشەی دیکە زمانزانە فارسەکان نەیانتوانیوە ئەم وشەیە بە تەواوی شیرۆڤە بکەن و مانای پڕ بە پێستی خۆی بۆ دیاری بکەن. مانای وشەکە ناتوانێ هەم "رنگ" و هەمیش "رەنگی رەش و بۆر" بێ، چونکوو رەنگ دەتوانێ جگە لە رەش و بۆر چەندین جۆری دیکەشی هەبێ. وەک لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژی دەری دەخا، ماناکە بریتییە لە "رەش، تارێک، بۆری توند". فەرهەنگنووسانی ناوبراو بەهۆی وشەی فارسی "شبدیز" تووشی هەڵە بوون و وایان زانیوە کە "شبدیز" واتا "دیزی شەب" و ئەمیش واتا "رەنگی شەو"! کەچی مەبەست لە "شبدیز" بریتییە لە "رەش و تاریک وەک شەو" واتا "رەش رەش". ئەم نموونەیە و گەلێک وشەی لەم چەشنە بەباشی نیشانی دەدەن کە لێکۆڵینەوە و ساخ کردنەوی ئێتیمۆلۆژیک تا چ رادیەک بۆ شیرۆڤە و مانا کردنەوەی دروستی وشەکان گرنگ و پێویستە].

دێزک **dêzık** [ *dezık* ] - "بێ تالع، بەدبەخت": دەچێتەوە سەر ↑دێز dez "1- رەش، رەشی ئامال بۆر 2- شووم 3- بەدبەخت". وەک دەزانین هەر لەکۆنەوە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک لەنێوان چەمکەکانی "رەش"، "شووم" و "بەدبەختی، چارەرەشی"دا هەیە و لە سەردەمی ئێستاشدا رەنگی رەش وەک نیشانە ماتەمباری بەکار دەهێنرێ. لە فۆلکلۆری کوردمادیدا قەلەرەشە و پشیلەرەشە وەک دوو ئاژەڵی شووم چاو لێ دەکرێن. لەم بارەوە هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "شووم" کە خزمە لەگەڵ "شێو" [شام] "تاریکان، ئێوارەدرەنگ".

دێل **del** [ *del* ] - "مێی ئاژەڵ": دەل del یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑دایک dayık. هەڵی سەنگینە دەگەڵ داڵک dalık "دایک" دە شێوەزارەی زمانی خوارووداا.

دێلم **delm** [ *delm* ] - "قاش، کووز": خزمە دەگەڵ ↑تیلمە tîlme "باریکەی بڕاو".

دێلێ **dele** [ *dele* ] - "تەختەبەردی میچ پۆش": هەروەها دێلەبەن deleben هەیە بە مانای "میچی خانووی بە بەرد داپۆشراو". وشەیەکی دیکەش هەر لەم پێوەندییەدا وشەی ↑دیمەک dîmek ە بە مانای "داری ناودیوار بۆ قایم کردنی". هەموو ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*تەمەڵە temele*.

دێم**1** **dem** [ *dem* ] - "کشت و کاڵ بە ئاوی باران": دیم deym (.P). دە کوردمادیدا دێمەزار demezar "زەوی دێم" و دیمەکار demekar "کێڵانی دێم" بەکار دەهێنرێن. دە وشەنامەی فارسی "فرهنگ عمید"دا ئەم وشەیە وەک وشەیەکی عەرەبی بە مانای "بارانی بەردەوامی بێ هەورەبروسکە" مانا کراوەتەوە. کاتێک لەم وشەیە و ماناکەی وردبینەوە، شیمانەیەکی بەهێزمان لا دروست دەبێ کە وشەکە پێوەندی بە ↑تەمتەمان temteman "رەقەن، بەردەڵان"ەوە هەبێ، واتا دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "هیشکایی" [رەقایی]

زەوییەکە کرابێ. لەباری ماناوە دەتوانین دەگەڵ وشەی "ئیشکاوز" [ئیشک - هاویشتن] هەڵی سەنگێنین بە مانای "چاندنی زەوەی هیشک (بەر لە باران)".

**دێم 2dem** *[ dem ]* - "دەم": شێوەیەکی دیکە لە ↑دەم dem. [دێم کردن، دێم پێ هێنانی چا و برینج. دەم کردنیش دەگوترێ].

**دێو dew** *[ dew ]* - "گیانداری ئەهریمەنی": [دێو و درنج dêw û dırınc]. دیو dīv (P.).

1- جێی بەراورد کردنە دەگەڵ deus (L.) بەمانای "خودا". لەم تیڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ دەگەڵ ↑تیر3 tîr "ئیزەدی تیر، ناوی هەسێرەی تیر، فریشتەی باران، ناوی چوارەمین مانگی ساڵ، سێزدەهەمین رۆژی هەرمانگێکێ".

2- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Dämon (G.) "دێو" کە دەچێتەوە سەر daemon (L.) "دێو، شەیتان، رووحی ئەهریمەنی" و ئەویش دەچێتەوە سەر daímōn "خودا، هێزی خودایی" و دواجار daiomai (Gr.) "دابەش کردن" [دابەش کردنی چارەنووس ؟]. ئەم وشە یۆنانییە بە مانای "دابەش کردن" دەشێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑دان dan [پێدان].

**دێوانە dewane** *[ dewāna ]* - "شێت": دیوانە dīvāne (P.).

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە daemon (L.) "دێو، شەیتان، رووحی ئەهریمەنی" و مەبەست ئەوە بووبێ کە مرۆڤی شێت دێو، واتا گیانداری ئەهریمەنی مێشکی داگیر کردووە.

2- لەلایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ demens و dementia (L.) "شێتی". وشە لاتینییەکە لە دوو کەرتی -de "بێ، بەبێ" و ment "هزر، رامان" پێک هاتووە.

# ر (R)

**را¹ ra-** [ *rā-* ] - "پێشگر": ئەم پێشگرە یەکێکە لە پێشگرە هەرە چالاکەکانی زمانی کوردمادی کە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کردارەکان دێ. ئەرکی ئەم پێشگرە لەوەدایە کە یان مانایەکی تایبەتی لە چوارچێوەی مانا گشتییەکەدا و یان مانایەکی تازە بە کردارەکە دەبەخشێ، وەک راگرتن ragırtın، راخستن raxıstın، راچەنین raçenîn، رابوون rabun، راپەڕین raperîn، راماڵین ramalîn و هتد. ئەم پێشگرە خزمە دەگەڵ پێشگری فرا -farā (.P) دە زمانی فارسیدا، وەک فراگرفتن farāgereftan، فرارسیدن farāresîdan، فراخواندن farāxāndan و هتد. دە زمانی فارسیدا پێشگرەکە زۆر کەمتر بەکار دێ لە چاو زمانی کوردمادی. پێشگرەکە دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *per- >* "تێپەڕین لە، تێپەڕین بە". خزمە دەگەڵ ↑پار par [ساڵی پار واتا ساڵی بەرێ]، ↑بەر ber "پێش"، ↑پەڕینەوە perînewe، ↑پەڕیوە *perînewe* و هتد.

**را² ra** [ *rā* ] - "بیر، بۆچوون": زۆرجار دەگەڵ "بیر" دێ [بیر و را bîr u ra]. ئەم وشەیە پێوەندی بە رأی raī (.Arb) "دیتن"ەوە نییە، بەڵکوو کورتکراوی ↑رەت2 ret ە بە مانای "هزر و بیر"ە [لە رەت دام چی بکەم]. هەروەها دەگەڵ ↑راوێژ rawej دێ بە مانای "حەدس وگومان، تەگبیر" و دەگەڵ ↑راوێچکە raweçke یان راوێشکە rawêşke "بیرکردنەوە لە شتێک". دە زمانی فارسیدا رایزن rāyzan (.P) هەیە بەمانای "راوێژکار" و هەروەها وشەی رایانە rāyāne (.P) دروست کراوە بە مانای "ئەژمێرەر، کۆمپیوتێر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانە ئەورووپییەکاندا کە هێندێک مانا لە خۆ دەگرن، وەک "شیمانە کردن، ئەژماردن، حیساب کردن، بیرکردنەوە، گێڕانەوە، ئاخافتن" و هتد. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑راشەن raşen.

[تێبینی: وەک لە زۆر جووتەوشە (وشەدوانە)دا دەبینرێ، ئەم وشانە یەک مانا یان مانای نیزیک لەیەکدیان هەیە، بۆ وێنە، کڕ و کپ، سارد و سڕ، تەڕ و بڕ، خوار و خێچ، شل و شەوێق، رێک و راست و هتد. هەر بۆیە کاتێکیش دوو وشەی "بیر و را" زۆرجار وەک جووتەوشە دەردەکەون، ئەمە نیشان دەدا کە ئەم دوو وشەیە مانایان لە یەکدی نیزیکە و کەوابوو ناتوانێ پێوەندی بە "رای" عەرەبییەوە هەبێ].

**را³ ra** [ *rā* ] - "را" کردن واتا هەڵاتن. هەڕا hera کردنیش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ rennen (.G)، (.Nl)، a rnan (.OE)، ränna (.Sw) "راکردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە ئاماژە دەکەن بە مانای "بزووتن"، بە تایبەتی بزووتنی خێرا. هێندێک لەم وشانە بەم جۆرەن: rinnen (.G) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بەمانای "جاری بوون، رەوان بوون"، rnoti (.OIn) "هەڵدەستێ، دەبزوێ" و rti-h (.OIn) "پەلامار، شەڕ"، oriro (.L)"هەستان، پەیدا بوون"، origo (.L) "سەرچاوە، بنەڕەت"، ruere (.L) "راکردن، پەڵە کردن، هەڵەنگوتن"، ronti (.Rus) "خستن"، reisen (.G) "گەشت کردن، سەفەر کردن"، rasen (.G) "تیژ تێپەڕین، هەڵچوون"، ierre (.OE) "سەرگەردان، شێت، قەڵس، هەڵەکار" و هتد. دە زمانی کوردمادیشدا ژمارەیەک وشەمان هەیە کە پێوەستن بە وشەکانی سەرەوە و دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش، بۆ وێنە ↑هەڕا hera [هەڕا کردن]، "بزووتن". دە پلەیەکی دوورتر دا هێندێک وشەی دیکەی *(IE.) *reu-, *re-, *ere- >* سەر ریشەی کوردمادیش دەبنە خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە، وەک ↑رەتاندن retandın، ↑راسان rasan، ↑رەوینەوە rewînewe و ↑رووبار rubar و هتد.

**را³ ra** ⁅ *rā* ⁆ - "جار، کەڕەت": [ئەم ڕایە واتا ئەم جارە]. وشەکە دەشێ دە بنەڕەتدا بە مانای "گەڕ، دەور، نۆرە" بووبێ. لە تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ڕێ re "ڕێگا"، سەر بە ریشەیەک بەمانای "گەڕان، ڕۆیشتن".

**ڕاپسکاندن rapıskandın** ⁅ *rāpıskāndın* ⁆ - "خۆ قوتار کردنی کەسێک لە دەستی یەکێک کە توند گرتوویەتی": ڕا [پێشگر] + پسکاندن pıskandın + ra. کەرتی پسکاندن شێوەی جەختکراوی پساندن pısandın‌ە. [بنجی پس -pıs + ناوگری جەخت کردنی ک k + نیشانەی کرداری ئاندن andın]. ڕاپسکاندن ئەو دۆخەیە کە کەسیکی بە دەست گیراو واتا "بەستراو" خۆی لە "بەند"ەکە داپچڕێنێ یاخود "بەندە"کە لە خۆی داپچڕێنێ. بڕوانە ↑پسان pısan.

**ڕاپۆڕاندن raporandın** ⁅ *rāporāndın* ⁆ - "پەستاوتن، ئاخنین": ڕا + پۆڕاندن porandın + ra. بنەوشەی پۆڕ -por خزمە دەگەڵ ↑پڕ pır. تێکرای وشەکە واتا زۆر تێکردن، پڕ کردن.

**ڕاپەڕاندن raperandın** ⁅ *rāparāndın* ⁆ - "هەڵسووڕاندن، چالاکانە ئەنجام دان": ڕا + پەڕاندن perandın + ra. خزمە دەگەڵ ↑تێپەڕین teperîn "بوورین، ڕویین". لەم تێڕوانینەوە ڕاپەڕاندن دە بنەڕەتدا واتا بەڕێوە بردن، مەشاندن، بەرەو پێش بردن". وەک دەردەکەوێ، کردارەکە پێوەندی بە "پەڕین" و "پەڕاندن" [بزاڤی توند لە هەوادا] نییە.

**ڕاپەڕکاندن raperkandın** ⁅ *rāparkāndın* ⁆ - "1- هەڵچوون بە دار و چیادا 2- چەمبۆڵە دادانی سەگ و ...": شێوەیەکی دیکەیە لە ڕاپەلکاندن rapelkandın [↑ڕاپەلکین rapelkîn].

**ڕاپەرموون rapermun** ⁅ *rāparmūn* ⁆ - "وێران، دە خۆڕا دیتن": ↑ڕا ra + ↑پەرموون permun.

**ڕاپەلکین rapelkîn** ⁅ *rāpalkīn* ⁆ - "سەرکەوتن بەسەر دار و دیواردا": ڕا + پەلکین ra+ pelkîn.
ڕاپەرکین raperkîn یش دەگوترێ. بنەی وشەکە، پەل -pel (پەر-per-)، هەمان ↑پەل pel بە مانای "دەست"ە و مەبەستی وشەکە دەبنەڕەتدا بەکارهێنانی دەست و قاچە بۆ سەرکەوتن.

**ڕاپیتە rapîte** ⁅ *rāpīta* ⁆ - "هاتوچۆی بەپەلەپەل و ئەم سەر ئەو سەر کردن": ↑ڕاوێچکە2 raweçke ش دەگوترێ. دەچنەوە سەر ↑ڕۆیشتن royıştın [رفتن raftan (P.)].

**ڕاتب ratıb** ⁅ *rātıb* ⁆ - "کەلوپەلی ڕاوکەر": خزمە دەگەڵ ↑ڕاشەن raşen "تۆێشووی ڕێگا".

**ڕاتڵەکاندن ratılekandın** ⁅ *rātlakāndın* ⁆ - "ڕاوەشاندن": ڕاتڵەقاندن ratıleqandın یش دەگوترێ. ڕا + تڵەکاندن ra + tılekandın.
1- یان خزمە دەگەڵ ↑شڵەقان şıleqan.
2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑ڕاچڵەکین raçılekîn.

**ڕاجلفین racılfîn** ⁅ *rajılfīn* ⁆ - "ڕاچەنین، شڵەژان": پێشگری ڕا + جلفین ra + cılfîn. بنجی جلف -cılf خزمە دەگەڵ ↑شلوێ şılwê "لێکدراو" و ↑شڵێوە şılêwe "باران و بەفری پێکەوە" [دە بنەڕەتدا: لێکدراو] و ↑ژڵێوان jılêwan "شێواندن، تێکەڵ پێکەڵ کردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑*شڵەقان şıleqan* "لێکدان".
[تێبینی: وشەی "ڕاچەنین"یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و خزمە دەگەڵ "ژەنین"].

**ڕاچڵەکین raçılekîn** ⁅ *rāčılakīn* ⁆ - "ترسان، هەڵبەزینەوە لە ترسان": ڕا + چڵەکین ra + çılekîn. چڵەکین çılekîn هاوڕیشەیە لەگەڵ schreken (G.) و schrikken (Nl.). ئەم کردارە دە زمانی ئەمرۆی ئەڵمانی و هولەندیدا مانای "زۆر ترسان" دەدا، بە ڵام دە بنەڕەتدا مانای"هەڵبەزین، بزاڤی خێرا و لەنەکاو"ی هەبووە. لە بەر ئەوی مرۆڤ بەهۆی ترسانی زۆر یان ترسانی لەنەکاو هەڵدەبەزێنەوە، مانای وشەکە گۆڕدراوە بۆ "ترسان". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک هەن کە خزمایەتییان دەگەڵ ئەو وشەیە هەیە، وەک ↑چڵە دان çıle یاخود ↑چڵیان çılyan بەمانای "لێدانی دڵ یان ڕەگ" [دە بنەڕەتدا هەڵبەزینەوە]، ↑چرکە çırke "سانیە، تەکان، بزاڤێکی کورت"،↑چالاک çalak و هتد.

**راچە raçe** [ *rač* ] - "داری خانوو، بەرچیغ": خزمە دەگەڵ Rahe (G.)، ra (NL.)، ra (Sw.) "تیرەگی کەشتی" [دە بنەڕەتدا دار، سینگ، کۆڵەکە] و هەروەها Reck (G.)، recke (Nl.) "داری راهیڵ کراو" [بۆ هیشک کردنەوەی جلکی شۆراو یان لەسەر هەڵنیشتنی مریشک و هتد]، ríeklas (Lit.) "داربەست بۆ هیشک کردنەوەی جلک و دووکەڵاندن". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑رۆت rot یش هەیە بە مانای "داردەستی درێژ" کە دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. ریشە؟

**راچەنین raçenîn** [ *rāčanīn* ] - "لەرزینی لەنەکاو": را + چەنین ra + çenîn. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ژەنین *jenîn* و ژەندن jendın بە مانای "لێدان" و "لێکدان" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە دەکەنە چەمکی "بزاڤ، تەکان و راوەشان"، وەک ↑چندک çındık "وەزاق دان، هەڵبەزین" [دە زمانی فارسیدا چندش čandeš (P.) "لەرز، موچڕک" و چندش اور čandešāwar (P.) "داچڵەکێنەر"]، ↑جنقین cınîqn "ڕاپەرین لە خەو، راچەنین"، ↑جنگ cıng "جم، بزاڤ، تەکان" و ↑راژان rajan "لەرینەوە". مەبەست لە هەموو ئەم وشانە تەکان خواردن یان هەڵبەزینەوەیە.

**راچێتە raçete** [ *rāčīta* ] - "سیایی (نوسخەی) پزیشک": خزمە دەگەڵ رایش rayş "لە بەر نووسراو" و ↑رایشان rayşan "لە بەر نووسینەوە" و دواتر ↑ریش rîş "ردێن".

**رادە rade** [ *rāda* ] - "حەد، ئەندازە، پلە": دە فارسیدا ردە rade (P.) بە مانای "ریز، سەف، پلە" دێ:

1- وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ ↑ریز rîz "رەدیف". لەم تێڕوانینەوە ماناکە سەرەتا بۆ "دەرەجە" [بەزی و نزمی ریزەکان] و دواتر بۆ "ئەندازە" پەرەی گرتووە [لە رادە بەدەر].

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑رێژە reje "نیسبەت، ئەندازە".

**راڕ rar** [ *rār* ] - "لەبەریەک بڵاو بوو، هەلاهەلا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ rarus (L.) "شل، سست، تاق و لۆق، دەگمەن".

**راڕا rara** [ *rārā* ] - "وازوازی، هەردەم لەسەر هەوایەک": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑را ra "بیر". هەروەک چۆن "وازوازی" لە بنەوشەی "واز" پێک هاتووە، بۆی هەیە "راڕا" ش لە بنەوشەی "را" پێک هاتبێ.

**راز[1] raz** [ *rāz* ] - "قسەی سەربەمۆر": بڕوانە ↑راشەن raşen "تۆێشووی رێگا".

**راز[2] raz** [ *rāz* ] - "شاخی بڵند، تیشەبەردی سەرکێو": هەروەها ↑رازوونە razune هەیە بە مانای "سەکۆی بەر دەرگا". دەشێ خزم بن دەگەڵ ragen (G.)، hraegan (OE.) "زەق بوون، قیت و دەرپەریو بوون". ئەم وشە ژێرمەنییە وا لێک دراوەتەوە کە دەتوانێ پێوەندی هەبێ بە krossai (Gr.) "دار وبەردی نووک تیژ". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑راژە raje "داری خانوو، پەرچیغ".

**رازان razan** [ *rāzān* ] - "راکشان، پاڵ کەفتن": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی ***(IE.) *reg- >*** "لەبەریەک کشان(ەوە)، درێژ بوون(ەوە)" و خزم بێ دەگەڵ ↑رێک rek "راست، کێشراوە".

**رازاندنەوە razandın(ewe)** [ *rāzāndınawa* ] - "جوان کردن": دە فارسیدا اراستن ā-rāstan. دە زمانی فارسیدا وشەکە پێشگری -a ی وەرگرتووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑راست rast و دە بنەڕەتدا ماناکەی "راست و ریس کردن، رێک و پێک کردن" بووە و لەوێوە مانای جوان کردن دە هەردوو زمانی کوردمادی و فارسیدا پەیدا بووە. وەک هەڵسەنگاندنێک دە توانین ئاماژە بە وشەی einrichten (G.) بکەین کە بە مانای "ئامادە کردن، شکڵ و شێوە پێدان، لەبارکردن" دێ و دەچێتەوە سەر کرداری richten (G.) "رێک و پێک کردن، دروست کردن، راست و ریس کردن". ئەم وشە ژێرمەنییەش خۆی خزمە دەگەڵ راست rast ی کوردمادی و لەوێشەوە دەگەڵ رازاندنەوە [razandın(ewe)].

**رازوونە razune** [ *rāzūna* ] - "سەکۆی بەر دەرگا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑راز[2] raz "شاخی بڵند، تیشەبەردی سەرکێو".

**راژان rajan** [ *rāžān* ] - "لەرزانەوە، شەکان، بەم لا و ئەولادا جوولّان": را + ژان ra + jan. کەرتی یەکەم پێشگرە. کەرتی "ژان" خزمە دەگەڵ ↑ژەندن jendın، ↑ژەنین jenin، راچەنین ra-çenîn، ↑ژان jan و هتد. ئەم وشانە دە ریشەدا بە مانای "لێدان، لێکدان" بوون و لەوێوە چەند مانایەکی دیکەش وەك تەکان دان و راوەشاندن پەیدا بوون.

**راژە raje 1** [ *rāža* ] - "داری خانوو، پەرچیغ": راچە raçe و راجە race ش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Rahe (G.)، ra (Nl.)، ra (Sw.) "کاریتەی کەشتی".مانای بنەڕەتی وشەکە "دار، سینگ، پەرچیغ" بووە. ئەم وشە ژێرمەنییانە بە پێی بۆچووتێک پێوەندییان هەیە بە regen (G.) و دواتر ragen (G.). لەم تێڕوانینەوە راژە raje دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑راز raz "تیشەبەرد، شاخی قوت وبڵند".

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین بەرهەڤی بکەین دەگەڵ radius (L.) "داردەست، تێڵا".

**راژە raje 2** [ *rāža* ] - "خزمەت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رەسین *resın* "گەیشتن". دە زمانی فارسیدا رسیدن rasīdan (P.) هەم بە مانای "گەیشتن لە شوێنێك بۆ شوێنێك "ە و هەم بە مانای "پێگەیشتنی شت" و هەمیش "پێڕاگەیشتن". مەبەست لە "راژە کردن" دە بنەڕەتدا "پێڕاگەیشتن"ە. وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە دە زمانی کوردمادیدا، لەوانە ↑راست rast، ↑رەخساندن rexsandn، ↑رازانەوە razanewe و هتد.

**راسان rasan 1** [ *rāsān* ] - "لووت پژان": رسکین rıskîn و رزکیان rızkîyan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رژان rıjan. دە بنەڕەتدا واتا "رژان" [ی خوێنی] سەر بە ریشەی ***(IE.) *re-, * reu-* >** "بزووتن". خزمە دەگەڵ ↑راسان2 rasan "هەستانی خێرا، بزوانی خێرا". بەرهەڤی وشە کوردمادییەکە بکە دەگەڵ race (E.) و rās (ME.) "بزوانی خێرا، جاری بوونی خێرا".

**راسان rasan 2** [ *rāsān* ] - "هەستان، راست بوونەوەی خێرا": [لێی راسا واتا خێرا لێی هەستا سەرپێیان]. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەك هەن کە دەتوانین لەپێوەندی لەگەڵ چەند وشەیەکی ژێرمەنیدا لێکیان بدەینەوەو بیانبەینەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. ئەم وشانە گشتیان ئاماژە بە "بزووتن" دەکەن، وەك Reise (G.) "سەفەر، گەشت" کە پێوەندی هەیە بە rizan (OG.) "بەرزبوونەوە، راست بوونەوە، رێکەوتن، [دا]کەوتن، سەرکەوتن"، ur-reisan (Got.) "هەستان، بەرزبوونەوە"، rise (E.) "بەرزبوونەوە، سەرکەوتن"، risa (OIs.) "1- بەرزبوونەوە 2- دروست بوون، رسکان". [لەوانەیە وشەی ↑رسکان rıskan ی کوردمادیش بە مانای "دروست بوون" لەم پێوەندییەدا جێ بگرێ]. دە زمانی کوردمادیدا ↑رسیان rısyan "هەڵدێران" و ↑هەرەس heres [he-res] "داکەوتن، دارمان" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە و گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *re-, * reu-* >** "بزوان، بزووتن". ئەم وشانە لەلایەکی دیکەوە دەبنە خزمیش دەگەڵ ↑راسان1 rasan بەمانای "رژان" و ↑رشتن rıştın و هتد.

**راست rast** [ *rāst* ] - "1- دژبەری چەپ 2- دژبەری چەوت": هاوریشە دەگەڵ rectus (L.)، riucht (Of.)، raihts (Got.)، right (E.)، reht (OG.)، recht (G.) گشتیان بە مانای "راست"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *reg-* >** "راست کردنەوە، بەڕێوە بردن". orego (Gr.) "خۆ لەبەر یەك دەکێشێتەوە"، rigati (OIn.) "خۆ راست دەکاتەوە" پێوەستن بەم ریشەوە. "راست" دە زمانی کوردمادیدا هەم بە واتای "لای راست" و هەم بە واتای "راست و دروست" بەکاردێ و دە ئینگلیزی و ئەڵمانیشدا هەم بە مانای "لای راست" و هەم بە مانای "حەق " و "ماف" بەکار دێ.

**راشکاو raşkaw** [ *rāškāw* ] - "ئاشکرا، دیار": وەرگیراوە لە راشکان raşkan [را + شکان ra + şıkan]. راشکان دەبێ بەم مانایە هاتبێ کە شتێك بە بارێك دا دەشکێتەوە و لە حاڵەتی نادیاری و ناڕوونی یان دوولایەنی دێتەدەر و یەك لا دەبێتەوە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی قەتعی بوون کە لە "قەتع" بە مانای "برین" وەرگیراوە و بە مانای ساخ بوونەوە و یەك لا بوونەوە بەکار دەهێندرێ.

**راشلکان raşılkan** [ *rāšılkān* ] - "بە شەلەشەل ڕۆیشتن": را + شلکان ra + şılkan. خزمە دەگەڵ ↑شەل şel.

**راشەن raşen** [ *rāšan* ] - "تۆیشووی ڕێگا": هەروەها ↑راتب ratıb هەیە بە مانای "ئەو کەلو پەلەی راوکەر لە پشتی خۆی دەبەستێ". خزمە دەگەڵ Rat (G.)، raad (Nl.)، ra d (OIn.)، rad (Sw.) "پێشنیار، ئامۆژگاری، تەگبیر، راوێژ". مانای کۆنی ئەم وشانە بریتی بووە لە "ئامراز و کەلوپەلی ژیان". ئەم مانا بنەرەتییە لەم وشە ئەڵمانییانەدا پارێزراوە: Gerät (G.) "دەزگا"، Vorrat (G.) "تۆیشوو، شتی پاشەکەوت کراو"، Hausrat (G.) "شتی ناوماڵ"، Heirat (G.) "زەماوەند" [دەبنەڕەتدا: جێ بەجێ کردنی ماڵ] و هتد. [ئەم وشە ئەڵمانییەی دوایی لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە لەگەڵ "جیاز" کە دە بنەڕەتدا مانای "ئامراز، کەرەستە" دەدا]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *redh- >*** "بیر لێکردنەوە، لێکدانەوە، دواتر: تەگبیری کار و بار کردن، دوورئەندێشی و پێشبینی کردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن هەروەها دەگەڵ چەندین وشەی ژێرمەنی دیکە وەک raten (G.)، read (E.) "شیمانە کردن، ئامۆژگاری کردن، پێشنیار کردن"، Rede (G.) "وتار، بێژە، قسە" [دەبنەڕەتدا: ئاوەز، هزر]، rajō (Gt.) "ئەژمار، ئەژماردن"، ratio (L.) "ئەژماردن، هەڵسەنگاندن، بیر کردنەوە، ئاوەزین، هزر و بیر". دیسان خرد xerad (P.) "ئاوەز" و دە کوردمادیدا ↑هزر hızır "بیر" دەستەخوشکی ئەو وشانەی سەرەوەن. بە ورد بوونەوە و بەرهەڤ کردنی ئەو دوو وشە کوردمادی و فارسییە بەم ئەنجامە دەگەین کە شێوەی پێشووتری وشەکە، واتا شێوە هاوبەشە کۆنەکە **hxrat* بووە و پاشان دە فارسیدا بووەتە خرد xerad و دە کوردمادیشدا بووەتە هزر hızır. وشەکانی ↑ژیر jîr و ↑زیرەک zîrek یش خۆیان لەناو ئەم دەستەوشەیەدا دەبیننەوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑رەت[2] ret هەیە بە مانای "بیر" [کورتکراوەکەی: ↑را ra بیر و را bîr u ra]. ئەم وشانە دیسان خزمن دەگەڵ Reim (G.) "قافیە، رەدیف"، rīm (OG.) "ریز، تەرتیب، ئەژمار"، rīm (OE.) "ئەژمار ئەژماردن، حیساب"، rīm (OIs.) "حیساب، ئەژماردن، رۆژەژمێر"، rīm (OIr.) "ئەژمار"، arthmós (Gr.) "ئەژماردن، ژمارە" و دە زمانی کوردمادیدا دەبنە خزم دەگەڵ ↑راڤ3 rav "ریز، سەف" و ↑راوێژ rawej "شیمانە، تەگبیر"، ↑راز raz "قسەی سەر بەمۆر"، ↑سرتە sırte "قسەی بە ئەسپایی"، ↑سرنج sırınc "ورد بوونەوە، بیر لێکردنەوە" و هتد. ریشە هیندوئەورووپییەکەی سەرەوە دە پلەیەکی دوورتردا خۆی دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *ar(e)- >*** "تێکبەزاندن، یەکانگیر کردن، تێکخستن". وشەی ↑ئانیشک anîşık [کۆنتر: *ئارنیشک *arnîşık*] و چەندین وشەی دیکە پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

**راڤ1 rav 1** [ *rāv* ] - "بەلەک ئەستوور بوونی ژنی سکپڕ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ straff (G.)، straf (Nl.) "رەق، شەق، لەبەر یەک کێشراو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)ter- >*** "رەق، توند، سفت، لەبەر یەک کێشراو". بەرهەڤی بکە دەگە ↑رەپ rap.

**راڤ2 rav 2** [ *rāv* ] - "1- پەڵەی رەش لەسەر پێست 2- پەڵەی دەموچاوی ژنی سکپڕ، ماڵە": خزمە دەگەڵ ↑رەمەکی remekî.

**راڤ3 rav 3** [ *rāv* ] - "ریز، سەف": خزمە دەگەڵ Reim (G.) "بەیت، دێڕەهۆنراوە"، rīm (OG.) "ریز، تەرتیب، ئەژمار"، rīm (OE.) "ئەژمار ئەژماردن، حیساب"، rīm (OIs.) "حیساب، ئەژماردن، رۆژەژمێر"، rīm (OIr.) "ئەژمار"، arthmós (Gr.) "ئەژماردن، ژمارە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ راوێژ rawej و چەندین وشە کە لەژێر ↑*راشەن raşen* دا شی کراونەوە.

**راڤ[4] rav [4]** [ *rāv* ] - "شەرم و شوورەیی": خزمە دەگەڵ ↑رەب reb "بەرەی زین و کورتان"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *rebh-*** "(دا) پۆشین". ئەو وشانەی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا مانای "عەیب و عار" دەبەخشن، پێوەندییان بەو ریشانەوە هەیە کە مانای "داپۆشین، شاردنەوە" دەدەن. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەکانی "شوورەیی"، "جندە" و هەروەها *سام* "ترس" [دە بنەڕەتدا: شەرم کردن].

**راڤه rave** [ *rāva* ] - "شەرح، شیکاری": راوه rawe ش دەگوترێ. وشەی شی/ شێ (کردنەوە) دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای"(لێکدا) برین، جیا کردنەوە، لێککردنەوە". هەربەم جۆرەش وشەی راوە/ راڤە دەچێتەوە سەر ریشەی **< *reu-** (**IE.**) "پچرین، دابرین، لێکردنەوە" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رەوتین rewtîn، ↑رفاندن rıfandın، ↑راو raw و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**راقوتان raqutan** [ *rāqutān* ] - "پەلامار، چوونەناو": را + قوتان ra + qutan. قوتان دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑کوتان kutan [هەڵکوتانە سەر].

**راک rak** [ *rāk* ] - "گاشەبەردی بن ڤاڵا": خزمە دەگەڵ rock (E.)، ro(c)que (OF.) یان roche (OF.). ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە.

**راگوزار raguzar** [ *rāguzār* ] - "1- رێباز 2- رێبوار": دەچێتەوە سەر rahgozar (P.) "رێبوار". وشە فارسییەکە لە دوو کەرتی ra "رێ، رێگە" و gozar پێک هاتووە. بنەوشەی gozar دەچێتەوە سەر کرداری gozaštan (P.) "بووربن، رابوردن". ئەم کردارە فارسییە خزمە دەگەڵ ↑گوزەران guzeran "تێپەڕ بوون، دەرباز بوون".

**رام ram** [ *rām* ] - "دەستەمۆ، کەوی": خزمە دەگەڵ ↑ئارام aram [(a)ram]. مەبەست لە رام کردن دە بنەرەتدا ئارام کردنی ئاژەڵی وەحشی یاخود ئاژەڵی سرک و نائارام بووە.

**رامکە ramke** [ *rāmka* ] - "ئەو هێلکەی دەبن مریشکی هێلکەکەری دەتین": راوکە rawke و رامە rameش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ ↑رام ram، دەبنەرەتدا واتا "ئارام، لەجووڵە وەستاو، کڕ". رامکە ئاماژەیە بەو هێلکەیە کە مریشک لەسەری ئارام دەگری، کڕ یان کورک دەبێ.

**رامڵ ramıl** [ *rāmıl* ] - "پەک کەوتن لە وەڵام دانەوە". هەروەها "رامڵ خستن" هەیە بە مانای "قسە پێ نەهێشتن، پەکخستن لە وەڵام دانەوە". وەک لە ماناکان دەردەکەوێ، وشەکە ئاماژە بە "بێدەنگی" دەکا، واتا "رامڵ بوو" مانا بنەرەتییەکەی دەبێتە "بێدەنگ بوو، قسەی پێ نەما"، یان "رامڵ خستن" دەبێتە "بێدەنگی کرد، قسەی پێ نەهێشت". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رام ram "دەستەمۆ، کەوی" و ↑ئارام aram "بێجووڵە، بێدەنگ".

[تێبینی: مانای ئەسڵی "ئارام" لە جووڵەکەوتنە، بەڵام دواتر مانای "بێدەنگ بوون"یش هاتووەتە سەری، چونکوو پێوەندی نیزیک لەتێوان ئەو دوو چەمکەدا هەیە. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "کڕ و کپ". ئەم دوو وشەیەش دە ریشەدا ئاماژە دەکەن بە "لە دەست دانی جووڵە و بزاڤ"، بەڵام پاشان مانای "بێدەنگ بوون"یش پەیدا بووە].

**رامووسین ramusîn** [ *rāmūsīn* ] - "ماچ کردن": را + مووسین ra + musîn. لەوە ناچێ پێوەندی بە "بوسیدن"ی فارسییەوە هەبێ. خزمە دەگەڵ ↑ماچ maç و ↑مووچ muç. دە زمانی فارسیدا موس موس کردن mus mus kerden "دەموچاو لێکخشاندن" هەیە کە دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**رامیاری ramyarî** [ *rāmyārī* ] - "سیاسەت": وشەی سیاسەت دە زمانە ئەورووپییەکاندا، واتا policy، لە زمانی یۆنانی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ئاپۆڕە، گەل". لەو باوەڕەدام دە زمانی کوردمادیشدا هەوڵ دراوە بەم پێودانە وشەی رامیاری وەک هاوبەرێک بۆ سیاسەت دروست بکرێ. لەم وشەیەدا رام -ram وێرای پاشگرێک بەکار هاتووە. ئەم بنەوشەیە یان لە ↑رەوە rewe [رمە reme (P.)] بە مانای "پۆل، ئاپۆرە" وەرگیراوە، یانیش پێوەندی هەیە بە ریشەی رەم -rem "رەش" ومەبەست لێرەدا "رەشایی" بە مانای ئاپۆڕەی گەلە [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "رەشەکوژی" بە واتای کوشتنی بەربڵاوی خەڵک یان "رەشبگیری"]. ئەم ریشەیە دە وشەی ↑رەمەکی remekî دا بەدی دەکەین.

**ران1** ran [ *rān* ] - "کۆمەڵێک مەڕ وماڵات":

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانی ناویندا netrün "رەوە، گەلە، ران" هەبووە کە هاوپێوەندە دەگەڵ trennen "جیا کردنەوە، دابرین" و خزمیشە دەگەڵ "درین"ی کوردمادی. مەبەست لە trünne دە ئەسڵدا "بەش، لەت

، کەرت، دەستە (یەکی جیا لە وانی دیکە)" بووە. دیسان هەر لە زمانی ئەڵمانیدا Rotte "دەستە، رەوە، گەلە" هەیە کە دەچێتەوە سەر rumpere (L.) "دادڕین، تێکشکاندن". وشەیەکی دیکەش دە زمانی ئەڵمانیدا هەر بەو مانایانەی سەرەوە هەیە کە schar ە و دەچێتەوە سەر scheren "بڕین، دادڕین، لەت کردن"].

بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە دەتیوان دوو چەمکی "رەوە، گەلە، ران" و "لەت کردن، بڕین و جیا کردنەوە" دەبێ دە زمانی کوردمادیشدا وشەی ران ran بە مانای "بەش، دەستە، گەڵە" پێوەست بێ بە وشەی ↑ڕنین rınîn کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پچڕین، لەت کردن، لێکردنەوە". لەم تێڕوانینەوە "ران" دەبێتە ئەو گاگەل یان مێگەلەی [ئەو بەشە ئاژەڵەی] کە جیایە لە بەشەکانی دیکە. ران دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە مانایەکی دیکەش بە کار دێ، واتا بە مانای "ئەندامێکی لەش، لە سمتەوە تا ئەژنۆ". ئەم وشەیەش دەگەڵ ران بەو مانایەی پێشتر دە بنەڕەتدا هەریەکە و ئاماژە دەکاتە مانای "لەت کردن، جیا کردنەوە، دابڕان ". ران ئەو بەشە یان ئەو شوێنەی لەشە کە بە هۆیەوە لەش "لەت" دەبێ و دابەش دەبێتە سەر دوو پارچە واتا دوو لاق.

**ران2 ran 2** [ *rān* ] - "لە سمتەوە تا ئەژنۆ": ران rān (P.)، خزمە دەگەڵ ↑ران[1] ran بە مانای "گەلە، رەوە، دەستە".

**رانک rank** [ *rānk* ] - "پانتۆڵی لە بووزوو": رانە rane ش دەگوترێ. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ rokk (OF.)، rocc (OE.)، Rock (G.)، وشە ژێرمەنییەکە مانای جۆراجۆر دەبەخشێ، هەر لە "دامەن"ی ژنانەوە بگرە تا چاکەت و رووپۆشی پیاوانە.

**رانکە ranke** [ *rānka* ] - "تیسکی دەوری گوانی ئاژەڵ کە لەبەر دڕک برینگی ناکەن": دەشێ پێوەندی بە ران[2] ran ەوە هەبێ.

**رانین ranîn** [ *rānīn* ] - "ئاژۆتن، لێخوڕین": راندن rāndan (P.)، خزمە دەگەڵ rennen (G.)، rennen (Nl.)، ærnan (OE.)، ränna (Sw.) "راکردن، هەڵاتن". مانای بنەڕەتی ئەم وشانە بریتی بووە لە "وە هەڵاتن خستن، وە جووڵە خستن، ئاژۆتن، راوەدوو نان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی لەوانە ↑را[3] ra کردن.

**راو raw** [ *rāw* ] - "تێچیر گرتن": راڤ rav یش دەگوترێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Raub (G.)، roub (OG.)، roof (Nl.)، rēaf (OE.) "تێچیر"، Raubtier (G.) "ئاژەڵی راوکەر"، Raubvogel (G.) "باڵداری راوکەر"، rauben (G.)، roubōn (OG.) "بە زۆر هەستاندن، پچڕینەوە"، rēafian (OE.) "رفاندن، پچڕینەوە، راوەرووت کردن"، raufa (OIs.) "پچڕپچڕ کردن، لەت و پەت کردن"، Räuber (G.) "چەتە" [راوەرووتکەر]. وەک لە مانای وشە ژێرمەنییەکاندا دەبینرێ، وشەکە لەپاڵ مانای "تێچیر گرتن" مانای "تاڵان کردن و رووت کردن"یش دەدا. ئەم مانایە دە زمانی کوردمادیشدا پارێزراوە، کاتێک دەگوترێ راوەرووت rawerut کردن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ رەوەت rewet یان ↑رەبەت rebet "بۆسەی راوچی" و دواتر دەگەڵ ↑*رفاندن rıfandın*، ↑رەویتن rewîtın "تاشین، هەڵکەندن"، ↑رووت rut [جلک داکەنراو، جلک داڕنراو] و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە دەکەن بە چەمکی "(دا) پچڕین، دارنین، لەت و کوت کردن، لێکردنەوە".

[تێبینی: مەبەست لە "راو" کردن دەبێ سەرەتا گرتنێکی خێرا یان داپچڕینێکی کوتوپڕ بووبێ، هەروەک چۆن ئەم حاڵەتە لە وشەی "رفاندن" یشدا بەدی دەکرێ. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها راونان raw nanهەیە بە مانای "رەپێ نان". لەم بارەوە دەتوانین بەرهەڤی بکەین دەگەڵ زمانی ئەڵمانی. دە ئەڵمانیدا jagen هەم بە مانای "راو کردن" دێ و هەمیش بە مانای "راو نان"].

**راواندن rawandın** [ *rāwāndın* ] - "وڕێنە کردن": هەروەها راوان rawan هەیە بە مانای "وڕێنە کردن". خزمە دەگەڵ Rune (G.) "کۆنترین خەتتی ژێرمەنی" [دەبنەڕەتدا: رەمزی جادوویی]، rūna (OG.)، rūn

(.OIs)، rūn (.OE) "ڕاز، ڕەمز، نەهێنی، تەگبیری نەهێنی"، rēonian (.OE) "بەدزییەوە سرتە کردن، بۆڵە کردن، سکاڵا کردن"، rumor (.L) "دەنگۆ"، rienrn (.MG) "پرتاندن، سکاڵا کردن"، rauen (.G)، rūnen (.MNl)، rūniyan (.OE) "بە دزییەوە قسە کردن، چپاندن، سرت و خورت کردن لە دژی کەسێک"، ryna (.OIs) "مەحرەمانە پێکەوە ئاخەفین، ڕەمزی جادوویی بەکار هێنان" [نووشتە لێکردن؟].

**راور rawır** [ rāwır ] - "ئاژەڵی دڕندە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ڕاو raw، سەر بە ریشەیەک بە مانای "پچڕین، لێکردنەوە".

2- لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑لاور lawır "ئاژەڵی کێوی، ئاژەڵی دڕندە".

**ڕاوەک rawek** [ rāwak ] - "پاڵوێنە": ڕاوک rawık و ڕاڤەک ravek یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ڕەواق rewaq "هەنگوینی پاڵاوتە"، ↑ڕیپۆق *rîpoq* "چڵکی چاو"، ↑ڕیڤن rîvın "چڵکن" و هەروەها ↑ڕیڤۆک rîvok "شەمەترێلکە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەڵاندن، دڵۆپاندن، تکانەوە"

**ڕاوێچکە1 raweçke 1** [ rāweçka ] - "بیر کردنەوە لە شتێک": ڕاوێشکە rawêşke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ڕاوێژ rawej.

**ڕاوێچکە2 raweçke 2** [ rāweçka ] - "لەم سەر بۆ ئەو سەر هاتوچۆ کردن": هەروەها ↑ڕاپیتە rapîte هەیە بە مانای "هاتوچۆی بەپەلەپەل و ئەم سەر ئەو سەر کردن". دەچنەوە سەر ↑ڕۆیشتن royıştın [رفتن raftan (.P)].

**ڕاوێژ rawej** [ rāwež ] - "1- شیمانە، حەدس و گومان 2- تەگبیر 3- دەراوی دەم [ڕاوێژی خۆشە کە قسە دەکا]": هەروەها ↑ڕاوێچکە raweçke و ڕاوێشکە rawêşke هەن بە مانای "بیر کردنەوە لە شتێک" و ↑ڕوێز roez "گومان، دوودڵی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشە کە لەژێر ↑ڕاشەن raşen دا شی کراونەوە. مانای سێهەمی ڕاوێژ نیزیکە لە مانای reden (.G) "قسە کردن، ئاخافتن" و read (.E) "خوێندنەوە" کە ئەوانیش هەر پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

**ڕاهشتن rahıştın** [ rāhıštın ] - "پەلامار بردن" [ڕاهشتە من]. خزمە دەگەڵ ↑ڕاهێژاندن rahejandın "لەپڕ و نەکاو بەسەردا دان".

**ڕاهێژاندن rahejandın** [ rāhežāndın ] - "لەپڕ و نەکاو بەسەردادان": ڕا + هێژاندن ra + hejandın. "هێژاندن" خزمە دەگەڵ ↑غیژ ĝîj [هەڵۆ غیژی جوجکان بوو].

**ڕایشان rayşan** [ rāyšān ] - "لەبەرنووسینەوە". ئەم وشەیە و ڕایش rayş "لەبەر نووسراوە" و ↑ڕاچێتە raçete "نوسخەی پزیشک" هاوپێوەندن بە ↑ڕیش rîş "ڕدێن".

**ڕایە raye** [ rāya ] - "حەد" [ڕایەم ناکەوێ واتا حەدم نییە، "ڕێم ناکەوی" ش دەگوترێ]. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ Reihe (.G) و ریز rîz ی کوردمادی کە هەردووکیان هاومانا و هاوریشەن و بە مانای "سەف، ڕەدیف" بەکار دێن. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑ڕێز rez یش بە مانای "ئیحترام" لەم وشەوە سەرچاوەی گرتووە و مەبەست سەرەتا جێگرتن لە "ڕیز"ی پێشەوەدا بووە و ئەم جێگرتنە وەک خاوەنی پلە و پایە لەبەرچاو گیراوە. هەر بەم جۆرش مەبەست لە ڕایە نەبوون [حەد نەبوون] ئەوەبووە کە مرۆڤ لەو ڕیزەدا نییە واتا لەو پلە و پایە و ڕادەیەدا نییە فڵانە کار بکا. وشەی ↑ڕایەدار rayedar بە مانای " کاربەدەست " هەرلێرەوە هاتووە و مەبەست ئەو کەسەیە کە خاوەنی پلەو پایەی دەولەتییە.

**ڕایەدار rayedar** [ rāyadār ] - " کاربەدەست، خاوەن پل و پایە، خاوەن دەرەجە": ↑ڕایە raye.

**ڕبازە rıbaze** [ rıbāza ] - ↑ڕەپستە repıste.

**ڕبساندن rıbsandın** [ rıbsāndın ] - "ئاو دانی کێڵگە بەر لە چاندنی": بڕوانە ↑ڕەپستە repıste. وشەی "ڕەپستە" دەشێ لە کردارێکەوە هاتبێ کە شێوەکەی *ڕەپستن repıstın** بووە، ئەمەش شێوەی کۆنتری ڕبساندن rıbsandın بووە، بۆ وێنە هەر وەک "تاختن"ی فارسی و "تەقاندن" [تێتەقاندن] دە کوردمادیدا.

رپان **rıpan** [ *rıpān* ] - "روان، شین بوونی گیا": دەشێ شێوەی کۆنتری "روان" بێ [ rıpan ← rıwan]، لەوانەیەخزم بێ دەگەڵ ↑رەپ rep "بەرز، هەستاو"، شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑لیفاندن lîfandın "بەرز بوون و هەڵدانی گیا" و ↑لافاو lafaw [لاف + ئاو واتا "ئاو هەستان"].

رپڵاندن **rıplandın** [ *rıplāndın* ] - "هەڵپەرتاوتنی لق و پۆپی دار": شێوەیەکی دیکە لە ↑رۆپلاندن roplandın .

رپن **rıpın** [ *rıpın* ] - "پنج": خزمە دەگەڵ ↑رپان rıpan "شین بوون".

رپنین **rıpnîn** [ *rıpnīn* ] - "پەڵە دان، بارانی زۆر": رپنی rıpnî یش بە مانای "بارانی زۆر" دێ. خزمە دەگەڵ ↑رەپستە repıste.

رت **rıt** - "قسەی بێزاری، تووک": هەروەها رتان rıtan هەیە بە مانای "تووک لێکردن" و رتاندن rıtandın "جتێو پێدان". خزمە دەگەڵ reden (.G) "قسە کردن"، read (.E) "خوێندنەوە" [دە بنەڕەتدا: بە دزییەوە قسە کردن، سرتە کردن". ئەم وشە ژێرمەنییانە پێوەندییان بە ژمارەیەک وشەوە هەیە کە لەژێر ↑راشەن raşen دا شی کراونەوە.

رتاندن **rıtandın** [ *rıtāndın* ] - "جتێو پێدان": خزمە دەگەڵ ↑رت rıt "قسەی بێزاری، تووک".

رجرجان **rıcrıcan** [ *rıjrıjān* ] - "شین بوونەوەی پێست لە وێکەوتنەوە": رجرجین rıcrıcîn و رجرجیان rıcrıcyan یش دەگوترێن. دەشێ پێوەندی بە ↑رەش reş ەوە هەبێ و دە ئەسڵدا بە مانای رەش بوون، رەش بوونەوە بێ.

[تێبینی: سەرنج بدە کە لێرەدا وشەکە بە دووبارە کردنەوەی بنەوشەی رج -rıc دروست کراوە و ئەمەش وشەکە دەخاتە دۆخی جەخت کردنەوە. دە شێوەزاری سەروودا نموونەی لەم چەشنە زۆرە].

رجڤین [ *rıjvīn* ] - "لەرزین": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ regen (.G) "لەرزاندن، جووڵاندن، هەژاندن"، Reck(.G) "دارێک کە دوو پەت لەم سەر و لەو سەری بەستراوە و هەڵواسراوە، بۆ هەڵنیشتنی پەلەوەر یان شتی دیکە". Aufregung (.G) دە زمانی ئەڵمانیدا مانای "هورووژان، هەژانی دەروونی" دەبەخشێ. ریشەی ئەو وشە ژێرمەنییانە دیاری نەکراوە.

رجە **rıce** [ *rıja* ] - "تەنافی جلکان": خزمە دەگەڵ ↑ریس rîs و↑ گوریس gurîs.

رچ **rıç** [ *rıč* ] - "بەستەڵەک، مەیین": خزمە دەگەڵ ↑رەق req.

رچە **rıçe** [ *rıča* ] - "ریز": باوە دەڵێن "میروولە رچەیان بەستووە". وەک ئاشکرایە "رچە" لێرەدا ناتوانێ بە مانای "رێچکە" بێ، بەڵکوو مەبەست ریز بەستن و بە ریز رۆیشتنە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ریز rîz. وشەی ↑رژە reje کە دە زمانی فارسیدا بۆ مارشی سوپایی بەکاری دێنن، لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

رچیان **rıçyan** [ *rıčyān* ] - "بەستن، مەیین، توند بوون": رچین rıçîn و رسیان ırsyan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رەق *req* و ↑رژد rıjd.

ردێن **rıden** [ *rıden* ] - "ریش": ↑رندێن rınden یش دەگوترێ و ئەمە دەبێ شێوەی کۆنتری وشەکە بووبێ. خزمە دەگەڵ کرداری ↑رنین rınîn "کراندن، تاشین، لێکردنەوە".

[تێبینی: وشەی ریش rîş کە دە فارسیدا و تا رادەیەک دە کوردمادیشدا بە مانای ردێن دێ، دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە کە ئەویش ماناکانی "رنین و پچرین و درین" لە خۆ دەگرێ. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی rasieren (.G) کە بە مانای "ردێن تاشین" دێ، دەچێتەوە سەر radare (.L) بە مانای "رنین، کڕاندن، تاشین". وشەی shave (.E) "ردێن تاشین" دە بنەڕەتدا بە مانای "ساوینەوە و کڕاندنەوە"یە و خزمیشە دەگەڵ وشەی کوردمادی ساوین/ سوونەوە sawîn /sun(ewe) . ئەم پێوەندییانەی سەرەوە بە باشی دەری دەخەن کە وشەی ردێن پێوەندی بە چەمکەکانی رنین و بڕین و تاشین و کڕاندنەوە هەیە ].

رز **rız** [ *rız* ] - "زنجیری باریک": خزمە دەگەڵ ↑ریز rîz، واتا ئاڵقەی بەریزکراو.

رزدە **rızde** [ *rızda* ] - "ئاڵقەرێزی دەرگا": خزمە دەگەڵ ↑ریز rîz یاخود رێز rez، واتا ئاڵقەی بەریزکراو [رێزکراو]. وشەی "رێز" دە وشەی ئاڵقەرێز alqerez یشدا دەبینین.

رزک **rızık** - "لووت پژان": هەروەها رزکیان rızkîyan هەیە بە مانای "لووت پژان". دەچێتەوە سەر رژان rıjan و ↑رشتن rıştın.

رزگ **rızıg** [ *rızıg* ] - "سەف": ↑ریز rîz.

رزل **rızıl** [ *rızıl* ] - "ریزە، چینە": ↑ریز rîz.

رزگار **rızgar** [ *rızgār* ] - "دەربازبوو": رستگار rastegār (P.). وشەکە دە زمانی فارسیدا هەروەها مانای "خۆشبەخت، بەختەوەر" دەگەیەنێ، ئەمەش زۆرتر دە چوارچێوێەکی دینیدا و رەنگە مەبەست رزگار بوون لە گوناح یان ئێش و ئازاری ژیانی سەر هەرد و شاد بوون بە خۆشییەکانی ئەو دنیا بێ. دە فارسیدا چاوگی وشەکە دەبێتە rastan (P.) "رزگار بوون، ئازاد بوون".

1- لە لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ los (G.)، loos (E.)، lisan (OE.)، losen (OG.) "ئازاد کردن، بەر دان، رەها کردن". شیاوی باسە دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ چەمکی "رستگاری"ی فارسی وشەی Erlösung (G.) بەکاردێ و ئەمەش دەچێتەوە سەر ئەو وشانەی سەرەوە.

2- - لە لایەکی دیکەوە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑رەها reha "ئازاد، بەردراو".

رزندی **rızındî** [ *rızındī* ] - "لوولە": لەوانەیە پێوەندی بە:

1- rotundus (L.) "خڕ".

2- Reuse (G.) "ئامرازێکی ماسیگری"، سەر بە ریشەی ژێرمەنی *rusjon *(Grm.)* و خزمە دەگەڵ Rohr (G.) "لوولە، قامیش".

رزین **rızîn** [ *rızīn* ] - "1- بۆگەن بوون، لەبەر یەک هەڵوەشان":

1- جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ (ver)rotten (G.)، rotten (MG.)، rot (E.)، rutten (Sw.)، rozen (OG.) و "رزین، گەنین" و roz (OG.) "زۆر کوڵیو یان زۆرگەییو، هەلابەهەلا بووگ" و هەروەها rösten (G.) "رزاندن لە رێی خووساندنەوە، ژەنگ هێنان". ریشەی هیندوئەوروویی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑رووزە ruze "کەچ و کرووچ و ژنگاوی".

2- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑ریش rîş و ریشاڵ rîşal و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە دڕاویی و شڕۆڵی دەکەن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ riß (G.) "درز، قەڵش، دڕاوی" کە ئەویش خزمە دەگەڵ "ریش"ی کوردمادی.

رژان **rıjan** [ *rıžān* ] - دەچێتەوە سەر ↑رشتن rıştın.

رژد **rıjd** [ *rıžd* ] - "1-رەق، سەخت 2- چرووک، دەستقووچاو": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ rigidus (L.) "رەق، سەخت".

رسان **rısan** [ *rısān* ] - "راپسکان، رەها بوون": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەرسان verısan یان ڤەرسین verısîn]. هەروەها ڤەرساندن verısandın هەیە بە مانای "راپسکاندن، رەها کردن". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑رزگارrızgar. بنەوشەکە رس -rıs یان رزە -rız.

رستن **rıstın** - "با دانی خوری و لۆکە و کردنی بە بەن": دە زمانی ئەڵمانیدا Riste (G.) هەیە بە مانای "دەستەریشاڵی لێکهاڵاو". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی هیندوئەوروویی < **(IE.) **uer- wer- ,** "با دان، سووڕان". دە زمانە خزمەکاندا هێندێک وشە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەک würgen (G.)، wyrgan (OE.) "رێککوشین"، varjati (OIn.) "با دەداتەوە، دەسووڕێ"، verpti (Lit.) "چنین، هۆنینەوە"، versti (Lit.) "با دان" و هتد. وشەی "رستن"یش دەبێ پێوەندی بەم خێزانەوە هەبێ. دە وشە کوردمادییەکەدا دەبێ فۆتیمی سەرەتای ریشەکە سوابێتەوە. وشەی ↑گوریس gurîs ئەم بۆچوونە

زۆرتر پشتراست دەکا. گوریس سەرەتا وەریس werîs یان verîs بووە و تا ئێستاش بەم شێوەیە دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا بەکار دێ. دە وشەی "گوریس"دا فۆنێمی v / w ی کۆن گۆڕدراوە بە g [ئەم گۆڕانە فۆنۆلۆژیکە، واتا گۆڕانی v بە g دە هێندێک وشەی کوردمادی و زورتر دە وشەی فارسیدا بەدی دەکرێ وەک "گرسنە" (پێشتر: ورسنە، دە کوردمادیدا برسی، ورسی) یان "وەژاردن/ بژاردن" کە دە فارسیدا دەبێتە "گزیدن" (هەڵبژاردن و برگزیدن) و چەندین نموونەی دیکە]. دە زمانی لاتیندا vers "بەیتەهۆنراوە" لە versare (L.) "با دان، سووڕان" وەرگیراوە و دە زمانی کوردمادیشدا وشەی "رستە" دەچێتەوە سەر "رستن". بەم جۆرە "رستن" دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکەی وەک ↑وڕ wır، ↑فرفرە fırfıre، ↑وڕێنە wırene، ↑وەرانین weranîn، ↑وەردێنە werdene و هتد.

**رستە rıste** [ *rısta* ] - "چەند وشەیەک بەسەریەکەوە مانایەک ببەخشن": ↑رستن rıstın.

**رستی rıstî** [ *rıstī* ] - "هێم، بناخە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑رەگ reg.

2- یان خزم بێ دەگەڵ ↑ریشە rîşe.

**رسق rısıq** - "بەهرە وبژێو [ی رۆژانە]": وشەکە دە کۆندا روزیک ruzîk بووە، واتا لە "روز" [رۆژ] هەوە هاتووەو دە زمانی عەرەبیدا بووەتە رسق risq (Arb) و پاشان بە شێوەی عەرەبێنراو هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و فارسی.

**رسکان rıskan** [ *rıskān* ] - "دروست بوون، بەدی هاتن، سەر هەڵدان":

1- لە لایەکەوە بۆی هەیە پێوەندی هەبێ بە رەخسان rexsan و ↑رەخساندن rexsandın "دروست بوون، ساز بوون" و لێرەوە ببێتە خزم دەگەڵ ↑راست rast.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین دەگەڵ ↑راسان rasan بەرهەڤی بکەین کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک کە ماناکانی "بەرز بوونەوە، هەڵدان، چوونەسەر" دەگرێتە خۆ. risa (OIs.) کە خزمە دەگەڵ راسان، هەم مانای "راسان"ی بەخشیوە و هەمیش بە مانای"دروست بوون، رسکان" بەکارهاتووە.

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "بەرز بوونەوە" و "پەیدا بوون" ئاشکرایە و دە زمانی کوردمادیشدا ئەم پێوەندییە بەم شێوانەی خوارەوە دەردەکەوێ: "قوت" [قیت] واتای بەرز دەدا و قوت بوونەوە واتای پەیدا بوون. "سەر هەڵدان" هەردوو مانای بەرز بوونەوە و پەیدا بوون دەگەیەنێ. "گووران" دە بنەڕەتدا مانای "شین بوون و سەرهەڵدان و فراژی بوون" دەگەیەنێ و دە هەمان کاتدا مانای "پەیدا بوون"یش دەبەخشێ].

**رسکین rıskîn** [ *rıskīn* ] - "بەر بوونی خوێنی لووت": ریزکین rîzkîn یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑راسان[1] rasan و دواجار خزمە دەگەڵ ↑*رشتن rıştın*.

**رسوا rıswa** [ *rıswā* ] - "ئابڕوو چوون": ریسوا rîswa ش دەگوترێ. rosvā (P.). دە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە دوو کەرتی روو + سوا ru + s(u)wa. کەرتی "سوا" هەمان ↑سیا sîya یە و بەم جۆرە تێکرای وشەکە مانای "ڕوورەش" دەدا.

**رسیان rısyan** [ *rısyān* ] - "هەڵدێران": خزمە دەگەڵ ↑رووخان ruxan.

**رشاندن rışandın** [ *rışāndın* ] - "پرژاندن": رەقشاندن reqşandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رشتن rıştın سەر بە ریشەیەک بە مانای "جاری بوون".

**رشانەوە rışan(ewe)** [ *rišānawa* ] - "هێنانەوەی شتی خواردراو":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑رشتن rıştın سەر بە ریشەیەک بە مانای "جاری بوون".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ئارۆشک aroşk "پشمین".

**رشتن rıştın** [ *rištın* ] - "جاری کردن": ریختن rīxtan (P.). بنەی کردارەکە دە زمانی کوردمادیدا رش -rış و رێژ -rej ە، دە زمانی فارسیدا ریخ -rīx و ریز -rīz ە. بنەوشەکە دە چەندین وشەی کوردمادی

دیکەدا دەردەکەوێ، وەک ↑رشاندن rışandın "پرژاندن"، ↑رێژنە[باران] rejne، رێژنگ rêjıng "رەشاش"، ↑رشێنە rışêne "وردەباران"، ↑رەشیش reşîş "نەرمەباران".

1- دە زمانی ئەڵمانیدا rieseln (G.) "بارینی ورد و لەسەرەخۆ" هەیە کە ریشەکەی دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *reu-, *re- >** "بزووتن [ی توند و خێرا]". دە زمانی کوردمادیشدا ↑راسان rasan هەیە کە بە مانای "لووت پژان" [رژانی خوێنی لووت] دێ. دە زمانی هیندی کۆندا rasa-h (OIn.) "تراو، خۆشاو" و arşati (OIn.) "جاری دەبێ، دەرژێ" هەن کە هەر لە هەمان ریشەوە دێن. ئەم وشانەی سەرەوە دەبێ گشتیان سەر بە خێزانێک بن و بچنەوە سەر ریشەی باسکراو. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی دیکە پێوەندییان بەم خێزانەوە هەیە وەک ↑ریتکە rîtke "هەوەڵ شیری تیکەڵ بە ژەک، هەویری شل" و ↑ریچاڵ rîçal "شیرەمەنی" و هتد. دە زمانی عەرەبیشدا وشەی رشا raššā (Arb.) "باری" و رشاش raššāš (Arb.) "موسەلسەل، گوللەبارێن" هەیە و ئەمانەش پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە ئاشکرایە. وێ دەچێ ئەم وشانە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابن.

2- لە لایەکی دیکەوە وشەکە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Regen (G.) "باران"، regen (OG.)، rigan (Got.)، rain (E.)، regen (Sw.) "بارین" [رژان لە حەواوە؟]. ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە.

**رشتە rışte** *[ rışta ]* - "بەن، دەزوو": rešte (P.)، خزمە دەگەڵ ↑رستن rıstın. دە زمانی کوردمادیدا ↑هەرشتە herışte ش هەیە کە لە هەویر دروست دەکرێ و وەک بەن دەچێ.

**رشک rışık** *[ rišık ]* - "گەرای ئەسپێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رێز(ە) reze "ورد، گچکە".

**رشێنە rışêne** *[ rišena ]* - "وردەباران": ↑رشتن rıştın.

**رفاندن rıfandın** *[ rıfāndın ]* - "پڕ پێداگردن و بردن": هاوریشەیە دەگەڵ raffen (G.) "هەستاندنی خێرا و بەپەلە" و هەروەها دەگەڵ rauben (G.) "تالان کردن، رفاندن"، rapare (L.) بە هەمان مانا و rapid "خێرا و بەپەلە"، سەر بە ریشەی **( IE. ) *reu(p)- >** "داپچرین، دارنین، لێکردنەوە".

[تێبینی: وەک دەبیندرێ وشەی "رفاندن" جیایە لە "فراندن". بەداخەوە زۆرجار بەهەڵە لەجیاتی "رفاندن" دەگوترێ "فڕاندن". دروستەکەی ئەوەیە کە شتێک برفیندرێ نەک بفرێندرێ، چونکوو هەر شتێک باڵی نەبێ ناتوانرێ بفرێندرێ!].

**رفت rıft** - "بارانی بە تەوژم": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑رەپستە repıste "ئاوەنیا، زەوی ئاودراوی بەر لە چاندن".

**رفۆک rıfok** - "چەنگاڵی باڵداری گۆشتخۆر": خزمە دەگەڵ ↑رفاندن rıfandın و ↑راو raw.

**رفە rıfe** *[ rıfa ]* - "*دارێکی* کون کونە لە حەسیرچنیندا بە کاری دەبەن": خزمە دەگەڵ raft (E.) "دار، ئاڵوودار، کەڵەک (بۆ پەرینەوە لە چەم)"، rāvo (OG.) "ئاڵوودار"، ráfr (ON.) "میچ". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە ساخ نەکراوەتەوە.

**رفێدە rıfede** *[ rıfeda ]* - "دۆشەگەڵەی نان پێوەدان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رەپاندن repandın.

**رق rıq** - "کینە، توورەیی": رک rık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Rache (G.) "تۆڵە"، rächen (G.)، wrecan (OE.) "تۆڵە کردنەوە"، سەر بە ریشەی **(IE.) *u(e)reg- >** "لێدان، پاڵنان، راونان".

[تێبینی: دە زمانی فەرانسەییدا rage (Fr.) "رق، توورەیی"، بەڵام ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر rabere (L.) "رق هەستان، توورە بوون". لەوە ناچێ وشە کوردییەکە پێوەندی بەم وشەوە هەبێ، چونکوو ئەگەر پێوەندییەکی وەها لە ئارادا بایە، دەبوو شێوەی وشەکە زۆرتر لە وشە لاتینییەکە چووبایە].

**رک1 rık** - "هەورازی سەخت": خزمە دەگەڵ ↑رژد rıjd.

**رک2 rık** - "پەتی ملی بەرخ و گوێلک": شێوەیەکی دیکە لە رس rıs یان ↑ریس rîs.

رکە **rıke** - "قەفەس، بێرکم": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Reuse (G.)، rusia (OG.) "ئامرازێکی ماسیگری"، جۆرێک قەفەس بووە کە بە تەختە و تێل و شووڵ دروست کراوە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑رزندی rızındî "لوولە".

رکێف **rıkef** [ *rıkef* ] - "ئاوزەنگی": رکاب rekāb (P.) > رکب *rakaba (Arb.)*.

رمان **rıman** [ *rımān* ] - "رووخان": ↑هەرافتن heraftın یش دەگوترێ [he-raftın]. ئەم وشانە ئاماژە بە بزاوت و جووڵاتێکی خێرا دەکەن و خزمن دەگەڵ ↑رەوین rewîn، رمیدن ramīdan (P.) "دەرپەڕین (بەتایبەتی بۆ ئاژەڵ)" و هەروەها دواتر دەبنە خزم دەگەڵ رەفتن raftan (P.) و ↑رۆیشتن royıştın "هەنگاو نان". هەروەها ↑رەپ² rep هەیە [رەپەرەپ] و ↑رەپێڵە repele "کوێرەرێ" کە پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ:

1- ↑را ra کردن، سەر بە ریشەی *(IE.) *reu-, *re-, *ere- >* "بزووتن".

2- laufen (G.)، (h)loufan (OG.)، leap (E.)، löpa (Sw.) "را کردن، باز دان". دە زمانی ئەمڕۆی ئەڵمانیدا مانای "رۆیشتن، بزوان"یش دەدا. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. لەم بارەوە هەروەها بڕوانە ↑لوان luwan "1- روویین 2- دەست دان، شیان".

رمب **rımb** [ *rımb* ] - "تیزە": خزمە دەگەڵ rambh-a (OIn.) "داردەست"، ramtis (Lit.) "کاریتە، کۆڵەکە". لەم تیڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رەوە³ rewe "داری گەزۆ تەکاندن".

رمبە **rımb(b)e** [ *rımba* ] - "دەنگی بە ئەرزدا کەوتنی شت": هەڵی سەنگینە دەگەڵ Rummeln (G.)، rumble (E.) "رمبە لێ هاتن، رمبە رمب کردن". وشەکە لە بنچینە دا لاسا کردنەوەی دەنگە.

رمڵ **rımıl** [ *rımıl* ] - "تەمی سەرچاو، رەشکەو پێشکە کردنی چاو": بنەی وشەکە واتا -rım دە وشەی ↑رەمەکی remekî شدا دەبینرێ و مانای "رەش" دەدا. هەروەها بەشێوەیەکی دیکە دە وشەی ↑راڤ2 rav دا دەبینرێ بە مانای "1- پەڵەی رەش لەسەر پێست 2- پەڵەی دەموچاوی ژنی سکپڕ، ماڵە".

رموودە **rımude** [ *rımūda* ] - "ئاڵوودە، هۆگر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رام ram. لەوانەیە سەرەتا مەبەست لە رموودە، "رام کراو" بووبێ و بۆ ئاژەڵی هۆگری مرۆڤ بەکارهێنرابێ. یان لەوانەیە رموودە کەسێک بێ کە بەو شتەی پێی ئاڵوودەیە، ئارام دەبێتەوە. "ئارام" خزمە دەگەڵ "رام".

رمێن **rımen** [ *rımen* ] - "برەو": وشەی "برەو" دەبێ لە بنەوشەی رەو- دروست کرابێ [ بە + رەو] و مەبەست ئەوەیە کە شتێک بەباشی دەچێتە [دەڕواتە] ناو خەڵکەوە. شیاوی باسە کە وشەی عەڕەبی "رواج" دەشێ لە وشەیەکی کۆنی کورمادی وەرگیرابێ. ئەم وشەیە دەتوانێ "رەوەک، رەواش [رەوەشتن ← رۆیشتن]؟" بووبێ و دە زمانی عەڕەبیدا کرابێ بە رەواج. وشەی "رمێن" دەشێ لە "رەوین rewîn" وەرگیرابێ کە شێوەیەکی کۆنترە لە ↑رۆیین royîn.

رند **rınd** - "جوان": رند rend (P.) "مرۆڤی ژیر و زانا و زیرەک". دەتوانین هەڵیسەنگینین دەگەڵ rank (G.) و (Nl.) "باریک، ناسک"، ranc (OE.) "رێک و راست، سەربەرز، ژیر و زیرەک"، rank (Sw.) "باریک، شلک". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ ↑راست rast.

رندێن **rındên** [ *rınden* ] - شێوەی پێشتری ↑ردێن rıdên.

رنگ **rıng** - "هەنگوین و دۆشاوی پاڵاوتە": خزمە دەگەڵ rein (G.)، (h)reini (OG.)، hrainis (Got.)، hrēna (OF.) "پاک، پاڵاوتە، بێگەرد"، سەر بە ریشەی *( IE. ) *(s)krei- >* "جیا کردنەوە، پاڵاوتن، دابێژتن". وشەکانی cribrum (L.) و criathar (OIr.) "بێژینگ، پاڵوێنە" لەم ریشەوە هاتوون.

رنگان **rıngan** [ *rıngān* ] - "پاڵاوتنی دۆشاو یان هەنگوین": ↑رنگ rıng.

رنگە **rınge** [ *rınga* ] - "ئامرازی تاشینی دار": رنکە rınke ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رنین rınîn "کڕاندن، رووشاندن". دە فارسیدا: رندە rande (P.).

رنوو **rınu** [ *rınū* ] - "بەفری هەرەس هیناو": رندوو rındu ش دەگوترێ. خزمەدەگەڵ ↑رنین rınîn.
رنوو ئەو بەفرەیە کە لە کێو "دادەندرێ"و دێتە خوار.

[تیبینی: پێوندی تیوان وشەکانی "رنوو" و "رنین" لە فەرهەنگی مامۆستا هەژار دا ئاماژەی پێ کراوە].

رنە **rıne** [ *rına* ] - "وردەباراتیک کە رەشماڵ دای دەدا": وەک دەر دەکەوێ لێرەدا تکانەوە و چۆڕانەوی ئاوی باران مەبەستە. هەر بۆیە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑رنگ rıng "هەنگوین و دۆشاوی پاڵاوتە".

[تیبینی: پێوەندی چەمکەکانی "پاڵاوتن" و "باران" لەم وشانەی خوارەوەشدا دەبینرێ: سافاندن safandın"دڵۆپاندن"، sipiti (.Serb) "بارینی نەرم" و zafa (.Pl) "هەوری بە باران"، زیپک zîpık "دڵۆپە"، ژاوە jawe "روون، پاڵاوتە"، شپین şıpîn "دادانی رێژنەباران"، ↑سەپی sepî "پاڵاوتە"].

رنین **rınîn** [ *rınīn* ] - "رووشاندن، کراندن، لێکردنەوە بە چەنگ": خزمە دەگەڵ رندیدن randīdan (.P) "کراندن" و رندە rande "رنگە، ئامێری دارتاشی". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ rend (.E)، rindan (.OE)، renda (.OF) "پچرین، لێکردنەوە"، -rándhra (.OIn) "دەرز، قەڵش، کەلێن" [وشە هیندییە کۆنەکە بەرهەڤ بکە دەگەڵ ↑رەهەند rehend و ↑رەندۆڵ rendol ی کوردمادی]. وشەی Rinde (.G) "تۆیکڵی دار" خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە و بۆیە ئاوا ناونراوە، چونکە لە دار داڕندراوە و لێکراوەتەوە. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە پێوەندییان بەم خێزانەوە هەیە وەک ↑رنوو rınû "شاپە"، رنە rıne "چنینی میوە"، رنەک rınek "قەشەو"، رندێن rındên "ریش"، رەندە rende "ئامرازی پێ رنین"، ↑رەندۆڵ rendol "ئاودڕ"، رەنک renık "پاککەرەوە"، ↑رەنگاڵ rengal "بزگوڕ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *< -rendh* (.IE)* "رنین، درین، پچرین". ئەم ریشەیە لەوانەیە خۆی شێوەیەکی پەرگرتوو بێ لە ریشەی کۆنتری *-reu** (.IE) "پچرین، لێکردنەوە".

رواڵ **ruwal** [ *ruwāl* ] - "تازەلاو، مێرمنداڵ": دەبێ پێوەندی هەبێ بە ↑رۆڵە role "فرزەند، منداڵ".

رونگ **rung** - "خوری و مووی بۆ جاری دووەم قەیچی کراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رنین *rınîn* و ↑رندێن rındên "ردێن، ریش"، سەر بە ریشەیەک بە مانای"پچرین، برین، لێکرنەوە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑رانکە ranke "تیسکی دەوری گوانی ئاژەڵ" و ↑رانک ranık "پانتۆڵی *بووزوو*".

روو **ru** [ *rū* ] - "دەموچاو": رووخسار ruxsar یش دەگوترێ. رو rū (.P)، رخ rox (.P) و رخسارroxsar (.P). بنەی وشەکە دەبێ روخ/ رووخ بووبێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ look (.E)، lōkcian (.OE)، lōkon (.OS)، loeken (.MG)، luogen (.OG) "رووانین، تیرین، چاو لێکردن". ریشە؟

رووالەت **ruwalet** [ *ruwālat* ] - "رووکار، سیما": خزمە دەگەڵ ↑روو ru.

رووان **ruwan** [ *rūwān* ] - "شین بوون، هەڵدانی گیا": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ lode (.G) "نەمام"، liotan (.Gt)، liudan (.Gt)، leodan (.OE) "شین بوون، هەڵدان"، سەر بە ریشەی *< -leudh** (.IE)* "هەڵدان".

رووانین **ruwanîn** [ *ruwānīn* ] - "تیرین، چاولێکردن":

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑روو ru.

2- لەوانەشە ئاڵوگۆڕکراوی وشەی ↑تیرین nerîn بێ [ تیرین ← نوارین ← رووانین؟].

رووبار **rubar** [ *rūbār* ] - "چەم": رود rūd (.P) و رودخانە rūdxāne (.P). بنەی وشەکە، ru(d) خزمە دەگەڵ rīde (.MG) "جۆگە"، rīth (.OS) و rīd (.OE) "جۆگە، چەم"، Rille (.G) "رەهەند، بەستێن" و rivus (.L) "جۆگە". وشەی rinnen (.G) "رەوان بوون، جاری بوون" و هاوتاکانی ئەم وشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە و گشتیان لە ریشەیەک هاتوون. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *< -re * , -reu** (.IE)* "بزووتن". دە کوردمادی سەروودا "رۆدا چوون"

roda çun بە مانای "نوقم بوون، ون بوون" بەکار دێ و لەوانەیە دە بنەڕەتدا  مانای ئەوە بووبێ کە شتێک بە ئاودا دراوە یان دە چەم کەوتووە و ئاو بردوویە و ون بووە.

**رووت rŭt** *[ rūt ]* - "رووت و قووت، بێبەرگ": لخت loxt ‹ P.›. بەم شێوانەش دەگوترێ: ریت rît رۆهت roht، رویت ruwît و رویچ ruwîç. هەروەها داڕووتاندن darûtandın و داڕووچاندن darûçandın  هەیە بە مانای "ئاوەڕووت کردن" و رووتاندنەوە rûtandınewe بە مانای "تاڵان کردن، هیچ پێ نەهێشتن". "رووت" دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "جلك لەبەر داکەنراو، جلك  لەبەر داڕنراو" بووبێ و دەچێتەوە سەر ریشەی *< ‹ IE.›* reu(p)-* "داپچرین، داڕنین، لێکردنەوە". خزمە دەگەڵ roden ‹ G.› و riuten ‹ OG.›، rooien ‹ Nl.›، ro(d)ja ‹ Sw.› "بڕینەوەی دار و هەڵکەندنی ریشەدار و کردنی زەوی جەنگەڵی بە زەوی بەرکێڵ، *رووتەن* کردن". ئەم وشە ژێرمەنییە خزمە دەگەڵ ↑رووتەن ruten یان رووییتان ruytan، ↑*ڕاو raw* "تێچیر گرتن"، راوەرووت rawerut کردن، ↑رفاندن rıfandın ، ↑رەوویتن rewîtın "تاشین، هەڵکەندن"، ↑رووشاندن rûşandın "داڕنین، کڕاندن"، ↑رەوێشتن rewêştın "لە بەرد هەڵکەندن"، ↑رەوتین rewtîn "داوەرینی گوڵ و گەڵا" [رووت بوونەوەی دار و دەوەن] و چەندین وشەی دیکە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑رەپاندن repandın "کوتان و نەرم کردنی شتی رەق".

**رووتەن ruten** *[ rūtan ]* - "زەوی بێ گیا و گژ": رووییتان ruytan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رووت rŭt "رووت و قووت، بێبەرگ". لەوانەیە وشەکە دە کۆندا چاوگ بووبێ نەك ئاوەڵناو، هەڵی سەنگینە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر "رووت"دا باس کراون.

**رووخان ruxan** *[ rūxān ]* - "رمان، بەسەر یەکدا هاتنەخوار": خزمە دەگەڵ ↑رشتن rıştın [دە فارسیدا: ریختن rīxtan ‹ P.›]. دە زمانی فارسیدا ریختن rīxtan بە مانای "رشتن" بەکار دێ و فروریختن forūrīxtan ‹ P.› بە مانای "رووخان، دارمان".

**رووزە ruze** *[ rūza ]* - "کەچ و کرووچ و ژنگاوی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رزین rızîn.

**رووشاندن rûşandın** *[ rūšāndın ]* - "رنین، خەت تێخستن، کڕاندن":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ خراشیدن xarāšīdan ‹ P.› "دارووشاندن" و ↑کڕاندن kırandın.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑رەوێشتن rewêştın "لە بەرد هەڵکەندن" و ↑*رووت rŭt*.

**رووگ rug** *[ rūg ]* - "شیرەی ترێی کوڵاو": خزمە دەگەڵ ↑رۆق roq "شۆرباو".

**روومەت rumet** *[ rūmat ]* - "1- روو، رووخسار 2- حورمەت، ئابڕوو": ↑روو + مەت ru + met. کەرتی - مەت پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە. سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "روومەت" و "حورمەت" هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "ئابڕوو" [ئاو- روو].

**روون run** *[ rūn ]* - "رووناك، تیشکدار، زەلال": روشن roušan ‹ P.›. دە زمانی کوردمادیدا پێشتر وشەکە ↑روشن roşın بووە و دەگەڕێتەوە بۆ وشەی ↑*ڕۆژ roj*. وەك دەردەکەوێ وشەی "رۆژ" دە بنچینەدا بە مانای "رووناکی" بووە و دواتر بۆ "خۆر"یش بەکار هینراوە. دە زمانی لاتیندا دا هەر ئەم رفتارە دەگەڵ "مانگ" کراوە وناوی نراوە luna ‹ L.› کە ئەمەش لە lux ‹ L.› "رووناکی"یەوە هاتووە. ئەوی لێرەدا گرنگە بەرهەڤ کردنی وشەی "روون" run دە کوردمادیدا و luna ‹ L.› یە. وشەی "روون"یش هەر وەك رۆژ roj و وشەکانی دیکەی سەرەوە دەگەڕیتەوە بۆ ریشەی *< ‹ IE.› *leuk-* "درەوشانەوە، رووناك بوون".

**رووناندن runandın** *[ rūnāndın ]* - "خاترجەم کردن": دەشێ لە ↑روون run ەوە هاتبێ و مەبەست دە بنەڕەتدا "روون کردنەوە" بووبێ.

**روونە rune** *[ rūna ]* - "دەمی باریکی تیخ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رونگ rung و ↑رنین rınîn و ژمارەیەك وشەی هاوپێوەند.

دەنگی خ / x  دە سەرەتای وشە کوردمادییەکەدا سواوەتەوە. خزمە دەگەڵ chrazzon ،(G.) kratzen، (OG.) krassen ،(Nl.) kratta ،(Sw.) charassein ،(Gr.) "رووشان، کڕاندن"، سەر بە ریشەی *** gradi- >** ***(IE.)*** "رووشاندن".

**رووی ruy** *[rūy]* - "تووکەبەر": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑رووت rut دا باس کراون، سەر بە ریشەی *** reu(p)- >** ***(IE.)*** "داپچرین، داڕنین، لێکردنەوە". جێی ئاماژەیە کە وشەکانی "ردێن"، "ریش"، "قژ" و "موو"ش دەچنەوە سەر ریشەگەلێک بە هەمان مانا.

**رۆ- ro-** - پێشگرێکە دەگەڵ هێندێک کردار دێ و ئاماژە بە لای خوارە دەکا وەک رۆنیشتن، رۆچوون، رۆکردن، رۆرژان و هتد. دە فارسیدا دەبێتە فرو frū (P.) [وەک فرورفتن، فروبردن، فروپاشیدن]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑بەر ber "خوارەوە" [بەر بوونەوە واتا کەوتن، سەر و بەر واتا سەر و خوار]. دە زمانی فارسیدا هەروەها فرود forūd (P.) هەیە بەمانای " ژێر، خوارەوە" کە دەبێ دەگەڵ وشە فارسییەکەی سەرتر خزم بێ. دەکرێ شیمانەی ئەوە بکەین کە دە زمانی کوردمادی و فارسی بەرێدا وشەیەک هەبووبێ لە چەشنی "فەروتەن" *farūtan** و لەم وشەیەوە پاشان وشە فارسییەکانی سەرەوە سەریان هەڵدابێ و ئەو کردارەش شێوەی کۆنتری هەمان کردار بێ کە دە زمانی ئەمڕۆی کوردمادیدا پێی دەڵێین ↑وەرین werîn "کەوتن، هاتنەخوار". بەگوێرەی ئەم شیمانەیە وشەی ↑خوار xuwar یش [واتا پێچەوانەی سەرەوە] دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە بنەوشەی وەر -wer کە دە کرداری "وەرین"دا بەدی دەکرێ.

**رۆپڵاندن roplandın** *[roplāndın]* - "هەڵپەرتاوتن، پەڕاندنی لق و پۆپی دار": خزمە دەگەڵ ↑رەپاندن repandın.

**رۆت rot** - "داردەستی درێژ": رۆتک rotık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Rute ،(G.) ruota ،(OG.) roe(de) ،(Nl.) rood ،(E.) ro?a ،(OIs.) "شووڵ، لقی باریک و درێژ، داردەست". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***ret-, *rot >** ***(IE.)*** "لقی درێژ، داردەست". ئەم وشە ژێرمەنییانە لە کۆندا وەک یەکەی پێوان بەکار هاتوون. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "گەز"ی کوردمادی.

**رۆچنە ronçe** *[ročna]* - "کولانەی سەربان": رۆژنە rojne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رۆژ roj.

**رۆخ rox** - "قەراخ": ↑رەخ rex یش دەگوترێ.

**رۆزی rozî** *[rozī]* - "رسق، بژیو": دەچێتەوە سەر وشەی ↑رۆژ roj. مەبەست ئەو بەهرە و بەرهەمەیە کە مرۆڤ رۆژانە وەک بژیو دەستی دەکەوێ. ئەسڵی وشەکە دەشێ *روزیک ruzîk** بووبێ و دە زمانی عەرەبیدا بووەتە رسق rısq (Arb.) [رسق و رۆزی].

**رۆژ roj** *[rož]* - "خۆر": رۆج roc یش دەگوترێ. ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیدا دوو مانای پەیدا کردووە یەکەمیان رۆژ واتا بەرانبەری "شەو"، دووەمیان بە مانای "خۆر". دە زمانی فارسیدا rūz (P.) تەنیا بە مانای یەکەم بەکار دەهێندرێ. هەڵسەنگاندن دەتیوان وشەی رۆژ و هێندێک وشەی پێوندیداری زمانە خزمەکان دەگاتە ئەم ئەنجامە کە رۆژ roj  دە بنەڕەتدا مانایەکی دیکەی هەبووە و بریتی بووە لە" تیشک و رووناکی". شێوەکانی ئەم وشەیە دە زمانە خزمەکاندا بەم جۆرەیە: raočah ،(Av.)، rocis(OIn.) ،Licht (G.) ،luč (Rus.) ،leukos (Gr.) ، lux  و lucidus (L.) "رووناکی"، Lucere (L.) "رووناکی کردن، درەوشانەوە"، illustris (L.) "رووناک، تیشکدەر"، rocte (OIn.) "دەدرۆشێتەوە، رووناکی دەبەخشێ" و هێندێک وشەی لەم چەشنە، پێوندییەکی تەواویان  بە وشەی رۆژ roj ەوە هەیە. ئەم وشانە وەک دەبینرێ، گشتیان مانای "رووناکی" دەبەخشن. لە لایەکی دیکە هەر لە زمانی کوردمادی و فارسیدا هێندێک وشە هەن کە ئەوانیش بنەی -rūz- /roj- /roş یان تیدایە و ئاماژە بۆ "رووناکی" دەکەن، وەک: roušan (P.) "رووناک"، افروختن af-rūxtan (P.) "داگیرساندن، هەڵکردنی ئاگر"، فروغ forūġ (P.) "تیشکدەر، بڵێسەر" [پێشتر: af-rūġ]. دە کوردمادیشدا ↑رۆچنە/ رۆژنە roçne / rojne هەیە کە بە

کولانەی سەربان دەگوترێ کە شوێنی پێداهاتنی رووناکییە. گشت وشە باسکراوەکان دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *leuk- >** "درەوشانەوە، رووناک کردن".

رۆست **rost** - "دێ، ئاوایی": خزمە دەگەڵ ↑رەعت reɛt "ماندوویی" و ↑رێنکە *renke* "لێک تۆپەڵ بوون و وەستان".

رۆشن **roşın** [*roşın*] - "روون، رووناک": روشن roušan (P.). شێوەی کۆنتری وشەی روون/ رۆن /ron run/ە و خزمە دەگەڵ ↑رۆژ *roj*.

رۆڤی**1** **rovî** [*rovī*] - "ئاژەڵێکی تووکن": رێوی rewî، رواس rıwas، لووی luwî و لوویە luye ش دەگوترێ. روباه rūbāh (P.). خزمە دەگەڵ alopex (Gr.)، vulpes (L.) "رێوی". دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە پێچەوانەی وشە یۆنانییەکە، وشەکە بزوێنی بە سەرەوە نییە. لەوانەیە بزوێنەکە سوابێتەوە. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا فۆتیمی l یش بەسەر وشەکانەوە نییە و وشەکان وەک دووەم کەرتی وشە یۆنانییەکە دەچن، بۆ وێنە Fuchs (G.)، voha (OG.)، fox (E.)، fauho (Got.)، foa (OIs.). ئەم وشانە گشتیان بە خزم دادەنرێن دەگەڵ puccha- (OIn.) "کلک" و puch (Rus.) "کوڵکە، تووک". وادیارە ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک کە دە بنەڕەتدا بە مانای"تووک" بووە و پاشان لەوێوە ماناکانی " کلک" و دواتر "رێوی" پەیدا بوون [دە ئەسڵدا مەبەست ئاژەڵی تووکن یاخود کلکدار بووە. کلکی رێوی بۆ تووکن بوون بەناوبانگە]. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە هەن کە ئەم بۆچوونە پشتراست دەکەن، وەک ↑بسک bısık و ↑بژ bıj و ↑بووزوو buzu و ↑پەشم peşım کە گشتیان ئاماژە بە "تووک" دەکەن و دەبنە خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

رۆڤی**2** **rovî** [*rovī*] - "ریخۆڵە": هەم ئەو وشەیە و هەم ↑ریخۆڵە rīxole خزمن دەگەڵ رودە rūde (P.) و urvata (Av.) "رۆڤی". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی **(IE.) *uer-, *wer- >** "با دان، سووران، لێکهاڵان". رۆڤی یان ریخۆڵە چ لەبەر ئەوەی خۆی شتێکی لوولەییە و چ لەبەر ئەوەش کە پێکهاتەیەکی درێژی لێکهاڵاوە، دەشێ پێوەندی بە ریشەکەی سەرەوە هەبێ. بەراوردی ئەم وشانە بکە هەروەها دەگەڵ ↑رستن rıstın و گوریس gurs [کۆنتر: وەریس werıs]

رۆق **roq** - "شۆرباو": هەروەها ↑رووگ rug هەیە بە مانای "شیرەی ترێی کوڵاو". خزمە دەگەڵ ↑رۆن ron، ↑رووبار rubar، ↑رژان rıjan، ↑راسان rasan و گەلێک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "جاری بوون، تراو بوون، رەوان بوون" دەکەن. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ arsati (OIn.) "دەرژی، جاری دەبێ" و rasa-h- (OIn.) "تراو، دۆشاو". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ریچاڵ rîçal "شیرەمەنی".

رۆڵە **role** [*rola*] - "منداڵ، فرزەند": روولە rule ش دەگوترێ. هەروەها ↑رواڵ ruwal هەیە بە مانای "تازەلاو، مێرمنداڵ":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑رووان ruwan ەوە هەبێ بە مانای "شین بوون، هەڵدان"ی گیا.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Nachwuchs (G.) هەیە کە لە دوو کەرت پێک دێ: کەرتی یەکەم مانای "پاش، دوا" دەدا و کەرتی دووەم مانای "رووان، هەڵدان". ئەم وشە ئەڵمانییە مانای "زارۆک و گەنج و لاو، بەرەی نوێ، جێگرەوەی بەرەی ئێستا" دەبەخشێ. لەوانەیە وشە کوردمادییەکەش هەڵگری ئەم مانایە بێ.

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑لوولە2 lule "بێچووی ورچ و بەراز" و ↑لەیر *leyır* "زارۆ، بێچوو". جێگەی سەرنجە کە زۆرجار ئەو وشانەی بۆ ناوی "زارۆک"ی ئاژەڵ و مرۆڤ بەکار دێن، هەر یەکن، وەک کودک [*کوودەڵە*] "بێچووەبەراز" و "کودک"ی فارسی واتا "زارۆک" یان "بچە"ی فارسی و "بێچوو"ی کورمادی، یان "کوڕ"ی کوردمادی و "کرە"ی فارسی و هتد.

رۆن **ron** - "چەوری": روغن rouġan (P.) "رۆن"، raoyna (Av.) "رۆنی کەرە". وشەکانی Rahm (G.)، ream (OE.)، room (Nl.) بە واتای "خامە" ریشەیان دە گەڵ وشەی "رۆن" یەکە. دە قامووسی ئێتیمۆلۆژی

DUDEN ئەڵمانیدا وشەی rouġan ی فارسی بە خزمی وشە ژێرمەنییەکانی سەرەوە داندراوە و ئەم وشانە بردراونەتەوە سەر ریشەی < *sreu-* (*IE.*) "جاری بوون، رەوان بوون". [وشەی ↑سروە sırwe لەم ریشەوە هاتووە].

**رۆناندن ronandn** [*ronāndın*] - "رووناک کردن": ↑روون run.

**رۆندک rondık** - "فرمێسک":

1- لە لایەکەوە بۆی هەیە بچێتەوە سەر ریشەی < *reu-*, *re-* (*IE.*) "رۆینی ئاو، رەوان بوون، جاری بوون". دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێک وشە بە مانای "جاری بوون" و بە مانای "چەم، جۆگە، جەریانی ئاو" لەم ریشەوە هاتوون. لەم تێروانینەوە رۆندک دەبێتە "جەریانە ئاوێکی بچووک". وشەی ↑رووبار rubar "چەم"یش سەر بەم ریشەیە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Träne "فرمێسک، رۆندک" و Tropfen "دڵۆپە" لە ریشەیەکەوە هاتوون و هەر دووک وشەکەش دەگەڵ "دڵۆپ" و "تەڕ"ی کوردمادی خزمن].

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی *sreu-* * (*IE.*) "جاری بوون، رەوان بوون". لەم ریشەیەش دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا چەندین وشە بە ماناکانی "چەم، جۆگە، رەوان بوون" بەدی هاتوون، بۆ وێنە Strom (G.) "جەریان" و rhéein (Gr.) "جاری بوون". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رۆن ron بە مانای "چەوری". دوور نییە هەردوو ریشەی هیندوئەورووپی سەرەوە دە بنەڕەتدا یەک بن و ریشەی دووەمیان لە یەکەمیانەوە پەرەی گرتبێ.

**رۆنیاس ronyas** [*ronyās*] - "ریشەی گیایەکە بۆ رەنگ کردن": روناس rūnās (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ rīabach (OIr.) "پەڵەدار، نیشانەکراو"، ráinas / ráimas (Lit.) "بەڵەک، خاڵدار". وشەی Reh (G.) "ئاسک" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە و ئاماژە بە رەنگی پێستی ئەو ئاژەڵە دەکەن کە دە هاویندا زەردێکی ئاماڵ سوور و دە زستانیشدا بۆرێکی ئاماڵ زەردە.

**رۆیشتن royıştın** [*royıštın*] - "چوون": رۆیین royîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑رمان rıman.

**رۆیین royîn** [*royīn*] - "هەنگاو نان": شێوەیەکی دیکە لە ↑رۆیشتن royıştın.

**رۆێز roez** [*roez*] - "گومان": خزمە دەگەڵ ↑راوێژ rawej "1- شیمانە، حەدس و گومان 2- تەگبیر 3- دەراوی دەم [راوێژی خۆشە کە قسە دەکا]":

**رە rıh** - "ردێن، ریش": شێوەیەکی دیکە لە ↑ریش rîş.

**رهنک rıhnık** - "رووناکی": شێوەیەکی دیکە لە ↑رووناک runak.

**رە re** [*ra*] - دەگەڵ هێندێک وشە دێ وەک رەگەڵ regel رەپاڵ repal، رەدوو redu، رەچاو reçaw و هتد. ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا پرێپۆزیسیۆنە و زۆرتر بەشێوەی پێشگری↑رێ re خۆ نیشان دەدا [رێخشاندن rêxışandın، رێنیشتن renîştın، رێکەوتن rêkewtın، رێخستن rêxıstın]. شێوەی کۆنتری ↑لە le.

**رەب reb** [*rab*] - "بەرەی زین و کورتان": دەشێ لە ریشەی < *rebh-** (*IE.*) ەوە هاتبێ بە مانای "(دا) پۆشین". Rippe (G.) و rib (E.) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بە مانای "پەراسوو"، -hirni reba (OG.) "کەللەسەر" [دە بنەڕەتدا واتا "مێشک پۆش"]، erephein (Gr.) "داپۆشین" دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑راڤ[4] rav "شەرم و شوورەیی" [ئەو شتەی مرۆڤەکان حەز لە داپۆشینی دەکەن].

**رەبا reba** [*rabā*] - دەگەڵ "تەبا" دێ: تەبا و رەبا teba u reba بوون واتا "دەگەڵ یەکتر کۆک بوون، پێکەوە هەڵکردن، لێک نەترازان". شێوەیەکی دیکەیە لە ↑رەوا rewa [رەڤا reva] "عادڵانە".

ڕەبەت **rebet** [ *rabat* ] - "بۆسە، سیپە": ڕەوەت rewet یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ڕەب reb "بەڕەی زین و کورتان"، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "داپۆشین". شیاوی باسە کە وشەی "کەمین"یش لە ڕیشەیەکەوە هاتووە بە هەمان مانا و خزمە دەگەڵ "جامە".

ڕەبەق **rebeq** [ *rabaq* ] - "موتڵەق، تەواو"؛ ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ڕەواق "هەنگوینی پاڵاوتە"، سەر بە ڕیشەی > **(IE.) *(s)krēi-** "دەڵاندن، چۆڕاندن، تکاندن". لێرەوە دەشێ سەرەتا مانا "ساف و پاڵاوتە، خالیس" دروست بووبێ و ئەوجار لەمەوە مانای "تەواو، بێ کەم و زیاد، موتڵەق" پەیدا بووبێ. ئەم ڕیشەیە خۆی دەچێتەوە سەر > **(IE.) *(s)ker-** "بڕین، جودا کردن(ەوە)، لێکردنەوە". خۆ ئەگەر وشەکە ڕاستەوخۆ لە ڕیشە کۆنەکەوە وەرگیرابێ، ئەوا ماناکەی دەبێتە "جیاوەبوو" و ئەمەش لەگەڵ مانای موتڵەق یەک دەگرێتەوە.

ڕەبەن **reben** [ *raban* ] - "1- سەڵت، تەنیا 2- گەڕیدە، هەڵوەدا 3- هەژار، بەلەنگاز": خزمە دەگەڵ (OIr.) orbe، (L.) orbus "ڕووت کراو، تاڵانکراو"، (G.) orphanós، (L.) orb "هەتیو" [بێکەس]، árbha-h (OIn.) "کز و لاواز"، (G.) arm "هەژار"، (G.) Arbeit "کار" [ دە بنەڕەتدا: کاری سەختی هەتیوان]، Erbe (G.) "میرات" [دە بنەڕەتدا: جێماکێ بۆ هەتیو]، (Pol.) robota "کار". وشەی تیکنیکی ڕۆبۆت robot کە دە زمانە ئەورووپییەکاندا بەکاردێ، لەم وشە سڵاڤییە وەرگیراوە و گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی > **(IE.) *orbho-** "هەتیو، هەتیو بوون". دە وشە کوردمادییەکەدا بزوێنی سەرەتای وشەکە دەرناکەوێ یان سواوەتەوە.

ڕەبەنۆک **rebenok** [ *rabanok* ] - "گوڵەمێلاقە، هەڵاڵە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ڕێواس rewas.

ڕەپ1 **rap 1** [ *rap* ] - "1- پڕ بوو، گنج لێبڕاو 2- هەستاو، ڕەق": [هێندەم پەنیر تێئاخنیوە، ڕەپ بووە]. وەک ئەم ڕستەیە نیشان دەدا، لەوانەیە مانای ئەسڵی وشەکە پڕ بوون، گنج لێبڕان، ئەستوور بوون و شەق بوون" بێ، واتا کاتێک شتێک دەئاخنرێ و ڕەق و ئەستوور دەبێ، لە هەمان کاتدا شەق و بێ گنجیش دەبێ. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑ڕەپێتە repete "دابەستە، ئاژەڵی ڕاگیراو بۆ قەڵەو بوون". دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- straff (G.)، straf (Nl.) "ڕەق، شەق، لەبەر یەک کێشراو"، سەر بە ڕیشەی > **(IE.) *(s)ter-** "ڕەق، توند، سفت، لەبەر یەک کێشراو" [بە سوانەوەی کەرتی -st کە لە وشە ژێرمەنییەکە].

2- ↑لیفاندن lîfandın "بەرز بوون و هەڵدانی گیا" و ↑لافاو lafaw [لاف + ئاو واتا "ئاو هەستان"]. لەم تیروانینەوە مانای "ڕەپ" دەبێتە "هەستاو، بەرزەوەبووک".

ڕەپ2 **rep 2** [ *rap* ] - دە کوردیدا بێژەیەک هەیە دەڵێ "بە کەرِ ناوێرێ، بە کورتان ڕەپەرەپیەتی" [ repe rep]. ئەم قسەیە بەم مانایەیە کە کەسێک نەوێری سواری کەر بێ و لەجیاتی سواری کەر بوون، سواری کورتان بێ و بخوازێ کورتان لێ بخورێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ڕمان rıman دا باس کراون. بە تایبەتی هەڵی سەنگینە دەگەڵ (E.) leap "بازد دان، خۆ هەڵاویشتن".

ڕەپاندن **repandın** [ *rapāndın* ] - "کوتان و نەرم کردنی شتی ڕەق": دەچێتەوە سەر ڕیشەی > **(IE.) *reu(p)-** "(دا) پچڕین، (دا)ڕنین، شکاندن، لەت و کوت کردن، شەرکردن، هەڵکەندن". دە زمانە خزمەکاندا هێندێک وشە بەو مانایانەی سەرەوە لەم ڕیشەوە هاتوون، وەک (G.) raufen، (OE.) rīepan "هەڵکەندن، ڕنینەوە"، (G.) rauh "زبر"، (L.) ruere "هەڵکەندن، کۆلین"، (L.) rudus "بەردی لەت وکوت کراو"، (L.) rumpere "شکاندن"، (Lit.) rauti "هەڵکەندن، ڕنینەوە"، (Rus.) ryt "هەڵکەندن". دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک پێوەندییان بە "ڕەپاندن" ەوە هەیە، وەک ↑ڕەپە repe "دەنگی کوتان"، ↑ڕەپن repın "زللە"، ↑ڕفێدە rıfede "ئامرازی نان بە تەنوورەوە دان"، ↑ڕەوتین rewtîn "تاشین، هەڵکەندن". هەروەها دە پلەیەکی دوورتردا وشەکانی↑ڕەپەل repel "دەستەی کایەکەران"، ↑ڕاو raw و ↑ڕفاندن rıfandınو هتد سەر بەم خێزانەن.

ڕەپستە **repıste** [ *rapısta* ] - "ئاوەنیا، زەوی ئاودراوی بەر لە چاندن": ڕبازە rıbaze، ڕباس rıbas و ڕبسان rıbsan یش دەگوترێن. هەروەها ڕبساندن rıbsandın و ڕەفساندن refsandın بەکار دەهێنرێن کە دە دەشێ بە مانای "ئاوداشتنی بەر لە چاندن" بێ. ئەو وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ چەند وشەیەکی وەك ↑ڕپنین rıpnîn "پەڵە دان، بارانی زۆر"، ↑ڕپنی rıpnî "بارانی پەڵە"، ↑ڕفت rıft "بارانی بە تەوژم". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ↑ڕەب reb "بەڕەی زین و کورتان"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *rebh-*** "(دا) پۆشین". مەبەست لە "ڕەبساندن" دەبێ داپۆشینی زەوی و کێڵگە بە ئاو بێ.

ڕەپن **repın** [ *rapın* ] - "زڵلە": خزمە دەگەڵ ↑ڕەپاندن repandın.

ڕەپە **repe** [ *rapa* ] - "دەنگی کوتان": ↑ڕەپاندن repandın.

ڕەپەڵ **repel** [ *rapal* ] - "1- دەستەی کایەکەران 2- لەوەڕ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ڕەپاندن repandın سەر بە ریشەیەك بە مانای "پچڕین، لێکردنەوە، ڕنینەوە". چۆنێتی پەرەگرتنی مانای وشەکە دەتوانین بەرهەڤ بکەین دەگەڵ پێوەندی "ڕنین" لە لایەك و "ڕان" لە لایەکی دیکەوە بە مانای "دەستە، گەلە". هەروەها چۆنێتی پەیدا بوونی مانای دووەمی وشەکە دەتوانین دەگەڵ وشەی"لەوەڕ" بەرهەڤ بکەین. ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "لێکردنەوە، ڕنینەوە، داپچڕین". دە بنەڕەتدا مەبەست لە هەر دوو وشەی "ڕەپەڵ" و "لەوەڕ" ئەوە بووە کە گەڵا و گژ و گیا لێ کراوەتەوە، داڕنراوە و کراوەتە خواردنی مەڕ و ماڵات.

ڕەپێتە **repete** [ *rapeta* ] - "دابەستە، ئاژەڵی ڕاگیراو بۆ قەڵەو بوون": خزمە دەگەڵ ↑ڕەپ rap.

ڕەپێڵە **repele** [ *rapela* ] - "کوێرەڕێ": ڕەپێڵگە repelge ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ڕاپیتە rapîte "هاتوچۆی بەپەلەپەل و ئەم سەر ئەو سەر کردن" [↑ڕاوێچکە2 raweçke] و دەچێتەوە سەر ↑ڕۆیشتن royıştın [ڕفتن raftan (P.)].

ڕەت1 **ret** [ *rat* ] - "1- ڕۆیشتن، بزووتن، تێپەڕین 2- هەڵەنگوتن". بە مانای یەکەم ڕەد red یش دەگوترێ. ڕد rad شدن (P.) "تێپەڕین". دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی < ***(IE.) *ret(h)-*** "ڕۆیشتن، گەڕان، خلۆر بوونەوە". ئەم وشانەی خوارەوە لەم ریشەوە هاتوون: Rad (G.) "چەرخ، گردوونە"، rad (Nl.) و ratas (Lit.) "چەرخ"، rotare (L.) "سووڕان" و rotula (L.) "ڕەوەڵە"، rethim (OIr.) "دەرۆم"، rísti (Lit.) "خلۆر بوونەوە"، road (E.) "جادە"، ride (E.) و rīdan "بەسواری ڕۆیشتن"، raithya (Av.) "ڕێگە" و ratha (OP.) و (OIn.) "چەرخ، گاری" و ↑ڕێ re [ ڕێکا، ڕێگا، ڕێگە].

ڕەت2 **ret** [ *rat* ] - "هزر و بیر": [لە ڕەت دام چی بکەم]. شێوەی پێشتری ↑ڕا[2] ra [بیر و ڕا]، خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑*ڕاشەن raşen* دا شی کراونەوە.

ڕەت3 **ret** [ *rat* ] - "قووڵکەی سەر ڕێگەی تێچیر": [کەروێشك دە ڕەت کەوت]. پێوەندی بە یەکێك لەم ریشانەوە هەیە:

1- < ***(IE.) *re-*** "ڕنین، بڕین، کڕاندن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ڕیز rîz و دە پلەیەکی دوورتر دا دەگەڵ ↑ڕنین *rınîn* "ڕووشاندن، کڕاندن"، ↑ڕەهەند rehend، ↑ڕەندۆڵ rendol و هتد،

2- < ***(IE.) *uer-*** "کڕاندن، دڕاندن، قەڵشاندن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ڕیش rîş.

[تێبینی: لەنێوان چەمکەکانی "چاڵ، قووڵکە، هەڵقەنراوی" لە لایەك و لە لایەکی دیکەدا "کۆڵین، کڕاندن، هەڵکەندن، قەڵشاندن"دا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیك هەیە. بۆوێنە سەرنجی ئەم وشانە بدە: "خەندەك" و "هەڵکەندن"، "ڕەهەند" (یان ڕەندۆڵ) و "ڕنین"، "قووڵکە" و "کۆڵین" (هەڵکۆڵین)، "شکێر" [یان شکاف] و "شکاندن"، "قەڵش" و "قەڵشاندن" و هتد].

ڕەتاندن **retandın** [ *ratāndın* ] - "غار پێ کردن". دەشێ هاوریشە بێ دەگەڵ یەك لەم وشانەی خوارەوە:

1- reiten (G.)، ride (E.)، ritan (OG.)، rida (Sw.)، rijden (Nl.) بە واتەی"ئەسب سواری کردن، بە سواری رۆیشتن" سەر بە ریشەی *reidh- > (IE.) "بزووتن، تێپەڕین". ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتووی ریشەیەکی پێشووترە، واتا ریشەی *(e)re- , * reu- , * rei- > (IE.) "جوولان، بزووتن".

2- leiten (G.) ، leitan (OG.)، leiden (Nl.)، lead (E.)، leda (Sw.) "بەڕێوە بردن"، lītan (OG.)، liđan (OE.)، lei?n (Gt.)، līđa (OIs.) "رۆیشتن، ئاژۆتن، دەرباز کردن"، سەر بە ریشەی *leit(h)- > (IE.) "رۆیشتن، چوون".

**رەتەوە retewe** [ ratawa ] - "1-نەژاد، تۆرەمە 2- تۆرەمەنامە":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ origo (L.) "سەرچاوە، بنەڕەت"، سەر بە ریشەی *re-, *ere- > *reu-, (IE.) "بزووتن". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشەی وەک ↑را[3] ra [هەرا hera] کردن لەم ریشەوە هاتوون. پێوەندی دوو چەمکی "ئەسڵ و بنەڕەت" دەگەڵ "بزووتن، رۆیشتن" لەوەدایە کە کەسەکان یان دیاردەکان *دەچنەوە* سەر ئەسڵی خۆیان، یان بە وتەیەکی دیکەوە *رەوتەکە* لە کەسێک یان شتێکەوە دەست پێدەکا و *دەگاتە* دۆخی هەنووکەیی، بۆ وێنە زمانە هیندوئەورووپییەکان دەچنەوە سەر زمانیکی کۆن، یان ئەو زمانە کۆنە لە رەوتێکی چەند هەزار ساڵەدا گەیشتووەتە دۆخێک کە دەیان لق و پۆی لێ بۆتەوە. هەر لێرەدا جێی ئاماژەیە کە لەوانەیە کەرتی رەت -ret دە وشەی ↑بنەرەت bıneret دا پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

2- لەوانەیە پێوەندی بە ↑رەسەن resen ەوە هەبێ.

**رەتەوی retewî** [ ratawī ] - "بەرخی لە شیر کراوە": دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا مانا فارسییەکەی بەم جۆرەیە: "برە از شیر بریدە". وەک دەبینی لێرەدا مانای "هەڵبڕین، جوێ کردنەوە، لێکردنەوە" لەبەر چاوە، واتا بەرخەکە لە شیر یان لە دایک (جوێ) دەکرێتەوە. بەم پێیە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشانە لە ژێر ↑ریش rîş دا باس کراون، سەر بە ریشەی *uer- > (IE.) "کڕاندن، دڕاندن، پچڕاندن، قەڵشاندن".

**رەچەڵەک reçelek** [ račalak ] - "ریشە، بنەچەک": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑ریشە rîşe.

2- ↑رەتەوە retewe "نەژاد، تۆرەمە".

**رەخ rex** [ rax ] - "لا، قەراخ، بەر": رۆخ rox یش دەگوترێ.

1- دەتوانێ وشەیەکی سەربەخۆ بێ و لەم بارەوە جێی بەراوردکردنە دەگەڵ regio (L.) "ناوچە، دەڤەر، راستە". ئەم وشەیە دوچێتەوە سەر regere (L.) "راست کردن(ەوە)، ئاراستە کردن، بەرێوەبردن، حوکم کردن" و خزمیشە دەگەڵ "راست" ی کوردمادی. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیشدا Reich (G.) "وڵاتی ژێر دەسەڵاتداری، کیشوەر" و (Be)reich (G.) "ناوچە، دەڤەر" هەن کە بەپێی بۆچوونێک پێوەندییان بەوشەی recht (G.) [↑راست rast لە کوردمادیدا] هەیە.

2 - لەوانەشە وشەکە کورتکراوی ↑قەراخ qerax بێ.

**رەخت rext** [ raxt ] - "چەک ورەخت": ئەم وشەیە دەگەڵ rüsten (G.)، rusten (Nl.) "تەیار کردن، ساز کردن، تەجهیز کردن" بە هاوریشە دەردەچێ. شێوەی وشەکە دە زمانە کۆنە ژێرمەنییەکاندا (H)rusten (OG.)، hryst (OE.) بووە بە مانای "رازاندنەوە بە خشڵ وزەنبەر، خۆ تەیار کردن بە چەک و چۆڵ و تەجهیزات". وشە ژێرمەنییەکە بە تایبەتی بۆ خۆ ساز دانی بەر لە شەڕ یان سەفەر بەکارهاتووە. دە زمانی کوردمادیشدا رەخت هم بە مانای "زنبەری ئەسب" بەکار دێ (بڕوانە هەنبانەبۆرینە- مامۆستا هەژار) و هم بە مانای تجهیزات و کەرەسەی شەڕ و هەر بۆیەش دەگوترێ "چەک ورەخت". جگە لەمانە وشەی شامرەخت şamrext بە جۆرێک زێر و زەنبەری ژنانە دەگوترێ. وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە

سەر ریشەی ژێرمەنی -herudo * (Grm.) "داپۆشین". ریشەی هیندوئەورووپی وشە ژێرمەنییەکە باس نەکراوە.

رەختە **rexte** [ raxta ] - "قایم": دەچێتەوە سەر ↑رەخت rext . هەر بەم جۆرەش دە ئەڵمانیدا rustig (G.) "قایم، رەختە" هەیە کە لە rüsten (G.) ورگیراوە و ئەمیش لە hrust (OG.) بە واتای "چەك ورەخت " وەرگیراوە.

رەخساندن **rexsandın** [ raxsāndın ] - "پێك هێنان، دروست کردن، گونجاندن":

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ regere (L.) "بەڕێوەبردن، حوکم کردن"، سەر بە ریشەیەك کە دە بنەرەتدا واتای "راست و دروست کردن" دەبەخشێ و خزمیشە دەگەڵ ↑راست rast.

2- یان لە پێوەندی دەگەڵ ↑رەسین resîn "گەیشتن، پێگەیشتن" دایە و ئەمەشیان هەر دەبێتە خزم دەگەڵ ↑راست rast. ئەگەر وشەکە پێوەندی بەمەوە هەبێ، مانای بنەڕەتی وشەکە "پێگەیشتن" و ساز بوونی بارودۆخ یان کارێك بووە و دواتر مانای وشەکە زۆرتر پەرەی گرتووە. بە هەر شێوەیەك لەم دوو شێوەیە بۆی بچین، بە یەك ریشەی هیندوئەورووپی دەگەین.

رەخش **rexş** [ raxš ] - "1- رەختی ئەسپ 2- ناوی ئەسپی رۆستەم" : شێوەیەکی دیکە لە ↑رەخت rext کە دە بنەڕەتدا بە مانای "خشڵ و زەنبەری ئەسپ" هاتووە. دەبێ ئەسپی رۆستەم لەباری رازاندنەوە زۆر بەناوبانگ بووبێ و بۆیە ئەم ناوەی پێ براوە.

رەخشان **rexşan** [ raxšān ] - "تیشکدەر، بریقەدار": رخشنده raxšande (P.). خزمە دەگەڵ↑ رۆژ roj.

رەخنە **rexne** [ raxna ] - "سەرکۆنە، ناتەواوی دەرخستن": مانای بنەڕەتی وشەکە "دەرز، قەڵش، کەلێن"ە. دە زمانی فارسیدا وشەکە بەم مانایە بەکار دێ. مانا کوردمادییەکە دەبێ بەم جۆرە پەیدا بووبێ کە سەرەتا ئاماژە بە دەرز و قەڵش لە شتێکدا کراوە، وەك ئاماژە کردن بە عەیب و ناتەواوی، و دواتر لێرەوە رەخنە (لێ) گرتن بەم مانایەی ئێستا سەری هەڵداوە. ریشەی وشەکە دەتوانین ببەینەوە سەر ریشەی < ***reu- , *re-*** **(IE.)** "پچڕین، بڕین، هەڵکەندن، کۆڵین". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رەهۆڵ rehol "قەڵشی زەوی".

رەد **red** [ rad ] - "تێپەڕین، بوورین": شێوەیەکی دیکە لە ↑رەت[1] ret [بە کووچەکەدا رەد بووین یان رەت بووین].

رەدا **reda** [ radā ] - ریشەی عەرەبی هەیە < رضا reza (Arb.) وەرگیراوە. دەگوترێ: نایەتە رەدایە، واتا رازی نابێ.

رەداڵ **redal** [ radāl ] - دەگەڵ "روو" دێ [روو و رەداڵ]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑رەزا reza "شێوە، رووخسار" [رەزاسووك یان رەزا شیرین واتا کەسێك کە رووخساری جوان و لەبەردڵانە]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ریت rît "بیچم و قیافە".

رەدە **rede** [ rada ] - "جێگەی سەخت و بەردەڵان لە شاخ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑راز raz "شاخی بلیند، تیشەبەردی چیا".

رەز **rez** [ raz ] - "داری ترێ": raz (P.) هەر بەو مانایە. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ racemus (L.) "ترێ" کە دە فەرانسەیی کۆندا بووەتە raisin (OF.) "ترێ". دە ئەڵمانیدا بووەتە Rosine (G.) "مێوژ، کشمیش".

رەزا **reza** [ razā ] - "شێوە، چارە، رووخسار": [رەزاسووك یان رەزا شیرین واتا کەسێك کە رووخساری جوان و لەبەردڵانە]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑رەداڵ redal "روو".

رەزاو **rezaw** [ razāw ] - "شوێنی پێکگەیشتنی دوو چەم": رەز + ئاو rez +aw. کەرتی "رەز" دەچێتەوە سەر ↑رەسین resîn "گەیشتن، پێگەیشتن، پێکگەیشتن".

[تێبینی: بۆ ئەم مەبەستە دە زمانی کوردمادیدا وشەی "یەکاو" یش دەگوترێ، واتا شوێنی یەکگرتن و یەکبوونی (دوو) ئاو].

**رەژ rej** *[ raž ]* - "دەرمانی رەنگ کردنی موو": خزمە دەگەڵ ↑رشتن rıştın "کل لەچاو دان، موو رەش کردن".

**رەژە reje** *[ raža ]* - "بە ریز رۆیشتنی لەشکر": رژە reže (.P)، خزمە دەگەڵ ↑ریز rîz "سەف". وێ دەچێ زمانی فارسی ئەم وشەیەی لە رچە کوردمادی وەرگرتبێ، چونکوو دە زمانی کوردمادیدا "رچە بەستن" دەگوترێ و ئەمەش هەمان مانای "ریز بەستن" دەدا. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ "رژە رفتن" و لێرەدا مانای "ریز" بە تەواوی دەرناکەوێ.

**رەژی rejî** *[ ražī ]* - "خەڵوز": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Russ (.G)، rouz (.OG) "دووده، سیان". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە نەدۆزراوەتەوە. رەژی دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑رەش reş. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە خزمایەتییان دەگەڵ رەش هەیە وەک ↑رشتن rıştşn [چاورشتن، کڵ کردنە چاو]، ↑رەشک reşık "بیبیلەی چاو"، ↑رەشکە reşke "دەنکێکی رەش"، ↑ریشۆل rîşol "سێروو"، ↑رەهن rehın "بیبیلەی چاو".

**رەسنە resne** *[ rasna ]* - "گوریس": خزمە دەگەڵ ↑ریس rîs و↑ گوریس gurîs و ↑رستن rıstın. رسن rasan (.Arb) بە مانای "گوریس" دەشێ لەم وشانە وەرگیرابێ.

**رەسەن resen** *[ rasan ]* - "ئەسڵ، خاوەنی ئەسڵ و نەسەب": ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە Rasse (.G) و race (.E) و (.F) "رەگەن، نەژاد". ئەم وشە ئەورووپییانە دەبردرێنەوە سەر razza (.It) و لەوێشەوە بۆ سەرradix (.L) "ریشە". شیاوی باسە کە دەزمانی یۆنانیدا rhiza (.Gr) بە مانای "ریشە" دێ و لەوانەیە پێوەندی بە وشە لاتینییەکەوە هەبێ. وێ دەچێ ↑ریشە rîşe ی خۆشمان ش پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ و گشت وشەکان بۆ ریشەیەکی هاوبەش بگەڕێنەوە. لەوانەیە ↑رستی rıstî "هێم، بناخە" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: دوو چەمکی "ریشە" و "بناخە" پێوەندی نیزیکیان پێکەوە هەیە، هەر بۆیە زۆر جار دوو وشەی "فۆندامێنتالیزم" [بناخەگەرایی] و "رادیکالیزم" [ریشەگەرایی] بە یەک مانا بەکار دەبرێن].

**رەسین resîn** *[ rasīn ]* - "پێگەیشتنی میوە و دەغڵ": دە فارسیدا رسیدن rasīdan هەم بە مانای "گەیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک " و هەم بە مانای "پێگەیشتنی شت" بە کار دێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ reichen (.G)، reiken (.Nl)، reach (.E)، reka (.OF) "بەس بوون، گەیشتن، گەیاندن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *reg- >*** "لەبەریەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، شەق بوون، راست بوون". reiti (.Lit) "شەق بوون، سفت بوون"، rigere (.L) "مەیین، رەق بوون" و گەلێک وشەی دیکە لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە لەم ریشەوە هاتوون وەک ↑راست rast، ↑رەق req، ↑رێک rek، ↑رژد rıjd، ↑رچیان rıçyan و هتد

**رەش reş** *[ raš ]* - "تاریک، دژبەری سپی": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑رەژی reji "خەڵوز".

**رەشک reşık** *[ rašık ]* - "بیبیلەی چاو": دەچێتەوە سەر ↑رەش reş.

**رەشکە[1] reşke** *[ raška ]* - "دەنکێکی رەش": دەچێتەوە سەر ↑رەش reş.

**رەشکە[2] reşke** *[ raška ]* - "تۆڕی کا تێکردن": خزمە دەگەڵ↑ رەشمە reşme و ↑ریس rîs و ↑رستن rıstın.

**رەشمە reşme** *[ rašma ]* - "جۆرێک لە هەوسار": خزمە دەگەڵ ↑ریس rîs و ↑رستن rıstın. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ریسمان rīsmān (.P)"بەن، دەزوو".

**رەشیش reşîş** [ rašīš ] - "نەرمەباران": ↑رشتن rıştın.

رەعت **reɛt** *[ raɛt ]* - "ماندوویی": خزمە دەگەڵ Rast (G.) rest (E.)، rasta (Gt.)، rost (OIs.) "پشوو، وچان، لەکار وەستان، حەسانەوە، مەنزڵ، قۆناخ". دەشێ شێوەی کۆنتری وشەکە دە زمانی کوردمادیدا "رەهت reht یان رەست rast" بووبێ. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ وشەی ↑رۆست rost "دێ، ئاوایی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑رێنکە *renke* "لێک تۆپەڵ بوون و وەستان"، سەر بە ریشەی *er(ə)-, *rē- > **(IE.)** "وچان دان".

رەفە **refe** *[ rafa ]* - "تاقەی بەرز": رفە rıfe و رەفعە reɛfe و رەفکە refke ش دەگوترێن. دەشێ خزم بێ دەگەڵ:

1- یان دەگەڵ roof (E.) "میچ"، hrōf (OE.)، rōf (OG.)، roef (Nl.) "سەرپەنا، سەرپۆشی تابووت"، hrōf (ON.) "سەرپەنا، لۆتکە". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییانە دیاری نەکراوە.

2- یانیش دەگەڵ ↑رفە rıfe "*دارێکی کون کونە* لە حەسیر چنیندا بە کاری دەبەن".

رەفی **refî** *[ rafī ]* - "قەراخ": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ripa (L.) "قەراخ، قەراخ چەم و ئاو".

رەفیسک **refîsk** *[ rafīsk ]* - "پشت ئەژنۆ" : لە دوو کەرتی رە + فیسک re + fîsk پێک هاتووە. کەرتی "فیسک" خزمە دەگەڵ↑ فیزان fîzan "چەمانەوە". کەرتی رە -re لەوانەیە کورتکراوی ↑رەگ reg بێ. بەم جۆرە تێکرای وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێتە ئەو رەگەی کە دەفیزێتەوە، دەچەمێتەوە.

رەق **req** *[ raq ]* - "سفت، توند": هاوریشەیە دەگەڵ rigidus (L.) "رەق، سفت" کە دەگەڕێتەوە بۆ (L.) rigere "رەق بوون، توند بوون". خزمە دەگەڵ ↑راست rast، ↑رەق req، ↑رێک rek، ↑رژد rıjd، ↑رچیان rıçyan سەر بە ریشەی *reg- > **(IE.)** "لە بەریەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، شەق بوون، راست بوون".

رەقاڵە **reqale** *[ raqāla ]* - "پێچکی لانکە": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑رێ re [رێگە]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "رۆیشتن، گلۆر بوونەوە، تلانەوە، بزووتن(ی خێرا)".

رەقە **reqe** *[ raqa ]* - "کیسەڵ": دە فارسیدا دەگوترێ لاک پشت lakpšot (P.). وشە فارسییەکە خۆی لە دوو کەرتی "لاک" و "پشت" پێک هاتووە. کەرتی "لاک" دە فەرهەنگی فارسیدا بە "قاوغ، قالب، زرێ" مانا کراوەتەوە و ئەمەش بە تەواوی دەگەڵ وشەی ↑لەش leš یەک دەگرێتەوە کە دە ریشەدا ماناکانی "بەدەن، بەدەنە، پێکهاتە، شێوە، هەیکەل" دەردەبرێ. کەوابێ "لاک پشت"ی فارسی بەو مانایە هاتووە کە ئەو ئاژەڵە قالب یان قاوغێکی لەسەر پشتی هەیە. ئەم شێوە ناو لێنانە زۆر نیزیکە لە ناوی ئەڵمانی ئاژەڵەکە کە دەبێتە Schildkröte واتا "بۆقی زرێدار". بەم پێیە دەبێ "رەقە"ی کوردمادی هەر ئەو "لاک"ە بێ کە دە وشە فارسییەکەدا هەیە. شیاوی باسە کە دە فەرهەنگی فارسیدا "لاک" هەر خۆی بە تەنیاش وەک "رەقە، کیسەڵ" مانا کراوەتەوە و ئەمەش ئەو بۆچوونەی سەرەوە پشت راست دەکا.

[تێبینی: ئەوە کە وشەی *لەش* "بەدەن" و *لاک* "قاوغ، قالب" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، بۆ ئەم تێڕوانینە دەگەڕێتەوە کە لەش وەک قالبێک لەبەرچاو گیراوە کە رووح تێیدا جێگیرە. هەر ئەم پێوەندییە دە وشەی "قالب"یشدا بەرچاوە کە هەم مانای "قاوغ" دەدا و هەمیش مانای "لەش" [قالبم دەئێشێ واتا لەشم ئێش دەکا].

رەگ **reg 1** *[ rag ]* - "1- خوێنبەر لە لەشدا 2- ریشاڵ، پرزەی گیا": ↑رەه reh یش دەگوترێ. رگ rag (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رێ re 1 "شەقام، شوێنی پێدارۆیشتن" [راه rah (P.)]. لەم تێڕوانینەوە "رەگ" دە بنەڕەتدا بە شوێن واتا رێگای جاری بوونی خوێن لە لەشدا، یان ئاو لە دارو درەختدا گوتراوە.

[تێبینی: وشەی شریان šaryān (Arb.) دە زمانی عەرەبیدا بە مانای "رەگ" بەکار دێ. ئەم وشەیە زۆر وێ دەچێ لە شارێ şarê وەرگیرابێ. هەروەها ئیحسانی تەبەری بە دروستی لەو باوەڕەدا بوو کە وشەی شارع šāriɛ (Arb.) "رێگا" لە وشەی شاهراه šāhrāh وەرگیراوە. دیارە زۆرتر وێ دەچێ لە شارێ şarê ی کوردمادی وەرگیرابێ].

ڕەگ reg 2 [ rag ] - "بنەچەک، تۆرەمە": ↑ڕەه reh یش دەگوترێ. ڕگ rag (P.)، هەروەها ↑ڕەهێشتە rehêşte هەیە بە مانای "ئەسڵ، نەجیبزادە".

1- لەوانەیە ئەم "ڕەگ"ە پێوەندی بە "ڕەگ"ی سەرەوە هەبێ [↑ڕەگ[1] reg]. وەک دەزانین ڕەگ جگە لە دەمار یان خوێنبەری لەش، بەمانای ریشاڵ و پرزەی گیاش بەکار دێ [ڕەگ و ریشە]. بەم جۆرە مانای دوو وشەی "ڕەگ" و "ریشە" تێکەڵ بە یەکدی بووە، واتا ڕەگ مانای ریشە و دواتر مانای "بنەچەک، تۆرەمە"ی وەرگرتووە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑ریسە rîse ی مل هەیە کە دەبێ هەمان ڕەگی مل بێ. لێرەدا وشەی ڕەگ بە شێوەی "ریسە" خۆی نیشان دەدا و ئەمەش زۆر نیزیکە لە وشەی "ریشە".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە origo (L.) "سەرچاوە، بنەڕەت". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ ڕا[3] ra "ڕا" کردن واتا هەڵاتن و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بزووتن، ڕۆیشتن". لەم تێڕوانینەشەوە "ڕەگ" پێوەندی بە چەمکی "ڕۆیشتن" پەیدا دەکا. لێرەدا مەبەست گەڕانەوە بۆ "سەرەتا"یە، یان بزوان و هاتن لە سەرەتایەکەوە بۆ دۆخی ئێستا.

ڕەگەز regez [ ragaz ] - "نەژاد، جینس":خزمە دەگەڵ ↑ڕەگ reg.

ڕەمانە remane [ ramāne ] - "جۆرێک داس": رمانە rımane ش دەگوترێ. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەک هەیە بە مانای "زۆڵەچەرم، نەواری چەرم" کە بەم شێوەیە: Riemen (G.)، riem (Nl.)، rēoma(OE.)، ئەو وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی ***reu-** > (**IE.**) "پچڕین، دابڕین، لێکردنەوە". وادیارە مانای بنەڕەتی وشە ژێرمەنییەکە بریتی بووە لە "بڕدراوە، تیکە، لەت"ێک لە چەرم. بەم پێیە وشەی کوردی "ڕەمانە"ش پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا و مانای "بڕین، لێکردنەوە" لە خۆ دەگرێ. دە زمانی کوردیدا چەندین وشە لەم ریشەوە دێن، بۆ وێنە ↑ڕاو raw، ↑رفاندن rıfandın و ↑ڕەپاندن repandın "کوتان و نەرم کردنی شتی ڕەق" و هتد.

ڕەمڵ remıl [ ramıl ] - "تەمی بەرچاو لەسۆنگەی چاوئێشە": خزمە دەگەڵ ↑ڕەمەکی remekî.

ڕەمەکی remeki [ ramakī ] - "1- خەڵکی ئاسایی، ئاپۆرە، ڕەشۆکی، ڕەشایی 2- شەوەکی، ماڵاتی شەوبەکیو 3- ڕەشەوڵاخ". بنەی وشەکە ڕەمە -rem(e) یە کە پاشگرێکی خراوەتەسەر. ئەم کەرتە خزمە دەگەڵ ram (MG.) و (OG.) "قورم، ڕەشایی" و ramah- (OIn.) "ڕەش". ئەم مانایە دە زمانی کوردمادیدا بە ئاشکرا پارێزراوە. لە وشەی ڕەمەکی بە مانای "ئاپۆرەئاسا"دا دەبێ دە بنەڕەتدا خڵکی ڕەش ورووت، ڕەشایی و نەخوێندەوار مەبەست بووبێ و پاشان بووبێتە ئاوەڵناوێک بە واتای"نەک لیزانانە وخوێندەوارانە، بەڵکوو بە گوێرەی خەڵکی ڕەشایی و نەخوێندەوار" [لە وشەکانی "ڕەشبگیری" و "ڕەشەکوژی"شدا "ڕەش" بە مانای خەڵکی ئاسایی، ئاپۆرە دەبینین]. خزمە دەگەڵ ↑ڕەمڵ remıl "تەمی بەرچاو لەسۆنگەی چاوئێشەدا" و ↑ڕاڤ2 rav "پەڵەی ڕەش لەسەر پێست، ماڵە".

ڕەن ren [ ran ] - "خۆیانی ڕاخراوی هێشتا گیرەنەکراو": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ڕەی rey "حاسڵ، بەرهەم".

ڕەنج renc [ ranj ] - " زەحمەت، ئازار": رنج ranj (P.). بەر لە شی کردنەوەی خودی وشەکە پێویستە لەوە بدوێین کە ئەو وشانەی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا باس لە ئازار و ئەشکەنجە دەکەن، دەچنەوە سەر چەند ریشەیەک بە مانای"خوار بوون، چەمین، قەد بوون". بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییە دەتوانین وشەی ڕەنج ببەستینەوە بە renken (G.) "جووڵانی تێکەڵ بە سووڕان و با دران"، wrench (E.) "بە زۆر کێشان"، ringen (G.) "خۆ ماندوو کردن، زۆرەوانی کردن، ململانی کردن"، Ring (G.) "بازنە، ئاڵقە" [دە بنەڕەتدا واتا چەماوە]، wrigen (MG.) "با دان، گوشین"، سەر بە ریشەی ***uer -, *wer-** > (**IE.**) "با دران، سووڕان". خزمە دەگەڵ ↑وڕ wır و ↑وەرانین weranîn و گەلێک وشەی دیکە کە چەمکی سووڕان و با دران دەردەبڕن.

[تێبینی: وشەی labor (L.) "زەحمەت، ڕەنج، تەقەلا" خزمە دەگەڵ وشەی کوردمادی لەپین1 lepîn "بەلادا هاتن" کە ئەمەش ماناکەی نیزیکە لەو مانایانەی سەرەوە].

**ڕەند1 rend 1** [ *rand* ] - "خاوەن چاکە، جوامێر، دەست و دلباز": زۆرتر دەگەڵ "مەرد" دێ [مەرد و ڕەند merd u rend]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ راد rad (P.) "دڵاوا، بەخشەر". هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ reich (G.)، reiks (Gt.)، rich (E.)، rik (Sw.) "دەوڵەمەند، ساماندار". وشە ژێرمەنییەکان خزمن دەگەڵ rex (L.) "فەرمانڕەوا، دەسەڵاتدار" و rî (OIr.) "شا".

[تێبینی: دە زمانی کوردمادیدا هێندێک جار فۆتیمی n لەبەر هاسانبێژی دەکەوێتە نێوان بزوێنەکانی e / a و چەند کۆنسۆنانتێکی وەک c و g و d بۆ وێنە ئامانج، کرمانج، هەنگاو، ئەنگاوتن و هتد].

**ڕەند2 rend 2** [ *rand* ] - "1- ئاد، زەوی هەڵکەوتوو لەناو ئاودا 2- تەختایی ناو گردان": دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑لەند lend.

**ڕەندۆڵ rendol** [ *randol* ] - "ئاودر": ڕەند + ئۆڵ rend + ol. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە↑ ڕەهەند rehend. کەرتی دووەم پاشگرە.

**ڕەنگ reng** [ *rang* ] - "چۆنێتی هاتنەبەرچاوی دیمەنێک وەک سوور، زەرد، سەوز و...": ڕنگ rang (P.). ئەگەر سەرنجی وشەی "سواخ" بدەین، دەبینن کە ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر وشەی "ساوین"، لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای "کڕاندن، داڕووشاندن، بڕین، سوونەوە، ڕێخشاندن" و دە بنەڕەتدا بەو شتە گوتراوە کە دە دار و دیواری *هەڵدەسوون*. بەم چەشنە وێ دەچێ "ڕەنگ"یش پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑ڕنین rınîn، سەر بە ریشەیەک بێ بە مانای "بڕین، کڕاندن، قەڵشاندن".لەم مانا بنەڕەتییەوە دەتوانێ هەر وەک وشەی لە وشەی "سواخ"دا دەبینرێ، مانای "ڕێخشاندن" پەیدا بووبێ. لەم تێڕوانینەوە "ڕەنگ" دەبێ مانایەکی وەک "سواخ" یان "هەتوان"ی هەبێ کە دە شت هەڵسووڕاوە. شیاوی باسە کە "هەتوان" یش خزمە دەگەڵ "سواخ".

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ hrīnan (OG.) "ڕێخشاندن، لێخشاندن" سەر بە ریشەی **(IE.) *krei- >** "ڕێخشاندن، لێخشاندن، پێداخشاندن". Reif (G.) و rime (E.) "زوقم، بەستەڵەکی زۆر تەنک" لەم ریشەوە هاتوون.

**ڕەنگاڵ rengal** [ *rangāl* ] - "بزگوڕ": خزمە دەگەڵ ↑ڕنین rınîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "پچڕین، دڕین، لێکردنەوە".

**ڕەنوونە renune** [ *renūne* ] - "هەپە، کەرکیت، شانەی تەون کوتان": دەچێتەوە سەر ↑ڕنین rınîn. ئەم ئامرازە وەک چەنگێک دەچێتە ناو تاڵەکانی تەون و کارەکەی وەک داڕنین وایە. شێوەی ئەم ئامرازە و هەروەها وشەکەی هەڵسەنگینە دەگەڵ ڕنەک rınek "قەشەو".

**ڕەو1 rew 1** [ *raw* ] - " کۆچ": ڕەڤ rev یش دەگوترێ. دەگەڵ "کۆچ" دێ [کۆچ و ڕەو koç u rew]. هەروەها وەک بنەوشە لە هێندێک وشەی دیکەدا دەردەکەوێ، وەک ڕەوەند بە مانای "کۆچەری"، ڕەوت، ڕەوش، ڕەوا، ڕەوان، ڕەوانە و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ڕۆیشتن royıştın.

**ڕەو2 rew 2** [ *raw* ] - "حەپە": [ڕەوڕەو: حەپەحەپ، وەڕەوەڕ، ڕەوین واتا وەڕین]. ڕەوە rewe ش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Ruf (G.)، (h)ruof (OG.)، hrōps (Gt.)، hrōp (OE.)، rop (Sw.) "بانگ، هاوار، قیژە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑قارەمان qareman و ↑قریوە qırîwe.

2- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ rienen (MG.) "ناڵاندن"، reonian (OE.) "سرت و خورت کردن"، rjona (Nor.) "چەقەچەق کردن"، rumor (L.) "دەنگەدەنگ، دەنگۆ"، roar (E.) و reren (OG.) "نەڕاندن، گوڕڕاندن" و هتد. ئەم وشانە دەبێ بە لاسا کردنەوەی دەنگ پێک هاتبن.

ڕەوا **rewa** ‏[ *rawā* ] - "بەحەق، دادپەروەرانە": روا ravā ‏(P.)‏. دەشێ لە بنەوشەی ڕەو -rew وەرگیراوبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑ڕۆیشتن royıştın.

[تێبینی: مەبەست لە "ڕەوا" دە بنەڕەتدا ئەو شتەیە کە کە بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵگا دەلوێ، دەبێ، بەرهەڵستی لەپێش نییە. شیاوی باسە کە وشەی ↑لوان luwan "شیان" پێوەندی بەم وشەوە هەیە. دە زمانی ئەڵمانیدا کاتێک ئاماژە بەوە دەکەن کە کارێک نابێ [جێ بەجێ نابێ، ناتوانرێ (جێ بەجی) بکرێ، دەڵێن: es geht nicht واتا "ناڕوا"، سەر بە کرداری gehen "ڕۆیشتن". دیارە مەبەست لە "ناڕوا"ی ئەڵمانی هەمان "نالوێ"ی لای خۆمانە. وەک باسیش کرا، "ناڕوا" و "ناڵوێ" دەشێ لە ریشەدا هەر یەکن].

ڕەوار **rewar** ‏[ *rawār* ] - "پێچکەی لانک": خزمە دەگەڵ ↑ڕۆیشتن royıştın.

ڕەواق **rewaq** ‏[ *rawāq* ] - "ڕنگاڵ، هەنگوینی هەڵچۆڕاو": خزمە دەگەڵ ↑ڕاوەک rawek "پاڵوێنە" و دواتر ↑*ڕیپۆق rîpoq*.

ڕەوان **rewan** ‏[ *rawān* ] - "رووح، وەزکێ": روان rawān ‏(P.)‏. ئەم ناوە ڕەنگە لەوەڕا هاتبێ کە مرۆڤانی کەونارا وایان بیرکردۆتەوە "ڕەوان" بە پێچەوانەی لەش، پێوەندی بە کات و شوێنەوە نییە، بەڵکوو دەتوانێ لە لەش دەرباز بێ و سنوورەکانی کات و شوێن تێپەر بکا. لەم تێڕوانینەوە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑ڕۆیشتن royıştın. لەباری مانای وشەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "وەزکێ" [وەزکێ دان]، هەروەها دەگەڵ "رووح" دە زمانی عەرەبیدا کە خزمە دەگەڵ کرداری *اروح* "دەرۆم".

ڕەوت **rewt** ‏[ *rawt* ] - "جۆری ڕۆیشتن": لە بنەوشەی ڕەو -rew وەرگیراوە و خزمە دەگەڵ ↑ڕۆیشتن royıştın.

ڕەوتین **rewtîn** ‏[ *rawtīn* ] - "داوەرینی گوڵ و گیا، گەڵارێزان": خزمە دەگەڵ ↑ڕووت rūt "ڕووت و قووت، بێبەرگ". ڕەوتین بە مانایەکی دیکە هەمان ڕووت بوونەوەی دار و دەوەنە.

ڕەورەوە **rewrewe** ‏[ *rawrawa* ] - "چەرخ، ڕەوەڵە": بنەی وشەکە ڕەو -rew ە و دەچێتەوە سەر کرداری ↑ڕۆیشتن roıştın.

ڕەوس(ە) **rews(e)** ‏[ *raws(e)* ] - "خۆیانی گیرەکراو": خزمە دەگەڵ reif ‏(G.)‏، rīfi ‏(OG.)‏، rijp ‏(Nl.)‏، ripe ‏(E.)‏ "گەیشتوو، ئامادەی لێکردنەوە، پێگەیشتوو". ئەم وشانە دەچنەوە سەر کردارێک بە مانای "دروونەوە، لێکردنەوە، ڕنینەوە" (ی بەر و بۆم). دە زمانی ئینگلیزی کۆندا وشەکە rīpan ‏(OE.)‏ بووە. دەچێتەوە سەر ریشەی ***< *reip-*** ***(IE.)*** و دواتر ***< *re-*** ***(IE.)*** "ڕنین، پچڕین، لێکردنەوە".

ڕەوش1 **rewş 1** ‏[ *rawš* ] - "خشڵ و زەنبەر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ڕۆشن roşın و ↑ڕۆژ roj سەر بەریشەیەک بە مانای "ڕووناکی بەخشین، درەوشانەوە".

ڕەوش2 **rewş 2** ‏[ *rawš* ] - "بار و دۆخ": دەچێتەوە سەر *روش raveš* ‏*(P.)*‏ "ڕێباز، ڕەوت".

ڕەوش3 **rewş 3** ‏[ *rawš* ] - "جوانی و گەشایی کوڵمە":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ڕەپ rep "ڕەق، ئەستوور، قەڵەو". دیارە زۆر لە پێوانەکانی جوانی سەردەم بە سەردەم دەگۆڕێن و لە سەردەمانی پێشوودا لەش و دەموچاوی پڕ و گۆشتن بە جوانتر زانراوە لە هی زراڤ و باریکەڵە".

2- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ڕەوش1 rewş 1 "خشڵ و زەنبەر".

ڕەوشت **rewışt** ‏[ *rawıšt* ] - "ئاکار، ئەخلاق": دەچێتەوە سەر *روش raveš* ‏*(P.)*‏ "ڕێباز، ڕەوت".

ڕەونج **rewınc** ‏[ *rawınj* ] - "لەش ڕەق بوون لە سەرمان، ڕەقیتە": خزمە دەگەڵ ↑ڕەپ rap "ڕەق بوون، ئەستوور بوون".

ڕەوە **rewe** [1] ‏[ *rawa* ] - "پۆل، دەستە، گەلە": رمه rame ‏(P.)‏. ئەم وشەیە چ پێوەندییەکی بە "ڕەووین(ەوە)" و "رمیدن"ی فارسییەوە نییە و وشەیەکی سەربەخۆیە. خزمە دەگەڵ rīm ‏(OG.)‏ "ڕیز، ڕیزبەندی، تەرتیب، هەژمار"، rīm ‏(OE.)‏ "هەژمار، ژماردن، حیساب کردن"، rīm ‏(OIs.)‏ "حیساب،

رۆژژمێر"، rīm (OIr.) "هەژمار"، arithmós (Gr.) "هەژماردن، هەژمار". بەم پێیە روون دەبێتەوە کە مەبەست لە "رەوە" یان "رەمە" بریتییە لە "هەژمار"، واتا کاتێک باس لە رەوەیەک ئەسپ یان بەراز کراوە، مەبەست هەژمارێک بووە. ئەم وشانە دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ گەلێک وشەی دیکە خزمن کە لەژێر ↑راشەن raşen دا شی کراونەوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Reim (G.) "قافیە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. پێوەندی دوو چەمکی "قافیە" و "ریز" [مانای کۆنی وشەکە دە زمانی ئەڵمانیدا] باشتر دەر دەکەوێ، ئەگەر سەرنجی وشەی "رەدیف" بدەین [رەدیف و قافیە].

رەوە² **rewe** [ *rawa* ] - "حەپەی سەگ": ↑رەو rew.

رەوە³ **rewe** [ *rawa* ] - "داری گەزۆ تەکاندن": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ rama (OG.) "پایە، کۆڵەکە"، ramtis (Lit.) "کۆڵەکە، داری خانوو"، rambha- (OIn.) "کۆڵەکە، داردەست". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ئارام aram.

رەوەز **rewez** [ *rawaz* ] - "ریزەبەرد، چین چینە بەردی چیا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Reif (G.)، rope (E.)، rep (Sw.)، reep (Nl.) "نەوار، پەت، گوریس، بەند". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Reihe (G.) "ریز" و دەچنەوە سەر ریشەی **< *re(i)- (IE.)** "رنین، برین، کڕاندن". ئەم وشەی دوایی خۆی خزمە دەگەڵ ↑ریز rîz ی کوردمادی. بەم شێوەیە مانای بنەرەتی "رەوەز" بریتی دەبێ لە "ریز" یان "نەوار". وەک دەبینین ئەم مانایەش دە زمانی کوردمادیدا پارێزراوە (بڕوانە مانای وشەکە).

رەو(ە)ق **rew(e)q** [ *raw(a)q* ] - "کۆتەرەن ئەستوورایی": خزمە دەگەڵ ↑رەپ rep "رەق، ئەستوور".

رەوەند **rewend** [ *rawand* ] - "1- کۆچەر 2- جەریان": لە بنەوشەی رەو -rew وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر کرداری ↑رۆیشتن royiştın.

رەویتن **rewîtın** [ *rawītın* ] - "تاشین، هەڵکەندن": رەوێرتن rewêrtın و رەوێشتن rewêştın یش دەگوترێ. هەروەها رەوێژە(ک) reweje(k) هەیە بە مانای "تیخی کەوچک کۆڵین". خزمە دەگەڵ raufen (G.)، rīepan (OE.) "هەڵکەندن، رنینەوە"، rauh (G.) "زبر"، ruere (L.) "هەڵکەندن، کۆڵین"، rudus (L.) "بەردی لەت وکوت کراو"، rumpere (L.) "شکاندن"، rauti (Lit.) "هەڵکەندن، رنینەوە"، ryt (Rus.) "هەڵکەندن"، سەر بە ریشەی **< *reu(p)- (IE.)** "پچڕاندن، هەڵکەندن، کڕاندن، کۆڵین". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑راو raw و ↑رووت rut دە زمانی کوردمادیدا.

رەوین(ەوە) **revîn(eve)** [ *rawīnawa* ] - "هەڵاتن، دەرچوونتیکی سووک و خێرا". رمیدن ramīdan (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑را ra [را کردن].

رەوێشتن **rewêştın** [ *raweštın* ] - " هەڵکەندن لە بەرد": خزمە دەگەڵ ↑رووت rŭt و رەپاندن repandın.

رەه **reh** [ *rah* ] - "رەگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑رەگ reg، سەر بە ریشەی **< *reu-, *re-, *ere- (IE.)** "بزووتن" [هەروەها بڕوانە را³ ra کردن].

رەها **reha** [ *rahā* ] - "ئازاد، نەبەستراوە": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *reu-, *re-, *ere- (IE.)** "بزووتن" [هەروەها بڕوانە را³ ra کردن]. ئاشکرایە پێکهاتەیەکی رەها بەپێچەوانەی پێکهاتەیەکی بەستراو و بەندکراو، دە دۆخی بزووتندایە یان توانای بزووتنی هەیە.

رەهاڵ **rehal** [ *rahel* ] - "جیازی بووک": رەهێل rehel یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە ↑راشەن raşen ەوە هەبێ.

رەهاندن **rehandın** [ *rahāndın* ] - "دەست یان کلك راوەشاندن": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ هێندێک وشە وەک rinnen (G.) "جاری بوون"، rennen (G.) "راکردن"، rnoti (OIn.) "هەستا، بزوا"، ruere (L.) "پەلە کردن، راکردن"، ronit (Rus.) "خستن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *reu-, *re-, *ere- (IE.)** "بزووتن، رەوان بوون، جاری بوون".

**رەهستن rehıstın** ] *rahıstın* [ - "رووان، شین بوون": رستن rosten ‎(P.)‎. بنەی -ros(t) ی ئەم کردارە فارسییە بۆ کاتی رابردوو بەکار دێ و بۆ کاتی ئێستا دەبێتە رووی rūy [رست rost واتا رووا، می روید mī rūyad واتا دەروێ]. خزمە دەگەڵ ↑راسان rasan سەر بە ریشەیەک بە مانای "هەڵدان، بەرز بوونەوە، سەرکەوتن"، بە تایبەتی بەرهەڤی بکە دەگەڵ rise ‎(E.)‎ "هەستان، بەرز بوون(ەوە)".

**رەهن rehın** ] *rahın* [ - "بیبیلەی چاو": پێوەندی هەیە بە ↑رهنک rıhnık و ↑رووناک runak.

**رەهندە1 rehınde 1** ] *rahında* [ - "ماڵ بە کۆڵ، عەودال، ئاوارە": خزمە دەگەڵ ↑رەها reha "ئازاد، نەبەستراوە".

**رەهندە2 rehınde 2** ] *rahında* [ - "پان و پۆڕ": خزمە دەگەڵ ↑رەسین resîn "گەیشتن، پێگەیشتن"، سەر بە ریشەیەک بەمانای "لەبەر یەک کشانەوە، پەل هاویشتن، بڵاو بوونەوە".

**رەهۆل rehol** ] *rahol* [ - "قەڵشی هەراو لەزەویدا": خزمە دەگەڵ ↑رەخنە rexne و دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑ریش rîş سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، ڕنین، پچڕین، کڕاندن".

**رەهەند rehend** ] *rahand* [ - "خەندەک، ئاودڕ، ئاوەڕۆ": سەر بە ریشەی < *(IE.) *rendh-* "ڕنین، دڕین". ↑ڕنین *rınîn* ی کوردمادی و -rándhra ‎(OIn.)‎ "دەرز، قەلش" لەم ریشەوە هاتوون. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێ بە مانای "دەرز و قەڵش [لە زەویدا]" بە کارهاتبێ و هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رەندۆڵ rendol "ئاودڕ". فۆتیمی h لە وشەکەدا زێدەیە.

**رەهێشتە rehêşte** ] *rahešta* [ - "ئەسڵ، نەجیبزادە": خزمە دەگەڵ ↑رەگ2 reg 2 "بنەچەک، تۆرەمە".

**رەهێل rehel** ] *rahel* [ - "رێژنە، تاوەباران": بنەوشەی رەه -reh هەرئەوەیە کە بە جۆرێکی دیکە دە وشەکانی رێژنە rejne و رگبار ragbār [رەگ rag + بار(ان) (bar(ān)]دا دەبینرێ. دەچێتەوە سەر ↑رشتن rıştın.

**رەی rey** ] *ray* [ - دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "ئەندازە، کێش، پڕی، قورسایی (گەنمەکەم ئەمساڵ پووکە، رەی نییە)". ئەم وشەیە دەبی پێوەندی هەبێ بە ↑رەوس(ە) (rews(e) "خۆیانی گیرەکراو"، reif ‎(G.)‎، rīfi ‎(OG.)‎، rijp ‎(Nl.)‎، ripe ‎(E.)‎ "گەیشتوو، ئامادەی لێکردنەوە، پێگەیشتووە"، rīpan ‎(OE.)‎ "دروونەوە، ڕنینەوە، لێکردنەوەی بەر و بۆ"، سەر ریشەی < *(IE.) *reip-* و دواتر ریشەی < *(IE.) *re-* "ڕنین، پچڕین، لێکردنەوە". لەم تێڕوانینەوە مانای بنەڕەتی وشەکە "حاسڵ، دەسکەوتی دروونەوە"یە. کاتێک دەگوترێ "ئەمساڵ گەنمەکەم رەی نییە"، مەبەست ئەوەیە کە گەنمەکە حاسڵ یان بەرهەمی (پێویستی) نەداوە. لەوانەیە ↑رەن ren "خۆیانی راخراوی هێشتا گیرە نەکراو" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا ernten بە مانای "دروونەوە، لێکردنەوەی بەر و بۆم" دێ و Ernte بە مانای "حاسڵ، خەرمان، دەسکەوتی دروونەوە"].

**ری rî** ] *rī* [ - "روخسار، چڕ و چاو": شێوەیەکی سواو لە ↑ریت1 rît 1 بیچم، وێنە".

**ریال rıyal** ] *rıyāl* [ - "قڕان، دەیەکی تمەنی ئێرانی، پووڵی سعوودی": وەرگیراوە لە < *(E.) royal* "پادشایی، پادشایانە" < *(OF.) roial* < *(L.) rēgālis*. ئەم پارەیە بە ناوی دەسەڵاتداریی پادشایی ئەو وڵاتانە کراوە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "قڕان" کە ئەویش دە ئەسڵدا وشەیەکی فەرەنگییە و بە مانای "تاج"ە.

**ریان rîyan** ] *rīyān* [ - "پیسایی لەش دانە دەرەوە": ریدن rīdan ‎(P.)‎. ئەم وشەیە و چەند وشەیەکی دیکە وەک ↑ریخ rîx و ↑ریقنە rîqne دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ریخۆڵە *rîxole* و ژمارەیەک وشەی دیکە بە مانای "بزووتن، جاری بوون، دەرباز بوون". لەوانەیە rheín ‎(Gr.)‎ "جاری بوون، جاری کردن" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

ریپاڵ **rîpal** [ *rīpāl* ] - "جلکی شڕ و دڕ": خزمە دەگەڵ ↑ڕەپاندن repandın سەربە ریشەیەک بە مانای "پچڕین، دڕین، لێکردنەوە".

ریپۆق **rîpoq** [ *rīpoq* ] - "چڵکی چاو": ریپ + پاشگری ئۆق [ئۆک] rîp + oq. بنەوشەی "ریپ" بە شێوەیەکی دیکە دە وشەکانی ↑ڕاوەک rawek "پاڵوێنە" و ↑ڕەواق rewaq "شیرەی هەنگوین" [هەڵچۆڕاوی هەنگوین، هەنگوینی پاڵێوراو]دا دەبینرێ. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ rein (G.) "خالیس، بێگەرد" [دەبنەڕەتدا: پاڵاوتە]، cribrum (L.) و criathar (OIr.) "پاڵوێنە" و دەچنەوە سەر ریشەی < *(IE.) *(s)krēi-* "دەڵاندن، چۆڕاندن، تکاندن" و ئەم ریشەیە خۆی دەچێتەوە سەر < *(IE.) *(s)ker-* "بڕین، جودا کردن(ەوە)، لێکردنەوە". ئەم وشەیە بەرهەڤ بکە هەروەها دەگەڵ ↑ریڤۆک rîvok "شەمەترێلکە".وشە کوردییەکانی سەرەوە بەتایبەتی دەگەڵ وشەی لاتینییەکە هەڵسەنگینە. فۆتیمی سەرەتای وشە لاتینییەکە دە زمانی کوردیدا سواوەتەوە، هەر وەک چۆن دە زمانی ئەڵمانیشدا سواوەتەوە. هەروەها وێ دەشێ ↑ڕێل rel "ئاونگ، شەونم" و ↑رینگانەوە rînganewe بە مانای "شیرە دانەوەی دۆشاو" پێوەندیان بەم وشانەوە هەبێ.

[تێبینی: بەم جۆرە دەردەکەوێ کە "ریپۆق" مانایەکی ناحەزی نییە و هیچ پێوەندیشی بە "ریان" یان "رین"ەوە نییە، بەڵکوو ماناکەی شتێکە وەک Sekret دە زمانی ئەڵمانیدا بە مانای "تەڕایی دەرچوو لە لەش". ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر secretum ی لاتینی بە مانای "جوداوەبوو"].

ریت1 **rît 1** [ *rīt* ] - "1- بزگوڕ 2- بیچم، وێنە": خزمە دەگەڵ ↑ریش rîş.

ریت2 **rît 2** [ *rīt* ] - "بزووتنی لە نەکاو": خزمە دەگەڵ↑ ڕەت ret [ڕەت بردن، ڕەت دان].

ریتاڵ[1] **rîtal** [ *rītāl* ] - "ریخ": دەچێتەوە سەر ↑رین rîn.

ریتاڵ[2] **rîtal** [ *rītāl* ] - "جلکی شڕ": دەچێتەوە سەر ↑ریش rîş. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ریشاڵ rīšāl.

ریتق **rîtıq** [ *rītıq* ] - "جیقنە": دەچێتەوە سەر ↑رین rîn.

ریتک1 **rîtık 1** [ *rītık* ] - "تیتوڵ"، هەروەها دەگەڵ "پیتک" دێ [ریتک و پیتک rîtık û pîtık]. خزمە دەگەڵ ↑ریش rîş و دەبێ بە واتای "لەت و پەت" بێ.

ریتک2 **rîtık 2** [ *rītık* ] - "بزووتنەوەی توند": خزمە دەگەڵ ↑ڕەت[1] ret [ڕەت بردن، ڕەت دان].

ریتک3 **rîtık 3** [ *rītık* ] - "لای خوارەوەی سک": دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑ریخۆڵە rîxole و رودە rūde (P.) "ریخۆڵە".

ریتکە **rîtıke** [ *rītka* ] - "1-هەوەڵ شیری تیکەڵ بە ژەک 2- هەویری شل و خۆ نەگرتوو": خزمە دەگەڵ ↑ڕشتن rıştın و ڕژان rıjan و ↑ریچاڵ rîçal "شیرەمەنی" و هتد.

ریچ(ە) **rîç(e)** [ *rīč(e)* ] - "1- ددانی گڕ و بەرچاو 2- ددان دە چیرەوە بردن لە تووڕەیی 3- گرژ و ناوچاوان ترش": ریچۆ rîço بە مانای "ددان گڕ" دێ، هەروەها ریکە rîke هەیە بە مانای "سیرەی ددان". وشەی سیرە [چیرە] دە بنەڕەتدا مانای "توند، ڕەق، سفت" دەدا. هەر بۆیە وشەی ریچ [ریچە] دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ڕچیان rıçyan "بەستن، مەیین، توند بوون" و ↑ڕەق *req* و ↑ڕژد rıjd.

ریچاڵ **rîçal** [ *rīčāl* ] - "شیرەمەنی": خزمە دەگەڵ ↑ڕشتن rıştın.

ریخ **rîx** [ *rīx* ] - "پیسایی ئاژەڵ": خزمە دەگەڵ ↑رین rîn و ↑*ریان rîyan*.

ریخنە **rîxne** [ *rīxna* ] - "جیقنە": ریقنە rîqne ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ریخ rîx "پیسایی ئاژەڵ".

ریخۆڵە **rîxole** [ *rīxola* ] - "ڕێگەی دەرباز بوونی هەڵتاوێنراو لە لەش": ڕۆخڵە roxle، ڕۆدی rodî و رووڤی ruvî یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ریخ rîx و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بزووتن، جاری بوون، لە بزاڤدا بوون". "ریخ" و "ریان" دە بنەڕەتدا بریتییە لە "دەرباز بوون لە لەش" و "ریخۆڵە"ش شوێنی دەرباز بوونەکەیە. ژمارەیەک لە وشەکانی سەر بەو ریشەیە لەژێر ↑ڕا[3] *ra* [ڕا کردن]دا باس کراون. یەکێک لەم وشانە بریتییە لە ↑ڕووبار rubar "چەم". "ڕووبار" واتا ئەو شتە کە دەرباز دەبێ

یاخود جارییە. بە فارسی وشەکە دەبێتە رود rūd (.P)، بە ئینگلیزی river (.E) کە ئەمەیان لە پێوەندی دایە لەگەڵ rīvus (.L) "چەم، رووبار". ئەگەر سەرنجی ئەم چەند وشە و جۆری فۆنێیمەکانیان بدەین، ئەوسا دەبینین کە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە، واتا رۆدی rodî و رووڤی ruvî بە مانای ریخۆڵە بە تەواوی یەک دەگرنەوە.

**ریز rîz** [ *rīz* ] - "رەدیف، سەف": رج raj (.P) بە هەمان مانا. خزمە دەگەڵ Reihe (.G)، rang (.G)، "ریز، پلە و پایە"، riga (.OG) "خەت". دە زمانی هیندی کۆندا rikha (.OIn) بە واتای "خەت خەت" هاتووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> -(i)re* (.IE)** "رنین، برین، کراندن".

**ریس rîs** [ *rīs* ] - "بەن": ↑رستن rıstın.

**ریسوا rîswa** [ *rīswā* ] - ↑رسوا ruswa.

**ریسە rîse** [ *rīsa* ] - دەگەڵ "مل" دێ [ریسەی مل]. دەشێ هەمان ↑رەگ[1] reg بێ [رەگی مل].

**ریش rîş** [ *rīš* ] - "ردین": دە زمانی کوردمادیدا هاومانا دەگەڵ ردین بەکاردەهێندرێ، بەڵام دە زمانی فارسیدا تاکە وشەیە بۆ "ردێن". لە باسی وشەی "ردێن"دا باس کرا کە وشەکە پێوەندی بە چەمکی "برین، پچرین، رنین، تاشین، کراندن"ەوە هەیە. هەربەم جۆرە دەبێ ریش rîş یش پێوەندی بە چەمکێکی ئەوتۆوە هەبێ. ئەوەی ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا، بوونی هێندێک وشەی پێوەندیدارە کە دەربڕی ئەم مانایەی سەرەوەن، وەک ↑ریشاڵ rîşal [ریزاڵ rîzal]، ↑ریشوو rîşû [ریشوە rîşwe]، ↑ریتک و پیتک rîtık "وردە و پردە"، ↑ریت rît "بزگور، کوتەپەڕۆ"، ↑رێزە reze "کەمووکە" [دە بنەڕەتدا کوتێک، بڕێک] و هتد. وەک دەبینین چەمکی سەرەکی و هاوبەش دە هەموو ئەم وشانەدا چەمکی "برین، دڕین، لەت و کوت کردن، لێکردنەوە"یە. ریش دە زمانی کوردمادی و فارسیدا بە مانای "برین، بریندار"یش بەکاردێ، بە تایبەتی لە دەقە هونراوەییەکانی پێشوودا. ئەم وشەیە دەبێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی ژێرمەنی وەک riß (.G) "دەرز، قەڵش"، riz (.OG) "خەت، کێر، دێر"، writs (.Got) "خەت"، writ (.OE) "خەت، پیتی نووسین"، rit (.OIs) "نووسین". [خەت و نووسین دە بنەڕەتدا بەشێوەی کراندن و رنین و قەڵش خستنەسەر دار و بەرد بووە]. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر کردارێک کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هێندێک مانای جیاواز بەڵام نیزیک لە یەکتری هەیە، وەک reien (.G) "پچرین، دڕین، لەت و کوت کردن"، ritzen (.G) "کراندن، دراندن"، rizan (.OG) و writan (.OE) "کراندن، نووسین، وێنەکێشان"، rita (.Sw) "وێنەکێشان". بەم جۆرە دەبینین کە وشە کوردمادییەکان مانای بنەڕەتی ریشەکە، کە بریتییە لە "برین، کراندن، پچراندن"، بە تەواوی پاراستووە. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەکان جگە لە ئاماژەکردن بەم مانایە و هەرلەسەر بنچینەی ئەم مانایە هێندێک مانای دیکەشیان وەرگرتووە، وەک "خەت، پیت، نووسینن وێنەکێشان". شیاوی سەرنجە کە ئەم مانایەی دوایی دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا بەدی دەکرێ. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑ریت rît جگە لە مانای "تیتۆڵ" مانای "بیچم و وێنە"ش دەدا و هەروەها ↑رایشان rayşan "لەبەر نووسینەوە" و ↑رایش rayş "لەبەر نووسراو" و ↑راچیتە raçîte "نوسخەی پزیشک" هەن، کە پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە دیارە. دە زمانی فارسیدا رد rad (.P) هەیە بە واتای "شۆپ، شوێن و ئەسەر" و "رد گرفتن" واتا " کەوتنە شوێن، رۆیشتن بەدوای شۆپدا". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **> -uer* (.IE)** "کراندن، دراندن، قەڵشاندن".

**ریشاڵ rîşal** [ *rīšal* ] - "بزگوری باریک باریک": ریزاڵ rîzal یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ریش rîş.

**ریشوو rîşû** [ *rīšū* ] - "ریشاڵ": ریشوە rîşwe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ریش rîş.

**ریشۆڵ rîşol** [ *rīšol* ] - "سێروو": خزمە دەگەڵ ↑رەش reş.

**ریشە rîşe** [ *rīša* ] - "بنی دارو دەوەن": ریشە rīše (.P). خزمە دەگەڵ rhiza (.Gr). ریشەی ئەم وشە یۆنانییە باس نەکراوە. دە زمانی یۆنانیدا هەروەها rha, rhon (.Gr) هەیە بە مانای "بنچک، پنچک" کە

لەوانەیە پێوەندی بە وشەکەی سەرترەوە هەبێ و دواجاریش پێوەندییان بە ↑رەگ reg ەوە هەبێ [رەگ و ریشە].

**ریف rîf** *[ rīf ]* - "قاش، کووز": وشەکانی قاش و کووز دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای"برین، درین، جیا کردنەوە". هەربەم چەشنە ریف rîf یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە هەمان مانا و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑راوraw، ↑رفاندن rıfandın، ↑رەپاندن repandın و ↑رۆپڵاندن roplandın و هتد.

**ریڤ rîv** *[ rīv ]* - "تووکەبەر": رووڤ ruv و رووی ruy یش دەگوترێ. هەر وەک چۆن وشەکانی "ردێن" و "ریش" دەچنەوە سەر دوو ریشە کە مانای" برین، پچرین، رنین" دەبەخشن، وشەی ریڤ rîv یش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە هەمان مانا و خزمە دەگەڵ ↑ریف rîf "قاش، کووز"، ↑رەوتین rewtîn"تاشین، هەڵکەندن" و ↑رۆپڵاندن roplandın "هەڵپەرتاوتن" و هتد.

**ریڤن rîvın** *[ rīvın ]* - "پیس، چڵکن": بنەوشەی -rîv خزمە دەگەڵ ریم rīm (.P) "چڵک، زووخاو". خزمە دەگەڵ ↑ریڤۆک rîvok "شەمەترێلکە". هەر چەند مانای ئەم دوو وشەیە، وەک لە گەلێک شوێنی دیکەدا، عەرز تا ئاسمان جیاوازە، بەڵام ریشەکەیان یەکە و مانای "دەڵاندن، دانەدەرەوەی تەڕایی، چۆڕاندن، تکاندن" دەدا. لە وشەی "ریڤن"دا مەبەست دەڵاندنی چڵک و کێم لە لەشە، لە وشەی "ریڤۆک"دا دەڵاندنی هەنگوین لە لەشی مێشەکە مەبەستە.

**ریڤۆک rîvok** *[ rīvok ]* - "شەمەترێلکە، شەمەتلێنکە، هەنگیکی رەشکەڵەیە هەنگوینێکی زۆر خۆش دروست دەکا": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ریپۆق rîpoq دا باس کراون. ئەم وشانە دە بنەڕەتدا بە مانای "دەڵاندن، دانەدەرەوەی تەڕایی، چۆڕاندن، تکاندن" دەبەخشن. "ریڤۆک" دە بنەڕەتدا واتا "دەڵێنەر(ی بچووک)" و ئاماژەیە بە دەڵاندن و دەردانی هەنگوین وەک تەڕاییەک لە لەشی ئەو هەنگە. ئەگەر سەیری وشەکانی "شەمەترێلکە" یان "شەمەتلێنکە" بکەین، ئەو راستییە باشتر روون دەبێتەوە. "شەمە" ئاماژەیە بە رەنگی رەش و تاریکی زیلەکە و خزمە دەگەڵ "شێو" [شام] بە مانای "ئێوارەی درەنگ، تاریکان". کەرتەی وشەی "ترێلکە" یان "تلێنکە" هەمدیسان ئاماژەیە بە دەڵاندن و تەڕایی دانەدەرەوە و خزمە دەگەڵ چەند وشەی وەک "تەڕ"، "دڵاندن" و "دڵۆپ" و هتد. لە وشەی شەمەترێلکەشدا پاشگری "ئێلکە" پاشگری گچکاندنە و ئاماژە بە بچووک بوونی زیندەوەرەکە دەکا.

**ریق rîq** *[ rīq ]* - "سیس هەڵاتوو، ژاکاو": دە زمانی فارسیدا ریقو rīqū (.P) بە مانای "لەڕ و بێهێز" بەکار دێ. خزمە دەگەڵ Rücken (.G)، ruki, (h)ruki (.OG)، hrycg (.OE)، ridje (.E)، rug (.NL)، rygg (.SW)"پشت" و hrukka (.OIs)، rynke (.Norw)، rynka (.Sw)، "قەد، لۆ، چرچ و لۆچی". ئەم وشانە دەچنەوە سەرە ریشەیەک بە مانای "خوار بوون(ەوە)". دە زمانەکانی دیکەشدا هێندێک وشە پێوەندییان بە وشەکانی سەرترەوە هەیە، وەک kriáuklas (.Lit) "پەراسوو"، kruknet (.Let) "خوار دانیشتن"، kruncati (.OIn) "خوار دەبێ(تەوە)"، curvus (.L) " پێچ، خواری"، circus (.L) "جەغز"، سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)ker- >* "سووڕان، با دران، خوار بوون". هەروەها schräg (.G) "خوار" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە پەیدا دەکا. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەک لەم چوارچێوەدا جێ دەگرن، وەک ↑چرچ çırıç [هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشە ئەڵمانییەکەی پێشتر]، ↑کووریانەوە kuryan(ewe) "بەزەویدا درێژ بوونی سەوزە لە سەرمان" و ↑کورژان kurjan "چرچ بوون" و لەوانەشە ↑خڕ xır.

**ریقنە rîqne** *[ rîqna ]* - "جیقنە، پیسایی پەلەوەر": خزمە دەگەڵ ↑ریخ rîx، ↑رین rîn و ↑ریان *rîyan* "پیسایی لەش دانان".

**رین rîn** *[ rīn ]* - "پیسایی دانان": ↑ریان rîyan یش دەگوترێ.

**رینک rînık** *[ rīnık ]* - "لەڕ و لاواز": خزمە دەگەڵ Runzel (.G)، runke (.MG)، rynka (.Sw)، rynke (.Nor)، hrukka (.OIs) "چین، چرووک"، skrynka (.Sw) "چرچ و لۆچ بوون"، shrink (.E)،

schrinken (MNl.) "چرچ بوون، چکۆڵە بوونەوە، تیکەوەچوون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چرچ ↑چرچ *çırıç* و ↑چرووک çırûk.

**رینگانەوە rînganewe** *[ rîngānawa ]* - "شیرەدانەوەی دۆشاو": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑ریپۆق rîpoq "چلکی چاو".

**ریوە ewe** *[ rīwa ]* - ریوەریو واتا "پرتەپرت، زۆربلێیی": خزمە دەگەڵ ↑رەو rew [رەوەرەو واتا حەپەحەپ".

**ریوەڵ(ە) rîwel(e)** *[ rīwal(a) ]* - "کز و لاواز": بنەوشەی ریو -rîw شێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑ریق rîq "سیس هەڵاتوو، ژاکاو"، [ریقو rīqū (P.)]"لەڕ و بێهێز".

**ڕێ re 1** *[ re ]* - "شەقام، شوێنی پێدارۆیشتن": راه rah (P.). خزمە دەگەڵ road (E.) "جادە"، ride (E.) و rīdan"بەسواری رۆیشتن"، raithya (Av.) "رێگە" و ratha (OP.) و (OIn.) "چەرخ، گاری"، Rad (G.)، rad (Nl.) و ratas (Lit.) "چەرخ"، سەر بە ریشەی **< *ret(h)- (IE.)** "گەڕان، رۆیشتن، تلان، خلۆر بوونەوە". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑رەت ret [رەت بوون واتا تێپەڕین].

**ڕێ re 2** *[ re ]* - "پێشگری کردار": لە چەند کردارێکی وەک "رێخستن، رێخشاندن، رێک کوشین"دا دەردەکەوێ. پێشگری ڕێ -re دە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە دوو کەرتی رە + وێ [ئەو] re + we و دەبێ سەرەتا "رە وێ خشاندن" گوترابێ واتا "رە ئەو خشاندن" و دواتر کرابێتە "رێخشاندن". ئەمجار ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەسڵی پێشگری re، ئەوا دەبێ هەروەک پێشگری "لە" le [لێ خستن، لێ خشاندن]، کە شێوەیەکی دواتر گۆڕداروی re یە، بیانبەستینەوە بە upari (Av.)، hyper (Gr.)، super (L.)، ubar (OG.)، over (E.)، över (Sw.)، بر ber (P.) و هتد بە مانای "سەرەوە، لەسەر، بەسەر".

**ڕێبوار rebwar** *[ rebwār ]* - "رێڤینگ": ری + بوار re + b(u)war. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر (را) بواردن (ra)buwardın یان بوورین burîn بە مانای "تێپەر بوون، رەت بوون". کەواتە وشەکە دەبێتە ئەوکەسەی رێگە دەبرِی [راستر: رێگە *دەبوورێ*، چونکە رێگە نابڕدرێ!].

**ڕێجە rece** *[ reja ]* - "بۆتەی زێرینگەران": پێوەندی هەیە بە ↑رشتن rıştın [دارشتن]ەوە.

**ڕێچکە reçke** *[ rečka ]* - ↑رچە rıçe.

**ڕێخ rex** *[ rex ]* - "بنج، بێخ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ریشە rîşe.

**ڕێز rez** *[ rez ]* - "قەدر و حورمەت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ریز rîz "رەدیف، سەف، پلە و پایە". لەم مانایەوە، مانای "رێز" سەری هەڵداوە، چونکوو کەسانی خاوەن رێز، کەساتێک بوون کە لە کۆمەڵگادا خاوەنی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی بوون.

[تێبینی: ئەوەندەی لە بیرم بێ، پێوەندی ئەم دوو وشەیە لە بیرەوەرییەکانی مامۆستا دڵزار دا ئاماژەی پێ کراوە].

**ڕێزک rezık** *[ rezık ]* - "ڕێ وشوێن، قانوون" : هەروەک ↑رێسا resa "رێوشوێن، قاعیدە و قانوون" خزمە دەگەڵ ↑راست rast و هەروەها Regel (G.) "رێوشوێن، رێسا".

**ڕێزل rezıl** *[ rezıl ]* - "زنجیر": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ریز rîz. مەبەست لە وشەکە دەبێ "دانەی ریزکراو" بووبێ.

**ڕێز(ە) rez(e)** *[ reza ]* - " کەمووکە، وردە": ریز rīz (P.) "ورد، گچکە". خزمە دەگەڵ ↑ریش rîş سەر بە ریشەیەک بە مانای "پچڕین، بڕین". هەروەک چۆن وشەی "بڕێک " بە مانای کەمێک لە کرداری "بڕین"ەوە هاتووە، بەم جۆرەش رێز (ریز) پێوەندە بە وشەی "ریش"ەوە، کە ئەویش دە بنەڕەتدا مانای "بڕین، پچڕین" دەبەخشێ.

**ڕێژاو rejaw** *[ režaw ]* - "1- یەکاو، جێگەی پێک گەیشتن یاخود "تێکرژان"ی دوو چەم 2- تاڤگە": رێژ + ئاو rej + aw. کەرتی رێژ دەچێتەوە سەر ↑رشتن rıştın.

**رێژنگ rêjıng** ‌[ režıng ] - "ڕەشاش، موسەلسەل": هەر وەک کرداری ↑رێژنە rejne باران و دەسترێژ destrejدەچێتەوە سەر کرداری ↑*ڕشتن rıştın*.

**رێژە reje** ‌[ reža ] - "نیسبەت، ئەندازە":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑ڕادە rade.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە rate ‌(E.) "ئەندازە یان نرخ بە نیسبەت ئەوی دیکە". وشە ئینگلیزییەکە دەچێتەوە سەر ratus ‌(L.) و دواجار rērī ‌(L.) "نرخاندن، هەڵسەنگاندن، بیر کردنەوە". لەوانەیە ئەم وشەیە دەگەڵ ئەو وشانە خزم بێ کە لەژێر ↑ڕاشەن raşen دا شی کراونەوە.

**رێژە reje** ‌[ reža ] - "بۆتەی زێرینگەری": رێجە rece ش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە ↑ڕشتن rıştın [دارشتن]ەوە.

**رێژەو rejew** ‌[ režaw ] - "ڕادەی بەرهەمی کشتو کاڵی، بڕشتی خەلە": رێژەن rejen و رێژان rejan یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑رێژە reje "نیسبەت، ئەندازە".

**ڕێسا resa** ‌[ resā ] - "یاسا، پێڕەو، ڕێبازی دیاریکراو": خزمە دەگەڵ ↑ڕاست rast. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هێندێک وشە کە بە مانای یاسا و ڕێسا دێن، خزمن دەگەڵ ئەو وشەیەی کە لەو زمانانەدا بە مانای ڕاست دێ. دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە Recht ‌(G.) "ماف، حەق"، Gericht "دادگا"، Regel "ڕێسا" و recht "ڕاست" گشتیان لە یەک ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادی و فارسیدا (ڕاست و ریس کردن) یش بەکاردێ و لێرەشدا دەتوانین وشەی ریس rîs هەر لەم پێوەندییەدا لێک بدەینەوە.

**ڕێڤینگ revîng** ‌[ revīng ] - "ڕێبوار": بنجی وشەکە ڕێڤ -rîv یان ڕێڤین -revîn خزمە دەگەڵ ↑ڕەوینەوە revîn(ewe) و ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑*ڕمان rıman* دا باس کراون. ئەم وشانە مانای "بزووتن" دەبەخشن. [جێی بیر هێنانەوەیە کە "بزووتن" خزمە دەگەڵ "باز" [ڕێباز، دەرباز] و هەروەها خزمە دەگەڵ ئەو وشانە کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای "ڕێگا" دەدەن. لەم بارەوە بڕوانە بڕوانە "باز"]. وشەی "ڕێبوار" بە جۆریکی دیکە دروست کراوە و پێک هاتووە لە "ڕێ" و "بوار"، سەر بە کرداری "بواردن، بووردن، بوورین"، واتا تێپەڕین و دەرباز بوون. بەم جۆرە مانای "ڕێبوار" دەبێتە "تێپەڕکەر یان دەربازکەری ڕێگا".

**ڕێک-¹ -rek** ‌[ rek ] - "پێشگرێکی کردارە": دەگەڵ هێندێک کردار دێ وەک ڕێککوشین، ڕێکخستن، ڕێککەوتن و هتد. دە بنەڕەتدا ئاوا بووە: ڕە + یێک re + yek [ڕە یەک یان ڕە یێک کوشین، ڕە یێک خستن] و دواتر بووەتە ڕێک rek [ڕە یێککوشین ← ڕێککوشین]. پێک pek یش بەم چەشنە دروست کراوە [بە یێک be yek بووە و دواجار بووەتە "پێک": بە یێک گەیشتن ← پێک گەیشتن].

**ڕێک² rek** ‌[ rek ] - "ڕاست": خزمە دەگەڵ recken ‌(G.)، recchen ‌(OG.)، rakjan ‌(Got.)، reccan ‌(OE.)، räcka ‌(Sw.) "لەبەریەک کێشانەوە، ڕاست کردن (ەوە)"، سەر بە ریشەی **_(IE.) *reg- >_** "لەبەر یەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، ڕاست کردن (ەوە)". وشەی ↑ڕاست rast یش لەم ریشەوە هاتووە.

**ڕێل rel** ‌[ rel ] - "ئاونگ، شەونم": وێ دەچێ پێوەندی هەبێ بە ↑ڕیپۆق rîpoq "چڵکی چاو".

**ڕێنج renc** ‌[ renj ] - "شوێن، ئاسەوار":

1- دەشێ لە ↑ڕنین rınîn ەوە وەرگیرابێ و مەبەست دە بنچینەدا شوێنی جێماو بەهۆی ڕنین و کڕاندن و خەت تێخستن بووبێ. ئەگەر ئەم بۆچوونە ڕاست بێ، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ڕدێن rıdên [ڕندێن rındên]، واتا ئەو شتەی دەکرێندڕێ و دەتاشرێ.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ڕەد red ‌(P.) "شوێن، ئاسەوار"ەوە هەبێ کە ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی دیکە بە مانای "برین، ڕنین" [لەم حاڵەتەدا دەبێ فۆتیمی ن n خزابێتە ناو وشەکەوە]. ئەگەر ئەم شیمانەیە ڕاست بێ، ئەوا وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ڕیش rîş.

**رێنکە renke** *[ renka ]* - "لێک تۆپەڵ بوون و وەستان"؛ ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Ruhe (G.)، ruowa (OG.)، roe (MNl.)، rōw (E.)، ro (Sw.) "پشوو، وچان، لەکار وەستان، حەسانەوە"، erōē (Gr.) "سست و ماندوو بوون، وچان"، Rast (G.) rest (E.) "وچان، حەسانەوە، مەنزڵ"، سەر بە ریشەی < *er(ə)-, *rē- (IE.) "وچان دان". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑رەعت reɛt [کۆنتر: رەهت reht یان رەست rast؟] بە مانای "ماندوویی" و ↑رۆست rost "دێ، ئاوایی" پێوەندیان بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**رێواس rewas** *[ rewās ]* - "گیایەکی خواردنی"؛ رێبێس rıbes و ربیز rıbîz یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Rhabarber (G.) "ریواس". وشە ئەڵمانییەکە دەچێتەوە سەر زمانی یۆنانی: rha, rhon + barbaros (Gr.) واتا "بنچکی بیانی" [بەربەر]. دە زمانی رووسیدا بە رێواس دەگوترێ reven (Rus.). بە گوێرەی بۆچووتێک وشەکە لە زمانی فارسی وەرگیراوە. ئەوە کە وشە یۆنانییەکە لە زماتیکی دیکە وەرگیرابێ، زۆر رێی تێ دەچێ و خودی وشەی "پنچکی بیانی" ئەم راستییە دەسەلمێنێ. بەڵام زمانی سەرچاوە دەبێ کوردمادی بووبێ، چونکوو یۆنانییەکان لە کۆندا دەگەڵ کوردەکان هاوسێ بوون و بێگومان ناوەکەیان لە هاوسێکانی خۆیان وەرگرتووە، نەک لە فارسەکان کە چەند هەزار کیلومیتر لێیان دوور بوون.

**رێوی rewî** *[ rewī ]* - ↑رۆڤی rovî.

# ز (Z)

زا **za** *[ zā ]* - "1- سا، جا [سا وەرە] 2- نۆبە لە گەمەدا": شێوەیەکی دیکە لە ↑جار car "بار، کەڕەت".
[تێبینی: وشەی "جار" دە بنەڕەتدا مانای "کات" دەبەخشێ و ئاماژە بە کاتێکی دیاریکراو دەکا. سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "جار" و "نۆبە لە گەمەدا"، جێی ئاماژەیە کە وشەکانی *کات* "دەم"،*کەشە* "جار" و*کایە* "گەمە" (دە بنەڕەتدا: نۆبە لە گەمەدا) پێوەندییان پێکەوە هەیە].

زاب **zab** *[ zāb ]* - "سەکۆ، دەکە": خزمە دەگەڵ ↑زۆپ zop "زەق، دەرپەڕیو".
[تێبینی: هەردوو وشەی "سەکۆ" و "دەکە"ش دە بنەرەتدا یەک وشەن و مانای "زەق و دەرپەڕیو بوون دەبەخشن].

زابۆق **zaboq** *[ zāboq ]* - "ئاودڕ، دادڕاوی لافاو": خزمە دەگەڵ ↑زاپ zap "لکی چەم".

زاپ **zap** *[ zāp ]* - "1- لکی چەم 2- گچکەبەردی پان و لووس": بە مانا دووەمەکەی ↑ساپ sap و سواپ suwap یش دەگوترێ. بە هەردووک ماناوە دەچێتەوە سەر ↑ساوین sawîn یان سوون sun. "زاب" بە مانای لکی چەم ئاماژەیە بە شوێنەی هەرد کە بە هۆی لافاو سواتەوە و قووڵایی دروست بووە. لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑زابۆق zaboq "ئاودڕ، دادڕاوی لافاو". هەروەها لە باری ماناوە هەڵیسەنگێنە دەگەڵ "ڕەندۆڵ" کە ئەویش دەچێتەوە سەر کرداری "ڕنین" و مەبەست شوێنێکە لە زەوی کە ئاو ڕنیویەتی. مانای دووەمیش دەشێ ئاماژە بێ بە پان و تەنک بوونی گچکەبەرد لە ئەنجامی سواوەنەوەدا.

زات **zat** *[ zāt ]* - "بوێری، ئازایەتی": [دە بنەڕەتدا: هێز و پتەوی]، خزمە دەگەڵ ↑سێتە1 sete "چیا"، ↑سیتەک sîtek "بەردەڵان، تمتمان" و ↑چیا çîya و Stein (G.) "بەرد". ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە دێن، بە مانای "سەخت، پتەو". لەباری ماناوە ئەم وشانە هەڵسەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی دیکە کە ئەوانیش پێکەوە خزمن، واتا "بەرد" و "پاڵەوان"، یان دوو خزمەوشەی دیکە، واتا *کەڕا* "گاشەبەرد" و *گورد* "ئازا، پاڵەوان"، هەروەها بڕوانە شیرۆڤەی ژێر "هەندرین"].

زاج **zac** *[ zāj ]* - "کاکۆڵی زارۆک": ساچ saç یش دەگوترێ [ساچ و پەرچەم]. خزمە دەگەڵ ↑سیخ sîx و دواجار ↑زەق *zeq*. لەباری پێوەندی دوو چەمکی "کاکۆڵ" و "سیخ بوون" بە یەکدی، هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "پۆڕ". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سیخ بوون، زبر بوون".

زاجلانی **zaclanî** *[ zājlānī ]* - "ژانی ژن لە کاتی زارۆ هاوردا": زا + جلانی za + c(ı)lanî. کەرتی زا zaدەچێتەوە سەر ↑زان zan. کەرتی جلانی c(ı)lanî دەچێتەوە سەر ↑چلیان[1] çılyan "لێدان، چڵە دان". منداڵدانی ژن لەکاتی زاندا جاربەجار لێدەدا، واتا چڵان دەدا. لەبەر ئەمە بەو دۆخە دەگوترێ "زاجلانی" یان "ژان". وشەی "ژان"یش دە بنەڕەتدا بە مانای "لێدان"ە و خزمە دەگەڵ "ژەندن" و "ژەنین" و چەندین وشەی دیکە.

زاخ **zax** *[ zāx ]* - "1- بەردێکی کریستالی 2- گاشەبەرد": بە مانای یەکەم زاج zac یش دەگوترێ. زاج zāj (P.)، ئەم وشەیە و هەروەها ↑زاخان zaxan، ↑زاخۆر zaxor "بەردەڵانی ڕژد"، ↑زگار zıgar "ورکەبەرد" و ↑زوخرە zuxre "ورکەبەرد". دەشێ وشەی صخرة saxra (Arb.) پێوەندی دەگەڵ زاخۆر zaxor هەبێ. ئەم وشانە پێوەندییان بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەیە:

1- saxum (L.) "بەرد، تیشەبەرد"، سەر بە ریشەی ***sek-*** > ***(IE.)*** "بڕین، قەڵشین" و sahs (G.)، seax (OE.)، sax (OIs.) "چەقۆ". وشەی ↑چەقۆ çeqo خزمە دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکان.

2- ↑سەق seq و ئەو وشانەی لەوێدا باس کراون. ئەم وشانە چەمکی "سەخت، بەهێز" لە خۆ دەگرن. پێوەندی تیوان دوو چەمکی "سەخت، پتەو، بەهێز" و "بەرد" لەو وشانەی خوارەوەشدا دەبینرێ: *خار*

"سەخت" و *کەرا* "بەرد"، *تاو* "هێز، گوشار"، *تەوەن* "بەرد"، *کەڤر* [ کەمر] "بەرد" و *خاو* [خام] "نەگەیشتوو، نەکوڵیو" [دە بنەڕەتدا: رەق، سەخت]. هەروەها دوو وشەی "بەرد" و "پاڵەوان" پێکەوە خزمن.

زاخ² **zax** [ *zāx* ] - "کیڕ، خەت": زاغ zaġ یش دەگوترێ، هەروەها ↑زاغوور zaġûr هەیە بە مانای "خەتکێش". جگە لەمە دە زمانی کوردمادیدا ↑زاخە zaxe "ئەشکەوتی گەورە" [دە بنەڕەتدا قەڵشەبەرد، قەڵشەشاخ] و زاخوڕ zaxur "رەهۆڵ" پێوەندیان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە سەر بەو خێزانە وشە گەورەیەن کە گەلێک وشەی لێ دەکەوێتەوە، وەک ↑چەقۆ çeqo، ↑شاقەل şaqel، ↑شکاندن şıkandın، ↑شکیڕ şıker، ↑ئەشکەوت eşkewt [ئە+ شکەوت] و گەلێکی دیکە سەر بە ریشەی ***sek-** < **(IE.)*** "بڕین، قەڵشین، لەت کردن، جودا کردن". شیاوی باسە وشەکانی "خەت" و "کیڕ" یش دە ریشەدا هەر مانای "بڕین و قەلشین" دەدەن.

زاخڕ **zaxır** [ *zāxır* ] - "1- سەرەوژێری بەردەلان 2- ئاغەڵی لە کێودا براو": دەچێتەوە سەر ↑زاخ zax.

زاخوڕ **zaxur** [ *zāxur* ] - "رەهۆڵ": خزمە دەگەڵ ↑زاخ² zax سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشین".

زاخۆر **zaxor** [ *zāxor* ] - "1- بەردەڵانی رژد 2- ئەشکەفت": ↑زاخ zax.

زاخە **zaxe** [ *zāxa* ] - "ئەشکەوتی گەورە": زاغە zaġe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زاخ² zax سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشین".

زاخی **zaxî** [ *zāxī* ] - "قشقەڵە": زاغ zāġ (P.). خزمە دەگەڵ ↑زیقە zîqe، هەروەک چۆن "قشقەڵە"ش دەچێتەوە سەر"قیژە".

زار1 **zar** [ *zār* ] - "دەم، دەڤ": خزمە دەگەڵ Kiefer (G.)، keve (Nl.)، ceafl (OE.)، käft (Sw.) "شەویلکە" و zafar (Av.) "زار" و gop (OIr.) "دەم"، سەر بە ریشەی ***ĝheb-** < **(IE.)*** "دەم، شەویلکە، خواردن". دە زمانی کوردمادیدا فۆتیمی ف f کە دە وشە ئەوێستاییەکە و دە وشە ژێرمەنییەکاندا هەیە، سواوەتەوە. گۆڕانی وشەکە بەم جۆرە بووە: zar ← zafar. ئەم جۆرە گۆڕانە دە ژمارەگەلێک وشەی کوردی و هەروەها فارسیدا دەبینرێ، بۆ وێنە خواستن و خاستن، چوار و چار، خوار [دە فارسیدا "خوار" دەنووسرێ، بەڵام "خار" دەگوترێ]، توانین [دە دیالێکتی سنەییدا: تانین] و هتد. "زار" دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەپۆ kepo، ↑قەپاڵ qepal، ↑گاپن gapın، ↑گوپ gup و هتد. پێوەندی ئەم وشانە لەژێر ↑کون *kun* دا شی کراوەتەوە.

زار2 **zar** [ *zār* ] - "پەریشان، بێچارە": زار zār (P.) "کز و داماو": خزمە دەگەڵ zarīk (Pl.) "خەم و خەفەت". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Sorge (G.)، saurga (Gt.)، sorrow (E.)، sorg (Sw.) "خەم و خەفەت"، serg (OIr.)"نەخۆشی"، sirgti (Lit.) "نەخۆش بوون"، soroga "مرچ و مۆن". ریشە؟

2- kar (MG.)، chara (OG.) "خەم، ناڵە" kara (Gt.)، care (E.) "خەم، نیگەرانی، خەم لێخواردن"، سەر بە ریشەی ***ĝar-** < **(IE.)*** "بانگ کردن، هاوار کردن، قیژاندن". gerys (Gr.) "قیژە، بانگ"، gāir (OIr.) "قیژە" لەم ریشەوە هاتوون.

زار3 **zar** [ *zār* ] - "1- زەوی [زەوی و زار] 2- پاشگری شوێن [گوڵزار]": مانای ئەسڵی وشەکە "زەوی، کێڵگە" یان باشتر بڵێین "کەرتەزەوی"یە. بە شێوەی ↑جاڕ2 car یش دەبینرێ [تێرگسجار].

زار⁴ **zar** [ *zār* ] - "تووکەبەر": هەروەها زار(ە)گا zar(e)ga بە مانای "بەرگەدە، جێگەی تووکە بەر" دێ. دە ریشەدا خزمە دەگەڵ ↑زار3 *zār* و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "بڕین، پچڕین، لێکردنەوە، لەت کردن" دەکەن، وەک ↑شڕ şır، ↑کێرد *kerd*، ↑کەرت kert و هتد. هەروەک چۆن "رندێن" [ردێن] پێوەندی بە "رنین"ەوە هەیە، ئەوهاش "زار" پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

**زارانج zaranc** [ *zārānj* ] - "کەو": زارانز zaranz و ↑ژەرەژ jerej یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە Star (G.)، stara (OG.)، stare (E.)، stare (Sw.)، sturnus (L.) "مەلێکی ئاوازەخێن"، stern (NL.)، starn (E.) "پەرەستێرکەی دەریایی". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگی مەلەکەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سێروو seru "رەشۆڵە، ریشۆڵە" [سار sar (P.)]. دە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی ئێستادا وشەکە دەگەڵ پاشگری گچکاندنی ling- بەکار دێ [ Starlin]. دە زمانی کوردمادیشدا کەرتی دوایی وشەکەی، واتا ج c، زج ، ژ j پاشگری گچکاندنن.

[تێبینی: فۆتیمی n دە هەر دوو وشەی "زارانز" و "زارانج"دا ناوگرە و بۆ هاسانبێژی خزاوەتە ناو وشەکەوە. ئەم فۆتیمە دە هێندێک وشەی دیکەشدا دەبینرێ، وەک تانج [تاج]، درنج، ئامانج، کرمانج، قولانج و هتد].

**زارۆ(ک) zarok** [ *zāro(k)* ] - "مندال": زارۆ + ک zaro + k [زارۆلە zaro + le ش دەگوترێ]. دەچێتەوە سەر وشەی ↑زان zan "بەدونیا هێنان". دە زمانی ئەلمانیشدا Kind (G.) "زارۆک" خزمە دەگەڵ وشەی زان zan و ئەویش دەچێتەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش دەگەڵ وشە کوردمادییەکان.

**زارە1 zare** [ *zāra* ] - "زراو": زهرە zahre (P.). خزمە دەگەڵ Galle (G.)، gall (E.)، chole (Gr.)، zāra (OIn.)، zulučí (OSl.) "زارە". خزمە دەگەڵ ↑زەرد zerd.

**زارە2 zare** [ *zāra* ] - "گەنمەکوتاو":

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑هاڕین harîn.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ زار³ zar و زار⁴ zar سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، پچڕین، جودا کردن، لەت کردن".

**زاری zarî** [ *zārī* ] - "گریان": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ Kar (G.)، care (E.)، chara (OG.) "خەم و خەفەت"، سەر بە ریشەی *(IE.) *gar- >* "بانگ کردن، هاوار کردن، هەرا کردن". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑جاڕ car [جاڕ کێشان].

**زارین zarîn** [ *zārīn* ] - "گریان": ↑زاری zarî.

**زازا zaza** [ *zāzā* ] - "ناوی بەشێک لە دانیشتوانی کوردستان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq "سەخت، پتەو"دا باس کراون. بۆچوونێک هەیە کە باس لەوە دەکا لە شێوەزارەی ئەم خەڵکەدا دەنگی z بە فراوانی بەکار دێ و ناوەی ئەوانیش لە دووبارەبوونەوەی za دروست بووە [za-za] و ئاماژە بەم دەنگە دەکا. من گومانم لەم بۆچوونە هەیە و زۆرتر لەم باوەڕە دام کە بنجی وشەکە زاز -zaz ە و زازایی zazayî و زازاکی zazakî لەم بنجە وەرگیراون. ئەم بنجە دەگەڵ چەندین وشە و لەوانە ناوی هۆزەکانی دیکەی کوردستان یەک دەگرێتەوە و دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "سەخت و بەهێز بوون" دەکا، وەک ↑زۆخ zox "هێز و توانایی"، ↑زیخ zîx "ئازا و بوێر"، ↑زۆق zoq "هیشک و زبر"، ↑زیک zîk "زۆر سارد"، ↑شەق şeq "سەخت، دژوار"، ↑سەگوەن segwen "ناوی هۆزێکی کورد"، ↑سەکر sekır "ناوی هۆزێکی کوردستان"، ↑زوکری zukrî "ناوی هۆزیکی کوردستان"، ↑زاگۆر zagor "پەیاغ، چۆماغ"، ↑شکاک şıkak"ناوی هۆزێکی کوردستان"، ↑سیسارک sîsark [sîs-ark] "لاشخۆر" [دەبنەڕەتدا: باڵداری بەهێز] و لەوانەشە ↑سیس sîs [دە بنەڕەتدا: هیشک هەڵاتوو ؟]، ↑ساسۆن sason "ناوی چیایەکی کوردستان" و ↑سەق *seq* "داربەڕووی ئەستوور" و هتد. جێی ئاماژەیە کە ناوی زۆرێک لە مەڵبەند، چیا و هۆزەکانی کوردستان و هەروەها ناوی نەتەوەی خودی "کورد" دەچنەوە سەر ئەو ریشانەی کە ئاماژە بە چەمکی "سەخت و بەهێز بوون"، دەکەن. لەم بارەوە بڕوانە وشەی "سۆران".

**زاڤ1 zav** [ *zāv* ] - "زۆر": زاف zaf و زەعف zeɛf یش دەگوترێن. شێوەیەکی دیکە لە ↑زۆر¹ zor "فرە". هەردووک شێوەی "زاڤ" [زەعف] و "زۆر" دەچنەوە سەر وشەیەکی کۆنتر.

**زاڤ zav 2** [ *zāv* ] - "هەسارەیەکی گەڕیدە، مێرکوور": زاوە zawe و ساوە sawe ش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە هەبێ بە ↑زڤرین zıfrîn "سووڕان(ەوە)".

**زاڤر zavır** [ *zāvır* ] - "(پێ) وێران، پێ وەستان، زەفەر پێ بردن": ↑زەفەر zefer.

**زاڤێر zaver [1]** [ *zāver* ] - "زورتر، فرەتر": هەرچەند ئەم وشەیە بەم جۆرە لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا مانا کراوەتەوە، بەڵام وا دەردەکەوێ کە وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "زاڤ، زۆر" بووبێ نەک " زۆرتر". دە زمانی کوردمادیدا ئەگەر وشەیەک پاشگری "تر" وەرنەگرێ، نابێتە ئاوەڵناوی باڵاتر و دە وشەی "زاڤێر" دا ئەم پاشگرە نییە. هەر دوو وشەی ↑ زاڤ zav و ↑*زۆر zor* گۆڕدراوی ئەم وشە کۆنەن.

**زاڤێر zaver [2]** [ *zāver* ] - "رەحەت بوونی ژن": زاوێر zawer یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑سەبر sebır "ئارامی، لەسەرەخۆیی". سەبر لای کوردانی باکوور مانای "ئاسوودەیی"یش دەدا [سەبرا من نایە].

**زاق zaq 1** [ *zāq* ] - "قیژە": دەگەڵ "زووق" دێ [zaq u zuq]، شێوەیەکی دیکە لە ↑زیقە zîqe.

**زاق zaq 2** [ *zāq* ] - "قەڵەرەشە": زاغ zāġ (P.)، خزمە دەگەڵ ↑زاق zaq 1 "قیژە". ئەم پەلەوەرە لەبەر زاق و زیقەکەی بەم جۆرە ناودێر کراوە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "قشقەڵە" کە ئەویش پێوەندی بە "قیژە"وە هەیە، واتا "قەلی قیژەکەر".

**زاق zaq 3** [ *zāq* ] - "دەرپەڕیو": شێوەیەکی دیکە لە ↑زەق zeq.

**زاق zaq [4]** [ *zāq* ] - "تۆقین لە ترسان": هەروەک چۆن وشەکانی "تۆقین" و "تەقین" پێوەندییان بە وشەی "دڕان"ەوە هەیە، بەم جۆرەش "زاق" خزمە دەگەڵ ↑شەق şeq [شەق و شڕ]، زاک zak، زاخ zax "خەت، کێڕ"، ↑چاک çak [3] "قەڵش، دەرز" و هتد. پێوەندییەکە لەمەدایە کە شتێک کاتێک دەتەقێ، ئەوا دڕبەدڕ و شەق و شڕ دەبێ.

**زاغوور zaġûr** [ *zāġūr* ] - "خەت کێش": دەچێتەوە سەر↑ زاخ zax [2] "خەت، کێڕ".

**زاک zak** [ *zāk* ] - "لەتکی دەنکەقەیسی": خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax "بەرد".

[تێبینی: سەبارت بە پێوەندی دوو چەمکی "دەنک، ناوکی میوە" و "بەرد" هەڵی سەنگینە دەگەڵ *کەڤر* "بەرد" و *قەوار* "ناوک، کاکڵ" یان دەگەڵ *هەستی* "ناوکی میوە، ئێسک" [ئێستک] و Stein (G.) "بەرد"].

**زاکوون zakun** [ *zākūn* ] - دەگەڵ "زیبک" دێ [بە زیبک و زاکوون zîbk u zakun واتا بە دەسەڵات و بە بڕشت لە بەڕێوەبردندا]. دەچێتەوە سەر *sakon* (*Rus.*) "قانوون، یاسا".

**زاگ zag** [ *zāg* ] - "هەوەڵ شێری دوای زان": شێوەیەکی دیکە لە ↑ژەک jek.

**زاگرۆس zagros** [ *zāgros* ] - "زنجیرەچیایەک لە کوردستان": زاگرۆز zagroz یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax 1 "1- بەردێکی کریستالی 2- گاشەبەرد"، ↑زاخان zaxan، ↑زاخۆر zaxor "بەردەڵانی رژد"، ↑زگار zıgar "ورکەبەرد" و ↑زوخرە zuxre "ورکەبەرد". لەوانەیە ئەم وشانە پێوەندییان هەبێ بە ↑سەخت sext و ژمارەیەک وشە کە لەژێر ↑*سەق seq* دا باس کراون بە مانای "سەخت"، بەتایبەتی ↑زاگۆر zagor "پەیاغ، چۆماغ". ناوی چەندین چیای سەختی کوردستان و هەروەها چەندین وشەی کوردمادی کە مانای "بەرد" دەبەخشن، پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. کەرتی ئۆس os- یان ئۆز oz- دەبێ هەر ئەو پاشگرە بێ کە کە لەژێر ↑ئۆز oz- دا شی کراوەتەوە. لەم تێڕوانینەوە مانای "زاگرۆس" دەبێتە "بەردەڵان، شاخاوی" یان "سەخت و بەردین".

[تێبینی: هێندێک جار دەبیسترێ کە دەڵێن وشەی "زاگرۆس" وشەیەکی یۆنانییە. رەنگە ئەمەش لەبەر بوونی کەرتەوشەی ئۆس os- بێ کە وەک نیشانەیەکی گراماتیک دە زمانی یۆنانیدا بەرچاو دەکەوێ. لەم بارەوە جێی بیر خستنەوەیە کە ئۆس os یان ئۆز oz وەک پاشگری بە ئاوەڵناو کردن دە دۆخی جەخت کردندا دە گەلێک وشەی زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا بەکار دەهێنرێ و لەوانەیە بۆ پاشگر یان

دۆخێکی ڕێزمانی مادی کۆن بگەڕێتەوە، واتا شتێک وەک پاشگرە یۆنانییەکە بێ. ئەوە کە ئایا "ئۆس"ی کوردمادی پێوەندی بە "ئۆس"ی یۆنانییەوە هەیە یان لەو وەرگیراوە، جێی لێکۆڵینەوەیە. بەڵام تەنانەت ئەگەر "ئۆس" دە وشە "زاگرۆس"دا ریشەی یۆنانیشی هەبێ، ئەوە هێشتا بەو مانایە نییە کە وشەکە خۆی یۆنانی بێ. پێوەندی (کەرتە)وشەی zag(r) لەم وشەیەدا بە چەندین وشەی دیکەی کوردمادی ئاشکرایە. لەوانەیە یۆنانییەکان بەپێی گراماتیکی خۆیان گۆڕاتیکیان لە وشەکەدا پێک هێنابێ یان کەرتی "ئۆس"یان بە وشەکەوە لکاندبێ. ئەم جۆرە گۆڕانکارییە دە زمانەکاندا زۆرجار بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە دە زمانی فارسی ئەمڕۆییدا کاتێک دە وشەیەکی بیانیدا کۆنسۆنانتی s یان š دەگەڵ کۆنسۆنانتێکی دیکە لە سەرەتای وشەکەدا دێن، بزوێنی e دەخرێتە سەر وشەکەوە، یان دەکەوێتە نێوان دوو کۆنسۆنانتەکەوە، چونکوو بەبێ ئەو بزوێنە گوتنی وشەکە بۆ ئاخێوەری فارس زمان ناگونجێ. بۆ وێنە ski دەبێتە eski یان star دەبێتە estar].

**زاگۆر zagor** *[ zāgor ]* - "پەیاغ، چۆماغ": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq. ئەو وشانەی لەژێر "سەق"دا باس کراون، بەگشتی ئاماژە بە چەمک ومانای "سەخت و پتەو بوون" دەکەن. لەم مانایەوە مانای "هێز، زەخت و زەبر"یش سەرچاوە دەگرێ. لەم بارەوە بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە دوو وشەی "گورد" و "گورز" بکەین، یەکەمیان بە مانای "بەهێز" و دووەمیان بە مانای "گوپاڵی شەڕ".

**زاڵ zal 1** *[ zāl ]* - "زۆر پێ شکاو، دەرەقەت هاتوو، سەرکەوتوو": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- sahuri (OIn.) "زاڵ، سەردەست". ئەم وشەیە لەژێر ↑سفت sıfıt "توند، سەخت"دا باس کراوە.

2- ↑زەفەر zefer [زەفەرپێ بردن واتا بە سەردا زاڵ بوون، زۆر پێ شکان]. ↑زۆر zor [زەخت و زۆر] شێوەیەکی نوێترە لە زەفەر. لەوانەیە "زاڵ"یش شێوەیەکی گۆڕدراوی دیکە لەم وشەیە بێ.

[تێبینی: لەباری گۆڕانکاری فۆنۆلۆژییەوە دەتوانین دەگەڵ وشەی زار zar "دەم" هەڵیسەنگێنین کە دەچێتەوە سەر zafar (Av.) "زار"، یان دەگەڵ زاڤێر zaver و زۆر zor [زۆر و زەوەند] کە هەردووکیان مانای "فرە" دەدەن و وشە دووەمییەکە گۆڕدراوی وشەی یەکەمە. هەروەها دەتوانین دەگەڵ زڤار zıvar یان زیوار بە مانای "بزگوڕ" هەڵی سەنگێنین کە شێوەیەکی دیکەشی پەیدا کردووە، واتا ↑زۆڵ zol (زۆڵەچەرم)].

**زاڵ zal 2** *[ zāl ]* - دەگەڵ "زبڵ" دێ [زبڵ و زاڵ zıbıl û zal]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چاڵ² çal [چڵتە و چاڵ]. وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "توێکڵی دەخڵ و دان"ە و مەبەست لە زبڵ و زاڵیش دە بنەڕەتدا ئەو پووش و چڵتە و چاڵە بووە کە بەهۆی شەن و کەو کردن ماوەتەوە و فڕێ دراوە.

**زاڵتە zalte** *[ zālta ]* - "پێوەندی لە زنجیر": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑جاڵ cal "بەن، هەودا، بەند".

**زاڵە¹ zale** *[ zāla ]* - "زارە، زراو": شێوەی کۆنتری ↑زارە zare "زراو"، Galle (G.)، gal (Nl.)، gall (E.) و هتد.

**زاڵە² zale** *[ zāla ]* - "داد و هاوار":

1- وێ دەچێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑زاری zarî "گریان و هاوار". لەم تێڕوانینەوە مانای "وە زاڵە هاتن" دەبێتە "وە گریان کەوتن، وە هاوار کەوتن".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑*زایەڵە zayele* "دەنگ دانەوە" و ↑سکاڵا sıkala سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)kel- <* "دەنگ لێ هاتن، دەنگ لێ بڵیند بوون، هاوار کردن".

**زام zam** *[ zām ]* - "برین": زخم zaxm (P.). دەتوانین هەڵیسەنگێنین دەگەڵ ↑شۆم şom "کێڵدراو" [دەبنەڕەتدا: بڕاو، قەڵشاو، لەیەک جیاکراو].

**زامق zamıq** *[ zamıq ]* - "چەسپ، سرێش": دە عەرەبیدا صمغ samġ (Arb.) "شیرەی دار، چەسپی دار"، دە ئەڵمانی و ئینگلیزیدا Gummi (G.) وGum (E.) "چەسپ، چەقە". ئەم وشانە دەگەڕێنە بۆ سەر زمانی

میسری کۆن و لە ڕێگەی زمانی یۆنانی kómmi (.Gr) و لاتینی gummis (.L) هاتوونەتە ناو زمانەکانی دیکەوە. وشەی فارسی انگم angom (.P) دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ [ an-gom].

**زان¹ zan** [ *zān* ] - "بەدونیا هێنان": زاین zayın یان زایین zayîn ش دەگوترێ. زادن zādan (.P). خزمە دەگەڵ janati (.OIn) "دەزێ"، (g)natus (.L) "لەدایك بوو"، gignomai (.Gr) "بە دونیا دێم"، gignere (.L) "زان"، gainethar (.OIr) "زان"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *gen- >*** "زان". بۆچووتیك هەیە کە دەڵێ ئەم ریشە خۆی بۆ ریشەی "ئەژنۆ" [ریشەی *genu-** ] دەگەڕێتەوە، چونکە ژنان لەکاتی زاندا چۆك دادەدەن. ئەم وشەیە دەبێتە خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی کوردمادی وەك ↑زایا zaya "تۆرەمە، وەچە، بەرە"، ↑نەژاد nejad "رەگەز، تۆرەمە"، ↑زاناڤ zanav "هاوشێوە، هاورەگەز"، ↑ژن jın "بە دونیا هێنەر، زایەن"، ↑کەنی kenî "کچ"، ↑گەنج genc "لاو"، زارۆ zaro "منداڵ"، ↑کۆنتۆ konto "گویلپار" و هتد.

**زاناڤ zanav** [ *zānāv* ] - "وەك یەك، هاوشێوە": زان + ئاڤ zan + av. ئاڤ av شێوەیەکی دیکەیە لە ↑هاو haw. کەوابوو "زاناڤ" بە شێوەیەکی دیکە دەبێتە "هاوزان hawzan". "زان" خۆی شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گۆن gon واتا "شێوە، نەوع"، دە زمانی فارسیدا دەگوترێ گون gūn (.P) و سان san (.P) [همگون hamgūn (.P) یان همسان hamsan (.P) واتا "وەك یەك، هاوزان، زاناڤ"]. وشەکە خۆی خزمە دەگەڵ genus (.L) "جینس، نەوع، نەژاد، تیپ" و دەچێتەوە سەر وشەی زان¹ zan "بەدونیا هێنان". جێی بیرهێنانەوەیە کە وشەی جنس jins (.Arb) لە وشە لاتینییەکە وەرگیراوە.

**زاندۆر zandor** [ *zāndor* ] - "ئەشکەفتی سەهۆڵخانە": پێك هاتووە لە دوو کەرتی زان + دۆر zan + dor. کەرتی زان zan دەبی دە ئەسڵدا زام *zam** بووبێ، هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑زستان zıstan [زمستان zımıstan، زڤستان zıvıstan]. کەرتی دۆر dor شێوەیەکی دیکەیە لە ↑دۆڵ dol یان دەرە dere، واتا جێگای قووڵ و قووپاو.

**زانقلە zanqıle** [ *zānqala* ] - "هێشوویەکی بچووك کە لە هێشوویەکی گەورە لێ دەکرێتەوە": بڕوانە ↑زەنگەتە zengete.

**زانك zanık** [ *zānık* ] - "زمانە چکۆڵە": زان + ك zan + ık. زان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زمان zıman. دە شێوەزاری زازاییدا زمان دەبێتە زۆن zon.

**زانەوە zanewe** [ *zānawa* ] - "دەرکەوتن و کۆ بوونەوەی ئاو": [تەنوورەکەمان زاوەتەوە، کوێرەکانی بەهاران دەزێتەوە]. شێوەیەکی دیکەیە لە ↑تزان tızan "دەرکەوتن یان کۆبوونەوەی تەڕایی لە شوێنێکدا". فۆتیمی t لە "زانەوە"دا سواوەتەوە.

**زانی1 zanî** [ *zānī* ] - "ئەژنۆ": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑(ئە)ژنۆ ejno.

**زانی2 zanî** [ *zānī* ] - "هێمن، ئارام": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شێنی şênî و پێوەندی هەیە بە ↑شێنەیی şêneyî.

**زانین zanîn** [ *zānīn* ] - "ناسین، ئاگادار بوون": دانستن dānestan (.P). بنەی وشەکە زان -zan ە و دەبێتە خزم دەگەڵ kennen (.G) "ناسین" و können (.G) "توانین"، know (.E) "زانین" و can (.E) "توانین"، känna (.Sw) "ناسین"، žinóti (.Lit) "زانین" و gegōna (.Gr) "رادەگەیەنێ، دەداتە زانین"، janati (.OIn) "دەزانێ، دەناسێ"، (g)noscere (.L) "ناسین"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *gen- >*** "ناسین، زانین". وشەی ↑ناسین nasîn یش هەر لەم ریشەوە هاتووە.

**زاوا zawa** [ *zāwā* ] - "مێردی بووك": زاڤا zava ش دەگوترێ. هەروەها زامایی zamayî هەیە بە مانای "زاوایی". داماد dāmād (.P). ئەم وشەیە وشەیەکی کۆنی هیندوئەورووپییە و دە بنەڕەتدا بە مانای "مێر، پیاو" بووە. خزمە دەگەڵ Bräutigam (.G)، brutigomo (.OG)، bruidegom (.Nl)، brydguma (.OE)، brudgum (.Sw) "زاوا" [دە بنەڕەتدا واتا "مێردی بووك"]. ئەم وشە ژێرمەنییانە لە دوو کەرت پێك هاتوون، کەرتی یەکەم بە مانای "بووك"ە و کەرتی دووەم بە مانای "پیاو، مرۆ" یە. ئەم کەرتە دە زمانە

کۆنەکاندا بە مانای "مێر، پیاو" بەکارهاتووە، بۆ وێنە gomo (OG.)، homo (L.)، guma (Gt.)، gumi (OIs.). ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ڕیشەی *(IE.) *ghđem-, *gh(đ)om- <* "زەوی، هەرد". مەبەست لە وشەکە واتا مەبەست لە مرۆڤ سەرەتا "بوونەوەری هەردین، بوونەوەری سەرهەرد، بوونەوەری خاکی" بووە. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زەوی zewî، ↑گیتی getî، ↑قاد qad "هەرد" و ژمارەیەك وشەی دیکە.

**زاور zawır** [ *zāwır* ] - "تاقەت، وێران": زاڤر zavır و زاوەرە zawere ش دەگوترێ. شێوەی کۆنتری ↑زۆر² zor "گوشار، زەخت".

**زاوزێ zauze** [ *zāūze* ] - "زان و زۆر بوون": زاوزۆ zauzo ش دەگوترێ. زا -za پێوەندی بە کرداری ↑زان zanەوە هەیە. زێ ze یان زێچ zeç شێوەیەکی دیکەیە لە زێد zed [↑زێدە zede].

**زاوق zawıq** [ *zāwıq* ] - "جیوە": زیبق zeybeq (P.). شێوەیەکی دیکەیە یاخود شێوەیەکی کۆنترە لە ↑جیوە cîwe و ↑ژووڤە juve.

**زاویتە zawîte** [ *zāweta* ] - "بای ساردی ڕۆژهەڵات": خزم دەگەڵ ↑زستان zıstan [زمسان zımsan/ زڤستان zıvıstan].

**زای zay** [ *zāy* ] - "1- مشت و ماڵ دان 2- ساف کردن": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn.

**زایا zaya** [ *zāyā* ] - "تۆرەمە، وەچە، بەرە": خزمە دەگەڵ ↑زان¹ zan.

**زایلە zayle** [ *zāyla* ] - "دەنگی شیوەن و گریان": خزمە دەگەڵ ↑زایەڵە zayele.

**زایە1 zaye 1** [ *zāya* ] - "پیزە، تۆل": خزمە دەگەڵ ↑زان zan و ↑زایا zaya "تۆرەمە، وەچە".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "زارۆك" و "نەسل، نەوع" لەم وشانەی خوارەوەشدا بەدی دەکرێ: Kind (G.) "زارۆك" و kind (E.) "نەوع" [ human kind واتا نەوعی بەشەر، تیرە و تۆرەمەی مرۆڤ]، هەروەها بێچوو "زارۆك" و وەچە "نەسل"].

**زایە2 zaye 2** [ *zāya* ] - "لەکارکەوتوو، لەناوچوو": ضایع zayiɛ (Arb.). ئەم وشەیە بە ئەسڵ وشەیەکی عەرەبی نییە و خزمە دەگەڵ ↑زای zay "مشتوماڵ" [دەبنەڕەتدا: ساوین، سوانەوە] و ساییدە sāyīda (P.) "سواوە". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی فرسوودە farsūde (P.) "کۆن، پەککەوتە" کە ئەویش خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn.

**زایەڵە zayele** [ *zāyala* ] - "دەنگدانەوە": خزمە دەگەڵ Schall (G.)، scal (OG.)، skall (SW.) "دەنگ، هەرا، سەدا"، Schelle (G.)، schel (NL.) "زەنگ، زەنگوڵە"، scellan (OG.)، sciellen (OE.) "دەنگ دانەوە، زەنگ لێدان"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *(s)kel- <* "دەنگ لێ هاتن". دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کاڵ kal.

**زبارە zıbare** [ *zıbāra* ] - "هەرەوەز، کاری بە کۆمەڵ": زەبارە zebare ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زەوەند zewend [زەبەند zebend]، ↑زاڤ zav و ↑*زۆر¹ zor* هتد. مەبەست لە زبارە، کارێکە کە کەمەڵێك واتا زۆر کەس پێکەوە دەیکەن.

[تێبینی: لەنێوان دوو چەمکی "زۆر و زەوەندی" و "دەستە و کۆمەڵ"دا پێوەندی نیزیك هەیە، بۆوێنە دە زمانی ئەڵمانیدا Volk "گەل" خزمە viel "زاف، زۆر". دە زمانی کوردمادیشدا پۆل pol "کۆمەڵ، دەستە" خزمە دەگەڵ فرە fire و هەروەها دەگەڵ ئەم وشە ئەڵمانییانە].

**زبر zıbır** - "زوور": زبر zebr (P.). شێوەیەکی دیکە لە وشەی ↑زوور zur. چەندین وشەی کوردمادی لە پێوەندی دەگەڵ ئەم وشەیەدا جێی لێکدانەوەن، وەك ↑زبرە zıbre "درشتەی لە هێڵەك دراو، کەپەك، درشتەی ساوار و گەنمەکوتاو"، ↑زبڵ zıbıl "ئاشغاڵ "، [↑سەبر2 sebır یش دەگوترێ] "دە بنەڕەتدا: درشتەی پاش دابێژتن]، ↑زپ zıp "تژە، قەبە، درشت"، ↑زیپکە zîpke [هەڵمساوی، قەڵەوی لەسەر پێست،

زوورایی سەر پێست]، ↑زپرکە zıpırke "زیپکە"، ↑زەبەلاح zebelah و چەندین وشەی دیکە. ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑گەورە gewre "درشت".

2- ↑سیڤە sîve، ↑قەبە qebe، ↑خەپە xepe "درشت" [دە بنەڕەتدا: بەهێز].

**زبرە zıbre** [ *zıbra* ] - "درشتەی لە هێلەک دراو، کەپەک، درشتەی ساوار و گەنمەکوتاو": دەچێتەوە سەر ↑زبر zıbır و ئەم وشەیەش خۆی بە مانای "درشت، گەورە" بووە و هەر لە بەر ئەوەش بەو دەنکە درشتانەی کە دوای دابێژتن ماونەتەوە، گوتراوە زبرە واتا "درشتە". وشەکە پاشان ئاڵوگۆڕێگی فۆنۆلۆژیک و مانایی دیکەی بە سەردا هاتووە و بووەتە ↑زبڵ zıbıl. بە وتەیەکی دیکە وشەیەکی نوێی دیکە لە سەر بنچینەی وشە کۆنەکە هاتووەتە ئاراوە. مەبەست لە وشەی "زبڵ" سەرەتا هەر زبر zıbır یان زبرە zıbre بووە، واتا بەو دەنکە درشتانە گوتراوە، کە پاش دابێژتن و لە هێلەک دان ماونەوە و فڕێ دراون. ئەوجا وشەکە ماناکەی پەرەی سەندووە و هەموو ئەوشتانەی گرتۆتەوە کە بەرماو و بێکەڵک بوون و فڕێ دراون.

**زبڵ zıbıl** - "ئاشغاڵ": ↑سەبر2 sebır یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ زبرە zıbre.

**زپ zıp** - "تژە، قەبە": خزمە دەگەڵ ↑زبر zıbır.

**زپرکە zıpırke** [ *zıpırka* ] - "زیپکە": شێوەیەکی دیکە لە ↑زیپکە zîpke و خزمە دەگەڵ ↑زبر zıbır.

**زپەر zıper** [ *zıpar* ] - "لەسەر پەڕ، لای هەرە سەرەوە یان لای هەرە دوایی لە ریزێکدا": زبر zebar (P.).
[زیر و زبر zīr o zebar (P.) واتا ژێر و ژوور]. خزمە دەگەڵ ↑ژوور jur "سەرەوە".

[تێبینی: لەباری ئاڵوگۆڕی فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "زبر" و "زوور". لێرەشدا وشەی "زبر" کۆنترە و دواتر بووەتە "زوور"].

**زتم zıtım** - "داخستنی دەرگا و پەنجەرە": [دە بنەڕەتدا پێوەدان، پێکدادان، لێکدان(ی دوو پارچە تەختە لە یەکتری)]. خزمە دەگەڵ ↑ساتمە satme "هەڵەنگوتن، ڕەت دان"، سەر بە ریشەی < ***stem-** (**IE.**) "وێککەوتن".

**زچ zıç** [ *zıč* ] - "قرنوو": ↑شەز şez یش دەگوترێ. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Zecke (G.)، cecho (OG.)، teek (Nl.) "قرنوو". وا شیمانە دەکرێ ئەم وشە ژێرمەنییانە پێوەندییان هەبێ بە dëgti (Lit.) "تێراچوون، هەڵچەقین". بە بۆچوونێکی دیکە ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***dagh-** (**IE.**) "زیلەی پێوەدەر، گازگر".

**زخور zıxur** - "ورکەبەرد": ↑زغرک zığırk و ↑زگار1 zıgar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx "ورکەبەرد" و ↑*زاخ1 zax* "بەرد".

**زدێ zıde** [ *zıde* ] - "هێز، توان": خزمە دەگەڵ stark (G.) "بەهێز"، staxra (Av.) "بەهێز، خورت، توند" و ↑ئەستوور estur [ئە + ستوور].

**زڕ¹ zır** - "نە ئەسڵ": [زڕباب، زڕدایک]. سهر sıhr یش دەگوترێ. لە ژێر وشەی ↑خەزوور xezur دا شی کراوەتەوە.

**زڕ² zır** - "زل": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑زل zıl "گەورە".

**زڕ³ zır** - "وشک و برینگ": دەچێتەوە سەر ↑زرەکان zırekan "وشک بوون، لە کەمی دان".

**زراری zırarî** [ *zırārī* ] - "قۆپچە، دوگمە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑گرێ girê. گشت ئەم وشانە ئاماژە بە "قوت بوون، زەق بوون" دەکەن.

**زراڤ zırav** [ *zırāv* ] - "باریک، ناسک": خزمە دەگەڵ straff (G.) "لەبەریەک کێشراو، توند، شەق"، straf (Nl.) "توند"، stramm (G.) "سفت، شەق، توند"، سەر بە ریشەی < ***(s)ter-** (**IE.**) "ڕەق، سفت". لەم

تیروانینەوە زراڤ دە بنەڕەتدا بە مانای "باریک و لەبەریەک کێشراو" [بە فارسی"کشیدە"] بەکار هاتووە و کەوتووەتە ناو زمانی عەرەبی و کراوە بە ظریف zarīf (Arb.).

**زراق zıraq** [ *zırāq* ] - "گزینگی هەتاو": ↑زەریق zerîq.

**زران zıran** [ *zırān* ] - "بەخراپ ناو دەرکردن": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە کە مانای"دەنگ هەڵبڕین، هەرا کردن" دەدەن، وەک ↑جاڕ car، ↑زاری zarî "داد و هاوار" و هتد.

**زڕاندن1 zırandın 1** [ *zırāndın* ] - "درکاندن": خزمە دەگەڵ ↑زڕان zıran. [دە بنەڕەتدا واتا لە قاو دان].

**زڕاندن2 zırandın 2** [ *zırāndın* ] - "خەو پەڕاندن": بنەوشەی زر- zır- خزمە دەگەڵ ↑چلە çıle "لێدانی رەگ" و ↑(ڕا)چلەکین (ra)çılekîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بزوانی خێرا".

**زرانەوە zıran(ewe)** [ *zırānawa* ] - ↑زرینگانەوە zırînganewe.

**زرانی zıranî** [ *zırānī* ] - "چۆک، ئەژنۆ": خزمە لەگەڵ ↑شلنگ şılıng "ترۆزی، خیارچەمبەر"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "با دان، چەمانەوە". "زرانی" ئەو شوێنەیە کە لەوێ قاچ دەچەمێتەوە.

**زراو zıraw** [ *zırāw* ] - "زاڵە، زارە": دە بنەڕەتدا واتا "ئاوی زەرد". بڕوانە ↑زەرد zerd.

**زرت1 zırt 1** - "زەلام، پیاوی تەژە و قەبە": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑زۆرەت zoret "گەنمە شامی".

**زرت2 zırt 2** - "1- خۆ هەڵکێشانی بە درۆ 2- جرت، تڕ دان بە دەم 3- هەڕەشە، گەڤ": بڕوانە ↑جرت2 cırt 2.

**زرز zırız** - "تووڕە، زویر": شێوەیەکی دیکە لە ↑جارز/ جارس carız / carıs.

**زرک zırk** [ *zırık* ] - "چوست و چالاک": شێوەیەکی دیکە لە ↑چالاک çalak.

**زرک zırk** - "کاڵەک": دەشێ پێوەندی هەبێ بە رەنگی ↑زەرد zerd ەوە.

**زرمە zırme** [ *zırma* ] - "دەنگی لێک کەوتنی شتی قورس": هەروەها ↑درم dırım [درم درم] هەیە بە مانای "دەنگی دەهۆڵ". خزمە دەگەڵ Trommel (G.) "تەپڵ، دەهۆڵ" و trumme (MG.) و drum (E.) "سازی زەربی". رەنگە ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگ بێ.

**زرنەقوتە zernequte** [ *zarnaquta* ] - "بەچکە چێشکەی هێشتا تووک لێ نەهاتوو": زەرن(ە) + قوتە zern(e)+qute . زەرنە zerne خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "هەرا کردن، دەنگ هەڵبڕین، گریان" دەدەن. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑جرت² cırt. قوتە qute هەمان ↑قووت qut ە [ڕووت و قووت].

**زرووبی zırûbî** [ *zırūbī* ] - "کولیرەی تەنک، نان ساجی": خزمە دەگەڵ ↑زراڤ zırav "زەریف، باریک".

**زرووقان1 zıruqan 1** [ *zırūqān* ] - "پێکەنینی منداڵ":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑تریقە tırîqe "دەنگی پێکەنینی بەرز".

2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑زریکاندن zırîkandın و ↑زیراندن zîrandın.

**زرووقان2 zıruqan 2** [ *zırūqān* ] - "بازرەبوونی ئاژەڵ": بنەوشەی -zır(uq) لێرەدا خزمە دەگەڵ ↑سرک sırık و ↑سلەمینەوە sılemînewe و ↑داچلەکین daçlekîn و هتد.

**زرووکە zıruke** [ *zırūka* ] - "دەنگی چۆڵەکە": جرووکە cıruke ش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑زرووقان zıruqan، ↑زریکاندن zırîkandın و هتد.

**زرە zıre** [ *zıra* ] - "دەنگی زنجیر": ↑زرینگانەوە zırînganewe.

**زرەک zırek** [ *zırak* ] - "تانەی سەر چاوی ماڵات کە لە بروسکەوە پەیدا دەبێ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑زل³ zıl "چاو تیبڕین".

**زڕەکان zırekan** [ *zırakān* ] - "وشک بوون، لە کەمی دان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ trocken (G.)، dry (E.)، droog (Nl.) "وشک". ریشەی ژێرمەنی: -drugi* (Grm.) "وشک". ریشەی هیندوئەورووپی ئەم وشە ژێرمەنییە باس نەکراوە.

**زریان zıryan** [ *zıryān* ] - "بای سارد": زەلان zelan یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑سار(د) sar(d).

2- ↑سروە sırwe "شنەبا"، سەر بە ریشەی *sreu- > (IE.) "جاری بوون، جەریان".

**زریزە zırîze** [zırīza] - "زنجیری زۆر باریک": دەشێ دە بنەڕەتدا بەم جۆرە بووبێ: زرێ + زە [چە] ze + zıre. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جیر cîr و ↑جەڕاندن cerandın سەر بە ریشەیەک بە مانای "با دان، توند و گرژ کردن". خزمە دەگەڵ Strang (G.) و string (E.) "ریس، بەنی بادراو"، stranc (OG.)، streng (OIs.) "چنراو، هۆنراو"، stringere (L.) "گوشین، ڕێک گوشین"، srangos (Let.) "بادراو"، strangale (Let.)، streang (OIr.) "ریس، بەنی بادراو"، stranx (Let.) "گوشراو"، stringt (Let.) "توند بوون، سفت بوون"، streng (G.) "سەختگیر، دەمارگرژ" staggós (Gr.) "بادراو"، سەر بە ریشەی *stren(k)- > (IE.) "بادراو، گوشراو، توند و گرژ بوون". ئەم ریشەیە خۆی دە پلەیەکی دوورتر دا دەچێتەوە سەر ریشەی *(s)ter- > (IE.) "ڕەق بوون، توند بوون، چڕ بوون". دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە پێوەندییان بەو خێزانە وشەوە هەیە، وەک ↑جیرِ cîr [جیرە بە با دان]، ↑چیرِ çîr "توند، سفت"، ↑جەڕ cer [جەڕ و مەنگەنە]. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑زرێ zıre [زرە zereh (P.)] بە مانای"جلکی بە زنجیرچندراوی شەڕ" بەکاردەهێنرێ، کە دەبێ هەر لەم چوارچێوەدا جێی لێکدانەوە بێ.

**زریکاندن zırîkandın** [zırīkāndın] - ↑زیراندن zîrandın.

**زرینچکاو zırînçıkaw** [zırīnčıkāw] - "زەرداوی دەمی برین": زری(ن) + چک + ئاو zırî(n) + çık + aw؟ بنجی وشەکە ↑زەرد zerd ە و مەبەست ئەو ئاوە زەردەیە لە برین دێتەدەر و لەوانەیە تێکڕای وشەکە مانای "زەرداوێکی کەم" بدا. لەوانەشە "چکاو" پێوەندی بە "تکان"ەوە هەبێ و مەبەست "دەڵاندنی زەردایی" بێ.

**زرینگ zrîng** [zrīng] - "1-چوست وچالاک، بەکار 2- زیرەک": زیرەنگ zîreng یش دەگوترێ. زرنگ zerang (P.). دە فارسیشدا هەردوو ماناکە دەگەیەنێ. خزمە دەگەڵ streng (G.) "توند، سەخت، سەختگیر" [لە کارێکدا یان لەسەر بیر و باوەڕێک]، strengi (OG.) "زرینگ، سەخت، موکوڕ"، streng (Nl.) "سەختگیر، قایم"، strong (E.) "سەخت، بەهێز"، strangr (OIs.) "توند، سەخت، بەهێز"، sträng (Sw.) "توند، سەختگیر". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ Strang (G.) و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەدا بە مانای "تەناف، گوریس" و دەچنەوە سەر ریشەی *stren(k)- > (IE.) "با دران، گوشران، توند و گرژ بوون". ئەم ریشەیە خۆی دە پلەیەکی دوورتردا دەچێتەوە سەر ریشەی *(s)ter- > (IE.) "ڕەق بوون، توند بوون، چڕ بوون". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑جەڕاندن cerandın "با دانی توند".

[تێبینی: پێوەندی چەمکەکانی "با دران، گوشران، توند و گرژ بوون، سەخت بوون" لەم وشانەی خوارەوەشدا، کە پێکەوە هاوریشەن، بەدی دەکرێ: *هەستی* "بەرد، ئێسک"، *خەست* "توند، پەیت" و گشت "توند، گرژ، گورج" (هەڵپەڕینی گشت، بە پێچەوانەی هەڵپەڕینی خاو)].

**زرینگانەوە zırîngan(ewe)** [zırngānawa] - "دەنگی وێککەوتنی زنجیر و زێر و زیوەر": جرنگ jerang (P.) و جرنگیدن jerangīdan (P.). خزمە دەگەڵ ↑جرینگە cırînge، ↑خرینگە xırînge. زرینگە zırînge و ئەم وشانەی دوایی دە بنچینەدا هەر یەک وشە بوون و دواتر چەند شێوەی بڕێک جیاوازیان پەیداکردووە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Klang (G.) "دەنگ و سەدا، زرینگە"، klingen (G.)، klingan (OG.)، klinken (Nl.)، clink (E.) "زەنگ لێدران، جرینگە لێهاتن". ریشەی ئەم وشانە دەچێتەوە سەر *ĝal- > (IE.) ە کە دە بنچینەدا لاسا کردنەوەی دەنگەکەیە.

**زریوە zırîwe** [zırīwa] - "ترووسکە": شێوەیەکی دیکە لە ↑جریوە cırîwe.

**زرێ[1] zıre** [zıre] - "جلکی بە زنجیرچنراوی شەڕ": زرە zereh (P.). وشەکە دە بنەڕەتدا بە واتای "ریسی توند بادراو و گرژکراو" بووە. [↑زریزە zırîze].

**زرێ 2 zıre** *[ zıre ]* - "دەریا": شێوەی کۆنتری ↑دەریا derya.

**زرێچ zıreç** *[ zıreč ]* - "چەسپ": شێوەیەکی دیکە لە ↑چرێش çırêş.

**زستان zıstan** *[ zıstān ]* - "وەرزی بەفر و بەستەڵەک": zemestān (.P). دە کوردمادیدا زمستان zımstan و زڤستان zıvstan یش دەگوترێ. وشەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی zı(m) + stan. کەرتی دووەم، ستان stan، لێرەدا پاشگری کات و وەرزە. کەرتی یەکەم، واتا زم zım دە زمانی کوردمادیدا تا ئێستاش وەک وشەیەکی سەربەخۆ ماوەتەوە و مانای "سەرما" دەدا. ئە وشەیە بە شێوەی ↑زما zıma دەگوترێ بە مانای سەرما. جگە لەمە دە هێندێک وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ کە پێوەندییان بە سەرماوە هەیە، وەکێ ↑زماک zımak "نسار"، ↑زەمبلە zembıle "چلوورە"، ↑زەمتین zemtîn "خوێن وەستان، لەختە بوونی خوێن"، ↑زمهەڕ zımher "ئازووقەی زستان" [هاردی زستان]، ↑زەمەگولیلک zemegulîlk "زوقم، خووسار"، zımherîr "زۆرسارد، سەرمای سەخت". وشەکە خزمە دەگەڵ jama (.Av)، zam (.Pl)، hima (.OIn)، zima (.Rus)، hiemis (.L)، kheimon (.Gr) "زستان، زمستان" و camag (.MP) "مەییو، بەستوو، جامید". لێرە دا دەردەکەوێ کە وشەی جامد jāmid (.Arb) لە زمانی کوردمادی یان فارسی بەرێ وەرگیراوە. هەروەها دەبێ وشەی زمزم zamzam (.Arb) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و مەبەست ئاوێکی سارد سارد بووبێ. وشەکانی ↑چای çay "سارد"، ↑چایمانی çaymanî و ↑چایین çayîn "سەرما بوون" و ↑*زستان zıstan* [زڤستان] پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**زغرک zığırk** - "ورکەبەرد": ↑زخور zıxur و ↑زگارا zıgar 1 یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx "ورکەبەرد" و ↑*زاخ zax* 1 "بەرد". هەروەها خزمە دەگەڵ ژاغر žāğar (.P) "سیکەتۆرە، چیکڵدان" [توورەکەی زیخ] و ساغر sāğar (.P) و ↑سەکرە sekre "جام، پیاڵە" [دە بنەڕەتدا: (قوری) بەردکراو، جێی ئاماژەیە کە "جام"یش دەگەڵ "کەمر، کەڤر" خزمە].

**زفت zıft** - "قیلی کانزا": زفت zeft (.P) "قیر، قەتەران":

1- جێی بەراورد کردنە دەگەڵ Schweiß (.G)، zweet (.Nl)، swāt (.OE)، sweat (.E)، svēda-h (.OIn)، sviedri (.Let)، sudor (.L) "ئارەقە"، سەر بە ریشەی ***< *sueid- (.IE)*** "ئارەقە کردن، ئارەق دەردان". لەم تێڕوانینەوە "زفت" دەبێ وەک جۆرێک ئارەق دەردان یان ئارەق لێ گرتن چاو لێکرابێ کە دیارە بە شێوەی دڵۆپ دڵۆپ پێک هاتووە.

2- یان ↑زیپک zıpık "دڵۆپە"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "چۆڕان، دڵۆپان".

3- هەروەها دەگەڵ ↑سفت sıfıt "سەخت". زفت شتێکە سفت پێوە دەنووسێ و بە سەختی لێ دەبێتەوە.

[تێبینی: دە زمانی عەرەبیشدا وشەی **قطران** دەبێ پێوەندی بە **قطرة** واتا "دڵۆپە"وە هەبێ].

**زڤار zıvar** *[ zıvār ]* - "بزگوڕ": شێوەیەکی دیکە لە ↑زێوار zewar، زیڤار zîvar، زیڤاڵ zîval، ↑زۆڵ zol [زۆڵەچەرم واتا کوتەچەرم].

**زڤر zıvır** *[ zıvır ]* - "ورکە نان": خزمە دەگەڵ ↑زڤار zıwar "بزگوڕ، تیتۆڵ".

**زڤرین zıfrîn** *[ zıvrīn ]* - "سووڕان(ەوە)": وشەکە دە شێوەزاری ناوڕاستدا بووەتە ↑سووڕان suran. خزمە دەگەڵ spaīra (.Gr) "خول، پێچ". Spirale (.G) لە spira (.L) "هێڵی مارپێچی" وەرگیراوە و دواجار دەچێتەوە سەر وشە یۆنانییەکە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەی ↑زەپرتی zepırtî هەیە بە مانای "بزۆز، ئۆقرەنەگر" کە خزمە دەگەڵ زڤرین. شیاوی باسە کە وشەی ↑سفر safar (.Arb) "گەشت و گەڕان" دەگەڵ ↑زفر zıfır "گەرانەوە" یەک دەگرێتەوە و دەشێ وشەکە دە بنەڕەتدا وشەیەکی زمانی کوردمادی بێ و چووبێتە ناو زمانی عەرەبییەوە. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑زڤیرک zıvîrk هەیە بە مانای "گێژەوڵووکە". ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ریشەی ***< *sper- (.IE)*** "جم و جۆڵی خێرا و نائارام کردن". مانای ئەم ریشەیە بەرهەڤ بکە دەگەڵ ↑زەپرتی zepırtî "بزۆز، ئۆقرەنەگر". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا Sperling (.G)، sparo (.OG)، sparrow (.E)، sparv (.Sw) "چوڵەکە" لەم ریشەوە

هاتووە. وێ دەچێ وشەی ↑چۆلەکە çoleke دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشە ژێرمەنییانەوە هەبێ.

**زڤنگ zıvnıg** - "ئەشکەوتی مەزن کە خەڵکی تێدا دەژی": زیڤینگ zîvîng یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑ساباتsabat دا شی کراونەوە.

**زق zıq** - "زوقم، بەستەلەک": جگە لەم وشەیە چەند وشەیەکی دیکە هەن کە دەبێ لە ریشەیەکی هاوبەشەوە هاتبن، وەک ↑زوقم zuqım، ↑سەقەم seqem [سەرما و سەقەم]، ↑زیک zîk "زۆر سارد"، ↑شەختە şexte، ↑سیخوار sîxwar و لەوانەشە ↑سەهۆڵ sehol. ژمارەیەکی دیکە لەم وشانە لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون.

**زقاف zıqaf** [ *zıqāf* ] - "خێشک": خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq، ↑چەقۆ çeqo و ↑زاخ zax "کێر، خەت" و هێندێک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، لەت کردن، لێک کردنەوە".

**زقاق zıqaq** [ *zıqāq* ] - "کووچە، کۆڵان": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شەقام şeqam و بچێتەوە سەر بنەوشەیەک بە مانای "لاق". بنەوشەکە دە فارسیدا بە شیوەی ساق sāq (.P) و دە کوردمادیدا بە شێوەی ↑چۆک çok و ↑شەق şeq دەردەکەوێ.

[تێبینی: مانای وشەکە لە "لاق"ەوە بووەتە "هەنگاو" و لەوێشەوە بووەتە "شوێنی هەنگاو نان، کۆڵان، شەقام". "هەنگاو"یش خۆی دە بنەڕەتدا هەر بە مانای "لاق"ە].

**زقاو zıqaw** [ *zıqāw* ] - "تەڕەزن، ئاوێک کە لە قەراخی مێرگ دەدەڵێ": زق + ئاو zıq + aw. کەرتی زق خزمە دەکەڵ ↑تکان (ەوە) tıkan و sichten (.G) و sicerian (.OE) "دەڵاندن، دڵوپاندن".

**زکین zıkîn** [ *zıkīn* ] - "زۆرخۆر، چڵێس": زکن zıkın و زکوون zıkun یش دەگوترێ. ↑زگ zıg "ورگ".

**زگ zıg** - "ورگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑سک sık.

**زگار1 zıgar** [ *zıgār* ] - "ورکەبەرد": ↑زخور zıxur و↑زغرک zıġırk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx "ورکەبەرد" و ↑*زاخ[1]* *zax* "بەرد".

**زگار2 zıgar** [ *zıgār* ] - "کز و کەنەفت": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ sick (.E) "نەخۆش". [بڕوانە ↑زیز zîz].

**زگماک zıgmak** [ *zıgmāk* ] - پێک هاتووە لە دوو کەرتی ↑زگ zıg + ماک mak. کەرتی ماک mak دەچێتەوە سەر ↑مێ me و لێرەدا مانای "دایک" دەدا [بە فارسی mādar (.P) "مادر"]. مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "لە زگی دایکەوە".

**زگورد zıgurd** - "رەبەن، سەڵت": لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە هێندێک وشە کە ئەوانیش ماناکانی "بڕین، لێکردنەوە، جودا کردن(ەوە)" دەگرنە خۆ، وەک ↑زاخ[2] zax "خەت، کێر"، ↑چاک[3] çak "بڕدراوی" [چاکی کەوا] و هتد. لەم تێڕوانینەوە مرۆڤی زگورد یان رەبەن کەسێکە کە بە جیا، بە *دابڕاوی* (لە ژن و منداڵ) دەژی. وشەی "مجرد" دە زمانی عەرەبیشدا هەر ئەو مانایە دەگەیەنێ.

**زل[1] zıl** - "گەورە، قەبە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ schwellen (.G)، swellan (.OG)، zwellen (.Nl)، swell (.E)، svälla (.Sw) "زل و گەورە بوون، ماسین"، سەر بە ریشەی **< *suel-* (IE.)** "زل بوون، هەڵمسان، لەبەر یەک کشانەوە، بەربلاڤ بوون". خزمە دەگەڵ ↑سێڵاو selaw [دە بنەڕەتدا: زل ئاو، ئاوێک کە "هەڵمساوە" و بەربڵاو بووە.

**زل[2] zıl** - "لاسکی گیا": ↑چڵ çıl.

**زل3 zıl** - "تەماشا بە چاودەرپەڕیوی، چاو تیبڕین": زل zol (.P). خزمە دەگەڵ Star (.G) "ئاوی مرواری"، staraplint (.OG)، strblind (.OE) "کوێری چاوزەق". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە starren (.G) "1- رەق بوون، بێجووڵە بوون 2- چاوی بێجووڵە تیبڕین". خزمە دەگەڵ ↑ئەستوور estur و

چەندین وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "رەق بوون، لە جووڵە وەستان". لەوانەیە ↑زرەک zırek بە مانای "تانەی سەر چاوی ماڵات" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**زڵچە zılçe** [ *zılča* ] - "دەنگی شتی تەڕ": خزمە دەگەڵ ↑جڵقە cılqe و ↑چِلم *çılım*. چەندین وشەی دیکەش کە هەڵگری چەمکی "تەڕ و لیچق" بوونن، پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە، وەک ↑زڵق zılq "قوڕ و لیتەی خلیسک"، ↑زڵفنچک zılfınçık "چڵک و کێمی برین"، ↑زڵزڵە zılzıle "چڵک و کێمی برین"، ↑زلیقۆ zılîqo "جۆرێک چەسپ"، ↑سڵق sılq "گیایەکی دوکلیو"، ↑سلپ sılp "تەڵتە"، ↑چڵپاو çılpaw، ↑زەلکە zelke "شۆرباوی بێتام" و هتد. ئەم وشانە و چەندین وشەی هاوشێوە دەچنەوە سەر ریشەی < *(s)lei-** ( *IE.* ) "تەڕ و لیچق بوون".

**زلحۆرت zılħort** - "زلی ناقۆڵا": زل + حۆرت zıl + ħort. کەرتی یەکەم هەمان ↑زل zıl ە و کەرتی دووەم پێوەندە بە ↑خورت xurt "بەهێز، قەوی".

**زڵزڵە zılzıle** [ *zılzıla* ] - "چڵک و کێمی برین": زلزە + لە zılze + le. خزمە دەگەڵ ↑زڵچە zılçe "دەنگی شتی تەڕ"

**زڵفنچک zılfınçık** [ *zılfinçık* ] - "چڵک و کێمی برین": خزمە دەگەڵ ↑زڵچە zılçe "دەنگی شتی تەڕ".

**زلق 1 zılıq** - "نائارام، هارو هاج": شێوەیەکی دیکە لە ↑شلۆق şıloq.

**زلق 2 zılıq** - "قوڕ و لیتەی خلیسک": خزمە دەگەڵ ↑زڵچە zılçe "دەنگی شتی تەڕ".

**زلقتی zılqtî** [ *zılqtī* ] - "زەرگەتە": هەروەک ↑زەرگەتە zergete لە دوو کەرت پێک هاتووە: زل -zıl هەمان زەر(د) ە و قتی qtî- یش هەمان "گەتە"یە و مانای "کەت، بڕاو" دەدا.

**زللە zılle** [ *zılla* ] - "شەپەڵاغە، لێدان بە لەپی دەست": سیلی sīlī ( P. ). خزمە دەگەڵ Schlag ( G. ) "زەبر" و schlagen ( G. )، slay ( E. )، sla ( Sw. )، slahan ( Gt. ) "لێدان، لێکدان"، Schlacht ( G. )، slieht ( OE. )، slauhts ( Gt. ) "شەڕ و کوشتار"، schlachten ( G. ) "سەربڕین"، slacc ( Mir. ) "شمشێر"، سەر بە ریشەی < *slak-** ( *IE.* ) "لێدان". وشەی سلاح silāħ ( Arb. ) و سلخ salaxa ( Arb. ) "پێستی کرد" لەوانەیە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابن. دە زمانی کوردمادیدا هێندێک وشە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک ↑شڵەقاندن şıleqandın "لێکدان"، ↑شڵە şıle "پێستی سپی و سووری تێکەڵ" [لێکدراو]، ↑شەللاق şellaq "قامچی"، ↑شلۆق şıloq "قەرەباڵغ، تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراو" و هتد.

**زلمبۆ zılmbo** - "گەزۆ، شیرەی دار": خزمە دەگەڵ ↑سالمە salm(e).

**زلووبیا zılubîya** [ *zılūbyā* ] - "جۆرە شیرنییەک": زولبیا zolbīyā ( P. ). خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک وەک ↑قڵفە qılfe،↑ کەڵاف kelaf و ↑زولف zulf. ئەم شیرنییە وەک بەتێکی قڵفەدار یان گرێ گرێ دراو و تێکهاڵاو وایە.

**زلە zıle** [ *zıla* ] - "چەقەچەق": خزمە دەگەڵ ↑شلۆق şıloq و ↑شلەقان şıleqan و↑ زللە zılle و هتد. ریشەی ئەم وشانە مانای "لێدان، لێکدان" دەبەخشێ و مانای "زلە" دەبێتە دەنگێ و هەرای تێکەڵ پێکەڵ یان "چەنە لێدان".

**زلەویان zılewyan** [ *zılawyān* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑ژلێوان jılewan "تێکەڵ پێکەڵ بوون، لێکدران".

**زلیقۆ zılîqo** [ *zılīqo* ] - "جۆرێک چەسپ": خزمە دەگەڵ ↑زڵچە zılçe "دەنگی شتی تەڕ".

**زم (1) zım(a)** [ *zımā* ] - "سەرما": خزمە دەگەڵ ↑زستان zı(m)stam.

**زماک zımak** [ *zımāk* ] - "نسار، شوێنی تاونەگر لە چیا": زماگ zımag یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زم(1) zım(a) "سەرما" و دەگەڵ ↑زستان *zı(m)stam*.

**زمان zıman** [ *zımān* ] - "ماسوولکەی ناودەم، ئامرازی قسە پێ کردن و پێ خواردن": زوڤان zuvan یش دەگوترێ. زبان zabān ( P. ). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Zunge ( G. ) و tongue ( E. ) و tunga ( Sw. )،

tengae ،(dingua :کۆنتر) ،(L.) lingua و(Pl.) izwan ،(OP.) hizanam ،(OIn.) jihva ،(Lit.) liezuvis (OIr.) سەر بە ریشەی **(IE.) * ndh- ghu- >** "ئەو شتەی ژێر مەڵاشوو".

**زمایش zımayış** [ *zımāyıš* ] - "دەنگی گریان و ناڵاندن": بڕوانە ↑زمین zımîn.

**زملیق zımlîq** [ *zımlīq* ] - دەگەڵ "زەرد" دێ [زەرد و زملیق zerd û zımlîq بە مانای "نەرم، لووس"]. خزمە دەگەڵ ↑ساماڵ samal "ساف، یەکدەست".

**زموڕڕود zımurrud** - "بەردێکی پرنرخ": زمرد zomorrod (P.)، زمرۆت zımrot و زامرۆت zamrot یش دەگوترێ. دە یۆنانیدا smaragd (Gr.) بووە و لەوێوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکانی دیکەوە. ریشە؟

**زمهەڕ zımher** [ *zımhar* ] - "ئازووقەی زستان": پێک هاتووە لە دوو کەرتی زم + هەڕ zım + her. کەرتی یەکەم واتای سارد وسڕی و ↑زستان zı(m)stan دەبەخشێ. کەرتی دووەم دەبێ هەمان↑ئارد ard[کۆنتر: هارد] بێ. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە "ئاردی زستان".

**زمە zıme** [ *zıma* ] - "1- کونکەر2- شیش و بەن بۆ خاوێن کردنەوەی لوولەتفەنگ": سنبە sonbe (P.). دەچێتەوە سەر ↑سمین sımîn "کون کردن".

**زمین zımîn** [ *zımīn* ] - "گریان و ناڵین": هەروەها زمی zımî دەگەڵ ناڵە دێ [زمی وناڵە] . جگە لەمە زمیهتن zımîhtın دەگوترێ بە مانای "1- ناڵە و زاری 2- دەنگ دانەوەی زۆر کەس پێکەوە". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- Jammer (G.) "ناڵە، گرین"، jāmar (OG.) و geōmer (OE.) "خەمگین، دڵتەنگ، پەشێو". رەنگە وشەی ↑خومار xumar یش [چاوی خومار] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

2- summen (G.) "وزەوز کردن، بڵماندن، لە بن لێوان گۆرانی گوتن". ریشەی ئەم وشەیە لاسا کردنەوەی دەنگە.

3- ↑گمایش gımayış "1- دەنگی بلێسەی ئاگر 2- بۆڵەبۆڵ کردن" و ↑گماندن gımandın.

**زنار zınar** [ *zınār* ] - "بەردی گەورە، شاخ": هەروەها زنێر zınêr ش دەگوترێ بە مانای "شاخی سەخت". وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە بە "پێکەوەنووساوی" دەکا، واتا کۆمەڵەبەردێکی پێکەوەنووساو. دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەنگل şenıgl "پێکەوەنووسان، لێکهاڵان".

**زناو zınaw** [ *znāw* ] - "زەوی تەڕ و شل": بڕوانە ↑زنە zıne "چیمەنی ئاودەڵێن".

**زنج1 zınc 1** [ *zınj* ] - "ئامرازێکی مۆسیقا": سنج sınc یش دە گوترێ. سنج sanj (P.). خزمە دەگەڵ کردای ↑ژەنین jenîn، سەر بە کردارێک بە مانای "لێدان، لێکدان". ئەم ئامرازە لە دوو شتی وەک کەشەف پێک هاتووە کە لێک دەدرێن.

**زنج2 zınc 2** [ *zınj* ] - "کوتەک، پەیاغ": خزمە دەگەڵ ↑زنج1 zınc 1 "ئامرازێکی مۆسیقا" و ↑زەنگ *zeng* [زەبر و زەنگ] و ↑جەنگ ceng.

**زنج3 zınc 3** [ *zınj* ] - "چەنەگە": شێوەیەکی دیکە لە ↑چەنەگە çenege.

**زنج4 zınc 4** [ *zınj* ] - "چارداغ، حەوش، چەپەر، پەرژین": سێنج senc یش دەگوترێ.

1- یان پێوەندی هەیە بە ریشەی **(IE.) *(s)ne- >** "بەستن، چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان". دیارە مانای "زنج" بە تەواوی دەگەڵ مانای ئەم ریشەیە یەک دەگرێتەوە. ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چنین1 cınîn 1 و هەروەها ↑کەنز *kenz* [کنج kınc] "جلوبەرگ".

2- یان بە شیمانەیەکی کزتر لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە Schanze (G.) "سەنگەر، چەپەر، بەربەست، خەندەک". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە یەک لا نەکراوەتەوە. بە گوێرەی بۆچوونێک لەوانەیە بچێتەوە سەر scansi (It.) "بەرگری، بەربەست".

**زنجار zencar** [ *zancār* ] - "ژەنگ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ژەنگ jeng.

زنجک **zıncık** *[ zınjık ]* - "لووشک، جووته": خزمە دەگەڵ کردای ↑ژەنین jenîn، سەر بە کردارێک بە مانای "لێدان، لێکدان".

زنجی **zıncî** *[ znjī ]* - "لووت، کەپۆ": زنژ zınj یش دەگوترێ. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا چەندین وشە هەن کە گشتیان پێوەندیان بە "کەپۆ، لووت"ەوە هەیە، وەک Schnabel (G.) "دندووک"، schnaufen (G.) "هەناسە کێشانی توند بە لووتدا"، Schnauze (G.) "دەم و لووت"، schnäuzen (G.)، snuiten (Nl.)، snyta (Sw.)، snytan (OE.) "فرماندن، چڵم دەردان"، snuzza (OG.)، snot (OE.)"چڵم". ئەم وشانە هەموویان بە دەنگی-sn دەست پێ دەکەن. وشە کوردمادییەکەش دیارە پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. هەروەها وشەی ↑گن gın "کەسێک کە دە کەپۆدا قسەدەکا" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

زنجیر **zıncîr** *[ zıncīr ]* - "بەندی ئاسنین کە لە گەڵێک ئاڵقە دروست بووە": زنجیر zanjīr (P.). دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑سندم sındım کە بۆ بەستنەوەی لاق بەکاری دەهێنرێ، سەر بە ریشەی **< -(s)ne* (IE.)** "بەستن، چنین، تەنین، هۆنین، گرێ دان". لەوانەیە ↑زنج zınc "چارداغ، چەپەر، پەرژین" و ↑زیندان zîndan یش لەم ریشەوە هاتبن. ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چنین cınîn و هەروەها ↑کەنز *kenz* [کنج kınc] "جلوبەرگ". سەبارەت بە پێوەندی ئەو مانایانەی سەرەوە بە یەکدی دەتوانین دەگەڵ وشەکانی "بەن"، "بەند" و "بەندی" هەڵیان سەنگێنین.

2- ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوە نووسان".

زنچک **zınçık** *[ zınčık ]* - "1- تەرایی کەم 2- چڵک وکێمی برین": زنچکاو zınçıkaw یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زنە zıne "(چیمەنی) ئاودەڵێن" و ژمارەیەک وشەی دیکە.

زنخ **zınıx** - "گەنیو": بنجی زن -zın شێویەکی دیکە لە گەن -gen دە کرداری ↑گەنین *genîn* دا و ↑گنخان gınxan دا.

زنگرین **zıngrîn** *[ zıngrīn ]* - "تۆپین، کەوتین": خزمە دەگەڵ sinken (G.)، sinkan (OG.)، sigqan (Gt.)، sink (E.)، sjunka (Sw.) "رۆچوون، بەرەو خوار چوون، دابەزین، هاتنەخوار". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -sengu* (IE.)** "کەوتن، هاتنەخوار".

[تێبینی: وەک لەسەرەوە دەبینرێ، "کەوتین" وشەیەکی دیکەیە کە بە مانای "زنگرین، تۆپین" بەکار دێ و ئەمەش پێوەندی بە کرداری "کەوتن"ەوە هەیە. لێرەدا پێوەندی دوو چەمکی "تۆپین" و "کەوتن" بە روونی دەردەکەوێ].

زنگی **zıngî** *[ zıngī ]* - "دەنگی وێککەوتنی ددانان لە سەرمان": خزمە دەگەڵ زنگ zıng یان ↑زەنگ zeng بە مانای "دەنگی زەنگوڵە".

زنە **zıne** *[ zına ]* - "چیمەنی ئاودەڵێن": خزمە دەگەڵ ↑زناو zınaw "زەوی تەڕ و شل"، ↑تەڕەزن terezın و لەوانەشە ↑زۆنگ zong "باتڵاق" و هتد. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Schnee (G.)، snow (E.)، snö (Sw.)، sneg (Rus.)، nipha (Gr.)، nix (L.)، sniegas (Lit.) و snahr (Pl.) "بەفر، بەرف"، سەر بە ریشەی **< -(s)neigh* (IE.)** "پێوەنووسان، گلوو بوون". هەروەها ↑زنار zınar "بەردی زلی شاخ" و ↑شەنگڵ *şengıl* "پێکەوە نووسان" پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

زنینەوە **zınînewe** *[ zınīnawa ]* - "هەستانەوەی دوای مردن": شێوەیەکی دیکە لە ژیانەوە jîyanewe [بروانە ↑ژین jîn].

زنێر **zınêr** *[ zıner ]* - "تووکەسەری لێکهاڵاوی چڵکن": خزمە دەگەڵ ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوە نووسان، لێکهاڵان".

زوخاڵ **zuxal** *[ zuxāl ]* - "تیڵا، داردەست": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- ↑زیخ zîx و ↑زەق *zeq* و ↑زەخت[2] zexıt "نەقیزە، مامزە".

2- ↑زاگۆر zagor "پەیاخ، چۆماخ".

**زوخره zuxre** [ *zuxra* ] - "ورکەبەرد": بڕوانە ↑زاخ1 zax "بەرد".

**زورار zurar** [ *zurār* ] - "ناوی مەڵبەند و هۆزێکی کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑زۆر zor "هێز، زەخت، تەوژم". وشەکە ئاماژەیە بە سەخت بوونی ناوچەکە و بەهێز و خورت بوونی ئەو هۆزە. شیاوی باسە کە ناوی زۆر لە مەڵبەند و هۆزەکانی کوردستان پێوەندییان بە چەمکی "سەخت و بەهێز" بوونەوە هەیە. لەم بارەوە بڕوانە ↑سۆران soran.

**زوڕنا zurna** [ *zurnā* ] - "سازێکی دەمی": سرنا sornā (P.). زوڕ + نا zur + na. کەرتی دووەمی وشەکە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑نەی/ نایە ney/ naye. کەرتی یەکەم لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ:

1-یان ↑سوور sur "شایی، جێژن".

2- یانیش ↑زار zar "دەم". لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ *دەمنە* "دارجگەرە".

**زورهان zurhan** [ *zurhān* ] - "پیری کەنەفتە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە zermān (Pl.) و zaurvan (Av.) "پیر، کەلەلا". خزمە دەگەڵ ↑زورەت zuret "گەنمەشامی".

**زورەت zuret** [ *zurat* ] - "گەنمەشامی": زوڕات zurat و زەرات zerat یش دەگوترێ. زرت zorrat (P.)، zurtak (Pl.). وشەکە خزمە دەگەڵ Korn (G.)، corn (E.)، kaurn (Gt.) "دەغڵ و دان" و هەروەها Kern (G.)، kärna (Sw.) "دەنک" و granum (L.) و zerno (Rus.) "دەنک، دەغڵ و دان" سەر بە ریشەی > -*ĝer** (IE.) "گەیشتوو، پیر، بڵ". دە زمانی ئەلمانیدا وشەی Kerl "پیاو، زەلام" هەیە کە خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە و هەروەها دەگەڵ churl (E.) و karl (Sw.) "زەلام، جووتیار" و gerōn (Gr.) "پیر، بەساڵداچوو". لێرەوە دەتوانین وشەکانی ↑سرد sırd "تازەگوڵی خەلە" و ↑زرت zırt بە مانای "زەلام" لەم چوارچێوەیەدا لێک بدەینەوە. هەروەها شیاوی باسە کە وشەی ذرة zarra (Arb.) "تۆزکاڵ، تۆسقاڵ" دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و دە بنەڕەتدا مەبەست "دەنک، دان، هەب" بێ.

**زوفت1 zuft** - "1- پڕاوپڕ، دارماڵ 2- قرنیس، دەسقوچاو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زۆر[1] zor سەر بە ریشەی > -*sp(h)ei** (IE.) "لە بەریەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، هەراو بوونەوە". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەر لەم ریشەوە وشە بە مانای "کەمی، دەست پێوەگرانە، پاشەکەوت کردن" هاتوونە ئاراوە، وەک sparen (G.) "پاشەکەوت کردن"، sparr (OIs.) "دەست پێوەگرانە، دەسقوچاو" و spare (E.) "کەم، لاواز".

**زوفت2 zuft** - "زبر": زوڤر zuvr یش دەگوترێ. شێوەیەکی دیکە لە ↑زبر zıbır.

**زوڤر zuvr** - "بنەچەک، رەگەز": دە زمانی ئەڵمانیدا spät (G.) بە مانای "دێر، درەنگ" بەکار دێ و دەچێتەوە سەر ریشەی > -*sp(h)ei** (IE.) "لە بەریەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، هەراو بوونەوە". وشە ئەڵمانییەکە هەروەها خزمە دەگەڵ ↑زاڤ zav یان ↑زۆر zor و مەبەست زۆر خایاندنی کاتە. لە لایەکی دیکەوە دە زمانی کوردمادیدا "دێر" بە مانای کاتی کۆن و *زۆر* بەر لە ئێستاش بەکار دێ، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "دێرین". بە لەبەرچاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەتوانین وشەی "زوڤر" ئاوا لێک بدەینەوە کە ئەم وشەیە سەرەتا وەک وشە ئەڵمانییەکە مانای "دێر، درەنگ"ی گەیاندووە، لەمەوە دواتر مانای "دێرین، کۆن" سەری هەڵداوە و دیسان لەمەشەوە مانای "بنەچەک، ئەسڵ" پەیدا بووە. هەر لێرەدا جێی بیر هێنانەوەیە کە وشەکانی "دێر" و"درەنگ" پێوەندییان بە "درێژ"ەوە هەیە و لەمانیشدا باس هەر لە دوور و درێژ بوونەوە و لە بەریەک کشانەوەی کاتە.

**زوقم zuqım** - "خووساڕ، سیخوار، بەستەڵەک": زوخم zuxm یش دەگوترێ. جگە لەم وشەیە چەند وشەیەکی دیکە هەن کە لە ریشەیەکی هاوبەشەوە دێن، وەک زق zıq "زوقم، بەستەلەک"، ↑سەقەم seqem [سەرما و سەقەم]، ↑زیک zîk "زۆر سارد"، ↑شەختە şexte، ↑سیخوار sîxwar و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سەق *seq*.

زوک **zuk** - "زەق، زۆپ": شێوەیەکی دیکە لە ↑زەق .

زوکری **zukrî** *[ zukrī ]* - "ناوی هۆزێکی کوردە": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq.

زوڵف **zulıf** - "موو، بسک": زلف zolf (P.). ئەم وشەیە دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "ئاڵقەی موو" بێ، واتا کاتێک موو هەڵدەگەڕێتەوە، فڕ دەبێ و ئاڵقەیەک دروست دەکا. "زلف" دە "فەرهەنگ جامع فارسی-المانی"دا وەک Locke "ئاڵقەی موو" و Harr "موو" مانا کراوەتەوە. دەبێ مانای یەکەم مانای ئەسڵی وشەکە بێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەند وشەیەکی زمانە ژێرمەنییەکان، وەک Schleife (G.)، Schlaufe(G.) "قڵفە"، Schlupf (G.) "کوتێک کە شتێک نەرم و هاسان بە تیویدا دەخوشێ"، schlüpfen (G.) "بە کوتێکدا خوشین و تێپەڕین"، schleifen (G.) "سمبادە لێدان، ساف و لووس کردن" [دەبنەڕەتدا: لێخشاندن]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)leib- (IE.)** "خلیسکان، خوشین، خزین" و دوورتریش دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)lei- (IE.)** "تەر و لیچق و خلیسک بوون". کەوابوو "زولف" ئەو موویانەن کە وەک شتێکی ساف و خلیسک لە دەوری یەکتر هاڵاون، خوشیون و پێکهاتەیەکی وەک قڵفە یان ئاڵقەیان دروست کردووە. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑قڵفە qılfe و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە.

زولوبیا **zulubya** *[ zulubyā ]* - "جۆرێک شیرینی": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑چلیپا *çılîpa* "خاچ" و دەگەڵ ↑زولف zulf.

زوم **zum** - "چەوری": زووم zum و زوهم zuhım یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑خامە xame ەوە.

زونگ **zung** - "گۆشتی قیمەکراوی دەناو ریخۆڵە ئاخنراو، پاسترمە، سووسیس": وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ زۆنپ zonp [یان ↑زۆمپ zomp] "کوتکی گەورە". هەروەک چۆن "قیمە" و "کفتە" دە ریشەیە مانای "کوتراو" دەبەخشن، هەروەساش "زونگ" دەشێ پێوەندی بە چەمکی "کوتان"ەوە هەبێ.

زوها **zuha** *[ zuhā ]* - "وشک": زوا zuwa ش دەگوترێ. هەروەها ↑سێ ە seh هەیە بە مانای "چەرمی وشک هەڵاتوو". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ئەو وشەگەلەی لەژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە. ئەم وشانە بە گشتی مانای "سەخت، رەق" دەبەخشن.

زویر **zuwîr** *[ zuwīr ]* - "نارەحەت، دڵ ئێشاو": خزمە دەگەڵ ↑زوورانەوە zuran(ewe).

زوو **zu** *[ zū ]* - "دژبەری درەنگ، بەپەلە": زود zūd (P.)، zūt (Pl.)، zūta (Av.) "زوو". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ schütten (G.) "هەڵڕشتن"، schudden (Nl.) "راوەشاندن"، scūdan (OE.) "پەلە کردن"، Scheuer (G.) "با و بارانی توند". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سە ریشەی **< *(s)kut- (IE.)** "راوەشاندن".

[تێبینی: وشەی "پەلە"ش خزمە دەگەڵ "پەڕین" و "پەلامار" و هێندێک وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بزاوتێکی خێرا"].

زووخ **zux** *[ zūx ]* - "توانایی، کارایی، هێز": خزمە دەگەڵ Sieg (G.)، sigi (OG.)، sigis (Gt.)، sige (OE.)، segr (Sw.) "سەرکەوتن، زاڵ بوون بەسەردا"، سەر بە ریشەی **< *seĝh- (IE.)** "راگرتن، بەسەردا زاڵ بوون، سەرکەوتن". ئەم وشە ژێرمەنییانە خزمن دەگەڵ sáhatē (OIn.) "دەتوانێ، بەرگە دەگرێ، دەرەقەت دێ، زاڵ دەبێ"، sáhas- (OIn.) "زەبر و زەنگ، دەسەڵات، زاڵ بوون"، échein (Gr.) "راگرتن، خاوەن بوون". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکەش وەک ↑ساخ *sax*، ↑سەخت sext و↑سەق seq.

زووخاو **zuxaw** *[ zūxāw ]* - "کێم و خوێنی تێکەڵاو": زەخماب zaxmāb (P.). زووخ + ئاو aw + zux. زووخ شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زام zam.

زوور **zur** [ *zūr* ] - "زبر، بەرانبەری لووس": شێوەیەکی نوێترە لە ↑زبر zıbır یان زوڤر zuvr.

زوورین **zurîn** [ *zūrīn* ] - "لووراندن": خزمە دەگەڵ ↑زیراندن zîrandın و ژمارەیەک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "دەنگ و هەرا هەڵبڕین" دەکەن.

زوورانەوە **zuran(ewe)** [ *zūrānawa* ] - "سووتانەوەی پێست، کزانەوە": خزمە دەگەڵ schwären (G.)، zweren (Nl.)، sweran (OG.) "ئێشان، چڵک کردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) *suer- >** "ئێشان، چڵک کردن". خزمە دەگەڵ ↑سیویر sîwîr "تاوێک کە پێست تاوانگاز دەکا"، ↑سەبەل sebel "نەخۆشییەکی چاو"، ↑ژوار juwar "ژان" [ژان و ژوار]، ↑زویر zuwîr "نارەحەت، دڵ ئێشاو" و دە پلەیەکی دوورتریشدا ↑زۆر[2] zor "زەحمەت، نهێم".

زوورک **zurk** [ *zūrk* ] - "تەپۆڵکەی رووت، زەوی بەردەلان": ئەم وشەیە بە چەند شێوەی دیکەش دەردەکەوێ کە بریتین لە زوورگە zurge، زوورکان zurkan، زووران zuran، زوورن zuran. خزمە دەگەڵ ↑ ژوورگ jurg "هەوراز" و ↑ژوور jur "(لای) سەرەوە".

زووف **zuf** [ *zūf* ] - "زوڵف": خزمە دەگەڵ ↑چەپک2 çepık "1- دەستە، باقە 2- تیسکەموو".

زووقاندن **zûqandın** [ *zūqāndın* ] - دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەزووقاندن vezûqandın واتا پاڵ پێوەنان]. خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq و سەر بە ریشەیەکە بە مانای "دەرپەڕاندن، پاڵ نان".

زۆ **zo** - دەگەڵ "زا" دێ [زاوزۆ zauzo]. کورتکراوی ↑زۆر zor ە. مەبەست زان و زۆر بوونە. زاوزێ zauze یش دەگوترێ. لێرەدا "زێ" دەچێتەوە سەر "زێد" [زیاد].

زۆپ1 **zop 1** - "1- قیت، دەرپەڕیو، خڕایی بەرزەوەبوو 2- داردەست 3- ئاماژە بە ئەندامی تیرینە": بە مانای "داردەست، چۆماغ" زۆپا zopa و زۆپک zopk ش دەگوترێ. هەروەها ↑زاب zab هەیە بە مانای "سەکۆ" [دە بنەڕەتدا: شوێنی دەرپەڕیو- سەرنج بدە کە "سەکۆ"ش بە مانای "دەرپەڕیو"ە]. جگە لەمانە ↑زیپکە zîpke هەیە کە بریتییە لە زەقایی و زۆپایی بچووک لەسەر پێست. ئەم وشانە جێی بەراورد کردنن دەگەڵ top (E.)، (Nl.) و topp (Sw.) "دوند، نووک، جەمسەر"، هەروەها Zipfel (G.)، tip (Nl.) و (E.) "گۆشە، جەمسەر، کۆتایی تیژ و دەرپەڕیو". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها Zapfen (G.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە کە بریتییە لە "دارێکی بچووکی کەڵلەقەندی کە دە زارکی شووشە یان دە سەری لوولەی دەئاخنن و پێی دەبەستن". دە زمانی کوردمادیشدا وشەی ↑تەپەدۆر tepedor خزمە دەگەڵ ئەم وشەیە. ریشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ تەپە tepe [↑تەپ tep] "گرد، شاخی بچووک".

زۆپ2 **zop 2** - "1- ئەستوور و رەق 2- گاشەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıfıt "سەخت".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "سەخت، رەق" و "بەرد" هەڵی سەنگینە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە کە دوو بە دوو خزمن: *ئاستەم* "سەخت" و *هەستی* "بەرد"، *کەڤر/کەمر* "بەرد" و *قەمرین* "بەستن، رەق بوون"، *قەرسین* "بەستن، مەیین" و *کەرا* "گاشەبەرد" و هتد].

زۆتی **zotî** [ *zotī* ] - "نەفرین": خزمە دەگەڵ ↑جادوو cadu دە بنەڕەتدا بە مانای "دووعا لێکردن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ zādīten (Pl.) "دووعا کردن، پاڕانەوە".

زۆخ **zox** - "1- توانا، بەکار 2- توانایی، هێز": ↑زووخ zux یش دەگوترێ.

زۆر1 **zor 1** - "فرە، گەلێک": ئەم وشەیە بە چەندین شێوەی جۆربەجۆر دە شێوەزارەکانی کوردمادیدا دەردەکەوێ وەک زاف zāf، زاڤ zāv، زەعف zıɛıf، زەحف zaħıf، ↑زاڤێر zāfer. ئەم شێوەی هەرە دوایی زۆرتر نیزیکە لە وشە ئەسڵییەکەوە. خزمە دەگەڵ sporyj (Rus.) "زۆر، کافی، بێش"، sphira-h (OIn.) "زۆر، بێش، قەڵەو"، spatium "فەزا، ڤاڵایی، هەراوی، مەودا"، spahr (Pl.) "ئاسمان"، sparen (G.) "پاشەکەوت کردن" [زۆر کردن، وەسەریەک نان؟]، ↑زوفت zuft "1- پڕاوپڕ 2- چکۆس، خەسیس"، ↑زۆڤ zov "هەزارپێ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *sp(h)ei- >** "لە بەریەک کشانەوە، درێژ

بوونەوە، هەراو بوونەوە“. ئێستا با بێنە سەر وشەی زاف/ ↑زاڤ zaf / zav کە ئەویش دە زمانی کوردمادیدا بە مانای ”زۆر“ بە کار دەهێندرێ. بە ورد بوونەوەیەک لە وشە خزمەکان بۆمان روون دەبێتەوە کە دە زمانی کۆنی کوردمادیشدا دەبێ یەک وشەی وەک [زەپەر/ زاڤەر *zaver / *zeper] هەبووبێ و پاشان ئەم وشەیە بە دوو جۆری سەرەکی گۆڕانی بەسەرداهاتبێ. لە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا فۆنیمی f یان v سواوەتەوە و وشەکە بووەتە زۆرzor و لە شێوەزاری سەروودا فۆنیمی r ی کۆتایی وشەکە سواوەتەوە و بووەتە زاف zaf یان زاڤ zav. دیارە شێوەی ↑زاڤێر zaver یش دە هێندێک شێوەزاردا ماوەتەوە کە هەمان مانای ”زۆر“ دەبەخشێ و دەبێ لە هەموو وشەکانی دیکە بە ئەسڵی وشە کوردمادییەکە نیزیکتر بێ.

جگە لەمە دە زمانی کوردمادیدا، بە شێوەزاری ناوەڕاستیشەوە↑زەوەند zewend (زەبەند zebend) هەیە کە دەگەڵ زۆر دێ [زۆر و زەوەند]. ئەم وشەیەش پێک هاتووە لە زەو zew [یان دە بنەڕەتدا: zaf- / zav-] و کەرتی دووەم کە رەنگە ↑هەند hend [هێند hend] بێ بە مانای ”بڕ، *ئەندازە*، میقدار“. لەم تیرِوانینەوە مانای زەوەند دەبێتە ”ئەندازەزۆر“ واتا بە ئەندازەیەکی زۆر.

[تێبینی: سەبارەت بە چۆنێتی گۆڕانی وشە کۆنەکە دە شێوەزاری ناوەڕاستدا چەندین نموونەی دیکەی ئەوتۆ لەبەر دەستە. ئەم جۆرە گۆڕانە چ بە گشتی دە زمانی کوردمادیدا وچ بە تایبەتی دە شێوەزاری ناوەڕاستدا باوە. لەم بارەوە بەراوردی ئەم وشانەی خوارەوە بکە: زڤران zıvran (شێوەزاری سەروو) و سووڕان suran (شێوەزاری خواروو)، دەڤ dev / دوو du، زبر zıbır / زوور zur، گڤاشتن gıvaştın / گووشین gûşîn و هتد].

**زۆر2 zor** - ”ستەم، تۆپز، بەکارهێنانی هێز“: زور zūr (.P)، zavar (.Pl) و (.Av). دەبێ خزم بێ دەگەڵ schwer (.G)، swar (.OG)، svar (.Sw)، svarus (.Lit) ”گران، گرینک، دژوار“. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *suer (.IE)** ”*زوورانەوە*، ئێشان، چڵک کردن“. دە زمانی کوردمادیدا ئەم مانا بنەڕەتییە دە هێندێک وشەدا پارێزراوە، وەک، ↑*زوورانەوە zuranewe* ”ئێشان، کزانەوە“، ↑سیویر sîwîr ”تاوێک کە پێست تاوانگاز دەکا“، ↑سەبەل sebel ”نەخۆشییەکی چاو“، ↑ژوار juwar ”ژان“ [ژان و ژوار]، ↑زویر zuwîr ”نارەحەت، دڵ ئێشاو“. هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە لەم ریشەوە هێندێک وشە بە مانای ”زەخت، فشار، ئاستەم بوون“ بەدی هاتوون، بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا swaerliche (.OG) ”ئاستەم، گوشەر“ [ئەوشتەی گوشارت دەخاتە سەر، بەرتەنگت دەکا یان ئازارت دەدا]، swārlīhho (.OG) ”بە زحمەت، بە ئاستەم، بە سەختی“ و schwierig (.G) ”سەخت، پڕزەحمەت، ئاستەم، پڕئازار“.

[تێبینی: لێرەدا ئەگەر بەراوردێکی دوو وشەی ”ستەم“ و ”ئاستەم“ بکەین وپێوەندی ریشەیی و مانایی ئەوان بە یەکەوە بخەینە بەرچاو، بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی زۆر2 zor پێوەندی بە وشە ئەورووپییەکانی سەرەوە هەیە. وەک دەبینین هەردوو وشەی ستەم و ئاستەم ئاماژە دەکەن بە چەمکی ”سەختی، قورسی، دژواری“. ”ئاستەم“ واتا سەخت و دژوار و ”ستەم“ کردنیش واتا خستنی کەسێک بۆ ناو دۆخێکی ”سەخت و دژوار“، بە وتەیەکی دیکە سەختی و توندی بەکارهێنان بەرانبەر لایەنێک. دیسان هەرلەسەر پێوەندی دوو چەمکی ”زەخت و گوشار“ لە لایەک و ”زۆر و ستەم “ لە لایەکی دیکەوە دەتوانین ئاماژە بکەینە oppression (.E) ”ستەم“ کە دەچێتەوە سەر بنەوشەی pressus (.L) ”گوشین، پاڵەپەستۆ کردن“].

خاڵێی دیکە کە دەبێ لێرەدا باسی بکەین، ئەوەیە کە وشەکانی ↑زەفەرzefer [زەفەر پی بردن واتا زۆر پێ شکان، زال بوون]، ↑جەور cewır ”زولم و زۆر“ [دە عەرەبیدا کراوە بە جبر jabr (.Arb)]، ↑زەبر zebır [دەبنەڕەتدا: هێز، گوشار، پاڵ]، ↑زوور zur یان ↑زبر zıbır ”رەق، سەخت، درشت“، گەڤار gavar یان ↑گەورە gewre ”مەزن“ [دەبنەڕەتدا: خاوەنی هێز و قورسایی، گرینگ]، ↑شەڤارە şevare ”زۆر درێژ“ [کۆنتر: ”مەزن“] پێوەندییان بە زۆر zor ەوە هەیە. دە راستیدا ئەم وشانە گشتیان لە یەک وشەی

بنەڕەتی پەیدا بوون کە ئەویش دەبێ زەڤەر *zaver** بێ [هەڵی سەنگینە دەگەڵ zavar (Pl.) و (Av.)].
ئەم وشە کۆن و بنەڕەتییە، کە بە تەواوی دەگەڵ وشە ئەورووپییەکانی سەرەوە، بۆ وێنە swar (OG.) و svar (Sw.) "قورس، گران، سەخت" یەک دەگرێتەوە، دواتر چەند گۆڕاتیکی بە سەردا هاتووە و چەند وشەیەکی لێ کەوتۆتەوە کە ماناکانیان زۆر لە یەکتر نیزیکن. ئەم وشە کۆنە دە هێندێک شێوەزاری زمانی کوردمادی ئەمرۆدا پارێزراوە و بووەتە زاڤر zavır یان ↑زاور zawır بە مانای "تاقەت، وێران".
بەم جۆرە چەندین مانا بەم شێوەی خوارەوە یەک لە دوای یەک لەو ریشەی سەرەوە پەیدا بووە: ئێشان، ئازار دان ← ئاستەم، گوشەر، دژوار، سەخت ← قورس، گران، سەنگین، مەزن ← سەختی، هێز، دەسەڵات، زەبر و زەنگ.

[تێبینی 1: سەبارەت بەو گۆڕانە فۆنۆلۆژیکەی بە سەر وشەی "زۆر" بە مانای "ستەم، دژواری"دا هاتووە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ زۆر[1] "فرە". ئاڵوگۆڕەکە لە هەردوو وشەکەدا هاوشێوەیە. تێبینی 2: پێوەندی چەمکەکانی "رەق، سەخت، درشت" لە لایەک و "هێز، گوشار، پاڵ" لە لایەکی دیکە لە دوو وشەی "سەخت" و زەخت"دا دەبینرێ. ئەم دوو وشەیە پێکەوە خزمن. "زەخت" دە زمانی عەرەبیدا بووەتە ظغط zext (Arb.) "گوشار و پاڵەپەستۆ" دێ].

**زۆز zoz** - "گیایەکە لە ئاو دا دەڕوێ": پێوەندی هەیە بە وشەی ↑سەوز sewız [zoz ← sewız ← sebız]. سەبارەت گۆڕانی فۆنۆلۆژیک لە وشەکەدا هەڵی سەنگینە دەگەڵ "گابار"، گەوڕ" و "گۆڕ"، یان "زەبر" و "زۆر".

**زۆزان zozan** [*zozān*] - "هەوارگە، کوێستان": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:
1- لەوانەیە مەبەست لەم ئەم وشەیە "چیا، کێو" بێ. دە زمانی کوردمادیدا "گەرمێن و "کوێستان کردن" بەکار دێ و کوێستان هاومانای "زۆزان"ە و دەچێتەوە سەر وشەی "کێو". بەم جۆرە "زۆزان" دەتوانێ دەگەڵ چەند وشە بە مانای "بەرد" و دواتر "شاخ" خزم بێ. [لەنێوان دوو چەمکی "بەرد" و "شاخ"دا پێوەندی هەیە، بۆ وێنە "چیا"ی کوردمادی خزمە دەگەڵ وشەیەکی ئەڵمانی بە مانای "بەرد"، یان وشەی "شاخ" لەوانەیە پێوەندی بە "زاخ[1]"ەوە هەبێ کە ئەویش مانای "بەرد" دەدا]. ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، بنجی زۆز -zoz دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شووژ şûj "ورتکەبەردی بە کوتک شکێنراو"، ↑شژ şıj "بەردی ناسک و تورت"، ↑زیخ zîx "ورکەبەرد" و ↑*زاخ[1] zax* "بەرد" و لەوانەشە دەگەڵ ↑شاخ şax "کێو". ئەم دەستەوشەیە بە شیمانەیەکی بەهێز دەگەڵ ژمارەیەک وشەی دیکە خزمن کە مانای "سەختی، پتەوی" لە خۆ دەگرن، وەک ↑زۆخ zox "هێز، توانایی" [دە ئەسڵدا: سەختی، پتەوی]، ↑زیخ zîx "بوێر، ئازا"، ↑زۆق zoq "هیشک و زبر"، سەقەم seqem [سارد و سەقەم]، ↑زیک zîk "زۆر سارد"، ↑زوقم zuqım "بەستەڵەک"، ↑سەخت sext و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑*سەق seq* دا باس کراون. هەروەها وشەکانی ↑ساسۆن sason و ↑ئاسۆس asos [a-sos] "ناوی دوو چیا لە کوردستان" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە.
2- لەوانەشە پێوەندی دەگەڵ ↑زۆز zoz هەبێ و مەبەست شوێنی جەنگەڵی و سەوزەڵان بێ.

**زۆڤ zov** - "هەزارپێ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زاڤ zav "زۆر" و ئاماژە بێ بە زاڤ بوونی لاقەکانی ئەم زیندەوەرە.

**زۆق zoq** - "وشک و زبر": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq.

**زۆڵ1 zol 1** - دەگەڵ "زەرد" دێ [زەرد و زۆڵ zerd u zol]. شێوەی کۆنتری وشەی ↑زەرد zerd.

**زۆڵ2 zol 2** - بۆ چەرم بەکار دێ: زۆڵەچەرم واتا تیکەیەک، باریکەیەک لە چەرم [دە بنەڕەتدا: کەنارەیەکە لە چەرم]. زوێڵ و زیڤاڵ zîval و ↑زیڤار zîvar یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زێوار zewar "پەراوێز" و دواتر ↑*جەم[1] cem 1* "کن، نک، قەراخ".

**زۆڵ3 zol** - "بیژوو، ئاوارته": ئەم وشەیە هەم بۆ منداڵی بیژوو بەکارهاتووە کە بە گوێرەی داب و نەریت وەک شتێکی ئاوارتە و *جیاواز* سەیر کراوە و هەمیش بو دانەوێڵەی نەکوڵ بە کار دێ. دیارە دانەوێڵەی نەکوڵیش [زۆڵ، زۆڵەک] جیاوازە لە دەنکەکانی دیکە. زۆڵ دە بنەڕەتدا ئاماژە دەکا بە جودا بوون و جیاواز بوون لەوانی دیکە. بەم پێیە ئەم وشەیەش وەک ↑جیا cîya و جۆ co [↑جوێ cuwe] و گەلێک وشەی دیکە دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "بڕین، لێک کردنەوە، جیا کردنەوە". شیاوی باسە کە وشەی "بیژوو"ش خۆی دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "جیا کردنەوە".

**زۆم(ە) zom(e)** - "کۆمەڵەڕەشماڵی لە دەوری یەکتر": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑سمتە sımte "وردی پێکەوەنووساو". ↑گیم gîm "باقەبێن، بەندی بەستنی باقەگیا" دەشێ پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

2- گۆم2 gom "1-ماڵی هاوین 2- زنج 3- خانووی دەربەستە 4- پەناگای پاسەوان".

**زۆمپ zomp** - " کوتکی زلی ئاسن": زۆنپ zonp یش دەگوترێ. جگە لەمە دە زمانی کوردمادیدا ↑دمبەک dımbek [دومبەک dumbek، دنبەک dınbek] و ↑تەمبوور tembur [تەنبوور tenbur] هەن کە ئەوانیش پێوەندیان بە چەمکی "ژەنین، لێدان، کوتان"ەوە هەیە و دەبێ دەگەڵ یەکتر خزم بن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەند وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑تەمر temır "مۆری پۆست"، ↑تەمغە *temġe* "مۆری ئیداری" و ↑چۆماخ çomax "تێلا، گۆپاڵ".

**زۆنگ zong** - "باتلاخ":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زنە zıne "چیمەنی ئاودەلێن" و ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوە نووسان".

2- یان لەوانەیە پێوەندی هەبێ ↑زنگرین zıngrîn "تۆپین، کەوتین"، sinken (G.)، sinkan (OG.)، sigqan (Gt.)، sink (E.)، sjunka (Sw.) "ڕۆچوون، بەرەو خوار چوون، دابەزین، هاتنەخوار". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **< *sengu- (IE.)** "کەوتن، هاتنەخوار، چوونە خوار".

**زهار zıhar** *[ zıhār ]* - "مار": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑حەزیا ħezya سەر بە ڕیشەی **< *eĝhi- (IE.)** "مار". وشەی ↑ژیشک jîşık و ↑ئەژدیها ejdîha دەچنەوە سەر هەمان ڕیشە.

**زەب zeb** *[ zab ]* - "ڕەق، سەخت": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıfıt "سەخت".

**زەبر zebır** *[ zabır ]* - "لێدان": دەگەڵ "زەنگ"یش دێ [زەبر و زەنگ zebır û zeng]. ئەم شێوەی کۆنتری ↑زۆر zor ە. مانای وشە بنەڕەتییەکە "قورسایی و گرانی" بووە و لەوێوە بووەتە "گوشار و تەنگەتاوی و پاڵەپەستۆ" و هەروەها "زوڵم و ستەم" [بڕوانە ↑زۆر zor]. چۆتیتی پێوەندی ئەم مانایانە بەیەکەوە لە ژێر وشەی "زۆر"دا شی کراوەتەوە. دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا لە سەر بنچینەی وشە بنەڕەتییەکە دوو وشە هاتووەتە ئاراوە، یەکەمیان کە شێوە کۆنترەکەیە و ئەمڕۆ مانای "لێدان"ی وەرگرتووە. شێوەی دووەمی وشەکە تازەترە و بووەتە "زۆر" و مانا کۆنەکەی باشتر پاراستووە. شیاوی باسە کە وشەکانی جەوڕ cewır و هەروەها جبر jabr (Arb.) پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە و وشە عەرەبییەکە لە زمانە کۆنە ئێرانییەکان وەرگیراوە.

**زەبلۆق zebloq** *[ zabloq ]* - "ساف و لووس لە دەستان": خزمە دەگەڵ ↑ساف2 saf.

**زەبەش zebeş** *[ zabaš ]* - ↑ژەبەژ jebej.

**زەبەلاح zebelaħ** *[ zabalāh ]* - "زەلامی ناقۆڵا": خزمە دەگەڵ ↑زپ zıp "تژە، زل" و ↑زبر *zıbır* "درشت، گەورە".

**زەبەند zebend** *[ zaband ]* - "1- چوغر، بێشەڵان 2- زۆر، فرە": ↑زەوەند zewend یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زۆر1 *zor* "فرە".

**زەپ zep** *[ zap ]* - "تەژەی ئەستوور": پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانەوە:

1- ↑گەپ gep و ↑قەبە *qebe*.

2- ↑گەورە *gewre*.

**زەپرتی zepırtî** [ *zapartī* ] - "بزۆن، ئۆقرەنەگر": خزمە دەگەڵ ↑زڤرین zıvrîn [سووران suran].

**زەخ zex** [ *zax* ] - "زل، مەزن": [دە بنەڕەتدا: قەوی، بەهێز". هەروەها ↑زەخم zexm هەیە بە مانای "1- چیای سەخت و ڕژد 2- زل و مل قەوی". خزمن دەگەڵ ↑سەق seq "سەخت، پتەو". دە زمانی عەڕەبیدا وشەی ضخم zaxm (Arb.) "ئەستووراییی، زلی" وێ دەچێ لەم وشانە وەرگیرابێ.

[تیبینی: پێوەندی دوو چەمکی "سەخت و بە هێز بوون" و "زل و زەبەلاح" بوون لەم وشانەی خوارەوەشدا دەبینن: *تاو* "هێز، گوڕ" و *تاپاز* "زل و زەبەلاح" یان *تەژی* "چڕ و پڕ" و تەژە "زەبەلاح" و هەروەها "زەبر" [زەبر و زۆر] و "زەبەلاح" ].

**زەخت1 zexıt** [ *zaxıt* ] - "گوشار، زۆر، تەنگەتاوی": زۆر جار دەگەڵ "زۆر" دێ [زەخت و زۆر zext u zor]. دە زمانی عەڕەبیدا ظغط zaxt (Arb.) "گوشار و پاڵەپەستۆ" لەم وشە کوردییە وەرگیراوە. "زەخت" خزمە دەگەڵ ↑سەخت sexıt. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا ↑جەخت cext کردن هەیە بە مانای "پێداگری" و گوشار خستنە سەر [دە فارسیدا: "پافشاری]، کە ئەویش پێوەندی بە "زەخت"ەوە هەیە.

[تیبینی: سەبارەت بەوە کە چۆن مانای وشەکە لە "سەخت "ەوە بۆ "تەنگەتاوی" گۆڕاوە، هەڵی سەنگینە دەگەڵ زۆر[2] zor کە بە مانای "گوشار، پاڵەپەستۆ، تەنگەتاوی" دێ و دەبنەڕەتدا بە مانای "دژوار و گران" بووە - بڕوانە زۆر[2] zor].

**زەخت2 zexıt** [ *zaxıt* ] - "1- نەقیزە 2- مامزە": سک sok (P.). خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq.

**زەخم zexm** [ *zaxm* ] - "1- چیای سەخت و ڕژد 2- زل و مل قەوی": خزمە دەگەڵ ↑زەخ zex "زل، مەزن" [دە بنەڕەتدا: قەوی، بەهێز] و هەروەها دەگەڵ ↑*سەق seq* "سەخت، پتەو".

**زەدە zede** [ *zada* ] - "عەیب و کەموکوری شتومەک": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Schaden (G.)، scado (OG.)، schade (Nl.)، sceađa (OE.)، skada (Sw.) "زەدە، زیان". وشەی ↑چەت çet یش [چەت تیخستن] لەوانەیە هەر لەم پێوەندییەدا جێ بگرێ.

**زەرا zera** [ *zarā* ] - "ڕوو، بیچم، چارە": شێوەیەکی دیکە لە ↑چارە çare "دەموچاو". هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ڕەزاشیرن razāšīrın "خوێن شیرن" و ڕەزاگران razāgırān "خوێن تاڵ" هەن، کە کەرتی یەکەمیان، واتا ڕەزا razā دەبێ شێوەی ئاڵوگۆڕکراوی زەرا zarā بێ.

**زەراڤە zerave** [ *zarāva* ] - "کونی دیوار": دەشێ خزم بێ دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ دەروو1 deru "دۆڵی تەنگ"، ↑دەلاقە delaqe "دەربیچە"، ↑دۆڵاب dolab "شکاف، جێی نوێن وبان یان جلوبەرگ دە دیواردا". ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑*دۆڵ dol* و ↑دەرە dere، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "قووپان، کۆڵدراو بوون، قووڵ بوون".

**زەراندن zerandın** [ *zarāndın* ] - "دەنگ هەڵبڕینی کەر": سەڕاندن serandın و هەڕاندن herandın یش دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا عرعر εar εar kardan (P.) مانای "زەراندن، زەڕەزەڕ کردن" دەدا. پێوەندی بەو وشانەوە هەیە کە لەژێر ↑جرت[2] cırt دا باس کراون.

**زەرب(ە) zerb(e)** [ *zarb(a)* ] - "زەبر، لێدان": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑ترپان tırpan "مەڵەغان، داسی دەسک درێژ" و چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا کە مانان "لێدان، کوتان" دەگەیەنن. ئەسڵی وشەکە دەبێ شتێکی وەک *دەرپە derpe** بووبێ. وشەکە دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە ضربة zarba (Arb.) و پاشان وەک "زەربە" هاتۆتەوە ناو زمانی کوردی. ئەوەی ئەم بۆچوونە پشتراست دەکا وشەی زەرپ zerp و ↑زەرپاندن zerpandın دە زمانی کوردمادیدایە بە مانای "لێدان". خۆ ئەگەر ئەسڵی وشەکە عەرەبی بایە، ئەوا زمانی کوردمادی بێ کێشە وشەکەی دەکردە "زەرباندن"، نەک "زەرپاندن".

بەپێچەوانەوە زمانی عەرەبێ لەبەر نەبوونی فۆتیمی p، ناچار بووە فۆتیمی p بکاتە b. دە زمانی کوردمادیدا دەربە derbe ش دەگوترێ.

**زەرپاندن zerpandın** *[ zarpāndın ]* - "لێدان، کوتان": بڕوانە ↑زەرب(ە) zerb(e) "زەبر، لێدان".

**زەرد1 zerd 1** *[ zard ]* - "ڕەنگی زێر": زەر zer یش دەگوترێ. زرد zard (P.). خزمە دەگەڵ gelb (G.)، geel (Nl.)، yellow (E.)، gul (Sw.)، hári-h (OIn.)، helvus (L.) "زەرد"، chlōros (Gr.) "سەوزی ئاماڵ زەرد"، zelënyi (Rus.) "سەوز"، سەر بە ریشەی **< *ĝhel- , *ĝhlē- (IE.)** "درەوشانەوە، بریسکانەوە". خزمە دەگەڵ ↑زێڕ zer، ↑زارە zare "زراو" و هتد.

**زەرد2 zerd 2** *[ zard ]* - "کێوی بەردینی بلیند": [ماە و زەرد یان زەرد و ماە]، خزمە لەگەڵ hart (G.) و hard (E.) "سەخت، ڕەق". خزمیشە دەگەڵ ↑خار xar "(هەردی) سەخت"، دواتر دەگەڵ ↑کورد kurd.

**زەرف zerıf** *[ zarıf ]* - "دەفر، پاکەت": هەرچەند ئەم وشەیە دە زمانی عەرەبیدا بەکار دێ، بەڵام بە ئەسڵ وشەیەکی عەرەبی نییە. ئەم وشەیە لە ژرف žarf (P.) "قووڵ" وەرگیراوە و ئەمەش شێوەیەکی گۆڕدراوە لە zafr (Pl.) و jafra (Av.) "قووڵ"و ↑دەفر defır ی کوردمادی بە مانای "زەرف".

**زەرقین zerqîn** *[ zarqīn ]* - "درەوشانەوە": خزمە دەگەڵ ↑زەرد1 zerd، ↑ زێڕ zer و ↑زریوە zırîwe و ↑جریوە cırîwe و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە، بریسکانەوە". وشەی زرق zarq (Arb.) [زرق و برق] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و وێ دەچێ وشەیەکی کوردمادی بێ.

**زەرک zerık** *[ zarık ]* - "تاسی بچووک لە مس": ئەم وشەیە و هەروەها زەڕک zerık "تۆێکلی گوێزی شین" دەشێ دەگەڵ schale (G.) خزم بن. وشە ژێرمەنییەکە هەم بەمانای "تۆێکڵ" دێ و هەم بە مانای "تاس، جام". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەللە kelle، ↑چەڵتووک çeltuk.

**زەرگ zerg** *[ zarg ]* - "شیشی دەروێشان": دەچێتەوە سەر ریشەی **< *(s)ker- (IE.)** "بڕین، قەڵشاندن، لەت کردن". دە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا ژمارەیەکی زۆر وشە لەم ریشەوە هاتوون و دە کوردمادیشدا بۆ وێنە ↑کێرد kerd، ↑شڕ şır، ↑کرتاندن kırtandn، ↑کەرت kert و هتد. "زەرگ" بەرهەڤ بکە بۆ وێنە دەگەڵ scharf (G.)، sharp (E.)، scherp (Nl.)، skarp (Sw.) "تیژ". ئەم وشە ژێرمەنییانە لەو ریشەی سەرەوە سەرچاوەیان گرتووە.

**زەرگە zerge** *[ zarga ]* - "بالابەرزی باریک و قیت": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەق şeq "لە بەریەک کێشراو".

**زەرگەتە zergete** *[ zargata ]* - "زەردەواڵە": زەر+ گەتە zer + gete. کەرتی یەکەم هەمان زەرد zerd ە. کەرتی دووەم، gete بە شێوەی قتی qıtî- یش دەردەکەوێ [زلقتی واتا زەرگەتە] و خزمە دەگەڵ ↑کەت ket و ↑کوت kut سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، کەت کردن، لەت کردن".

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی insekt (L.) و entomos (Gr.) بە مانای "حەشەرە" دە بنەڕەتدا "بڕدراو، بڕ لێدراو، کەت کراو" مانا دەدەن. ئەم ناوانە لەوەوە هاتوون کە ناوقەدی حەشەرە لە یەک یان چەند شوێندا وەک "بڕاو، بڕ لێدراو" دەچێ، واتا ناوقەدی بڕبڕە.

**زەرنوق zernuq** *[ zarnuq ]* - "چەورایی کەم لەسەر ئاوی چێشت": زەرنوقاو zernuqaw یش دەگوترێ.

**زەروو zeru** *[ zarū ]* - "کرمی خوێنمژ": زالو zālū (P.).

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Gier (G.) "حەز و مەیلی زۆر"، giri (OG.) "تامەزرۆ، حەریس"، gern (OG.) "شێلگیر، کۆڵنەدەر"، gairns (OE.) "چاوچنۆک، پووڵەکی" و geron (OE.) "شێلگیر، تامەزرۆ، پڕتاسە"، سەر بە ریشەی **< *gher- (IE.)** "پێ خوش بوون، تامەزرۆ بوون، خۆ بۆ کوتان". هەروەها بەراوردی ئەم وشانەی سەرەوە بکە دەگەڵ ↑قرنوو qırnu "گەنە" و ↑قرنیس qırnis "رژد و دەست قوچاو" و دواتر ↑گەڕناس gernas.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانین "زەروو" بەراورد بکەین دەگەڵ zelus ‎(L.)‎ و zelos ‎(Gr.)‎ "شێلگیر، خۆکوت". ریشە؟

**زەرۆپ zerop** ‎[ *zarop* ]‎ - "خۆشرەو": پێوەندی هەیە بە < *drome* ‎(*Gr.*)‎ "رەوت، رویین". دەشێ وشەیەکی خوازراو بێ.

**زەریق zerîq** ‎[ *zarīq* ]‎ - "تیشکی بەرەبەیان": ↑زەرقین zerqîn "درەوشان، تروسکان".

**زەعفەران zeɛferan** ‎[ *zaɛfarān* ]‎ - "بەری گولێکی رەنگ زەردە و بۆ پلاو و دەرمان بە کار دێ". زافران zafran یش دەگوترێ. زعفران zaɛfarān ‎(P.)‎، وشەیەکی خوازراوە و دەچێتەوە سەر < *صفرا safrā* ‎(*Arb.*)‎ "زەردی".

**زەفەر zefer** ‎[ *zafar* ]‎ - "زەفەر پێ بردن واتا زۆر پێ شکان، بەسەردا زاڵ بوون". زەڤەر zever یش دەگوترێ. ئەم وشەیە شێوەیەکی کۆنە لە وشەی ↑زۆر zor "گوشار، زەخت، نهێم، پاڵەپەستوو". چۆنیەتی ئاڵوگۆڕی ئەم وشەیە لە ژێر وشەی ↑زۆر zor دا شی کراوەتەوە. ئەوەی لێرەدا دەبێ زیادی بکەین، ئەوەیە کە زمانی عەرەبی ئەم وشەیەی لە زمانی کوردمادی یان فارسی وەرگرتووە و کردوویە بە ظفر zafar ‎(Arb.)‎ "سەرکەوتن، زاڵ بوون".

**زەڤلەک zevlek** ‎[ *zavlak* ]‎ - "ماسوولکە": ↑زیپەر zîper یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑زبر zıbr "درشت، گەورە".

2- ↑ساباط sabat، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لەبەر یەک کشانەوە" و لەوانەیە پێوەندی بە ↑سیپەلک sîpelk ەوە هەبێ. بە هەر بارێکدا لێکی بدەینەوە، ماسوولکە ئەو ئەندامەیە کە لەکاتی بەکار هێنانی هێز دەماسێ، ئەستوور و گەورە دەبێ.

**زەق zeq** ‎[ *zaq* ]‎ - "دەرپەڕیو": ئەم وشەیە و ژمارەیەک وشەی دیکە پێوەندییەکی نیزیک نیشان دەدەن و لە ریشەیەکی هاوبەشەوە هاتوون. ئەم وشەیە بە چەند شێوە دەبینرێ، وەک زۆق zoq، زوک zuk، زەک zek و هتد. هێندێک لەم وشانە بریتین لە ↑شاخ şax "1- قۆچی ئاژەڵ 2- لقەدار" [شاخ šāx ‎(P.)‎ و شاخە šāxa ‎(P.)‎ "لقی دار"]، ↑زیخ zîx "1- زیت و زرینگ 2- دڕکی ئەستوور"، ↑زیخان zîxan "دنە دان، پاڵ نان"، ↑زەخت² zext [زیخت] "1- نەقیزە 2- مستەکوڵە 3- مامزە" [سک sok ‎(P.)‎]، ↑زیق zîq "قیت و بەل"، ↑چق çıq "1- لقی بچووک 2- قیتکەی پاشنەی کەڵەشێر"، ↑چغا çığa "تەپە" [شێوەیەکی دیکە لە "شاخ"]، ↑سەکۆ seko "شوێنی زەقکراو بۆ دانیشتن یان وەستان"، ↑ساکەتە sakete "زەقایی دووگی مەڕ"، ↑سیخ sîx "1- شیش 2- دەرپەڕیو"، ↑سیخاندن sîxandın "بە زۆر تێرا کردن"، ↑سیچقە sîçqe "مووچڕک"، ↑سیچکە sîçke "خونچەی تازە"، ↑شیش "1-زەرک 2- تیشە شاخ" و هتد. چەمکی هاوبەش لە هەموو ئەم وشانە دا "زەق بوون، دەرپەڕین، دەرپەڕاندن"ە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < **(s)kēu-* ‎(***IE.***)‎ "دەرپەڕاندن، رە پاڵ نان، راو نان، پەلە کردن، تاو دان". ئەم ریشەیە دە زمانە ژێرمەنییەکان و دە زمانی کوردمادیدا لک و پۆیەکی زۆری لێ دەبێتەوە و گەلێک وشە بە مانای جۆراوجۆر دروست دەکا، بۆ وێنە ↑گۆشە goşe،↑سووچ suç [سیک sîk]، ↑چووزەرە çuzere، ↑چەکەرە çekere، ↑شات şat، ↑چات çat، ↑سات sat [سوور و سات] و دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑شەپ *şep* دا باس کراون.

**زەقاو zeqaw** ‎[ *zaqāw* ]‎ - "ئاو کە لە قەراخی مێرگ دەدەڵێ": زەق zeq + ↑ئاو aw. کەرتی زەق zeq پێوەندی هەیە بە ↑تکانەوە tıkan(ewe). مەبەست ئاوێکە کە دەتکێتەوە.

**زەقین zeqîn** ‎[ *zaqīn* ]‎ - "تریقانەوەی منداڵ": خزمە دەگەڵ ↑زیقە zîqe.

**زەگر zegır** ‎[ *zagır* ]‎ - "ورکەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax "بەرد".

زەل¹ zel [ zal ] - "زۆنگ، هەردی تەڕ وشل": خزمە دەگەڵ زەلین zelîn و ↑زەلاندن zelandın. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردمادی، بۆ وێنە ↑گلان gılan، ↑خلیسکان xılîskan، ↑زلچە zılçe و هتد.

زەل² zel [ zal ] - "قامیش، چیت": خزمە دەگەڵ ↑قەڵەم qelem.

زەلال zelal [ zalāl ] - "روون، ساف": زولال zulal یش دەگوترێ. زلال zolāl (P.). خزمە دەگەڵ klar (G.)، clear (E.). وشە ژێرمەنییەکان دەبردرێنەوە سەر clarus (L.) "روون، ئاشکرا، بەرچاو، بەدەنگ، بە ناوودەنگ". ئەم وشە لاتینیە بە خزم دادەندرێ دەگەڵ hell (G.) "روون، رووناک" و ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑کاڵ kal "رووناک، کەمڕەنگ"، ↑زایەلە zayele "دەنگ دانەوە" و ژمارەیەکی زۆر وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا.

زەلام zelam [ zalām ] - "1- گەورە، مەزن 2- مرۆ (ی گەورە، نەک منداڵ)": ↑زل zıl. کەرتی دووەمی وشەکە، am- لەوانەیە کورتکراوی ↑ئادەم adem بێ.

[تێبینی: سەبارەت بە مانای دووەمی وشەکە دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ erwachsen (G.) "مرۆی گەورە، نەک منداڵ" کە دەچێتەوە سەر کرداری wachsen "هەڵدان، گەورە بوون"].

زەلاندن zelandın [ zalāndın ] - "1- خلیسکاندن 2- لە رێگە کلا کردن": خزمە دەگەڵ زەل¹ zel "زۆنگ، هەردی تەڕ وشل".

زەلانەوە zelan(ewe) [ zalānawa ] - "لەسەر خەڵک لەوەڕان": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑چلە çıle، ↑چلێس çıles، ↑چەرین çerîn [چەران çeran].

زەلقاندن zelqandın [ zalqāndın ] - "چەسپاندن": بنەوشەی زەل -zel(q) خزمە دەگەڵ Klei (G.) "گڵ، لیتە"، kleben (G.)، clīfan (OE.) سەر بە ریشەی **(IE.) *glei- >** "گلوو بوون، پێوەنووسان". هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑گڵ gıl.

زەلکاو zelkaw [ zalkaw ] - "باتڵاق، قامیشەڵان": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑زەل(ک) zel(k) "قامیش، لاسگەگیا".

2- ↑زەل zel و زەلین zelîn "خلیسکان، رۆچوون، تەر و لیچق بوون".

3- ↑خۆڵ xol، solum (L.) "خۆڵ، خاک"، hyle (Gr.) "خڵتە و خاڵ، لیتە"، hal (Kymr.) "پیسایی، زەلکاو"، soloti (Rus.) "زەلکاو".

زەلکە zelke [ zalka ] - "شۆرباوی بێتام": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زڵچە zılçe باس کراون.

زەڵم zelm [ zalm ] - "1- ئاوی توێژلەسەر 2- ناوی چەمیک لە کوردستان": هەروەها ↑ژەلم jelm هەیە بە مانایی "ئاوی لێڵ". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Schlamm (G.)، slam (MG.) "قوڕ و چڵپاو، لیتە و لەجەنی چەم و ئاوی پیس". ئەم وشە ئەڵمانییە بۆ یەکەم جار لە نووسینەکانی 1300 زایینیدا بەدی کراوە و لە زمانانی دیکەی ژێرمەنیدا هاواڵەکانی دەست نیشان نەکراوە. لەوەدەچێ تەنیا دە زمانی ئەڵمانیدا بەکار بهێنرێ. ریشەی وشەکە بە روونی ساخ نەکراوەتەوە. بە گوێرەی بۆچووتیک دەتوانێ پێوەندی بە schlaff (G.) هەوە هەبێ بە مانای "شل و شۆڕ و داکەوتوو". بە باوەڕی من ئەم وشەیە دەگەڵ وشەیەکی دیکەی ئەڵمانی باشتر دەگونجێ کە بریتییە لە Schleim (G.) و slim (OG.) "تراوی لیچق". یەکێک لەم مانایانەی کە لە وشەنامەی ئەڵمانیدا بۆ Schleim دیاری کراوە بریتییە لە Schlamm، واتا ئەم دوو وشەیە مانایان زۆر لێک نیزیکە. هەر بۆیە زۆر رێی تێ دەچێ کە وشەکە دەگەڵ ↑چڵم çılm خزم بێ و بچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تەڕ و لیچق بوون".

زەلووت zelut [ zalūt ] - "1- بێموو، تاس 2- رووت و قووت": خزمە دەگەڵ glatt (G.) "ساف و لووس، خلیسک، بریقەدار"، glat (OG.) "بریقەدار، درەوشاوە"، glad (Nl.) "ساف و لووس، خلیسک"، Glatze

gladkij (G.) "تاسی، بێمووییی"، glad (E.)، glad (Sw.) "خۆشحاڵ" [دەبنەڕەتدا: دەموچاو درەوشاوە]، (Rus.) " ساف و لووس"، glaber (L.) "ساف و لووس، تاس"، سەر بە ڕیشەی < -ghel̂* (IE.)
"درەوشانەوەنەوە، بریقانەوە". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑زەرد zerd، ↑زێڕ zer و هتد.
[تێبینی: وەک دەبینرێ لە نێوان دوو چەمکی "تاس و لووس" و "بریقانەوە"دا پێوەندی هەیە. ئەمەش لەوەڕا دێ کە ڕووبەڕێک هەر چەند ساف و لووستر بێ، ئەوا بریقەدارتر خۆی دەنوێنێ].
**زەلەویان zelewyan** [ *zalawyān* ] - "شێوان، شلوێ بوون": ژلێوان jılêwan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شلوێ şılwe، ↑*شلەقان şıleqan* و ↑شڵەژان şılejan. گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "لێدان، لێکدان".
**زەماوەند zemawend** [ *zamāwand* ] - "گۆوەند، شایی": زەما + وەند zem(a) + wend. وەک دەزانرێ لە جیاتی زەماوەند، "گۆوەند"یش دەگوترێ. بنەوشەی "زەم" دەبێ هاومانای بنەوشەی "گۆ" بێ. ئەگەر لەم تێڕوانینەوە وشەکان لێک بدەینەوە، بەو ئەنجامە دەگەین کە هەر دووک بنەوشە مانای "کۆ بوونەوە، هاتنە جەم هەڤ" دەبەخشن، واتا گۆوەند دەبێ دە بنەڕەتدا "کۆ(م)وەند" بووبێ و زەماوەندیش خزم بێ دەگەڵ ↑ *جڤین cıvîn* "کۆم بوون، کۆ بوونەوە" و چەندین وشەی لەم چەشنە کە مانای "یەکگرتن، هاتنە جەم هەڤ" دەبەخشن، بۆ وێنە ↑ئەزماندن ezmandın "بانگ هێشتن، میوانی دان". کەرتی دووەمی وشەکان واتا وەند wend- شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بەند bend و دەگەڕێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "بەستن، گرێ دان". بەم پێیە ئەم دوو وشەیە دە بنەڕەتدا مانایەکیان هەبووە وەک کۆ بوونەوە یان دە ئەڵمانیدا Versammlung (G.) کە خۆشی دەبێتە خزم دەگەڵ "زەماوەند".
**زەمبلە zembıle** [ *zambıla* ] - "چلوورە، شووشە سەهۆڵ": زەمبەلیلک zembelîlk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زستان zı(m)stam.
**زەمبوورە zembure** [ *zambūra* ] - "کونی تەنگی بن دۆڵاش": خزمە دەگەڵ سنبە sonbe (P.) "کون"، سنبیدن sonbīdan (P.)، ↑سمین sımîn یان سمتین sımtîn "کون کردن".
**زەمبۆل zembol** [ *zambol* ] - "تلسک، کەرتەهێشوو": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑زەمۆمە zemome.
**زەمبەر zember** [ *zambar* ] - "خشڵ" [زێڕ و زەمبەر]. دە ئەسڵدا دەبێ زەنبەر zenber بێ، پێک هاتووە لە زەن zen "لێدان" + بەر ber [سینگ و بەر]. زەمبەر ئەو خشڵەیە کە لە سینگ و بەر دەدرێ. بۆ کەرتی "زەن" بڕوانە ↑ژەنین jenîn.
**زەمبیل zembîl** [ *zambīl* ] - "قەرتاڵە": زەنبیل zenbîl یش دەگوترێ. زنبیل zanbīl (P.). هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑زەمۆمە zemome.
[بە گوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی وشەکە دە زمانی ئارامیدا zabīlā و دە زمانی ئەرمەنیشدا zampīl بە مانای "قەرتاڵە"یە].
**زەمتین zemtîn** [ *zamtīn* ] - "وەستانی خوێن، لەختەبوون": خزمە دەگەڵ ↑زستان zı(m)stam. ئەم وشەیە دەبێ پێشان بەگشتی بە مانای "مەیین لە سەرمان، بەستن، سەهۆڵ بەستن" بەکار هاتبێ.
**زەمر zemr** [ *zamr* ] - "زۆر مەست 2- تەوەزەل، لەشگران": خزمە دەگەڵ ↑قەمرین qemrîn "بەستن، بوونە سەهۆڵ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "بەرد". دواتر لەمەوە ماناکانی "ڕەق بوون، سەخت بوون، قورس بوون" پەیدا بوون.
**زەممە zemme** [ *zamma* ] - "دەفری قوڕ پێ کێشان کە بە دوو کەس هەڵدەگیرێ": زنبە zanbe (P.).
[سەرەتا تێبینییەک: وشەکە بە فارسی ئاوا مانا کراوەتەوە: "ناوە، گل کش دونفرە". کاتێک چاو لە مانای ناوە nāve دە فەرهەنگی فارسیدا دەکەین، دەبینین کە ئەم وشەیە بە دوو مانای "کەشتی چکۆڵە" و "زەممە" واتا دەفری قوڕکێشان بەکار دێ. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو دەفرە شێوەی کەشتییەکی چکۆڵەی هەیە و لەبەر ئەوەش ئەوەندە زلە کە پێویستی بە دوو هەڵگر هەیە. لە لایەکی دیکەوە

دەردەکەوێ کە ناوە nave ی کوردمادی یان دە فارسیدا nāve (P.) پێوەندی هەیە بە nāvis (L.) بە مانای ”کەشتی“. هێندێک وشە وەک ناوگان nāvgan (P.) و navy (E.) ”کەشتیگەل“ لەم وشەوە هاتوون].

ئێستا بگەڕێینەوە سەر وشەی زەممە zemme. بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پێوەندییانەی سەرەوە گومان لەوەدا نامێنێ کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑گەمی geme ”کەشتی چکۆڵە“.

**زەمۆمە zemome** [ *zamoma* ] - ”تیغە، تیوان کردن بە قوڕ یان تامان“: خزمە دەگەڵ hemmen (G.) ”بەر گرتن، وەستاندن، پێش لێگرتن“، heman (OG.)، hemman (OE.) ”بەر گرتن، بەستن“، Hamm (Nl.) ”زەوییەکی بە پەرژین دەورگیراو“، kom (Rus.) ”گلوو، سمتە، تۆپەڵە“، komit (Rus.) ”ڕێککوشین، تۆپەڵە کردن“، kēmós (Gr.) ”تۆڕ، دەمبێن“ [دەبنەرەتدا: تێکچرژاو، تەنراو]، سەر بە ریشەی ***kem-** < ***(IE.)*** ”بە تامان یان پەرژین دەور گرتن، ڕێککوشین“. دەشێ هێندێک وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندیان بەم وشانەوە هەبێ، وەک ↑هەمزالە hemzale ”چارداغی باغ“، ↑سمتە sımte ”تۆڵا، پێکەوەنووساوی ڕێککوشراو، ↑گومتل gumtıl ”کلۆی چکۆڵە“، ↑زۆم(ە) zom(e) ”کۆمەڵەرەشماڵی لە دەوری یەکتر“ ؟، ↑زەمبیل zembîl ”قەرتاڵە“ و ↑زەمبۆل zembol ”تلسک، کەرتەهێشوو“، ↑کەوانە kewane ”لاکان“ و هتد.

**زەمەر zemer** [ *zamar* ] - ”1- وێران، تێکتەپیو 2- خێشک“: خزمە دەگەڵ ↑ساماڵ samal ”ساف، تەخت، یەکدەست“. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ساماڵە samale کردن ”خێشک لە شێوەرد دان، ساف و یەکدەست کردنی شێوەرد“.

**زەمەن zemen** [ *zaman* ] - ”گێژەڵووکە، گردەلوول“: پێوەندی هەیە بە ↑چەمان çeman [چرەچەمان çıreçeman واتا چرەدووکەڵ].

**زەنا zena** [ *zanā* ] - ”هەراهەرا، چەقەچەق“:

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شین şîn ”شیوەن“دا هاتوون.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە کرداری ↑ژەنین jenîn ”لێدان، لێکدان“. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە ”شلۆقی یاخود دەنگ و هەرای تێکەڵ پێکەڵ“.

[تێبینی: شیاوی باسە کە وشەی ”شلۆق“ (شلۆقی) یش دەچێتەوە سەر کرداری ”شڵەقان“، سەر بە ریشەیەک بە مانای ”لێدان، لێکدان“].

**زەنبەر zenber** [ *zanbar* ] - ”خشڵ، زێر و زێو“: زەمبەر zember یش دەگوترێ. دەشێ لە دوو کەرتی زەن + بەر zen + ber پێک هاتبێ، واتا ئەو شتەی لە ↑بەر ber [بەرۆک] *دەدرێ*. بەوتەیەکی دیکەی ئەو زێر وزیوەرەی بە خۆوە هەڵدەواسرێ. کەرتی زەن -zen دەچێتەوە سەر↑ ژەندن jendın و↑ ژەنین jenîn بە مانای ”لێدان“.

**زەنج zenc** [ *zanj* ] - ”زنە، زۆنگ، باتڵاق“: ↑زنە zıne.

**زەنجەفیل zencefîl** [ *zanjafīl* ] - ”بنەگیایەگی تیژە“: بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی ئەسڵی وشەکە شنگلیل şınglîl ە، دەچێتەوە سەر šangavīr (MP.) و لەوێشەوە بۆ زمانی سانسکریت < *śrngavera* ”*OIn.*“.

**زەنجەلە zencele** [ *zanjala* ] - ”ئامرازێکی کشت و کاڵ“: خزمە دەگەڵ ↑زەنگ zeng ”لێدان“.

**زەند zend** [ *zand* ] - ”لای خوارەوەی قۆڵ“: خزمە دەگەڵ ↑زەنگاڵ zengal.

**زەندق1 zendıq** [ *zandıq* ] - ”مونافیق، گاوڕ“: ئەم وشەیە لە سەدەکانی بەرێدا بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنرا کە بە گوێرەی بیر و بۆچوونی دەسەڵاتدار لە دین وەرگەڕا بوون. وەک دەبینرێ بنجی وشەکە زەند zend ە و ئەم وشەیەش دەبێ پێوەندی بە ↑ژەندن jendın و ↑ژەنین jenîn ەوە هەبێ بە مانای ”لێدان، لێکدان، لێکدانەوە“. بەم جۆرە دەبێ مەبەست لە زەندق دە بنچینەدا ئاماژە کردن بەم بابەتە بووبێ کە ئەو کەسانە پابەند و پێڕەوی ”لێکدانەوە“یەکی تایبەتی بوون لە مەسەلەکانی ئایین. بە

وتەیەکی دیکە ئەم وشەیە دەبێ مانایەکی هەبووبێ وەک "پێڕەوانی لێکدانەوە" یاخود "لێکدەرەوەکان".
هەر لێرەدا دەتوانین ئاماژە بکەین بە وشەکانی زەند zend و پازەند pazend کە دوو بەشەنووسراوی سەر بە پەڕتووکی ئەڤێستان. ئەم بەشانەش دەبێ هەر لێکدانەوە و شیرۆڤە کردنی ئەڤێستا بووبن. لەوانەشە وشەی "زەندەق" دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە پێڕوانی زەردەشت [باوەڕمەندان بە "زەند" [لێکدانەوە، تەفسیر] کردبێ.

**زەندق2 zendıq 2** *[ zandıq ]* - [زەندەقم چوو]، بڕوانە ↑زەندەک2 zendek 2.

**زەندک zendık** *[ zandık ]* - "جومگەی دەست": خزمە دەگەڵ ↑زەنگاڵ zengal.

**زەندۆل zendol** *[ zandol ]* - "1- قەڵشی زل لە زەویدا، رەهۆڵ 2- شیوی تەنگ": زەندۆر zendor یش دەگوترێ. کەرتی زەن -zen یان [زەند zend؟] خزمە دەگەڵ ↑جنین cınîn "بڕین". وشەکە ئاماژە بە بڕدراویی زەوی دەکا، هەروەک چۆن وشەی "رندۆڵ"یش پێوەندی بە وشەی "رنین"ەوە هەیە. کەرتی دووەمی وشەکە لەوانەیە پاشگر بێ یان پێوەندی بە ↑دۆڵ dol ەوە هەبێ.

**زەندەک1 zendek 1** *[ zandak ]* - "پارچەی باسک پۆش بۆ کار": دەچێتەوە سەر ↑زەند zend "لای خوارەوەی قۆڵ".

**زەندەک2 zendek 2** *[ zandak ]* - "ورە و هێزی دڵ": زەندەق zendeq یش دەگوترێ. "زەندەق چوون" واتا گیان دان، مردن، دڵ تۆقین. بنەوشەی زەن (د) -zen(d) دەچێتەوە سەر کرداری ↑ژین jîn و ↑گیان/ جان gîyan /can. وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێ بە مانای "هێزی دەروون، مایەی ژیان" و بە وتەیەکی دیکە هەمان "ژیان، *زیندەگی*" بووبێ. بەم جۆرە زەندەک [زەندەق] چوون بەمانای دڵ تۆقین و لەدەست دانی گیان بووە.

**زەنگ1 zeng 1** *[ zang ]* - دەگەڵ "زەبر" دێ [زەبر و زەنگ zebır û zeng]. خزمە دەگەڵ ↑ژەنین *jenîn* "لێدان"، ↑ژەندن jendîn "لێدان، لێکدان"، ↑جەنگ ceng "شەر و لێکدان"، ↑جینگن cîngın "شەڕانی"، ↑زەنگن zengın "کوڵینگ، پاچ"، ↑ژەنگەسوورە jengesure، ↑زنج zınc "ئامرازی مۆسیقا"، ↑زەنگ² zeng "دەنگی زەنگوڵە" و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**زەنگ2 zeng 2** *[ zang ]* - "دەنگی زەنگوڵە": زنگ zang (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑زەنگ1 zeng 1 [زەبر و زەنگ]، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، لێکدان". مەبەست لە "زەنگ" دە بنەڕەتدا لێدان لە پارچە ئاستیک، یان لێکدانی دوو پارچە ئاسن بووە بۆ بەدی هێنانی دەنگ و ئاگادار کردنەوە لەرێگەی دەنگەکەوە. "زەنگ" یان "زەنگوڵە" (زەنگی بچکۆڵە) ئەو ئامرازەیە کە تێیدا پارچە ئاستیک وە ئاستیکی دیکە دەکەوێ و دەنگێک بڵیند دەبێ. دواتر وشەکە نەک هەر بە مانای ئامرازەکە، بەڵکوو بە مانای دەنگی ئامرازەکەش بەکار هاتووە.

**زەنگ3 zeng 3** *[ zang ]* - بە رۆنەکەرەی قاڵکراو دەگوترێ "رۆنی زەنگ". دەبێ وشەی "زەنگ" مانایەکی وەک "قاڵ کردن" بگەیەنێ. خزمە دەگەڵ sengen (G.) سووتانی سەتحی"، zengen (L.)، singe (E.) "سوتاندن، هیشک کردن"، senge (MG.) "هیشکایی"، sengla (Norw.) [دیالێکتی ناوەندی] "بۆسۆ بوون". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑سنجر sıncır هەیە بە مانای "بڵێسە" کە ئەویش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. دە فارسیدا زنگ zang (P.) وەک "تیشکی رۆژ و مانگ"یش مانا کراوەتەوە. وێ دەچێ وشەکانی زەنگی zangī "رەش پێست" [پێست سووتاو؟] و زەنگان zangān [شاری زەنجان] دە زمانی فارسیدا و هەروەها ↑شەنگار şengar [یان شەنگال] لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *senk- >** "سووتان، هیشک بوون".

**زەنگاڵ zengal** *[ zangāl ]* - "پووزەوانە، بەلەک پێچ": زنگال zangāl (P.). ئەم وشەیە و چەند وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندییان بەیەکەوە هەیە و دەچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش. وشە کوردمادییەکان ئەمانەن: ↑زەند zend "لای خوارەوەی قۆڵ"، ↑زەندک zendık "جومگەی دەست"،

↑زەنگە zenge ”لای خوارەوەی لاق“، ↑زەنگی zengî ”گوێزینکَ“. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Schenkel (G.)، scencel (OE.)، shank (E.) و (Sw.) ”سەرووی لاق، ران“. ئەم وشانە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا مانای ”پایە، لاسك، دەسك“یشیان وەرگرتووە. هەر دە زمانی ئەلمانیدا Schinken هەیە بە مانای”گۆشتی رانی بەراز“. دە زمانی فارسیدا ساق saq (P.) ”لای خوارەوەی لاق“ و ساقە sāqe (P.) ”لاسکی گیا“ سەر بەم خێزانەن. دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑شەق şeq ”زەبری پێ“ و ↑شەقام şeqam و ↑شەقاو şeqaw ”هەنگاو“، ↑شەقۆن şeqon ”لەقەی گا“، ↑چۆك çok و چەند وشەیەکی دیکەش پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *(s)keng- >* ”خوارو خێچ“. ئەم مانایە دە skakkr (OIs.)، hinken (G.) ”شەلین“ و skazo (Gr.) ”شەل“دا پارێزراوە. پێوەندی دوو چەمکی ”لاق“ و ”خوار و خێچی“ دەبێ لەوەڕا هاتبێ کە لاقەکان وەك دوو شتی خوار نیسبەت بە یەکدی لەبەرچاو گیراون. مانای خوار و خێچی دە زمانی کوردمادیشدا پارێزراوە، واتا دە وشەی ↑شەق[2] şeq دا بە مانای”لە خەت دەرچوونی گاجووت [خوار رۆیشتنی گاجووت]“. دە زمانی فارسیدا شنگیدن šangīdan (P.) هەیە کە بۆ ئەو حاڵەتی رۆیشتنە بەکار دێ کە ژن دەیهەوێ سەرنجی پیاو بۆ لای خۆی رابکێشێ. ئەم وشە فارسییە دە بنەڕەتدا بە مانای ”لەنجە و لار کردن“ بووە و هەر وەك دە وشەکانی ”لەنگین“ و ”لەنجە“شدا دەبینرێ، مەبەست خۆ لار کردن و خۆ با دان دە رۆیشتندا بووە.

زەنگن **zengın** [*zangın*] - ”کوڵینکَ، پاچ“: خزمە دەگەڵ ↑زەنگ1 zeng ”زەبر“ [زەبر و زەنگ].

زەنگوو **zengu** [*zangū*] - ”رکێف“: خزمە دەگەڵ ↑زەنگاڵ zengal.

زەنگۆ **zengo** [*zango*] - ”رکێف“: ئاوزەنگی awzengî یش دەگوترێ. بەگوێرەی فەرهەنگا کورمانجی-ئینگلیزی وشەکە لە زمانی تورکی وەرگیراوە و دە ئەسڵدا üzengi (T.) بووە. ئەم بۆچوونە زۆر رێی تێ ناچێ و دەشێ وشەکە لە زمانی کوردمادییەوە چووبێتە ناو زمانی تورکی. زەنگَ/ زەند/ zeng /zend دە زمانی کوردمادیدا بە مانای لاق، بەتایبەتی لای خوارەوەی لاق، بەکار دەهێنرێ،↑زەنگوو zengu مانای ”گوێزینکَ“یش دەدا، ↑زەنگە zenge بە”لای خوارەوەی لاق، بەلەك“ دەگوترێ و ↑زەنگاڵ zengal بە مانای ”بەلەك پێچ“ بەکار دێ. بە پێی ئەم پێوەندییانەی سەرەوە تورکی بوونی وشەکە زۆر جێگەی پرسیارە. هەروەها بڕوانە ↑ئاوزەنگی awzengî.

زەنگە **zenge** [*zanga*] - ”لای خوارەوەی لاق، بەلەك“: خزمە دەگەڵ ↑زەنگاڵ zengal.

زەنگەتە **zengete** [*zangata*] - ”هێشوویەکی بچووك کە لە هێشوویەکی گەورە لێ دەکرێتەوە“: ↑زانقلە zanqıle ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑*شەنگڵ şengıl* ”پێکەوە نووسان“ و شەنگڵە şengıle ”دوو دانە بەری داری پێکەوەنووساو“. مانای ”زەنگەتە“ دەبێتە ”پێکەوەنووساو“ [ئەو دەنکانەی پێکەوە نووساون].

زەنگەسوورە **zengesure** [*zangasūra*] - ”ژەنگەسوورە“: زەنگە + سوورە zenge + sre. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑زەنگَ zeng ”لێدان، پێوەدان“. کەرتی دووەم ئاماژەیە بە رەنگی ئەم زیلە(حەشەرە) سوورە.

زەنگەلۆر **zengelor** [*zangalor*] - ”کرِکرِاگە“: بە فارسی وەك ”سرخنای“ مانا کراوەتەوە، کە بەشێکە لە لوولەی هەناسەکێشان و بە هۆی رەنگەکەیەوە ناوی ”سرخنای“ لێ نراوە، واتا ”نایەی سوور، لوولەی سوور“. دە وشە کوردمادییەکەدا کەرتی دووەم، واتا لۆر lor- مانای ↑لوولە lule دەدا و خزمە دەگەڵ ئەم وشەیە. کەرتی یەکەمی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑زەنگ3 zeng ”قاڵکراو“. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”سووتان، هیشك بوون“. دیارە پێوەندی ”سووتان، هیشك بوون“ و رەنگی سوور بەیەکەوە ئاشکرایە. ئەم پێوەندییە دە کرداری ”سوور کردنەوە“ یان ”ئاگری سوور“دا خۆی نیشان دەدا.

زەنگەن **zengen** [*zangan*] - ”قولینکَ“: دەچێتەوە سەر ↑زەنگَ zeng ”لێدان“ [زەبر و زەنگ]. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑سەنگَ seng ”بەرد“.

**زەنگەنە zengene** ⌊ *zangana* ⌋ - "ناوی هۆزێکی کورد": دەچێتەوە سەر ↑زەنگ zeng "لێدان" [زەبر و زەنگ]. ناوی ئەم هۆزە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەوان هۆزێکی بە زەبر و زەنگ بوون یاخود شەڕکەر و جەنگی بوون. وشەکە خزمیشە دەگەڵ ↑جەنگ ceng.

**زەنگی zangî** ⌊ *zangī* ⌋ - "گوێزینگ": خزمە دەگەڵ ↑زەنگاڵ zengal.

**زەنگیانە zengîyane** ⌊ *zangīyāna* ⌋ - "موروویی زۆر ورد": رەنگە ئەو مورووویانە وەک دەستبەند لە دەست یان لاق کرابن و بۆیە ئەم ناوەیان بۆ دانراوە. بەراوری بکە دەگەڵ ↑زەنگە zenge "لای خوارەوەی لاق، بەلەک" یان ↑زەندک zendık "جومگەی دەست".

**زەنگین zangîn** ⌊ *zangīn* ⌋ - "دەوڵەمەند": شێوەیەکی دیکە لە ↑سەنگین sengîn "قورس و قایم". دیارە لێرەدا مەبەست لە قورس و گران، پارە و سامانی قەبەیە کە وای کردووە کابرا لەناو کۆمەڵدا جێگە و پێگەیەکی قورس و قایمیش پەیدا بکا.

[تێبینی: لەباری ماناوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ "ئەنگران" واتا زۆر دەوڵەمەند بوون. ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر "گران" و دە بنەڕەتدا واتا قورس و گران بوون].

**زەنوێر zenwer** ⌊ *zanwer* ⌋ - "شوێنی خۆش ئاو و هەوا ": زەن + وێر zen + wer. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر↑ زنە zıne "هەردی تەڕ"، کەرتی دووەم لەوانەیە پێوەندی بە ↑وار war "ماڵ، مەڵبەند، شوێن"ەوە هەبێ. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە شوێنێک کە هەردەکەی تەڕ و بڕە.

**زەنەک zenek** ⌊ *zanak* ⌋ - "باتڵاخ، زۆنگ": ↑زنە zıne.

**زەنی zenî** ⌊ *zanī* ⌋ - "چەنە(گە)": شێوەیەکی دیکە لە ↑چەنە çene.

**زەواد zewad** ⌊ *zawad* ⌋ - "بژێو، خواردەمەنی": زەود zewıd و زاد zad یش دەگوترێ. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- sopp (OE.) و soppen (Nl.) "پارووی تلێت"، soppian (OE.) "تلێت کردن"، Suppe (G.) "شورباو، سوپ"، saufen (G.) "هەڵقوڕاندن"، supa-h (OIn.) "شورباو"، sugere (L.) "مژین"، سەر بە ریشەی > ***(IE.) *seu-*** "هەڵقوڕاندن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑دۆشین doşîn.

2- sieden (G.)، siodan (OG.)، sjuda (Sw.)، seethe (E.) "جۆشان، کوڵان". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە ساخ نەکراوەتەوە، بەڵام بەراورد دەکرێ دەگەڵ siausti (Lit.) "هەڵچوون، قەڵس بوون" و sauts (Gt.) "ئەو شتەی وەک قوربانی دەکوڵێندرێ".

**زەود zewıd** ⌊ *zawıd* ⌋ - "بێگار، کاری بەزۆر": دەشێ پێوەندی بە↑ زۆر zor [دە بنەڕەتدا zaver] ەوە هەبێ.

**زەوە zewe** ⌊ *zawa* ⌋ - "زیپکە": شێوەیەکی دیکە لە ↑زیبکە zîbke.

**زەوەند zewend** ⌊ *zawand* ⌋ - "زۆر، فرە": خزمە دەگەڵ ↑زۆرzor و ↑زاف zaf/ زاڤ zav.

**زەوی zewî** ⌊ *zawī* ⌋ - "هەرد": زمین zamīn (P.)، zamīk (Pl.)، zemlia (Rus.)، Humus (L.) "هەرد، خاک"، chamaí (Gr.) "لەسەرهەرد"، دەچێتەوە سەر ریشەی > ***(IE.) *ĝhđem- , *ĝh(đ)om-*** "زەوی، هەرد". خزمیشە دەگەڵ ↑زاوا *zawa*، هەروەها دەگەڵ ↑قاد qad و ↑گێتی getî.

**زەها zeha** ⌊ *zahā* ⌋ - "هیشک و رەق": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq [دە بنەڕەتدا: سەخت].

**زەهاو zehaw** ⌊ *zahāw* ⌋ - "ناوی مەڵبەندێک لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq [دە بنەڕەتدا: سەخت].

[تێبینی: لە رۆژهەڵاتی کوردستان شار و ناوچەیەک بە ناوی سەرپێڵی زەهاو serpelî zehaw هەیە. وەک دەردەکەوێ، ئەم ناوە پێوەندی بە "پرد" و "ئاو"ەوە هەیە. لەوە دەچێ باس لە چەم و ئاوێکی توند و بەهێز کرابێ].

**زەهر zehır** [ *zahır* ] - "سەم، دەرمانی کوژەر": ژار jar و ژاڵ1 jal یش دەگوترێ. زهر zehr (P.). وشەکە لەوانەیە لە ↑زارە zare [زاڵە] وەرگیرابێ، کە شتێکی زۆر تفت و تاڵە.

**زەهی zehî** [ *zahī* ] - "زیان": ئەم وشەیە و هەروەها وشەی ↑*زیان zîyan* خزمن دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ژەنین jenîn، ↑زەنگ zeng، ↑ژەنگ jeng و ↑جەنگ ceng بە مانای "لێدان".

**زەیستان zeyıstan** [ *zayıstān* ] - "ژنی تازەزاو": زەی + ستان zey + stan. کەرتی یەکەم پێوەندی بە ↑زان zan ەوە هەیە. کەرتی دووەم لێرەدا پاشگری دۆخ و چۆتێتییە.

**زەین zeyn** [ *zayn* ] - "هۆش، ئاگا": پێوەندی هەیە بە ↑زی1 zî "هەست، حیس".

**زەینین1 zeynîn 1** [ *zaynīn* ] - "رازانەوە": پێوەندی هەیە بە ↑شێن şên و ↑جوان cuwan ەوە. هەروەها زەین zeyîn هەیە بە مانای "خشڵ و رنبەر". دە زمانی فارسیدا ازین āzīn (P.) بە مانای "رازانەوە" دێ [ā +zīn]. وێ دەچێ زینة zīna (Arb.) لەم وشانەی سەرەوە وەرگیرابن.

**زەینین2 zeynîn 2** [ *zaynīn* ] - "هۆش پێدان": دە زمانی عەرەبیدا ذهن zihn (Arb.) بەکار دێ و دە کوردمادیشدا ↑زەین zeyn دان هەیە بە مانای "هۆش پێدان". لەوە دەچێ وشەکە بە ئەسڵ وشەیەکی کوردی بێ، چونکوو دە زمانی کوردمادی و زمانە هیندوئەورووپییەکاندا چەند وشەیەک پێوەندی بەم وشەیە پەیدا دەکەن. لەم بارەوە بڕوانە ↑زی1 zî "هەست، حیس".

**زەیە zeye** [ *zaya* ] - "سفت تەنراو": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑جاڵ cal، ↑جۆڵا cola، ↑زێوار zewar، ↑زیلۆ zîlo، ↑ژێ je و ↑سوژن sujın و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سە ریشەی > ***(IE.) *sei-, *seu-, *siu-*** "بەستن، لێکبەستن، دروون، گرێ دان".

**زەیی zeyî** [ *zayī* ] - "خزمی نزیک": دەشێ لە وشەی ↑زان zan ەوە هاتبێ.

**زیار zîyar** [ *zīyār* ] - "لەواشەی دەمی وڵاخ": خزمە دەگەڵ Seil (G.)، zeel (Nl.)، sāl (OE.)، seil (OIs.) "بەند، پەت، گوریس"، sa lan (OE.) "بە پەت بەستن(ەوە)"، sailas (Lit.) "بەند، پەت"، silo (Rus.) "گرە، قڵفە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑جاڵ cal و چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا.

**زیان zîyan** [ *zīyan* ] - دەشێ خزم بێ دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ژەندن jendın، ↑ژەنین jenîn، ↑زەنگ zeng و ↑ژەنگ jeng و هیتر سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان". مەبەست لە زیان گەیاندن بە کەسێک یان شتێک لەوانەیە دە بنەڕەتدا "زەبر لێدان" بووبێ، جا یان لێدانی فیزیکی یان جۆرێکی دیکە لە لێدان.

**زی1 zî 1** [ *zī* ] - "هەست، حیس": خزمە دەگەڵ Sinn (G.)، zin (Nl.) "هەست"، sentire (L.) "هەست کردن، تێگەیشتن"، sensus (L.) "بیر، هەست"، sinteti (Lit.) "هزرین"، سەر بە ریشەی > ***(IE.) *sent-*** "رۆیشتن، گەڕان، بوورین". سەبارەت بەوەی چۆن لەم ریشەوە مانای "هەست و بیر کردن" پەیدا بووە، دەتوانین دەگەڵ دوو وشەی "گەیشتن" و "تێگەیشتن"دا بەرهەڤی بکەین. دوور نییە وشەی ذهن zihn (Arb.) "زەین" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لەوانەی وشە کوردمادییەکە لەپێشدا "زین" یان "زێن" بووبێ و سوابێتەوە و بووبێتە "زی". لەوانەیە خزمیش بێ دەگەڵ ↑زیت zît "وریا، بەهۆش". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شاندن şandın "ناردن، بەڕێ کردن".

**زی2 zî 2** [ *zī* ] - "1- دەرپەڕیوی 2- دڕک": خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx و ↑زەق zeq.

**زیبک zîbık** [ *zībık* ] - "ئۆتۆریتە، دەسەڵات": زیپک zîpık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زیپکە zîpke "ئاوڵە و بلۆقی سەر پێست" و ئەو وشانەی لەژێر ↑زبر zıbır دا باس کراون کە ئاماژە بە "ماسین، قەڵەو بوون، ئەستوور بوون" دەکەن. لە مانای ماسین و ئەستوور بوونەوە مانای "بەهێز بوون، بە دەسەڵات بوون" پەرەی گرتووە. لەوانەیە هاوکات پێوەندی بە ↑زەبر zebır [زەبر و زەنگ] یشەوە هەبێ.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "ماسین، ئەستوور بوون" و "بەهێز بوون" سەرنجی وشەی "ماسین" بدە کە هەم مانای "ئەستوور بوون، قەڵەو بوون" دەگەیەنێ و هەمیش مانای "سفت بوون، توند

بوون، مەیین". خودی وشەی "مەیین" شێوەیکی دیکە لە "ماسین" نیشان دەدا و هەروەها مانای "مایبدەشت" دەبێتە "دەشتی سەخت و رەقەن" یان "دەشتی بەپیت" (پیت مانای "هێز" دەبەخشێ). ئەم پێوەندییانەی سەرەوە لەم وشانەشدا بەدی دەکرێن: تەوەن tewen "بەرد" (سەخت، پتەو)، تاپاز tapaz "زەبەلاح، ئەستوور، زلحۆرت"، تەڤا teva "وزە، هێز"، تەوژم tewıjım، توانین tuwanîn (دەبنەڕەتدا: زاڵ بوون بە سەردا، دەسەڵات بەسەردا هەبوون"، هەروەها tumor (L.) "دوومەڵ، کوان"، túmara-h (OIn.) "قەڵەو، بە هێز" و هتد. ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ماسین، ئەستوور بوون" و هەروەها "بەهێز بوون"].

**زیپ zîp** [ *zīp* ] - "تەوژم، بە تەوژم پەستاوتن": خزمە دەگەڵ ↑ شەپ şep و ↑سەپاندن sepandın سەر بە ریشەیەک بە مانای "پاڵ پێوەنان، لێدان".

**زیپک1 zîpık** [ *zīpık* ] - "دڵۆپە": خزمە دەگەڵ Sieb (G.)، zeef (Nl.)، sieve (E.) "سوزمە، پاڵۆینە"، sipiti(Serb.) "بارینی ورد، خوناوەبارین"، سەر بە ریشەی **< *seip-* (IE.)** "چۆڕاندنەوە، دلۆپاندن".

**زیپک2 zîpık** [ *zīpık* ] - "1- بەردی زۆر چکۆلە 2- تەرزە 3- چەکەرە": خزمە دەگەڵ ↑زیپکە zîpke. ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە "قووتەکە بوون، خڕەکە بوون، هەڵتۆقاو بوون".

**زیپکە zîpke** [ *zīpka* ] - "ئاوڵە و بلۆقی سەر پێست": زیپ + کە zîp + ke. زیبکە zîbke و ↑زەوە zewe ش دەگوترێ. بنجی "زیپ" [زیپ -zîp، زەو -zew] خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زبر zıbır دا باس کراون و ئاماژە بە "ماسین، قەڵەو بوون، ئەستوور بوون دەکەن.

بەرزەوەبووکێ". زیپکە واتا " خڕەکە و هەڵمساوی چکۆڵە" کە لەسەر پێست پەیدا دەبێ و هەڵدەتۆقێ. وشەی ↑ئازەب azeb پێوەندی بەم وشەوە هەیە [ئا- زەب].

**زیپەر zîper** [ *zīpar* ] - "ماسوولکە": ↑زەڤڵەک zevlek یش دەگوترێ.

**زیت zît** [ *zīt* ] - "وریا، بەهۆش": زیچ zîç یش دەگوترێ.

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑زی zî "هەست". لەم تێڕوانینەوە مانای "زیت" دەبێتە "لەسەر هەست، هەستیار، بەهۆش".

2- یانیش پێوەندی هەیە بە ↑زیخ1 zîx "زیت، وریا". ئەم وشەیەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑*زەق zeq*"قوت، دەرپەڕیو". "زیت بوونەوە" دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "راپەڕین و راکردنی جانەوەر". بێگومان "زیت" ئا بەم مانایە پێوەندی بە بەو وشانەوە هەیە کە مانای "زەق بوون، دەرپەڕین، دەرپەڕیو بوون" دەبەخشن. دوور نییە دە بنەڕەتدا دوو وشەی "زیت" دە زمانی کوردمادیدا هەبووبێ کە لەبەر نیزیک بوونی شێوە و ماناکانیان تێکەڵ بە یەکدی بووبن. ئەگەر ئەم شیمانەیە راست بێ، ئەوە "زیت"ی یەکەم بە مانای "وریا، زرینگ" پێوەندی هەیە بە زی zî "هەست" و "زیت"ی دووەمیش بە مانای "قوت و دەرپەڕیو" پێوەندی پەیدا دەکا بە زەق zeq ەوە. ئا بەم مانایەوە وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە ↑زیتک zîtık "لوشکە، جووتە".

**زیتک zîtık** [ *zītık* ] - "لوشکە، جووتە": خزمە دەگەڵ schießen (G.)، shoot (E.)، skjuta (Sw.) "هاویشتن، دەرپەڕاندن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیە بە مانای "دەرپەڕین، دەرپەڕاندن، راو نان، پاڵنان، را دان". گەلێک وشە دە زمانی کوردمادیدا لەم ریشەوە هاتوون، هەر لە ↑چووز(ەرە) çuz(ere)"چرۆ، تیرتکی تازەدەرهاتووی گیا" و ↑چووزین çuzen "دەرپەڕین، هاویشتن"ەوە بگرە تا دەگاتە ↑چوخساندن çuxsandın "دەرپەڕاندن" و تا دەگاتە ↑شەپ şep "لێدان، پاڵ نان".

**زیتکە zîtıke** [ *zītıka* ] - "1- زمانەی تەڵەی راو 2- زیپکە": هەروەک ↑زیتک zîtık "لوشکە، جووتە" پێوەندی بەو وشانەوە هەیە کە مانای "دەرپەڕین، دەرپەڕیو بوون" دەدەن. هەم زمانەی تەڵەی راو و هەم زیپکە دوو شتی زەق و دەرپەڕیون و لەبەر ئەمە وەسا ناودێر کراون.

**زیته zîte** [ *zīta* ] - "1- پەلەپیتکە 2- دارۆکەیەکە دەناو فاقەدا بۆ راوی مەل، زیتکە": خزمە دەگەڵ ↑زیتک zîtık "لووشك، جووتە" و دەگەڵ ↑زیتکە zîtıke.

**زیچ1 zîç** [ *zīç* ] - "پێلەقەی مرۆڤ 2- جووتەی یەکسم": خزمە دەگەڵ یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زیتك zîtık "لوشکە، جووتە".

**زیچ2 zîç** [ *zīç* ] - "وردەبەرد کە منداڵ کایەی پێ دەکەن": زیچێن zîçen ناوی گەمەکەیە. ئەمەش خزمە دەگەڵ ↑زیچ1 zîç "1- پێلەقەی مرۆڤ 2- جووتەی یەکسم". هەردووك وشە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "دەرپەڕاندن، هاویشتن". هەروەها بەرهەڤی بکە دەگەڵ ↑ساچمە saçme.

**زیخ1 zîx** [ *zīx* ] - "زیت، وریا": خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq "دەرپەڕیو". هەروەها لەوانەیە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑زیت zît.

**زیخ2 zîx** [ *zīx* ] - "ورکەورد": زخور zıxur، زگار zıgar و ↑زغرك zığırk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax "گاشەبەرد".

[تێبینی: ئەم وشەیە جیایە لە خیز xîz. "زیخ" و "خیز" دەشێ سەر بە دوو ریشەی جیاواز بن، چونکوو "خیز" دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە Kies (G.)].

**زیخ3 zîx** [ *zīx* ] - "دڕکی ئەستوور": دەگەڵ وشەکانی خوارەوە سەر بە ریشەیەکن: ↑زی zî "دڕك"، ↑زیق zîq "قیت و بەل"، ↑زەق *zeq* "دەرپەڕیو"، ↑زیك zîk "راستەوەبوونی موو"، ↑زەخت/ زیخت zext /zîxt "نەقیزە"، ↑شخت şıxt "زەرگی دەروێشان" و هتد. چەمکی هاوبەش دە هەموو ئەو وشانە دا زەق بوون و دەرپەڕیو بوونە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑زەق zeq "دەرپەڕیو".

**زیخ[4] zîx** [ *zīx* ] - "بوێر، ئازا": پێوەندی هەیە بە ↑زۆخ zox "1- توانا و بەکار 2- توانایی، هێز".

**زیخاندن zîxandın** [ *zīxāndın* ] - "پاڵ نان، هان دان": سیخاندن sîxandın یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی بە ↑زیخ zîx "بوێر، ئازا"وە هەبێ و دە بنەرەتدا بە مانای"ورە وەبەرنان، هێز وەبەرنان" بووبێ.

**زیڕاندن zîrandın** [ *zīrāndın* ] - "هاوار کردن، زیقاندن":

1- لە لایەکەوە دەتوانێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑جڕت cırt دا باس کراون.

2- لە لایەکی دیکەوە دەتوانێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شیڕاندن şîrandın.

**زیرگ zîrıg** [ *zīrıg* ] - "پیس، گەمار": زیرگن zîrgın یش دەگوترێ. لەوانەیە "زیرگ" خۆی بەمانای "پیسی" بووبێ و لەمەوە "زیرگن" دروست کرابێ بە مانای "پیس و پۆخڵ. خزمە دەگەڵ Salz (G.)، salt (E.)، salt (Sw.)، halz (Gr.)، sal (L.)، sol (Rus.) "خوێ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***sal-** < **(IE.)** "بۆرێکی پیس، ئاماڵ ڕەش، لێڵ". لەبەر ئەوەی "خوێ" لە سەردەمە کۆنەکاندا وەك ئەمڕۆ سپی و پاك و پاڵاوتە نەبووە و بۆر و پیس بووە، بە جۆرە ناوزەد کراوە. دە هێندێك لە زمانە ئەورووپییەکاندا وشە بە مانای "بۆر، پیس، ڕەش" دەچنەوە سەر ئەم ریشەی سەرەوە، وەك salu (OE.) "ڕەش، تەڵخ، تار"، solr (OIs.) "پیس"، solovyj (Rus.) "بۆری ئاماڵ زەرد". لەوانەیە ↑خلتە xılte پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ [خڵتە و خۆڵ].

**زیرەڤان zîrevan** [ *zīravan* ] - "1- شۆفار 2- ئێشکگر": زیران zîran یش دەگوترێ. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑سیلە sîle "نیشانە، ئامانج"، Ziel (G.) "نیشانە، ئامانج"، zielen (G.) "نیشانە گرتن، بە ئامانج گرتن". لە ناوچەی موکریان باوە بە کەسێك کە بە وریایی و هێندێك بە دزییەوە دەرواتیتە شوێتێك یان ئاراستەیەك، دەبێژەن "ئەوە سیلەت لە چی گرتووە؟". ئەم بێژەیە زۆرتر بۆ شتی نەرێنی بەکار دێ.

**زیرەك zîrek** [ *zīrak* ] - "بەهۆش، وریا": زیرك zīrak (P.). خزمە دەگەڵ ↑ژیر jîr [ ↑هەژیر hejîr] "زانا، ئاوەزمەند".

**زیز zîz** [ *zīz* ] - "زوێر، تۆراو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ sick (E.)، siuks (Gt.)، sjuk (Sw.)، saik (OF.) "نەخۆش، ناساخ". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە وشەکە سەرەتا مانایەکی

گشتی وەک "ئێش، پەژارە، دڵتەنگی" هەبووبێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەخسان şexsan "رەنگێ پەڕین لەبەر نەخۆشی"، ↑سیس sîs و ↑ژاکان jakan .

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی تیوان نەخۆشی و نارەحەتی لە لایەک و زیز و زوێر بوون لە لایەکی دیکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ Leid (G.) "ئێش و ئازار، نارەحەتی" و beleidigt (G.) "زیز، زوێر". ئەم دوو وشە ئەڵمانییە لە یەک ریشەوە هاتوون].

**زیزک zīzk** [ *zīzk* ] - "مێشێکی کەسکە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑کەسک kesık.

**زیڤار zvar** [ *zīvār* ] - "زوێڵ(ەچەرم)": شێوەیەکی دیکە لە ↑زۆڵ zol [زۆڵەچەرم].

**زیڤان zîvan** [ *zīvān* ] - "دەنکی رەش و تاڵ دەناو گەنمدا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شێو şêw "دەمی تاریکان".

**زیڤرک zîvırk** [ *zīvırk* ] - "خڕکەبەرد": خزمە دەگەڵ ↑کەڤر kevır "بەرد".

**زیق1 zīq** [ *zîq* ] - "1- زبر، زوور 2- چاوی زۆپ و زەق 3- قیت و بەل": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زەق zwq. چەمکی "زەق بوون" دە هەموو ماناکاندا بەرچاو دەکەوێ.

**زیق2 zīq** [ *zîq* ] - "هەوا و کێم و چڵکی برین": خزمە دەگەڵ ↑جیقنە cîqne "پیسایی پەلەوەر". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "جودا بوون(ەوە)، لێکبوونەوە". دەبنەرەتدا مەبەست ئەو شتانەن کە لە لەش جودا دەبنەوە و دێنە دەرەوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا دوو کرداری ausscheiden و absondern بۆ جیا بوونەوە و دەرچوونی شتی وەک میز و ئارەقە لە لەش بەکار دێن. ئەم وشانە دە ریشەدا مانای "جودا بوون(ەوە)" دەبەخشن و وشەی یەکەمیان خزمە دەگەڵ "جودا". هەروەها وشەی لاتینی secrentum "جیابۆوە (لە لەش)" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "جودا کردن، بڕین، لێکردنەوە"].

**زیقاندن zîqandın** [ *zīqāndın* ] - "قیژاندن": زیکاندن zîkandın یش دەگوترێ و دەبێ ئەمە شێوەی کۆنتری وشەکە بێ. وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکە بێ لە↑شاخاندن şaxandın "زیقە و هەرا کردن".

**زیقاوڵە zîqawle** [ *zīqāwla* ] - "ماسیگرە": ئەم مەلە لەبەر زیقە زیقەکەی بەو جۆرە ناوزەد کراوە. [بڕوانە ↑زیقاندن zîqandın]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑زاغ zāġ (P.) "قشقەڵە".

**زیقن1 zîqın** [ *zīqın* ] - "بە زیقەزیق، گرینۆک": دەچێتەوە سەر ↑زیقاندن zîqandın "قیژاندن". سەبارەت بە کەرتی دووەمی وشەکە بڕوانە پاشگری بە ئاوەڵناو کردنی ↑ن ın.

**زیقن2 zîqın** [ *zīqın* ] - "لاواز، ریوەڵە": خزمە دەگەڵ ↑سیس sîs و ↑ژاکان jakan. سەبارەت بە کەرتی دووەمی وشەکە بڕوانە پاشگری بە ئاوەڵناو کردنی ↑ن ın.

**زیک1 zîk** [ *zīk* ] - "راستەوەبوونی موو، زەق و زۆپ": شێوەیەکی دیکە لە ↑زەق zeq.

**زیک2 zîk** [ *zīk* ] - "زۆر سارد": خزمە دەگەڵ ↑زوقم zuqım.

**زیک3 zîk** [ *zīk* ] - "گشتەکی مۆم لێدراو": خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ژێ je "بەن، تاڵ".

**زیل1 zîl** [ *zīl* ] - "1- دەنگی باریک و تیژ 2- زەنگ، زەنگوڵە": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑زایلە zayle، ↑زایەڵە zayele و هتد.

**زیل2 zîl** [ *zīl* ] - "1- زمانە چکۆڵە 2- بەلووکە": زیلک zîlık یش دەگوترێ. هەروەها چیلک çîlık هەیە بە مانای "1- میتکە 2- گۆپکەی مەمک" و ↑گلک2 gılık بە مانای "لاسکەگەنمەشامی بێ دەنک 2- بەلووکە". هەموو ئەم وشانە خزمن دەگەڵ↑*کلک kılık* سەر بە ریشەیەک بە مانای "قوت و زەق بوون".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "بەلووکە" واتا "باڵابووگی بچووک" و هەروەها "میتکە" بە مانای "قیتاییەکی بچووک"].

**زیلان zîlan** [ *zīlān* ] - "زیوان، جوڵان": خزمە دەگەڵ ↑جوڵان culan.

زیلك **zîlık** *[ zīlık ]* - "میتکە(ی یەکسم)": خزمە دەگەڵ ↑زیل2 zîl "1- زمانە چکۆڵە 2- بەلووکە".

زیلۆ **zîlo** *[ zīlo ]* - "پەڵاسی لە دەزوو": زیلو zīlū (P.). خزمە دەگەڵ ↑جاڵ cal و ↑جۆڵا cola. زیلە **zîle** *[ zīla ]* - "حەشەرە، زیندەوەری چکۆڵە": زی + لە zî + le. دەچێتەوە سەر کرداری ↑ژین jîn.

زیلەمۆ **zîlemo** *[ zīlamo ]* - "ئاگری بن خۆڵە مێش": ↑ژیلەمۆ jîlemo ش دەگوترێ.

زین **zîn** *[ zīn ]* - "جێگەی دانیشتنی سوار لەسەر پشتی ئەسپ": زین zīn (P.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هاومانای ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر کرداری "دانیشتن" لەو زمانانەدا، بۆ وێنە Sattel (G.)، saddel (E.)، zadel (Nl.)، sadel (Sw.) "زین"، سەر بە ریشەی **(IE.) *sed- >** "دانیشتن". وشەی ↑سەندەڵی sendelî "کورسی لە سەر دانیشتن" خزمە دەگەڵ ئەو وشە ژێرمەنییانە و تەنیا فۆتیمی n وەك زێدە خزاوەتە ناو وشەکەوە، کە ئەمە لە چەندین وشەی دیکەشدا بەرچاو دەکەوێ. دەتوانین وای بۆ بچین کە وشەی زین zîn لە سەندەڵی sendelî وەرگیرابێ. ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ↑(دا) نیشتن da-nî-şt-ın و دەچنەوە سەر هەمان ریشەی هیندوئەورووپی سەرەوە.

زینات **zînat** *[ zīnāt ]* - "1- ئازاردەر، بەدفەڕ 2- زوڵم و ستەم": دەشێ پێوەندی هەبێ بە وشەکانی ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن jendın و ↑زەنگ zeng و ↑جەنگ ceng سەر بە ریشەیەك بە مانای "لێدان".

زیندان **zîndan** *[ zīndān ]* - "بەندیخانە":

1- بنەوشەی -zin دە وشەکانی ↑زنجیر zıncîr و ↑سندم sındım و چەند وشەی دیکەدا دەبیندرێ و دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *sei- >** "بەستنەوە". لەوانەیە "زیندان" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑زنج4 zınc "چارداغ، حەوش، چەپەر، پەرژین".

زیندوو **zîndu** *[ zīndū ]* - "گیانلەبەر": زنده zende (P.). خزمە دەگەڵ ↑ژین jîn .

زینوو **zînu** *[ zīnū ]* - "ملەی کێو، تیغەشان": خزمە دەگەڵ ↑زینی zînî "تیغی گوێزان". ئەم شوێنە بە تیغ چوێندراوە، چونکە شوێنی پێکگەیشتنی دوو قەدپاڵە و لە دوورەوە وەك تیژاییەك دێتەبەرچاو. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "ستیغ کوە" دە زمانی فارسیدا کە ئەویش دەگەڵ وشەی "تیغ" خزمە.

زینە **zîne** *[ zīna ]* - "دڕك، دڕکەزی": خزمە دەگەڵ↑ زینی *zînî* "تیغی گوێزان" و ↑زینوو zînu "تیغەشانی کێو".

زینی **zînî** *[ zīnī ]* - "تیغی گوێزان": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ sense (G.)، segensa (OG.) "مەڵەغان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *sek- >** "بڕین، لیکردنەوە، جیا کردنەوە". گەلێك وشەی کوردمادی دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە وەك ↑چەقۆ çeqo، ↑شاقەڵ şeqel، ↑شی şî ، ↑ژێ je، ↑زۆڵ zol، ↑جیا cîya و هتد.

زیوار **zîwar** *[ zīwār ]* - "1- پارچەی براو لە چەرم 2- تیتۆڵ": زیڤار zîvar و زیڤال zîval و زۆڵ zol یش دەگوترێ [زۆڵە چەرم]. خزمە دەگەڵ ↑زێوار zewar "پەڕاوێز، قەراخ".

زیوارە **zîware** *[ zīwāra ]* - "ئێوارە": خزمە دەگەڵ ↑شێو *şêw* [ئێوارەی درەنگ، دەمی تاریکان]. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑زیڤان zîvan "دەنکی رەش و تاریك لە ناو گەنم دا".

زیوان **zîwan** *[ zīwn ]* - "جوڵان، بزوان": شێوەیەکی دیکە لە ↑جمین/ جڤین cımîn / cıvîn.

زیوەر **zîwer** *[ zīwar ]* - "زێو، خشڵی زێوین ": زێوەر zewer یش دەگوترێ. شێوەی کۆنتری ↑زێو zew.

زێ **ze** *[ ze ]* - "چەمی گەورە": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ See (G.)، see (E.)، saiws (Gt.) "دەریا، دەریاچە". "زێ" دە وشەی ↑دەریا derya [کۆنتر: zerya] شدا دەبیندرێ. ریشە؟

زێبار **zebar** *[ zebār ]* - "مەڵبەندێکە لە کوردستان": زێ + بار ze + bar. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑زێ ze "چەمی گەورە". کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑بەر ber "پێش، لا". تیکڕای وشەکە واتا "بەری چەم، لای چەم".

زێچ **zeç** *[ zeč ]* - "ژەك، هەوەڵ شیری دوای زان": شێوەیەکی دیکە لە ↑ژەك jek.

زێد **zed** *[ zed ]* - "نیشتمان، زاگە":

1- لەوانەیە لە وشەی ↑زان zan وەرگیرابێ، بە مانای "شوێنی لە دایك بوون، زاگە". لەم بارەوە هەڵیسەنگێنە دەگەڵ زادگاه zadgah (P.).

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑جیات cıyat ەوە هەبێ [لە جیات، لە جیاتی].

**زێدە zeded** [ *zeda* ] - "زۆر، زەوەند": دە زمانی فارسی و عەرەبیدا دەگوترێ زیاد ziyad (Arb.). ئەم وشەیە وێ دەچێ بە ئەسڵ وشەیەکی کوردمادی و فارسی بێ. دە زمانی فارسیدا دە زمانی فارسیدا فزودن fızūdan [افزودن af-zūdan (P.) ؟] بە مانای "زێدە کردن، زۆر کردن". ئەم کردارە فارسییە دەشێ پێك هاتبێ لە پێشگری "اف" و کەرتی "زودن". هەر چۆتیك بێ، پێوەندی پەیدا دەکا بە هێندێك وشە دە زمانە ئەورووپییەکاندا، وەك satt (G.) "تیر، تێر و تەسەل"، satur (L.) "تیر و تەسەل"، satis (L.) "زۆر و زەوەند"، sotus (Lit.) "تیر و تەسەل، زۆر و زەوەند"، سەر بە ریشەی *(IE.) *sā-,*sə- >* "تێر کردن".

**زێڕ zer** [ *zer* ] - "ئاڵتوون، تەڵا": زر zar (P.). خزمە دەگەڵ Gold (G.)، gold (E.)، guld (Sw.)، zelts (Let.)، zolotus (Rus.)، hiranya (OIn.) "زێر" و خزمە دەگەڵ ↑زەرد zerd و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تروسکان، برووسکانەوە، درەوشانەوە". وشەی ↑ئاڵتوون altun زۆر لە golden (G.) "زێڕین" دەچێ و دەشێ وشەیەکی خزم یان وەرگیراو بێ.

**زێو zew** [ *zew* ] - "کانزایەکی بەنرخ": زیو zîw یش دەگوترێ. سیم sīm (P.). خزمە دەگەڵ Silber (G.)، silver (E.) و (Sw.)، silubr (Gt.) و serebro (Rus.) "زیو". دە کوردمادی و فارسیدا ↑زیوەر zîwer [زێوەر] یش بە مانای زێو دێ و بە هەڵسەنگاندن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە دەبێ ئەمەیان شێوەی کۆنتری وشەکە بێ. بەپێی بۆچووتیك ریشەی ئەم وشانە دەبێ بۆ زماتیکی ناهیندوئەورووپی بگەڕێتەوە و شوێنەواری وشە کۆنە هیندوئەورووپییەکە دە زمانی لاتینیدا ماوەتەوە کە بریتییە لە argentum.

**زێوار zewar** [ *zewār* ] - "پەراوێز لێنان، قەراخی جلك و شتی دیکە دروون": خزمە دەگەڵ Saum (G.)، zoom (Nl.)، seam (E.)، söm (Sw.) "زێوار، پەراوێز". ئەم وشانە دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "دروون" کە شێوەکانی بەم جۆرەن: siuwen (OG.)، siujan (Gt.)، sew (E.)، sy (Sw.) سەر بە ریشەی *(IE.) *siu-,*seu- >* "دروون، (لێك) بەستن". وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شوژن şûjın "دەرزی گەورە"، زیڤال zîval یان ↑زۆڵ zol [زۆڵەچەرم] و چەندین وشەی دیکە. دە زمانی فارسیدا زوار zavār (P.) دەگوترێ، بە مانای "قەراخ، چوارچێوە".

## ژ (J)

ژ **jı** [ *žı* ] - "پرێپۆزیسیۆتیکه". جه ce ش دەگوترێ. دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا نەماوە و لە جێگەی ئەو "لە" بەکار دەهێنرێ. از az (P.). خزمە دەگەڵ aus (G.)، out (E.)، ut (Sw.) "ژ" سەر بە ریشەی ***ud-s-** > (IE.) "بەرەو دەرەوە، بەرەوە سەرەوە". -úd, út (OIn.) و už (Lit.) دەچنەوە سەر هەمان ریشە.

ژا **ja** [ *žā* ] - "کاوێژ": دەچێتەوە سەر "جووتن" [↑جاوین cawîn].

ژار **jar** [ *žār* ] - "زار، نەخۆش، لاواز": دەگەڵ "ژەنگ"یش دێ [ژار و ژەنگ jar u jeng واتا نەخۆشی]. شێوەیەکی دیکە لە ↑زار zar "داماو، بێچارە، نەخۆش". وشەی "ژەنگ" کە دەگەڵ ئەم وشەیە دێ، دەچێتەوە سەر *ژان* "ئێش و ئازار".

ژاژ **jaj** [ *žāž* ] - "چیتک، قامیش": هەروەها ژاژەڵان jajelan هەیە بە مانای "قامیشەڵان". خزمە دەگەڵ ↑زی zî "دڕک"، ↑زیخ3 zîx "دڕکی ئەستوور"، ↑زیق zîq "قیت و بەل"، ↑زەق *zeq* "دەرپەڕیو"، ↑زیک zîk "راستەوەبوونی موو"، ↑زەخت/ زیخت zext /zîxt "نەقیزە" و هتد. چەمکی هاوبەش دە هەموو ئەو وشانە دا زەق بوون و دەرپەڕیو بوونە.

ژاژک **jajık** [ *žāžık* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑جاجک cacık.

ژاژی **jajî** [ *žāžī* ] - "شیرێژ": خزمە دەگەڵ ↑کەشک kaşık.

ژاکان **jakan** [ *žākān* ] - "سیس وچرچ بوون": لەوە دەچێ خزم بێ دەگەڵ siechen (G.)، siukan (OG.)، siukan (Gt.) "نەخۆش بوون" و لەوانەشە دەگەڵ ↑سیس sîs "ژاکاو". دە زمانی فارسیدا تکیدە takīda (P.) هەیە بە مانای "سیس، ژاکاو".

ژاڵ1 **jal 1** [ *žāl* ] - "ژار، ژەهر": وشەکە بە چەند شێوە دەبیندرێ، وەک ژار، ژەهر، زار، زەهر. (بڕوانە ↑زەهر zehır).

ژاڵ2 **jal 2** [ *žāl* ] - "کۆمگای مێشەنگوین": شێوەیەکی دیکە ↑شار şar [شارە مێروو، شارە زەرگەتە و هتد]. خزمیشە دەگەڵ ↑شەڵغە şelğe "پوورە".

ژان **jan** [ *žān* ] - "1- ئێش، دەرد 2- دەرد لە کاتی زاندا": چەند جۆرە ئێشێک لە لەشدا پەیدا دەبن کە تایبەتمەندییەکی هاوبەشیان هەیە. ئەو ئێشانە کە چەند ئێشێکی توندن، دێن و دەڕۆن و هەر چەند چرکە یان چەند خولەک دووبارە دەبنەوە. لە راستیدا چۆتیتی ئەو ئێشانە وەک ئەوە وایە کە شتیک *لێدەدا* یا خود چڵان دەدا. دیارە ئەو ئێشەی لەکاتی "زان"یشدا پەیدا دەبێ، هەر بەم چەشنەیە. مانای "ژان" دە بنەڕەتدا "لێدان"ە و بۆیە بەو جۆرە ئێشانە گوتراوە "ژان کردن"، چونکوو دۆخێکی "لێدان" واتا "چڵەدان" دەناو ئەو شوێنەدا دروست دەبێ کە دێشێ. وشەکە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ژەنین jenîn و↑ زەنگ zeng [زەبر و زەنگ ]، ↑ژەنگ jang [ژار و ژەنگ] و هیتر بە مانای "لێدان".

ژاندن **jandın** [ *žāndın* ] - "لێکدان، لێکدانی شیر": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑ژەندن jendın.

ژانین **janîn** [ *žānīn* ] - "1- ئێشان 2- نەخۆش کەوتن": ↑ژان jan.

ژاوە1 **jawe 1** [ *žāwa* ] - "قڕەی بۆق، دەنگەدەنگ":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑قاو qaw [قاوەقاو]

2- یانیش دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑شیوەن şîwen و ↑*سۆنە sone* "مراوی تیر".

ژاوە2 **jawe 2** [ *žāwa* ] - "ئاوی ڕوون و ساف": [مامۆستا هەژار دەبێژێ: ژاوەڕۆ واتا چەمی هەمیشەڕوون]. خزمە دەگەڵ↑ زیپک zîpık "دڵۆپە" و سابوون sabun [↑ئەسپۆن (e)spon ] و ↑ساف

سەر بە ڕیشەیەك بە مانای "هەڵچۆڕاندن، دڵۆپاندن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ zafā (Pl.) saf "هەوری بە باران".

**ژبل jıbıl** [ *žıbıl* ] - "جگە لە، جیا لە": پێك هاتووە لە دوو کەرتی ژ + بل jı + bıl. بۆ کەرتی یەکەمی وشەکە بڕوانە پرێپۆزیسیۆنی ↑ژ ji. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ ↑ئاوارتن awartın [یان هەڵواردن helwardın] واتا "جیا کردنەوە". بنجی ئەم وشانە وار war- ە و دە ڕیشەیەدا مانای "هەڵبژاردن" دەدا، واتا جیا کردنەوەی کەسێك یان شتێك لەوانی دیکە. بەم جۆرە "بل" لێرەدا مانای "غەیر" دەدا، واتا "جیا لەوانی دیکە" و مانای تێکڕای وشەکەش دەبێتە "ژ غەیر، لە غەیری"]. دە شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاستدا لە بری le bırî هەیە بە مانای "لە جیاتی". کەرتی "بڕ" شێوەیەکی دیکەیە لە "بل".

**ژل jıl** [ *žıl* ] - "لکی باریکی ڕەز": دەشێ پێوەندی بە یەکێك لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑چڵ çıl.

2- ↑زەل zel "قامیش".

**ژلووقاندن jıluqandın** [ *žılūqāndın* ] - "تێکەڵ و پێکەڵ کردن": خزمە دەگەڵ ↑شلۆق şıloq و ↑شڵەقاندن şıleqandın سەر بە ڕیشەیەك بە مانای "لێدان، لێکدان".

**ژڵەژان jılejan** [ *žılažān* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑شڵەژان şılejan و خزمیشە دەگەڵ↑ شڵەقان şıleqan.

**ژلێوان jılewan** [ *žılewān* ] - "تێکەڵ پێکەڵ بوون، لێکدران": زلەویان zılewyan و زلەپان zılepan یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شلێوە şılêwe "بەفر و بارانی تێکەڵ" و ↑ڕاجلفین racılfîn "ڕاچەنین، شڵەژان". وەك لەجێی خۆی باس کراوە، وشەکانی "شڵەژان" و هەروەها "شڵەقان" دەچنەوە سەر ڕیشەیەك بە مانای "لێدان، کوتان". لەم مانایەوە هەروەها مانای "لێکدان، لێکدران" پەیدا بووە، چونکوو وەك ئاشکرایە ئەم چەمکانە پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. هەر ئەم پرۆسەیە سەبارەت بە وشەی "ژلێوان"یش لە ئارا دایە. وشەکە دەچێتەوە سەر ڕیشەی **(IE.) *gleubh- <** "کوتان، قەڵشاندن، بڕین" و دەبێتە خزم دەگەڵ klieben (G.)، chliuban (OG.)، cleave (E.)، klyva (Sw.) "قەڵشین، درز بردن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر glubere (L.) "تویکڵ کردن" و glyphein (Gr.) "بە ئەسکەنە کار کردن". بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەکە دە بنەڕەتدا مانای "لێدان، کوتان"ی هەبووە و دواتر ماناکەی بۆ "لێکدان، لێکدران" پەرەی گرتووە. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑گوڵبێنە gulbene "کوتیکە لە بنەوەی تەنوور، باکێشی تەنوور". هەر لەم پێوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بە وشەی "ڕاچەنین" بکەین کە لە سەرەوە وەك مانای ڕاجلفین ra-cılfîn شیرۆڤە کراوە. مانای وشەی "ڕاچەنین" ئەو بۆچوونانەی سەرەوە زۆرتر پشتراست دەکا. وشەی "ڕاچەنین" خۆی دەگەڵ وشەکانی ژەنین "لێدان"، ژەندن "لێکدان" و جەنگ "شەڕ و لێکدان" خزمە.

**ژماردن jımardın** [ *žımārdın* ] - "حیساب کردن، بژاردن": هەژماردن hejmardın یش دەگوترێ. شمردن šomordan (P.) و amar (P.) "ژماردن". وشەکە پێك هاتووە لە دوو کەرتی *hmar- +*uz / uš و دەچێتەوە سەر (hiš)maraiti (Av.) "سەرنج دەدا، بە بیر دەسپێرێ" و خزمە دەگەڵ smar (Skt.) "وەبیر هێنانەوە" [بڕوانە فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی، ل. 235]. بنجی ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەند وشە دە زمانی کوردیدا وەك ↑مەراق meraq.

**ژن1 jın** [ *žın* ] - "هاوسەری مێر": زن zan (P.). خزمە دەگەڵ queen (E.)، cwene (OE.)، quena (OG.)، qinō (Gt.)، gune (Gr.)، gnā (OIn.)، žena (OSl.) "ژن"، سەر بە ڕیشەی **(IE.) *gen- <** "ژن".

[تێبینی 1: وێ دەچێ ئەم ڕیشەیە دەگەڵ ڕیشەی *(IE.) *gen-* بە مانای "زان" هەر یەك بێ، واتا ناوی "ژن" دەشێ پێوەندی بە "زان"ەوە هەبێ].

ژن2 **jın 2** [ *žın* ] - "داخستنی دەرک و پەنجەرە و قفڵ و هتد": خزمە دەگەڵ ↑زنجیرzıncîr و ↑زیندان zîndan و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەستن(ەوە)، لێک بەستن".

ژنەوتن **jınewtın** [ *žınawtın* ] - "بیستن": شنیدن šanīdan و شنفتن šenoftan (P.). خزمە دەگەڵ schnappen (G.)، snappen (Nl.)، snaben (MG.)، snapa (OIs.) "قۆستنەوە، گرتنی خێرا" [دە بنەڕەتدا: قەپ لێدانی خێرا]. وشەکە خزمە دەگەڵ Schnabel (G.)، snapas (Lit.) "دەنووک"، nef (OIs.) "لووت"، neb (Nl.) "دەنووک، دەرپەڕیوی، زەقایی". ریشەی ئەم وشانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ گەڕێنراوەتەوە. "ژنەوتن" دە زمانی کوردمادی و فارسیدا دەبێ سەرەتا هەر وەک دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بە مانای گشتی "قۆستنەوە" هاتبێ و دواتر مانای "قوستنەوەی دەنگ"ی دەنگی پەیدا کردبێ، واتا (وەر) گرتنی خێرای دەنگ.

ژنین **jınîn** [ *žınīn* ] - "ئاخنین": خزمە دەگەڵ ↑ئاخنین axınîn [ (a)xınîn].

ژوار **juwar** [ *žuwār* ] - دەگەڵ "ژان" دێ [ژان و ژوار jan u juwar]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زوورانەوە zuran(ewe) "سووتانەوەی پێست".

ژوان1 **juwan 1** [ *žuwān* ] - "(مەوعیدی) پێک گەیشتن": ژڤان jıvan یش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ↑ جڤین cıvîn "کۆم بوون، کۆ بوونەوە".

ژوان2 **juwan 2** [ *žuwān* ] - "بە ئاستەم چوونە خەو": خزمە دەگەڵ ↑خەوتن xewtın.

ژولیان **julyan** [ *žulyān* ] - "ژاکان": ژولیدن žūlīdan (P.). خزمە دەگەڵ ↑ژەلم jelım "سیسی، ژاکان" و ↑چلمسین çılımsîn.

ژوی **jıwî** [ *žıwī* ] - "جیوەی دار": شێوەیەکی دیکە لە ↑جیوە cıwe و ↑ژووڤە juve و ↑زاوق zawıq.

ژوور1 **jur 1** [ *žūr* ] - "(لای) سەرەوە": خزمە دەگەڵ زبر zebar (P.) [تێبینی: "زێر" و "زبر" بە فارسی واتا ژێر و ژوور. هەروەها دە فارسیدا زبردەست zebardast "کارامە" هەیە کە دە بنەڕەتدا دەبێ مەبەست "باڵادەست" بووبێ. دە کوردمادیشدا دەڵێن فڵان کەس لەو کارەدا دەستێکی باڵای هەیە]. خزمە دەگەڵ über (G.)، over (E.)، ufar (Gt.)، hyper (Gr.)، super (L.)، upari (OIn.) و (Av.) و (ا)بر (e)ber (P.) "سەرەوە، لای سەروو".

[بە گوێرەی "فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی" وشەکە دە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە دوو کەرتی *upari* + *hača*. کەرتی یەکەم بە مانای "ژ، لە" و کەرتی دووەم بە مانای "سەرەوە"].

ژوور2 **jur 2** [ *žūr* ] - "هۆدە، دیو": خزمە دەگەڵ Scheuer (G.)، scūr (OG.)، schuur (Nl.) "ئەنبار(ی دەخڵ و دان، کا، گیا)"، skur (Norw.) "سەرپەنا، پەناگا". وشەکە خزمە دەگەڵ ↑کوێر kuwer [کۆر kor "نابینا" سەر بە ریشەیەک بە مانای "داپۆشین".

ژوورک **jurk** [ *žurk* ] - "هەوراز": خزمە یا خود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زوورک zurk "تەپۆڵکە". خزمە دەگەڵ ↑ژوور jur "سەر، بالا، لای سەرەوە".

ژووژان **jujan** [ *žūžān* ] - "بووژانەوە، وە گوڕ هاتن": خزمە دەگەڵ ↑ژین jîn. ریشەی وشەی ژین دە زمانە هیندوئەرووپییەکانی دیکەشدا هێندێک وشەی لێ کەوتۆتەوە، کە مانای "چوست و چالاک بوون، بە تین و گوڕ بوون" دەدەن، بۆ وێنە بڕوانە ↑ژووڤە juve "جیوە".

ژووڤە **juve** [ *žūva* ] - "جیوە": ↑جیوە cîwe و ↑زاوق zawıq ش دەگوترێ. جیوە jīve و زیبق zaybaq (P.). دە زمانە ژێرمەنییەکاندا ناوی ئەم کانزایە دەبێتە Quecksilber (G.)، cwicseolfor (OE.)، quicksilver (E.) و هتد. مانای ئەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا دەبێتە "زێوی (سەر)زیندوو، زێوی چالاک و بزۆز". ئەم کانزایە بە چالاک و بزۆز بوون بە ناوبانگە و بۆیە بەم جۆرە ناودێر کراوە. دە زمانی کوردمادیشدا بە کەسێک زۆر بزۆز بێ، دەگوترێ "دەڵێی جیوەی تێ کراوە". کەرتی دووەمی وشە ژێرمەنییەکان، واتا silber "زێو" ئاماژەیە بە رەنگی زێوینی کانزاکە. کەرتی یەکەمی وشە

ژێرمەنییەکان، واتا -queck مانای "چوست و چالاک، خێرا" دەدا و دەبنەڕەتدا بە مانای "زیندوو، سەرزیندوو" بەکار هاتووە و خزمە دەگەڵ ژووڤە juve یان زاوق zawıq، دواتر دەگەڵ ↑ژین jîn و ↑ژیان jîyan و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "ژیان"، سەر بە ریشەی *guei-* (IE.) >* "ژین، ژیان".
وەک دەبینین ناوی ئەم کانزایە دە زمانی کوردمادی و فارسیشدا لەسەر هەمان پێودان دروست کراوە کە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەبیندرێ. هەر لەم چوارچێوەیەدا هەروەها بڕوانە وشەی ↑کێچ keç "زیلەیکی خێرا و گورج و گۆڵ".

ژووڵە **jule** *[ žūla ]* - "بزاڤ": جووڵە cule و ژیلی jîlî یش دەگوترێ. بڕوانە ↑جووڵان culan.

ژە **je** *[ ža ]* - "پاشگری جە، جێ" [تەنگژە، پەیژە]. بڕوانە ↑جێ ce.

ژەبەژ **jebej** *[ žabaž ]* - "شووتی": ↑زەبەش zebeş و جەبەش cebeş یش دەگوترێن. ئەم وشانە دەشێ شێوەیەکی دیکە بن لە ↑شووتی şûtî [کۆنتر: شەفتی şeftî] و دەتوانین بەراوردیان بکەین دەگەڵ (.G) süß، (.E) sweet، (.Nl) zoet، (.Sw) söt "شیرن"، سەر بە ریشەی *suād-* (IE.) >* "شیرن، خۆش". دە زمانە ناژێرمەنییەکانیشدا هاوتای ئەم وشانە دەبینین، وەک (.L) suavis "خۆش"، (.Gr) hēdys و (.OIn) svādu-h "خۆش، شیرن". ئەم وشانە دە بنەڕەتدا بۆ تام ومەزەی خۆشی شیرەی میوەکان بە کار هاتوون.

ژەرەژ **jerej** *[ žaraž ]* - "کەو": ↑زارانز zaranz و زارانج zaranc یش دەگوترێ.

ژەقنەبووت **jeqnebut** *[ žaqnabūt ]* - "دارێکە بەری تاڵە": ژەقنە jeqne یان زەقنە zeqne دەچێتەوە سەر *zqūm* زقوم (.Arb) "تاڵ". بووت but خزمە دەگەڵ بوتە (.P) būte "پنچکەدار".

ژەک **jek** *[ žak ]* - "هەوەڵ شیری دوای زان": زاگ zag، ژاک jak، زاک zak و زێچ zeç یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە پێوەندی بە وشەی ↑زان zan ەوە هەبێ.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ (.G) saugen، (.E) soak، (.E) suck، (.OE) sūcan، (.OE) sūgan، (.OE) sūgere، (.L) suga، (.ON) "هەڵمژینی تراو، شیر مشتن، دۆشین"، سەر بە ریشەی *sug-, *suk-* (IE.) >* "مشتن، دوشین". ↑دۆشین doşîn پێوەندی بەم ریشەوە هەیە.

3- ↑شۆک şok "1- گەزووی مازوو 2- شیرەی ترێ": خزمە دەگەڵ ↑شفت şıft "دۆشینی شیر"، سەر بە ریشەی *seu-* (IE.) >* "دۆشین، دوشاو گرتن، شیرە گرتن".

[تێبینی: لەوە دەچێ ئەم دوو ریشەیە سەرەوە لە بنەڕەتدا پێکەوە خزم بن و ریشەی *sug-* لە ریشەی *seu-* پەرەی گرتبێ].

ژەلم1 **jelım 1** *[ žalım ]* - "سیسی، ژاکان": خزمە دەگەڵ ↑چلمسین çılımsîn.

ژەلم2 **jelım 2** *[ žalım ]* - "ئاوی لێڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑زەلم zelm "ئاوی توێژلەسەر".

ژەلمۆ **jelmo** *[ žalmo ]* - "تەوەزەل، سست": دەبێ هاوپێوەند بێ دەگەڵ ↑شل şıl.

ژەم **jem** *[ žam ]* - "دەمی نان خواردن": جەم cem یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ (.Pl) zamān "زەمان، دەم". [تەمەن؟]. ئەم وشانە دەشێ پێوەندییان هەبێ بە ↑دەم dem و ↑تەمەن temen و ↑تاف tav و ↑تاو taw. ئەم وشانە گشتیان چەمکی " کات" بەیان دەکەن. وێ دەچێ وشەی زمن zaman (.Arb) دە ئەسڵدا وشەیەکی عەرەبی نەبێ و لەم وشانەی سەرەوە وەرگیرابێ.

ژەندن **jendın** *[ žandın ]* - "لێدان، لێکدان": زدن zadan (.P) "ژەنین". دە زمانی فارسیدا هەر یەک کردار هەیە، دە زمانی کوردمادیدا "ژەندن" و "ژەنین" هەیە کە یەکەمیان بە مانای "لێکدان" و دووەمیان بە مانای "لێدان" بەکاردێ. خزمە دەگەڵ (.Pl) zatak و (.Av) gan "ژەندن، ژەنین" و هەروەها لەوانەشە دەگەڵ کرداری ↑هەژاندن hejandın "راتڵەکاندن، لێکدان". ریشەکەی دەبێ بچێتەوە سەر ریشەی *gono-* (IE.) >* "لێدان، کوتان".

**ژەنگ jeng** ] *žang* [ - "1- تۆێژی ئۆکسیدەبووی سەر کانزا 2- پەتایەکی گەنم": زەنگ zang (P.). زنجار zıncar و ژەنگار jengar یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زەنگ zeng [زەبر و زەنگ] و ↑ژەنین jenînبە مانای "لێدان" و هەروەها ↑زیان zîyan. مەبەست لە ژەنگ دە بنەڕەتدا زیان پێ گەیشتن یاخود "لێدان"ی ئاو و هەوا لە کانزا یان "لێدان"ی پەتا لە گەنم بووە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Plage (G.) بە مانای "ئافەت، پەتا"ی گژ و گیا بەکار دێ کە خزمە دەگەڵ بەڵا bela، فەللاقە fellaqe، پلۆسین pılosîn بە مانای "لێدان"].

**ژەنگە سوورە jengesure** ] *žangasūra* [ - "زیلەیەکی پێوەدەر": ↑زەنگەسوورە zengesure ش دەگوترێ. ژەنگ + ە + سوورە jeng + e + sure. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر ↑زەنگ zeng "لێدان، پێوەدان" و کەرتی دووەم ئاماژە بە رەنگی ↑سوور sur ی زیلەکەیە.

**ژەنین jenîn** ] *žanīn* [ - "لێدان": خزمە دەگەڵ ↑ژەندن jendın.

**ژەهر jehır** ] *žahır* [ - "دەرمانی کوژەر": ↑زەهر zehır و ژار jar یش دەگوترێ.

**ژی jî** ] *že* [ - "ئاوەڵکرداری خستنەسەر": دە شێوەزاری کوردمادی خوارووادا دەبێتە"ئیش" ş(î) [وان ژی واتا ئەوانیش]. نیز nîz (P.) [? n-îz]. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ auch (G.)، ēac (OE.)، ock (Sw.) "ئیش، ژی ". وشە ژێرمەنییەکان پێوەستن بە وشەیەک کە لە کۆندا بە مانای "زۆر بوون، هەڵدان" بەکار هاتووە، وەک ēaca (OE.)، auki (OIs.) و aukan (Gt.). وێ دەچێ وشەی ایضا ayzan (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**ژیان jîyan** ] *žīyān* [ - "ژین": ↑ژین jîn.

**ژیر1 jîr** ] *žīr* [ - "بەئاوەز، تێگەیشتوو": خزمە دەگەڵ هزر hızır "بیر"، jīra (Av.) "ژیر، زیرەک"، -hu xratav (Av.) "زانا، بەئاوەز" و خرد xerad (P.) "ژیری، ئاوەز". ئەگەر بخوازین بەراوردی ئەم وشانە دەگەڵ وشە هیندوئەوروپییەکان بکەین، دەتوانین پێوەندییان بدینەوە بە raten (G.) "گریمان کردن، بۆ چوون" و Rätsel (G.) "*راز*، مەتەڵۆک" و ratio (L.) "ئەژماردن، هەڵسەنگاندن، بیر کردنەوە". وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر وشەیەکی کۆن کە دە بنەڕەتدا بە مانای "بیر کردنەوە، هەڵسەنگاندن، دۆزینەوە" بووە و هەم ئەم وشانە و هەم وشە لاتینییەکەش دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(a)re- >*** "تێک خستن، گونجاندن" [خستنەوە سەر یەکی کێشەکان؟]. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ وشەگەلێک کە لەژێر ↑راشەن raşen دا باس کراون.

**ژیر2 jîr** ] *žīr* [ - "ئارام": ژیرکردنەوە واتا ئارام کردنەوەی زارۆکێک کە دەگرێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ still (G.) و (E.)، stil (Nl.) "ئارام، خامۆش"، stillan (OG.) "ئارام کردن، بێدەنگ کردن"، stillen (G.) و (Nl.)، stilla (Sw.) "شیر دانە زارۆکی ساوا" [دە بنەڕەتدا: ژیر کردنەوە و ئارام کردنەوەی زارۆکی برسی]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *stel- >*** "وەستاندن، وەستاو، راوەستاو، بێ جووڵە". ئەمەش خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی ***(IE.) * st(h)a- >*** "وەستان، وەستاندن". دە زمانی کوردمادیدا ↑ستار sıtar "ئارام" هەیە کە لەوانەیە شێوەی کۆنتری وشەی "ژیر" بێ. هەروەها وشەی ↑زل² zıl "چاو تێبڕین" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ kirre (G.) "نەرم و لەسەرەخۆ"، kvirr (OIs.) "ئارام، بێدەنگ، میهرەبان"، qaírrus (Gt.) "نەرم و نیان". ریشەی ئەم وشانە ساخ نەکراوەتەوە.

3- هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ژیکەڵە jîkele [ژیرکەڵە] "چکۆڵەی لەبەر دڵان".

**ژیشک jîşık** ] *žīšık* [ - "ئاژەڵێکی دڕکاوی": ↑جووشک jûşık یش دەگوترێ.

**ژیکەڵە jîkele** ] *žīkala* [ - "چکۆڵەی لەبەر دڵان": ژیرکەڵە jîrkele ش دەگوترێ و ئەمەیان شێوەی کۆنتری وشەکەیە: ژیر + کەڵە [پاشگری گچکاندن] jîr + kele. بەم پێیە دەبێ وشەکە مانای "ژیری چکۆڵە" بدا. بەڵام ژیر لێرەدا ناتوانێ بە مانای "زیرەک، ئاوەزمەند" بێ، چونکوو زارۆک ئەگەر "زیرەک و

ئاوەزمەند"یش بێ، مەرج نییە لەبەر دڵان بێ. هەروەها زارۆك دەتوانێ "زیرەك و ئاوەزمەندیش" نەبێ، بەڵام ژیکەڵە [ژیرکەڵە] بێ. کەوابێ ئەم "ژیر"ە جودایە لە "ژیر" بە مانای "زیرەك، ئاوەزمەند". ئەم "ژیر"ە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ hiuri (OG.) "لەبەردڵان، میهرەبان"، hīere (OE.) "لەبەردڵان، ئارام و لەسەرەخۆ"، hyrr (OIs.) "میهرەبان، شاد، نەرم و نیان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ Heim (G.) "ماڵ" و دە بنەڕەتدا ماناکەی "سەر بە بنەماڵە" بووە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑حاوان(ەوە) ħawan(ewe). لەم تێروانینەوە ژیرکەڵە دەبێ ئەو زارۆکە بێ کە "دەحاوێتەوە"، واتا هەڵسوکەوتی بساز و خۆمانەیە.

**ژیل jîl 1** *[ žīl ]* - "بزووتن، جوولان": ژێل jel یش دەگوترێ. ژێلی هەرد jelî herd واتا بوومەلەرزە یان ئەردهەژ. خزمە دەگەڵ ↑جوولان(ەوە) culan(ewe) و ↑زیلان zîlan. وشەی زلزلة (Arb.) "ئەردهەژ" دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**ژیل jîl 2** *[ žīl ]* - "وردە": مامۆستا هەژار وشەی ↑بنژیل bınjîl [بن ژیل] ی وەسا شی کردۆتەوە: "وردەی بن کەوتوو لە بێژنگ". ئەم وشەیە دەبێ دە بنەڕەتدا بە مانای "خڵتە و خۆڵ" بێ و خزم بێ یان شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑خۆڵ *xol*. دە زمانی فارسیدا "بنژیل" دەبێتە بنجل bonjol (P.)، واتا "جۆل jol "ی بنەوە. ئەگەر سەرنجی وشەی ↑ژیلەمو jîlemo یان زیلەمۆ zîlemo ش بدەین، دەبینین کە لەم وشەیەشدا "ژیل" یان "زیل" دەگەڵ مانای "خۆڵ" بە باشی یەك دەگرێتەوە و مانای وشەکە دەبێتە "خۆڵەمێش" [خۆڵی مێشی رەنگ]، یان "خۆڵەکەوە". کەرتی مۆ mo- دە وشەی ژیلەمۆ jîlemo دا شێوەیەکی دیکەیە لە مێش mêş- دە وشەی خۆڵەمێش xolemêş دا و ئاماژە بە رەنگی خۆڵەکە دەکا کە رەنگیکی ئاماڵ رەشە.

**ژیلە jîle** *[ žīla ]* - "تەرزەی ورد": خزمە دەگەڵ ↑سار(د) sar(d) و هەروەها وشەی ژێل jel کە لە زمانە ئەورووپییەکان وەرگیراوە، دواتر بڕوانە ↑گلێرە gılêre.

**ژیلەمۆ jîlemo** *[ žīlamo ]* - مامۆستا هەژار دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئەم وشەیەی وەك "وردەئاگری ناو خۆڵەمێش" مانا کردۆتەوە. وشەکە دە زمانی ئەدەبیدا وەك "ئاگری ژێر خۆڵەمێش" جێی خۆی کردۆتەوە و تەنانەت بووەتە ناوێکی جوانیش بۆ کچان. بەڵام لەوە ناچێ وشەکە دە بنەڕەتدا بەم مانایە بووبێ. رەنگە ئەم مانایە لەمەوە پەیدا بووبێ کە وشەی "ژیل" دەگەڵ "ژێر" تێکەڵ بە یەکدی کراون. ↑ژیل jîl وەك پێشتر باس کرا، مانای "وردە، خاك و خۆڵ" دەدا. مۆ mo- شێوەیەکی دیکەیە لە مێش mêş- [خۆڵەمێش xolemêş]. لەم تێروانینەوە هەم وشەی "خۆڵەمێش" و هەم "زیلەمۆ" ماناکەیان دەبێتە "خۆڵی ئاماڵ رەش، خۆڵی کەوەرەنگ، خۆڵەکەوە". ئەگەر "ژیل" هەمان "ژێر" بێ، ئەوسا مانای وشەکە دەبێتە "ژێرخۆڵەمێش" کە ئەمەش چەمکی ئاگری تێدا بەدی ناکرێ، واتا "ژێرخۆڵەمێش" نابێتە "ئاگری ژێر خۆڵەمێش".

**ژین jîn** *[ žīn ]* - "گیان لەبەر بوون": زیستن zīstan (P.). خزمە دەگەڵ zēn و zōein (Gr.) "ژین"، vivere (L.)، žit (Rus.) "ژین"، qius (Gt.) "زیندوو"، kvick (Sw.)، keck (G.)، quick (E.) "خێرا، چوست و چالاك، سەرزیندوو"، سەر بە ریشەی ***guei- > (IE.)*** "ژین، ژیان". وشەکانی ↑گیان gîyan یان ↑جان can، ↑جیو cîw "ژیان" و ↑جووقە cuqe و هەروەها ↑جیوە cîwe خزمن دەگەڵ ژین.

**ژێ je 1** *[ že ]* - "تاری کەمان": زە zeh (P.). خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑جاڵ cal، ↑زیل zîl، ↑زیلۆ zîlo و هیتر سەر بە ریشەیەك بە مانای "بەستن، بەستنەوە، لێکبەستن".

**ژێ je 2** *[ že ]* - "ژێ کردن واتا (سەر) بڕین": خزمە دەگەڵ جوێ/ جیا cîya/ cuwe، ↑شێ şê و چەندین وشەی دیکە کە سەر بە ریشەیەکن بە مانای "جیا کردنەوە، بڕین، لێکردنەوە".

**ژێدەر jeder** *[ žedar ]* - "سەرچاوە": ژێ + دەر der + je. کەرتی "ژێ" پێوەندی هەیە بە پرێپۆزیسیۆنی ↑ژ jı هوە. لەم تێروانینەوە ژێدەر دەبێتە شوێن یان سەرچاوەی "ژێ دەرهاتن، ژێ دەرکەتن".

**ژێر jer** *[žer]* - "لای خوارەوە، بن": زیر zīr (.P). [بە گوێرەی فەرهەنگا کورمانجی- ئینگلیزی وشەکە دە بنەڕەتدا پێک هاتووە لە دوو کەرتی *adari* + **hača*. کەرتی یەکەم بە مانای "ژ، لە" و کەرتی دووەم بە مانای "بنەوە، خوارەوە". وشەکە دە فارسی ناویندا azēr (.MP) بووە]. وەک دەردەکەوێ، کەرتی دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ unter (.G)، undar (.Gt)، under (.E) و (.Sw) "ژێر، خوارەوە"، سەر بە ریشەی < ****ndheri-* (.IE)** "ژێر، خوارەوە".

## س (S)

سا **sa** *[ sā ]* - [ئەوسا، سا وەرە]، شێوەیەکی دیکە لە ↑جا *ca* کە ئەمیش خۆی کورتکراوەی ↑جار car ە.

سابات **sabat** *[ sābāt ]* - "کەپر": خزمە دەگەڵ ↑سەوەتە sewete [سەبەتە sebete] "دەفری لە توول چنراو" و هەروەها ↑سیپ sîp "تامان لەناو چەم بۆ ماسی گرتن" و ↑سیپاڵ sîpal "1- جلو بەرگ (بەتایبەتی هی کۆن) 2- کۆنەپەڕۆ 3- بەڕەی ساکار وکەم بەر". ئەم وشانە هەڵگری مانای "چنین، تەنین"ن و خزمن دەگەڵ Spinne (G.) "جاڵجاڵۆکە" و spinnen (G.)، spin (E.)، spinna (Sw.)، pinti (Lit.) "تەنین، رستن"، spannen (G.)، spannan (OE.)، spänna (Sw.) "لەبەر یەک کیشانەوە"، spáein (Gr.) "کێشان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی کوردمادی دیکە وەک ↑سفرە sıfre، ↑ساباق sabaq "شوێن و جێگەی بەرفراوان"، ↑زڤنگ zıvıng [زیڤینگ zîvîng] "ئەشکەوتی مەزن کە خەڵکی تیدا دەژی"، ↑زەوەند zewend [زەبەند zebend] و ↑زۆر *zor* [1] سەر بە ریشەی **> *sp(h)ei-* (IE.)** "لەبەر یەک کشانەوە، درێژ بوونەوە، هەراو بوونەوە". سپهر sepehr (P.) "ئاسمان" [spahr (Pl.) "فەلەک"] و space (E.) "فەزا" [spatium (L.)] پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە. وێ دەچێ وشەکانی ↑سیپەلک sîpelık [سیپەلاک sîpelak] "سی، ئەندامی هەناسەکیشان" و ↑زیپەر zîper [زەڤڵەک zevlek] "ماسوولکە" پێوەندییان بەم ریشانەی سەرەوە هەبێ و دە بنەڕەتیشدا هەر یەک وشە بووبن و ئاماژەیان بە "لەبەر یەک کشانەوە" کردبێ.

ساباق **sabaq** *[ sābāq ]* - "شوێن و جێگەی بەرفراوان": خزمە دەگەڵ ↑زۆر [1] zor "فرە".

سابرێن **sabren** *[ sābren ]* - "تەگە، تیری": خزمە دەگەڵ ↑کاوڕ kawır و ↑کوور *kur*.

سابوورە1 **sabure 1** *[ sābūra ]* - "تەختەرەشی فێرگە": دەچێتەوە سەر < *tabula* (L.) "مێز، تەختە". ئەم وشە لاتینییە کەوتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکان و بووەتە table (E.) و Tafel (G.) بە هەمان مانا.

سابوورە2 **sabure 2** *[ sābūra ]* - "نیرەمووک، خواجە": لەوانەیە پێوەندی بە وشەی ساف [1] saf "لووس"ەوە هەبێ و مەبەست ئاماژە کردن بە روومەتی ساف و لووس واتا بێ ردێن بووبێ.

سابوون **sabun** *[ sābūn ]* - "کەرەسەی پێ شوتن و پاک کردنەوە": sābūn (P.). دەچێتەوە سەر وشەی کوردمادی ↑(ئە)سپۆن (e)spon "بنەگیایەک بۆ جل شوتن کە کەف دەکا". وشە کوردمادییەکە دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە صابون sabūn (Arb.) و ئەوجار بەم شێوەیە هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی و فارسی.

ساپ1 **sap 1** *[ sāp ]* - "سواپ": شێوەیەکی دیکە لە ↑سواپ suwap.

ساپ2 **sap 2** *[ sāp ]* - "کۆی سووری خەرمان": خزمە دەگەڵ Schober (G.)، scobar (OG.) "خەرمان"، scubil (OG.) "باقەموو، باقەگیا"، sheaf (E.) "باقە، چەپک"، schof (G.) "پۆپە"، čub (Rus.) "باقەموو، چەپکەموو"، سەر بە ریشەی **> *(s)keub-* (IE.)** "باقە، چەپک". ↑چەپک çepık و هەروەها ↑سمێڵ sımel [سبیل sebīl (P.)] دەشێ خزم بن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. هەروەها لەوانەیە صوفی sofī (Arb.) پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ و ئاماژە بە باقەمووی ردێنی سۆفییەکان کرابێ.

ساپیتە **sapîte** *[ sāpīta ]* - "1- میچی خانوو 2- کاریتە، دیرەکێ 3- لای هەرە بڵیند": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زاب zab "سەکۆ، دەکە" و ↑زۆپ *zop* "زەق، دەرپەڕیو".

سات[1] **sat** *[ sāt ]* - " کات، دەم": خزمە دەگەڵ seit (G.) "لە ... وە" (بۆ ئاماژە کردن بە کات)، بۆ وێنە seit gestern ماناکەی دەبێتە "لە دوێنێ وە". مانای کۆنی ئەم وشە ئەڵمانییە بریتی بووە لە "درەنگتر لە" و خزمە دەگەڵ sīd(or) (OG.) sīd (OE.)، setius (L.) "درەنگتر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑هەتا1 het

"کن، نک، جەم" و دواتر دەگەڵ ↑چاندن çandın سەر بە ڕیشەی < *sei- (IE.) "چاندن، وەشاندن، فڕێ دان". لەژێر وشەی ↑هەت het 1دا شی کراوەتەوە کە چۆن ئەم چەمکانەی سەرەوە پێوەندی بە چەمکی "کات"ەوە پەیدا دەکەن.

**سات² sat** [ sāt ] - "دەگەڵ "سوور" دێ [سوور و سات sur u sat] بە مانای "ئازووقەی لەشکر کە لە ڕەعێتان وەردەگیرا". سوورسات sūrsāt و سیورسات seyūrsāt (P.) "ئازووقەی وەرگیراو". وشەکە لە دوو کەرت پێک هاتووە. کەرتی دووەم، واتا "سات" دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schoß (G.)، schot (Nl.)، shot (E.)، scot (OE.) "باج و خەراج، پیتاک، گومرگ"، سەر بە ڕیشەی < *(s)keu- (IE.) "دەرپەڕاندن، پاڵ نان، ڕاو نان، پەلە کردن". ڕەنگەی وشەی ↑سوود sud/ سووت sut "قازانج" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**ساتان satan** [ sātān ] - دەگەڵ "سمت" دێ [سمت وساتان sımt û satan]. وشەکە خزمە دەگەڵ sitzen (G.)، sit (E.)، sita (Sw.)، sedeti (Lit.)، sidet (Rus.)، sedre (L.)، گشتیان بە مانای "دانیشتن". ساتان ئەو شوێنەی لەشە کە لەسەری دادەنیشن. ناوی ئەم شوێنە دە زمانەکانی دیکەشدا لە وشەی "دانیشتن" وەرگیراوە، بۆ وێنە نشیمنگاه nešīmangā (P.) "ساتان"، gesäss (G.). وشەکان دەچنەوە سە ڕیشەی < *sed- (IE.) "دانیشتن"، خزمە دەگەڵ ↑دانیشتن danîştın.

**ساتاندن satandın** [ sātāndın ] - "کوتانی چەڵتووک". دەتوانین دوو شیمانە بخەینە ڕوو:

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ cedere (Lat.) "لێدان، کوتان".

2- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ stoßen (G.)، stoten (Nl.)، tudati (OIn.)، tundere (L.) "لێدان، لێکدان، پێکدادان"، سەر بە ڕیشەی < *(s)teu- (IE.) "لێدان، پێکدادان". وشەی ↑تووش tûş دەچێتەوە سەر ئەم ڕیشەیە.

**ساتف satıf** [ sātıf ] - "شێلانی هەویر": خزمە دەگەڵ ↑ساتمە satme "هەڵەنگوتن، ڕەت دان" [دە بنەڕەتدا: وێککەوتن]. شیاوی باسە وشەی "شێلان"یش دە ڕیشەدا بە مانای "لێدان"ە.

**ساتمە satme** [ sātma ] - "هەڵەنگوتن، ڕەت دان": خزمە دەگەڵ stemmen (G.)، (for)stemman (OE.)، stämma (Sw.) "پاڵ نان، پاڵ پێدان، بەرگرتن، وەستاندن". هەروەک چۆن دە زمانی کوردمادیدا "زمان هەڵەنگوتن" هەیە، دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا هەر لەم ڕیشەوە وشە بە مانای "زمان هەڵەنگوتن" [زمان وەستان] دروست بووە، وەک stammeln (G.)، stamerian (OE.) "زمان هەڵەنگوتن" و stam (OE.)، stamm (OE.) و stamr (OIs.) "کەسێک زمانی گیر دەکا"، سەر بە ڕیشەی < *stem- (IE.) "وێککەوتن". دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑سەتماندن setmandın "ڕووخاندنی دیوار"، ↑ساتف satıf "شێلانی هەویر" [دە بنەڕەتدا: لێدان و پێک دادانی هەویر]، ↑زتم zıtım "داخستنی دەرگا و پەنجەرە" [دە بنەڕەتدا: پێک دادان]، ↑چاتمە çatme "پێک هەڵپەساردنی تفەنگان" [دە بنەڕەتدا: پاڵ وێکدانیان، وێککەوتنیان" و لەوانەشە ↑ساچمە sačme "1- ورکەگوللەی ناو تفەنگ 2- تەوس و پللار". "چاتمە" بەو دۆخە گوتراوە کە چەندین کەس تفەنگەکانیان لێکدەکەوێ، هەر وەک دۆخێ وێککەوتنی گلاسەکان لە کاتی خواردنەوەدا. دە زمانی عەرەبیدا وشەکانی صدمة sadama (Arb.) "زەبر، زیان" و شتم šatm (Arb.) "زەبر، لێدان" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە و لەوانەیە لە وشە کوردمادییەکان وەرگیرابن. بە گوێرەی بۆچووتێک ئەم ڕیشەی سەرەوە خۆی دەچێتەوە سەر ڕیشەیەکی دوورتر، واتا ڕیشەی < *sta- (IE.) "وەستان، وەستاندن". لەم تیڕوانینەوە ساتمەدان دە بنەڕەتدا مانای "بە شتێک کەوتن، شتێک هاتنە بەر پێ، لە ڕویشتن وەستیندران"ی هەبووە و دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ستان sıtan. هەروەها چاتمە çatme "پێک هەڵپەساردنی تفەنگان" دە بنەڕەتدا بەمانای پاڵ وێکدانیان، *وەستاندنیان* بەیەکەوە بووە.

**ساتوور satr** [ sātūr ] - "ئامرازی گۆشت و ئێسک لەت کردن": پێوەندی هەیە بە وشەی ↑ساتاندن satandın "کوتانی چەڵتووک".

**ساج sac** *[ sāj ]* - "سێڵ": لەوانەیە پێوەندی بە ↑زەق zeq ەوە هەبێ. ساج کە نانی لەسەر دەکەن، دۆخێکی زەق و هەڵتۆقاوی هەیە و دەشێ ناوەکەی بۆ ئەمە بگەڕێتەوە.

**ساچمە sačme** *[ sāčma ]* - "1- ورکەگوللەی ناو تفەنگ 2- تەوس و پللار": دەشێ خزم بێ دەگەڵ یەك لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑ساتمە satme "هەڵەنگوتن، ڕەت دان"، سەر بە ریشەی **< *stem- (IE.)** "وێککەوتن".

2- ↑زیچ2 zîç "وردەبەرد کە منداڵ کایەی پێ دەکەن" و ↑زیچ1 zîç "1- پێلەقەی مرۆڤ 2- جووتەی یەکسم".

**ساخ sax** *[ sāx ]* - "تەندروست": ساغ saġ یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سار2 "ئامادە، چێکراو، لەسەرڕێ"، ↑چاك çak "باش، دروست". "چاك" جگە لە مانای "باش"، مانای "ساخ و تەندروست"یش دەدا [چاك بوونەوەی دوای نەخۆشی]. دە فارسیدا چاق čāq (P.) هەیە بە مانای"بەهێز، تەندروست" [چاق سلامتی کردن واتا چاك و خۆشی کردن]. "چاق" دە زمانی فارسیدا هەروەها مانای "قەڵەو" دەدا. ئەمەیان وشەیەکی سەربەخۆیە و پێوەندی بەو "چاق"ەوە نییە بە مانای "چاك". ئەم وشانە دە ریشەدا خزمن دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑زووخ zux "هێز، توانایی"، ↑سەخت sext "بەهێز، قایم، پتەو"، ↑زیخ zîx "بوێر"، ↑زەخت zext "هێز، گوشار"، ↑سۆخرە soxre "بێگاری" [کاری بە زۆرەملی، بەراوردی شێوەی ئەم وشەیە بکە دەگەڵ seger (Sw.) لە خوارەوە]، ↑جەخت cext "پێداگرتن، گوشار خستنەسەر"، ↑سخ sıx "تەنراوی سفت، چڕ و پڕ"، ↑سۆغین soġîn "ئەنجام دان، پێك ئانین"، ↑سۆکین sokîn "بناخە، هیم" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Sieg (G.)، sige (OE.)، seger (Sw.) "زاڵ بوون"، sáhatē (OIn.) "زاڵ دەبێ، دەتوانێ، بەرگە دەگرێ"، sáhas (OIn.) "زەخت و زۆر، زاڵ بوون". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *seĝh- (IE.)** "ڕاگرتن، (بەسەردا) زاڵ بوون، قەوەت پێ شکان". بەگوێرەی لێکدانەوەیەکی دیکە ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *sghuwent- (IE.)** "سەخت، قایم، بەهێز". وێدەچێ ئەم دوو ریشەیە پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ. ئەگەر ریشەی "ساخ" بچێتەوە سەر ئەم ریشەیەی دوایی، ئەوسا دەبێتە خزم دەگەڵ gesund (G.) [ge-sund] "ساخ". ئەم وشە ئەڵمانییەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑سفت *sıfit* واتا "سەخت، قایم". وەك دەبینین دە زمانی ئەڵمانیشدا چەمکی "ساخ" دەگەڵ چەمکی "سفتی، سەختی" دە پێوەندیدایە. ئەو وشە کوردمادییانەی سەرەوە دە بنەڕەتدا هەڵگری چەمکی "هێز و توانایی"ن و دە بنەڕەتدا ئاماژەیان بە "بەهێز و پتەو بوون، قورس و قایم بوون" کردووە، بە پێچەوانەی شتی ناساز یان ناساخ کە لە هێز و توانایی بێ بەشە و شل و شەوێقە. وشەی صحة sihhe (Arb.) "دروستی، تەندروستی، ساخی" لە وشە کوردمادییەکانی سەرەوە وەرگیراوە.

**ساخلەم saxlem** *[ sāxlam ]* - "ساغ، بێ کەمایەسی": ساغلەم sağlem یش دەگوترێ. ↑ساخ sax + لەم lem. کەرتی دووەمی وشەکە لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Leib (G.) "تەن، بەدەن" و ↑لەم2 lem "زگ، سك". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "لەش ساخ".

**سادر sadır** *[ sādır ]* - "جێگەی چاندنی تۆو کە بوویێتە شەتڵ": خزمە دەگەڵ Saat (G.)، sat (OG.)، sad (Sw.)، seed (E.)، zaad (Nl.)، satus (L.) "تۆو، چاندنی تۆو"، سەر بە ریشەی **< *se(i)- (IE.)** "چاندن، وەشاندنی تۆو". خزمە دەگەڵ ↑چاندن çandın.

**سادە sade** *[ sāda ]* - "ساف، هاسان": sāde (P.).

[سەرەتا تێبینییەك: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی schlicht (G.) بە مانای "سادە" دێ و خزمە دەگەڵ schlecht (G.) "خراپ". ئەم وشانە دە ئەسڵدا هەر یەك وشە بوون بە مانای "ساف، خز، لووس" و پاشان دوو وشەیان لێ دروست بووە، یەکەمیان بە مانای "سادە" و دووەمیش بە مانای "خراپ، بەد". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schleichen (G.) "خوشین" و *شێڵەهان şêlehan* "خزین، خوشین" و چەندین وشەی دیکەی کوردمادی وەك شەلەختە şelexte "نارێك و پێك، شل و شەوێق"، شەڵیتە şelîte [سەلیتە selîte]

"ژنی بەد و بێشەرم" [G.) Schlampe)]، شەلفین şelfîn یان شەڵپین şelpîn "ڕەت بردن، خلیسکان، کەوتن" ["شڵپەی لێ هێنا" واتا ڕەتی برد و لە ئەزموون سەر نەکەوت]، شەڵف şelf "ژنی خۆ فرۆش"، جلْف cılf "هەرزە، سووک"، شل şıl "تراو، ناپەیت". ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تەر و لیچق و خلیسک بوون". وەک دەبینین دە زمانی ئەڵمانیدا لە مانای "تەر و لیچق، خلیسک، خز" مانای "لووس، ساف"، دواتر مانای "سادە" و هەروەها مانای "بەد، خراب" سەریان هەڵداوە. پێوەندی دوو چەمکی "ساف" و "سادە" دە زمانی کوردمادیشدا ئاشکرایە، بۆ وێنە کاتێک دەڵێن "فڵان کەس ساف و سادەیە". بەڵام ئەوەی جێی پرسیارە، ئەوەیە کە چ پێوەندییەک لە نێوان چەمکی "بەدی، خراپی" و ئەو مانایانەی سەرەوەدا هەیە. ئەگەر ئێمە دە زمانی کوردمادیدا سەیری وشەی "چاک" بکەین، دەبینین کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "ساخ، سەخت"، واتا پێوەندی هەیە دەگەڵ "بەهێز و پتەو و پایدار بوون". بە هەمان شێوە دەبێ شل و شەوێقی، لاوازی، خزۆکی و ناپایداری وەک نیشانەی "خراپی" سەیر کرابێ و لەمەوە مانای "خراپ" پێوەندی بەم چەمکانەوە پەیدا کردبێ].

ئێستا بگەڕێینەوە سەر وشەی سادە sade دە زمانی کوردمادیدا. بە لەبەر چاو گرتنی پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک لەنێوان دوو چەمکی "ساف و سادەیی" و "خراپی"دا بیر بۆ ئەوە دەچێ کە "سادە" پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ کە مانای "خراپ" دەدەن، وەک ↑چەتە *çete* "ڕێگر" [دە بنەڕەتدا: خراپ، بەدکار، زیانبەخش]، ↑شەتە şete "بەڵای گیا" و هتد. لەم تێڕوانینەوە دەتوانین بڵێین کە دە زمانی کوردمادیدا لە سەر بنەمای مانای "خراپ"، مانای "ساف، خلیسک" [↑شەت şet "مووی ساف"] و دواتریش "مانای "سادە" سەریان هەڵداوە.

**سار1 sar 1** *[ sār ]* - "وشتر": [سارەوان sarewan واتا وشترەوان]. چەند وشەیەک هەن دە زمانی کوردمادیدا کە دەبێ هەموویان دە پێشدا یەک وشە بووبن و دواتر گۆڕابن بۆ چەند وشە و چەند مانایان وەرگرتبێ. دە زمانی ئاڤێستادا -staora (.Av) بە مانای "ئاژەڵی گەورەی ماڵی" بووە. ئەم وشەیە دواتر چەند گۆڕاتیکی بەسەردا هاتووە و چەند وشەی لێ پەیدا بووە کە بریتین لە ↑وشتر wıştır یان حوشتر ĥuştır [اشتر oštor یان شتر šotor (.P)]، ↑ئێستر êstır [استر astar (.P)]، سار sar، ↑چێل çel "مانگا"، ستور setūr (.P) "یەکسم"، دەوار dewar "یەکسم". بۆ زانیاری لەسەر ریشەی ئەم وشانە بڕوانە ↑چێل¹ *cel* "مانگا".

**-سار2 -sar 2** *[ sār ]* - "پاشگری شوێنە، ئاماژە بە پڕانی و زۆر و زەوەندی دەکا" [کۆسار kosar واتا شوێنی پڕ لە کێو]. شێوەیەکی دیکە لە ↑جاڕ² -car [تێرگسجاڕ].

**سارا sara** *[ sārā ]* - "چۆلگە، بیابان": دە زمانی عەرەبیدا **صحرا** sahrā (.Arb) هەیە، بەڵام ئێمە دەتوانین گومانمان هەبێ لەوە کە وشەکە بە ئەسڵ عەرەبی بێ. ئەم وشەیە لەوە دەچێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەبێ:

1- ↑شەکر şekır.

2- ↑زار³ zar [زەوی و زار] و scearu (.OE) "بەش، ناوچە [دەڤەر]، سنوور". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑جاڕ² -car [تێرگسجاڕ].

**سار(د) sar(d)** *[ sār(d) ]* - "پێچەوانەی گەرم": سرد sard (.P). خزمە دەگەڵ kalt (.G)، cold (.E)، kalds (.Gt)، kall (.Sw) "سارد"، kala (.OIs)، calan (.OE) "سەرما بوون، بەستن لە سەرمان"، gelare (.L) "بەستن لە سەرمان، سەهۆڵ بەستن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< -*gel** **(IE.)** "سارد بوون(ەوە)، بەستن لە سەرمان". ئەم ریشەیە شیمانەی ئەوە دەکرێ بچێتەوە سەر ریشەی **< -*gel** **(IE.)** "گلوو بوون، گلۆڵە بوون، خڕ بوونەوە، تۆپەڵە بوون" [ئاشکرایە کە شتەکان بە سارد و سەرما تێکەوە دەچن و چکۆڵە دەبنەوە و گیانلەبەرانیش خۆیان خڕ دەکەنەوە و خۆیان *گلۆڵە* دەکەن].

وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سۆڵ sol، ↑ژیلە jîle "تەزرەی ورد"، ↑گلێرە gılêre و دە پلەیەکی دوورتردا دەگەڵ ↑گل(ە) gıl(e) "دەنکی ورد و خڕ"، ↑گلوو gılû، ↑گلۆڵە gılole، ↑کلۆ kılo و چەندین وشەی دیکە.

**سارمە sarme** [ *sārma* ] - "1- نەخشی دوورواوی سەر زین 2- گوڵینگەی لە ئاوریشم و تاڵەزێو": دەشێ پێشتر *سالمە salme** بووبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑جاڵ cal "تاڵ، ریس".

**سارێژ sarej** [ *sārež* ] - "چاک بوونەوەی برین": دە زمانی کوردمادیدا ئەو وشانەی بە مانای "تۆیژی سەر برین" بەکار دەهێنرێن، ئاماژە بە چەمکی "رەق و سەخت" بوون دەکەن و مەبەست دە بنەڕەتدا خۆ گرتن و رەق بوونی خوێنەکەیە کە تۆێخ و پێستیکی تازە دروست دەکا. لەم بارەوە بۆ وێنە سەرنجی وشەکانی "پترۆک، پەترۆکە" و "قرتماغە" بدە. هەرچی وشەی "سارێژ"یشە، دە بنەڕەتدا ئاماژە بە خۆ گرتنەوەی برین دەکا، واتا دروست بوونی تۆێخ یان پێستیک بەسەر شوێنی برینەکەدا. هەر بۆیەشە سارێژ تەنیا لەگەڵ "برین" بەکار دەهێنرێ. وشەکە خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوە: roh (G.)، (h)āo (OG.)، rauw (Nl.)، raw (E.)، hrēaw (OE.)، rä (Sw.) "خاو" [بە مانای نەکوڵیو، نەگەیشتوو، واتا سفت و رەق]، kréas (Gr.)، kraví (OIn.) "گۆشتی خاو، نەکوڵیو"، cru (OIr.)، kraūjas (Lit.)، kruvi (OSl.) "خوێن" [دە بنەڕەتدا لەختەی خوێن]، crūdus (L.) "خاو، رەق، سفت"، krūrá-h (OIn.) "خوێناوی، دڵتەزین، سامناک". ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ crusta (L.) "تۆێکڵی دار" کەهاتووەتە ناو زمانی ئەڵمانی و بووەتە Kruste (G.) بە مانای "تۆێکڵ، تۆێخ". گشت ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***kreu-** (**IE.**)* "مەیین، قەرسین". وشەکانی kryos (Gr.) "بەستەڵەک" و krystallos (Gr.) "کریستاڵ، سەهۆڵ" لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردیدا ↑کرچ kırç [کاڵ و کرچ] و هەروەها ↑کرێژ kırêj "پێست یان تۆێخی لێوەبووی سەر" پێوەندیان بەم وشانەوە هەیە. ئەگەر سەرنجی ریشەی وشەکان بدەین، بە هاسانی دەر دەکەوێ کە ئەم ریشەیە خۆی شێوەیەکی پەرەگرتوویە لە ریشەی < ***kar-, *ker-*** *(**IE.**)* "خار، سەخت، پتەو بوون". بەم شێوەیە ئەم وشانە دواجار دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردی دیکە پێوەندی پەیدا دەکەن، وەک ↑*خار xar* "رەق، سەخت"، ↑کارین karîn "توانین، بەهێز بوون"، ↑قەرسین qersîn "مەیین، تەزین"، ↑گرسە gırse "توندبووی پێکەوەنووساو" و هتد.

**ساز1 saz** [ *sāz* ] - " چێکراو، ئامادە، تەواو، دروستکراو": خزمە دەگەڵ ↑چاک çak "باش، دروست". "ساز" جگە لە مانای "ئامادە"، مانای "باش و چاک"یش دەبەخشێ، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "زۆر سازم". دە زمانی فارسیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ساختن sāxtan (P.) "ساز کردن، دروست کردن" و ئەمەش خۆی خزمە دەگەڵ ↑*ساخ sax* "تەندروست".

**ساز2 saz** [ *sāz* ] - "ئامرازی موسیقی": ساز sāz (P.). وشەی "ساز" دە بنەڕەتدا بە مانای "ئامراز" بووە، خزمە دەگەڵ ↑ساز[1] saz کردن و ساختن sāxtan (P.)، واتا "ساز" بریتی بووە لەو شتەی کە بۆ "ساز کردن" بەکاری دەهێنن و شتی پێ دروست دەکەن، واتا "ئامراز". پاشان وشەکە ئەم مانا گشتییەی خۆی لە دەست داوە و تەنیا دەگەڵ "موزیک" بەکار هێنراوە، واتا سازی موزیک sazî muzîk. دە پلەیەکی دیکەدا وشەی "موزیک" ئیتر سواوەتەوە [هەڵگیراوە] و بە کورتی گوتراوە "ساز". مانای کۆنی ساز دە وشەی جهاز jihāz (Arb.) عەرەبیدا پارێزراوە. ئەم وشە عەرەبییە لە وشە کوردمادییەکە وەرگیراوە و دواتر بە گۆڕاتێکی کەم لە ماناکەیدا بە شێوەی ↑جیاز cîyaz هاتۆتەوە ناو زمانی کوردمادی.

[تێبینی: پێوەندی دوو وشەی ساز "ئامراز" و "ساز کردن" دە دوو وشەی ئینگلیزیدا بەرچاو دەکەوێ کە پێکەوە خزمن، واتا tool (E.) "ئامراز" و tawian (OE.) "ساز کردن، دروست کردن". ئەم وشەیە وێ دەچێ خزم بێ دەگەڵ *تاوژین* "خەریک بوون"].

**سازان sazan** [ *sāzān* ] - "دەگەڵ یەک هاتنەوە، دەگەڵ یەک بە باشی حاوانەوە": ساچان saçan یش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ساز[1] saz و ↑*چاک çak*. مەبەست دە بنەڕەتدا "چاک بوون دەگەڵ یەکدی" بووە.

**ساسۆن1 sason** [ *sāson* ] - "جۆرێکە لە دروون و تەقەڵ لێدان": خزمە دەگەڵ ↑سوژن sûjın.

**ساسۆن2 sason** [ *sāson* ] - "ناوی چیایەك لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑سەق *seq* دا شی کراونەوە. ↑ئاسۆس asos کە ناوی چیایەکی دیکەیە کە کوردستان پێوەندی بەم وشەوە هەیە [a-sos]. دواتر هەروەها خزمە دەگەڵ ↑سازان sazan.

**ساف¹ saf** [ *sāf* ] - "روون، پاك، پاڵاوتە": وشەکە کوردمادییە و ↑خزمە دەگەڵ سافان safan و ↑سەپی sepî "دلۆپە، چۆڕە، چکە". صاف saf (Arb.) و صفا safā (Arb.) [باسەفا ] دەشێ لە زمانی کوردمادی یان فارسی وەرگیرابن.

**ساف² saf** [ *sāf* ] - "تەخت، یەکدەست، رێك، لووس": وەك لە ژێر وشەی ساف¹ saf باس کرا، ئەو وشەیە مانای روونی، پاك و بێگەردی دەگەیەنی، بەڵام دە زمانی کوردمادیدا "ساف" ێکی دیکەش هەیە کە وشەیەکی سەربەخۆیە و مانایەکی جیاواز دەبەخشێ، بۆ وێنە کاتێك دەڵێن ساف و لووس کردن. لێرەدا ساف بریتییە لە داتاشین و رێك کردن و هەموار کردن. ئەم "ساف"ە پێوەستە بە↑ساوین sawîn یاخود سوونەوە [سابیدن sābīdan (P.)].

**سافان safan** [ *sāfān* ] - "دلۆپە، چکە، تکە": خزمە دەگەڵ Sieb (G.)، sib (OG.)، zeef (Nl.)، sieve (E.) و sife (OE.) "سوزمە، سەلە" و sieben (G.) و sift (E.) "بە سوزمەدا کردن، بەسەلەدا کردن، چۆڕاندنەوە، پاڵاوتن"، سەر بە ریشەی **> *seip-** **(IE.)** "دلۆپاندن، چۆڕاندن، تکانەوە".[ئەم ریشەیە دەگەڵ ریشەی *seik-* (IE.) کە وشەکانی "چکانەوە، تکانەوە"ی لێ کەوتۆتەوە، خزمە]. وشەی سافان safan دەشێ هەر وەك sieben (G.) سەرەتا کردار بووبێ بە مانای "چۆڕان، دلۆپان، تکان". ئەم حاڵەتە کردارییە دە وشەی ↑سافاندن safandın "دلۆپاندن"دا باشتر دەبینرێ. وشەکانی sipiti (Serb.) "بارینی نەرم" و zafa (Pl.) "هەوری بە باران" لە هەمان ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادیدا چەند وشەیەکی دیکەش وەك ↑کەو kew [کەو و بێژینگ]، ↑زیپك zîpık "دلۆپە"، ↑ژاوە jawe "روون، پاڵاوتە"، ↑شپین şıpîn "دادانی رێژنەباران"، ↑(ئە)سپۆن espon "سابوون" و ↑سەپی sepî "پاڵاوتە" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. وشەی صفا safā (Arb.) "ساف و پاڵاوتە کردن" دەشێ لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**سافاندن safandın** [ *sāfāndın* ] - "دلۆپاندن": ↑سافان safan.

**سافۆ safo** [ *sāfo* ] - "پاڵوێنە، راوەك": ↑سافان safan.

**ساق saq** [ *sāq* ] - "بەلەکپێچی لە بەن چنراو": ساق saq (P.) "لاق ". خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشەی وەك ↑زەنگاڵ zengal و ↑چۆك çok و ↑شەق şeq.

**ساقۆ saqo** [ *sāqo* ] - "باڵتۆ، پاڵتاو": دە ئەڵمانیدا Sakko (G.) "چاکەت" دەگوترێ. ئەم وشەیە لە زمانی ئیتالیایی وەرگیراوە و دەچێتەوە سەر < *saccus* (L.) "ساك" و *sakkos* (Gr.) و دواجاریش < *śaq* (Hbr.) "پارچەی لە موو تەنراو".

**ساقۆڵ saqol** [ *sāqol* ] - "سەوەتە، قەرتاڵە": ساقۆر saqor یش دەگوترێ. وێ دەچێ پێوەندی بە ساك sak ەوە هەبێ. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ *sacculus* (L.) "ساکی چکۆڵە".

**ساقۆت saqot** [ *sāqot* ] - "1- گۆشتی بە ئێسکەوە 2- ئێسکی ئەژنۆ": خزمە دەگەڵ ↑ساق saq.

**ساقی saqî** [ *sāqî* ] - "پیاڵەدەر، پێشکێشکەری خواردنەوە": خزمە دەگەڵ ↑سەقا2 *seqa 2* "ئاوکێش".

**ساك1 sak** [ *sāk* ] - "جانتا": ساك sak (P.)، Sack (G.)، zak (Nl.)، sack (E.)، saccus (L.)، sakkos (Gr.) "ساك" > *śag* (Hbr.) "پارچەی لە موو تەنراو". ئەم پارچەیە دە کەوناراردا "ساك"ی لێ دروست کراوە. خزمە دەگەڵ ↑ساکۆ sako [ساقۆ] "پاڵتەو".

**ساك2 sak** [ *sāk* ] - "پاڵاغ، بێچووی گامێش": خزمە دەگەڵ ↑زان *zak* و دواتر ↑زارۆ(ك) zaro(k) "منداڵ" و ↑ساوا sawa.

ساكۆ1 **sako** [ *sāko* ] - "سەکۆ، دەکە": خزمە دەگەڵ ↑زەق *zeq*، ↑سەکۆseko و گەڵێک وشەی دیکە کە ئاماژە بە "زەق و دەرپەڕیو بوون" دەکەن.

ساکۆ2 **sako** [ *sāko* ] - "جۆرێک پاڵتەو": ساقۆ saqo ش دەگوترێ. Sakko (G.)، sakkos (Gr.) "جۆرێک پاڵتەو" [پاڵتەوێک بووە پارچەکەی لە مووی بزن تەنراوە]. خزمە دەگەڵ ↑ساک sak.

ساکۆ3 **sako** [ *sāko* ] - "چیای رووتەن": خزمە دەگەڵ ↑شاخ1 şax "کێو".

ساکەتە **sakete** [ *sākata* ] - "زەقایی دووگی مەڕ": خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq "دەرپەڕیو".

ساڵ **sal** [ *sāl* ] - "دوازدە مانگێ پێکەوە": ساڵ sal (P.). خزمە دەگەڵ Jahr (G.)، jār (OG.)، year (E.)، gēar (OE.)، jēr (OF.)، ar (Sw.)، "ساڵ"، hōra (Gr.) "کات و سات، وەرزی ساڵ"، jara (Rus.) "بەهار"، -yar (Av.) "ساڵ"، Uhr (G.) "سەعات" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) * iēro- >** "ساڵ"، ئەمەش دەچێتەوە سەر ریشەی کۆنتری **(IE.) *ei- , *iē-, *iā- >** "رۆیین". بەم جۆرە وشەکە دەبنەڕەتدا دەبێ پێوەندی بە "رەوتی خۆر" یان "تێپەڕ بوونی کات"ەوە هەبێ. شێوەی کۆنی وشەکە دە وشەی ↑پێرار perar [پێر + ئار per + ar] دا بەدی دەکەین کە لە دوو کەرت پێک هاتووە، کەرتی پێر -per شێوەیەکی کۆنترە لە ↑بەر ber "پێش، پێشوو" و کەرتی دووەم شێوەیەکی کۆنترە لە "ساڵ".

سالار **salar** [ *sālār* ] - "سەردار، سەرکردە": سالار sālār (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زاڵ zal "بەدەسەڵات، حاکم".

سالم(ە) **salm(e)** [ *sālm(a)* ] - "گیایەکە بنەکەی بۆ دەقی چیت بەکار دێ": سارمە sarme ش دەگوترێ. وەک لە مانای وشەکە دەردەکەوێ، دەبێ بنکی ئەو گیا شیرەیەک یان چەسپێکی لێ بگرن کە بۆ شەق کردنی چیت بەکار دەهێنرێ. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑چلم čılım، ↑سلق sılıq و ↑زلچە zılçe، شەلەم şelem [شەلەم شۆرباو] و هتد. ئەم وشانە لە ریشەیەکەوە دێن بە مانای "تەڕ و لێچق بوون".

سالوق **saluq** [ *sāluq* ] - "کولکە، وردەپەڕی نەرمی بنەوە": پێوەندی هەیە بە silk (E.)، sioloc (OE.)، shelk (Rus.)، šilkaī (Lit.) "ئاوریشم". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر sericum (L.) و دواتر Seres (Gr.) کە ناوی گەلێکی خۆرهەڵاتی ناوین بووە کە بۆ یەکەم جار لە وێوە ئاوریشم بەرهەم هاتووە و هەناردە کراوە.

سالووت **salut** [ *sālūt* ] - دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "دەوەن لە دەشتایی تیوان دوو کێودا"، بەڵام هەر لەپاڵ مانا کوردمادییەکەدا بە فارسی وەسا شیرۆڤە کراوە: "بوتە دروون جلگەای کە داخل *درە* باشد"، واتا لێرەدا ئاماژە بە "دۆڵ" کراوە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Schlucht (G.) "هەردی دادڕاوی قووڵ، رەهۆڵ". ئەم وشەیە دە شێوەزاری باکووری ئەڵمانیدا بەشێوەی Schluft (G.) یش هەبووە. ئەم وشەیەی زمانی ئەڵمانی دەبێ دەگەڵ ↑زوڵف zulıf "موو، بسک" خزم بێ.

سالۆر **salor** [ *sālor* ] - "ژێر، بەئاوەز": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ schlau (G.)، sluw (Nl.) "زیرەک". ئەم وشە ژێرمەنییانە پێوەندی پەیدا دەکەن بە schleichen (G.) "خوشین" و ↑*شێلەهان şêlehan* ی کوردمادی بە مانای "خزین، خوشین" و دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *sleuk- >** "خوشین، خزین، خلیسکان". لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە "سالۆر" دە بنەڕەتدا "خشۆک" بووە، واتا ئاژەڵێک [دواتر کەسێک] کە دەخوشێتە ناو کون و کەلێنانەوە و دەتوانێ خۆی دەرباز بکا یان راوی خۆی بەدەست بێنێ.

سالیس **salîs** [ *sālīs* ] - "پەیاغی لووس و حولی": خزمە دەگەڵ ↑حولی ḧulî.

سام **sam** [ *sām* ] - "ترس، هەیبەت": دە فارسیدا سهمگین sahmgīn (P.) دەبێتە "سامناک". خزمە دەگەڵ Scham (G.)، scama (OG.)، shame (E.)، skam (Sw.) "شەرم"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kem- >** "داپۆشین، شاردنەوە، لێهاڵاندن". وێ دەچێ دە زمانی کوردمادی و فارسیدا مانای وشەکە لە "شەرم"ەوە گۆڕابێ بۆ "ترس". دیارە دەتیوان ئەو دوو چەمکەدا پێوەندی نیزیک هەیە. [هەر لێرەدا بەراوردی دوو

وشەی "عەیب" و "هەیبەت" بکە دە زمانی عەرەبیدا کە وێ دەچێ پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان بە یەکەوە هەبێ]. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەی دیکە وەک ↑سامە same "پەناگا، پەسیو" و ↑جامە came.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "شەرم، شوورەیی" و "داپۆشین، شاردنەوە"، هەروەها بڕوانە وشەکانی "شوورەیی" و "راڤ[4]"].

**ساماڵ samal** *[ sāmāl ]* - "ئاسمانی بێ هەور": ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "یەکسان، یەکدەست، وەک هەڤ"ە و دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *sem- >*** "یەک". ئەم وشەیە بە شێوەی ساو[1] saw یش بەکار دەهێندرێ کە دیارە شێوەیەکی کەمێک گۆڕدراوی "ساماڵ"ە. مەبەست لە ساماڵ یان دروستتر بڵێین ئاسمانی ساماڵ (ساو) دە بنەڕەتدا ئەوەیە کە ئاسمان یەکدەست و یەکسانە واتا پەڵەهەوری تێدا بەدی ناکرێ. ئەم مانایە لە وشەی ↑ساماڵە samale کردندا باشتر دەردەکەوێ کە دەبێتە "خێشک لە شێوەرد دان "، واتا یەکدەست و هەموار کردنی شێوەرد. ئەو وشانەی خوارەوە دەبنە خزم دەگەڵ ساماڵ: samt (G.) "وێکڕا، بەیەکەوە"، sanft (G.)، semfti (OG.)، soft (E.) "نەرم و نیان" [کەسێک کە هەڵچوون و داچوونی نییە، کەسایەتییەکی تەراز و یەکسان]، samjan (Gt.) "خۆ رێکخستن"، sama "گونجان" و sämjas (Sw.) "رێک و تەبا بوون"، zusammen (G.) "پیکەوە، دەگەڵ یەک"، gesammt (G.) "تێکڕا"، semper (L.) "هەمیشە"، simplex (L.) "سادە"، homós (Gr.) "هاوبەش، هەمان، وەک یەک"، háma (Gr.) "پێکەوە، هاوکات"، sam (Rus.) "هەمان، خود"، samá-h (OIn.) "هەمان، وەک یەک، هەروا". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑هاواڵ hawal، ↑هەمان heman، ↑هەمین hemîn "ناوێکی ژنانە کە دەبێ بە مانای نەرم و نیان دە خوو و ئاکاردا بووبێ"، ↑هەمار hamar "رێک، تەخت" یان ↑هەموار hemwar "رێک، رێک و پێک، تەخت، یەکدەست". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑جڤین cıvîn "کۆم بوون، یەک گرتن"، ↑سەرجەم sercem "تێکڕا، بەیەکەوە"، ↑جەم cem [لەجەم بابێ خۆ] و↑ ئەنجومەن encumen "جڤات، یەکیەتی".

**ساماڵە samale** *[ sāmāla ]* - ساماڵە کردن واتا "خێشک لە شێوەرد دان ". دەچێتەوە سەر ↑ساماڵ samal و مەبەست ساف و تەخت کردنی هەردە.

**سامان1 saman** *[ sāmān ]* - "دارایی، ماڵ": سامان saman (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ sammeln (G.) "کۆ کردنەوە، وە سەر یەک نان" و مەبەست لە وشە کوردییەکە دەبێ ئەو داراییە بێ کە کۆم کراوەتەوە و وە سەریەک نراوە. دە فارسیدا وشەی "انباشتن" ئەم مانایە باش دەردەبڕێ کە خزمە دەگەڵ "ئەنبار" و مەبەست ئەنبار کردن [خەزن کردن]ی داراییە. وشەکە هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑جڤین cıvîn "کۆ بوونەوە" و ↑ساماڵ samal دا باس کراون.

**سامان2 saman** *[ sāmān ]* - "هێمنی، ئارامی". وشەکە دە کوردمادی و فارسیدا هەروەها بە مانای "نەزم و تەرتیب" بەکار دێ، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ سامان دان saman dan]. مانای بنەڕەتی وشەکە دەبێ "هێمنی و ئارامی" بێ. دواتر لەمەوە مانای "نەزم و تەرتیب" سەری هەڵداوە، چونکوو نەزم و تەرتیب لە ئەنجامی هێمنی و ئارامیدا دێتە ئاراوە، هەروەک چۆن بێنەزمی و بێ سەرەوبەرەییش دەگەڵ نائارامی و پەشێوی لە پێوەندیدایە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑هەمین hemîn "نەرم و نیان، لەسەرەخۆ".

**سامتی samtî** *[ sāmtī ]* - "جۆرێک دەزووی قایم و بریقەدار": سامتین samtîn یش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە Samt (G.) "مەخمەر" کە دەچێتەوە سەر samitum (L.) و لەویشەوە بۆ hexamitos (Gr.) "بەنی (ئاوریشمی) شەش لۆ".

**سامۆتک samotık** *[ sāmotık ]* - "رەشایی لە دوورەوە، تارمایی": کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑سێ se "سێبەر" و ↑سیا sîya "رەش". کەرتی "مۆتک" ڕەنگە پێوەندی بە ↑مۆتەکەوە moteke هەبێ. هەردوو

کەرتی وشەکە یەک مانا دەبەخشن و ئەم شێوازە لە دروست کردنی وشە، واتا لێکدانی دوو وشەی هاومانا، دۆخی جەخت کردن ساز دەکا.

سامە **same** [ *sāma* ] - "پەناگا، پەسیو": خزمە دەگەڵ ↑سام sam "ترس، هەیبەت"، سەر بە ریشەی < ***(s)kem-*** ***(IE.)*** "داپۆشین، شاردنەوە، لێهاڵاندن". وشەی ↑کەمین kemîn یش دەبێ هەر لەم ریشەوە هاتبێ. "سامە" و "کەمین" بەو شوێنانە گوتراون کە مرۆڤ خۆی تێیاندا حەشار دەدا و پەنا دەگرێ.

سامیتیل **samîtîl** [ *sāmītīl* ] - "بەن کەڵەوە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑سامتی samtî.

سان **san** [ *sān* ] - "ریز": [سان بەستن واتا ریز بەستن]. سان san (P.) "ڕەژەی سوپایی". خزمە دەگەڵ ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوەنووسان".

سانا **sana** [ *sānā* ] - "ئاسان":

1- لەوانەیە مانای ئەسڵی وشەکە "هێواش، بەشێنەیی" بووبێ. ئەگەر وابێ، دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شێنەیی şêneyî "هێواشی، لەسەرەخۆیی".

2- لەوانەشە هەمان ↑ئاسان asan بێ و ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتبێ.

ساناڵە **sanale** [ *sānāla* ] - "مشتاخ، جێی میوە هەڵخستن لەبەر تاو". دەشێ خزم بێ دەگەڵ sonnen (MG.) و sunnen (OG.) "هەڵخستن لەبەر تاو" و Sonne (G.) "خۆر"، سەر بە ریشەی < ****sauel-, *su-*** ***(IE.)*** "خۆر". وشەی ↑خۆر xor دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیە.

سانجوور **sancur** [ *sānjūr* ] - "دارێکە بە پەتەوە دەخرێتە ملی سەگ": ساجوور sacur یش دەگوترێ. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑سندم sındım "پێوەند".

ساو**1** **saw** [ *sāw* ] - "ئاسمانی بێ هەور، ساماڵ": زۆر جاریش دەگەڵ "تاو" دێ [تاو و ساو taw u saw]. شێوەیەکی دیکە لە ↑ساماڵ samal .

ساو**2** **saw** [ *sāw* ] - "1- تیژکراو بە هەسان 2- تیژایی دەمی تیغ": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn و ↑ساف² saf "رێک، لووس".

ساوا **sawa** [ *sāwā* ] - "زارۆکی شیرەخۆر": ساڤا sava ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زان zan و↑زارۆ[ک] zaro [k]. "ساوا" واتە "تازە لەدایکبوو". وشەکە دە بنەڕەتدا مانای "لەدایکبوو، بەدی هاتوو، بە دونیا هاتوو" دەدا. naiv (L.) "ساوا، لەدایکبوو" دە زمانی لاتینیشدا دەچێتەوە سەر natus (L.) "زان". [وشە لاتینییەکان خزمن دەگەڵ وشە کوردمادییەکان]. وشەی ↑ساویلکە sawîlke ش دەشێ خزم بێ دەگەڵ ساوا و دە بنەڕەتدا واتا "زارۆک ئاسا، منداڵانە".

ساوار **sawar** [ *sāwār* ] - " گەنمی بە دەستارکراو": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn [سوون sun] "ڕێخشاندن، ورد کردن، نەرم کردن".

ساواز **sawaz** [ *sāwāz* ] - "ڕوو هەڵماڵراو، بێشەرم": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn "سوون". ساواز واتا کەسێک کە ڕووی سواوەتەوە. "چەقاوەسوو"ش دەگوترێ.

ساواق **sawaq** [ *sāwāq* ] - "سەرمای زۆر": خزمە دەگەڵ هێندێک وشە وەک ↑سایقە sayıqe "بەستەڵەک"، ↑زاویتە zawîte "بای سارد"، ↑چایگ çayıg "سارد" و دواتر ↑*زستان zıstan*.

ساوانی **sawanî** [ *sāwānī* ] - "لامسە": ساوایی sawayî ش دەگوترێ. لە کرداری ↑ساوین sawîn "پێدا ماڵین، پێداخشاندن" وەرگیراوە.

[تێبینی: بەم پێودانە دەکرێ بۆ هەستەکانی دیکەش ئەم وشانە دابنرێن: بینایی، بیسایی، بۆنایی و چێژایی].

ساولغی **sawlığî** [ *sāwlıġī* ] - "پیساییەکی شل و چڵم ئاسا": ئەم وشەی لە ناوچەی مەهاباد بە کار دەهێنرێ، بەڵام دە فەرهەنگەکەی مامۆستا هەژاردا بەدی ناکرێ. ئەم وشەیە لەوانەیە ئاڵوگۆڕی

بەسەردا هاتبێ و دە ئەسڵدا سۆڵەگ *soleg* یان سۆڵک *solık** بووبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑شل şıl [ (P.)šol] و چەندین وشەی دیکە سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "تەر و لووس و لیچق بوون".

**ساوەساو sawesaw** [ *sāwasāw* ] - ئەم وشەیە وەک "سستی و تەمبەڵی" مانا کراوەتەوە، بەڵام مانای ئەسڵی وشەکە هێندێک جیاوازە و بریتییە لە "دواخستنی کار". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ aufschieben (G.) [auf-schieben] "دواخستن"ی کار. بنەوشەی ساو -saw ی کوردمادی خزمە دەگەڵ کرداری schieben (G.) "پاڵ نان، ڕادان، وە پێش خۆ دان، بۆ پێشەوە بردن". خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑شفرە şıfre "پێمەڕە، کەڵپی ئاژەڵ"،↑شەپلتە şepılte "بەفرماڵ، وەروەرە" و ↑شەپ *şep*. "ساوەساو کردن" واتا ئەنجام نەدانی کار لە کاتی خۆیدا و دواخستنی کارەکە، واتا ئەنجام دانی کارەکە بۆ داهاتوو "ڕەپاڵ دەندرێ".

**ساوەڵ sawel** [ *sāwal* ] - "شەڵتە، داری بەردکێشانی دووتایی کە دەخرێتە سەر پشتی بارەبەر": خزمە دەگەڵ یەکێک یان هەر دووکی ئەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑جالە[1] cale "دار یان تەختەی بە سەر ڕووباردا ڕایەڵ کراو بۆ پەڕینەوە"، Schwelle (G.)، swella (OG.)، sill (E.)، syll (Sw.) "دار یان تەختەی بەر دەرگا"، sélma (Gr.) "داری خشتکراو"، súolas (Lit.) "تەختی دانیشتن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی **> -(IE.) *s(u)el*** "داری خشتکراو، تەختە".

2- Säule (G.)، sūl (OG.)، zuil (Nl.)، syl (OE.)، sūl(a) (OIs.) "کۆڵەکە، ستوون" [دە بنەڕەتدا داری کۆڵەکە". ڕیشەی ئەم وشانە باس نەکراوە. بە باوەڕی من دەشێ لە پێوەندی دەگەڵ وشەکانی سەرتردا بن.

**ساوی sawî** [ *sāwī* ] - "چێشت و نان کە لە ماڵان کۆ دەکرێتەوە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زەواد zewad "نان و چێشت، پێخۆر".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە جڤین و خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "کۆ(م) بوونەوە، کۆ(م) کردنەوە".

**ساویر sawîr** [ *sāwīr* ] - "خەیاڵات، وەهم": هەروەها ↑سەهویر sehwîr هەی بە مانای "تارمایی، ڕەشکە و پێشکە". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ↑سێ se "سایە"، سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "سێبەر، تاریکایی". وێ دەچێ کەرتی "ویر" پێوەندی بە ↑بیر bîr ەوە هەبێ. ئەوسا مانای تێکرای وشەکە دەبێتە "بیر یان خەیاڵێکی سایەئاسا یان بیر و خەیاڵێکی ناروون، تاریک".

**ساویلکە sawîlke** [ *sāwīlka* ] - "کەسێک کە خاوە و زوو فریو دەخوا": لەوە ناچێ پێوەندی بە "ساو، ساف"ەوە هەبێ، بەڵکوو دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑ساوا sawa "زارۆکی شیرەخۆر". naiv دە زمانە ئەورووپییەکاندا بە مانای "ساویلکە" بەکار دێ کە دەچێتەوە سەر nativus (L.) "ساوا، لەدایک بوو، ڕسکاو" و natus (L.) "لە دایک بوون، ڕسکان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑زان zan دە زمانی کوردمادیدا.

**ساوین sawîn** [ *sāwīn* ] - "سوون، ڕێخشاندن، پێداماڵین، ساف کردن، ورد کردن، تیژ کردن": سایین sayîn و سوون sun یش دەگوترێ. سابیدن sābīdan و ساییدن sāyīdan (P.). خزمە دەگەڵ schaben (G.)، scaban (OG.) و (Gt.) "کڕاندن، تاشین"، shave (E.) "(ڕدێن) تاشین"، skava (Sw.) سەر بە ڕیشەی **< (IE.) * ska-bh-, *ske-bh*** "بە ئامرازێکی تیژ کارکردن، داتاشین، کڕاندن، ڕێخستن". گەلێک وشە دە زمانەکانی دیکەدا دەچنەوە سەر ئەم ڕیشەیە: skabeti (Lit.) "بڕین، کوتان"، skobti (Lit.) "هەڵکۆڵین"، scabere (L.) "کڕاندن، ڕێخستن، ڕێخشاندن"، scabies (L.) "خوروو، گڕۆیی"، Schuppe (G.) "کرێژ [توێژی لێکراوەی پێست]" و هتد. بەم جۆرە دەبینین کە وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "داتاشین، کڕاندن، ڕێخشاندن بە ئامرازی تیژ" بووە و پاشان چەند مانایەکی دیکەشی وەرگرتووە، وەک ساف کردن، پاک کردنەوە، کوتانەوە، ورد و نەرم کردن، تیژ کردن، هەڵکۆڵین و هتد. دە زمانی ئەڵمانی ناویندا وشەکە ئەم مانایانەی هەبووە: کڕاندن، پاک کردنەوە، هەڵکۆڵین، ساف کردن و ئەمەش دەگەڵ مانا

کوردمادییەکان یەک دەگرێتەوە. دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشە خزمایەتییان دەگەڵ "ساوین" هەیە، وەک ↑ساوارsawar یان شێوە کۆنترەکەی شڤار şıvar، ↑ساواز sawaz، ↑سواڵەت suwalet، ↑شفنە şıfne یان ↑شەپنە şepne "خێشک"، ↑شەپک şepık "تەختەی ساف و لووس کردنی ئامانی تازەی گڵین"، ↑شێوە şêwe و ↑ساپ sap یان ↑سواپ suwap، ↑سەپان sepan "دروێنەوان" و ↑شفتە2 şıfte 2 "یەکەم جار موو هەڵپاچین لە سەری زارۆک"، ↑ساف[2] saf "داتاشراو، لێک و لووس". دە زمانی فارسیدا هەروەها سپور sopūr (.P) هەیە بە مانای "گەسک لێدەر" و ئەم وشەیەش خزم دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

**ساهل sahıl** [ *sāhıl* ] - "جنۆکە": خزمە دەگەڵ ↑ساویر sawîr "خەیاڵات، وەهم" و ↑سەهویر sehwîr "تارمایی، رەشکە و پێشکە". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە ↑سێ se "سایە"وە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "تاریکایی".

**سایقە sayqe** [ *sāyqa* ] - "بەستەڵەک": خزمە دەگەڵ ↑چایگ çayıg "سارد و فێنک".

**سای(ە) 1 say(e)** [ *sāy(a)* ] - "سێبەر": شێوەیەکی دیکە لە ↑سێ[2] se.

**سایە2 saye 2** [ *sāya* ] - "ژەنگی ئاسن": لە کرداری سایین sayîn [↑ساوین sawîn] وەرگیراوە. مەبەست ئەو شتەیە کە بە "سایین" [ساوینەوە] لێ دەبێتەوە. لەباری چۆتیتی پێکهاتنی وشەکەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "کەرِوو" کە دەچێتەوە سەر کرداری "کرِاندن". ئەم وشەیە هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑زایە zaye [زایە بوون دەبنەرِەتدا واتا سوان، سواوە بوون].

**سایە3 saye 3** [ *sāya* ] - "باڵاپۆشی پێش ئاوەڵەی ژنانە": خزمە دەگەڵ ↑چادر çadır و دواجار ↑سێ[2] *se* "نیسێ، سێبەر".

**سایی sayî** [ *sāyī* ] - "ساو، ساماڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑ساو[1] saw "ساماڵ".

**سبات sıbat** [ *sıbāt* ] - "سەقامگرتوویی، بەرقەراری": وشەیەکی بە رەچەڵەک کوردمادییە، خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە مانای "سەخت، قایم" و هەروەها "نەجووڵ" دەبەخشن، وەک ↑سفت sıfıt "سەخت"، ↑سفن sıfın "بناخە"، ↑زۆپ zop "گاشەبەرد"، ↑زەب zeb "رەق، سەخت" و لەوانەشە ↑زفت zıfıt [قیر و زفت]. وشەکە دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە ثبات subāt (.Arb).

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "سەخت، پتەو" و "نەجووڵ" سەرنجی دوو وشەی "قورس و قایم" بدە. قورس خزمە دەگەڵ *قەرسان* "توند بوون، مەیین". "قایم "یش وشەیەکی عەرەبییە بە مانای "وەستاو". هەروەها سەرنجی ئەم دوو ریشە هیندوئەورووپییە بدە کە بە شیمانەیەکی بەهێز دەبێ خزمایەتییان هەبێ: -**staī* (.IE) "رەق بوون، سفت بوون، توند بوون" و -*st(h)ā* (.IE) "وەستان، وەستاندن". وشەی "ئاستەم" لە ریشەی یەکەم و "وەستان" لە ریشەی دووەمەوە هاتووە. ئاشکرایە شتی سەخت و پتەو شتێکە کە لە جێی خۆی وەستاوە و بە هاسانی نابزوێ، یان تراوێک کە دەیبەستێ و توند و پەیت دەبێ، دە هەمان کاتدا لە جووڵە *دەوەستێ*. هەروەها دوو وشەی *پەیت* "خەست، توند" و "پتەو"یش پێکەوە خزمن].

**سبەی sıbey** [ *sıbay* ] - "رۆژی دواتر": سبە sıbe، سبەینێ sıbeyne و سبیانی sıbyanî دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سپێدە sıpede و سپیدە sepīde (.P) "بەرەبەیان" [سپێدە شێوەیەکی کۆنترە لە ↑*سپی sıpî*]. مەبەست لە سبە(ی) دە راستیدا "بەرەبەیان" یاخود "بەیان"ی رۆژی دواتر بووە و ئاماژە بووە بە رۆژ هەڵاتن و رووناک بوونەوە. پاشان مانای وشەکە بە گشتی بووەتە "رۆژی دواتر". ئەم پێوەندییە دە وشەی "بەیانی"شدا دەبیندرێ. زۆر کەس وشەی "بەیانی" بە مانای "سبە"ش بەکار دێنێ و دە بنەرِەتدا مەبەستەکە بەیانی رۆژی دواترە. دە زمانی فارسیدا وشەی seba (.P) سەرنج رادەکێشێ و ئەم وشەیە دە هۆنراوە کۆنەکاندا دەگەڵ "باد" دێ و باد صبا bād e sabā بە مانای "شنەبا" لێک دەدرێتەوە. بە ورد بوونەوە لە بابەتەکە بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست دە بنەرِەتدا دەبێ "بای بەرەبەیان" بووبێ و بەم جۆرە وشە فارسییەکە دەگەڵ "سبە"ی کوردمادی یەک دەگرێتەوە. هەروەها صبح subħ (.P) دەچێتەوە

سەر sabāh (Arb.) "بەیانی". ئەم وشەیە دە زمانی تورکیشدا بەکار دەهێنرێ و ریشەکەی بۆ وشە کوردمادییەکە دەگەڕێتەوە. سەبارەت بە وشەی سبەینی sıbeyne یان سبیانی sıbyane پێ دەچێ کە ئەم وشانە لە دوو کەرتی [سبە + بەیانی sıbe + beyanî] پێک هاتبن، واتا وشەکە "سبە(ی) بەیانی" بووبێ و پاشان گۆڕدرابێ بە "سبەینێ".

**سپ sıp** - "تەواو، بێ زیاد و کەم": شێوەیەکی دیکەیە لە زاڤ zaf و ↑زۆرا zor 1 "فرە، گەلێک".

**سپا sıpa** *[ sıpā ]* - "لەشکر": ↑سوپا supa ش دەگوترێ.

**سپاتە spate** *[ spāta ]* - دەگەڵ "سەڵت" دێ [سەڵت و سپاتە selt u spate واتا رەبەن، بێ ژن و ماڵ]. سۆبا soba ش دەگوترێ. لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑زڤرین zıvrîn [سووڕان] و مەبەست کەسێک بێ کە بەم لا و ئەو لادا دەخولێتەوە.

**سپاردن sıpardın** *[ sıpārdın ]* - "بە ئەمانەت دانان، ئەرکداری پاراستن کردن": ↑ئەسپاردن espardın یش دەگوترێ [پێشگری ئە + سپاردن e + spardın]. سپردن sepordan (P.). خزمە دەگەڵ ↑سپر sıper و ↑ئەسپەرە espere کە ئەوانیش جۆرێک لە پاراستن دەستەبەر دەکەن.

**سپاس sıpas** *[ sıpās ]* - "تەشەککور": سوپاس supas یش دەگوترێ. sepās (P.). ئەم وشەیە دە زمانی رووسیشدا بەکار دەهێنرێ. وشەکە شێوەیەکی زۆر نیزیکی هەیە لەو وشانەی کە باس لە چەمکی "زۆر و زەوەندی" و "هەراوی و بەربڵاوی" دەکەن، وەک ↑*زۆر zor*، سپا sıpa [↑سوپا supa]، ↑سپایی sıpay ["ئەسپایی" واتا لەسەرەخۆیی، درێژ بوونەوەی کات]، ↑سفرە sıfra و هتد. دە هێندێک شێوەزاری کوردمادیدا بەرانبەر بەخشینی شتێک یان کردنی کارێک دەگوترێ "بە زیاد بێ" واتا بۆ بەخشەر [بکەر] ئارەزوو دەکرێ کە ئەو شتەی بەخشیویەتی [کردوویەتی] بە زۆر و زەوەندی هەبێ یان بیکا. لێرەوە بیر بۆ ئەوە دەچێ کە وشەی "سپاس" دە بنەڕەتدا هەر ئەو مانایە بگەیەنێ و ئارەزووی زۆر و زەوەندی بۆ لایەنی بەرانبەر لەخۆ بگرێ.

**سپایی sıpayî** *[ sıpāyī ]* - "هێواشی، لەسەرەخۆیی": ↑ئەسپایی espayî یش دەگوترێ [e + spayî]. دە زمانی ئەڵمانیدا spät (G.) و دە هولەندیدا spa(de) (Nl.) هەیە بەمانای "درەنگ". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *sp(h)ē(i)- >* "لەبەر یەک کشانەوە، هەراو بوونەوە، درێژ بوونەوە". [هەرلێرەدا شیاوی باسە کە وشەی "درەنگ" دەگەڵ "درێژ" لە یەک ریشەوە هاتوون و مەبەست لە درەنگ بوون و درەنگ کردن دە راستیدا بەسەر چوونی کاتێکی زۆر واتا درێژ بوونەوەی کاتە]. هەر ئەم دۆخە لە وشەی "سپایی" [ئەسپایی] یش دا بەدی دەکرێ. کاتێک کارێک بە ئەسپایی دەکرێ، دە راستیدا کارەکە کاتێکی زۆرتر و درێژتر دەخایەنێ و درەنگتر بە ئەنجام دەگا. بەم جۆرە دەبینین کە وشەکە لەبەر یەک کشانەوە و درێژ بوونەوەی کات بەیان دەکا. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە ئاماژە بە بەربڵاوی، زۆری و فرەیی و دوور و درێژی دەکەن و دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زاف zaf و↑ *زۆر zor*، ↑سوپا supa "لەشکر، قۆشەن" و ↑سفرە sıfre.

**سپر sıpır** - "هەڵۆ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Sperling (G.)، sparo (OG.)، sparwa (Gt.)، sparrow (E.)، sparv (Sw.) "چۆلەکە، چڤیک"، sparásion (Gr.) "مەلی چۆلەکەئاسا". وشەی ↑چۆلەکە çoleke یان ↑چڤیک çıvîk خزمن دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە و هێندێک ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە.

**سپڵ sıpıl** - "ئەندامێکی هەناو": پێوەندی هەیە بە splen (L.) و (Gr.) "سپڵ".

**سپڵە sıple** *[ sıpla ]* - "پست، نزم کردار": سفلە sefle یان sofle (P.). خزمە دەگەڵ هەموو ئەو وشانەی لە ژێر ↑کون kun دا شی کراونەوە و بە تایبەتی نیزیکە لە zufr (Pl.) و jafra (Av.) "قووڵ". ئەم وشانەی دوایی دە زمانی فارسی نوێدا گۆڕاون و بوونە ژرف žarf (P.) "قووڵ". بەم جۆرە دەردەکەوێ کە ئەو وشانە دەچنەوە سەر وشەیەکی بنەڕەتی بە مانای "قووڵ، قووڵکە" و دواتر لەمەوە چەندین مانای

نیزیك بە یەكدی و یەك لەوانەش مانای "نزم كردار" سەریان هەڵداوە. وشەكە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە سفلة sifla ‎(Arb.)‎.

[تێبینی: بە زمانی ئەڵمانی "سپڵە، پەست" دەبێتە niederträchtig كە پێك هاتووە لە دوو كەرتی nieder "نزم، نەوی، پەست، خوارەوە" و trachten "تێكۆشان، شوێن كەوتن". هەروەها وشەی "پەست" دە كوردمادیدا مانای "نزم كردار" دەدا و دە فارسیدا جگە لەم مانایە، بە مانای زەوی "رۆچوو، دە قووڵدا"شدا بەكار دەهێنرێ].

**سپڵۆ sıplo** - "گەماڵ، سەگ": سپەڕ sıper یش دەگوترێ. شێوەیەكی دیكەیە لە ↑گەماڵ gemal.

**سپەر** *[ sıpar ]* **sıper** - "1- چەپەر، سەنگەر، بەربەست 2- مەتاڵی شەڕ": سپر separ ‎(P.)‎. خزمە دەگەڵ sperren ‎(G.)‎ و ‎(Nl.)‎ و spärra ‎(Sw.)‎ "بەربەست كردن". مانای بنەڕەتی وشەكان "داخستن بە دار یان دارۆكەیەك " و هەروها "سینگ و دار داكوتان" بووە و دواتر مانای گشتی "بەربەست كردن، داخستن"ی وەرگرتووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ‎< *(s)per- ‎(IE.)‎‎ "پللار، دارۆكە، سینگ". خزمە دەگەڵ ↑ئەسپەرە espere و ↑چەپەر çeper.

**سپەهی** *[ sıpahī ]* **sıpehî** - "جوان، خۆشیك، پەسەند": زیبا zîbā ‎(P.)‎. دە زمانی فارسیدا هەروەها شیوا šīvā ‎(P.)‎ هەیە بە مانای "خۆش، رەوان" [بۆ "وتار و نووسراو" بەكار دێ]. دە كوردمادیدا ↑شەپاڵ şepal یش بەكار دێ بە مانای "جوان، خۆشیك". دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سپی sıpî سەر بە ریشەیەك بە مانای "رووناكی، درەوشانەوە". دە كوردەواریدا زۆرجار بۆ كیژی جوان دەبێژن: "دەڵێی مانگە دەدرەوشێتەوە".

**سپی** *[ sıpī ]* **sıpî** - "رەنگی دژبەری رەش": سفید sefīd ‎(P.)‎ [كۆنتر: سپید sepīd]. خزمە دەگەڵ svēta ‎(OIn.)‎ "سپی"، svet ‎(Rus.)‎ "رووناكی"، šviesti ‎(Lit.)‎ "دەشەوتێ، دەئاییسێ"، سەر بە ریشەی ‎< *kueit- ‎(IE.)‎‎ "سپی بوون، رووناك بوون، بریقانەوە". دە زمانە ژێرمەنییەكاندا فۆتیمی سەرەتای وشەكە سواوەتەوە و وشەكە بووەتە weiß ‎(G.)‎، wiz ‎(OG.)‎، wheit ‎(E.)‎، vit ‎(Sw.)‎ "سپی". وشەكانی albus ‎(L.)‎ "سپی" و بیاض beyza ‎(Arb.)‎ "سپییەتی" دەبێ پێوەندییان بە وشەكانی سەرەوە هەبێ. دە زمانی كوردمادیدا گەلێك وشە دەبنە خزم دەگەڵ "سپی"، بۆ وێنە ↑سووتان sutan/ شەوتین şewtîn،↑سپێدە sıpede "بەرەبەیان"، ↑سبەی sıbey و هتد.

**سپین** *[ sıpīn ]* **sıpîn** - "تیغە، تیوان، مابەین": خزمە دەگەڵ ↑چەپەر çeper و ↑سپەر *sıper*.

**سپێدە** *[ sıpeda ]* **sıpede** - "بەرەبەیان": سپیده sepīde ‎(P.)‎. شێوەی كۆنتری ↑سپی sıpî و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "هایسان، درەوشانەوە، رووناك بوون(ەوە)".

**ستار** *[ sıtār ]* **sıtar** - "ئارام": ستار گرتن واتا ئارام گرتن. بڕوانە ↑ژێر jîr "ئارام، بێدەنگ" [ژێر بوونەوە واتا ئارام بوونەوە].

**-ستان** *[ sıtān ]* **-stan** - "پاشگری شوێن و وڵات": [كوردستان، كوێستان، دارستان ...]. ستان -stān ‎(P.)‎ بە هەمان مانا و استان ostān ‎(P.)‎ "پارێزگا". خزمە دەگەڵ Stadt ‎(G.)‎ "شار" و Statt ‎(G.)‎ "شوێن، مەڵبەند، جێگە و پێگە"، stat ‎(OG.)‎، stede ‎(OE.)‎ "شوێن، جێگە" و state ‎(E.)‎ "پارێزگا، ناوچەی ئیداری، حكوومەت" و sthana ‎(OIn.)‎ "شوێن، مەڵبەند"، Staat ‎(G.)‎ "وڵات، حكوومەت"، سەر بە ریشەی ‎< *st(h)a- ‎(IE.)‎‎ "وەستان". بەم جۆرە وشەكە دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە وەستان و گیرسانەوە لە شوێنێك كردووە. دە زمانی ئەڵمانیشدا وشەكە وەك پاشگر دەگەڵ ناوی چەندین شار دێ وەك Darmstadt، Lippstadt، Neustadt و هتد. هەروەها شیاوی باسە كە دە زمانی ئینگلیزیدا وشەی state بە مانای "بار و دۆخ"یش بەكاردێ و ئەمەش نیزیكە لە بەكارهێنانی پاشگرەكە دە زمانی كوردمادیدا وەك پاشگری "بار و دۆخ" بۆ وێنە دە وشەی "زەیستان"دا. پاشگرەكە هەروەها دە هەردوو زمانی كورد و فارسیدا وەك

پاشگری "کات و سات "یش بە کار دێ، بۆ وێنە دە وشەی "زستان"دا بە مانای "وەرزی سەرما و بەستەڵەک" و "تابستان" دە فارسیدا "هاوین، وەرزی تاو و گەرما".

[تێبینی:

**ستاندن sıtandın** *[ sıtāndın ]* - "وەرگرتن، بە دەست هێنان": هەستاندن (he)standın یش دە گوترێ. ستاندن setāndan (P.). بنەوشەی ست -sıt دەشێ خزم بێ دەگەڵ get (E.)، geta (ON.) "بەدەست هێنان"، سەر بە ریشەی **< -ghed *(IE.)** "ستاندن". khandanein (Gr.) "گرتن" لەم ریشەوە هاتووە.

**ستانگ sıtang** *[ sıtāng ]* - "ژەنگەسوورە": خزمە دەگەڵ ↑سینگ sîng "داری داکوتان" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بەمانای "تێهەڵچەقین".

**ستر1 sıtır** - "پەیژە، تیردیوان": خزمە دەگەڵ Gatter (G.) "پەرژین، نەردە"، Gitter (G.) "تێکبەست". ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە تێکچرژان و یەکانگیر بوونی پاژگەلی دار یان ئاسن و شتی تر کە تێکرا پێکهاتەیەکی تێکچرژاو و تێکخراو دروست دەکەن، وەک نەردە، پەرژین، داربەست و هتد. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑خاس xas "باش".

**ستر2 sıtır** - "(دا)پۆشینی نهێنی": [سترم کە، خوا سترت بکا]. خزمە دەگەڵ ↑چادر çadır و دواجار ↑سێ se"سایە، سێبەر". وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە ستر sitr (Arb.) "داپۆشین".

**ستران sıtran** *[ sıtrān ]* - "گۆرانی": ئەستران estıran یش دەگوترێ. ترانە tarāne (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑تر[1] tır "دەنگی توند لە کاتی با لێبوونەوە"دا، [وشەی "تر" دە بنەڕەتدا مانای ئەمرۆیی نەبووە، بەڵکوو بە مانای "دەنگ" و هەرای توند" بووە]. کرداری ئەم وشەیە دەبێتە ستراندن sıtrandın یان سترین sıtrîn "گۆرانی گوتن".

[تێبینی: وشەی سروودن sorūdan (P.) لەوە دەچێ پێوەندی بەم وشانەوە نەبێ، بەڵکوو ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑چرین çırîn - گۆرانییەکی چڕی].

**ستراندن sıtrandın** *[ sıtrāndın ]* - "شێلانی هەویر": سترین sıtrîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ stören (G.) "موزاحیم بوون"، stōran (OG.)، storen (Nl.) "تێکەڵ کردن، شێواندن"، stir (E.) "تێکوەردان"، styrr (OIs.) "ئاژاوە"، Sturm (G.) "گێژەڵووله، تۆفان". وا شیمانە دەکرێ ئەم وشە ژێرمەنییانە بچنەوە سەر ریشەی **< -tuer* (IE.)** "سووڕان، خولانەوە". لە وانەیە ↑تەوەر tewer "میحوەر" یش پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ.

**سترۆ sıtro** - "شاخی ئاژەڵ": سترەه sıtreh ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ستری sıtrî "دڕک".

**سترە1 sıtıre** - "جۆرێک کەوای کورت کە لەسەر جلیقە دەیپۆشن": خزمە دەگەڵ ↑ستر2 sıtır "(دا)پۆشینی نهێنی" و↑چادر çadır و دواجار ↑سێ se "سایە، سێبەر".

**ستری sıtrî** *[ sıtrī ]* - "دڕک": هەروەها ↑سترۆ sıtro یان سترەه sıtreh هەیە بە مانای "شاخی ئاژەڵ". [لە باری پێوەندی مانای وشەکان بەیەکدی هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "شاخە" و "شاخ" دە زمانی فارسیدا، یەکەم بە مانای "لقی دار" و دووەمیان بە مانای "شاخ، قۆچی ئاژەڵ"]. وشەکە خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی ئەڵمانی وەک starren (G.) "رەق بوون"، straub (OG.) "قیت (وەستاو)، زەق"، Strauch (G.) "پنچک"، straff (G.) "توند، شەق، لەبەر یەک کێشراوە"، sterben (G.) "مردن" [دە بنەڕەتدا: رەق و هیشک هەڵاتن] و هتد. ئەم وشانە خزمن دە زمانی کوردمادیدا دەگەڵ ↑ئەستوور estur و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**ستوون sıtun** *[ sıtūn ]* - "کۆڵەکە": ئەستوون estun یش دەگوترێ. ستون setūn (P.). خزمە دەگەڵ stollo (OG.)، stele (Gr.) "ستوون"، سەر بە ریشەی **< -st(h)a* (IE.)** "وەستان، راوەستاندن، راگرتن". خزمە دەگەڵ ستۆ یان ↑ئەستۆ esto "مل". ئەستۆ دە راستیدا ستووتێکە سەری لەسەر راگیراوە، بەوتەی دیکە سەر لەسەری وەستاوە. خزمە دەگەل ↑وەستان westan و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**ستۆ sto** *[ sto ]* -"مل": ↑ئەستۆ esto.

سته **sıte** [ *sıta* ] - "1- بەردی ئاگرپژێن 2- ئاستێک کە لە بەردئەسێ دەدرێ": بڕوانە ↑ئەستێ este [sıtê+e].

ستەم **sıtem** [ *sıtam* ] - "زۆر، بێداد": خزمە دەگەڵ ↑ئاستەم astem "سەخت، دژوار، زەحمەت". ستەم [زوڵم و زۆر] و ئاستەم دە بنەڕەتدا هەر یەک وشە بوون و پێوەندی ماناکانی ئەم دوو وشەیە لەم دوو رستەیەی خوارووەدا بە باشی دەردەکەوەی: 1- بە زۆری دەستم گەیشتە میچەکە 2- بە ئاستەم دەستم گەیشتە میچەکە.

ستیرمە **stîrme** [ *stīrma* ] - "سەرایەت": [بڵاو کردنەوە و گرتنەوەی نەخۆشی]. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑تیرێژ tîrej "تیشک"دا باس کراون.

ستین **sıtîn** [ *sıtīn* ] - "توانایی، هێز": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ستە sıte "بەرد"، ↑ستەم sıtem "زۆر، بێداد"، [دە بنەڕەتدا: سەختی، دژواری]، ↑ئاستەم astem "سەخت، دژوار"، سەر بە ریشەی **< *staī-** ***(IE.)*** "رەق بوون، سفت بوون، توند بون".

[تێبینی: لە نێوان دوو چەمکی "رەق، سەخت" و "بەهێز"دا پێوەندی نیزیک هەیە، بۆ وێنە وشەی stark "بەهێز" دە زمانی ئەڵمانیدا خزمە دەگەڵ "ئەستوور"ی کوردمادی و لە ریشەیەکەوە دێ بە مانای "رەق و سفت بوون"، هەروەها "زووخ" بە مانای "هێز و توانایی" خزمە دەگەڵ "سەخت"].

ستیر(ک) **ster(k) 1** [ *ster(k)* ] - "گۆڵاو": ↑ئەستیرک[1] esterk یش دەگوترێ [e-sterk].

ستیر(ک) **ster(k) 2** [ *ster(k)* ] - بڕوانە ↑ئەستیرە estere [e-stere].

ستیر(ک) **ster(k)** [ *ster(k)* ] - "هەرزاڵ": ↑ئەستیرک[2] esterk.

ستێرپژیان **stêrpıjyan** [ *sterpıžyān* ] - "راخوشینی ئەستێرە": بنەوشەی ستێرپ sterp- شێوەیەکی کۆنترە لە وشەی ↑تریفە trîfe "تیشکی مانگ و ئەستێرە" و خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑ئە*ستێرە estere*، ↑ئەستڕین estırîn، ↑درەوشان drewşan و هتد. دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی streifen (G.) "لێخشاندن، رێخشاندن" دەبێتە خزم دەگەڵ ئەم وشانە.

ستێور **stewır** [ stewır ] - "نازا، بێبەر": ستەور stewır و ↑ئەستێور estewır و ئەستەویر estewîr یش دەگوترێن. سترون setarwan (P.). خزمە دەگەڵ Sterke (G.) "مانگای جەوان (کە هێشتا نەزاوە)"، stairo (Gt.) "نازا، ستێور"، stari (OIn.) "مانگای شیر نەدەر"، سەر بە ریشەی **< *ster-** ***(IE.)*** "رەق، سفت". لە لایەکی دیکەوە دە زمانی لاتینیدا sterilis (L.) "ستێور، نازا، بێبەر" هەبووە. وشەی steril دە زمانە ئەورووپاییەکاندا بە مانای "پاک کراوە لە ویروس و باکتری" پێوەندی بەم وشە لاتینیە هەیە و دەبێ دە بنەڕەتدا مەبەست "بێبەر" کردن و ستێور کردنی باکترییەکان بووبێ. لەوانەیە ئەم وشە لاتینیە لەو ریشەیەی سەرەوە هاتبێ.

سخ **sıx** - "1- تەنراوی سفت 2- چڕ و پڕ": خزمە دەگەڵ ↑سەخت sexıt.

سخار **sıxar** [ *sıxār* ] - "زەوی نەکێڵ": سخرە sıxre ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax "بەرد" و دواجار دەگەڵ↑ سەخت sexıt.

سختیان **sıxtîyan** [ *sıxtīyān* ] - "چەرمی ئەستووری دەبباغی کراو": سەختیان sextîyan و سەخەری sexerî یش دەگوترێ. ساغری sāġarī (P.). خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext و گەلێک وشە کە لەژێر ↑سە*ق seq* دا باس کراون. هەروەها خزمە دەگەڵ ↑شەکە şeke "کڵاوی پێستەمەڕ".

سدە **sıde** [ *sıda* ] - "رایەڵ": خزمە دەگەڵ Saite (G.) "ژێ، تار"، seita (OG.)، sada (OE.)، seidr (OIs.) "بەن، تاڵ، ریس". خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑ژێ je و ↑شەدە şede سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەستن، بەستنەوە".

سڕ **sır 1** - "تەزیو": دە فارسیدا کرخ (ت) karax(t) (P.). ئەم وشانە خزمن دەگەڵ چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا وەک ↑کڕ *kır*، کورک kurk، قورس qurs و هتد. ئەم وشانە ئاماژە دەکەن بە دۆخی

"بێجووڵە بوون، لە جووڵە کەوتن" و دوا جار دەبنە خزم دەگەڵ ↑خار xar "سەخت". وەک ئاشکرایە پێوەندی نیزیک هەیە لەتیوان چەمکی "سەختی" و "بێجووڵەیی"دا، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ "قورس و قایم". ↑سرەوتن sırewtın "ئارام و قەرار گرتن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.
[تیبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا steif (.G) "رەق، رەقبوو" هەروەها بە مانا "سڕ، تەزیو" بەکار دەهێنرێ. ئەمە لەوەڕا هاتووە کە کاتێک شوێنێکی لەش سڕ دەبێ و لە جووڵە دەکەوێ [جووڵەی تێدا هەست پێ ناکرێ]، مرۆڤ هەست بەوە دەکا کە ئەو شۆینە یان ئەو ئەندامە رەق و تەقە. دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها taub (.G) بە مانای "کەڕ" بە کار دێ. ئەم ↑کەڕ ker ەش پێوەندی هەیە بە وشەکانی سەرەوە و مەبەست "سەخت بوون و قورس بوون"ی گوێیە [گوێی گران بووە]. سەرنجراکێش ئەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی تەزین یان سڕ بوون لە وشەکەی سەرترەوە هاتووە و دەبێتە betäuben (.G) "سڕ کردن، تەزاندن". هەمدیسان سەرنجراکێش ئەوەیەکە ↑تەپ tep دە زمانی کوردمادیدا مانای "قورس، بێجووڵە" دەبەخشێ، بۆ وێنە کاتێک دەگوترێ فڵانکەس تەپە یان تەپلۆسە [لەش گرانە]، یان خۆی تەپ بە عەرز دادا، واتا خۆی بە سەختی، بە قورسی خستە سەر عەرز].
**سڕ2 sır 2** - "بزاڤ، توند و تۆڵی": [سرا تە قەمری].
1- جێی بەراورد کردنە دەگەڵ ↑سڕ1 sır 1 "تەزیو" و ↑گوڕ gur. مانای بنەڕەتی ئەم وشانە "سەخت"ە و ئاماژە بە "هێز و توان" و "قورس و قایم" بوون دەکەن.
2- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑سروە sırwe.
**سرپە sırpe** [ *sırpa* ] - "چپە، سرتە": شێوەیەکی کۆنتر لە وشەی ↑چپە çıpe.
**سرت sırt** - "1- دڕک، چقڵ 2- زبر 3- رەق، سەخت 4- رژد و هەزاربەهەزار 5- ئازار 6- نەداری و دەستەنگی": ئەگەر هەموو ئەم مانایانە دەگەڵ یەکتر هەڵسەنگێنین و چەمکێکی هاوبەشیان لێ هەڵێنجین، دەبینین کە ئەو چەمکە بریتییە لە "سەخت یان سەختی". لەم بارەوە دەتوانین بەراوردی بکەین دەگەڵ چەند وشەی وەک "ستەم"، "ئاستەم" و "ئاستەنگ" کە ئەوانیش دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "رەق و سەخت بوون". هەر بۆیە "سرت"یش دەبێ لە ریشەکەوە هاتبێ بە مانای "سەخت بوون". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑سڕ² sır²، ↑کڕ kır، ↑خار *xar* و ↑زەرد² zerd² [ماه و زەرد] و هتد.
**سرتە sırte** [ *sırta* ] - "سرپە، چپە": سرت sırt یش دەگوترێ. ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە چەندین وشە دە زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا کە مانای "قسە، گێڕانەوە، تەگبیر، راوێژ، تێهزرین" دەگەیەنن. بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ↑راشەن raşen "تۆیشووی رێگا".
[تیبینی: دە زمانی کوردمادیدا دەگوترێ "سرتە و خورتە" یان "سرت و خورت". وشەی خورت یان خورتە شێوەیەکی دیکە لە ↑ورتە wırte. هەر دووکی ئەم وشانە دە کۆندا بە مانای "قسە" بوون].
**سرد sırd** - "تازەگوڵی خەلە": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑زۆرەت zoret "گەنمەشامی".
**سرشت sırışt** [ *sırışt* ] - "خۆزا، خۆکرد، خۆرسک": سروشت sıruşt یش دەگوترێ. سرشت sereşt (.P). ئەم وشە فارسییە دەچێتەوە سەر سرشتن sêreşten (.P) بە مانای "تێکەڵ کردن، هەڵشێلان، تێکوەردان". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑هارووژان harujan. مانای "هارووژان" دە ئەسڵدا "تێکوەردان" بووە. هەروەها بڕوانە ↑سرنجە sırınce "زیخ و رەڵمی لێکدراو".
[تیبینی: وشەکانی machen (.G) و make (.E) "کردن، دروست کردن" دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵشێلان". هۆزە ژێرمەنییەکان ئەم کردارەیان سەرەتا بە مانای هەڵشێلانی قوڕ بۆ دروست کردنی خانوو بەکار هێناوە. لەمەوە دواتر مانای "دروست کردن، بینا کردن، بەرپا کردن" سەری هەڵداوە و دواجار مانای وشەکە بووەتە "کردن". وێ دەچێ سەبارەت بە وشەی "سروشت"یش رەوتێکی نیزیک بەمە

لەئارادا بووبێ، واتا لە مانای "هەڵشێلدراو، تێکوەردراو" مانای "دروست کراو" سەری هەڵدابێ و لەمەشەوە مانای "تەبیعەت"، وەک "دروستکراو" لە لایەن هێزی سەرەوە].

**سرشک sırışk** [ *sırıšk* ] - "رۆندک، فرمێسک": پێک هاتووە لە دوو کەرتی سر + شک sır + (e)şk. کەرتی یەکەم هەمان ↑ئەسر(ین) esr(în) ە. کەرتی دووهەم دە فارسیدا اشک ašk (.P) ە و دە وشەی ↑فرمێسک fırmêskیشدا دە بینرێ [fırm-esk].

[تێبینی: وەک دەبینین وشەی "سرشک" خۆی لە دوو وشە پێک هاتووە کە هەدووکی مانای "فرمێسک" دەبەخشێ. ئەمە جۆرێکە لە وشەسازی دە زمانی کوردمادیدا بە مەبەستی جەخت کردن و هێز و گورێکی زۆرتر بەخشین بە مانای وشەیەک. ئەم وشەیە زۆرتر لە هۆنراوە و پەخشانی هونەرمەندانەدا بەکار دێ و بۆ ئەوەیە کە نووسەر بتوانێ هەست و سۆزی بەتینی خۆی باشتر دەرببڕی].

**سرک sırk** ـ "رەوەک": سرگ sırg یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ یاخود شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سڵ sıl.

**سرگون sırgûn** [ *sırgūn* ] - "دوورخرانەوە، تەبعید". دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا هەروەها سوورگوم surgum هاتووە بە مانای "وندابووی بێسەروشوێن". دە ئەسڵدا ئەم دوو وشەیە دەبێ هەر یەک وشە بن و دەبێ ئەوەی یەکەمیان شێوەی راستی وشەکە بێ. لەبەر ئەوەی دە وشەی "سرگوون"دا کەرتی "گون" شێوەکەی لە "گوم" دەچێ و هەروەها لەتیوان "دوورخرانەوە" و "گوم بووندا" جۆرێک لە پێوەندی لە ئارادایە، ئەو دوو وشەیە تێکەڵ بە یەکدی کراون و وشەکە کراوەتە "سوورگوم". "سرگون" خزمە دەگەڵ ↑سرک sırk یان سرگ sırg بە مانای "رەوەک، قوشقی" [لێرەدا بە مانای "رەوێنراو، تارێنراو]. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "باز دان، هەڵبەزین".

[تێبینی: دەتیوان دوو چەمکی "باز دان، هەڵبەزین" و "دوور بوونەوە، رۆیشتن، ون بوون" پێوەندی نیزیک هەیە. بۆ وێنە وشەکانی "پەرەوازە"، "لانەواز"، "بازرە"، "بزر"، "رێباز" و هیتر خزمن دەگەڵ "باز(د)". هەروەها سەرنج بدە کە وشەی "قوشقی" واتا دەرپەڕین لە ترسان خزمە دەگەڵ "کۆچ" واتا رۆیشتن و دووربوونەوە. کەوابوو "سرگوون" هەمان "بازرە بوون، قوشقی بوون یان کۆچ کردنە"].

**سرکە sırke** [ *sırka* ] - "ترشاوی میوە": خزمە دەگەڵ sauer (.G)، sūr (.OG)، zuur (.Nl)، sour (.E)، sur (.Sw) "ترش" و هەروەها ↑سوێر suwer [سۆر sor] یش دەگوترێ.

**سرمە sırme** [ *sırma* ] - "گەردانە لە زێڕ یان مرواری": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کرمەک kırmek.

**سرنج sırınc** [ *sırınj* ] - "ورد بوونەوە، بیر لێکردنەوە": ↑سەرنج serınc یش دەگوترێ

**سرنجە sırınce** [ *sırınja* ] - "زیخ و رەڵمی لێکدراو": خزمە دەگەڵ ↑سرشت sırışt "خۆرسک" و ↑*هورووژان hurujan* [هرووژان hırujan، هارووژان harujan]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تێکەڵ کردن، تێکوەردان، لێکدان". بەراوردی بکە دەگەڵ srīnati (.OIn) "تێکەڵ دەکا" و kerannynai (.Gr) "لێکدان و تێکەڵ کردن". ئەم وشانەش لە هەمان ریشەوە دێن.

**سرنی sırnî** [ *sırnī* ] - "عارەبەی کەڵان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Karre(n) (.G)، karra (.OG)، Kar (.Nl) "عارەبە"، car (.E) "عارەبانە، ترۆمبێل". ئەم وشە ژێرمەنییانە بردراونەوە سەر carra (.L) کە ئەمەش خۆی پێوەندی هەیە بە کرداری curere (.L) "را کردن".

**سروە sırwe** [ *sırwa* ] - "شنەبا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Strom (.G) "جەریان"، sravati (.OIn) "جەریانی هەیە، جاری دەبێ"، sruaim (.OIr) "چەم"، serum (.L) "تراو"، سەر بە ریشەی ***sreu-*** **(.IE)** "جاری بوون، جەریان". وشەی جریان jaryān (.Arb) دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. هەروەها لەوانەیە ↑زریان zıryan "بای سارد" پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**سروود srud** [ *srūd* ] - "هەڵبەست یان گۆرانی رەزمی": سرود sorūd (.P) و سرودن sorūdan (.P) "شێعر خوێندنەوە (بە گۆرانی)". خزمە دەگەڵ ↑چرین çırîn.

**سرەواندن srewandın** *[ srawāndın ]* - "لێدان، کوتان": [تێ سرەواندن]، خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە لە ژێر ↑ترپان tırpan دا باس کراون. ئەم وشانە، هەر یەکەی بە جۆرێک مانای "لێدان، کوتان" دەبەخشن.

**سرەوتن sırewtın** *[ sırawtın ]* - "ئارام گرتن": سرەفتن sıreftın یش دەگوترێ. پێوەندی هەیە بە هێندێک وشەی وەک ↑سڕ1 sır "تەزیو"، ↑کڕ *kır* [قڕ و ڤپ]، ↑ئۆقرە oqre [o-qıre] و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون، توند بوون، لە جووڵە وەستان".

[تیبینی: لەباری وشەسازییەوە "سرەوتن" بەرهەڤ بکە دەگەڵ "بزاوتن"، "پەرتاوتن"، "پشاوتن" و هتد. ئەم کردارانە پێک هاتوون لە بنجی وشەکە + aw / ew (کۆنتر af یان ab ؟) + تن].

**سریلە1 sırîle 1** *[ sırīla ]* - "ناوی زیلەیەکە": سیسرە sîsre و سیسرک sîsırk یش دەگوترێ. جیرجیرەک jīrjīrak (P.). خزمە دەگەڵ Grille (G.) و grillus (L.) "قالۆنچە". ریشەی وشەکە لاسا کردنەوەی دەنگە.

**سریلە2 sırîle 2** *[ sırīla ]* - "مەلێکی بچووکی جوان": خزمە دەگەڵ ↑سێروو seru.

**سریمە srīme** *[ srîma ]* - "ژانی بە هۆی بریندار بوونەوە": خزمە دەگەڵ ↑چڵە2 çıle 2 چڵەدان یان ↑چڵیان çılyan واتا "پەڕینی پێلووی چاو، لیدانی دڵ یان چڵیانی شوێنی بریندار"، ↑*چڵەکین çılekîn* [راچڵەکین] "هەڵبەزینەوە"، ↑سرک sırk "رەوەک، بازرە"، ↑سڵەمینەوە slemînewe "رەوینەوە، دەرپەڕین". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "باز دان، هەڵبەزین".

**سڕین sırîn** *[ sırīn ]* - "خاوێن کردنەوە، رێخشاندن": سترین sıtrīn و ↑ئەسترین estırîn یش دەگوترێ.

**سریوە[1] srîwe [1]** *[ srīwa ]* - ↑جریوە cırîwe "ترووکە ترووکی ئەستێرە".

**سریوە[2] srîwe [2]** *[ srīwa ]* - ↑سروە sırwe "شنەبا".

**سز sız** - "بێدەنگ": سس sıs یش دەگوترێ. [کاتیک بە تووڕەییەوە فەرمانی بێدەنگ بوون بە یەکیک دەدرێ، دەگوترێ "سز بە"، واتا بێدەنگ بە. خزمە دەگەڵ sige (Gr.) "بێدەنگی و sigaein (Gr.) "بێدەنگ بوون". schweigen (G.)، sweigen (OG.)، swigian (OE.) "بێدەنگ بوون" دە زمانە ژێرمەنییەکادا دەگەڵ وشە یۆنانییەکە بە هاوریشە دادەنرێن. سکت sakata (Arb.) "بێدەنگ بوو" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

**سزا sıza** *[ sızā ]* - "جەریمە، تۆڵە": مانای ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا جەریمە کردن یاخود تۆڵە هەستاندنە لەبەرانبەر کارێکی خراپ یان تاواتیکدا. [سزا دان، بە سزا گەیاندن]. ئەم وشەیە دواتر مانای "پاداشت" [تۆڵە کردنەوەی چاکە]شی وەرگرتووە، بەڵام لەراستیدا ئەمە مانای دروستی وشەکە نییە، هەر وەک چۆن "تۆڵە"ش دە بنەڕەتدا کاردانەوەیەکە لە هەمبەر کاری خراپ و تاوان، نەک لە هەمبەر "چاکە"دا. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑سکاڵا sıkala "شکایەت" سەر بە ریشەیەک بە مانای "دادگایی کردن، سکاڵا کردن، بە کێشە هاتن، سەرکۆنە کردن". وەک دەبینین، "سزا" پێوەندی تەواوی بەم مانایانەوە هەیە، نەک بە مانای "پاداشت"ەوە. ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە جزا cazā (Arb.).

**سزاو sızaw** *[ sızāw ]* - "ئاوی لە ماستی ناو توورەکە تکاو": سز + ئاو sız + aw. کەرتی سز -sız خزمە دەگەڵ ↑تکان tıkan [چکان çıkan]، سەر بە ریشەی < *seik- (P.)* "تکان، چکان، دڵۆپان". خزمیشە دەگەڵ ↑سوزمە suzme "پاڵوێنە".

**سزک sızık** - "1- ئاوی پەنیر کە لۆرکی لێ دەگرن 2- تیژاوی دۆ کە دەکرێتە شیرێژ": خزمە دەگەڵ ↑سزاو sızaw.

**سست sıst** - "لاواز، لەرزۆک": سست sost (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ↑ زیز zîz.

**سفت sıfıt** - "توند، سەخت": سفت seft (P.). خزمە دەگەڵ swint (MG.) "توند، سەخت"، swind (OG.)، swints (Gt.)، swid (OE.) "سەخت، توند، بەهێز" و svinnr (OIs.) "بەلەز، زیرەک". هێندێک وشەی دیکە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە، وەک geschwind (G.) "خێرا"، gesund (G.)

"ساخ" [دە بنەڕەتدا قایم و توند و تۆڵ]. بەگوێرەی لێکدانەوەیەک ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەی < ***sghuwent-** (IE.)* "سەخت، قایم، بەهێز". هەروەها بەپێی هێندێک لێکدانەوە وشەکانی Sieg (G.)، sige (OE.)، seger (Sw.) "سەرکەوتن، زاڵ بوون" و sahate (OIn.) "زاڵ دەبێ" و sahuri (OIn.) "*زاڵ*، سەردەست" پێوەندی بەم ڕیشەوە پەیدا دەکەن. ئەگەر پێوەندی ئەم وشانەی دوایی بەم ڕیشەوە ڕاست بێ، دەتوانین وشەکانی ↑سەخت sext و ↑زۆخ zox "هێز، توانایی" و↑زەخت zexıt "زۆر، هێز، گوشار"، ↑سواژ sıwaj "جەنگ، شەڕ" و هەروەها ↑سەفین sefîn [کێوی سەفین واتا کێوی سەخت] و ↑سەفدر sefdır "بوێر، ئازا، بەجەرگ": لەم چوارچێوەیەدا لێک بدەینەوە. وشەی سفت sıfit چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە ثابت sābit (Arb.) "قایم، پایدار، نەگۆڕ" [دە بنەڕەتدا سفت، سەخت]. شیاوی باسە لەنێوان چەمکی "سەخت و سفت" لە لایەک و "قورس و قایم و نەگۆڕ بوون" لە لایەکی دیکەوە پێوەندی هەیە، بۆ وێنە وشەکانی *قورس*، *کورسین* "قایم بوون، سەقامگیربوون" و *خار* "سەخت" خزمن و لە یەک ڕیشەوە پەیدا بوون. ژمارەیەکی دیکە لەو وشانەی دەگەڵ "سفت" خزمن، بریتین لە ↑سفن sıfın "بناخە"، ↑زۆپ zop "گاشەبەرد"، ↑زەب zeb "ڕەق، سەخت"، ↑شفتە1 şıfte 1 "جۆرێک بێتۆن"، ↑کەپتار keptar "بناری چیای پڕ لە دار"، ↑کەبادە kebade "دارێکی بە زنجیرەوە کە لە زۆرخانە بەکاری دێنن"، ↑کەبۆت kebot [کەڤۆت kevot، کەوت kewıt ] "دارێکی سەخت" و ↑کەبس kebıs "ڕەنج کێشان و شەکەت بوون" [سەختی کێشان]، ↑کەبەر keber "دەوتێکی دڕکاوی" و هەروەها چەندین وشەی دیکە کە لەژێر ↑*سیپان2 sîpan 2* دا باس کراون. "سفت" هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ↑سفەت sıfet "وەفا، ئەمەک".

**سفرە sıfre** [ *sıfra* ] - "کەوڵی نان لەسەر خواردن": سفره sofre (P.). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە ئاماژە بە بەربڵاوی، زۆری و فرەیی و دوور و درێژی دەکەن و سەر بە ڕیشەیەکن بە مانای "لەبەر یەک کشانەوە، هەراو بوونەوە، پان و بڵاو بوونەوە، درێژ بوونەوە". خزمە دەگەڵ ↑زاف zaf و↑ *زۆر1 zor 1* و ↑ئەسپایی espayî [ئە + سپایی]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ spatium (L.) "فەزا" و spahr (Pl.) "ئاسمان، گەردوون".

**سفک1 sıvık 1** - "1- کەم وەزن 2 - نەگران، هاسان 3- لەز، خێرا": دە شێوەزاری کوردمادی تیوەڕاستدا بووەتە سووک suk. سبک sabok (P.). ئەم وشەیە هەروەها خزمە دەگەڵ چابک çabık یان ↑چابوک çabuk [چابک čābok (P.)] بە مانای "چوست و چالاک، خێرا". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schweifen (G.)، sweifan (OG.)، swīfan (OE.) "بزوان بە شێوەیەکی خێرا و گەوزی"، swoop (E.) "بەر بوونەوە"، swipa (OIs.) "فڕێ دان"، swift (E.) "بزاڤێکی بەلەز، درێژمەودا و کەم خایەن"، sweep (E.)، swāpan (OE.) "گەسک دان"، سەر بە ڕیشەی < ***suēi(b)-** (IE.)* "سووڕان یان بزوانی سووک، بەلەز و چالاکانە". دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑سووتە sute [کلکەسووتە] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. کلکەسووتە بۆ سەگ بەکار دێ و ئاماژەیە بۆ ئەو جم و جۆڵ و بزاڤە سووک و چالاکانەی سەگ بە کلکی خۆی دەیکا، وەک دەربڕینی وەفا و خۆشەویستی بۆ خاوەنەکەی. دیارە ئەو جۆرە کلک بزواندنە تایبەتی سەگە و هەر بۆیەش وشەی کلکەسووتە تەنیا بۆ سەگ بەکار دێ. وشەی "سووتە" گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەبێ پێشتر شێوەیەکی وەک سەبتە *sebte*[*سەفتە *sefte*، *سەپتە *sefte*] ی هەبووبێ و دواتر سواوەتەوە و بووەتە "سووتە". ئەم ڕیزەوشەیە لە پلەیەکە دوورتردا پێوەندی پەیدا دەکا بە دەستەوشەیەکی دیکە کە لە ژێر ↑جینگڵ cîngıl دا شی کراوەتەوە.

**سفک2 sıvık 2** - "کۆست، بڵیندایی سەر ڕێگە": خزمە دەگەڵ ↑زاب zab "سەکۆ، دەکە" و ↑زۆپ zop "زەق، دەرپەڕیو".

**سفن(ک) sıfın(k)** - "هێم، خیم، بناخە": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıfit "سەخت، قایم".

**سفوور sıfûr** [ *sıfūr* ] - "1- گەسکدەری کۆڵان 2- ژنە شارستانی بێ ڕووپۆش": سپور sopūr (P.) "گەسکدەری کۆڵان". خزمە دەگەڵ ↑*ساوین savîn* "پێداخشاندن، پێداماڵین". سفوور ئەو کەسەیە گەسک

لە ئەرز دەخشێنێ، ئەرز دەماڵێ، بە مانایەکی گشتی ئەرز دەساوێ. مانای دووەمی وشەکە دە زمانی کوردمادیدا، واتا مانای "ژنە شارستانی بێ ڕووپۆش" ڕەنگە لەمەوە هاتبێ، کە ئەو ژنانە چارشێویان لە خۆیان *هەڵماڵیوە* یان دارنیوە. یان لەوانەیە مەبەست ساف بوون [تاس و لووس بوون] بێ. شیاوی باسە کە ↑ساف saf² یش پێوەندی بە ساوین savîn ەوە هەیە.

**سفەت sıfet** ⌈ *sıfat* ⌉ - "وەفا، ئەمەگ": بەسفەت واتا "بەوەفا"، بێسفەت واتا "بێوەفا". ئەم وشەیە چ پێوەندییەکی بە "سفەت"ی عەرەبییەوە نییە و ماناکەشی بە تەواوی دەگەڵ ئەو وشە عەرەبییە جیاوازە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑سفت sıfit. "سفت" مانای "سەخت و قایم" دەبەخشێ و دە هەمان کاتدا هەڵگری مانای "قورس و قایم و نەگۆڕ" بوونە.

[تێبینی 1: دە زمانی ئەڵمانیدا وشەی Treu (G.) مانای "سفەت، ئەمەگ، وەفا" دەگەیەنێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ دار dar ی کوردمادی و دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بەمانای "دار، داربەڕوو". مەبەست لە وشە ئەڵمانییەکەش دە بنەڕەتدا "سەخت و قایم بوون"ە، سەختییەک وەک سەختی داربەڕوو. هەروەها ئەگەر سەیری وشەی "ئەمەک" یان "ئەمەگ" بکەین، دەبینین کە ئەم وشەیەش دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "هێز و توانایی" واتا سەخت بوون. کەوابوو کاتێک دەڵێن فڵانکەس ئەمەگی نییە یان بێ سفەتە، دە ڕاستیدا مەبەست ئەوەیە کە پێوەندی یان دۆستایەتی ئەو مرۆڤە هێز و توانی نییە و سست و لاوازە.
تێبینی 2: وشەکانی ثبات sibāt (Arb.) و صفة sifa(t) (Arb.) دەشێ لەم وشە کوردمادییە وەرگیرابن. وەک ئاشکرایە دوو چەمکی "سەخت و بەهێز بوون" و "پایدار، قورس و جێگیر بوون" پێوەندییان بەیەکەوە هەیە. نموونەیەکی دیکە لەم بارەوە وشەکانی "قورس"، گیرسانەوە" و "کورسین" و هیترن کە هەموو لە ڕیشەیەکەوە هاتوون. هەروەها مانای **صفة** دە زمانی عەرەبیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو شتەی وەک **صفة** [خیسلەت] سەیر کراوە، بە شتێکی جێگیر، نەگۆڕ و قورس و قایم داندراوە].

**سڤنک sıvınk** - "گسک": سڤیک sıvîk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سفوور sıfûr "گەسکدەری کۆڵان".

**سڤنگ sıvıng** - "چنگەکلۆش [چەپکەکلۆش] کە پشتی گاگیرەی پێ دەماڵن": خزمە دەگەڵ ↑سڤنک sıvınk "گسک".

**سقڵ sıqıl** - "نەخۆشی خواردن نەتواندنەوە، گرفت": خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext. وشەکە ئاماژەیە بە ڕەق و سەخت بوونی سک بە هۆی گرفت پەیدا بوون لە کاری گەدە و ڕیخۆڵەدا.

**سک sık** - "هەناو، ورگ": شێوەی کۆنتری ↑زگ zıg. ↑ئاشک aşık یش دەگوترێ [ئا a + شک şık]. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەیە کە پێوەندییان بە چەمکی "خواردن"ەوە هەیە، وەک ↑ئازا *az lı* "چێشت، خۆراک"، [اش aş (P.) "دۆکلیو"]، ↑ئازووقە azuqe "خواردەمەنی پاشەکەوتکراو". سک یان ئاشک ئاماژە بە شوێنێک یان شتێک دەکا کە خۆراکی تێ دەچێ، واتا "خۆراکدان". لە باریماناوە بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "هوور" (ورگ)].

**سکاڵا sıkala** ⌈ *sıkālā* ⌉ - "شکایەت":

1- یان پێوەندی هەیە بە Sache (G.) "شت، تشت، کاروبار". مەبەست لەم وشە ژێرمەنییە دە بنەڕەتدا "شتی دادوەری، کاروباری یاسایی" بووە. ئەم مانایە لەم وشانەی خوارەوەدا بەروونی بەدی دەکەین: sahha (OG.)، zaak (Nl.)، sacu (OE.)، sak (Sw.). ئەم وشانە دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی کە ئێستا نەماوە، بەڵام دە زمانە کۆنە ژێرمەنییەکاندا هەبووە، وەک sahhan (OG.)، sakan (Gt.)، sacan (OE.) "دادگایی کردن، سکاڵا کردن، بە کێشە هاتن، سەرکۆنە کردن". ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ↑سۆسە sose سەر بە ڕیشەیەک بە مانای "شۆپاندن، شوێن گرتن، کەوتنە شوێن کێشەیەک یان تاوانبارێک"، ↑دۆسیە dosîye، ↑دۆزین dozîn و ↑تشت *tışt*.

2- یان لەوانەیە بچێتەوە سەر ڕیشەی ***(s)kel-** *(IE.)* "دەنگ لێ هاتن، دەنگ لێ بڵیند بوون". ↑زایەڵە zayele "دەنگ دانەوە" لەم ڕیشەوە هاتووە. ئەم ڕیشەیە خۆی لە پێوەندی دایە دەگەڵ ڕیشەی

"دەنگ هەڵبڕین *IE.) *kel- /*kle)* "هەرا کردن، هاوار کردن". لەم تیروانینەوە "سکاڵا کردن" بریتییە لە "دەنگ هەڵبڕین و هاوار لێ هەستان".

**سکان sıkan** *[ sıkān ]* - "چەسپین، لکان": خزمە دەگەڵ sticken (G.) "گوڵدۆزی کردن، پێوەنووساندن"، دە ئەڵمانی ناویندا وشەکە بە مانای "پێوەنووساندن، قایم کردن" بووە و دە ئەڵمانی کۆندا بە مانای "تێکخستنەوە"ش بەکارهاتووە. stick (E.) دەبێتە "پێوەنووساندن، چەسپاندن" و stitch (E.) "دروون، گوڵدۆزی کردن". دە بنەڕەتدا مانای وشە ژێرمەنییەکە پێوەنووساندنی نەخش و نیگار بە هۆی تەقەڵ لێدان و قایم کردن بە هۆی دەرزی و شتی تیژی ئەوتۆ بووە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑چەقین çeqîn و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**سکر sıkır** - "پاڵوێنە، بەربەندی ئاو لە شووڵ": خزمە دەگەڵ ↑تکان tıkan [چکان çıkan] و دە پلەیەکی دوورتریشدا دەگەڵ ↑سافان safan "دڵۆپە، چکە".

**سکپ sıkıp** - "بن ڕێسمە، داری بنەوە دە چوارچێوەی دەرگادا": شێوەیەکی زۆر کۆنە لە وشەی ↑چێو çew.

**سککە1 sıkke 1** *[ sıkka ]* - "گوڵمیخ": خزمە دەگەڵ ↑سیخ sîx.

**سککە2 sık(k)e 2** *[ sık(k)a ]* - "پارەی لە زێڕ و زێو دارێژراو": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ signum (L.) "شکڵ، نیشانە، شەقڵ، مۆر" و ↑شەقڵ şeqıl. سککە دە بنەڕەتدا ئەو شەقڵ و نیشانەیە بووە کە لەسەر پووڵ دراوە و مەبەست لە سککە *لێدان*، شەقڵ و نیشانە لێدان بووە.

[تێبینی: پێوەندی شەقڵ و نیشانە بە پووڵ و پارەوە دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا دەبیندرێ. Mark (G.) کە ناوی پارەی ئەڵمانی بوو، دە ئەسڵدا بە مانای "شەقڵ و نیشانەیە"].

**سکڵ sıkıl** ـ "پۆلوو، پشکۆ": بڕوانە ↑ئەسکڵ eskıl.

**سکوم sıkum** - "بیچم، شێوە": بڕوانە ↑سەکوت sekut [سەر و سەکوت].

**سگڵ sıgıl** - "بالۆکە": زگیل zegīl (P.). خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq.

**سل sıl** - "ئەوەندە لە پیسایی کە بە جارێک لە لەش دەر دەچێ": خزمە دەگەڵ وشەکانی ↑زەل zel "هەردی تەڕ و خلیسک"، ↑سیلک sîlık "خیز و لمی چەم"، ↑چلم çılım و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ڕیشەی **< *(IE.) *(s)lei-*** "خلیسکان، تەڕ و لیچق بوون".

**سڵ sıl** -"ڕەوەک": سڵ کردن واتا ترسان و ڕەو کردن. سلک sılk و سرک sırk و سرگ sırg یش دەگوترێ. ئەم وشەیە، وەک بنەوشە لە کرداری ↑سڵەمینەوە sılemînewe و ↑سلکین sılkîn شدا دەبیندەرێ . بنەوشەی سڵ -sıl شێوەیەکی دیکەیە لە بنە وشەی چڵ -cıl کە لە کرداری ↑داچڵەکین dacılekîn و↑چڵە cıle [چڵە دان] دا دە بیندرێ، دەبنەڕەتدا بە مانای "هەڵبەزین، بزووتنی خێرا".

**سلار sıl(l)ar** *[ sıl(l)ār ]* - "بەلادا هاتوو": ئەم وشەیە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "تخێل، ڕاست بە عەرزدا درێژبووگ". بەڵام مانای بنەڕەتی وشەکە "بەلادا هاتن، خوار بوون(ەوە)، بوورانەوە"یە. کاتێک کەسێک یان ئاژەڵێک لەپڕ بە لادا دێ و بەردەبێتەوە و لەوانەشە بمرێ، دەڵێن سللار بۆوە. ئەم وشەیە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑لار lar "خوار، بەلاداهاتوو" [لەنجە و لار lar u lence]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کل kıl و ↑لەرینەوە lerîn(ewe) [بەم لا وئەو لادا لار بوونەوە]، سەر بە ڕیشەی **< *(IE.) *klei-*** "سلار بوون، لار بوون، کل بوون". وەک دەبینین هەر سێ وشەی "سلار"، "لار" و "کل" سێ وشەی جیاواز، بەڵام هاومانان کە لەم ڕیشەوە سەریان هەڵداوە و لەوانەیە دە کۆندا یەک وشە بووبن. دە زمانی کوردمادیدا لەم بارەوە هەروەها وشەیەک سەرنج ڕادەکێشێ کە بریتیی لە ↑سڵاو sılaw بە مانای "پارسەنگی تەرازوو" و سڵاو دانەوە sılaw danewe بە مانای "تۆزێک گران کێشانی تەرازوو بۆ دڵخۆشی کڕیار". دیارە ئەم وشەیە ناتوانێ هیچ پێوەندییەکی دەگەڵ "سلام و علیک"ەوە هەبێ. لێرەشدا ئەگەر سەرنجی مانای وشەکە بدەین، دەبینین کە وشەکە پێوەندی بە لار

بوون [داهاتنی] لایەکی تەرازوو هەیە. مانای سڵاو وەک "پارسەنگ" لێرەوە پەیدا بووە کە تەرازوو لە دۆخی هاوسەنگیدا بەم لا و ئەو لادا دەلەرێتەوە، وەک کەشتی لەنگەرگرتوو لەسەر ئاو کە ئەویش لەنگە [لەنجە] دەکا.

**سڵاو sılaw** [*sılāw*] - "پارسەنگی تەرازوو": بڕوانە ↑سلار sıl(l)ar "بەلاداهاتوو".

**سلپ1 sılp 1** - "تلّتە، تلّپە": خزمە دەگەڵ ↑زەل zel و ↑سل sıl سەر بە ریشەیەک بە مانای "خلیسک بوون، تەڕ و لیچق بوون".

**سلپ2 sılp 2** - "تەپ، تەوەزەل": خزمە دەگەڵ schlapp (G.) "شل، داتەپیو، داهێزاو" و Schlaf (G.) "خەو" [دە بنەڕەتدا پاڵ کەوتن، شل بوونەوە]، سەر بە ریشەی **< *(s)leb-** (*IE.*) "شل بوونەوە، شۆڕ بوونەوە، داهێزان".خزمیشە دەگەڵ ↑شل[1] şıl [شل و شەوێق]، ↑شۆڕ şor و چەندین وشەی دیکە.

**سلّق sılq** - "گیایەکی دوکلیو": خزمە دەگەڵ ↑زلّچە zılçe "دەنگی شتی تەڕ"، ↑جلّقە cılqe [جلّق و فلّق]، ↑چلّم *çılım*، ↑زلّق zılq "قوڕ و لیتەی خلیسک"، ↑زلّفنچک zılfınçık "چلّک و کێمی برین"، ↑زلّزلّە zılzıle "چلّک و کێمی برین"، ↑زلیقۆ zılîqo "جۆرێک چەسپ"، ↑سلپ sılp "تەلّتە"، ↑چلّپاو çılpaw، ↑زەلکە zelke "شۆرباوی بێتام" و هتد. ئەم وشانە و چەندین وشەی هاوشێوە دەچنەوە سەر ریشەی **< *(s)lei-** (*IE.*) "تەڕ و لیچق بوون".

**سلکاندن sılkandın** [*sılkāndın*] - "دوورەپەرێزی لە مردم": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑سلکین sılkîn "سڵ کردن، رەوین" و هەروەها ↑سرگون sırgûn "دوور خرانەوە".

**سلکاندن sılkandın** [*sılkāndın*] - "دوورەپەرێزی لە مردم": هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑سلکین sılkîn "سڵ کردن، رەوین" و هەروەها ↑سرگون sırgûn "دوور خرانەوە".

**سلکین sılkîn** [*sılkīn*] - "سڵ کردن": ↑سڵ sıl.

**سلۆری slorî** [*slorī*] - "گڕی ئاگر": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑قاڵ qal.

**سلۆگان sılogan** [*sılogān*] - "دروشم، شوعار": وشەیەکی ئینگلیزییە، slogan (E.)، دەچێتەوە سەر زمانی گالی *sluaghghairm* (*Gal.*) "قیژەی شەڕ" [گوڕڕاندن لە شەڕدا].

[تێبینی 1: وشە ئینگلیزییەکە دە زمانی ئەڵمانیدا وەک Schlagwort (G.) "تیتر، دروشم". وشە ئەڵمانییەکە لە دوو کەرت پێک هاتووە کە کەرتی یەکەمەکەی دەگەڵ وشە ئینگلیزییەکە و هەروەها دەگەڵ وشەی کوردمادی ↑شڵەقان şıleqan خزمە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان". کەرتی دووەمی وشە ئەڵمانییەکە مانای "وشە" دەدا و خزم دەگەڵ "ورتە"ی کوردی. Schlagwort دە زمانی ئەڵمانیدا بە وشەیەک یان چەند وشەیەک دەگوترێ کە بابەتێک بە شێوەیەکی بەهێز و کاریگەر نیشان دەدا یاخود پێناسە دەکا. تێبینی 2: لەژێر وشەی "دروشم"دا شی کراوەتەوە کە ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە دە ریشەدا مانای "کوتان، لێدان" دەگەیەنن و مەبەست لە دروشم [یان "درفش" دە زمانی فارسیدا] دە بنەڕەتدا بریتی بووە لە نەخش و نیگار و شەقڵێک کە وەک پێناسە لەسەر دار و بەرد و کانزا (بە لێدان و کوتان) دروست کراوە. هەروەها دە زمانی یۆنانیدا وشەکانی grámma (G.) [gráph-ma] "پیت، حەرف، نیشانە، خەت" و هەروەها typos (G.) "وێنە، شەقڵ، تیپ، جۆر، تایپ" پێوەندییان بە دوو کردارەوە هەیە کە مانای "لێدان، کوتان" دەبەخشن]. هەر بەم شێوەیە سلۆگان sılogan دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑*شڵەقان şıleqan* و ↑زللە zılle و ↑شەللاق şellaq و چەندین وشەی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان".

**سلەم sılem** [*sılam*] - "پەیژە، تیردیوان": خزمە دەگەڵ klimmen (G.)، climb (E.)، clamber (E.)، climban (OE.)، klimban (OG.)، klembra (OIs.) "پێدا هەڵچوون، وە سەر کەوتن". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *glembh- ، کە خۆی لە ریشەیەکی کۆنتر پەرەی گرتووە، واتاریشەی **< glem-**

*(IE.)* "ڕێکگوشین". klimmen (G.) "پێدا هەڵچوون، وە سەر کەوتن" دە زمانی ئەڵمانی ناویندا بەم مانایانەش بەکار هاتووە: "ڕێکوشین، قورنجاندن، چەنگ پێدا گرتن". هەروەها دە زمانی ئەڵمانیدا klemmen (G.) هەیە بە مانای "ڕێککوشین، ئەوقاندن، دە گیر خستن، تەنگەتاو کردن، قایم کردن". ئەم پێوەندییانەی سەرەوە دەری دەخا کە مانای "وەسەر کەوتن، پێدا هەڵچوون" لێرە پێدا بووە کە مرۆڤ یان ئاژەڵ دەست (و قاچ)ی لە دار و بەرد گیر داوە، واتا چەنگی لە دار و بەرد قایم کردووە و بەم شێوەیە توانیویەتی بەسەر دار و بەرددا سەر بکەوێ. دە زمانی کوردیدا چەندین وشە پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن، وەک ↑کەڵەوە kelewe [کەڵەمە keleme] و ↑کرمەک kırmek و هتد.

[تێبینی 1: ئەم ڕیشەیە سەرەوە دەشێ خۆی بۆ ڕیشەیەکی بۆ ڕیشەیەکی دوورتر بگەڕێتەوە کە بریتییە لە *gel- (IE.) "ڕێکگوشین، پێوە نووساندن، پێکەوەنووساندن، تۆپەڵە کردن". ژمارەیەک زۆر وشە دە زمانی کوردیدا لەم ڕیشەوە پەیدا بوون کە هێندێکیان لەژێر ↑گلوو gılû دا باس کراون. لەم نموونەیەدا دەبینرێ کە ڕیشەیەکی هەرە بنەڕەتی بە مانای باسکراو بۆ ڕیشەیەکی دیکە پەرە دەستێنێ کە مانای "ئەوقاندن، دە گیر خستن، تەنگەتاو کردن، قایم کردن" دەبەخشێ و ئەمیشیان دیسان بۆ ڕیشەیەکی دیکە پەرە دەگرێ کە چەندین وشەی بە مانای "پێدا هەڵچوون، وە سەر کەوتن" لێ پەیدا دەبێ. تێبینی 2: ئەم وشانە دە پلەیەکی دوورتر دا دەبنە خزم دەگەڵ ↑قولاپ qulap ی کوردی و Klaue (G.) "چەنگ، چەنگاڵ". دیارە ئەم ناوانەش بۆ ئەوە دەگەڕێنەوە کە قولاپ و چەنگ و چەنگاڵ ئەو شتانە بوون کە لە شت گیر دراون، شتیان پێ ڕێککوشراوە و پێیان ڕاگیر کراوە، بۆ وێنە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دۆخێک کە ئاژەڵێکی ڕاوکەر چەنگی خۆی لە نێچیرێک قایم کردووە].

**سڵەمینەوە sılemîn(ewe)** [*sılamīnawa*] - "سڵ کردن": هەروەها سڵم sılm هەیە بە مانای "سرک، قوشقی، ڕەوەک". دەچێتەوە سەر ↑سڵ sıl کردن.

**سم sım** - "نینۆکی ئاژەڵ": سم som (P.). خزمە دەگەڵ Huf (G.)، hoof (E.)، hov (Sw.)، saph-h (OIn.)، safa (Av.)، kopyto (Rus.) "سم"، سەر بە ڕیشەی **< *kopho-**

***(IE.) *kapho-*,** "سم، دەست". خزمە دەگەڵ ↑چەپڵە çeple، ↑چەپۆک çepok [بنەوشەی چەپ -çep واتا "دەست"، کەپ kep [کەپلەمە]، دە فارسیدا "کف kaf دست" واتا "بەری دەست"].

**سمات sımat** [*sımāt*] - "کەمرە": خزمە دەگەڵ Schmutz (G.)، smut (E.) "پیسی"، سەر بە ڕیشەی **<** ***(IE.) *(s)meu-*** "تەڕ، چەوڕ و چڵۆک".

**سماتە sımate** [*sımāta*] - "1- بەردێکی ڕەشی زوور و سەختە 2- کاغەزێکی زوورکراو بۆ سووانەوە": سنبادە sonbāde (P.). پێوەندە بە ↑سمین sımîn "کون کردن" [دە بنەڕەتدا: کارکردن بە ئامرازی تیژ، تاشین، تراش دان].

**سماخ sımax** [*sımāx*] - "ئاو دانی تیغ": پێوەندە بە ↑سمین sımîn "کون کردن" [دە بنەڕەتدا: کار کردن بە ئامرازی تیژ، تاشین، تراش دان].

**سماق sımaq** [*sımāq*] - "بەری دارێکە، ترشە و بۆ هێندێک چێشت کەڵکی لێ وەردەگیرێ": سماق somāq (P.). خزمە دەگەڵ schmecken (G.)، smecken (MG.) "چێژ لێوەرگرتن، مەزەکردن"، smac (OG.)، smack (E.) "چێژ، مەزە"، سەر بە ڕیشەی **< *(IE.) *smeg(h)-*** "مەزە کردن، چێشتن". لەم تێڕوانینەوە دەبێ ئەو ترشە بۆیە پێی گوترابێ "ترشی سماق"، چونکوو بۆ مەزەدان و خۆش کردنی چێشت کەڵکی لێ وەرگیراوە. وشەی ↑مەزە meze لەم ڕیشەوە هاتووە و لەم وشەیەدا فۆتیمی s کە دە ڕیشەکەی سەرەوەدا هەیە، سواوەتەوە و فۆتیمی g بووەتە z.

**سماقە sımaqe** [*sımāqa*] - "لەش ڕەق بوون لە سەرمان": وشەکە دە کۆندا *زەماک zemak** یان *زەماگ zemag** بووە. بنجی زەم -zem بە مانای "سارد و سڕی"یە و دە هێندێک وشەدا دەبینرێ، وەک

↑زستان *zıstan* [زمستان zımıstan]، ↑زمهەر zımher، زەمزیران zemzîran "گەردنەیەک لە تیوان مەهاباد و سەردەشت"؟،↑ زماک zımak یان زماگ zımag "نسار" و هتد.

**سمت sımt** - "کەفەڵ": خزمە دەگەڵ Hüfte (G.)، hup (OG.)، hip (E.)، hups (Gt.) سەر بە ریشەی< ***(IE.) *keu-*** "چەمانەوە". cubitum (L.) "ئانیشک" پێوەندی بەو ریشەوە هەیە. هەروەک چۆن دە زمانی لاتینیدا مانای وشەکە بریتییە لەو جومگەیەی کە دەست دەنوشتێتەوە، دە زمانی ئەڵمانیشدا مەبەست جومگەی کەفەڵە کە دەبێتە هۆی نووشتانەوەی لاق. دە زمانی کوردمادیشدا مەبەستی ئەسڵی هەر ئەوە بووە.

**سمتە sımte** [ *sımta* ] - "تولا، پێکەوەنووساوی رێککوشراو": [وەک سمتەگڵ]. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑زەمۆمە zemome.

**سمتین sımtîn** [ *sımtīn* ] - سمتاندن sımtandın یش دەگوترێ. ئەمانە دوو شێوەی دیکەن لە ↑سمین sımîn "کون کردن".

**سمراخە sımraxe** [ *sımrāxa* ] - "چڵکی گوێ": خزمە دەگەڵ ↑سمرە sımre.

**سمراو sımraw** [ *sımrāw* ] - "(پیاوی) پتەو و توند گوشت": تێکسمراو têksımraw یش دەگوترێ. بڕوانە ↑سمێریان sımeryan "پتەو بوون".

**سمرە sımre** [ *sımra* ] - "دووگە": خزمە دەگەڵ Schmer (G.)، smero (OG.) "پیو، بەزی ئاژەڵ"، smör (Sw.)، smear (Sw.) "چەوری"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *smer-*** "چەوری". ئەم وشەیە دواتر دە زمانی کوردمادیدا وشەیەکی دیکەی لێ ساز بووە و بووەتە ↑هەویر hewîr.

**سمسک sımsık** - "چاوپیس، شووم": کەرتی سم -sım شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شووم şûm و دواجار خزمە دەگەڵ ↑شێو şêw "تاریکان". کەرتی دووەمی وشەکە پێویستی بە ساخ کردنەوە هەیە.

**سمسیرە sımsîre** [ *sımsīra* ] - "تڵتەی ترێی گوشراو": سەمیر semîr و سەمسیر semsîr یش دەگوترێ. پێک هاتووە لە دوو کەرتی سم + سیرە sîre + sım. کەرتی سم -sım خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "تاریک بوون، تەڵخ بوون" دەکەن [بڕوانە ↑شێو şêw "تێوارەدرەنگ"]. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شیرە şîre [یان شیلە şîle]. ئەو تڵتەیە شتێکی شیرەئاسای تەڵخ رەنگە.

**سمقە sımqe** [ *sımqa* ] - "زەوی نەرم و راست کە بێ جووت لێدان چەڵتووکی لێ دەچێنن". خزمە دەگەڵ ↑ساماڵ *samal* و ↑ساماڵە samale کردن بە مانای "خێشک لە شێوەرد دان". مانای ئەسڵی وشەکە "یەکدەست، هەموار"ە. ئاسمانی ساماڵ واتا ئاسمانێکی یەکدەست (شین) و بێ پەڵەهەور. هەروەها ساماڵە کردنی زەوی واتا هەموار کردنی. "سمقە"ش هەر ئەو مانایە دەبەخشێ و مەبەست زەوییەکە کە پێویستی بە هەموارکردن نییە.

**سمۆرە smore** [ *smora* ] - "ناوی ئاژەڵێکی تووکنی چکۆڵەیە کە وەسەر داران دەکەوێ و گوێز و بەڕوو کۆ دەکاتەوە":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑سمین sımîn ەوە هەبێ و ئاماژە بە ددانە تیژەکانی ئەو ئاژەڵە بکا کە وەک ↑سمەک sımek گوێز دەبڕێ.

2- لەوانەیە پێوەندی بە ↑سمەر smer "ساقەتەدەخڵی وردکراو، کا" هەبێ.

**سمەر smer** [ *smar* ] - "ساقەتەدەخڵی وردکراو، کا": خزمە دەگەڵ ↑مارین marîn [ماردین mardîn] "شکاندن، ورد و خاش کردن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)mer-*** "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، ورد کردن، هاڕین".

**سمەک sımek** [ *sımak* ] - "ئامرازی کون کردن": ↑زمە zıme ش دەگوترێ. دەچێتەوە سەر ↑سمین sımîn.

سمین **sımîn** [ *sımīn* ] - "کون کردن": سفتن softan و سمبیدن sombīdan (P.). هەروەها سنبە sombe (P.) بە مانای "کون" دێ [سوراخ سمبە]. خزمە دەگەڵ Schmied (G.)، smid (OG.)، smith (OE.)، smed (Sw.) "ئاسنگەر"، سەر بە ریشەی < *smei- (IE.) "داتاشین، بڕین، کارکردن بە ئامرازی تیژ". smile (Gr.) "چەقۆی داتاشین و هەڵکۆڵین" و sminyē (Gr.) "پاچ" هەر لەو ریشەوە هاتوون.

سمێریان **sımeryan** [ *sımeryān* ] - "پتەو بوون": تیک سمران (tek)sımran یش دەگوترێ. تیکسمراو واتا پتەو و بەخۆوە:

1- یان خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑حەمرین hemrîn دا هاتوون و ئاماژە بە "سەخت و بەهێز بوون" دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەرد،کەڤر".

2- یان دەنا خزمە دەگەڵ ↑سمرە sımre "دووگە، بەز، چەوری". لەم تیڕوانینەوە سمێریان یاخود تیکسمران دەتوانێ بە مانای "قەڵەو بوون" بێ و لەمەوە دواتر مانای"پتەو و بەهێز بوون"ی پەیدا بووبێ. سەبارەت بە پێوەندی ئەم دوومانایانە پێویستە ئاماژە بە وشەی "قەڵەو" بکەین کە دە بنەڕەتدا ماناکەی "بەهێز" بووە.

سمێڵ **sımel** [ *sımel* ] - "مووی بان لێو": سبیل sebīl (P.). خزمە دەگەڵ scubil (OG.) "چەپکەموو، چەپکە گیا"، sheaf (E.) "باقە، چەپک"، čub (Rus.) "پۆپە، کاکۆڵ" و خزمە دەگەڵ ↑ساپ sap "خەرمان" و ↑چەپک çepk "باقە".

سن **sın** - "1- لووتکەی چیا 2- داری دوولک بۆ بادانی پێستی ئاژەڵ". خزمە دەگەڵ ↑دوند dund، ↑دوندووک dunduk، ↑ددان d(d)an. وشەکانی zinne (G.) و zinke (G.) بە مانای "ددانە، نووکی تیژ و دەرپەڕیو" خزمن دەگەڵ Zahn (G.) "ددان". ئەم وشەی دواییش خۆی خزمە دەگەڵ د(د)ان d(ıd)an.

سنت **sınt** - "هەویرێکە هەنگ دیواری خەڵیفی پێ سواخ دەدەن": ستێتر sınêtır ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ kneten (G.)، knetan (OG.)، kneden (Nl.)، knada (Sw.) "هەڵشێلان، هەویر کردن، بە هەویر کار کردن"، gnesti (Rus.) "گوشین، رێکگوشین"، سەر بە ریشەی < *gnet- (IE.) "گوشین، رێککوشین، تۆپەڵە کردن". ↑سند sınd [سندەگڵ sındegıl] واتا "تۆپەڵەگڵ، گلێکی رێکگوشراو" پێوەندی بەم ریشەوە هەیە. لەم ریشەوە چەندین وشە دیکە دە زمانی کوردمادیدا سەریان هەڵداوە، وەک ↑گنج gınc، ↑خونچە xunçe، ↑گونجان guncan، ↑قوتیر *quner*، ↑قونچک qunçık و ↑قۆندەرە qondere و هتد.

سنجاخ **sıncax** [ *sınjāx* ] - "دەرزیلەیەکە بوی شت پێ قایم کردن": سنجاق sıncaq یش دەگوترێ. sanjāq (P.) "سنجاخ" و سنجاقک sanjāqak (P.) "پووشکەبەقوونە". هەروەها ↑سنجووق sıncûq هەیە بە مانای "داردەستی سەردادراو کە منداڵ کایەی پێ دەکەن". بەم کایەش دەگوترێ سنجووقێن sıncûqên. وەک دەبینین "سنجاق" و "سنجووق" ئاماژە بە شتی نووک تیژ دەکەن کە بۆ تێهەڵچەقاندن بەکار دێن. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سینگ[2] sîng [سنگ sıng] "مێخی ئەستووری لە دار یان ئاسن".

سنجڕ **sıncır** [ *sınjır* ] - "بڵێسەی ئاگر": هەروەها سنجران sıncıran و سنجراندن sıncırandın هەیە بە مانای "بڵێسەدار بوون" و "وە بڵێسە خستن"ی ئاگر. خزمە دەگەڵ ↑زەنگ[3] zeng [رۆنی زەنگ واتا رۆنی قاڵبوو].

سنجک **sıncık** [ sınjık ] - "دەفری گڵین بۆ بن بێشکەی منداڵ": خزمە دەگەڵ ↑سندۆڵ sındol.

سنجووق **sıncûq** [ *sınjūq* ] - "داردەستی سەردادراو کە منداڵ کایەی پێ دەکەن": بڕوانە ↑سنجاخ sıncax "دەرزیلەیەکە بوی شت پێ قایم کردن".

سنجەق **sınceq** [ *sınjaq* ] - "مەڵبەند": خزمە دەگەڵ ↑شەنگڵ *şengıl* "پێکەوەنووسان" و ↑زەنگەتە zengete [↑زانقەلە zanqele]. مەبەست لە "سنجەق" کۆمەڵەئاواییەکە کە پێکەوە بەند و گرێدراون، هەر وەک دەنکەترێکان لەناو زەنگەتەیەکدا. لەوانەیە فۆتیمی ج c شێوەی عەرەبێنراوی g بێ، واتا وشە کوردمادییەکە دە ئەسڵدا "زەنگەک/ سەنگەک" بووبێ.

سندان **sından** *[ sındān ]* - "دەزگای شت لەسەر کوتان": سندان sendān (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑زەنگ[1] zeng "لێدان" [زەبر و زەنگ]، ↑زنج zınc "ئامرازێکی مۆسیقا"، ↑ژەندن jendın و ↑ژەنین jenîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان".

سندانک **sındank** *[ sındānk ]* - "کووپەڵە": خزمە دەگەڵ ↑سندۆڵ sındol.

سندریک **sındrîk** *[ sındrîk ]* "تابووت": خزمە دەگەڵ ↑سندۆڵ sındol.

سندم **sındım** - "بەندی پێ لە ئاسن": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زنجیر zıncîr و ↑زیندان zîndan و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەستن، بەستنەوە".

سندووق **sınduq** *[ sındūq ]* - ئەم وشەیە وشەیەکی عەرەبی نییە و ریشەکەی بۆ زمانی کوردمادی دەگەڕێتەوە. خزمە دەگەڵ ↑سندۆڵ sındol "دەفری لە دار یان بەرد بۆ ساوارکوتان".

سندۆڵ **sındol** - "دەفری لە دار یان بەرد بۆ ساوارکوتان": جگە لەم وشەیە چەند وشەی دیکەش هەن کە سەر بە یەک خێزانەوشەن، وەک ↑سندانک sındank "کووپەڵە"، ↑سنجک sıncık "دەفری گڵین بۆ بن بێشکەی منداڵ"، ↑سندریک sındrîk "تابووت" و ↑سندووق sınduq. هەموو ئەم وشانە چەمکی "دەفر" لە خۆ دەگرن و وێ دەچێ خزم بن دەگەڵ ↑کەندوو kendu "دەفری زلی دارین بۆ دەخڵ و دان". ئەم وشەیە خۆی دەچێتەوە سەر کەند kend "قووڵ" و ↑کەندن *kendın* [هەڵکەندن] واتا "قووڵ کردن".

[تێبینی: دە زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا دوو چەمکی "قووڵ" و "دەفر" پێوەندی نیزیکیان بە یەکەوە هەیە، بۆ وێنە "زەرف" خزمە دەگەڵ "ژرف"ی فارسی بە مانای "قووڵ"، یان "تاوە" (ئافتاوە) خزمە دەگەڵ "تاپی" بە مانای خەندەک (کۆنتر: کەندەک)].

سندە **sınde** *[ sında ]* - "کلۆ، تۆڵا، پێکەوەنووساو، تۆپەڵەبوو": [سندەگڵ sındegıl]. خزمە دەگەڵ ↑سنت sınt "هەویرێکە هەنگ دیواری خەڵیفی پێ سواخ دەدەن"، سەر بە ریشەی **< *gnet- (IE.)** "کوشین، رێککوشین، تۆپەڵە کردن".

سنسل **sınsıl** - "بڕبڕەی پشت": خزمە دەگەڵ ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوەنووسان".

سنکۆڵک **sınkolk** - "قووڵێنکێ": کەرتی سن -sın(k) دەبێ خزم بێ دەگەڵ:

1- سندان sından سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان".

2- یان خزمە دەگەڵ ↑جنین cınîn سەر بە ریشەی **< *sneit- (IE.)** "بڕین".

سنگ **sıng** *[ sıng ]* - "دەرزی زەلامی جەواڵ دوورین": خزمە دەگەڵ ↑سنجاخ sıncax "دەرزیلە بۆ شت پێ قایم کردن".

سنگە **sınge** *[ sınga ]* - "دەرپەڕیو لە شتێک": هەروەها ↑سنگەک sıngek هەیە بە مانای "زیپکە".

1- ئەم وشانە یان خزمن دەگەڵ ↑سن sın "لووتکە" [دە بنەڕەتدا: دەرپەڕیوی]. زیپکە ئەو شتەیە کە لە سەر پێست دەردەپەڕێ و قوت دەبێتەوە. [وشەی "زیپکە"ش خۆی خزمە دەگەڵ "زۆپ" بە مانای "زەق، دەرپەڕیو، هەڵتۆقیو"].

2- یان لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑سندە sınde "کلۆ، تۆپەڵە، خڕکە". لەم بارەوە بڕوانە ↑قوتیر quner "کوان".

سنگەک **sıngek** *[ sıngak ]* - "زیپکە": بڕوانە ↑سنگە sınge "دەرپەڕیو لە شتێک".

سنلە **sınle** *[ sınla ]* - "تەپەگوو": خزمە دەگەڵ ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوە نووسان".

سنوور **sınûr** *[ sınūr ]* - "مەرز، کەوشەن": لە وتاری بەڕێزێکدا خوێندمەوە [ بەداوای لێبووردن کە ناوەکەی نایەتەوە بیرم] کە ئەم وشەیە دە زمانی یۆنانیشدا بەکار دێ. من دڵنیا نیم کە ئەم وشەیە بە ئەسڵ کوردمادی یان یۆنانی یان هاوبەش بێ. بەڵام دەکرێ شیمانەی ئەوە بکەین کە بە ئەسڵ وشەیەکی کوردمادی بێ. ئەم وشەیە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑کەنار kenar. وەک ئاشکرایە سنوور یان مەرزەکانی وڵاتێک شتێک نییە جگە لە کەنارەکانی ئەم وڵاتە. سەبارەت بەم پێوەندی دوو چەمکی

"سنوور" و "کەنار" دەتوانین ئاماژە بە وشەی "مەرز" بکەین کە خزمە دەگەڵ وشەی لاتینی marginal "لاوەکی، لە قەراخ وەستاو].

**سنوورچە sınûrçe** *[ sınūrča ]* - "چرۆ، لکی تازەدەرهاتوو": خزمە دەگەڵ ↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ".

**سنۆ sıno** - "باڵغ بوونی سەگ": خزمە دەگەڵ senex (L.) hénos (Gr.)، sána-h (OIn.) "پیر، بەساڵداچوو"، senatus (L.) "جڤاتی پیران"، senator (L.) "ئەندامی جڤاتی پیران". وشەی شیخ šayx (Arb.) لەم وشانە وەرگیراون. هەروەها سن sinn (Arb.) "تەمەن" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**سنەوبەر sınewber** *[ sınawbar ]* - "ناوی دارێکی دەرزیدار": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Kiefer (G.)، Kienforha (OG.) "سنەوبەر". وشەکەی ئەڵمانی کۆن خۆی لە دوو وشە پێک هاتووە و لە ئەنجامی سواونەوە دە ئەڵمانی نوێدا بووەتە یەک وشە. کەرتی دووەمی وشەکەی ئەڵمانی کۆن forha دە بنەڕەتدا بە مانای داربەڕوو بووە و خزمیشە دەگەڵ "بەڕوو". کەرتی یەکەم kien دە بنەڕەتدا بە مانای "قەڵشدار، دەرزدار، قەڵشێنراو" بووە. cinan (OE.) بە مانای "قەڵشاندن" و cinu (OE.) بە مانای "قەڵش، دەرز" بووە. ئەم وشەی دوایی دەچێتەوە سەر ریشەی < -*gēi (IE.) "قەڵشان، لێک جودا بوونەوە". وێ دەچێ وشەی ↑چنار çınar یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. رەنگە ئاماژە بە قەڵش قەڵش بوونی گەڵای ئەو دارانە کرابێ.

**سنەی sıney** *[ sınay ]* - "جۆرێک ترێ": خزمە دەگەڵ ↑قوتیر quner "کوان، دومەڵ".

[تێبینی: لە باری ماناوە بەراوردی ئەم دوو وشەی سەرەوە بکە دەگەڵ *گلە* "دەنکەترێ" و "گۆڵە" (زیپکە وکوانی سەر زمان)].

**سنێ sıne** *[ sıne ]* - "دارێکە لە مل و کەلەکەی ئاژەڵی دەبەستن تا دەمی نەگاتە برینی خۆی": خزمە دەگەڵ ↑سندم sındım سەر بە ریشەیەک بە مانای "بەستن، بەستنەوە".

**ستێژە sınêje** *[ sıneža ]* - "ئامرازێکی دەزگای جۆڵایی": خزمە دەگەڵ ↑چنین çınîn "تەون کردن".

**سواپ suwap** *[ suwāp ]* - "بەردی تەنکی پان": ساپ sap یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Scheibe (G.)، sciba (OG.)، skive (OF.)، skiva (Sw.) "سەفحە، شتی پان وتەنک". ئەم وشە ژێرمەنییانە دە بنەڕەتدا بە کوتی پان و تەنک گوتراون کە لە قەدی دار بڕدراون. ئەم وشەیە دەبردرێتەوە سەر ریشەی < -*skei (IE.) "بڕین". لە لایەکی دیکەوە هێندێک وشە دە زمانە ژێرمەنییەکاندا هەن وەک schaben (G.)، shave (E.)، skava (Sw.) "کڕاندن، ساوینەوە، داتاشین"، سەر بە ریشەی < -*ske-bh (IE.) "کڕاندن، سوونەوە و داتاشین بە شتی تیژ". دە کتێبە ئێتیمۆلۆژییەکانی زمانی ئەڵمانیدا ئاماژە بە پێوەندی وشە ژێرمەنییەکانی Scheibe "سەفحە" و schaben "کڕاندن، داتاشین" نەکراوە، بەڵام هەم لە رووی ماناکانی ئەم وشانە و هەمیش لەرووی ریشەکانیانەوە [-skei و -ske-bh] پێوەندی ئەم دوو وشەیە بە باشی دەردەکەوێ. ئەم دوو وشە ئەڵمانییە دەبێ دواجار لە ریشەیەکەوە سەرچاوەیان گرتبێ و هەروەها خزمیش بن دەگەڵ ↑سواڵەت suwalet "(لەت و پەتی) دیزە و گۆزە"، ↑ساوین sawîn و ↑ سوان suwan. لەم تێڕوانینەوە دەتوانین سواپ/ ساپ ببەینەوە سەر کرداری سوان و ساوین. وشەی ↑ساف² saf یش بە مانای "یەکدەست، تەخت، رێک، داتاشراو" دەبێ هەرلەم چوارچێوەیەدا جێی دەگرێ. ساوین [دە فارسیدا سابیدن sābīdan (P.)] هەروەک وشە ژێرمەنییەکان دە بنەڕەتدا بە مانای "کڕاندن و داتاشین و ساف کردن بە شتی تیژ" بووە و دواتر ماناکەی زۆرتر پەرەی سەندووە. لێرەدا وشەی صفحة sefĥe (Arb.) "سەفحە" [ساپە؟] سەرنج رادەکێشێ و دەشێ ئەمەش وشەیەکی بە ئەسڵ عەرەبی نەبێ و لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**سواخ suwax** *[ suwāx ]* - "قوڕ تێهەڵسوون و پێداماڵین": خزمە دەگەڵ کرداری *تێهەڵسوون* [بڕوانە ↑سوون sun، ↑سوان suwan، ↑*ساوین sawîn*].

سوار **suwar** *[ suwār ]* - "دژبەری پیادە": asprbak (.Pl). دە شێوەزاری زازاییدا دەگوترێ ئەسپار aspār . [بڕوانە فەرهەنگی پەهلەوی، ل. 28]. وێ دەچێ وشەکە لە دوو کەرتی ئەسپ esp و بارەک barek پێک هاتبێ. کەرتی دووەم جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ بر ber (.P) "سەر، لەسەر". لەم تێڕوانینەوە سوار واتا ئەو کەسەی لەسەر ئەسپە.

سواژ **sıuwaj** *[ suwāž ]* - "جەنگێ، شەڕ": سواش suwaş یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سفت sıfıt "توند، سەخت" [دە بنەڕەتدا: توند و تیژی].

سواڵ **suwal** *[ suwāl ]* - "گەدایی، پارسە": دەچێتەوە سەر سوال sual (.Arb) "پرس". شیاوی باسە کە تیوان دوو چەمکی "گەدایی" و "پرسین"دا پێوەندی هەیە. دوو وشەی "پرسین" و "پارسە کردن" ئەم پێوەندییە بە روونی دەردەخەن. مەبەست لە "پارسە کردن" دە بنەڕەتدا "پرسین" بووە سەبارەت بە بەجێ هێنانی داواکارییەک.

[تێبینی: لەباری پێوەندی ماناکانی سەرەوە بە یەکدی وشەی ask (.E) جێی سەرنجە، کە هەم بە مانای "پرسین" دێ و هەمیش بە مانای "داوا کردن"].

سواڵەت **suwalet** *[ suwālat ]* - "(لەت و پەتی) دیزە و گۆزە": سفال sofāl (.P) "دیزە و گۆزە، شتی گڵینی سوورەوەکراو". دە زمانی فارسیدا هەروەها سبو sabū (.P) هەیە بە مانای "گۆزەڵە". وشە کوردمادییەکە دەبنەڕەتدا سواڵ + لەت suwal + let بووە بە مانای "لەت و پەتی دیزە و گۆزە". خزمە دەگەڵ Schaff (.G)، scapf (.OG) "دەفر"، scaphium (.L) "دەفر، تەشت، قاب و قاپاخ"، scapha (.L) "قایق، بەلەم"، Schiff (.G) "کەشتی"، سەر بە ریشەی **> *skā-bh* (.IE)** "ساوین، کڕاندن، تاشین". بەم پێیە وشەکە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ساوین sawîn.

سوان **suwan** *[ suwān ]* - "ڕێخستران، توێژ لێکرانەوە، ساف و تەخت بوون": دەچێتەوە سەر ↑سوون sun و↑ساوین sawîn.

سوان(ە) **suwan(e)** *[ suwāna ]* - "لێواری سەربان": سواندە suwande و سێڤاندە sevande ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سیڤان sîvan "چەتری بەرخۆر" و شێوەیەکی دیکەیە لە↑سەیوان seywan "*سایەبان*". سوانە بەو لێوارەی سەربان گوتراوە کە دێتە پێشەوە و سێبەر دروست دەکا.

سوپا **supa** *[ supā ]* - "لەشکر، قۆشەن": سپا sıpa ش دەگوترێ. سپاه sepāh (.P). ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەند وشەیەک دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا کە ئاماژە بە لەبەریەک کشانەوە، بەربڵاوی، زۆری و فرەیی و دوور و درێژی دەکەن و دەچنەوە سەر ریشەی **> -*sp(h)ē(i)* (.IE)** "لەبەر یەک کشانەوە، هەراو بوونەوە، درێژ بوونەوە". خزمە دەگەڵ ↑زاف zaf و↑ زۆر zor و ↑ئەسپایی espayî [ئە + سپایی]. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ spatium (.L) "فەزا" و spahr (.Pl) "ئاسمان، گەردوون" و ↑سفرە sıfre.

سوختە **suxte** *[ suxta ]* - "خوێندکاری سەرەتایی دە دەرسی ئاییندا، تازەفەقێ": ئەم وشەیە ناتوانێ پێوەندی بە "سوختن"ی فارسی واتا "سووتان"ەوە هەبێ، چونکوو لەم مانایەوە ناتوانین مانای "خوێندکار، فەقێ" هەڵێنجین. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑دۆزین dozîn "پشکنین، بە شوێندا گەڕان"، [دوزینەوە dozînewe "پەیدا کردن"]، ↑سەچتین seçtîn "پشکنین" و ↑سۆسە sose کردن "بە گومان دۆزینەوەی نەهێنی". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ suchen (.G)، suohhen (.OG)، sōkjan (.Gt)، seek (.E)، söka (.Sw) "بەدوادا گەڕان، دۆزین، پەیدۆزی کردن"، سەر بە ریشەی **> -*sag* (.IE)** "دۆزین، سەچتین". sagire (.L) "هەست کردن، سۆسە کردن"، saigim (.OIn) "دەیدۆزم، بە شوێندا دەگەڕێم"، hēgeīsthai (.Gr) "بەرەو پێش چوون" خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

[تێبین: دە زمانی عەرەبیدا وشەی **طلبة** "خوێندکار" دە بنەڕەتدا مانای "خوازیار" دەبەخشێ، واتا کەسێک کە خوازیاری زانستە و بە دوایدا دەگەڕێ].

**سوخمە suxme** [ *suxma* ] - "کولێجە": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Schuh (G.)، scuoh (OG.)، skōhs (Gt.)، shoe (E.)، sko (Sw.) "کەوش، پێڵاو". وشە کوردی و ژێرمەنییەکان هەروەها هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑چەکمە çekme. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *(s)keu- >** "داپۆشین". لەم ریشەوە گەلێک وشە دە زمانی کوردمادی و زمانە ژێرمەنییەکاندا سەرچاوەیان گرتووە کە بە مانای سەرپۆش، سەرپەنا، تیپێچ و جلو بەرگێ بەکار دێن. دە زمانە کوردمادیدا بۆ وێنە ↑قایش qayış ["قایش" هەڵسەنگینە دەگەڵ ↑هەیاسە heyase]، ↑هۆدە hode دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

**سوڕ sur** - "جێگەی سەربەرێژێری خلیسک": سر sor (P.) "خلیسک". خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە ئاماژە بە "خلیسک" و "خلیسکان" دەکەن، وەک ↑سل sıl [سلەگوو]، ↑سۆرک sorık "ئاوهەڵدێر، تاڤگە"، ↑سوول sul "پلوسک، ئاوهەڵدێر"، ↑سولاڤ sulav "ئاوهەڵدێر"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)lei- >** "تەڕ و لیچق بوون، لووس و خلیسک بوون". slippen (Nl.) و slip (E.) "خلیسکان" لەم ریشەوە هاتوون. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەلپین şelpîn و چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا.

**سورک surık** - "حەوزی حەمام":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑سوڕ *sur* "جێگەی سەربەرێژێری خلیسک"، ↑سۆرک sorık "ئاوهەڵدێر، تاڤگە"، ↑سوول sul "پلوسک، ئاوهەڵدێر"، ↑سولاڤ sulav "ئاوهەڵدێر" و هتد. لەم تێڕوانینەوە مەبەست لە وشەکە خودی حەوز نەبووە، بەڵکوو ئەو شوێنە بووە کە ئاوی پێدا هاتووەتە خوار بۆ ناو حەوزەکە.

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑گۆل gol و ↑جوڕنە curne "خەزێنەی حەمام".

**سورمە surme** [ *surma* ] - "کل، تۆزی زێو بۆ چاوڕشتن": لەوانەیە پێک هاتبێ لە سور sur + مە me و کەرتی یەکەم دەگەڵ ↑خۆڵ xol و کەرتی دووەمیش دەگەڵ ↑ماک2 mak "ئاسۆ"، ↑مژ *mıj*، ↑مێش mêş خزم بێ و تێکرای وشەکە بە مانای "تۆزی ڕەش" [خۆڵەمێش] بێ.

**سوزمە suzme** [ *suzma* ] - "پاڵوێنە": خزمە دەگەڵ seihen (G.) و sigan (OE.) و sia (OIs.) "چکان، تکان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *seik- >** "دڵۆپاندن، چۆڕاندن". ↑چکان çikan و ↑تکان tıkan یش دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

**سوژن sujın** [ *sužın* ] - "تەبەنە، جەواڵدوز": سوزن sūzan (P.) "دەرزی". خزمە دەگەڵ siuwen (OG.)، sew (E.)، sy (Sw.)، siujan (Gt.) "دروون، دروومان کردن"، سەر بە ریشەی **(IE.) * seu-, *siu- >** "بەستن، لێکبەستن، دروون". sivayati (OIn.) "دەدروێ"، syuman (OIn.) "تەقەڵ، دەزوو"، sutra-m (Gr.) "دەزوو"، suere (L.)، şît (Rus.) "دروون" پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

**سوکرە sukre** [ *sukra* ] - "مەنجەڵ لە گڵی سوورەوەکراو": خزمە دەگەڵ ↑سەکرە sekre "جام، پیاڵە" [ساغر saġer (P.)] و دواجار ↑زیخ zîx و ↑زاخ *zax* "بەرد". دە بنەڕەتدا ئاماژە بە سوور کردنەوە و بەرداندنی قوڕ دەکا.

**سونگی sungî** [ *sungī* ] - "تیژە":

1- لەوانەیە پیوەندی بە سینگێ² sîng ەوە هەبێ بەمانای "داری نووک تیژ یان مێخ بۆ چەقاندن".

2- یان لەوانەیە پێوەندی بە زەنگێ¹ zeng ەوە هەبێ [زەبر و زەنگێ].

**سوهان suhan** [ *suhān* ] - "ریخ، شیاکە": خزمە دەگەڵ ↑سوهن suhın.

**سوهن suhın** - "سام، هەیبەت": جگە لەمە ↑سوهان suhan هەیە بە مانای "ریخ، شیاکە" و ↑سۆهانە sohane"ناوی هۆزێکی کورد". ئەم وشانە هەر چەند لە مانادا زۆریان جیاوازی دەگەڵ یەکتر هەیە، بەڵام لەباری ئێتیمۆلۆژیکەوە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سۆکین sokîn "بناخە، خیم" و چەندین وشەی دیکە وەک ↑ساخ *sax* و ↑سەخت sext. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت بوون، بە هێز بوون" و لە هەمان کاتدا مانای "بە دەسەڵات بوون، زاڵ بوون"یش

دەبەخشن. مەبەست لە "سوهن" دە بنەڕەتدا ئەو شتە یان ئەو کەسەیە کە بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێ و لەمەوە مانای "سام، هەیبەت" پەیدا بووە. [ئەم وشەیە دەبێ وەك überwältigen ی ئەڵمانی بەکارهاتبێ کە ماناکەی دەبێتە "بەسەردا زاڵ بوون، هێز لێ بڕین، سەرسام کردن". ئەم وشە ئەڵمانییەش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "بەهێز بوون، زاڵ بوون" و خزمە دەگەڵ "پاڵەوان"]. سەبارەت بە مانای "شیاکە" وا پێ دەچێ کە ماناکە "کەمرە" بووبێ، واتا شیاکەی پەستیوراو، رەق و سفت. سەرنج بدە کە وشەکانی "کەمرە"، "خیم یان هیم" بە مانای بناخە و هەروەها "قەمرین" بە مانای "سەهۆڵ بەستن" لە یەك ریشەوە هاتوون و هەر ئەم پێوەندییەش لە نێوان "سوهن" و "سوهان" و "سەهۆڵ"یش لە ئارادایە. هەروەها وشەی سۆهانە sohane وەك ناوی هۆزێکی کورد ماناکەی دەبێتە "سەخت، بەهێز، قەوی". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ سوهان souhan (P.) "بەردی تیژ کردن" [دە بنەڕەتدا: بەرد، هەروەها سەخت وەك بەرد]. وەك لەژێر وشەی "سۆران"دا باس کراوە، ناوی زۆرێك لە ناوچە و هۆزە کوردەکان لەو ریشانە وەرگیراون کە مانای "سەخت، بەهێز، قەوی" دەبەخشن.

**سویتە sıwîte** *[ sıwīta ]* - "قوڵکەی داو تێدا نانەوە": سووت sut یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون kun دا باس کراون، بەتایبەتی هەڵی سەنگێنە دەگەڵ کاویدن kāvīdan (P.) "هەڵکەندن، قووڵ کردن".

**سوێ suwe** *[ suwe ]* - "حەز، تامەزرۆیی و تاسەی بە ژان": سۆ so ش دەگوترێ.

1- لە لایەکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ sehnen (G.) و senen (OG.) "سۆ کردن، تاسە کردن، ئارەزوو کردنی بە تین و بە ژان"، senlich (G.) "تاسەبار، تاسەبارانە"، sen(e)lich (MG.) "خەمخۆرانە، پڕئێش و ئازار"، sehnsucht (G.) "تاسەباری، ئارەزووی دەروونی پڕ ئێش، نۆستالژی". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە نەدۆزراوەتەوە.

2- لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑سۆز soz و سووتان sutan ەوە هەبێ. لەم تێڕوانینەوە هەروەك چۆن دەگوترێ "لە تاوی تۆ" [تاو، تین، گەرما] یان "لە شەوقی تۆ" [شەوق، شەبەق، رووناکی]، هەر بەم جۆرەش گوتراوە "لە سۆی تۆ".

**سوێر suwer** *[ suwer ]* - "پڕخۆی": ↑سۆر sor یش دەگوترێ. شور šūr (P.). خزمە دەگەڵ sauer (G.)، sūr (OG.)، zuur (Nl.)، sour (E.)، sur (Sw.) "ترش". ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ sūras (Lit.) "سوێر" و sūris (Lit.) "پەنیری سوێر" [خزمە دەگەڵ ↑شیرێژ şîrej]، syr (Rus.) "پەنیر" و syroj (Rus.) "تەڕ، خاو، ترش"، سەر بە ریشەی < *sura-* (IE.) "ترش، سوێر، تەڕ".

**سوێس soes** *[ soes ]* - "تارمایی، رەشایی لە دوورەوە": خزمە دەگەڵ ↑سێ se "سێبەر" سەر بە ریشەی < *skot-* (IE.) "سێبەر، تاریکایی". skotos (Gr.) "تاریك" لەم ریشەوە هاتووە. ئەم وشانەی خوارەوەش هەر لەم پێوەندییەدا جێی شی کردنەوەن: ↑سۆسکە soske یان سوێسکە suweske "باڵدارێکە وەك کەو بەڵام بۆرە" و↑سووسەلێ susele "بزنی رەشی دەم و چاو سوور".

**سوێند suwend** *[ suwend ]* - سوگند sougand (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ schwören (G.)، swerian (OG.)، swaran (Gt.)، swear (E.)، svärje (Sw.) "سوێند خواردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ swaran (OG.) و answer (E.) "وڵام دانەوە" و svara (Rus.) "کێشە" [دە بنەڕەتدا: قڕە، هەرا] سەر بە ریشەی < *suer-* (IE.) "ئاخافتن، قسە کردن".

[تێبینی: یەکێك لە گۆڕانەکانی فۆنۆلۆژی زمانی فارسی، گۆڕانی فۆتیمی بە یە. زۆر رێی تێ دەچێ کە فۆتێمی دە وشە فارسییەکەدا گۆڕانی بەسەر داهاتبێ و شێوەی وشەکە دە زمانی کوردیدا کۆنتر بێ: سوێند s(u)wend ← سوگند sougend (P.)].

**سوێنە suwene** *[ suwena ]* - "تەشتی سوفال، کەشکی تێدا دەسوونەوە": خزمە دەگەڵ سوون و ↑ساوین sawîn. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑سواڵەت suwalet.

سوو **su** *[ sū ]* - ↑سووچ suç. [ده وشەی سێ سوو، چوارسوودا]. وشەکە دە بنەڕەتدا بە واتای "زەقایی، دەرپەڕیوی"یە و پێ دەچی وشەی سو su (P.) " لا، ئاراستە" پێوەندی بەم وشە کوردمادییەوە هەبێ.

سووتان **sutan** *[ sūtān ]* - "ئایسان، گڕ گرتن": ↑شەوتین şewtîn یش دەگوترێ. سوختن sūxtan (P.).

1- یان خزمە دەگەڵ ↑سپی sıpî [کۆنتر: سپید sıpîd] سەر بە ریشەی **< *kueit- (IE.)*** "هایسان، درەوشانەوە".

2- یانیش خزمە دەگەڵ Schwaden (G.) "تەم، هەڵم"، swađul (E.) "دووکەڵ"، swedan (OG.) "سووتانی وێڕای دووکەڵ کردن"، svīđa (OIs.)، svida (Sw.) "سووتان، کزانەوە"، سەر بە ریشەی **< *sueid- (IE.)** "هایسان، درەوشانەوە".

[تێبینی: وێ دەچێ ئەو دوو ریشە هیندوئەورووپییەی سەرەوە دە بنەڕەتدا هەر یەک ریشە بن و یەکیان لەوەی دیکەوە سەرچاوەی گرتبێ].

سووتوو **sutu** *[ sūtū ]* - "خۆڵەمێشی جگەرە و هتد":

1- لە لایەکەوە لەوانەیە پێوەندی بە کرداری ↑سووتان sātan ەوە هەبێ.

2- دووریش نییە وشەیەکی سەربەخۆ بێ و خزم بێ دەگەڵ soot (E.)، sōt (L.)، sót (ON.) "قورم، دوودە". ئەم وشانە دەبردرێنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "نیشتن" و دەبنە خزم دەگەڵ ↑نیشتن nîştın. وەک دەزانین قورم یان دوودە لەسەر شت دەنیشێ.

سووتە **sute** *[ sūta ]* - "جووڵاندنی کلک"، بۆ سەگ بەکار دێ [کلکە سووتە]. خزمە دەگەڵ ↑سڤک sıvık "سووک".

سووچ **suç** *[ sūč ]* - "گۆشە": ↑سیک sîk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سیچکە sîçke "خونچەی تازە" و ↑چووزە çuze "چەکەرە، تیرتکی گیا". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "دەرپەڕین، زەق بوون".

[تێبینی: پێوەندی دوو چەمکی "دەرپەڕین، دەرپەڕیو بوون" لە لایەک و " گۆشە و قەراخ" لە لایەکی دیکەوە دە زمانەکانی دیکەشدا دەبیندرێ، بۆ وێنە Ecke (G.) "سووچ، گۆشە" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "تیژ، تیژایی"]. وشەکانی ↑زەق zeq و ↑سیخ sîx یش پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەیە.

سووخ **sux** *[ sūx ]* - "زوقم": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە.

سووخار **suxar** *[ sūxār ]* - "جۆخین": بنەوشەی سووخ -sux شێوەیەکی دیکەیە لە جۆخ -cox دە وشەی ↑جۆخین coxîn دا.

سوود **sud** *[ sūd ]* - "قازانج، بەهرە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑سات² sat [سوور و سات].

سوور¹ **sur** [1] *[ sūr ]* - "رەنگی خوێن": سۆر sor یش دەگوترێ. سرخ sorx (P.). دە "فرهنگ ریشەشناختی زبان فارسی"دا (ل. 45) سەبارەت بە وشەی ئاڵ al 3 "سووری کاڵ" بەراوردی ئەم وشەیە کراوە دەگەڵ harda- (OI.) "سوور"، سەر بە ریشەی **< *sor-, *ser- (IE.)** "سوور". ئەم سەرچاوەیە بەڵام ئاماژەی بە چ وشەیەکی خزم دە زمانەکانی دیکەدا نەکردووە کە لەم ریشەوە سەری هەڵدابێ.

سوور² **sur** [2] *[ sūr ]* - "1- ئاشکرا، دیار 2- رەپ و راست گوتن 3- پێداگر": بە هەر سێ ماناکەیەوە رێک دەکەوێ دەگەڵ sure (E.) "دڵنیا، یەقین و ئاشکرا، پێداگر" < *sēcūrus (L.)* "دڵنیا، موتمەئین".

سوور(ان) **sur(an)** *[ sūr(ān) ]* - "میوانداری بە هۆی رووداوێکی خۆش": سور sūr (P.) "داوەت و میوانداری". دەبێ خزم بێ دەگەڵ شور šūr (P.) "هوروژان، دەنگ و هەرای زۆر، پشێوی، بەدبەختی و پەرێشانی، خۆشی، خۆشەویستی، شادمانی". دە زمانی کوردمادیدا ↑شووڕ şûr دەگەڵ "شەر" دێ [شەڕ و شووڕ şer û şûr]. ئەگەر سەرنجی مانای وشە فارسییەکە بدەین، دەبینین کە ئەم وشەیە هەم مانای "پشێوی، بەدبەختی" دەدا و هەمیش مانای "خۆشی و شادمانی". ئەمە نیشان دەدا کە مانای ئەسڵی وشەکە هیچکام لەمانە نییە، بەڵکوو مانای ئەسڵی دەبێ شتێک بێ کە لە هەردوو دۆخەکەدا روو دەدا و

ئەمەش بریتییە لە هوروۆزان، شڵەژان و هەرا و هەنگامە". دە زمانی فارسیدا کرداری شوریدن šūrīdan (.P) هەیە بە مانای "هوروۆزان، تیکەڵ بوون، تووڕە بوون، پەرێشان بوون" و هەروەها شورش šūreš "سەرهەڵدان، ئاژاوە، هورووژاوی". وشەی ↑شۆرش şorış "سەرهەڵدان، راپەڕین" لەم وشە فارسییە وەرگیراوە. لەم تێڕوانینەوە دەتوانین دەگەڵ دوو وشە هەڵی سەنگێنین:

1- ↑هورووژان hurujan [هارووژان harujan یش دەگوترێ]. لە ئەنجامی هورووژاندایە کە تووڕە بوون، پەشۆکان، سەرهەڵدان، ئاژاوە و هیتر دێنە ئاراوە. بۆیە لەوانەیە مانای بنەڕەتی "شووڕ" یان "سوور" هەمان "هورووژان" بێ، سەر بە ریشەی *ker(ə)- (.IE) "تیکەڵ کردن".

2- schüren (.G) "تیڵ دانی ئاگر، تین دان"، schorn (.MG) "پێکدادان، لێکدان، پاڵ نان، ڕادان". مانای تیڵ دانی ئاگر لەوانەیە لەوەڕا هاتبێ کە ئاگر بە هۆی لێدانی با و تیکوەردانی خۆش کراوە و پاشتریش مانای تین دانی ئاگر پەرەی گرتووە بۆ دنە دان [تینەدان] و هورووژاندن. وشە ژێرمەنییەکە دەچێتەوە سەر ریشەی < *skeu- (.IE) "کڕاندن، تیوەژاندن، لێکدان".

**سووڕان suran** [ *sūrān* ] - "گەڕان": شێوەیەکی تازەترە لە ↑زڤڕین zıvrîn.

**سوورکارە surkare** [ *sūrkāra* ] - "ئاماڵ سوور، سوورباو": دە بنەڕەتدا سوورکاڵە surkale بووە بەمانای سووری ↑کاڵ kal یاخود سوورێکی مەیلەو کاڵ. هەڵی سەنگینە دەگەڵ "رەشتاڵە" واتا رەشی مەیلەو تاڵ [تار]. لە جیاتی سوورکارە هەروەها سوورکەڵە surkele و سوورخوول surxul و سوورهوول surhul یش دەگوترێ.

[تێبینی: دە یەکێک لە فەرهەنگەکاندا "سوورکەڵە" وەک "رەنگێ سووری چکۆڵە" مانا کراوەتەوە. دیارە مانا کردنەوەی وشەکە بەم شێوەیە ڕاست نییە و "سوورکەڵە" هەمان "سوورکاڵە"یە کە دواتر بووەتە "سوورکارە"].

**سوورفل sûrfıl** [ *sūrfil* ] - "سوور خوول، کاڵی موو زەرد": پێک هاتووە لە ↑سوور sur + فل fıl. کەرتی "فل" خزمە دەگەڵ ↑بەڵەک belek بە مانای "سپی، رووناک". لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "سوورکارە".

**سووزەنەک suzenek** [ *sūzanak* ] - "جۆرێک نەخۆشی جینسی": سوزاک sūzak (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سووتان sutan. دە زمانی کوردمادیدا وشەی "سووتان" بەم شێوانەش دەگوترێ: سۆژان sujan، سووچان suçan، سۆزیان sozyan. لەوانەیە مەبەست لە وشەی "سووزەنەک" سووتانەوەی ئەو شوێنەی لەش بێ کە برین و چڵکی تێدا دروست دەبێ.

**سووسەلێ susele** [ *sūsalī* ] - "بزنی رەشی دەم و چاو سوور": خزمە دەگەڵ ↑سوێس soes "تارمایی، رەشایی لە دوورەوە". رەنگەی وشەی سووسەمار susemar پێوەندی بەم وشەوە هەبێ.

**سووک¹ suk** [ *sūk* ] - "کەم وەزن": شێوەی تازەتری ↑سڤک sıvık.

**سووک² suk** [ *sūk* ] - "حینچکە لێدان، ژەنین": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑سووچ suç، ↑سیخ sîx و ↑سیخاندن sîxandın "بەزۆر تێڕاکردن" و هتد. خودی وشەی ↑حینچکە ĥînçıke پێوەندی بەم وشەوە هەیە: "ئەنسووکە ← هەنسکە ← حینچکە].

**سووڵ sul** [ *sūl* ] - "پلوسک، ئاوهەڵدێر": خزمە دەگەڵ ↑سوڕ sur "جێگەی سەربەرێژێری خلیسک".

**سووڵان(ەوە) sulan(ewe)** [ *sūlānawa* ] - "چووزانەوە، کزانەوە":

1- یان خزمە دەگەڵ schwelen (.G) "سووتانی بە ئەسپایی و بێ بڵێسە"، swelan (.OE) "سووتان"، svelti (.Lit) "سووتان، هایسان"، سەر بە ریشەی < *suel- (.IE) "سووتان، هایسان".

[تێبینی: وشەی ↑خۆر xor "هەتاو" دە زمانی کوردمادیدا و وشە هاوبەرەکانی دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا دەچنەوە سەر ریشەی *sāule- (.IE) "خۆر". لەتێوان ئەم دوو ریشانەی سەرەوەدا خزمایەتی هەیە].

2- یانیش شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زوورانەوە zuranewe.

سوون(ەوە) **sun(ewe)** *[ sūnawa ]* - "ڕێخستن، ساف کردن، تیژ کردن": ↑ساوین sawîn.

سۆ **so** - "ڕووناکی، درەوشان": سو sū ‏(P.)‏، [سوسو زدن]. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑سۆما soma "سۆی چاوان".

سۆبایی **sobayî** *[ sobāyī ]* - "مەلە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schwimmen ‏(G.)‏، swimman ‏(OG.)‏، zwemmen ‏(Nl.)‏، swim ‏(E.)‏، svim(m)a ‏(OIs.)‏، simma ‏(Sw.)‏ "مەلە کردن"، سەر بە ڕیشەی **< *suem-** ‏**(IE.)** "(لەناو ئاودا) جووڵانەوە، شڵپەشڵپ کردن". لەوانەیە شنا šenā ‏(P.)‏ "مەلە" و هەروەها ↑چەم çem پێوەندیان بەم وشانەوە هەبێ.

سۆبە **sobe** *[ soba ]* - " کوورە، ئاگردان": سۆپە sope و زۆپا zopa ش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ Stube ‏(G.)‏ "دیوەلکە" [دە ئەڵمانی کۆندا بە مانای "ژووری گەرم کردن و خۆ شوتن"]، stoof ‏(Nl.)‏ و stove ‏(E.)‏ " ئاگردان، کوانوو"، stuga ‏(Sw.)‏ "ژووری چکۆڵەی گەرم وگوڕ". ڕیشەی وشە ژێرمەنییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆ چووتیک لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە typhos ‏(Gr.)‏ "هەڵم".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑سپی sıpî و سەر بە ڕیشەیەک بەمانای "سووتان، هایسان".

سۆپ **sop** - "جووتەگای دابەستراو": هەروەها سۆپار sopar هەیە بە مانای "جۆرێک گاسن". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ ↑شەپڵتە şepılte "بەفرماڵ، وەروەرە" و ↑شەپ *şep*. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "پاڵ نان، ڕا دان، دەرپەڕاندن، وە پێش خۆ دان".

سۆخرە **soxre** *[ soxra ]* - "بێگاری" [کاری بە زۆرەملی]: دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زەخت zext و ئەو وشانەی لەژێر ↑*ساخ sax* دا باس کراون.

[تێبینی: بە زمانی ئەڵمانی سۆخرە دەبێتە Zwangarbeit واتا کاری بە زۆرەملی، کار لە ژێر زەخت و زۆردا].

سۆر **sor** - ↑سوێر suwer.

سۆران **soran** *[ sorān ]* - "ناوی ناوچەیەکی کوردستان": وشەی "سۆرانی" کە بە هەڵە وەک ناوی شێوەزاری کوردمادی ناوەڕاست بەکار دێ، بۆ ناوی ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە، پێک هاتووە لە بنەوەشەی سۆر + پاشگری ئان sor + an. پاشگری an- ئاماژە بە ناوچەکان دەکا بەشێکە لە ناوی چەندین ناوچەی کوردستان، وەک گەرمیان germîyan، کرماشان kırmaşan، بادینان badînan، هەورامان hewraman ، بۆتان botan، ئەردەڵان erdelan، موکریان mukıryan، شەمزینان şemzînan، ئالان alan و هتد. ئەم پاشگرە دە زمانی فارسیشدا دەبیندرێ، بۆ وێنە دە وشەکانی "خراسان، گیلان، سمنان، کرمان، مازندران" و هیتردا. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیشدا پاشگرێکی لەم چەشنە بۆ ناوی وڵاتەکان بەکار دێ، وەک Indien "هیند"، Arabien "عەرەبستان"، Armenien "ئەرمەنستان" و هتد. دە وشەی سۆران soran دا بنەوشەی -sor خزمە دەگەڵ ↑*زۆر zor* "زەخت، هێز، گوشار"، واتا خەلکی ئەم ناوچەیە لە چوارچێوەی ناوی گشتی "کورد" و "کوردستان"دا ناوێکی تایبەتیشان لەسەر خۆیان داناوە، بۆ پێناسە کردنی خۆیان و ناوچەکەیان. خەڵکی ئەم دەڤەرە ئەم ناوەیان بردۆتەوە سەر وشەیەک کە مانای "بە هێز بوون، زاڵ بوون" دەبەخشێ و ویستوویانە ئەمە ڕابگەیەنن کە ئەوان خەڵکێکی ئازا و بەهێزن. "سۆران" هەروەها خزمیشە ↑زورار zurar "ناوی مەڵبەند و هۆزێکی کوردستان" و↑سۆرەک sorek "لێدان و کوتانی زۆر" واتا زەبر ە زەنگ.

[تێبینی: ئەگەر سەرنجی ناوی هێندێک لە ناوچەکان و خەڵکانی دیکەی کوردستان بدەین، دروستی ئەو بۆچوونەی سەرەوەمان باشتر بۆ دەردەکەوێ. بۆ وێنە ناوی ↑موکری mukrî و موکریان mukıryan خزمە دەگەڵ ↑موکور mıkur "پێداگر، (سەر)سەخت" و دواجار سەر بە ڕیشەیەکە بە مانای "هێز و توانا،

دەسەڵات". ناوی گۆران goran یان گووران guran خزمە دەگەڵ ↑گوڕ gur (هێز و گوڕ)، ناوی ئەردەڵان erdelanخزمە دەگەڵ ↑خار xar (سەخت، بەهێز)، ناوی فەیلی feylî خزمە دەگەڵ ↑پاڵەوان palewan، ناوی ↑مزووری mızûrî خزمە دەگەڵ ↑موکری mukrî و موکریان mukırıyan. هەروەها مەنگور menguršێوەیەکی گۆڕدراوە لە ↑موکور mıkur یان mukır (فۆتیمی n زێدەیە و کەوتووەتە ناو وشەکەوە)، واتا پێوەندی بە "موکری"یەوە هەیە. ناوەکانی شکاک şıkak، سۆهانە sohane و ↑سەکر sekır و ↑شوقاق şuqaq خزمن دەگەڵ ↑سەخت sext و لە ریشەیەکەوە هاتوون بە مانای "سەخت، بەهێز، زاڵ"، ناوی ↑گەورک gewırk خزمە دەگەڵ ↑گەورە gewre و دواجار دەگەڵ "زەبر"، ناوی ↑بۆتان botanخزمە دەگەڵ ↑پیت pît واتا هێز و توانایی"، زەنگەنە zengene دەچێتەوە سەر ↑زەنگ zeng (سۆران لە "زەبر" هاتووە و زەنگەنەش لە زەنگ، زەبر و زەنگ). بێگومان ئەگەر لە ناوەکانی دیکەش ورد ببینەوە، چەندین ناوی دیکە پەیدا دەکەین کە پێوەندیان بە چەمکی "بەهێز بوون"ەوە هەیە. جێی بیرهێنانەوەیە کە وشەی کورد kurd خۆشی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەهێز، سەخت". هەر بۆیە ناوچە و هۆزە کوردییەکان ویستوویانە لە چوارچێوەی ئەم مانایەدا ناوێکی تایبەتی لەسەر خۆیاندا بنێن کە پێوەندی بە مانای گشتی کوردەوە هەبێ].

**سۆرانی1 soranî 1** [ *soranī* ] - خەڵک وشێوەزاری ناوچەی ↑سۆران soran.

**سۆرانی2 soranî 2** [ *soranī* ] - "ئەنگوچکی درێژی کراسی کوردمادی":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑سووڕان suran. لێرەدا مەبەست لە "سووڕان" لە قۆڵ هاڵاندنە، چونکوو ئەو ئەنگوچکە بە چەند لۆ لە قۆڵ دەهاڵێنرێ.

2- یان لە ناوچەی ↑سۆران soran باوە و بۆیە پێی گوتراوە "سۆرانی".

**سۆرک sorık** - "ئاوهەڵدێر، تاڤگە": خزمە دەگەڵ ↑سوڕ sur "جێگەی سەربەرێژێری خلیسک". هەروەها ↑سورک surık هەیە بە مانای "حەوزی حەمام".

**سۆرە sore** [ *sora* ] - دەگەڵ "تۆرە" دێ و دەگوترێ: سۆرە و تۆرە sore u tore بە مانای "فرزەندی هەوێ" [بە گشتی کەس و کاری ناخۆشەویست]. تۆرە بە مانای "تۆرەمە"یە واتا "وەچە، نەسل". سۆرە لە تورکی وەرگیراوە: < *sora* (*Tur.*) "دوایە، دواتر". مەبەست لە "سۆرە" لێرەدا دەبێتە ئەو کەسانە کە دواتر دێنە سەر دنیا واتا بەرەی دواتر. دە زمانی ئەلمانیدا وشەی Nachwuchs بەمانای "بەرەی دواتر" دێ کە لە دوو کەرتی nach "دوایە، دواتر" و wachsen "گەورە بوون، پێگەیشتن" پێک هاتووە.

**سۆرەک sorek** [ *sorak* ] - "لێدان و کوتانی زۆر": خزمە دەگەڵ ↑زۆر2 *zor* [زەخت و زۆر] و ↑زەبر zebır [زەبر و زەنگ].

**سۆز soz** - "1- گفت، بڵێن 2- قسە 3- گۆرانی بە دەنگی نزم و خەمبارانە": خزمە دەگەڵ سخن soxan (P.) "قسە"، sagen (G.)، zegen (Nl.)، say (E.)، säge (Sw.)، sakyti (L.) "گوتن"، سەر بە ریشەی < ***soku-** (***IE.***) "گوتن" [کۆنتر: "دیتن، نیشان دان"].

[تێبینی: 1- سەبارەت بە پێوەندی "قسەکردن" و "بڵێن دان" دەتوانین ئاماژە بە زمانی ئەلمانی بکەین، کە تێیدا sprechen مانای "قسەکردن" دەدا و versprechen مانای "بەڵێن دان". هەروەها دەتوانین ئاماژە بە وشەی "قەول" بە مانای "بەڵێن" بکەین کە لە عەرەبی وەرگیراوە و دە ئەسڵدا مانای "قسە" دەبەخشێ. دیسان سەرنجی وشەی "گفت" بدە بە مانای "بەڵێن" کە دە ئەسڵدا بە مانای "گوتن"ە. 2- سەبارەت بە پێوەندی ماناکانی "قسە" و "گۆرانی" لە وشەی "سۆز"دا هەڵی سەنگێنە دەگەڵ دوو وشەی "وشە" و "ئاواز" کە لە یەک ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە].

**سۆزی sozî** [ *sozī* ] - "بەیانی": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑سپی sıpî، ↑سپێدە sıpêde، سفید sefīd (P.) [کۆنتر: سپید sepīd]، svēta (OIn.) "سپی"، svet (Rus.) "رووناکی"، šviesti (Lit.) "دەشەوتێ، دەئاییسێ"، ↑سۆزیان sozyan [↑سووتان sutan، ↑شەوتین şewtîn]،

سەر بە ریشەی **< IE.) *kueit-)** "سپی بوون، ڕووناك بوون، بریقانەوە". لەم تیروانینەوە دەتوانین لەباری ماناوە دەگەڵ "بەیانی" هەڵی سەنگینین کە ئەویش مانایەکی لەم چەشنە دەبەخشێ.

2- ↑سوێس soes "تارمایی، ڕەشایی لە دوورەوە"، سەر بە ریشەی **< IE.) *skot-)** "سێبەر، تاریکایی".

[تێبینی: لە پێوەندی دەگەڵ خاڵی دووەمدا دەتوانین دەگەڵ وشەی Morgen (G.) و morning (E.) "بەیانی" (دە ئەسڵدا: شەوەکی) هەڵی سەنگینین کە دەبێتە خزم دەگەڵ مۆران moran "تەم و مژ"].

**سۆژە1 soje** *[ soža ]* - "بێگاری": هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑سۆخرە soxre "بێگاری".

**سۆژە2 soje** *[ soža ]* - "داد و هاوار": خزمە دەگەڵ ↑سۆز soz "گفت، بڵێن، قسە".

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا هێندێك وشە بە مانای "قسەکردن"، "بانگ کردن"، "هەراکردن"، هاوار کردن" هەن کە لە یەك ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە وشەکانی "ورتە"، "هاوار"، "هۆرە" خزمن دەگەڵ Wort (G.) "وشە"، وشەکانی "بێژتن"، "وشە"، "ئاواز" لە یەك ریشەوەن، هەروەها "قسە" و "قیژە" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە].

**سۆس sos** - "کەپەك، درشتەی سەر هێڵەگ": سبوس sabūs (P.) "پووش، کەپەك". خزمە دەگەڵ ↑*ساوین sawîn*، ↑ساوار sawar، ↑سەپان sepan و چەندین وشەی سەر بەم خێزانە کە باس لە "ساوین" دەکەن. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "ڕێخشاندن، ساوین، پێدا ماڵین، داتاشین، ورد کردن".

**سۆست sost** - "سۆز، پەیمان، بەڵێن": بڕوانە ↑سۆز soz.

[تێبینی: لەوە دەچێ کۆنتر کردارێك هەبووبێ لە چەشنی *سۆستن sostın** بە مانای "قسە کردن، بەڵێن دان". "سۆست" دەبێ پاشماوەی ئەم کردارە بێ].

**سۆسکە soske** *[ soske ]* - "باڵدارێکە وەك کەو بەڵام بۆرە": سوێسکە soeske ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سوێس soes "تارمایی، ڕەشایی لە دوورەوە".

**سۆسە1 sose** *[ sosa ]* - "دۆزینەوەی نهێنی": خزمە دەگەڵ ↑دۆزین dozîn "پشکنین، بە شوێندا گەڕان".

**سۆسە2 sose** *[ sosa ]* - "شنەبا، بای نەرم": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ sausen (G.) "وژە کردن، ویزە کردن، بە خێرایی بزوان". ریشەی وشە ژێرمەنییەکە لاسا کردنەوەی دەنگە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وێنە دەگوترێ Der Wind saust in den Bäumen "با بە ناو دارەکاندا دەوژێنێ"].

**سۆغین soġîn** *[ soġīn ]* - "ئەنجام دان، پێك ئانین": بە داخەوە دە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا شێوەی بەکار هێنانی ئەم وشەیە ڕوون نەکراوەتەوە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ siegen (G.) "سەرکەوتن، زاڵ بوون" و ↑*ساخ sax* دە زمانی کوردمادیدا. لەوانەیە وشەکە دە ئەسڵدا بەمانای "ساخ کردنەوە" بەکار هاتبێ [ساخ کردنەوەی کارێك، کێشەیەك]. وشەی "ساخ" خۆی خزمە دەگەڵ سەخت "بەهێز، قایم". هەروەها بەراوردی "سۆغین" بکە دەگەڵ ↑سۆکین sokîn "بناخە، هیم". دیارە ئەم وشەی دواییش دە ریشەدا هەر بە مانای "سەخت و قایم"ە، چونکوو تایبەتمەندی بناخە، سەخت و قایم بوونەکەیەتی.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی ئەم مانایانەی سەرەوە دەکرێ وشەی verwalten (G.) [ver-walten] "بەرێوە بردن، هەڵسووڕاندن، ڕێك و پێك کردن" بە نموونە بێنینەوە کە دە ریشەدا دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "سەخت، بەهێز، زاڵ" و مەبەست زاڵ بوون بە سەر کار و ئیشدا بووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "پاڵەوان" دە زمانی کوردمادیدا].

**سۆفی sofî** *[ sofī ]* - "ئەهلی تەریقەت": sūfī (P.) < *(Gr.) sophos* "وەیس، زانا".

**سۆکی sokî** *[ sokī ]* - "ئامرازی ساوار کوتان": خزمە دەگەڵ ئەم وشانەوەی کە لەژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە، وەك ↑سۆکین sokîn "بناخە"، سۆهان souhan (P.) "بەردی تیژ کردن"، زاگ zag "جۆرە بەردێك"، ↑شژ şıj "بەردی کلۆر"، ↑شووشە şûşe "جام، گلاس" [دە بنەڕەتدا: بەرد]. وەك دەبینرێ

چەندین وشەی سەر بەم خێزانەی مانای "بەرد" دەبەخشن و ئەمەش ئەو شتە بووە کە وەك ئامرازی ساوار کوتان کەڵکیان لێ وەرگرتووە.

سۆکین **sokîn** *[ sokīn ]* - "بناخە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە. هەروەها هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑سۆغین soġîn.

سۆڵ **sol** - "کەوشی بێ پانییە": هەروەها سۆلبەند solbend هەیە بە مانای "ناڵبەند". خزمە دەگەڵ Sohle (G.)، sola (OG.)، zool (Nl.) "بن، بەر" [بەری لاق، بنی کەوش]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر > *solum (L.)* "بن، بەری خوارەوە، رووبەری بنەوە".

سۆڵ**1 sol** - دەگەڵ "سەرما" دێ [سەرما و سۆڵ serma u sol].

1- یان خزمە دەگەڵ kühl (G.)، cool (E.)، koel (Nl.)، kuoli (OG.) "فێنك، سارد" و هەروەها ↑سارد sard،

2 - یانیش شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سەهۆڵ sehol "یەخ".

سۆڵ**2 sol** - دەگەڵ "سفت" دێ [سفت و سۆڵ sıft û sol].

1- یان خزمە دەگەڵ ↑سەهۆڵ sehol "یەخ" [بەفری رەق، بەفری سەخت]،

2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑زاڵ zal "بەدەسەڵات، بەهێز".

[تێبینی: لەتیوان چەمکەکانی "سەخت بوون" و "زاڵ بوون"دا پێوەندی هەیە. بۆوێنە دە زمانی کوردمادیدا "چیڕ" بە مانای "سفت، سەخت" دێ و "چیرە" دە زمانی فارسیدا مانای "زاڵ" دەبەخشێ. یان "سەخت" دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ siegen (G) "زاڵ بوون"].

سۆڵ**3 sol** - دەگەڵ "سپی" دێ [سپی و سۆڵ sıpî u sol]. بە شێوەیەکی دیکە دەگەڵ "زەرد" دێ [زەرد و زۆڵ zerd u zol]. بڕوانە ↑زۆڵ zol، دە ریشەدا بە مانای "درەوشانەوە".

سۆڵ **4 sol** - "پڕخوێ، سوێر": شێوەیەکی دیکە لە سۆر sor [↑سوێر soer]. هەروەها ↑سۆڵەکە soleke هەیە بە مانای "لۆرکی سۆڵ".

سۆلە **sole** *[ sola ]* - "هەڵاش، چرپی": هەروەها سولە sule هەیە بە مانای "پووش (ی هەرزن و چەڵتووك)". ئەم دوو وشەیە دە بنەڕەتدا هەر یەك وشە بوون. خزمە دەگەڵ ↑چاڵ çal [چیلکە و چاڵ].

سۆڵە **sole** *[ sola ]* - "بڵێسە": سۆڵەچرا یان چۆڵەچرا مانای "مەشغەڵ" دەدا.

1- یان خزمە دەگەڵ ↑سووڵان(ەوە) sulan(ewe) "چووزانەوە، کزانەوە"،

2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑سۆڵ3 sol [سپی و سۆڵ].

سۆڵەکە **soleke** *[ solaka ]* - "لۆرکی سۆڵ": بڕوانە ↑سۆڵ 4 sol "پڕخوێ، سوێر" و ↑سوێر*soer*.

سۆلینە **solîne** *[ solīna ]* - "گونجە، رێگەی ئاو لە سواڵەت": خزمە دەگەڵ ↑سوول sul "پلوسك، ئاوهەڵدێر" و دەگەڵ ↑سوڕ sur "جێگەی سەربەرێژێری خلیسك".

سۆما **soma** - "سۆی چاوان": خزمە دەگەڵ schemen (G.) ، scem(e) (OG.) "تارمایی، شەوە"، scēme (MNl.) "سێبەر، درەوشانەوە(ی کەم)، scima (OE.) "بوومەلێڵ" [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ شام šām (P.) و↑شێو şêw واتا کاتی بوومەلێڵی ئێوارە]، skim(i) (OIs.) "تیشك، درەوشاوەیی"، skeima (Gt.) "چرا"، skiā(Gr.) "سێبەر،سایە"، هەروەها خزمە دەگەڵ دەگەڵ Schime (MG.) "بریقە، تروسکە"، schimmern (G.) "درەوشانەوە(ی مات)"، و shine (E.) و scheinen (G.) "درەوشانەوە"، سەر بە ریشەی > ***skāi-(IE.)*** "درەوشانەوە(ی مات)، لە بن شتێکەوە درەوشان و خۆ بە دیار خستن". وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێك وشە دە زمانی کوردمادیدا وەك ↑سۆ so [سۆی چاو]، ↑شێ şê [رەنگێکی ئەسپ]، ↑شێو *şêw*، ↑شەمشەمەکوێر şemşemekuwere، ↑شووم şûm و↑ سەمەن semen "کەوە، خۆڵەمێشی"،

↑سەمانەک semanek "بالدارێکە زلتر لە ڕەشۆڵە" و لەوانەشە ↑سەمیت semît "ماکێکی ڕەش لەسەر دەرگای خەڵیفەهەنگ" و هتد.

**سۆنک sonk** - "تۆز و خۆڵ، تەپ و تۆز": خزمە دەگەڵ ↑تنووک tnuk [تاریک و تنووک tarîk u tnuk].

**سۆنگە songe** [ *songa* ] - لە سۆنگە واتا بەخاتری، لەبەر، لەپێناو. دەشێ پێوەندی بە↑سەبا seba ەوە هەبێ.

**سۆنە sone** [ *sona* ] - "مراوی تیر": خزمە دەگەڵ Schwan (G.)، swan (OG.) و (E.)، zwaan (Nl.)، svan (Sw.) "قوو، قورینگ". وشەکە خزمە دەگەڵ swinn (OE.) "مۆسیقا، گۆرانی"، swinsian (OE.) "چڕین"، -svanati (OIn.) "دەنگی لێ دێ" و sonare (L.) "دەنگ لێ هاتن، دەنگ هەڵبڕین"، -senn (OIr.) "ساز ژەنین"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *swen- <*** "دەنگ و ئاواز لێ هاتن". مەلی ناوبراو دەبێ بە هۆی دەنگ و ئاوازەکەی بەو جۆرە ناودێر کرابێ. دە زمانی کوردمادیدا مانای وشەکە لە "قورینگ"ەوە بۆ "مراوی تیر" گۆردراوە. دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑شین şîn [↑شیوەن şîwen] پێوەندی بەم وشەوە هەیە.

**سۆهانە sohane** [ *sohāna* ] - "ناوی هۆزێکی کوردمادی یەزدایی لە رۆژئاوای کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑سوهن suhın "سام، هەیبەت".

**سهاندن sıhandın** [ *sıhāndın* ] - "شاردنەوە": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەسهاندن vesıhandın]. خزمە دەگەڵ ↑شش şış یان شیش şîş "شاردنەوە بە زمانی زازۆک". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ئەو ریزەوشەیەی کە لەژێر ↑سەق seq دا باس کراوە و بە گشتی مانای "سەخت، بەهێز" دەبەخشن.

[تێبینی: دە زمانی ئاخاوتنی فارسیدا قایم کردن qāyem kardan مانای "شاردنەوە" دەدا. ئەم "قایم"ەی زمانی فارسی هەر ئەوەیە کە دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "توند، سفت" دێ (قایم کردن یان قورس و قایم واتا سەخت و بەهێز). بەم جۆرە دەردەکەوێ کە "قایم کردن"ی فارسیش دە بنەڕەتدا بۆ ئەو مانایە دەگرێتەوە. بە وتەیەکی دیکە کاتێک شتێک شاردراوەتەوە، ئەوا ئەو شتە قورس و قایم راگیراوە واتا لە شوێنێک بەند کراوە، توند کراوە، بۆ ئەوەی لە دەست نەچێ. دە زمانی ئەڵمانیدا verstecken مانای "شاردنەوە" دەگەیەنێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ stecken "قایم و جێگیر بوون" و دواتر stechen "تێهەڵچەقاندن". وەک دەبینین دە زمانی ئەڵمانیشدا لە مانای "تێ هەڵچەقاندن"ەوە مانای "قایم کردن، جێگیر کردن" و دواتر مانای "شاردنەوە" سەریان هەڵداوە].

**سهنتی sıhıntî** [ *sıhıntı* ] - "زللە، شەپلاغە": خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن *jendın* و چەندین وشەی دیکە بە مانای "لێدان". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑سەنتەنە sentene [سەنتەنە و دەبدەبە sentene u debdebe].

[تێبینی: بنەوشەی دەب -deb یش هەر مانای "لێدان" دەدا و خزمە دەگەڵ ↑تۆپ top].

**سهنە sıhne** [ *sıhna* ] - "تارمایی": ↑سەهوێر sehwîr یش دەگوترێ.خزمە دەگەڵ ↑سێ *se* "سایە، سێبەر" و ↑شانۆ şano.

**سەبا seba** [ *sabā* ] - "لەبەر، سەبارەت، سۆنگە": هەر سێ وشەی سەبا seba و سەبارەت sebaret و سۆنگە songe دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون و ماناکانیشان هەر یەکن. "سۆنگە" دەبێ پێشتر *سەبەنگە* *sebenge** بووبێ، بووەتە *سەوەنگە* *sewenge** و دواجار سۆنگە songe. ئەم وشەیە لەوانەیە پێوەندی بە ↑شەپ şep "رادان، پاڵ نان"ەوە هەبێ. لەم بارەوە بڕوانە ئەو شی کردنەوەیە کە لەژێر *سەدەم* "سەبا، بۆ خاتری"دا باس کراوە.

**سەبر sebır** [ *sabır* ] - "ئارامی، لەسەرەخۆیی": صبر sabr (P.) و (Arb.). ئەم وشەیە وێ دەچێ لە ڕێگای زمانی عەرەبییەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردمادی و فارسی. وشەکە بەڵام ریشەی لاتینی هەیە و دەچێتەوە سەر *(L.) sobrius* "لەسەرەخۆ، مەند، ئاوەزمەند، قانع". ئەم وشەیە هاتووەتە ناو زمانە

ژێرمەنییەکانیش و بۆ وێنە دە ئەڵمانیدا بووەتە sauber (G.) "پاقژ". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑زاڤێر zaver [زاوێر] هەیە بە مانای "رەحەت بوونی ژن". ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە. دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا دەبێژن "سەبرا من نایە" واتا من (بەو شتە) راحەت نابم، ئۆقرە ناگرم.

**سەبر2 sebır** [ *sabır* ] - "زبڵ و زاڵی ماڵ": شێوەیەکی دیکە لە ↑زبڵ zıbıl.

**سەبڵ sebıl** [ *sabıl* ] - "گەوڕ، تەویلە، پشتێر": شێوەیەکی دیکە یە لە ↑گەوڕ gewır و خزمە دەگەڵ گەلێک وشە کە لەژێر ↑کون kun دا ریز کراون.

**سەبەتانە sebetane** [ *sabatāna* ] - "سیرەی تفەنگ": خزمە دەگەڵ ↑زاب zab "سەکۆ، دەکە" و ↑زۆپ *zop* "زەق، دەرپەڕیو".

**سەبەتە sebete** [ *sabata* ] - "شێوەیەکی دیکە لە ↑سەوەتە sewetw.

**سەبەل sebel** [ *sabal* ] - "نەخۆشییەکی چاو": خزمە دەگەڵ ↑*زوورانەوە zuran(ewe)* "ئێشان، کزانەوە". ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *suer- <** "ئێشان، چڵک کردن". وەک لەوێدا شی کراوەتەوە، لەم ریشەوە چەندین مانای جۆربەجۆر، بەڵام هاوپێوەند سەریان هەڵداوە کە لە هێندێک وشەدا خۆیان دەبینەوە. دەستەیەک لەم وشانە ئاماژە بە"ئێش و ئازار" دەکەن، بەڵام دەستەیەکی دیکە ئاماژە بە چەند چەمکێک دەکەن، کە بریتین لە "گوشار، هێز، زەخت، سەختی، دژواری، گەورەیی، قەبەیی" و هتد. چەند نموونەیەک لەم وشانە بەم شێوەیەن: ↑جەور cewır "زولم و زۆر" [هاوکات ئێش و ئازار: جەوری رۆژگار، جەور و جەفا]، ↑زەبر zebır "زەربە" [دەبنەڕەتدا: هێز، گوشار، پاڵ]، ↑زوور zur یان ↑زبر zıbır "رەق، سەخت، درشت"، ↑زەبەلاح zebelaĥ "مەزن"، گەڤار gavar یان ↑گەورە gewre "مەزن" [دەبنەڕەتدا: خاوەنی هێز، قورسایی، گرینگ]. دە راستیدا ئەم وشانە گشتیان لە یەک وشەی بنەڕەتی پەیدا بوون کە ئەویش *زەڤەر* zaver*ە. وەک دەبینرێ، ئەم وشانە بەگشتی هەڵگری دوو چەمکن، یەکەم "سەختی، هێزداری، قورس و قایمی"، دووەم "مەزنایی، گەورەیی". بەم جۆرە وشەی سەبەل sebel "چاوئێشە" پێوەندی پەیدا دەکا بە سەبەلان sabalān "ناوی یەکێک لە دوو چیای هەرە بەرزی ئازەربایجان".

[تێبینی: ناوی چیاکانی سەهەند sehend و سەبەلان sebelan و گەلێک ناوی دیکەی شوێنەکانی ئازەربایجان بە تەواوی دەری دەخەن کە وڵاتی ئازەربایجان دە ئەسڵدا هیچ پێوەندییەکی بە تورک و زمانی تورکییەوە نەبووە و نییە. ئەم وڵاتە لە کۆندا بەشێک بووە لە وڵاتی گەورەی ماد و خەڵکەکەشی بەشێک بوون لە مادەکان [کوردمادەکان] و زمانەکەیان کوردمادی بووە. دواتر پاش هێرش و داگیرکاری تورکەکەکان بەداخەوە زمانی خەڵکی ئەو ناوچەیە گۆڕاوە و خەڵکەکەی تووشی ئاسیمیلەی زمانی بوون، هەر وەک خەڵکی ئەمریکای لاتین کە زمانی سپانی و پرتەقاڵی بەسەریاندا سەپێنراوە. کەوابوو ئازەرییەکان وەک گەل "تورک" نین و تەنیا زمانەکەیان تورکییە، هەر وەک چۆن گەلانی ئامریکای لاتین، سپانی یان پرتەقاڵی نین، بەڵام بە حوکمی دەسەڵاتداری داگیرکەران زمانەکەیان گۆڕاوە. ئەو بەشە لە ئازەرییەکان کە لەژێر پڕوپاگەندەی تورکە شۆڤینیستەکاندا خۆیان بە تورک دەزانن، لە راستیدا بە تەواوی ئاسیمیلە بوون، نکۆڵی لە مێژوو، زمان و فەرهەنگی رەسەنی مادی [کوردمادی] خۆیان دەکەن. ئەوان بەم هەڵوێستەیان هەروەها دەکەونە رێزی داگیرکەرانی ئاسیای ناوینەوە کە هەمووی هەزار ساڵ زۆرتر نییە دەستیان بەسەر ئەو ناوچانەدا گرتووە و لانی کەم دووهەزارساڵ بەر لە هێرش و داگیرکاری ئەوان مادەکان [کوردمادەکان] خاوەنی ئەم وڵاتە بوون و گەلێک ناوی وەک "سەهەند" و "سەبەلان" بۆ زمانی ئەوان دەگەڕێتەوە. بۆ ناوی چیای "سەهەند" بڕوانە ↑سەهەندا sehend "زۆر سارد (خزمە دەگەڵ ↑سەهۆڵ sehol) و ↑سەهەندە sehende "1- بزۆز و نائارام 2- ئاژاوەچی 3- زرینگ 4- سەرسەخت و لاسار". دیاردەیەکی پێکەنینی و منداڵانە کە لەم دوایانەدا پەیدا بووە و بێگومان تورک و

پارسە داگیرکەرەکان دەستیان تێدایە و پەرەی پێ دەدەن، ئەوەیە کە هێندێک لە ئازەرییە خۆ بە تورک زانەکان باس لەوە دەکەن کە بەشێکی پان و بەرینی کوردستان خاکی ئازەرییەکانە کە کوردەکان وەک میوان و کۆچەر تییدا دەژین!! ئەو گێلانە پەنا بۆ ناوی بە تورکی کراوی هێندێک شار و گوند لە کوردستان دەبەن (وەک ناوی سابڵاغ، ساوجبلاغ: کانیاوی سارد) و دەیکەنە بەڵگە بۆ ئازەری بوون (یان تورکی بوون)ی ئەو شوێنانە. بەڵام وەک لەسەرەوە باس کرا، تورک و زمانی تورکی هەمووی هەزار ساڵە پێی داگیرکەرانەی کەوتووەتە ئەم ناوچانەوە. ئەو داگیرکەرانە نەک هەر زمانی بەشێکی زۆری گەلی کوردمادیان کردە تورکی، بەڵکوو لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانەیاندا ناوی دەیان و سەدان شوێنیان گۆڕی و کردیانە تورکی. ئەمەش دیاردەیەکە کە داگیرکەر لە هەموو وڵاتیکی داگیرکراودا پێادەی دەکا، بۆ ئەوەی گەلی داگیرکراو لە زمان و فەرهەنگ و مێژووی خۆی بسڕێتەوە. هەموو بەڵگە مێژووییەکان، بە بێ هیچ ئاوارتەیەک، ئەم راستییە دەسەلمێنن کە وڵاتی ئازەربایجان، هەر وەک ناوەکەی نیشان دەدا، بەشێک بووە لە وڵاتی ماد و زمانەکەشی مادی (کوردمادی) بووە. بێگومان ئەگەر ئێمە لیستەیەکمان لە ناوی دەیان و سەدان شار و گوند و چیا و دەشت و دۆڵی ئازەربایجان لەبەر دەستدا بێ، زۆر بە هاسانی دەتوانین نیشانی بدەین کە سەدان ناو لەم ناوانە فڕیان بە زمانی تورکییەوە نییە و ریشەکەیان بۆ زمانی مادی (کوردمادی) دەگەڕێتەوە. تەنانەت هەر بەم شێوەیە دەتوانین دەیان و سەدان ناوی کوردمادی لە ناوچە داگیرکراوەکانی باکووریش هەتا دەگاتە ئانکارا و ئەوبەرتر، بدۆزینەوە. بەراستی زۆر سەیر و بێشەرمانەیە کەسێک کە بەر لە هەزارساڵ خاک و وڵاتی تۆی داگیر کردووە، بە تۆی کە لانی کەم سێ هەزار ساڵە لەم وڵاتەدا دەژی، بڵێ تۆ بێگانە و کۆچەر و میوانی لەم وڵاتە!! ].

**سەبیلە sebîle** *[ sabīla ]* - "پیپ": چپق čopoq (G.). بنەوشەی سەب -seb هەر ئەویە کە دە وشە فارسییەکەدا بەشێوەی چپ- -čop دەردەکەوێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ↑سەپاندن sepandın و "چپاندن čapāndan (P.) "پەستاوتن". دیارە سەبیلە ئەو شتەیە کە تووتنی تێدا دەپەستێون و ئاگری دەدەن بۆ هەڵمژینی دووکەڵەکەی.

**سەپان sepan** *[ sapān ]* - "درووێنەوان": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawīn و ژمارەیەک وشەی سەر بەم خێزانە کە ئاماژە دەکەن بە ماناکانی رێخشاندن، رنینەوە، ساف کردن، تاشین و هتد. ئەم خێزانەوشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *ska-bh-, *ske-bh >* "بە ئامرازێکی تیژ کارکردن، داتاشین، کڕاندن، رێخستن". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ سپور sopūr (P.) "گەسک لێدەر" [دەبنەڕەتدا: گەسک رێخشێنەر].

**سەپاندن sepandın** *[ sapāndın ]* - "بە ملدا هێنانی بە تۆپزی": خزمە دەگەڵ چپاندن čapāndan (P.) "پەستاوتن" [دە بنەڕەتدا پاڵەپەستۆ کردن، بە زۆر تێنان]. خزمە دەگەڵ ↑سەبیلە sebîle [چپق čopoq]. "سەبیلە" توتنەکەی تێدا پاڵەپەستۆ دەکرێ و بۆیە ئەم ناوەیان لەسەر داناوە. دەتوانین دەگەڵ دوو وشە بەراوردی بکەین:

1- لەوانەیە هەمان ↑تەپاندن tepandın بێ بە مانای "1- شێلان، کوتان 2- ئاخنین".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑شەپ şep [دە بنەڕەتدا بە مانای "پاڵ نان، را دان"].

**سەپتک septık** *[ saptık ]* - "1- بەردێک کە دە جادە دەگیرێ 2- جۆگەئاوی داپۆشراو": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıft "توند، قایم".

**سەپک1 sepık** *[ sapık ]* - "ئامراز بۆ کوتانی پۆی چادر": خزمە دەگەڵ ↑شەپ *şep* "لێدان، کوتان" و ↑شەپک şepık.

**سەپک2 sepık** *[ sapık ]* - "خەپلە، سەولە": شێوەیەکی دیکە لە ↑سەولە sewle.

**سەپۆل sepol** *[ sapol ]* - "گێلۆکە، گەمژە": حەپۆل ĥepol یش دەگوترێ. دە بنەڕەتدا گەپۆل **gepol* بووە، بە مانای کەسێک کە هەر دەم دەکاتەوە. دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑حەپەسان ĥepesan.

سەپی **sepî** *[ sapī ]* - "پاڵاوتە": خزمە دەگەڵ ئەم وشانە: ↑سافان safan "دڵۆپە، چکە"، ↑سافۆ safo "پاڵوێنە، راوەک"، ↑زیپک zîpık "دڵۆپە"و هەروەها ↑کەو kew [کەو و بێژینکێ]. Sieb (G.) "پاڵوێنە" و چەند وشەیەکی ژێرمەنی دیکە پێوەندییان بەم وشانە هەیە و گشتیان دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "چۆڕاندنەوە، دڵۆپاندن".

سەت **set** *[ sat ]* - "دە جار دە": سەد sed یش دەگوترێ. صد sad (P.)، satam (OIn.)، centum (L.)، hekaton (Gr.)، hund (OE.)، cet (OIr.)، suto (OSl.) "سەد"، سەر بە ریشەی **( IE. ) *dekm(t)- >** "دە".

[تێبینی: سەیر ئەوەیە کە وشەی "سەد" دە زمانی فارسیدا بە پیتی ص دەنووسرێ کە پیتێکی ئەلفوبێی عەرەبییە و وشەکەش فری بە زمانی عەرەبییەوە نییە!].

سەترە **setre** *[ satra ]* - "زڵلە": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑ساتاندن satandın "کوتانی چەڵتووک".

سەتڵ **setıl** *[ satıl ]* - "دۆڵچە": setıl (P.). پێوەندی هەیە بە situla (L.) "سەتڵ". ریشە؟

سەتماندن **setmandın** *[ satmandın ]* - "رووخاندنی دیوار". هەروەها سەتم setım هەیە بە مانای "دارووخانی دیوار". خزمە دەگەڵ ↑ساتمە satme "هەڵەنگوتن، رەت دان" [دەبنەرەتدا: وێککەوتن، لێکدان، لێدان". "سەتماندن" بە مانای "پڕ کردنەوەی چاڵ"یش دێ. ئەم مانایە دواتر پەیدا بووە.

سەچتین **seçtîn** *[ sačtīn ]* - "پشکنین، گەڕان بە شوێندا": خزمە دەگەڵ suchen (G.)، suohhen (OG.)، sokjan (Got.)، soka (Sw.)، seek (E.) بە مانای "بەشوێندا گەڕان، پشکنین" سەر بە ریشەی **(IE.) *sag >** "بە شوێندا گەڕان، پشکنین". هەروەها saigim (OIr.) "دوای دەکەوم، بەشوێنی دادەگەڕێم"، sagire (L.) "سۆسەکردن، هەست پێ کردن، گومان لێکردن" خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. خزمیشە دەگەڵ ↑سۆسە sose. دە زمانی ئەڵمانیدا Suche (G.) واتا "بەشوێندا گەڕان، پشکنین".

سەخت **sext** *[ saxt ]* - "بە هێز، توند، رەق": خزمە دەگەڵ ↑*ساخ sax* "تەندروست" [دە بنەرەتدا: بەهێز، بەتوانا، سەخت، قایم". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا هاتوون.

[تێبینی: دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک هەیە لەتیوان ئەو وشانەی کە ئەم مانایانەی خوارەوە دەدەن: سەخت، رەق، بەهێز، قەوی، قورس و قایم، بەدەسەڵات، دەسەڵات، توانین، زاڵ بوون و هتد. بۆ وێنە وشەی "سەخت" خزمە دەگەڵ *ساخ* "بەتوانا، قورس و قایم"، *سەقام* "جێگیری، پایداری"، *زیخ* "بوێر"، *زات* "وێران" [توانین، هێز پێ شکان] و siegen (G.) "زاڵ بوون". هەروەها ئەم وشانەی خوارەوەش لە ریشەیەکی هاوبەشەوە هاتوون: *خار* "سەخت"، *خورت* "بەهێز"، kratos (Gr.) "هێز، دەسەڵات" و kratein (Gr.) "زاڵ بوون، دەسەڵاتدار بوون"، hart (G.) و hard (E.) "سەخت، پتەو"، *قورس* "قایم، جێگیر"، *کارین* "توانین" و هتد].

سەخڵەت **sexlet** *[ saxlat ]* - "پەرێشان، داماو، کۆڵەوار": پێک هاتووە لە دوو کەرتی سەخ + لەت let + sex. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext. وشەکە ئاماژە بە "سەختی و دژواری"یەک دەکا کە کەسێک تووشی دەبێ. کەرتی دووەم جێی هەڵسەنگاندن دەگەڵ last (G.) "بار" و laden (G.) "بار کردن، هەڵچنینی بار لەسەر یەکتر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑لۆدە lode "بارەگیا" دە زمانی کوردمادیدا. هەروەک چۆن دە وشەی "کۆڵەوار"دا، کەرتی "وار" هەمان "بار"ە و ئاماژە دەکا بەوە کە کەسێک "کول" و کەسەر بووەتە بار بە سەرییەوە [هەڵگری کول و کەسەر]، بە هەمان شێوە لەوانەیە کەرتی "لەت" دە وشەی "سەخڵەت"دا ئەم نەخشەی هەبێ. وشەی ↑شقلە şıqle "خەستە، نەخۆش" لەوانەیە پێوەندی بە "سەخڵەت"ەوە هەبێ.

سەخناخ **sexnax** *[ saxnāx ]* - "1- شوێنی سوخت لە چیا 2- ناوی کێوێکی کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext. کەرتەوشەی ناخ nax- لەوانەیە پاشگری ناک nak- بێ کە بۆ وێنە لە وشەکانی سامناک samnak، رووناک run(n)ak دا دەبینرێ. ئەم پاشگرە دە زمانی فارسیشدا بەکار دەهێنرێ وەک دە وشەکانی "خشمناک"، "دردناک"، "هولناک" و هیتردا.

**سەخەر sexer** [ *saxar* ] - ”ئابڕوو“: [دە بنەڕەتدا: *سەنگینی*، قورس و قایم بوون دە رەفتاردا، بەپێچەوانەی *سووك* و چرووك بوون]. خزمە دەگەڵ ↑سەق seq ”سەخت“. جێی ئاماژەیە وشەی ”قورس“یش دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”سەخت“.

**سەدەف sedef** [ *sadaf* ] - ”زیندەوەرێکی رەقی ناو چەم و ئاوان“: خزمە دەگەڵ ↑جدەو cıdew ”رەق بوونی ماسوولکە“. ناوی ئەم زیندەوەرە پێوەندی بە چەمکی ”رەق“ەوە هەیە.

**سەدەقە sedeqe** [ *sadaqa* ] - ”خێر“: بەگوێرەی بۆچوونی مامۆستا هەژار دە فەرهەنگی ”هەنبانە بۆرینە“دا وشەکە ”سەدیەکە“ بووە و لە زمانی عەرەبیدا کراوە بە سەدەقە. وشەکە لێرەوە پەیدا بووە کە لە سەردەمە کۆنەکاندا لە سەد دانە مەڕ و ماڵات یان پارە و پووڵ یەك دانەیان کردووەتە خێر [واتا یەك لە سەد].

**سەدەم sedem** [ *sedem* ] - ”سەبا، بۆ خاتری“: خزمە دەگەڵ ↑سەدەمە sedeme ”بەڵا، زیان“ و دواجار ↑ساتمە satme ”هەڵەنگوتن، رەت دان“، سەر بە ریشەی < ***stem-** ( **IE.** ) ”وێککەوتن“. مەبەست لە ”سەدەم“ دە بنەڕەتدا ”عیللەت، پاڵنەر“ بووە، واتا ئەو شتەی یان ئەو بزاڤەی کە شتێك بەدوای خۆیدا دێنێ، [بەدی دێنێ]. بۆ وێنە کاتێك دەگوترێ ”بە سەدەما شەڕێ لە کوردستانێ گەلێك مرۆڤین مە هاتینە کوشتن“، مەبەست ئەوەیە کە بە هۆ یان بە عیللەتی شەڕ. ئێستا با بزانین ئەم مانایە چۆن دروست بووە. لێرەدا دەتوانین بە دووشێوە شیرۆڤەی باسەکە بکەین. لە لایەکەوە لەوانەیە مانای بنەڕەتی ”وێککەوتن“، دواتر مانای ”تەکان، بزاڤ، پاڵ، پڵتۆك“ی بەدوای خۆیدا هێنابێ و لەمەشەوە مانای پاڵنەر impulse، بزوێنەر motive و دواجار مانای هۆ، عیللەت، سەبەب cause دروست بووبێ. لە لایەکی دیکەوە دەتوانین ئاماژە بەو وشانەی زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی بکەین: Stamm (G.) ”تەنە، تەنەی دار“، stammen (G.) ”لە ریشەیەکەوە هاتن، چوونەوە سەر ئەسڵ و نەسەب“، stem (E.) ”تەنە“. ئەم وشە ئینگلیزییە هەروەها پێشتر ئەم مانایانەشی هەبووە: ”قیت کردن، تەکان دان، بزاوتن، پاڵ نان“. وەك دەبینین لەم وشە ژێرمەنییانەشدا دوو مانا بەرچاو دەکەون، یەکەم مانای ”ریشە، بناخە“ و دووەم مانای ”تەکان، پاڵ، بزاڤ“ و وەك لەسەرەوە شی کراوە، ئەم مانایانە دەگەڵ مانای ”عیللەت“ یەك دەگرنەوە. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی< ***sta-** ( **IE.** ) ”هەستان، بەپێوە بوون“. بە گوێرەی بۆچووتێك خودی ریشەی **stem-* ( *IE.* ) ”وێککەوتن“ دواجار دەچێتەوە سەر ریشەی **sta-*.

[تێبینی 1: دە زمانی ئەڵمانیدا دوو وشە بە مانای ”سەبارەت، لەبەر، بەهۆی“ بەکار دێ: wegen کە دەچێتەوە سەر Weg ”رێگا، پێناو“ و aufgrund کە دەچێتەوە سەر Grund ”بناخە“. هەروەها Grund ی ئەڵمانی و ground ی ئینگلیزی بە مانای ”دەلیل“ بەکار دێن و ئەمەش خۆی پێوەندی بە چەمکی ”عیللەت“ەوە پەیدا دەکا [بە دەلیلی، بە عیلەتی]. تێبینی 2: لە زمانی کوردمادیدا هەروەها وشەکانی ”سەبا“، ”سەبارەت“ و ”سۆنگە“ هەن کە ئەم مانایانە دەبەخشن: لەبەر، بۆخاتری، لەپێناو، بەهۆی“. ئەم سێ وشەیە هەرسێکیان دەبێ دە کۆندا یەك وشە بووبن، خزمن دەگەڵ ”شەپ“ و دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”پاڵ نان، را دان، دەرپەڕاندن“. دیسان شیاوی باسە کە دە زمانی ئەڵمانیدا Ursprung”هۆ، سەبەب، عیللەت“ دەچێتەوە سەر کرداری Springen ”دەرپەڕین“].

**سەدەمە sedeme** [ *sadama* ] - ”بەڵا، زیان“: خزمە دەگەڵ ↑ساتمە satme ”هەڵەنگوتن، رەت دان“، سەر بە ریشەی < ***stem-** ( **IE.** ) ”وێککەوتن“. وشەی ”زیان“ یش خزمە دەگەڵ ”زەنگَ“ [زەبر و زەنگَ]، هەروەها ”بەڵا“ خزمە دەگەڵ *پڵۆسین* ”لێدان“. مەبەست لە هەر سێ وشەکە-سەدەمە، زیان، بەڵا- دە بنەڕەتدا ”لێدران، وێکەوتن“ە، واتا هێزێك لە کەسێك یان شتێك دەدا، وێی دەکەوێ کە لە نەنجامدا ئێش و ئازار یان خراپ بوون و خەوشدار بوون بەدی دێ.

سەر **ser** [ *sar* ] - "کەللە، دوند، بڵیندترین شوێن": سر sar (P.). خزمە دەگەڵ sira (OIn.)، kárā (Gr.) "سەر" و cerebrum (L.) "مێشک" و kranion (Gr.) "کەللە سەر"، سەر بە ریشەی *(IE.) *ker- >* "سەر، دوند، قۆچ، بەرزترین شوێن". لەوانەیە وشەی ↑کەللە kelle ش شێوەیەکی دیکە بێ لە سەر.

سەرا **sera** [ *sarā* ] - "ماڵی گەورە، کۆشک، تالار": سرا sarā (P.). دە هەردووک زمانی کوردمادی و فارسیدا وەک پاشگر دەگەڵ هێندێک وشە دێ وەک کاروانسەرا، مهمانسرا (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- Saal (G.)، sele (OE.)، salle (OF.)، sala (It.) "دیو، هۆدە (ی گەورە)، سەرا". ریشەی ژێرمەنی: *salaz* *(Grm.)* *، ریشەی هیندووئەورووپی باس نەکراوە.

2- cella (L.) "هۆدە یان خانووی چکۆڵە". وشەی سلول sellūl (P.) "دیوەلکە، شانە یان خانەی لەش"، Zelle (G.) "دیو، دیوەلکە"، Keller (G.) "ژێرزەمین" لەم وشە لاتینییە وەرگیراون.

سەرانگۆلک **serangolk** [ *sarāngolk* ] - "گووفک، جێگەی لێ رشتنی پەین و ریخ": پێک هاتووە لە دوو کەرتی سەران + گولک seran + golk. "سەران" شێوەیەکی دیکەیە لە سەرین serîn و ↑سەرگین sergîn بە مانای "ریخ". گۆلک golk هەروەک گوفک gufk شێوەیەکی دیکەیە لە ↑گەوڕ gewır "تەویلە" و خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑کون *kun* دا شی کراونەوە.

سەرپەرەست **serperest** [ *sarparast* ] - "چاوەدێری ماڵ یان گرووهێک": سەرپەرستserperıst یش دەگوترێ. سرپرست sarparast (P.). لە ↑پاراستن parastın وەرگیراوە و مەبەست پاراستنی سەرخێزانە. کەرتی ↑سەر ser ئاماژەیە بە کەسانی ناو ماڵ. [ماڵی کاک هەردی پێنج سەر خێزانن].

[تێبینی1: وشە فارسییەکە دەشێ وشەیەکی کۆنی فارسی نەبێ، بەڵکوو لە "پاراستن"ی وەرگیرابێ، چونکوو "پاراستن" بەم شێوەیە و بەم مانایە دە زمانی فارسیدا نییە. تێبینی 2: دە زمانی ئەڵمانیشدا Kopf "سەر" لەپاڵ مانا بنەڕەتیەکەی خۆیدا، هەروەها بە مانای "کەس، نەفەر" یش بەکار دەهێنرێ، بۆ وێنە دەگوترێ vierköpfige Familie واتا خێزانی چوار کەسی].

سەرجەم **sercem** [ *sarjam* ] - "تێکرا، پێکەوە": سەر + جەم ser + cem . "جەم" خزمە دەگەڵ samt (G.) و gesamt (G.) تێکرا، سەرجەم"، سەر بە کرداری sammeln (G.) "کۆ کردنەوە". هاوتای ئەم کردارە ئەڵمانییە دە زمانە ژێرمەنییەکانی دیکەشدا هەیە و دە زمانی کوردمادیدا ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑جڤین cıvîn "کۆم بوون" و↑ ژوان juwan "هاتنە جەم یەک (ی دوو دڵدار)".

سەرچاخ **serçax** [ *sarčāx* ] - "گوڵینگ و ریشوەی سەرپێچی ژنان": سەر + چاخ ser + çax. "چاخ" خزمە دەگەڵ ↑چادر çadır.

سەرچاوە **serçawe** [ *sarčāwa* ] - "ژێدەر، مەنبەع": بڕوانە ↑چاو çaw.

سەردۆلکە **serdolke** [ *sardolka* ] - "لاواندنەوەی مردوو بە گۆرانی": بڕوانە ↑دۆلگە dolge "هەڵبەستی پێهەڵگوتن".

سەرزەنشت **serzenışt** [ *sarzanıšt* ] - "سەرکۆنە": لە فارسی وەرگیراوە: > سرزنش sarzaneš (P.). ["سر" واتا سەر و "زنش" واتا لێدان]، خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenîn "لێدان". تێکرای وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێتە "دە سەر کوتان" بە مانای "بەسەردا هاتن".

سەرسم **sarsım** [ *sarsım* ] - سەرسم دان یان سەر سم بردن واتا "رەت بردن، رەت دان". سەر ser لێرەدا دەچێتەوە سەر ↑سوڕ sur "جێگەی سەربەرێژێری خلیسک" [سر sor (P.) "خلیسکان، خزین]. کەوابوو سەرسم دان ماناکەی دەبێتە "خزین یان خلیسکانی ↑سم sım".

سەرسەڕ **serser** [ *sarsar* ] - "بای ساردی بە تەوژم": دەچێتەوە سەر ↑سار(د) sar(d). زمانی عەرەبی وەری گرتووە و کردوویە بە صرصر sarsar (Arb.).

**سەرشار serşar** ‌[ *saršār* ] - "سەری مەیدانی گەمە، کۆتایی مەیدانی گەمە": "شار" لێرەدا بە مانای "مەیدان، زەوی" بەکار هاتووە و خزمە دەگەڵ ↑زار3 zar "1- زەوی [زەوی و زار] 2- پاشگری شوێن [گوڵزار]"، هەروەها ↑جاڕ2 *car* [تیرگسجار].

**سەرماوەز sermawez** [ *sarmāwaz* ] - "ناوی دوامانگی پاییز": سەرما + وەز serma + wez. کەرتی وەز -wez دە زمانی فارسیدا وەك کردار هەیە و دەبێتە وزیدن wazīdan (P.) "هاتنی با، هەڵکردنی با". خزمە دەگەڵ wehen (G.)، waejen (MG.)، waaien (Nl.)، waian (Gt.)، wawan (OE.) "با هاتن، هەڵکردنی با"، vayati (OIn.) "بای هات"، vejat (Rus.) "با هاتن"، سەر بە ریشەی *hwe- (IE.) > "با هاتن". خزمە دەگەڵ وشەکانی ↑با ba و هەوا hewa. ئەم وشانەی دوایی کە دە زمانی ئەمڕۆدا زۆرتر مانای "دەنگی با هاتن" دەبەخشن، دە بنەڕەتدا ئاماژەیان بە "با هاتن" کردووە.

**سەرمك sermık** [ *sarmık* ] - "سەرجەم": سەر + مك ser + mık. "مك" کورتکراوەی ↑هەموو hemu یان هەمە heme یە و لە کۆتاییشدا پاشکری ك ık پێیەوە لکێنراوە. ماناکەی دەبێتە "هەموو بە سەر یەکەوە".

**سەرنج serınc** [ *sarınj* ] - "ورد بوونەوە، بیر لێکردنەوە": سرنج sırınc یش دەگوترێ. ئەم وشەیە چ پێوەندییەکی بە وشەی "سەر" [کەللە]ەوە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەك ↑ژیر jîr، ↑هزر hızır، ↑زیرەك zîrek و هتد. هەروەك لەژێر وشەی ↑راشەن raşen دا شیرۆڤە کراوە، دە زمانی کوردمادی و زمانە ئەورووپییەکاندا چەندین وشەی خزم هەن کە ئاماژە بەم مانایانە دەکەن: قسە کردن، گێڕانەوە، ئەژماردن، هەڵسەنگاندن، بیر کردنەوە، راوێژ کردن". دە زمانی فارسیدا خرد xerad (P.) پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشە فارسییە و وشە کوردمادییەکانی سەرەوە دەبێ کە وشەیەکی کۆنترەوە سەرچاوەیان گرتبێ کە بریتی بووە لە *hxrat*. ئا لەم وشەیە دواتر چەندین وشە بە مانای جۆربەجۆر سەریان هەڵداوە، وەك هزر، هەژیر، ژیر، زیرەك. ئەم وشانە هەڵگری چەمکی "بیر کردنەوە"ن. لەهەمانکاتدا چەند وشەی دیکە پەیدا بوون کە چەمکی "قسە" لە خۆ دەگرن، وەك ↑راز raz، ↑سرتە sırte و هتد. سرنج sırınc یان سەرنج serınc یش دەچێتەوە سەر هەمان وشە کۆنە بنەڕەتییەکە واتا *hxrat*. ئاڵوگۆڕی ئەم وشەیە دەبێ بەم جۆرە بووبێ: *hxrat ← sered ← serec ← serenc ← serınc.

[تێبینی: ئاڵوگۆڕی فۆنۆلۆژیك لەم وشەیەدا هەڵسەنگینە دەگەڵ وشەی ↑کرمانج kırmanc. ئەم وشەیە دە ئەسڵدا کوردماد kurdmad بووە و چەند گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتووە، وەك گۆڕانی فۆتیمی d بۆ c و تێخزانی فۆتیمی n لەتیوان بزوێنی a و کۆنسۆنانتی c دا. ئەم دۆخە لە وشەی *سرنجە* "زیخ و لمی لێکدراو" و چەندین وشەی دیکەشدا دەبینرێ].

**سەرەتاتکێ seretatke** [ *saratātke* ] - "سەرکێشان و روانین بە دزییەوە": سەر + ە + تاتکێ ser + e + tatke. ↑سەر ser ئاماژەیە بە سەرکێشان و "تاتکێ" دەچێتەوە سەر کرداری ↑دیتن dîtın.

**سەرەد sered** [ *sarad* ] - "بێژینكَ": سرند sarand (P.). وشەکە بە خزم دەردەچێ دەگەڵ Reiter (G.)، ritera (OG.)، hridder (OE.)، criathar (OIr.)، cribrum (L.) "هێڵەكَ"، سەر بە ریشەی *krei- (IE.) > "لە هێڵەكَ دان، جۆی کردنەوە" و دوورتریش سەر بە ریشەی *sker- (IE.) > "بڕین، لەت کردن، جیا کردنەوە".

**سەفتە sefte** [ *safta* ] - سەفتەکردن واتا "لەسەر یەك دانان و کەڵەکە کردن". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- ↑سفت sıft "قایم". لەم تێڕوانینەوە مەبەست جێگیر و قایم کردنی نانەکان لەسەر یەکترە.

2- ↑چفت cıft [چفت و بەست]. بڕوانە ↑جووت² cut.

**سەفدڕ sefdır** [ *safdır* ] - "بوێر، ئازا، بەجەرگ": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıft.

**سەفی sefî** *[ safî ]* - "کەم ئاوەن، حۆل": سەفیچ sefîc یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑ساویلکە sawîlke [ساوی + لکە یان ساو + ئیلکە]. سفیة safīh (Arb.) "حۆل" لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە.

**سەفین sefın** *[ safîn ]* - "1- ناوی چیایەکی بەرز لە کوردستان 2- ناوێک بۆ مێران": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıft.

**سەق seq** *[ saq ]* - "1- دار بەڕووی زۆر ئەستوور 2- ساوینی تیغ (بە بەرد، بە هەسان)": جگە لەم وشەیە چەندین وشەی دیکە هەن کە پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، وەک ↑سەقی seqî "جۆرێک بەردی مەرمەڕی زەرد"، ↑سەقەر seqer یان ↑سەقەم seqem یان ↑زوقم zuqım"بەستەڵەک"، ↑سەهۆڵ sehol "یەخ"، ↑سەهەند sehend "ناوی چیایەک"، ↑سەقام seqam "جێگرتوویی، قورس و قایم بوون" [سەخت و نەجووڵ]، ↑سەقیل seqîl "رژد، رەزیل"، ↑سەقەمی seqemî "نەخۆشییەکی یەکسم"، ↑سەکر sekır "ناوی هۆزێکی کورد"، ↑سەکران sekran "ناوی کێوێک لە کوردستان"، ↑سختیان sıxtîyan "پێستی دەباغی کراو"، ↑سەخڵەت sexlet "دژواری، سەختی"، ↑سووخ sux "زوقم"، ↑سۆکی sokî "ئامرازی ساوار کوتان"؟، ↑شیشک şîşk "خیم، بناخە، ↑سۆکین sokîn "بناخە، بەردی بناخە"، سوهان souhān (P.) "هەسان، بەردی تیژ کردنی چەقۆ"، ↑ساسۆن sason "ناوی چیایەکی کوردستان"، ئاسۆس asos [a-sos] "ناوی چیایەکی کوردستان"، ↑سیق sîq "دانی هەزم نەکراوی ناو سکی مەل"، زاگ zag یان ↑زاخ zax "جۆرە بەردێک"، ↑زاک zak "لەتکە دەنکە قەیسی کە منداڵ کایەی پێ دەکەن"، ↑زاگۆڕ zagor "پەیاغی ئەستوور"، ↑زاخ zax "گاشە بەرد"، ↑زاخۆر zaxor "بەردەڵانی رژد و بلیند"، ↑زیخ zîx یان زخور zıxur یان زگار zıgar یان ↑زغرک zığırk "ورکەبەرد"، ↑ئازگار azgar [ a-zgar] "سەخت"، ↑زووخ zux "توانایی، هێز"، ↑زۆق zoq"وشک و زبر"، ↑زوها zuha "وشک"، ↑سوکرە sukre "مەنجەڵی لە گڵی سوورەوەکراو"، ↑زوکری zukrî"ناوی هۆزێکی کوردە"، ↑سەخەر sexer "ئابڕوو" [دە بنەڕەتدا: *سەنگینی*، بەپێچەوانەی سووکی و چرووکی]، ↑زەخ zex "زل، مەزن" [دە بنەڕەتدا: قەوی، بەهێز"، ↑زەخم zexm "1- چیای سەخت و رژد 2- زل و مل قەوی"، ↑زەخت zext "گوشار، هێز"، ↑جەخت cext "گوشار، پێداگری"، ↑زیخ zîx "ئازا، بوێر"، ↑زیخاندن zîxandın یان سیخاندن sîxandın "دنەدان" [وەرە وەبەر نان، ئازا کردن]، ↑زازا zaza "ناوی بەشێک لە دانیشتووانی کوردستان"، ↑سەگوان segwan "تیرهاوێژی زەبردەست"، ↑سەگوەن segwen "ناوی هۆزێکی کورد"، زیک zîk "زۆر سارد"، ↑سیسارک sîsark [sîs-ark] "لاشخۆر" [دەبنەڕەتدا: باڵداری بەهێز]، ↑سەقر seqır "باز"، ↑شەق[2] şeq "سەخت، دژوار"، ↑شەهێن şehên "مەلێکی راوکەر"، ↑شاهۆ şaho "ناوی چیایەک لە کوردستان"، ↑شەهۆ şeho "رێگەی سەختی بەردەڵان"، ↑زەهاو zehaw "ناوی مەڵبەندێک لە کوردستان"، ↑شژ şıj "بەردی کلۆر"، ↑شووشە şûşe "جام، گلاس" [دە بنەڕەتدا: بەرد]، ↑شیشک şîşk "خیم، بناخە، بنەڕەت"، ↑شەختە şexte "سەرمای سەخت"، ↑شقووق şıqûq "جۆرێ هەرمێ کێویلە" [هەرمێی رەق]، ↑شوقاق şuqaq "1- ناوی هۆزێکی کورد 2- سەرمای دە رۆژی سەرەبەهار"، ↑شکاک şıkak "ناوی هۆزێکی کوردە"، ↑شەقوق şeqoq "جۆرێک دارەبەن"، ↑شیخاڵ şîxal "باریکەبەفری سەهۆڵ بەستووی پەنا رەشانکێ کە درەنگێ دەتوێتەوە"، ↑سیخار sîxar "زوقم" و هتد. ئەگەر سەرنجی ماناکانی سەرەوە بدەین، دەبینین کە بەگشتی ئەو مانایانە بەرچاو دەکەون: رەق، سەخت، زەخت، بەهێز، پەیت، قایم. چەمکی هاوبەش دە هەموو ئەو وشانەی سەرەوە و ماناکانیاندا "سەخت بوون"ە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سەخت *sext* "بەهێز، رەق، توند، پەیت، سفت، جێگیر". وەک دەبینرێ سەرجەم وشەکانی سەرەوە بە گشتی دوو مانا دەردەبڕن، واتا "بەرد" و "سەخت، پتەو". لە لایەکی دیکە وەک لە چەند شوێنی دیکەدا باس کراوە، ئەو وشانەی دیکەش کە لە ریشەی جیاوازەوە دێن و ئەم دوو مانایەی سەرەوە دەبەخشن، پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان پێکەوە هەیە. بۆیە زۆر رێی تێ دەچێ کە وشەی ↑زاخ[1] zax و چەندین وشەی دیکە بە مانای "بەرد" پێوەندییان بەم وشانەی سەرەوە هەبێ و گشتیان لە یەک ریشەوە هاتبن.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "بەرد" و "سەخت، پتەو" و خزمایەتی دوو وشەی "زاخ" و "سەخت"، سەرنجی ئەم وشانەی خوارەوە بدە کە دوو بە دوو پێکەوە خزمن: سفت و سەپتک، کەڤر/کەمر و قەمرین، بەرد و پاڵەوان، توانین و تەوەن، کارین و کەڕا، هەستی و خەست].

**سەقا seqa 1** [ *saqā* ] - "تەکووز، ڕێک و پێک": هەروەها سەقا دان seqa dan بە مانای "تەکووز کردن، ڕێک و پێک کردن" دێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑سەق *seq* و ↑سەخت sext. بەڵام با بزانین کە ئەو خزمایەتییە چۆن دروست بووە. [تێبینییەک لەم بارەوە: دە زمانی ئەڵمانیدا verwalten (G.) [ver-walten] بە مانای "تەکووز کردن، بەڕێوە بردن، ڕێک و پێک کردن" دێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "سەخت و بەهێز بوون" و دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ "پالەوان"، "فەیلی"، "فیل" [پیل]، "پۆلا" و هتد. مانای ئەسڵی وشە ژێرمەنییەکەی سەرەوە دەرەقەت هاتن و زاڵ بوون بە سەر ئیش و کاردا بووە، واتا ڕاگرتن و بەڕێوەبردنی کار وبار لەژێر ڕکێف و دەسەڵاتدا]. "سەقا دان"یش دە زمانی کوردمادیدا هەر لە تێڕوانینێکی ئاواوە سەری هەڵداوە، واتا بەکار هێنانی توانایی و هێز و دەسەڵات لە بەڕێوەبردندا تاکوو شتەکان لە ڕەوشێکی تێکەڵ و پێکەڵ، شل و شەوێق و ناجێگیر دەرباز بکرێن و بخرێنە سەر دۆخێکی ↑سەقام seqam گرتوویی و قورس و قایم بوون.

**سەقا seqa 2** [ *saqā* ] - "ئاوکێش": دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشە هەن کە لەم پێوەندییەدا جێی سەرنجدانن، وەک هەروەها ↑ساقی saqî "پیاڵەدەر، پێشکێشکەری خواردنەوە"، ↑سەکرە sekre [ساغر sāġar (P.)] "پیاڵە، ئاوخۆری". ئەم وشانە دەشێ ریشەیان دە زمانی کوردمادیدا بێ، جێی هەڵسەنگاندنن دەگەڵ Schank (G.) "پێدانی خواردنەوە، فرۆشتنی خواردنەوە"، schanc (MG.) "سەکرە، پیاڵەی مەی"، Schenk (G.) "ساقی، مەی فرۆش"، Schenke (G.) "مەی فرۆشی، جێی خواردنەوەی مەی". هەروەها وشەکانی schenken (G.) "بەخشین، پێشکێش کردن" و Geschenk (G.) "خەڵات، پێشکێشی، دیاری" دە زمانی ئەڵمانیدا ریشەکەیان بۆ ئەم وشانەی سەرەوە دەگەڕێتەوە واتا لە مانای بنەڕەتی "پێدان بۆ خواردنەوە، تێراو کردن" دواتر مانای "پێدان" و دواتریش مانای "بەخشین" سەریان هەڵداوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***(s)keng-* (*IE.*)** "خوار، خوار کردنەوە". ڕەنگە مەبەست دە بنەڕەتدا خوارکردنەوەی زارکی گۆزە بووبێ بۆ ئاودان یان لە پیاڵە کردنی ئاو. ئەم وشانە دەبنە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشەی زمانی کوردمادی کە لەژێر ↑زەنگاڵ zengal "پووزەوانە، بەلەکپێچ"دا شی کراونەوە. وەک لەوێدا دەیبینین، بەشێک لە وشەکان فۆتیمی n تێیاندا پارێزراوە، بەڵام لە بەشێکی دیکەدا ئەم فۆتیمە سواوەتەوە. لێرەشدا، لە وشەکانی "سەقا"
و "ساقی" و هیتردا فۆتیمی n سواوەتەوە.

**سەقر seqır** [ *saqır* ] - "باز": خزمە دەگەڵ ئەو وشانە کە لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون.

**سەقام seqam** [ *saqām* ] - "جێگرتوویی، پایداری، دامەرزاوی": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا ریز کراون و مانای "سەخت، قایم، بەهێز" دەبەخشن. مانای "جێگرتوویی، بێجووڵەیی" لەمەوە پەیدا بووە کە شتی سەخت و قورس و قایم لە جێی خۆی نابزوێ و ئەم لا و ئەو لا ناکا، بە پێچەوانەی شتی شل و شەوێق و تەق و لەق کە لەبەردەم جووڵان و گۆڕاندایە.

[تێبینی: لەم پێوەندییەدا دەتوانین دوو وشەی دیکە بە نموونە بێنینەوە. وشەی *قورس* "سەنگین، قایم" خزمە دەگەڵ *کورسین* "ریشە داکوتان" [جێگرتوو بوون] و دەگەڵ *کورد* "بەهێز، پاڵەوان" و گەلێک وشەی دیکە کە دواجار خزمایەتییان هەیە دەگەڵ *خار* "سەخت". هەروەها وشەی *سبات* "سەقامگرتوویی، بەرقەراری" خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە هەمدیسان مانای "سەخت" دەبەخشن، وەک *سفت* "سەخت"، *سفن* "بناخە"، *زۆپ* "گاشەبەرد"، *زفت* [قیر و زفت]، *زەب* "ڕەق، سەخت" و هتد].

**سەقەت seqet** [ *saqat* ] - "جێی مەترسی": [پیاوێکی سەقەتە، ناوێرم بچمە لای]. هەروەها وشەیەکە بەگاڵتە دەگوترێ، کاتێک کە کارێک بە پێچەوانەی چاوەنواری بێ [سەقەت نەهاتی، سەقەت نەتکرد].

وەک دەبینرێ لەم وشانەشدا مانای ئەسڵی وشەکە ↑سەخت sext ە. لە ڕستەکەی سەرەوەدا مەبەست لە "پیاوێکی سەقەت" هەمان پیاوێکی سەخت و بەهێز و بە زەبر و زەنگە. لە ڕستەکەی دووەمیشدا مەبەست ئەوەیە کە کارەکە دەبایە بەسەختی و بە هێز و گوڕەوە کرابا، کەچی نەکراوە. لەم بارەوە ئاواش دەگوترێ [چاک هاتی، چاک کردت]، بۆ ئاماژە کردنێکی تەوساوی بەوە کە کابرا نەهاتووە، کەچی دەبا هاتبا، یان کارەکە نەکراوە، کەچی دەبا بە چاکی بکرایە. هەردوو وشەی ↑چاک çak و سەقەت seqet لە یەک ڕیشەوەن. نموونەیەکی دیکە لەم بارەوە وشەی "تەڕ"ە کە ئەویش لە ڕیشەیەکەوە دێ بە مانای "سەخت" [تەڕت زانی، تەڕت پێ گوت].

**سەقەر seqer** [ *saqar* ] - "بەستەڵەک": خزمە دەگەڵ ↑سەقەم seqem و هەروەها ↑*سەق seq*.

**سەقەم seqem** [ *saqam* ] - "سەرما و سۆڵەی دژوار": خزمە دەگەڵ ↑سەقەر seqer "بەستەڵەک" و هەروەها ↑*سەق seq*.

**سەقەمی seqemî** [ *saqamī* ] - "نەخۆشییەکی یەکسم": خزمە دەگەڵ گەلێک وشە کە لەژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە و دواجار پێوەندی بە ↑سەخت sext ەوە پەیدا دەکەن. وادیارە ئەمە نەخۆشییەکە کە لە ئەنجامیدا شوێنێک لە لەشی ئاژەڵ ڕەق یان ئەستوور دەبێ.

**سەقی seqî** [ *saqī* ] - "جۆرێک بەردی مەڕمەڕ": خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax "بەرد" و گەلێک وشەی دیکە کە لەژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە و دواجار پێوەندی بە ↑سەخت sext ەوە پەیدا دەکەن.

[تێبینی: پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان دوو چەمکی "سەخت" و "بەرد"دا. زۆڕ "گاشەبەرد" خزمە دەگەڵ *سفت* "سەخت". *بەرد* (کۆنتر: *وەرد*) دەبێ خزم بێ دەگەڵ fortis (L.) "سەخت، قەوی"، هەروەها stein(G.) "بەرد" خزم دەگەڵ styāyate (OIn.) "ڕەق دەبێ، سەخت دەبێ"].

**سەقیل seqîl** [ *saqīl* ] - "ڕژد، ڕەزیل": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑سەق seq دا هاتوون و دە ڕیشەدا مانای "سەخت" دەبەخشن. ثقیل saqīl (Arb.) "قورس" دە زمانی عەرەبیدا لەوانەیە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ. لە نێوان دوو چەمکی "قورس" و "سەخت"دا پێوەندی نیزیک هەیە [قورس و قایم]. وشەی "قورس" خۆی دە ڕیشەدا بە مانای سەختە.

**سەکر1 sekır 1** [ *sakır* ] - "داخستن، پێوەدانی دەرک و پەنجەرە": خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext و ئەو وشانەی لەژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە. مەبەست لە "سەکر کردن" هەمان توند کردن، قایم کردن بووە.

**سەکر2 sekır 2** [ *sakır* ] - "ناوی هۆزێکی کورد": خزمە دەگەڵ ↑زاخ zax "بەرد" و گەلێک وشەی دیکە کە لەژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە و دواجار پێوەندی بە ↑سەخت sext ەوە پەیدا دەکەن. ئەم ناوە دەربڕی چەمکی هێز و گوڕ و پتەو بوونە. گەلێک لە هۆز و ناوچەکانی کوردستان، ئەو ناوانەیان لەسەرە کە باس لە هێز و قەوی بوون دەکەن.

**سەکران sekran** [ *sakrān* ] - "ناوی کێوێک لە کوردستان": بڕوانە ↑سەکر² sekır "ناوی هۆزێکی کورد".

**سەکرە sekre** [ *sakra* ] - "زەرک، ئەخۆری": ساغر sāġar (P.). خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq "سەخت"دا هاتوون. مانای وشەکە دە بنەڕەتدا "بەرین، بەردکراو" بووە. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "هەوڕ" [هەوەڕ] "تێربار، دەفری سواڵەت". ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ کەڤر "بەرد".

**سەکوت sekut** [ *sakut* ] - "تەرح و دیدار، بیچم، شێوە" [سەر و سەکوت ser u sekut].خزمە دەگەڵ چەندین وشە کە مانای "شەقڵ و شێوە" دەدەن، وەک ↑شەقڵ şeqıl، ↑سککە sık(k)e، ↑ئەسک esk "وێنە"، ↑ئەسکەناس eskenas و هتد.

**سەکۆ seko** [ *sako* ] - "بەرزایی چێکراو بۆ دانیشتن": سکو sakū (P.). خزمە دەگەڵ ↑زەق zeq [سەکۆ دە بنەڕەتدا واتا شوێنی زەق. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "هەرزاڵ" کە ئەویش دەچێتەوە سەر ڕیشەیەک بە مانای "زەق بوون، دەرپەڕیو بوون].

**سەکین sekîn** [ *sakīn* ] - "ئاڵ بوونەوەی ددان بە ترشی": دەشێ خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑*سەق* *seq* دا باس کراون و مانای "سەخت، توند" دەبەخشن.

**سەگسار segsar** [ *sagsār* ] - "ناشیرن، ناحەز": سەگ + سار seg + sar. کەرتی سار sar - شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چارە¹ çare "دەموچاو، روخسار". کەوابوو "سەگسار" واتا وێچواندنی دەموچاوی کەسێك بە سەگ.

**سەگوان segwan** [ *sagwān* ] - "تیرهاوێژی زەبردەست": هەروەها ↑سەگوەن segwen هەیە کە ناوی هۆزێکی کوردە. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە و مانای "سەخت، بەهێز، زاڵ" دەبەخشن. ئەم وشانە هەر وەك "پاڵەوان" دروست کراون کە ئەویش خۆی لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای "بەهێز بوون، زاڵ بوون، بە دەسەڵات بوون".

[تێبینی: هێندێك کەس بە هەڵە لای وایە ریشەی ئەم وشانە بۆ وشەی "سەگ" دەگەڕێتەوە کە دیارە ئەمە لێکدانەوەیەکی نەشیاو و بێجێیە].

**سەگوەن segwen** [ *saqwan* ] - "ناوی هۆزێکی کورد": خزمە دەگەڵ ↑سەگوان segwan "تیرهاوێژی زەبردەست" و دەگەڵ ئەو وشانەی لە ژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە

**سەل sel** [ *sal* ] - "بەردی پان و تەنك": هەروەها ↑سەلین selîn "بەردی سەر گۆڕیچە" [تاتەبەرد، بەردی پان] و↑سەلەبەند selbend "رێگەی بەرد تێگیراو" بەکار دەهێنرێن. خزمە دەگەڵ ↑سێڵ sel "ساج" و ↑سەلپ selıp "سەوڵ، بێلی قایق ئاژۆتن" و چەند و شەیەکی سەر بە ریشەیەك بە مانای "رووبەر، پانتایی".

**سەلا sela** [ *salā* ] - "رۆژی پساتێ": شێوەیەکی دیکە لە ↑سەرا sera "ماڵ، هۆڵ". دە زمانی فارسیدا دەگوترێ "سرای اخرت" واتا "ماڵی ئەو دنیا، دنیای پاش مردن".

**سەلالیك selalîk** [ *salālīk* ] - "رەورەوە": وشەکە ئاماژە بە "خلیسك، خلیسکان، خزین" دەکا و خزمە دەگەڵ یەك لەم دوو دەستەوشەی خوارەوە:

1- ↑سوڕ sur "جێگەی سەربەرێژێری خلیسك"، سر sor (P.) "خلیسك" و سرتمە sortme (P.) "رەورەوەی سەر بەفر"، ↑سۆرك sorık "ئاوهەڵدێر، تاڤگە"، ↑سوول sul "پلوسك، ئاوهەڵدێر"، ↑سولاڤ sulav"ئاوهەڵدێڕ"، ↑سۆلینە solîne "رێگەئاوی لە سواڵەت"، slippen (Nl.) و slip (E.) "خلیسکان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)lei- >** "تەڕ و لیچق بوون، لووس و خلیسك بوون".

2- ↑گلان gılan ، ↑خلیسکان xılîskan، ↑چاڵە cale، ↑زەلووت zelut "تاس، بێموو" و هیتر، سەر بە ریشەی **(IE.) *ghel- >** "درەوشانەوە، ترووسکانەوە". وشەکانی ↑زێڕ zer ، ↑زەرد zerd، ↑زۆڵ¹ zol [زەرد و زۆڵ)، ↑سۆڵ³ sol [سپی و سۆڵ] ئەم مانا بنەرەتییان پاراستووە. پاشان لەم مایەوە مانای "ساف، لووس، خلیسك" و هەروەها "خلیسکان، زەلین" [بە نەرمی بەسەر هەردێکی سافدا خوشین" پەیدا بووە. رەوتی ئەو ئاڵوگۆڕە دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا بەم شێوەیە، بۆ وێنە لەم وشانەدا: gleißen (G.) "درەوشانەوە، بریقانەوە"، Gold (G.) "زێڕ"، gelb (G.) "زەرد"، glatt (G.) ساف، لووس"، gleiten (G.) "خزاندن، خوشاندن، خلیسکاندن". سەلالیك "رەورەوە" ئەو شتەیە کە بە نەرمی بە سەر هەرددا دەخوشێ. ناوێکی دیکە بۆ سەلالیك، ↑سەلیلانك selîlanık ە [سەلی + لانك]. لێرەشدا هەر ئەو پێوەندییانەی سەرەوە لە ئارادان و دە بنەڕەتدا مەبەست لانکەیەکە کە "سەلی"یە، واتا دەزەلێ، دەخوشێ، بە پێچەوانەی لانکەی جێگیر و وەستاو. سەبارەت بە پێوەندی چەمکەکانی "زەلین، گلان، خلیسکان" و "رەورەوە" بڕوانە "تلین".

**سەلان selan** [ *salān* ] - "بەرزاییەکان": شێوەیەکی دیکە لە سەران seran [بڕوانە ↑سەر ser "بان"].

**سەلایە selaye** [ *salāya* ] - "دەسکاونگ": خزمە دەگەڵ ↑زللە zılle و چەند وشەی دیکە بە مانای "لێدان". خودی وشەی "هاونگ" [ئاونگ] یش لە ریشەیەکەوە هاتووە بە مانای "کوتان".

**سەلەبەند selbend** [ *salband* ] - "(ڕێگەی) بەرد تێگیراو": بڕوانە ↑سەل sel "بەردی پان و تەنک".

**سەڵپ selıp** [ *salıp* ] - "سەوڵ، بێڵی قایق لێخوڕین": پێوەندی هەیە بە ↑سەل sel "بەردی پان و تەنک".

**سەڵت selt** [ *salt* ] - "تەنیا، ڕەبەن": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- selten (G.)، seldom (E.)، zelden (Nl.) "دەگمەن، نائاسایی" و هەروەها seltsam (G.) "سەیر، سەمەرە"، سەر بە ریشەی ژێرمەنی < *selda-* (Ger.) "تەنیا، جیا لەوانی دی".

2- solus (L.) "تاک، تاکانە، بەتەنیا". دوور نییە وشە ژێرمەنییەکە و وشە لاتینیەکە دە بنەڕەتدا بچنەوە سەر ریشەیەکی هاوبەش.

**سەلە sele** [ *sala* ] - "پاڵوێنەی لە شووڵ تەنراو": خزمە دەگەڵ sil (Sw.) "سوزمە، سەلە، راوەک"، Siel (G.) "بەنداوێکی بچکۆڵە کە ئاوی پێدا دەڕوا". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ seihen (G.)، sion (OE.)، sia (OIs.) "(هەڵ)چۆڕاندن، بە سەلەدا کردن" و sigan (OE.) "تکان، چکان"، سەر بە ریشەی < *seik-* (IE.) "تکانەوە، چۆڕانەوە، دڵۆپان". خزمە دەگەڵ ↑تکان tıkan [چکان].

**سەلەف selef** [ *salaf* ] - "پڕ تاو بوونی ئەسپ": خزمە دەگەڵ ↑سڵەمینەوە sılemînewe.

**سەلەم selem** [ *salam* ] - "پێش فرۆش": خزمە دەگەڵ sell (E.)، sellan (OE.)، sellen (OG.)، sellian (OS.) "فرۆشتن"، سەر بە ریشەی ژێرمەنییەکە < *saljan* (Grm.). ریشەی هیندوئەورووپی وشەکان باس نەکراوە.

**سەڵیتە selîte** [ *salīta* ] - "ژنی بێحەیا": شەلیتە şelîte ش دەگوترێ.

1- یان خزمە دەگەڵ slut (E.) "ژنی بەڕەڵڵا، ژنی جلف". ریشەی ئەم وشە ئینگلیزییە ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە ئەم وشە ئینگلیزییە خزم بێ دەگەڵ ↑جلف cılf.

2- یانیش خزمە دەگەڵ schlecht (G.)، sleht (OG.)، sliht (OE.)، slät (Sw.) "خراپ". مانای بنەڕەتی ئەم وشانە "ساف، لووس، هەموار" بووە و پاشان بووەتە "سادە" و لەوێشەوە بووەتە "خەراپ، بێ نرخ". ئەم وشانە دەگەڵ ↑جلف cılf بە خزم دەر دەچن و دەچنەوە سەر ریشەی < *(s)lei-* (IE.) "تەڕ و لیچق بوون، لووس و خلیسک بوون".

**سەلیلانک selîlanık** [ *salīlānık* ] - "ڕەورەوە": بڕوانە ↑سەلالیک selalîk.

**سەلین selîn** [ *saīln* ] - "بەردی سەر گۆڕیچە": دە بنەڕەتدا مەبەست "بەردی تەنک و پان، تاتەبەرد" بووە و دەچێتەوە سەر ↑سەل sel "بەردی پان و تەنک".

**سەما sema** [ *samā* ] - "خۆ بادان و خۆ جولاندن لە خۆشیان": زەما zema ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑جمە cıme "جووڵە و تەکان"، سەر بەکرداری ↑جمین *cımîn* "جوولان، تەکان خواردن". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چمە çıme "کلک" [ئەو ئەندامەی کە بەدەوام لە جمین و جووڵاندایە]. سماع semaε (Arb.) لە "سەما"ی کوردمادی وەرگیراوە.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "تلان" و "دیلان" یان "پەڕین" و "هەڵپەڕین". وەک دەبینین پێوەندی نیزیک هەیە لە نێوان چەمکەکانی جم و جۆڵ و شایی و سەما و هەڵپەڕیندا].

**سەماس semas** [ *samās* ] - "هێمن، لەسەرخۆ": خزمە دەگەڵ ↑ساماڵ samas "یەکدەست، هەموار" سەر بە ریشەیەک بە مانای "یەک". مەبەست لە*سەماس* یان *ساماڵ* هەموار بوون و یەکدەست بوونە. *سەماس* کەسێکە کە هەڵس و کەوتی هەڵچوون و داچوونی تێدا نییە. هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑هەمین hemîn و ↑هێمن hêmın. کەرتی as- لەم وشەیەدا پاشگرە. لەم بارەوە بڕوانە پاشگری ↑ئۆز -oz.

**سەمانەک semanek** [ *samānak* ] - "بالدارێکە زلتر لە ڕەشۆڵە": دەشێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە مانای "تاریک، ڕەش" دەردەبڕن. لەم بارەوە بڕوانە ↑شێو şew "تاریکان".

**سەماوەر semawer** [ *samāwar* ] - "ئامرازی ئاو تێدا کوڵاندن": وشەیەکی زمانی ڕووسییە. دۆستێکی ڕووسیزانم بۆی باس کردم کە وشەکە لە دوو کەرتی sama و var (Rus.) پێک هاتووە کە یەکەمیان

بەمانای "خود"ە و دوومیان بە مانای "کوڵان"، سەر بە کرداری varit ‎(Rus.)‎ واتا بە کوردمادییەکەی دەبێتە "خۆکوڵ" یان "خۆکولێن". بەم جۆرە کەرتی یەکەم دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هاو haw و کەرتی دووەمیش دەگەڵ ↑ئاور awır.

**سەمەر(ە 1 semer(e)** ‎[ *samar(a)* ]‎ - "پاڵان": خزمە دەگەڵ ↑کەمەر kemer.

**سەمەرە 2 semere** ‎[ *samara* ]‎ - "سەیر": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑ساماڵ *samal* "بێ هەور، یەکدەست"، ↑سەماس semas "لەسەرەخۆ" [بێ هەڵچوونە و داچوون]، ↑جڤین cıvîn "کۆم بوون" [هاتنە لای یەک] و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "یەک". لەم تیڕوانینەوە مانای "سەمەرە" دەبێتە "تاک، دەگمەن، بێوێنە". دیارە شتی سەیر و سەمەرە وەک شتێکی دەگمەن و بێوێنە تەماشا کراوە و بۆیە ئەم ناوەی پێ دراوە.

**سەمەن semen** ‎[ *saman* ]‎ - "کەوە، خۆڵەمێشی": بڕوانە ↑سەمانەک semanek.

**سەمەنگوڵ semengul** ‎[ *samangul* ]‎ - "شەلێک کە زۆر کەم دەلەنگێ": دەشێ پێک هاتبێ لە سەم + ناوگری ن + گوڵ sem + n + gul. کەرتی "سەم" خزمە دەگەڵ ↑کەم kem. کەرتی گوڵ gul خزمە دەگەڵ ↑کوللە kulle سەر بە ریشەیەک بە مانای "لەنگین".

**سەمیت semît** ‎[ *samīt* ]‎ - "ماکێکی رەش لەسەر دەرگای خەڵیفەهەنگ": سەمید semîd یش دەگوترێ.

1- بنەوشەی سەم- sem- بەمانای "رەش، تاریک"ە و دە ژمارەیەک وشەی کوردمادیدا بەرچاو دەکەوێ، وەک ↑شەمشەمەکوێرە şemşemekuwere "ئاژەڵی شەوهەڵفڕ"، ↑شەمەترێلکە şemetırêkle "مێشەهەنگوینێکی رەشکەڵە"، ↑سەمەن semen "کەوە، خۆڵەمێشی"، سەمانەک semanek "باڵدارێکە زلتر لە رەشۆڵە" و هتد. ئەم وشانە دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑شێو şêw "تێوارەدرەنگ، تاریکان".

2- ↑زەمۆمە zemome "تیغە، تیوان کردن بە قوڕ یان تامان"، ↑سمتە sımte "توڵا، پێکەوەنووساوی رێککوشراو" و هتد. ئەم وشانە ئاماژە بە رێکگوشران، پێکەوەنووسان و بەربەست کردن دەکەن.

**سەنتوور sentur** ‎[ *santūr* ]‎ - "سازێکی ژەنین": خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن *jendın* و ↑سهنتی sıhıntî "زللە" و هێندێک وشەی دیکە بە مانای "لێدان". ناوی هێندێک لە سازەکانی مووزیک دەچنەوە سەر ئەو وشانەی کە مانای "لێدان" دەبەخشن، وک ↑سەنج senc [هەڵی سەنگینە دەگەڵ سەنتوور]، تەپڵ، دمبەک، تەمبوور و هتد.

**سەنتەنە sentene** ‎[ *santana* ]‎ - وشەکە دە "فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە"دا ئاوا مانا کراوەتەوە: "1- دەبدەبە، شکۆ و جەلال 2- ناوە بۆ پیاوان". مانای ئەسڵی وشەکە "لێدان"ە و دەبێ لە کۆندا زەنتەن *zenten* بووبێ. دە زمانی کوردمادی ئەمڕۆدا دەبێتە ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن *jendın* . بنەوشەی زەن- zen- بە شێوەی جۆربەجۆر لە چەندین وشەی دیکەشدا دەردەکەوێ وەک ↑زەنگ zeng [زەبر ە زەنگ]، ↑زەنگ zeng "جەرەس"، ↑جەنگ ceng "شەڕ"، ↑سهنتی sıhıntî "زللە"، ↑سەنگ seng "بەرد" [ئامرازی لێدان]، ↑زەنگەن zengen "قولێنگ"، ↑سەنتوور sentur "سازێکی ژەنین"، ↑سەنج senc "سازێک" و هتد. هەروەها ئەگەر چاو لە مانای "دەبدەبە"ش بکەین دەبینین، کە مانای ئەسڵی ئەویش هەر "لێدان"ە. ئێستا پرسیار ئەمە کە چۆن لەم مانایەوە مانای "شکۆ و جەلال" پەیدا بووە. لەوانەیە ئەم مانایە لێرەوە پەیدا بووبێ کە فەرمانڕەوای بە دەسەڵات لە کاتی هاتوچۆی خۆی و دەستە و دایرەکەی یان سپاکەی وەک رێز لێگرتن بە دەهۆڵ و زوڕنای رەزمی هاورێیەتی کراوە و لێرەوە مانای "شکۆ و جەلال" سەری هەڵداوە. وشەکە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە طنطنة tantana ‎(Arb.)‎.

**سەندەڵ[1] sendel** ‎[ *sandal* ]‎ - "دارێکی بۆن خۆش": < sandalum ‎(ML.)‎ < candana ‎*(OIn.)*‎ "داری سەندەڵ".

**سەندەڵ[2] sendel** ‎[ *sandal* ]‎ - "پێڵاوی دارین، تەق تەقیلە": دە زمانی یۆنانیدا sándalon ‎(Gr.)‎ گوتراوە. بەگوێرەی بۆچوونێک ریشەکەی دەچێتەوە سەر زمانێکی ئاسیایی. ئەم زمانە ئاسیاییە دەشێ هەمان

زمانی کوردمادی بووبێ. ئەگەر سەیری وشەی تەقتەقیلە teqteqîle "(پێڵاوی) سەرپایی" بکەین، دەبینین کە ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە ↑تەق teq "دەنگی لێدان یان لێکدان و پێکدادان". تەقتەقیلە دە بنەڕەتدا سەرپاییەک بووە کە بنەکەی لە دار بووە و لە کاتی ڕۆیشتنندا لە هەرد کەوتووە و تەقەتەقی لێ هاتووە. هەر بەم پێیە "سەندەڵ" دەچێتەوە سەر بنەوشەی "زەند" و خزمە دەگەڵ ↑سهنتی sıhıntî "زللە"، ↑سەنتوور sentur "سازێکی ژەنین"، ↑سەنج senc، ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن *jendın* و ↑زەند zend و هێندێک وشەی دیکە بە مانای "لێدان، لێکدان".

[تێبینی: کەرتی ئەل el- پاشگری بەناو کردن و دروست کردنی ناوی کەلوپەلە کە دە وشەی کوردی دیکەشدا دەبینرێ، وەک "سەندەڵی" و بەتایبەتی لە زمانە ژێرمەنییەکاندا زۆر باوە. نموونەیەکی دیکە سەوڵ sewıl ە، واتا بێڵی لێخوڕینی بەلەم کە خزمە دەگەڵ Schaufel (G.) "بێل، خاکەنداز"].

**سەندەڵی sendelî** *[ sandalī ]* - "کورسی دانیشتن": sandalī (P.). ئەم وشەیە دەشێ بچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *sed- >** "دانیشتن". دەکرێ بەهەڤی بکەین دەگەڵ Sessel (G.)، sitls (Gt.)، setl (OE.) "سەندەلی" و هەروەها Sattel (G.)"زین". دە وشەی "سەندەلی"دا فۆنیمی n خزاوەتەوە ناو بنەوشەکەوە. وشەکە خزمە دەگەڵ ↑دانیشتن danîştın و لەوانەشە ↑زین zîn. فۆنیمی n دە کۆتایی وشەی زین zîn دا لەوانەیە هەر ئەوە بێ کە دە وشەی "سەندەلی"دا دەبینرێ.

**سەنگ seng** *[ sang ]* - "بەرد": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی دە ریشەدا مانای "لێدان" دەبەخشن، وەک ↑ژەنین jenîn و ↑ژەندن *jendın* ، ↑زەنگ zeng [زەبر ە زەنگ]، ↑زەنگ zeng "جەرەس"، ↑جەنگ ceng "شەڕ"، ↑سهنتی sıhıntî "زللە"، ↑زەنگەن zengen "قولێنگ". مانای بنەڕەتی "سەنگ" بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بۆ لێدان و کوتانی شت واتا بۆ شکاندن، ورد کردن و هاڕین کەڵکی لێ وەرگیراوە.

[تێبینی: لەم پێوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بە وشەی Hammer (G.) "چەکوچ" بکەین، کە دەبێتە خزم دەگەڵ کەڤر kevır "بەرد" دە زمانی کوردمادیدا. هەروەها دەتوانین ئاماژە بکەینە چەکوچ çekuç و چەک çek "سیلاح" کە لەوانەیە خزم بن دەگەڵ زاخ zax "بەرد". ئەم نموونانە نیشان دەدەن کە چۆن چەمکەکانی "لێدان"، "ئامرازی لێدان" و "بەرد" پێوەندییان بە یەکەوە هەیە].

**سەنگەر senger** *[ sangar ]* - "مەتەرێز، پەنا و پەسیوی شەڕ":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زنج[4] zınc "چارداغ، حەوش، چەپەر، پەرژین".

2- وشەی "مەتەرێز" پێوەندی بە چەمکی "کان، کانزا، سەنگی مەعدەن، قوڵکە"ەوە هەیە، ئەوسا بۆی هەیە "سەنگەر"یش پێوەندی بە ↑سەنگ seng ەوە هەبێ بە مانای "بەرد".

**سەنگین sengîn** *[ sangīn ]* - "1- قورس 2- ئابڕوومەند 3- دەوڵەمەند": زەنگین zengîn یش دەگوترێ کە شێوەی کۆنتری وشەکەیە. سنگین sangīn (P.) "قورس، گران". دەچێتەوە سەر ↑سەنگ berd "بەرد". "سەنگین" دە بنەڕەتدا مانای "بەردین" دەدا، واتا وەک بەرد قورس و قایم. لەم مانایەوە دواتر مانای "ئابڕوومەند" پەیدا بووە، چونکوو مرۆڤی ئابڕوومەند کەسایەتییەکی قورس و قایمی هەیە و کاریگەرییە نەرینییەکان ناتوانن بە هاسانی دایرووشێن و لەباری ببەن. مانای "دەوڵەمەند"یش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤی ساماندار وەک کەسێک چاو لێ کراوە کە بە هۆی سامانەکەیەوە پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و هەلومەرجی ژیانی قورس و قایمە.

**سەنمین senmîn** *[ sanmīn ]* - "پیس و گڵاو بوون": هەروەها سەنم senım "پیس، گڵاو" و سەنماندن senmandın بەکار دەهێنرێن. ئەم وشەیە دە بنەڕەتدا بە مانای "پێوەنووسان، چەسپان"ە، واتا کاتێک قوڕ و خۆڵ و شتی پیس و ناخاوێنی دیکە بە دەست و قاچ یان جلوبەرگەوە نووساوە، ئەو وشەیان بەکار هێناوە و دواتر وشەکە بەگشتی مانای "پیس بوون"ی وەرگرتووە. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەی **( IE.) *(s)neigh- >** "پێوەنووسان، گلوو بوون" و دەبێتە خزمە دەگەڵ چەندین وشە، لەوانە

↑شەنگڵ şengıl "پێکەوەنووساو" دە زمانی کوردمادیدا و Schnee (.G) و nípha (.Gr) "بەفر، بەرف" [دە بنەڕەتدا: کڵۆ، گلووبەفر] و sniwan (.OE) "بەفر بارین".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی گڵاو gılaw "پیس" کە دە راستیدا خزمە دەگەڵ kleben (.G) "چەسپان، پێوەنووسان"].

**سەنیرە senîre** [ *sanīra* ] - "دارێکە لە کاتی وەستاندنی ئارەبەدا دەخرێتە بنی تاکوو کەڵ وەحەسێ": خزمە دەگەڵ ↑سنێ sıne "دارێکە لە مل و کەلەکەی ئاژەڵی دەبەستن تا دەمی نەگاتە برینی خۆی" و هەروەها دەگەڵ ↑سندم sındım "پێوەندی ئاسن" و هێندێک وشە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای"بەستن، بەستنەوە".

**سەنیری مار senîrmar** [ *sanīrmār* ] - "کرمێکی بەڵەکە و هێدی هێدی دەڕوا": خزمە دەگەڵ Schnecke (.G) "شەیتانۆکە، حەلەزوون"، snacke (.E) "مار"، snok (.Sw) "جۆرێک ماری ئەفعی". ئەم وشانە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر کردارێکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "خوشین، خزین" کە دە ئەڵمانی کۆندا snahhan (.OG) بووە.

[تێبینی 1: دە زمانی ئەڵمانیدا Schnecke واتا شەیتانۆکە سیمبۆلی لەسەرەخۆ رۆیشتنە. زۆر جار لەو شەقام و شوێنانەی ماڵ و منداڵی زۆری لێ دەژین، وێنەی "حەلەزوون" لە قەراخ شەقام دادەندرێ تاکوو لێخوڕانی ئوتۆمبێلەکان لە حەلەزوون فێر ببن و بە ئەسپایی باژۆن. تێبینی 2: وشەی "سەنیری مار" لەباری داڕشتنەوە لاسەنگییەکی تێدا بەدی دەکرێ، ئەم وشەیە بەپێی رێساکانی وشەسازی دە زمانی کوردیدا دەبێ بەم جۆرە بێ: سەنیرمار، سەنیرەمار، سەنیرمارە].

**سەتێر sener** [ *saner* ] - "ریخ، سەرگین": ستێر sınêr یش دەگوترێ. دە ئەسڵدا ↑سەرگین sergîn بووە و گۆڕاوە [سەرگین sergîn ← سەرین serîn ← ستێر sener].

[تێبینی: لەباری گۆڕانکاری فۆتیمەکانەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ *سەرین* "باڵنجی سەر" کە دە هێندێک شێوەزاردا بووەتە "سەنیر"].

**سەواڵ sewal** [ *sawāl* ] - "ئاژەڵ، مەڕ و ماڵات": خزمە دەگەڵ schmal (.G) "باریک"، small (.E)، smals (.Gt)، smal (.Sw). ئەم وشانە بە مانای "چکۆڵە، کەم" و دە هەمان کاتیشدا بە مانای "ئاژەڵی چکۆڵە" بەکار هاتوون، بۆ وێنە smali (.ON) و mīl (.OIr) "ئاژەڵی چکۆڵە"، maal (.Nl) "گوێلک"، melon (.Gr) "مەڕ".هەروەها malyj (.Rus) "چکۆڵە" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا ↑مەڕ mer، ↑گەماڵ gemal "سەگ" و ↑تەماڵ temal "کەروێشک (لە لاندا)"، ↑ماڵ[1] mal [ماڵات malat] و ↑شەپاڵ2 şepal "بەچکەشێر" خزمایەتییان دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەیە.

**سەوچیان sewçıyan** [ *sawčıyān* ] - "شیان، ژێهاتن". هەروەها سەوچ sewç هەیە بە مانای "شیاوی، لێهاتوویی". جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- ↑تاوژین tawjîn [ *tāwžīn* ] - "خەریک بوون بە کارێکەوە".

2- ↑تاو2 taw "هێز، گوڕ". ئەگەر وشەکە پێوەندی بە "تاو"ەوە هەبێ، ئەوا دە بنەڕەتدا ماناکەی "توانایی هەبوون، بە توانا بوون" بووە.

**سەودا1 sewda 1** [ *aswdā* ] - "دانوسان، گۆڕینەوەی کاڵا": سودا soudā (.P). لەوانەیە پێوەندی بە ↑سوود sud "قازانج" ەوە هەبێ.

**سەودا2 sewda 2** [ *aswdā* ] - "بیر و خەیاڵی ئەڤیندارانە": چەند وشەیەک دە زمانی کوردمادی و فارسیدا هەن کە لەوە دەچێ پێوەندییان بەیەکەوە هەبێ و لە یەک چوارچێوەدا جێگەی شی کردنەوە بن. ئەم وشانە بریتین لە ↑شەیدا şeyda [شیدا šeydā (.P)] "ئەڤینداری بەتین"، ↑شێت şêt "دێوانە" [شێت و شەیدا]، شیفتە šīfte (.P) "شەیدا، ئەوداڵ"، ئاشفتە āşofte (.P) "شێواو، تێکەڵ" [ā-šofte]، ↑*شێوان* *şêwan*"تێکەڵ بوون، لێکدران"، ↑ئاژاوە ajawe "تێکەڵ وپێکەڵی، لێکدراوی" [a-jawe] و هتد. مانای

سەرەکی لە هەموو ئەم وشانەدا "لێکدران"ە. بەهۆی "لێکدران و شڵەقان"ی مەژی، مرۆڤ شێت دەبێ یان لە پێناو ئەڤین و خۆشەویستی لەرادەبەدەر مێشکی تێک دەچێ، بەوتەیەکی دیکە دەشێوێ. لەم تێڕوانینەوە "سەودا" دەبێ هەر ئەو بیر و خیاڵە ئاڵۆز و شێواوە بێ کە مرۆڤێکی "شەیدا" هەیەتی.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا verrückt (G.) "شێت، دێوانە" بە مانای "شەیدا بوون و ئەڤینداربوون"ی لەرادەبەدر بەکار دێ، بۆ وێنە کاتێک کوڕێک بە کیژێک دەڵێ Ich bin verrückt nach dir، ئەوە هەر وەک کوردمادییەکەی خۆمان ماناکەی دەبێتە "من شێت و دێوانەی تۆم"].

**سەوڵ sewıl** *[ sawıl ]* - "سەڵپ، بێڵی گەمێوانی": خزمە دەگەڵ Schaufel (G.)، schoffel (Nl.)، shovel (E.)، skovel (Sw.) "خاکەنداز، پێمەڕە، بێڵ"، سەر بە ریشەی **(IE.) *skeub(h)- >** "فڕێ دان، هاویشتن، ڕا دان". خزمە دەگەڵ ↑شەپ *şep* "لێدان بە لاق". هەروەها بڕوانە ↑چەپە çepe "سەوڵی بەلەم لێخوڕین". وەک دەبینرێ، هەم "سەوڵ" و هەمیش "چەپە" دوو شێوەن لە یەک وشە.

**سەولە sewle** *[ sawla ]* - "ئەستوورک لە درشتەی ئارد کە خۆراکی سەگە": هەروەها سەویک[1] sewîk هەیە بە مانای "ئەستۆرکی بە ڕۆن". خزمە دەگەڵ ↑زبرە zıbre "درشتەی ساوار" و ↑زبر zıbır/ زوور zur [دە بنەڕەتدا: درشت] و هەروەها ↑زبل zıbıl و هتد.

**سەوەتە sewete** *[ sawata ]* - "قەرتاڵەی گەورە": سەبەتە sebete ش دەگوترێ. سبد sabad (P.) "قەرتاڵە". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها ↑ساباط sabat "کەپر" هەیە کە خزمە دەگەڵ "سەوەتە". سەبەتە و ساباط هەردووکیان بە شووڵ دەچنرێن.

**سەویک[1] sewîk** *[ sewīk ]* - "ئەستۆرکی بە ڕۆن": هەر وەک ↑سەولە sewle دەچێتەوە سەر ↑زبر *zıbır* و دواتر ↑زیبک zîbık [بە زیبک و زاکوون].

**سەویک[2] sewîk** *[ sewīk ]* - "گۆزەی ملباریک": سبو sabū (P.). خزمە دەگەڵ↑سواڵەت suwalet.

**سەه seh** *[ sah ]* - "حیس، ئاگاداری": سەح seĥ یش دەگوترێ. [سەح کرن واتا "پێزانین، ئاگادار بوون: من ئەو خەبەر سەح نەکریە]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ sehen (G.)، sehan (OG.)، saíhan (Gt.)، see (E.)، se (Sw.) "دیتن" سەر بە ریشەی **(IE.) *sek- >** "هەست پێکردن، دیتن". مانای بنەڕەتی ئەم ریشەیە بریتییە لە "چاو بە دوودا گێڕان، (بەچاو) شوێن کەوتن". sequi (L.) "شوێن کەوتن، بەدوادا هاتن"، sácatē (OIn.) "دوای دەکەوێ، ڕەگەڵ دەکەوێ، بە دوادا دێ"، sekt (Let.) " شوێن کەوتن، شۆپاندن، بۆن کردن" پێوەندییان بە م ریشەوە هەیە. هەروەها sagen (G.) "قسە کردن" و هاوتاکانی دە زمانە ژێرمەنییەکاندا دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە. مەبەست لەم وشەیەی دوایی دەئەسڵدا "خستنە بەر هەست، خستنە بەرچاو، ئاگادار کردن" بووە. دە زمانی کوردمادیدا ↑سۆز soz [سخن soxan (P.)] بە مانای "قسە" خزمە دەگەڵ ئەم وشە ژێرمەنییانە کە مانای "قسەکردن" دەبەخشن. وەک لەمانای ریشەکەدا دەبنیرێ، ئەو ریشەیە ئاماژە دەکا بە چەمکی "شوێن کەوتن، ڕەگەڵ کەوتن". ئەم مانایە شیمانەی ئەوەمان لا دروست دەکا کە وشەی ↑شکۆ şıko [شان و شکۆ] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ. لەم تێڕوانینەوە کەسێکی بە شان و شکۆ یان شکۆمەند، شکۆدار ئەو کەسەیە کە خەلکێکی زۆری وە شوێن دەکەوی، ڕەگەڵی دەکەوێ، وەک چۆن کەسانی خاوەن دەسەڵات بەدەوام خەڵکێکی زۆری مفتەخۆر و مشەخۆریان بە دەوەرەوەیە و لە کاتی گەڕان و سەردانەکاندا ڕەگەڵ خۆیان دەخەن تاکوو هێز و دەسەڵاتیان بە خەڵکی بێدەسەڵات نیشان بدەن. وشەیەکی دیکەش کە لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ، ↑چاو çaw ە.

**سەهان sehan** *[ sahān ]* "ریخ": دەگەڵ ↑شەنگڵ şengıl "پێکەوەنووسان".

**سەهۆڵ sehol** *[ sahol ]* - "ئاوی لە سەرمان ڕەق هەڵاتوو، یەخ": خزمە دەگەڵ ↑سەهەند[1] sehend "1- زۆر سارد 2- ناوی چیا و زۆزاتێک"، ↑سەقەر seqer "بەستەڵەک"، ↑سەقەم seqem "سەرمای زۆر"، ↑زوقم zuqım یان ↑سیخار sîxar "ئاڵشت، خووس". وەک دەبینین، چەمکی سەرەکی لەم وشانەدا "بەستەڵەک"ە

کە دەچێتەوە سەر "بەستن". مەبەست لە "بەستن" ئەوەیە کە ئاو ئیتر "ئازاد" و رەها نییە، ناجووڵێتەوە و وەک شتێکی بەستراو و شەتەکدراو، توند و بێجووڵەیە. بە وتەیەکی دیکە ئاوەکە رەق و سەخت بووە. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە ئەم وشانە پێوەندییان بە گەلێک وشە هەیە کە مانای "سەخت، توند، پەیت، بەهێز" دەدەن و هەروەها بە خودی وشەی ↑سەخت *sext* ەوە.

**سەهەند1** **sehend** *[ sahand ]* - "1- زۆر سارد 2- ناوی چیا و زۆزانێک": خزمە دەگەڵ ↑سەهۆڵ sehol "یەخ". ناوی چیاکە هەم دەتوانێ ئاماژە بووبێ بۆ سەخت و ئاستەم بوونی چیاکە و هەمیش دەتوانێ ئاماژە بووبێ بە سەرما و بەستەڵەکی سەر چیاکە.

**سەهەن(د)2** **sehen(d)** *[ sahand ]* - "سێبەری خەستی دار": خزمە دەگەڵ ↑سێ se "نیسێ، سێبەر".

**سەهەندە** **sehende** *[ sahanda ]* - "1- بزۆز و نائارام 2- ئاژاوەچی 3- زرینگ 4- سەرسەخت و لاسار":

1- یان خزمە دەگەڵ ↑سفت sıft سەر بە ریشەی **(IE.) *sghuwent- >** "سەخت، قایم، بەهێز"،

2- یانیش پێوندی هەیە بە ↑زەنگ zeng [زەبر و زەنگ] و ↑زیان zîyan. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ↑ژەندن *jendın* و دە ریشەدا مانای "لێدان" دەبەخشن.

**سەهویر** **sehwîr** *[ sahwīr ]* - "1- تارمایی 2- رەشکە و پێشکە": خزمە دەگەڵ ↑سێ se "نیسێ، سێبەر". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑ساویر sawîr "وەهم، خەیاڵات" [بیری سێبەرئاسا، بیری نە روون و شەففاف].

**سەیر** **seyr** *[ sayr ]* - "جێی سەرسوورمان، نائاسایی، دەگمەن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ selten (G.)، seltan (OG.)، zelden (NL.)، seldom (E.)، sällan (Sw.) "سەیر، دەگمەن، نایاب". ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر ریشەی ژێرمەنی *(Grm.) *selda-* "تاک و تەنیا بوون، جیا لەوانی دیکە". لەم تێروانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سەڵت selt "رەبەن، بێ هاوسەر".

**سەیوان** **seywan** *[ saywān ]* - "سایەبان": سایەبان sāyebān (P.)، سەی + وان sey + wan. کەرتی یەکەم دەچێتەوە سەر↑ سێse "سایە" و کەرتی دووەمیش پێوەندی هەیە بە:

1- یان پاشگری ↑وان wan- [بان bān- (P.)]. ئەم پاشگرە دە بنەڕەتدا مانای پاراستن و ئاگاداری کردن دەبەخشێ وەک باخەوان، پاسەوان، گەمێوان، دەستەوانە، قامکەوانە و هتد. لەم تێروانینەوە سەیوان دەبێتە شتێک بۆ خۆ پاراستن لە هەتاو، نەک لە "سایە"!

2- یان ↑بان ban "سەربان". لەم تێروانینەوە سەیوان دەتوانێ ئاماژە بە سێبەری ژێر هەیوان بکا.

**سی1** **sî** *[ sī ]* - "سێ جار دە": خزمە دەگەڵ ↑سێ se "دوو و یەک".

**سی2** **sî** *[ sī ]* - "ئەندامی هەناسە کیشان": ↑سیپەلک sîpelık.

**سیا** **sîya** *[ sīyā ]* - "رەش": سیاه sīyāh (P.). دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سێ se [سا(یە)].

**سیاچەمانە** **sıyaçemane** *[ sıyāčamāna ]* - "جۆرێک گۆرانی": پێک هاتووە لە ↑سیا sıya + چەمانە çemane. کەرتی یەکەم مانای "رەش" دەدا. کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ چامە çāme (P.) "سروود، ئاواز" و hymnos (Gr.) "سروود". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) * seu- , *siu- >** "بەستن، لێکبەستن، دروون". مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا "هەڵبەستراو، هەڵبەست" [سەرنجی کرداری "بەستن" بدە] و "تێکخراو"ی دەنگەکان بووە. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑شاشک şaşık "مێزەر"، ↑سوژن sujın [شوژن şûjın] "تەبەنە، جەواڵدوز"، ↑شاڵ *şal*، ↑جاجم cacım، ↑جۆڵا cola و ↑جاڵجاڵووکە calcaluke و چەندین وشەی دیکە. کەوابوو مانای "سیاچەمانە" دەبێتە "سروودی رەش، بەستەی رەش" و ئەمەش ئاماژەیە بەوە کە ئەم سروود و هەڵبەستانە بۆ کات و بۆنەی ناخۆش و مەینەتبار بەکار هاتوون.

**سیان** **sîyan** *[ sīyān ]* -"قورم، دوودە": خزمە دەگەڵ ↑سیا sîya "رەش" .

**سیاون** **sîyawın** *[ sīyāwın ]* - "1- رەشانگ 2- بزنەموو". خزمە دەگەڵ ↑سیا sîya "رەش".

سیپ1 **sîp 1** ] *sīp* [ - "تامان لەناو چەم بۆ ماسی گرتن": خزمە دەگەڵ ↑سیپە sîpe "رەبەت، بۆسەی راوکەر".

سیپ2 **sîp 2** ] *sīp* [ - "تابشتی زۆر": خزمە دەگەڵ ↑سفت sıft و ↑*سیپان2 sîpan 2* "ناوی دوو چیا لە کوردستان".

سیپ(ە) **sîp(e)** ] *sīp(a)* [ - "تەختەی ناسک و پان": خزمە دەگەڵ ↑چێو çew "چۆڤ، دار، داردەست".

سیپاڵ **sîpal** ] *sīpāl* [ - "1- جلو بەرگ (بەتایبەتی هی کۆن) 2- کۆنەپەڕۆ 3- بەرەی ساکار وکەم بەر": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑چەپکەن1 çepken 1 "کراسی داوێن درێژی ژنانە"، ↑*سابات sabat* و ↑سەوەتە sewete، دە بنەڕەتدا بە مانای "چنین، تەنین"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لەبەر یەک کشانەوە، هەراو بوونەوە، تەنینەوە".

سیپان1 **sîpan 1** ] *sīpān* [ - "بڵیندایی باگیرەوە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑زیپکە zîpke و ↑زۆپ zop "زەق، دەرپەڕیو".

سیپان2 **sîpan 2** ] *sīpān* [ - "ناوی دوو چیا لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە کە ئاماژە بە "سەختی، توندی، هێز" دەکەن، وەک ↑زۆپ zop "گاشەبەرد"، ↑زۆپک zopık "پەیاخی ئەستوور، تۆپز"، ↑سەپتک septık "بەرد"، ↑سیپ sîp "تابشتی زۆر"، ↑شەب şeb "زاخ، بەردێکی سپی"، ↑شەبۆت şebot "درێژترین ماسوولکە" و ژمارەیەک وشەی دیکە کە لەژێر ↑سفت sıft دا باس کراون.

سیپان3 **sîpan 3** ] *sīpān* [ - "رنوو، کڵێڵە، شاپە": شێوەیەکی دیکە لە ↑شاپە şape.

سیپکان **sîpkan** ] *sīpkan* [ - "ناوی هۆزێکی کورد": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم دوو دەستەوشەی خوارەوە. وشەکانی سەر بە هەر دوو خێزان ئاماژە بە چەمکی "سەختی، توندی، هێز" دەکەن:

1- ↑زیبک zîbık [زیپک zîpık] "ئۆتۆریتە، دەسەڵات" و دەگەڵ ↑زەبر zebır [زەبر و زەنگ].

2- ↑سیپان2 sîpan 2 "ناوی دوو چیا لە کوردستان".

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی ناوی هۆزە و مەڵبەندەکانی کوردستان بە چەمکی "سەختی، توندی، هێز" بڕوانە وشەی "سۆران"].

سیپە **sîpe** ] *sīpa* [ -"رەبەت، بۆسەی راوچی". جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ saepes (L.) "پەرژین، بەربەست، چەپەر".

سیپەلک **sîpelık** ] *sīpalık* [ - "ئەندامی هەناسە کیشان": ↑سی sî و سیپەلاک sîpelak یش دەگوترێ. هەروەها ↑زیپەر zîper [ یان زەڤلەک zevlek] هەیە بە مانای "ماسوولکە". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ وشەگەلێک کە لەژێر ↑سابات sabat دا شی کراونەوە و چەمکی "لەبەر یەک کشانەوە، هەراو بوون(ەوە)" لەخۆ دەگرن.

سیت **sît** ] *sīt* [ - "ئەندامی مێیینەی ژن": جێی بەراورد کردنە دەگەڵ Scheide (G.)، sceida (OG.)، schede (Nl.)، skaidir (OIs.) "کالان" [لە دوو پارچە تەختەی لێک بەستراو دروست کراوە]. لە سەدەی هەفدەوە ئەم وشە ژێرمەنییانە بە مانای "ئەندامی مێیینەی ژن" بە کار دەهێنرێن و ئەمەش بە چاولێکەری لە وشەی vagina (L.) کە بە هەر دوو مانای "کالان" و "ئەندامی مێیینەی ژن" بە کار هاتووە. وشە ژێرمەنییەکان دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *skei- >*** "بڕین، لێک جودا کردن، قەڵشاندن". وشەی ↑جودا cuda و گەلێک وشەی دیکە دەچنەوە سەر ئەم ریشەیە.

سیت(ە) **sît(e)** ] *sīta* [ - "تەپکە، داو": خزمە دەگەڵ ↑سدە sıde "تاڵ، رایەڵ" و ↑سێتە sete "پۆ" [تان و پۆ] و↑شەدە şede.

[تێبینی: وشەی "داو"یش بە هەردوو مانای "تەپکە" و " تاڵ، دەزوو" بەکار دێ، چونکە تەپکە لە چەند دانە داو واتا تاڵ دروست دەکرێ کە قاچی پەلەوەر لێی گیر دەبێ].

**سیته‌ک sîtek** [ *sītak* ] - "به‌رده‌ڵان و تمتمان": سیتك sîtık یش ده‌گوترێ. هه‌روه‌ها ↑سێته sete هه‌یه به مانای "چیا". ئه‌م وشانه خزمن ده‌گه‌ڵ ↑چیا *çîya* و سه‌ر به ریشه‌یه‌کن به مانا "سه‌خت". "سێته" ده‌بێ شێوه‌ی کۆنتری "چیا" بێ.

**سیچقه sîçqe** [ *sīčqa* ] - "ماسینی بنی موو له سه‌رمان": سیچقه کردن واتا موو راست بوونه‌وه له سه‌رمان. خزمه ده‌گه‌ڵ ↑سیچکه sîçke "خونچه‌ی تازه" و سه‌ر به ریشه‌یه‌که به مانای "ده‌رپه‌ڕین، زه‌ق بوون".

**سیچکه sîçke** [ *sīčka* ] - "خونچه‌ی تازه": سیچ + که [پاشگری گچکاندن] sîç + ke. "سیچ" ده‌شێ خزمه بێ ده‌گه‌ڵ Schoß (G.)، scoz (OG.) "چرۆ، چه‌که‌ره، چووزه‌ره"، scuz (OG.)، scheut (Nl.)، scyte (OIs.) "داری نووك ده‌رپه‌ڕیوی که‌شتی". وشه‌که‌خزمه ده‌گه‌ڵ ↑چووزه çuze "تیرتکی گیا"، سه‌ر به ریشه‌ی < *(s)keu-* (IE.) "ده‌رپه‌ڕاندن، پاڵ نان، راو نان، له‌زگین بوون]. له‌م تیروانینه‌وه سیچ sîç یان چووز çuz ده بنه‌ڕه‌تدا واتا شتیکی "ده‌رپه‌ڕیو". ئه‌م مانایه ده هێندێك وشه‌ی دیکه‌شدا خۆی نیشان ده‌دا، وه‌ك سیچقه‌سڵاو sîçqesılaw یان ↑سیتکه‌زه‌لام sîtkezelam "باپشکێو"، ↑سیچقه‌sîçqe ده‌رکردن "موو هه‌ستان له ترسان" و ↑سووچ suç "گۆشه" [ده بنه‌ڕه‌تدا شوێنی ده‌رپه‌ڕیو] و هتد. ئه‌م وشانه هه‌روه‌ها خزمن ده‌گه‌ڵ ↑زه‌ق *zeq*.

[تێبینی: ده زمانی تورکیدا وشه‌ی çîçek (Tur.) به‌کار دێ که به مانای "خونچه"یه و له هه‌مان کاتیشدا وه‌ك ناوی فامیلی بره‌وی هه‌یه. ئه‌م وشه‌یه له وشه کوردمادییه‌که‌ی سه‌ره‌وه وه‌رگیراوه].

**سیخ sîx** [ *sīx* ] - "1- زه‌رگێ 2- شیش": شێوه‌یه‌کی دیکه‌یه له ↑شیش şîş و خزمه ده‌گه‌ڵ ئه‌و وشانه‌ی له‌ژێر ↑زه‌ق zeq دا باس کراون.

**سیخار sîxar** [ *sīxār* ] - "زوقم، سه‌قه‌م": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑سه‌قه‌م seqem و ئه‌و وشانه‌ی له‌ژێر ↑سه‌ق *seq*دا باس کراون.

**سیخاندن sîxandın** [ *sīxāndın* ] - " به‌زۆر تیراکردن": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑زه‌ق zeq.

**سیخن sîxın** [ *sīxın* ] - "له‌جه‌ر، لاواز": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑سیس sîs و ↑*ژاکان jakan*.

**سیخوڕ sīxur** [ *sīxur* ] - "شۆڤار، جاسووس": خزمه ده‌گه‌ڵ schauen (G.) "چاو لێکردن، سه‌رنج دان"، schouwen (Nl.) "چاو لێکردن"، show (E.) "نیشان دان"، skygn (OIs.) "وردبین، زیت"، skygna (OIs.) "سیخوڕ". ئه‌م وشانه ده‌چنه‌وه سه‌ر ریشه‌ی < *(s)keu-* (IE.) "سه‌رنج دان، ئاگا لێبوون، وشیار بوون".

**سیخورمه sîxurme** [ *sīxurma* ] - "نقورچك": سیخ + ورمه sîx + wırme. که‌رتی یه‌که‌م ده‌چێته‌وه سه‌ر ↑سیخ sîx "نووك تیژ"، که‌رتی دووه‌م وشه‌یه‌کی تورکییه به مانای "لێدان". تیکڕای وشه‌که واتا "سیخ لێدان، لێدان به سیخ".

**سیخول sîxul** [ *sīxul* ] - "جۆرێك ژیشکی زه‌لام": سیخ چووله sîxçule ش ده‌گوترێ. ده‌چێته‌وه سه‌ر ↑سیخ sîx "نووك تیژ" و ئاماژه به دڕکه‌کانی ئاژه‌ڵه‌که ده‌کا.

**سیرمه sîrme** [ *sīrma* ] -"پارچه‌چرمی باریك": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑چه‌رم cerım.

**سیره sîre** [ *sīra* ] - "1-ده‌نگی که‌و له ترسان 2- زیره": شێوه‌یه‌کی دیکه له ↑زیره zire.

**سیس sîs** [ *sīs* ] - "چرچ، ژاکاو، ره‌ق هه‌ڵاتوو": ده‌شێ پێوه‌ندی به یه‌کێك له‌م وشانه‌وه هه‌بێ:

1- ↑ژاکان jakan.

2- ↑سه‌ق seq. وشه‌کانی سه‌ر به‌م خێزانه ده بنه‌ڕه‌تدا ئاماژه به "ره‌ق، سه‌خت و پته‌و بوون" ده‌که‌ن و هه‌روه‌ها مانای "هیشك بوون"یش ده‌گه‌یه‌نن، چونکوو "هیشك" و "ره‌ق" پێوه‌ندییان به یه‌که‌وه هه‌یه [هیشك هه‌ڵاتن، ره‌ق هه‌ڵاتن]. وشه‌ی ↑زه‌ها zeha "هیشك و ره‌ق" و ↑زازا zaza سه‌ر به‌م خێزانه وشه‌یه‌ن. هه‌روه‌ها هه‌ڵی سه‌نگینه ده‌ده‌گه‌ڵ ↑سیسارك sîsark.

سیسارک **sîsark** *[ sīsārk ]* - "مەلێکی زلی لاشەخۆر": دەشێ پێک هاتبێ لە دوو کەرتی سیس + ئارک ark + sîs. کەرتی یەکەم سیس -sîs دەبێ پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون و مانای "سەخت، بەهێز" دەدەن. کەرتی دووەم دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.) *hor- >* "هەڵۆ، پەڵەوەری راوکەری گەورە". بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑هەڵۆ helo و ماناکەی دە بنەڕەتدا دەبێتە "پەڵەوەری بەهێز":

سیسان **sîsan** *[ sîsan ]* - "بەیانی زوو، شەوەکی":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑*سێ se*، ↑سیا sîya، ↑سیان sîyan و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە تاریکی و رەنگی خۆڵەمێشی دەکەن.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑سوزی sozî.

سیسرک **sîsırk** *[ sīsırk ]* - ↑سریلە sırîle و سیسرە sîsre شی پێ دە گوترێ. وشەکە دەشێ پێشتر "سرسرک" [سیرسیرک] بووبێ، وەک جیرجیرک jīrjīrak (P.).

سیڤان **sîvan** *[ sīvān ]* - "چەتری بەرخۆر": شێوەیەکی دیکە لە ↑سەیوان seywan "سایەبان".

سیڤە **sîve** *[ sīva ]* - "قەڵەو، پرگۆشت": [دە بنەڕەتدا: سەخت، رەق، بەهێز]، خزمە دەگەڵ ↑خەپە xepe "قەڵەو"، ↑قەبە qebe "ئەستوور"، ↑سەویک sewîk "ئەستۆرکی بە رۆن"، ↑سەولە sewle و ↑سەپک2 sepık "نان لە درشتەی ئارد بۆ سەگ". هەروەها بڕوانە ↑گوڤین guvîn "مەیین" [دە بنەڕەتدا: سەخت و رەق بوون].

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی نێوان چەمکەکانی "قەڵەو"، "ئەستوور" و "بەهێز" دەکرێ ئاماژە بە وشەی "قەڵەو" بکەین کە خزمە دەگەڵ *کولفت* "ئەستوور" و kraft (G.) "هێز"].

سیق **sîq** *[ sīq ]* - "دانی هەزم نەکراوی ناو سکی مەل": خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx "خیز، ورکەبەرد" و گەلێک وشەی دیکە کە لە ژێر ↑*سەق seq* دا شی کراونەوە. ئەم وشانە بەگشتی هەڵگری مانای "سەخت"ن و هێندێکیان مانای "بەرد" دەبەخشن، وەک ↑زاخ zax یان زاگ zag "جۆرێک بەرد"، ↑سەقی seqî "جۆرێک بەردی مەڕمەڕی زەرد"، ↑زاخۆر zaxor "بەردەڵانی رژد و بلیند" و هتد. کەوابوو سیق sîq [یان سیک sîk، جیک cîk یان چیک çîk] ئەو ورکەبەردانەن کە لەناو گەدەی پەلەوەردا هەزم ناکرێن و بەو شوێنەش کە ئەو سیقانە لەوێدا خڕ دەبنەوە دەگوترێ سیقەتۆرە sîqetore یان ↑سیکەتۆرە sîketore واتا "توورەکەی سیقان". وشەیەکی دیکە کە بۆ سیکەتۆرە بەکار دەهێنرێ، ↑جیکڵدان cîkıldan [چیکڵدان çîkıldan]ە، واتا شوێنی جیکڵ cıkıl [یان چیکڵ çîkıl]. لێرەدا پاشگری گچکاندنی -ıl خراوەتە سەر "جیک" یان "چیک" و وشەکە گچکێنراوە.

سیک **sîk** *[ sīk ]* - "سووچ، گۆشە": شێوەیەکی دیکە لە ↑سووچ suç.

سیکەتۆرە **sîketore** *[ sīkatora ]* - "جیکڵدانە": توورەکەیەکی بچووکە لە ناو سکی پەڵەوەر کە خۆراکی هەڵنەتاوێنراو و ورکەبەردی قووت دراوی تێدا کۆ دەبێتەوە. سیقەتۆرە sîqetore و جیکڵدان cîkıldan و چیکڵدان çîkıldanî یش دەگوترێن. پێک هاتووە لە دوو وشەی سیک(ە) + تۆرە tore + sîk(e). کەرتی یەکەم واتا sîk(e) [یان سیق، جیک، چیک] خزمە دەگەڵ ↑زیخ zîx "بەردۆکە". مەبەست لە کەرتی دووەم "توورەکە"یە و تێکڕای وشکە دەبێتە توورەکەی ورکەزیخ. دە پلەیەکی دوورتردا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زاخ zax "بەرد". دە زمانی کوردمادیدا بە مرۆڤی بێسەبر و کەم حەوسەلە دەڵێن "جیکڵدانەی نییە". مەبەست لە "جیکڵدانە هەبوون" ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانێ قسە و کارو کردەوەی رەقی بەرانبەرەکەی وەک بەردی ناو جیکڵدان لەناو خۆیدا هەڵبگرێ و بە حەوسەلە و لەسەرەخۆ "هەزم"ی بکا.

سیڵخان **sîlxan** *[ sīlxān ]* - "قوڕ و لیتەی ناو جۆگە": خزمە دەگەڵ ↑سێلاخ selax.

سیلل **sîll** *[ sīll ]* - "نەخۆشی ئازارەباریکە": سل sell یان soll (P.). دە زمانی فارسیدا هەروەها سل soll (P.) هەیە بە مانای "سی، سیپەلاک". لەڕووی ئەم پێوەندییانە دەکرێ شیمانەی ئەوە بکەین کە ئەم

وشەیە دە ئەسڵدا وشەیەکی کوردمادی و فارسی بووبێ و دەگەڵ ↑سی sî خزم بێ، چونکوو ئەم نەخۆشییە لە رێگەی سییەکانەوە پەیدا دەبێ و یەکێک لە نیشانەکانی کۆخەکۆخی زۆرە.

**سیلە sîle** [ sīla ] - "نیشانە، ئامانج": سیلە گرتن واتا "نیشانە گرتن، لەبەر چاو گرتنی ئامانج". خزمە دەگەڵ Ziel (G.) "ئامانج، مەبەست، هەدەف"، zilēn (G.) "سیلە گرتن، کردنە ئامانج"، erzielen (G.) "بە دەست هێنان، بە ئامانج گەیشتن". ئەم وشانەی زمانی ئەڵمانی خزمن دەگەڵ tilian (OE.) "پەڵە کردن" [خزم دەگەڵ "تالووکە" ؟] و til (OE.) "تا، بەرەو" [بەرەو ئامانج]. دە زمانی فارسیدا تیلە tīle (P.) بە مانای "مت، کەلا" دێ و دە بنەڕەتدا بەو مەرمەڕ یان بەو متە گوتراوە کە دە کایەی مێشێن [متین]دا کراوەتە ئامانج. ئەم وشانە دواجار دەبنە خزم دەگەڵ ↑دان dan سەر بە ریشەی < *dā(i)- (IE.) "بەش دان، بەش کردن، لەت کردن". لەم تێڕوانینەوە سیلە دە بنەڕەتدا بە مانای "بەشکراو، ئەندازەگیراو" بووە.

**سیلک sîlık** [ sīlık ] - "خیز و لمی چەم": خزمە دەگەڵ ↑سێلاخ selax "لمێکە ئاو رایداوەتە رەخی رووبار".

**سیلی sîlî** [ sīlī ] - "کای برینج": خزمە دەگەڵ ↑چاڵ çal [چیلکە و چاڵ].

**سیم sîm** [ sīm ] - "تێل": سیم sīm (P.). خزمە دەگەڵ ↑سوژن sujın "تەبەنە، جەواڵدوز"، سەر بە ریشەی < *seu-, *siu- (IE.) "بەستن، لێکبەستن".

**سیما sîma** [ sīmā ] - "بیچم، شێوە، روخسار": سیما sīmā (P.). جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ schēma (Gr.) و (L.) "شێوە، سیما، فۆرم". ئەم وشە یۆنانییە- لاتینییە دەچێتەوە سەر échein (Gr.) "راگرتن".

**سیمکە sîmke** [ sīmka ] - "نیر": سیمکە یان نیر ئەو دارەیە کە دوو گاجووت بە یەکەوە دەبەستێتەوە. جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ:

1- ↑سیم sîm "تێل" سەر بە ریشەی < *seu-, *siu- (IE.) "بەستن، لێکبەستن".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە چەندین وشەی وەک ↑جڤین cıvîn "یەکگرتن، لەدەوری یەک کۆم بوون" کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "یەک".

**سینگ[1] sîng[1]** [ sīng ] - "لای پێشەوەی لەش لە نێوان مل و سکدا": [سینگ و بەر]. سینە sīne (P.). وەک دەردەکەوێ وشەکە دەگەڵ "بەر" دێ کە ئەویش مانای سینگ دەدا و خزمە دەگەڵ "بەرین". بەم پێیە وشەی "سینگ" دە بنەڕەتدا ئاماژە بە شتێکی پان و بەرین دەکا. ئەم مانایە لە وشەی ↑سینی sînî شدا دەبینرێ، بە مانای "کەشەف، تەبەک". لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑تەنین tenîn، dehnen (G.)، dennan (OE.)، tänja (Sw.) "لەبەر یەک کشانەوە، تەنینەوە"، teinein (Gr.) و tendere (L.) "تەنین، تەنینەوە، لەبەر یەک کشانەوە"، سەر بە ریشەی < *ten- (IE.) "کێشان، لەبەر یەک کێشانەوە، تەنین(ەوە)". دە زمانی کوردمادیدا وشەکانی ↑تەنک tenık، ↑تان tan "رایەڵی تەوون"، ↑تەناف tenaf "گوریس"، ↑توونا tuna و ↑تەنگ teng پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

**سینگ[2] sîng[2]** [ sīng ] - "داری داکوتان، مێخی ئەستووری لەدار": خزمە دەگەڵ Stange (G.)، stanga (OG.)، stang (E.) و (Nl.) و stäng (Sw.) "سینگ". هەروەها دەگەڵ stinga (Sw.) و sting (E.) "تێراچوون، تێراکردن"، سەر بە ریشەی < *ste(n)gh- (IE.) "نووک تیژ، تێراچوون، تێهەڵچەقین". stagg (Sw.) "درکەزی"، Stengel (G.) "لاسکەگیا" و tigma (OIn.) "تیژ" دەچنەوە سەر هەمان ریشە. ئەم ریشەیە خۆی پەرەی گرتووە لە ریشەی < *(s)teig- (IE.) "تیژ بوون و تێراچوون". دە زمانی کوردمادی دەبێتە خزم دەگەڵ گەلێک وشە بۆ وێنە ↑چەقین çeqîn و ↑تیغ tîġ و ↑تیژ tîj.

**سینی sînî** [ sīnī ] - "کەشەف، تەبەق": سینی sīnī (P.). لەوە ناچێ ئەم وشەیە پێوەندی بە "چینی"یەوە هەبێ، چونکوو مەبەست لە "چینی" یان سرامیک ماتریالەکەیە و نەک جۆرێکی تایبەت لە دەفر. بۆیە وشەکە دەشێ بە مانای دەفرێکی پان و پۆڕ و خزم بێ دەگەڵ ↑سینگ[1] sîng[1] [سینگ و بەر].

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ plate (E.) "دەوری" کە خزم دەگەڵ پەل pel ی کوردی و دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "پەل، پان و بڵاو"].

**سیواد sîwad** [ *sīwād* ] - سیواد بوونەوە واتا "رووقایم بوون، پرروو بوون". خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn [سوون sun]. هەڵی سەنگێنە دەگەڵ "چەقاوەسوو" بوون واتا روو هەڵماڵدراو و بێشەرم بوون.

**سیواک sîwak** [ *sīwāk* ] - "دارۆکەیەکە بۆ ددان خاوێن کردنەوە بە کاریان دێنا": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn [سوون sun] "رێخشاندن، رێخستن". وشەی مسواک mīswāk (Arb.) لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە، واتا وشە کوردمادییەکە عەرەبێنراوە. هەروەها بنە وشەی سیو -sîw لە وشەی "سیواد" و "سیواک"دا هەڵسەنگێنە دەگەڵ ↑سیوسیوە sîwsîwe بە مانای "تیف تیفەدان، ساف و لووس کردن".

[تێبینی: سەبارەت بە وشەی "میسواک" دە زمانی کوردیدا، وەک دەیان وشەی لەم چەشنە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەیەکی کوردمادی - لەم پێوەندییەدا "سیواک"- عەرەبێنراوە و پاشان ئەم شێوە عەرەبێنراوە هاتۆتەوە ناو زمانی کوردی و جێی بە وشە کوردمادییە رەسەنەکە چۆڵ کردووە. لەم باوەرەدام زمانی کوردمادی پێویستی بەم وشە عەرەبێنراوانە نییە و دەکرێ وشە رەسەنەکانی خۆمان لە جێیان دابنێینەوە، واتا بۆ وێنە "بە سیواک ددان شوتن" لەجیاتی "بە میسواک ددان شوتن" بەکار بێنین].

**سیوسیوە sîwsîwe** [ *sīwsīwa* ] - "ساف و لووس کردن، تیف تیفە": خزمە دەگەڵ ↑سیواک sîwak.

[تێبینی: لەوە ناچێ "سیوسیوە" شێوەی گۆردراوی "تیف تیفە" بێ، یان بە پێچەوانەوە. هەر کام لەم وشانە دەبێ وشەیەکی سەربەخۆ و سەر بە ریشەیەکی جیاواز بێ].

**سیویر sîwîr** [ *sīwīr* ] - "تاوێک کە پێست تاوانگاز دەکا": خزمە دەگەڵ ↑زویر zuwîr "نارەحەت، دڵ ئێشاو" و ↑*زوورانەوە zuran(ewe)* "سووتانەوەی پێست، کزانەوە"، سەر بە ریشەی **< *suer- (IE.)** "ئێشان، چڵک کردن".

**سێ[1] se** [ *se* ] - "دوو و یەک": سە se (P.)، drei (G.)، drī (OG.)، three (E.)، tre (Sw.)، tres (L.)، trēis (Gr.) "سێ" **< *trei- (IE.)** "سێ".

**سێ[2] se** [ *se* ] - "نیسێ، سێبەر": نیسێ nîse و سێبەر seber یش دەگوترێن. سایە sāye (P.). خزمە دەگەڵ chayā (OIn.)، skiā (Gr.) سێ، سایە"، هەروەها دەگەڵ skēné (Gr.) "چادر، خێوەت" [دە بنەرەتدا: سایەبان؟]. وشەی ↑شانۆ şano دە زمانی کوردمادیدا کە وشەیەکی وەرگیراوە، ریشەکەی بۆ ئەم وشە یۆنانییەی دوایی بە مانای "چادر" دەگەرێتەوە. ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ↑شەعن şeɛın "بزنی بەڵەک"، scheinen (G.)، scīnan (OG)، skeinan (Gt.)، shine (E.)، skina (Sw.) "بە دیار کەوتن، درەوشان" و sijat (Rus.) "درەوشانەوە". تێکرای ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **< *skāi- (IE.)** "درەوشانەوەی کز ومات، رووناکایی دەرکەوتن" [وەک شەوقی چرا لەپشت تەڵڤێک کە رووناکاییەکی گەش نییە]. چەندین وشەی دیکە دە زمانی کوردمادیدا پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکەن کە بریتین لە ↑سیا sîya "رەش"، ↑سەهویر sehwîr "تارمایی" و ↑سهنە sıhne "تارمایی" و ↑*شێو şêw* "تاریکان" و هتد. دە زمانە هیندوئەورووپییەکان و لەوانە زمانی کوردمادیشدا دوو دەستە وشە لەم ریشەوە سەریان هەڵداوە، دەستەیەک ئاماژە بە "سێبەر، تاریکایی" و دەستەیەکیش ئاماژە بە "درەوشانەوە" دەکەن. پەیدا بوونی ئەم دوو مانا دژ بە یەکە بۆ مانای ریشەکە دەگەرێتەوە کە باس لە رووناکاییەکی کز و مات، ترووسکانەوەیەکی بە ئاستەم" دەکا، وەک چۆن شتێک بەحاڵ دەترووسکێتەوە یان رووناکاییەک کە بە حاڵ دیاری دەکا. ئیتر لەم مانا بنەرەتییەوە هەم وشە بە مانای "درەوشانەوە" و هەمیش بە مانای "سایە، تاریکایی" سەریان هەڵداوە.

**سێپ1 sep** [ *sep* ] - "کونی سیرەی تفەنگ": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زۆپ zop "زەقایی، دەرپەرپوی" و دە بنەرەتدا ئاماژە بکا بەو تیکە زەقەی سەر لوولەی تفەنگ کە کونەکەی تێدایە.

**سێپ2 sep** [ *sep* ] - "دەستەندە، دەسکی ئاموور": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schaft (.G)، shaft (.E)، skaft (.Sw) "دەسک، دەستک" و هەروەها skeptron (.Gr) "داردەست، چێو"، سەر بە ریشەی < *skab- (.IE) "بڕین، ڕنین، داتاشین". بەم جۆرە مانای وشە ژێرمەنییەکان دە بنەڕەتدا "لقە داری بڕدراو و داتاشراو" بووە. لەم تێڕوانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ساوین sawîn [سابیدن sabīden (.P)].

**سێتە1 sete** [ *seta* ] - "چیا": هەروەها ↑سیتەک sîtek هەیە بە مانای "بەردەڵان، تمتمان". "سێتە" پێوەندی بە ↑چیا çîya وە هەیە. ↑زات zat "بوێری" [دە بنەڕەتدا: هێز و پتەوی] پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی دیکە کە ئەوانیش پێکەوە خزمن، واتا "بەرد" و "پاڵەوان".

**سێتە2 sete** [ *seta* ] - "پۆ":[تان و پۆ]. خزمە دەگەڵ ↑سدە sıde "رایەڵ".

**سێروو seru** [ *serū* ] - "جۆرێک چۆلەکە": سار sar (.P). دەشێ خزم بێ دەگەڵ star (.G)، stara (.OG)، stare (.E) و sturnus (.L) "سار، سێروو".

**سێڤ سیڤۆک sevsevok** [ *sevsevok* ] - "پیازەخووگانە": خزمە دەگەڵ ↑سێو sew [سێڤ sev].

**سێڤاندۆک sevandok** [ *sevandok* ] - "چۆلەکە":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑سوانە suwane [سێڤانە sevane] "لێواری سەربان" و لەبەر ئەوەی ئەم پەڵەوەرە زۆرتر لەسەر گوێسوان هەڵدەنیشێ، بەم جۆرە ناوزەد کراوبێ.

2- یان لەوانەیە بنجی سیڤ -sev شێوەیەکی دیکە بێ لە چڤ -çıf و ↑چۆلەکە çoleke.

**سێڤەرۆک severok** [ *sevarok* ] - "پەتاتە": سێوک sewık ش دەگوترێ. بڕوانە↑سێو sew. وشەی "یارەماسی/ یارەڵماسی" کە بە مانای "پەتاتە" بەکار دەهێنرێ، وشەیەکی تورکییە و ماناکەی دەبێتە "سێوی (سەر) زەوی" [بۆ جیا کردنەوە لە سێوی دارەسێو واتا سێوی بە حەواوە]. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ "سیب زمینی" هەر بە هەمان مانا. ئەم ناو لێنانانە بە چاو لێکردن لە زمانی فەرانسەیی دروست کراون. بە فەرانسەیی دەگوترێ pomme de terre (.Fr) "هەردەسێو". وشەی کوردی سێڤەرۆک severok یش بەم پێوانەیە لە سێ کەرت پێکهاتووە: سێو sew + ئەر er + پاشگری ئۆک ok. کەرتی ئەر -er کورتکراوەی ئەرد erd[↑هەرد herd]ە.

**سێڵ sel** [ *sel* ] - "ساج": بە لەبەر چاو گرتنی ئەوە کە "سێڵ" روو بەرێکی پانە بۆ نان پێوەدان، دەبێ پێوەندی هەبێ بە↑ سەل sel "بەردی پان و تەنک" و ↑ سەڵپ selp "بێلی گەمێوان".

**سێڵاخ selax** [ *selāx* ] - "رەڵمێک کە ئاو رایماڵیوە و داویەتە رەخی رۆبار": ئەم وشانەی خوارەوەش لەپێوەندی دەگەڵ ئەم وشەیەدا جێی شی کردنەوەن: ↑سیڵخان sîlxan "قوڕ و لیتەی ناو جۆگە"، ↑سیلک sîlık "رمڵ، خیزی چۆمان"، ↑سێلەک selek "شۆرەکات".

1- لە لایەکەوە دەشێ پێوەندی بە هێندێک وشەوە هەبێ کە مانای "تەڕ و لیچق" دەبەخشن، وەک ↑جلق cılq، ↑سلق sılq و ↑زەلک zelk [زەلکاو zelkaw] و دە پلەیەکی دوورتردا ↑شێلهان şêl(e)han "راخوشین"، schleichen (.G)، slihhan (.OG)، sliken (.ME) "خوشین" [دە بنەڕەتدا: خلیسکان]. وشەی ↑لم *lım* یش پێوەندی بەم وشانەوە پەیدا دەکا.

2- لە لایەکی دیکەوە جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Schlack (.G) "لیتە" و Schlacke (.G)، slagge (.MnG) "ئەو خڵتە و خاڵەی لە تواندنەوەی بەردی مەعدەن دروست دەبێ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schlagen (.G) "لێدان، لێکدان" و هەروەها دەگەڵ ↑شڵەقان şıleqan.

**سێڵاو selaw** [ *selāw* ] - "لافاو، ئاوهەستان": سیل seyl و سیلاب seylāb (.P). سێڵ + ئاو sel + aw. کەرتی یەکەم دەبێ خزم بێ دەگەڵ schwellen (.G)، swellan (.OG)، zwellen (.Nl)، swell (.E)، svälla (.Sw) "هەڵمسان، گەورە بوونەوە" و Schwall (.G) و swal (.MG) "شەپۆل". خزمە دەگەڵ ↑زل zıl "قەبە، گەورە".

سێله‌ك **selek** [ *selak* ] - "شۆره‌كات": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑سێلاخ selax.

سێو **sew** [ *sew* ] - "میوه‌یه‌كی شیرن": سێڤ sev ش ده‌گوترێ. سیب sīb (P.). ده زمانی كوردمادیدا هێندێك وشه له‌م پێوه‌ندییه‌دا سه‌رنج راده‌كێشن، وه‌ك ↑سێڤه‌رۆك severok "په‌تاته"، ↑سێڤ سێڤۆك sevsevok "پیازه خووكانه"، ↑سێفه‌لووكه sefeluke "گیایه‌كه به‌رێكی خڕی هه‌یه و ده‌خورێ"، ↑سیفۆكه sîfoke "گیایه‌كه"، ↑كیفۆك kîfok "گیایه‌كی بن خڕ" و هتد. وه‌ك ده‌بینین وشه‌كه بۆ ئه‌و گیایانه‌ش به‌كار دێ كه بنكی خڕ، واتا پیازچه‌یان هه‌یه. ئه‌مه وامان لێده‌كا وشه‌كه پێوه‌ند بده‌ینه‌وه به cepa (L.) "پیاز، پیواز". ریشه‌ی وشه لاتینییه‌كه ساخ نه‌كراوه‌ته‌وه و به پێی بۆچوونێك ده‌بێ له زمانێكی نه‌ناسراو وه‌رگیرابێ. له‌وانه‌یه زمانی لاتینی وشه‌كه‌ی له زمانی كوردمادی وه‌رگرتبێ.

سێوالا **sewala** [ *sewālā* ] - "ره‌ش تاڵه": خزمه ده‌گه‌ڵ ↑ سێ se "سێبه‌ر" و ↑سیا sîya "ره‌ش".

[تێبینی: شیاوی باسه كه ده وشه‌ی "ره‌شتاڵه"دا كه‌رتی " تاڵ"یش ئاماژه به" تاری و تاریك" بوون ده‌كا نه‌ك تامی تاڵ].

سێونگ **sewıng** [ *sewıng* ] - "1- ره‌شانگ 2- بزنه‌ره‌ش": خزمه ده‌گه‌ڵ↑ سێ se "سێبه‌ر" و ↑سیا sîya "ره‌ش".

سێ ه **seh** [ *seh* ] - "1- چه‌رمی وشك هه‌ڵاتوو 2- رك، توورِه‌یی": خزمه ده‌گه‌ڵ ئه‌و وشه‌گه‌له‌ی له‌ژێر ↑سه‌ق seq دا شی كراونه‌وه. ئه‌م وشانه به گشتی مانای "سه‌خت، ره‌ق" ده‌به‌خشن.

سێهرا **sehra** [ *sehrā* ] - "تووره، قه‌ڵس" [سێهرا بوون sehra bun واتا تووره بوون، رق هه‌ستان]. ↑ده‌هری dehrî بوونیش ده‌گوترێ كه ئه‌مه‌یان شێوه‌یه‌كی تازه‌تری وشه‌كه‌یه. بروانه ↑جه‌حنین ceĥnîn.

## ش (Ş)

**شابۆق şaboq** [ *šāboq* ] - "لقی گەورەی دار":
1- یان خزمە دەگەڵ ↑ساپیتە sapîte "1- میچی خانوو 2- کاریتە، دیرەکێ 3- لای هەرە بڵیند".
2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑شیپ şîp "دار"، ↑شیپانە şîpane "چوارچێوەی دەرگا" و ↑چێو *çew*.
**شاپاڵۆخ şapalox** [ *šāpālox* ] - "وەروەرە، بەفرماڵی پان": خزمە دەگەڵ ↑شەپڵتە şepılte "بەفرماڵ، وەروەرە"، ↑سەوڵ sewıl و هەروەها ↑شەپ[1] *şep*.
**شاپان şapan** [ *šāpān* ] - "تێڵا، چۆماغ":
1- یان خزمە دەگەڵ ↑شیپ şîp "دار"، ↑شیپانە şîpane "چوارچێوەی دەرگا" و ↑چێو *çew*.
2- یانیش خزمە دەگەڵ ↑شەپ şep "لێدان".
**شاپک şapık** [ *šāpık* ] - "1- چۆغە 2- پاڵتۆی کورت": شەپک şepk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شەپکە şepke "جۆرێک کڵاو".
**شاپە1 şape** [ *šāpa* ] - "1- رنوو 2- تاوێرەبەرد": شاپ şap یش دەگوترێ.
1- بە لەبەر چاو گرتنی ئەوە کە "رنوو" لە "رنین"ەوە هاتووە، "شاپە" دەتوانێ پێوەندی بە کرداری ↑ساوین sawîn ەوە هەبێ [کۆنتر: *şapîn**؟]. ئەم کردارە هەر لە کۆنەوە هێندێک مانای وەک "کڕاندن، ڕنین، سوونەوە، تاشین، ڕێخشاندن" بە دەستەوە دەدا.
2- لە لایەکی دیکەوە زۆر باش دەگەڵ وشەی ↑شەپ şep رێک دەکەوێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان، (رە) پاڵ نان، رادان، دەرپەڕاندن، هاویشتن".
**شاپە2 şape** [ *šāpa* ] - "خۆیان، کڵۆشی بەسەریەکدادراو": خزمە دەگەڵ ↑زاڤ zav و ↑زۆر[1] *zor*.
[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ گیشە gîşe و گشت gışt "زۆر، هەموو"].
**شات1 şat** [ *šāt* ] - "لکەداری یەکساڵە، چرۆ": خزمە دەگەڵ ↑سیچکە sîçke "خونچە"، ↑سیتکەسڵاو sîtkesılaw "باپشکێو"، ↑سووچ suç "گۆشە" و چەندین وشەی دیکە کە ئاماژە بە چەمکی دەرپەڕین و زەق بوونەوە دەکەن. ئەم وشانە دەچنەوەو سەر ریشەی ***(IE.) *(s)kēu- >*** "دەرپەڕاندن، رە پاڵ نان، راو نان، را دان، پەلە کردن، تاو دان". (E.) shoot "دەرپەڕاندن، هاویشتن" و (E.) shout "قیژاندن" لەم ریشەوە هاتوون.
**شات2 şat** [ *šāt* ] - "قیژە و هەرا": [شاتە شات]. خزمە دەگەڵ (E.) shout "قیژاندن" و (E.) shoot "دەرپەڕاندن، هاویشتن"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)kēu- >*** "دەرپەڕاندن، رە پاڵ نان، راو نان، را دان، پەلە کردن، تاو دان". مەبەست لە "شات" دە بنەڕەتدا بەسەردا گوڕڕاندن بووە بە مەبەستی رادان، لێخوڕین یان راونان. [هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی "لێخوڕین" بە مانای "ئاژۆتن" کە لە بنەوشەی "خوڕین" دێ کە خۆی خزمە دەگەڵ گوڕڕە و گوڕڕاندن]. بەم جۆرە شات دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشە دە زمانی کوردمادیدا، لەوانە ↑شات1 şat "چرۆ"، ↑سات sat "سوور و سات"، ↑چات çat کردن واتا "تیر هاویشتنە سەر مێ"، ↑شاتاڵ şatal "پەلامار"، ↑شاتر şatır "پیادەی چابوک"، ↑شووت şût [شات و شووت]، ↑شاتک şatk "رەگی مل" [رەگی دەرپەڕیو]، ↑چووزە çuze، ↑چەکەرە çekere،↑چوخساندن çuxsandın"دەرپەڕاندن"، ↑زەق *zeq* "دەرپەڕیو" و هتد.
**شاتاڵ şatal** [ *šātāl* ] - "پەلامار": خزمە دەگەڵ ↑شات2 şat سەر بە ریشەی ***(IE.) *(s)kēu- >*** "دەرپەڕاندن، رەپاڵ نان، راو نان، را دان، پەلە کردن، تاو دان".
[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ "هەرا" و "خێرا" و "هێرش" یان "پەلە" و "پەلامار"].

شاتاندن **şatandın** [ *šātāndın* ] - "ریان [ی پیسایی شل]": خزمە دەگەڵ scheißen (G.)، scīzan (OG.)، shit (E.)، skita (Sw.)، schijten (Nl.) "رین، ریان"، سەر بە ریشەی **(IE.) *skēi- >** "قەڵشاندن، جیا کردنەوە، لێک کردنەوە". مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا جیا بوونەوە و لێ بوونەوەی پیسایی لە لەشە. خزمە دەگەڵ ↑شیاکە şîyake "ریخ" و↑شێ şê [شی کردنەوە] و ژمارەیەک وشەی دیکە.

شاتر **şatır** [ *šātır* ] - "پیادەی چابوک": خزمە دەگەڵ ↑شاتاڵ şatal "پەلامار" و↑شات2 şat سەر بە ریشەی **(IE.) *(s)kēu- >** "دەرپەڕاندن، رەپاڵ نان، راو نان، را دان، پەلە کردن، تاو دان".

شاتک **şatk** [ *šātk* ] - "رەگی مل": خزمە دەگەڵ ↑شات2 şat "قیژە و هەرا".

شاتلۆرە **şatıl(l)ore** [ *šātıl(l)ora* ] - "گلار (بوونەوە)، تلۆر (بوونەوە)": کەرتی یەکەمی وشەکە واتا "شا" ناتوانێ پێوەندی بە "شا، پادشا"وە هەبێ. ئەم وشەیە دەبێ پێک هاتبێ لە شات + تلۆرە (t)lore + şat. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑شات2 şat "قیژە و هەرا" [شاتە شات] سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەرپەڕاندن، رەپاڵ نان، راو نان، را دان، پەلە کردن، تاو دان". بۆ کەرتی دووەم بڕوانە ↑تلۆر tılor.

شاچاغ **şaçaġ** [ *šāčāġ* ] - "گوڵینگەی سەر بۆ رازاندنەوە": خزمە دەگەڵ ↑سیچکە sîçke "خونچەی تازە".

شاخ1 **şax** [ *šāx* ] - "کێو، چیا": خزمە دەگەڵ یەک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑شاخ2 şax "قۆچی ئاژەڵ" [بڕوانە ↑زەق zeq]. سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "شاخ و کێو" و "زەقایی و دەرپەڕیوو بون" بەرهەڤی بکە دەگەڵ وشەی "تەپە، تەپپە".

2- ↑زاخ[1] "بەرد". دوو چەمکی "شاخ و کێو" و "بەرد" پێوەندییان هەیە، لەم بارەوە بڕوانە وشەی "چیا" کە خزمە دەگەڵ وشەیەکی ئەڵمانی بە مانای "بەرد"، یان وشەی "داش" [بە ئەسڵ تورکییە، بە مانای بەرد] کە دەگەڵ ناوی کێو دێ، بۆ وێنە شاخی "داشامەجید" لە مەهاباد یان سووورداش [سوورەبەرد].

شاخ2 **şax** [ *šāx* ] - "قۆچی ئاژەڵ": پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەوە هەیە:

1- شاخە šāxe (P.) و šāk (Pl.) "لک(ی دار)"، ↑زیخ zîx "دڕکی ئەستوور" و ↑زەق *zeq* "دەرپەڕیو" و دواتر دەگەڵ ↑شاخاندن şaxandın "هەرا کردن بە تووڕەیی". جێی ئاماژەیە کە وشەی "قۆچ"یش ئاماژە بە "زەق و دەرپەڕیو بوون" دەکا.

2- زاخ[1] zax "بەرد".

[تێبینی: دەتیوان چەمکەکانی "شاخ، قۆچ" و "بەرد، هەستی" و هەروەها "سەخت، زبر"دا پێوەندی لەئارا دایە. شاخ شتێکە لە چەشنی هەستی و بەرد، هەر وەک چۆن عاجی فیل وەک بەردێکی بەنرخ سەیر کراوە. دە زمانی کوردمادیدا "هەستی" بە هەر سێ مانای "بەرد"، "ئێسک" (ئێستک) و "ناوکی میوە" (بەردی ناو میوە) بەکار دێ. دە زمانی ئەڵمانیدا Bein (G.) دەبێتە "ئێسک" و Elfenbein (G.) دەبێتە "عاجی فیل"، واتا "شاخی فیل". دە زمانی ئەڵمانیدا هەروەها بۆ وێنە دەگوترێ Stein und Bein "بەرد و ئێسک". وشەی Stein خۆی دەگەڵ "هەستی، ئێستک، ئێسک" خزمە. وشەیەکی دیکە کە دە زمانی ئەڵمانیدا مانای "شاخ" دەدا، بریتییە لە Horn (G.)، سەر بە ریشەی *(IE.) *ker-* " قۆچ، سەر، کەللە". هاوکات ریشەیەکی دیکەی هیندوئەورووپی هەیە، واتا ریشەی *(IE.) *ker-* "سەخت، رەق، خار". زۆر وێ دەچێ ئەم دوو ریشەیە دە بنەڕەتدا هەر یەک ریشە بووبن و وشەی ئەڵمانی Horn "شاخ" دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە رەقایی، بەردین بوون و ئێسک بوونی شاخ کردبێ. شتێک کە ئەم شیمانەیە بەهێزتر دەکا، ئەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا Hornhaut (G.) بە مانای "پێستی رەق و خاراو" بەکار دێ، بۆ وێنە وەک ئەو پینە سەخت و زبرانەی بە هۆی کاری زۆر و گران یان سوانەوە لەسەر بەری دەست یان بەری پێ دروست دەبێ. بە لەبەر چاو گرتنی ئەو پێوەندییانە رێی تێ دەچێ کە وشەی "شاخ"ی ئاژەڵ پێوەندی بە چەمکی "بەرد، هەستی"یەوە هەبێ].

**شاخ şax** *[ šāx ]* - شاخ کردن واتا "1- رووشاندن 2- چەپۆکانە کردنی ئەسپ": خزمە دەگەڵ↑چەقۆ çeqo سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشاندن".

**شاخاندن şaxandın** *[ šāxāndın ]* - "هەرا کردن بە تووڕەیی": خزمە دەگەڵ یان شێوەیەکی دیکەیە لە↑زیقاندن zîqandın [زیکاندن]. ئەم وشەیە دەچێتە ریزی ئەو وشانەی لەژێر وشەی ↑زەق zeq شی کراونەوە. هەروەها ↑شاتاندن şatandın و(E.) shout پێوەندییان بەم خێزانە وشەیە هەیە.

**شاد şad** *[ šād ]* - "خۆشحاڵ، دڵگەش": شاد šād (P.)، šāt (Pl.)، šāta (Av.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ heiter (G.)، hedar (OIs.)، hador (E.) "شاد، بەکەیف، سەرزیندوو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *kai- >*** "درەوشانەوە، گەشانەوە". لەم تێڕوانینەوە "شاد" دە بنەڕەتدا واتا کەسێک کە لە خۆشیان چاوی دەدرەوشێتەوە یان دەموچاوی رووناک و گەشاوەیە، بە پێچەوانەی مرۆڤی خەمبار کە دەموچاوی تەڵخ و تووشە. دە زمانی فارسیدا دەستەواژەیەک هەیە کە دەڵێ "برق شادی در چشمانش میدرخشد" واتا "بریقەی شادی دە چاویدا دەدروشێتەوە". ئەم دەستەواژەیە پێوەندی دوو چەمکی "شادی" و "درەوشانەوە" بە باشی روون دەکاتەوە. هەروەها دە زمانی کوردمادیدا وشەی ↑شاهیک şahîk هەیە بە مانای "بریقەدار، درەوشاوە" و ئەمەش ئەو پێوەندییەی سەرەوە پشتراست دەکا.

**شادە şade** *[ šāda ]* - "داری سنووری کا و گەنم": خزمە دەگەڵ ↑جودا cuda.

**شار1 şar 1** *[ šār ]* - "باژێر": شهر šahr (P.)، šatr (Pl.)، xšathra (Av.). دە زمانی پارسی کۆندا ساتراپ satrap بە مانای "شارەوان، والی" هەبووە [پاشگری ap- خزمە دەگەڵ پاشگری وان wan- دە زمانی ئەمرۆی کوردمادیدا]. ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ siedeln (G.)، sidalen (OG.) "نیشتەجی بوون"، sedal (OG.)، sedel (OE.) "جێگای نیشتەجێ بوون"، Siedlung (G.) "ئاوایی" و هتد. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑دانیشتن danîştın [دا- نی- شتن]. لەوانەیە وشەکانی ↑زێد zed و ↑جێگا cega پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

**شار2 şar 2** *[ šār ]* - "کۆمی زیندەوەرانی وەک مێروو، هەنگ، زەرگەتە": [شارەمێروو]. ئەم وشەیە لەوە ناچێ پێوەندی بە ↑شار1 şar "باژێر"ەوە هەبێ، بەڵکوو خزمە دەگەڵ ↑ -جاڕ2 car- "پاشگرێکە ئاماژە بە پرانی و زۆر و زەوندی دەکا، وەک تیرگزجاڕ".

**شار3 şar** *[ šār ]* - "داغی، گەرمی": هەروەها شاریان şaryan هەیە بە مانای "گەرم داهاتن" و ↑شەڵق şelq بە مانای "تاو و تێ". دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑سووڵان(ەوە) sulan(ewe) "چووزانەوە، کزانەوە". ↑شەلقاندن şelqandın یش بە مانای "زوورانەوەی ناو ڕان" بەکار دێ.

2- calor (L.) "گەرما" و calere (L.) "گەرم بوون".

**شارا şara** *[ šārā ]* - "1- ماسولکەی گەنم لەسەر خەرمان 2- کای تێوان دیوارەی چاڵ و دەخڵ 3- گیشەدەخڵی درواو": ↑شارۆ şaro ش دەگوترێ بە مانای "خۆیان". لەوانەیە پێوەندی بەم ریشەوە هەبێ: ***(IE.) *(s)ker- >*** "بڕین، لەت کردن، جودا کردن". چەندین وشە دە زمانی کوردیدا لەم ریشەوە هاتوون، بۆ وێنە ↑هەوجاڕ hewcar، ↑کێرد kerd، ↑شڕ şır [شڕ و شاڵات]. لەم تێڕوانینەوە مانای "شارا" دە بنەڕەتدا دەبێتە "بڕدراوە، لێکراوە".

**شاردنەوە şardınewe** *[ šārdınawa ]* - "داپۆشین، نەدیارکردن": لە پێوەندی دەگەڵ ئەم وشەیەدا، دوو وشەی چەردە çerde "رەشتاڵە" [سیەچردە sīyahčarde (P.)] و ↑چرسین çırsîn "رەشکە و پێشکە کردنی چاو" سەرنج رادەکێشن. بنجی شار -şar دە وشەی "شاردنەوە"دا دەشێ پێوەندی هەبێ بە:

1- ↑تار tar و ↑تاریک tarîk. سەبارەت بە پێوەندی ئەم مانایانە دەتوانین ئاماژە بکەین بە وشەی "کوێر" [کۆر] کە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "داپۆشین، تێپێچان".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑تارا tara.

**شارۆ şaro** [ *šāro* ] - "خۆیان": [جێگەی کۆ کردنەوەی خەرمان]، بڕوانە ↑شارا şara.

**شارەزا şareza** [ *šārazā* ] - "لێزان، بەڵەد": دەتوانین بە دوو شێوە لێکی بدەینەوە:

1- پێک هاتووە لە دوو وشەی شار şar + زا za [سەر بە کرداری ↑زانین zanîn]، واتا ئەو گوندییە کە ڕێگا و بانی شار پێدەزانێ و دەبێتە ڕێنوێنی ئەو کەسانەی لە گوندەوە دەچن بۆ شار.

2- شار şar + زا za [سەر بە کرداری ↑زان zan] واتا کەسێک کە زادەی شارە و چاو و گوێ کراوەترە و شت زۆرتر دەزانێ لەچاو ئەو کەسەی لە گوند پەروەردە بووە.

**شاز şaz** [ *šāz* ] - "1- جۆرێک چیتکی زراڤ 2- هەڵکەوتە، ئاوارتە": خزمە دەگەڵ ↑شات şat "لقی باریک، چرۆ" و ↑چیتک çîtık "قامیش". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑شاخ şax "1- کێو 2- قۆچ"، شاخە šāxa (P.) "لکەدار"، ↑زیخ zîx "دڕکی ئەستوور" و دواجار ↑زەق *zeq* "دەرپەڕیو". مانای "هەڵکەوتە و ئاوارتە"ش لێرەوە پەیدا بووە کە کەس یان شتی لەم چەشنە وەک "زەق و دەرپەڕیو" سەیر کراوە، لەچاو کەس یان شتە ئاساییەکان. دە زمانی فارسیدا وشەی برجستە barjaste (P.) "زەق، دەرپەڕیو، هەڵکەوتە، گرینگ" خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە [بر + جستە ber + jaste]. لێرەشدا بنجی وشەکە جس- jas-ە کە دەگەڵ "شاز" و گەلێک وشەی دیکە یەک دەگرێتەوە کە لەژێر ↑زەق *zeq* دا شی کراونەوە. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وشەی "شاز" [دە عەرەبیدا شاز šaz (Arb.)] وشەیەکی بە ئەسڵ کوردمادییە و لە زمانی کوردمادی وەگیراوە.

**شاش1 şaş** [ *šāš* ] - "1- لێک جودا، تیوان تێکەوتوو 2- شل، نەسفت": خزمە دەگەڵ ↑شێ şê [شێ کردنەوە واتا لێک جودا کردنەوە]. شاش بە مانای "بیربڵاو"یش دێ، واتا کەسێک هزر و بیری پەرژ و بڵاو بێ.

**شاش2 şaş** [ *šāš* ] - "پێچی سەر، مێزەر":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑چەتفە çetfe و ↑چیت çît "پەڕۆ"،

2- یان لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑چادر çadır.

**شاش3 şaş** [ *šāš* ] - "ئەسپێی ئارد و گەنم": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زیچ zıç "قورنوو".

**شاش[4] şaş** [ *šāš* ] - "1- تێکەڵ و ئاڵۆزاو 2- خێل 3- هەڵە و هەڵەکار": پێوەندی هەیە بە ریشەی < ***sqei-** ***(IE.)*** "خوار،چەوێل، شەل". هەر لەم ریشەوە ریشەیەکی دیکە سەری هەڵداوە کە دەبێتە **skeip-* *(IE.)* "خوار، چەپ" و چەندین وشە وەک ↑چەپ1 çep لەم ریشەوە هاتوون. دە زمانی کوردمادیدا شاش و بێش şaş û bêş و شاش و وێش şaş û wêş یش دەگوترێ. بۆ وشەی بێش bêş یان وێش wêş بڕوانە ↑واژ2 waj "پێچەوانە".

[تێبینی: سەبارەت بە مانای "هەڵە، هەڵەکار" هەڵیسەنگینە دەگەڵ "چەوت" کە خزمە دەگەڵ "چەپ" و دواجار پێوەندی بە "شاش"ەوە پەیدا دەکا].

**شاشک şaşık** [ *šāšık* ] - "مێزەر": خزمە لەگەڵ ↑سوژن sujın [شوژن şûjın] "تەبەنە، جەواڵدوز"، siuwen (OG.)، sew (E.)، sy (Sw.)، siujan (Gt.) "دروون، دروومان کردن"، سەر بە ریشەی < ****siu-***، ****seu-*** ***(IE.)*** "بەستن، لێک بەستن، دروون". syūman (OIn.) "دەزوو، باند، تەسمە" و hymēn (Gr.) "سیرمە، تەسمەی چەرمین" پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە. لە زمانی کوردمادیدا ↑شاڵ *şal*، ↑جاجم cacım، ↑جۆلا cola و ↑جاڵجاڵووکە calcaluke و چەندین وشەی دیکە پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

[تێبینی: وشەی hymnos (Gr.) "سروود" خزمە لەگەڵ ئەم وشە یۆنانییەی سەرەوە و لە بنەڕەتدا مەبەست "هەڵبەستراو" [سەرنجی کرداری "بەستن" بدە] و "تێکخراو"ی دەنگەکان بووە. ئەم وشە یۆنانییە هەڵ سەنگینە دەگەڵ چەمانە çemane (↑سیاچەمانە sîyaçemane)].

**شاشە[1] şaşe** [ *šāša* ] - "زەوی خەت دراو بۆ تووتن چاندن": خزمە دەگەڵ ↑شاش şaş و ↑شێ şê و ↑شێوەرد şêwerd و هتد.

شاشه² **şaşe** [ *šāša* ] - "سەفحەی تەلەویزیون": ئەم وشەیە لە زمانی عەرەبی وەرگیراوە، بەڵام وشەکە خۆی دەچێتەوە سەر شیشە šīše (P.) و ↑شووشە şûşe ی کوردمادی. دیارە ئەو سەفحەیە لە شووشە دروست کراوە و هەر بۆیەش ئەم ناوەیان بۆ داناوە.

شاف **şaf** [ *šāf* ] - "جۆرێک دەرمان": شیاف šīyāf (P.)، دەچێتەوە سەر *Zäpfchen (G.)* > و ئەمەش بچووککراوی Zapfe (MG.) یە بە مانای "دارۆکەیەکی نووک باریک کە زارکی شتی پێ دەبەستن". خزمە دەگەڵ ↑تەپەدۆر tepedor.

شافر **şafır** [ *šāfır* ] - "1- بیابان و چولگە 2- دەشتی پان و بەرینی بێ دار و بار": جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ زاف zaf [↑زاڤ *zav*] و ↑زەوەند zewend [زۆر و زەوەند] سەر بە ریشەیەک بە مانای "لەبەر یەک کشانەوە، هەراو بوون(ەوە)".

شاڤین **şavîn** [ *šāvîn* ] - "باقاندنی کەروێشک"خزمە دەگەڵ ↑چپاندن çıpandın.

[تێبینی: باقاندن baqandın (واقاندن waqandın) یش خزمە دەگەڵ بێژتن bejtn و وشە wışe].

شاڤێر **şavêr** [ *šāver* ] - "دەبەنگ، گێل و حۆل": شاوێر şawêr یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی زمانی کوردمادی کە دە ریشەدا مانای "خوار" دەدەن، وەک ↑چەپ *çep*، ↑چەوێل çewel، ↑شەپلە şeple، ↑شیو şîw [شیو و دۆڵ] و هتد. وشەی "گێل" خۆی دە ریشەدا بە مانای "خوار"ە.

شاق **şaq** [ *šāq* ] - "1- ماسیگرە 2- قیرەی مریشک": خزمە دەگەڵ ↑زیقاندن zîqandın. ماسیگرە مەلێکی بە زاق و زیقە و لەبەر ئەمەش بەم جۆرە ناودێر کراوە. جگە لەمە "زیقاولە"شی پێ دەگوترێ و وەک دەبینین ئەوەش لە "زیقە"وە هاتووە. لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "قاژوو" یان "قشقەڵە" کە ئەوانیش پێوەندییان بە "قیژە"وە هەیە.

شاقوت **şaqut** [ *šāqut* ] - "پەرتاوتنی لکی زل": خزمە دەگەڵ ↑چەقۆ çeqo.

شاقەل **şaqel** [ *šāqal* ] - "چاکی داوێنی کەوا": بنەوشەی شاق -şaq شێوەیەکی دیکەیە لە↑چاک çak "قەڵش و دەرز (ی داوێن)". دە فارسیشدا چاک čāk (P.) بە هەمان مانا. خزمە دەگەڵ ↑چەقۆ çeqo و ↑شەقە şeqe [شەقەمشار] و هێندێک وشەی دیکە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشین".

شاقەڵ **şaqel** [ *šāqal* ] - "بارست، *ئەستوورایی*، قوتر، ئەندازە": هەروەها شاقەڵدار şaqeldar هەیە بە مانای "زەلامی ئەستوور". خزمە دەگەڵ ئەو وشەگەلەی لەژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە، بە مانای "سەخت، بەهێز".

[تێبینی: وشەی ئەستوور estur یش دە ریشەدا دەچێتەوە سەر ریشەیە بە مانای "سەخت، بەهێز"].

شاک¹ **şak¹** [ *šāk* ] - "بڕ، کوون، قاش": خزمە دەگەڵ ↑شکاندن şıkandın، ↑شکێڕ şıkêr "کەلێنەبەرد"، ↑چەقۆ *çeqo* و ژمارەیەک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشاندن".

شاک² **şak²** [ *šāk* ] - "گۆچانی گۆیێن": خزمە دەگەڵ ↑دەگەڵ ↑زەق *zeq*.

شاکۆن **şakon** [ *šākon* ] - "گۆچان": چوگان čouwgan (P.). هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑شاک² şak² "گۆچانی گۆیێن".

شاکە **şake** [ *šāka* ] - "باڵەفرکەی جووجەڵە": خزمە دەگەڵ ↑شەکانەوە şekanewe "لەرینەوە، تەکان خواردن". دە زمانی کوردمادیدا هەروەها دەگوترێ "لە شەقەی باڵی دا" کە مەبەست لێرەدا "شەکاندنەوەی باڵ"، بە واتایەکی دیکە باڵ لێکدانە.

شاگرد **şagırd** [ *šāgırd* ] - "بەردەستی وەستا": شاگرد šāgerd (P.) "بەردەست، خوێندکار". خزمە دەگەڵ ↑شەکێرت şekêrt "جیازی بووک".

شاگەشکە **şageşke** [ *šāgaška* ] - "بوورانەوە لە خۆشیان": شا + ↑گەشکە geşke + şa. کەرتی یەکەم هەمان شاد şad ە و کەرتی دووەمیش خۆی مانای بوورانەوە دەدا و خزمە دەگەڵ ↑گیژ gej. گەشکە دە بنەڕەتدا واتا دە گیژەوە هاتن و بە لادا هاتن.

**شاگونج şagunc** *[šāgunj]* - ”دارێکە وەك رەحەتی دەخرێتە دەم دۆڵاشەوە“: پێوەندی هەیە بە ↑شاك[2] şak، ↑شەقە şeqe ”داردەستی شەل“، ↑شاکۆن şakon ”گۆچان“. ئەم وشانە مانای ”داردەست، لکەدار، دارۆکە“ دەبەخشن و دواجار خزمن دەگەڵ ↑زەق *zeq*. وێ دەچێ فۆتیمی ج c لە کۆتاییدا وشەکەدا پاشگری گچکاندن بێ.

**شاڵ şal** *[šāl]* - ”پەڕۆی چندراو“: شال šāl ‹P.›. ئەم وشەیە لە رێگەی زمانی فارسییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ئەورووپییەکان و بە مانای ”شاڵگەردن“ بەکار دێ، وەك Schal ‹G.›، shawl ‹E.›. دە زمانی کوردمادیدا ژمارەیەك وشە پێوەندییان بە ”شاڵ“ەوە هەیە، وەك ↑شالك şalık ”عەبا“، ↑شۆلك şolık”رەشکە“، ↑شۆلە şole ”جەواڵ“، ↑شوولەکە şûleke ”توورەکە“، ↑شلێم şılêm ”سەرکڵاوی لە بەن“ و هتد. ئەم وشانە لە دوو چەمکدا یەك دەگرنەوە کە بریتین لە ”بەن“ و ”چنین“ و ئەم دوو چەمکەش خۆیان پێوەندییەکی نیزیکیان پێکەوە هەیە. [نموونە: Strick ‹G.› ”بەن، دەزوو، ریس“ و stricken ‹G.› ”چنین“]. بەلەبەر چاو گرتنی ئەم پێوەندییانە دەتوانین وای بۆ بچین کە شاڵ پێوەندی هەبێ بە ↑جۆڵا cola، ↑جاڵجاڵووکە calcaluke، ↑جەواڵ cewal، ↑زیلۆ zîlo و هتد .ئەم وشانە گشتیان ”چەمکی ”بەن“ یان ”چنین“ دەگرنە خۆ و دە پلەیەکی دوورتردا دەتوانن پێوەندییان هەبێ بە هێندێك وشە کە چەمکەکانی ”بەن، بەند، دروون، لێکبەستن، بەستنەوە“ دەردەبڕن، وەك ↑سدە sıde، ↑سیتە sîte، ↑سێتە sete، ↑شەتەك şetek، ↑شوژن şujın، ↑ژێ je، سەر بە ریشەی < *sei- , *seu-, *siu- ‹IE.›* ”بەستن، لێکبەستن، دروون“.

**شاڵات şalat** *[šālāt]* - دەگەڵ ”شڕ“ دێ [شڕ و شاڵات şır û şalat]. بنەوشەی شاڵ -şal دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شەل2 şel ”پاژ، کوت، لەت“.

**شاڵاو şalaw** *[šālāw]* - ”هێرش، پەلامار“: دەشێ خزم بێ دەگەڵ schwellen ‹G.›، swellan ‹OG.›، zwellen ‹Nl.›، swell ‹E.›، svälla ‹Sw.› ”هەڵمسان، گەورە بوونەوە“ و Schwall ‹G.› و swal ‹MG.› ”شەپۆل“. لەم تێڕوانینەوە ”شاڵاو“ سەرەتا بە شتێك گوتراوە کە بە هۆی زل و زەبەلاح بوونەوەی مەترسی دروست دەکا، وەك ئاگرێك کە ئەگەر بڵیسە بستێنی، شاڵاو دێنێ بۆ دەوروبەر، یان ئاوی رووبار کە ئەگەر هەڵستێ، شاڵاو دەبا بۆ ئەم بەر و ئەو بەری خۆی. کەوابێ ”شاڵاو“ دەئەسڵدا بە مانای ”هێرش“ نەبووە، بەڵکوو هەڵمسان و گەورەبوونەوەی هێزێك بووە کە لە ئەنجامدا هێرشی ئەو هێزەی بەدواوە بووە و لەبەر ئەمە ماناکەی بۆ ”هێرش“ گۆڕاوە. خزمیشە دەگەڵ ↑زل zıl ”قەبە، گەورە“.

**شالك şalık** *[šālık]* - ”عەبا“: خزمە دەگەڵ ↑شاڵ şal ”پەڕۆی چنراو“ [دەبنەڕەتدا واتا پارچە].

**شالووز şalûz** *[šālūz]* - ”مەراییکەر“: هەروەها شالووزی کردن هەیە بە مانای ”مەرایی کردن“. شال + ئووز şal + uz. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑شەلاف şelaf [شەلاف کردن واتا مەرایی کردن]. کەرتی دووەم پاشگرە، بڕوانە ↑ئۆز oz.

**شاڵینە şalîne** *[šālīna]* - ”پارچەی چوارگۆشەی لە خوری“: خزمە دەگەڵ ↑شاڵ şal ”پەڕۆی چنراو“.

**شام şam** *[šām]* - شێوەی کۆنتری ↑شێو şêw.

**شاماکی şamakî** *[šāmākī]* - ”مەمکبەند“: خزمە دەگەڵ ↑جامە came.

**شامبۆز şamboz** *[šāmboz]* - ”ئازا، جوامێر“: پێك هاتووە لە دوو کەرتی شامب + پاشگری ئۆز şamb + oz. پاشگری ↑ئۆز -oz [یان ئۆس -os] ئاوەڵناو دروست دەکا لە دۆخی جەخت کردندا، [وەك کلۆز kıloz یان کەلۆس kelos، کنۆس kınos، چکۆس çıkos، گرۆز gıroz و هتد]. کەرتی ئەسڵی وشەکە واتا şamb دەشێ خزم بێ دەگەڵ Kampf ‹G.›، champf ‹OG.›، camp ‹OE.› ”شەڕ و ململانە، زۆرەوانی“. وشەکە پێشتر بە مانای ”مەیدانی شەڕ“ بووە و دواتر مانای ”شەڕ و زۆرانبازی“یشی وەرگرتووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر campus ‹L.› ”مەیدان، مەزرا، مەیدانی شەڕ، شەڕگە“.

[تێبینی: لەوانەیە پاشگری ئۆز oz- پێوەندی بە نیشانەی us- دە زمانی لاتینی یان os- دە زمانی یۆنانیدا هەبێ].

**شامرەخت şamrext** [ *šāmraxt* ] - "جۆرێک زێر و زەنبەری ژنانە": شام şam + ↑رەخت rext. شام şam لەوانەیە پێوەندی بە ↑جامە came وە هەبێ.

**شان1 şan** [ *šān* ] - "جومگەی نێوان دەست و لەش": دە بنەڕەتدا مەبەست ئەو جومگەیە دەست و لەش پێکەوە دەبەستێتەوە. خزمە دەگەڵ چەندین وشەی وەک ↑زەند zend "لای خوارەوەی قۆڵ"، ↑زەندک zendık "جومگەی دەست"، ↑زەنگە zenge "لای خوارەوەی لاق"، ↑زەنگی zengî "گوێزینگ" و هەمدیسان ↑چەنگ çeng. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)keng- >*** "خوارو خێچ". وەک دەبینرێ هەموو ئەو شوێنانەی لەش بریتین لەو شوێنانەی کە بەشێک یان ئەندامێک لە لەش توانای خوار بوونەوە و وەرسووڕان بۆ ئەم لا و ئەو لای هەیە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Schulter (G.) "شان" بەگوێرەی بۆچوونێک دەچێتەوە سەر ریشەی *(IE.)* *(s)kel- "خوار و خێچ". وەک دەبینرێ لێرەشدا وشەکە هەڵگری مانای "خوار و خێچ"ە. ئەگەر ئەم بۆچوونە راست بێ، وشە ئەڵمانییەکە دەبێتە خزم دەگەڵ هێندێک وشەی کوردمادی وەک "شەڵ" و "خێل" و هتد].

**شان2 şan** [ *šān* ] - "پلە و پایە": ئەم مانایە لە مانای یەکەمی ↑شان1 şan "جومگەی نێوان دەست و لەش" پەرەیان گرتووە. لەبیرمە کاتێک ئێمە منداڵ بووین و بۆ ئەوەی بزانین کێ بڵێندترە خۆمان پێکتر دەگرت، دەگەڵ منداڵێکی دیکە لەپەنای یەک رادەوەستاین و چاومان لە شانی یەکتر دەکرد، بزانین شانی کێ بەرزترە. ئا بەم شێوەیە "شان" سەرەتا بووەتە پێوەرێک بۆ پێک گرتنی لەشی مرۆڤ و رەنگە ئاژەڵەکانیش. بەم جۆرە بۆ دوو کەس [یان ئاژەڵ؟] کە شانیان لە یەک ئاستدا بووبێ، گوتراوە "هاوشان". لێرەوە دواتر مانای "شان" و "هاوشان" گۆزراوەتەوە بۆ پلە و پایەی کۆمەڵایەتی، واتا دوو کەس ئەگەر لە باری پلە و پایەی کۆمەڵایەتییەوە وێکچوو بوون، گوتراوە "دە شانی یەکتر دان"، یان "هاوشان"ن.

**شان3 şan** [ *šān* ] - "شکۆ، گەورەیی": [بە شان و شکۆ].

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ scheinen (G.)، scīnan (OG.)، shein (E.)، keinan (Gt.)، skina (Sw.) "دەرەوشانەوە، بە دیار کەوتن"، سەر بە بە ریشەی ***(IE.) *skāi- >*** "دەرەوشانەوە(یەکی کز)، بە دیار کەوتن".

2- لەوانەشە مانای "شکۆ و گەورەیی" بگەڕێتەوە بۆ ↑شان2 şan "پلە و پایە"، واتا کەسێکی "بەشان" و خاوەن پلە و پایە دە هەمان کاتدا وەک کەسایەتییەکی "گەورە و شکۆدار" سەیر کراوە و لێرەوە "شان" مانای "شکۆ"شی وەرگرتووە.

[تێبینی: سەبارەت بە پێوەندی دوو چەمکی "پلە و پایە" و "گەورەیی، شکۆداری" سەرنجی "جاە و جلال" دە زمانی فارسیدا بدە کە یەکەمیان هەمان "جا"ی فارسی یان "جێ"ی کوردمادییە].

**شان4 şan** [ *šān* ] - "خاڵی سەر گۆنا": خزمە دەگەڵ scheinen (G.)، scīnan (OG.)، shein (E.)، keinan (Gt.)، skina (Sw.) "دەرەوشانەوە، بە دیار کەوتن"، سەر بە بە ریشەی ***(IE.) *skāi- >*** "دەرەوشانەوە(یەکی کز)، بە دیار کەوتن". دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑سهنە sıhne "تارمایی" و ↑شانی(ک) şanî(k) "نیشان، بەڵگە، مەدرەک".

**شاندن1 şandın** [ *šāndın* ] - "ناردن": خزمە دەگەڵ senden (G.)، send (E.)، sandjan (Gt.)، sända (Sw.) "ناردن، شاندن"، هەروەها خزمە دەگەڵ sit (OE.)، sint (OG.)، set (OIr.) "رێگە، جادە، رەوت". وشەی ↑جادە cade خزمە دەگەڵ ئەم وشانە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *sent- >*** "رۆیشتن، گەڕان، بوورین".

**شاندن2 şandın** *[ šāndın ]* - "چاندن": شێوەیەکی دیکە لە ↑چاندن çandın.هەروەها ↑شانین1 şanîn "تووڕ دان، فڕێ دان" هەیە و دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "بەردانەوە، پرژاندن، پێوەرکردن، فڕێ دان".

**شاندن3 şandın** *[ šāndın ]* - دەگەڵ پێشگری هەڵ -hel دێ [↑هەڵشاندن helşandın "1- رووخاندن، رماندن 2- هەڵوەشاندن]. خزمە دەگەڵ ↑شاندن2 şandın "چاندن" و دەچێتەوە سەر ریشەی **(IE.) *sei- <** "چاندن، وەشاندن، فڕێ دان". ژمارەیەک وشەی کوردمادی پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە کە لەژێر ↑هەت1 het "کن، نک، جەم"دا باس کراون.

**شاندەلیک şandelîk** *[ šāndalīk ]* - "زەرگەتە": کەرتی شاندە -şande شێوەیەکی دیکەیە لە زەنگە -zenge یان ژەنگە -jenge لە وشەی ↑ژەنگەسوورە jengesure دا. ئەم کەرتەوشەیە مانای "لێدان، پێوەدان" دەبەخشێ. کەرتی لیک -lîk وێ دەچێ پاشگری گچکاندن بێ. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە "پێوەدەری بچووک".

**شانۆ şano** *[ šāno ]* - "تیئاتر": دە زمانی کوردمادیدا شانۆ هەم بە مانای "سەکۆی تیئاتر" بەکار دێ کە کایەکەرەکان لەوێ دەلەیزن، هەمیش بە مانای لەیستنی تیئاتر خۆی. دە زمانی فارسیدا سن sen دەگوترێ بە مانای "سەکۆی تیئاتر". دە زمانی عەرەبیدا بووەتە صحن sahn (Arb.) و صحنة sahna (Arb.)، دە ئینگلیزیدا scene (E.) و دە ئەڵمانیدا Szene (G.) "سەکۆی تیئاتر، سەحنەیەک لە فیلم یان تیئاتر" [بچووکترین یەکەی فیلم یان تیئاتر]. *< scēna (L.) < skēnḗ (Gr.)* "چادر، هۆدە، سەکۆ". وشە یۆنانییەکە خزمە دەگەڵ skiā (Gr.) "سێ، سێبەر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑سێ se "سێبەر" و ↑سهنە sıhne "تارمایی".

**شانە1 şane** *[ šāna ]* - "ئامرازێکە مووی پێدا دەهێنن": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑ Kamm (G.)، kam (Nl.)، comb (E.) سەر بە ریشەی **(IE.) *gombh <** "ددان". [گۆڕانی فۆتیمی m بۆ n لە وشەی شانە2 şane بە مانای "خانە"شدا بەدی دەکەین].

2- ↑دان dan "ددان". لەم تیروانینەشەوە وشەکە پێوەندی بە چەمکی "ددان" پەیدا دەکا و دە بنەڕەتدا "ئامێری ددانەدار یاخود دەندەدار" دەگەیەنێ.

3- ↑شەنە şene.

**شانە2 şane** *[ šāna ]* - "خەلییە، سللوول" [شانەی هەنگوین، شانەی حیزبی، شانەی لەش]: خزمە دەگەڵ ↑خانە xane "ماڵ، هۆدە". بۆ شانەی هەنگوین دە زمانی فارسیشدا شانە šāne (P.) دەگوترێ و دە بنەڕەتدا مەبەست ئەو "خانە" بچکۆڵانەن کە مێشەنگوین دروستییان دەکا، بۆ ئەوەی تێیاندا بژی.

[تێبینی: وشەی خلیة xalīyya (Arb.) لە cella (L.) وەرگیراوە بە مانای "هۆدە یان خانووی چکۆڵە". هەروەها وشەی سلول sellūl (P.) دەچێتەوە سەر هەمان وشەی لاتینی. لەوانەیە ئەم وشە یۆنانییە خزم بێ دەگەڵ سەرا sera "خانوو"].

**شانی(ک) şanî(k)** *[ šānī(k) ]* - "نیشان، بەڵگە، مەدرەک": هەروەها شانی دان şanî dan هەیە بە مانای "نیشان دان، خستنە بەرچاو". خزمە scheinen (G.)، scīnan (OG.)، shein (E.)، keinan (Gt.)، skina (Sw.) "درەوشانەوە، بە دیار کەوتن". دەبێتە خزم دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑شان4 şan "خاڵی سەر گۆنا"، ↑قانی qanî "لەککە، پەڵە" و ↑سێ *se* "سێبەر" و هتد. لەوانەیە وشەی ↑نیشان nîşan شێوەیەکی دیکە بێ لە "شان" [شانی]. دە زمانی ئەڵمانیدا...es scheint (G.) ماناکەی دەبێتە "(وا) دەردەکەوێ، (وا) دیارە، وا خۆ نیشان دەدا". هەروەها Schein (G.) بە مانای "بەڵگە" و بە گشتی کاغەز یان نوسراوەیەک کە شتێک نیشان دەدا، بەکار دێ. ئەم وشەی دوایی لە ئەڵمانی ناویندا بە مانای "مەدرەک، بنچاخ"یش بەکار هاتووە.

**شانین1 şanîn 1** [ *šānīn* ] - "توورِ دان، فڕێ دان": خزمە دەگەڵ ↑شاندن şandın "چاندن".

**شانین2 şanîn 2** [ *šānīn* ] - "ڕاژاندن": شاندن şandın یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شنین şınîn "هەڵکردنی با، لەرینەوە لەبەر با".

**شاور şawr** [ *šāwr* ] - "1- فیتوو، فیکە 2- سازی فوویی": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شیوەن şîwen سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەنگ و ئاواز لێ هاتن".

**شاهۆ şaho** [ *šāho* ] - "ناوی چیایەک لە کوردستان": خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext و گەلێک وشە کە لەژێر ↑سەق *seq* دا باس کراون.

**شاهیک şahîk** [ *šāhīk* ] - "بریقەدار، درەوشاوە": خزمە دەگەڵ ↑شاد şad "خۆشحاڵ، دلگەش". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *kai-*** < "درەوشانەوە، گەشانەوە".

[تێبینی: لەوانەیە ئەم ریشەیە پێوەندی هەبێ بە ریشەی *(IE.) *skāi-* "درەوشانەوە(یەکی کز)، بە دیار کەوتن". بڕوانە شان3 şan "شکۆ، گەورەیی"].

**شایک şayık** [ *šāyık* ] - "لووس، ساف": خزمە↑ شاهیک şahîk "بریقەدار، درەوشاوە".

[تێبینی: دوو چەمکی "ساف و لووسی" و "درەوشانەوە" پێوەندی پتەویان بە یەکەوە هەیە. بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا glatt "ساف، لووس" خزمە دەگەڵ Gold "زێڕ" و چەندین وشەی دیکە کە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە"].

**شایلۆغان şayîloġan** [ *šāyīloġān* ] - شای (ی) + لۆغان loġan + (şay(î. کەرتی یەکەم ↑شایی şayî یە. بۆ کەرتی دووەم بڕوانە ↑لۆغان loġan.

**شاینەشەکێ şayneşkê** [ *šāynašake* ] - "جۆرێ سەما": کەرتەوشەی شاینە şay(ne) پێوەندی بە ↑شایی şayî "شادی"یەوە هەیە. کەرتەوشەی شەکێ şekê- دەچێتەوە سەر ↑شەکانەوە şekanewe "تەکاندان، لەراندن". بەم جۆرە مانای تێکرای وشەکە دەبێتە "خۆ تەکان دان لە خۆشیان".

**شایی şayî** [ *šāyī* ] - "1- شادی، خۆشی 2- هەڵپەڕین، بەزم گێران": ↑شاد şad.

**شبتی şıbtî** [ *šıbtī* ] - ↑شفتی şıftî "شووتی".

**شپ şıp** [ *šıp* ] - "خشە، دەنگی وێککەوتنی شتی وشک وەک پووش و بەرگی نوێ": خزمە دەگەڵ ↑چپە çıpe "سرتە".

**شپرزە şpırze** [ *špırza* ] - "پەرژ و بڵاو، پەرێشان": وشەکە بە شێوەی کرداریش بەکار دێ، شپرزیان şıpırzîyan واتا شپرزە بوون. خزمە دەگەڵ ↑پرژان pırjan "بڵاو بوونەوە"ی توندی شتی ورد یان ئاوەکی.

**شپرێو şprew** [ *šprew* ] - "شپرزە": "پەرژ و بڵاو، پەرێشان": خزمە دەگەڵ ↑پرژان pırjan "بڵاوبوونەوە"ی توندی شتی ورد یان ئاوەکی.

**شپنە şıpne** [ *šıpna* ] - "خێشک": شپک şıpık و شەپنە şepne و ↑شفنە şıfne دەگوترێن.

**شپەستە şıpeste** [ *šıpasta* ] - "راواندن، قسەپەڕاندنی نەخۆش": خزمە دەگەڵ ↑چپە çıpe "سرتە".

**شپی şıpî** [ *šıpī* ] - "رێژنەباران، رەهێڵە": ↑شپین şıpîn "دادانی رێژنە باران".

**شپین şıpîn** [ *šıpīn* ] - "دادانی رێژنەباران": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑زیپک zîpık و ↑سافان safan "دڵۆپە"، sipiti (Serb.) "بارینی نەرم" و zafā (Pl.) "هەوری بەباران".

**شت şıt** [ *šıt* ] - شێوەی تازەتری ↑تشت tışt.

**شتل şıtıl** [ *šıtıl* ] - "چلەگیا و نەمامی بە دەست چەقێندراو": خزمە دەگەڵ ↑چل çıl.

**شتلین şıtılîn** [ *šıtlīn* ] - "دە زەوی چەقاندن": دەشێ لە ↑شتل şıtıl وەرگیرابێ.

**شخاب şıxab** [ *šıxāb* ] - "مەتکەو، کونکەرە": شخاڤ şıxav یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شکاف şıkaf "کون و کەلێن" و گەلێک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "برین، قەلشاندن".

شخارته **şıxarte** [ *šıxārta* ] - "شەمچە، گووگرد": لە شقارتە *şqarta* (Arb.) وەرگیراوە. ئەم وشە عەرەبییە خۆی لە ↑گووگرد gugırd وەرگیراوە و گۆڕدراوە.

شخت **şıxt** [ *šıxt* ] - "زەرگی دەروێشان": خزمە دەگەڵ ↑سیخ sîx و ↑زیخ zîx "دڕکی ئەستوور" و هتد.

شخره **şıxre** [ *šıxra* ] - "بارەگیا": شەخرە şexre ش دەگوترێ. هەروەها ئەم وشانەی خوارەوە دە زمانی کوردمادیدا بەکار دێن: ↑شخەل şıxel "بێشەی دەم رووبار" و ↑شخلین şıxlîn "کەڵەکە کردن". ئەم وشانە دە ئەسڵدا ئاماژە بە "چڕ و پڕ بوون" دەکەن و خزمن دەگەڵ ↑چغوور çıġûr [چوغوور çuġûr] "دارستانی چڕ و پڕ" و ↑چغر çıġır "چڕ و پڕ [ی دارستان]".

شخلین **şıxlîn** [ *šıxlīn* ] - "کەڵەکە کردن": بڕوانە ↑شخرە şıxre "بارەگیا".

شخەل **şıxel** [ *šıxal* ] - "بێشەی دەم رووبار": شەخەڵان şexelan یش دەگوترێ. بڕوانە ↑شخرە şıxre "بارەگیا".

شڕ1 **şır 1** [ *šır* ] - "دڕاو، لەت لەت، کۆن کون": [شڕ و دڕ، شڕ و شاڵات، شڕە و بڕە]. خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک Schrot (G.) "دەخل و دانی لەت و پەتکراو"، Schrott (G.) "ئاسنەواڵەی شەق وشڕ و لەت و پەت".[ئەم وشە ئەڵمانییە بە مانای "گۆڕستانی ئوتۆمبێل"یش بەکار دێ]، schroten (G.) "لەت و پەت کردن"، sherd (E.) "دڕین، پچڕین"، Schere (G.) "مەقەست، برینگ" و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *sker- >* "بڕین". دە زمانی کوردمادیدا خزمە دەگەڵ ↑شڕن şırın "شفرە، ددانی بەراز"،↑کیرد kerd و ژمارەیەک وشەی دیکە.

شڕ2 **şır 2** [ *šır* ] - "دەنگی رژانی ئاو": شوڕ şûr یش دەگوترێ [شڕشڕ şırşır یان شوڕشوڕ şûrşûr]. وەک گەلێک وشەی دیکە کە مانای دەنگێک دەگەیەنن، بەڵام دە بنەڕەتدا پێوەندییان بە مانای کردارێکەوە هەیە، ئەم وشەیەش خزمە دەگەڵ ↑سروە sırwe "شنەبا"، سەر بە ریشەی *(IE.) > *sreu-* "جاری بوون، جەریان".

شرت **şırt** [ *šırt* ] - دەگەڵ "گوم" دێ [شرت و گوم şırt û gum واتا بێ سەر وشوێن، ون و نادیار].

1- لەلایەکەوە دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑شاردنەوە şardınewe "نادیار کردن".

2- لەلایەکی دیکەوە لەوانەیە پێوەندی بە ↑شەردین şerdîn "ئاوارە بوون، بڵاو بوون"ەوە هەبێ.

شرش **şırış** [ *šırıš* ] - "پەمۆی پێچراوی گلۆڵەکراو": خزمە دەگەڵ ↑گرسە gırse "1- توند و لێک چەسپاو، تۆڵا، قورسە".

شرک **şırık** [ *šırık* ] - "پلووسک، لووساوک": خزمە دەگەڵ ↑شڕ2 şır 2 "دەنگی رژانی ئاو".

شڕن **şırın** [ *šırın* ] - "شفرە، ددانی بەراز": خزمە دەگەڵ ↑شڕ şır "لەت لەت".

شرنگ(ە) **şırıng(e)** [ *šırıng(a)* ] - "1- دەنگی کەوتنی شتی قورس 2- دەنگی لێکدرانی شیر و خەنجەر": خزمە دەگەڵ ↑زرینگانەوە zırîngan(ewe) "دەنگی وێک کەوتنی زنجیر و زێر و زیوەر".

شڕۆ **şıro** [ *šıro* ] - "لێکدانەوەی خەون": خزمە دەگەڵ ↑شڕ şır، "لەت و کوت"، سەر بە ریشەی **(s)ker- (IE.)* "بڕین، لەت کردن، جودا کردن". وشەکانی "شرح" و "تشریح" دە زمانی عەرەبیدا پێوەندییان بەم وشانەوە هەیە.

شرەقیان **şıreqyan** [ *šıraqyān* ] - "درز بردن، قەلشین": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑چرژ çırj.

2- ↑شڕ šır.

شریت **şırît** [ *šrīt* ] - "1- پەت، کەندر 2- نەوار": شەلیت şelît یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ Draht (G.)، trad (Sw.)، thread (E.)، draad "تێل، تاڵ". وشەکانی ↑تار tar، ↑تاڵ tal "داو، دەزوو"، ↑تێل tel [تەل tel] "سیم" دەشێ پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ. وشەکە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "با دان،

سووڕان“ و مانای ئەم وشانەی سەرەوە دە بنەڕەتدا دەبێتە ”بادراو“ و مەبەست دەبێ با دانی چەندین بەن یان دەزوو بێ کە بەتیکی ئەستوورتری لێ دروست دەبێ.

**شریخاندن şırîxandın** *[ širīxāndın ]* - خزمە دەگەڵ چریکاندن çırîkandın و ↑زریکاندن zırîkandın و هتد.

**شرینقە şırînqe** *[ širīnqa ]* - ”ئامێری دەرزی لە نەخۆش دان، ئاودووزەک“: وشەکە لە زمانی عەرەبی وەرگیراوە، ئەویش لە فارسی وەرگرتووە و فارسیش لە زمانە ئەورووپییەکانی وەرگرتووە و ریشەکەی دەچێتەوە سەر زمانی یۆنانی: *شرنقة šrnqa (Arb.) <* سرنگ *sorang (P.)* ”لوولەی دەرزی لێدان“ *< Zylinder (G.) < cylinderus (L.) < kylindros (Gr.)* ”ئوستوانە، لوولەئاسا“ *< kylindein (Gr.)* ”گەوزان، وەرسووران(ەوە)“.

**شژ şıj** *[ šıž ]* - ”بەردی ناسک و تورت“: هەروەها شژرێژ şıjrêj هەیە بە مانای ”سەرباتیک کە ورکەبەردی ناسکی لەسەر رۆ کراوە و تەپاوە“. خزمە دەگەڵ هێندێک وشە بەمانای ”بەرد“ وەک ↑زیخ zîx ”ورکەبەرد“ و ↑زاخ zax ”بەرد“، ↑شووشە şûşe.

**شش şış** - ”شاردنەوە بە زمانی زارۆک“: شیش şîş یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑سهاندن sıhandın ”شاردنەوە“.

**شفت şıft** *[ šıft ]* - ”دۆشینی شیر“: خزمە دەگەڵ Saft (G.)، saf (OG.)، sap (E.) ”شیرە، خۆشاو“، saffen (MG.) ”شیرەگرتن، دۆشاو گرتن“، سەر بە ریشەی ***seu- (IE.) >*** ”دۆشین، هەڵمژین“.

**شفتە1 şıfte** *[ šıfta ]* - ”قوری خۆش نەکراو“: šefte (P.) ”بێتۆن“: خزمە دەگەڵ ↑سفت sıfıt.

**شفتە2 şıfte** *[ šıfta ]* - ”یەکەم جار موو هەڵپاچین لە سەری زارۆک“: خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn سەر بە ریشەیەک بە مانای ”برین، تاشین، کڕاندن، ڕنین“. هەڵی سەنگینە دەگەڵ shave (E.) ”ردێن تاشین“ سەر بە هەمان ریشە.

**شفتی şıftî** *[ šıftī ]* - ”شووتی، هەنی“: شبتی šıbtī و ↑شووتی şûtî ش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ süß (G.)، sweet (E.)، zoet (Nl.)، söt (Sw.) ”شیرن“، سەر بە ریشەی ***suād- (IE.) >*** ”شیرن، خۆش“. دە زمانەکانی ناژێرمەنیشدا هاوتای ئەم وشانە دەبینین، وەک suavis (L.) ”خۆش“، hēdys (Gr.) و svādu-h (OIn.) ”خۆش، شیرن“. ئەم وشانە دەبنەڕەتدا بۆ تام و مەزەی خۆشی شیرەی میوەکان بە کار هاتوون. لەوە دەچی ↑زەبەش zebeş کە ناوێکی دیکەیە بۆ شفتی، شێوەیەکی دیکە بێ لەم وشەیە. [بەراوردی زەبەش بکە بەتایبەتی دەگەڵ وشە لاتینییەکە].

**شفتیل şıftel** *[ šıftel ]* - ”شووڵ“: ↑شووڵ şûl.

**شفرە1 şıfre** *[ šıfra ]* - ”1- کەڵپی بەراز 2- ئامرازی چەرم برین“: جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Schaufel (G.)، scuvala (OG.)، shovel (E.)، skovel (Sw.)، schoffel (Nl.) ”پێمەڕە، دادنی پێشەوەی ئاژەڵ، قۆچی ئاژەڵ“. دە زمانی ئەڵمانیدا Schippe ش دەگوترێ. وشە ژێرمەنییەکە دە بنەڕەتدا بە مانای ”ئامێری ڕەپاڵدان، بۆ پێشەوە ڕادان“ بووە و خزمە دەگەڵ ↑شەپ şep.

**شفرە2 şıfre** *[ šıfra ]* - ”ئەندازەی بارێک لە گیا و کڵۆش“: خزمە دەگەڵ زاف zaf و ↑زۆر zor ”فرە“.

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ ”گیشە“ [گیشەگیا] و ”گشت“ بە مانای ”هەموو“ یان هەڵی سەنگینە دەگەڵ ”ئاپۆڕە“بە مانای ”کۆمەڵ“ کە خزمە دەگەڵ ”پڕ“ واتا زۆر و زەوەند].

**شفسک şıfsık** *[ šıfsık ]* - ”چەقالەکێویلە“: خزمە دەگەڵ گەلێک وشە کە مانای ”سفت، سەخت“ و هەروەها ”بەرد“ دەبەخشن، وەک ↑سەپتک septık ”بەرد“، ↑زۆپ zop ”گاشەبەرد“ و ↑سفن(ک) sıfın(k) ”هێم، خیم، بناخە“ و ↑سفت *sıfıt* ”سەخت، قایم“. ژمارەیەکی دیکە لەم وشانە لەژێر وشەی ↑سیپان2 sîpan ”ناوی دوو چیا لە کوردستان“دا باس کراون.

[تێبینی: وشەی "چەقالە"ش خۆی مانای "سەخت، چڕ و پڕ، توند" دەبەخشێ. هەروەها لەباری ماناوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەکانی "کاکڵ"، "هەستی"، "کڕۆک"، "قەوار" کە ئەوانیش دە بنەڕەتدا مانای "سەخت، رەق" دەگەیەنن].

**شفنە şıfne** [ *šıfna* ] - "خێشک" [ئامرازی ساف و لووس کردنی شێوەرد]:

1- یان خزمە دەگەڵ ↑ساوین *sawnî* "سوونەوە، رێخشاندن، پێداخشاندن" و ↑هەشافتن heşaftın "بن قوڕ دان" [he-şaftın].

2- یان خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ *şep¹* و ↑شفرە şıfre دا هاتوون، سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، (رە)پاڵ نان، رادان".

**شڤ 1 şıv** [ *šıv* ] - "یەکەم کوڵاندنی دۆشاو": خزمە دەگەڵ↑ شفت şıft "دۆشینی شیر".

**شڤ 2 şıv** [ *šıv* ] - "شووڵ": شێوەیەکی پێشووتر لە ↑شووڵ şûl.

**شڤار şıvar** [ *šıvār* ] - شێوەیەکی کۆنترە لە↑ ساوار sawar.

**شڤتاندن şıvtandın** [ *šıvtāndın* ] - "لەسەرەوە بۆ خوار دادڕین": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑شێ şê، ↑شۆم şom، ↑شووڤی şûvî و ↑جیا cîya و هتد سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشاندن، جودا کردن".

**شقاقی şıqaqî** [ *şıqāqî* ] - "نەخۆشی سمی وڵاخەبەرزە": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر وشەی ↑سەق seq دا باس کراون و مانای "سەخت" دەبەخشن. ئەم نەخۆشییە دەبێ پێوەندی بە چەمکی "رەق بوون"ەوە هەبێ.

**شقلە şıqle** [ *šıqla* ] - "خەستە، نەخۆش": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە هەبێ:

1- ↑شەخسان şexsan "نەخۆش کەوتن".

2- ↑سەخلەت sexlet ەوە.

**شقووق şıqûq** [ *šıqūq* ] - "جۆرێ هەرمێ کێویلە": شکووک şıkûk یش دەگوترێ. ئەم هەرمێیە رەقە و لەبەر ئەوە ئەم ناوەی پێ دراوە. خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر وشەی ↑سەق *seq* دا باس کراون، بۆ وێنە ↑شکاک şıkak "ناوی هۆزێکی کورد". مەبەست لەم ناوە "سەخت و بەهێز" بوونە.

**شقین şıqîn** [ *šıqīn* ] - "گرماندنی هەور": خزمە دەگەڵ↑ زیقاندن zîqandın.

**شکار 1 şıkar** [ *šıkār* ] - "1-کەڵەکەبەرد 2- بەردەڵان": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑زاخۆر zaxor بەردەڵانی رژد".

**شکار 2 şıkar** [ *šıkār* ] - "راو": شکار šekār (P.). ئەم وشەیە دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سۆسە sose سەر بە ریشەی **(IE.) *sāg- <** "شۆپاندن، شوێن گرتن، کەوتنە شوێن" [دە بنەڕەتدا بۆ سۆسە کردنی سەگی راو بەکار هاتووە].

[تێبینی: هەروەها دە زمانی لاتینیدا sequi (L.) مانای "وە شوێن کەوتن" دەدا کە دەبێتە خزم دەگەڵ سیخوڕ "شۆڤار"].

**شکاک şıkak** [ *šıkāk* ] - "ناوی هۆزێکی کورد": وەک زۆر ناوی دیکەی مەڵبەند و هۆزە کوردمادییەکان هەڵگری مانای "سەخت، بەهێز، قورس و قایم"ە. بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ↑سەق seq.

**شکاندن şıkandın** [ *šıkāndın* ] - "قەڵشاندن، ورد کردن": شکەستن şıkestın یش دەگوترێ. شکستن šekastan (P.). خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑چەقۆ çeqo، ↑ئەشکەوت (e)şkewıt، ↑شکاف şıkaf سەر بە ریشەی **(IE.) *sek- <** "بڕین، قەڵشاندن". Säge (G.) "*شەقە* [مشار]"، secare (L.)، seč (Rus.) "بڕین" لەم ریشەوە هاتوون.

**شکڵ şıkıl** [ *šıkıl* ] - "وێنە، شێوە": شێوەیەکی دیکە لە شقڵ şiqıl یان ↑شەقڵ *şeqıl* "مۆر، وێنە" و خزمیشە دەگەڵ ↑چەقۆ çeqo و↑شکاندن şıkandın و گەلێک وشەی دیکە سەر بە ریشەی < ***sek-** (**IE.**) "بڕین، قەڵشاندن". "شکڵ" دە بنەڕەتدا ئەو وێنە و نیشانانە بوون کە بە چەقۆ و شتی تیژ لەسەر دار و بەرد هەڵکەنراون، واتا قەڵش و بڕی سەر دار و بەردەکان.

**شکنا şıkna** [ *šıknā* ] - "دۆن، مەرام، مەبەست": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑*دۆزینەوە* *dozîn(ewe)*، دۆز doz، ↑سۆسە sose، ↑سوختە suxte "فەقێ" [شوێنگر و پەیدۆزی مەقسەد]، ↑سکالا skala"شوێنگری دۆزێک"، ↑شکار şıkar "راو" و هیتر سەر بە ریشەی < ***sāg-*** (***IE.***) "شۆپاندن، شوێن گرتن، کەوتنە شوێن".

**شکۆ şıko** [ *šıko* ] - "پایەبەرزی": شکوە šekūh (P.). دە زمانی عەڕەبیدا کراوە بە شوكة šawka(t) (Arb.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑سەھ seh "حیس، ئاگاداری".

**شکۆفە şıkofe** [ *šıkofa* ] - "گوڵی دار": خزمە دەگەڵ ↑شکاف şıkaf و ↑ئەشکەفت eşkeft و گەلێک وشەی دیکە سەر بە ریشەی < ***sek-** (**IE.**) "قەڵشین، جیا بوونەوە". وشەکە ئاماژەیە بە دەم کردنەوە و لێک جودا بوونەوەی پەرەکانی خونچە. هەروەها شکۆفیانەوە şıkofyanewe هەیە بە هەردوو مانای "1- گوڵ دەر کردنی دار 2- ئاهەک وەختێک ئاوی بە سەردا دەکەن و خۆی دەکاتەوە". ئاهەک کاتێک ئاوی بەسەردا دەکرێ، دەپشکوێ و لێک بڵاو دەبێتەوە.

**شکێر şıkêr** [ *šıker* ] - "کەلێنەبەردی فراوان لە کێو": دەچێتەوە سەر ↑شکاندن şıkandın و چەند وشەیەکی وەک ↑چەقۆ çeqo، ↑ئەشکەوت (e)şkewıt، ↑شکاف şıkaf و هیتر سەر بە ریشەی < ***sek-** (**IE.**) "بڕین، قەڵشاندن".

**شل1 şıl** [ *šıl* ] - "خاو، داکەوتوو، بێهێز، شۆڕ، بەرانبەری توند": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە دە زمانە ئەورووپییەکاندا و لەوانە Schlaff (G.)، Schlapp (G.)، slap (Nl.)، slapp (Sw.) "خاو، داهێزاو، داکەوتوو، slabyj (Rus.) "بێهێز، داکەوتوو"، Schlaf (G.)، slaap (Nl.)، sleep (E.) "خەو" [دە بنەڕەتدا: پاڵکەوتن، داکەوتن، شل بوونەوە]، slāpr (OIsl.) "داهێزاو، تەپ، ناچالاک" [هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی کوردمادی ↑سلپ2 sılp "تەپ، تەوەزەل"] سەر بە ریشەی < ***(s)lab-, *(s)leu-*** (***IE.***) "شل، داهێزاو، داکەوتوو، شۆربۆوە". هێندێک وشەی دیکەش دە زمانی کوردمادیدا لەم چوارچێوەیەدا جێ دەگرن، وەک ↑شۆر şor، شلێرە şılere [ئەو گوڵەی سەری بەرەو خوار شۆر دەکاتەوە] و دە پلەیەکی دوورتردا ↑لێو lew، ↑لێفە lefe و هتد.

**شل2 şıl** [ *šıl* ] - "رەوان، تراو، ئاوەکی، نەمەییو": دە زمانی کوردمادی و فارسیدا دوو"شل" هەیە، واتا شل بە دوو مانا بەکار دێ. یەکەمیان شل بە مانای "خاو، بێهێز، شۆڕ، داکەوتوو" و دوومیان بە مانای "رەوان، تراو، ئاوەکی". دە زمانە ژێرمەنییەکاندا بۆ ئەو دوو مانایە دوو وشەی جیاواز بەکار دێن. وێ دەچێ دە زمانی کوردمادی و وفارسیشدا ئەو دوو "شل"ە دوو وشەی جیاواز و سەر بە دوو ریشەی جیاواز بن کە بەهۆی هاوشێوە بوونیان تێکەڵ بە یەکدی کراون و وەک یەک وشەیان لێ هاتووە. "شل" بەم مانایەی دووەم دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی < ***(s)lei-*** (***IE.***) "تەڕ و لیچق بوون، لووس و خلیسک بوون".

**شلپە1 şılpe** [ *šılpa* ] - "دەنگی لە ئاو کەوتن، دەنگی وێک کەوتن": [شلپە، شلپەشلپ، شلپ و هۆڕ]:

1- بە شیمانەیەکی بەهێز خزمە دەگەڵ ↑خوڕپە xurpe "راتڵەکانی دڵ، تەپەی دڵ" [خوڕپە لە دڵمەوە هات، دەبنەڕەتدا: تەپەتەپی دڵ لەبەر نیگەرانی زۆر]، ↑*غەڵبە* *ġelbe* [غەڵبەغەڵب]، ↑قوڵپ qulp "دەنگی توندی گریان"، ↑کلپە kılpe "دەنگی بڵێسە".

2- ده زمانی کوردمادیدا هەروەها دەگوترێ "شڵپێک ئاو بە دەموچاوتدا دە". دە زمانی ئەڵمانیدا (G.) Schlappe بە مانای "ناسەرکەوتوویی، سەرنەکەوتوویی" بەکار دێ و هەروەها بە مانای "زەبر لێدان بە دەست"یش بەکار دێ و ئەمەش دەگەڵ "شڵپێک ئاو بە دەموچاو دادان" یەک دەگرێتەوە. ریشەی وشە ژێرمەنییەکە وەک لاسا کردنەوەی دەنگ باس کراوە. لەوانەیە دوو وشەی "شڵپە" بەو مانایانەی سەرەوە دە زمانی کوردمادیدا هەبووبن و تێکەڵ بەیەکدی کرابن.

**شڵپە2 şılpe** [ *šılpa* ] - "بریتییە لە پڵاوی زۆر چەور": پێوەندی هەیە بە شڵپاو şılpaw کە شێوەیەکی دیکەیە لە ↑چڵپاو çılpaw. خزمیشە دەگەڵ ↑شلف şılıf "تیژایی دەمی تیغ" و ↑*شەڵپین şelpîn* "رەت بردن، خلیسکان، کەوتن".

**شڵپە3 şılpe** [ *šılpa* ] - "کەوتن": بە کەسێک کە لە ساڵی خوێندن دەرنەچووبێ و کەوتبێ، بە تەوس و گاڵتەوە دەگوترێ "شڵپەی لێ هێنا". ئەم وشەیە پێوەندی بە شڵپە1 şılpe وەوە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ ↑*شەڵپین şelpîn* "رەت بردن، خلیسکان، کەوتن".

**شلف şılıf** [ *šılıf* ] - "تیژایی دەمی تیغ": خزمە دەگەڵ schleifen (G.)، slifan (OG.)، slijpen (Nl.) "سوونەوە، تیژ کردن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑شەڵپین şelpîn "رەت بردن، خلیسکان، کەوتن".

**شڵفت şılıft** [ *šılıft* ] - "خوێری و بێکارە": دەشێ پێوەندی بە یەکێک لەم وشانەو هەبێ:

1- ↑جڵف cılıf "سووک، هەرزە".

2- ↑*سلپ2 sılıp* "تەپ، تەوەزەل".

**شڵقە şılqe** [ *šılqa* ] - "دەنگی لێکدرانی تراو دە دەفر دا": خزمە دەگەڵ شڵەقان و ↑شڵەقاندن şıleqandın "لێکدان". وشەکە دە بنەڕەتدا بە مانای "دەنگ [ی شڵەقان]" نەبووە، بەڵکوو ئاماژە کردن بە خودی شڵەقان بووە.

**شلنگ şılıng** [ *šılıng* ] - "ترۆزی، خیارچەمبەر": خزمە دەگەڵ schlank (G.)، slank (Nl.) "قەدباریک". مانای وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بەوە بووە کە شتێک بە هۆی شل و مل بوونی با دەدرێ، دەچەمێتەوە. slingan (OG.) "بەم لا و ئەولادا جووڵانەوە، بەم لا و ئەو لادا با دانەوە"، slingan (OE.)، "با دانەوە، خوشین" و Schlange (G.) "مار" دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *slenk-, -g- >** "*با دان*، بەم لا و ئەو لادا جووڵانەوە". "شلنگ" واتا "بادراو". شیاوی باسە هەردوو وشەی "چەمبەر" و "ترۆزی"یش دە ریشەدا مانای "با دران" دەبەخشن و هەروەها بە پاپۆکە کردن [پەپکە کردن]ی ماریش دە زمانی فارسیدا دەگوترێ "چنبرە زدن" [ئەم وشە فارسییە دەگەڵ "خیارچەمبەر" بەرهەڤ بکە].

**شڵنگ şılıng** [ *šılıng* ] - "تەکان بە خۆ دان، راپەڕین لە کار":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑*چەلەنگ çeleng* و ↑شلنگ şılıng "ترۆزی، خیارچەمبەر".

2- لەوانەشە هەمان ↑شنگڵ şıngıl بێ و گۆڕانی بەسەرداهاتبێ.

**شلوێ şılwê** [ *šılwe* ] - "لێڵ، قوڕاوی": پێوەندی هەیە بە↑شلێوە şılêwe "بەفر و بارانی تێکەڵ" و ↑شلە şıle "پێستی رەنگ تێکەڵ" و دە بنەڕەتدا بە مانای "لێکدان، شڵەقاندن".

**شڵۆق şıloq** [ *šıloq* ] - "1- شێواو، تێکەڵ پێکەڵ 2- بزۆز، هار و هاج": خزمە دەگەڵ شڵەقان و ↑شڵەقاندن şıleqandın "لێکدان". مەبەست لە شڵۆق بوونی شوێنێک دە بنەڕەتدا ئەوەبووە کە شوێنەکە

لێک دراوە، تێکەڵ پێکەڵە و مەبەستیش لە شلۆق بوونی کەسێک دەبێ ئەوە بووبێ کە ئەو کەسە دەبێتە مایەی شلۆقی و شێواندن.

**شلە** **şıle** [ *šıla* ] - "شۆرباو": لە شل↑ şıl ەوە هاتووە. شلە šole (P.) "خواردنێکی شلە لە برینج ساز دەکرێ".

**شڵە** **şıle** [ *şıla* ] - "سوورکاڵی پنۆک پنۆک، بەڵەکی سوور و سپی": خزمە دەگەڵ شڵەقان [↑شڵەقاندن şıleqandın] و هێندێک وشەی دیکە سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێدان، لێکدان". لەم تێڕوانینەوە وشەکە واتا "رەنگێکی لێکدراو و تێکەڵ" [نەک یەکڕەنگ و روون و زەلال].

**شلەپەتە** **şılepete** [ *šılapata* ] - "شل و شەوێق، خۆنەگر": خزمە دەگەڵ یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- ↑شلەپین şılepîn "خلیسکان" و ↑*شەڵپین şelpîn* "رەت بردن، خلیسکان، کەوتن".
2- ↑سلپ² sılp "تەپ و تەوەزەل، schlaff (G.)، slap (NL.)، slapp (Sw.) "بێهێز، داکەوتوو، شل و شەوێق"، schlappen (G.) "1- شۆڕ بوونەوە، داکەوتن 2- لەترە دان، بە لادا هاتن 3- خلیسکان، خوشین". ئەم وشە ژێرمەنییانە هەروەها خزمن دەگەڵ schlafen (G.)، slaap (Nl.)، sleep (E.) "خەوتن" [پاڵکەفتن]. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی < ***(IE.) *(s)lap-, *(s)leb-*** "شل بوونەوە، شۆڕ بوونەوە، داهێزان، داکەوتن".

**شلەپین** **şılepîn** [ *šılapīn* ] - "خلیسکان": شێوەیەکی دیکە لە ↑*شەڵپین şelpîn* "رەت بردن، خلیسکان، کەوتن".

**شڵەژان** **şılejan** [ *šılažān* ] - "شێوان": خزمە دەگەڵ شڵەقان و ↑شڵەقاندن şıleqandın "لێکدان".

**شڵەقاندن** **şıleqandın** [ *šılaqāndın* ] - "لێکدان، ژەندن": هەروەها شڵەقان şıleqan هەیە بە مانای "لێکدران". خزمە دەگەڵ schlagen (G.)، slā(he)n (OG.)، slahan (Gt.)، slay (E.)، sla (Sw.) "لێدان". خزمیشە دەگەڵ Schlacht (G.)، slātta (OE.) "شەڕ، کوشتار، سەربڕین"، slacc (Mir.) "شمشێر". دە زمانی کوردمادیدا دەبێتە خزم دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑شەڵڵاق şellaq، ↑زللە zılle، ↑شڵۆق şıloq، ↑شڵەژان şılejan، ↑شڵە şıle، ↑شێلە şêle [شێلە و بێلە şêle û bêle]، ↑شێل şêl "شێوە" و هتد. گشت ئەم وشانە دەربڕی چەمکی "لێدان" یاخود "لێکدان"ن. دە زمانی فارسیدا شلیک šellīk (P.) "تەقە کردن، هاویشتنی گوللە" هەیە کە خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە و دە بنەڕەتدا مانای "لێدان" دەبەخشێ. ئەم وشە فارسییە لەباری ماناوە دەگەڵ "تفەنگ" هەڵسەنگێنە کە ئەویش خزمە دەگەڵ *تەپاندن* "لێدان". هەروەها دوو وشەی ↑کلان kılan "ژەندن، کیاندن، شڵەقاندن" و ↑شێلان şêlan لە "شڵەقان"ەوە هاتوون و دە بنەڕەتدا مەبەست "لێکدان" بووە [هەوێر شێلان].

**شلیک** **şılîk** [ *šılîk* ] - "تووی فەرەنگی": ↑چلیک çılîk یش دەگوترێ.

**شلێرە** **şıl(l)ere** [ *šılera* ] - "گوڵی سەر نەوی": شلیل şılîl یش دەگوترێ. دە فارسیدا دەگوترێ "لالەی سرنگون lāla ye sernegūn". وشە کوردمادییەکە پێک هاتووە لە دوو کەرتی شل + لێرە şıl + lere. کەرتی یەکەم، واتا هەمان ↑شل şıl ە بە مانای "داکەوتوو، شۆڕ"، هەروەها خزمیشە دەگەڵ ↑شۆڕ şor. کەرتی دووەم هەمان لالە lale یە کە بووەتە لێرە lere- یان لیل lîl-. کەوابوو مانای وشەکە دەبێتە "لالەی داکەوتوو یان (سەر)شۆڕ".

**شڵێقان** **şılêqan** [ *šıleqān* ] - "پلیخان(ەوە)": خزمە دەگەڵ شڵەقان şıleqan و ↑شڵەقاندن şıleqandın "لێکدان، ژەندن". ریشەی ئەم وشانە بە مانای "لێدان"ە. "شڵێقیاگ" یان "پلیخاوە" ئەو شتەیە کە بە لێدان

ورد و بڵاو بۆتەوە. دە زمانی فارسیدا دەگوترێ لە leh [لە شدن leh šodan واتا پلیخانەوە]. ئەم وشە فارسییە دەبێ هەمان "شلێقان" بووبێ کە سواوەتەوە.

**شلێل şılêl** *[ šılel ]* - "نەگەنم نەجۆ": خزمە دەگەڵ ↑شلە şıle بە مانای "لێکدراو، تێکەڵ".

**شلێم şılêm** *[ šılem ]* - "کڵاوی لە بەن چنراو": خزمە دەگەڵ ↑شاڵ şal "پەڕۆی چنراو".

**شلێوە şılêwe** *[ šılewa ]* - "بەفر و بارانی تێکەڵ": شلۆپە şılope و شلوڤە şılove ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑راجلفین racılfîn "راچەنین، شڵەژان" و هەروەها شڵەقان و ↑شڵەقاندن şıleqandın "لێکدان". دەشێ شێوە کۆنترەکە *şılage /* şılêge** بووبێ و فۆتیمی g گۆڕدرابێ بە w. لەم تێڕوانینەوە شلێوە واتا بەفر و بارانی "لێکدراو".

**شماڵ şımal** *[ šımāl ]* - "لاوی جوانچاك و ئاکارپەسەند": خزمە دەگەڵ ↑*هەمین hemîn* و ↑هێمن hêmın، ↑ساماڵ samal و ↑شەماڵ şemal "بای ئارام".

**شمراخ şımrax** *[ šımrāx ]* - "داری لك و پۆ بڕاو": خزمە دەگەڵ ↑شمشات şımşat "ساف و ڕێك کراو".

**شمش şımş** - "زێڕی داڕشتەی ڕێك و ڕاست": خزمە دەگەڵ ↑شمشات şımşat "ساف و ڕێك کراو".

**شمشات şımşat** *[ šımšāt ]* - "ساف و ڕێککراو": ئەم وشەیە و چەند وشەی دیکە هەن کە دە چوارچێوەیەکدا جێ دەگرن. ئەم وشانە بریتین لە ↑شمشاد şımşad "ناوی دارێکە" [دەبێ دارێکی ڕێك و ڕاست بێ]، ↑شمراخ şımrax "داری لك و پۆ بڕاو"، ↑شمشە şımşe "ڕاستەداری بەننایی"، شمش şımş "زێڕی داڕشتەی ڕێك و ڕاست". ئەم وشانە دەبێ خزم بن دەگەڵ ↑*ساماڵ samal* "ساف، یەکدەست".

**شمشاد şımşad** *[ šımšād ]* - "ناوی دارێکە": خزمە دەگەڵ یان شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شمشات şımşat "ساف و ڕێککراو".

**شمشاڵ şımşal** *[ šımšāl ]* - "بلوێری تێ تووڕاندن": دەشێ پێك هاتبێ لە لە دوو کەرتی شم + شاڵ şal + şım. کەرتی "شاڵ" یەك دەگرێتەوە دەگەڵ calmus (.L) و kalamus (.Gr) "قامیش، نەی، بلوێر". وشەی chalemie (.OF) "شمشاڵی شوان" دەچێتەوە سەر ئەو وشانەی سەرەوە. کەرتی یەکەمی وشەکە، واتا شم -şım لەوانەیە جۆرێکی دیکە بێ لە ↑دەم dem. ئەگەر ئەم شیمانەیە ڕاست بێ، مانای وشەکە دەبێتە "نەیی دەم، قامیشی دەم". [دە زمانی فارسیدا بە شمشاڵ دەگوترێ "نی لبك" واتا "نەیی لێو"]. وشەی ↑قەڵەم qelem یش دەبنەڕەتدا بە مانای "قامیش، نەی" بووە و پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

**شمشە şımşe** *[ šımša ]* - "ڕاستەداری بەننایی": خزمە دەگەڵ ↑شمشات şımşat "ساف و ڕێککراو".

**شمشێر şımşêr** *[ šımšer ]* - "شیری خوار": شمشیر şımşīr یش دەگوترێ. شمشیر šamšīr (.P). خزمە دەگەڵ šufšēr (.Pl). وشەکە دەبێ دەبنەڕەتدا لە دوو کەرت پێك هاتبێ. کەرتی یەکەم واتا -şım مانای "خوار" دەبەخشێ و کەرتی دووەم ↑شیر şîr ە، واتا مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "شیری خوار، شیری چەماو". کەرتی یەکەم دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑چەوت çewıt [چەفت çefıt] و هتد.

**شمڵی şımlî** *[ šımlī ]* - "دووانەی پێکەوە نووساو": خزمە دەگەڵ ↑جمك cımık "دووانە".

**شمەك şımek** *[ šımak ]* - "کەلوپەلی ماڵ":

1- لەوانەیە پێوەندی بە ↑*جامە came* وە هەبێ و دە ئەسڵدا مەبەست "جامەك" بێ. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەمل şemıl "جاجم یان هەر کرێك کە دە خۆیەوە دە پێچن"، شەملك şemılk "1- بەرماڵ 2- فۆتە، داپۆشی خوار لە کەمەر" و ↑شەمەد şemed "پۆپەشمین".

2- یان شێوەیەکی کورتکراوە لە شتوومەک şıtûmek، پێک هاتووە لە ↑شت şıt + مەک mek [↑ماکە makeواتا ماددە، ماتریاڵ].

**شن şın** [ *šın* ] - "خن، دەنگی هەناسەدانی ماندوو": [دروێنە نییە و شنەشن، ئاردپێژانە و گیان کێشان]. خزمە دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑گن gın "دە لووتدا قسەکەر"، schnauben (G.) بە دەنگ هەناسە کێشان"، schnaufen (G.) "بە سەختی هەناسە کێشان"، schnäuzen (G.) "پڕماندن، توند و بە دەنگ هەوا لە لووت دەر کردن" (بۆ وێنە لە کاتی چڵم سڕیندا)، snot (E.) "چڵم"، schnupfen (G.) "نەخۆشی سەرمابوون" [دە بنەڕەتدا: لووت گیران، بەسەختی هەناسە کێشان]، schnuppern (G.) "کورت و زووزوو هەناسە هەڵکێشان بۆ هەست کردن بە بۆنێک". ریشەی ئەم وشانە بۆ لاسا کردنەوەی دەنگ دەگەڕێندرێتەوە.

**شندڕ şıdır** [ *šındır* ] - "ریشاڵ ریشاڵ، بزگوڕ، تیتاڵ": خزمە دەگەڵ ↑جنین cınîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشین، لەت کردن". لەوانەیە کەرتی دووەمی وشەکە پێوەندی بە دڕین dırîn ەوە هەبێ، واتا لە دوو وشە پێک هاتبێ کە هەر دووکیان یەک مانا ببەخشن.

**شندل şındıl** [ *šındıl* ] - "بە حەواوە هەڵواسراوی بە تەکەتەک":

1- یان پێوەندی بە ↑ژەندن jendın ەوە هەیە بە مانای "لێکدان، راژاندن، تەکان دان".

2- یانیش خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑جینگڵ cîngıl دا ئاماژەیان پێ کراوە. ئەو وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "جووڵان، لەرینەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا schweben (G.) "دە حەوادا تەکان خواردن و لەرینەوە" دوورە خزمە دەگەڵ ئەم خێزانەوشەیە.

**شندۆک şındok** [ *šındok* ] - "پیر، زورهان":

1- لەوانەیە لە زمانی لاتینی وەرگیرابێ: < *senex* (*L.*) "پیر، بەتەمەن".

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑شندل şındıl ەوە هەبێ و مەبەست تەکە تەک و لەقەلەقی مرۆڤی پیر لە بزوان و رۆیشتندا بێ.

**شندی ışndî** [ *šındī* ] - "گزی، فێڵ": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ swindler (E.)، Schwindler (G.) "فێڵباز، ساختەچی". ئەم وشانە دەچنەوە سەر کرداری schwindeln (G.) "دە گێژەوە هاتن، وشیاری لە دەست دان"، دواتریش schwinden (G.)، swindan (OE.) "کز بوون، لە کەمی دان، لە ناو چوون، وندا بوون". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑ون(دا) wın(da).

**شنک şınık** [ *šınık* ] - "بان مەڵاشوو، پێشەسەر": جنیک cınîk یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑جانگ cang.

**شنگ¹ şıng** [ *šıng* ] - " گیایەکی بەهاری بۆ خواردن دەشێ، ئەسپینگ": شێوەیەکی نوێتری ↑ئەسپینگ espîng.

**شنگ² şıng** [ *šıng* ] - "زۆر، هێز":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑زەنگ zeng [زەبر و زەنگ].

2- هەروەها جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Schwung (G.) "جووڵەی خێرا و بەهێز، تەکانی بە تەوژم". ئەگەر ئەم پێوەندییە راست بێ، ئەوسا وشەکە پێوەندی پەیدا دەکا بە ئەو وشانەی لە ژێر ↑جینگڵ cîngıl دا شی کراونەوە

**شنگڵ şingıl** [ *šıngıl* ] - شەنگڵ şengıl یش دەگوترێ. شنگڵ لە خۆدان واتا بزاڤێکی خێرا دانە خۆ یان خۆ هەڵسووڕاندن بۆ ڕاپەڕاندنی کارێک. خزمە دەگەڵ ↑جینگڵ cîngıl.

**شنگین şingîn** [ *šıngīn* ] - "دەنگی ئارام": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شێنەیی şêneyî "ئارامی، هێواشی".

**شنە şine** [ *šına* ] - شنەبا واتا "نەرمەبا، سووکەبا":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە ↑شێنەیی şêneyî "هێواشی، لەسەرەخۆیی". لەم تێڕوانیەوە مانای شنەبا دەبێتە "بایەکی لەسەرەخو".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ kinesis (Gr.) "جووڵان، شنین". هەر لەم پێوەندییەدا هەڵیسەنگینە دەگەڵ ↑شنین şınîn هەیە بە مانای "لەرینەوە (لەبەربا)".

3- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑جینگڵ cîngıl.

**شنەفتن şıneftın** [ *šınaftın* ] - "بیستن": شنەوتن şınewtın و ↑ژنەوتن jınewtın یش دەگوترێن.

**شنین(ەوە) şınîn(ewe)** [ *šınīn(awa)* ] - "هەڵکردنی با، لەرینەوە لەبەر با":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑ڕاژان rajan "لەرینەوە" [را +ra ژان jan]، کەرتی دووەمی وشەکە خزمە دەگەڵ ↑ژەنین jenîn "لێدان، لیکدان". لەم مانایەوە هێندێک وشە پەرەیان گرتووە کە ئاماژە بە بزاڤ و جووڵە دەکەن، وەک ↑ژان jan "ژان و ئێش، ژان و پێچ"، ↑جنقین cınqîn و چەنین çenîn [↑ڕاچەنین raçenîn] "هەڵبەزینەوە" و هتد.

2- وشەکە هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ kinesis (Gr.) و kineīn (Gr.) "جووڵان". ئەم وشە یۆنانییە خزمە دەگەڵ ↑هاتەران hateran.

**شوار1 şuwar** [ *šuwār* ] - "جل شوشتن": خزمە دەگەڵ ↑شۆردن şordın "شوشتن".

**شوار2 şuwar** [ *šuwār* ] - "پتە، لێدان، چڵیانی ڕەگ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑جمین cımîn [یان جڤین cıvîn].

**شوان şuwan** [ *šuwān* ] - "ئەو کەسەی ئاگاداری لە مەڕ و بزن دەکا": چوپان čūpān (P.) و šabān (P.)، šupān (Pl.)، fšupaiti (Av.). وشەکە دە بنەڕەتدا دەبێ لە دوو کەرتی fšu + paiti پێک هاتبێ. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ ↑پەز pez "مەڕ". کەرتی دووەم خزمە دەگەڵ کردارێک کە دە زمانی فارسی ئەمڕۆدا بووەتە پائیدن pā(y)īdan (P.) "ئاگاداری کردن، خستنە ژێر چاوەدێری". ئەم کەرتە خزمە دەگەڵ پاشگری ↑وان wan- [باخەوان، پاسەوان]. بەم جۆرە وشەکە دەبنەڕەتدا ماناکەی دەبێتە "پەزەوان، مەڕوان".

**شوقاق şuqaq** [ *šuqāq* ] - "1- ناوی هۆزێکی کورد 2- سەرمای دە ڕۆژی سەرەبەهار": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq.

**شوقڵ şuqıl** [ *šuqıl* ] - "پۆرگی سەر پێست": شێوەیەکی دیکە لە ↑تۆقلە toqle "پۆرگ" و خزمە دەگەڵ ↑توێکل toekıl [↑تۆکل tokıl].

**شوێن şuwen** [ *šuwen* ] - "جێگە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Zone (E.) و zone (E.) "ناوچە، دەڤەر" [شوێنێک کە دەوروبەرێکی دیاریکراوی هەیە]. ئەم وشە ژێرمەنییانە دەچنەوە سەر zone (L.) "کەمەربەند، کەمەربەندی زەوی" و zone (Gr.) "کەمەربەند".

**شوو şû** [ *šū* ] - "مێری ژندار، مێری هاوسەری": خزمە دەگەڵ ↑خەزوور xezur.

شووت[1] **şût** [ šūt ] - "دارۆکەی نووک تیژ لە کایەی منداڵاندا کە دەیهاوێن و دەچەقێ": شیت şît یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑شات1 şat "لکەداری یەکساڵە، چرۆ"، ↑سیتکەسڵاو sîtkesılaw،↑سیچقە sîçqe، ↑چووزە çuze، ↑سووچ suç "گۆشە"، ↑چوخساندن çuxsandın. گشتیان سەر بە ریشەیەک بە مانای "دەرپەڕاندن، راو نان، ڕادان، پەلە کردن". وشەی shoot (E.) و schießen (G.) "لێدانی توند و دەرپەڕاندن، هاویشتن" خزمن دەگەڵ وشەکانی سەرەوە.

شووت[2] **şût** [ šūt ] - دەگەڵ "شات" دێ [شات و شووت şat û şût واتا هەراهەرا]. دەبێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شات[2] şat [شاتەشات] و خزمیشە دەگەڵ شووت[1] şût "دارۆکەی نووک تیژ". لەوانەیە سوت sūt (P.) "فیکە" پێوەندی بە "شووت"ەوە هەبێ.

[تێبینی: وەک دەبینرێ "شووت" هەم بە مانای دارۆکەی نووک تیژ و هەمیش بە مانای هەرا و قیژە دێ. "شات" یش هەم بە مانای لکەدار و هەم بە مانای "هەرا و قیژە" دێ].

شووت3 **şût** [ šūt ] - "زرینگ، وشیار": شێوەیەکی دیکە لە ↑زیت zît.

شووتی **şûtî** [ šūtī ] - "شفتی، زەبەش": ↑شفتی şıftî.

شووڕ **şûr** [ šūr ] - دەگەڵ "شەڕ" دێ [شەڕ و شووڕ şer û şûr]. خزمە دەگەڵ ↑شۆڕش şorış "ڕاپەڕین"،↑شۆڕان şoran "ڕاپەڕین (بە تووڕەیی)" و شوریدن šūrīdan (P.) "ڕاپەڕین، وە خۆ کەوتن". ئەم وشانە لەوانەیە پێوەندییان هەبێ بە ↑*سوور(ان) sur(an)* "شادی کردنی بە کۆمەڵ، پارتی، بزم" [بەزم و ڕەزم].

شوورە **şûre** [ šūra ] - "دیوار": شوورا şûra و سوور sur یش دەگوترێن. خزمە دەگەڵ Säule (G.)، sūl(OG.)، zuil (Nl.)، syl (OE.)، sul(a) (OIs.)، sauls (Gt.) "ستوون، کۆڵەکە". ئەم وشانە هەروەها خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشەی ژێرمەنی دیکە وەک Schwelle (G.)، swella (OG.)، sill (E.)، syll(Sw.) "داری ئاسۆیی بەر دەرگا". مانای بنەڕەتی ئەم وشانەی دوایی "داری بنەڕەتی خانوو" بووە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(IE.) *s(u)el- <*** "دار، تەختە، لە دار و تەختە دروستکراو".

شوورەیی **şûreyî** [ šūrayī ] - "نەنگ، رسوایی": دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)keu <*** "داپۆشین". ↑کوێر kuwer "نابینا"، ob-scurus (L.) "تاریک، نادیار"، skur (Norw.) "سەرپەنا، پەناگا، دیوەلکە"، ↑ژوور *jur "هۆدە"* و گەلێک وشەی دیکە پێوەندییان بەم ریشەوە هەیە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا Scham (G.) "شەرم، عەیبە" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "داپۆشین" و خزمیشە دەگەڵ "جندە" دە زمانی کوردمادیدا. هەر بەم شێوەیە "شوورەیی"ش دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "داپۆشین"، واتا هەر دوو وشە کوردمادی و ئەڵمانییەکە لەسەر بنەمایەکی لۆژێکی هاوبەش دروست کراون. ئەم پێوەندییە رەنگە لەوەڕا هاتبێ کە مرۆڤ هەوڵی داوە عەیب و عارەکانی خۆی داپۆشی].

شووز **şûz** [ šūz ] - "1- جەغز 2- خەتی لەسەر وێستان بۆ هاویشتنی مت بۆ ناو جەغز": خزمە دەگەڵ ↑جەغز ceġz.

شووژ **şûj** [ šūž ] - "ورتکەبەردی بە کوتک شکێنراو": خزمە دەگەڵ ↑شژ şıj "بەردی ناسک و تورت"، ↑زیخ zîx "ورکەبەرد" و ↑*زاخ[1] zax* "بەرد" و ↑شووشە şûşe.

شووژن **şûjın** [ šūžın ] - "جەواڵدووز": ↑سوژن sujın یش دەگوترێ.

شووش **şûş** [ šūš ] - دەگەڵ "باریک" دێ [شووش و باریک şûş û barîk]. دەبێ خزم بێ دەگەڵ ↑شیش şîş "سیخ". [هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ئاوەڵناوی "قەڵەمی" کە لە وشەی "قەڵەم" وەرگیراوە].

شووشە **şûşe** [ šūša ] - "گلاس، جام": شیشە šīše (P.). وشەی شاشة šāša (Arb.) [شاشەی تەلەفیزیۆن] لە شووشە یان شیشەی فارسی وەرگیرابێ و دە بنەڕەتدا مەبەست شووشەکەیە کەوا وێنەکانی لەسەر نیشان دەدرێ. ئەم وشەیە جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ:

1- سەر بە scheinen (G.)، skeinan (Gt.)، shine (E.) و skina (Sw.) "درەوشانەوە، تروسکانەوە" ریشەی *skei- (IE.) "درەوشانەوە". sijat (Rus.) "درەوشان" لەم ریشەوە هاتووە.

[تیبینی: وشەی "گلاس"یش کە لە زمانە ئەورووپییەکان وەرگیراوە، دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە" و خزمە دەگەڵ "زەرد" و "زێڕ" و چەندین وشەی کوردمادی دیکە].

2- لەوانەشە وشەکە دە بنەڕەتدا مانایەکی وەک "بەرد، مینا"ی هەبووبێ و خزم بێ دەگەڵ ↑شووژ şûj "ورتکەبەردی بە کوتک شکێنراو"، ↑شژ şıj "بەردی ناسک و تورت"، ↑زیخ zîx "ورکەبەرد" و ↑زاخ[1] zax "بەرد". دە زمانی کوردمادیدا ↑سەکرە sekre "جام، پیاڵە" و سوکرە sukre هەیە بە مانای "دیزە، مەنجەڵ لە گڵی سوورەوەکراو". مەبەست لەم وشانە دە بنەڕەتدا (قوڕی) سوورەوەکراو و بەردینکراوە. جێی ئاماژەیە کە دە زمانی کوردمادیدا مانای دوو وشەی "جام" و "شووشە" زۆر لە یەک نیزیکە و زۆر جار ئەم دوو وشەیە بە یەک مانا بەکار دەهێنرێن، وەک "جامێک ئاو" کە ئاماژە بە دەفر دەکا و "جامی پەنجەرە" [یان جامخانە] کە ئاماژە بە شووشەی پەنجەرە دەکا. وشەی "جام"یش خزمە دەگەڵ "کەمر، کەڤر" بە مانای "بەرد".

**شووڤی şûvî** [ *šūvī* ] - "کێڵانی چەند گاسنە": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑شێ şê و ↑شۆم şom و↑شێوەرد şêwerd.

**شووڵ şûl** [ *šūl* ] - "لقەداری باریک": شولک şûlı ، شڤ şıv، شفتیل şıftel یش دەگوترێ. شوو + ڵ (ık)l + şû [یان شفت + ئیل şıft + îl]. کەرتی "شوو-" یان "شفت" خزمە دەگەڵ ↑چێو çew [چوب čūb (P.)]. کەرتی دووەم پاشگری گچکاندنە و بەم جۆرە وشەکە "دارۆچکە" مانا دەدا. خزمیشە دەگەڵ ↑چەفت2 çefit"دارۆکە" [یان ئاسنۆکە].

[تیبینی: دە زمانی فارسیدا بە شووڵ دەگوترێ ترکە tarake (P.) کە لە دوو کەرتی -tar "دار" و ake "پاشگری گچکاندن" پێک هاتووە و دە بنەڕەتدا دەبێتە "دارۆکە"ی کوردمادی].

**شوولاندن şûlandın** [ *šūlāndın* ] - "سک چوون، بەڵەفیرە": دەبێ لە ↑شل şıl "رەوان"ەوە هاتبێ.

**شوولکاندن şûlkandın** [ *šūlkāndın* ] - "خۆ لە کار دزینەوە، بۆی دەرچوون": دە ئەسڵدا بە مانای "خوشین" بوون واتا بە خشکەیی بۆی دەرچوون لە ژێر ئەرک و کار. خزمە دەگەڵ ↑شێلهان şêl(e)han "راخوشین".

**شوولەکە şûleke** [ *šūlaka* ] - "توورەکە": خزمە دەگەڵ ↑شۆلە şole "جەواڵ".

**شووم şûm** [ *šūm* ] - "نەگریس، بێفەڕ": بە لەبەر چاو گرتنی ئەوە کە هەر لە کۆنەوە رەنگی رەش و تاریک بە نیشانەی نەهامەتی، نەکبەتی و چارەرەشی زانراوە [هەڵی سەنگینە دەگەڵ وشەی چارەرەش]، دەبێ وشەکە پێوەندی هەبێ بە ↑شێو şêw [شام şam] "کاتی تاریکان".

**شۆبە1 şobe** [ *šoba* ] - "بوورانەوە، لە هۆش چوون": خزمە دەگەڵ schwabbeln (G.) "تەق و لەق بوون، بە لادا هاتن، بەم لا و ئەو لادا لەرینەوە" و schwappen (G.) "هەڵچوونی تراو، بەم لا و ئەو لادا، جووڵانی تراو". ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە دیاری نەکراوە.

**شۆبە2 şobe** [ *šoba* ] - "جانەورێکی وردی رەشە بە گەزووی دارەوە دەنووسێ و خراپی دەکا": خزمە دەگەڵ Schabe (G.)، schabe (MG.)، ma lsceafe (OE.) "جۆرێک مۆرانە". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schaben (G.) و ↑ساوین sawîn سەر بە ریشەیەک بە مانای "کڕاندن، رێخشاندن، رووشاندن، ساوین".

**شۆپ şop** [ *šop* ] - "رەد، شوێن پێ": هاوریشەیە دەگەڵ şpur (G.)، spor (OG.)، spoor (Nl.)، spar (Sw.) "شۆپ، شوێن پێ"، سەر بە ریشەی < *sper- (IE.) "پێ لێنان، پێ لەسەر دانان".

**شۆپاندن şopandın** [ *šopāndın* ] - "رەد هەڵگرتن، دواکەوتن": ↑شۆپ şop.

**شۆخی şoxî** [ *šoxī* ] - "جەفەنگ، حەنەک، گاڵتە": شوخی šūxī (P.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ Jux (G.)، joke (E.)، jeu (OF.)، iocus (L.) "شۆخی، حەنەک". وشە ژێرمەنییەکان لە وشە لاتینیەکە

وەرگیراون. هەروەها دە زمانی کوردمادی و فارسیدا شۆخ şox [شوخ šūx (P.)] بەمانای "قسەخۆش، سەرزیندوو" بەکار دێ.

**شۆڕ şor** *[ šor ]* - "شل، داهێڵراو": خزمە دەگەڵ ↑شل şıl [şol (P.)] سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)leb- >* "شل، شۆڕ بوونەوە". شۆڕ بوونەوە پێوەندی تەواوی بە چەمکی "شلی"یەوە هەیە و هەردووک وشەی "شل" و " شۆڕ" دە بنەڕەتدا یەک وشە بوون و پاشتر دوو وشە بە دوو مانای جیاوان، بەڵام لێک نیزیک پێک هاتوون. هەروەها مەبەست لە "شۆڕەژن" دەبێ دە بنەڕەتدا ژنی شل و مل و بەژن زراڤ بووبێ. وشەکە خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑شلێرە şılêre [گولێک کە سەری شۆڕ دەکاتەوە] و هتد.

**شۆڕان şoran** *[ šorān ]* - "راپەڕین بە تووڕەیی": شوریدن šūrīdan (P.) "راپەڕین". خزمە دەگەڵ ↑شووڕ şûr [شەڕ و شووڕ].

**شۆرباو şorbaw** *[ šorbāw ]* - "چێشتی تراو": ئەم وشەیە پێوەندی بە "شۆر" واتا "سوێر"ەوە نییە، چونکوو ئەگەر وابا، دەکرا زۆر بە هاسانی بگوترێ "شۆراو"، نەک "شۆرباو". بوونی فۆتیمی b نیشان دەدا کە وشەکە پێوەندی بە شتێکی دیکەوە هەیە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ schlürfen (G.)، slorpen (NL.)، slurpe (Norw.) "هەڵقوڕاندن". ئەم وشەیە دە ئەڵمانی ناویندا شێوەکەی بریتی بووە لە sür(p)feln (MG.). ئەم شێوەیە دەگەڵ کەرتەوشەی شۆرب -şorb دە وشەی شۆرباو şorbaw دا بەتەواوی یەک دەگرێتەوە. بەگوێرەی بۆچوونێک ئەم وشە ژێرمەنییە دەچێتەوە سەر ریشەی *< *srbh- (IE.)* "هەڵقوڕاندن". کەرتی دووەمی وشەکە دەشێ هەمان ↑ئاو aw بێ و مانای تێکرای وشەکە دەبێتە ئاو یاخود تراو بۆ هەڵقوڕاندن.

**شۆردن şordın** *[ šordın ]* - "شوشتن، شوتن، خاوێن کردنەوە بە ئاو": می شورم mi šūram (P.) "دەشۆم، دەشۆرم". دە زمانی کوردمادی و فارسیدا شوشتن şûştın و شستن şostan (P.) یش دەگوترێ، بەڵام رەگی ئەم کردارانە، واتا -şûş / -şos تەنیا بۆ کرداری رابردوو بەکار دەهێنرێ: شوشتم şûştım و شستم şostam (P.). روون نییە کە ئایا لێرەشدا وەک چەندین کرداری دیکە دە بنەڕەتدا دوو وشەی هاوشێوە لە گۆڕێدا بووبن کە پاشان تێکەڵ بە یەکدی بووبن و بنجی یەکیان لە کرداری کاتی رابردوودا پارێزرابێ. بە هەرحاڵ بنجی شۆر -şor جێ بەرهەڤ کردنە دەگەڵ scheuern (G.)، schiuren (MG.) "پاک کردنەوە، خاوێن کردنەوە" (بە رێخشاندن و سوانەوە). ریشەی ئەم وشە ژێرمەنییە یەکلا نەکراوەتەوە. شیمانە دەکرێ بچێتەوە سەر زمانی فەرانسەیی کۆن، واتا escurer (OFr.) "سوانەوە، رێخشاندن" و دواتریش *excurare** لە زمانی ئاخافتنی لاتینیدا.

**شۆرش şorış** *[ šorıš ]* - "راپەڕین": لە زمانی فارسی وەرگیراوە، دەچێتەوە سەر شورش *šūreš (P.)* سەر بە کرداری شوریدن šūrīdan (P.) "راپەڕین، وە خۆ کەوتن". خزمە دەگەڵ ↑شۆڕان şoran "راپەڕین (بە تووڕەیی)" و ↑شووڕ *şûr* [شەڕ و شووڕ]

**شۆرەکات şorekat** *[ šorakāt ]* - "شۆرەزار، زەوی سوێر و بێ رووەک": پێک هاتووە لە دوو وشەی شۆر şor + کات kat. کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑سوێر suwer [سۆر sor]. کەرتی دووەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑قاد qad "زەوی".

**شۆسە şose** *[ šosa ]* - "جادەی خۆشکراو": شۆستە şoste ش دەگوترێ. شوسە şose (P.) < *chaussée* *(Fr.)* "شەقامی پێدا ئاژۆتن، سەنگچنی شەقام". ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ calx (L.) "کڵس، قسڵ، بەردی کلس" و chálix (Gr.) "خیز، بەرد، بەردی کلس".

**شۆڤار şovar** *[ šovār ]* - "جاسووس، سیخوڕ": خزمە دەگەڵ spehari (OG.)، Späher (G.)، spy (E.)، spion (It.) "شۆڤار"، spähen (G.) "بە دزی لێ ڕوانین، شۆڤاری کردن"، spektesthai (Gr.) "چاو لێکردن، سەرنج دان"، سەر بە ریشەی *< *spek- ( IE. )* "بەوردی لێ ڕوانین".

**شۆق1 şoq** *[ šoq ]* - "رووناکی": شێوەیەکی دیکە لە ↑شەبەق şebeq.

**شۆق2 şoq** [ *šoq* ] - "شۆق وەشاندن واتا بە سەر تیهەڵدانی ئاژەڵ": ↑شەقۆن şeqon یش دەگوترێ. دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑شاخ şax "قۆچی ئاژەڵ".

**شۆک şok** [ *šok* ] - "1- گەزووی مازوو 2- شیرەی ترێ": خزمە دەگەڵ ↑شفت şıft "دۆشینی شیر"، سەر بە ریشەی **(IE.) *seu- >** "دۆشین، دوشاو گرتن، شیرە گرتن". دە پلەیەکی دوورتردا لەوانەیە ببێتە خزم دەگەڵ ↑ژەک jek "شیری دوا بەدوای زان".

**شۆلک şolık** [ *šolık* ] - "رەشکە": خزمە دەگەڵ ↑ شۆلە şole "جەواڵ".

**شۆلە şole** [ *šola* ] - "جەواڵ":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شاڵ şal "پەڕۆی چنراو".

2- لەوانەشە شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑جەواڵ cewal [جواڵ cuwal].

**شۆڵە şole** [ *šola* ] - "راخوشینی ئەستێرە": خزمە دەگەڵ ↑شێلهان şêl(e)han "راخوشین".

**شۆ(م) şo(m)** [ *šom* ] - "زەوی کێڵدراو": خزمە دەگەڵ ↑شێ şê، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشین، لێک جودا کردنەوە". دە فارسیدا دەبێتە شخم šoxm (P.).

**شۆنک şonık** [ *šonık* ] - "سوێنە": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑سوێنە suwene و دەچێتەوە سەر کرداری ↑ساوین sawîn.

**شهین şıhîn** [ *šıhīn* ] - "1- حیلاندن 2- خوێندنی کەڵەشێر 3- کۆخین": شیهە šīhe (P.) "حیلەی ئەسپ". خزمە دەگەڵ زیقە و ↑زیقاندن zîqandın.

**شە şe** [ *ša* ] - "1- شانە 2- شەنە 3- دەفەی جۆڵایی": شەه şeh و شەهن şehn یش دەگوترێ:

1- دەتوانێ کورتکراوی ↑شانە şane بێ.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑شێ şê و شی şî کردنەوە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "(لێک) جودا کردن(ەوە)".

**شەب şeb** [ *šab* ] - "زاخ، بەردێکی سپی": خزمە دەگەڵ ↑سەپتک septık "بەرد"، ↑زۆپ zop "گاشەبەرد"، ↑سیپان2 *sîpan* و دواجار ↑سفت sıfıt.

**شەباک şebak** [ *šabāk* ] - ↑شەبەق şebeq.

**شەبکین şebkîn** [ *šabkīn* ] - "شەلینی کەم": هەروەها شەبک şebık هەیە بە مانای "کەسێک کە تۆزێک دەشەلێ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ schwanken (G.) "بەم لا و ئەو لادا لار بوونەوە، لاترە دان"، svangr (OIs.) و svancor (OE.) "شلک" [شتێک کە بە هاسانی بەم لا و ئەو لادا با دەدرێ]. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑جمین cımîn.

**شەبۆت şebot** [ *šabot* ] - "درێژترین ماسوولکە لە لەشی جانەوەردا": خزمە دەگەڵ ↑زیپەر zîper "ماسوولکە" و دواجار ↑*سفت sıfit*.

**شەبەق şebeq** [ *šabaq* ] - ↑شەباک şebak و شوق şewq و ↑شۆق şoq یش دەگوترێن. ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ spectrum (L.) "وێنە". ئەم وشە لاتینییە دە زمانەکانی ئەورووپیدا مانای "تەیف، شەبەنگ" دەدا، دەچێتەوە سەر spectare (L.) "روانین، چاوەدێری کردن" و specere (L.) "دیتن". هەروەها speculum (L.) "ئاوێنە" پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە. وشەی ↑شەبەنگ şebeng یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و فۆتیمی n وەک زێدە خزاوەتە ناو وشەکەوە.

[تیبینی: دە زمانی کوردمادیدا ئەو چەند وشەیەی لەم پێوەندییەدا جێ دەگرن، سێ چوار مانای نیزیک لە یەکدی دەبەخشن. "شەبەق" بە مانای رووناکی ئاسۆ، تیشکی سەرەتایی هەتاو بەکار دێ. هەروەها "شەبەق تیکەوتن" بە مانای کون بوونی دیوار و کالا دێ. دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە بەو کونەدا تیشک تیپەڕ دەبێ. جگە لەمە "شەباقە" بە دەلاقەی ناو دیوار دەگوترێ کە رووناکایی دێتە ژوورەوە. "شەوق" یان "شۆق" بەگشتی بە مانای "تیشک، رووناکی" بەکار دێ. "شەباک" مانای تیشکدانەوە دەدا.

”شەبەک“ بە پەنجەرەی سەر چاك و پیران دەگوترێ. دە زمانی فارسیدا شفق šafaq (P.) هەیە بە مانای ”تیشکی بەیانی زوو و تیشکی سووری بەر لە خۆرئاوا“. وەك دەبینین چەمکی هاوبەش لەم مانایانەدا تیشك و رووناکییە. خاڵێکی دیکەی جێگای سەرنج ئەوەیە کە دە زمانی عەرەبیدا بە پەنجەرە دەگوترێ شباك šabāk (Arb.). دیارە ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی دیکەوە هەیە و مەبەست دە ئەسڵدا ئاماژە کردن بە رووناکییە کە بە پەنجەرەدا دێتە ژوورەوە]. دەشێ دە زمانی عەرەبیدا شبكة šabaka (Arb.) پێوەندی بەو وشانەی سەرەوە هەبێ.

**شەبەنگ şebeng** [ *šabang* ] - ”تەیف، کۆتیشك“: بڕوانە ↑شەبەق şebeq.

**شەپ şep 1** [ *šap* ] - ”لێدان بە لاق“: خزمە دەگەڵ Schub (G.) ”پاڵ، گوشار“ [پێشتر schupp (G.) یش بە مانای ”پاڵ نان، لێدان“ بەکار هاتووە]، schieben (G.)، shov (E.)، skiuban (Gt.)، skyve (Norw.) ”پاڵ پێوەنان، ڕادان“، سەر بە ریشەی *(IE.) *skeu(h)- >* ”هاویشتن، (رە)پاڵ نان، ڕادان، دەرپەڕاندن“. Schaufel (G.) ”پێمەڕە، خاکەنداز“ و Schippe (G.) ”پێمەڕە، بێڵ“ پێوەندییان بە وشەکانی سەرەوە هەیە. دە زمانی کوردمادیدا گەلێك وشە بە مانای دوور و نیزیك لەیەکدی، خزمایەتییان دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەیە، وەك ↑شفرە şıfre ”پێمەڕە، کەڵپی ئاژەڵ“، ↑شەپڵتە şepılte ”بەفرماڵ، وەرووەرە“، ↑شەپل şepıl ”ئامرازێك گاسنی پێدادەگرن تا قووڵتر بیکێڵێ“، ↑شەپڵی شەپان şeplîşepan ”گەمەی هەڵاویشتن و گرتنەوەی شت“، ↑چاپ çap، ↑چەپە çepe ”سەوڵی بەلەم لێخوڕین“ [دەبنەڕەتدا: ئاوڕادەر]↑سەپاندن sepandın ؟، ↑چەپاو çepaw ”تاڵان“. هەروەها دە پلەیەکی دوورتر دا دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شاخ şax ”قۆچی ئاژەڵ“، ↑شات şat، ↑زەخت zext ”نەقیزە“، ↑سووچ suç ”گۆشە“، ↑چوخساندن çûxsandın ”دەرپەڕاندن“ و ↑چووزە çuze و هتد.

**شەپ şep 2** [ *šap* ] - ”داهێڵراو، داهاتوو“: [شەپ و شۆڕ واتا شۆڕەوە بووی نارێك و پێك]. مانای ئەسڵی وشەکە ”خوارەوەبوو، بادراو“ە. خزمە دەگەڵ ↑چەپ çep.

**شەپاڵ şepal 1** [ *šapāl* ] - ”جوان، خۆشیك“: خزمە دەگەڵ ↑سپەهی sıpehî [دە فارسیدا زیبا zībā (P.)].

**شەپاڵ şepal 2** [ *šapāl* ] - ”بەچکەشێر“: خزمە دەگەڵ ↑سەواڵ sewal.

**شەپك şepık 1** [ *šapık* ] - ”تەختەی ساف و لووس کردنی ئامانی تازەی گڵین“: شەپکە şepke ش دەگوترێ:

1- یان خزمە دەگەڵ ↑*ساوین sawnî* ”سوونەوە، رێخشاندن“ و ↑هەشافتن heşaftın ”بن قوڕ دان“ [he-şaftın].

2- یان خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ *şep 1* و ↑شفرە şıfre دا هاتوون، سەر بە ریشەیەك بە مانای ”لێدان، (رە)پاڵ نان، رادان“.

**شەپك şepık 2** [ *šapık* ] - ”تەختەیەك بۆ توند کردنی کەژوو لە دەمی چنیندا“: شەپکە şepke ش دەگوترێ: بڕوانە ↑شەپك şepık 1.

**شەپك şepık 3** [ *šapık* ] - ”ئێسکی شان“: زۆرتر دەگەڵ ”شان“ دێ: شان و شەپك şan û şepık یان شەپکەشان şepkeşan. ↑شەپیلك şepîlk یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بە scapula (L.) ”ئێسکی شان“. دەنگی -sc دە زمانی کوردمادی و هەروەها دە زمانی ئەڵمانیشدا دەگۆڕدرێ بۆ ş. دە زمانی کوردمادیدا زۆرتر دەگۆڕدرێ بۆ s.

2- دە زمانی کوردمادیدا چەند ئامێرێك هەن کە ناوەکانیان خزمن دەگەڵ یەکتر، وەکوو ↑شەپك şepık 1. ئەم ئامرانە بریتین لە ئاسن یان تەختەیەکی پانکەڵە. لەبەر ئەوەی ئێسکی شان پارچەیەکی تەخت و پانە، دەشێ بەو ئامرازانە شوبهێندراوە.

[تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیشدا وشەی Schulter (G.) ”شان، شەپیلك“ دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای ”بڕین“ و خزمە دەگەڵ skállein (Gr.) ”هەڵکەندن“ و skelís (Gr.) ”درمغ، شەپنە“ و دەگەڵ چاڵ çal ی

کوردمادی. دە زمانی ئەڵمانیدا لەبەر وێکچوونی ئێسکی شان بە شفرە و پێمەڕە ناوەکەی بۆ ناوی ئامێرەکە دەگەڕێتەوە].

**شەپکە şepke** [ *šapka* ] - "کڵاوی لبەدار": شەپقە şepqe و شەبقە şebqe ش دەگوترێن. شاپو şāpū (P.). لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑سابات sabat "کەپر"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "چنین، تەنین".

**شەپل şepıl** [ *šapıl* ] - "ئامرازێک گاسنی پێ دادەگرن تا قووڵتر بیکێڵێ": خزمە دەگەڵ ↑شەپ[1] şep.

**شەپڵاغە şeplaġe** [ *šaplāġa* ] - "زللە":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "دەست، بەری دەست" دەبەخشن، وەك ↑چەپ[2] çep، ↑چەپڵە çeple، ↑چەپۆك çepok.

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑شەپ[1] şep "لێدان".

**شەپلان şeplan** [ *šaplān* ] - "پەشێو بوون، بێ سەرە و بەرە بوون": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەشەپلان veşeplan]. هەروەها ڤەشەپلاندن veşeplandın هەیە بە مانای "پەشێو کردن". خزمە دەگەڵ ↑شپڕێو şıprêw.

**شەپڵتە şepılte** [ *šapılta* ] - "بەفرماڵ، وەروەرە": خزمە دەگەڵ ↑شەپ[1] şep.

**شەپڵۆر şeplor** [ *šaplor* ] - "نەخۆشییەکە وەك سوورێژە وایە لە گەرما و سەرماوە پەیدا دەبێ": خزمە دەگەڵ ↑زیپکە zîpke.

**شەپڵە şeple** [ *šapla* ] - "گۆجی، فەلەجی": خزمە دەگەڵ ↑چەپ çep کە دە ریشەدا مانای "خوار" دەدا. بەم پێیە "شەپڵە" دەبێتە "خواروخێچ" بوونی ئەندامەکان.

**شەپلیشەپان şeplîşepan** [ *šaplīšapān* ] - "بە لەپی دەست گەمە بە شتێک کردن، هەڵاویشتن و گرتنەوەی":

1- یان خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی مانای "دەست، بەری دەست" دەبەخشن، وەك ↑چەپ[2] çep، ↑چەپڵە çeple، ↑چەپۆك çepok.

2- یان دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شەپ[1] şep "لێدان"، سەر بە ریشەیەك بە مانای "لێدان، پاڵ نان، رادان، هاویشتن".

**شەپنە şepne** [ *šapna* ] - ↑شفنە şıfne.

**شەپنی şepnî** [ *šapnī* ] - "خەتاکار": [ئەز شەپنیمە، تە من ببەخشە]. خزمە دەگەڵ ↑چەپ1 *çep 1* و ↑چەوت çewıt "بەرانبەری راست". دە ئەسڵدا مەبەست ئەوەیە کە کەسێک کارەکەی چەوت و نەڕاستە.

**شەپۆڕ şepor** [ *šapor* ] - "شیوەن بە دەنگی بڵیند": خزمە دەگەڵ ↑شیپۆڕ şîpor بەمانای "گوڕڕە و هەڕای بە توورەیی" و ↑شیپە şîpe "حیلەی ئەسپ". دە زمانی فارسیدا شیپور šeypūr (P.) هەیە بە مانای "ترۆمپێت". ئەم وشانە جێی بەرهەڤ کردنن دەگەڵ ↑چپە çıpe. پێوەندی دوو وشەی "شەپۆڕ" و "چپە" دەتوانێ وەك هی "نارین" و "نەڕڕاندن" بێ.

**شەپۆکان şepokan** [ *šapokān* ] - "پەشۆکان، سەر لێ تیکچوون، وڕ بوون": خزمە ↑چەپ1 *çep 1* "بەرانبەری راست" [خوار، بادراو، چەپ و چیڕ]، سەر بە ریشەی ***skeip-** > **(IE.)*** "خوار، بادراو، چەپ". هەروەها خزمە دەگەڵ ↑وەرچەپین werçepîn "لە رێ لا دان، رێگە خوار کردن"، چپە شدن čape šodan (P.) "وەرگەڕان(ی ئوتۆمبێل)"، ↑شەفت şefıt [چەفت çeft، چەوت çewt]، ↑چەوێل çewel "خوار، گێڕ". شەپۆکان بریتییە لەوە کە دۆخی دەروونی مرۆڤ لە شێوەی راست و هەمواری خۆی لا دەدا و وەردەگەڕێ. جێی ئاماژەیە کە لەم وشانەی خوارەوەشدا چەمکی "خوار، بادران و ناراست بوون" خۆی حەشار داوە: وڕ بوون، شێوان، کاس بوون، گێژ بوون و هتد. هەروەها لەوانەیە ↑شێوان şêwan [اشفتن a-šoftan (P.)] پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**شەپۆل şepol** [ *šapol* ] - "پێل، مەوج": شەپێل şepêl یش دەگوترێ. دە شێوەزاری کوردمادی سەروودا وشەی "پێل" بەم مانایە بەکار دێ کە خزمە دەگەڵ وێل، *وڵین* "تێکوشین"، *وەلەک2* "گێژەڵووکە، کرێوە"، *وەلوەلە* "شلووقی، ئاڵۆزی، ئاژاوە" و هیتر سەر بە ریشەیێک بە مانای "سووڕان، با دران". بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە باوە، کە دەڵێ "شەپۆل" یان "شەپێل" بە مانای "پێل، پۆلی مەزن"ە و دەبێتەوە خزم دەگەڵ وشەکەی شێوەزاری سەروو، وا پێ دەچێ کە ئەم وشەیە سەر بە ریشەیەکی دیکە بێ و خزم بێ دەگەڵ ↑شەپۆکان şepokan "پەشۆکان، سەر لێ تێکچوون، وڕ بوون"، سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار، بادراو، وەرسووڕاو".

**شەپە şepe** [ *šapa* ] - "خشە": خزمە دەگەڵ ↑چپە çıpe.

**شەپیتە şepîte** [ *šapīta* ] - "ئامرازێکی جۆڵایی، تیوەدانی پێ سفت دەکرێ":

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سفت *sıfit* و ↑شەبۆت şebot.

2- لەوانەشە پێوەندی بە ↑شەپ[1] şep "لێدان"ەوە هەبێ.

**شەپیلک şepîlk** [ *šapīlk* ] - "ئێسکی شان": پێوەندی هەیە بە scapula (L.) "ئێسکی شان". spalla (It.) "شان" دەبێ پێوەندی بەم وشە لاتینییەوە هەبێ. هەروەها بڕوانە ↑شەپک3 şepık.

**شەت1 şet** [ *šat* ] - "قیلەوقاچ بڕاو": هەروەها دەگەڵ پەت pet دێ [شەت و پەت şet û pet واتا لەت و کوت]. خزمە دەگەڵ ↑کەت ket و ↑کوت kut "بڕ، بڕاو، لەت".

**شەت2 şet** [ *šat* ] - "مووی ساف": خزمە دەگەڵ ↑سادە sade.

**شەترەنج şetrenc** [ *šatranj* ] - "جۆرێک کایەی سەر تەختەیە، شا لە پشتەوە خۆی شاردۆتەوە و سەرباز لە پێشەوە شەڕی بۆ دەکەن": وەک لە هێندێک جێگەدا باس کراوە، وشەکە پێک هاتووە لە دوو وشەی شەت şet + رەنج renc .کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ↑شەش şeş. کەرتی دووەم شێوەی گۆڕدراوی ↑رەنگ reng ە و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە "شەشرەنگ". مەبەست لەم وشەیە ئاماژە کردنە بە ژمارەی فیگۆر و پەیکەرەکانی ئەم گەمەیە کە لە شەش جۆر پێک هاتوون، واتا شا، وەزیر، فیل، ئەسپ، قەڵا و سەرباز.

**شەتری şetrî** [ *šatrī* ] - "ریزەگوڵینگەی سەر و پۆڕ": خزمە دەگەڵ سیتکە sîtke یان ↑سیچکە sîçke "خونچە".

**شەتە şete** [ *šata* ] - "پەتای گیا": خزمە دەگەڵ ↑چەتە çete.

**شەتەک şetek** [ *šatak* ] - "بەستنی توند": خزمە دەگەڵ هێندێک وشەی وەک ↑شیتک şîtık یان شووتک şûtık "کەمەربەند"، ↑سدە sıde "تاڵ، بەن"، ↑سیتە sîte "پۆ" [تان و پۆ]، ↑سێتە sete "تەپکە، داو"، ↑شەتەن şeten "تەناف"، سەر بە ریشەی *sei- >* (*IE.*) "بەستن، بەستنەوە، لێکبەستن". ئەم وشانە بەرهەڤ بکە دەگەڵ Saite (G.) و sāda (OE.) "ریس، گوریس، بەند". شد šada (Arb.) "بەستن، بەستنەوە" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە و لەوانەشە لە زمانی کوردمادی وەرگیرابێ.

**شەتەن şeten** [ *šatan* ] - "تەناف": خزمە دەگەڵ ↑شەتەک şetek.

**شەحنە şeĥne** [ *šaĥna* ] - "داڕۆغە": لەوانەیە پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە، سەر بە ریشەیەک بە مانای "سەخت، بەهێز".

**شەختە şexte** [ *šaxta* ] - "سەرمای سەخت": خزمە دەگەڵ ↑سەخت sext و ↑سەق *seq*.

**شەخسان şexsan** [ *šaxsān* ] - "رەنگ پەڕین لەبەر نەخۆشی": خزمە دەگەڵ siech (G.)، siuks (Gt.)، sick (E.)، sjuk (Sw.) "نەخۆش"، siuchan (OG.)، siukan (Gt.) "نەخۆش کەوتن". دەشێ وشەکانی ↑زیز zîz، ↑سیس sîs و ↑ژاکان jakan پێوەندییان بەم وشانەوە هەبێ.

**شەخف şexıf** [ *šaxıf* ] - "سواخ دانی بان": خزمە دەگەڵ ↑ساوین *sawîn* و ↑سواخ suwax و تیهەڵسوون tehelsun.

**شەدە şede** [ *šada* ] - "سەرپێچی ئاوریشمین":

1- جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑شەتەک şetek "بەستنی توند".

2- هەروەها جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ (G.) Seide، (OG.) sida، (It.) seta، (Sp.) seda "ئاوریشم". ئەم وشە ئەورووپییانە دەچنەوە سەر (ML.) seta. ریشەی وشە لاتینییەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. گومان دەکرێ پێوەندی بە (L.) saeta "موو، فلچە"ەوە هەبێ.

**شەڕ1 şer 1** [ *šar* ] - "کێشە، جەنگ": خزمە دەگەڵ (G.) Heer، (OG.) heri، (OE.) here، (Sw.) här "سوپا، هێزی شەڕکەر". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ (Lit.) karas "شەڕ" و (OP.) kara "هێزی شەڕکەر"، سەر بە ریشەی *(IE.) *koro-s >* "شەڕ".

**شەڕ2 şer 2** [ *šar* ] - "لەت": دەگەڵ "نخۆ" دێ [نخۆشەڕ nıxoşer واتا "لەتەنۆک"]. خزمە دەگەڵ ↑شڕ şır.

**شەرا şera** [ *šarā* ] - "بای گەرمی زیانبەخش بە بێستان": خزمە دەگەڵ ↑شاریان şarîyan "گەرم داهاتن".

**شەربە şerbe** [ *šarba* ] - "دەفری ئاوخواردنەوەی گڵین": هاوریشەیە دەگەڵ (G.) Scherbe "لەتە سواڵەت"، (OG.) scribi "سواڵەت، دەفری لە سواڵەت"، سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)ker- >* "لەت کردن". (OIn.) Karparah "سواڵەت، کاسە(ی سەر)"، (Ukr.) čerep "کاسەی سەر" دەگەڵ وشە ژێرمەنییەکە بەرهەڤ دەکرێن. وشەی ↑هیربار hîrbar "قاپ و قاچاخ"یش پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشەی دوایی بەتایبەتی هەڵسەنگینە دەگەڵ (OIn.) Karparah "سواڵەت، کاسە(ی سەر)".

**شەردین şerdîn** [ *šardīn* ] - "ئاوارە بوون، بڵاڤ بوون": هەروەها ↑شرت şırt هەیە [شرت و گوم بوون şırt û gum]. دەشێ خزم بێ دەگەڵ (G.) schreiten، (OG.) scrītan، (Nl.) schrijden، (OE.) scriđan "رۆیشتن، بەرەو پێش چوون، خوشین"، (Lit.) skriesti "سووڕانەوە"، (Lit.) skrieti، (Sw.) skrida "راکردن، فڕین"، سەر بە ریشەی *(IE.) *(s)ker- >* "سووڕان، چەمانەوە".

**شەرم şerım** [ *šarım* ] - "حەیا، فەدی": شرم (P.) šarm. خزمە دەگەڵ (E.) harm، (OG.) harm، harmr (ONr.) "رەنج، خەم و خەفەت"، (OSlav.) sramŭ "شەرم" [بڕوانە فەرهەنگی ئێتیمۆلۆژی ئینگلیزی Oxford].

**شەز şez** [ *šaz* ] - "قرنوو": ↑زچ zıç یش دەگوترێ.

**شەست1 şest 1** [ *šast* ] - "قامکەگەورە": شست (P.) šast. ناوی ئەم قامکە دە زمانی ئەڵمانیدا خزمە دەگەڵ وشەکانی *تاو* "هێز، گوڕ" و *توانین* دە زمانی کوردمادیدا [بڕوانە *تبل* "قامک"]. وەک دەبینرێ پێوەندییەک لەنێوان ئەم دوو چەمکەدا هەیە و ئەوەش بریتییە لەوە کە ئەم قامکە قەڵەو و بەهێز و ئەستوورە. ریشەی وشەکان ئەم مانایانە بە دەستەوە دەدا: "ماسین، ئەستوور بوون، بەهێز بوون". ئێستا ئەگەر سەرنجی وشەی ↑شەست2 şest "رێژنەبارانی توند" [شەستەباران، *تاوەباران*] بدەین، دەبینین کە هەمان پێوندی لەنێوان قامکی شەست و شەستەباراندا لەئارا دایە، واتا هەر دووک وشە ئاماژە بە "هێز، خوڕ، گوڕ، تاو" دەکەن.

**شەست2 şest 2** [ *šast* ] - "رێژنەبارانی توند": [شەستەباران، تاوەباران]. وەک دەبینرێ شەست بە مانای "تاو"ە، واتا "هێز، گوڕ، خوڕ" و ئاماژە بە باراتیکی (بە) خوڕ و بەهێز دەکا. لەژێر وشەی ↑شەست1 şest "قامکەگەورە"دا پێوەندی ئەم چەمکانە باس کراوە. ئەم وشەیە دەشێ دەگەڵ ئەو وشانە خزم بێ کە لەژێر ↑سەق seq دا شی کراونەوە، بە مانای "سەخت، بەهێز".

**شەش şeş** [ *šaš* ] - "دووجار سێ": شش (P.) şêş، (Av.) xšvaš، (G.) sechs، (E.) six، (L.) sex، (Gr.) hex، (Lit.) šeši، (OIn.) şaş سەر بە ریشەی *(IE.) *seks- >* "شەش".

**شەعر şeεır** [ *šaεır* ] - "دەسرۆکەی سەر": دەشێ شێوەیەکی دیکە بێ لە ↑چار çar [چارۆکە]. بڕوانە ↑چادر çadır.

**شەعن şeɛın** [ *šaɛın* ] - "بزنی بەڵەک": خزمە دەگەڵ schenen (G.)، scīnan (OG)، skeinan (Gt.)، shine (E.)، skina (Sw.) "بە دیار کەوتن، درەوشان". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑سێ *se* [سێبەر]، سەر ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوەی کز، بە دیار کەوتن، دەرکەوتنێکی سایەئاسا". دواتر خزمە دەگەڵ ↑شانۆ şano.

[تێبینی: وشەی "بەڵەک"یش خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە، بریقانەوە"].

**شەفت şefit** [ *šaft* ] - "چەفت، چەوت، خوار": شێوەیەکی دیکە لە ↑چەوت çewıt. هەروەها شەڤ şev یش هەیە بە مانای "لار، چەوت، خوار".

**شەڤارە 1 şevare 1** [ *šavāra* ] - "خەڵفی تازە": خزمە دەگەڵ شەڤ şev و ↑شەفت şefit "چەفت، چەوت، خوار، لار". شەڤارە ئەو خەڵفەیە کە لە بەر تازە بوونی بە هاسانی (لە بەر با) دەچەمێتەوە و دەلەرێتەوە.

[تێبینی: لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ دوو وشەی "نەمام" و "لاوێن" کە ئەوانیش مانای "تازەخەڵف" دەبەخشن و ماناکانیشیان بۆ چەمانەوە و لەرانەوە دەگەڕێنەوە].

**شەڤارە 2 şevare 2** [ *šavāra* ] - "زۆر درێژ": ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑گەورە gewre و دەشێ شێوەیەکی کۆنتری وشەکە بێ. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ schwer (G.)، swar (OG.)، svar (Sw.)، svarus (Lit.) "گران، گرینگ، دژوار". ئەم مانا کۆنە دە زمانی کوردمادیدا پەرەی گرتووە و وشەکە مانای "مەزن"یشی وەرگرتووە و هەروەها مانای "زۆر درێژ".

[تێبینی: پێوەندی نیزیک هەیە لە تیوان دوو چەمکی "مەزن" و "درێژ"دا. بۆ وێنە دە زمانی ئەڵمانیدا groß "مەزن" هەم بۆ مرۆڤی "گەورە و گرینگ" بەکار دێ و هەمیش بۆ مرۆڤی "باڵابەرز"].

**شەڤشەڤۆک şevşevok** [ *šavšavok* ] - "شێوەیەکی دیکە لە ↑شەڤرەڤیک şevrevîk "شەمشەمەکوێرە".

**شەق[1] şeq** [ *šaq* ] - "لێدان بە پێ":

1- لەوانەیە دە بنەڕەتدا مانای "پێ، لاق" ببەخشێ و پاشان ماناکە بووبێتە "لێدان بەپێ". ئەم مانایە دە چەندین وشەدا پارێزراوە، وەک ↑شەقاو şeqaw "هەنگاو"، ↑شەقام şeqam، ↑شەقاڵ şeqal "پێڵاوی بە موو چندراو"، ساق saq (P.) "لای خوارەوەی لاق" و ↑چۆک çok "ئەژنۆ" و چەند وشەیەکی دیکە کە لەژێر وشەی ↑زەنگاڵ *zengal* دا باس کراون.

[تێبینی: وشەی شەق بە مانای "لێدان بە پێ" هەڵسەنگینە دەگەڵ لگد leged (P.) "شەق" کە دە بنەڕەتدا هاوریشەیە دەگەڵ "لاق"].

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ چک čak (P.) "زللە" و ↑چەک çek "سیلاح". ئەم وشەیە دەشێ لە ریشەیەکەوە هاتبێ بە مانای "لێدان"، هەر وەک چۆن وشەی "زللە"ش بۆ ریشەیەک دەگەڕێتەوە کە هەمان مانا لە خۆ دەگرێ].

**شەق[2] şeq** [ *šaq* ] - "1- لەبەریەک کێشراو، راست، بێ گنج 2- سەخت، توند": مانای دووەم دە وشەکانی کەللەشەق kelleşeq "سەرسەخت" و ↑شەقەزللە şeqezılle "زللەی توند و سەخت"دا بەدی دەکرێن. ئەم دوو مانایە دە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیک دەگەڵ یەکتر دان. دە راستیدا مانای دووەم مانا بنەڕەتییەکە پێک دێنێ، چونکوو ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردمادی کە لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون و مانای "سەخت، بەهێز" دەردەبڕن. مانای "ساف و بێ گنج" لێرەوە پەیدا بووە کە بە هۆی لەبەر یەک کێشانەوەی شتێک، بۆ وێنە پارچەیەک، ئەو شتە لە دۆخی شل و شەوێقی دەردەچێ، دۆخێکی توند و سفت پەیدا دەکا و بەم هۆیەشەوە گنج و لۆچی تێدا نامێنێ و شەق دەبێ.

[تێبینی1: پێوەندی ئەو دوو مانایەی سەرەوە دەتوانین دە دوو وشەی ئەڵمانی spannen (G.) "لەبەر یەک کێشانەوە" و gespannt (G.) " گرژ، توند" [دە بنەڕەتدا: لەبەریەک کێشراو]دا بەدی بکەین. وشەی

دووەم لە هی یەکەم وەرگیراوە. شیاوی باسە کە spannan (OE.) بە هەر دوو مانای "لەبەر یەك کێشانەوە" و "توند کردن، قایم کردن" بەکار هاتووە. تێبینی 2: دە زمانی ئەڵمانیدا بەرانبەری "شەق" بە مانای "بێ گنج، تورت" (وەك پێستێکی شەق) وشەی knackig بەکار دەهێنرێ کە خزمە دەگەڵ Knochen "ئێسك" و ئاماژە بە "رەق بوون" دەکا. دە زمانی کوردیشدا دوو وشەی "شەق و رەق" لەگەڵ یەکتر بەکار دەهێنرێن].

**شەق3 şeq** [ *šaq* ] - دەگەڵ هێندێك وشە دێ و مانای گەورە، زل دەبەخشێ، وەك شەقەجۆگە şeqecoge "جۆگەی زل"، شەقەترِ şeqetır "ترِی زل"، شەقەمێو şeqemêw "کۆتەرەرەز" [مێوی زل] و ↑شەقەمشار şeqemışar "مشاری زل". ئەم وشەیە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیك پەیدا دەکا دەگەڵ ↑شەق2 şeq "سەخت، توند". لەنێوان دوو چەمکی "سەخت" و "زل"دا جۆرێك پێوەندی ئێتیمۆلوژیك هاتووەتە ئاراوە، چونکوو بە گشتی ئەو شتانەی کە سەخت و بەهێز و کاریگەر بوون، دە هەمان کاتدا شتی زل و گەورە بوون. بۆ وێنە بایەکی سەخت و بەهێز تەنیا دەتوانێ بایەکی زل بێ، باڵدارێکی بەهێز [وەك سیسارك] تەنیا دەتوانێ باڵدارێکی زل بێ، چیایەکی سەخت و ئاستەم تەنیا دەتوانێ چیایەکی مەزن بێ و هتد. ئەم پێوەندییە دە چەندین وشەی زمانی کوردمادیدا ئاشکرایە، بۆ وێنە ↑زووخ zux بە مانای "هێز و توانایی" دێ و ↑زەخ zex بە مانای "مەزن، زل". ئەم دوو وشەیەش بەشێکن لە گەلێك وشە کە دەگەڵ "شەق" خزمایەتی پەیدا دەکەن. لەوانەیە وشەی ↑شا şa(h) "دەسەڵاتدار و فەرمانرەوای وڵات" پێوەندی بەم "شەق"ەوە هەبێ کە وەك باسکرا مانای "بەهێز، مەزن" دەبەخشێ. "شا" وەك فەرمانرەوای وڵات هەردوو ئەم مانایانە لە خۆ دەگرێ، واتا هەم کەسێکی خاوەن دەسەڵات، بە هەیبەت، خاوەن زەخت و زۆرە و هەمیش کەسێکی مەزنە. شیکردنەوەی وشەی "شا" [شاه] بەم شێوەیە گەلێك رێی تێدەچێ. لەم بارەوە ئەگەر سەیری وشەکانی "سەڵتەنەت"، "سوڵتان" و "سوڵتە" دە زمانی عەرەبیدا بکەین، دەردەکەوێ کە ئەم وشانە دە بنەرەتدا ئاماژە بە "هێز و دەسەڵات" دەکەن. هەروەها ئەگەر دە زمانی ئەڵمانیدا سەیری وشەکانی verwalten "بەرِێوە بردنی کار و بار" و Verwaltung "بەرِێوەبەرایەتی، دەسەڵاتی دیوانی" بکەین، دەردەکەوێ کە ئەم وشانە پێوەندییان هەیە بە Gewalt "زەبر و زەنگ، هێز و دەسەڵات" و دواجاریش خزمن دەگەڵ "پاڵەوان"ی کوردمادی و لە ریشەیەکەوە هاتوون بە مانای "بەهێز بوون، زاڵ بوون" و دواجار خزمن دەگەڵ "بەرد". رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بووبێ کە بنەماڵەی پاشایەتی پێشووی ئێران ناوی "پەهلەوی" [پاڵەوان] یان لەخۆیان نابوو، واتا ناوێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە کە لە دیدی خۆیانەوە دەگەڵ پلە و پایەی پاشایەتی ئەوان بگونجێ و لەگەڵ ناوی خەڵکی ئاسایی و بێدەسەڵات جیاواز بێ. هەر لەدرێژەی ئەم باسەدا خاڵێکی دیکە سەرنج رادەکێشێ و ئەویش وشەی "شا" وەك پێشگرە کە دەگەڵ هێندێك وشەی کوردمادی و فارسیدا دێ و ئاماژە بە "مەزن بوون" دەکا، بۆ وێنە شاکار، شارِێ، شارِەکَ، شابەیت، شاپەرِ، شاگوڵ و هتد. زۆر وێ دەچێ ئەم "شا"یە پێوەندی راستەوخۆی بە "شا"ی دەسەڵاتدار و فەرمانرەواوە نەبێ، بەڵکوو پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان پێکەوە هەبێ. "شا"ی یەکەم کورتکراوی ئەو "شەق"ەیە کە لەسەرەوە باسکرا و دە وشەی وەك "شەقەجۆگە" و "شەقەمشار" و "شەمێو" و هیتردا دەردەکەوێ.

**شەق4 şeq** [ *šaq* ] - "لەت": [شەق و شرِ]. شەق کردن بە مانای (دوو) لەت کردن بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەك وشە کە مانای "برِین" دەبەخشن، وەك ↑چەقۆ çeqo، سەر ریشەی ***sek-*** **<** ***(IE.)*** "برِین".

**شەق5 şeq** [ *šaq* ] - "لە خەت دەرچوونی گاجووت": [ دە بنەرِەتدا: خوار رۆیشتنی گاجووت]، خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑زەنگاڵ *zengal* دا شی کراونەوە.

**شەقام şeqam** [ *šaqām* ] - "کۆڵان": دەچێتەوە سەر ↑شەق1 şeq. شەق دە بنەرِەتدا بە مانای "لاق"ە و لەوێوە ماناکانی "هەنگاو" و هەروەها "کۆڵان" [شوێنی هەنگاو نان]یشی وەرگرتووە.

**شەقاندن1 şeqandın** [ *šaqāndın* ] - "پێشبرِکێ، کێبەرکێ": شەقین şeqîn یش دەگوترێ.

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ siegen (G.) "زاڵ بوون، سەر کەوتن لە شەڕ و زۆرەوانیدا"، Sieg (G.)، sige (OE.)، seger (Sw.) "زاڵی، سەرکەوتوویی لە شەڕ و زۆرانبازیدا"، -sáhas (OIn.) "زاڵی، زەبر و زەنگ" سەر بە ریشەی **(IE.) *seĝh- >** "توند راگرتن، بەسەردا زاڵ بوون". دە زمانی کوردمادیدا گەلێک وشە پێوەندییان بە ریشەوە هەیە، وەک ↑زووخ zux "هێز و توانایی"، ↑شەق² şeq "سەخت، توند"، ↑ساخ sax"تەندروست" [دەبنەڕەتدا: سەخت، قایم، توند و تۆڵ]، ↑سەق *seq* و هتد.

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑شەق¹ şeq "لێدان بە پێ"، دە بنەڕەتدا مانای "پێ، لاق".

**شەقاندن2 şeqandın** [ *šaqāndın* ] - "شڵەژاندن، تەکان پێدان": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەشەقاندن veşeqandın]. هەروەها ڤەشەقان veşeqan هەیە بە مانای "تەکان خواردن، راژان". شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شەکان(ەوە) şekan(ewe) بە مانای "تەکان خواردن، لەرینەوە".

**شەقاو şeqaw** [ *šaqāw* ] - "هەنگاو، لۆقاو": دەچێتەوە سەر↑ شەق şeq [دە بنەڕەتدا بە مانای لاق]. پێوەندی "لاق" و "هەنگاو" ئاشکرایە و ئەمە لە وشەی "لۆقاو"یشدا دەبیندرێ [لاق و لۆقاو].

**شەقتاندن şeqtandın** [ *šaqtāndın* ] - "بە درێژایی لەت کردنی دار": خزمە دەگەڵ ↑شەق⁴ şeq [شەق و شڕ].

**شەقتین şeqtîn** [ *šaqtīn* ] - "داڕووشان": خزمە دەگەڵ ↑شەق⁴ şeq [شەق و شڕ].

**شەقشەقە şeqşeqe** [ *šaqšaqa* ] - "لەیستۆکێک تەکان دەدرێ و دەنگی لێ دێ": خزمە دەگەڵ ↑شەکانەوە şekanewe و *شەکاندنەوە* "تەکان دان، لەرزاندن".

**شەقڵ şeqıl** [ *šaqıl* ] - "نیشانە، مۆر": پێوەندی هەیە بە sigillum (L.) "وێنە، نیشانەی چکۆڵە"، سەر بە ریشەی signum (L.) "وێنە، نیشانە، مۆر". وشەی شکل šakl (Arb.) پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەیە و لەرووی پاشگرەکەیەوە، واتا -ıl وێ دەچێ وشەیەکی وەرگیراو لە زمانی لاتینی یان زمانە ئێرانییەکان بێ. لە لایەکی دیکەوە دەبێتە خزم دەگەڵ چەند وشەیەکی وەک ↑سککە sık(k)e، ↑سەکوت sekut [سەر و سەکوت]، ↑ئەسک esk [ئە + سک e + s(ı)k] "وێنە، عەکس"، ↑ئەسکەناس eskenas و هتد. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی **(IE.) *sek- >** "برین". بەم جۆرە دەبینین کە "شەقڵ" دە بنەڕەتدا خەت یان کێڕێک، بە واتایەکی دیکە بڕدراوییەک بووە کە وەک نیشانە و مۆر کەڵکیان لێ وەرگرتووە.

**شەقوق şeqoq** [ *šaqoq* ] - "جۆرێک دارەبەن": خزمە دەگەڵ ↑سەق seq "داربەڕووی ئەستوور".

**شەقۆن şeqon** [ *šaqon* ] - "بە سەر تیهەڵدانی ئاژەڵ": ↑شۆق şoq یش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شاخ şax "قۆچی ئاژەڵ".

**شەقە1 şeqe** [ *šaqa* ] - "(دەنگی) باڵ لێکدانی پەلەوەر": خزمە دەگەڵ ↑شەکان(ەوە) şekan(ewe) بە مانای "تەکان خواردن، لەرینەوە". بەم پێیە مەبەست لە "شەقەی باڵ" دە بنەڕەتدا "باڵ تەکاندان، باڵ لێکدان بۆ هەڵفرین" بووە.

**شەقە2 şeqe** [ *šaqa* ] - "داردەستی بن هەنگڵ": بڕوانە ↑چێوشەقە çêwşeqe "داری بن هەنگڵی قاچ شکاو".

**شەقەمشار şeqemışar** [ *šaqamıšār* ] - "مشاری زلی دوو کەسی": "شەقە" لێرەدا مانای "زل" دەبەخشێ، وەک شەقەجۆگە şeqecoge "جۆگەی زل"، شەقەتڕ şeqetır "تڕی زل"، شەقەمێو şeqemêw "کۆتەرەرەز" [مێوی زل] و هتد. بڕوانە ↑شەق3 şeq.

**شەک1 şek** [ *šak* ] - "مەڕی دوو ساڵە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ teg (E.)، tagga (OE.)، takka (OSw.)، tacka (Sw.) "مەڕی دووساڵە". وێ دەچێ پێوەندییەک لەنێوان ئەم وشانە و ↑تەگە tage "تیری" لەئارادا بێ.

**شەک2 şek** [ *šak* ] - "لەرەی ئاوی چەم": خزمە دەگەڵ ↑شەکانەوە şekanewe "تەکان خواردن، راژان، لەرینەوە".

**شەکی3 şek** [ *šak* ] - "کڵاوی پێستەمەڕ": جگە لەم وشەیە ↑شەکال şekal [شەقالşeqal] هەیە بە مانای "پێڵاوی سەربەمووچنراو"، ↑شەکیلە şekîle "پارچە هەنبانەی خۆشکراو بۆ بەسەر دەفردا گرتن"، ↑شەهک şehk "مەشکەی ئاوکێشان" و هەروەها ↑شەکیلی şekîlî "پینە چی". وێ دەچێ هەموو ئەم وشانە پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ. چەمکی هاوبەش لە هەموو ئەم وشانەدا چەرمی خۆشکراوە. [تێبینی: دە زمانی ئەڵمانیدا خۆش کردنی چەرم پێی دەگوترێ gerben (G.). ئەم وشە ئەڵمانییە دەچێتەوە سەر وشەیەکی کۆنی ژێرمەنی بە مانای "ئامادە، ساز، تەواو(کردن)" و خزمە دەگەڵ ↑گورووە gurwe [گورە gure] "کار، خەبات". مەبەست لە کردارە ئەڵمانییەکە ساز و ئامادە کردن، واتا خۆش کردن(ی چەرم) بووە. لەم تێڕوانینەوە دەشێ شەک şek خزم بێ دەگەڵ ژمارەیەک وشەی کوردمادی کە باس لە "ساز و ئامادە و دروست کردن" دەکەن، وەک ↑ساز saz، ↑چاک çak، ↑ساخ sax [تەواو، دروست]، ↑شەکێرت *şekêrt* "جیاز(ی بووک)" و هتد.

[تێبینی: وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا بە مانای "چەرمی ئەستووری لە دەبباغدراو" بریتییە لە ↑سختیان sıxtîyan. ئەم وشەیە بە فارسی دەبێتە ساغری sāġarī (P.). ئەم وشانەش وەک هەموو وشەکانی سەرەوە پێوەندی بە ↑سەختsext و ↑سەق seq ەوە هەیە].

**شەکال şekal** [ *šakāl* ] - "پێڵاوی سەربەموو چنراو": خزمە دەگەڵ ↑شەکی3 şek "کڵاوی پێستەمەڕ".

**شەکانەوە şekanewe** [ *šakānawa* ] - "تەکان خواردن، راژان، لەرینەوە": خزمە دەگەڵ shake (E.)، skakan (OS.)، skaka (ON.) "شەکاندنەوە، لەراندنەوە". ریشە؟ لەوانەیە وشەی ↑تەکان tekan یش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**شەکر şekır** [ *šakır* ] - "ماکەی شیرینی": شکر šaker (P.). خزمە دەگەڵ saccharum (L.)، sakcharon (Gr.) "شەکر" و sakara (OIn.) "شەکر، رەڵم". بە لەر چاو گرتنی مانای وشەکە دە هیندی کۆندا لەوانەیە وشەکە دە ریشەدا مانایەکی وەک "ورکە، خاکە"ی هەبووبێ. وشەی صحرا saḥrā (Arb.) دەکرێ دەگەڵ وشەکانی سەرەوە هەڵبسەنگێندرێ. هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چەوەندەر çewender"بەرهەمێکە شەکری لێ دەگرن".

**شەکۆ şeko** [ *šako* ] - "داری کوێز تەکاندن": خزمە دەگەڵ ↑شەکانەوە şekanewe و شەکاندنەوە "لەراندنەوە، تەکاندن".

**شەکەت şeket** [ *šakat* ] - "ماندوو": دەچێتەوە سەر < سقط *seqete (Arb.)* "کەوتن" و دە بنەڕەتدا بە مانای "(لەپێ)کەوتوو" بە کار هاتووە.

[تێبینی: دەتیوان دوو چەمکی "ماندوو بوون" و "کەوتن"دا پێوەندی نیزیک هەیە. دە زمانی فارسیدا ماندوو دەبێتە خستە xeste کە ئەمەش دەشێ دەگەڵ خستن xıstın ی کوردمادی هاوریشە بێ. وشەی "خستە" دە دەقە ئەدەبییە فارسییەکاندا لە پاڵەوە بە مانای"بریندار"یش بەکارهاتووە. دە زمانی کوردمادیدا خەستە بە مانای "نەخۆش" بەکار دێ [خەستەخانە]. ئەوەی دە هەموو ماناکاندا هاوبەشە، چەمکی "کەوتن"ە واتا لەپێ کەوتن یان دە جێدا کەوتن].

**شەکیلە şekîle** [ *šakīla* ] - "پارچە هەنبانەی خۆشکراو بۆ بەسەر دەفردا گرتن": خزمە دەگەڵ ↑شەکی3 şek "کڵاوی پێستەمەڕ".

**شەکیلی şekîlî** [ *šakīlī* ] - "پینە چی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەکال şekal "پێڵاوی سەر بەموو چنراو" و ↑شەکی3 şek "کڵاوی پێستەمەڕ".

**شەکێرت şekêrt** [ *šakert* ] - "جیاز(ی بووک)": لەژێر وشەی ↑جیاز cîyaz "کەلوپەلی بووک کە دەگەڵ خۆی دەیبا" روون کراوە کە ئەم وشەیە لە جهاز jihāz (Arb.) "شتومەک، دەزگا، ئامراز" وەر گیراوە، بەڵام وشە عەرەبییەکە خۆی لە ↑سازı saz ی کوردمادی وەرگیراوە بە مانای "ئامادە، مجەهەز". سەرنج بدە کە ↑ساز2 saz دە کوردمادی و فارسیدا مانای *"ئامرازی مووزیک"*یش دەدا و سازوبرگ sāz o barg

(.P) دە زمانی فارسیدا مانای "*تەجهیزات*" دەبەخشێ. لە رووی ئەم وشانەوە دەردەوکەوێ کە "ساز" دە زمانی بەرێیی کوردمادی و فارسیدا بەگشتی بە مانای "ئامراز، ئامێر، ئالەت، وەسیلە" بەکار هاتووە، واتا ئەو شتانەی کە کارێکیان پێ جێبەجێ دەکری. کەوابوو مەبەست لە "جیاز" [ساز یان ساز و بەرگَ] هەمان "وەسایل" بووە و جیازی بووکیش بریتی بووە لە "وەسایل"ی بووک. ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ساختن saxtan (.P) "ساز کردن، ئامادە کردن، دروست کردن". ئێستا ئەگەر سەیری وشەی شەکێرت şekêrt "جیاز" بدەین، دەبینین کە ئەم وشەیەش دەگەڵ وشەی ساختن saxtan (.P) و "ساز" خزمایەتی هەیە، واتا بنجی وشەکە بە سێ شێوەی ساخ -sax و شەك -şek و ساز saz خۆی نیشان دەدا. کەوابوو "شەکێرت" وشەیەك بووە کە هەر وەك "ساز" بە مانای "ئامراز، وەسیلە" بەکار هاتووە. شتێك کە گومان لەم بۆچوونەدا ناهێڵێتەوە، وشەی شگرد şegerd (.P)ە کە دە زمانی فارسی ئەمڕۆدا بە مانای "فەند و فێڵ" بەکار دێ. بۆ نموونە دەگوترێ کە فلانکەس توانی بەو "شگرد"ە کارەکەی جێبەجێ بکا. "شگرد" دە زمانی ئێستای فارسیدا مانایەکی نەرێنی وەرگرتووە و بریتییە لە *وەسیلە*یەکی نەرێنی بۆ ئەنجام دانی کارێك و گەیشتن بە ئامانج. بەڵام ئەم وشەیە دەبێ لە زمانی کۆندا وشەیەکی بێلایەن بووبێ و بە گشتی بە مانای "وەسیلە، ئامراز" بەکار هاتبێ. ئەم وشانە هەروەها بیری ئەوەمان لا دروست دەکەن کە وشەی ↑شاگرد şagırd یش لەم چوارچێوەیەدا جێ بگرێ. ئاشکرایە "شاگرد" کەسێکە کە پێوەندی بە چەمکی "ساز کردن"ەوە هەیە، ناوی "شاگرد" دەبێ یان لەوەڕا هاتبێ کە ئەو کەسە کەلوپەلی پێویست بۆ وەستاکەی ساز و ئامادە دەکا و دەیخاتە بەر دەستی، یان "شاگرد" کەسێکە کە لە لایەن وەستاکەیەوە بۆ کار و پیشەیەکی دیاریکراو ساز و ئامادە و پەروەردە دەکرێ.

**شەل 1 şel** [ *šal* ] - "کەسێك کە دەلەنگێ": پێوەندی هەیە بە ریشەی **> *(s)kel-*** **(IE.)** "خوار، چەفت". بەم جۆرە شەلین واتا خوار رۆیشتن [لار رۆیشتن]. skélos (.Gr) "ران، لاق"، skélis "سمت"، skoliós (.Gr) "خوار" و scheel (.G) "خێل" لەم ریشەوە هاتوون. وشەی ↑خێل xel "چاو خوار" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە.

**شەل 2 şel** [ *šal* ] - "پاژ، لەت، کوت": دەکرێ بە دوو جۆر لێکی بدەینەوە:

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑شڕ şır، سەر بە ریشەی **> *(s)ker-*** **(IE.)** "بڕین، لەت کردن".

2- دەشتوانێ خزم بێ دەگەڵ Teil (.G)، deal (.E)، del (.Sw) و (.Rus) "پاژ، بەش"، سەر بە ریشەی **> *dai-li-*** **(IE.)** "بەش، لەت، کەرت".

**شەلاف şelaf** [ *şalāf* ] - "مەرایی کردن، شالووزی کردن، پێهەڵگوتن و هەڵفشاندنی درۆزنانەی کەسێك لە پێناو پارووی چەوردا": خزمە دەگەڵ گەلێك وشەی کوردمادی کە دەچنەوە سەر ریشەیەك بە مانای "تەڕ و لیچق وخلیسك بوون"، بۆ وێنە ↑چڵم çılım و ↑چڵپاو çılpaw و جلّقە çılqe و هتد. دە زمانی ئەڵمانیدا Schleim (.G) بە مانای "شتی تەڕ و لیچق، *چڵم* ئاسا" بەکار دێ و schleimen (.G) بە مانای "مەرایی کردن، شەلاف کردن". مەبەست لەم وشە ئەڵمانییە دەبێ "بۆ تێهەڵسوون بە شتێکی تەڕ و لیچق" بێ. دیارە مەرایی کردن یەکێکە لە پیس و پۆخڵترین خیسلەتەکان و هەر بۆیەش ئەو ناوانای بۆ ئەم ئاکارە دانراون، ئەوپەڕی نزم بوون و قێزەون بوون نیشان دەدەن. دە زمانی ئاخاوتنی فارسیدا وشەی "خایەمالی" بەکار دێ واتا "مشت و ماڵ دانی گون". دە زمانی ئەدەبی فارسیدا بە مرۆڤی مەراییکەر دەگوترێ "چاپلووس". ئەم وشەیە پێك هاتووە لە دوو وشەی "چاپ" [چەپ، کەف، چەپك واتا دەست، بەری دەست] و "لووس" و مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە ئەو کەسەی بە دەستێکی تەڕ و لووسەوە خزمەت دەکا. وشەی "مەرایی" دە زمانی کوردمادیدا ریشەکەی خزمە دەگەڵ "پێداماڵین" و "مشت و *ماڵ* دان". "تملق" دە زمانی عەرەبیدا خزمە دەگەڵ یان وەرگیراوە لە وشەی کوردمادی *مەلقاندن* "گەیاندنی میوە بە گوشین و دەست رێخستن" و دەچێتەوە سەر ریشەیەك بە مانای "داماڵین ، پێداخشاندن، رێخشاندن". "شەلاف کردن"یش هەر لەم چوارچێوەیەدا جێ دەگرێ و خزمە دەگەڵ schleifen (.G)،

slīfan (OG.)، slijpen (Nl.) "ساف و لووس کردن، پێداخشاندن". وشەی ↑شالووز şalûz بە مانای "مەراییکەر" پێوەندی بەم وشانەوە هەیە. ئەم وشانە هەروەها دەبنە خزم دەگەڵ ↑چلف çılıf "هەرزە، سووک و چرووک" و ↑شەلف şelıf "ژنی خۆ فرۆش". ئەم خاڵەش نابێ نەگوتراو بهێڵینەوە کە ژنێکی شەلف کە بە ناچاری لەشی خۆی دەفرۆشێ، هەزار جار لەو پیاوە شەلافکەرانە شەرافەتمەندترە کە کەسایەتی خۆیان لە پێناو پارە و پلە وپایەدا دەفرۆشن.

**شەلال şelal** [ *šalāl* ] - "1- درێژبوو، سلار 2- نەرم و ناسک": دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی **< (s)leu- *, *(s)leb-** *(IE.)* "شل، داهێزاو، خاو، داکەوتوو، شۆڕبۆوە". دەبێتە خزم دەگەڵ ↑شل¹ şıl و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**شەڵاڵ şelal** [ *šalāl* ] - "تێوەردراو، ئامێتە": دەبێ لە ریشەی **> *(s)lei-** *(IE.)* "تەڕ، لیچق، لووس، خلیسک" ەوە هاتبێ. بەم جۆرە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سیلک sîlk "لم"، ↑زەل zel "هەردی تەڕ"، ↑چلم çılım و هتد. لەم تێڕوانینەوە "شەڵاڵی خوێن بوون " یان "لە خوێندا شەڵاڵ بوون" ماناکەی دەبێتە "تەڕ و خووسان و لیچق بوون دە خوێندا".

**شەلان şelan** [ *šalān* ] - "رووت بوونەوە": هەروەها شەلاندن şelandın هەیە بە مانای "1- رووت کردنەوە 2- رووت کردن": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ کل kel (P.)، kahl (G.)، kaal (Nl.)، callow (E.)، calvus (L.) "کەچەڵ". ریشەی وشەکە بە تەواوی ساخ نەکراوەتەوە. بە پێی بۆچوونێک دەشێ پێوەندی هەبێ بە galdyti (Lit.) "پاک کردنەوە، لێکردنەوە".

**شەڵانە şelane** [ *šālna* ] - "قەیسی": بنجی شەل şel- پێوەندی بە ↑زەرد zerd ەوە هەیە. لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "میوەی زەرد". دە فارسیدا بەم میوەیە دەگوترێ "زردالو" واتا "ئاڵووی زەرد".

**شەڵپین şelpîn** [ *šalpīn* ] - "رەت بردن، خلیسکان، کەوتن": هەروەها بە کەسێک کە لە ئەزموونێک سەرنەکەوێ، بەتایبەتی ئەو کەسەی لە کلاسی خوێندن بکەوێ، دەگوترێ "شڵپەی لێ هێنا" [واتا رەتی برد و لە ئەزموون سەر نەکەوت]. ↑شەلفین şelfîn یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑چڵپاو *çılpaw* [قوڕاو] و ↑سڵپ sılp "تڵتە"سەر بە ریشەی **> *(s)lei-** *(IE.)* مانای "تەڕ و لیچق و خلیسک بوون". هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ schleifen (G.) هەم بە مانای "تیژ کردن، ساف و *لووس* کردن" و هەم بە مانای "بەسەر هەرد دا راکێشان، خشاندن" [دە بنەڕەتدا خلیسکاندن]، slippen (Nl.) و slip (E.) "خلیسکان".

**شەڵتە şelte** [ *šalta* ] - "شەختە، سەرمای سەخت": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑سارد sard.

**شەڵغە şelğe** [ *šalġa* ] - "پوورەی میشەنگوین":

1- لەوانەیە پێوەندی هەبێ بەو وشانە کە لەژێر ↑ئۆردوو ordu "سپا"دا باس کراون.

2- لەوانەشە پێک هاتبێ لە شەڵ + غە şel + ğe، کەرتی یەکەم شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شار şar [شارەمێروو، شارەزەرگەتە] و کەرتی دووەم گە/ گا ga / ge ی پاشگری شوێن بێ. [دە بنەڕەتدا: شارگە؟].

**شەلف şelıf** [ *šalıf* ] - "ژنی خۆفرۆش": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چلف cılıf "سووک، هەرزە" و ژمارەیەک وشە سەر بە ریشەیەک بە مانای "خلیسکان، لووس و لیچق بوون".

**شەڵفین şelfîn** [ *šalfīn* ] ـ "هەڵەنگوتن، رەت دان، خلیسکان": ↑شەڵپین şelpîn یش دەگوترێ.

**شەلق¹ şelq** [ *šalıq* ] - "تای هەموو رۆژە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەلقاندن şelqandın "زوورانەوە، سۆلانەوە".

**شەلق[2] şelıq** [ *šalıq* ] - "ریپۆقی چاو، زینچکاوی برین": خزمە دەگەڵ ↑شەلقین şelqîn "رزین و گنخانی سەوزە و میوە و هێلکە". ئەم وشانە دەشێ خزم بن دەگەڵ ژمارەیەک وشە وەک ↑سیلک sîlk "لم"، ↑زەل zel "هەردی تەڕ"، سلق sılq، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)lei-*** "تەڕ، لیچق، لووس، خلیسک".

**شەلقاندن şelqandın** [ *šalqāndın* ] - "زوورانەوەی ناوران لەبەر زۆر رۆیشتن": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سوولان(ەوە) sulan(ewe) "چووزانەوە، کزانەوە".

**شەلقین şelqîn** [ *šalqīn* ] - "رزین و گنخانی سەوزە و میوە و هێلکە": هەروەها ↑شەلق[2] şelıq هەیە بە مانای "ریپۆقی چاو، زینچکاوی برین".

**شەللاق şellaq** [ *šallāq* ] - "قامچی": خزمە دەگەڵ ↑زللە zılle "لێدان".

**شەڵوار şelwar** [ *šalwār* ] - "دەرپێ": شلوار šalwār (P.). لەوانەیە پێوەندی بە ↑شاڵ şal ەوە هەبێ. دە زمانی فارسیدا چلوار čalwār (P.) یش هەیە بە مانای "پارچەی کەتان، جاو".

**شەلە şele** [ *šala* ] - "شوێنی هەڵبڕینی جۆگەئاو": شەلەگە şelege ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑کەل kel "کەلش، قەڵش" سەر بە ریشەیەک بە مانای "برین، لەت کردن، جیا کردنەوە".

**شەلەم şelem** [ *šalam* ] - "شەلغەم، بنکی گیایەکە بۆ خواردن دەشێ": هەروەها شەلەم شۆرباو şelemşorbaw هەیە کە بە مانای "تێکەڵ پێکەڵ" بەکار دێ و بۆ شۆرباوی شەلەم دەگەڕێتەوە کە دەشێ تراوێکی لیچق و لێکدراو بێ. خزمە دەگەڵ ↑شەلەمە şeleme.

**شەلەمە şeleme** [ *šalama* ] - "گیایەکە بنکەکەی لە پەتاتە دەکا و زۆر رەوانە": هەروەها شەلەمین şelemînهەیە بە مانای "چێشتی ترخێنە". خزمە دەگەڵ↑چلم çılım و Schleim (G.) بە مانای "شتی تەڕ و لیچق، *چڵم* ئاسا". وشەی "چلم" دە بنەڕەتدا هەروەک وشە ئەڵمانییەکە مانایەکی گشتی هەبووە و بە هەموو تراوێکی لیچق گوتراوە. دواتر وشە کوردمادییەکە مانا گشتییەکەی خۆی لە دەست داوە و تەنیا بەو تراوە لیچقە گوتراوە کە لە لووتەوە دێتەدەر. ئەم وشانە دواجار خزمن دەگەڵ ↑شل[2] şıl "رەوان، ناپەیت، ئاوەکی".

**شەلەنگ şeleng** [ *šalang* ] - "بە لەنجەولار": خزمە دەگەڵ ↑چەلەنگ çeleng.

**شەلیپان şelîpan** [ *šalīpān* ] - "مۆزەشینە": لەوانەیە خزمە بێ دەگەڵ ↑شەلیل şelıl و پێوەندی هەبێ بە ریشەی < ***(IE.) *(s)li-*** "ئاماڵ شین".

**شەلیل şelıl** [ *šalīl* ] - "میوەیەکە خزمی هلوو": دەشێ خزم بێ دەگەڵ Schlehe (G.)، slee (Nl.)، sloe (E.) "میوەیەکە وەک قەرەلوو"، سەر بە ریشەی < ***(IE.) *(s)li-*** "ئاماڵ شین". sliva (Rus.) "هەڵووچە" دەچێتەوە سەر ئەم ریشەیە. لەوانەیە ↑هلوو hılu ش پێوەندی بەم وشانەوە هەبێ.

**شەم şem** [ *šam* ] - "1- مۆمی داگیرساندن 2- سێبەر": خزمە دەگەڵ ↑شێو şêw "ئێوارەدرەنگان" سەر بە ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوەی کز و مات"، بە شیمانەیەکی بەهێز ئەم وشەیە لە زمانی کوردمادییەوە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و کراوە بە **شمع** šamɛ (Arb.).

**شەماتە şemate** [ *šamāta* ] - "کۆمەڵگا، خەڵک، ئاوایی": خزمە دەگەڵ ↑جڤات cıvat.

**شەمار şemar** [ *šamār* ] - "خزۆک، خەزەندە": شەمارە şemare "خزین" وەک ناوی واتا بەکار دێ. خزمە دەگەڵ ↑شەمتین şemtîn "خلیسکان".

**شەمارەنگ şemareng** [ *šamārang* ] - "بۆیاخی کەوش": پێک هاتووە لە دوو وشەی شەم + رەنگ şem +(a)+ reng. ↑شەم şem ئاماژە دەکا بە "تاریکی" یان "درەوشاتیکی کز و مات".

**شەماق şemaq** [ *šamāq* ] - "زللە، شەق": خزمە دەگەڵ ↑چۆماخ çumax.

**شەمال şemal** [ *šamāl* ] - "1- مۆم، شەم 2- تیشکی شەم و چرا": خزمە دەگەڵ ↑شەم şem، ↑سۆما soma و ↑شێو *şêw* [شام şam].

**شەماڵ şemal** [ *šamāl* ] - "بای باکوور": راستە دە زمانی عەرەبیدا شمال šimal (.Arb) بە مانای "باکوور"دێ، بەڵام من وا هەست دەکەم ئەم وشە عەرەبییە لە وشە کوردمادییەکە وەرگیراوە، نەک بەرەواژی. "شەماڵ" بایەکی ئارام و یەکسانە و هەر بۆیە دەشێ پێوەندی بە ↑ساماڵ samal و چەندین وشەی دیکەوە هەبێ کە ماناکانی "هەموار، یەکدەست، بێ هەڵچوون و داچوون، ئارام" دەگرنە خۆ. جا لەبەر ئەوەی ئەم بایە لە ناوچەی ئێمە لە باکوورەوە هەڵدەکا، ئیتر وای لێ هاتووە کە "بای شەماڵ" مانای "بای باکوور"ی وەرگرتووە و زمانی عەرەبیش وشەکەی بە مانای "باکوور" بەکار هێناوە.
[تێبینی: پێوەندی "با" بە ئاراستە جوگرافییەکان دە زمانی ئەڵمانیشدا دەبینرێ. دە زمانی ئەڵمانیدا süd بە مانای "جنووب، باشوور" بەکار دێ. دە ئەڵمانی ناویندا sūd بە مانای "بای باشوور" بەکار هاتووە].
**شەمامە şemame** [ *šamāma* ] - "گرکەی بونخۆش": لە شم šam (.Arb) "بۆن کردن" وەرگیراوە.
**شەمبە şembe** [ *šamba* ] - "ڕۆژی پاش هەینی": شەم(ە) şem(e) یش دەگوترێ [یەکەشەم(ە)، دووشەم(ە)...]، یەوشەوا yewşewa و یەوەشەوە yewşewe ش دەگوترێ بە مانای "یەکشەمە". بە فارسی دەگوترێ شنبە šanbe (.P). ئەم وشەیە وەک پێوەر بۆ ڕۆژەکانی دیکەی هەفتە دیاری کراوە، واتا ڕۆژی دوای ئەم ڕۆژە دەبێتە یەکشەمبە و دواتر دووشەمبە و هتد. ئەگەر لە ڕۆژی یەکشەمبەوە دەست پێ بکەین، "شەمبە" دەبێتە ڕۆژی حەوتەم. هەر بۆیە لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ سبت sabt (.Arb) "شەمبە" کە دەشێ لە زمانی کۆنی کوردمادی یان فارسی وەرگیرابێ. لە زمانی هیندی کۆندا saptá- (.OIn) بە مانای "حەوت، هەفت" بووە و دەشێ لە زمانی کۆنی کوردمادی و فارسیشدا فۆتیمی سەرەتای وشەکە s بووبێ. لە چەند زمانێکی دیکەشدا هەر بەم جۆرەیە: sieben (.G)، sibun (.OG)، seven (.E)، sju (.Sw)، septem (.L)، heptá (.Gr)، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *septm- >* "حەوت، هەفت". وشەی September بەپێچەوانەی ئێستا کە وەک مانگی نۆیەمی ساڵی زایینی دێتە ئەژماردن، لە سەردەمی ڕۆمی کۆندا مانگی هەوتەم بووە، واتا ساڵ لای ڕۆمییەکانیش لە سەرەتای بەهارەوە نوێ بووەتەوە و یەکەم مانگی بەهار بووەتە یەکەم مانگی ساڵ و بە شێوەیە September بووەتە مانگی هەوتەم (ی ئەوسا). ئێستا ئەگەر لە وشەی "شەمبە" و ماناکەی ورد بینەوە، دەتوانین شیمانەی ئەوە بکەین کە ئەم وشەیەش بەجۆرێک پێوەندی بەم وشانەی سەرەوە هەبێ و مەبەست "ڕۆژی هەوتەم "بووبێ کە وەک ڕۆژی پیرۆز و پشوودان سەیر کراوە و دوای ئەو ڕۆژەکان لە نوێوە دەست پێ کراونەوە [هەژماردراونەوە]. لەوانەیە وشەکە چەند گۆڕانێکی بەسەرداهاتبێ و شێوەی ئەمڕۆیی پەیدا کردبێ.
**شەمتین şemtîn** [ *šamtīn* ] - "خلیسکان، خزین": خزمە دەگەڵ schmiegen (.G) "شلک بوون"، smugan (.OE) "خزین، خوشین"، smyga (.Sw) "خزین"، smykatśja (.Rus) "خزین"، smukti (.Lit) "داخزان، ڕۆچوون"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *smeugh- >* "خلیسکان". خزمە دەگەڵ ↑شەمار şemar "خزۆک، خەزەندە" و شەمارە şemare "خزین" و شەماتۆک şematok "زەوی خلیسکانێ" و ↑شەمتۆک şemtok "خلیسکەر، سکی باز".
**شەمچک şemçık** [ *šamčık* ] - "گزیکار، فێڵباز، مەککار":
[سەرەتا تێبینییەک: دە زمانی ئەڵمانیدا schlau (.G) بە مانای "زیرەک، فێڵباز" بەکار دێ. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ شێلهان şêl(e)han "راخوشین" دە زمانی کوردمادیدا و هەروەها دەگەڵ schleichen (.G)، slihhan (.OG)، sliken (.ME) "خوشین"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *sleu(k)-* "خوشین، خزین، خلیسکان". ئەم پێوەندییە ڕەنگە لەوەڕا پەیدا بووبێ کە ئاژەڵی زیرەک و فێڵباز لەکاتی کەوتنە شوێنی بە کون و کولێناندا خوشیوە و بۆی دەرچووە].
هەر بەم شێوەیە شەمچک şemçık دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑شەمتین şemtîn "خلیسکان، خزین"، سەر بە ڕیشەی *(IE.) *smeugh- >* "خلیسکان".

**شەمچە şemçe** [ *šamča* ] - "شخارتە، گوگرد": ↑شەم şem + چە çe. کەرتی "چە" پاشگری گچکاندنە و مانای وشەکە دەکاتە "شەمی چکۆڵە". "شەم" خۆی دە ریشەدا واتا "درەوشاتیکی کز و مات".

**شەمخین şemxîn** [ *šamxīn* ] - "ترشان و کەف کردنی چێشت لە گەرمان": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ schäumen (G.) "کەف کردن" و Schaum (G.) "کەف". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑کەف kef.

**شەمراندن şemrandın** [ *šamrāndın* ] - "شاردنەوە": دەگەڵ پێشگری ڤە ve دێ [ڤەشەمراندن veşemrandın]. دەشێ پێوەندی هەبێ بە ریشەی ***(IE.) *kem- >*** "داپۆشین، لێهاڵاندن" و دەبێتە خزمە دەگەڵ ↑جامە *came* و ↑شەمل şemıl "جاجم، پەتوو" و چەندین وشەی دیکە. دە پلەیەکی دوورتردا هەروەها دەبێتە خزم دەگەڵ ↑حەمرین ħemrîn.

[تێبینی: وەک پێشتر باس کرا، "حەمرین" و چەندین وشە بە ماناکانی "بەرد، سەخت، رەق، ئاستەم" دەچنەوە سەر ریشەی ریشەی ***(IE.) *(a)kamen- >*** "بەرد، کەمر، کەڤر". وشەکانی سەر بەم ریشەیە دە زمانە کۆنەکاندا هەم مانای "ئاسمان" و "هەمیش مانای "بەرد"یان گەیاندووە. بە گوێرەی بۆچوونێک مرۆڤەکانی کەونارا ئاسمانیان وەک تاقێکی بەردین لەبەرچاو گرتووە کە هەردی داپۆشیوە. لەم پێوەندییەدا ریشەیەکی دیکەش ، واتا *(IE.) *kem- >* "داپۆشین، لێهاڵاندن" پەیدا بووە. هەردووک ریشەی سەرەوە، خۆیان دەچنەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر کە بریتییە لەریشەی *(IE.) *ak-* " تیژ". لەوانەیە رەوتی پەرەسەندنی ماناکان بەم جۆرەی خوارەوە بووبێ: تیژ ، بەرد، ئاسمان (تاقی بەردین)، داپۆشین، شاردنەوە].

**شەمزان şemzan** [ *šamāzn* ] - "1-ژاکان، سیس بوون 2- پەشۆکان": هەروەها شەمز şemz [یان شەمس şems] هەیە بە مانای "ژاکاوی، سیسی". خزمە دەگەڵ schmähen (G.)، smāhen (OG.) "کەم کردن، پچووک کردن، لاواز کردن"، smā (OIs.) "گاڵتە پێ کردن"، smaht (MG.) "برسییەتی، تینوویەتی"، schmächtig (G.) "کز بوون، سیس بوون"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *sme(i)k- >*** "دەنک و دانی ورد کراو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *sme- >*** "تیهەڵسوون، رێخشاندن". وشەیەکی دیکە دە زمانی کوردمادیدا هەیە کە ئەو پێوەندییانەی سەرەوە پشتراست دەکا، ئەویش ↑شەمزە şemze یە بە مانای "کاریلە و بەرخۆڵەی ساوا". ئەم وشانە هەروەها لەوانەیە خزم بن دەگەڵ ↑کەم kem. بەم پێیە لە مانای بنەڕەتی "رێخشاندن، سوونەوە" مانای "ورد (کردن)"، دواتر "کەم بوون، بچووک بوون( ەوە)" و دواجاریش مانای "ژاکان، سیس بوون" سەریان هەڵداوە.

**شەمزە şemze** [ *šamza* ] - "کاریلە و بەرخۆڵەی ساوا": خزمە دەگەڵ ↑شەمزان şemzan "ژاکان، سیس بوون".

**شەمشەمەکوێرە şemşemekuwere** [ *šamšamakuwera* ] - "ئاژەڵی شەوهەڵفڕ": ئەم وشەیە پێک هاتووە لە دوو وشەی شەم şem کە دووبارە دەبێتەوە و ↑کوێر kuwer. "شەم" شێوەیەکی کۆنترە لە ↑شێو êşw. شەم یان شێو بە مانای "بوومەلێڵی پێش تاریکان، ئێوارەدرەنگ"ە. ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادی و هەروەها خزمەکاندا بە مانای "تارمایی، شەوە، سێبەر"یش بەکار هاتووە. لەم تێڕوانینەوە شەمشەمەکوێرە دەتوانێ بەو مانایە هاتبێ کە ئەو ئاژەڵە کوێرە کاتی تاریکان دەفڕێ. [لەم بارەوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ناوەکانی دیکەی ئەم ئاژەڵە: "پڕچەمیک"، "شەڤرەڤیک" و "شەڤشەڤۆک" دە کوردمادیدا و "شب پره" دە فارسیدا]. یان لەوانەیە ئەم ئاژەڵە بە جۆرێک تارمایی و سێبەر چوێنرابێ، چەنکوو بە شەو دەفڕێ و وەک سێبەر و تارمایی خۆ دەنوێنێ.

**شەمل şemıl** [ *šamıl* ] - "جاجم یان هەر کرێک کە دە خۆیەوە دە پێچن": هەروەها شەملک şemılk هەیە بە مانای "1- بەرماڵ 2- فۆتە، داپۆشی خوار لە کەمەر": خزمە دەگەڵ ↑شەمەد şemed "پۆپەشمین".

**شەمەترێلکە şemetırêkle** [ *şamatırelka* ] - "مێش هەنگویتیکی باریکی رەشکەڵە کە شانە لە ناو دڕکاندا دەکا و هەنگویتیکی زۆر خۆش دروست دەکا": کەرتی شەمە -şeme ئاماژە بە رەنگی تاریک و رەشی مێشەکە دەکا و خزمە دەگەڵ ↑شەمشەمەکوێرە şemşemekuwere. کەرتی ترێلکە tırêkleخزمە دەگەڵ چەندین وشە وەک ↑تەڕ ter، ↑*دڵۆپ dılop*، ↑دەڵاندن delandın. بەم جۆرە مانای وشەکە دەبێتە "رەشێکی دەڵێنەر"، مەبەست لێرەدا دەڵاندنی هەنگوین لە لەشی مێشەکەیە.

**شەمەد şemed** [ *šamad* ] - "پۆپەشمین": خزم بێ دەگەڵ ↑جامە came "جلوبەرگ" و ↑*جامانە camane* "ئاغابانوو، پێچی لەسەر نان" [دە بنەڕەتدا: جامەدان، بوخچەی جلان].

**شەمەند şemend** [ *šamand* ] - [مامۆستا هەژار: زەق و قیتی جوان و لەبەرچاو- مەمکی تورت و گرد و شەمەندن]. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر > *charmant** (*Fr.*) "سێحرئامێز، ئەفسوناوی" > *charme**(*Fr.*) "دڵگری و ناسکی (لە روخسار و کاراکتێردا) > *carmen* (*L.*) "هەڵبەست و گۆرانی ئەفسون کەر، تەلیسم".

**شەمیت şemît** [ *šamīt* ] - "کەڵەکە، بە سەر یەکدا کراو":

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شەماتە şemate "کۆمەڵگا، خەڵک، ئاوایی" و دواجار ↑جڤین[1] cevîn "کۆم بوون، کۆ بوونەوە".

2- لەوانەشە خزم بێ دەگەڵ ↑سمتە sımte و ↑زەمۆمە zemome.

**شەمیران şemîran** [ *šamīrān* ] - "پێکهاتن، جێبەجێ بوون": هەروەها شەمیراندن şemîrandın هەیە بە مانای "پێک هێنان، ئەنجام دان".

[سەرەتا تێبینییەک: دە زمانی ئەڵمانیدا machen (.G) و دە ئینگلیزیدا make (.E) مانای "کردن، دروست کردن" دەبەخشێ. ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هەڵشێلانی هەویر". لەم مانایەوە مانای "قوڕ گرتنەوە، قوڕ شێلان" و دواتر مانای "خانوو کردن، دروست کردنی خانوو" و دواجاریش مانای "کردن، دروست کردن" پەیدا بوون. شیاوی باسە لەم ریشەوە چەندین وشە دە زمانە هیندوئەورووپییەکاندا پەیدا بوون کە ماناکانی "شێلان، گوشین، تیهەڵسوون، سواخ دان، رێخشاندن" دەبەخشن. بۆ وێنە دە زمانی کوردمادیدا "ماشتن" و "*مشت* و ماڵ" و دە زمانی رووسیدا maslo (.Rus) "رۆن، رۆنەکەرە" لەم ریشەوە هاتوون].

ئێستا بگەڕێینەوە سەر وشەی شەمیران şemîran ی خۆمان. دە زمانە ژێرمەنییەکاندا وشەیەک هەیە کە مانای "رۆن، چەوری، پیو" دەبەخشێ و بەم جۆرەیە: Schmer (.G)، smear (.E)، smör (.Sw). دە زمانی سوێدیدا وشەکە مانای "کەرە، رۆنەکەرە، نڤیشک" دەبەخشێ. ئەم وشەیە دە زمانی کوردمادیشدا هەیە و دەبێتە ↑سمرە sımre "دووگە". وشە ژێرمەنییەکە دەبردرێتەوە سەر ریشەی ***smer** (**IE.**) "چەوری". لەم باوەڕە دام کە ئەم ریشەیە ریشەیەکی سەر بەخۆ نەبێ، بەڵکوو هەر ئەو ریشەی ***(s)mer-** (**IE.**) بێ بە مانای "رێککوشین، پشاوتن، رێخشاندن، ورد کردن". مانای سەرەکی ئەم ریشەیە دەبێ "رێخشاندن، پێداخشاندن" بێ و پاشان لەمەوە ماناکانی دیکە وەک شێلان، رێککوشین، پشاوتن و هیتر سەریان هەڵداوە. ↑مەڕە[1] mere [پێمەڕە یان مەڕک] و گەلێک وشەی دیکە کە لەژێر مەڕە[1] دا باس کراون، مانای بنەڕەتی ئەم ریشەیە نیشان دەدەن. دواتر لەم مانا بنەڕەتییەوە گەلێک وشە بە مانای جیاواز پەیدا بوون، وەک ↑مەرهەم merhem "هەتوان" کە لە لەش یان لە شتی دیکە دەخشێندرێ و تیهەڵدەسوورێ و هەروەها myron (.Gr) "رۆن". وشەیەکی دیکە کە لەم بارەوە جێی ئاماژەیە، ↑هەویر hewîrە [خمیر xamîr (.P)]. ئەم وشەیە دەگەڵ ریشەکەی سەرەوە بەتەواوی یەک دەگرێتەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە چەمکەکانی "رێخشاندن، ساوین، پێداماڵین، مشت و ماڵ دان" و "رۆن، مەرهەم، هەویر" و "شێلان، هەڵشێلان، پشاوتن" و "تیهەڵسوون، سواخ دان" هەموویان دە پێوەندی دەگەڵ یەکتر دان و وشەکانی دەربڕی ئەم چەمکانە پێوەندی ئێتیمۆلۆژیکیان پێکەوە هەیە. [ئەم پێوەندییە دە وشەی

"هەتوان"یشدا بەدی دەکرێ کە خزمە دەگەڵ "*ساوین*، تێهەڵسوون و سواخ". هەروەها دە وشەکانی "کەرە" و "نقیشک"یشدا هەر هەمان پێوەندی لەئارادایە. کەرە kere خزمە دەگەڵ chrīsma (L.) "هەتوان، مەرهەم" و kirnen (G.)، karnen (Nl.)، churn (E.) "کەرە گرتن" و گشت ئەم وشانەش دەچنەوە سەر ریشەی *ĝer- (IE.) "سوونەوە، رێخشاندن". هەروەها *نقیشک* "رۆنەکەرە" خزمە دەگەڵ *نقانی* "قوڕەکاری، کار کردن لە دروست کردنی خانوو دا"، دە بنەڕەتدا: قوڕ شێلان یان تێهەڵسوونی قوڕ، سواخ دان]. بەم شێوەیە دەشێ وشەی "شەمیران" بە مانای "دروست بوون، پێک هاتن" هەر وەک وشە ئەڵمانییەکەی سەرسەرەوە دە بنەڕەتدا بە مانای "قوڕ شێلان" یان "سواخ دان" بووبێ، دواتر مانای "خانوو دروست کردن" سەری هەڵداوە و لەمەشەوە دواجار مانای "دروست کردن، پێک هێنان، ئەنجام دان".

**شەمیک şemîk** [ *šamīk* ] - "رێسمەی دەرگا": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەمتین şemtîn "خلیسکان، خزین".

**شەند şend** [ *šand* ] - دەنووک، دندووک": خزمە دەگەڵ ↑دان dan "ددان".

**شەنگ şeng** [ *šang* ] - "جوان":[شۆخ و شەنگ].

1- لەوانەیە شێوەیەکی کورتکراو بێ لە ↑قەشەنگ qeşeng و دواتر ↑*کەشخە keşxe*.

2- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شێن şên "جوان" و دواتر ↑*جوان cuwan*.

**شەنگڵ şengıl** [ *šangıl* ] - "پێکەوە نووسان": شەنگڵە şengıle بریتییە لە "دوو دانە بەری داری پێکەوەنووساو". هەروەها ↑زەنگەتە zengete و زانقلە zanqıle هەن بە مانای "کەرتەهێشوو" [دەنکەترێی پێکەوەنووساو" و ↑زانق zanıq "چەسپ". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ Schnee (G.)، snow (E.)، snö (Sw.)، sneg (Rus.)، nipha (Gr.)، nix (L.)، sniegas (Lit.) و snahr (Pl.) "بەفر، بەرف"، سەر بە ریشەی < *(s)neigh- (IE.) "پێوەنووسان، گلوو بوون". هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑سان san "ریز" [سان بەستن واتا ریز بەستن]، ↑سنسل sınsıl "بڕبڕەی پشت"، ↑سنجەق sınceq "مەڵبەند"، ↑سنلە sınle "تەپەگوو"، ↑سەهان sehan "ریخ"، ↑زنە zıne "چیمەنی ئاودەڵێن"، ↑چنچک çınçık "پلەگۆشت"، ↑چەنی çenî "دەگەڵ، پێڕا"، ↑زنار zınar، ↑زنێر zınêr "تووکەسەر لێکهاڵاوی چڵکن"، ↑زەنج zınc "باتڵاق" و لەوانەشە ↑زۆنگ zong.

**شەنگۆل şengol** [ *šangol* ] - "شاد و بەکەیف، سەرزیندە". شنگول šangūl (P.).ئەم وشەیە پێوەندی هەیە بە چەند وشەیەک کە ئاماژە بە "خۆ بادان و خۆ تەکان دان" دەکەن، وەک ↑شنگڵ şıngıl، ↑*جینگڵ cîngıl* [گینگڵ gıngıl].

[تێبینی: پێوەندییەکی راستەوخۆ هەیە لەتیوان دوو چەمکی "شادی" و "خۆ جووڵاندن"دا. لەم بارەوە هەڵی سەنگینە دەگەڵ *سەما* "رەقس" سەر بەکرداری *جمین* "جوولان، تەکان خواردن" و هەروەها "پەڕین" و "هەڵپەڕین"].

**شەنە şene** [ *šana* ] - "ئامرازێکی ددانەداری کشتوکاڵ": خزمە دەگەڵ ↑شانە şane.

**شەو şew** [ *šaw* ] - "دەمی تاریکی": شب şeb (P.)، šap (Pl.)، xšap (Av.). جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑خەوتن xewtın [خەفتن xeftın]، خفتن/ خوابیدن xābīdan (P.)/ xoftan (P.)، hypnos (Gr.) "خەو"، sopor (L.) "خەوی قووڵ"، sopire (L.) "خەو بردنەوە"، سەر بە ریشەی < *su(e)p- (IE.) "خەوتن". لەوانەیە وشەی "شەو" دە بنەڕەتدا بە مانای "کاتی خەوتن" بووبێ.

[تێبینی: دە وشەنامەی فارسیدا خسپیدن xospīdan (P.) بە مانای "خەوتن" هاتووە. ئەم شێوەی وشەکە دەگەڵ وشەی xšap (Av.) "شەو" باشتر رێک دەکەوێ. فۆتیمی x لە سەرەتای ئەم وشانەدا لەوانەیە فۆتیمێکی ئەسڵی (ئوریجینال) نەبێ و وەک زێدەیەکی فۆتیتیکی هاتبێتە سەر وشەکەوە].

**شەوات şewat** [ *šawāt* ] - "سووتمان": دەچێتەوە سەر شەوتین şewtîn و ↑سووتان sutan.

**شەواک şewak** [ *šawāk* ] - "گێلۆکە":

1- دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑چەپ çep سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار". شیاوی باسە "گیل"یش خۆی لە ریشەکەوە هاتووە بە مانای "خوار".

2- هەروەها دەشێ خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑شەپۆکان şepokan "پەشۆکان، سەر لێ تێکچوون، وڕ بوون" و دەگەڵ ↑شێوان şêwan [سەر لێ شێوان]. بڕوانە ↑*شێواندن şêwandın*. لەوانەیە ئەم خێزانەوشەیەش خۆی پێوەندی بە "چەپ"ەوە هەبێ.

**شەوسین şewısîn** [ *šawısîn* ] - "لارەولار رۆیشتن":

1- دەتوانێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەوێق şewêq [شل و شەوێق].

2- لەوانەشە خزمایەتی هەبێ دەگەڵ ↑چەپ çep سەر بە ریشەیەک بە مانای "خوار".

**شەوشین şewışîn** [ *šawıšîn* ] - "پەرێشان بوون، بێ سەرەوبەرە بوون": خزمە دەگەڵ ↑شەوهاندن şewhandın "1- تێکەڵ و پێکەڵ کردن 2- بیچم ناحەز کردن" و ↑*شێواندن* şêwandın.

**شەوک şewık** [ *šawık* ] - "1- دەرزیلە 2- قولاپی ماسیگری":

1- لەوانەیە خزمە بێ دەگەڵ ↑هەفک hefk [خەفک xefk] "تەڵە" سەر بە ریشەیەک بە مانای "گرتن".

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە ↑گاو gaw "تێلی خوار بۆ دروون و پینە کردن".

**شەول1 şewıl** [ *šawıl* ] - "دەشتایی تیوان چیا": خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "قووڵ، قووڵایی، نزم"، وەک ↑سپڵە sıple.

**شەول2 şewıl** [ *šawıl* ] - "گەرما": هەروەها "شەوڵ دان" هەیە بە مانای "تین و تاوی هاوینان کە مرۆڤ لە پێش خۆیەوە دەیبینێ". دەشێ پێوەندی بەو وشانەوە هەبێ کە لەژێر ↑سوولانەوە sulanewe "سووتانەوەی پێست"دا باس کراون.

**شەول3 şewıl** [ *šawıl* ] - دەگەڵ "شێت" دێ [شەوڵەشێت şewleşêt]. خزمە دەگەڵ ↑شەواک şewak "گێلۆکە" و ↑شەپڵە şeple.

**شەونخوونی şewnıxunî** [ *šawnıxūnī* ] - "شەوبێداری": شەو + نخوونی şew + nıxunî. کەرتی نخوونی nıxunî لە کرداری ↑خەوتن xewtın ەوە هاتووە. نخوونی دە بنەڕەتدا نەخەونی nexewnî بووە و "خەون" لێرەدا بە مانای "خەوتن" هاتووە. [زازایی: هەون واتا خەوتن]. بەم جۆرە شەونخوونی [شەو نەخەونی] واتا "شەونەخەوتن".

**شەوهاندن şewhandın** [ *šawhāndın* ] - "1- تێکەڵ و پێکەڵ کردن 2- بیچم ناحەز کردن": شێوەیەکی دیکە لە ↑شێواندن şêwandın. ئەم وشە کوردمادییە دە زمانی عەرەبیدا کراوە بە تشویش tašwīş و مشوش (Arb.) muşawwaş و هتد

**شەویلکە şewîlke** [ *šawīlka* ] - "ئەو ئێسکەی ددانەکانی تێدا جێگیر کراوە": شەو + ئیلکە şew + îlke. کەرتی دووەم پاشگرە. کەرتی یەکەم خزمە دەگەڵ jaw (E.)، jow(e) (ME.)، joe (OF.) "شەویلکە". ریشەی وشەکە ساخ نەکراوەتەوە. لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑جاوین cawîn.

**شەوین şewîn** [ *şawîn* ] - "چەمانەوە": شێوەیەکی دیکە لە ↑چەمانەوە çemanewe.

**شەوێق şeweq** [ *šaweq* ] - دەگەڵ "شل" دێ [شل و شەوێق şıl û şewêq واتا سست و ناقایم، لەق و تەق]. خزمە دەگەڵ schwach (G.) "سست، بێ هێز"، zwak (Nl.) "سست، شلک"، swaken (MG.) "لەق بوون، شل و شەوێق بوون"، svaga (Norv.) "لەق بوون، شلک بوون، شەکانەوە"، دواجار خزمە دەگەڵ ↑جمین cımîn.

**شەهت şeht** [ *šaht* ] - "شەپڵە لێدراو، هەست نەمان لە دەست و قاچدا": خزمە دەگەڵ وشەگەلێک کە لەژێر ↑سەق *seq* دا باس کراون و مانای "سەخت" دەبەخشن. خودی وشەی سەخت sext یش لەم چوارچێوەدا جێ دەگرێ.

[تێبینی: کاتێک دەست و قاچ شەپڵە لێی دەدا و توانای تێدا نامێنێ، جم و جۆڵی خۆی لە دەست دەدا و هەر بۆیە وەک شتێکی سەخت و رەق و تەق هەست پێ دەکرێ. بە وتەیەکی دیکەیە وەک ئەوە وایە کە "سڕ" بووبێ. وەک لەژێر وشەی "سڕ"دا باس کرا، ئەویش دە بنەڕەتدا مانای "سەخت" دەدا. هەروەها دە زمانی ئەڵمانیدا کاتێک باس لە "سڕ بوون" یان نەمانی هێز و جم و جۆڵ و چالاکی لە ماسوولکەکاندا دەکرێ، لەپاڵ وشەکانی دیکەدا وشەی steif "سەخت، رەق"یش بەکار دەهێنرێ. ئەم وشە ئەڵمانییە خۆی خزمە دەگەڵ "جدەو" دە زمانی کوردمادیدا (پشتی ریش و شانی زامدار و جدەو بوو، ناعیلاج..."شێخ رەزا"].

**شەهتین şehtîn** [ *šahtīn* ] - "مردن لە تینوان": خزمە دەگەڵ ↑شەهت şeht. ئەم وشانە دە ریشەدا مانای "سەخت" دەگەیەنن.

[تێبینی: وشەی "تینوو" دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "هیشک بوون" و ئەم مانایە دەگەڵ چەمکی "سەخت، رەق" دە پێوەندیدایە (هیشک و رەق). هەروەها "مردن" دە زمانی ئەڵمانیدا دەبێتە sterben کە ئەویش سەر بەریشەیەکە بە مانای "سەخت و رەق بوون". لەم تێڕوانینەوە مردن دۆخێکە کە لەش هێزی جم و جۆڵ و چالاکی تێدا نامێنی و رەق هەڵدێ].

**شەهک şehk** [ *šahk* ] - "مەشکەی ئاوکێشان": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەک3 şek "کڵاوی پێستەمەڕ".

**شەهنک şehnık** [ *šahnık* ] - "خاڵ، خاڵی سەر گۆنا": ↑شان4 şan ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شانی(ک) şanî(k) "نیشان، بەڵگە، مەدرەک".

**شەهوان şehwan** [ *šahwān* ] - "بەردەڵان": خزمە دەگەڵ چیای ↑شاهۆ şaho ["(چیای) سەخت و ئاستەم"] و دەگەڵ ↑سەق *seq*.

**شەهۆ şeho** [ *šaho* ] - "رێگەی دژواری بەردەڵان": هەروەها شەهوان şehwan هەیە بە مانای "بەرەڵان". خزمن دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑سەق seq دا باس کراون.

**شەهێن şehên** [ *šahen* ] - "1- باڵدارێکی راوکەر 2- ناوی دارێک": بە مانای یەکەم شاهێن şahên ش دەگوترێ. شاهین šāhīn (.P). خزمە دەگەڵ ↑شاهۆ şaho "ناوی چیایەک" و دەگەڵ ژمارەیەک وشە بە مانای "سەخت، بەهێز".

**شەیپوور şeypûr** [ *šaypūr* ] - "زورنای زل": جێی هەڵسەنگاندنە دەگەڵ ↑شەپۆڕ şepor [بە دەنگی بەرز گریان]. لەوانەیە وشەکە ئاماژە بە "دەنگی زل و بەرز" بکا.

**شەیتان şeytan** [ *šaytān* ] - "ئەهریمەن": ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زمانی عیبری: < *sātān* (*Heb.*) و دە بنەڕەتدا مانای "دوژمن" دەدا و مەبەست "دوژمنی خودا "یە. وشەکە لە رێگەی زمانەکانی یۆنانی و لاتینییەوە کەوتووەتە ناو زمانە ژێرمەنییەکانیش.

**شەیتانۆکە şeytanoke** [ *šaytānoka* ] - "حەلەزوون": ئەم زیندەوەرە بچکۆڵە و بێ ئازارە هیچ پێوەندییەکی بە شەیتانەوە نییە و هەر بۆیە ئەم وشەیە لە "شەیتان" وەرنەگیراوە، بەڵکوو گۆڕانی بەسەردا هاتووە. وشە بنەڕەتییەکە لەباری شێوەوە لە وشەی "شەیتان" نیزیک بووە و ئەمە وای کردووە کە دەگەڵ وشەی شەیتان تێکەڵ بکرێ. وشە ئەسڵییەکە دەبێ پێوەندی هەبووبێ بە ↑شەهت şeht "شەپڵە لێدراو، هەست نەمان لە دەست و قاچدا" [دە بنەڕەتدا: سەخت و قورس بوون]، ↑شەهوان şehwan "بەردەڵان"، ↑شاهۆ şaho "(چیای) سەخت و ئاستەم"، ↑شەهێن şehên "باڵداری بەهێز 2- ناوی دارێک (ی سەخت)". ئەم وشانە دواتر دەبنە خزم دەگەڵ ↑سیتەک sîtek [سیتک sîtık] "بەردەڵان و تمتمان"، ↑سێتە sete "چیا" و هەروەها ↑چیا çîya سەر بە ریشەی < ***staī-*** (***IE.***) "رەق بوون، سفت بوون، توند بون". ↑هەستی hestî "ئێسک" و ↑ئاستەم astem "سەخت" لەم ریشەوە هاتوون. ناوی زیندەوەرەکە ئاماژەیەک بووە بە قاوغی ئێسکین یان بەردین، واتا ئەو سەدەفە کە لەشی زیندەوەرەکە دادەپۆشێ.

[تێبینی: لەباری ماناوە بەراوردی بکە دەگەڵ وشەی *سەدەف* "زیندەوەرێکی رەقی ناو چەم و ئاوان" کە ئەویش ناوەکەی دە بنەڕەتدا هەر ئەو مانایەی سەرەوە بە دەستەوە دەدا].

**شەیدا şeyda** *[ šaydā ]* - "دێوانەی ئەوین": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑سەودا sewda [سەوداسەر].

**شی şî** *[ šī ]* - شی کردنەوە واتا لێک (جیا) کردنەوە. شێوەیەکی دیکە لە ↑شێ şê.

**شیان şîyan** *[ šīyān ]* - "1- گونجان، بۆ بوون 2- رۆیشتن": شایستن šāyestan (P.) "گونجان، شیاو بوون". دە فارسیدا هەروەها شایستە šāyeste (P.) "گونجاو، لایق" و شایان šāyān (P.) "لایق" و شاید šāyad (P.) "دەشێ، بۆی هەیە" پێوەندیان بە کردارەکەوە هەیە. شاید و باید šāyad o bāyad (P.) دە زمانی فارسیدا واتا "دەشێ و دەبێ"]. دە زمانی کوردمادیشدا شیاو şîyaw هەیە بە مانای "1- گونجاو 2- لایق" و شیمانە şîmane"ئیحتیمال، ئەو شتەی رێیی تێ دەچێ، ئەو شتەی گونجانی بۆ هەیە". بە ورد بوونەوە لەو مانایانەی سەرەوە دەبینین کە مانای سەرەکی وشەکە "گونجان"ە و لەوێوە مانای "لایق" و "ئیحتیمال" سەریان هەڵداوە. بە وتەیەکی دیکە کاتێک گوتوویانە ئەو شتە یان ئەو کارە دەشێ، مەبەست ئەوە بووە کە ئەو کارە دەگونجێ، زەمینەی کران و جێبەجێ بوونی هەیە. هەروەها کاتێک گوتراوە ئەو کارە یان ئەوە شتە "شیاو"ە، مەبەست ئەوە بووە کە ئەو کارە یان ئەو شتە دەگەڵ بار و دۆخێکی دیاریکراودا دەگونجێ و رێک دەکەوێ. مانای "گونجاو" دواتر پەرەی گرتووە و مانای "لایق، شایان" سەری هەڵداوە. لە لایەکی دیکەوە مانای "ئیحتیمال" پەیدا بووە و ئەوەش لەسەر ئەو بنەمایەیە کە ئەگەر کارێک یان شتێک بگونجێ و زەمینەی پێکهاتنی خۆش بێ، ئەوا بۆی هەیە روو بدا، واتا چەمکی "شیان" دەبێتە حامل و هەڵگری رووداو. ئێستا پرسیارێک کە سەر هەڵدەدا، ئەوەیە کە وشەی "شیان" خۆی لە کوێوە هاتووە. ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ ↑چوون çun "رۆیشتن" و شدن šoden (P.) "بوون" [لە شتێکەوە بوونە شتێکی دیکە]. شدن šoden ی فارسی پێشتر هەر وەک "چوون"ی کوردمادی مانای "رۆیشتن"ی هەبووە. ئەم مانایە دە امد وشد āmad o šod (P.) "هاموشۆ، هاتوچۆ"دا پارێزراوە. هەروەها دە دەقە فارسییە کۆنەکاندا مانای وشەکە هەروەک "چوون"ی کوردمادی بووە. ئەوە کە چۆن وشەی"چوون" پەرەی گرتووە بۆ "شیان" و چۆن لە مانای "رۆیشتن"ەوە مانای "گونجان" پەیدا بووە، بەم جۆرە دەتوانین شی بکەینەوە: دە زمانی ئەڵمانیدا کاتێک ئاماژە بەوە دەکەن کە کارێک نابێ [جێ بەجێ نابێ، ناتوانرێ (جێ بەجێ) بکرێ، زەمینەی کرانی لە ئارادانییە] دەڵێن: es geht nicht واتا "ناڕوا" [بەرێوە ناچێ]، سەر بە کرداری gehen "رۆیشتن". دیارە مەبەست لە "ناڕوا"ی ئەڵمانی هەمان "نالوێ"ی لای خۆمانە. ["ناڕوا" و "نالوێ"ش دە ریشەدا هەر یەکن]. هەروەها ئەگەر سەرنجی وشەی رەوا rewa "بەهەق، دادپەروەرانە" بدەین، دەبینین لێرەشدا وشەکە لە کرداری رۆیشتن royıştın وەرگیراوە و دە بنەڕەتدا مەبەست ئەوە بووە کە ئەم کارە یان ئەو شتە بەگوێرەی داب و نەریت یان یاسا و رێسای کۆمەڵگا شیاوە، *بەرێوە دەچێ* و بۆیە دادپەروەرانەیە. کەوابوو وشەکانی "شیان" و لوان" دە ریشەدا بەو مانایە هاتوون کە کارێک یان شتێک بەڕێوەیە، "دەحاڵی رۆیشتن" و قەومان دایە ["قەومان"یش دە ئەسڵدا بە مانا "هاتن"ە]. هەر بۆیەش دە زمانی فارسیدا وشەی "شدن" مانای "بوون"ی وەرگرتووە، واتا بۆ وێنە کاتێک لە فارسیدا دەڵێن "جنگ میشود" [دەبێتە شەڕ]، ئەوە سەرەتا بەو مانایە بووە کە شەڕ *بەڕێوەیە*، بارودۆخەکە بەرەو شەڕ *دەچێ*. مانای "گونجان"یش هەر لەم چوارچێوەیەدا سەری هەڵداوە. بە وتەیەیەکی کاتێک گوتراوە "جنگ میشود" [شەر بەڕێوەیە، بارودۆخەکە بەرەو شەڕ دەچێ]، لێرەوە ئاماژە بەو بارو دۆخە کراوە کە شەڕی تێدا دەگونجێ. بۆ زانیاری لەسەر ریشەی وشەکە بڕوانە ↑*چوون çun*. هەروەها بەراوردی ئەم وشەیە بکە دەگەڵ ↑لێوەشانەوە leweşanewe "لێ هاتن، ژێهاتن". لێرەشدا پێوەندی دوو چەمکی "شانەوە" [لێ-وە-شان-ەوە] و "هاتن" [بەڕێوە بوون] بە ڕوونی دەردەکەوێ.

[تیبینی: شدن šoden (P.) ده زمانی فارسیدا وەک کرداری یاریدەر بۆ دروست کردنی کرداری نادیار بەکار دەهێنرێ، وەک "دیده شد"، "شنیده شد"، "خوانده شد"، "شناخته شد" و هتد. ده زمانی کوردمادی-شێوەزاری سەرووودا- کرداری "هاتن" ئەم ئەرکە دەبینێ، وەک "هاتە دیتن، هاتە بهیستن، هاتە خاندن، هاتە ناسین" و هتد. وەک دەبینین لێرەشدا کردارێک ئەو دەورە دەبینێ کە پێوەندی بە چەمکی "رۆیشتن"ەوە هەیە].

**شیاکە şîyake** [ *šīyāka* ] - "ریخ": دەشێ خزم بێ دەگەڵ scheißen (G.)، scīzan (OG.)، shit (E.)، skita (Sw.)، schijten (Nl.) "رین، ریان"، سەر بە ریشەی *(IE.) *skēi-* > "قەڵشاندن، جیا کردنەوە، لێک کردنەوە". مەبەست لە وشەکە دە بنەڕەتدا جیا بوونەوە و لێ بوونەوەی پیسایی لە لەشە. خزمە دەگەڵ ↑شێ şê [شی کردنەوە] و ژمارەیەک وشەی دیکە.

**شیب şîb** [ *šīb* ] - "رزیوی لە کار کەوتوو": [کراسەکەی ونجڕونجڕ بە جارێک ببووە شیب]. خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawîn، سەر بە کردارێک بە مانای "رنین، کڕاندن، رووشاندن، سوونەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا schäbig (G.) "شێب، سواوە، رزیو، بێکەڵک، شڕ و دڕ" پێوەندی بەم وشانەوە هەیەز مانای وشەکە دە زمانی ئەڵمانی ناویندا "سواو" بووە.

**شیبا şîba** [ *šībā* ] - "بریقە، ترووسکە، رووناکی": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەبەق şebeq.

**شیت şît** [ *šīt* ] - "فیتوو": سوت sūt (P.). خزمە دەگەڵ sausen (G.)، siuzen (Nl.)، susa (Sw.) "وژەوژ، ویزەویز، خشەخش کردن". هەروەها دەگەڵ sysati (OSl.) "فیتوو لێدان، ویزەویز کردن". ریشە؟

**شیپ1 şîp 1** [ *šīp* ] - "گیپ": شێوەیەکی دیکە لە↑ گووپ gup.

**شیپ2 şîp 2** [ *šīp* ] - شێوەیەکی کۆنتر لە ↑چێو *çew* [çub (P.)] بە مانای "دار". خزمە دەگەڵ ↑شووڵ şûl[دە بنەڕەتدا: "شیپەل، شیپل" ← شوول "داری چکۆڵە"]. هەروەها هەڵی سەنگینە دەگەڵ ↑شیپانە şîpane "چوارچێوەی دەرگا".

**شیپ³ şîp** [ *šīp* ] - "1- لافاوی بە تەوژم 2- رنوو، شاپە 3- جۆرێک پڵینگ": خزمە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑شەپ şep دا باس کراون و دەچنەوە سەر ریشەیەک بەمانای "پاڵ نان، ڕادان، دەرپەڕاندن، تاو دان".

**شیپانە şîpane** [ *šīpāna* ] - "چوارچێوەی دەرگا": دەچێتەوە سەر ↑شیپ şîp بە مانای "دار".

**شیپۆران şîporan** [ *šīporān* ] - " گوڕڕاندن": خزمە دەگەڵ ↑شەپۆڕ şepor.

**شیپە1 şîpe 1** [ *šīpa* ] - "1- ئامرازێکە لە نیر و ئامووردا 2- پانایی تیغ": خزمە دەگەڵ ↑شەپک¹ şepık.

**شیپە2 şîpe 2** [ *šīpa* ] - "سیرمەی قامچی": لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ ↑شەپ şep "لێدان".

**شیپە3 şîpe 3** [ *šīpa* ] - "حیلەی ئەسپ، شهە": دەشێ خزم بێ دەگەڵ ↑شەپۆڕ şepor.

**شیتاڵ şîtal** [ *šītāl* ] - "تیتاڵ، بزگور": شێوەیەکی دیکە لە ↑تیتاڵ tîtal.

**شیتک şîtık** [ *šītık* ] - "کەمەربەند": شووتک şûtık یش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ ↑شەتەک şetek [شەتەک دان واتا بەستنەوە].

**شیتەڵ şîtel** [ *šītal* ] - شیتەڵ کردن(ەوە) واتا شی کردنەوە، لێک جیا کردنەوە، ئانالیز کردن:

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑چەتاڵ çetal و ↑تەتەڵە tetele و دە بنەڕەتدا هەر وەک "تەتەڵە" بە مانای "شەنە" بەکار هاتووە و مەبەست لە شیتەڵ کردن هەمان تەتەڵە کردنی دەخڵ و دان بووە و پاشان ماناکەی فراوانتر بووەتەوە و بووەتە ئانالیز و لێک جودا کردنەوەی بابەتیکی بیرەکی (فکری) ئاڵۆز و لێک گرێدراو [لەم بارەوە بڕوانە ↑تەتک tetık].

2- لەوانەشە پێوەندی هەبێ بە شی şî [↑شێ şê] کردنەوە سەر بە ریشەیەک بە مانای "لێک دابڕین، جودا کردنەوە، قەڵشاندن، لێک کردنەوە". دە زمانی ئەڵمانیدا Scheitel (G.) "تەوقی سەر" هەیە، کە دە

بنەڕەتدا بە مانای "شوێنی جیا بوونەوەی مووی سەر" بووە، واتا ئەو شوێنەی کە موویەکان بە لای ڕاست یان چەپدا دەکەون و لێک جودا دەبنەوە.

**شیخاڵ** **şîxal** [ *šīxāl* ] - "باریکەبەفری سەهۆڵ بەستووی پەنا رەشانکێ کە درەنکێ دەتوێتەوە": خزمە دەگەڵ ↑سیخار sîxar "زوقم" و دواتر ↑*سەق seq*.

**شیرازە** **şîraze** [ *šīrāza* ] - "1- ریزەتەقەڵی پەڕاوێزی جلك 2- دروونی پەڕتووك": بنجی وشەکە دەبێ شی -şî بێ و خزمە دەگەڵ ↑شوژن şujın [-şî هەڵسەنگینە دەگەڵ sy (Sw.) "دروون"]. کەرتی دووەم واتا رازە -raze رەنگە پێوەندی بە ↑ریز rîz ەوە هەبێ.

**شیراندن** **şîrandın** [ *šīrāndın* ] - "قیژاندن، زیراندن": ئەم وشەیە دەشێ پێوەندی هەبێ بە ↑زیراندن zîrandın، ↑چرین çırîn "چرین، دەنكێ هەڵبرین، هۆنینەوە [خوێندنەوەی هەڵبەست]" و سرود sorud (P.) "سروود" بەیەکەوە هەبێ. ↑سروود sırud دە کوردمادیشدا بەکار دەهێنرێ. ئەم وشانە وێ دەچێ خزم بن دەگەڵ schreien (G.)، scrīan (OG.)، scrīen (MNl.)، scream (E.)، hrīna (OIs.) "زیراندن، هاوار کردن".

**شیرن** **şîrın** [ *šīrın* ] - "دژبەری تاڵ": شیرین şîrîn یش دەگوترێ. شیرین šīrīn (P.). خزمە دەگەڵ ↑شیرە şîre.

**شیرۆڤە** **şîrove** [ *šīrova* ] - "شەرح کردن": شی + رۆڤە şî + rove. کەرتی شی şî [یان ↑شێ şê] بە مانای "لێك دابرین، جیا کردنەوە"یە. کەرتی رۆڤە rove شێوەیەکی دیکە لە ↑راڤە rave [راڤە کردن واتا شەرح کردن].

**شیرە** **şîre** [ *šīra* ] - "تراوی دار یان گیا": شیلە şîle ش دەگوترێ. دەشێ خزم بێ دەگەڵ glykys (Gr.) "شیرین". ریشە؟

**شیرێژ** **şîrej** [ *šīrež* ] - "جۆرێك پەنیر": سیراج sîraj یش دەگوترێ. شیراز šīrāz (P.). خزمە دەگەڵ sūris (Lit.) "پەنیری سوێر"، syr (Rus.) "پەنیر" و syroj (Rus.) "تەڕ، خاو، ترش"، سەر بە ریشەی < ***sura-** (IE.)* "ترش، سوێر، تەڕ". لەم تێروانینەوە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سوێر suwer.

**شیش** **şîş** [ *šīš* ] - "1- تیشەشاخ 2- سیخ": خزمە دەگەڵ هێندێك وشەی وەك ↑شاخ şax، ↑سیخ sîx، ↑زیخ zîx "دڕکی ئەستوور" [بڕوانە ↑*زەق zeq*].

**شیشان** **şîşan** [ *šīšan* ] - "بەپەلە خەریکی کارێك بوون" [وای تێ شیشاوە هەر مەپرسە]. خزمە دەگەڵ ↑شیش şîş "1- تیشەشاخ 2- سیخ". ئەم دوو وشەیە هەر چەند مانایان زۆر جیاواز دێتە بەر چاو، بەڵام هەر دووکیان سەر بە ریشەیەکن بە مانای "دەرپەڕاندن، پاڵ نان، راو نان، پەلە کردن"، [بڕوانە ↑*زەق zeq*].

**شیشك** **şîşk** [ *šīšk* ] - "خیم، بناخە، بنەڕەت": خزمە دەگەڵ ↑شووشە şûşe و دواتر ↑*سەق seq* [دە بنەڕەتدا: سەخت].

[تێبینی: پێوەندی "سەق" و "شیشك" و "شووشە" وەك پێوەندی ئەم وشانەی خوارەوەیە: *کەڤر* "بەرد"، *هێم* "بناخە" و *خاو* "نەکوڵیو، پێنەگەیشتوو" [دە بنەڕەتدا: رەق].

**شیف** **şîf** [ *šīf* ] - "شووڵ": شێوەیەکی کۆنتر لە ↑چێو çew.

**شیقین** **şîqîn** [ *šīqīn* ] - شێوەیەکی دیکە لە ↑زیقاندن zîqandın.

**شیکە** [ *šīka* ] - "بێچووە بەراز": خزمە دەگەڵ Sau (G.) "بەرازی مێ"، su (OE.)، syr (OIs.) "بەرازی کەوی، خووك"، sys (Gr.) و sus (L.) "بەراز". بە پێی بۆچوونێك ئەم وشانە دواجار دەچنەوە سەر ئەو ریشەیەی کە مانای "زان" دەبەخشێ و مەبەست دە بنەڕەتدا "ئاژەڵی پڕ زاوزێ" بووە. بەم جۆرە وشەکە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑زان zan.

**شیلافە şîlafe** [ *šīlāfa* ] - "جێگەی خواردنی هەزمکراو لە ورگیماڵاتی کاوێژکەردا کە بۆ هەوێنی پەنیر دەبێ": شیلاوک şîlawk و شیلاڤ(ک) (šîlav(k یش دەگوترێ. لەوانەیە بچێتەوە سەر ریشەی **< *gel-** ***(IE.)*** "گلوو بوون، پێکەوەنووسان، رێکگوشران، بەستن و مەیین". بەم شێوەیە وشەکە دەبێ ئاماژەی بە "مەیین"ی پەنیر کردبێ و خزم بێ بۆ وێنە دەگەڵ ↑*گلوو gılû*، ↑گلۆپ gılop، ↑گلۆفین gılofîn، ↑سۆڵ sol [سارد و سۆڵ] و هتد.

**شیلانک şîlank** [ *šīlānk* ] - "بەلووعە، لوولەئاوی پلاستیکی": شلنگ šelang (.P). خزمە دەگەڵ schlank (.G)، slank (.Nl) "قەدباریک". مانای وشەکە دە بنەڕەتدا ئاماژە کردن بەوە بووە کە شتێک بە هۆی شل و مل بوونی با دەدرێ، دەچەمێتەوە. slingan (.OG) "بەم لا و ئەولادا جووڵانەوە، بەم لا و ئەو لادا بادانەوە"، slingan (.OE) "بادانەوە، خوشین"، slyngva (.OIsl) "هاویشتن، فڕێ دان"، Schlange (.G) "مار"، دەچنەوە سەر ریشەی **< *slenk-,-g-** ***(IE.)*** "با دان، بەم لا و ئەو لادا جووڵانەوە، پێچ و خەم خواردن".

**شیلەپە şîlepe** [ *šīlapa* ] - "1- ئامرازێکە لە نیر و ئامووردا 2- دارۆکەیەکە لە عارەبانەی کاکێشاندا": شیرەپە şîrepe ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ schleppen (.G) "(بەسەر هەردا) راکێشان"، slei(p)fen (.OG) "خشاندن، خزاندن، خلیسکاندن". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ گەلێک وشە دە زمانە ژێرمەنییەکان و هەروەها کوردمادیدا، بۆ وێنە ↑شێلهان şêl(e)han "راخوشین".

**شین şîn** [ *šīn* ] - "1- رەنگی (ئاوی) چەم و دەریا، رەنگی ئاسمان 2- رەنگی گژ و گیا": هەشین heşîn یش دەگوترێ.

1- لەوانەیە خزم بێ دەگەڵ kyaneos (.Gr) "شین". دەشێ دە زمانی کوردمادیدا شین سەرەتا رەنگی ئاسمان و دەریا بووبێ و پاشتر ماناکەی بۆ رەنگی گژ و گیاش پەرەی سەندبێ و ئەوجار لەوێوە "شین بوون" بە مانای سەر وەدەرنانی گژ و گیا دروست بووبێ. ریشە؟

[تێبینی: وشەی "ئوقیانووس" دەچێتەوە سەر ōkeanós (.Gr). وێ دەچێ ئەم وشە یۆنانییانە پێوەندییان بە یەکەوە هەبێ].

2- هەروەها جێی بەراورد کردنە دەگەڵ ئەو وشانەی لەژێر ↑هەش heş (خاڵی 2)دا باس کراون.

**شین şîn** [ *šīn* ] - "شەپۆڕ، گریانی بە دەنگ": شێوەیەکی دیکەیە لە ↑شیوەن şîwen و دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑*سۆنە sone* "مراوی تیر".

**شیناخ şînax** [ *šīnāx* ] - "چۆڵەمە، ئێسکێکی دوو فلیقانە لە نێوان شان و ملدا": جناغ jonāġ (.P). پێوەندی هەیە بە ریشەی **< *kneigh-** ***(IE.)*** "نەوین، چەمانەوە". ئەو ئێسکە، ئێسکێکی خوار و چەماوەیە و بووەتە دوو لک. لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ kniken (.G) "قەد کردن، نووشتاندنەوە" و kneikja (.OIs) "چەماندنەوە، رێکگوشین". ریشەکەی سەرەوە بە شێوەی *-gneig* ***(IE.)*** یش نووسراوە و خۆی دەچێتەوە سەر ریشەیەکی کۆنتر، واتا ریشەی**-gen < *** ***(IE.)*** "رێکگوشران، وێک هاتن، تۆپەڵە بوون". ↑گنج gınc و ژمارەیەک وشەی دیکە لەم ریشەوە هاتوون.

**شیو1 şîw** [ *šīw* ] - "دۆڵی تەنگ": شیڤ şîv و شێپ şêp ش دەگوترێ. خزمە دەگەڵ شیب šīb (.P)، šēp (.Pl)، xšvaepā (.Av) "سەرەوژێری، نشێو". ئەم وشانەش خزمن دەگەڵ schief (.G)، scaf (.OE)، skev (.Sw)، škibs (.Lit) "خوار، چەفت". دوڵی تەنگ یان سەرەوژێری پێوەندی تەواویان بە خوار بوونی هەردەوە هەیە واتا ئەو شوێنانەن کە لەوێ هەرد راست و تەختان نییە. خزمە دەگەڵ ژمارەیەک وشەی وەک ↑چەفت çeft [↑چەوت çewt]، ↑چەپ çep، ↑چەوێل çewel، ↑شەپڵە şeple و هتد. هەروەها خزمیشە دەگەڵ ↑نشێو nışêw "سەرەوژێری".

**شیو2 şîw** [ *šīw* ] - "جل شوتن" [شیو و کوڵ]. دەچێتەوە سەر ↑شوشتن şuştın.

**شیوەن** **şîwen** *[ šīwan ]* - "شەپۆڕ، گریانی بە دەنگ": دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑سۆنە sone "مراوی تیر".

**شێ 1 şê** - *[ še ]* - شی şî ش دەگوترێ. شێ کردنەوە یان شی کردنەوە واتا "لێک جودا کردنەوە (ی بەن و خوری وهتد)". دە زمانی کوردمادیدا چەندین وشەی دیکە هەن کە هەر لەم پێوەندییەدا جێی لێکدانەوەن، وەک شی کردنەوە بە مانای "شەرح کردن (ی بابەتێک)"، ↑شیرۆڤە şîrove "شەرح کردن"، ↑شاش şaş "لێک بڵاو، لێک جودا"، ↑شۆم şo(m) "زەوی کێڵدراو" [دەبنەڕەتدا لێک جیاکراوە]، ↑شێوەرد şêwerd و هتد. ئەم وشانە گشتیان دەچنەوە سەر ریشەی *(IE.) *skei- >* "بڕین، لەت کردن، لێک جودا کردن". هەر لەم ریشەوە هێندێک وشەی دیکەش پەیدا بوون، وەک ↑جۆی cuwe، ↑جیا cîya، و↑ ژێ je [سەر ژێ کردن] و ↑زۆڵ zol [زۆڵە چەرم] و هتد.

**شێ 2 şê** *[ še ]* - ئەم وشەیە ناوی رەنگێکی ئەسپە، بەڵام مانای وشەکە بەتەواوی روون نییە یان باشتر بڵێین بە چەند مانا بە کار دێ، وەک زەردی ئاماڵ سوور، سپی بە خاڵی سوورەوە، سوور بە خاڵی سپییەوە. جێی بەرهەڤ کردنە دەگەڵ Schimmel (.G) "برش، کەڕوو". ئەم وشە ئەڵمانییە لە سەدەی پازدەوە بە مانای "ئەسپی سپی"یش بەکار دێ و خزمە دەگەڵ Schime (.MG) "بریقە، تروسکە" و shine (.E) و scheinen (.G) "درەوشانەوە". بەکار هێنانی وشەی Schimmel (.G) دە زمانی ئەڵمانیدا بە دوو مانای "کەڕوو، برش" و هەروەها "ئەسپی سپی" ئەم بیرە دەخاتە مێشکەوە کە وشەی کوردمادی ↑شێ3 se "نم، تەرایی" دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە "برش هێنان" کردبێ و دواتر ماناکەی بۆ "نم، تەرایی" گۆڕدرابێ. وشەی "شێ" دە زمانی کوردمادیدا بەگوێرەی ئاگاداری نووسەر مانای "تەڕایی" بەگشتی نادا، بەڵکوو بە تەڕایی سەر هەرد و دار و دیوار دەگوترێ کە دە بێتە مایە برش هێنان. [شیاوی باسە کە وشەی "برش" خۆشی دەچێتەوە سەر ریشەیەک بە مانای "درەوشانەوە". "شێ" خزمە دەگەڵ ↑شێو êşw و ↑*سۆما soma* و چەندین وشەی دیکە. دە زمانی فارسیدا سمند semend (.P) بۆ رەنگی ئەسپی ئاماڵ زەرد بەکار دەهێنن. ئەم وشەیەش پێوەندی بە وشەکانی سەرەوە هەیە.

**شێ 3 şê** *[ še ]* - "نم، تەڕایی"، دەشێ خزم بێ دەگەڵ↑ شێ2 şê "رەنگێکە بۆ ئەسپ".

**شێب şêb** *[ šeb ]* - "رزیو، شڕ وڕدڕ": خزمە دەگەڵ ↑ساوین sawın. مەبەست لە وشەکە ئەوەیە کە شتەکە سواوەتەوە و لە کەڵک کەوتووە. خزمە دەگەڵ schäbig (.G) "کۆنە، بێکەڵک " سەر بە کرداری schaben (.G) "کڕاندن، تاشین، ساوین". ئەم کردارە ئەڵمانییە هاوریشەی "ساوین"ە. دە زمانی فارسیدا فرسوودە farsude (.P) خزمە دەگەڵ ئەم وشانەی سەرەوە [far-sūde].

**شێپ şêp** *[ šep ]* - "دۆڵی تەنگ": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑شیو şîw "دۆڵ، گەلی".

**شێت şêt** *[ šet ]* - "دێوانە": وێ دەچێ دەگەڵ ئەو وشانە خزم بێ کەلەژێر سەودا[2] sewda دا باس کراون [سەوداسەر].

**شێخ şêx** *[ šex ]* - "پیری تەریقەت": دەشێ وشەکە لە زمانی عەرەبییەوە هاتبێتە ناو کوردمادی. بەڵام ئەم وشەیە لەوانەیە بە ئەسڵ لاتینی بێ: < *(.L) senex* پیر، بە ساڵداچوو". [ senatus (.L) "ئەنجوومەنی پیران" دە زمانی عەرەبیدا دەبێتە"مجلس الشیوخ ". فۆنیمی n دە وشە عەرەبییەکەدا سواوەتەوە].

**شێل şêl** *[ šel ]* - "شێوە": خزمە دەگەڵ ↑شێلان şêlan، دە بنەڕەتدا بە مانای "لێدان".

[تێبینی: لەباری ماناوە هەڵی سەنگێنە دەگەڵ typus (.L) "شەقڵ، وێنە، پەیکەر" و typos (.Gr) "زەبر، لێدان، شەقڵ، شێوە، وێنە". ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەیەک بە مانای "لێدان" و خزمن دەگەڵ تۆپ top دە زمانی کوردمادیدا. پێوەندی دوو چەمکی "لێدان" بە "شەقڵ و شێوە" لەوە دایە کە لە شەقڵ و شێوە سەرەتا لەرێگەی لێدان و کوتان واتا هەڵکەندن و تاشین و هەڵکۆڵین لەسەر دار و بەرد دروست کراون].

**شێلان** **şêlan** *[ šelān ]* - "هەڵگلۆفین": خزمە دەگەڵ شڵەقان و ↑شڵەقاندن şıleqandın بەمانای "لێکدان". "شێلان" دە بنەڕەتدا بە مانای "لێکدان"ی هەویر و شتی وا بەکار هاتووە و پاشان ماناکەی بەربڵاوتر بۆتەوە و بە مانای "مشت و ماڵ دان"ی لەشی مرۆڤیش بەکار هاتووە.

لەباری سوانەوەی فۆتیمی q هەڵی سەنگێنە دەگەڵ ↑شلوێ şıl(u)we "لێڵ" [دە بنەڕەتدا: ئاوێ تێکەڵ بە گڵ، لێکدراو] و ↑شڵە şıla "رەنگێ لێکدراو" کە ئەوانیش پێوەستن بەم خێزانەوشەوە.

[تێبینی: دە زمانی فارسیدا چلانیدن čelānīdan (P.) هەیە بە مانای "گوشین"ی جلوبەرگی شۆراو. ئەم وشەیە پێوەندی بە "شێلان"ەوە نییە، بەڵکوو خزمە دەگەڵ "چۆڕان" و چۆڕاندنەوە. مەبەست لە وشە فارسییەکە دە بنەڕەتدا چۆڕاندنەوەی ئاوی جلوبەرگە شۆراوەکەیە].

**شێلهان** **şêl(e)han** *[ šelhān ]* - "راخوشین": خزمە دەگەڵ schleichen (G.)، slihhan (OG.)، sliken (ME.) "خوشین"، سەر بە ریشەی ***(IE.) *sleu(k)- >*** "خوشین، خزین، خلیسکان". ئەم ریشەیەش دەچێتەوە سەر ***(IE.) *(s)lei- >*** "تەڕ و لووس و لیچق بوون".

**شێلە** **şêle** *[ šela ]* - دەگەڵ "بێلە" دێ [شێلە و بێلە şêle û bêle: 1- فێڵ و تەڵەکە 2- بێ سەرەوە و بەرە، تێکەڵ و پێکەڵ]. شیلە و پیلە şîle u pîle ش دەگوترێ. [فڵانی کابرایەکی بێ شیلە و پیلەیە واتا رووراستە و شاراوەیی دە کارەکەیدا نییە]. "شێلە" یان "شیلە" خزمە دەگەڵ ↑شڵەقان şıleqan "لێکدان" [لێدان] و چەندین وشەی دیکە کە مانای "لێکدراو، شڵەقاو" دەگەیەنن. هەروەها "بێلە" یان "پیلە"ش دەچنەو سەر ریشەیەك بە هەمان مانا و خزمە بۆ وێنە دەگەڵ ↑پڵ3 pıl "1- لێدانی رەكێ 2- چەقەنە بە پەنجە". کەوابوو مانای بنەڕەتی هەر دوو وشەکە "لێدان" و دواتر "لێکدان"ە و مەبەست لە شیلە و پیلە هەبوون دەکاردا "لێکدراوی، شڵەقاوی"یە کە لە ئەنجامیدا لێڵی وناڕوونی پەیدا دەبێ.

**شێلەگە** **şêlege** *[ šelaga ]* - "جێگەی دادڕینی جۆگە": شەلەگە şelege ش دەگوترێ. بنجی وشەکە، واتا شێڵ یان شەڵ دەچێتەوە سەر ریشەی ***(IE.) *(s)kel- >*** "قەلشاندن، بڕین، لێك جودا کردنەوە" و دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چاڵ çal و چەندین وشەی دیکە.

**شێن** **şên** *[ šen ]* - "جوان": شێوەیەکی کۆنترە لە ↑جوان cuwan.

**شێنا** **şêna** *[ šena ]* - "بەهێز، بەتوان": هەروەها شێناهی şênahî هەیە بە مانای "هێز و توانایی". خزمە دەگەڵ können (G.)، kunnan (OG.)، cunnan (OE.)، can (E.)، kunna (Sw.) "توانین". ئەم وشانە خزمن دەگەڵ ↑زانین zanîn. دە زمانە ژێرمەنییەکانیشدا مانای "زانین، ناسین" کە مانای بنەڕەتییە، پارێزراوە، بۆ وێنە kennen (G.)، cennan (OE.)، känna (Sw.) "ناسین". لەم مانایەوە دواتر مانای "توانین" سەری هەڵداوە و دە بنەڕەتدا مەبەست "توانایی هزری" بووە. وێ دەچێ ئەم پەرەگرتنی مانایە بۆ سەردەمێکی کۆن بگەڕێتەوە و لەو کاتەوە هەم دە زمانە ژێرمەنییەکاندا و هەمیش دە زمانی کوردمادیدا بوونی خۆی بەردەوام کردبێ.

**شێنەیی** **şêneyî** *[ šenayī ]* - "هێواشی، لەسەرەخۆیی": خزمە دەگەڵ seine (MD.) "هێواش، شل"، seim (OIs.) "هێواش، درەنگێ"، serus (L.) "درەنگێ"، sainjan (Gt.) "درەنگێ کەوتن، دواکەوتن، فریانەکەوتن"، säumen (G.) "دواکەوتن، فریا نەکەوتن" و saumselig (G.) "لەسەرەخۆ، تەپ، نەپەڕژاو"، سەر بە ریشەی ***(IE.) * se(i)- >*** "فڕێ دان، بەردانەوە، خستن، داکەوتن". لەم تێڕوانینەوە دەبێتە خزم دەگەڵ ↑چاندن çandın و چەند وشەیەکی دیکە.

**شێنی** **şênî** *[ šenī ]* - : "ناوێکی پیاوانە":

1- یان پێوەندی هەیە بە ↑شێنەیی şêneyî "هێواشی، لەسەرەخۆیی". لەم تێڕوانینەوە مانای وشەکە دەبێتە "ئارام، هێدی".

2- یانیش پێوەندی هەیە بە ↑شێنا şêna "بەهێز، بەتوان". لەم تێڕوانینەوە وشەکە مانای بەهێز و گوڕ بوون دەدا.

**شێو şêw** [ *šew* ] - "بوومەلێڵ، بەرەو تاریک بوون": شێڤ şêv یش دەگوترێ. شام šām (P.) "ئێوارە، جەمی ئێوارە". وشەکە دە هێندێک فەرهەنگی کوردمادیدا وەک "چێشت، خواردن یان خواردەمەنی شەو" مانا کراوەتەوە. دە راستیدا ئەم مانایە هەڵەیە و خودی وشەکە چ پێوەندییەکی بە خواردن و خواردەمەنییەوە نییە. وشەکە بە مانای "ئێوارەی درەنگ، بوومەلێڵی پێش تاریکان"ە و ئەم مانایەش بە تەواوی دیار دەکەوێ کاتێک دەگوترێ "نوێژی شێوان"، هەروەک چۆن دەشگوترێ نوێژی بەیانی، نوێژی نیوەڕۆ و هتد. وشەکە خزمە دەگەڵ scem(e) (OG.) "تارمایی، شەوە"، scēme (MNl.) "سێبەر، درەوشانەوە(ی کز)، scima (OE.) "بوومەلێڵ". دە زمانی کوردمادیدا شێوەی کۆنی وشەکەش، واتا ↑شەم şem پارێزراوە کە هەم بە مانای "مۆمی داگیرساندن" دێ و ئاماژە بە "ڕووناکی و درەوشانێکی کز" دەکا و هەم مانای "سێبەر" دەدا، هەروەک چۆن دە زمانی هولەندی ناوینیشدا هەڵگری ئەم مانایە بووە. ئەم وشە کوردمادییە خزمە دەگەڵ چەندین وشەی دیکە وەک ↑زیڤان zîvan "دەنکی ڕەش و تاڵ دە ناو گەنم دا" و ↑سۆما *soma*.

[تێبینی: لەم بارەوە کە چۆن مانای وشەکە لە "ئێوارەی درەنگ، بوومەلێڵ"ەوە بووەتە "خواردنی شەو" دەتوانین بەرهەڤی بکەین دەگەڵ زمانی ئەڵمانی. لەم زمانەدا بە نانی نیوەڕۆ (جەمی نیوەڕو، فراوێن) دەگوترێ Mittagessen "نیوەڕو خواردن واتا خواردنی نیوەڕۆ" و بە نانی شەو (جەمی شەو، "شێو") دەگوترێ Abendessen "ئێوارەخواردن، خواردنی ئێوارە". دە زمانی کوردمادیشدا "شێوخواردن" هەر بەم شێوەیە بووە، واتا کاتێک گوتراوە "شێو دەخۆین"، مەبەست ئەوە بووە کە لە کاتی شێودا واتا لە کاتی بوومەلێڵی ئێوارەدا دەخۆین (نان دەخۆین). کەواتە "شێو" دە بنەڕەتدا ئاماژەی بە خواردن نەکردووە بەڵکوو ئاماژەی بەو "کات"ە کردووە کە خواردنی شەوی تێدا دەخورێ، هەروەک چۆن نوێژی تایبەتی ئەو کاتەشی تێدا دەکرێ].

**شێواندن şêwandın** [ *šewāndın* ] - "لێکدان": اشفتن āšoftan (P.) [a- šoftan]. هەروەها شیبانیدن šībānīdan (P.) هەیە بە مانای "شێواندن، لێکدان، تێکەڵ کردن". دە زمانی فارسیدا هەروەها اشوب āšūb (P.) [a- šūb] "ئاژاوە، ڕەوشی لێکدراو" و شیفتە šīfta (P.) "عاشق، ئەویندار" هەیە کە دەبنەڕەتدا ماناکەی "شێت و دێوانە"یە واتا ئەو کەسەی تێکەڵی کردووە یاخود مێشکی لێکدراوە. جگە لەمانە دە زمانی کوردمادیدا ↑شەوشین şewışîn "پەرێشان بوون، بێ سەرەوبەرە بوون" و ↑شەوهاندن şewhandın "1- تێکەڵ و پێکەڵ کردن 2- بیچم ناحەز کردن" بەکار دەهێنرێن. بنەوشەی şêw- / şew- دە زمانی کوردمادیدا و هەروەها دە فارسیدا [šīb / šīf- / šūb- / šof-] (P.) و şēp- (Pl.) پێوەندی هەیە بە یەکێک لەم وشانەی خوارەوە:

1- یان Schweif (G.) "کلکی درێژ"، schweifen (G.)، sweifan (OG.) "جووڵاندن(ەوە)، سووڕان(ەوە)"، umbesweif (MG.) "جووڵانی جەخزی"، sveipa (OIs.) "فڕێ دان، تیوە پێچان"، svíesti (Lit.) "فڕێ دان، هاویشتن، لێدان"، schweben (G.) "بە حەواوە جوولانەوە"، schwappen (G.) "بەم لا و ئەو لادا جووڵانەوە، شڵەقان"، schwabbeln (G.) "هەڵلەرزین، بە لەرزە لەرز جووڵانەوە". ئەم وشانە پێوەندییان هەیە هەروەها بە schwingen (G.)، swingan (OG.)، swingen (Nl.)، swing (E.) "بە تەوژم بزواندن، هەژاندن، لێکدان، شڵەقاندن". بەم جۆرە سەرجەم ئەم وشانە خزمایەتی پەیدا دەکەن دەگەڵ چەندین وشەی کوردی وەک ↑شەوێق şewêq [شل و شەوێق، لەق و تەق]، ↑چمە çıme، دووما duma [دووڤ duv، ↑دوو du]، ↑سووتە sute [کلکەسووتە]، ↑سووک suk [سڤک sıvık]، ↑چابوک çabuk و دواجاردەگەڵ ↑جمین *cımîn* یان جڤین cıvîn "بزوان"، سەر بە ریشەی < ***suēi(b)- (IE.)*** "سووڕان یان بزوانی سووک، بەلەز و چالاکانە".

2- یان ↑چەپ çep "خوار، بادراو، سووڕاو". ئەگەر وشەکە پێوەندی بە "چەپ"ەوە هەبێ، ئەوا دەبێ ماناکە لە "خوار بوون، با دران"ەوە بۆ "سووڕان، لێکدران" گۆڕدرابێ.

[تێبینی: "چپه شدن" ده زمانی فارسیدا به مانای "وەرگەڕانی ئوتۆمبێل" بەکار دێ. سەرنجراکێش ئەوەیە کە دە زمانی ئەڵمانیدا بە "وەگەڕان" دەگوترێ überschlagen. کەرتی ئەسڵی ئەم وشەیە خزمە دەگەڵ "شڵەقان". دە زمانی کوردمادیدا "وەرچەپین"یش بەکار دەهێنرێ. ئەم وشانە پێوەندی چەمکەکانی چەپ، خوار، با دران، سووڕان، لێکدران بەیەکەوە بەباشی دەردەخەن].

**شێوە şêwe** [ *šewa* ] - "بیچم، وێنە، چۆتیتی": شیوه šīva (P.). خزمە دەگەڵ Scaf (OG.)، skap (OIs.) "شێوە، چۆتیتی"، shape (E.) "شەقڵ و شێوە"، gesceaft (OE.) و gaskafts (Gt.) "دروستکراو، رسکێندراو" [دە بنەڕەتدا شەقڵ و شێوە پێدراو]. کرداری schöpfen (G.) "رسکاندن، خولقاندن" خزمە دەگەڵ وشەکانی سەرەوە. ئەم وشانە دەچنەوە سەر ریشەی ***(s)ka-bh-** > (**IE.**) "ساوین، تاشین، کڕاندن". بەم جۆرە "شێوە" واتا بیچم و روخسار ئەو شتە بووە کە بە هۆی *ساوین* و کڕاندن و داتاشین [ی دار و بەرد و ئاسن و قوڕ و هتد] بەدی هاتووە. وشەکە دواجار دەبێتە خزم دەگەڵ ↑ساوین sawîn.

[تێبینی 1: ئەم پێوەندییەی سەرەوە بە جۆرێکی دیکە دە وشەی typos (Gr.) "تیپ، فۆرم، شێوە" دا دەبیندرێ کە دەچێتەوە سەر کرداری typtein (Gr.) "لێدان، کوتان". هەروەها "ئەفراندن"یش پێوەندی بە کرداری "بڕین"ەوە هەیە. تێبینی 2: وشەی شبهة šibha (Arb.) "وەکوو، (هاو)شێوە" لەم وشە کوردمادییە وەرگیراوە. "شبهەجزیرە" واتا شێوەکەی لە جەزیرە دەچێ، شێوەجەزیرەیە].

**شێوەرد şêwerd** [ *šeward* ] - "زەوی کێڵدراو": خزمە دەگەڵ ↑شێ şê 1، سەر بە ریشەیەک بە مانای "بڕین، قەڵشین، لێک جودا کردنەوە". بۆ کەرتی دووەمی وشەکە بڕوانە ↑وەرد werd [وەرد دانەوە واتا پێدا هاتنەوە و دووبارە کێڵان].